زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی • العقيدة الاسلامية و مذاهبها • 58

د. قحطان عبدالرحمن الدوري

# بیروباوەڕی ئیسلامی و مەزهەبەکانی



وەرگێرانی

زنیار عزیزخان مهاجر



# بیروباوەڕی ئیسلامیی
# و
# مەزهەبەکانی



نووسینی
**د. قحطان عبدالرحمن الدوري**

بەکوردی کردنی
**زێبار عزیزخان مهاجر**







# بیروباوەڕی ئیسلامی و مەزهەبەکانی


نوسینی: د. قحطان عبدالرحمن الدوري

بەکوردی کردنی: زێبار عزیزخان مهاجر

بلاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بلاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر

خەت: نەوزاد کۆیی

نەخشەسازی بەرگ: ترایزۆن

نەخشەسازی ناوەرۆک: جمعه صدیق کاکە

نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣٦ك - ٢٠١٥ز

تیراژ: ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٧٧٩) ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە







نوسینگەی تەفسیر

بۆ بلاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

هەولێر - [illegible]

Mob: +964 750 440 51 22

Tel: +964 750 818 00 66

www.tafseer-pub.com

tafseeroffice@yahoo.com

# پێشەکی وەرگێڕ

سوپاس و ستایش بۆ خوای زانا و خاوەن توانا، درودو سڵاو بـڕژێ بەسـەر پێغەمبـەری خاوەن پەیامی ڕەوا و، بەسەر خانەوادە و یاران و شوێنکەوتووانی تـا ڕۆژی جیاکردنـەوەی ڕەواو ناڕەوا.

مرۆڤ لەگەڵ داگیرسانی چرای دیدەی و هەنگاونانی بـۆ نـاو شـانۆی جیهـانی دونیـا پێویستی بە بەرنامەیەك هەبوو، تا بوارەکانی ژیانی خۆی پێ ڕێکبخـات و ڕێگـەی خـۆی پێ ڕۆشن بکاتەوە، لە سەرجەم لایەنەکانی گوزەرانیدا پەنای بۆ ببات. بۆیە خـوای گـەورە لە ڕێی نێردراوە یەك لە دوای یەکەکانی پەیامی ئاسمانی ڕەوانە دەکرد، تا بە پێغەمبـەری کۆتا سەردەم ئاینی ئیسلامی وەك دوا بەرنامە ڕەوانەکرد، تا ببێتـە مەشـخەڵی ڕێـی و، کاروانی ژیان نەکەوێتە گێژاوی سەرگەردانیەوە.

پەیامی ئیسـلامی هـاتووە تـا برینـی پرسـیارەکانی مرۆڤـ سـارێژ بکـات، بـواری بیروباوەڕی بە تەواوی بۆ ڕوون بکاتەوە، بەمەش لایەنی دەروونی مرۆڤـ بحەسێتەوە، دواتر مرۆڤـ سەرقاڵی چاك بەکارهێنانی کێڵگەی دونیـا بێـت لـە پێنـاو بەرهـەمی بـاش لـە دواڕۆژدا، ئاینی ئیسلام بەندە لە دەست گرێ و گۆڵـەکان ڕزگـار دەکـات و دەیخاتـە سـەر ڕێگەی سەرکەوتن بەرەو لوتکە، بـەهۆی بـەکردار کردنـی تواناکـان و پاراسـتنی لـە خـۆ سەرقاڵکردنی بە جیهانی خەیاڵ.

ئاینی ئیسلام هیچ کەلێنێکی لە بابەتی بیروباوەڕدا جێ نەهێشتووە، بـەڵکو بـە تێـڕو تەسەلی و بە بەڵگەی سەلمێنراو چەسپاندوویەتی، ئەم بیروباوەڕەش کـاری دروسـت کردنـی دەروونێکی دەریا ئاسایە، کە هەرگیز لایـەنی ڕۆحـی ئـەم دەروونـە نووسـتنی بـۆ نییـە، بەمەش هەر شتێك ببێتە مایەی بۆگەن و پیس کردنی بیروباوەڕەکەی ئەوا ڕاستەوخۆ ئـەو شتە ڕەتدەکاتەوە، تەنها شتێك پەسەند دەکات کە بیروباوەڕەکەی چاڵاکتر بکات، هەروەك چۆن دەریا ناخی ناکاتە هەمبانەی ماسی مردوو، بەڵکو لە زووترین کاتدافرێی دەدات.

بیروباوەڕ چاوگی چاکسازی ڕۆحە، جا ئاییـنی ئیسلام کەسێك لـە بـاوەش ناگرێـت کـە ڕۆحـی پوکابێتـەوە کەچـی ئـایین تـەنها شوناسـی بێـت و ڕۆحـی بـۆ سـاتێکیش لـەناو

شەپۆڵەکانی خواپەرستی دا مەلەی نەکردبێت و تێکەڵی توخمی بەندایەتی خوا نـەبووبێت. ئاینی ئیسلام ڕۆح و دەروونێك پێدەگەیەنێت کە بەرزە فـــڕ بێـت و نزمـی و داتـەپینی بەلاوە پەسەند نەبێت.

جا بیروباوەڕ کـار لەسـەر ڕوونکردنـەوەی ئاماژەکـان و شـرۆڤەی مەتەڵـەکان دەکـاتو ڕایدەگەینێت، دینداری بریتی نییە لە سەر خستنە سەر زەوی، بەڵکو بریتییە لـە خسـتنە سەر زەوی ئەو شتەی لە ناو کەللەی سەردایە.

لەبەر گرنگی ئەم لایەنە هەڵسام بە وەرگێڕانی ئەم کتێبە، کە (دانـەر) خـوا پاداشـتی بەچاکە بداتەوە توانیویەتی بە ڕۆشنی بیروباوەڕی ئیسلامی بـە ڕاڕەو (مەزهەب)ەکانیـەوە بخاتەڕوو، هەر چەندە پێشتر هەڵساوم بە وەرگێڕانی کتێبی (أصـول الـدین الإسـلامي) کـە دانەر بە هاوبەشی لەگەڵ (د.رشدي عليان) نووسیویانە، لەگـەڵ ئەوەشـدا هـەر سـوربووم لەسەر وەرگێڕانی ئەم کتێبە بەهۆی هەژاری کتێبخانەی کوردی لەم بوارەدا، بەو هیوایـەی بتوانم هیچ نەبێت خزمەتێکی کەم پێشکەش بکەم بە ئاینی خواو کتێبخانەی کـوردەواری بکەم.

شایەنی باسە وەرگێڕانی کتێبێکـی لـەم جـۆرە بـۆ کەسـێکی کـەم توانـای وەك مـن (وەرگێڕ)[1] پێویستی بە یارمەتییەکی زۆری هاوەڵ و مامۆستایان بووە، لـەلای خۆشمـەوە سوپاسیان دەکەم و داواشم وایە خوا پاداشتیان بداتەوە، بەتایبەت ئەم مامۆسـتا بەڕێزانـە کە شەونخونیان بەدیار پێداچـوونەوەو هەڵەچـنینی ئـەم بەرهەمـەدا کـردووە: (م. مهـاجر موحەممەد، م. ڕەقیب ڕەسول ڕەوستایی، م. ئینعام موحەممەد، م. مەلا محمود).

زێبار عزیزخان

---

[1] بۆ ڕاڤەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز سوودم بینیوە لە: خولاصەی تەفسیری نامی، دانراوی مەلا عبدالکریمی مدرس. تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان، نووسینی بورهان موحەممەد ئەمین. (وەرگێڕ).

## پێشەکی نووسەر

سوپاس و ستایش بۆ خوای جیهانیان، درووده سڵاو لە گەورەی پێغەمبەران و لەسەر خانەوادەو هاوەڵە ڕوو سپی و بەرەکەتدارو ڕاستڕەوەکان، لەسەر ئەوانەش کە بە چاکە شوێنیان دەکەون تا ڕۆژی دوایی.

ئاینە ئاسمانیەکان هاتوون تا عەقڵی مرۆیی ڕزگار بکەن لە چاڵەکانی گومڕایی و شەوەزەنگە تاریکیەکان. ئیسلامیش وەك کۆتا شەریعەت، ئاینێکە چاکسازی دەروون و حەسانەوەی دڵ و ڕێکخستنی جیهان لەخۆ دەگرێت.

بۆیە ڕوونکردنەوەی ئەو شتانەی گرتە ئەستۆ کە لە میانەیاندا لایەنەکانی ژیانی مرۆڤ ڕێکدەخەن لە هەر سێ لایەنەوە:

١- **بنەما بیروباوەڕییەکان**: ئامانجی ئەم لایەنە چەسپاندنی بیروباوەڕی ئیسلامییە، بە هێنانەوەی بەڵگەی دڵنیاکەرەوەو لادانی گومان لە بەردەمی دا.

٢- **بنەما ڕەوشتییەکان**: ئامانجی ئەم بنەمایانەش بریتییە لە بڵاوکردنەوەی چاکەکاری و خوو ڕەوشتە بەرزەکان و دوورکەوتنەوە لە خراپەکاری و ڕەوشتە نزم و پەستەکان، ئەمەش بەهۆی چاندنی ئەو سیفەتانەی کە دەبنە سەرچاوەی کارە چاکەکان لە دەرووندا، وەك: دەستپاکی، بە ئەمەك بوون، دادگەری، خاکی بوون، لێبوردەیی، یارمەتی یەکتری دان، یەکتر خۆش ویستن.... تاد.

٣- **حوکمە کردارییەکان**: ئامانجی ئەم لایەنە ڕێکخستنی کۆمەڵگەیە لە هەموو بارودۆخێك و لە هەر کات و شوێنێکدا بێت، وەك ڕێکخستنی پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ خوای بەدیهێنەریدا لە میانەی پەیڕەوێکی ڕۆحی. پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ

برا مرۆڤــەکەی تریدا لە میانەی پەیڕەوی کۆمەڵایەتیەوە. پەیوەنـدی مرۆڤـــ بـە سەروەت و سامانەوە لە میانەی پەیڕەوێکی ئابووریدا، هەروەها پەیوەندی مرۆڤـــ بە سەرۆکایەتی دەوڵەت لە میانەی بەرنامەیەکی سیاسی... .

بەم پێیەش ئاینی ئیسلام بە دادگـەری و دلۆڤانیەکـەی هـەموو لایەنـەکانی ژیـــانی دونیا و دواڕۆژ لەخۆ دەگرێت. ئەمەش سەلمێنەری ئەو فەرمایشتەی خـوای پایەبـەرزە کـە لــە بــارەی پێغەمبـــەرە ڕێزدارەکـــەی فەرموویـــەتی: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴾ الأنبِياء: ۱۰۷. واتە: ("ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)" ئێمە تۆمان ڕەوانە نـەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە ببیتە ڕەحمەت و بەرەکەت بۆ هەموو جیهانیان).

بابەتی کتێبەکەمان بریتییە لەلایەنی یەکەم (زانستی بیروباوەڕی ئیســلامی) کـە لــەم بوارانە دەکۆڵێتەوە: خواناسی (الإلهيـات)، پێغەمبەرایەتی (النبـوة)، ڕۆژی دوایـی (اليـوم الآخر)، مەزهەبەکانی موسڵمانان لە هەمبەر ئەم سێ لایەنە.

زانایانی (زانستی کەلام) ئەم لایەنەیان بە (بنەماکانی ئایین) ناوناوە، چونکە بناغەیـە بۆ بنەما ڕەوشتی و حوکمە کردارییەکان.

زانایانی کەلام زۆر بە دوورو درێژی هەڵوەستەیان کردووە لە سـەر دەقـەکانی قورئـانی پیرۆزو سوننەتی بەپێزی پێغەمبـەر، کـە لــە بـارەی ڕوون کردنـەوەی بیروبـاوەڕ هـاتوون، تێگەیشتنی جیاوازیان هەبووە بۆ هەندێ لەو دەقانە، ئەمەش خۆی لەخۆیدا یەکێك بوو لە هۆکارەکـانی ســەرهەڵدانی مەزهەبــە جیاوازەکــان لــە مێــژووی ئیســلامیماندا، وەك: (خەوراجیــەکان، شــیعەکان، مورجیئــەکان، جەبرییــەکان، قەدەرییــەکان، موعتەزیلــەکان، ئەشعەرییەکان، ماتوریدییەکان، سەلەفییەکان..).

لە بەرنامەی کۆلێژدا ئەوە دانرابوو کە دەبێـت قوتـابی فیکـری ئیسـلامی لــە بــواری بیروباوەڕو ئەو مەزهەبانەی لە سەرەتای ئیسلام سەریان هەڵدا بخوێنێت.

ئەمـــەش وای لێکــردم کـــە کتێبێـــك بنووســم لـــەبارەی (بیروبـــاوەڕی ئیســـلامی و مەزهەبەکانی) بەشێوەیەك کە پێداویستیەکانی ئەو پەیڕەوە بڕیـار لەســەردراوە جێبـەجێ

بکات، قوتابیش بەهۆیـەوە لەسـەر زەوییـەکی پتـەو بوەسـتێت لـە گۆڕەپـانی ململانـێ فیکرییەکانی ئەمڕۆی جیهان، بەشێوەیەك کە بەهۆی ئەم کتێبە لە بیروبـاوەڕە ڕاسـتەکەی تێبگات کە سەرچاوەی گرتووە لە بەڵگە دڵنیاکەرەوەکان، هەروەها لە میانەی کتێبەکـەدا پەیی ببات بە مەزهەبە جیا جیاکانی ئیسلامی، تا بەمەش ئەو گومانانـە بتاوێنـەوە کـە لە دەوری ئەو بیروباوەڕە پاکە دەوروژێنرێن و گەنگەشە دەکرێن.

لەبەر ئەمە ئەم کتێبە حەوت بەش لە خۆ دەگرێت:

**بەشی یەکەم:** دەروازەیەك بۆ بیروبـاوەڕی ئیسـلامی، کـە ئـەم بابەتانـەی تیـادا هاتووە: پێناسەکەی، بەڵگەکانی، تایبەتەمەندییەکانی... تاد.

**بەشی دووەم:** مەزهەبە ئیسـلامیەکان و شـیکردنەوەو ڕوونکردنـەوەی چـۆنیەتی سـەرهەڵدانیان، هـەروەها باسـکردنی گـرنگترین ئـەو مەزهەبانـەی کـە پـەیڕەوی کۆلیژەکە دەستنیشـانی کـردووە، دواتـر خسـتنەڕووی بنـەماکانی ئـایین لەلایـەن مەزهەبە ئیسلامیەکان و لەسەر کام بنەما کـۆکن و لـەبارەی کامـەیان نـاکۆکن و خستنەڕووی ناوەڕۆکی ئەو ڕاجیاییە.

**بەشی سێیەم:** حەقیقەتی ئیمان و باوەڕ و گرنگیەکەی لە ژیاندا.

**بەشی چوارەم:** خواناسی (الإلهیات)، ئەمانە لـەخۆ دەگرێـت: بەڵگـەکانی بـوونی خوا، سیفەتەکانی خوا بە سەرجەم جۆرەکانیەوە، ئەو شتانەی لەسـەر سـیفەتەکانی خوا کەڵەکە دەبن.

**بەشی پێنجەم:** پێغەمبەرایەتی (النبوات)، ئەمانە لەخۆ دەگرێت: ڕوون کردنـەوەی پێویستی مرۆڤـ بـە ڕێنمـایی پێغەمبەرایـەتی، پێغەمبەرایـەتی بـە شـێوەیەکی گشـتی، پێغەمبەرایـەتی بەشـێوەیەکی تایبـەتی کـە بریتیـە لـە پێغەمبەرایـەتی گەورەمان موحەممەد (صلى الله عليه وسلم).

**بەشی شەشەم:** ڕۆژی دوایی، دیمەنەکانی ڕابوونی قیامەت.

**بەشی حەوتەم:** کوفرو تەکفیر، حوکمی تـەکفیر کردنـی ئـەهلی (ڕووگـە) قیبلـە، سزای هەڵگەڕاوە (المرتد).

بەوپەڕی توانامەوە کە بۆم کراوە هەوڵمداوە جەخت بکەمەوە لەسەر ماددە و کەرستە زانستییەکەی، هەروەها زۆر گەڕانەوە بۆ ئەو سەرچاوانەی جێگای پشت پێبەستنن لە مەزهەبە جیاوازەکان، بەوەی پەراوێزی زۆربەی لاپەڕەکان گران بکەم بە نووسینی ناوی ئەو سەرچاوانە تیایدا، ئەمەش بە پێداگیری کردنی زۆری خۆمەوە لەسەر ئەوەی کە ببمە ڕێنوێنی کارێکی سوودبەخش بە قوتابی لە تێگەیشتنی بیروباوەڕەکەیدا، هەروەها تا ببمە یارمەتیدەریش لە نووسینی توێژینەوە زانستیە بەراوردکارییەکان، هەروەها بۆ ئەوەی سەرچاوەی ئەو زانیارییە لاوەکیانەی ئەو کتێبە لەخۆی دەگرێت بناسێت، هەڵوێستەش بکات لەسەر ڕاو بۆچوونی خاوەن مەزهەبەکانی تریش لە بابەتەکەدا.

ئا لەو کاتەدا قوتابی پەیی بە کرۆك و ڕاستی ڕاجیایی نێوانیان دەبات و دەزانێت ئەم ڕاجیاییە تەنها لە بابەتە لاوەکییەکانە، کە تەکفیر کردنی ئەوەی تر پێویست ناکات، مادەم بڕوای هەیە بە سێ بنەماکانی بیروباوەڕ کە هەموو مەزهەبە ئیسلامیەکان لەسەری کۆکن، ئەویش بریتین لە: باوەڕ بوون بەخوای گەورەو بە پێغەمبەرو بە ڕۆژی دوایی، ئامانجی ئێمەش کۆکردنەوەو ڕیز پتەوکردنە نەك پەرتەوازەکردن، خوای پاك و بەرز دەفەرموویت: ﴿ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْ ﴾ آل عمران: ١٠٣. واتە: ("هەوڵ بدەن" هەر هەمووتان بە توندی دەست بگرن بە ئایینی خواوەو پەرت و بڵاو مەبن).

بەڵام هەندێ کەس لە نەزانی خۆیانەوە بۆچوونیان وایە کە ئەو ڕاجیاییەی لە نێوان ئەو مەزهەبانە هەیە ڕاجیاییەکی تەواو دژیەکە و ڕاجیایی جۆرێتی نییە، ئەمەش وای لێکردووە دەمارگیر بێت بۆ مەزهەبەکەی، بەمەش تاقمی قین هەڵگر سەری هەڵدا و دەستەی بەدگۆیی و لێك خوێندن لە دایك بوو، ئەمەش سەری کێشا بۆ پەرتەوازە بوون و ڕاجیاییەکی تاڵ لە نێوان موسڵمانان.

بەڵام ئیسلام ئەم تاقمەی فڕێدا، زانایانیش نکۆڵیان لێکرد، چونکە تاقمەکە تەنها دەنگدانەوەیەك بوو بۆ چەند شتێك بەدەر لە ڕاستی ئاینی ئیسلامی وەك: کاروباری سیاسی و هەواو هەوەسی کەسی و هاوشێوەی ئەم هۆکارانە.

بۆچوونم وابوو کە پیتی قەشەنگ هەڵبژێرم بۆ ئەم کتێبە و ئایەتەکانی قورئـانی پـیرۆز بە خەتی (موصحەف) بنووسم، هەروەها ڕێککاری بکەم بۆ زۆرێك لە نیشانەکان و زۆرێك لە پیتەکان، ئەمەش بەهۆی سوربوونم لەسەر خوێندنەوەی سەلامەت.

ئومێدەوارم خوای گەورە ئەو کارە بە ڕەزامەندی خۆی قبوڵ بکـات و بیکاتـە مایـەی سوود، ڕیزی موسڵمانانیش ڕێك بخات و وشەیان یەك بخات، تا ببنە سەرچاوەی خێرو چاکە بۆ جیهان هەروەك چۆن لە سەرەتای ئیسلام وابوون. بەڕاستی هەر ئەو بیسەرو وەڵـامگۆی نزایە.

پ.د. قحطان عبدالرحمن الدوري
ڕاگیری کۆلیژی توێژینەوەی فیقهی و یاسایـەکان -
زانکۆی ئالوبەیت
(المفرق) - شانیشینی ئوردنی هاشمی

# بەشی یەکەم

## دەروازەیەك بۆ بیروباوەڕی ئیسلامی

لە سێ دەروازە پێکدێت:

دەروازەی یەکەم:

بیروباوەڕی ئیسلامی و بەڵگەکانی چەسپاندنی:

پێناسەکردنی بیروباوەڕو عەقیدەی ئیسلامی لـە ڕووی زمانەوانی و زاراوەییەوە، ناوەکانی زانستی بیروباوەڕ، زانستی بیروباوەڕ بناغەی زانستە شەرعییەکانە، گرنگی بیروباوەڕی ئیسلامی، تایبەتمەندییەکانی بیروباوەڕی ئیسلامی، بەڵگەکانی چەسپاندنی بیروباوەڕی ئیسلامی.

دەروازەی دووەم:

پەیڕەوی قورئانی پیرۆز لە خستنەڕوو و نمایشکردنی بیروباوەڕی ئیسلامی.

دەروازەی سێیەم:

بارودۆخی بیروباوەڕ لە سەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و دوای ئەویش.

# دەروازەی یەکەم

## بیروباوەڕی ئیسلامی و بەڵگەکانی چەسپاندنی

### پێناسەی بیروباوەڕو عەقیدەی ئیسلامی:

له ڕووی زمانەوانیەوە:

ئیبن فارس وتویەتی: (عقد) هەر سێ پیت: (ع، ق، د) یەك بنچینەن، ئاماژەیە بۆ گرێدان و بەستنەوە بەشێوەیەکی توونـد، هەموو لق و پۆپەکانی بەشەکە بۆی دەگەڕێنەوە[1]. نمونەش لەم بارەوە:

پەتەکە و مامەڵەکە و پەیمانەکەی بەست و گرێی دا: بە توونی و تۆکمەیی[2].

(عاقدته) و (عاهدته) وەك یەکن کە بریتییە لە گرێبەست (عقد)، کۆیەکەشی (عقود)ە، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِ﴾ المائدة: ١. واتە: (بەوەفا بن بەرامبەر بەڵێن و پەیمانەکانتان).

گرێبەستی سوێند خواردن، هەروەك ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە لەوبارەوە هاتووە: ﴿وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلۡأَيۡمَٰنَ﴾ المائدة: ٨٩. واتە: (بەڵکو لەو سوێندانەتان دەپرسێتەوە کە بیرو هۆشتان لای هەبووەو بۆ مەبەستێك وتوتانە).

گرێبەستی مارەبڕین و ئەو شتانەی پێیەوە پەیوەستن: پێویست بوونی و یەکلاکردنەوەی[3].

وای بۆچووم: دڵ و دەروونم لەسەری دامەزراند[4].

---

[1] معجم مقاييس اللغة مادة (عقد) ٨٦/٤.

[2] القاموس المحيط مادة (عقد) ٣٨٣.

[3] معجم مقاييس اللغة، سەرچاوەی پێشوو. بڕوانە: أساس البلاغة مادة (عقد)، و المصباح المنير مادة (عقدت) ٤٢١ و القاموس المحيط، سەرچاوەی پێشوو، مادة (عقد).

[4] المصباح المنير، سەرچاوەی پێشوو.

هەموو ئەو مانایانــە ئامــاژەن بــۆ توونــد گرێــدان، کــە پێچــەوانەی هەڵوەشــانەوەیە. (زوبەیدی) وتویەتی: پێشەواکانی داتاشینی وشە (إشتقاق) ڕاشـکاوانە دەریـان بڕیـوە کـە گرێدان و بەستن پێچەوانەی هەڵوەشانەوەیە...، دواتر بۆ هەموو جۆرەکانی مامەڵە و کڕین و فرۆشــتن و شــتی تــریش بــەکارهێنراوە، لــە پاشــان بــۆ ســوربوون و بــاوەڕی دامــەزراو بەکارهێنراوە[1].

لە ڕووی زاراوەییەوە:

زانستی بیروباوەڕ: زانستێکە لەگەڵیدا یان بەهۆیەوە دەتوانرێـت بیروبـاوەڕو عـەقیـدەی ئاینی بچەسپێنرێت، بە خستنەڕووی بەڵگە و لادان و نەهێشــتنی گومــان. مەبەســت لــە بیروباوەڕ خودی بیروباوەڕە بەبێ کردەوە، مەبەست لە ئاینی بوونی ئەوەیە کە دراوەتە پــاڵ ئاینی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) [2].

## ناوەکانی ئەم زانستە:

ئەو زانستە بە چەند ناوێك ناونراوە، گرنگترینیان:

١- فیقهی مەزن (الفقه الأكبر): ئیمامی ئەبو حەنیفــە ئــەو نــاوەی لێنــاوە، هــەروەها باسی ئەوەشی کردووە کە: (تێگەیشتن لە ئاین چاکترە لە تێگەیشتن لە حوکمــەکان، چونکە پیاو تێبگات لەوەی چۆن بەندایەتی بۆ خوا بکات باشترە لەوەی زانســتێکی زۆر کۆ بکاتەوە)[3].

---

[1] تاج العروس مادة (عقد) ٢/٤٢٦.

[2] المواقف للإيجي ١/٣٤ و٣٨. و السعد التفتازاني في المقاصد ١/ ١٦٣ بەم شێوەیە پێناسەی کردووە: زانستی کلام: زانستێکە هەوڵی شارەزا بوون و زانینی بیروباوەڕە ئاینیەکان دەدات بە بەڵگە دڵنیاکەرەوەکان.

[3] الفقه الأبسط ٤٠، و کتێبی (الفقه الأبسط) ئەبو موتیع لە ئەبو حەنیفە (ڕەزای خوایان لێبێت) گێڕاویەتیەوە، کتێبی (الفقه الأبسط) خۆی لە خۆیدا کتێبی (الفقه الأكبر)ە، بەڵام بە (الفقه الأبسط) ناسێنرا بۆ جیاکردنەوەی لە (الفقه الأكبر) کە حەمادی کوڕی ئەبو حەنیفە لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە.

٢- زانستی یەکخواناسیی (التوحید): بۆیە بەو ناوە ناوبانگی دەرکردووە، چونکە ئەم بەشەی ناودارترین بەشەکانی ئەم زانستەیە، تەنانەت گرنگترینیانە[١].

٣- زانستی بنەماکانی ئایین[٢]: بۆیە بەوناوە ناونراوە، چونکە هەڵدەستێت بە شیکردنەوەی بنەماکانی بیروباوەڕ، ئەویش ئەم بابەتانە دەگرێتەوە کە پەیوەستە بە خواناسی و پێغەمبەرایەتی و ڕۆژی دوایی.

ئەم ناونانەش لە بەرامبەر زانستی فیقهە کە هەڵدەستێت بە شیکردنەوەی حوکمە کردارییە لاوەکیەکان، هەروەها لە بەرامبەر زانستی ڕەوشت و بەرەوخواچوون (الأخلاق و السلوك)[٣].

٤- زانستی کەلام: بەهۆی چەند هۆیەکەوە بەو ناوە ناوبانگی دەرکردووە گرنگترینیان ئەمانەن:

أ- گرنگترین بابەت کە ڕاجیایی لێکەوتەوەو بووە چەقی گفتوگۆ بابەتی (فەرمایشتی خوا) و (بەدیهێنراوی قورئان) بوو، کە مشتومڕو دژەڕایی لەم بارەوە زۆربوو[٤].

ب- یاخود توانا دەبەخشێت لەسەر قسەکردن لەبارەی چەسپاندنی بابە شەرعیەکان و پابەند کردنی دژەکان، نمونەی ئەمەش وەك: زانستی لۆژیکە لە ئاست فەلسەفەدا[٥].

پ- یاخود لەبەر ئەوەی زانایانی زانستی کەلام دواون لەو شتانەی کە پێشینان لە

---

[١] شرح الخريدة للدردير و الصاوي عليه ٢٦.

[٢] سەرچاوەی پێشوو.

بەغدادی ناوی (بنەماکانی ئایین)ی لە کتێبەکەی خۆی ناوە، هەروەها جەمالەدینی زەنویش ناوی (بنەماکانی ئایین)ی لە کتێبەکەی ناوە.

[٣] کتێبەکەمان: أصول الدين الإسلامي ١٥.

[٤] المواقف للإيجي ١/٦٠ و شرح العقائد النسفية للتفتازاني ١٥ و الصاوي على الدردير، سەرچاوەی پێشوو.

[٥] المواقف، و شرح العقائد النسفية، هەر دوو سەرچاوەی پێشوو.

هاوەڵان و شوێنکەوتوان لە ئاستیدا بێ دەنگ بوونە. وەك بابەتی سیفەتەکان و قەدەر[1].

## زانستی بیروباوەڕ بناغەی زانستە شەرعییەکانە:

هەموو زانستە شەرعییەکان بنیاتنراون لەسەر ئەم زانستە، چونکە بوونی خوای بەدیهێنەری جیهان و پەروەردگاری خاوەن توانا و ڕەوانەکەری پەیامبەران و دابەزێنەری کتێبەکان لە میانەی زانستی (تەفسیر، فەرموودە، فیقه و بنەماکانی) نە سەلمێنراوە. بەڵکو هەمووی لەسەر زانستی کەلام وەستاوەو لەوەوە سەرچاوە دەگرێت، جا ئەوەی شت لە ئایین وەردەگرێت، بەبێ ئەم زانستە، وەك ئەوە وایە تەلارێك دروست بکات بەبێ بناغە[2].

## سوودەکانی لێکۆڵینەوە لەم زانستە:

١- هاتنەدەر لە چاڵەکانی لاسایی کردنەوەو بەرز بوونەوە بۆ بەرزاییەکانی یەقین و دڵنیایی، کە پلەی هەرە بەرزە، هەروەك لەم فەرمایشتەی خوای گەورەدا هاتووە: ﴿يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَـٰتٍ﴾ المجادلة:١١. واتە: (خوای گەورە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە لە ئێوە و ئەوانەشتان زانست و زانیاریان پێدراوە چەندەها پلەوپایە بەرزیان دەکاتەوە).

٢- ڕێنموونی کردنی ئەوانەی داوای ڕێنموونی دەکەن و ڕۆشنکردنەوەی ڕێگە بۆیان بۆ بیروباوەڕی ئایین، هەروەها پابەندکردنی سەرکەشەکان بە بەرپاکردنی بەڵگە لەسەریان.

٣- پاراستنی بیروباوەڕی ئایین لەوەی گومانەکانی دوژمنان زیانی پێبگەیەنن[3]. پێناسەکەی ئیجی کە کەمێك پێش ئێستا خرایەڕوو ئەمەی لەخۆ گرتبوو.

---

[1] بڕوانە کتێبەکەمان: أصول الدين الإسلامي، سەرچاوەی پێشوو.

[2] المواقف و شرحه للسيد الشريف ٥١/١.

[3] المواقف و شرحه، سەرچاوەی پێشوو.

## گرنگی بیروباوەڕی ئیسلامی:

گرنگی بیروباوەڕی ئیسلامی لە ژیانی موسڵماندا دەدرەوشێتەوە، هەروەك لەم خاڵانەدا دەیانخەینەڕوو:

١- ڕزگارکردنی مرۆڤ لە کۆتی بەندایەتی کردن بۆ جگە لە خوای گەورە: خوای گەورە مرۆڤی دروست کردووە بۆ ئەوەی زەوی ئاوەدان بکاتەوە، خوای پاك و بەرز دەفەرموویێت: ﴿هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا﴾ هود: ٦١. واتە: (خوای گەورە بەرپای کردوون لە زەویداو داوای لێکردوون کە ئاوەدانی بکەنەوە).

خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ مرۆڤی کردۆتە جێنشینی خۆی، خوای پاك و بەرز دەفەرموویێت: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ البقرة: ٣٠.واتە: ("ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) باسی ئەوە بکە لە دێرین زەماندا" پەروەردگارت بە فریشتەکانی وت: بەڕاستی من دەمەوێت لە زەویدا جێنشینێك دابنێم).

بەدیهێنراوەکانی بۆ مرۆڤ ڕام و دەستەمۆ کردووە، خوای بێ هاوتا دەفەرموویێت: ﴿أَلَمْ تَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُۥ ظَـٰهِرَةً وَبَاطِنَةً﴾ لقمان: ٢٠.واتە: (ئایا سەرنجتان نەداوە کە بەڕاستی هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر هەمووی خوا بۆ خزمەتی ئێوەی دروست کردووەو ملکەچی کردووە، هەروەها بە فراوانی نازو نیعمەتی ئاشکراو پەنهانی بەسەریدا ڕژاندووون).

هەروەها خوای گەورە چەندین توانا و سیفەتی وای بە مرۆڤ بەخشیوە کە بتوانێت ئەرکی خۆی وەك جێنشین لەسەر زەوی ڕاپەڕێنێت، عەقڵی لە مرۆڤدا بەدیهێناوە، بەمەش مرۆڤ توانی پەیی بەشتەکانی دەورووبەری ببات، سیفەتی خۆویستی (أنانیە)ی لە مرۆڤدا دروست کرد بەمەش مرۆڤ دەستی بەسەر سەرەوەت و سامانی جگە لەخۆیدا گرت، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَأُحْضِرَتِ ٱلْأَنفُسُ ٱلشُّحَّ﴾ النساء: ١٢٨. واتە: (هەر چەندە خەڵکی بە سروشت حەز بە ڕەزیلی دەکەن و تەنها

بەرژەوەندی خۆیان دەویت). خوای گـەورە توانـا و هیـزی لـە مرۆڤـــدا دامەزرانـد بەمەش زاڵ بـوو بەسـەر دەوروبەریـدا، هـەروەها لـە کێڵگـەی دەروونـی مرۆڤـــدا سۆزداری و عاتیفەی بڵاوکردەوە بەمەش مرۆڤــ خۆشویستن و خـۆش نەویسـتن و ڕق لیّ بوونەوەی هەیە.

سەرباری ئەمەش پێویستە بزانریّ ئەم توانایانە چەکی دوو سەرەن، ئەگەر بە ڕاست و دروستی بەکارهێنرا ئەوا دەبێتە مایەی خێرو بەرەکـەت، هـەروەها ئەگـەر بـە ڕووی خراپ بەکارهێنرا ئەوا دەبێتە هۆی هێنانی ئاشووب و خراپەی وێرانکـەر، بـۆ نمونـە سیفەتی هێز خاوەنەکەی پاڵدەدات بۆ ئەوەی ستەم لـەوانی تـر بکـات و ملکەچـیان بکات و بیانکاتە بەندە و ماڵ و سەروەتیان داگیر بکات و شتە پیرۆزەکانیان هەتك و پێشێل بکات، هـەروەك ئەمـە شـتێکی زانـراوە لـە مێـژوودا، کـە ئەمـە بووەتـە سەرچاوەی بەدبەختی لە جیاتی ئەوەی ببێتە سەرچاوەی خۆشبەختی.

بۆیە پێویستە ئەو سیفەتانە بە شێوەیەکی چاك ئاراستە بکرێن بەڕووی چاکەدا، تاکە ڕێگەش بۆ ئەمە تەنها بیروباوەڕە، جا ئەگـەر تـاك بـڕوای هـەبوو بـە بـوونی خـواو یەکتاییەکەی و بەوەی هیچ هێزێك نییـە جگـە لـە هێـزی خـوای گـەورە، هـەروەها پەروەردگار چاودێریشە بەسەر بەندەکانی و لێپرسینەوەشـیان لەگـەڵ دەکـات لەسـەر ئەو کردەوانەی کە لە ژیانی دونیادا ئەنجامیانداوە، ئەو کاتە ئەو تاکە هەست دەکات کە بەندەی ئەو خوایەیە، بەمەش ئەو سیفەتانەی دەبنە هۆکارو ئـامرازی خۆشـبەختی لە ژیاندا و حەزی داگیر کردن و خستنەژێر دەست دەبێتە ئامرازێـك بـۆ بـەرپاکردنی ژیانێکی دادگەرانە، حەز و خواستی هێزو توانا دەبێتە پارێزەری مافەکان، خواسـتی زانست دەبێتە تیشکی ڕێنیشاندەر. ئـا لەوکاتـەدا خـۆ بەزلزانـەکان لـە لووتبـەرزی خۆیـان دێنـەخوار و چەوسـێنراوەکانیش لـە بچـوکی و سەرشـۆڕییەکەیان بـەرز دەبنەوە[1].

[1] کبری الیقینیات ٦٥-٦٦.

بەمەش مرۆڤ لە بەندایەتی کردن بۆ جگە لە خوای گەورە ڕزگاری دەبێت، خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ دەفەرموویێت: ﴿وَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ لَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ القصص: ٨٨. واتە: (لەگەڵ خوادا هاناو هاوار لە خوایەکی تر مەکە، چونکە جگە لەو زاتە خوایەکی تر نییە، هەرچی شت هەیە تیاچوو و لەناوچووە جگە لەو زاتە، فەرمانڕەوایی هەر شایستەی ئەوە، هەمووانیش هەر بۆ لای ئەو دەبرێنەوە).

٢- ڕزگار کردنی عەقڵ لە لاسایی کردنەوەی کوێرانە و خەیاڵاوی، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِى ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَٰبٍ مُّنِيرٍ ۝٢٠ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُوا۟ بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ أَوَلَوْ كَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ يَدْعُوهُمْ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ۝٢١﴾ لقمان: ٢٠-٢١. واتە: (هەندێ لە خەڵکی موجادەلە و گفتوگۆی نابەجێ دەربارەی خواو بەرنامەکەی دەکەن، بێ هیچ بەڵگەیەکی زانستی و ڕێنموویییەکی پێغەمبەران و کتێبێکی ڕوونکەرەوەی خوایی. کاتێکیش پێیان بوترێت شوێنی ئەو بەرنامەیە بکەون کە خوا ناردوویەتی، ئەوە دەڵێن: نەخێر شوێنی ئەوە ناکەوین، بەڵکو هەر شوێنی ئەو شتانە دەکەوین کە باوو باپیران و مامۆستایانمان پەیڕەویان لێ کردووە، ئایا ئەگەر شەیتانیش بانگی کردبن بۆ سزای داگیرساوی دۆزەخ، هەر پەیڕەوی دەکەن).

بانگەوازی کردن بۆ بیرکردنەوەو تێفکرین و بەکارهێنانی عەقڵ، خوای پایەبەرز دەفەرموویێت: ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ﴾ الأنعام: ٥٠. واتە: (بڵێ: ئایا کوێرو چاوساغ وەك یەکن؟ ئایا بۆ بیر ناکەنەوەو تێنافکرن). هەروەها دەفەرموویێت: ﴿قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ﴾ آل عمران: ١١٨. واتە: (بێگومان ئێمە نیشانە و بەڵگەمان بۆ دیاری کردوون، ئەگەر عەقڵ و ژیریتان بخەنەکار).

٣- پابەندبوون بەو فەرمانانەی کە لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی بەپێزی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هاتوون، هەروەها خۆگرتنەوە لەو شتانەی کە قەدەغەیان کردووە، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ آل عمران:

١٣٢. واتە: (گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرەکەی بن بۆ ئەوەی ڕەحمتان پێ بکرێت). هەروەها دەفەرموویێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ﴾ الأحزاب: ٣٦. واتە: (بۆ هیچ پیاو ئافرەتێکی ئیماندار دروست نییە، کاتێك خواو پێغەمبەرەکەی بڕیاری شتێك بدن، ئەوان سەرپشك بن لە ئەنجامدانی ئەو کارەدا).

بڕوابوون بە خوای گەورەو بە پێغەمبەرایەتی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) بناغەی بە دادوەر دانانی قورئانی پیرۆزە، خوای پەروەردگار دەفەرموویێت: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴾ النساء: ٦٥. واتە: (نەخێر، سوێند بە پەروەردگارت ئەوانەی "لافی بڕوا لێدەدەن" بڕوا ناهێنن هەتا لە هەموو کێشەیەکدا کە ڕوودەدات لە نێوانیاندا تۆ نەکەن بە دادوەرو گوێڕایەڵی تۆ نەکەن، دوای ئەوەش نابێت لە دڵ دەروونیاندا هیچ نارەزاییەك دروست ببێت بەرامبەر ئەوەی کە داوەریت لەسەر کردووەو دەبێت بە تەواوی تەسلیم و ڕازی بن).

٤- پەروەردەکردنی دەروونێکی هۆشیارو بێدار، کە بەهۆیەوە مرۆڤ دەتوانێت لەخۆی بپێچێتەوە لەسەر ئەو کردەوانەی کە کردوویەتی، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویێت: **(حاسبوا أنفسكم قبل أن تحاسبوا)**[1] واتە: لێپرسینەوە لەگەڵ خۆتان

[1] فەرموودەی: لێپرسینەوە لەگەڵ خۆتان بکەن .... تاد: ڕازی لە (شرح أسماء الله الحسنى ٢٦٢) هێناویەتی. بەڵام لە (سنن الترمذي: ٣٨ كتاب صفة القيامة، ٢٥ باب، رقم ٢٤٥٩، ٤/٥٥٠)دا هاتووە: (لە عمری کوڕی خەتتاب گێڕدراوەتەوە کە وتویەتی: لێپرسینەوە لەگەڵ خۆتان بکەن بەر لەوەی لێپرسینەوەتان لەگەڵ بکرێت و خۆتان برازێننەوە بۆ نمایشکردنی گەورە، بەڕاستی سزا لە ڕۆژی دواییدا لەسەر کەسێك سووکە کە لە دونیادا لێپرسینەوەی لەگەڵ خۆ کردووە). ئەم شوێنەوارە بەهەمان شێوە لە کتێبی (المصنف، أبي شيبة: ٣٣ كتاب الزهد، ٨ كلام عمر بن خطاب، رقم ٣٤٤٤٨، ٧/١١٥) بەم شێوەیە هاتووە: (لە عمری کوڕی خەتتابەوە هاتووە کە لە وتارێکیدا وتویەتی: لێپرسینەوە لەگەڵ خۆتان بکەن بەر لەوەی لێپرسینەوەتان لەگەڵ بکرێت،

بکەن بەرلەوەی لێپرسینەوەتان لەگەڵ بکرێت، چونکە خوای گەورە لێپرسینەوە لەگەڵ خەڵکدا دەکات بەهۆی کردەوەکانیان، خوای پاك و تاك دەفەرموویت: ﴿لِّلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ۗ وَإِن تُبْدُوا۟ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ ٱللَّهُ ﴾ البقرة: ٢٨٤. واتە: (هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدا هەیە هەر خوا خاوەنیانە و ئەگەر ئەوەی لە دڵ و دەروونتاندا جێگیر بووە، دەری بخەن یان بیشارنەوە خوا دەربارەی لێتان دەپرسێتەوە).

خوای گەورە چاودێری بەندە دەکات بە بەردەوامی لە بەندایەتی کردن و خواردن و خواردنەوەو پەیوەندیی بەندە لەگەڵ خانەوادە و کۆمەڵگاکەی، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویت: (**إتقِ الله حيثما كنت، وَأَتْبِع السيئة الحسنة تمحها، وخالق الناس بخلق حسن**)[1] واتە: لە خوا بترسە لە هەر کوێیەك بیت، کاری چاکە بەدوای کاری خراپە بکە دەیسڕێتەوە، بەڕەوشتی بەرز هەڵسوکەوت بکە لەگەڵ خەڵکدا.

لەبەر ئەوەی بە دڵنیاییەوە دەزانێت کە خوای گەورە سزاو پاداشتی دەداتەوە لەسەر هەر کردەوەیەك کە کردوویەتی، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ۝٨ ﴾ الزلزلة: ٧، ٨. واتە: (جا ئەوەی بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك خێرو چاکەی ئەنجام دابێت دەیبینێتەوە. ئەوەش کە بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك شەڕو خراپەی هەبێت، دەیبینێتەوە).

---

کردەوەکانتان بکێشن بەر لەوەی بکێشرێن، خۆتان برازێننەوە بۆ نمایشکردنی گەورە ئەو ڕۆژەی کە کردەوەکانتان نمایش دەکرێن و هیچ شتێکی پەنهانتان لەلا شاراوە نابێت).

[1] فەرموودەی: لە خوا بترسە لە هەر کوێیەك بیت... تاد: ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا و ترمذی و حاکم لە موستەدرەکدا و بەیهەقی لە (شعب الإيمان) لە ئەبو زەڕەوە هێناویانە. و ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا و ترمذی و بەیهەقی لە (شعب الإيمان) لە موعازەوە هێناویانە. و ئیبن عەساکریش لە ئەنەسەوە هێناویەتی/ الجامع الصغير ١٤.

جا ئەگەر سامان و ماڵی کەسانی تری لەلابوو، ئەوا ناپاکی و ستەم ناکات، چونکە دەڵێت: لە خوادەترسم. بەمەش هەست کردن بە بەرپرسیارێتی و ڕێککاری دروست دەبێت.

٥- پاکسازی کردن لە هەڵسوکەوت و خووڕەوشتدا[1]. موسڵمان بەهۆی کاریگەری بیروباوەڕی ئیسلامی:

- خاوەن دەروونێکی بەهێزە و ئازادە و بوێرەو تەنها ملکەچە بۆ خوای گەورە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ المنافقون: ٨. واتە: (عیززەت و دەسەڵات و پایەداری هەر شایستەی خواو پێغەمبەرەکەی و ئیماندارانە). لەبەرئەوەی موسڵمان دەزانێت هاتنی سەرەمەرگ تەنها بەدەست خوایە.
- خاکی و خۆ بەکەم زانە لە ئاستی بڕواداران، خوای پایەبەرز دەفەرمووێت: ﴿أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ المائدة: ٥٤. واتە: (ملکەچ و فەرمانبەرو بەسۆزن بۆ ئیمانداران و سەربڵند و شکست نەخۆرو دەروون بەرزن بەسەر بێ باوەڕاندا).
- لووتبەرز نییە و نانازێت بەخۆیەوە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَلَا تُصَعِّرۡ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمۡشِ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَحًاۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخۡتَالٖ فَخُورٖ ﴾ لقمان: ١٨. واتە: (هەروەها ڕووت وەرمەگێڕە لە خەڵکی "لووت بەرز مەبە و بەچاوی سووك سەیریان مەکە"، بەسەر زەویدا بەنازو فیز مەڕۆ، بەڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە خۆهەڵکێش و فەخر فرۆش و فیزاوین).
- ئەوانی تری خۆشدەوێت و چاکەیان لەگەڵ دەکات، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

[1] بڕوانە: کاریگەری بیروباوەڕ لەسەر تاك و کۆمەڵگە، لەم سەرچاوانەدا : الإيمان والحياة، والعقيدة الإسلامية وأسسها ٢٩ و عقيدة التوحيد في القرآن الكريم ٣٨.

دەفەرموویّت: (**لا يؤمن أحدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه**)[1] واتە: هیچ کامێکتان ئیمانی تەواو نابێت تا چی بۆ خۆی پێخۆشه، ئەوەشی بۆ براکەی پێخۆش نەبێت. هەروەها فەرموویەتی: (**المسلم أخو المسلم لا يظلمه ولايسلمه، من كان في حاجة أخيه كان الله في حاجته، ومن فرج عن مسلم كربة فرج الله بها كربة من كرب يوم القيامة، ومن ستر مسلما ستره الله يوم القيامة**)[2] واتە: موسڵمان برای موسڵمانه ستەمی لیّ ناکات و وازی لێناهێنێت کە ستەمی لێبکرێت، ئەوەی پێویستی براکەی جێبەجیّ بکات، خوای گەورە پێویستیەکانی جێبەجیّ دەکات، هەر کەسێکیش یارمەتی موسڵمانێك بدات و نارەحەتیەکی بۆ سووك بکات، ئەوە خوای گەورە نارەحەتیەکی لە نارەحەتیەکانی رۆژی دوایی لەسەر سووك دەکات. هەر کەسێك کەم و کوڕی موسڵمانێك بشارێتەوە و دەری نەخات ئەوە خوای گەورە کەم و کوڕییەکانی لە رۆژی دواییدا دەشارێتەوە.

- بەر لەوەی شت بەخۆی ببەخشێت، کەسانی تر پێش خۆ دەخات، خوای پایەبەرز دەفەرموویّت: ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾ الحشر: ٩. واتە: (فەزڵی ئەوان دەدەن بەسەر خۆیاندا، هەر چەندە هەژارو نەداریش بن). چونکە موسڵمان وادادەنێت کە سەرچاوەی رِزق و رۆزی تەنها لەلایەن خواوەیە.
- فەرمان بەچاکە و رێگری دەکات لە خراپە و خۆڕاگریشە لەسەر تاقیکردنەوەو ناخۆشیەکان، خوای گەورە دەفەرموویّت: ﴿ يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ

[1] فەرموودەی: هیچ کامێکتان ئیمانی تەواو نابێت تا ئەوەی بۆ براکەی پێخۆش نەبێت ... تاد، ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا و بوخاری موسلیم و ترمذی نەسائی و ئیب ماجە هێناویانە. فەرموودەکەش ڕاس و دروستە. / الجامع الصغير ٥٨٦.

[2] فەرموودەی: موسڵمان برای موسڵمانە ستەمی لیّ ناکات... تاد، هاتووە لە: صحيح مسلم: ٤٥ كتاب البر و الصلة، ١٥ باب تحريم الظلم، رقم ٢٥٨٠، عن سالم عن أبيه (عەبدوڵای کوڕی عومەر).

عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ ﴾ لقمان: ١٧. واتە: (کوڕی شیرینم نوێژەکانت بەچاکی ئەنجام بدە، فەرمان بەچاکە و قەدەغە لە گوناهو خراپە بکە، بە ئارامبە لە بەرامبەر ئەو نەخۆشیانەی تووشت دەبێت، بەڕاستی ئەوانەی کە باسکران هەندێکن لەوانەی کە دەبێت بکرێن).

- کارکەرێکی کارجوان و دڵسۆزە و خۆی دوور دەگرێت لە پاڵدانەوەو تەمبەڵی، خوای گەورە دەفەموویت: ﴿ وَقُلِ ٱعۡمَلُواْ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمۡ وَرَسُولُهُۥ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴾ التوبة: ١٠٥. واتە: (بەو خەڵکە بڵێ: ئێوە هەرچی دەتوانن لەکارو کردەوە ئەنجامی بدەن، چونکە خوا کارو کردەوەتان دەبینێت، هەروەها پێغەمبەرەکەشی و ئیماندارانیش). پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویت: **(إن الله تعالى يحب إذا عمل أحدكم عملا أن يُتْقِنَهُ)**[1] واتە: خوای گەورە پێیخۆشە ئەگەر یەکێکتان کارێکی کرد، کارەکەی بەچاکی و جوانی بکات.

- خۆی پێشەواو نمونەیەکی چاکە لە هەموو گوفتارو کردارێکی دا کە دەیکات، ئەمەش لە میانەی خۆ ڕازاندنەوە بە ڕەوشتی بەرز و کاری چاك و شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە پێشەوای هەرە چاکە بۆ خەڵك، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾ الأحزاب: ٢١. واتە: (سوێند بەخوا بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا چاکترین نمونەی تەواو ڕێك و پێك هەیە تا چاوی لێ بکەن و شوێنی بکەون). کە لەم فەرمایشتەی خوای گەورەدا وەسفی کراوە:﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾ القلم: ٤. واتە: (بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشت و خوویەکی زۆر جوان و پەسەند و بێ وێنە و مەزنیت).

بیروباوەڕی ئیسلامی دەبێتە بناغەی یەکەم لە بنیاتنانی کەسایەتی موسڵمان، بەمەش موسڵمان دەبێتە تاکێکی سوودبەخش لەناو کۆمەڵگەدا و ئامانجیشی بەدەستهێنانی

---

[1] فەرموودەی: خوای گەورە دەیەوێت ئەگەر یەکێکتان کارێکی کرد... تاد: بەیهەقی لە (شعب الإيمان) لە عائیشەوە گێراویەتیەوە./ الجامع الصغير للسيوطي ١١٥ و بەلاوازی داناوە.

ڕەزامەندی خوایە لە هەر کارێکدا کە دەیکات، ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾ الحجرات: ١٣. واتە: (بەڕاستی بەڕێزترینتان لەلای خوا ئەو کەسانەتانە کە زۆرتر لە خواترسە و فەرمانبەرداری خوایە). لەبەرچاوی دادەنێت ئەگەر جیاوازی کرد لە نێوان خەڵکیدا.

جا ئەگەر تاك باش بوو، ئەوا خانەوادە و خێزان و دواتر کۆمەڵگەش باش دەبێت، ئەو کاتەش ئوممەت دەبێتە چاکترین ئوممەتێك کە بۆ خەڵکی هێنرابنە مەیدانەوە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾ آل عمران: ١١٠.واتە: ("بەڕاستی" ئێوە چاکترین ئوممەتێکن کە "بۆ سوودی" خەڵکی هێنراونەتە مەیدانەوە، چونکە فەرمان بەچاکە و قەدەغە لە خراپە دەکەن و باوەڕی دامەزراوتان بەخوا دەهێنن).

نموونەی کۆمەڵگەی موسڵمانان لە بەزەیی پێکداهاتنەوەو پەیوەندیدا وەك یەك جەستە وایە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: (**مثل المؤمنين في توادِّهم وتراحمهم وتعاطفهم مثل الجسد إذا اشتكى منه عضوٌ، تداعى له سائر الجسد بالسَّهر والحُمَّى**)[1] واتە: نمونەی ئیمانداران لە خۆشەویستیان بۆ یەکتری و هاوسۆزی و بەزەیی بەیەکدا وەك یەك جەستە وان، ئەگەر ئەندامێکی ئازارێکی هەبوو ئەوا دەناڵێنێ، لەتاو بێخەوی و گەرمی تا.

شایەتی دەدات لەسەر ئوممەتەکانی تردا، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا﴾ البقرة: ١٤٣. واتە: (بەوشێوەیە ئێوەمان بە گەلێکی میانڕەو گێڕاوە، تا ببنە شایەت بەسەر خەڵکیەوە، بۆ ئەوەی پێغەمبەریش شایەتیتان بۆ بدات).

---

[1] فەرموودەی: نمونەی ئیمانداران... تاد: ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا و مسلیمیش لە نوعمانی کوڕی بەشیر گێڕاویانەتەوە، فەرموودەکە ڕاست و دروستە./ الجامع الصغير ٤٩٨. بێژەی فەرموودەکە هی موسلیمە لە صەحیحەکەیدا هاتووە: ٤٥ كتاب البر و الصلة، ١٧ باب تراحم المؤمنين و تعاطفهم و تعاضدهم، رقم ٢٥٨٦.

## تایبەتمەندییەکانی بیروباوەڕی ئیسلامی:

بیروباوەڕی ئیسلامی بە چەند تایبەتمەندییەك لەوانی تر جیا دەکرێتەوە، گرنگترین ئەو تایبەتمەندییانە:

١- سەرچاوەکەی خواییە، لەلایەن خواوە هاتووە، مرۆڤ هیچ ڕۆڵ و بەشێکی نەبووە لە بنیاتنانی بناغەکانی دا، قورئانی پیرۆز کتێبی خوایە و سەرچاوەی یەکەمی شەریعەتی ئیسلامیە کە خوای گەورە بۆ پێغەمبەر موحەممەدی (صلى الله عليه وسلم) ناردووە، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ﴾ النحل: ٨٩. واتە: (قورئانیشمان بۆ تۆ دابەزاندووە، ڕوونکەرەوەی هەموو شتێکە، هیدایەت بەخش و ڕەحمەتە و مزگێنیشە بۆ موسڵمانان).

خوای گەورە ئەرکی پاراستنی قورئانی لە ئەستۆی خۆی گرتووە، هەروەك دەفەرموویت: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ الحجر: ٩. واتە: (بەڕاستی هەر ئێمە قورئانمان دابەزاندووەو بێگومان هەر ئێمەش پارێزگاری دەکەین).

بیروباوەڕی ئیسلامی بنەمای یەکەمی ئیسلامە، سروش و وەحی بوو کە خوای گەورە بۆ پێغەمبەرە بەڕێزەکەی (صلى الله عليه وسلم) نارد، هیچ ماوەیەکی نییە بۆ گۆڕانکاری و تێکدانی، خوای بالادەست دەفەرموویت:﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ ۙ قَالَ الَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا ائْتِ بِقُرْآنٍ غَيْرِ هَٰذَا أَوْ بَدِّلْهُ ۚ قُلْ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أُبَدِّلَهُ مِن تِلْقَاءِ نَفْسِي ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰ إِلَيَّ ﴾ يونس: ١٥.

واتە: (کاتێکیش ئایەتەکانی ئێمە کە ڕوون و ئاشکرایە بەسەریاندا بخوێنرێتەوە، ئەوانەی کە بەتەمانین ئامادەی بەردەم بارەگای ئێمە بن دەڵێن: قورئانێکی جگە لەمە بهێنە و بخوێنەرەوە یان بیگۆڕە "بەشێوەیەکی تر"، تۆیش ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵێ: من بۆم نییە لە خۆمەوە بیگۆڕم، من شوێنی هیچ شتێك ناکەوم جگە ئەوە نەبێت کە بەوەحی پێم دەگات). قورئانی پیرۆز خاوەن

پیرۆزی و ڕێزو گەورەیی و شکۆمەندییە لە دڵی موسڵماندا، بۆیە ڕێزی دەگیرێت و گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری دەکات بەبێ ئەوەی موسڵمانان لەمەدا ناچار بکرێن، بەڵکو بەویستی خۆیان ئەم ملکەچییە دەنوێنن.

بەپێچەوانەی تیۆرو فیکرو بنەما بەخەیاڵ هاتووەکانی مرۆڤ، کە گۆڕانکاری و کەم و کوڕی بەردەوامی بەسەردا دێت لەلایەن دادوەر یاخود پیاوی ئایینی یان کەسانی تر.

٢- سەربەخۆ بوونی و جیابوونی لە هەموو بیروباوەڕەکانی تر، بیروباوەڕی ئیسلامی سەربەخۆیە و بەخۆوە ڕاوەستاوە، سەرچاوەی یەکەمی قورئانی پیرۆزە و سەرچاوەی دووەمی سوننەتی بەپێزی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم).

بیروباوەڕی ئیسلامی دان ناهێنێت بە ماددیەتی بێ دینی کە نکۆڵی لەبوونی خوا دەکات، هەروەها دان نانێت بەبوونی چەند خوایەك، چونکە لەسەر خوابەیەکگرتنی ڕەها ڕاوەستاوە، خوای پایەبەرز دەفەرموێت: ﴿ مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٩١﴾ عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ المؤمنون: ٩١-٩٢.

واتە: (هەرگیز خوا کەسی نەکردووە بە ڕۆڵەی خۆی و هیچ خوایەکی لەگەڵ نییە، چونکە ئەو کاتە هەر خوایەك دەچوو بەلای دروستکراوەکانی خۆیەوەو هەندێکی خۆی بڵند دەکرد بەسەر هەندێکی تردا "ئەوسا بوونەوەر تێکدەچوو"، پاکی و بێگەردی بۆ زاتی خوایە لەبەرامبەر ئەو شتانەوە کە "خوانەناسان" هەڵی دەبەستن و دەیڵێن. "ئەو زاتە" زانای نهێنی و شاراوەکانە، هەروەها زانای دیارو ئاشکراکانە، بەرزو بڵندی بۆ ئەوە لە بەرامبەر ئەو شتانەوە کە "نەفامان" دەیکەنە شەریك و هاوەڵی).

٣- گونجاوە لەگەڵ فیترەتی مرۆیی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ الروم: ٣٠. واتە: ("ئەی ئینسان بە دڵێکی

پاك و بێگەردەوە" ڕوو بکەرە بەرنامە و ئایینی خوا و ئەملاو ئەولا مەکە، خەڵکینە پابەندی ئەو نەخشەیە بن کە خوا ئێوەی لەسەر دروست کردووە، هیچ جۆرە گۆڕانکارییەك لە هیچ نەخشە و دروستکراوێکی خوادا نیە، ئائەوەیە دینی ڕاست و دروست، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم ڕاستیە نازانن).

ئیسلام ئاینی فیترەتە، فیترەتیش هەروەك ئیبن عەتییە دەڵێت: (ئەو ئامادەگی و شێوەیەی کە لە دەروونی منداڵدا هەیە ئەوا ژمێردراوەو ئامادەکراوە، بۆ ئەوەی بتوانێت بەهۆیەوە دروستکراوەکانی خوای گەورە لەیەکتر جیا بکاتەوە، هەروەها ئەو دروستکراوانەش بکاتە بەڵگە لەسەر بوونی پەروەردگاری پاك و بەرز، شەریعەت و بەرنامەکانی بناسێت و بڕوایان پێ بهێنێت، وتراوە فیترەت بریتیە لە ئوممەت و ئایین)[1].

ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) هەر لەوبارەیەوە هاتووە: **(کل مولود یولد علی الفطرة، فأبواه یهودانه أو ینصرانه أو یمجسانه)** واتە: هەر منداڵێك کە لە دایك دەبێت ئەوا لەسەر فیترەت دێتە دونیاوە، جا دایك و باوکی یان دەیکەن بە جولەکە یان نەصرانی یاخود ئاگرپەرست.

نەیفەرمووە: باوك و دایکەکە منداڵەکە دەکەن بە موسڵمان، چونکە ئیسلام هەر ئایینی فیترەتە، هەر لەبەر ئەمەشە کە لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: (منداڵ لەسەر بیروباوەڕی ئوممەتی ئیسلام لە دایك دەبێت) و لە یەکێکی تریاندا هاتووە: (منداڵ لەسەر بیروباوەڕی ئەم ئوممەتە لە دایك دەبێت)[2].

---

[1] تفسير محرر الوجيز ١١/٤٥٣- ٤٥٤.

[2] شرح العقيدة الطحاوية ٣٣-٣٤ و هەر دوو گێڕانەوەکەی کۆتایی هی پێشەوا موسلیمن. لە پەڕاوێزی: هەر منداڵێك کە لە دایك دەبێت لەسەر فیترەت دێتە دونیاوە....تاد، هاتووە: بوخاری و موسلیم و ئەبوداود و ترمذی و ئەحمەد و مالیك و جگەلەوانیش گێڕاویانەتەوە.

٤- دەقە نەقلّیەکان دژ نین لەگەڵ عەقلّدا: بنچینەی چەسپاندنی بیروباوەڕی ئیسلامی و ڕوون کردنەوەی بنەماکانی بریتیە لەو دەقانەی کە لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی بەپێز سەرچاوەیان گرتووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بڕوایە وەك بڕوایەکی کوێرانە نەبووە، بەڵکو بەڵگەی عەقلّیشی لەسەر هێناوەتەوە و داواش لە مرۆڤ کراوە کە بیر بکەنەوەو تێبفکرن بۆ ئەوەی دەروونیان پڕ ببێت لە ئیمان، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ قُلِ ٱنظُرُواْ مَاذَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾ یونس: ١٠١. واتە: (پێیان بڵێ: تەماشا بکەن و سەرنج بدەن: خوا چی دروستکردووە لە ئاسمانەکان و زەویدا). هەروەها دەفەرمووێت: ﴿ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ ءَايَٰتٞ لِّلۡمُوقِنِينَ ۝٢٠ وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ۝٢١ ﴾ الذاریات: ٢٠-٢١. واتە: (بێگومان لەسەر گۆی زەویدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەیە بۆ کەسانێك کە بە شوێن دڵنیاییدا دەگەڕێن. هەروەها لە خودی خۆشتاندا "بەڵگەی بێ سنوور هەیە" ئایا ئەوە بۆ بینایتان ناخەنە کار).

قورئانی پیرۆز بەڵگەی بەرپاکردووە لەسەر بوون و یەکتایی خوای گەورە و پێغەمبەرایەتی و ڕۆژی دوایی و زیندوو کردنەوەی جەستەکان لە گۆڕەکانیاندا، تەنانەت بەڵگەی هێناوەتەوە لەسەر هەموو بابەتە لاوەکیەکانی بیروباوەڕیش.

ئیبن تەیمیە ڕوونی کردۆتەوە کە: هەرگیز دەقێکی ڕاست نییە کە دژ بێت لەگەڵ عەقلّدا. جا ئەگەر دژایەتی بینرا لە نێوانیاندا، ئەوا دەکرێت دژیەکیەکە ڕووکەشی بێت و دەتوانرا کۆ بکرێنەوە لە دەرەنجامدا یەکبخرێن یاخود دژیەکیەکە سەریهەڵداوە لە کەم و کورتییەك کە لە عەقلّەکەدا هەیە وەك ئەوەی خاوەن عەقلّەکە هەواو هەوەس پەرست بێت، جا بیەوێت دەقەکە لەگەڵ هەوای عەقلّەکەی بگونجێنێت یان دەکرێت ئەم دژیەکیە لەوەوە سەرچاوەی گرتبێت کە ئەو دەقە نەقلّیە بە هەڵە و ناڕاست دراوەتە پاڵ پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) [1].

---

[1] هەندێ لەوانەی ئەم تایبەتمەندییانەیان نووسیوە: د. عبدالکریم زیدان: المدخل إلى دراسة الشریعة الإسلامیة ٣٥ و د. موحەممەد مەلکاوی: عقیدة التوحید في القرآن الکریم ٢٨. و وتەکەی ئیبن

## بەڵگەکانی چەسپاندنی بیروباوەڕی ئیسلامی:

بەڵگەکانی چەسپاندنی بیروباوەڕی ئیسلامی دوو جۆرن: گێڕانەوە (نەقلّی) و عەقلّی.

بەڵگە نەقلّیەکان بریتین لە: دەقەکانی قورئانی پیرۆز، هەروەها دەقە چەسپاوەکانی سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

بەڵگە عەقلّییەکانیش، ئەو بەڵگانەن کە لەسەر بەڵگە دڵنیاکەرەوەکان بنیاتنراون کە عەقلّ پشتیان دەگرێت، ئەم بەڵگانە پەرتن لە دوو توێی ئەو وتانەی کە لەبارەی بابەتەکانی بیروباوەڕ کراون.

### بەڵگەی نەقلی:

زانایان ڕێکەوتوون لەسەر ئەوەی کە سەرچاوەی یەکەم کە بیروباوەڕی ئیسلامی پێ دەچەسپێت بریتیە لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەی موتەواتیر[1]، جا هەر دووکیان سەلمێنراوان کە لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم)چەسپاون، بەڵام بەو مەرجەی واتاو ئاماژەی هەر یەکێکیان ڕوون و ڕاشکاو بێت و تەئویل هەڵنەگرێت.

بەڵام سەبارەت بە فەرموودەی تاقانە (آحاد)- ئەو فەرموودەیەیە کە گێڕەرەوەیەك دەیگێڕێتەوە یان زیاتر کە نەگەیشتوون بە ڕێژەی تەواتر - ئەوا زانایان ڕاجیاییان هەیە لەوەی ئایا: بیروباوەڕی پێ ئەچەسپێت یان نا؟ لەمبارەوە ڕایەکی جیاوازیان هەیە:

---

تەیمیە لەم کتێبەیدایە: (درء التعارض بین العقل و النقل) کە ناسراوە: (موافقة صحیح النقول لصریح المعقول).

[1] فەرموودەی موتەواتیر: بریتیە لەو فەرموودەیەی کۆمەڵێك لە پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) گێڕاویانەتەوە ناکرێت و دوورە لە نەریت و عادەتەوە کە کۆ ببنەوە لەسەر درۆ، بەهۆی زۆری ژمارەیان و دەستپاکیان و جیاوازی تێڕوانین و ژینگەکانیان، هەروەها کۆمەڵێکی هاوشێوەی کۆمەڵەی وەسفکراو بیگێڕێتەوە تا بە زنجیرەیی و سەنەد بە ئێمە گەیشتووە، هەر توێژێك کۆمەڵێك گێڕەرەوە لەخۆ دەگرن کە ناکرێت لەسەر درۆ کۆببنەوە، هەر لە وەرگرتنی لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) تا گەیشتنی بە ئێمە. بۆ نمونە: سوننەتە کردارییەکان، نوێژکردن و ڕۆژوو گرتن.../ علم أصول الفقه لعبد الوهاب خلاف ٤١.

**ڕای یەکەم:** فەرموودەکانی تاقانە (آحاد) بیروباوەڕی پێ ناچەسپێت، بەڵکو تـەنها لـە بواری کردار کاری پێدەکرێت نەوەك لە زانستی بیروباوەڕدا(مەبەسـتی ئەوەیـە کـە زانیاریی تەواو بێ چەندو چوون نادەن بەدەستەوە[1])، واتە: ماناکەی دڵنیاکـەرەوەو سەلمێنراو نییە. ئەمە مەزهەبی زۆربەی زانایان و شەرعناسان و زانا قوڵ بووەکانـە هەروەك ئیبن عەبدولبەر) لە کتێبی (التمهید)دا باسی کـردووە، هـەروەها زۆربـەی موسڵمانان لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان و دواتـر فەرمووەدەناسـان و شەرعناسـان و زانایانی ئوصوڵیش لەسەر ئەم ڕایەن، هەروەك نەوەوی لـە کتـێبی (شـرح صـحیح مسلم)دا باسی کردووە[2].

---

[1] وەرگێڕ.

[2] بەم شێوەیە لە کتێبی (الإرشادو التقریب)دا هاتووە، ئەمە ڕای: ئەبو حەنیفە و مالیك و شافعي و ڕای بەناوبانگی ئەحمەدە، تەنانەت ئەمە ڕای زۆربەی حەنبەلییەکانیشە، ئیبن تەیمییەش لە کتێبی (منهاج السنة)دا و قەرافی لە (تنقیح الأصول وشرحه) و ئەبو مەنصوری بەغدادی لە (أصول الدین) و ئەسنەوی و باجی لە (الإشارة و تحقیق المذهب و إحکام الفصول) و ئیمامی حەرەمەین لە (برهان والورقات) و غەزالی لە (المستصفی) و ئەبو ئیسحاقی شیرازی لە (التبصرة و اللمع) و خەتیبی بەغدادی لە (الکفایة) و فەخری ڕازی لە (المطالب العالیة) و (المعالم) و (أساس التقدیس) و ئیبن ئەسیر لە (مقدمة جامع الأصول) و ئیبن حاجب لە (منتهی الوصول) و صەدری شەریعە لە (التنقیح و شرح التوضیح) وسەعدی تەفتازانی لە (التلویح) و سەمەرقەندی لە (میزان الأصول) و بەزدەوی و ڕاڤەکارەکانی عەبدولعەزیزی بوخاری و سەرخەسی لە (الأصول) و جەصاص لە (الفصول) و ئیبن جوزەییێ لە (تقریب الوصول إلی علم الأصول) و ئیبن بەرهان لە (الوصول إلی الأصول) و ئیبن سوبکی لە (جمع الجوامع و المحلی علیه) و ئیبن عەبدشکور لە (مسلم الثبوت) و ئیبن عاصم لە (مرتقی الأصول و شارحه في نیل السؤل) و باوکی خەتابی حەنبەلی لە (تمهید) و صەفیەدینی بەغدادی حەنبەلی لە (قواعد الأصول) و ئیبن قودامە لە (روضة الناظر وحاشیته لإبن بدران) و توفی لە (البلبل في أصول الفقه) و سەفارینی حەنبلی لە (الأنوار السنیة) و موحەمەد عەبدە و موحەمەد ڕەشید ڕیزا لە (المنار) و صەنعانی لە (إجابة السائل) و شەنقیتی لە (مراقي الصعود)، جگە لەمانەش ئەم ڕایەیان پەسەندی کردووە. هەروەها گشت ئیبازییەکان و موعتەزیلەکان و زەیدیەکان و زۆربەی حەنەفی و شافیعی و دەستەیەك لە زاهیریەکان لەسەر ئەم ڕاو بۆچوونەن.

**بەڵگەكانی ئەم ڕایە:**

١- ئەگەر هەواڵ و خەبەری تاقانە (ئاحاد) مەبەستی یەكلاكەرەوەی بگەیاندایە، ئـەوا دەبوایە ئەو كات هەر هەواڵێكمان گوێ لێبوویایە بەڕاستی بزانین، بەڵام ئێمە هـەر هەواڵێك كە دەیبیستین ڕاستەوخۆ بە ڕاستی نازانین ئەگەر هەواڵدەرەكـەش متمانـە پێكراو بێت، چونكە هەواڵەكە ئەگەر هەڵدەگرێت و سەلمێنراو نییە.

٢- ئەگەر هەواڵی تاقانەبەڵگە هەڵگر بوایە و سەلمێنراو و بڕاوە بوایە، ئەوا ئـەو كاتـە دروست دەبوو كە قورئانی پیرۆزو سوننەتی موتەواتیر، بە هـەواڵ و خەبـەری تـاكی هەڵبوەشێنرابانەوە، چونكە ئەو كاتە دەچووە ئاست پلەی ئەوان لەوەی مانای بڕاوەو سەلمێنراوی هەڵدەگرت، بەپێچەوانەوە قورئانی پیرۆزو سوننەتی موتەواتر بە هەواڵی تاكی هەڵناوەشێنەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە هەواڵی تاكی مانای بڕاوە (قطعي) و سەلمێنراو ناگەیەنێت.

٣-ئەگەر هەواڵی تاقانە یەكلاكەرەوە بوایە، ئەوا دروست دەبوو كە حوكم دەر بكرێـت بەهۆی گەواهیدانی یەك شایەتی دەرەوە، تەنانەت پێویست نەبوو كەسێكی تر وەك شایەتی دووەم شایەتی بدات، هەر پێویست نـەدەبوو كـە شـایەتی یەكـەم سـوێند بخوات لەكاتی نەبوونی شایەتی دووەمدا، بەبێ ڕاجیایی حوكمدان بە هۆی گـەواهی دانی یەك شایەتیدەرەوە دروست نییە، ئەمەش بەڵگەیەكی ترە لەسـەر ئـەوەی كـە هەواڵی تاقانە (ئاحاد) یەكلاكەرەوەو بڕاوە نییە.

٤-لـە هەنـدێك هاوەڵـەوە چەسـپاوە كـە هەنـدێك فـەرموودەی تاقانـە (ئاحاد)یـان ڕەتكردۆتەوە بەهۆی ئەوەی تێكگیراوە لەگەڵ ڕووكەشی قورئانی پیرۆز یـان لەگـەڵ

---

دەقەكانی ئەم زانایانە و جگە لەوانیش لە كتێبی (السيف الحاد في الرد على من أخذ بحديث الآحاد في مسائل الإعتقاد لسعيد بن مبروك القنوبي ٦١- ٧٨ و ٧-٨) هاتوون. هەروەها بڕوانە: روضة الناظر لإبن قدامة وشرحها نزهة الخاطر العاطر لإبن بدران ٢٦١/١ ولوامع الأنوار البهية ١٧-٢٠.

هەندێك گێڕانەوەی تردا، جا ئەگەر هەواڵە تاقانەکان مەبەستی ڕوون و بێ چەندو چوونیان بەدەستەوە دابایە ئەوا ڕەتیان نەدەکردەوە[1].

**ڕای دووەم:** پێی وایە کە هەواڵەکانی تاقانە (ئاحاد) بە بەڵگە دەشێن لە بابەتەکانی بیروباوەڕدا و مانای یەکلاکەرەوەو بڕاوە دەگەیەنن. زانستی دیارو کردار بەیەکەوە بەدەردەخات و بەدەستەوە دەدات، ئەمە مەزهەبی زۆرێك لە ئەهلی ئەسەر (أهل الأثر) و هەندێك لە زانایانی تێڕوانینکارە (أهل النظر)ە هەروەك ئیبن عەبدولبەر لە کتێبی (التمهيد)دا ئاماژەی پێداوە، هەندێك لە زاهیریەکانیش ئەمەیان پەسەند کردووە وەك ئیبن حەزم)[2]، ئیبن تەیمیەش ئەمەی لە: قازی عەبدولجەباری مالیکی و ئیسفەراینی و قازی باوکی تەیبی تەبەڕی و ئیبن فەورك و ئەوانی تریشی هێناوە[3].

**بەڵگەکانی ئەم ڕایە:**

١- کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چاوی دەکەوت بە خەڵکی بە تاك و کۆ لە کاتی حەج کردندا، ئەوا ئەو خەڵکە دەگەڕایەوە بۆ شارەکانیان، ئەو شتانەیان بە هۆزەکانی خۆیان ڕادەگەیاند کە لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) بیستبوویان، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هاوەڵی تاقانە (ئاحاد) بە بەڵگە دەشێت لە بابەتەکانی بیروباوەڕدا، هەروەك چۆن بە بەڵگە دادەنرێت لە بابەتە لاوەکییە فیقهییەکان.

---

[1] السيف الحاد، سەرچاوەی پێشوو، ١٣-١٨ و ٧٥.

[2] السيف الحاد، سەرچاوەی پێشوو، و تیایدا هاتووە: هەندێ لە فەرموودەناسان (أهل الحديث) ئەم ڕایەیان پەسەند کردووە، هەروەك نەوەوی لە (شرح المسلم)دا باسی کردووە، حوسەینی کوڕی عەلی کەرابیسی و هەندێ حەنبەلیش ئەمەیان پەسەند کردووە، ئیبن خوەیزی مەنداد لە مالکیەکان باسی کردووە کە ئەوەی ئەم ڕایە پەسەند بکات دەبێتە هۆی دەرچوونی لە مەزهەبی مالیکی، ئەم ناوانە هاتوون لەو دەقانەی کە قەنوبی وەك دەستەبژێرێك لە وتەکانی زانایانی لە کتێبی (السيف الحاد)دا هێناویەتی.

[3] اختصار علوم الحديث ٣٦.

٢- دانیشتووانی (قوباء) کاریان بە هەواڵی تاقانە (ئاحاد) کرد لەبارەی گۆڕانی ڕووگە (قیبلە)دا، پێغەمبەریش (صلی الله علیە وسلم) ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر ئەم کارەیان.

وەڵامی ئەم بەڵگانە دراونەتەوە بەوەی:

بنەماکانی بیروباوەڕ لە ڕێگەی تەواتری براوەو سەلمێنراو نەقڵکراون، ئەمەش بەهۆی بەر بڵاوی بانگەواز بەشێوەیەك کە لەلای هیچ کەسێك شاراوە نەبوون.

بەڵام سەبارەت بە بابەتە فیقهیەکان ئەوا بەبێ ڕاجیایی هیچ کێشە و کۆسپێك لەوەدا نییە کە لە ڕێی هەواڵێکی تاکییەوە بێت[1].

**ڕای سێیەم:** ئەو فەرمایشت و دەقانەی هەر دوو شێخ بوخاری و موسلیم لە صەحیحەکانیاندا هێناویانە، یاخود یەکێکیان گێڕاویەتیەوە، ئەوا ڕاستی و دروستیەکەی شتێکی سەلمێنراو و براوەیە، زانستی دڵنیاکەرەوەی تیۆری پێی دروست دەبێت، ئیبن صەلاح ئەم ڕایەی پەسەند کردووە و تەنها هەندێك فەرموودەی کەمی لێ هەڵاواردووە کە فەرموودەناسان قسەیان لەبارەوە کردووە[2].

ئیمامی نەوەوی لە کتێبی (تقریب)دا وتویەتی: ئیبن صلاح لەمەدا ڕای بەپێچەوانەی زانا لێکۆڵەرو و ڕای زۆرینەیە، وتویانە: هەواڵ و خەبەری تاکەکەسی (ئاحاد) ئەگەر و گومان هەڵدەگرێت مادام بەتواتر نەهاتبێت[3].

---

[1] السیف الحاد، سەرچاوەی پێشوو، ٥٧.

[2] الباعث الحثيث ٣٦.

[3] السیف الحاد، سەرچاوەی پێشوو، ٨٣ و لاپەڕەکانی دواتری، چەند دەقێکیشی لەوبارەوە هێناوە.

**ئەو ڕایەی کە بەدەر دەکەویت:**

مەبەستی وتەی زانایان کە دەڵێن: بیروباوەڕ بە هەواڵ و خەبەری تاکەکەسی و تاقانە (ئاحاد) دانامەزرێت و ناچەسپێت ئەوەیە کە: بیروباوەڕ هێنان (إعتقاد) بریتیە لە گرێدانی دڵ و باوەڕ هێنان بە دڵ بەپشت بەستن بە بەڵگەی چەسپاو کە ناکرێت لە کاتێك لەکاتەکاندا هەڵە و خەیاڵی بەسەردا بێت، ئەمەش بەدەستەبەر نابێت تەنها بە دەقەکانی قورئانی پیرۆز و سوننەتی موتەواتیری پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەو مەرجەی مانای هەر یەکەیان ڕوون و ڕاشکاو بێت و تەئویل هەڵنەگرێت، جگە لەوەی باسمان کرد ناکرێت پشتی پێ ببەسترێت لە بابەتی بیروباوەڕدا[1].

شێخ مەحمود شەلتوت دوای ئەوەی چەند دەقێکی لە غەزالی و ئەسنەوی و بەزدەوی هێناوە لەبارەی ئەوەی کە هەواڵ و خەبەری تاقانە (ئاحاد) ئەگەر و گومان هەڵدەگرێت، وتویەتی: ئا بەوشێوەیە دەبینین دەقەکانی زانایانی کەلام و ئصول کۆکن لەسەر ئەوەی کە مانای یەکلاکەرەوەو بڕاوە ناگەیەنن، بۆیە بیروباوەڕی پێ ناچەسپێت....، ئەمەش مانای وانیە هەواڵی تاقانە (ئاحاد) زانست بەدەستەوە نادات، چونکە هەندێك کەس هەیە کە زانست و شت لە دەروونیدا دەچەسپێت کە کەمترە لە هەواڵی تاقانە (ئاحاد) کە ئێمە لەبارەی دەدوێین، بەڵام ئەمە لەسەر هیچ کەسێك نابێتە بەڵگە، بیروباوەڕیشی پێ ناچەسپێت تا نکۆڵی کارەکەی تەکفیر بکرێت، خوای گەورە بەندەکانی ڕانەسپاردووە بە پەسەندکردنی بیروباوەڕێك لە سەرچاوەیەکەوە کە تەنها گومان نەبێت هیچی تری هەڵنەگرتبێت. ئا لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەوەی ئێمە دانمان پێدانا شتێکە کۆڕای لەسەرە لەوەی کە فەرموودەکانی تاقانە (ئاحاد) بە بیروباوەڕ وەرناگیرێن و پشتیان پێ نابەسترێت لە بواری غەیبییات، ئەمەش شتێکی چەسپاوە بە پێی ئەوەی عەقڵ بە پێویستی دادەنێت و عەقڵمەندان ڕاجیاییان تیادا نییە[2].

---

[1] السيف الحاد ٢٣.

[2] الإسلام عقيدة وشريعة ٦٠-٦١.

جا ئەو وتەیەی زانایان کە دەڵێن تەنها دەقێك پەسەندە لە بواری بیروباوەڕدا، کە (موتەواتیر) بێت، مەبەستیان لەو بیروباوەڕەیە کە هەر کەسێك نکۆڵی لێ بکات تەکفیر دەکرێت[1].

بەم پێیە: هەر کەسێك نکۆڵی بکات لە شتێك لە بیروباوەڕدا کە ئەو شتە بە واتایەکی ناڕۆشن و گوماناوی چەسپا بێت و لە دەقێکی سەلمێنراوی بڕاوە (قطعي) سەرچاوەی گرتبێت یاخود واتایەکەی بڕاوەو ڕاشکاو بێت بەڵام ئەو واتایە لە دەقێکەوە سەرچاوەی گرتبێت کە چەسپاوییەکەی قسە هەڵبگرێت و ئەگەری تێدابێت یاخود لە واتایەکی گوماناوی ناڕۆشن سەرچاوەی گرتبێت لە دەقێك کە چەسپاوییەکەی قسە و ئەگەر هەڵبگرێت، گشت ئەمانە نکۆڵی کارەکە پێی کافر نابێت[2].

---

[1] المختصر المفيد في شرح جوهرة التوحيد ١٧.

[2] العقيدة الإسلامية وأسسها ٣٨.

ئاگاداری:

دەقەکانی قورئانی پیرۆز لە ڕووی هاتنیانەوە (واتە: چەسپاوی هاتنی ئەو دەقانە لە پێغەمبەرەوە (صلی اللە علیە وسلم)) هەر هەموویان چەسپاون بەشێوەیەکی بڕاوە (قطعي) و سەلمێنراوە، بۆیە ئێمە بە دڵ بەوپەڕی تۆکمەییەوە دان بەوەدا دەنێین کە هەر دەقێك لە قورئانی پیرۆزدا بریتییە لەو دەقەی کە خوای گەورە دایبەزاندووە بۆ پێغەمبەرە بەڕێزەکەی (صلی اللە علیە وسلم)، پێغەمبەریش (صلی اللە علیە وسلم) بە ئوممەتەکەی ڕاگەیاندووە.

لە ڕووی واتا بەخشینیشەوە دەقەکانی قورئانی پیرۆز دوو جۆرن:

أ- ئەوانەی مانای ڕاشکاویان هەیە (قطعية الدلالـة): بۆ نمونە: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿فَٱجْلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِاْئَةَ جَلْدَةٍ﴾ النور: ٢. واتە: (سەد قەمچی لە هەر یەك لە ئافرەت و پیاوی زیناکەر بوەشێنن). ئەم دەقە ماناکەی ڕاشکاوە لەوەی زیناکەر ئەگەر شوی نەکرد بێت یان ژنی نەهێنابێت، ئەوا سەد قەمچی لێدەدرێت، بەبێ زیادو کەم.

ب- ئەوانەی مانای ناڕاشکاویان هەیە (ظنية الدلالة): بۆ نمونە: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ﴾ البقرة: ٢٢٨. واتە: (بۆ ئەوانەی کە سوێند دەخۆن نزیکی هاوسەریان نەکەون، بۆیان هەیە سێ "قرء" ببینن). وشەی (قرء) لە زمانەوانیدا بە دوو مانا دێت: ١- پاکژی. ٢- خوێن بینین (حەیز). ئەم دەقە مانایەکی

جا کاتێك زۆربەی زانایان وتویانە بیروباوەڕ بە هەواڵی ئاحاد ناچەسپێت مەبەستیان ئەوەبووە ئەو کەسە تەکفیر نەکرێت نکۆڵی لە شتێك دەکات کە بە هەواڵی تاقانە (ئاحاد) چەسپا بێت.

کاتێکیش زانایان بۆ ئەو ڕاو بۆچوونەش چوون ئەوا پێیان وابوو هەر کاتێك هەواڵە ئاحادەکان سەنەد و زنجیرەیان بێ خەوش و دروست بوو، دەقەکانیش شتێکیان هەڵنەگرتبوو کە بەلای عەقڵەوە ئەستەم بێت، ئەوا پێویستە کار بەو هەواڵە بکرێت ئەگەرچی زانست و زانیاریی بێ چەندو چوونیشی پێ نەچەسپێت، ئەمە وەك شایەتی دانی

ڕاشکاوی دیاری کراوی نییە و یەکێك لەو دووانەی بەبێ چەندوچوون دیای نەکردووە، بۆیە زانایان ڕاجیاییان هەبووە لەبارەی شیکردنەوەی وشەی ناوبراو، شافیعیەکان بە (پاکژی) شیان کردۆتەوە، حەنەفیەکانیش بە خوێن بینین (حەیز).

**دەقەکانی سوننەتی پێغەمبەر**(صلی الله علیه وسلم):

دەقەکانی سوننەت لە ڕووی هاتنیانەوە دوو جۆرن:

أ- ئەو دەقانەی هاتنیان سەلمێنراو و بڕاوەیە: وەك: فەرموودەی موتەواتیر.

ب-ئەو دەقانەی کە هاتنیان گومان هەڵدەگرێت و یەکلابووەوە نییە: وەك: هەواڵی تاقانە (ئاحاد).

**دەقەکانی سوننەتی پێغەمبەر**(صلی الله علیه وسلم) **لە ڕووی واتایشەوە دوو جۆرن:**

أ- مانا ڕاشکاو (قطعیة الدلالة): وەك: ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم): (بني الإسلام علی خمس) واتە: ئیسلام لەسەر پێنج بنچینە دامەزراوە. ئەم فەرموودەیە یەك مانای ڕاشکاو هەڵدەگرێت و بەس، ئەوە بەدەستەوە دەدات کە بنچینەکانی ئاینی ئیسلام پێنجن نەکەم و نە زۆر.

ب- مانا گوماندارەکان (ظنیة الدلالة): وەك: ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم): **(لا یصلین أحد منکم العصر إلا في بني قریظة)** واتە: هیچ کامێکتان نوێژی ئێوارە نەکەن تا نەگەین بە ناوچەی "هۆزی قوڕەیزە". هاوەڵان لەبارەی واتای ئەم فەرمایشتەوە ڕاجیاییان تێکەوت، هەیان بوو نوێژی لە ڕێگاکە کرد، چونکە گەیشتە نوێژی ئێوارە "عصر"، هەشیان بوو نوێژی نەکرد تا نەگەیشتە ناوچەی "هۆزی قوڕەیزە" ئەمەیان ڕووکەشی فەرموودەکەی وەرگرت./ بڕوانە: علم أصول الفقه لعبد الوهاب خلاف ٣٤-٤٢.

کەسـی دادپـەروەرە لەلایـەن دادوەرەوە، پێویسـتە حـوکم بـدرێت بـەپێی ڕووکەشـی شایەتیدانەکە ئەگەرچی نەشزانێت کە ئایا لە دەروونداشایەتیدەرەکان ڕاستگۆن یان نا[1].

---

[1] أصول الدین للبغدادي ١٢. هەروەها بڕوانە دەقی وتەی هەندێ لە زانایان لە کتێبی (سیف الحاد)ی پێشوو.

# دەروازەی دووەم

## پەیڕەوی قورئانی پیرۆز
## لە خستنەڕوو و نمایشکردنی بیروباوەڕی ئیسلامی

قوئانی پیرۆز پەیڕەوێکی ڕوونی هەیە لە خستنەڕوو و نمایشکردنی بیروباوەڕدا، هەروەك لەمانەی خوارەوەدا دەردەکەوێت:

١- خوای گەورە عەقڵی بەرز ڕاگرتووە و پلەی بڵندی پێ بەخشیوەو پایەداری کردووە.

خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ دەفەرموویێت: ﴿فَفَهَّمْنَاهَا سُلَيْمَانَ وَكُلًّا آتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا﴾ الأنبياء: ٧٩. واتە: (جا ئێمە چارەسەری کێشەکەمان کرد و لە سولەیمانمان گەیاند، بەڵام "هەریەکە لەو باوك و کوڕە" بەهرەوەرمان کردبوو لە حیکمەت و دانایی و عیلم و زانست).

هەروەها دەفەرموویێت: ﴿وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ﴾ البقرة: ٢٦٩.واتە: (هەر کەس حیکمەتی پێ ببەخشرێت، ئەوە بێگومان خێرێکی زۆری پێدراوە، جا بێجگە لە ژیرو هۆشمەندەکان کەسانی تر لەو بەهرەیە تێناگەن و پەند وەرناگرن).

- هەروەها بانگەوازی کردووە بۆ بەکارهێنان و بەگەڕخستنی عەقڵ و ڕامان لە دروستکراوەکانی ناو ئاسمانەکانو زەوی: خوای پاك و تاك دەفەرموویێت: ﴿ قُلِ انظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ یونس: ١٠١. واتە: (پێیان بڵێ: تەماشا بکەن و سەرنج بدەن: خوا چی دروستکردووە لە ئاسمانەکان و زەویدا).

هـــــەروەها دەفــــەرموویت: ﴿ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ ﴾ العنكبوت: ٢٠.واتە: ("ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)" پێیان بڵێ: با بگـەڕێین بە زەویدا، تەماشا بکەن و سەرنج بدەن چۆن ئەو زاتە دروستکراوانی بەدیهێناوە).

- قورئانی پیرۆز ڕەخنەی گرتووەو سەرزەنشتی ئەوانـەی کـردووە کـە عـەقڵی خۆیـان پەکخستووە:

خوای تاك و بێ هاوەڵ لەسەر زمانی پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) دەفەرموویت: ﴿ قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْئًا وَلَا يَضُرُّكُمْ ﴿٦٦﴾ أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾ الأنبياء: ٦٦-٦٧.واتە: (ئیبراهیم وتی: باشە، ئاخر، چۆن شتێك دەپەرستن لە جیاتی خـوا کـە ناتوانێـت هـیچ جـۆرە قازانج یان زیانێکتان پێ بگەیەنێت. ئۆف لە دەستان و لەو شتانەش کە لە جیـاتی خوا دەیپەرستن!، جا ئایا ئەوە تێناگەن و بیرو هۆشتان ناخەنەکار؟!).

- سەرزەشتی ئەوانەی کردووە کە تەنها بە شوێنکەوتنی باوو باپیرانیان واز دێنن:

خوای بێ وێنە دەفـەرموویت: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْئًا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴾ البقـرة: ١٧٠. واتە: (ئەگەر بەو خەڵکە بوترێت: شوێنی ئەو بەرنامەیە بکەون کە لەلایـەن خـواوە ڕەوانە کراوە، دەڵێن: نەخێر، هەر شوێنی ئەوە دەکەوین کە بـاوو باپیرانمـان پێـوەی ئاڵودە بوون و لەسەری ڕاهاتووین!، ئایا ئەگەر باوو باپیرانیشـیان تـێ نەگەیشـتوو هیچ نەزان و ناشارەزاو ڕێنموویش وەرنەگرن "هەر شوێنیان دەکەون؟!").

بۆیە پێشەوا (موحەممەد عەبدە) دەفەرموویت: (بۆ یەکەم جار عەقڵ و ئـایین بـوون بـە بـرای یـەکتر لـە کتێبێکـی پـیرۆزدا لەسـەر زمـانی پێغەمبـەرێکی پایـەدار، بەشێوەیەکی ڕاشکاوانە کە تەئویل هەڵناگرێت)[1].

[1] رسالة التوحيد لمحمد عبده ٩.

٢- قورئانی پیرۆز سیستەمی بوونەوەری خستووەتەڕوو بۆ بیر لێکردنەوەو ووردبوونەوە لە بەخششەکانی خوا.

خوای پایەبەرز دەفەرمووێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فِرَٰشٗا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءٗ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزۡقٗا لَّكُمۡۖ فَلَا تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادٗا وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴾ البقرة: ٢١-٢٢. واتە: (ئەی خەڵکینە پەروەردگاری خۆتان بپەرستن، ئەو زاتەی کە ئێوەو پێشینانی ئێوەشی بەدیهێناوە، بۆ ئەوەی ڕێبازی خواناسی و تەقواو پارێزگاری بگرنە بەر. هەر ئەو زاتە زەوی کردووە بە فەرش و جێگای نیشتەجێ بوون و ژیان بۆتان، ئاسمانی وەکو سەقفێك بەسەرتانەوە ڕاگیر کردووە، لە ئاسمانەوە ئاوی بۆ باراندوون، جا بەهۆیەوە جۆرەها بەرهەمی دەرهێناوە تا ببێتە ڕزق و ڕۆزی بۆتان، کەواتە شەریك و هاوتا بۆخوا بڕیار مەدەن، کە خۆشتان دەزانن پەرستراو دەبێت بەدیهێنەر بێت).

قورئانی پیرۆز ئەم دیاردە و ڕووخسارە بوونەوەرییانەی نمایش کردووە، وەك: (ئاسمانەکان و زەوی، ڕۆژو شەو، باران و با، ڕووەك بەهەموو جۆرەکانی، بەدیهێنراوان بەهەموو جۆرەکانیان)، ئەمەش بۆ ئەوەیە مرۆڤ لەو بەدیهێنراوانە وردببێتەوەو ڕابمێنێت تا بزانێت کە ئەمانە دەستکردی مرۆڤ نین، بەڵکو خوای کاربەجێ و کار لەجێ دروستی کردوون، بۆیە پێویستە مرۆڤ بە بەندایەتی و پەرستشەوە ڕوو بکاتە خوای گەورە.

ئەوانەش کە ناتوانن شت بەدیبهێنن وەك: پەیکەرو بت و بەدیهێنراوەکانی تر، شیاوی پەرستن نین، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٞ فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥٓۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخۡلُقُواْ ذُبَابٗا وَلَوِ ٱجۡتَمَعُواْ لَهُۥۖ وَإِن يَسۡلُبۡهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيۡـٔٗا لَّا يَسۡتَنقِذُوهُ مِنۡهُۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلۡمَطۡلُوبُ ﴾ الحج: ٧٣. واتە: (ئەی خەڵکینە: نمونەیەك هێنراوەتەوە چاك گوێی

بۆ بگرن" بەڕاستی ئەوانەی کە هانا و هاواریان لێدەکەن لە جیاتی خوا، هەرگیز ناتوانن تاکە مێشێك دروست بکەن، هەرچەندە بۆ ئەو کارە کۆببنەوە، ئەگەر مێشەکە شتێکیان لێ بفڕێنێت، ناوانن لێی بسەننەوە، داواکارو داوالێکراو هەردووکیان لاواز و بێ دەسەڵاتن).

٣- بنەماکانی بیروباوەڕی ئیسلامی: خواناسی، پێغەمبەرایەتی، ڕۆژی دوایی، باس کردووەو بەڵگەشی لەسەر هێناوەتەوە.

- خوای گەورە پەروەردگاری بوونەوەرە، دەفەرمووێت: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ۝﴾ الفاتحة: ٢-٤. واتە: (سوپاس و ستایش هەر شایستەی خوایە، بۆ خوایە کە خاوەن و پەروەردگاری هەموو جیهانیان و هەموو بوونەوەرە. بەخشندە و دلۆڤانە، کانگای ڕەحمەت و میهرەبانیە. خاوەن و سەرداری ڕۆژی پاداشت و سزایە).

- خوای گەورە بەدیهێنراوانی بە بەڵگە هێناوەتەوە لەسەر بوونی بەرزی خۆی: دەفەرمووێت: ﴿ هَٰذَا خَلْقُ ٱللَّهِ فَأَرُونِى مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ۚ بَلِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾ لقمان: ١١. واتە: (ئا ئەمەیە دروستکراوانی خوا، وەرن نیشانم بدەن بزانم ئەوانی تر جگە لەو زاتە، چیتان دروست کردووە، نەخێر هیچیان دروست نەکردووە، بەڵکو ستەمکاران هەمیشە لە گومڕاییەکی ئاشکرادان).

- بەڵگەشی هێناوەتەوە لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە تاکە و پاکە لە هاوەڵ: دەفەرمووێت: ﴿ لَوْ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَا ﴾ الأنبیاء: ٢٢. واتە: (ئەگەر لە هەر دووکیاندا "لە ئاسمانەکان و زەویدا" چەند خوایەکی تر هەبوبا غەیری "الله"، ئەوە کاوڵ و وێران دەبوون و تێکدەچوون بەسەر یەکدا).

- خوای گەورە وەسفی خۆی کردووە بە وەسفە کامڵەکان. ئەمە لەکاتی قسەکردن لەسەر سیفەتە خواییەکان بە ڕوون کراوەیی دەخرێتەڕوو.

- پەیامبەرو پێغەمبەرانی ڕەوانە کردووە وەك ڕێنیشاندەری مرۆڤ بۆ سەر ڕێگەی خۆشبەختی لە دونیا و دوارۆژدا.

خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ دەفەرموویێت: ﴿لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ آل عمران: ١٦٤. واتە: (سوێند بێت بێگومان خوا منەتی ناوەتە سەر ئیمانداران کاتێك پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانەکردوون لە خۆیان و ئایەتەکانی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوەو دڵ و دەروونیان پاك و پوخت دەکاتەوە، هەروەها فێری قورئان و داناییان دەکات، بەڕاستی پێشتر لە گومڕاییەکی ئاشکرادا ڕۆچوو بوون).

هەروەها دەفەرموویێت: ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِى كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ ﴾ النحل: ٣٦. واتە: (سوێند بەخوا بێگومان ئێمە لە ناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردووەو پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت: تەنها خوا بپەرستن، خۆتان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر).

- باوەڕ هێنانی بە ڕۆژی دوایی پێویست کردووە.

خوای دانا و خاوەن توانا دەفەرموویێت: ﴿قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّى لَتُبْعَثُنَّ﴾ التغابن: ٧. واتە: (پێیان بڵێ: وا نییە، سوێند بە پەروەردگارم، بەڕاستی هەر زیندوو دەکرێنەوە).

بەڵگەشی لەسەر هێناوەتەوە، بەم فەرمایشتەی:﴿ قَالَ مَن يُحْىِ ٱلْعِظَٰمَ وَهِىَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِىٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴾ يس: ٧٨-٧٩. واتە: (دەیوت: کێ ئەم ئێسکانە زیندوو دەکاتەوە لە کاتێکدا ڕزیوو و پرتوکاون؟!. پێیان بڵێ: ئەو زاتەی کە یەکەمجار دروستی کرد، هەر ئەویش زیندووی دەکاتەوە، ئەو بەهەموو دروستکراوێك زاناو ئاگایە).

٤- باسی ڕاو بۆچوون و گوفتاری بێ باوەڕانی کردووەو بەرپەرچیشی داوەتەوە.

- بەم فەرمایشتە بەپەرچی پەیکەرو بتپەرستەکانی داوەتەوە: ﴿ إِنَّمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَٰنًا وَتَخْلُقُونَ إِفْكًا ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ لَكُمْ

رِزْقًا فَٱبْتَغُواْ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزْقَ وَٱعْبُدُوهُ وَٱشْكُرُواْ لَهُۥٓ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾ العنكبوت: ١٧.
واتە: (بەڕاستی ئەو شتانەی کە لە جیاتی خوا دەیانپەرستن تەنها بت و پەیکەرن، ئێوە بوختان و شتی نابەجێ دروست دەکەن، بێگومان ئەو شتانەی کە لە جیاتی خوا دەیانپەرستن خاوەنی هیچ ڕزق و ڕۆزییەك نین بۆ ئێوە، کەواتە هەر داوای ڕزق و ڕۆزی لە خوا بکەن، هەر ئەویش بپەرستن، هەر سوپاسگوزاری ئەو بن، بۆ لای ئەویش دەگەڕێنرێنەوە).

- قورئانی پیرۆز بەرپەرچی ئەستێرەو هەسارەو مانگ و خۆر پەرستانی داوەتەوە، دەفەرموێت:

﴿ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ ٱلَّيْلُ رَءَا كَوْكَبًا ۖ قَالَ هَٰذَا رَبِّى ۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلْءَافِلِينَ ﴿٧٦﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَٰذَا رَبِّى ۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِى رَبِّى لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧٧﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَٰذَا رَبِّى هَٰذَآ أَكْبَرُ ۖ فَلَمَّآ أَفَلَتْ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٧٨﴾ إِنِّى وَجَّهْتُ وَجْهِىَ لِلَّذِى فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا ۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾ الأنعام: ٧٦-٧٩. واتە: (ئینجا کاتێك شەو باڵی کێشا بەسەر ئیبراهیمدا ئەستێرەیەکی "گەشی گەورەی" بینی، بۆیە وتی: ئاگاداربن، وادابنێین ئەمە پەروەردگارمە، کاتێك ئەستێرەکەی لێ ئاوا بوو وتی: من شتی لەبەرچاو وون بووم خۆش ناوێت و ناپەرستم. ئینجا کاتێك مانگی بینی هەڵهات، وتی: ئاگاداربن، وادابنێین ئەمەیان پەروەردگارمە، کاتێکیش ئەویش ئاوا بوو، وتی: سوێند بێت بەخوا ئەگەر پەروەردگارم هیدایەتی نەدابام، ئەوە بێگومان لە ڕیزی دەستەی گومڕاکاندا دەبووم. ئینجا کاتێك خۆری بینی هەڵهات، وتی: ئاگاداربن، وادابنێین ئەمەیان پەروەردگارمە، ئەمە گەورەتریشە کاتێك ئەویش ئاوابوو وتی: ئەی خەڵکینە، ئەی خزمینە، بەڕاستی من بەریم لەو شتانەی ئێوە کردووتانە بەهاوەڵ و شەریك "بۆ پەروەردگار". بەڕاستی من ڕووی خۆم و دڵم لە پەرستندا کردۆتە ئەو زاتەی ئاسمانەکان و زەوی فەراهەم هێناوە، لە

کاتێکدا ڕووم لە هیچ شتێکی تر ناکەم، بەدڵئارامی تەواویشەوە "دەڵێم کە": هەرگیز من لە ڕیزی موشریك و هاوەڵگەڕاندا نیم).

- بەرپەرچی فریشتە پەرستەکانیشی داوەتەوە دەفەرمووێت:

﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ أَهَـٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ﴿٤٠﴾ قَالُوا۟ سُبْحَـٰنَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم ۖ بَلْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ٱلْجِنَّ ۖ أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ ﴿٤١﴾ ﴾

سبأ: ٤٠-٤١. واتە: (ڕۆژێکیش دێت کە خوا تێکڕای هەموویان کۆ دەکاتەوە، ئەوسا ڕوو بە فریشتەکان دەفەرمووێت: بەڕاست! ئەو دەستە گومڕایە ئێوەیان دەپەرست. لە وەڵامدا دەڵێن: پاکی و ستایش بۆ تۆ ئەی پەروەردگار تۆ یارو یاوەری ئێمەی نەك ئەوان، نەخێر" ئێمەیان نەدەپەرست، بەڵکو ئەوان پەرییان دەپەرست، زۆربەیان باوەڕیان پێیان هەبوو).

- بەرپەرچی جولەکەکانیشی داوەتەوە، هەروەك دەفەرمووێت:

﴿ قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ هَادُوٓا۟ إِن زَعَمْتُمْ أَنَّكُمْ أَوْلِيَآءُ لِلَّهِ مِن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُا۟ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَلَا يَتَمَنَّوْنَهُۥٓ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٧﴾ ﴾

الجمعة: ٦-٧. واتە: (ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵێ: ئەی ئەوانەی لەسەر دینی جولەکەن، ئەگەر بڕواتان وایە کە بەڕاستی ئێوە دۆست و لایەنگیری خوان، جگە لە خەڵکی تر، کەواتە داوای مردن بکەن و ئاواتی مەرگ بخوازن. کەچی ئەوانە هەرگیزاو هەرگیز ئاواتی وا ناخوازن و مردن داوا ناکەن، چونکە خۆیان دەزانن دەست پێشخەری چییان کردووە، خوایش زانایە بەکاروکردەوەی ستەمکاران).

- بەرپەرچی ئەوەشی داوەتەوە کە بڕوای وایە عیسا خوایەکە و دەپەرسترێت، هەروەك دەفەرمووێت:

﴿ وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَـٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَـٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالَ سُبْحَـٰنَكَ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِى بِحَقٍّ ۚ إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥ ۚ تَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِى وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِكَ ۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّـٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴾ المائدة: ١١٦. واتە:

(کاتێکیش خوا "هەر لە قیامەتدا" فەرمووی: ئەی عیسای کوڕی مەریەم، ئایا ئەوە تۆ بەخەڵکیت وتوە: منیش و دایکیشم بە دوو خوا دابنێن لە خوار خوای پەروەردگارەوە؟ عیسا لە وەڵامدا وتی: پاکی و بێگەردی و بێ هاوەڵی شایستەی تۆیە، بۆم نییە من شتێك بڵێم بۆ خۆم کە مافی من نەبێت؟! خۆ ئەگەر شتی وام وتبێت ئەوە بەڕاستی دەیزانیت و لێت شاراوە نییە، چونکە تۆ شارەزایت بەهەرچی لە دڵ و دەروونمدا هەیە، بەڵام من نازانم بەوەی کە لە دەریای عیلم و زانستی بێ پایانی تۆدا هەیە، چونکە بەڕاستی هەر خۆت زانا و شارەزای نهێنی و پەنهانی).

- بەرپەرچی ئەوەشی داوەتەوە کە دەڵێت خوای گەورە کوڕی هەیە، لەمبارەوە دەفەرمووێت:

﴿ وَمَا يَنۢبَغِي لِلرَّحۡمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ﴿٩٢﴾ إِن كُلُّ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ إِلَّآ ءَاتِي ٱلرَّحۡمَٰنِ عَبۡدٗا ﴿٩٣﴾ ﴾ مريم: ٩٢-٩٣. واتە: (لە کاتێکدا بۆ خوای میهرەبان نەهاتووە و ڕەوا نیە کە نەوە بۆ خۆی بڕیار بدات. هیچ کەسێك نییە لە ئاسمانەکان و زەویدا، کە بەندەی ملکەچی خوای میهرەبان نەبێت).

- بەرپەرچ و تەکفیری ئەوانەشی کردووە کە نکوڵی لە پێغەمبەرایەتی دەکەن، لەمبارەیەوە دەفەرمووێت:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤۡمِنُ بِبَعۡضٖ وَنَكۡفُرُ بِبَعۡضٖ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١٥٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ حَقّٗاۚ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا ﴿١٥١﴾ ﴾ النساء: ١٥٠-١٥١. واتە: (بێگومان ئەوانەی باوەڕ بەخواو پێغەمبەران ناهێنن و دەیانەوێت جیاوازی بکەن لە نێوان پێغەمبەرەکانیاندا، یاخود دەڵێن: باوەڕ دەهێنین بەهەندێك لە پێغەمبەران و باوەڕ بەهەندێکیان ناهێنین و دەیانەوێت لەو نێوانەدا ڕێگە و بەرنامەیەك بۆ خۆیان بەدەست بهێنن. ئا ئەو جۆرە کەسانە بەڕاستی هەر بێ باوەڕن و بۆ بێ باوەڕان سزایەکی سەر شۆڕکەرمان ئامادەکردووە).

- بەرپەرچی ئەوانەشی داوەتەوە کە نکۆڵی لە زیندوو بوونەوە دەکەن، خوای پاك و تاك دەفەرمووێت:

﴿ وَإِن تَعۡجَبۡ فَعَجَبٞ قَوۡلُهُمۡ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡأَغۡلَٰلُ فِيٓ أَعۡنَاقِهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾

الرعد: ٥. واتە: (خۆ ئەگەر تۆ بەشتێك سەرسام بیت و پێت سەیر بێت، ئەوە قسەی بێ باوەڕان جێی سەرسامییە کە دەڵێن: ئایا کاتێك بووینەوە بەخاك و خۆڵ، سەر لە نوێ زیندوو دەکرێینەوەو دروست دەبینەوە؟ ئا ئەوانە "کە ئەو قسەیە دەکەن" ئەوانەن کە بێ باوەڕبوون بە پەروەردگاریان، زنجیرەکان لە گەردەنیاندان و نیشتەجێی ئاگری دۆزەخن و هەمیشە دەبێ تیایدا بمێننەوە).

٥- بیروباوەڕی بەشێوەیەکی ساکاری خستووەتەڕوو کە کەسی نەخوێندەواری سادەو زانای ڕۆچوو لە هەموو زانستە جیاوازەکان لێی تێدەگات.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ أَنَّا صَبَبۡنَا ٱلۡمَآءَ صَبّٗا ﴿٢٥﴾ ثُمَّ شَقَقۡنَا ٱلۡأَرۡضَ شَقّٗا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا حَبّٗا ﴿٢٧﴾ وَعِنَبٗا وَقَضۡبٗا ﴿٢٨﴾ وَزَيۡتُونٗا وَنَخۡلٗا ﴿٢٩﴾ وَحَدَآئِقَ غُلۡبٗا ﴿٣٠﴾ وَفَٰكِهَةٗ وَأَبّٗا ﴿٣١﴾ مَّتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِأَنۡعَٰمِكُمۡ ﴿٣٢﴾ ﴾ عبس: ٢٤-٣٢. واتە: (دەبا ئادەمیزاد سەیری خواردنەکەی بکات و سەرنجی بدات و بیری لێبکاتەوە. بێگومان ئێمە بارانمان بۆ داباراندۆتە خوارەوە، چۆن دابارینێك. لەوەودوا زەویمان بۆ لەت لەت کردووە بەچەکەرەی ناسکی ڕووەك. ئینجا دانەوێڵە، هەروەها ترێ و سەوزە هەروەها زەیتوون و دارخورمایشمان تیادا ڕوواند. باخچەی دەورەدراو بە دار خورما یان درەختی تر، یاخود باخی چڕو پڕ. جۆرەها میوە، هاوڕێ لەگەڵ هەموو ئەو گژو گیایانەی کە خواکردە و ماڵات دەیخوات لە لەوەڕگاکاندا. تا خۆتان و ماڵاتەکانتان سوودی لێ وەربگرن).

٦- کاتێك قورئانی پیرۆز بیروباوەڕە ڕاست و دروستەکەی ئیسلام دەخاتەڕوو، بەڵگە و جیاوازی لەسەر دەخاتەڕوو، ئەوا فەرمان دەکات کە بانگەواز بۆ ئەو بیروباوەڕە بکرێت

بەشێوەو ڕێگەیەکی چاك و دوور لە مشتومڕی نەزۆك کە دەبێتە هۆی ڕق و کینە و پەرتەوازەیی.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ ﴾ النحل: ١٢٥[١]. واتە: ("ئەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، ئەی ئیماندار" بانگەواز بکە بۆ لای بەرنامە و ڕێبازی پەروەردگارت بە حیکمەت و دانایی "بۆ هەندێك" و ئامۆژگاری جوان و بەجێ "بۆ هەندێکی تر" و گفتوگۆ و موجادەلە بەجوانترین شێوە "لەگەڵ هەندێکی تردا بەتایبەت خاوەن کتێبەکان").

ئیمامی غەزالی وێنەی بەڵگەکانی قورئانی کردووە بەوەی وەك خۆراك وان بۆ مرۆڤـ، هەروەها وەك ئاو کە منداڵی شیرەخۆر و پیاوی بەهێز سوودی لێ دەبینن[٢].

[١] پێشەوا موحەمەد عەبدە ئاماژەی بۆ هەندێ لەمانە کردووە لە: (رسالة في التوحيد ٨). و بڕوانە کتێبەمان: أصول الدين الإسلامي ٢٧-٣١.

[٢] إلجام العوام للغزالي ٤٠.

# دەروازەی سێیەم

## بارودۆخی بیروباوەڕ

## لە سەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و دوای ئەویش

پێغەمبەر موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) سەرچاوە (مرجع)ی موسـڵمانانە، ئەوانـەی پرسیاریان هەیە لەبارەی ئاینەکەیان و دەیانەوێت زیاتر لەبارەی زانستەکانی ئاینیان بـزانن بۆی دەگەڕێنەوە، لـەکاتی گەڕانــەوە بـۆ لای ئــەو زاتــە پـیرۆزە ئـەوا وەڵـامی تـەواویان دەستدەکەوێت.

هەروەها هاوبەشدانەران و خـاوەن کتێبــەکان دێنــە لای گفتوگــۆو مشـتومڕی لەگـەڵ دەکەن و پشتیشی تێدەکەن.

وەڵامەکانی پێغەمبەریش بۆ ئەوان جاری واهەیە بە نەرم و نیانییــە،جاری واش هەیــە بەشێوەیەکی توونده، وەڵامەکان بەپێی بارودۆخەکان دەبوون.

بەڵام پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)کاتێـك وەڵـامی موسـڵمانانی دەدایـەوە شـێوازی دەمەتەقێ و ڕەقی نەدەگرتەبەر[1].

کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئـەم فەرمایشـتەی خـوای گـەورەی خوێنـدەوە: ﴿ إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَٰرِدُونَ ﴿٩٨﴾ لَوْ كَانَ هَٰٓؤُلَآءِ ءَالِهَةً مَّا وَرَدُوهَا ۖ وَكُلٌّ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٩٩﴾ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَهُمْ فِيهَا لَا يَسْمَعُونَ ﴾ الأنبياء: ٩٨-١٠٠. واتە: ("پێیان دەوترێت" بەڕاستی ئێوەو ئەو شتانەی لـە جیاتی خوا دەتانپەرست سووتەمەنی دۆزەخن و سەلکە بزوتی ئاگرن، دەبێـت هـەر بچـنە نـاوی و هەمیشــە تێیــدان. "هــەروەها بــە هەڵگــەڕاوەکان دەوترێـت" ئەوانــەی ئێــوە

[1] التفكير الفلسفي في الإسلام لعبد الحليم محمود ١١٩.

دەتانپەرست ئەگەر خوا بوونایە ئاوا نەدەخرانە ناو دۆزەخەوە، بێگومان هەر هەموویان لە دۆزەخدا بۆ هەمیشەیی دەمێننەوە. ئەوانە" بەهەناسەی قورس و لرخەلرخ و ئـاهو ناڵـەوە "ژیانی سەختی تیادا دەبەنەسەر" و مژدە و هیواو قسەیەکی خۆش نابیسن). هەنـدێ لـە هاوبەشدارنەران پرسیاریان لێکرد: هەر بەندەیەك جگە لە خوای گەورە بپەرسترێت دەچـێە دۆزەخەوە؟ جا ئێمە فریشتە دەپەرستین، جولەکـەش عـوزێر دەپەرسـتن، نەصـرانیەکانیش مریم و عیسا دەپەرستن؟.

پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) وەڵـامی دایـەوە: (هـەر یـەکێك پێـی خـۆش بێـت بپەرسترێت لـە غـەیری خـوای گـەورە ئـەوا لەگـەڵ ئـەو کەسـە دەچـێتە دۆزەخـەوە کـە دەیپەرستێت، بەڕاستی ئەوانە شـەیتانەکان دەپەرسـتن، کەچـی کـێ فـەرمانی پەرسـتنی ئەوانەی پێکردوون). خوای گەورە ئـەم ئایەتـەی دابەزانـد: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا ٱلْحُسْنَىٰٓ أُو۟لَٰٓئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ ﴿١٠١﴾ لَا يَسْمَعُونَ حَسِيسَهَا ۖ وَهُمْ فِى مَا ٱشْتَهَتْ أَنفُسُهُمْ خَٰلِدُونَ ﴾ الأنبياء: ١٠١-١٠٢[1]. واتە: (بەڕاستی ئەوانەی هـەر زوو بڕیارمانـداوە چـاکە بهێنینـە ڕێـیان"بـەهۆی ئیمـان و بـاوەڕو کـردەوەی چـاکیانەوە"دوورە پـەرێز کـراون لـە دۆزەخەوە. قرچە قرچ و ورشەو دەنگی بڵێسـەی نابیسـتن، "بـەڵکو ئەوانـە لـە نـاو نـازو نیعمەتدا" کە حەزیان لێی بوو و ئارەزوویان دەکرد بۆ هەتا هەتایی دەمێنن).

ڕۆژێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چووە لای هاوەڵەکانی، بینی کە قسە لە بابەتی چارەنووس (قەدەر)دا دەکەن، پێغەمبەر بە توڕەیی هاتەدەر بۆ لایان چوو و لە بـەردەمیان ڕاوەستا و پێی فەرموون: ئەی خەڵکینە بەڕاستی ئوممەتەکانی پێش ئێوە بەمە گومڕابوون، بەهۆی ڕاجیاییان سەبارەت بە پێغەمبەرەکانیان، بەگژ یەکتردا بردنی هەندێ بەشی قورئان

---

[1] تفسير إبن كثير ٨٧٧.

بە هەندێکی تر، جا قورئان بۆ ئەوە دانەبەزیوە تا هەندێکی بە گژ هەندێکی تریدا ببرێـت، بەڵکو قورئان هەر بەشێکیشی پشتگیری ڕاستێتی بەشەکەی تـر دەکـات، جـا ئەوەنـدەی شارەزاییتان پێ هەبوو کاری پێ بکەن، ئەوەی وێکچوو (متشابە) بوو بـڕوای پـێ بێـنن و بەس[1].

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کۆچی دوایی کـرد، هاوەڵـە بـەڕێزەکانی (ڕەزای خوایـان لێبێت) بەردەوام بوون لەسەر ڕێگەی ڕۆشنەکەی لە سەرزەنشـت کردنـی بەرهەڵسـتکاران و دوورکەوتنەوە لە مشتومڕی نەخوازراو و ئامۆژگاری خەڵکیشیان دەکرد کە کار تەنها لەو چوارچێوەیەدا بکەن کە دەقی چەسپاوی سروش (وحی) لەسەر هاتووە.

هاوەڵان لە بەڵگـە هێنانەوەکانیشـیاندا ڕێچـکەی زانایـانی کـەلامیان نەگرتەبـەر لـە چۆنیەتی دابەش کردنی بەڵگەکاندا، ئەمەش لەبەر بێ تواناییان نەبووە لە ئاست ئەمـەدا، بەڵکو ئەگەر بیانزانیبوویا کە ئەمە مایەی سوود دەبێت،ئەوا بێگومان زۆر بە شـێوەیەکی بەرچاو کاریان لەسەر نووسینەوەی بەڵگەکان دەکرد.

لە ئیبن عومەرەوە (خوای لێ ڕازی بێت) هاتووە کە یەکێك پرسیاری لێکرد سەبارەت بـە دوو ئایەتی وێکچوو (متشابە)، ابن عمر بە قەمچیەکەی لێیداوە.

جا شوێنکەوتووان و گەورە پێشەوایانیش لەسەر ئەم ڕێگەیە ڕۆیشتوون[2].

لە دوای سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)ڕاجیایی لە نێوان هاوەڵاندا لە بابەتە کردارییەکان سەریهەڵدا، وەك: خەلافـەت، جـەنگ کـردن لەگـەڵ زەکـات نـەدەرەکان.... هاووێنەی ئەم بابەتانە[3].

---

[1] التفکیر الفلسفي في الإسلام ١١٩ و فەرموودەکە لە عەمروی کوڕی شوعەیب گێڕدراوەتەوەو ئەویش لە باوکی و لە باپیری گێڕاوەتەوە.

[2] التفکیر الفلسفي في الإسلام ١٢٥-١٢٦ و لە کتێبی غەزالی: إلجام العوامی، وەرگرتووە. و بڕوانە: إلجام العوام ٤١ غەزالی گێڕانەوەکەی ئیبن عومەری (خوای لێ ڕازی بێت) لە ٥٥ هێناویەتی.

[3] الفرق بین الفرق ١٤ و الملل و النحل للشهرستاني ١٢/١ و لاپەڕەکانی دواتری. التبصیر في الدین ١٧.

بەڵام نەمانیی‌نی لە بابەتەکانی بیروباوەڕدا ڕاجیاییان هەبێت، ئەوەش کە دەبینین لە هەندێ گێڕانەوەدا هاتووە لەوەی وەڵامی هەندێك پرسیار دراوەتەوە ئەوا تەنها ئامانج لێی چەسپاندنی بیروباوەڕو لادانی گومانی دوژمنانە.

گێڕدراوەتەوە کە ئەبو موسای ئەشعەری (خوای لێ ڕازی بێت) گفتوگۆی کردووە لەگەڵ ئەوانەی دەڵێن: چۆن خوای گەورە شتێکی بە قەدەر لەسەر من تۆمار کردووەو دواتر سزاشم دەدات لەسەری؟ ناوبراو وەڵامی دایەوە: کە خوای گەورە شتەکەی بە پێی زانستی خۆی ئەندازەکردووە و سزاش دەدات بەبێ ئەوەی ستەمی لێ کردبێت؟.

چەندین ڕا لە ئیمامی عەلی (خوای لێ ڕازی بێت) هاتووە لەبارەی زات و سیفەتەکانی خوای گەورە و لەبارەی قەدەر و دروست بوونی قورئان (خلق القرآن).

سەبارەت بە ڕاجیایی لە بنەما (أصول)ەکاندا ئەوا لە کۆتایی سەردەمی هاوەڵان و سەرەتای سەردەمی ئەمەوییەکان سەری هەڵدا، وەك بیدعەکەی مەعبەدی جەهەنی و غەیلانی دیمەشقی سەبارەت بە بابەتی (قەدەر) و نکۆڵی کردن لە دانە پاڵی خێرو شەڕ بۆ پاڵ خوای گەورە و دروست بوونی قورئان (خلق القرآن) و سیفەتەکانی خوا. واصڵی کوڕی عەتاء و عەمروی کوڕی عوبەیدیش لەسەر ڕێچکەی ئەوان چوون لە بۆچوونە موعتەزیلیەکانیاندا[1].

دوای هەر دوو پێشەوا ناوبراوەکەی موعتەزیلە، شێخەکانیان هەڵسان بەخوێندنەوەی کتێبەکانی فەلسەفە کە لە سەردەمی مەئمون وەرگێڕدران، دوای ئەمە موعتەزیلەکان پەیڕەوە فەلسەفیەکانیان ئاوێتە کرد لەگەڵ پەیڕەوەکانی زانستی کەلام، ئەمەش بووە هۆی داهێنانی زانستێك، کە ناونرا بە زانستی کەلام، کە لە میانەیدا هونەرەکانی لۆژیك (منطق) و فەلسەفە بەدەرکەوتن.

---

[1] بڕوانە کتێبەکەمان: أصول الدین الإسلامی ٣٨ کە وەرگیراوە لە: نشأة الآراء و المذاهب و الفرق الکلامیة لیحیی حسن فرغل.

جا ئەم شێخانە بیدعەیەکیان داهێنا لە سیفەتەکانی خوای گەورەدا وەك: دوان (کـلام) و ویست (الإرادة) و لە کردارەکانی بەندە و لە قەدەردا.

جەهەمی کوڕی صەفوان هەڵکەوت و بیدعەکەی دەرخست لە بواری جەبریدا.

لە نێوان موعتەزیلەکان و پێشینان و جەبرییـەکان مێژگـەرد و ڕاگۆڕینـەوە هەبوونـە، هەروەك کتێبەکانی دەستەو تاقمەکان و زانستی کەلام ئەمانەیان تۆمار کردووە[1].

نمونەیەك لەو ڕاجیاییانە کە لە بنەماکان دەژمێردرێت بریتییە لە بابەتی: (ئەو کەسەی گوناهی گەورە دەکات)، خـەواریج ئـەم بابەتـەیان وروژانـد و مورجیئـە و موعتەزیلـە و ئەهلی سوننە قسەیان لەسەر کردووە.

کتێب و نامە و پەیام لە بواری زانسـتی کەلامـدا نووسـران بەتایبـەت لـە سـەردەمی عەبباسیەکان، لەلایەن ئەهلی سوننە و موعتەزیلە و جەبەری و خـەواریج و ئیمامییـەکان و زەیدی و ئیبازی و زاهیریەکان.

پەیڕەوی تێڕوانینی عەقڵی پەرەی سەند لە داننان بە بیروبـاوەڕە ئاینیـەکان و بـەرگری لێکردنی، کە موعتەزیلەکان بەتایبەت پێی دەناسران.

دوای ئەمە ئەشعەری دەرکەوت پشتی مەزهـەبی ئـەهلی سـوننەی دەگـرت و سـەری دەخست، بەرپەرچی موعتەزیلەکانی دایەوەو دەسەڵاتی ئەوانی لەق کـرد. ئەشـعەرییەکان میانڕەو مامناوەند بوون لەنێوانی فەرموودەناسان (أهل الحديث) و موعتەزیلەکان.

هەروەها ماتوریدی دەرکەوت، بەهـەمان شـێوە پشـتی مەزهـەبی ئـەهلی سونـنەی دەگرت و سەری دەخست، بەڵام ڕێگەکەی نزیکتر بوو لـە ڕێچـکەی موعتەزیلـەکان، جـا ماتریدیەکان ناوەند بوون لە نێوان ئەشعەریەکان و موعتەزیلەکان.

هەنـدێك زانـا دوایینـەکانی ئەشـعەری و ماتریـدی دەرکـەوتن و ئاوێتـەی کتێبـە فەلسەفیەکان بوون و ئەوەی لەبارەی زانستی کەلام نووسـیبوویان تێکـەڵیان کـرد لەگـەڵ فەلسەفەدا، هـەروەك بـەیزاوی لـە کتێبەکەیـدا (طوالـع الأنـوار) و ئیجـی لـە کتێـــبی (المواقف) و تەفتازانی لە کتێبی (المقاصد و شرحه)... تاد، ئەمەش لەبـەر ئـەوەبووە کـە

---

[1] الملل والنحل للشهرستاني ١/٢٢-٢٧.

ئەو سەردەمەی تیایدا ژیاون ڕۆشنبیری فەلسەفی تێدا بڵاوبووە و تەنانەت خەسڵەتی دیاری ئەو سەردەمە بووە. زانایانی سەردەم بە وردی خوێندنەوەیان بۆ زانستی کەلام هەبووە، بەپێی ڕێچکەیەکی عەقڵی لە سەرەتای ژیانی خوێندنیاندا، بۆیە ئەم ڕێگەیەیان گرتۆتەبەر لە دانانی کتێب و بەڵگە بەرپاکردن لەسەر دژەڕاکان.

بەڵام هەندێك حەنبەلی ڕووبەڕووی ئەم پەیڕەوە عەقڵییە بوونەوە، بەتایبەت ئیبن تەیمیە و قوتابیەکەی ئیبن قەیمی جەوزی.

لە کاتی خستنەڕووی دەستە و تاقمە ئیسلامییەکان ئەوا بەتێرو تەسەلی ئەم بۆچوونانە دەخەینەڕوو.

لەم سەردەمەی خۆشماندا چەندین کتێبی جیاواز لە زانستی کەلامدا دەرکەوتوون، ئەو شتانەی پێشینان باسیان کردووە بە شێوەیەکی ئاسانکراوەیی خراوەتەڕوو دوور لە ئاڵۆزی.

هەندێ لەو توێژینەوانەی لەسەر زانستی کەلام کراون هەیانە تەواو مەزهەبییە. هەیانە بەراوردکارییە: بۆچوونەکانی مەزهەبە ئیسلامییەکان لە بابەتەکانی بیروباوەڕدا دەخاتەڕوو، دواتر دەیانپێوێت بەهیوای ئەوەی بتوانێت کۆیان بکاتەوە، لە پێناو نەهێشتنی ئەو کەلێنەی کە ئەندێشە دەکرێت لە نێوان موسڵماناندا هەیە، ئەمەش بە پشت بەستن بە ڕێگەی نەقلی و عەقلی لە بەڵگە هێنانەوەدا.

هەشیانە لە بەراورد کردن لە نێوان بۆچوونەکاندا سنوری بەزاندووە بۆ فیکری خۆرئاوایی.

ڕێڕەوی بەراورد کردنی بۆچوونەکان و هەوڵی کۆکردنەوەیان و بەڵگە هێنانەوە بەنەقڵ و عەقڵ، ئەوە دەبێتە پەیڕەوی ئێمە لەم کتێبەدا.

ئەمەش:

لەبەر ئەوەی کە ئەوەی: (پێویستە لەسەرمان بڕوامان وابێت - هەروەك ئیمام موحەمەد عەبدە دەڵێت - ئاینی ئیسلام مانای یەکتاییە لە بیروباوەڕدا، ئاینی پەرتەوازەیی نییە لە بنەما و بناغەکاندا، عەقڵ بەهێزترین یارمەتیدەرو پشتگیریەتی، نەقڵیش بەهێزترین بنەماکانیەتی، لە دوای ئەمەش تەنها ئاژاوەی شەیتانەکانە)[1].

---

[1] رسالة التوحيد لمحمد عبده ٢٧.

## بەشی دووەم

## مەزهەبە ئیسلامییەکان

### لە سێ دەروازە پێکدێت:

دەروازەی یەکەم:

شـیکردنەوەو شـرۆڤەکردنی سـەرهەڵدانی مەزهەبـە ئیسـلامییەکان، فـەرموودەی پەرتـەوازەبوونی ئوممەت.

دەروازەی دووەم:

گرنگترین مەزهەبـە ئیسلامییەکان لـە بـواری بیروبـاوەڕدا: خەواریج، ئیبازیەت، شـیعە، مورجیئـە، قەدەریـەت، جەبریـەت، موعتەزیلـە، ئەشـعەرییەکان، ماتوریدیەکان، سەلەفیەت.

دەروازەی سێیەم:

بنەماکانی ئایین لەلایەن مەزهەبە ئیسلامییەکان: ئـەهلی سـوننە و جەماعـەت، شـیعەی دوازدە ئیمـامی، موعتەزیلە.

# دەروازەی یەکەم

## شیکردنەوەو شرۆڤەکردنی سەرهەڵدانی مەزهەبە ئیسلامییەکان

سەرهەڵدانی مەزهەبە ئیسلامیەکان لە بوارەکانی سیاسەت و بیروباوەڕدا لە سەدەمی سەرەتای ئیسلامدا دەستی پێکرد ، ئەو مێژوو نووسانەی لەوبارەیان نووسیووە وا لێڕاهاتوون کە ئەو مەزهەبانە ناو بنێنن بە دەستەو تاقمە ئیسلامییەکان (الفرق الإسلامية)، لە کتێبەکانیاندا بیروبۆچوونی هەر یەك لەو دەستەو تاقمانەیان نووسیوە. زانایان ڕاجیاییان هەبووە، لەبارەی سەرهەڵدانی مەزهەبە ئیسلامیەکان، گرنگترین هۆکارەکانی ڕاجیایی موسڵمانانیان لە بواری بیروباوەڕدا خستوەتەڕوو، ئەمانەن:

١- هۆکاری سیاسیی: کاتێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کۆچی دوایی کرد. هاوەڵان ڕاجیا بوونە، لەبارەی ئەوەی کێ شیاوترە بە شوێن گرتنەوەی، پشتیوانان (أنصار) و لە سەروشیانەوە (سەعدی کوڕی عوبادە) ملکەچی کۆچبەران (مهاجرین) بوون، کاتێك ئەبو بەکری صدیق (خوای لێ ڕازی بێت) وتی: بەڕاستی سعد تۆ زانیوتە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وتی ئەو کاتە تۆ دانیشتبووی: قورەیش خاوەنی ئەم کاروبارەن، چاکترینی خەڵك شوێنکەوتووی ئەوانن، خراپترین خەڵکیش شوێنکەوتووی خراپترینیانە. سەعد وتی: ڕاستت وت، وەزیرایەتی بۆ ئێمە، ئەمیرایەتیش بۆ ئێوە[1].

---

(1) منهاج السنة لإبن تيمية، تحقيق محمد رشاد سالم ١/٣٧١-٣٧٢. و قول أبي بكر رواه أحمد في مسنده - مسند الصديق. وهو في كتابي: الشورى بين النظرية والتطبيق ٢٣٢.

دواتر ڕاجیایی لەبارەی خەلافەت زۆر توووند بوو، لە دەرەنجامدا دەرکەوتنی خەواریج و شیعە و جگە لەوانەشی لێکەوتەوە.

٢- هاتنی دەقی وێکچوو (متشابە) لە قورئانی پیرۆزدا: خوای گەورە لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۖ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾ آل عمران: ٧. واتە: (ئەو خوایە زاتێکە کە قورئانی بۆ سەر تۆ "ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)" ناردە خوارەوە، بەشێك لە ئایەتەکانی دامەزراو و پایەدارو ڕوون و ئاشکران، ئەوانە بنچینە و بناغەی قورئانەکەن و هەندێکی تریشی واتای جۆراو جۆر هەڵدەگرن و بە ئاسانی نازانرێن، جا ئەوانەی کە لە دڵیاندا لاری و لادان هەیە، حەز لە حەق و ڕاستی ناکەن. ئەوانە شوێنی ئەو ئایەتانە دەکەون کە مانای جۆراو جۆرو فراوانیان هەیە، بۆ ئەوەی فیتنە و ئاشوب و ناکۆکی و دووبەرەکی دروست بکەن، یان بۆ ئەوەی لێکدانەوەی هەڵەی بۆ هەڵبەستن، لە حاڵێکدا کە لێکدانەوەی ئەو جۆرە ئایەتانە هەر خوا خۆی بەتەواوی دەیزانێت. جا ئەو کەسانەی کە لە زانستدا ڕۆچوون دەڵێن: ئێمە باوەڕی دامەزراومان بە هەر هەموو "ئەو ئایەتانە" هەیە کە لەلایەن پەروەردگارمانەوەیە و فەرمایشی ئەوە، "لە ڕاستیدا" بێجگە لە خاوەن بیرو ژیرەکان یادەوەری وەرناگرن و بیرناکەنەوە "لەم قورئانە").

زانایـان ڕاجیاییـان هـەبووە، لـەبارەی تەفسـیرو لێکدانـەوەی ئایەتـە فرەواتـاو وێکچووەکان (المتشابهة)، هەندێکیان لە ئاستیدا بێ دەنگ بوونە، هەندێکی تریـان تەئویلیان کردووە. ئەوانەش کە تەئویلیان کردووە لەبارەی تەئویلەکـەش ڕاجیاییـان هەیە، هەروەك چۆن ڕاجیاییان هەبووە لەبارەی تەفسیرکردنی دەقەکانی تری قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، هـەروەها ڕاجیاییـان لـەوەی ئـەم دەقانە دەکرێت لەگەڵ یەك کۆبکرێنەوە یان نا.

ئەوەی من بۆی ئەچم ئەوەیە کە ئەمە بەهێزترین هۆکاربووە لە سەرهەڵدانی دەستەو تاقم و مەزهەبە ئیسلامیەکان.

٣- وەرگێڕانی کتێبە فەلسەفیەکان: ئەمەش سەری کێشا، بۆ دەرکەوتنی پەیڕەوی فەلسەفی، لە بواری چەسپاندنی بیروباوەڕی ئیسلامی و لێکۆڵینەوەیدا، هەروەك موعتەزیلە و ئەشعەری و ماتوریدیەکان و جگە لەوانیش ئەمەیان پەیڕەو کردووە، بەوەی هەندێك شتی هەڵهێنجراوی لۆژیك(منطق)یی و توێژینەوەی فەلسەفییانبەکارهێنا، کە ئەمەش خولگەی گفتوگۆ بوو لەلایەن ئەوانەی کە ئەم پەیڕەوەیان ڕەتدەکردەوە کە بریتی بوون لە قوتابخانەی سەلەفیەت کە بەهەموو شێوەیەك لێکۆڵینەوەو خوێندنەوەی لۆژیك (منطق) و فەلسەفەیان ڕەتدەکردەوە.

پەیڕەوی فەلسەفی ئەمانەی کێش کرد، بۆ ئەوەی لە بابەتانێك بکۆڵنەوە کە عەقڵی مرۆڤ ناتوانێت دەرەنجامەکانی دیاری بکات. وەك: سیفەتەکانی خوای گەورە، بابەتی توانای بەندە لە ئاست توانای پەروەردگار، لێکۆڵینەوە لەم بابەتانە بێگومان سەردەکێشێت بۆ تێڕوانینی جیاواز.

٤- موسڵمانان دراوسێتی زۆرێك لە خاوەن ئایینەکانی پێشووتر بوون: زۆرێك لە هاوبەش دانەران و جولەکە و نەصرانی و ئاگرپەرست و جگە لەوانیش بوونە موسڵمان و هاتنە ناو بازنەی ئیسلامەوە، ئەو بابەتانەیان وروژاند، لە ناو موسڵماناندا، کە پێشتر وەك بیروباوەڕی ئایینە کۆنەکەیان دانیان پێدانابوو لەبارەی: ناچار و سەرپشك بوون (الجبر و الإختیار) و سیفەتەکانی خوای گەورە و بابەتی تریش.

هەیان بوو موسڵمان بوونەکەی بەچاکی بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا فیکرەکانی دەخستەڕوو بۆ ئەوەی لە ئاین تێبگات. هەشیانبوو تەنها بە ڕووکەش موسڵمان ببوو کەچی لە ناخیدا گورگی بێ دینی پەنهان کردبوو، دەیویست بیروباوەڕی موسڵمانان تێك بدات و ئایینیان پوچەڵ بکاتەوە.

ئەمەش بووە هۆى كەڵەكە بوونى ڕاو بۆچوون و دەركەوتنى پێڕو تاقمەكان[1].

زۆرێك لە ڕۆژهەڵاتناسان بۆ ئەوەچوون، كە عەقڵى عەرەبى لە ڕەسەنايەتى خۆيەوە تووشى نابابەتى بووە، دژى نوێخوازى و نوێبوونەوەيە، هەروەها دژى تێڕوانينى بەشيى (جزئى)ە، نايەوێت شت لە يەكتر جيا بكاتەوە. بەڵكو زياتر حەزو ويستى بەلاى دووبارەوە كردنەوەدا دەچێت. پێكهاتن و يەكێتى بابەتى لە عەقڵى عەرەبيدا بوونى نييە. دواى ئەمەش دەستەوەسانە لە دروستكردنى مەزهەبى فەلسەفيى گشتگيرو داهێنانى فيكرى.

دواتر ئەم ڕۆژهەڵاتناسانە گەيشتن بە گشتاندنێك كە خۆى لەمەدا دەبينێتەوە: هەر بابەت و دۆزو كێشەيەك لە ئيسلامدا شوێنەوارو دەرەنجامى لايەنێكە لە لايەنەكانى فيكرى بيانى.

بەڕاستى ئەمە بوێرييەكى ترسناكە، ئەمە گەلەكۆمەكێكى گەورەيە لە دژى موسڵمانان، چونكە لێكۆڵينەوە هاوچەرخەكان، ئەوەيان چەسپاندووە، كە دەركەوتنى فيكرەيەكى ديارى كراو لە ناو ئومەتێكى دياريكراودا، دواتر هەمان فيكرە لە بازنەيەكى ترى ڕۆشنبيريشدا دەربكەوێت. ئەوە ماناى وانيە كە هى دووەم كاريگەر بووە بەهى يەكەم، تەنها ئەو كاتە نەبێت كە بەڵگەى ماددى سەلمێنراو لەبەر دەست بێت لەسەر ئەمە.

شتێكى دروستيش نييە كە هەر ديادەيەك لە ديارەكان بگەڕێنينەوە بۆ هۆكارى دەرەكى، بەمەش هۆكارى ناوەخۆيى فەرامۆش بكەين. چونكە هيچ فيكرەيەك لە فيكرەكان كە نرخ و كاريگەرى لەسەر دەروونى خەڵكى هەبێت، ئەوا هەر دەبێت پەيوەندييەكى تۆكمەى لەگەڵ ئەواندا هەبێت، جا ئەگەر هۆكارێكى دەرەكى هات. ئەو كاتە تەنها كارى بەخەبەر هێنان و جوڵاندنى فيكرەكەيە نەوەك دروستكردنى.

هۆكارە ناوەخۆييەكان، هۆكارى سەرەكى و يەكەمن، لە سەرهەڵدانى مەزهەبە ئيسلاميەكان، هۆكارە دەرەكيەكانيش هۆكارى لاوەكى و پاشكۆن[1].

---

[1] ئەوەى لەبارەى هۆكارى ڕاجيايى موسڵمانان لەبوارى بيروباوەڕدا نووسيويەتى: شێخ ئەبو زەهرەيە لە كتێبى: تأريخ المذاهب الإسلامية ١٣ و لاپەڕەكانى دواترى.

### فەرموودەی پەرتەوازەبوونی ئوممەت:

چەندین فەرموودەی جیاواز لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) هاتوون، سەبارەت بەوەی ئوممەتی ئیسلام بۆ چەندین پێڕو دەستە پەرت و دابەش دەبن، نمونەی ئەم فەرمایشتانەش:

١- پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) خوا دەفەرمووێت: **(تفرقت اليهود على إحدى وسبعين أو إثنين وسبعين فرقة، والنصارى مثل ذلك، و تفترق أمتي على ثلاث و سبعين فرقة)**[2] واتە: جولەکەکان پەرتەوازە بوون بۆ حەفتاو یەك یان حەفتاو دوو

---

[1] دراسات في الفرق ٧-١٧.

[2] فەرموودەی: جولەکەکان پەرتەوازە بوون بۆ حەفتاو یەك..... تاد، لەم سەرچاوانەدا هاتووە: سنن الترمذي في: ٣٨ كتاب الإيمان، ١٨ باب ما جاء في إفتراق هذه الأمة، رقم ٢٦٤٥، عن أبي هريرة./ عارضة الأحوذي بشرح صحيح الترمذي لابن العربي ١٠/١٠٨-١٠٩. قال الترمذي: حديث أبي هريرة حديث حسن صحيح، قال: وفي الباب عن سعد و عبدالله بن عمرو وعوف بن مالك.

ونحو هذا اللفظ في سنن أبي داود في: كتاب السنة، باب شرح السنة، عن أبي هريرة./ بذل المجهود في حل أبي داود ١٨/١١٦. وفي سنن ابن ماجه في: كتاب الفتن، ١٧ باب افتراق الأمم، رقم ٣٩٩١، عن أبي هريرة./ سنن ابن ماجة بشرح السندي ٤/٣٥٢. وفي مسند الإمام أحمد، رقم ٨٣٩٦، ١٤/١٢٤، عن أبي هريرة. طبعه مؤسسة الرسالة، قال محققه الشيخ شعيب: إسناده حسن، وذكره هؤلاء المخرجين و غيرهم.

وأورده المقريزي في الخطط ٢/٣٤٥ بنحو هذ اللفظ و قال: (أخرجه أبو داود والترمذي و إبن ماجة من حديث أبي هريرة، قال البيهقي: حسن صحيح. وأخرجه الحاكم وإبن حبان في صحيحه بنحوه، فأخرجه في المستدرك من طريق الفضل بن موسى عن محمد بن عمرو عن أبي سلمة عن أبي هريرة به، قال: هذا حديث كثير في الأصوا، و قد روي عن سعد بن أبي وقاص و عبد الله بن عمر و عوف بن مالك عن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) بمثله. وقد إحتج مسلم بمحمد بن عمرو عن أبي سلمة عن أبي هريرة، وإتفقا جميعاً على الإحتجاج بالفضل بن موسى وهو ثقة).

والحديث في الجامع الصغير، رقم ١٢٢٣ قال السيوطي: رواه أبو داود والنسائي والترمذي وإبن ماجة عن أبي هريرة، وصححه./ فيض القدير ٢/٢٠، قال المناوي: (وكذا الحاكم والبيهقي عن أبي هريرة. قال الزين العراقي: في أسانيده جياد، ورواه الحاكم من عدة طرق، ثم قال: هذه الأسانيد تقوم به الحجة، وعده المؤلف من التواتر).

تاقم، نەصرانیەکانیش بەهەمان شێوە، ئوممەتیشم پەرتەوازە دەبێت بۆ حەفتاو سێ تاقم).

ئەم بەشە لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم): (**على إحدى وسبعين أو إثنين وسبعين فرقة**) واتە: بۆ حەفتاو یەك یان حەفتاو دوو تاقم. گێڕەرەوەکە گومانی هەبووە لەوەی کامەیانە بۆیە هەر دووکیانی وتووە، هەروەها لە فەرموودەی (عەبدوڵای کوڕی عەمر) کە ئێستا دەیخەینەڕوو: (حەفتاو دوو تاقم) بەبێ گومان هاتووە [1].

٢- پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (**... وإن بني إسرائيل تفرقت على ثنتين وسبعين ملة، وتفترق أمتي على ثلاث و سبعين ملة، كلهم في النار إلا واحدة. قالوا: ومن هي يا رسول الله؟ قال: ما أنا عليه وأصحابي**) واتە: نەوەی ئیسرائیل پەرتەوازە بوون بۆ حەفتاو دوو تاقم، ئوممەتەکەشم پەرتەوازە دەبێت بۆ حەفتاو سێ تاقم، هەر هەموو تاقمەکان دەچنە دۆزەخەوە، تەنها یەکێکیان نەبێت. وتیان: ئەو تاقمەی ڕزگاربووە کامەیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەو تاقمەیە، کە لەسەر ڕێبازی من و هاوەڵانی منن [2].

---

وذكره البغدادي في: الفرق بين الفرق، بسنده، بلفظ مقارب.

[1] تحفة الأحوذي للمباركفوري ٣/٣٦٧.

[2] فەرموودەی: نەوەی ئیسرائیل پەرتەوازە بوون بۆ حەفتاو دوو تاقم.... تاد، لەم سەرچاوانەدا هاتووە: سنن الترمذي في: ٣٨ كتاب الإيمان، ١٨ باب ما جاء في إفتراق هذه الأمة، رقم ٢٦٤٦، عن عبدالله بن عمرو. قال الترمذي: هذا حديث مفسر غريب لا نعرفه مثل هذا إلا من هذا الوجه./ عارضة الأحوذي ١٠/١٠٩-١١٠.

والحديث في جامع الصغير، رقم ٧٥٣٢، قال السيوطي: رواه الترمذي عن إبن عمرو، وضعفه./ فيض القدير ٥/٣٤٧ وفيه: (قال الصدر المناوي: فيه عبدالرحمن بن زياد الإفريقي، قال الذهبي: ضعفوه).

واعتمد هذا الحديث بعض كُتاب الفرق الإسلامية، و ذكروه بألفاظ مقاربة لهذا الحديث مثل: الملطي في التنبيه والرد ١٢، والبغدادي في الفرق بين الفرق ٦ بسنده، الإسفراييني في التبصير في الدين ١٤، والشهرستاني في الملل و النحل ١/٥، والشيخ عبدالقادر في الغنية ١/٩٤، والإيجي في المواقف

فـەرموودەی پەرتـەوازەبوونی ئوممـەت، چـەندین سـەنەد و زنجـیرەی هـەن کـە لـە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) هاتوون[1].

---

٣٧٦/٨، والمقريزي في الخطط ٣٤٥/٢، والسفاريني في لوامع الأنوار البهية ٩٢/١ و نقل عن ابن تيمية، وذكر رواته من الصحابة.

وذكر ابن المرتضى في المنية والأمل ٧٩: (في الأثر عنه (صلى الله عليه وسلم) أنه قال: إفترقت أمة موسى على إحدى وسبعين فرقة كلها هالكة إلا واحدة وهي الناجية، وإفترقت أمة أخي عيسى على اثنتين وسبعين فرقة كلها هالكة إلا فرقة واحدة، وستفترق أمتي إلى ثلاث وسبعين فرقة كلها هالكة إلا واحدة. رواه عبدالله بن مسعود وأنس وعبدالله بن عباس. قال الإمام يحيى: وتلقته الأمة بالقبول) وانظر ١٨ أيضا.

[1] ئەمانە لە گێڕەرەوەکانی ئەم فەرموودەیەن:

أنس بن مالك، في سنن إبن ماجة، في: كتاب الفتن، ١٧ باب إفتراق الأمم، رقم ٣٩٩٣./ سنن ابن ماجة بشرح السندي ٣٥٣/٤. ومسند أحمد رقم ١٢٢٠٨، ٢٤١/١٩. رقم ١٢٤٧٩، ٤٦٢/١٩ طبعة الرسالة. وقال الشيخ شعيب محقق المسند عن كل منها: صحيح بشواهده، وذكر أن إسناد كل منهما ضعيف، وخرجهما. وذكره البغدادي في الفرق بين الفرق ٧ بسنده.

وعوف بن مالك في سنن ابن ماجة، الباب السابق رقم ٣٩٩٢.

ومعاوية بن أبي سفيان، في سنن أبي داود، الباب السابق.

قال البغدادي: (رواه عن النبي (صلى الله عليه وسلم) جماعة من الصحابة: كأنس بن مالك، وأبي هريرة، وأبي الدرداء، وجابر، وأبي سعيد الخدري، وأبي بن كعب، وعبدالله بن عمرو بن عاص، وأبي أمامة، و واثلة بن الأسقع. وغيرهم. وقد روي عن الخلفاء الراشدين أنهم ذكروا إفتراق الأمة بعدهم فرقا، وذكروا أن الفرقة الناجية منها واحدة، وسائرها على ضلال في الدنيا والبوار في الآخرة)./ الفرق بين الفرق ٨-٩.

ورواه جابر بن زيد عن ابن عباس عن النبي (صلى الله عليه وسلم) قال: ستفترق أمتي على ثلاث وسبعين فرقة كلهم إلى النار ما خلا واحدة ناجية، وكلهم يدعي تلك الواحدة./ الجامع الصغير مسند الربيع بن حبيب - شرح السالمي ٦٧/١ و فيه تخريجه. وفي شرح الترتيب لمحمد بن عمر ٦٣/١: حديث مشهور في كثير من كتب أصحابنا (أي: الإباضية) وغيرهم.

وعن علي عليه السلام قال: قال رسول الله صلى الله عليه وآله: ستفترق أمتي على ثلاث وسبعين فرقة، فرقة منها ناجية، والباقون عالكون، والناجون يتمسكون بولايتكم، ويقتبسون من علمكم، ولا يعملون برأيهم، فأؤلئك ما عليهم من سبيل./ تفصيل وسائل الشيعة (آل البيت) للحر العاملي ٥٠/١٧ رقم ٣٣١٨١، و (الإسلامية) ٣١/١٨ رقم ٣٣١٦٥.

سەرباری ئەوەی کە هەندێك ئەم فەرمووودەیان بەلاواز داناوە[1]، کەچی هەندێك ئەم فەرموودەیان بە ڕاست (صحیح) یاخود بە چاك (حسن) داناوە، هەروەك خرایەڕوو، هەندێکیش گێڕانەوە زۆرەکانی ئەم فەرموودەیان بە هۆکارێك داناوە لە لادانی گومان لەسەر فەرموودەکە، (موقبەلی) وتویەتی: (فەرموودەی پەرتەوازە بوونی ئوممەت بۆ حەفتاو سێ تاقم، گێڕانەوەکانی زۆرن، پشتی یەکتر دەگرن، بەجۆرێك کە گومان نامێنێت لە هەمبەر دەرەنجامی واتاکەی)[2].

هەروەها پێشەوا یەحیا وتویەتی: (ئوممەت ئەم فەرموودەیەی قبوڵ کردووە)[3].

لەبارەی تەفسیری وشەی (الملة) کە لە فەرموودەکەدا هاتووە، دوو قسە هەن:

١- لە بنچینەدا بریتییە لەوەی خوای گەورە لەسەر زمانی پێغەمبەرانی وەك شەریعەت و پەیام بۆ بەندەکانی ناردووە، تا بەهۆیەوە نزیك ببنەوە لە بارەگای پەروەردگار، دواتر وشەی (الملة) فراوان بوو بەکارهێنرا بۆ ئوممەتە بێ باوەڕو باوەڕ پوچەکان، دەووترا: کوفر هەمووی یەك میللەت و تاقمە. واتای فەرموودەکەش ئەوەیە: بۆ چەندین تاقم دابەش دەبن و هەر یەکەیان بەندایەتی بەپێچەوانەی ئەوەی

---

[1] وەك: الشيخ القرضاوي في الفتاوى المعاصرة ٧٦/٣ و توانج لێدانەکەی (ابن وزیر) بە گەواهی هێناوەتەوە کە لە فەرموودەکەی داوە لە کتێبەکەیدا (العواصم والقواصم ١٨٦/١)، و بەوەی کە (ابن حزم) لە: (الفصل ٢٩٢/٣) ئەم فەرموودەیەی بە لاواز داناوە.
جا (مەولا حەسەنی جیبلی) لە (حاشیته علی المواقف ٣٧٥/٨)دا وتویەتی: (هەندێك توانجیان داوە، لە دروست و ڕاستی ئەم هەواڵە، جا دەڵێت: ئەگەر مەبەستی لە حەفتاو دوو تاقم بێت لە بنەماکانی ئایینەکاندا، ئەوا ناگات بەو ڕێژەیە، ئەگەر مەبەستیشی لە لایەنی لاوەکیەکان "فروع" بێت، ئەوا لە ژمارەی ناوبراو تێپەڕ دەکات، بۆ چەندانی زیاتر. ئیمامی ڕازی وەڵامی داوەتەوە: بەوەی ئوممەتەکەم لە بارێك لە بارەکاندا پەرتەوازە دەبێت، لەم فەرموودەیەدا ئاماژە نیە بۆ ئەوەی کە لە هەموو بارودۆخەکاندا ئوممەت هەر پەرتەوازە دەبێت بەشێوەیەك کە کەم و زیاتر نەبێت لە ژمارەی دیاریکراو).

[2] تأريخ المذاهب الإسلامية لأبي زهرة ١١ نقلا عن العلم الشامخ المقبلي.

[3] الملل والنحل وشرحه المنية والأمل لإبن المرتضى ١٨-٧٩.

تر دەکات، بۆیە وەك بە خوازراو (مجاز)ی ناودەبرێن بە (الملة)[1].

٢- وتراوە: (الملـة) بریتییە لە هەر گوفتارو کردارێك ڕاست بێت یان هەڵـە و پـوچ کـە کۆمەڵێك لەسەری کۆ ببنەوە[2].

فەرموودە پیرۆزەکەش ئەو واتایە بەدەستەوە دەدات: نەوەی ئیسرائیل بـۆ حـەفتاو دوو تـاقم، پەرتـەوازە بـوون، بەهـەمان شـێوە ئوممـەتی موحەممـەدیش (صلى الله عليه وسلم) پەرتەوازە دەبێت، بەڵام لە ئەنجامدانی بیدعەکارییدا پلەیەك لەوان زیاتر دەبێت[3].

مەبەست لە (ئوممەت) ئوممەتی وەڵامگۆیە[4]، کە بریتین لە ئەهلی قیبلە، چونکە نـاوی ئوممەت کە دەدرێتە پاڵ موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) ئەوا ڕاستەوخۆ ئوممەتی وەڵـامگۆی لێدەخوازرێتەوە[5].

بەم پێیەش حەفتاو سێ تاقمەکە کورت هەڵدێت لە ئەهلی قیبلەکەماندا[6].

لەبارەی تەفسیرو شرۆڤەکردنی حەفتاو سێ تاقمەکەش ڕاجیاییان هەبووە:

١- بریتییە لە ڕێژەی بنەمای مەزهەبەکان[1].

---

[1] فيض القدير ٣٤٧/٥. وهو في شرح الطيبي على المشكاة ٦٤٠/٢. سەیری ئەمانە ش بکە: مرقاة المفاتيح ٤١٨/١ و تحفة الأحوذي ٣٦٨/٣ ونقل عن المرقاة.

[2] المرقاة المفاتيح للقاري، سەرچاوەی پێشوو.

[3] المرقاة المفاتيح للقاري، سەرچاوەی پێشوو.

[4] فيض القدير ٣٤٧/٥ و مرقاة المفاتيح ٤١٨/١ و شرح سنن ابن ماجه للسندي ٣٥٢/٤ و بذل الجهود في حل أبي داود للسهارنفوري ١١٧/١٨.

(قاری) ئەوەی خستووەتەڕوو کە تەفسیر کردنی وشەی (ئوممەت) بە (ئوممەتی وەڵامدەرەوە: أمة الإجابة) تەفسیرو شیکردنەوەی هەرە دیارو پەسەندەکەیە، و لە (ئەبهەری)ەوە هێناویەتی کە ئەو تەفسیرە لەلایەن زۆرینەوە کراوە./ مرقاة المفاتيح، سەرجاوەی پێشوو.

وتراوە: مەبەست لە ئوممەت ئوممەتی بانگەوازە، بەمەش سەرجەم ئوممەت و خاوەن بانگەوازەکانی تر کە لەسەر قیبلەو ڕووگەی ئێمە نین لەژێر ژمارەی حەفتاو سێیەیەکە ڕیز دەبن./ فيض القدير، و مرقاة المفاتيح، هەردوو سەرچاوەکەی پێشوو. هەروەها (مەناوی) ئەمەی لە (قازی) وەرگرتووە.

[5] شرح سنن ابن ماجة، سەرچاوەی پێشوو.

[6] مرقاة المفاتيح، سەرچاوەی پێشوو. و سەیری ئەمە بکە: فيض القدير، سەرچاوەی پێشوو.

٢- بریتییە لەو ڕێژەیەی کە بنەمای ئەم مەزهەبانە لە کاتێك لە کاتەکان بۆ ئەو ڕێژەیە هەڵکشاون، ئەگەرچی زۆربەی کاتیش زیادو کەمیان دەکردو ئەو ڕێژەیە جێگر نەبووە[٢].

٣- ئەو ڕێژە وەك زۆرینە وەردەگیرێت[٣].

هەروەها ڕاجیاییان هەیە لەبارەی تەواو پێگەیشتن و کامڵ بوونی ئەو حەفتاو سێ تاقمە:

هەندێکیان وتوویانە: ئەم ڕێژەیە لە تاقمە بیدعەچی و هەوەسبازانە، هێشتان تەواو پێنەگەیشتوون و کامڵ نەبوون، بەڵکو تەنها هەندێکیان پەیدابوون، بەر لە هاتنی ڕۆژی دوایی، ئەوا هەموویان پەیدا دەبن، چونکە هەر شتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەواڵی لەبارەوە دابێت، ئەوا بەبێ گومان دێتەجێ.

هەندێکی تریان وتویانە: تەواوی ئەو تاقمانە لە بازنەی ئیسلام پەیدابوونە، پێویستیشە لەسەر موسڵمان، بیروباوەڕی خۆی جیا بکاتەوە، لە بیروباوەڕە پوچەڵەکەی ئەوان. ژمارەکەشیان وەك ئەوەیە کە لەو کتێبانەدا هاتووە کە نووسراون لەبارەی تاقمەکانەوە[٤].

پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) ئەوەی ڕوونکردۆتەوە کە هەموو ئەو تاقمانە دەچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە،بەهۆی کارە ناشرین و بیدعەکانیان، تەنها تاقمە ڕزگار بووەکەی لەو تاقمانە جیاکردۆتەوە، بەناوی کۆمەڵ (جماعة) باسی کردووە، هەروەك لەمانەدا هاتووە: سنن أبی داود، و ابن ماجة و مسند أحمد. هەروەها لە: سنن الترمذي (ئەوانەن کە لەسەر ڕێبازی من و هاوەڵانی منن).

کۆمەڵ (جماعە)تیش بە چەند ڕاڤەیەکی بۆ کراوە: ئەهلی سوننە و جەماعەت[٥]. یان:

---

[١] فيض القدير ٢/٢٠ عن المحقق الدواني، وبذل المجهود ١١٧/١٨.

[٢] فيض القدير، سەرچاوەی پێشوو.

[٣] بذل المجهود، سەرچاوەی پێشوو.

[٤] التبصير في الدين ١٥ وفيض القدير ٣٤٧/٥.

[٥] فيض القدير ٢/٢٠ ومرقاة المفاتيح ٤١٩/١ و ب١ المجهود ١١٨/١٨.

ئەوانەن کە کۆکن لەگەڵ کۆمەڵەی هاوەڵان، بیروباوەڕی ئەوانیان وەرگرتووە، دەستیان بە ڕاوبۆچوونی ئەوانەوە تووند گرتووە[1]، شوێن پێی ئەوانیان هەڵگرتووە، بەپێی ڕێنمایی ئەوان هەنگاو دەنێنن چ لە بابەتە بنەڕەتییەکان چ لە بابەتە لاوەکیەکاندا[2]، ئەمانەش بریتین لە زانایان و شەرعناسان کە کۆبوونەوە لەسەر شوێنکەوتنی شوێنەوارەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەگەر ئەو شوێنەوارە زۆر ورد و بچوکیش بێت وەك خاڵێکی سەر پشتی ناوکی خورما، لێکدانەوەی نابەجێ و گۆڕانکاری بیدعەئامێز ناکەن[3].

ئا ئەمەیە کە ئەهلی سوننە، جیا دەکاتەوە لە تاقمە بیدعەچیەکانی تر، چونکە هەر تاقمێکی بیدعەچی پێی وایە ئەو تاقمی ڕزگاربووەو ئەوانی تریش تیاچوون[4].

ئەو پەرتەوازەبوونەی کە لە فەرموودە پیرۆزەکەدا سەرزەنشتی کراوە، بریتیە لە پەرتەوازە بوون لە بنەماکانی ئایین و بیروباوەڕدا، واتە: پەرتەوازەبوون لەم سێ بنەمایەدا: خواناسی و پێغەمبەرایەتی و ڕۆژی دوایی.

پەرتەوازە بوون و ڕاجیایی لە بابەتە لاوەکیەکانی فیقهی و بابەتە ئیجتهادییەکان و مەسەلە فیقهیەکان، ئەوا خۆی لە خۆیدا ڕەحمەت و میهرەبانی خواییە، هەر ئەمەشە مەبەستی ئەو دەقەی دراوەتە پاڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم): (ڕاجیایی ئوممەتم ڕەحمەتە)[5]، چونکە موجتەهیدەکان کە ڕاجیاوازن لە حوکمە لاوەکیەکان ئەوا دابەش بوون

---

[1] شرح سنن ابن ماجة للسندي ٣٥٣/٤.

[2] فيض القدير ٢١/٢ و ٣٤٧/٥. و سەیری ئەمەش بکە: مرقاة المفاتيح، سەرچاوەی پێشوو.

[3] مرقاة المفاتيح ٤٢٠/١.

[4] فيض القدير ٢٠-٢١.

[5] بڕوانە: الفرق بين الفرق ١٠ وفيض الفرق ٢٠/٢ و ٣٤٧/٥ وبذل المجهود ١١٧/١٨ وشرح سنن ابن ماجة للسندي ٣٥٢/٤.

فەرموودەی: ڕاجیایی ئوممەتم ڕەحمەتە: سیوطي وتویەتی لە: الجامع الصغير: ئەمانە گێڕاویانەتەوە: (نصر المقدسي في الحجة، والبيهيقي في الرسالة الأشعرية بغير سند، وأورده الحليمي والقاضي حسين وإمام الحرمين و غيرهم، ولعله أخرجه في بعض كتب الحفاظ التي لم تصل إلينا). سەیری ئەم

بۆ دوو بۆچوون:

١- بۆچوونی یەکەم پێی وایە کە هەموو موجتەهیدەکان بە ڕاستپێك دابنێیت لە بابەتە لاوەکیەکانی فیقهدا، مەزهەبە فیقهییەکان هەموویان ڕاستیان پێکاوە.

٢- بە ڕاستدانانی یەکێك لە موجتەهیدەکان لە هەر بابەتێکی لاوەکیدا، بەهەڵەدانانی ئەوانی تر بەبێ ئەوەی بە گومڕا دابنرێن یان تەکفیر بکرێن[١].

سەرچاوانە بکە کە لەبارەی ئەم فەرموودەوە دوواون: فیض القدیر شرح الجامع الصغیر ١/٢٠٩ رقم ٢٨٨ و کشف الخفا والإلباس للعجلوني ١ رقم ١٥٣.

[١] الفرق بین الفرق، سەرچاوەی پێشوو.

بابەتی بە ڕاست یان بە هەڵدانانی موجتەهید، بەتێرو تەسەلی لە کتێبەکانی بنەماکانی فیقهدا خراوەتەڕوو، پوختەکەشی ئەمەیە:

ئەو شتانەی ئیجتهادیان تێدا دەکرێت دوو شتن: یان ئەوەتا عەقڵیە یان شەرعییە.

**یەکەم**: ئەگەر ئیجتهادەکە لە شتێکی عەقڵیدا بوو (واتە: لە بنەماکانی ئایین بوو)، ئەوا دوو بۆچوون هەن:

١- تەنها یەکێك ڕاست دەپێکێت و جگەلەویش هەڵەیان پێکردووە. ئەمە ڕای زۆربەی زانایانە. جا ئەگەر ئیجتهادەکەی سەری کێشا بۆ شتێکی پێچەوانەی ئایینی ئیسلام ئەوا ئەو کاتە گوناهبارو کافرە، ئەگەرنا بیدعەچییەکی لاسارە.

٢- هەموو ئەوانەی ئیجتهاد لە بابەتە عەقڵیەکان دەکەن ڕاسپێکن. ئەمە ڕای (جاحز) و (عوبەیدوڵای کوڕی حەسەنی عەنبەری)یە. هیچ گوناهێك لەسەر ئەو کەسە نیە، کە ئیجتهاد لە بابەتە عەقڵیەکاندا دەکات، مادام نەگاتە پلەی سەرکەشی، چونکە ئەوەندەی لە توانای دابوو خەرجی کردووەو بۆ ئەمە پاساوی هەیە.

**دووەم**: ئەگەر کۆشش (ئیجتهاد) بکات لە بابەتێکی فیقهی شەرعی، ئەوا ئەو بابەتە یان حوکمی بڕاوەی لەبارەوە هاتووە یاخود حوکمەکەی نەبڕاوەو یەکلا نەبووەوەیە:

ئەگەر بابەتەکە یەکلابووەوە بێت، وەك پێویست بوونی نوێژو زەکات و حەرام بوونی زینا و دزی.... ئیجتهاد لەم جۆرە بابەتانەدا دروست نیە، چونکە ئەو شتانە زانینیان بەپێویست زانراوە لە ئایینداو، جا ئەوەی هەڵە لەو بابەتانەدا بکات گوناهبارە، ئەوەش کە نکۆڵی لێ بکات کافرە.

ئەگەر بابەتەکە بڕاوەو یەکلابووەوە نەبێت، ئەوا زانایان کۆکن لەسەر دروستی ئیجتهاد کردن تیایدا، بەڵام ڕایان جیاوازە لەوەی ئایا هەموو ئیجتیهادکارێك ڕاستپێکە یاخود تەنها یەکێکیان ڕاستپێکن؟

## دەروازەی دووەم

## گرنگترین مەزهەبە ئیسلامییەکان

## لە بواری بیروباوەڕدا

لەم دەروازەیەدا ڕوونکردنەوە دەدرێت لەبارەی گرنگترین مەزهەبە ئیسلامیەکان لە بواری بیروباوەڕدا، کە مێژوونووسانی ئەم بوارە بە تاقمە ئیسلامیەکان ناویان بردوون، کە بریتین لەمانە:

خەواریج، ئیبازی، شیعە، مورجیئە، قەدەری، جەبری، موعتەزیلە، ماتوریدی، ئەشعەری، سەلەفیەکان.

---

سەرچاوەی ڕاجیاییەکەش ئەوەیە کە ئایا خوای گەورە لەبارەی هەر بابەتێك حوکمێکی دیاریکراوی داناوە بەر لەوەی موجتەهید ئیجتیهاد بکات یان حوکمێکی دیاریکراو نییە، بەڵکو حوکم ئەوەیە کە موجتەهید بە ئیجتهادی خۆی پێی گەیشتووە؟ لەمبارەوە دوو بۆچوون هەن:

١- خوای گەورە حوکمێکی دیاریکراوی هەیە، لەبارەی هەر بابەتێك بەر لەوەی موجتەهید ئیجتهاد بکات، هەر کەسێك بە ئیجتهادی خۆی ئەو حوکمە بپێکێت ئەوا ڕاستی پێکاوە، هەرچیش نەیپێکێت ئەوا هەڵەپێکە، بەم پێیەش هەموو موجتەهیدێك ڕاستپێك نییە. ئەمە ڕای زۆربەی زانایانە، ئەمە ڕای ناسرەوەو هاتووە لە چوار پێشەواکە.

٢-خوای گەورە هیچ حوکمێکی دیاریکراوی نییە لەبارەی هیچ بابەتێك بەرلەوەی ئیجتهادی لەبارەوە بکرێت، بەڵکو حوکمی خوا ئەوەیە کە هەر موجتەهیدێك بە ئیجتهادەکەی پێی دەگات، بەم پێیەش هەر موجتەهیدێك ڕاستپێکە. ئەمە ڕای (باقلانی و (ئەبو عەلی جوبائی و کوڕەکەی ئەبو هاشمە)./ سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە: أصول الفقه لمحمد أبو النور زهير ٤/١٩٨-١٩٩ بەڵگەکانیش تیایدا خراونەتەڕوو.

## خەواریج (الخوارج)

ئەوانەن كە دەرچوون دژی ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) و لێی یاخی بوون پاش ئەوەی ئیمام ناوبژیوانیەكەی قبوڵكرد لە ڕووداوەكەی (صەففین).

### ناوەكانی ئەم تاقمە:

ئەمانە چەندین ناویان هەن، هەندێك لەو ناوانە:

١- خەواریج: كۆی (خارج: دەرچووە)، دەرچوو و یاخی كەسێكە لە گوێڕایەڵی ئیمامی ڕاست و دروست دەرچووەو یاخی بوونی خۆی بۆ ئەو ئیمامە ڕاگەیاندووە، شەرعناسان كەسی یاخی بوو لە گوێڕایەڵی ئیمام بە: (باغی) ناودەبەن كۆیەكەشی بریتییە لە (البغاة: یاخیبوان)[1]، بەڵام ڕاجیان لەبارەی هۆكاری ناونانی خەواریجەكان بەوناوە:

خەواریجەكان دەڵێن: هۆكاری ئەم ناونانە بریتییە لە دەرچوونیان لە پێناوی خوا، لەبەر ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە:﴿ وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً ۚ وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾النساء: ١٠٠.[2] واتە: (هەر كەسێكیش ماڵ و حاڵی خۆی بەجێ بهێڵێت و لە پێناو خواو پێغەمبەرەكەیدا كۆچ بكات، پاشان مردن یەخەی پێبگرێت، ئەوە ئیتر ئەو كەسە پاداشتەكەی كەوتۆتە سەر خوا، خوا هەمیشە و بەردەوام لێخۆشبوو مهیرەبانە).

یان بۆیە ئەو ناوەیان لێنراوە، چونكە یاخی بوون لە ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای

---

(١) تعليق محمد محيي الدين عبدالحميد على مقالات الإسلاميين للأشعري ١٦٨/١ و تعليقه على الفرق بين الفرق للبغدادي ٧٢. وسەیری ئەمەش بكە: الملل و النحل للشهرستاني ١٠٥/١ و شرح الحور العين ٢٥٤.

(٢) دراسات الفرق ٨٩.

لێبێت)و دژایەتیان كرد[1].

جگە لە خەواریجەكان وتویانە: بۆیە ئەو ناوەیان لێنـراوە، چـونكە دەرچـوون لـە دژی خەڵك یان ئایین یاخود ڕاستی[2].

٢- حەروریە (الحروریـة): وەك ئاماژەو دانەپاڵیان بۆ ناوچەی حەڕوریە، كە لادێیەكـە لـە پشت شاری كوفە، كە خەواریجەكان دوای گەڕانەوەیان لـە جـەنگی (صـەففین) لـەوێ كۆبوونەوە[3].

٣- شراة: كۆیە، تاكەكەی (شار)ە، كە لە (شراء: فرۆشتنەوە)ەوە هـاتووە، وەك: قضـاة، كە كۆیە، تاكەكەشی (قاض)یە، گومانیان وابوو كە بۆیە ئەو ناوەیان لـە خـۆ نـاوە، چونكە ئەوان گیانی خۆیان فرۆشتووەتە خوای گەورەی لەسەر ئەوەی بەهەشـتیان پـێ بدرێت، بۆ ئەمەش ئاماژە دەكەن بۆ ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە:﴿ إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ ﴾ التوبة: ١١١.[4] واتە: (بەڕاستی خوا، گیان و مـاڵی لـە

---

[1] مقالات الإسلامیین ٦٤/١ و٢٠٧ وشرح الحور العین، سەرچاوەی پێشوو. وتاج العروس مادة (خرج)، والغنیة للشیخ عبدالقادر ٩٦/١ باسی نازناو و ئاراستەكانی خەواریجی باس كردووە.

[2] تاج العروس، سەرچاوەی پێشوو. و دراسات في الفرق، سەرچاوەی پێشوو وەریگرتووە لە: ابن منظور و الزبیدي.

[3] مقالات الإسلامیین ٢٠٧/١ والفرق بین الفرق ٧٥ وشرح الحور العین ٢٥٤ وخطط المقریـزي ٣٥٤/٢ والمنیة والأمل ١٠٤.

[4] تعلیق محمد محیي الدین عبد الحمید على المقالات الإسلامیین للأشعري ١٦٨/١. و تعلیـل التسـمیة في: مقالات الإسلامیین للأشعري ٢٠٧/١ وشرح الحور العین ٢٥٤ والمنیة والأمل ١٠٤.
غەیری خەواریجەكان ئەم ناوەیان بەوە شیكردۆتەوە: كە لە (شـری و الشـر)ەوە هـاتووە كـە لـە - بابی: رضـي -ەیە بەواتای كەڵەكە بوون و خڕبوونەوە سەریەك دێت. یـان بـەمانای (شـري الرجـل) دێت وەك (رضي) واتە تووڕە بوو./ تعلیق محمد محیي الدین، سەرچاوەی پێشوو، وأشار الی الصحاح الجوهري.

ئیمانداران کرپوه بەوەی کە بەهەشت بۆ ئەوانەو بەشیانە، ئەوانە دەجەنگن لە پێناوی ئایینی خوادا، دوژمنانی ئایینی خوا دەکوژن "لە گۆڕەپانی جەنگدا" یان دەکوژرێن "شەهید دەکرێن").

٤- نەواصب: کۆی (ناصب)ە یان (ناصیبی)ە، ئەوانەن کە زیادەڕۆچوون لە بوغزاندنی ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) [١].

٥- موحەکیمە (المحكمة): بۆیە بەو ناوەوە ناونراون، چونکە نکۆڵیان کرد لە دادوەرییەکەی ڕووداوی (صفین) و بەناپەسەندیان زانی، وتیان: حوکم تەنها بۆ خوایە [٢].

٦- مارقە (المارقة) [٣]: واتە لە ئایین دەرچوان، بەهۆی ئەم فەرموودەیە: (**يمرقون من الدين مروق السهم من الرمية**) واتە: لە ئایین دەردەچن وەك چۆن تیر لە کەوانە دەردەچێت.

بەڵام خەواریجەکان بەو ناونانە ڕازی نین، چونکە وادەزانن تەنها ئەوان خۆیان باوەڕدارن، دژەکانیان هاوبەشدانەرو بێ باوەڕن [٤].

٧- هەندێك ناوی تر کە خەواریجەکان بۆ خۆیان دەستنیشانیان کردووە: موسڵمانان، کۆمەڵەی موسڵمانان، بانگەوازخوازان، ئەهلی حەق، خۆڕاگران [٥].

---

[١] خطط المقريزي ٣٥٤/٢ وتعليق محمد محيي الدين، سەرچاوەی پێشوو، وأشار إلى خطط المقريزي. وتعليقه على الفرق بين الفرق للبغدادي ٧٢.

[٢] مقالات الإسلاميين ٢٠٧/١ و شرح الحور العين، سەرچاوەی پێشوو ٢٥٥ و المنية و الأمل، سەرچاوەی پێشوو.

[٣] مقالات الإسلاميين، سەرچاوەی پێشوو، والملل والنحل للشهرستاني ١٠٧/١. وشرح الحور العين، والمنية والأمل، هەردوو سەرچاوەکەی پێشوو، و تعليق محمد محيي الدين على الفرق بين الفرق للبغدادي ٧٢.

[٤] مقالات الإسلاميين، والملل والنحل للشهرستاني، وشرح الحور العين، والمنية والأمل، سەرچاوەکانی پێشوو، و تأريخ الفرق الإسلامية للغرابي ٢٦٥. پاش کەمێکی تر بەتەواوی بابەتی دەرچوون (مروق) دەخرێتەڕوو.

[٥] البعد الحضاري ٥٦.

## ڕاو بۆچوونەکانیان:

سەرجەم خەواریجەکان ئەم ڕایانە پەسەند دەکەن:

١- تەکفیر کردنی عەلی و عوسمان و هاوەڵانی وشتر (أصحاب الجمل)، ئەوانەی کە ڕازی بوون بە دادوەرییەکە و هەردوو دادوەرەکە، یاخود یەکێکیانی بە ڕاست دادەنا[1].

سەرجەم خەواریجەکان دان دەنێن بە ئیمامەتی (ئەبو بەکرو عومەر)، نکۆڵی دەکەن لە ئیمامەتی (عوسمان) لە کاتی ئەو ڕووداوانەی کە لەو پێناوەدا تیاچوو، واتە: دوای شەش ساڵ لە حوکمڕانیەکەی، دان بە ئیمامەتی عەلی دادەنێن بەر لەوەی ڕازی بێت بە دادوەرییەکە و لەدوای دادوەرییەکەوە تەکفیری دەکەن.

٢- ئیمامەت تەنها لە قوڕەیش کورت هەڵنەهاتووە، بەڵکو خەڵکی غەیرە قوڕەیشیش دەکرێت ببێتە ئیمام ئەگەر شیاو بێت.

٣- قورئان بەدیهێنراوە[2].

---

[1] الفرق بين الفرق ٧٣ و التبصير في الدين ٣٨. سەیری ئەمانەش بکە: مقالات الإسلاميين ١٦٧/١ و الملل و النحل للشهرستاني ١٠٧/١ و إعتقادات فرق المسلمين ٥١ و البدء و التأريخ ١٣٥/٥ و المنية و الأمل ١٠٤.

ئەوەی تێبینی دەکرێت کە (ئیبازیەکان) ڕایەکی جیاواز لەو ڕایەیان هەیە، کەمێکی تر دەخرێتەڕوو.

زۆربەی خەواریجەکان وتیان: هەر کەسێ سەرپێچی خوای گەورە بکات و تاوان ئەنجام بدات، ئەوا کوفری کردووە، بەمەش دەبێتە کافر، حوکمەکەیشی مانەوەی هەتا هەتاییە لە ئاگری دۆزەخ، جا ئەو تاوان و سەرپێچیە گەورە یان بچوك بێت، هەیانە دەڵێت کافر نییە بەڵکو هاوبەش دانەرە. لە (نەجدەی حەنەفی) خاوەنی ڕەوتی (نەجدات) گێڕدراوەتەوە، ئەوەی تاوانی گەورە دەکات بۆ هەتا هەتا لە ئاگری دۆزەخدا نابێت بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت هەر سزا بدرێت، بە ئەندازەی ئەو تاوانەی و دروست نییە لێبووردن بۆ ئەو کەسە تاوانبارە، پاشان ئاکامی هەر چوونە بەهەشتە./ تبصرة الأدلة ٧٦٧/٢.

[2] مقالات الإسلاميين ٢٠٣/١-٢٠٤.

٤- دەرچوون دژی حوکمڕان و دەسەڵاتداری ستەمکار[١].

## پێڕەکانی خەواریج:

خەواریج بۆ چەندین پێڕو دەستە دابەش بوون کە کۆکبوونێك نییە لەبارەی ژمارەیانەوە، جا بەغدادی[٢] و ئیسفەراییینی[٣] باسیان کردووە، کە بریتین لە بیست دەستەو پێڕ، کەچی زیاتر لە بیست دەستەیان ژماردووە. مەقریزی بەهەمان شێوە وتویەتی بیست دەستە و پێڕن، کەچی دواتر حەوت دەستەی دیکەی زیادکردووە[٤]. ڕازی وتویەتی بیست و یەك دەستەن[٥]، مەقدیسی بیست و یەك تاقمی لەوان ژماردووە[٦]. مەلتی وتویەتی بیست و پێنج دەستەن[٧]، خوارزمی وتویەتی چواردە دەستەن[٨].

هەروەها لەبارەی شتە سەرەکیەکانی ئەو تاقمانە کە وەك لق و پۆپی ئەو بنەمایانەن بەهەمان شێوە ڕاجیایی هەیە، لەوانە ئەوەی کە (إسفراییینی) باسی کردووە، حەوتن:

محکمەکانی یەکەم، ئەزاریقە، نەجدات، صوفریە، عجاردە، ئیبازیە، شبیبیە[٩].

---

[١] الفرق بين الفرق، والتبصير في الدين و الملل و النحل للشهرستاني، والبدء والتأريخ، سەرچاوەکانی پێشوو.

[٢] الفرق بين الفرق ٧٢. و ئیجی لە (المواقف ٣٩٦/٨) بەهەمان شێوە باسی کردووە کە بیست دەستەن.

[٣] التبصير في الدين ٣٨.

ڕاجیایی لەبارەی ژمارەی دەستەکان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هەندێك شتی لاوەکی بە بنەما دادەنێن و هەندێکیشیان بە بنەما داینانێن./ شرح المواقف للسيد الشريف، سەرچاوەی پێشوو.

[٤] خطط المقريزي ٣٥٤/٢.

[٥] إعتقادات فرق المسلمين ٥١-٦٦.

[٦] البدء والتأريخ ١٣٤/٥.

[٧] التنبيه والرد ١٧٨.

[٨] مفاتيح العلوم ١٩.

[٩] التبصير في الدين، سەرچاوەی پێشوو. ئەمانەش بە حەوت بنەمای سەرەکیان لێکداوەتەوە: الإيجي في المواقف ٣٩٣/٨ و الكرماني في الفرق الإسلامية ٦٢، السفاريني في لوامع الأنوار البهية ٨٦/١، بەڵام لە جیاتی (شەبیبیە و بەیهەسییەکان هێناوە.

**١- محكمەكانی یەكەم:** ئەوانەن كە یاخی بوون و دەرچوون لە دژی ئیمامی عەلی لە كاتی دادوەری كردنەكە، ئەمەش دوای ئەوەی كە لـە جـەنگی (صـەففین) لەگـەڵ ئیمـام بوون[1]، بە ئیمـامی عـەلیان (ڕەزای خـوای لێبێـت)، وت كاتێـك دوو دادوەرەكـەی دەستنیشان كرد: ئەگەر تۆ ئیمامی ڕاست و دروست بیت، بۆچی هـەر لەسـەرەتادا فەرمانی جەنگت پێكردین؟ دواتر بەم هۆیەوە لە ئیمام جیا بوونەوە[2].

یەكەم كەس لە خەواریج كە وتی: (حوكم تـەنها حـوكمی خوایـە) (عـروەی كـوڕی حودەیر) بـوو، پێـی دەوترێـت: (عـروەی كـوری ئـەدی)، نـاوی تریشـی لێنـراوە، بانگەوازی لەكار لادانی ئیمامی عەلی و موعاوییەیان كرد.

دوای گەڕانەوەی ئیمـامی (عـەلی) لـە (صـەففین)، خەواریجـەكان لـە (حـەروراء) كۆبوونەوەو ژمارەیان دوازدە هەزار بوو، سەركردەكەشیان (عەبدوڵای كوڕی كەواء) و (شبسی كوڕی ڕوبعی) بوو، ئیمامی عـەلی (ڕەزای خـوای لێبێـت) چـووە لایـان و گفتوگۆی لەگەڵ كردن، بـەم هۆیـەوە (ئـیبن كـەواء) بـە هـەزار سـەربازەوە داوای پاراستنی لە ئیمامی عەلی كرد.

خەواریجەكانی دیكە مانەوەو لە سەر ئەو گومڕاییەی خۆیان بەردەوام بوون، كۆچیان كرد بۆ ناوچەی (نەهرەوان)، بەسەركردایەتی (عەبدوڵای كوڕی وەهـەبی ڕاسـبی) و (حرقوصی كـوڕی زوهـەیری بجلـی) كـە بـە (خـاوەن مەمكەكـە) (ذي الخويصـرة) ناسراوە. لە (مەدائن) گەیشتن بە (عەبدوڵای كوڕی خەبابی كوڕی ئەڕەت) كـە والی

شەهرستانی لە (الملل والنحل ١٠٧/١) گەورە تاقمەكانی خەواریجی بە شەش دەستە داناون، (سەعالیبەكان) لە جیاتی (شەبیبیە و موحەكیمەكان) وەك دەستەیەكی خەواریج باس نەكردووە، بەڵام دواتر لەبارەیەوە دواوە كاتێك لەبارەی خەواریجەوە قسەی كردووە.

[1] الملل والنحل للشهرستاني ١٠٦/١ وإعتقادات فرق المسلمين ٥٢ والمواقف ٣٩٢/٨ والفرق الإسلامية للكرماني ٦٢. سەیری ئەمانەش بكە: التنبيه والرد ٤٧ والبدء و التأريخ ١٣٥/٥-١٣٧ و خطط المقريزي ٣٥٤/٢.

[2] إعتقادات فرق المسلمين، سەرچاوەی پێشوو.

ئـەویٚ بـوو، نـاوبراو قسـەی لەگـەڵ کـردن، (عەبـدوڵا)یان کوشـت و خـوێنی بـە ڕووبارەکەدا ڕۆیشت، کوڕو کەنیزەکەکەشیان کوشت، ئەمانە سەربازگەیان دانـا لـە (نەهرەوان)، ئیمامی عەلی بە چوار هەزار هاوەڵیەوە بۆیان دەرچـوو، لـە پێشـتردا (عەدی کوڕی حاتەمی تائی) ڕەوانەکرد و گفتوگۆی لەگەڵ کـردن و دواتـر جـەنگی لەگەڵ کردن، (حەرقوص) بەرەو ڕووی ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) هاتەدەر و وتی: سوێند بەخوا کە جەنگت لەگەڵدا دەکـەین، تـەنها مەبەسـتمان ڕەزامەنـدی خوایە و ڕزگاربوونە لـە ئـاگری دۆزەخ لـە ڕۆژی دوایـیدا، پاشـان ئـەم ئایەتانـەی خوێنـــــدەوە: ﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا ﴿١٠٣﴾ الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا ﴿١٠٤﴾﴾ الكهف: ١٠٣-١٠٤. واتە: (ئـەی موحەممـەد (صـلی الله علیه وسلم) پێیـان بڵـێ: ئایـا هـەواڵی ئـەو کەسـانەتان بـدەمێ کـە لـە کـارو کردەوەیاندا زۆر زەرەرمەندو خەسارەتمەندن؟!. "ئەوانە" ئەو کەسانەن کـە هـەوڵ و کۆششیان لە ژیانی دونیادا، بەزایە و بەهەدەر چووە بە مەرجێك وایان دەزانـی کـە بەڕاستی کاری چاك دەکەن و کردەوەی ڕەوا ئەنجام دەدەن).

ئیمامی عەلی هێرشی کردنە سـەرو لـەناوی بـردن، (عەبـدوڵای کـوڕی وەهـەبی) کوشت، شوێنی حرقوصیش کەوت، ئیمام عەلی فەرمانی کرد کە بیکوژن، نـاوبراو مەمکی هەبوو وەك مەمکی ئافرەت، ئیمـامی عـەلی (ڕەزای خـوای لێبێـت) وتـی: خواو پێغەمبەرەکەی ڕاستیان فەرموو. ئەو پیاوە خاوەن مەمکە بەلای پێغەمبەردا ڕۆیشتبوو کاتێـك دەسـتکەوتەکانی جـەنگی بـەدری دابـەش دەکـرد، نـاوبراو بـە پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) وت: دادپەروەربە. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: دوابڕاو زەرەرمەند بوویت، ئەگەر من دادگەر نەبم کـێ دادگـەر دەبێـت؟ دواتر فەرمووی: تاقم و دەستەیەك لە نەوەی ئەو کابرایە دێنە دونیا کـە لـە ئـایین دەردەچن وەك چۆن تیر لە کەوانەکەی دەردەچێت.

دوای ئەمــە خــەواریج لــە عێــراق چــوونەدەر، ئیمــامی عــەلی بــەردەوام لەگەڵیاندادەجەنگی، تا ئەو کاتەی ئیمامیان کوشت.

مەزهەبی خەواریجەکانیش بریتییە لە تەکفیر کردنی عـەلی و عوسمـان و هاوەڵـانی وشتر (أصحاب الجمل)، هەر دوو دادوەرەکە، تەکفیر کردنی ئـەو کەسـەش کـە بـە دادوەرییەکە ڕازیبووە، هەروەها تەکفیر کردنی هەموو ئەوانـەی تـاوان و گوناهیـان کردووە.

خەواریجەکان هەر لەسەر ئەم بۆچوونە بوون، تا پێـڕی (ئەزاریقـە) دەرکـەوت، لـەو کاتدا ڕاجیاییان کەوتە ناو[1].

٢- **ئەزارقە**: بریتین لە شوێنکەوتوانی (نافعی کوڕی ئەزرقی حەنەفی). زۆرترین ژمارەی خـەوارج پێکـدێنن و بەدەسـەڵاتترینیانن، لەگـەڵ پێـڕی یەکـەمی خـەوارج جیـا ئەکرێنەوە بەچەند شتێك وەك:

ئەزاریقەکان دژەڕاکانیان ئەگەر لە ناو بازنەی ئوممەتیش دابن، ئەوا بە هاوبەشـدانەر ناودەنێن، پێڕی یەکەم (محکمەکانی یەکەم) دەڵێن: کافرە.

هەندێك لە بۆچوونەکانیان:

أ- ئەو کەسە بە هاوبەشدانەر دادەنێن، کە کـۆچ بـۆ لای ئـەوان ناکـات، ئەگەرچـی هەمان بۆچوونی ئەوانیشی هەبێت.

ب- بەپێویستیان دادەنا کە ئەو کەسە تاقی بکەنـەوە کـە دەچـێتە سـەربازگەکەیان ئەگەرچی کابرا بانگەشەی ئەوەش بکات کە لەوانە، بەوەی دیلێك یان منـداڵێکی دژەڕاکانیان دەدەنە دەستی و فەرمانی پێدەکەن بیکوژن.

پ- منداڵەکانی دژەڕاکانیان هاوبەشدانەرن و بۆ هەتا هەتایی لە ئاگردا دەمێننەوە.

[1] الفرق بین الفرق ٧٤-٨١ والتبصیر في الدین ٣٨. و سەیری ئەمانەش بکە: الملل والنحل للشهرستاني ١٠٧/١. والکامل للمبرد ٢٦٣/٣: ئەخفەش وتویەتی: حرقوص: خاوەن مەمکەکەیە.
فەرموودەی: دەرچوون لە ئاین...: بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە. کەمێکی تر دەخرێتەڕوو.

ت- کوشتنی ئافرەت و منداڵی دژەڕاکانیان حەڵاڵ کردبوو.

ج- وازهێنان و سڵ کردنەوەیان لە جەنگ بە حەرام دەزانی، هەروەها ئەوانەیان بە هاوبەشدانەر دەزانی کە جەنگ ناکەن و دانیشتوون[1].

چ- بەڕاستدانانی (عەبدوڕەحمانی کوڕی مولجەم) لە کوشتنی ئیمامی عەلی.

ح- توقیە" لەلای ئەوان دروست نییە لە گوفتارو کرداردا[2].

خ- بڕینی دەستی دزیکەر لە بازووەوە، هەروەها پوچەڵ کردنەوەی بەردباران (ڕەجم) کردنی ئافرەت و پیاوی زیناکەر[3].

**٣- نەجدات:** بریتین لە شوێنکەوتوانی (نەجدەی کوڕی عامر حەنەفی). نەجدە لەگەڵ هەندێك لە شوێنکەوتوانی لە (یەمامە) دەرچوون، دەیویست بە پێری (ئەزاریقە) بگات، لە سەربازگەکەی (نافع) چەند کەسێك پێشوازیان لێکرد، ئەوەیان پێڕاگەیاند، کە نافع هەڵساوە بە تەکفیر کردنی ئەوانەی دانیشتوون و جەنگ ناکەن، ئەوانیش بەمە ڕازی نین، بۆیە نەجدەیان بەسەرکردەی خۆیان ناساند.

دواتر پێڕی نەجدات لەبارەی نەجدە ڕاجیاوازییان تێکەوت بەهۆی چەند شتێکەوە، دواتر نەجدە هەر لەسەر دەستی تاقمەکەی کوژرا.

ئەم پێڕە بۆ سێ دەستە دابەش بوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کۆکن لەسەر ئەوەی: کە خەڵك هەرگیز پێویستی بە ئیمام نییە، بەڵکو پێویستە لە ناو خۆیاندا شتەکان تاوتوێ بکەن، جا ئەگەر پێیان وابوو کە ئەو شتانە پێویستی بە ئیمامێکە کە ئەو کارانەیان پێبکات. ئەوا ئەو کاتە دەستنیشان کردنی ئیمام دروستە.

---

[1] الفرق بين الفرق ٨٢-٨٣ والتبصير في الدين ٤٢ والملل والنحل للشهرستاني ١/١١١-١١٦. بڕوانە: مقالات الإسلاميين ١/١٧٠ والتنبيه والرد ١٧٨ والفصل لابن حزم ٥/٥٢ و اعتقادات فرق المسلمين ٥٤ والبدء والتأريخ ٥/١٣٨ وخطط المقريزي ٢/٣٥٤ والمواقف ٤/٣٩٢ و الفرق الإسلامية للكرماني ٦٤-٦٦ والبعد الحضاري ٥٣.

[2] الملل والنحل للشهرستاني، والفرق الإسلامية للشهرستاني، سەرچاوەکانی پێشوو.

[3] الفصل لإبن حزم، سەرچاوەی پێشوو.

هەروەها (كەعبى) ئەم وتەيەى ئەوانى گێڕاوەتەوە: كە توقيە دروستە لـە گوفتـارو كرداردا تەنانەت لە كوشتنى كەسێكيشدا.

نجەدە خوێنى خاوەن پەيمان و لە ئەستۆگيراوان (ئـەهلى ذمـە)ى حـەڵاڵ كـرد، لـەو شوێنەى توقيەى تێدا بەكاردێت، بـەريبوونى ڕاگەيانـد لەوانـەى ئەمـە بـە حـەڕام دەزانن[1].

٤- **صـوفريه (الصفرية، الأصفرية)**: شـوێنكەوتووى (زيـادى كـوڕى ئەصـفر)ن. ئەمانـە دەڵێن:

أ- هەمان ڕاى ئەزاريقەكانيان هەيە لەوەى گوناهكار بە هاوبەشدانەر دادەنـێن، دواتـر ئەمانەش بوونە سێ دەستە، بەڵام شايەنى باسە كە هەر هەموويان كوشتنى ئافرەت و منداڵى دژەڕاكانيان بە حەڵاڵ نازانن، بەپێچـەوانەى ئەزاريقـەكان كـە بـە ڕەواى دەزانن.

ب- هەمووشيان پشتگيرى لە (عەبدوڵاى كوڕى وەهەبى ڕاسبى) و (حرقوصى كـوڕى زوهير)و شوێنكەوتووەكانيان لـە پێـڕى (موحەكيمـەكانى يەكـەم) دەكـەن. دواى ئەمانە (ئەبو بلالى مرداسى خارجى)يان وەك ئيمـام دانـاوە، كـە بـراى (عـروەى كوڕى حەدير) بوو، دواى ئەميش (عيمرانى كوڕى حەتانى دەسوسى)يان بە ئيمـام داناوە.

---

[1] الملل والنحل للشهرستاني ١١٦/١ و مقالات الإسلاميين ١٧٤/١ والفرق بين الفرق ٨٧ والتبصير في الدين ٤٣. سەيرى ئەمانەش بكە: الفصل لإبن حزم ٥٣/٥ وإعتقادات الفرق المسلمين ٥٥ والبدء والتأريخ ١٣٩/٥ والمواقف ٣٩٣/٨ والفرق الإسلامية للكرماني ٦٦ وخطط المقريزي ٣٥٤/٢. و (المبرد) لە (الكامل ٢٨٦/٣-٢٨٩) نامەكەى نەجدەى كە بۆ نافعى ناردووە هێناوە دواى لێ جيابوونەوە و وەڵامەكەى نافيعى بۆ ئەو بەهەمان شێوەى هێناوە.

(عیمران) شاعیرێکی ناسك بوو و یەکێك بــوو لــە تووندڕەوەکانی صــوفریەکان، ئەوەبوو کە بۆ (عەبدوڕەحمانی کوڕی مولجەم) کە بکــوژی ئیمــامی عــەلی (ڕەزای خوای لێبێت) بوو شیوەنی گێڕا[1].

پ- توقیە بە دروست دەزانن لە گوفتاردا نەك لە کرداردا[2].

٥- **عەجاردە:** شوێنکەوتووی (عەبدولکەریمی کوڕی عەجرەد)ە. دواتر ئەم پێڕە بۆ چەندین دەستە دابەشبوون، بۆ نزیکەی بیست دەستە پەرت بوون، ئەم بۆچوونە کۆیان دەکاتەوە:

أ- منداڵ کە باڵغ بوو داوای موسڵمان بوونی لێ دەکرێت، پێش ئەمە خۆ لێ بەری کردنی پێویستە، تا موسڵمانێتی ڕادەگەیەنێت یان وەسفی ئیسلام دەکات.

ب- ماڵی دژەڕاکانیان بە دەستکەوت نازانن تا خاوەن ماڵەکە نەکوژرێت، بەپێچەوانەی پێڕی ئەزارقە کە بەهەموو شێوەیەك ماڵی دژەڕاکانیان بە حەڵاڵ دەزانن. دوای ئەمە ئەم پێڕە بۆ پازدە دەستە دابەش بوون.

پ- کۆچکردن بە چاکە دادەنێن نەوەك بە فەرزو پێویست.

ت- بە کردنی گوناهی گەورە کەسەکە تەکفیر دەکەن[3].

٦- **شبیبیە:** بریتین لە شوێنکەوتووی (شەبیبی کوڕی یەزیدی شەیبانی) کە نازناوەکەی (ئەبو صەحاری)یە، کە لە سەردەمی (حەجاج) دەرچوو.

شەبیب و شوێنکەوتوانی ئیمامەتی ئافرەتیان بە دروست دانا، ئەگەر ئافرەتەکە بە ئەرکی پێویستی خۆی هەڵسا، لــە ئاســت دژەڕاکــانی دەرچــوو، شــوێنکەوتووانی

---

[1] مقالات الإسلاميين ١٨٢/١ واللفرق بين الفرق ٩٠ والتبصير في الدين ٤٤ والملل والنحل للشهرستاني ١٣٤/١ و المواقف ٣٩٤/٨ وخطط القريزي ٣٥٤/٢.

[2] إعتقادات فرق المسلمين ٦٥ وشرح المواقف للسيد الشريف، سەرچاوەی پێشوو.

[3] مقالات الإسلاميين ١٧٧/١ والفرق بين الفرق ٩٣ والتبصير في الدين ٤٥ والملل والنحل للشهرستاني ١٢٤/١ والفصل لابن حزم ٥٤/٥ و إعتقادات فرق المسلمين ٥٦ والبدء والتأريخ ١٣٨/٥ والمواقف ٣٩٤/٨.

ناوبراو پێیان وابوو کە غەزالەی دایکی شەبیب لە دوای کوژرانی ناوبراو ئیمام بووە تا کوژرا[1].

پێیــان وابــوو کــە مرۆڤـــ ئەگــەر شــایەتمانی هێنــا و دۆســتایەتی و پشــتگیری خۆشەویستانی خوا بکات و خۆی بەری بکات لــە دوژمنــانی خــوا، دان بنێـت بــە پەیامی نیردراوی خوا، ئەوا دەبێتە موسڵمان ئەگەرچی شارەزا نەبێت بــە ســەرجەم ئەو فەرزانەی کە خوای گەورە دایناون، بەوەی چ فەرزە چ فەرز نییە، تا ئەو کاتەی تاقیدەکرێتەوە بەکردارو لێیدەپرسرێتەوە[2].

٧- **ئیبازییەکان:** سەرکردەی ئیبازیەکان بریتییــە لــە: (ئــەبو شەعســائی جــابری کــوڕی ئەزدی عەمانی بەصر)، ساڵی ٢١ك کــە هێشــتا دوو ســاڵ لــە تەمــەنی خەلافــەتی ئیمامی عومەر مابوون لە دایك بوو، کۆچی کردووە لە پێناو بەدەستهێنانی زانست، هاوەڵی (عەبدوڵای کوڕی عەبباس) بووە، شتی زۆر وەرگرتووە لە زۆرێك لە هاوەڵــان (ڕەزای خوایان لێبێت)، وتویەتی: (بە حەفتا کەس گەیشتووم لە هاوەڵانی بــەدر، شــتی هەر هــەموویانم وەرگــرت تــەنها دەریاکــە نــەبێت). مەبەســتی لــە دەریاکــە (ئــیبن عەبباس)ە، لەبەر زۆری زانستەکەی ئەو ناوەی لێناوە.

جا (ئەبو عوبەیدەی موسلیمی کــوڕی ئوبــەی کەریمــەی تــەمیمی) زۆر شــتی لــە (جــابر) وەرگرتووە، کە (ڕەبیعی کوڕی حەبیب) کتێبی (الجـامع الصــغیر) لێگێڕاوەتــەوە کــە سەرچاوەی سەرەکی کتێبی (ئیبازییەکانە) لە بواری فەرموودەدا. جــابر ســاڵی ٩٣ك کۆچی دوایی کردووە[3].

---

[1] الفرق بين الفرق ١٠٩ والتبصير في الدين ٥٠ والملل والنحل للشهرستاني ١٢٣/١. سەیری ئەمەش بکە: خطط المقريزي ٣٥٥/٢.

[2] مقالات الإسلاميين ١٩٤/١.

[3] البعد الحضاري ٥٠، لە پەراوێزەکەیدا.

سەیری ژیاننامەی (جابری کوڕی زەید) بکە: طبقات المشايخ بالمغرب للدرجيني ٢٠٥/٢-٢١٤ والسير للشماخي ٦٧/١-٧٢، لەم سەرچاوەیەدا هاتووە کە لە ٩٦ك مردووە، بەهەمان شێوە

ئینجا (عەبدوڵای کوڕی ئیبازی تەمیمی مری) شوێن بۆچوونەکانی ئەو کەوت، ئەوەش ئەوەیە کە مەزهەبەکەی دراوەتە پاڵی، کەچی سەرکردەی ڕاستەقینەی ئەم تاقمە جابری کوڕی زیدە، هۆکاری ئەمەش دەرکەوتنی (ئیبن ئیباز) بووە لە بواری سیاسی، کە لە نافعی کوڕی ئەزرەق جیابووەوە. ساڵی ٨٦ك کۆچی دوایی کردووە[1].

نووسەرانی تاقمەکان، وەك: ئەشعەری[2]، مەلتی[3]، بەغدادی[4]، ئیسفەرایینی[5]، ئیبن حەزم[6]، شەهرستانی[7]، نەشوانی حەمیری[8]، ڕازی[9]، مەقدیسی[10]، ئیجی[11]،

---

ئەمانەش ئاماژەیان پێداوە: (جەعبەری) لە (البعد الحضاري)، و ئیبن حەجەر لە: التذهيب التذهيب ١/٢٧٩ طبعة مؤسسة الرسالة.

(1) البعد الحضاري، سەرچاوەی پێشوو، ٥٢ ئەم دەقەی نەقڵ کردووە لە (بەغتوری و بەرادی). (موبەڕەد) لە (الكامل ٣/٢٧٥)دا وتویەتی: (دواتر خەواریجەکان دەرچوون کە هیچ دەنگوباسیان نییە، لەبەر ئەوەی هەموویان کوژران، تا کارگەیشتە ئەزارقەکان، لێرەوە خەواریج دەستیان بە پەرتبوون کرد، بۆ چوار کەرت: ئیبازییەکان: کە بریتین لە هاوەڵانی "عەبدوڵای کوڕی ئیباز". صوفریە... بەیهەسیە.... ئەزارقە.... ئەمان پێشتر لەسەر یەك بۆچوون بوون، لە چەند بابەتێکی لاوەکی ڕیزپەڕ نەبوایە ڕاجیاییان نەبوو). بەهەمان شێوە (موبەڕەد) لە (الكامل ٣/٢٩١) باسی جیا بوونەی (عەبدوڵای کوڕی ئیباز) لە (نافع)ی کردووە. سەیری ژیاننانەی (ئیبن ئیباز) بکە لە: طبقات المشايخ بالمغرب للدرجيني ٢١٤ والسير الشماخي ١/٧٢.

(2) مقالات الإسلاميين ١/١٨٣.

(3) التنبيه والرد ١٧٨.

(4) الفرق بين الفرق ١٠٣.

(5) التبصير في الدين ٤٨.

(6) الفصل لابن حزم ٥/٥١.

(7) الملل والنحل للشهرستاني ١/١٣١.

(8) الحور العين ٢٥٦.

(9) إعتقادات فرق المسلمين ٦٤.

(10) البدء والتأريخ ٥/١٣٤ و ١٣٨.

(11) المواقف ٨/٣٩٤.

کرمانی[١]، مەقریزی[٢]، ئیبن مورتەزا[٣]، پێیان وایە کە ئیبازییەکان دەستەو پێڕێکن لە خەواریج، ناوبراوان باسی تاقم و بۆچوونەکانی خەواریجیان کردووە.

موبەڕەد کە فیکری هاوشێوەی خەواریجەکانی هەبوو، باسی ئەوەی کردووە کە ئیبازیەکان بەشێکن لە خەواریج، دواتر لە خەواریجەکان جیابوونەوە، هەروەك ئەمە پێشتر خرایەڕوو لە کتێبەکەی موبەڕەدا کە ناوی (الکامل)ە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نووسەرە ئیبازییەکان، نکۆڵی دەکەن لەوەی ئیبازییەکان بەشێك بن لە خەواریج، دەشڵێن هیچ خاڵێکی کۆکەرەوە نیە لە نێوان ئیبازییەکانو خەواریجەکان، تەنها بەناپەسەند زانینی ناوبژیوانیەکە نەبێت[٤]، چونکە ئیبازییەکان پێیان وایە کە دادوەرییەکە هەڵەیە، ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) ئیمامی ڕاستەقینەیەو نەدەبوایە بە دادوەرییەکە ڕازی بوبا[٥].

پێشیان وایە دوای سەر هەڵدانی بۆچوونەکەی (نافعی کوڕی ئەزرەق) ئیبازییەکان لە خەواریجەکان جیابوونەتەوە، ئەمەش دوای ئەوەی (عوبەیدوڵای کوڕی زیاد) کوڕی والی بەصرە کە سەر بە معاویە بوو، جەنگێکی گەرمی لەگەڵ تاقمی (موحەکیمە)ی خەواریجەکان کرد، لە دەرەنجامی ئەوەدا دوو دەستە بەدەرکەوتن:

یەکەم: دەستەی (جابری کوڕی زەید) بەردەوام بوو لەسەر ڕێبازی (موحەکیمەکان) بەشێوەیەکی نهێنی، هەروەها (عەبدوڵای کوڕی ئیباز)یشی لەگەڵدابوو، کە بە ئاشکرا

---

[١] الفرق لإسلامية للكرماني ٦٨.

[٢] خطط المقريزي ٣/٣٥٥.

[٣] المنية والأمل ١٠٤.

[٤] مقالات الإسلاميين ١/١٧٧ والفرق بين الفرق ٩٣ والتبصير في الدين ٤٥ والملل والنحل للشهرستاني ١/١٢٤ والفصل لابن حزم ٥/٥٤ و إعتقادات فرق المسلمين ٥٦ والبدء والتأريخ ٥/١٣٨ والمواقف ٨/٣٩٤.

[٥] مقالات الإسلاميين ١/١٧٧ والفرق بين الفرق ٩٣ والتبصير في الدين ٤٥ والملل والنحل للشهرستاني ١/١٢٤ والفصل لابن حزم ٥/٥٤ و إعتقادات فرق المسلمين ٥٦ والبدء والتأريخ ٥/١٣٨ والمواقف ٨/٣٩٤.

بەرگری لەو ڕێبازە دەکرد، ناوبراوان پێیان وابوو، تاکە ڕێگە بۆ ڕزگاربوون، بریتییە لە دانیشتن و نەچوون بۆ جەنگ لە دژی دژەڕاکانیان و پێداگیری کردن لەسەر لایەنی ڕۆشنبیری بۆ پاراستنی دروشم و پەیامی ئیسلام.

دووەم: شوێنکەوتووانی نافعی کوڕی ئەزرەق، کە باسی بۆچوونەکانی ئەم دەستەیەمان کرد کەمێك پێش ئێستا.

بناغەی جیابوونەوەی ئەم دوو دەستەیە: ئەوەبوو کە موسڵمانان - خەواریج - دوای کوژرانی (ئەبو بلالی میرداس)ی کوڕی (حەدیر) لە ساڵی (٦١ك) لە مزگەوتی بەصرە کۆبوونەوە، بڕیاری دەرچونیاندا، لەم کۆبوونەوەیدا (عەبدوڵای کوڕی ئیباز) و نافعی کوڕی ئەزرەق و زۆرێك لە موسڵمانان ئامادەی بوون، جا کاتێك شەو باڵی کێشا بەسەر ناوچەکەدا، عبدالله گوێی لە ئاوازی قورئان خوێنان و لەرەی دەنگی بانگدەران و لاوانەوەی تەسبیحات کاران بوو، بە هاوەڵانی وت: ئایا لە دژی ئەمانە دەربچم؟ بۆیە شتەکەی شاردەوەو پەشیمانبووەوە.

دوای ئەمە ئیبازییەکان خۆیان بەریی کرد لە نافعی کوڕی ئەزرەق، هەروەك ئەمە بەڕوونی دیارە لەو پەیامەی (عەبدوڵای کوڕی ئیباز) بۆ (عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان)ی نارد: (من خۆم بەخوای گەورە پەنادەدەم و بەری دەکەم لە ئیبن ئەزرەق و گوفتارو کردارو شوێنکەوتوانی)[1].

بۆیە بەهەموو شێوەیەك ئیبازییەکان ئەوە ڕەت دەکەنەوە، کە بە خەواریج ناوبنرێن، چونکە خەواریجەکان بە لە ئایین دەرچوو دەزانن[2].

ئەوەی من بۆی دەچم: ئەوەیە کە وتەی هەر دوو دەستەو تاقمەکە ڕاستە، جا نووسەرە ئیسلامییە ناوبراوەکان پێیان وایە کە ئیبازییەکان بەشێکن لە خەواریج، چونکە تەماشای سەرەتای سەرهەڵدانی ئەوانیان کردووە، چونکە سەرەتا ئیبازییەکان لەگەڵ خەواریجەکاندا

---

[1] البعد الحضاري ٥١-٥٤. سەیری ئەمانەش بکە: الإباضية بين الفرق الإسلامية لعلي يحيى معمر ٣٣٤ کە وەریگرتووە لە: الدليل والبرهان للوارجلاني.

[2] الحضاري، سەرچاوەی پێشوو.

بوون، دواتر لێیان جیا بوونەوە. و نووسەرە ئیبازییەکانیش پێیان وایە ئیبازییەکان بەشێك نین لە خەواریجەکان، چونکە تەماشای کۆتایی بارودۆخی ئیبازییەکان دەکەن، پاش جیا بوونەوەیان لە خەواریج، ئەمەش بەو واتایەی ئێمە باسمان کرد، هیچ یەکێك لەم دوو دەستە نووسەرە نکۆڵی لێ ناکەن. ڕاجیایی لە نێوان ئەم دوو دەستە نووسەرانە ڕاجیاییەکی ڕاستەقینە نییە.

ئیبازییەکان لە هەندێك بۆچووندا، پێیان وایە:

أ- وڵات و شاری دژە ڕاکانیان بە شارو وڵاتی یەکخواناسی دادەنێن، تەنها سەربازگەی دەسەڵات نەبێت، کە بە وڵات و شوێنی جەنگ، نەك هاوبەشدانانی دادەنێن.

ب- دان بە بیرۆکەی نمایشکاری (استعراض)دا نانێن. نمایشکاری: بریتییە لە کوشتنی دژەڕاکان بەوەی بە هاوبەشدانەر دابنرێن.

پ- هیچ شتێکی جەنگاوەرە دژەکانیان بە دەستکەوت وکۆیلە بەڕەوا نازانن، تەنها خوێنیان نەبێت.

ت- دان دەنێن بە بنەمای شۆرش نەکردن، ئەمەشیان بە بنەمای نهێنی ناو ناوە، بەشێوەیەك کە دەرچوون بە ڕەوا نازانن تا ژمارە و چەك و پێداویستیان بە ئەندازەی نیوەی ژمارەی دوژمن نەبێت[1].

---

[1] البعد الحضاري ٥٥-٥٦. عەلی یەحیای مەعمەر لە کتێبی: (الإباضية بين الفرق الإسلامية ٣٤٠-٣٥٠)، بەتێرو تەسەلی لە بارەی جۆرەکانی وڵات دواوە:

أ- وڵات" وڵاتی ئیسلامە و سەربازگەی دەسەڵات سەربازگەی ئیسلامە، بەو مەرجەی نیشتمان و دانیشتووانەکە و دەوڵەتەکە موسڵمان بن و کار بە حوکمی خوا بکەن.

ب- وڵات" وڵاتی ئیسلامە سەربازگەی دەسەڵات سەربازگەی ئیسلامە، بەڵام ئەوە هەیە کە سەربازگەکە سەربازگەی ستەم و زۆردارییە، ئەگەر هاتوو نیشتمان و دانیشتووان و دەوڵەت موسڵمان بوون بەڵام کار بە حوکمی خوا نەکەن.

پ- وڵات" وڵاتی ئیسلامە و سەربازگەی دەسەڵات سەربازگەی کوفرە، ئەگەر هاتوو نیشتمان و دانیشتووان موسڵمان بوون، دەوڵەتی حوکمڕان داگیرکەر بێت جا هاوبەشدانەرێکی خاوەن کتێبی ئاسمانی بێت یان خاوەن کتێبی ئاسمانی نەبێت.

شتێکی ڕوون و دیارە کە سەرجەم ئەو ڕاوبۆچوونانە پێچەوانەی بیروبۆچوونی ئەزاریقەکانە.

ج- کوفر لەلای ئەوان دوو جۆرە:

**یەکەم: کوفری نیعمەت:** کە بەکوفری دوو ڕوویـی ناودەبرێـت، کـە بکـەری ئـەو کوفرە هەر حوکمی موسڵمانانی بەسەردا جێبەجێ دەکرێت[1]، ئەمە هاومانایـە لەگەڵ لاساریی و تاوانکاریی و سەرپێچی کردن[2].

**دووەم: کوفری دان پێدانەهێنان (جحود):** بەم کوفرە موسـڵمان لـە موسـڵمانێتی دەشۆرێت و دەچێتە دەرەوەی بازنەی ئیسلام[3].

## پەرستشکردنی خەواریجەکان

سەرباری ئەوەی کە پێشتر بۆچوونە توندو تیژو لاڕێیەکانی خەواریجەکانمان خسـتەڕوو، ئەوا خەواریجەکان بە چەند سـیفەتێکی دژیـەك جیادەکرێنـەوە هـەبوو، وەك: توونـدی لـە پەرستشدا.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەبارەی ئەوانەوە فەرموویەتی: **(يخرجون فيكم قوم تحقر أحدكم صلاتكم مع صلاتهم و صيامكم مع صيامهم، وعملكم مع عملهم، ويقرؤن القرآن لا يجاوز حناجرهم، يمرقون من الدين كما يمرق السهم من الرمية)**[4] واتە: کۆمەڵێك لە ئێـوە

---

ت- وڵات وڵاتی کوفرە و سەربازگەی دەسەڵات سەربازگەی کوفرە، ئەگەر نیشتمانەکە و دانیشتوانەکەی هاوبەشدانەر بوون، دەوڵەتێکی هاوبەشدانەر حوکمی دەکرد. سەیری ئەم بۆچوونە و بۆچوونی تریش بکە، لە: تحفة الأعيان للسالمي ٨١-٨٥ لەکاتی باسکردنی: (بەشی: بیروباوەڕی دانیشتووانی عومان).

(١) مختصر تأريخ الإباضية للباروني ٧٤.

(٢) البعد الحضاري ٥١٢.

(٣) مختصر تأريخ الإباضية للباروني، سەرچاوەی پێشوو.

(٤) فەرموودەی: کۆمەڵێك لە ئێوە پەیدا دەبن و نوێژی خۆتان بەکەم دەزانن.... تاد، لەمانەدا هاتووە: صحيح البخاري في: ٦٦ كتاب فضائل القرآن، ٣٦ باب من رايا بقراءة القرآن رقم ٥٠٥٨، عن أبي سعد الخدري.

پەیدا دەبن و نوێژو ڕۆژوو و کردەوەی خۆتان بەکەم و بێ نرخ دەزانن لە چاو نوێژو ڕۆژوو و کردەوەی ئەوان، قورئان دەخوێنن کەچی لە گەرویان تێناپەڕێت، لـە ئـایین دەردەچـن وەك چۆن تیر لە کەوانەکەی دەردەچێت.....

لە ئەبو سەعیدی خودریەوە (ڕەزای خوای لێبێت) هاتووە، وتویەتی: کاتێك ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین (صلی الله علیه وسلم) دەستکەوتی دابەش دەکرد، (ذو الخويصرة) پیاوێکە لە هۆزی (تەمیم) هاتە لای وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دادگەربە، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: سزا بۆ تۆ ئەگەر من دادگەر نەبم کێ دادگەر دەبێت، بەڕاستی زەرەرمەند و بێ هیوا بوویت، ئەگەر من دادگەر نەبم، عومەر وتی: ڕێگەم بدە با ملی بپەڕێنم؟ فەرمووی: **(دعه، فإن له أصحابا يحقر أحدكم صلاته مع صلاتهم و صيامه مع صيامهم، يقرؤن القرآن لا يجاوز تراقيهم، يمرقون من الدين كما يمرق السهم من الرمية.... آيتهم رجل أسود، إحدى عضديه مثل ثدي المرأة، أو مثل البعضة تدردر، و يخرجون على حين فرقة بين الناس)** واتە: لێبگەڕێ، ئەمە هاوەڵی وای هەن کە هەندێکتان نوێژو ڕۆژووی خۆتان لە چاو نوێژی ئەوان بەبێ نرخ دەزانن، قورئان ئەخوێنن لە گەروویان تێناپەڕێت، لە ئایین دەردەچن وەك چۆن تیر لە کەوانەی دەردەچێت.... نیشانەی ئەمانە پیاوێکی ڕەشە، باسکێکی وەك مەمکی ئافرەتە، یان وەك پارچە گۆشتێکە دەجوڵێتەوە، ئەمانە لە کاتێکدا دەردەچن کە موسڵمانان پەرتەوازەن.

ئەبو سەعید وتی: شایەتی دەدەم کە ئەم فەرموودەیەم لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بیستووەو شایەتیش دەدەم کە (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) و منیشی لەگەڵدا بووم، جەنگی لەگەڵ ئەوان کرد، فەرمان کرا ئەو کەسە بدۆزرێتەوەو پاشان دۆزیانەوەو هێنایان، تا تەماشای ئەو سیفەتە بکەم کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێی وەسف کردبوو[1].

---

[1] فەرموودەی: کاتێك ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین(صلی الله علیه وسلم).... تاد، لەمانەدا هاتووە: صحيح البخاري في: ٦١ كتاب المناقب، ٢٥ باب علامات النبوة في الإسلام، رقم ٣٦١٠،

لە گێڕانەوەیەکی تردا بەهەمان دەربڕین هاتووە، تەنها ئەمەی زیاد کردووە: أبو سعید وتی: ئەم ئایەتە لەبارەی ئەو کابرایە دابەزی: ﴿ وَمِنۡهُم مَّن يَلۡمِزُكَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ ﴾ التوبة:٥٨.[1] واتە: (هەیانە تانەو تەشەر لە تۆ دەدات لە دابەش کردنی زەکات و دەستکەوتدا).

جا ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم): **(يحقر أحدكم صلاته مع صلاتهم و صيامه مع صيامهم)** واتە: هەندێکتان نوێژو ڕۆژووی خۆتان لە چاو نوێژی ئەوان بەبێ نرخ دەزانن.

عوروەی کوڕی حەدیر کە بە (ئیبن ئەدیە)ش ناودەبرێت، یەکەم کەسیان بوو کە دادگایی کرا، کاتێك هێنرایە لای زیادی باوکی، ناوبراو چەند پرسیارێکی لە عروە کرد، دواتر بڕیاری لەبارەی دەرکرد و سەری پەڕێنرا، گەورەکەی زیاد بانگی کرد: وتی باسی عروەم بۆ بکە، وتی: بە درێژی بۆت باس بکەم یان بەکورتی. وتی: بەکورتی.

وتی: هەرگیز بە ڕۆژ خواردنم بۆ نەبردووە، هەرگیز بەشەویش ڕایەخم بۆ ڕانەخستووە. مەبەستی ئەوەیە کە بەڕۆژ بە ڕۆژوو بووەو بە شەوەکەیشی بە شەونوێژ بێدار کردۆتەوە[2].

کاتێك خەوارجەکان دوای دادوەرییەکە لە ئیمامی علی یاخی بوون، لە (حەروراء)

عن أبي سعيد الخدري. ونحوه في صيح البخاري في كتاب الأدب، ٩٥ باب ما جاء في الرجل ويلك، رقم ٦١٦٣، عن أبي سعيد الخدري.

والحديث في صحيح مسلم في: ١٢ كتاب الزكاة، ٤٧ باب ذكر الخوارج وصفاتهم، رقم ١٠٦٤، ٧٤٤/٢، عن أبي سعيد الخدري.

وە سەیری ئەمەش بکە: التبصير في الدين ٤١.

[1] ئەم گێڕانەوەیە بە زیادەوە هاتووە لە: صحيح البخاري في: ٨٨ كتاب استتابة المرتدين، ٧ باب من ترك قتا الخوارج للتألف، رقم ٦٩٣٣، عن أبي سعيد الخدري.

[2] الكامل ١٨١/٣. و سەیری ئەمەش بکە: الملل والنحل للشهرستاني ١١١/١ و وتویەتی: ئەمە ڕەفتارو ئیجتهادی ئەوە، ئەمەش بیرو باوەڕو شتە پیسەکەیەتی. و بەهەمان شێوە سەیری ئەمەش بکە: محمد محيى الدين عبدالحميد على الفريق بين الفرق للبغدادى ٧٤ پەراوێزەکەی کە لە (المعارف)ی (ئیبن قوتەیبە)ی وەرگرتووە.

نیشتەجێ بوون، ئیمامی عەلی (عەبدوڵای کوڕی عباس)ی ڕەوانەکردە لای ئەوان، کاتێک گەیشتە لایان پێشوازییێکی گەرمیان لێکرد، ناوبراو کەسانێکی بینی، کە نێوچەوانیان ڕووشابوو، بەهۆی زۆری مانەوەیان لە سوژدەدا، دەستی هەندێك کەسی بینی کە شەق شەق بووە وەك بەری دەستی وشتر، جلێکی شۆڕاویان بەسەر باڵی خۆداداوە، ملیان هەڵکردووە[1].

دەڵێن صوفریەکان بۆیە بەوناوەوە ناونراون - لە یەکێك لە وتەکان و ڕای زۆربەی زاناکانی کەلامدا - لەبەر ئەوەی کۆمەڵێك بوون کە پەرستش ئەوانی شەکەت کردبوو بەمەش ڕەنگیان زەرد هەڵگەڕابوو[2].

هەروەها وتارەکەی (ئەبو حەمزەی کوڕی موختاری شاری) کە لە ١٣٠ك مردووە، وێنەی ئەوە دەکێشێك کە ئەوانە چەند پەرستشی زۆریان کردووە[3].

---

[1] الكامل للمبرد ٢١١/٣.

[2] الكامل للمبرد ٢٧٥/٣ و٣٠٤.

[3] ئەبو حەمزەی شاری، بە خەڵکی حیجازی وت: ڕەخنەم لێدەگرن بەهۆی هاوەڵانمەوەو گومان دەبەن ئەوان گەنجن؟ جا ئایا هاوەڵانی پێغەمبەریش گەنج نەبوون... بەڕاستی هاوەڵانم گەنجانێکن لە گەنجێتیاندا پیرن، لە ئاست خراپەی چاوەکانیان خۆپارێزن، پێیەکانیان لە ئاست چوون بۆ شتی پوچ گرانن، ڕەنگیان تێکچووە لەبەر پەرستش، بە شەو بێدارییەوە شەکەت و ماندوون، خوای گەورە لە شەودا بۆیان دەڕوانێت کە ئەوان پشتیان چەماوەتەوەو سەرقاڵی قورئان خوێندنن، هەر کاتێك یەکێیان بەسەر ئایەتێکدا بڕوات کە باسی بەهەشت بکات ئەوا لە خۆشیان و بە ئاواتی ئەویێ بۆی دەگرییێت و کاتێکیش بەسەر ئایەتێکدا دەچن کە باسی ئاگر بکات. ئەوا ڕائەچڵەکێن و دەنگی ناخۆشی دۆزەخیان لە نێوان گوێچکەکانیاندا دەبێت، ماندوێتیان بەردەوامەو بەیەکەوە بەستراوە، ماندوێتی شەو بەستراوەتەوە بە ماندوێتی ڕۆژ، زەوی ئەژنۆ و دەست و لووت و نێوچەوانی ئەوانی ڕووشاندووەو خواردووە، ئەوانە لە پاڵ خۆشەویستی خوادا بارگەیانداناوە، تا بینیان تیر بەرز بوونەتەوە، ڕمەکان هەڵکران، شمشێرەکانیش ئامادەکراون، ئەم دەستەیە پەیمانی مەرگی دا وەك هەورە تریشقەی مەرگی دا و تیشکی دایەوە، پەیمانی دەستەکەیان بەکەم زانی لەبەر پەیمانی خوا، هەر گەنجێك لەو دەستەیە بەرەو پێش چوو تا پێیەکانی لەسەر ملی ئەسپ تێك ئاڵان و ڕووە گەشەکەی بە خوێن تەڕبوو، لەو کاتەدا دڕندەکانی سەر زەوی خێرا بۆی چوون، باڵندەکانی

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پەرستشە زۆرەکانیان بێ نیازیان ناکات، چونکە ئەمانە یاخی بوون لەو گوێڕایەڵی کردنی ئەو ئیمامەی کە لە سەر خەڵکی پێویستە گوێڕایەڵی بکەن بە دەقە چەسپاوەکان.

## شـــیعــە

**شیعە لە بنچنەی زمانەوانیدا:** بە مانای شوێنکەوتوو و پشتیوان دێت، هەر کۆمەڵێك لەسەر شتێك کۆبوونەوە ئەوا ئەمانە شیعەن.

(شايعته على الأمر مشايعة): واتە بەچاکی بەدواداچوونم بۆ کرد، بەم مانایە دێت چ لە ڕووی (وزن)ەوە چ لە ڕووی واتاوە[1]، ئەم فەرمایشتەی پەروەردگاریش لەوەوەیە: ﴿ فِي شِيَعِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾ الحجر: ١٠.واتە: (بۆ سەر گەل و هۆزو میللەتانی پێشوو).﴿ وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِۦ لَإِبْرَٰهِيمَ ﴾الصافات: ٨٣.[2] واتە: (بێگومان لە شوێنکەوتەی نوح - ئیبراهیم -ە "سەلامی خوایان لێبێت").

**لە زاراوەدا:** شیعە بریتییە لەوانەی بەتایبەت لە دەوری ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) کۆبوونەوەو پشتی ئەویان گرت، بانگەشەی ئەوەیان کرد کە ناوبراو ئیمامە بە دەق (نص) و ڕاسپاردن (وصية) وەك ئیمام جا چ بە ئاشکرا یاخود بە نهێنی.

---

ئاسمانیش بەسەریدا ڕژان، ئای چەند چاو هەن لە دەنووکی باڵندەدا مادام خاوەنەکەی لە نیوەشەودا لە ترسی خوا بگرییێت، ئای چەند دەست هەن لە مەچەکەکەیاندا دەرهاتووە کەچی بەردەوام خاوەنەکەی لە نیوەشەودا پشتی پێدەبەست لە کورنووش بردن بۆ خوای گەورە./البيان والتبيين للجاحظ ٢/١٢٤-١٢٥.

[1] المصباح المنير، والقاموس المحيط، وكلاهما مادة (شاع).

[2] شرح الحور العين ٢٣٢.

بڕوایان وایە کە ئیمامەت تەنها بۆ کوڕو نەوەکانی ئەوە، جا ئەگەر ئیمامەت لەوانەوە دەرچوو ئەوا بەهۆی ستەمکاری ئەوانی ترەوەیە یاخود بەهۆی بەکارهێنانی توقیەیە[1].

شیعە وەك بزوتنەوەیەکی سیاسی ڕوون لە دوای کوژرانی ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) بە دەستی خەواریجەکان بەدەرکەوت، ڕەگ و ڕیشەی شیعە دەگەڕێتەوە بۆ کاتی ڕاجیایی لەبارەی ئیمامەت.

## پیڕو تاقمەکانی شیعە:

شیعە چەندین پیڕو تاقمی زۆرن کە بەپێی وتەی (مەقریزی) دەگاتە سێ سەد پیڕ[2]، کە دەچنە ژێر سێ تاقمەوە کە بریتین لە: زیادەڕۆچووەکان، زەیدییەکان، ئیمامیەکان و ئەمە دابەشکردنی ئەشعەریی[3]، ئیبن حەزم[4]، ئیجی[5]، کرمانی[6]، سەفارینی[7].

بەڵام ئەو دابەشکارییەی کە نووسەرانی دیکەی تاقمەکان باسیان کردووە[8]، ئەوا ئەچنە ژێر چەتری ئەو سێ بەشە.

---

[1] الملل والنحل للشهرستاني ١٤٤/١ والفرق الإسلامية للكرماني ٣٣ وشرح المواقف للسيد الشريف ٣٨٤/٨. سەیری ئەمەش بکە: مقالات الإسلاميين ٦٥/١ ومقدمة ابن خلدون ١٨٣.

[2] خطط المقريزي ٣٥١/٢.

[3] مقالات الإسلاميين ٦٦/١ و ٨٨ و ١٣٦.

[4] الفصل لإبن حزم ٣٥/٥، تیایدا هاتووە: تاقمە بۆچوون نازێك و دزێوەکانی شیعیەکان سێ تاقمن: جارودی کە لە زەیدیەکانن، ئیمامیە کە لە ڕافیزیەکانن، پاشان زیادەڕۆچووەکان.

[5] المواقف ٣٨٥/٨.

[6] الفرق الإسلامية للكرماني ٣٣.

[7] لوامع الأنوار البهية ٨٠/١.

[8] بۆ نمونە:

سێ بەش: زەیدی، ئیمامی، باتینیەکان. ابن المرتضى لە: (المنية والأمل ٨٩) بەوشێوەیە دابەشی کردووە.

ئیسفەراییني لە (التبصير ٢٤)دا و نشوان لە (شرح الحور العين ٢٣٥)دا و ڕازی لە (اعتقادات فرق المسلمين ٧٧)دا بە هەمام شێوە بۆ سێ بەش دابەشیان کردووە: زەیدی، ئیمامی، کیسانی.

## بەشی یەکەم: زیادەڕۆچووەکان:

ئەمانە زیاد ڕۆچوون لە بارەی ئیمامەکان، تا ئیمامەکانیان لە سنووری مرۆڤ بردنە دەرەوە، وەك خوا ڕەفتاریان لەگەڵ ئیمامەکانیاندەکرد.

ئەو بنەمایانەی لە ناو تاقمە شیعیەکان دەرکەوتن بریتین لە: وێچواندن، ئاوێتە بوون (حلول)، گیانگۆڕکێ (التناسخ)، گۆڕانی ویستی خوا (بداء)، تەئویل، بێ باوەڕی[1].

١- وێچواندن و جەستەدار کردن (التشبيه والتجسيم): بریتیە لە چواندنی زاتی خوای گەورە بە بەدیهێنراوەکانی، هەروەها وێچواندنی سیفەتەکانی خوای گەورە بە سیفەتەکانی بەدیهێنراوان.

ئەو تاقمانەی شیعە کە بڕوایان بە وێچواندن و جەستەدار کردن (التشبيه والتجسيم) هەیە ئەمانەن:

بەیانیەکان: بریتین لە شوێنکەوتووانی (بەیانی کوڕی سەمعانی تەمیمی)، ناوبراو بڕوای وابوو کە پەرستراوەکەی مرۆڤێکە لە نوور، ئەندامەکانی لەسەر شێوەی ئەندامەکانی مرۆڤن، بڕواشی وابوو کە هەموو ئەندامەکان لە ناودەچن تەنها

بەغدادی لە (الفرق بين الفرق ٢١)دا بۆ چوار بەش دابەشی کردووە: زەیدی، ئیمامی، کیسانی، و زیادەڕۆچووان.

شەهرستانی لە (الملل والنحل ١٤٥/١)دا بۆ پێنج بەش دابەشی کردووە: زەیدی، ئیمامی، کیسانی، زیادەڕۆچووان، ئیسماعیلی.

نشوان لە (شرح الحور العين ٢٠٦)دا بۆ شەش بەشی دابەش کردووە: سەبەئی، سحابی، غرابی، کاملی، زەیدی، ئیمامی.

مەقدسی لە کتێبی (البدء والتأريخ ١٢٤/٥) ئەو تاقم و بەشانەی شیعە کە باسکراون گەڕاندوویەتیەوە بۆ: زەیدی، ئیمامی.

[1] سەیری ئەم بنەمایانە بکە لە: الملل والنحل للشهرستاني ١٧٦/١ و لاپەڕەکانی دواتری. لە کتێبەکەی خۆشمدا (الحركات الهدامة في الإسلام ١٣ لاپەڕەکانی دواتری).

ڕووخسار (وجه)ی خواکەی نەبێت[1].

موغەیریەکان: بریتین لە شوێنکەوتووی (موغەیرەی کوڕی سەعید عیجلی)، ناوبراو بڕوای وابوو کە خوای گەورە وێنە و جەستەی هەیە کە ئەندامەکانی لەسەر شێوەی پیتی هەجوو (هجاء)ن، وێنەکەشی وێنەی پیاوێکە لە نوور، تاجێکی نوورینی لەسەرە، دڵێکی هەیە کە دانایی و کار لەجێی و حیکمەتی لێ هەڵدەقوڵێت[2].

مەنصورییەکان: بریتین لە شوێنکەوتووی (ئەبو مەنصوری عیجلی)، خۆی بە پەروەردگاری خۆی چوواند، واگومانی ئەکرد کە بەرز بووەتەوە بۆ ئاسمان، خوا دەستی خۆی بەسەریدا هێناوە، پێی وتووە: ئەی کوڕی شیرینم لە منەوە پەیام ڕابگەیەنە[3]، دواتر دایبەزاندووەتە سەر زەوی، جا ناوبراو ئەو پارچەیەیە لە ئاسمانەوە هاتووەتە سەر زەوی، کە لەو فەرمایشتەی خوای گەورەدا باس کراوە: ﴿ وَإِن يَرَوْاْ كِسْفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ سَاقِطًا يَقُولُواْ سَحَابٌ مَّرْكُومٌ ﴾ الطور: ٤٤. واتە: (خۆ ئەگەر پارچە "ئەستێرەیەکیان" تێ بگرێت و ڕوو بەزەوی دابەزێت ئەو نەفامانە دەڵێن: هیچ نیە!! پەلە هەورەو نیشتۆتە سەریەك!!).

٢- ئاوێتە بوون (حلول): بریتییە لەوەی خوای گەورە بە زاتی خۆی یان بە گیانی خۆی لەگەڵ مرۆڤێکدا ئاوێتە ببێت و لەناو جەستەی مرۆڤەکە جێگیر ببێت. جا ئەکرێت ئاوێتە بوون بە بەشێکیش بێت وەك درەوشانەوەی تیشکی خۆر لە پەنجەرەدا، دەشکرێت ئاوێتە بوونەکە هەمەکی و گشتی بێت وەك دەرکەوتنی فریشتە

---

[1] الفرق بين الفرق ٢٢٦ ومقالات الإسلاميين ٦٧/١ والمواقف ٣٨٥/٨.

[2] الملل والنحل للشهرستاني ١٨٠/١. و بڕوانە: الفرق بين الفرق، والمواقف، هەر دوو سەرچاوەکەی پێشوو.

[3] الفرق بين الفرق، سەرچاوەی پێشوو، والمواقف ٣٨٦/٨ وفرق الشيعة للنوبختي ٣٨.

لە کەسێکدا[1].

مەزهەبی ئاوێتە بوون (الحلول) مەزهەبێکی کۆنە، یەك ئەگرێتەوە لەگەڵ بۆچوونی نەصرانیەکان سەبارەت بە عیسا (سەلامی خوای لێبێت)[2].

ئەو تاقمە شیعانەی کە بڕوایان بە ئاوێتە بوون (حلول) هەیە ئەمانەن:

سەبەئیەکان: شوێنکەوتووی عەبدوڵای کوڕی سەبەئن، کە ناوبراو گومانی وابوو کە عەلی پێغەمبەرە، دواتر زیادەڕەوی کرد تا گومانی برد کە عەلی خوایە، ئەمەش بەوەی گیانی خوای گەورە، لەگەڵ لاشەی عەلی ئاوێتە بووە، کاتێك ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) گوێبیستی ئەمە بوو، فەرمانی سووتاندنی بۆ هەندێك لەوانە دەرکرد، ترسا لەو ئاشوویە، بۆیە ئیبن سەبەئی شاربەدەر کرد وڕەوانەی کرد بۆ(مەدائن)، کاتێك ئیمامی عەلی کوژرا، (عەبدوڵای کوڕی سەبەء) گومانی وابوو کە ئیمامی عەلی نەکوژراوە، بەڵکو ئەوەی کوژرا شەیتان بوو کە لە بەرچاوی خەڵك هاتە سەر وێنەی ئیمام، عەلی چووەتە ئاسمان هەروەك چۆن عیسای کوڕی مەریم (سەلامی خوای لێبێت) پێشتر بەرزبووەتەوە بۆ ئاسمان.

هەندێك لە سەبەئییەکان گومانیان وابوو کە عەلی لە ناو هەورەکاندایە، گرمەو هۆڕەی هەورو بریسکەکەی قەمچی عەلین. هەر یەکێك لەوانە گوێی لە دەنگی هەور بووبایە دەیوت: سڵاوت لێبێت ئەی ئەمیری بڕواداران[3].

بەیانیەکان: لەبەر ئەوەی بەیانی کوڕی سمعان گومانی وایە خۆی خوایە[4].

---

[1] الملل والنحل للشهرستاني ١٨٢/١. و سەیری ئەمانەش بکە: التبصير في الدين ١٠٥. و مقالات الإسلاميين ٧٤/١. و المقالات والفرق للقمي ٤٧ و المواقف، سەرچاوەی پێشوو.

[2] الملل والنحل للشهرستاني ١٧٨/١.

[3] الفرق بين الفرق ٢٣٣ و ٢٥٥ والبدء والتأريخ ١٢٥/٦ والتبصير في الدين ١٠٣ والفصل لإبن حزم ٣٦/٥ والمواقف ٣٨٥/٨. و سەیری ئەمانەش بکە: فرق الشيعة للنوبختي ٢٢ ونشأة الفكر الفلسفي في الإسلام ٣٦/٢.

[4] الفرق بين الفرق ٢٣٧ و ٢٣٤ هاتووە: هەندێکیان لە پێڕی (حربیە)ن، کە بڕوایان وابووە سەرکردەکەیان (عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی حەربی کیندی) خوایە. التبصير فى الدين ١٠٤.

عومیریەکان: بریتین لە شوێنکەوتووی عومیری کوڕی بەیانی عجلی، ئەمانە جەعفەری صادقیان دەپەرست، ناوی پەروەردگاریان لە ناوبراو نابوو[1].

ئەبو موسلیمیەکان: بریتین لە شوێنکەوتووی (ئەبو موسلیم)ی خوراسانی، بڕوایان وابوو کە (ئەبو موسلیم) بووەتە خوا بەهۆی ئاوێتە بوونی گیانی خوا لەگەڵ لاشەی ناوبراو[2].

حلمانیەکان: بریتین لە شوێنکەوتووی (ئەبو حلمانی دیمەشقی فارسی)، ئەوانە بڕوایان وابوو خوا ئاوێتە دەبێت لەگەڵ مرۆڤی جوان، جا ئەگەر یەکێکیان وێنەیەکی جوان و قەشەنگیان بینیبا کورنووشیان بۆ دەبرد، بەو گومانەی خوا لەگەڵ ئەو وێنەیە ئاوێتە بووە[3].

شریعیە: بریتین لە شوێنکەوتووانی شریعی، ئەوانە گومانیان وابوو، خوای گەورە لەگەڵ پێنج کەس ئاوێتە بووە، کە بریتین لەمانە: پێغەمبەر، عەلی، فاتیمە، حسن، حسین، بڕوایان وابوو کە ئەم پێنجانە خوان[4].

موقنعییەکان: ئەمان لە پشت ڕووباری (جەیحون) نیشتەجێ بوون، ئەوانە بڕوایان وابوو کە (موقنیع) خوایە[5].

عەزافریەکان: ئەوانەن کە بڕوایان وابوو (کوڕی ئەبو عەزافیر) خوایە[6].

ئیسماعیلییەکان: ئەوانە بڕویان وایە کە ئاوێتە بوونی خوا تەنها لەگەڵ ئیمامەکانە، بۆیە (ئیبن هانی ئەندەلوسی) شاعیر بە هۆنراوە دێتە ئاخاوتن لەگەڵ خەلیفەی فاتیمی (موعیز لیدینلاه):

---

[1] الفرق بين الفرق ٢٤٩.

[2] الفرق بين الفرق ٢٥٧.

[3] الفرق بين الفرق ٢٥٩ والتبصير في الدين ١١٠.

[4] الفرق بين الفرق ٢٥٢ و مقالات الإسلاميين ٨٣/١ والتبصير في الدين ١٠٧.

[5] الفرق بين الفرق ٢٢٦ والتبصير في الدين ١٠٩ و ٔتقادات فرق المسلمين ١٢٣.

[6] الفرق بين الفرق ٢٢٧ والتبصير في الدين ١١٢.

ما شأت لا ما شاءت الأقدار فاحكم فأنت الواحد القهار[1]

واتە: ویستت لەسەر چییە هەر ئەوە دێتەجێ نەوەك ئەوەی قەدەر دەیەوێت، حوکم بدە بەڕاستی هەر تۆی تاکی زاڵ.

٣- گیانگۆڕکێ (تناسخ): بریتییە لە گەڕانەوەو ڕۆیشتنی ڕۆح (گیان) بۆ غەیری جەستەی یەکەم[2].

ئەو پێڕە زیادەڕۆچوانەی بڕوایان بەمە هەیە:

بەیانیەکان: بریتین لە شوێنکەوتووی بەیانی کوڕی سەمعان، ناوبراو دەڵێت: گیانی خوا گەڕاوەتەوە ناو لاشەی پێغەمبەران و پێشەواو ئیمامەکان، ئەم گەڕانەوەیە بەردەوام بوو تا گەیشتە (ئەبو هاشمی عەبدوڵای کوڕی موحەممەدی کوڕی حەنیفە)، دواتر ڕۆحەکە لە (ئەبو هاشم)ەوە بۆ (بەیان) هاتووە، بەیان بانگەشەی خوایەتی بۆ خۆی کرد بەپێی مەزهەبی ئاوێتەبوونی خۆی لەگەڵ خوا[3].

جەناحییەکان: بریتین لە شوێنکەوتوانی (عەبدوڵای کوڕی موعاویەی کوڕی عەبدوڵای کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب)، گومانی وابوو کە خوا لەگەڵ ئەودا ئاوێتە بووە، گیانی خوا لەگەڵ ئادەم دواتر(شیث) پاشان لەگەڵ پێغەمبەران و ئیمامەکان ئاوێتە بوو تا گەیشتە ئیمامی عەلی، دواتر ئەم گیانە ئاوێتە بوو لەگەڵ لاشەی سێ کوڕەکەی ئیمام، دوای ئەمە ئەو گیانە هاتە ناو لاشەی عەبدوڵای کوڕی معاویە[4].

ئەوانەی بڕوایان بە گیانگۆڕکێ (تناسخ) هەیە. نکۆڵی دەکەن لە بوونی ڕۆژی دوایی و دەڵێن: (زیندوو بوونەوەو ڕۆژی دوایی بوونی نیە، بەڵکو تەنها ڕۆحە کە

---

[1] تبين المعاني في شرح ديوان ابن هاني ٣٦٥.

[2] الغلو والفرق الغالية ١٢٩ نقلا عن ابن سينا. الكليات لأبي البقاء ٣٠٥ و كشاف اصطلاحات الفنون ٥١٢/١.

[3] الفرق بين الفرق ٢٣٧.

[4] الفرق بين الفرق ٢٤٦.

دەگەڕێتەوە لـە شـێوەی وێنـەدا، جـا ئـەوەی کەسـێکی چـاکەکار بێـت پاداشـت دەدرێتەوە، بەوەی ڕۆحەکەی دەگەڕێتەوە لە جەسـتەیەکدا کـە ناخۆشـی و ئـازاری پێنەگات، ئەو کەسەش کە خراپەکارە، پاداشات دەدرێتەوە بـەوەی کـە ڕۆحەکـەی دەگەڕێتەوە لە جەستەیەکدا کە دەبێتە مایەی ئێش و ئازار بۆ ڕۆحەکـەی، زینـدوو بوونەوەو ڕۆژی دوایی تەنها بریتییـە لـە گەڕانـەوەی ڕۆح، دونیـاش بـەردەوام بـەم شێوەیە دەبێت)[1].

٤- بۆ دەرکەوتن و گۆڕانی ویستی خوا (بداء): ئەم چەمکە چەند مانایەکی هەیە:

- بۆ دەرکەوتن لە زانستدا (البداء في العلم): بریتییە لەوەی خوای گەورە شـتێکی بـۆ دەربکەوێت بەپێچەوانەی ئەوەی کە دەیزانی.
- بۆ دەرکەوتن لە ویستدا (البداء في العلـم): بریتییە لەوەی خوای گـەورە ڕاسـتی بـۆ دەربکەوێت، بە پێچەوانەی ئەوەی کە ویستویەتی و فەرمانی لەبارەوە داوە.
- بۆ دەرکەوتن لە فەرماندا (البداء في الأمر): بریتییە لەوەی خـوا فـەرمان بەشـتێك بکات، دواتر فەرمان بکات بەشتێکی تر بەپێچەوانەی فەرمانەکەی پێشوو[2].

زیادەڕۆچووەکان وتویانە: (خوای گەورە چەند شتێکی بۆ دەردەکەوێت، لە هەندێك لە کاتەکاندا ویستی وایە شتێك بکات دواتر فەرمانی بوونی پێ ناکات، بەهۆی ئـەوەی بەپێچەوانەی ویست و فەرمانی ئەو شتی بۆ دەرەکەوێت)[3].

موختاری کوڕی ئەبو عوبەیدی سەقەفی، پێشتر خەواریج بوو، دواتر بووەتە زوبەیری، پاشان بووەتە شیعی، دواتر کیسانی، دانی نا بە ئیمامەتی موحەممەدی کوڕی حەنیفە لە دوای میری بڕواداران عەلی کوڕی ئەبو تالیب، وتراوە لە دوای: حەسەن و حوسەین (ڕەزای خوایان لێبێـت). موختـار بۆیـە بـە بیروکـەی گـۆڕانی ویسـتی خـوا (البـداء)

---

[1] مقالات الإسلاميين ١/١١٩.

[2] الملل والنحل للشهرستاني ١/١٤٨ طبعة محمد سيد كيلاني.

[3] مقالات الإسلاميين ١/١١٣.

گەیشت، چونکە بانگەشەی ئـەوەی دەکـرد کـە دەزانێـت چـی ڕوودەدات، جـا ئـەم زانینەی بە هۆی هاتنی سروش بێت بۆی یاخود بەهۆی پەیامەکەی ئیمامەوە. ئەگەر پەیمانی ڕوودانی شتێکی بە هاوەڵانی دابوایە، ئەگەر ڕاست هاتبایەجیّ، ئەوا ئەمـەی دەکردە بەڵگە لەسەر ڕاستێتی بانگەشەکەی، ئەگەر وەك قسـەکەی ڕوودەوەکـە ڕووی نەدابووایە، دەیوت: بۆ پەروەردگارتان وا دەرکەوت[1].

کاتێك ناوبراو هێزەکەی بۆ جەنگ کردن لەگـەڵ مصـعبی کـوڕی زوبـێر خسـتەڕوو، پەیمانی سـەرکەوتنی بـە هێزەکەیـدا، کەچـی هێزەکـەی شکسـتی خـوارد، زۆربـەی سەربازەکانی کوژران، بە مختاریان وت: ئەی بۆچی پەیمانی سەرکەوتنت بەئێمـەدا بـە سەر دوژمنەکانماندا؟ وتی: چونکە خوای گەورە پێشتر ئەو پەیمانەی پێدام، کەچی بـە پێچەوانە بۆی دەرکەوت. ئەم ئایەتـەی وەك بەڵگـە هێنایـەوە: ﴿يَمْحُوا اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ﴾ الرعد: ٣٩.واتە: (خوا ویستی نەمانی لەسەر هـەر چـییەك بێـت، لـەناوی دەبات و دەیکوژێنێتەوە، یان دەیهێڵێتەوەو پایەداری دەکات). بغـدادی وتـی: ئەمـە هۆکاری داننانی کیسانیەکانە بە بۆچوونی: گۆڕانی ویستی خوا (البداء)[2].

٥- تەئویل: بریتییە لە لادانی وتە لە ڕووخسارو ڕووە دیارەکەی بۆ مانایەك کە لـە خـۆی بگرێت، ئەمەش چ بەڵگەیەکی سەلمێنراو و بڕاوە لە بەڵگە براوە (قطعي)ەکان بێت یان بەڵگەیەکی گوماندار ئەمەی پێویست کردبێت.

تەفسیر بریتییە لە: ڕوونکردنەوەی مانای بێژەییەکە جا نزیك یان شاراوە بێت[3].

ڕێگەی تەئویل کردن بە لەبەرچاو گرتنی مەرجەکانی نزیکترین ڕێگەیە لە ڕاسـتیەوە، ئەمە ڕای (عیزی کـوڕی عەبدوسـەلام)ە. مەبەسـت لـە بەرچـاوگرتنی مەرجـەکانی

---

[1] الملل والنحل للشهرستاني ١/١٤٥-١٤٧. و بڕوانە: الكامل للمبرد ٣/٢٦٤.
[2] الفرق بين الفرق ٥١.
[3] تهذيب الأسماء واللغات ٢/١٥.

ئەوەیە کە زمانی عەرەبی تەئویلەکە هەڵبگرێت[1].

سەبارەت بەو تەئویلەی کە زۆرێك لە زیادەڕۆچووان کردوویانە، بۆ پشتگیری کردنی بانگەشەکەیان سەرباری ئەوەی کە تێکدەگیرێت لەگەڵ ئەو بنەمایانەی کە بە ڕوونی لە دەقە ڕۆشنەکانی قورئانی و سوننەتدا هاتوون، ئەمە تەئویلێکی ڕەتکراوەیە.

بۆ نموونە:

خەتتابیەکان ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەیان تەئویل کردووە: ﴿ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴾ ص: ٧٢. ئەمەی لەو ئایەتەدا هاتووە ئادەمە و ئێمەش ئەوەی ئەوین. جا خەتتابیەکان (ئەبو خەتاب)یان پەرست، گومانیان وابوو کە ناوبراو خوایە، بەهەمان شێوە گومانیان وابوو جەعفەری صادقیش خوای ئەوانە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا (ئەبو خەتاب) لە جەعفەری صادق و تەنانەت لە عەلیش گەورەترە[2].

ئەبو مەنصوری عیجلی وتی: مرداربوو، خوێن، گۆشتی بەراز، مەیی، قومار، جگە لەم شتە قەدەغەکراوانە حەڵاڵن و خوای گەورە ئەو شتانەی لە ئێمە حەرام نەکردووە، شتێکیشی حەرام نەکردووە کە خۆمان پێی بەهێز بین، ئەمانە تەنها ناوی پیاوانێکن کە خوای گەورە حەرامی کردووە پشتگیری و دۆستایەتیان بکرێت، لەم ئایەتەشدا تەئویلی کردووە: ﴿ لَيْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوٓاْ ﴾ المائدة: ٩٣. بەمەش فەرزەکانی نەهێشتن وتی: ئەمانە ناوی پیاوانێکن کە خوای گەورە دۆستایەتی ئەوانی پێویست کردووە[3].

---

[1] المسامرة بشرح المسايرة ٣٧.

[2] مقالات الإسلاميين ١/٧٧.

[3] مقالات الإسلاميين ١/٧٥.

٦- ئاڕاستەكانی بێ باوەڕی و بەڕەڵایی و خۆ داڕنین لە ڕەوشت و ئایین: حەمزەی كوڕی عمار كچی خۆی مارەكرد، سەرجەم شتە قەدەغەكراوەكانی حەڵاڵ كرد، هەروەها وتیشی: هەر كەسێك ئیمامی ناسیبێت حەزی لە چییە با بیكات، چونكە هیچی لەسەر نییە[1].

دەستەی (معمریە) كە سەر بە (خطابیة)كانن: مەیی، زینا، سەرجەم قەدەغەكراوەكانی تریان بە حەڵاڵ دانا، نوێژو زەكات و ڕۆژوو و حەجیان فەرامۆش كرد، ئەمەش لە میانەی تەئویل كردنی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْ ﴾ النساء: ٢٨. پێیان وت: ئەی أبو خەتتاب ئەم كۆت و بەندانەمان لەسەر لابەرە و بارەكەمان لەسەر سووك بكە، مەبەستیان لە نوێژ و ڕۆژوو و زەكات و حەج بوو. جا ئەوەی پێغەمبەرو پەیامبەری پێشەوای ناسی ئەوا چی حەز دەكات با بیكات[2].

جەناحیەكان بێ باوەڕ بوون بە بەهەشت و ئاگری دۆزەخ، مەیی، مردار بوو، زینا، نێربازی، سەرجەم قەدەغەكراوەكانی تریان حەڵاڵ كرد، هەروەها سەرجەم پەرستشەكانیان پەكخست.

وتیان: ئەو پەرستشانەی كە لە قورئاندا باسیان كراوە، وەك نازناو بەكارهاتوون بۆ ئەوانەی لە ئالوبەیتی ئیمامی عەلین كە پێویستە پشتگیریان بكرێت.

ئەو شتانەش كە قەدەغەكراون لە قورئانی پیرۆزدا تەنها نازناون بۆ ئەو كۆمەڵەی كە پێویستە موسڵمان ڕقی لەوان ببێتەوە وەك: ئەبو بەكر، عومەر، تەڵحە، زوبەیر، عائیشە[3].

---

[1] فرق الشيعة للنوبختي ٢٨ والمقالات والفرق للقمي ٣٤.

[2] فرق الشيعة للنوبختي ٤٢-٤٣. سەیری ئەمەش بكە: المقالات والفرق للقمي ٥١. و بڕوانە: مقالات الإسلاميين ١/٧٨ والفرق بين الفرق ٢٤٨.

[3] الفرق بين الفرق ٢٤٦. و بڕوانە: المواقف ٨/٣٨٦.

لە پەیامەکەی (عوبەیدوڵای مەهدی کوڕی حوسەینی قەیرەوانی) کە بۆ (سولەیمانی کوڕی حەسەنی جەنابی) ناردوویەتی هاتووە: ئامۆژگاریت دەکەم بەوەی گومان لە دڵی خەڵکیدا دروست بکەیت سەبارەت بە: (قورئان، تەورات، زەبوور، ئینجیل)، بانگیان بکە بۆ پەکخستنی شەریعەتەکان، پووچ کردنەوەی ئیمان بە دوارۆژو زیندووبوونەوەو بوونی فریشتە لە ئاسمان و بوونی پەری (جنۆکە) لە زەویدا[1].

ئەبو مەنصوری عیجلی خاوەنی دەستەی (مەنصوریە)، دەڵێت: پەیامبەران هەر دێن و کۆتایی نایەن، هەروەها پەیامیش ناپچڕێت[2].

ئەم پێڕە بە زیادەڕۆچووەکان ناونراون، چونکە زیادەڕۆچوون لە ئیمامی عەلیدا (ڕەزای خوای لێبێت)، شتی زۆر گەورەیان لەبارەی ناوبراو دەوروژاند[3].

سەرجەم تاقمەکانی موسڵمانان ئەو زیادەڕۆچووانەیان تەکفیر کرد، بەهۆی ئەوەی بە شێوەیەکی ڕووت و بەرەڵا لە ئیسلام دەرچوون، تەنانەت (ئیبن بابویەی قومی شیعی ئیمامی) لەبارەی ئەوانەوە وتویەتی: (بڕوامان وایە کە زیادەڕۆچووەکان بڕوایان نییە بە خوای گەورەو خاوەن ناوی جوان، ئەوانە خراپترن لە جولەکە و نەصرانی و ئاگرپەرستەکان).

بەهەمان شێوە شێخ (موفید) کە لە ئیمامیەکانە حوکمی ئەوەی داوە کە ئەوانە سەرگەردان و کافرن و دەرچوون لە بازنەی ئیسلام. دواتر وتویەتی: میری باوەڕداران (سەلامی خوایان لێبێت) حوکمی کوفرو کوشتن و سووتاندنی بە ئاگر لەبارەی ئەوانەوە داوە، هەروەها ئیمامەکانیش (سەلامیانخوایان لێبێت) ئەوانەیان تەکفیر

---

[1] الفرق بين الفرق ٢٩٦، والتبصير في الدين ١٢٠.
عوبەیدوڵای باپیری پادشاکانی دەوڵەتی عوبەیدی (فاتیمی) کە لە میسر بوو، ٣٢٢ك مرد. جەنابی قرمتی ئەو کەسەیە کە بەردە ڕەشەکەی لە شوێنی خۆی هەڵگرت ٣١٧ك./ پەڕوایزی: التبصير في الدين.

[2] الملل والنحل للشهرستاني ١/١٨٢.

[3] مقالات الإسلاميين ١/٦٦.

کردووەو حوکمی دەرچوونیان لە ئیسلام لەبارەی ئەوانەوە داوە[1].

بناغەی بانگەوازی زیادەڕۆچووەکان لەسەر پەکخستنی شەریعەتەکان بنیاتنراوە، ئەمەش:

لەبەر ئەوەی (غیاریەکان): کە کۆمەڵێکن لە ئاگرپەرستەکان، خوویان گرتبوو و خۆیان لێ ڕاهێنا لەسەر تەئویل کردنی شەریعەتەکان، ئەمەش بەتایبەت لەو کاتەی کە هێزو شکۆی ئیسلام باڵی کێشابوو، جا تاقمی ناوبراو بەشێوەیەك تەئویلەکەیان دەکرد کە بگەڕێتەوە سەر ڕێساکانی باوباپیرانیان، بۆیە کۆبوونەوەو باسی ئەو موڵك و دەسەڵاتەیان دەکرد کە باپیرانیان هەیانبووە، وتیشیان ناتوانین ڕووبەڕووی موسڵمانان ببینەوە بە شمشێر، بەهۆی ئەوەی موسڵمانان بە شمشێر و دەسەڵاتیان زاڵ بوون، بەڵام پەنا دەبەینەبەر تەئویل کردنی شەریعەتەکان بەشێوەیەك کە لەگەڵ ڕێساکانمان بێتەوە، بەمەش لاوازەکانی موسڵمانان بە پلەبەندی کێش بکەین، ئەمەش دەبێتە هۆی تێکگیران و شەڵەژانیان[2].

## بەشی دووەم: زەیدییەکان:

ئەوانە بریتین لە شوێنکەوتووی: زەیدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی أبو طالب (ڕەزای خوایان لێبێت)، ئەوانە بڕوایان بە ئیمامەتی زەید هەبوو[3].

---

(1) دراسات في الفرق ٧٦ نقلا عن عقائد الإمامية لإبن بابوية باب: نفي الغلو، وتصحيح عقائد الإمامية لليشخ المفيد - باب الغلو والتفويض. و بڕوانە: مقدمة فرق الشيعة للنوبختي التي كتبها محمد صادق آل بحر العلوم.

(2) المواقف و شرحه للسيد شريف الجرجاني ٣٨٩/٨. سەیری هاوشێوەیەکی نزیك لەمە بکە لە: الفصل لغبن حزم ٢٧٣/٢ وتلبيس إبليس ١٠٣. وخطط القريزي ٣٦٢/٢ والمنية والأمل ٩٦ ورد محمد عبده على هانوتو - الأعمال الكاملة للإمام محمد عبده ٢١٠/٣.

(3) مقالات الإسلاميين ١٣٦/١ والتنبيه والرد ٣٣ والفرق بين الفرق ٢٢ والتبصير في الدين ٢٥ و شرح حور العين ٢٣٥ والملل والنحل للشهرستاني ١٥٣/١ و إعتقادات فرق المسلمين ٧٧ والمنية والأمل ٨٩ والمواقف ٣٩١/٨ والفرق الإسلامية للكرماني ٥٧ وخطط المقريزي ٣٥٢/٢ ومقدمة إبن خلدون

پێنج هەزار کەس لە دانیشتوانی شاری (کوفه) پەیمان و بەیعەتیان بە زەید دابوو، بە پشت بەستن بەمانە ناوبراو جەنگی کرد لەگەڵ میری کوفە کە ناوی (یوسفی عومەری سەقەفی) کارگێڕی (هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك) بوو، زەید بیستی کە هەندێك جوێن دەدەن بە ئەبو بەکر و عومەر، ڕێگری لەمە کرد و ئەمەی بە ناپەسەند دانا، فەرمووی: باپیرم عەلی ستایشی ئەم دوانەی کردووە. جا ئەوانەی جوێنیان دەدا لە زەید یاخی بوون و ئەمەیان ڕەت کردەوە بۆیە بە ڕەتکەرەوە (رافضة) ناوبراون، دواتر هەموویان زەیدیان بە جێهێشت، تەنها (نەزری کوڕی خوزەیمەی عەبسی) و (معاویەی کوڕی ئیسحاقی حارسە) و نزیکەی دوو سەد پیاو نەبێت، هەموویان لەگەڵ زەید کوژران، ئەمەش لە ساڵی ١٢٢ك-٧٣٨ز. (یەحیای کوڕی زەید) هەڵات بۆ خوراسان، لەوێش چووە ناحیەی (جوزجان)، پاشان دەرچوو لە دژی (نەصری کوڕی سەیار) والی خوراسان، نەصر سەرکردەیەکی خۆی بۆ ڕەوانەکرد کە ناوی (سەلەمی کوڕی ئەحوەزی مازنی)یە بە سێ هەزار سەربازەوە، (یەحیای کوڕی زەید) شەهید کرا، ئەم ڕووداوە لە ساڵی ١٢٦ك بوو، گۆڕی یەحیا لە ناحیەی (جوزجان)ە[1].

---

١٨٤ والزيدية للأكوع ١٤ نقلا عن فهرست لإبن نديم، والملل والنحل لإبن المرتضى، والرحيق للجنداري، و أوائل المقالات للشيخ المفيد.

[1] مقالات الإسلاميين ١/١٣٧ والتبصير في الدين ٢٦. سەیری ئەمانەش بکە: الفرق بين الفرق ٣٥ والغنية للشيخ عبدالقادر ١/٩٨ والملل و النحل للشهرستاني ١/١٥٥ وشرح الحور العين ٢٣٨ و اعتقادات فرق المسلمين، و سەرچاوەکانی پێشوو.

سەیری ئەمانەش بکە: الزيدية للأكوع سەرچاوەی پێشوو ١٨، هەندێك دەقی هێناوە لە زانا زەیدییەکانەوە، وەك: ئیمامی هادی و مقبلی و عیسای کوڕی یوسف و جگەلەوانەش، لەبارەی بەکارهێنانی ناوی (رافضة) بۆ ئەوانەی خۆیان بەری دەکەن لە ئەبو بەکرو عومەر. مەجدەدینی موئەیەدی موفتی یەمەن لە کاتی نووسینی پێشەکی بۆ کتێبی (زيدية: علي بن عبدالكريم الفضيل الصفحة) کۆدەنگی لەسەر ئەمە هێناوە. بەهەمان شێوە سەیری ئەم ناوەو هۆکاری ناونانەکە بکە لە (المصابيح لأبي العباس أحمد بن إبراهيم من علماء الزيدية ٣٩٠-٣٩٢) و چەند

## دەستەو پێڕەکانی زەیدی:

زەیدییەکان بۆ چەندین دەستەو پێڕ دابەش بوون، لێکۆڵەران لەئاست ژمارەیان ڕاجیان[1]، بەناوبانگترینیان ئەمانەن:

**١- جارودیە**: بریتین لە: شوێنکەوتوانی (ئەبو جارودی زیادی کوڕی مونزیری عەبدی کوفی مەدانی کوێرە)، ئەمە ئەو کەسەیە کە ئیمامی جەعفەر ناوی (سەرحوب)ی لێناوە، کە پێناسەی کردووە بەوەی شەیتانێکە لە دەریادا نیشتەجێیە. ئەبو جارود لە ساڵی (١٥٠ك) مردووە، وتراوە لە ساڵی ١٦٠ك، بڕوایان وابووە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) عەلی کوڕی ئەبو تالیبی دیاریکردووە بەناو نا بەڵکو بە (دەق وەسفی کردووە) کە تەنها لەودا دێتەجێ وەك: بەخشینی زەکات لەکاتی

---

گێرانەوەیەکی لەوبارەوە هێناوە، و بڕوانە: المنیة والأمل لإبن المرتضی ٩٣-٩٤ و تاج العروس مادە (رفض).

[1] لێکۆڵەران ڕاجیاییان هەیە لەمەر ژمارەی دەستەو پێڕە زەیدییەکان، بەم شێوەیەی خوارەوە:

سێ دەستەو پێڕن بریتین لە: جارودیە، سلیمانیە (جریریە)، بەتریە (أبتریە، صالحیە). بەغدادی لە: الفرق بین الفرق ٢٢ و ئیسفەراییني لە: التبصیر فی الدین ٢٤ و شەهرستانی لە: الملل والنحل ١٥٧/١ و ڕازی لە: اعتقادات فرق المسلمین ٧٧ وئیجی لە: المواقف ٣٩١/٨ و کرمانی لە: الفرق الإسلامیە ٥٧ و نشوان لە: شرح الحور العین ٢٠٧دا بەم شێوەیە دابەشان کردووە.

چوار دەستەو پێڕن: جارودیە، جریریە، بەتریە، یەعقوبیە. ئەمە ڕای مەقریزیە لە: الخطط ٤١١/٣.

شەش پێڕن: جارودیە (دابەش بوو بۆ دوو سێ دەستە)، سلیمانیە، بەتریە، نەعیمیە، بۆچوونەکانی پێڕێکیشی باس کردووە بێ ناوەکەی، یەعقوبیە، ئەمە ڕای ئەشعەرییە لە: کتێبی (المقالات ١٤٠/١-١٤٥) و ئیبن مورتەزا لە: المنیة و الأمل لا ٨٩ باسی کردووە کە شەش پێڕن. و بڕوانە: الغنیة للشیخ عبدالقادر ٩٨/١.

هەشت پێڕن: جارودیە، مەرسەدیە، ئەبرقیە، یەعقوبیە، عەمیمیە، ئەبتریە، جەریریە، یەمانیە. ئەمە ڕای عیسای کوڕی موحەممەدی کوڕی هارونی وەراق و هەندێکی تریشە، بەپێی ئەوەی مەسعودی لە: (مروج الذهب)دا هێناویەتی. موحەممەد موحیەدین عەبدولحەمید لە: پەراوێزی کتێبی ئەشعەری: (مقالات الإسلامیین) هێناویەتی.

خۆچەماندنەوە (ركوع) لە نوێژدا، بۆیە عەلی ئیمام بووە لە دوای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، هاوەڵانیش كوفریان كرد، بەوەی ئیمامی عەلیان فەرامۆش كرد و بەیعەتیان پێنەدا و ئەبو بەكریان كردە جێنشین.

لە دوای ئەو حەسەنی كوڕی عەلی ئیمامە، پاشان حوسەین لەدوای حسن ئیمامە[1].

٢- **سولەیمانیە (جریریە):** بریتین لە شوێنكەوتووانی سولەیمانی كوڕی جریری زەیدی، ناوبراو وتویەتی: ئیمامەت ڕاوێژ (شورا)یە، ڕاوێژیش بە دوو پیاو لە پیاوە چاكەكانی موسڵمانان دادەمەزرێت.

ئیمامەتی كەسی باش (مفضول)یان بە دروستی داناوە، ئەگەرچی كەسی باشتر (فاضل) لە هەموو باردۆخەكاندا چاكترە. ئیمامەتی ئەبو بەكرو عومەری بە تەواو داناوە. سولەیمان گومانی وابووە كە ئوممەت بەیعەتی بە هەر دوو ناوبراوەكە داوە، ئەوا كەسێكی تریان فەرامۆش كردووە، كە شیاوتر بووە لەوان، چونكە عەلی شیاوترە بووە بۆ ئیمامەت لەوان، لەگەڵ ئەوەشدا كە ئوممەت هەڵەی كردووە، لە بەیعەتدان بەو دوانە، مانای وانیە كوفرو لاسارییان كردبێت.

---

[1] مقالات الإسلاميين ١/١٤٠ و پەراوێزەكەی، والفرق بين الفرق بين الفرق ٣٠ والملل والنحل للشهرستاني ١/١٥٧ والفصل لإبن حزم ٤/١٥٧ والمنية والأمل ٩٠ والزيدية للأكوع ٢٤، و سەرچاوەكانی پێشوو.

(سەرحوب: شەیتانێكی كۆرەیە لە دەریادا نیشتەجێیە)، ئەمە نازناوی (أبو جارودی ئیمام)ی پێڕی (جارودیە)، كە لە زیادەڕۆچووەكانی زەیدییەكانن، بە ئاشكرا جوێن دەدەین بە أبو بكرو عمر، خوای گەورە ئەو دووانەی پاك گرتووە لەوەی دژەكان دەیڵێن، ئەمانە لە شاری صنعاء لە یەمەن بوونیان هەیە، (باوكی عەبدوڵای موحەممەدی باقر) ئەو ناوەی لێناوە./ تاج العروس شرح القاموس المحيط - مادة (سرحب)، طبعة الكويت. و انظر تلقيب الإمام الباقر أبا الجارود بالسرحوب في فرق الفرق الشيعة للنوبختي ٥٥.

سولەیمانیەکان ئیمامی عوسانیان بەکافر دادەنا، بەهۆی ئـەو ڕووداوانـەی دژەکـانی عوسمان ئەنجامیاندا لە دژیدا[1].

**٣- بتریه ( أبتریـه ):**شوێنکەوتووی دوو پیاون: یەکـەمیان: حەسـەنی کـوڕی صـاڵحی حەی، دووەمیان: کەسیری نەواء کە ناونراوە بە (ئەبتر).

بۆ چوونەکانی ئەمانە وەك بۆچوونی سولەیمانی کوڕی جەریرە، بەڵام تەنها لـەبارەی عوسمان وەستاون، نە ستایش نە سەرزەنشتیان نەکردووە[2].

هەر دوو تاقمی (سولەیمانیە) و (بەتریە) تاقمی (جارودیە) تەکفیر دەکـەن، چـونکە تاقمی (جاردویە) تەکفیری ئەبو بەکر و عومـەر دەکـات. بەهـەمان شـێوە تـاقمی (جارودیە)ش تەکفیری هەر دوو تاقمی (سـولەیمانیە) و (بەتریـە) دەکـات، بـەهۆی ئەوەی هەر دوو تاقمەکە تەکفیری ئەبو بەکرو عومەر ناکەن[3].

---

[1] مقـالات الإسـلاميين ١٤٣/١ والفـرق بـين الفـرق ٣٢ والتبصـير في الـدين ٢٥ والملـل والنحـل للشهرستاني ١٥٩/١ و شرح الحور العين ٢٠٧ و إعتقـادات فـرق المسلمين ٧٨ والمواقـف ٣٩٢/٨ والفرق الإسلامية للكرماني ٥٩ وخطط المقريزي ٣٥٢/٢ والزيديـة للأكـوع ٢٧. سـەيرى ئەمـەش بكە: الفرق الشيعة للنوبختي ٩ ... .

[2] مقالات الإسلاميين ١٤٤/١ والفرق بين الفرق ٣٢ والتبصير في الدين ٢٥ وشـرح الحور العـين ٢٠٧ والفرق الإسلامية للكرماني سەرچاوەی پێشوو ٦٠ والمنية والأمل ٩٠. و نوبختي لـە: فـرق الشـيعة ١٣ باسی کردووە. لە ٥٧ باسی ئەوەی کردووە کە ئەوانە کەم و کوڕی لە عوسمان دەگرن.
شەهرستانی لە کتێبی: الملل والنحل ١٦١/١ بۆ دوو پێڕ دابەشی کـردووون: (صـالحیە: هاوەڵـانی حەسەنی کوڕی صاڵحی کوڕی حەی. و بەتریە: هاوەڵانی کەسیری نەوائی ئەبتر، هەر دوو ناوبراوەکە لە مەزهەبدا کۆکن).
ڕازی لە کتێبی (إعتقادات فرق المسلمین ٧٨) بە: صالحیە ناوی ناوە. و ئیجی لە کتێبی (المواقـف ٣٩٢/٨) بە: بەتیریەی ثومي ناوی ناوە. و خطط للمقریزي ٣٥٢/٢. و بڕوانە: الزیدیة للأکوع ٢٧.

[3] الفرق بين الفرق ٣٤ والتبصير في الدين، سەرچاوەی پێشوو.

## ڕاو بۆچوونی زەیدییەکان:

١- هەر هەموو زەیدییەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە ئەوەی گوناهی گەورە دەکات سزا دەدرێت لە دۆزەخدا، بۆ هەتا هەتایی تیایدا دەمێننەوە، لە ئاگر دەرناچن[١]، زەیدییەکان لەم بۆچوونەیاندا وەك خەواریجەکان[٢] و قەدەرییەکانن[٣].

٢- کۆکن لەسەر بە ڕاستدانانی عەلی کوڕی ئەبو تالیب لە جەنگەکەدا و بەهەڵەدانانی دژەکانی[٤]. و کۆکن لەسەر ئەوەش کە عەلی ڕاستی پێکاوە لە دانانی دوو دادوەرەکە[٥].

٣- کۆکن لەسەر دژایەتی کردنی پێشەوا ستەمکارەکان و نەهێشتنی زۆرداری و بەرپاکردنی ڕاستی[٦]. زەید: دەرچوونی بە مەرجێك داناوە بۆ ئەوەی ئیمام ببێت بە ئیمام[٧].

٤- سەرباری ئەوەی بڕوایان وایە کە ئیمامی عەلی گەورەترین و باشترین هاوەڵە، لەگەڵ ئەوەشدا بۆچوونیان وایە خەلافەتی أبو بکر و عمر شەرعی و ڕەوایە، خۆیان لەم دوانە بەری نەکردووە، لەبەر ئەوەی زەیدییەکان بڕوایان وایە ئیمامەتی باش (مفضول) دروستە، سەرباری ئامادەبوونی باشتر (أفضل)، تەنها تاقمی (جارودیە) نەبێت ئەم بۆچوونەیان نییە[٨].

٥- مەرج نییە ئیمام پارێزراو (معصوم) بێت، ئیمامەتیان کورت هەڵهێناوە لە نەوەکانی فاتیمەدا (ڕەزای خوای لێبێت)، ئیمامەتی غەیری نەوەی ئەویان بە دروست

---

[١] مقالات الإسلاميين ١٤٩/١ والفرق بين الفرق ٣٤ و التبصير في الدين ٢٥.
[٢] الفرق بين الفرق، والتبصير في الدين، هەر دوو سەرچاوەکەی پێشوو.
[٣] التبصير في الدين، سەرچاوەی پێشوو.
[٤] مقالات الإسلاميين،سەرچاوەی پێشوو.
[٥] مقالات الإسلاميين، سەرچاوەی پێشوو، ١٥٠.
[٦] مقالات الإسلاميين، سەرچاوەی پێشوو، والمنية والأمل ٨٩.
[٧] الملل والنحل للشهرستاني ١٥٥/١.
[٨] الملل والنحل للشهرستاني ١٥٤/١ و ١٥٧ والزيدية للأكوع ١٦-٢٢. و بڕوانە: المنية والأمل ٨٩.

نەزانیوە. جا ئیمامەتی نەوەکانی فاتیمەیان (ڕەزای خوای لێبێت) بەدروست داناوە چ لە منداڵەکانی (حەسەن) بێت یان (حوسەین)، ئەگەر هاتوو زانا و دونیا بەکەمزان و بوێرو بەخشندە بوو[1].

٦- زەید لە بنەماکانی ئاییندا دەگەڕێتەوە بۆ موعتەزیلایەتی، چونکە زید (ڕەزای خوای لێبێت) قوتابی (واصلی کوڕی عەتاء) بووە، کە ناوبراو شێخی موعتەزیلە بووە[2].

زەید لە هیچ بۆچوونێکیدا ڕاجیایی نەبووە لەگەڵ (واصل)دا تەنها لە بابەتی پلەیەك لە نێوان دوو پلەکە (المنزلة بین المنزلتین)دا نەبێت[3].

ئیمام (موحەممەدی کوڕی ئیبراهیمی وەزیر)[4]، هەروەها (عەلی کوڕی عەبدولکەریمی فوزەیل) ئەم بۆچوونەیان ڕەتکردۆتەوە[5].

---

[1] الملل والنحل للشهرستاني ١٥٣/١. و سەیری ئەمەش بکە: المنیة والأمل، سەرچاوەی پێشوو.

[2] الملل والنحل للشهرستاني ١٥٤/١، والمواقف ٣٩٢/٨، وتویەتی: (زۆربەی زەیدییەکانی سەردەمەکەمان لاسایکەرەوەن لە بنەماکانی ئاییندا دەگەڕێنەوە بۆ فیکرەی موعتەزیلایەتی، هەروەها لە بابەتە لاوەکیەکانی ئاینیش دەگەڕێنەوە بۆ مەزهەبی ئەبو حەنیفە تەنها لە چەند بابەتێکی کەمدا نەبێت). والزیدیة للأکوع ١٥ ونقل عن طبقات المعتزلة للإمام المهدي بن المرتضی روایة في ذلك، وهي واردة عند القاضي عبدالجبار في فضل الإعتزال و طبقات المعتزلة، والحاکم أیضا.

[3] والزیدیة للأکوع پەراوێزی ١٥، تیایدا هاتووە: (ابن یزداد، وتویەتی: زەیدی کوڕی عەلی هیچ ڕایەکی پێچەوانەی موعتەزیلەکان نەبووە تەنها لە بابەتی: پلەیەك لە نێوان دوپلەکە "المنزلة بین المنزلتین" نەبێت).

[4] أکوع، ئەم بەرپەرچ و ڕەتدانەوەیەی لە کتێبی: (الزیدیة، پەراوێزی ١٦) هێناوە کە وەری گرتووە لە کتێبی وەزیر: (العواصم والقواصم)، تیایدا هاتووە، کە وەزیر وتویەتی: (بێگومان ئەمانە شتی پڕو پووچن، بەڵکو دەکرێ لە درۆیەکانی ڕافیزەکان بێت).

[5] الزیدیة لعلي بن عبدالکریم ٢١، باسی ئەوەی کردووە کە زەید موعتەزیلی نەبووەو زانستی لە (واصلی کوڕی عەتاء) وەرنەگرتووە، بەڵکو زانستی وەرگرتووە لە باوك و براکەی باقر و زانایانی شاری مەدینەی پیرۆز، ئەگەر زەید بدرێتە پاڵ تاقمێکیش ئەوا دەدرێتە پاڵ تاقمی (دادگەرا: العدلیة) کە دان دەنێن بە دادگەری و یەکتاناسی و نکۆڵی دەکات لە زۆرەملێی (جبر) و وێچوواندن (تشبیه)، بەهەمان شێوە (قازی عەبدولجەبار) و (ئیبن مورتەزا) و سەرجەم خەلیفەکانی ڕاشدین و هاوەڵانی تریش دەدرێنە پاڵ ئەم تاقمە.

زەیدییەکان لە بابەتە لاوەکی (فرعی)ەکاندا دەگەڕێنەوە بۆ مەزهەبی (ئەبو حەنیفە)، تەنها لە چەند بابەتێکی کەم نەبێت[1]. دەکرێت هۆکاری ئەمەش ئەوەبێت کە ئیمامی (ئەبو حەنیفە) بە نهێنی فەتوای دەدا لەسەر پێویستی سەرخستن و پشتگرتنی ئیمام زید و کۆمەکی بۆ کردنی بە ماڵ و سامان[2].

## بەشی سێیەم؛ لە تاقمەکانی شیعە: ئیمامیەکان:

هۆکاری ئەم ناونانەش بریتیە لەوەی: کۆی تاقمەکانیان کۆکن لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەدەق (نص) ناوی عەلی کوڕی أبو تالیبی دیاریکردووە وەك خەلیفە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەمەشی بە ئاشکرایی ڕایگەیاندووە.

زۆربەی هاوەڵان گومڕابوون، بەهۆی فەرامۆش کردنی شوێنکەوتنی ئیمامی عەلی، لە دوای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) [3]، بەمەش کوفریان کرد و کافر بوون[4].

ئیمامیەکان لە زۆر پێڕو دەستە پێکدێن، بەناوبانگترینیان: ئیسماعیلیە، دوازدە ئیمامی.

---

[1] المواقف، سەرچاوەی پێشوو.

[2] دراسات في الفرق ٦٦ نقلا عن الكشاف للزمخشري ٦٤/١ و نقل نحوه عن أبي الفرج الأصبهاني في مقاتل الطالبين ١٠٧. تأريخ المذاهب الإسلامية ٤٣ و ٣٦٤ ئاماژەی کردووە بۆ کتێبی (مناقب)ی بەزاز.

لەبارەی زەیدییەکانەوە سەیری ئەمانەش بکە: تأريخ الفرق الإسلامية للغرابي ٢٨٩ وفي علم الكلام - الزيدية لأحمد محمود صبحي ٦٠/٣.

[3] مقالات الإسلاميين ٨٩/١ والتبصير في الدين ٣٥ و تبصرة الأدلة ٨٢٨/٢ و لاپەڕەکانی دواتریش. و شرح الحور العين ٢٠٦ والملل والنحل للشهرستاني ١٦٣/١ و إعتقادات فرق المسلمين ٨٥ والفرق الإسلامية للكرماني ٦١ وشرح المواقف للسيد الشريف ٣٩٢/٨ والمنية والأمل ٩٥ وخطط المقريزي ٣٥١/٢ و كشاف اصطلاحات الفنون ٢٦٠/١.

[4] سەرچاوەکانی پێشوو، جگە لە: مقالات الإسلاميين و تبصرة الأدلة و شرح الحور العين.

***یەکەم: ئیسماعیلیەکان(السبعیە):***

ئەم پێڕە بە ئیسماعیلیە ناونراوە وەك درانە پاڵ ئیسماعیلی کوڕی ئیمامی جەعفەری صادق[1].

ئیسماعیلیەکان دەڵێن، کە ئیمامی جەعفەری صادق بەدەق ئیسماعیلی دیاریکردووە وەك ئیمام لە دوای خۆی، ڕاسپاردە (وصیة)ەکەشی بۆ ئەو داناوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی ئیسماعیل بەتەمەنترین و خۆشەویسترین کوڕ بووە لەلای ئیمام[2].

ئیسماعیلیەکان ڕاجیان لەبارەی مردنی ئیسماعیل هەر لە ژیانی باوکیدا، لەمبارەوەش چەند بۆچوونێکیان هەیە:

**بۆچوونی یەکەم:** ئیسماعیل زیندووەو نەمردووە، ناشمرێت تا دەسەڵاتی هەموو زەوی بەدەستەوە نەگرێت و دەبێتە ئیمام لە دوای باوکی، مردنی خۆی وەك توقیە و خۆپارێزی بەدەرخست لە ترسی خەلیفەکانی عەبباسی، تا نەبێتە ئامانج بۆ کوشتن.

**بۆچوونی دووەم:**ڕاستە ئیسماعیل مردووە، دەقی ئیمامەتی ئیسماعیل ناگەڕێتەوە. بەڵکو سوود لە دەقەکە ئەوەیە کە ئیمامەت هەر دەمێنێت لە نەوەکانی ئەوەی دەق لەسەر ئیمامەتی ئەو هاتووە، ئیمامەت ناگوێزرێتەوە بۆ جگەلەو، لە برایەکەوە بۆ برایەکی تر نابێت لە دوای حەسەن و حوسەین (سڵاوی خوایان

---

[1] فرق الشیعة للنوبختي ٦٧ ومقالات الإسلاميين ١/١٠٠ والفرق بين الفرق ٦٢ و الملل والنحل للشهرستاني ١/١٧٠ والتبصير في الدين ٣٣ وشرح الحور العين ٢١٦ واعتقادات فرق المسلمين ٨١ والفرق الإسلامية للكرماني ٥٢ و مقدمة ابن خلدون ١٨٨ وكشاف اصطلاحات الفنون ١/١٨٩ و ٩٢٧.

ئەم ناوانەشیان هەیە: باتینیەکان لەبەر ئەوەی ئیسماعیلیەکان دەیان وت: هەر شتێکی دیار (ظاهر) لای شاراوەو پەنهانی هەیە. (سەبعییە): چونکە پێیان وایە ئیمامەت تەنها پێنج خولە. (تەعلیمیە): چونکە تێڕوانین و ڕامانیان پەکخست و فێربوون لە ئیمامی پارێزراویان بە بەس زانی./ الملل والنحل للشهرستاني ١/١٩٩ و لاپەڕەکانی دواتری. وفضائح الباطنية ١٧ و بيان مذهب الباطنية وبطلانه للديلمي ٢١ والمواقف ٨/٢٨٨ والفرق الإسلامية للكرماني ٤٩ سەرچاوەی پێشوو، والإسماعيلية لإحسان إلهي ظهير ٩٩-١٠٠.

[2] شرح الحور العين، سەرچاوەی پێشوو. و دراسات في الفرق ٦٦-٦٧.

لێبێت)، ئەمە بۆچوونی (مبارکیەکانە).

بەم پێیە ئیمامەت لە دوای ئیسماعیل بۆ نەوەکەیتی کە موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلە، بەهۆی ڕاسپاردە (وصیة)ی جەعفەری باپیریەوە، بەمەش موحەممەد بووە جێنشینی جەعفەری باپیرەی نەوەك مامەکانی موحەممەد، بەمەش کاتێك جەعفەر کۆچی دوایی کرد موحەممەد شیاوی ئیمامەت بوو[1].

پاشان ئیسماعیلیەکان بۆ دوو دەستەی سەرەکی دابەش بوون[2]:

**دەستەی یەکەم:** ڕاوەستان لە ئاست مردنی موحەممەدی کوڕی ئیسماعیل، کە بە (مەکتوم) ناوزەدکراوە، ئەمان بڕوایان وایە ئیسماعیل دەگەڕێتەوە دوای مردنی، تەنانەت ئەم دەستەیە پێیان وایە وەك مەهدی دەگەڕێتەوە، ئەمانە پێیان دەوترێت (قەرامیتە)، بەهۆی ناوی سەرۆکەکەیان ئەم ناوەیان لێنراوە کە لە (ئەنبات) دادەنیشت و نازناوەکەی (قیرموتیە) بوو[3]، نمونەی هەندێك لە بۆچوونەکانیان:

---

[1] الملل والنحل للشهرستاني، وشرح الحور العين، هەر دوو سەرچاوەی پێشوو. و بڕوانە: فرق الشيعة للنوبختي، و مقالات الإسلاميين، و الفرق بين الفرق، سەرچاوەکانی پێشوو.
موبارەکییە: بەناوی سەرکردەکەیان (موبارەك)ەوە ناونراون کە خزمەتکاری ئیسماعیلی کوڕی جەعفەر بووە. نوبەختی ئاماژەی بەمە کردووە لە: فرق الشيعة ٦٨- ٦٩. و بڕوانە: مقالات الإسلاميين ١٠١ والفرق بين الفرق ٦٤ والملل والنحل للشهرستاني ١٧٠-١٧١ و ٢٠٠ و شرح الحور العين ٢١٦.

[2] دراسات في الفرق ٦٧.

[3] ئیبن جەوزی لە کتێبی (تلبيس إبليس ١١٠)دا دوو وتەی هێناون لەبارەی ئەم ناونانەیان:
١- پیاوێك لە ناحیەی (خوزستان)ەوە هاتە کوفە، لەوێ بانگەشەی کرد بۆ ئیمامێك لە ئالوبەیت، لە کوفە چووە لای پیاوێك کە ناوی (کرمتیە) بوو واتاکەی بە (نەبتیە) واتە: چاوتیژ. بۆیە بەناوی ئەو پیاوە ناونرا کە چووە ماڵەکەی کە بریتی بوو لە (کرمیتە)، دواتر ناوەکەی گۆڕا بۆ: قرمط، تا لەسەر زمان سووك بێت.
دووەم: بەهۆی درانە پاڵ پیاوێك کە پێی دەوترێت: حمدان قرمط، کە یەکێکە لە بانگخوازەکانیان. وتراوە: بۆیە حمدان بە (قرمت) ناسراوە بەهۆی ئەوەی کورتە باڵا بووەو لاقەکان بوونە و

١- لە دوای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تەنها حەوت ئیمام دەبن، کە بریتین لەمانە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب کە ئیمام و پەیامبەرە، حەسەن، حوسەین، عەلی کوڕی حوسەین، موحەممەدی کوڕی عەلی، جەعفەری کوڕی موحەممەد، موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی جەعفەر کە بریتییە لە ئیمام و مەهدی و پەیامبەریشە.

٢- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەو ڕۆژەی کە فەرمانی پێکرا عەلی کوڕی ئەبو تالیب بکاتە ئیمامی خەڵك لە (غەدیر خم) ئەوا پەیام لەو ڕۆژەوە لە پێغەمبەرەوە پچڕا و هەر لەو ڕۆژەوە پەیامەکە گوازرایەوە بۆ ئیمامی عەلی.

٣- موحەممەدی کوڕی ئیسماعیل زیندووەو نەمردووەو لە وڵاتی ڕۆمە و ئەو مەهدیە، واتای (قائم) لەلای ئەوان بریتییە لەوەی شەریعەت و پەیامێکی نوێ دەهێنێت و شەریعەتی موحەممەدی (صلى الله عليه وسلم) پێ هەڵدەوەشێنێتەوە.

٤- موحەممەدی کوڕی ئیسماعیل لە پێغەمبەرە ورەبەرز "ئولولعەزم"ەکانە، لەلای ئەوان حەوتن: نوح، ئیبراهیم، موسا، عیسا، موحەممەد، عەلی، موحەممەدی کوڕی ئیسماعیل.

موحەممەدی کوڕی ئیسماعیل کۆتا پێغەمبەرە، هەروەك خوای گەورە باسی کردووە.

٥- خوای گەورە بەهەشتی ئادەمی بۆ موحەممەدی کوڕی ئیسماعیل داناوە، ئەمەش واتای ئەوەیە کە هەموو قەدەغەکراوێك ڕێپێدراوە، هەموو شتێك کە خوای گەورە لەو دونیایەدا بەدیهێناوە ڕێپێدراوە.

٦- نمایشکردنی خەڵکی بە شمشێر و کوشتنیان و تاڵان کردنی ماڵ و سامانیان و شایەتیدان لەسەر کافر بوونیان و دیل کردنی ئافرەتەکان و کوشتنی منداڵەکان، هەموو ئەو شتانەیان حەڵاڵ کرد.

---

هەنگاوەکانی کورت بوونە، سەرەتای دەستپێکی کاروباری ئەمە لە ساڵی ٢٦٤ك بووە. / سەیری ئەمە بکە: پەراوێزی ٧٢ من فرق للنوبختي، والفهرست لإبن نديم ٢٦٥.

٧- کوشتنی ئەو کەسیان بە پێویست دەزانی، کە بڕوای بە ئیمامەت هەیە بەڵام بەپێچەوانەی ڕێبازو بۆچوونی ئەوانە، بەتایبەت کوشتنی ئەوانەی بڕوایان بە ئیمامەتی موسای کوڕی جەعفەرو منداڵەکانی دوای ئەو هەیە[1].

**دەستەی دووەم:** ئەم دەستەیە ئیمامەتی گواستەوە، لە دوای ئیسماعیل لە چەند پێشەوایەکی نادیاردا، یەکەمیان موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی نادیار، تا ئیمامی شەرعی لە کەسێکدا بەدەرکەوت کە ناوی (عوبەیدوڵای مەهدی)ە، دامەزرێنەری دەوڵەتی فاتیمیە لە مەغریب، ناوبراو یەکەم ئیمامی دیارو بەرچاوە[2]، لە ساڵی ٣٢٢ک مردووە[3].

لە ماوەی سەدەی پێنجەمی کۆچی ئیسماعیلیەکان دابەش بوون بۆ چەندین دەستەی جیاواز.

لێکترازانی یەکەمی ئیسماعیلیەکان لە ساڵی ٤١١ک-١٠٢١ز کاتێك (حاکم بأمر الله) ڕایگەیاند کە جەستەی خوایی لەگەڵ لاشەی ئەو ئاوێتە بووە، دوای ئەمە ناوبراو بزربوو، وتراوە بە کوشتن مرد.

بەڵام شوێنکەوتووەکانی کە بریتین لە (دروز) بڕوایان وابووە ناوبراو نەمردووە، بەڵکو دەگەڕێتەوە، چونکە لەلای ئەوان ناوبراو ئیمامی چاوەڕوانکراوە.

دوای ئەمە پەرت بوونێکی تر ڕوویدا لە دوای مردنی (موستەنصر بالله) لە ساڵی ٤٨٧ک-١٠٩٤ز، بەوەی نزاری کوڕی خۆی ناچارکرد کە واز بێنێت لە ئیمامەت، ئەمەش بەپێچەوانەی بیروباوەڕی ئیسماعیلیەکان بوو کە پێویست بوو لەسەری کوڕەکەی بکاتە

---

[1] فرق الشيعة للنوبختي ٧٢-٧٦.

لەبارەی (قەرامیتەکان) بڕوانە: مقالات الإسلاميين ١/١٠٠-١٠١ والتنبيه والرد ٢٠ والفرق بين الفرق ٢٨٢.

[2] مقدمة ابن خلدون ١٨٨ و دراسات في الفرق ٦٧.

[3] الإسماعيلية لإحسان إلهي ظهير ١٠١-١٢١ ژیاننامەی مهدیشی باس کردووە.

ئیمام، ئەمەش هەموو بەپێی پلانێکی دارێژراو بوو لەلایەن وەزیری هەرە چاکی موستەنصر (شاهنشاه)ی کوڕی (ئەمیر جیوشی بەدری جەمالی)، دەستپێشخەری کرد بە دانانی کوڕی بچوکی موستەنصر (موستەعلا) وەك ئیمام لەبەر ئەوەی کوڕە خوشکی بوو، بۆیە داینایە سەر تەختی خەلافەت، لە نێوان هەر یەکلەم برایانە دژایەتی هەبوو و چەند جەنگێك ڕوویدا، ئەم ململانێیە کۆتایی هات بە دەست بەسەرکردنی نزارو بەندکردنی، ناوبراو لە بەندیخانەدا مرد.

### ئیسماعیلیەکان دابەش بوون بۆ دوو لقی سەرەکی:

**لقی یەکەم:** موستەعلیە، بەناوی (موستەعلای ئەبو قاسمی ئەحمەد)ەوە ناونراون، کە لە ساڵی ٤٩٥ك مردووە، ناوەندی بانگەوازەکەی لە میسرەوە گوێزرایەوە بۆ یەمەن پاشان بۆ هیند، دوای ڕووخانی دەوڵەتی فاتیمیە لەسەر دەستی (صەلاحەدیینی ئەیوبی)، دوای ئەمە چەندین پەرتبوون بەسەر ئیسماعیلیەکاندا هاتن، دەستەی (بهرە)ی لێ جیابووەوە کە ئێستا لە هیند بوونیان هەیە[١].

**لقی دووەم:** نزاریە، دوای کوژرانی نزار و چوونە سەر تەختی براکەی مستعلی، کوڕە بچوکەکەی (موهتەدی) لەلایەن شوێنکەوتووانیەوە گوازرایەوە بۆ وڵاتی فارس، جا لەوێ لەسەر دەستی گەورە بانگخواز حەسەنی کوڕی صەباح پێگەیشت.

پاشماوەی ئەم تاقمە لە هند دەناسرێت بە (خوجا) یان (مەولی) سەرکردەیان ناوی (ئاغاخان)ە، باپیرشیان (حەشاشون)ن[٢].

---

[١] دراسات في الفرق ٧٠، و الإسماعيلية لإحسان إلهي ظهير ١٥٨ ژیاننامەی (موستەعلا)شی باس کردووە، بەهەمان شێوە لە ٧٣٥ هاتووەو ئاماژەی کردووە بۆ ئەم سەرچاوانە: اتعاظ الحنفا للمقريزي، والنجوم الزاهرة، و تأريخ ابن إياس، والكامل لإبن أثير.

[٢] دراسات في الفرق ٧١. سەیری ئەمەش بکە: الإسماعيلية لإحسان إلهي ظهير ١٥٩ نقلا عن النجوم الزاهرة و ٧٣٦ نقلا عن اتعاظ الحنفا للمقريزي. و سەیری ئەمەش بکە: دائرة المعارف الإسلامية - ترجمة: أحمد الشنتناوي ورفاقه ٢/١٨٧-١٩٥ مادة (الإسماعيلية).

گرنگترین ئەو پیاوانەی کە بانگەوازی ئیسماعیلی لەسەر دەستی ئەوان لەسەر خۆی ڕاوەستا و بیروباوەڕی ئیسماعیلیان داهێناو دواتر ئەمەش بووە بناغەیەك بۆ ئیسماعیلیە شوێنکەوتووەکانیان لە دوای خۆیان:

ئەبو خەتابی موحەممەدی کوڕی ئەبو زەینەبی مەقلاصی ئەجدەع. خزمەتکاری هۆزی ئەسد بوو، بانگەشەی ئەوەی کرد کە ڕەوانەکراو و ڕاسپێردراوی دوای ئیمامی جەعفەرە، بە شوێنکەوتووانیشی دەوترێت خەتتابیە.

مەیمونی قەداحی کوڕی دەیصانی هاوبەشدانەری ئەهوازی و کوڕەکەی (عەبدوڵای کوڕی مەیمون)، ئەمانە هەموویان لە زیادەڕۆچووەکانن، خۆیان بە شیعەگەرێتی و زانست داپۆشیوە، چەند بانگخوازێکیان بۆ پەیدابوو، پاشان شتە قەدەغەکراوەکانیان پەکخست و بەرەڵاییان لەناودا دەرکەوت[1]. جەعفەری صادق و ئیمامەکانی تریش خۆیان لەوانە بەری کرد.

### بیروباوەڕی ئیسماعیلیەکان:

نووسین لەبارەی بیروباوەڕی ئیسماعیلیەکان شتێکی گران و سەختە، چونکە کتێبەکانیان دوو جۆرن:

١- کتێبە دیارەکان: ئەو کتێبانەن کە بۆ خەڵکی نووسراون بە ئیسماعیلی و ئەوانی تریش، دەستخستنی ئەم کتێبانە ئاسانە و دەستاودەستی پێ ئەکرێت، ئەم کتێبە

---

[1] الإسماعيلية لإحسان إلهي ظهير ٨٤ و نقل في ١٧٢ عن ابن نديم. و بڕوانە: بيان مذهب الباطنية و بطلانه للديلمي ٢٠.

ڕاوبۆچوونەکانی خەتتابیەکان ئیسماعیلی کوڕی جەعفەریان هەڵخەڵەتاند بوو، بۆیە ئیسماعیل شوێن ئەوان کەوت، (کوشی و مامەقانی و هەدانی) کە لە زاناکانی ئیمامیەکانن گێڕاویانەتەوە: کە ئیسماعیل لەگەڵ خەتتابیەکان مەیی دەخواردەوە، ئەبو خەتتاب بە ئەبو ئیسماعیل ناوزەد کرابوو، بۆیە ئیمامی جەعفەر خۆی بەری کرد لە ئیسماعیل و ئەبو خەتتاب و خەتتابییەکان. / الإسماعيلية لإحسان إلهي ظهير ٥٦-٦٢.

بیروباوەڕی ڕاستەقینەی ئیسماعیلیەکان ناخاتەڕوو.

٢- کتێبە شاراوەکان: ئەو کتێبانەن کە تەنها کەسانێك دەیبینن و بە دەستیان دەکەوێت کە تایبەت و ڕۆچوون لە بیروباوەڕی ئیسماعیلیەکان، تەنانەت ئەم کەسە تایبەتانەش کاتێك ئەم کتێبەیان دەستدەکەوێت کە دەبێت پەیمان و بەڵێن بدەن کە بەکەسی تری نەدەن، ئەو شتانەی لەو کتێبانەشدا هەن بەکەس ڕانەگەیەنرێت[١].

جیاوازی لە نێوان ئەم دوو کتێبە زۆر زۆرە، نمونەش لەم بارەوە ئەوەیە کە بانگخوازی ئیسماعیلی ڕەها ئیدریس عیمادەدین لە کتێبە دیارەکەیدا باسی کردووە: کاتێك ئیسماعیلی کوڕی جەعفەری باوکی موحەمەد کە کۆچی دوایی کردووە ئەوا تەمەنی موحەمەد بیست و شەش ساڵ بووە[٢].

بەڵام لە کتێبە نهێنیەکەیدا دەڵێت تەمەنی موحەمەد سێ ساڵ بووە[٣].

١- بیروباوەڕیان سەبارەت بە خوای پایەبەرز:

یەکتاناسی و خوابەیەکگرتن لەلای ئیسماعیلیەکان بریتییە لە دارنینی خوا لە هەموو ناو و سیفەتەکانی، جا خوای گەورە بەهیچ وەسفێك وەسف ناکرێت، هیچ ناوێکیشی نییە.

خوای گەورە نە هەیە و نە نییە[١]. جا بەهۆی ئەوەی ناو و سیفەتیان بۆ خوا بریارنەدا، ناچاربوون پەنا ببەنەبەر داهێنانی چەند خوایەکی تر بۆ ئەوەی ئەو ناو و سیفەتانەی

---

[١] الإسماعيلية لإحسان إلهي ظهير ٢٦٨ هەندێك نمونەی لەو پەیمانانە هێناوەتەوە لە کتێبی: المبدء والمعاد للداعي الإسماعيلي حسين بن العلي بن الوليد ١٠ چەند نمونەیەکی هێناوە لە کتێبی: الأنوار اللطيفة للداعي الإسماعيلي طاهر بن إبراهيم الحارثي، کە لە ساڵی ٥٤٨ك مردووە، هەروەها نمونەی لەمانەشەوە هێناوە: مسائل مجموعة من الحقائق العالية و الدقائق و الاسرار السامية لداع إسماعيلي كبير، والمؤيد الشيرازي، کە لە ساڵی ٤٧٠ك مردووە، وطاهر سيف الدين الداعي المطلق لفرقة البهرة.

[٢] الإسماعيلية لإحسان إلهي ظهير ٢٠ وأشار إلى عيون الأخبار ٣٥١ للداعي إدريس.

[٣] الإسماعيلية لإحسان إلهي ظهير ٢١ وأشار إلى زهر المعاني ٤٧ من المنتخب.

که له قورئان و سوننەتدا هاتوون بۆیان بەکار بهێنن، وتیان: (هەموو سیفەته بەرزو بەرزو پایەدارو شکۆمەندەکان به بەهەر شێوەیەك بەهەر زمانێك دەربېڕدرێت که ئاماژەن بۆ سیفەته خواییەکان ئەوا لەسەر عەقلی یەکەم دێتەجێ)[2].

به عەقلی یەکەم دەوترێت: عەقلی گشتی و هەمەکی، بوونی یەکەم، داهێنەری یەکەم، پێشوو (السابق)، پێنووس، وشه (الکلمة)، ئەم عەقلّه وەسف دەکرێت به سیفەتی بەدیهێنەر و ڕۆزیدەرو وێنەکێش و بەدیهێنەری کارجوان... و له جیهانی خواروو ئەم شتانه لەبەرامبەر ئەمانەن و هاومانان: وتەبێژ (الناطق)، پێغەمبەر.

به عەقلی دووەم دەوترێت: دەروون و نەفسی گشتی، تۆمارو تێنووس (اللوح)، داهێنەری دووەم. ئەمانه لەبەرامبەر ئەو شتانەن: بنچینه (الأساس) که ئەویش بریتییه له ڕاسپێردراو (وصی)[3].

حامدی وتویەتی: عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) بریتیه له خوای دروستکەرو بەدیهێنەری کارجوان و وێنەکێش[4].

واگومانیان بردووه که عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) لەبارەی خۆیەوە وتویەتی: (من دەژێنم و دەمرێنم، ڕزق دەگرمەوەو دەبەخشم، کەسی بەڵەك و کوێری زگماك چاك

---

(1) الإسماعيلية لإحسان إلهي ظهير ٢٧٧. ئەمەی وەرگرتووە له (موئەییەد فیدینی هیبەتوڵای شیرازی) بانگخوازی بانگخوازانی ئیسماعیلی، ئیمامی ئیسماعیلی موستەنصر له کتێبه شاراوەکەیدا (المجالس المؤيدية)، ئیبراهیمی کوڕی حوسەینی حامدی له کتێبه شاراوەکەیدا: (کنز الولد)، کرمانی ئەحمەد حەمیدەدین له کتێبەکەیدا (راحة العقل) هێناویەتی، جگه لەوانەش ئەوەیان هێناوە.

(2) الإسماعيلية لإحسان إلهي ظهير ٢٨٥. نقلا عن رسالة المبدء والمعاد للحسين بن علي بن الوليد، و نحوه عن الصوري وطاهر الحارثي و الكرماني و غيرهم من دعاة الإسماعيلية.

(3) الإسماعيلية لإحسان إلهي ظهير ٢٨٦-٢٨٨. و چەند دەقێکی لەمانەوە هێناوە: نعمان القاضي و الحامدي و السجستاني.

(4) الإسماعيلية لإحسان إلهي ظهير ٢٩٨ نقلا عن كنز الولد للحامدي ٢٢١.

دەکەمەوە، هەواڵیشتان پێدەدەم سەبارەت بەوەی دەیخۆن و پاشەکەوتی دەکەن لە ماڵەکانتاندا)[1]. چەند وتەی هاوشێوەی تری ئەم وتەیە.

هاوبەشدانان لەلای ئیسماعیلیەکان بریتییە لە بانگەوازی کردن بۆ جگە لە ئیمام نەوەك بانگەوازی کردن بۆ جگە لە خوای گەورە[2].

٢- بیروباوەڕیان لەبارەی پێغەمبەرەوە:

پێغەمبەر لەلای ئەوان بریتییە لە وتەبێژ، دوازدە سیفەتی هەن، کە دەبێت ئەمانەبن: ئەندامەکانی تەواوبن، تێگەیشتن و دەربڕینی باش بێت، زیرەك و ژیر بێت، دەربڕینەکانی جوان بن، زانست و سوود لێوەرگرتن و ڕاستگۆیی خۆش بوویت، زۆر ئارەزوومەندی خواردن و خواردنەوەو ژن هێنان نەبێت، دەروونێکی گەورەی هەبێت، دونیا بەکەم بزانێت، دادگەری خۆش بوویت، ورەی بەهێز بێت.

وتیان: ئەگەر ئەو سیفەت و خەسڵەتانە لە کەسێکدا لە کاتێك لە کاتەکاندا کۆببوونەوە، ئەوا ئەو کەسە نێردراوەو خاوەنی سەردەمەکەیە.

پێغەمبەرایەتی بەبۆچوونی ئیسماعیلیەکان شتێکە دەتوانرێت بەدەست بهێنرێت، جا مرۆڤ دەتوانێت بەهۆی کۆشش و ڕاهێنانەوە ببێتە پێغەمبەر[3].

وتیان: قورئان بریتییە لە فەرمایشتی پێغەمبەر کە لە ڕازو نیازو کارلێکی ناو دەروون و نەفس دروست بووەو پێکهاتووە[4].

---

[1] الإسماعيلية لإحسان إلهي ظهير ٢٩٩ نقلا عن زهر المعاني للداعي المطلق إدريس ٧٧.

[2] الإسماعيلية لإحسان إلهي ظهير ٢٨٩ نقلا عن الكشف لجعفر بن منصور اليمن ١٦٦.

[3] الإسماعيلية لإحسان إلهي ظهير ٣٢١-٣٢٢ نقلا عن الرسائل إخوان الصفا ١٢٩/٤ و ١٣٥.

[4] الإسماعيلية لإحسان إلهي ظهير ٣٢٩-٣٣٨. لەم بارەیەوە چەندین دەقی لە بانگخوازە ئیسماعیلیەکانەوە هێناوە، بۆ نمونە: الحارثي اليماني في الأنوار اللطيفة ١٢٦ و ١٦٠-١٦١ والحامدي في كنز الولد ٢٠٦-٢٠٧ و ٢١٧ و ٢١٩ و جعفر بن منصور اليمن في سرائر النطقاء ٢٠٩ مخطوط، والشيرازي في المجالس المؤيدية ١٥٢.

یەحیای کوڕی حەمزەی عەلەوی بەرپەرچی داونەتەوە بەوەی بۆچوونی ئیسماعیلیەکان لە بارەی پێغەمبەرایەتی نزیکە لە بۆچوونی فەیلەسوفەکان، بەڵام ئەوان وتەی فەیلەسوفەکانیان بە کوێرانە و هەڕەمەکی وەرگرتووە، جا یەحیا بە تێروتەسەلی بەرپەرچی ئەوانی داوەتەوە[1].

٣- بیروباوەڕیان لەبارەی ڕاسپاردن و ڕاسپێردراو (الوصایە والوصی):
ئیسماعیلیەکان دەڵێن هەر پێغەمبەرێك ڕاسپێردراو (وصی)ەکی هەیە، جا ڕاسپێردراوی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) عەلییە(ڕەزای خوای لێبێت).

لەم بارەوە ڕاجیاییان هەیە و بۆ دوو بۆچوون دابەش بوونە:

أ- یەکسان بوونی پێغەمبەر و ڕاسپێردراو (وصی)، بەبێ ئەوەی یەکێك بەسەر ئەوەی تریان بەرزتر بکرێت. بۆیە ئەم وتەیەیان بە ناوی ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) گێڕاوەتەوە: (من و موحەممەد لە یەك نوورین، کە ئەویش نووری خوای پایەبەرزە، خوای گەورە فەرمانی کرد بەو نوورە کە بۆ دوو بەش لەت ببێت، جا بە لەت و کەرتی یەکەمی فەرموو ببە بە موحەممەد، هەروەها بە لەتی دووەمی فەرموو ببە بە عەلی)[2].

ب- ڕاسپێردراو (وصی) گەورەترە لە پێغەمبەر، عەلی گەورەترو باشترە لە موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)، چونکە ئیمامی عەلی مەبەست و ئامانجی بانگەوازە، لەبەرئەوەی بانگەوازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تەنها بۆ عەلی بووە، هەروەك پەیمان و بەڵێن کە لە پێغەمبەران و پەیامبەران تەنها بۆ داننان بووە بە

---

[1] الإسماعیلیة لإحسان إلهي ظهیر ٣٤٤-٣٤٧.

[2] الإسماعیلیة لإحسان إلهي ظهیر ٣٥٠ و گێڕانەوەکەی هێناوە لە حارسی لە: (الأنوار اللطیفة)دا، چەند دەقێکی لەوبارەوە هێناوە لە عەلی کوڕی وەلید لە (تاج العروس)، و بانگخوازی بانگخوازان (عیمادەدین) لە (زهر المعاني)دا، حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی وەلید لە (المبدء والمعاد)، و ئەبو یەعقوبی سەجستانی لە (إثبات النبوات)، و داعی حاتەمی کوڕی عیمران و کرمانی لە (راحة العقل)، و هیبەتوڵای شیرازی.

ڕاسپێردراوی و ویلایەت و ئیمامەتی عەلی. بەندایەتی تەنها بە شوێنکەوتن و دانان بە ئیمامەتی عەلی قبولّ دەبێت[1].

٤- بیروباوەڕیان لەبارەی ئیمامەت (هەندێك كات بە ویلایەت دەری دەبڕن):

ئیسماعیلیەكان پێیان وایە ئیمامەت لەلایەن خواوە پێویست كراوە، ئایین تەنها بە ئیمامەت كاملّ دەبێت، ئیمان بەخواو بە پێغەمبەر دروست نییە تا باوەڕ بە ئیمام نەهێنرێت[2].

هەر كەسێك بمرێت و ئیمامی سەردەمی خۆی نەناسی بێت ئەوا بە مردنێكی نەفامانە مردووە[3].

هەرگیز زەوی بێ ئیمام نابێت، جا ئیمامەكە دیار یاخود پەنهان بێت[4].

دادوەرەكەیان نوعمانی كوڕی موحەممەد: تەنها كەسێك دەبێت بە ئیمام كە لە منداڵەكانی عەلی بێت، حسن و حسین، پاشان لە منداڵەكانی حسین نەوەك منداڵەكانی حسن، پاشان لە منداڵەكانی ئیسماعیلی كوڕی جعفر نەك منداڵەكانی كەسی تر[5].

[1] الإسماعيلية لإحسان إلهي ظهير ٣٦٠، ئەمەی وەرگرتووە لە: جەعفەری كوڕی مەنصوری یەمەن، حوسەینی بن نوحی هیندی، و حامدی و جگە لەوانەش.

[2] الإسماعيلية لإحسان إلهي ظهير ٣٦٧، چەند دەقێكی لەوبارەوە لەمانەوە وەرگرتووە لە: (قازی نوعمانی كوڕی موحەممەد) لە (دعائم و تأويل الدعائم)، و شەرەف عەلی ئیسماعیلی لە (عيون المعارف)، و ئەحمەد حەمیدەدین كرمانی لە (المصابيح في إثبات الإمامة)، و موئەیەدی شیرازی و جەعفەری كوڕی مەنصوری یەمەنی و جگە لەوانەش.

[3] الإسماعيلية لإحسان إلهي ظهير ٣٧٣ نقلا عن المجالس المؤيدية للشيرازي ١١٩.

[4] الإسماعيلية لإحسان إلهي ظهير ٣٧٤ نقلا عن تاج العقائد لعلي بن محمد بن الوليد، ساڵی ٦١٢ك مردووە، هاوشێوەی ئەمەیان هێناوە لە وتەی: حسنی كوڕی نوح، حاتمی كوڕی ئیبراهیم، و أبی يعقوب السجستاني و جگە لەمانەش لە بانگخوازە ئیسماعیلیەكان.

[5] الإسماعيلية لإحسان إلهي ظهير ٣٧٥ نقلا عن دعائم الإسلام للقاضي النعمان.

ئیسماعیلیەکان بەشێوەیەك دەدوێن لەگەڵ پێشەواکانیان وەك چۆن بەندە لەگەڵ پەروەردگارەکەی دەدوێت، ئیبن هانی لە کاتی دوان لەگەڵ (المعز الإسماعیلی)دا دەڵێت:

ما شأت لا ما شاءت الأقدار  فاحكم فأنت الواحد القهار[1].

واتە: ویستت لەسەر چیە هەر ئەوە دێتەجێ نەوەك ئەوەی قەدەر دەیەوێت، حوکم بدە بەڕاستی هەر تۆی تاکی زاڵ.

٥- ئیسماعیلیەکان بڕوایان بە ئاوێتە بوون (الحلول) گیانگۆڕکێ (تناسخ) هەیە

ئەمەش خودی بڕوای هیندۆسەکانە، ئەوەی لەم بارەوە باسیان کردووە ئەوەیە: (هەر بوونەوەرێك لە ئاسمانەکان و زەوی بەر لە ئێوە ئوممەت بوونە، ڕۆحی دوژمنەکانمان دەگەڕێتەوە لە هەر وێنەیەکدا کە پێچەوانەی وێنەی مرۆیی بێت، تەنانەت یەکێك لەم دوژمنانە دەگەڕێتەوە هەزار تاوانی کوشتن دەکات و هەزار کەس سەر دەبڕێت و هەزار جاریش دەمرێت، بەڵام خۆشەویستان و ئەولیاکانی خوا و شوێنکەوتووە باوەڕدارەکانیان ئەوا خوای گەورە ئەوانی پاراستووەو ڕزگارکردووە لە گەڕانەوەی ڕۆحیان لە وێنە ناشرینەکاندا، ئەم پرۆسەی گەڕانەوەی ڕۆحە لە وێنە نا مرۆییەکاندا، سزایەکە خوای گەورە دیاری کردووە بۆ دوژمنەکانی باوەڕداران....)[2].

٦- ئیسماعیلیەکان پێیان وایە کە قورئان دەستکاری کراوە.

نمونەش لەسەر ئەمە: ئەو وتەیەیە کە (جەعفەری کوڕی مەنصوری یەمەن) وتویەتی: (وقد خاب من حمل ظلما، ظلم آل محمد: بێگومان ئەوەی ستەمی کردووە

---

[1] الإسماعیلیة لإحسان إلهي ظهیر ٣٨٤ چەندین دەقی زۆر نزیك لەو مانایەیان هێناوە لە بانگخوازە ئیسماعیلیەکانەوە.

[2] الإسماعیلیة لإحسان إلهي ظهیر ٤١٨-٤٤١، و چەند دەقێکی لە بانگخوازە ئیسماعیلیەکانەوە هێناوە لەبارەی داننانیان بە گیانگۆڕکێ (تناسخ)، ئەم دەقەش لە ٤٣٩.

ڕەنج بەخەسارو نائومێد بووە، ئەو ستەمەی کە لە خانەوادەی موحەممەدی کردووە). ئەم ئایەتە بەوشێوەیە دابەزیوە[1].

٧- ئیسماعیلیەکان بڕوایان بە تەکفیر کردنی هاوەڵان هەیە لە سەروشیانەوە ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان[2].

٨- ئیسماعیلیەکان پێیان وایە کە موحەممەدی کوڕی ئیسماعیل شەریعەتی پێغەمبەر موحەممەدی هەڵوەشاندۆتەوە،

(موعیز لدینیلاه) ئیمامی ئیسماعیلی چوارەم لە کاتی دەرکەوتنیدا بە ڕاشکاوی دەربڕیوە لەکاتی نزاکانی ڕۆژی شەممە: (... ئەوەی کە بە ڕاستی ڕەوانە دەکرێت و ڕاستگۆ دەدوێت، نۆیەمە لە دوای پێغەمبەری باپیری، هەشتەمە لە دوای باوکەکەی کەوسەر، حەوتەمە لە دوای باوکە ئیمامە چاکەکانی.... ئەمەش پلەو پایەکەی گەورە کردووەو ڕێزدارو شکۆمەندی کردووە، جیهانی سروشتی بە هاتنی ئەمە کۆتایی هات، بە هاتنی ئەم ئیمامە ڕووکەشی شەرعەتی موحەممەد لەکار کەوت...).

بەپێی بۆچوونی ئەوان (موعیز) پارێزراوەو پلەی خوایەتی بەدەست هێناوە[3].

بۆیە ئیسماعیلیەکان شەریعەتیان لە کارخست، ئەرکەکانیان فەرامۆش کرد، شتە ڕووکەشیەکان وەك نوێژ و زەکات و ڕۆژوو و حەج و جیهاد[1]، شتە قەدەغەکراوەکانیان حەڵاڵ کرد و توانجیان لە پێغەمبەران داو موسڵمانانیان کوشت[2].

---

[1] الإسماعيلية لإحسان إلهي ظهير ٤٦٥ نقلا عن كتاب الكشف لجعفر بن منصور ٧٨ و نقل قولهم بتحريف القرآن من أساس التأويل للقاضي النعمان.

[2] الإسماعيلية لإحسان إلهي ظهير ٤٦٦ و نقل نصوصا عن جعفر اليمن في كتابه الكشف ١٢٥ وسرائر النطقاء، والقاضي نعمان في أرجوزته ٩٩ و كتاب المجالس والمسايرات لا ٣٧٩ والمؤيد الشيرازي في المجالس المؤيدية ١٣٦/٢ والكرماني في راحة العقل ٥٠٠، والحامدي في كنز الولد ٩٩، حسن بن نوح الهندي في الأزهار ٢٢١، والسجستاني في إثبات النبوءات ١٥٩، وضياءالدين في مزاج التسنيم ٢٣٥.

[3] الإسماعيلية لإحسان إلهي ظهير ٥٥٠-٥٥٢ نقلا عن أدعية الأيام السبعة للمعز لدين الله.

لەبەر ئەمە زانایان فەتوایان داوە بە هەڵگەڕانەوەو بێ دینی ئیسماعیلیەکان، هەروەك (قاضي عیاض) وتویەتی: (زانایانی قەیروان کۆکن لەسەر ئەوەی بارودۆخی "عوبەیدییەکان" بارودۆخ و حاڵەتی هەڵگەڕاوەو بێ ئایینەکانە)[3].

بەغدادی وتویەتی: (ئەو ڕایەی کە من پەسەندی دەکەم لەبارەی ئایینی باتینیەکان - ناوێکە لە ناوەکانی ئیسماعیلیەکان- ئەوانە ڕۆژگارپەرستی لە ئایین دەرچوون، بڕوایان بە بێ سەرەتایی و لەمێژینەیی جیهان هەیە، نکۆڵی دەکەن لە سەرجەم پەیامبەران و

---

[1] ئەو دەقەنانەی لەبارەی فەرزە ڕووکەشیەکانەوە هاتوون، بەپێی بۆچوونی خۆیانیان تەئویل کردووە، وتیان: قیامەت واتە هاتنی ئیمام، ڕووبارەکان: واتە ئەو سوودەی کە لە زانایانەوە دەڕژێت بەسەر سوودمەندەکانیان، بەهەشت: واتە مانەوەو زانین لە جیهانی مەعقوڵدا و چێژ بینین لە جیهانی بەرهەستدا، نوێژ: واتە گوێڕایەڵی کردن بۆ میری بڕواداران علی و ئەو منداڵانەی کە پێشەواو ئیمامن. یاخود نوێژ بریتیە لە پەیوەندی کردن بە ئیمامەوە یاخود.... / الإسماعیلیة لإحسان إلهي ظهير ٤١١ ولاپەڕەکانی دواتری. و چەند دەقێکی لەوبارەوە نەقڵ کردووە لە بانگخوازە ئیسماعیلیەکانەوە. سەیری ئەمەش بکە: المنية والأمل ٩٦ و لاپەڕەکانی دواتری.

[2] الإسماعيلية لإحسان إلهي ظهير ٥٦٠-٥٦٣ نقلا عن سير الأعلام النبلاء للذهبي ١٥٢/١٥ والبيان المغرب للكراشي ٢١٦/١.

تیایدا هاتووە: ذهبي ئەم وتەیەی قاضي عبدالجباری نەقڵ کردووە: (نێردراە "قائم" بە ئاشکرا توانج و جنێوی بە پێغەمبەران دەدا، بانگدەرەکەی هاواری دەکرد: نەفرەت لە ئەشکەوتەکەو ئەوی تیایدا بکەن، زۆرێك لە زانایانی کوشتن و پشتگیر "قەڕامیتە"کانی بەحرەینی دەکرد، فەرمانی بە شوێنکەوتووانی دەکرد کە مزگەوت و قورئان بسووتێنن).

الإسماعیلیة لإحسان إلهي ظهير ٥٦٦: نامەی (موعيز لدينيلاه) کە بۆ (قرمیتی حەسەنی ئەعصەم)ی ناردووە، تیایدا دانی بە کا.ەکانی باپیرانی داناوە کە کردوویانە، وەك: کوشتن و ئاژاوەو حەڵاڵ کردنی قەدەغەکراوەکان و هەڵکەندن و لەجێ بردنی بەردە ڕەشەکە و تاڵان کردنی حاجیەکان.....

[3] الإسماعيلية لإحسان إلهي ظهير ٥٦٤ و مابعدها، نقلا عن ترتيب المدارك للقاضي وسير أعلام النبلاء ١٥١/١٥، و شایەتی زانایانیشی تێدایە کە ئیمامی ذهبي و أبو زيد الدباغ لە کتێبەکەیدا (معالم الإيمان) و أبو حسن القابسي لە (الملخص) و مەراکشی خاوەنی (بيان المغرب) هێناویانە.

شەریعەتەکان، چونکە حەزیان لە حەڵاڵ کردنــی هــەموو ئــەو شــتانەیە کــە نــەفس پێــی خۆشە).

ئیمامی غەزالی کتێبەکـەی (فضـائح الباطنیـة)ی نووسـی، لەمیانـەی ئـەم کتێبـەی بەرپەرچی بۆچوونەکانی ئەوانی داوەتەوەو بەپێویستی زانیـوە کـە ئـەم تاقمـە بـە هەڵـەو گومڕا بژمێردرێت و تەکفیر بکرێت و موسڵمان خـۆی لـیّ بـەری بکـات، مـوحـــەممەدی کوڕی و حسەینی دیلەمی لە کتێبەکەیدا (بیان مذهب الباطنیة وبطلانـه) هەمان بۆچوونی ئیمامی غەزالی هەیە[1].

***دووەم: دوازدە ئیمامی:***

زۆرینەی شیعە پێکدێنن، ئەم بۆچوونە تایبەتیانەیان هەیە:

١- ئیمامەت پێویست و بەردەوامە.

ئیمامەت بنەمایەکە لە بنەماکانی ئایین، ئیمان دانامەزرێت تـەنها بـە بڕوابـوون بـەو بنەمایە نەبێت، چونکە ئیمامــەت بـەردەوامی پێغەمبەرایتیــە، ئـەو بەڵگەیـەی نـاردنی پێغەمبەرو پەیامبەرەکان پێویست دەکات، هەمان ئەو بەڵگەیەیە کە نـاردنی ئیمامــەکان لە دوای پێغەمبەران پێویست دەکات.

نابێت سەردەمێك لە سەردەمەکان بـەتاڵ بێـت لـە ئیمامێـك کـە گوێڕایـەڵی کردنـی پێویست بێت و لەلایەن خواوە دانرابێت، جا خەڵکی گوێڕایەڵی بکەن یان نا، ئیمامەکە لە پێش چاوی خەڵکی یان شاراوەو پەنهان بێت، جا ئـەو پەنهانیـەی ماوەدرێـژ یـان کـورت بێت[2].

---

[1] دراسات في الفرق ٧٢-٧٤ و قول البغدادي في كتابه الفرق بين الفرق ٢٩٦، وكتابه الغزالي والديلمي، هەردووکیان چاپکراون و دەستاودەست دەکرێن.

[2] عقائد الإمامية ٦٥-٦٦. وأصل الشيعة وأصولها ٥٨-٥٩.

٢- پارێزراویی ئیمام:

ئیمام وەك پێغەمبەرە پێویستە پارێزراو بێت لە شتە ناپەسەند و پەست و نزمە دیارو نادیارەکان، هەر لە تەمەنی منداڵییەوە تا مردن، ناکرێت کاری ناپەسەند بکات. تەنانەت بە ئەنقەست و بە لەبیرچوونەوەش. هەروەك پێویستە ئیمام پارێزراو بێت لە لەبیرچوونەوەو هەڵە، چونکە ئیمامەکان پارێزەری شەرعن، لەمەشدا حاڵیان وەك پێغەمبەرە[1].

جا مادەم ئیمام وەك پێغەمبەرە، ئەوا پێویستە لە سیفەتە تەواو و کامڵەکانیدا باشترینی خەڵك بێت لە بوێری و بەخشندەیی و ڕێزداری و پاکێتی و ڕاستگۆیی و دادگەری و مشورگێڕی و کارگێڕی و حیکمەتدا... .

هەموو زانیاری و حوکمە خوایی و سەرجەم زانیارییەکان لە ڕێگەی پێغەمبەرەوە یان ئیمامی پێشخۆی وەردەگرێت، ئەگەر ویستی شتێك بزانێت و لێیکۆڵیەوە،ئەوا پێویستە بیزانێت لە ڕێگەی خورپە (ئیلهام) بەو هێزە پیرۆزەی خوای گەورە لە ناخیدا داینـاوە، جـا ئەگەر ڕووی کردە شتێك ویستی بیزانێت ئەوا بەرووی ڕاستەقینەکەی دەیزانێت و هەڵە ناکات و لێی تێکناچێت. لەمەشدا پێویستی بە بەڵگەی عەقڵی و خوێندن نیە لەلایەن مامۆستاوە[2].

لەبەر ئەوەی ئیمامەکان خاوەن دەسەڵات (أول الأمرن) و شایەتیدەرن لەسەر خەڵکی و فەرمانی ئەوان فەرمانی خوایە و شتێك ئەوان ڕێگری لێبکەن خوا ڕێگری لێکردووە،

---

ئیمامەت بنەمایەکە لە بنەماکانی ئایین، ئەمە بۆچوونی دوازدە ئیمامیەکانە بەگشتی، جا بەم پێیە هەر کەسێك نکۆڵی لێ بکات لە ئایین دەردەچێت.

لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك لە ئیمامیەکان بۆ ئەوەچوون کە ئیمامەت بنەمایەکە لە بنەماکانی مەزهەب، بەم پێیەش هەر کەسێك نکۆڵی لێ بکات لە مەزهەب دەردەچێت بەڵام هەر بە موسڵمان دەمێنێتەوە. بەتێروتەسەلی ئەمە باس دەکرێت لە بنەمای ئایینی و مەزهەبی.

[1] عقائد الإمامية ٦٧. والباب الحادي عشر، وعليه شرح النافع ٤١ ومفتاح الباب ١٨٢، وتجريد الإعتقاد وشرحه كشف المراد ٣٩٠ والمنية والأمل ٩٥. و سەیری ئەمەش بکە: عصمة الأئمة عند الشيعة لأنور الباز.

[2] عقائد الإمامية ٦٧-٦٨.

گوێڕایەڵی کردنی ئەوان گوێڕیەڵی کردنی خوایە، سەرپێچی کردنیان سەرپێچی کردنی خوایە[1].

بە داننان بە بۆچوونی پارێزراوی ئیمام ئەم شتانە کەڵەکە دەبن:

أ- چەسپاندنی ئەو بۆچوونە کە ئیمامەت لە بەرژەوەندییە دونیاییەکان نییە کە تێڕوانینی ئومەت بڕیاری لەسەر بدات، بەڵکو بنەمایەکە لە ئایین، بۆ پێغەمبەریش دروست نییە ئەم بابەتە فەرامۆش بکات و بە ئومەت ڕاسپێرێت، بەڵکو پێویستە لەسەری ئیمامێك دیاری بکات بۆ ئەم مەبەستە، لە ڕێگەی سروش (وحی)ەوە، یاخود لە ڕێگەی ئیلهامێك کە دڵنیایی و زانستی دڵنیاکەرەوە بەدەستەوە بدات.

ب- ئەم بۆچوونەش هەڵوەشاندنەوەی خەلیفایەتی سێ ئیمامەکەی پێش ئیمامی عەلی (ڕەزای خوایان لێبێت) لە دوو توێی خۆیدا هەڵدەگرێت، چونکە سێ ئیمامەکە بەیەکدەنگی زانایان بە پارێزراوی وەسف ناکرێن.

بۆیە زاناکانی شیعە هەوڵیاندا بەهەر بەڵگەیەك کە هەیانە بەرگری بکەن لە بابەتی پارێزراوی ئیمام.

تەنها ئەمانە نەبن کە ئەم ڕیزپەڕیەیان هەیە: (ئیبن بابویەی قومی) کە ساڵی ٣٨١ك مردووەو موحەممەدی کوڕی حسنی کوڕی حمدی کوڕی ولید کە ساڵی ٣٤٣ك مردووە، ناوبراوان پێیان وابوو کە دروستە بەهۆی لەبیرچوونەوە ئیمام هەڵە بکات. پێشەواکانی شیعە بە توندی وەڵامی ئەوانیان دایەوە، لەوانە شێخ مفید کە پەیامێکی نووسی لە میانەیدا بەرپەرچی ئەوانە دەداتەوە کە گومانیان وایە پێغەمبەر یاخود ئیمام هەڵەدەکەن[2].

٣-دەق و دەستنیشان کردن (النص والتعیین):

لەلای شیعەی دوازدە ئیمامی، ئیمامەت تەنها دەبێت بە دەق بێت، کە لەلایەن خواوە

---

[1] عقائد الإمامیة ٦٩-٧٠.

[2] دراسات في الفرق ٤٧- ٤٩.

لەسـەر زمـانی پێغەمبـەر ڕاگەیـەنرابێت، یـاخود لەسـەر زمـانی ئیمـامی پێشـووتر ڕاگەیەنرابێت، ئیمامەت بە هەڵبژاردن نیە لەلایەن خەڵکیەوە. و لە فەرموودەشدا هاتووە: (هەر کەسێك بمرێت و ئیمامی سەردەمی خۆی نەناسێت بە نەفامی مردووە)[1].

لەبەر ئەوەی ئیمامەت پەیوەستە بە پارێزراوییەوە، هەر شتێکیش پەیوەسـت بێـت بـە بپارێزراوییەوە دەبێت دەقی لەسەر هەبێت، بەم پێیەش دەبێت ئیمامەت بە دەق بێت[2].

دەڵێن ئیمامەکان دوازدە ئیمامن، بەم شێوە زنجیرەییەی خوارەوە:

عەلی کوڕی ئەبو تالیب، کە ساڵی ٤٠ك کۆچی دوایی کردووە، پاشان حەسەنی کـوڕی عەلی، کە ساڵی ٥٠ك کۆچی دوایی کردووە، پاشان حسینی کوڕی عەلی، کە ساڵی ٦١ك کۆچی دوایی کردووە، پاشان ئیمامەت لە منداڵەکانی حسین بەردەوام بوو نەوەك حەسـەن، کە بریتین لەمانە: عەلی زەینولعابدینی کوڕی حوسـەین، کـە سـاڵی ٩٥ك کۆچـی دوایـی کردووە، دواتر موحەممەدی باقری کوڕی عەلی، کە ساڵی ١١٤ك کۆچـی دوایـی کـردووە، دواتر جەعفەری صادقی کوڕی موحەممەد، کە ساڵی ١٤٨ك کۆچی دوایی کـردووە، پاشـان موسای کازمی کوڕی جەعفەر، کە ساڵی ١٨٣ك کۆچی دوایی کردووە، دواتر عەلی ڕیزای کوڕی موسا، کە ساڵی ٢٠٣ك کۆچی دوایی کـردووە، پاشـان موحەمـەد جـەوادی کـوڕی عەلی، کە ساڵی ٢٢٠ك کۆچی دوایی کردووە، پاشان عەلی هادی کوڕی موحەمـەد، کـە ساڵی ٢٥٤ك کۆچی دوایی کردووە، دواتر حەسەنی عەسکەری کـوڕی عـەلی، کـە سـاڵی ٢٦٠ك کۆچی دوایی کردووە، دواتر مەهدی چاوەڕوانکراوی کوڕی حەسـەن کـە لـە سـاڵی ٢٥٦ك لە دایك بووە. موحەممەدی مەهدی بەڵگـەیی لـە سـەردەم و ڕۆژگارەکـەمان، کـە پەنهان و چاوەڕوانکراوەو تا ئێستاش هەر زیندووە، دێتەدەرو زەوی پڕ دەکات لە دادگەری

---

[1] عقائد الإمامية ٦٦. و سەیری ٧٤ بکە. و سەیری ئەمانەش بکە: أصل الشيعة وأصولها ٥٨ والباب الحادي عشر، و عليه شرح النافع ٤٣ و مفتاح الباب ١٨٦. و تجريد الإعتقاد وشرحه كشف المراد ٣٩٢.

[2] مفتاح الباب، سەرچاوەی پێشوو. و سەیری ئەمەش بکە: النافع، تجريد الإعتقاد و شرحه كشف المراد، سەرچاوەکانی پێشوو.

دوای ئەوەی کە پڕبووە لە ستەم و خراپە[1].

بڕوایان بەگەڕانەوە (الرجعة) هەیە: دەڵێن بریتییە لەوەی:

خوای گەورە کۆمەڵێك دەگەڕێنێتەوە بۆ دونیا دوای مردنیان لە سەر هەمان وێنەی پێشوویان، جا بەشێکیان سەربەرزو بەشێکی تریان سەرشۆڕ دەکات، ئەم ڕووداوە لە کاتی هاتنی مەهدی چاوەڕوان کراوە.

ناگەڕێتەوە تا کەسی ئیماندار پلەی ئیمانی زۆربەرز نەبێت و کەسی خراپ نەگاتە ئەوپەڕی خراپە، دوای ئەمە دەمرن و پاشان زیندوو دەبنەوە[2].

٤- بڕوایان بە توقیە هەیە.

ئەم وتەیەی ئیمامی جعفری صادقیان گێڕاوەتەوە: (توقیە ئایینی من و باپیرانمە) و (کەسێك توقیەی نەبێت ئایینی نییە).

توقیە، بریتییە لەوەی: ئەگەر هەر کەسێ هەستی بە مەترسی کرد لەسەرخۆی وماڵەکەی بە هۆی بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕەکەی یاخود دەرخستنی بیروباوەڕەکەی، ئەوا پێویستە بیروباوەڕی خۆی بشارێتەوەو پەنهانی بکات، لە کات و شوێنە مەترسیدارەکان، ئەمەش لە پێناو لادانی زیان و مەترسی لەسەر خۆی و شوێنکەوتوانی و لەپێناو پاراستنی خوێنیان.

توقیە چەند حوکمێکی هەیە، فەرزە یاخود فەرز نییە، ئەم حوکمانەی دەگۆڕێن بە پێی شوێنەکان و ئاستی مەترسی، ئەم حوکمانە لە فیقهدا باسکراون، بەهەر حاڵ توقیە لە هەموو حاڵەتێکدا پێویست نیە، بەڵکو هەندێك جار پێویستە بە پێچەوانەی توقیە بجولێیتەوە، هەروەك لە حاڵەتی دەرخستنی ڕاستی لە پێناو خزمەتی ئیسلامدا پێویستە بە پێچەوانەی توقیە هەڵسوکەوت بکرێت[3].

---

[1] عقائد الإمامية ٧٦ و ٧٨. و سەیری ئەمەش بکە: الباب الحادي عشر، و عليه: شرح النافع ٥٠ و مفتاح الباب ٢٠٠ و كشف المراد في شرح تجريد الإعتقاد ٤٢٢.

[2] عقائد الإمامية ٨٠.

[3] عقائد الإمامية ٨٤-٨٥. و بڕوانە: أصل الشيعة وأصولها ١٥٠ ودراسات في الفرق ٥٤-٦٣.

## مـورجــیــئە

مورجیئە وشە و بێژەیەکە وەرگیراوەو داتاشـراوە لـە (الإرجـاء)، (أرجیتـە و أرجأتـە)، ئیرجاء دوو مانای هەیە:

**واتای یەکەم:** دواخستن و فەرامۆش کردن دێت، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿أَرْجِهْ وَأَخَاهُ﴾ الاعـراف: ١١١. واتە: دوای بخە و بیهێڵەوە، لەبەر ئەم هۆیانە ئەم نـاوە لە مورجیئەکان نراوە:

أ- چونکە ئەوەی تاوانی گەورە ئەنجامدەدات، فەرامۆشی دەکەن تا ڕۆژی دوایـی، جـا لە دونیادا حوکمی لەبارەیەوە نادەن کە ئایا بەهەشتییە یاخود دۆزەخییە؟[1].

ب- یاخود لەبەر ئەوەی کردار پاش ئەخەن لە نیەت و مەبەست[2].

پ- یاخود لەبەر ئەوەی ئەوان عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) لە پلـەی یەکـەم دوائەخـەن و دەیبەنە پلەی چوارەم[3].

**واتای دووەم:** پێدانی ئومێد و هیوا، ئەمەش بەوەی:

أ- لەبەر ئەوەی دەڵێن: گوناه لەگەڵ ئیمان هیچ زیانێکی نییە، هەروەك لەگەڵ کـوفر پەرستش سوودی نییە[1]. جا ئەوان ئومێدی پاداشت ئەخوازن لە خوای گـەورە بـۆ گوناهباران[2].

---

(1) الملل والنحل للشهرستاني ١٣٧/١. هاوشێوەی ئەمە لەمانەشدا هاتووە: خطط المقريزي ٣٤٩/٢ والمنية والأمل ١١٣ و شرح الحور العين ٢٥٧.

(2) الملل والنحل للشهرستاني، سەرچاوەی پێشوو، و لە (الفرق بين الفرق ٢٠٢) هاتووە: (لەبەر ئەوەی کرداری لە ئیمان پاش دەخەن). ئیسفەرایینی هاوشێـوەی ئەمەی وتوە لە: التبصير في الدين ٨٣. هەروەها سەیری ئەم سەرچاوانەش بکە: شرح المواقف للسيد شريف الجرجاني ٣٩٦/٨ الفرق الإسلامية للكرماني ٨١.

(3) الملل والنحل للشهرستاني، سەرچاوەی پێشوو.

ب- یان لەبەر ئەوەی ئەوان کەسی لاساریان والێکردووە بە ئومێدی لێخۆشبوون بێت، بێ ئومێدیان نەکردووە لە ڕەحمەت، سەرباری ئەوەی کابرای لاسار لەسەر لاسارییەکەشی مردبێت. (ابن المرتضی) وتویەتی: پێم وایە ئەمە هۆکاری ناونانە لەوان[٣].

## سەرهەڵدانی مورجیئە:

تۆی ئەم تاقمە لە نێوان هاوەڵانی، سەرەتا ئەوانەی کە نەچوونە ناو ململانێ لە کۆتایی سەردەمی عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) هەبوو، وەك: (ئەبو بەکرە، عەبدوڵای کوڕی عومەر، عمرانی کوڕی حصین).

ئەبو بەکر (ڕەزای خوای لێبێت) گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: **(ستکون فتن، القاعد فیها خیر من الماشي، والماشي فیها خیر من الساعي**

---

[١] الملل والنحل للشهرستاني، سەرچاوەی پێشوو. و شرح المواقف للسید الشریف، سەرچاوەی پێشوو، وتویەتی: (بەم پێیە نابێت بێژەی مورجیە بە هەمزە بکرێت)، والفرق الإسلامیة للکرماني، وخطط المقریزي، هەردوو سەرچاوەکەی پێشوو، و سەیری ئەمەش بکە: التبصیر في الدین ٨٣.

[٢] خطط المقریزي، سەرچاوەکەی پێشوو، نەسەفی لە (تبصرة الأدلة ٢/٧٦٦) وتویەتی: (موڕجیئەکان پێیان وابوو کە هیچ یەکێك لە موسڵمانان بە هۆی ئەنجامدانی گوناهی گەورەوە سزا نادرێت، هەروەك کاری چاکیش هیچ سوودی نییە لەگەڵ کوفردا، جا بەم پێیەش کاری خراپە زیانی نییە لەگەڵ ئیمان و باوەڕ).

[٣] المنیة والأمل، سەرچاوەکەی پێشوو، لە کتێبی ناوبراودا بەرپەرچی شرۆڤەکەی شەهرستانی داوەتەوە کە بۆ ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە کردوویەتی: ﴿ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ ﴾ الاعراف: ١١١. وتویەتی: (ڕای ڕاست ئەوەیە کە دەڵێت: "أرج زیدا" واتە وای لێبکە ئومێد و هیوای ببێت، هەروەك دەڵێت: "أصلح کذا" واتە وای لێبکە چاك بێت، ئەمە بە مانای ئەوە نایەت کە بڵێی خواستەکەی بێنەدی و شتەکەی پێبدە هەروەك شەهرستانی وای بۆ چووە، جا بەم پێیە واتای ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ ﴾ الاعراف: ١١١. ئەوەیە: کە وایان لێبکە بە چاوەڕێی وەڵامی تۆ بن، ئەوەندە کار بکە و تێبکۆشە کە لەماوەی چاوەڕوانیەکەیاندا بەڵگەکەیان پوچەڵ بکەیتەوە).
دەڵێم: شەهرستانی ئایەتەکەی بە گەواهی و شایەتیدەر هێناوە بۆ مانای یەکەم: کە دواخستنە" و بە شایەتی دەری بۆ مانای دووەم نەهێناوە.

**إليها، ألا فإذا نزلت أو وقعت، فمن كان له إبل فليلحق بإبله، ومن كـان لـه غـنم فليلحـق بغنمه، ومن كان له أرض فليلحق بأرضه. قال: فقال رجل: من لم تكن له إبـل ولا غـنم و لا أرض؟ قال: يعمد إلى سيفه فيدق على حدة بحجر، ثـم ليـنج إن اسـتطاع النجـاة)**[1] واتـه: بێگومان لەمەولا چەندین فیتنە بەرپا دەبێت، ئـەوەی دانیشـتووە تێیـدا باشـترە لـەوەی بەناویدا دەڕوات، ئەوەشی تێیدا دەڕوات باشترە لەوەی بە تەکان بـەرەو پیریـەوە دەچـێت، ئاگادار بن کاتێکیش دابەزییە ناوتان یان ڕوویدا، با هەر کەسێك حوشتری هـەبوو بچـێت بەلای حوشترەکەی خۆیەوە، هەر کەسێکیش مەڕی هەبوو با بچێت بەلای مەڕی خۆیـەوە، هەر کەسـێکیش زەوی و زاری هـەبوو بـا بچـێت بـەلای زەوی و زاری خۆیـەوە. دەڵێـت: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەی ئەگەر هات و کەسێك نە وشتر نە مەڕ نـە زەوی و زاری هەبوو؟ فەرمووی: با بچێت شمشێرەکەی بێنێت بە بـەردێکی تیـژ بڕندەکـەی کـەل و کۆڵ بکات، پاشان ئەگەر توانی خۆی ڕزگار بکات[2].

کاتێك ئاشووب و جەنگەکان دەرکەوتن لە نێوان موسڵمانان هەر لە سەرەتای ئیسـلام، کۆمەڵێك پێیان وابوو کە دەستی خۆیان تێکەڵ نەکەن، حوکمی ڕاست پێکان و هەڵەپێکان بەسەر هیچ یەکێکیان نەدەن.

ئیبن عەساکر لەبارەی ڕوونکردنـەوەی ڕای ئەمانـە ئـەوەی گێڕاوەتـەوە: (ئەوانـە ئـەو کەسانەن کە گومانگەرا "شكاك"ن، ئەوانە گومانیان هەبوو و لە جەنگ و غەزاکاندا، جا

[1] فجر الإسلام ٢٨٠ و تاريخ المذاهب الإسلامية ١١٩.

د. حوسەین عەتوان لە (الفرق الاسلامية في بلاد الشام في العصر الأموي ١٦-٢٢) لەمانەوە گێڕانەوەی هێناوە: عن عبدالله بن عمر نقلا عن طبقات ابن سعد و تذكرة الحفاظ، و عن عمران بن الحصين نقلا عن طبقات ابن سعد، و عن أبي بكر نفيع بن حارث الثقفي نقلا عن صحيح البخاري و مسلم و أبي داود و إبن ماجه. و نقل روايات أخرى في ذلك. والحديث بلفظ آخر في الجامع الصغير ٢٨٧ و فيه: (أخرجه أحمد في مسنده والبخاري ومسلم عن أبي هريرة وهو صحيح).

[2] دەقی کوردی ئەم فەرموودەیەم وەرگرتووە لە: پوختەی سەحیحی موسلم، وەرگێڕانی لیژنەیەك، ١٠٠٤/٢.

کاتێك دوای کوژرانی عوسمان گەڕانەوە شاری "مەدینە" ئەوا پەیمان و گوفتاریان بۆ خەڵکی یەك بوو بەبێ ڕاجیایی، وتیان: ئێمە کە ئێوەمان بەجێهێشت کاروبارو فرمان و ڕیزتان یەك بوو، ڕاجیایی لە ناوتان نەبوو، کەچی گەڕاینەوە دەبینین ئێوە ڕاجیان، هەندێکتان دەڵێن: عوسمان بە ستەم کوژرا.دادگەرترینی هاوەڵانی بوو، هەندێکی تریشتان دەڵێن: عەلی و هاوەڵانی لە ڕاستی نزیکتر بوون، هەموویان باوەڕپێکراون و بەڵگەی ڕاست سەلمێنمان لەبەر دەستە، ئێمە نە خۆمان بەری دەکەین لەو دوو پێرە و نە نەفرەتیشیان لێدەکەین، بەڵکو حوکمی ئەوانە بەخوا ڕادەسپێرین، تا خوا خۆی دادوەرییان لە نێواندا بکات).

خەواریجەکان: تەکفیری عەلی و عوسمان و ئەوانەشیان کرد کە بڕوایان بە دادوەرییەکە هەبوو. و شیعەش: ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان و پشتگیرەکانی ئەوانەیان تەکفیر کرد. هەردوو تاقمی ناوبراو: ئەمەوییەکانیان تەکفیر کرد. ئەمەوییەکانیش جەنگیان لەگەڵ هەردوو تاقمی ناوبراو کرد و بڕوایان وابوو کە هەردوو تاقمی ناوبراو شەرع لەکار دەخەن و کار لەسەر پەکخستنی دەکەن.

لەم نێوانەدا مورجیئەکان دەرکەوتن کە لەبەرامبەر هەموویان بێ هەڵوێست و ئاشتی ئامێز بوو، هیچ کۆمەڵێکی لەو کۆمەڵانەی تەکفیر نەکرد، مورجیئەکان دەیان وت: کە خەواریجو شیعە و ئەمەوییەکان باوەڕدارن، بەڵام هەندێکیان ڕاستیان پێکاوەو هەندێکی تریان هەڵەیان پێکاوە، لە توانامان‌دا نییە ئەوە دیاری بکەین کە ڕاستی پێکاوە، بۆیە ئێمە ئەو بارودۆخ و حاڵەتە کە ئەوان تیایدان بەو خوایە دەسپێرین کە زانایە بە نهێنی خەڵك و لێپێچینەوەیان لەگەڵ دەکات لەسەر ئەو شتانەی ئەنجامیان داوە[1].

---

[1] فجر الإسلام ٢٧٩-٢٨٠. و سەیری ئەمەش بکە: تاريخ المذاهب الإسلامية ١١٩.

وتراوە: یەکەم کەس کە فیکرەی ئیرجائی دانا و قسەی تێداکرد، بریتییە لە: موحەممەد حەسەنی کوڕی موحەممەد کە ناسراوە بە (ئیبن حەنیفەی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالیب).

حەسەنی کوڕی موحەممەدی کوڕی حنیفە نامەی دەنووسی بۆ وڵاتان و بانگەشەی دەکرد بۆ فیکرەی مورجیئایەتی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناوبراو کردەوەی لە ئیمانی پاش نەخست هەروەك ئەمە بۆچوونی هەندێکیانە، بەڵکو وتویەتی: ئەنجامدانی پەرستشەکان و نەکردنی گوناهەکان بەشێك نیە لە ئیمان و باوەڕ و بە لاچوونی ئیمان لا ناچێت.

ئیبن قتیبە وتویەتی: یەکەم کەس کە لە شاری بەصرەدا فیکرەی مورجیئایەتی دانا (حەسانی کوڕی بیلالی کوڕی حاسی موزنی) بوو.

هەندێك وتویانە: کە یەکەم کەس فیکرەی مورجیئایەتی دانا (سەلت سەمان) بوو، کە ساڵی سەدو پەنجاو دوو کۆچی دوایی کرد[1].

بەڵگەی مورجیئەکان لەوەی حوکم نادەن لەسەر ئەو کەسانەی تاوانی گەورە دەکەن، لە ئوممەتی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) بەڵکو حوکمی ئەوانە بە خوا دەسپێرن، لێخۆش بوون یاخود سزا بۆ ئەو کەسانە بڕیار نادەن و یەکلایی ناکەنەوە، ئەمانەن:

أ- ئەم فەرمایشتەی خوای پایەبڵند: ﴿ وَءَاخَرُونَ مُرْجَوْنَ لِأَمْرِ ٱللَّهِ إِمَّا يُعَذِّبُهُمْ وَإِمَّا يَتُوبُ عَلَيْهِمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ التوبة: ١٠٦. واتە: (کەسانێکی تریش هەن "لە جێ ماوەکان" ئەنجامی کردەوەیان دوا خراوە بۆ فەرمانی خوا، یان سزایان دەدات یاخود تەوبەیان لێ وەردەگرێت).

ب- جوڵانەوە بە پێچەوانەی پەیمان درۆیە و پێچەوانەی پەیمانی سزادان و هەڕەشەش لێخۆشبوون و لێبووردنە.

[1] خطط المقريزي ٢/٣٥٠. و ئەو بۆچوونەی پێی وایە حەسەنی کوڕی موحەممەد یەکەم کەس بووە لەبارەی فیکرەی ئیرجاء قسەی کردووە لەم سەرچاوەیەدا هاتووە: شرح أصول الإعتقاد أهل السنة والجماعة ٥/٢٩٠ و ٢٨٩ لە قتادەوە گێڕدراوەتەوە کە وتویەتی: لەدوای شکست هێنانی (ئیبن ئەشعەس) فیکرەی ئیرجاء هاتە کایە. و سەیری ئەمەش بکە: تأريخ الفرق الإسلامية للغرابي ٢٠.

ئەگەر حوکمڕانێك هەڕەشە و گوڕەشەی کرد لە یەکێك لە ژێردەستەکانی بەوەی سزای بدات، دواتر لێخۆشبوو و بەڵێنەکەی شکاند، ئەوا حوکمڕانەکە بە درۆزن ناژمێردرێت لەلایەن عەرەبەکان، ئەم وتەیەی (عامری کوڕی توفەیل)ی شاعیریان وەك بەڵگە هێناوەتەوە:

ولا يرهب ابن العم مني صولتي ولا إحنتي من قوله المتهدد

وإني إذ أوعدته ووعدته لمخلف ميعادي و منجز موعدي

واتە: کوڕە مامم لە توندو تیژی من ناترسێت، هەروەها ڕق و قینەی منیشلە ئاست وتە هەڕەشە ئامێزەکانی ئەودا هیچ نییە، منیش ئەگەر پەیمانم پێدا یاخود هەڕەشەم لێکرد، ئەوا لە هەڕەشەکەم پاشگەز دەبمەوەو پەیمانەکەشم دەبەمەسەر.

وتویانە: دروستە خوای گەورە بەڵێنە هەڕەشە ئامێزەکەی کە لە قورئاندا هاتووە بشکێنێت و هیچ یەکێك لە گوناهبارە گەورەکانی موسڵمانان سزا نەدات، هەروەها دروستیشە کە بەئەندازەی تاوان و گوناهیان سزایان بدات، بۆیە ئەمە بەخوا ڕادەسپێرین[1].

## پێڕو دەستەکانی مورجیئە:

مورجیئەکان بۆ دوازدە پێڕو دەستە پەرت بوون، ئەمە ڕای ئەشعەری[2]، مەڵتی[3]، ئەو نووسەرانەی کە لەبارەی تاقمەکان دەنووسن چەند دابەش کردنێکی تریان هەیە، بۆ نمونە:

## مورجیئە سێ تاقمن:

١- بڕوایان بە فیکرەی (ئیرجاء) هەبوو لە بابەتی ئیمان و باوەڕدا و بڕوایان بە فیکرەی قەدەرەیەت (سەرپشك بوون لە کرداردا) هەبوو ئەمەش لەسەر مەزهەبی قەدەری و

---

[1] شرح الحور العين ٢٥٧. و سەیری ئەمەش بکە: مقالات الإسلاميين ٢٢٨/١.
[2] مقالات الإسلاميين ٢١٣/١.
[3] التنبيه والرد ١٤٦.

موعتەزیلەكان، وەك: غیلان، أبو شمره، موحەممەدی كوڕی شەبیبی بەصری و صالح قوبە.

٢- بڕوایان بە (ئیرجاء) هەبوو لە بابەتی ئیمان و باوەڕدا، هەروەها بڕوایان بە جەبریەت هەبوو لە بابەتی كرداردا ئەمەش بەپێی مەزهەبی (جەهەمیەكان) كە بریتی بوون لە شوێنكەوتووی جەهمی كوڕی صەفوان.

٣- بڕوایان بە فیكرەی (ئیرجاء)ی تەواو هەبوو، بڕوایان نە بە جەبریەت نە بە قەدەریەت نەیە، بەڵكو مورجیئەی پوختن. ئەمانەش پێنج پێڕن: یونسیە" بریتین لە شوێنكەوتووی یونسی كوڕی عەونی نەمری. و غەسانیە" بریتین لە شوێنكەوتووی غەسانی مورجیئی. و تومنیە" بریتین لە شوێنكەوتووی ئەبو موعازی تومنی. و سەوبانیە" بریتین لە شوێنكەوتووی ئەبو سەوبانی مورجئی. و مریسیە" بریتین لە شوێنكەوتووی بشری كوڕی غیاسی موریسی، كە ساڵی ٢١٨ك مردووە[1].

---

[1] الفرق بین الفرق ٢٠٢ والتبصیر في الدین ٨٣. و نشوان لە (شرح الحور العین ٢٥٧) ئاماژەی كردووە بۆ دوو پێڕەكەی یەكەم.

شەهرستانی لە (الملل والنحل ١٣٧/١) باسی كردووە كە: مورجیئە چوار بەشن: مورجیئەی خەواریج، مورجیئەی قەدەری، مورجیئەی جەبری، مورجیئەی پوخت. هەروەها باسی هەر پێنج بەشی مورجئەی پوختی كردووە، بەڵام پێڕی عبیدیە" هاوەڵانی (عبیدی مكتب)ی لە جیاتی مریسیەی باس كردووە، و (عبید مكتب) ژیاننامەی لە (تهذیب التهذیب)دا باس كراوە.

ئیبجی لە (المواقف و شرحه للسید الشریف ٣٩٦/٨)دا باسی بەشەكانی مورجیئەی پوختی كردووە وەك چۆن شەهرستانی دابەشی كردوە، بەڵام عبید بە (عبید مكذب)ی تیایدا هاتووە، و لە: (الفرق الإسلامیه للكرمانی ٨١-٨٦)دا هەمان دابەشەكەی إیجی باسكراوە.

ڕازی لە (إعتقادات فرق المسلمین ١٠٧)دا باسی بەشەكانی مورجیئەی پوختی كردووە وەك دابەشەكەی بغدادی، بەڵام (خالدیەی) لە جێگای (مریسیە) هێناوە.

مەقریزی لە (الخطط ٣٥٠/٢) باسی كردووە كە مورجیئە لە دوای حەسەنی كوڕی موحەممەدی كوڕی حەنیفە بوون بە چوار بەش: مورجیئەی خەواریج، مورجیئەی قەدەری، مورجیئەی جەبری، مورجیئەی صالحیە.

هەندێك كە خاوەنی بیروبۆچوونی تایبەتن ئەوا ئیمامی (ئەبو حەنیفە)یان بە مورجیئەی ئەهلی سوننە ژماردووە، هۆكاری ئەمەش ئەوە بووە:

١- ئیمامی (ئەبو حەنیفە) دەیووت: ئیمان بریتییە لە دانپێدانان بە دڵ، زیادو كەم ناكات، بۆیە بەمەش واگومانیان برد كە ئیمامی ناوبراو كردەوە پاش دەخات لە ئیمان، كەچی وانیە لەبەرئەوەی كردارو كۆششی زۆر ناسراوبووە.

٢- ئیمامی (ئەبو حەنیفە) هەر لە سەرەتاوە ڕای پێچەوانەی قەدەری و موعتەزیلەكان بوو، بەم پێیەش موعتەزیلەكان و دەستەی (وعیدیە) لە خەواریجەكان ناوی مورجیئەیان لە هەر كەسێك دەنا كە ڕای پێچەوانەی ئەوان بووبا لە قەدەردا[1].

جا ئەوەی بڵێت ئیمامی (ئەبو حەنیفە) مورجیئەیە[2]، مانای زمانەوانی وشەی

---

هەروەها سفارینی لە (لوامع الأنوار البهية ١/ ٨٩) باسی كردووە كە شەش پێڕن، كە بریتین لەمانە: یونسیە، عبیدیە، غەسانیە، سەوبانیە، تومنیە، نەجاریە.

[1] الملل و النحل للشهرستاني ١٣٩/١. و نقله السيد الشريف في شرح المواقف ٣٩٧/٨ عن الآمدي. ونقله أبو زهرة عن الشهرستاني في تأريخ المذاهب الإسلامية ١٢٢. وانظر تعليق محمد محيي الدين عبدالحميد على المقالات الإسلاميين ٢١٩/١-٢٢٠. وانظر قول بعض من أسند الإرجاء إلى الإمام أبي حنيفة في شرح أصول الإعتقاد أهل السنة والجماعة ٢٨٤/٥.

لە: (المواقف و شرحه للسيد الشريف ٣٩٧/٨) هاتووە: (غەسانی مورجیئی فیكرەی مورجیئایەتی لە ئەبو حەنیفەی دەگواستەوەو بە یەكێك لە مورجیئەكانی دادەنا، ئەمەش درۆ هەڵبەستنە بۆی، چونكە غەسان ویستویەتی مەزهەبی خۆی برەو پێبدات بەهۆی بەدەستهێنانی پشتیوانی كەسێكی ناودار).

[2] تعليق محمد محيي الدين عبدالحميد، ، و تیایدا هاتووە: دوو تاقم وشەی ئیرجائیان بۆ (ئەبو حەنیفە) بەكارهێناوە:

یەكەمیان: هەندێك لە فەرموودەناسان: چونكە (ئەبو حەنیفە) ڕای جیاوازە لەگەڵ ئەواندا لە دیاریكردنی واتای ئیمان، چونكە فەرموودەناسان ئیمان بە سێ بنەمای پێكهاتوو دادەنێن، كە بریتین لە: دانپێدانان بە دڵ، دەربڕین بە زمان، ئەنجامدانی بە ئەندامەكان. كەچی (ئەبو حەنیفە) ئیمانی كورت هەڵێناوە لە بنەمای یەكەمدا كە بریتییە لە (دانپێدانان)، بۆیە ناویان نا مورجیئە، بەو واتایەی كە كردەوەی پاش خست لە پلەی ئیماندا.

(إرجاء)ی وەرگرتووە، کە بریتییە لە دواخستن، چونکە ئیمامی ناوبراو کردەوەی لە ئیمان دواخست، نەك مانای نەریتی ئەم زاراوەیەی مەبەست بێت لە زانستی کەلامدا، جا لەرئەوەی (ئەبو حەنیفە) یەکێکە لەوانەی کە دەڵێت نابێت سزا بۆ هیچ کەسێك یەکلایی بکرێتەوە بەڵکو دەبێت بە خوا بسپێردرێت، جا ئەگەر خوای گەورە ویستی لێی خۆش

دووەمیان: زۆربەی موعتەزیلەکان، چونکە (ئەبو حەنیفە) ڕای جیاوازە لەگەڵ ئەوان سەبارەت بەو ئیماندارەی گوناهی گەورە دەکات، چونکە موعتەزیلەکان بەبێ دوودڵی بڕیار دەدەن لەسەر ئەنجامدەری گوناهی گەورە بەوەی هەتا لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە. بەڵام (ئەبو حەنیفە) هیچ حوکمێك یەکلایی ناکاتەوە، بەڵکو دەڵێت: ئەمە خوای گەورە یەکلایی دەکاتەوە، بۆیە ناویان لێنا مورجیئە، چونکە حوکمدان لەسەر ئەو جۆرە کەسانەی دواخست و بەبێ دوودڵی دانی بەوەدا نەنا کە سزا دەدرێت.

شێخ زەفەر تەهانوی لە: (قواعد علوم الحدیث ٢٣٣-٢٣٥) وەك ڕوونکردنەوەیەك لەسەر ئەوەی لە (ئیبن حەجەر)ەوە هێناویەتی لە پێشەکی کتێبی (الفتح) وتویەتی: (شتێکی شاراوە نییە کە دواکەوتن لە دەرکردنی بڕیاری ئەوەی کامە تاقم ڕاستی پێکاوە، لەوانەی جەنگیان لەگەڵ یەکتر کرد، لە دوای خەلافەتی عوسمانی بەهیچ شێوەیەك گومڕایی فڕی بەسەریەوە نییە، بەڵکو سوێند بەخوا ئەمە خۆپارێزی و دووربینیە، بێ دەنگ بوون لە ئاست ئەوەی لە نێوان هاوەڵان ڕوویدا زۆر چاکترە لە قسە تێدا کردنی، جا هەر کەسێك مورجیئەی بۆ بەکارهێنرا مانای وانیە لە ئایینەکەیدا تۆمەتبارەو لە سوننەت دەرچووە، بەڵکو پێویستە حاڵ و بارودۆخی ئەو کەسە بپشکێنرێت، جا ئەگەر دواخستنی بڕیاری یەکلاییکردنەوەکەی لەبارەی بابەتی هاوەڵان بێت - ئەوانەی جەنگیان لەگەڵ یەکتر کرد - و ئەم بڕیارە بەخوا بسپێرێت، ئەوا ئەو کەسە لە ئەهلی سوننەیە و بەبێ دوودڵی لە پارێزگارانە. جا ئەوەش کە کردەوە پاش دەخات لە ئیمان و دەڵێت گوناه زیانی نییە، ئەوا ئەو کەسە تۆمەتبار دەکرێت لە ئایینەکەیدا). پاشان وتەی (تەفتازنی) لە (شرح المقاصد) و (ئیبن حەجەری مەککی) لە (فصل السابع والثلاثین من کتابه الخیرات الحسان) و آمدی، هێناوەو دواتر وتویەتی: (دەڵێم: بەکارهێنانی نازناوی ئیرجاء لەلایەن فەرموودەناسانەوە بۆ ئەوانەی بڕوایان بە زیادو کەم کردنی ئیمان نیە و دەڵێن کردەوە ناچێتە ناو حەقیقەتی ئیمان زۆر زۆرە، لە ڕاستیدا ئەمە توانج نیە و ناشاردرێتەوە لە بلیمەتەکانی شەریعەت، ڕاجیاییەکە لەمبارەوە تەنها لە دەربڕیندایە، هەروەك زانا لێکۆڵەرانی پێشین و پاشین ئەم دەرەنجامەیان دەستخستووە).

لەبارەی ئیرجائەوە بڕوانە: الرفع والتکمیل للکنوي ٣٥٢ و لاپەڕەکانی دواتری، و تعلیق الشیخ عبدالفتاح أبو غدة علی کتاب قواعد في علوم الحدیث ٢٣٥-٢٣٩.

دەبێــت و ئەگــەر بیشــیەوێت ســزای دەدات، ئەمــە (ئیرجائــە) بــەو مانایــەی کــە یەکلاییکردنەوەکە دوادەخات و بڕیار بە سزا یاخود پاداشــت بــۆ هــیچ کــەس دەرناکــات، بەڕاستی ئەمەیە مەزهەبی پەیڕەوانی ڕاستی[1].

جا دواخستنی کردەوە بەوەی لە بنەما ڕەسەنەکانی ئیمان بێت ئەمە ســوننەتە، بــەڵام ئەو (ئیرجاء)ەی بە بیدعە دادەنرێت ئەوەیە کە بڵێت: گوناه لەگەڵ ئیماندا هیچ زیــانێکی نییە. هاوەڵانمان پاکن لە وێنەی ئەم بۆچوونانە[2].

## ڕاو بۆچوونەکانیان:

١- ئیمان تەنها بریتییە لە دانپێدان بەدڵ، کردەوەی ڕووکەش و دیارەکان بەشــێك نــین لــە ئیمان. جا ئەوەی بــاوەڕ بــەخواو پێغەمبەرەکــەی بێنێــت و گونــاهی گــەورە بکــات و فەرزەکان فەرامۆش بکات ئەوا ئەو کەسە باوەڕدارە.

هەندێك لە مورجیئەکان زۆرتر زیادەڕەویان کرد و وتیان: (ئیمان بریتییە لــە بڕوابــوون بە دڵ ئەگەر بە زمــان کــوفریش دەرببڕێــت و بــت بپەرســتێت یــاخود پابەنــدبێت بــە جولەکایەتی و نەصرانیەت لە وڵاتی ئیسلامدا و خــاچ بپەرســتێت و بیروبــاوەڕی ســێ کۆچکەیی "التثلیث" ڕابگەیەنێت لە وڵاتی ئیسلامدا و لەسەر ئەمــەش بمرێــت، ئــەو کەسە ئیمانی تەواوی هەیە لەلایەن خوای باڵادەستو خاوەن شکۆ، خۆشەویستی خــوای گەورەیە و بە بەهەشتیە).

ئەوان کافرێتی نەصرانی و جولەکەکان یەکلا ناکەنەوە، چونکە شوێنی ئیمــان بریتییــە لە دڵ، تەنها خوای گەورە زانایە بە دڵ، ئەمەش سەردەکێشێت بۆ ئەوەی کە مامەڵەی

---

[1] شرح المقاصد للتفتازاني ١٥٦/٥ ونقله التهانوي في قواعد الحديث ٣٣٤. نسفی لە: (تبصرة الأدلة ٧٦٦/٢)دا وتویەوتی: (ئەبو حەنیفە - ڕەحمەتی خوای لێبێت - بە مورجیئە ناودەبرا چونکە چارەنووسی ئەنجامدەری گوناهی گەورەی دەسپارد بە خوا. ئیرجائیش واتە دواخستن).

[2] تأنيب الخطيب للكوثري ٢٨١ ونقله عنه التهانوي في قواعد في علوم الحديث ٢٣٨.

ئاشتی ئامێز لەگەڵ هەموو خەڵکیدا بکرێت[1].

هەندێك لە مورجیئەکان دەڵێن: هەر کەسێك بڵێت، هیچ خوایەك نییە بە حەق جگە لە "الله" و موحەممەد پەیامبەرو نێردراوی خوایە، ئەو شتە حەرام بکات کە خوا حەرامی کردووە، ئەوەش حەڵاڵ بکات کە خوا حەڵاڵی کردووە، ئەگەر مرد دەچێتە بەهەشتەوە، ئەگەرچی زیناو دزی کردبێت و یەکێکیشی کوشتبێت و مەیی خواردبێتەوەو ئافرەتی پاکیشی تاوانبار کردبێت و نوێژی نەکردبێت و زەکاتی

[1] فجر الإسلام ٢٨١ ونقل قول الغلاة بعض المرجئة عن ابن حزم، ونقله أبو زهرة في تأريخ المذاهب الإسلامية ١٢٠ عن الفصل لإبن حزم في الفصل ٧٣/٥.

سابت قوتنەی شاعیر: مورجیئایەتی لێ زانراوەتەوە، ناوبراو لە چامەکەیدا وتویەتی کە (ئەحمد ئەمین) لە (فجر الإسلام ٢٨٢) لە (کتاب الأغاني لأبي الفرج الأصبهاني) نەقڵی کردووە:

المسلمون على الإسلام كلهمو والمشركون استووا في دينهم قددا

واتە: موسڵمانان هەموویان لەسەر ئیسلام و هاوبەشدانەرانیش لە قەبارەی ئایینەکانیاندا وەك یەکن.

جا (مەڵتی) لە (التنبيه والرد ١٤٦) وتویەتی: (لە ناو مورجیئەکاندا هەیە دەڵێت: هەر کەسێك شایەتمانی بەڕاست هێنا، ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە، ئەگەر هەر کارو کردەوەیەکیش بکات، هەروەك ئەگەر کابرا هاوبەشدانەر بوو کارە چاکەکانی نابنە مایەی سوود بۆی، هەروەك ئەگەر کابرا خوابەیەکگر و یەکتاناس بوو کارە خراپەکانی نابنە مایەی زیان بۆی. گومانیان وابوو کە کابرا هەرچەندە گوناهی گەورە بکات و فەرزەکان فەرامۆش بکات تاوانی مەزن پیشەی بێت ئەوا هەر ناچێتە دۆزەخەوە). و (مەڵتی) چەند ڕەتدانەوەیەکی لەسەر ئەم بۆچوونە هێناوە.

هەروەها لە (١٤٩) وتویەتی: (هەشیانە وتویەتی: ئیمان بریتییە لە: بەدڵ ناسین، بە زمان دەربڕین و کردەوەی ئەندامەکان ناچنە ناو چوارچێوەی ئیمانەوە، جا هەر کەسێك خوای بەدڵی خۆی ناسی بەوەی کە خوای گەورە وێنەی نییە، جا ئەو کەسە ئیماندارو برواداره ئەگەرچی نوێژ ڕووەو خۆرهەڵات یاخود خۆرئاوا بکات و پشتێنێك لە ناوقەدی ببەستێت).

سابت قوتنەی شاعیر ئەوەی خستووەتەڕوو: کە گوناه هەرچەند گەورە بێت هەر نابێتە هۆی لاچوونی ئیمان، دەڵێت: ولا أرى أن ذنبا بالغ أحدا م الناس شركا إذا ما وحدوا الصمدا

واتە: پێم وانیە کە هیچ گوناهێك هەبێت کە خاوەنەکەی بباتە خانەی هاوبەشدانانەوە مادام ئەو گوناهبارە خوای بێ نیازی جێگای نیاز بە تاك و تەنها دابنێت.

فجر الإسلام ٢٨٢ عن كتاب الأغاني لأبي الفرج الأصبهاني.

نەدابێت و ڕۆژووی نەگرتبێت، ئەگەر شایەتمان بێنێت و دانی پێدابنێت ئەوا چاوەڕوانی تەوبەی لێدەکرێت، بەمەش ئەنجامدانی تاوانە گەورەکان و فەرامۆش کردنی فەرزەکان و کردنی خراپەکاری زیانی بۆ نابێت.

ئەگەر ئەم کارانەی ناوبراوی کرد و بەحەڵاڵیشی زانی لەو کاتەدا بێ باوەڕەو هاوبەشی بۆ خوا بڕیارداوە و خۆی لە ئیمان دارنیوەو یەکێکە لە دۆزەخییەکان، بەم بەڵگانە:

أ- ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴾ النساء: ٤٨ و ١١٦. واتە: (بەڕاستی خوا خۆش نابێت ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیار بدرێت، بێجگە لەوە لە هەر گوناهێکی تر بیەوێت خۆش دەبێت). وتیان کافر بەتەنها لێخۆش بوونی بۆ نییە، گوناهەکانی خوار کوفر ئەوا خاوەنەکانیان لێخۆش بوونیان بۆ هەیە.

ب- ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم): **(من قال لا إله إلا الله دخل الجنة، وإن زنى و إن سرق وقتل)**[1] واتە: هەر کەسێك بڵێت هیچ خوایەك نییە بەهەق جگە لە "الله" ئەوا دەچێتە بەهەشت، ئەگەر زیناو دزی کردبێت و یەکێکیشی کوشتبێت.

سەرجەم مورجیئەکان دەڵێن: هیچ یەکێك نییە لە کافرەکان بڕوای بەخوای گەورە هەبێت[2].

زۆربەی مورجیئەکان هیچ یەکێك لە تەئویلکارەکان تەکفیر ناکەن، تەنها کەسێك تەکفیر دەکەن کە ئوممەت کۆك بێت لەسەر تەکفیر کردنی[3].

---

[1] التنبیە والرد ٤٣، وسەیری ١٤٦ بکە.
لە (الجامع الصغير للسيوطي ٥٣٦) هاتووە: (هەر کەسێك بە دڵسۆزی بڵێت هیچ خوایەك نییە بەحەق جگە لە "الله" ئەوا دەچێتە بەهەشت)، رواه البزار عن أبي سعيد، و صححه السيوطي.

[2] مقالات الإسلاميين ١/٢٢٢.

[3] مقالات الإسلاميين ١/٢٢٥. سەیری ڕاجیایی بکە لەم بارەوە ٢٣٢.

تاقمەکانی تر بەرپەرچی مورجیئەکانیان داوەتەوە، تەنانەت ئیمامی زەیدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەین (ڕەزای خوایان لێبێت) وتویەتی: (خۆم بەری دەکەم لە مورجیئەکان کە لێخۆشبوونی خوایان دەرخواردی لاسارەکاندا)[1].

٢- ئیمان زیاد و کەم ناکات. و ئیمان و باوەڕی فریشتەکان و پێغەمبەران و ئومەتەکان و زانایان و خانەدانەکانی خەڵکی و نەزانەکانیان یەك شتە، هیچ شتێك لەسەر بنەڕەت و ئەصڵی شتێکی تر زیاد ناکات[2].

هەندێکیان وتویانە: ئیمانی ناوبراوان جێگیرە هەمیشە، زیاد ناکات، ئەگەرچی کاری چاکەی زۆر گەورە بکات و پارێزکار بێت و قەدەغەکراوەکان فەرامۆش بکات و حەجی ماڵی خوا بکات و بەردەوام نوێژ بکات و ڕۆژوو بگرێت.

ئیمان کەم ناکات، ئەگەرچی کاری خراپە و تاوانی گەورە بکات و بە ئاشکرا شتە قەدەغەکراوەکان ئەنجام بدات و نوێژو ڕۆژوو و حەج هەر نەکات[3].

٣- نابێت خوێنی هیچ موسڵمانێك برژێنرێت، تەنها بەمەبەستی بەرگری کردن لە خود نەبێت، وتویانە: ئەگەر شتەکان ئاڵۆز بوون، هەر تاقمێك تاقمەکەی تری بەهۆی کردەوەکانی تەکفیر بکات، ئەوا ئێمە بەخوا دەیان سپێرین، کە لە دوارۆژدا خۆی دادگایی ئەوان دەکات لەسەر ئەو شتەی ئەوان ڕاجیاییان لەسەر هەبووە.

سەبارەت بە ستەمی ئاشکراو کردەوە دیارەکان، ئەوا حوکمی خۆمان بە ڕاشکاوانە لەسەری دەردەبڕین و ڕاست و هەڵەیان دەست نیشان دەکەین، خەواریجەکان هەڵەیان کرد کە تەکفیری عەلی و عوسمانیان کرد، چونکە ناوبراوان دوو بەندەی خوان کە لەوەتەی خوایان ناسیوە هاوبەشیان بۆ بڕیار نەداوە، سەرباری ئەوەی کە ئاڵۆزییەك

---

[1] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٢٢. و سەیری ئەمەش بکە: فجر الإسلام ٢٩٣.

[2] التنبيه والرد ٤٣. ئەمە ڕای غیلانییە./ الفرق بين الفرق ٢٠٧، غەسانی مورجیئی وتویەتی: ئیمان زیاد دەبێت بەڵام کەم ناکات./ الفرق بين الفرق ٢٠٣ والملل والنحل للشهرستاني ١٣٩/١.

[3] التنبيه والرد ١٥٤ هەندێ بۆچوونی تری لە دەستەکانی ئەوانی گێڕاوەتەوە.

هەبووە لە نێوانیاندا، کەچی ئەمە نەبووەتە هۆی دەرچوونیان لە ئیمان و ئێمەش بەخوایان دەسپێرین کە خوا خۆی ئەندازەی کارەکانیان دەکات و پاداشتیان دەداتەوە بەپێی کردەوەکانیان.

ئەمە ئەوەیە کە (سابت قوتنە)ی شاعیر لە چامەکەیدا وتویەتی[1].

---

(1) فجر الإسلام ٢٨٢ و چامەکەی (ثابت القطنة)ی لە کتێبی (الأغاني لأبي الفرج الأصفهاني)دا هێناوە، نمونە:

| | |
|---|---|
| يا هند فاستمعي إن سيرتنا | أن نعبد الله لم نشرك به أحدا |
| نرجي الأمور إذا كانت مشبهة | و نصدق القول فيمن جار أو عندا |
| لا نسفك الدم إلا أن يرادبنا | سفلك الدماء طريقا واحدا جددا |
| من يتق لله في الدنيا فإن له | أجر التقي إذا وفى الحساب غدا |
| كل الخوارج مخط في مقالته | ولو تعبد فيما قال واجتهدا |
| أما علي و عثمان فإنهما | عبدان لم يشركا بالله مذ عبدا |
| وكان بينهما شغب وقد شهدا | شق العصى وبعين الله ما شهدا |
| يجزي عليا و عثمانا بسعيهما | ولست أدري أية وردا |
| الله يعلم ماذا يحضران به | وكل عبد سيلقى الله منفردا |

واتە: ئەی (هیند) گوێبگرە ڕێچکەکەمان بریتییە لەوەی خوا بپەرستین و هاوبەشی بۆ بڕیار نەدەین. شتێك کە ئاڵۆز بێت بەخوای دەسپێرین و وتەی ئەوەش بەڕاست دادەنێین کە لادەدات و سەرکەشە. خوێنی هیچ یەکێك نارێژین مەگەر مەبەستی کوشتنی ئێمە بێت و هەوڵی ئەوە بدات. کەسێك لە دونیادا لە خوابترسێت ئەوا لە دواڕۆژدا پاداشت وەردەگرێتەوە ئەگەر بە تەواوی خۆی بۆ سبەینێ ئامادە کردبێت. خەواریجەکان لە بۆچوونەکانیاندا هەڵەن ئەگەرچی زۆر خوا بپەرستن بەپێی بۆچوونەکەی خۆیان. عەلی و عوسمان دوو بەندەی خوان لەوەتەی خوایان پەرستووە هاوبەشیان بۆ خوا بڕیار نەداوە. لە نێوان هەر دووکیاندا ئاڵۆزیی هەبووە و بەچاوی خۆیان بینیان کە موسڵمانان ڕیزپەرت بوون و بە تێڕوانینی خوایی بۆ ئەمەیان نەڕوانی. عەلی و عوسمان پاداشت بە ئەندازەی کۆششەکەیان وەردەگرنەوە بەڕاستی من نازانم هەڵەکە هی کام لایە. خوای گەورە دەزانێت چی لەگەڵ خۆیاندا دەهێنن و هەر بەندەیەکیش بەتەنها دەگەڕێتەوە لای خوای پەروەردگار.

## قــەدەریــــیـــەکـــان

**قەدەرییەکان:** تاقمێکن بڕوایان بە قەدەر هەیە، واتە: کردەوەی بەنـدەکان دەدەنـە پاڵ قەدەرەکانیان[1]، بەوەی بەندەکان خۆیان کردەوەکانیان بەدیدەهێنن و هەڵی دەبـژێرن و قەدەری خۆیان دەستنیشان دەکەن.

### سەرچاوەی ڕاوبۆچوونەکانیان

لەم بارەوە ڕاجیاییان هەیە و بۆ دوو بۆچوون دابەش بوون:

١- سەرچاوەکەی دەرەکییە، لەبەر ئەوەی قەدەرییەکان ئەم فیکرەیەیان وەرگرتـووە لـە نەصـڕانی و فەلسـفەی ڕۆمـانی، باسـکراوە کـە بابـەتی خواناسـی (لاهـوت) و فەلسەفەیان لە کتێبەکانی یوحەننای دیمەشقی وەرگرتووە، ئەمە بۆچوونی هەنـدێك ڕۆژهەڵاتناسان و جگەلەوانیشە[2].

٢- سەرچاوەکەی ناوەخۆییە، کە بریتییە لە تێڕامـان و وردبوونـەوە لـە هەنـدێك لـە دەقەکانی قورئانی پیرۆزو سوننەتی بەپێز.

لە ڕووکەشی هەندێك ئایەتدا فیکری جەبری بەدەردەکەوێت، وەك:

---

[1] تفسير القدر للسيد الشريف في شرح المواقف ٣٧٨/٨. و اشعري لە: الإبانة ١٩٧ بەمشێوەیە پێناسەی کردووە: (قەدەری ئەو کەسەیە کە قەدەر دەداتە پاڵ خۆی نەوەك خوای خۆی، هەروەها بڕوای وایە خۆی ئەندازەو قەدەری کردەوەکانی دیاری دەکات نەوەك بەدیهێنەرەکەی، قەدەر لە زمانیشدا هەمان واتای هەیە).

[2] الفرق الإسلامية في بلاد الشام ٢٧ ئاماژەی کردووە بۆ: سیل، کارل بروکلمان، غوردیە، واولیری، فلیب حتی، أسد رستم. غرابی هەمان بۆچوونی پەسەند کردووە لە: تأريخ الفرق الإسلامية ٣٦.
یوحەننای دیمەشقی بریتییە لە سەرجونی کوڕی مەنصوری ڕۆمی، یەکێك بووە لە خزمەتکارەکانی معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان، ناوبراو سەرپەرشتی کردنی خانەی باجی گرتە دەست بۆ معاویە و یەزیدی کوڕەکەی و بۆ مەڕوانی کوڕی حەکەم و عەبدولمەلکیی کوڕی مەڕوان و لەسەردەمی عەبدولمەلکیدا کۆچی دوایی کرد./ الفرق الإسلاميە فی بلاد الشام ٢٧-٢٨.

ئەم فەرمایشتەی پەروەردگار: ﴿ وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِيٓ إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾ هود: ٣٤. واتە: ("وادیارە" ئامۆژگاریی و دڵسۆزیم سوودتان پێناگەیەنێت ئەگەرچی بمەوێت بەردەوامیشبم لەسەر ئامۆژگاریتان، ئەگەر خوا بیەوێت سەرگەردانتان بکات ئەوە ئەو زاتە پەروەردگارتانە و هەر بۆ لای ئەویش دەبرێنەوە).

ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە (جابر) گێڕاویەتیەوە: **(لا يؤمن عبد حتى يؤمن بالقدر خيره وشره، وحتى يعلم أن ما أصابه لم يكن ليخطئه، وما أخطئه لم يكن ليصيبه)** واتە: هیچ بەندەیەك نابێتە باوەڕدار تا بڕوا بەخێرو شەڕی قەدەر نەهێنێت، تا بزانێت ئەو شتەی کە تیایدا ڕاستی پێکاوە هەرگیز هەڵەی تێدا نەدەکرد، ئەوەش کە تیایدا بەهەڵەچووە هەرگیز تیایدا ڕاستی نەدەپێکا.

لە قورئانی پیرۆزدا چەندین ئایەت هەن کە لە ڕووکەشدا وادەردەکەون کە مرۆڤ سەرپشکە و بەرپرسیشە لە کردەوەکانی، وەك:

ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴾ الكهف: ٢٩. واتە: (جا ئەوەی دەیەوێت با باوەڕ بهێنێت و ئەوەی دەیەوێت با کافرو بێ باوەڕ بێت).

ئەم تەرزە بیرکردنەوەیە لەم دەقانە سەری کێشاوە بۆ دەرکەوتنی ئەو کێشەیە و مشتومڕ لەسەری. ئەمە وتەی (ئەحمەد ئەمین)ە[1].

## هۆکاری ناونانی قەدەریەکان بەم ناوە:

قەدەرییەکان دەدرێنە پاڵ قەدەر. هۆکاری ئەم درانە پاڵەش ئەوەیە کە سەرباری ئەوەی ئەوان دەڵێن قەدەر نییە (بەواتای زانست و ئەندازەگیری) و قەدەر نادەنە پاڵ خوا، لەبەر ئەم هۆکارانە:

---

[1] فجر الإسلام ٢٨٣-٢٨٤. ونقله حسين عطوان ٢٩، سەرچاوەی پێشوو.

١- ئەوان کاتێك قەدەریان نەدایە پاڵ خوا ئەوا دایانە پاڵ بەندەکان، بەمەش هەموو شتێکیان دایە پاڵ ویستی سەربەخۆی مرۆڤ دوور لەویستی خوا، وەك ئەوەی قەردەرییەکان دەسەڵاتێکیان دایە مرۆڤ کە زاڵبێت بەسەر قەدەریشدا.

جا (مەعبدی جیهەنی) کە سەرکردەیانە بەرپەرچی ئەوانەی داوەتەوە کە هۆکار بۆ گوناهەکانیان دێننەوە بە قەدەر بە وتەی: (لا قدر والأمر أنف) قەدەر بوونی نییە بەڵکو شتەکان هاکەزایین. واتە: دووبارە زانیاری و زانستی نوێبەدەست دێنێت لەبارەی کارو بارودۆخەکان بەمەش پێویستی بە ویستی نوێ هەیە. بەمەش نکۆڵی کرد لە بوونی ویست و زانستی لەمێژینە و بێ سەرەتا تا کردەوەی مرۆڤ دەربچێت لە چوارچێوەی توانای خوایی[1].

[1] تاریخ المذاهب الإسلامیة ١١٠- ١١١.

لە سەحیحی موسلم سەرەتای بەشی ئیمان هاتووە:(لە ئیبن بریدەوە هاتووە کە لە یحیای کوڕی مەعمەری گێڕاوەتەوە، وتویەتی: یەکەم کەس کە بابەتی قەدەریەتی وروژاند لە بەصرەبوو بەناوی معبدی جهنی، من و حمیدی کوڕی الحمیری بە مەبەستی حەج یان عومەرە چووین، وتمان: ئەگەر بە یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بگەیشتینایە و پرسیارمان لێبکردایە لەبارەی بۆچوونی قەدەرییەکان لەبارەی قەدەرەوە، لە ناو مزگەوت "عەبدوڵای کوڕی عومەری خەتتاب"، خۆم و هاوەڵەکەم هەریەکە چوونە لا تەنیشتێکی و واگومانم برد کە هاوەڵەکەمان منی ڕاسپارد بۆ قسە کردن، منیش وتم: باوکی عەبدورحەمان هەندێك خەڵکی لەلای ئێمە دەرکەوتوون قورئان دەخوێنن و زانستیان پێ نییە، باسی حاڵ و باڵی ئەوانی کرد، بڕوایان وایە قەدەر بوونی نییە و کاروبارو بارودۆخەکان هاکەزایین. وتی: ئەگەر بەوانە گەیشتیت پێیان ڕابگەیەنە کەمن لێیان بەریم و ئەوانیش لەمن بەرین. سوێند بەو زاتەی "عەبدوڵای کوڕی عومەر" سوێندی پێدەخوات، ئەگەر هەر یەکێکیان بە ئەندازەی کێوی ئوحود زێڕ ببەخشێت، خوای گەورە هیچیان لێ وەرناگرێت، دواتر وتی: ابن عمر بۆی گێڕامەوە..). و فەرمووودەکەی جبریلی هێناوە کە لەبارەی: ئیمان و ئیسلام و ئیحسانە، و تیایدا هاتووە: کە بڕوا بێنیت بە قەدەر بە خێرو شەڕیەوە.

٢- قەدەرییەکان، دراونەتە پاڵ دژەکەیان، چونکە دەکرێت شتێك بە دژەکەی ناوبنرێت[(١)]، وەك ناونانی کەسی کوێر بە بینەر، جا قەدەرییەکان دراونەتە پاڵ قەدەر لە کاتێکدا ئەوان نکۆڵی دەکەن لە بوونی قەدەر.

## پیاوە قەدەرییەکان

لە ئەوزاعی گێڕدراوەتەوە: یەکەم کەس کە لە بابەتی قەدەر دواوە پیاوێك بووە لە عێڕاق، پێی دەوترێت: سوسن، پێشتر نەصرانی بوو و بووە موسڵمان دووبارە بووەوە بە نەصرانی، جا مەعبەدی جهەنی) فیکرەی قەدەری لەناوبراو وەرگرتووەو غەیلانیش لە مەعبەدەوە وەریگرتووە[(٢)].

معبد یەکەم کەس بوو لە شاری بەصرە[(٣)] کە لە بارەی بابەتی قەدەر[(٤)] دوا. ناوبراو یەکێکە لە شوێنکەوتووان (التابعين)[(١)]، باوەڕپێکراوە لە فەرموودەدا[(٢)]، لەگەڵ ئەوەشدا

---

(١) تاريخ المذاهب الإسلامية ١١١.

(٢) تهذيب الكمال ١٦٩/٧ و تهذيب التهذيب ١١٦/٤. و نحوه ما ذكره ابن نباتة في سرح العيون ٢٩٠. و نقله عن ابن نباتة كل من: أحمد أمين في فجر الإسلام ٢٨٥ ومحمد أبو زهرة في تأريخ المذاهب الإسلامية ١١١.

موزی لە (تهذيب الكمال) وتویەتی: (مەعبەدی جهەنی بەصری، دەوترێت: کوڕی عەبدولکەریمی جهەنییە، دەشوترێت: کوڕی "عەبدوڵای کوڕی عویمە، هەروەها دەوترێت: کوڕی خالیدە. ڕای ڕاست ئەوەیە نەدرێتە پاڵ هیچ یەکێك لەمانە).

(٣) تهذيب الكمال، سەرچاوەی پێشوو، لە أبي حاتم، وكذا تهذيب التهذيب، وتقريب التهذيب، والكاشف، سەرچاوەکانی پێشوو.

لە صحيح مسلم، أول كتاب الإيمان: عن يحيى بن يعمر) هاتووە: کە یەکەم کەس لە شاری بەصرە، دەربارەی بابەتی قەدەر دوا، معبد الجهني بوو.

(٤) فجر تهذيب الكمال، سەرچاوەی پێشوو، وفيه: هو قول أبي حاتم وأبي زرعة الغساني. وفي هامش المزي: عن البخاري في الضعفاء الصغرى وابن حبان في المجروحين، والذهبي في الميزان. وزاد ابن حجر في تهذيب التهذيب ١١٦/٤-١١٧ عن الدارقطني. وتقريب التهذيب ٥٣٩ والذهبي: الكاشف ٢٧٩/٢ والمعارف لإبن قتيبة ٤٨٤ في ترجمة غيلان. ونسبه إلى القدرية: ابن قتيبة أيضا في المعارف ٥٤٧ و ٦٢٥.

سەرکردە بوو لە بابەتی قەدەردا[٣]، زانایان لەبارەیدا هۆشداریان داوە[٤]. عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان لە ساڵی ٨٠ك لە دیمەشق کوشتی[٥].

باوکی غەیلانی دیمەشقی[٦] خزمەتکاری عوسمانی کوڕی عەففان بووە[٧].

فیکرەی قەدەرییەتی لە (مەعبەدی جهەنی) وەرگرتووە، هەروەك کەمێك پێش ئێستا خستمانەڕوو لە میانەی وتەکەی ئەوزاعیدا[٨].

---

(١) تهذیب الکمال، سەرچاوەی پێشوو، لە: ابن سعد، وکذا في تهذیب تهذیب، سەرچاوەی پێشوو، لە: ابن سعد وعجلي.

(٢) تهذیب الکمال، سەرچاوەی پێشوو، و تیایدا هاتووە: ابن معین بە باوەڕپێکراوی داناوە. و ئەبو حاتم وتویەتی: لە فەرموودەدا ڕاستگۆ بوو. و ئیبن حەجەر لە: (تهذیب التهذیب ١١٧/٤)دا وتویەتی: عیجلی وتویەتی: باوەڕپێکراوەو بە درۆ تۆمەتبار نەکراوە. و لە: (تقریب التذهیب ٥٣٩)دا هاتووە: ڕاستگۆیەکی بیدعەچیە. و زەهەبی لە: (الکاشف ٢٧٩/٢)دا وتویەتی: ڕاستگۆیە.

(٣) تهذیب الکمال، سەرچاوەی پێشوو، لە أبي حاتم، و في الهامش: عن الجوزجاني في أحوال الرجال. و ابن حجر: تهذیب التهذیب ١١٧/٤ عن الجوزجاني.

(٤) تهذیب الکمال، سەرچاوەی پێشوو، لە: حسن البصري و طاوس و جگەلەوانیش. وتهذیب التهذیب، سەرچاوەی پێشوو.

(٥) تهذیب الکمال، سەرچاوەی پێشوو، لە: غەسانی و سەعیدی کوڕی کەسیری کوڕی غەفیر، وتهذیب التهذیب، والکاشف، هەردوو سەرچاوەکەی پێشوو.

(٦) الکامل في التأریخ ٢٦٣/٥، تیایدا هاتووە: کە ناوی باوکی بریتییە لە یونس یاخود مسلم. و نازناوی غەیلان بریتی بوو لە ئەبو مەروان، سرح العیون ٢٨٩، تیایدا هاتووە: غەیلانی کوڕی یونس. والمنیة والأمل ١٣٧ و تیایدا هاتووە: کە ناوی باوکی بریتییە لە مسلم یان مروان. و لە: المعارف لإبن القتیبە ٤٨٤ هاتووە: کە نازناوی أبی مروانە.

(٧) سرح العیون، والمنیة والأمل، هەردوو سەرچاوەکەی پێشوو.

(٨) ئیبن قوتەیبە لە: (المعارف ٤٨٤)دا وتویەتی: (کابرایەکی قەدەری بوو و هیچ کەسێك بەر لەو قسەی لەبارەی قەدەرەوە نەکردبوو، دواتر معبد الجهني بانگەشەی بۆ کرد... و بە زنجیرەو سەنەدی خۆی لە ئەوزاعیەوە گێڕاویەتیەوە کە وتویەتی: یەکەم کەس کە قسەی لەسەر قەدەر کردبێت مەعبەدی جهەنی بووە دوای ئەو غیلان بوو).

عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان ناوبراوی دەستنیشان کرد بۆ پەروەردەکردنی (سەعید)ی منداڵەکەی.

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ناوبراوی لە خۆ نزیك کردەوەو گوێی لە ئامۆژگارییەکانی دەگرت، بەڵام عومەر مامەڵەیەکی وشکی لەگەڵ کرد کاتێك بیرۆکە قەدەرییەکەی دەرکەوت، ئەمەش دوای ئەوەی عومەر گفتوگۆی لەگەڵ کردو داوای تەوبەی لێکرد، پاشان دەستی هەڵگرت لە قسەکردن لەسەر ئەم بابەتە.

دواتر (مەعبەدی جهەنی) لە پیاوە تایبەتەکانی هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك بوو، لە سەردەمی ناوبراودا گەڕایەوە سەر وروژاندنی بابەتەکە و بانگەشەی بۆ کردەوە، سیاسەتی بەنی ئومەییەی بە ناپەسەند دەزانی، جا هشام لە کۆتاییدا کوشتی[1]، ئەمەش لە دوای ساڵی ١٠٥ك بوو[2].

ئەوزاعی وتویەتی: غەیلانی قەدەری لە سەردەمی خەلافەتی هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك هاتە لامان، غەیلان هاتە دوان جا کەسێکی زمان پاراو و ڕەوان بوو، دواتر خەڵکی بەهۆی بۆچوونەکەی لەبارەی قەدەر هێرشیان کردە سەر و تۆمەتباریان کرد، هیشامی کوڕی عبدالملیکیان لە دژی هاندا، هیشام فەرمانی کرد دەست و پێیەکانی ببڕن پاشان بکوژرێت و لە سێدارەی بدەن[3].

---

لە (المنیة والأمل، سەرچاوەکەی پێشوودا) هاتووە: مەزهەبی وەرگرتووە لە حەسەنی کوڕی موحەممەدی کوڕی حەنەفییە. و ئیبن نەباتە لە: (سرح العیون ٢٨٩)دا وتویەتی: غەیلان یەکەم کەس بوو کە لەسەر بابەتی قەدەر دوا.

[1] الفرق بین الفرق في بلاد الشام ٣٥. و سەیری ئەمەش بکە: الکامل ٢٦٣/٥.

ئەم سەرچاوانە گفتوگۆیەکەی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز و غەیلانیان هێناوە: الملطي في التنبیه والرد ١٦٨ وابن نباتة، سەرچاوەی پێشوو ٢٩٠، ونحوها في فجر الإسلام ٢٨٥ وتأریخ المذاهب الإسلامیة ١١٢. وأشار إلیها الغرابي في تأریخ الفرق ٤٠ نقلا عن ابن نباتة.

[2] الأعلام للزرکشي ١٢٤/٥. باسی ئەوەشی کردووە کە سەرچاوەکان کاتی کوژرانی ئەویان نەنووسیوە، جا ئەو کاتەکەی دیاری کردووە بە پشت بەستن بەوەی کە ئەوەی ناوبراوی لە سێدارە داوە هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك بوو، کە خەلافەتەکەی ١٠٥ك بوو.

[3] فجر الإسلام ٢٨٥.

پێشتر ئەوەمان خستەڕوو کە هەندێ کەس هەن مورجیئەی قەدەریین لەگەڵ غەیلاندا وەك: ئەبو شەمر، موحەممەد ی کوڕی شەبیب، صالح قوبە.

غەیلانی دیمەشقی و صالحی کوڕی سوەید لە سەرکردەکانی قەدەرییەکان بوون، بانگەشەیان دەکرد بۆ مەزهەبەکە و سەریان دەخست. دوای ئەو دوانە چەندین سەرکردە قەدەرییەکانی بەڕێوەبردووە لە خەلافەتی وەلیدی کوڕی یزیدی کوڕی عەبدولمەلیك، یزیدی کوڕی وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك پشتی ئەوانی گرت و ئەوانی لەخۆ نزیك کردەوە، لە دواییدا کردنی بە سەرباز، بۆ لەسەر حوکم لادانی کوڕە مامەکەی وەلیدی کوڕی یەزید.

شافعی وتویەتی: (کاتێك یزیدی کوڕی وەلید هاتە سەر حوکم، بانگەشەی کرد بۆ قەدەرییەت و خەڵکی ناچارکرد ئەم فیکرەیە قبوڵ بکەن، هاوەڵانی غەیلانیشی لە خۆ نزیك کردەوە). زۆر کۆمەڵ و دەستە لە هۆزەکانی (روبعیە) و (یەمانیە) و (شامیە) ئەو فیکرەیان قبوڵ کرد بەهۆی ئەوەی دژی بەنی ئومەیە بوو، چونکە هۆزەکان دوورخرابوونەوە لە پلەوپایە سیاسیە گەورەکان.

بەڵام لە دوای مردنی یەزیدی کوڕی وەلید دەسەڵاتیان کەم بووەوە، مەڕوانی کوڕی موحەممەد تەنگی پێهەڵچنین، لەبەر ئەوەی بڕوای وابوو کە ئەوان وەلیدی کوڕی یەزیدیان کوشتووە، جا هەندێك لە قەدەرییەکان ڕایانکرد و چوونە ڕیزی بانگەوازی عەبباسی[1].

مێژوونووسان هەندێك لەو گفتوگۆیانەیان نەقڵ کردووە کە لەگەڵ ئەوانەدا ئەنجامدراون:

عمری کوڕی عبدالعزیز گفتووگۆی کرد لەگەڵ غەیلان و صالح.

هەروەها ئیاسی کوڕی معاویەی فەقیهی بەصرە لە مەجلیسی عەمری کوڕی عەبدولعەزیزدا گفتوگۆی لەگەڵ غەیلان کردووە.

[1] الفرق الإسلامية في بلاد الشام ٤١ ولاپەڕەکانی دواتری. و ناوی زۆرێك لە سەرکردەو هۆزەکانی هێناوە.

هیشامی کوڕی عەبدولمەلیکیش دەمەتەقێی کردووە لەگەڵ غەیلان، بە یارمەتی ئەم شەرعناسانە: مەیمونی کوڕی میهران شەرعناسی جەزیرە، ئەوزاعی شەرعناسشی شام و (ڕەبیعەی ڕەئی) شەرعناسی مەدینە بەهەمان شێوە دەمەتەقێی لەگەڵ کردووە، کە لە ساڵی ١٣٦ك کۆچی دوایی کردووە.

زانایان بەرپەرچی قەدەرییەکانیان دایەوە، عومەری کوڕی عەبدولعەزیز نووسراوێکی نووسی کە تیایدا بەپێویستی داناوە کە داوای تەوبەیان لێبکرێت، جا ئەگەر تەوبەیان کرد ئەوا ڕێگەیان بەربدەن ئەگەرنا دەبێت شاربەدەر بکرێن.

شەرعناسەکانی شام کوشتنی غەیلانیان بەباش زانی، وەك: (رەجائی کوڕی حیوە) و (عوبادەی کوڕی نسی) و (نەمیری کوڕی ئەوسی ئەشعەری)[1].

## شوێنەوارەکانیان

دوای ئەوەی خەلیفەکان دژایەتی ئەوانیان کرد و زانایان ئەهلی سوننەش هێرشیان کردنەسەر، ئایا شوێنەوارەکانی قەدەرییەکان توانەوەو لەناوچوون؟ لەم بارەیەوە دوو بۆچوون هەن:

١- شوێنەوارەکانیان تواونەتەوەو لەناوچوون، کەسایەتیەکی سەربەخۆیان نەما، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك لە ڕاکانیان لە ناو فیکرەی موعتەزیلەدا هەر ماوە، بۆیە زۆرجار موعتەزیلەکان بە قەدەری ناودەبرێن. ئەمە ڕای ئەحمەد ئەمینە[2].

---

[1] الفرق الإسلامية في بلاد الشام ٥٧ و لاپەڕەکانی دواتری.

لە (سرح العيون لإبن نباته ٢٩٠)دا هاتووە: (گێڕدراوەتەوە کە ڕۆژێکیان غەیلان لەلای رەبیعە ڕاوەستا و پێی وت: تۆ ئەو کەسەیت واگومان دەبەی کە پێویستە سەرپێچی خوا بکرێت؟ جا ربیعە لە وەڵامدا پێی وت: تۆش ئەو کەسەی واگومان دەبەیت کە پێویستە بە زۆری سەرپێچی خوا بکرێت).

ئیبن نەباتە هەندێك هەواڵەکانی لەمانەوە هێناوە: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، مکحول، هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك و ئەوزاعی.

[2] فجر الإسلام ٢٨٧، ونقله عنه د.حسين عطوان في الفرق الإسلامية في بلاد الشام ٧٩.

٢- ئەم مەزهەبە نەمردووەو نەتواوەتەوە لەناو مەزهەبێکی تردا، بەڵکو بە بەردەوامی هەبووە بۆ ماوەی چەند سەدەیەکی درێژ لەناو دانیشتووانی بەصرەدا، دواتر لەلایەن هەندێکیانەوە گۆڕا و وەك هاوشێوەی مەزهەبی دوانە پەرست (ثنوي)ەکانی لێهات کە بڕوایان وایە دوو هێز حوکم بەسەر جیهاندا دەکەن: نوور و تاریکی، چاکە و خێریان داوەتە پاڵ نوور، هەروەها خراپەو شەڕیان داوەتە پاڵ تاریکی.

جا قەدەرییەکان کاری چاك و خێرییان دەدایە پاڵ خوا، کاری خراپەشیان دەدایە پاڵ خۆیان بەشێوەیەك کە ویستی خوا هیچ ڕۆڵێکی تێدا نەبێت، بەڵکو پێیان وابوو ئەوان کاری خراپە دەکەن، ئەوا لەو کاتەدا دژی ویستی خوا دەجولێنەوەو ویستی خوا دەشکێنن. ئەمە ڕای شێخ موحەممەد أبو زهرەیە[١].

ئەو مێژگەردەی (ئیبن قەیم جەوزییە، کە لە ساڵی ٧٥١ك کۆچی دوایی کردووە) هێناویەتی بەڵگەیە لەسەر ڕای دووەم، جا ئەگەرچی مێژگەردەکەش تەنها شتێکی وێنەیی بێت، کە لە کتێبەکەی خۆیدا (شفاء العليل) هێناویەتی، تیایدا ڕای شێخەکەی خۆی کە (ئیبن تەیمیەیە، لە ساڵی ٧٢٨ك کۆچی دوایی کردووە) پەسەند دەکات، کە ناوبراو پێی وایە کردەوەکانی بەندە دەدرێنە پاڵ خوا، خوای گەورە بەدیهێنەری کردەوەکانە[٢].

## ڕاو بۆچوونەکانی قەدەرییەکان

قەدەرییەکان چەند ڕاو بۆچوونێکیان هەیە. ئەو کتێبانەی لە فیکرو تاقمەکان (المقالات والفرق) دەکۆڵنەوە، باسیان کردووەو هێناویانە. کە هەندێك بۆچوون لەگەڵ هەندێکی تر جیاوازن، ناودارترینیان غەیلانە، ڕاو بۆچوونی بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

---

(١) تأريخ المذاهب الإسلامية ١١٥.

(٢) تأريخ المذاهب الإسلامية ١١٦. شفاء العليل لابن القيم ٢٨٢. واشار إليها محمد سلام المدكور في منهاج الإجتهاد ٤٩٣.

١- قەدەر خێر بێت یان شەڕ ئەوا لە بەندەوەیە[1].

ناوبراو بڕوای وایە مرۆڤ سەرپشکە، واتە مرۆڤ توانای بەسەر کردەوەکانی خۆیدا دەشکێت، مرۆڤ بە ویست و توانای خۆی کاری چاکە دەکات، هەروەها بە ویست و توانای خۆی کاری خراپە دەکات، قەدەر هیچ دەسەڵاتێکی بەسەر مرۆڤدا نییە[2].

بۆیە قەدەرییەکان بۆ ئەوەچوون کە توانای بەدیهێنان و دروست کردن بۆ بەندە بچەسپێنن و بەندە لەمەدا پێویستی بە یارمەتیدەر نییە لەلایەن خواوە لە کارو کردەوەکانیدا[3]، بەڵکو مرۆڤ سەرپشکە و دەستەمۆو ناچار نییە.

لەم بۆچوونەدا موعتەزیلەکانیش لەگەڵ غەیلان کۆکن.

٢- باوەڕ: بریتییە لە دووبارە ناسینی خوا (واتە: ناسینەکە بەدەستهێنراو بێت، بەو واتایەی لە تێڕامان و بەڵگە هێنانەوە سەرچاوەی گرتبێت) و خۆشویستنی و ملکەچ بوون بۆی و داننان بەو پەیامەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەلایەن خوای گەورەوە هێناویەتی.

سەبارەت بە زانیاری سەرەتا (یەکەم) ئەوا زانیارییەکی خوارسکی پێویستە وەك ئەوەی کە دەبێت بزانێت کە جیهان بەدیهێنەرێکی هەیە، ئەم زانیاری و ناسینە بە ئیمان ناونانرێت[4].

غەیلان شوێنی بۆچوونی (ئەبو سەوبان)ی مورجیئی و شوێنکەوتووانی کەوت، هەروەك شهرستانی ئەمەی وتوە[5].

---

[1] الملل والنحل للشهرستاني ١/١٤٠. پێشتر ئەوەمان خستەڕوو کە غیلان یەکێکە لە مورجیئە قەدەرییەکان.

[2] تأريخ الفرق الإسلامية للغرابي ٣٣.

[3] الخطط للمقريزي ١٤٣/٢.

[4] الملل والنحل للشهرستاني ١٤٣/١.

[5] الملل والنحل للشهرستاني ١/١٤٠.

بۆچوونەکەی (ئەبو سەوبان) بریتییە لەوەی: ئیمان بریتییە لە دانپێدانان و ناسینی خواو پێغەمبەرەکانی و هەموو ئەو شتانەی کە بە عەقڵ پێویستە بکرێت، جا شتێك کە لە عەقڵدا

ئەگەر بەندە ئیمانی بە دەربڕین و ناسین دەستەبەرکرد. ئەوا دوای ئەمە هیچ کردەوەیەکی تری لەسەر پێویست نییە، تەنها بەجۆرێك پێویستە لەسەری کە بەبێ پەلە کردن کارەکان ئەنجام بدات و هەر کاتێك پێی خۆش بوو، ئەو لەسەر خۆبوونەش زیان بە ئیمانەکەی ناگەیەنێت چونکە ئیمانی بە هۆی دەربڕین و ناسین دەستەبەرکردووە[1]. غەیلان لەم بۆچوونەدا کۆکە لەگەڵ مورجیئەکان.

٣- ئیمان زیاد و کەم نابێت، لە ئیماندا خەڵکی وەك یەکن و کەسیان لەوەی تر گەورەتر نییە[2]. و ئەمە ڕای مورجیئەکانیشە.

٤- قورئان دروستکراوە[3]، هەر هەبوو و بێ سەرەتاش نییە. و ئەمە ڕای موعتەزیلەکانیشە.

٥- دان نەنان بە بوونی سیفەتە[4]چەسپاوەکان وەك: زانست و توانا و ویست، واتە: ئەم سیفەتانە خودی زاتی خوان و شتێکی جیاواز نین.

---

تەنها دروست بێت بزانرێت نەوەك پێویست بێت ئەوا ناچێتە ناو چوارچێوەی ئیمان./ الفرق بين الفرق ٢٠٤ ومقالات الإسلاميين ٢١٦/١ و الملل و النحل للشهرستاني ١٣٩/١ والمواقف ٣٩٧/٨ وخطط المقريزي ٣٥٠/٢.

بەمەش ئیمان پێویستی کرد بە عەقڵ پێش ئەوە شەرع بێت و پێویستی بکات./ الفرق بين الفرق، وخطط المقريزي، هەردوو سەرچاوەکەی پێشوو.

کردەوەی تەواوی پاش خست لە ئیمان. / الملل والنحل للشهرستاني، والمواقف. هەردوو سەرچاوەکەی پێشوو.

(١) تأريخ الفرق الإسلامية للغرابي ٣٣-٣٤.

(٢) الفرق بين الفرق ٢٠٧.

(٣) سرحون العيون ٢٨٩ و تیایدا هاتووە: غیلان یەکەم کەسە لە ئیسلامدا کە لە سەر بابەتی قەدەرو دروستکراوی قورئان قسەی کردبێت./ والفرق الإسلامية في بلاد الشام ٣٧ عن ابن نباتة، وتأريخ الفرق الإسلامية ٣٤.

(٤) سەرچاوەکانی پێشوو.

بۆیە ئەشعەرییەکان ناویان لێناوە پەکخەرەکان (المعطلة)، پەکخستنیش لەلای ئەشعەرییەکان بریتییە لە دان نەنان بە بوونی سیفەتەکان و نەفی کردنیان.

موعتەزیلە دەڵێن غەیلان یەکێکە لەوانەی دان بە تیۆری دادگەری و یەکخواناسیدا دەنێت، واتای یەکخواناسیی لەلایەن موعتەزیلەکان بریتییە لەوەی کە سیفەتە چەسپاوەکان و زات بەیەك شێوە دادەنێن و لەیەکیان جیاواز ناکەنەوە[1].

موعتەزیلەکانیش دان نانێن بە بوونی سیفەتەکان و نەفی دەکەن.

٦- دروستە ئیمامەت بۆ جگە لە قورەیشیەکان بێت، جا هەر کەسێك قورئان و سوننەت جێبەجێ بکات ئەوا شیاوی ئیمامەتە، ئیمامەت تەنها بەیەکدەنگی ئوممەت دەچەسپێت[2]. غیلان لەم بۆچوونەیدا کۆکە لەگەڵ خەواریجەکان.

## جەبرییەکان

جەبر: بریتییە لەوەی کە کردار بەشێوەیەکی ڕاستەقینە نەدرێتە پاڵ بەندە بەڵکو لێی ڕەت بکرێت و بدرێتە پاڵ خوای گەورە[3].

جەبریەکان: بریتین لەوانەی کە دەڵێن مرۆڤ دەستەمۆو ناچارکراوەو سەرپشك نییە.

ناودارترین کەسەکانی جەبریەت بریتین لە: جەعدی کوڕی درهەم کە یەکێکە لە

---

[1] تأريخ الفرق الإسلامية للغرابي، سەرچاوەی پێشوو، و (ابن المرتضى) لە: (المنية و الامل ١٣٧) باسی ڕای غەیلانی کردووە کە داندەنێت بە تیۆری دادگەری و یەکتاناسی، هەروەها غەرابی لە پەراوێزدا ئاماژەی بۆ کردووە.

پەکخستن (التعطيل): زاراوەیەکە کە پێشینان "سلف" بۆ موعتەزیلە و پێشینەکانی موعتەزیلەکان بەکاریان هێناوە وەك نیشانە هێمایەك بۆ ناسینەوەیان، واتاکەشی: بریتییە لە نکۆڵی کردن لە بوونی سیفەتە لەمێژینەو بێ سەرەتاکانی کە پەیوەستن بە زاتی خواوە./ نشأة الفكر الفلسفي في الإسلام ١/٣٣١.

[2] الملل والنحل للشهرستاني ١/١٤٠ و تأريخ الفرق الإسلامية للغرابي، هەردوو سەرچاوەکەی پێشوو.

[3] الملل والنحل للشهرستاني ١/٧٢ وإعتقادات فرق المسلمين ١٠٣ والفرق الإسلامية للكرماني ٨٩. و إيجي لە: (المواقف ٣٩٨/٨)دا وتویەتی: (بریتییە لەوەی کردەوە بدرێتە پاڵ خوا).

شوێنکەوتوان[1] و خزمەتکار بووە[2]. بنەچەکەی لە خوراسانە[3]، وتراوە لە حرانـە[4]. لـە شاری دیمەشق دادەنیشت[5]. وانەی پیشـانی مـەروانی کـوڕی موحەممـەد دەدا، کـە کۆتـا خەلیفەی بەنی ئومەییە بوو، بۆیە درایە پاڵ جعد، کە پێی دەوترا: مـەڕوانی جەعـدی[6]. وا گێڕدراوەتەوە، کە دایکی مەڕوان کۆیلە بووەو جەعدیش برای بووە[7].

جەعد یەکەم کەس بوو لە ئوممەتی موحەممـەد (صـلى الله عليـه وسـلم) کـە لـە دیمەشـق لەبارەی (بەدیهێنراوی قورئان) دووا، جا بەنی ئومەییـە داوایـان کـرد، بـەڵام نـاوبراو لـە دیمەشق هەڵات بەرەو کوفە و لەوێ نیشتەجێ بوو، ئینجا لە کوفە جەهمی کوڕی صـەفوان بە جعد گەیشت و فیکرەی دروستکراوی قورئانی لەوەوە وەرگرت[8].

جەعدی کوڕی درهەم ئەو بیدعەیەی لە بەیانی کوڕی سـەمعان وەرگرتـووە، بـەیانیش ئەمەی وەرگرتبوو لە تالوتی کوڕی خوشکی لوبەیدی کوڕی ئەعصەم کـە دەکاتـە مێـردی کچەکەی، و لوبەیدی کوڕی ئەعصم ئەو کەسەی کە جادووی لە پێغەمبەری خوا (صـلى الله

---

[1] ميزان الإعتدال ٣٩٩/١ ونقله ابن حجر في لسان الميزان ١٠٥/٢.

[2] وتراوە خزمەتکاری سوەیدی کوڕی غەفلە بووە./ الأنساب للسمعاني ٢٦٥/٣ وللباب لإبن الأثير ٢٨٢/١. وتراوە: خزمەتکاری بنەماڵەی مەڕوانی کوڕی حەکەمە./ سرح العيون ٢٩٣ والبداية والنهاية ٣٥٠/٩.

[3] البداية والنهاية، سەرچاوەی پێشوو.

[4] مختصر تأريخ دمشق لإبن عساكر: ابن منظور ٥٠/٦.

[5] مختصر تأريخ دمشق، سرحون العيون، والبداية والنهاية، والأنساب للسمعاني، سەرچاوەکانی پێشوو.

[6] سرحون العيون،سەرچاوەی پێشوو. و سەیری ئەمانەش بکە: الأنساب للسمعاني، مختصر تأريخ دمشق، البداية والنهاية، سەرچاوەکانی پێشوو، والفهرست لإبن النديم ٤٧٢.

[7] سرحون العيون، سەرچاوەکانی پێشوو.

[8] سرحون العيون، ومختصر تأريخ دمشق، والبداية والنهاية، سەرچاوەکانی پێشوو. عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو حاتەم لە باوکیەوە هێناویەتی کە جەعد یەکەم کەس بوو فیکرەی دروستکراوی قورئانی هێنا لە ساڵی سەدو بیست و نیو./ شرح أصول الإعتقاد اهل السنة والجماعة ١٦/٣.

علیه وسلم) کرد، ئەویش ئەو بیرۆکەیەی لە جولەکەیەکی یەمەنی وەرگرتبـوو[1]. وتراویشـە وەریگرتووە لە صابیئەیەکی فەیلەسوف کە لە حران دادەنیشت[2].

خالیدی کوڕی عەبدوڵای قەسری کە کاربەدەستی هیشـامی کـوڕی عەبدولمـەلیك بـوو بەسەر عێراق، جەعدی کوشـت، لـە ڕۆژی جـەژنی قوربـانی سـاڵی ١٢٤ك[3] لـە شـاری کوفە[4]، وتراوە لە ناوچەی واسیت[5]، ئەمانە دوو شارن لەوانەیە ناوی یەکێکیان بهێنرێت و مەبەستیش لێی شارەکەی تر بێت، بەهۆی نزیکی نێوانیان.

ئەمەش لەدوای ڕاپرسی کردن بوو بە زانا پێشینە چاکەکانی سەردەمی خۆی[6].

## ڕاو بۆچوونەکانی جەعدی کوڕی درهەم، وەك نمونەیەك:

١- بڕوای وابووە قورئان دروستکراو و بەدیهێنراوە[7]، وتراوە: جعد یەکەم کـەس بـووە لە ئوممەتی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) کە ئەو قسەیەی لە دیمەشق کردبێت[8].

٢- بڕوای بەبوونی سیفەتەکان نییە و ڕەتیان دەکاتەوە، وتـراوە: جەعـد یەکـەم کـەس بووە کە بوونی سیفەتەکانی ڕەتکردۆتەوە[9].

---

[1] البداية والنهاية ٩/٣٥٠ نقلا عن ابن عساكر وغيره. و بڕوانە: مختصر تأريخ دمشق ٦/٥١ و تیایدا هاتووە: أبان بن سمعان.

[2] شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٧٩٥.

[3] مختصر تأريخ دمشق، سەرچاوەی پێشوو، و سەیری ئەمانەش بکە: الأنساب للسمعاني واللباب لإبن الأثير و سرح العيون، والبداية والنهاية و الفهرست لإبن النديم، سەرچاوەکانی پێشوو، وشذرات الذهب ١/١٦٩.

[4] مختصر تأريخ دمشق، و سرح العيون، والبداية والنهاية، سەرچاوەکانی پێشوو.

[5] الأنساب للسمعاني، وشذرات الذهب، هەردوو سەرچاوەکەی پێشوو.

[6] شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٧٩٤.

[7] مختصر تأريخ دمشق ٦/٥٠ وسرح العيون ٢٩٣ والبداية والنهاية ٩/ ٣٥٠. و لە: (الكامل ٥/٢٦٣)ی ئیبن ئەسیردا هاتووە: جەعد لە سەردەمی هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك فیکرەکەی خۆی سەبارەت بە دروستکراوی قورئان دەرخست.

[8] سرح العيون، سەرچاوەی پێشوو.

[9] شذرات الذهب ١/١٦٩.

جەعــد گومــانی وابــوو كــە خــوای گــەورە ئیبراهیمــی وەك خۆشەویســتی خــۆی هەڵنەبژاردووە، موساش گفتوگۆی لەگەڵ خوا نەكردووە[1]. جعد زۆر پرسیاری لە (وەهەبی كوڕی مەنبەی كردووە لەبارەی سیفەتەكانی خوا، جا وەهب ئەوی ئاگادار كردۆتەوە بەوەی پێی وتووە: من واگومان دەبەم تۆ لە تیاچـووانیت، ئەگـەر خـوای گـەورە لـە كتێبەكـەی خۆیدا بە ئێمەی نەفەرمووبایە من (ید: توانا. و عین: بینین)م[2] هەیە، ئەوا ئێمە هـەرگیز ئەوەمان نەدەوت... [3].

غـەیلانی دیمەشـقی وتویـەتی: گفتوگـۆم لەگـەڵ جەعـد كـرد بینـیم كـە سـیفەتەكان پەكدەخات[4].

بۆیە جعـد بـە بیدعەچـییەكی سەرلێشـێواو دانـراوە[5]، هـەروەها بـە گومڕابـووێكی گومڕاكەر ژمێردراوە[6].

تەنها چەند ڕاو بۆچوونێكی كەمی جعد ماوون.

بـەڵام قوتابیەكـەی جـەهمی كـوڕی صـەفوان ئـەو كەسـەیە كـە ڕاو بۆچـوونەكانی جەبرییەكانی دەدرێتە پاڵ، تا وای لێهات ناوی (جەهمەی)یان بۆ جەبرییەكان بەكارهێنا.

---

[1] الأنساب للسمعاني ٣٩٣/٣ ومختصر تأريخ دمشق ٥١/٦ والكامل ٢٦٣/٥ وسرح العيون ٢٩٤ وميزان الإعتدال ٣٩٩/١ و نقله ابن حجر في لسان الميزان ١٠٥/٢. و ذكر ابن كثير في البداية والنهاية ٣٥٠/٩ ذلك عن البخاري وابن أبي حاتم وابن أبي والبيهقي و عبدالله بن أحمد وابن عساكر. و سەیری: شذرات الذهب، سەرچاوەی پێشوو بكە.

[2] لە بەشی خواناسی بە تێرو تەسەلی بابەتی سیفەتەكانی خوا ڕوون كراوەتەوە بگەڕێوە بۆ ئەوێ. (وەرگێڕ).

[3] البداية والنهاية، سەرچاوەی پێشوو.

[4] الفرق الإسلامية في بلاد الشام ٨٦ نقلا عن أنساب الأشراف. پێشتر كە ڕاو بۆچوونەكانی قەدەرییەكانمان خستەڕوو ئەوەمان ڕوونكردەوە كە واتای (تعطيل) بریتییە لە نەفی كردن و ڕەتكردنەوەی سیفەتەكان.

[5] ميزان الإعتدال، سەرچاوەی پێشوو. ونقله إبن حجر في لسان الميزان، سەرچاوەی پێشوو.

[6] مغني الضعفاء ١٣١/١ رقم ١١٢٨ ونقله عنه ابن عماد في شذرات الذهب ١٦٩/١.

جەهمی کوڕی صەفوانی ڕاسبی، نازناوەکەی (ئەبو میحرەز)ە، خزمەتکاری خانەوادەی ڕاسبە لە (ئەزد)[1].

ئەم نازناوانەشی بۆ بەکارهاتوون: سەمەرقەندی[2]، خزری[3]، ترمزی[4]، وتراوە: خەڵکی (بەلخ)ە و بیدعەکەی لە (ترمز) بەدەرکەوت[5].

جەهمی کوڕی صەفوان فیکرەکەی وەرگرتووە لە جەعدی کوڕی درهەم[6].

وتراوە: کە جەهم فیکرەکەی خۆی لە فیکرەی سیمینیەکان داتاشیوە، سیمینیەکان تاقمێکی بیانین، عەرەب نین لە ناوچەی خراسان، سەرەتا سیمینیەکان وایان لە جهم کرد کە گومانی هەبێت لە ئایینەکەی تا وای لێهات بۆ ماوەی چل ڕۆژ نوێژی نەکرد و فەرامۆشی کرد، وتی: نوێژ بۆ یەکێك ناکەم کە نایناسم، دوای ئەمە جەهم فیکرەکەی داهێنا و دواتر هەندێك بۆچوونی تری بۆ زیاد کرد[7].

---

(1) الفصل لإبن حزم ٢٩٦/٢ وسير أعلام النبلاء ٢٦/٦ و البداية والنهاية ٢٦/١٠ ولسان الميزان ١٤٢/٢.

(2) الفصل لإبن حزم، سەرچاوەی پێشوو، و ميزان الاعتدال ٤٢٦/١. ونقله ابن حجر في لسان الميزان، سەرچاوەی پێشوو، وسير أعلام النبلاء، سەرچاوەی پێشوو، والمغني في الضعفاء ١٣٨/١ رقم ١٢٠١.

(3) البداية والنهاية ٣٥٠/٩.

(4) مختصر تأريخ دمشق ٥١/٦ والبدء والتأريخ ١٤٦/٥ وتبصرة الأدلة ٥٩٤/٢ والتمهيد للامشي ٩٧ وشرح الحور العين ٢٠٠ و ٣٠٩ واعتقادات فرق المسلمين ١٠٣ والبداية والنهاية، سەرچاوەی پێشوو، و خطط المقريزي ٣٤٩/٢ وشرح المواقف للسيد الشريف ٣٩٨/٨.

(5) الانساب للسمعاني ٣٩٢/٣، و لە: (الملل والنحل للشهرستاني ٧٣/١)دا هاتووە: بيدعەکەی لە ترمذ بەدەرکەوت.

(6) سرح العيون ٢٩٣ ومختصر تأريخ دمشق ٦/ ٥٠ والبداية والنهاية ٣٥٠/٩ وشذرات الذهب ١٦٩/١ والأنساب للسمعاني ٣٩٣/٣ نقلا عن قتيبة بن سعيد، واللباب لإبن الأثير ٣١٧/١.

(7) التنبيه والرد ٩٩. و سەیری ئەمانەش بکە: شرح أصول الإعتقاد أهل السنة والجماعة ١٢/٣ وشرح العقيدة الطحاوية لابن أبي العز ٧٩٥. و "نەشار" لە: (نشأة الفكر الفلسفي في الإسلام ٣٣٥/١) ئەم گێڕانەوەی بەدوور لە ڕاستی داناوەو پێی وابووە کە حەشەوییەکان ئەمیان بۆ هەڵبەستووە،

جەهم لە بلخ مایەوە، نوێژی لەگەڵ موقاتلی كوڕی سلمان دەكرد، تەفسیر نووسە ناودارەكە، هەر لە مزگەوتی موقاتلدا گفتوگۆیان دەكرد، تا جەهم شاربەدەر كرا بۆ ناوچەی ترمز[1].

موقاتل سیفەتەكانی بۆ خوا بڕیاردەدا، بەپێچەوانەوە جەهم بڕیاری نەدەدا و ڕەتی دەكردەوە[2].

حارسی كوڕی سەریجی تەمیمی جەهمی كردە نووسەرو بانگەشەكاری خۆی. و كاتێك ململانێی نێوان حارس و نەصری كوڕی یەسار میری (مەرو) لە خوراسان پەرەی سەند، ئەوا نەصر سەلمی كوڕی ئەحوزی مازنی ڕەوانەكرد بۆ جەنگ كردن لەگەڵ سەریج، جا جهم لە ناو جەنگەكەدا كوژرا، وتراوە: بە دیل گیرا، لە بەردەم سەلمی كوڕی ئەحوز ڕاوەستا و جەهم داوای لێخۆشبوونی كرد، سەلم پێی وت: (ئەگەر ئێرە پڕ بكەیت لە هەسارە و عیسای كوڕی مریم داببەزێنیت ڕزگارت نابێت، سوێند بەخوا ئەگەر لە سكی مندا بوای ئەوا سكی خۆم هەڵدەدڕاند، بۆ ئەوەی تۆ دەربهێنم و بتكوژم)، جا سەلم جەهمی كوشت، ئەم ڕووداوە لە ساڵی ١٢٨ك بوو[3].

---

چونكە جهم زۆر زیادەڕەوی كرد لە پاك گرتنی خوا، دژەكانی جەهم كە حەشەوییەكانن زیادەڕەوییان كرد لە وێچواندن و جەستە بڕیاردان بۆ خوا (التشبيه والتجسيم).

[1] البداية والنهاية ٩/٣٥٠.

[2] تأريخ الفرق الإسلامية للغرابي ٢٢.

[3] البداية والنهاية ١٠/٢٦-٢٧. و ئیبن حەجەر لە: (لسان الميزان ٢/١٤٢) وەڵامەكەی سلمی داوەتە پاڵ نەصری كوڕی یەسار. ئەم سەرچاوانە هەواڵی كوژرانی جەهمیان هێناوە لەسەر دەستی سەلم: مقالات الإسلاميين ١/٣٣٨ والفرق بين الفرق ٢١٢ والفصل لإبن حزم ٢/٢٩٧ والتبصير في الدين ٩١ والبدء والتأريخ ٥/١٤٦ والملل والنحل للشهرستاني ١/٧٣ وشرح الحور العين ٣٠٩ والمنية والأمل ١٠٧ والأنساب للسمعاني ٣/٣٩٢ واللباب لإبن الأثير ١/٣١٧ و مختصر تأرين إبن عساكر ٦/٥١ عن الغسيلي، وشرح أصول أهل السنة والجماعة ٣/١٢ و ١٤ و١٥ وسير أعلام النبلاء ٦/٢٧.

وتراوە: لە ناوچـەی (مـەرو) کوشـتوویانە[1]، کـە دەکەوێتـە سـەر کـەناری ڕووبـاری (بەلخ)[2]، گۆڕەکەیشی هەر لە ناوچەی (مەرو)ەیە[3].

هەروەها وتراوە: سەلم لە شاری ئەصفهان جەهمی کوشت[4].

ئیبن مورتەزا وتویەتی: (واصلی کـوڕی عـەتاء) قوتابیـەکی خـۆی نـارد، بـۆ ئـەوەی گفتوگۆ لەگەڵ جەهم بکات، قوتابییەکە دەمی جهمی بەست، بەمەش جەهم ڕایگەیاند کـە لە مەزهەبی خۆی پاشگەزبووەتەوە، کاتێکیش جەهم گەڕایـەوە بـۆ شـاری بەصـڕە، ئـەو دووبارە دەستی بە بانگەشە و بۆچوونە خراپەکانی کـردەوە[5]. (زەهـەبـی) لـەم بارەیـەوە وتویەتی: کەسێکی گـومڕاو بیدعەچـی بـوو. خراپـە و ئاشـووبێکی گـەورەی چـاند[6]. و بەهەمان شێوە لەم بارەیەوە وتویەتی: جەهم بنچینە و بناغەی گومڕاییە[7].

## ڕاو بۆچوونی جەبرییەکان

جەهمی کوڕی صەفوان و مامۆستاکەی جەعدی کوڕی درهـەم بەشـێوەیەکی تایبـەتی نوێنەرایەتی ڕاو بۆچوونی جەبرییەکان دەکەن بە تایبەتی، ئەم بۆچوونانەش ئەمانەن:

---

(1) مقالات الإسلاميين، والبدء والتأريخ، والملل والنحل للشهرستاني، وشرح الحور العين، والبداية والنهاية، والأنساب للسمعاني، سەرچاوەکانی پێشوو، والفرق الإسلامية للكرماني ٩٠.

(2) سرح الحور العين، سەرچاوەی پێشوو.

(3) مختصر تأريخ دمشق ٥١/٦ عن الغسيلي.

(4) مختصر تأريخ دمشق، والبداية والنهاية، هەردوو سەرچاوەکەی پێشوو، و شرح أصول الإعتقاد أهل السنة والجماعة ١٢/٣.

(5) المنية والأمل، سەرچاوەی پێشوو.

(6) ميزان الإعتدال ٤٦٢/١ و نقله عنه ابن حجر في لسان الميزان ١٤٢/٢ و لە: (المغني الضعفاء ١٣٨/١) هاتووە: کە بیدعەچییە.

(7) سير أعلام النبلاء ٢٦/٦.

١- جەهم بڕوای وابوو کە ئیمان تەنها بریتییە لە ناسینی خوا، کوفریش بریتییە لە نەناسینی خوا[1]. ئیمان و کوفر تەنها لە دڵەوەن و پەیوەندییان بە ئەندامەکانی تری جەستە نییە.

جا ئەگەر مرۆڤ خوای ناسی بەدڵ، هەر چەندە بە زمان نکۆڵیش بکات، ئەوا بەو نکۆڵی کردنەی تەکفیر ناکرێت، کردەوەی ئەندامەکان بەشێك نین لە ئیمان[2].

ئیبنن حەزم دەڵێت: جەهم وتویەتی: ئیمان بریتییە لە گرێبەست و ڕازی بوونی دڵ، ئەگەرچی بە زمان کوفر دەربڕێت و باوەڕی بە بیروباوەڕی سێکوچکەیی (التثليث) و خاچ هەبێت و تەنانەت لە ناو وڵاتی ئیسلامدا بەبێ خۆپارێزی بیانپەرستێت[3].

بەرپەرچی ئەم ڕاو بۆچوونانە دراوەتەوە، بەوەی:

بەپێی ئەم بۆچوونە بێت مانای وایە کە فیرعەون و گەلەکەی باوەڕدار بوونە، چونکە ئەوانە خوایان دەناسی و نکۆڵیشیان لێدەکرد، خوای گەورە دەفەرموویت:﴿وَجَحَدُواْ بِهَا

[1] مقالات الإسلاميين ١/٣٣٨ و ٢١٤ والفرق بين الفرق ٢١١. سەیری ئەمانەش بکە: الغنية للشيخ عبدالقادر ١/١٠٢. و مقدسی لە: (البدء والتأريخ ٥/ ١٤٦) وتویەتی: (ئیمان بریتییە لە ناسینی بە دڵ و بەس دانپێدانان بە زمان و بە کردار بەشێك نیە لە ئیمان). و نشوان لە: (شرح الحور العين ٣١٠) وتویەتی: (ئیمان بریتییە لە ناسینی دڵ، پەرستشەکانی تر ناچنە ناو ئیمانەوە). و (ئیبن مورتەزا) لە: (المنية والأمل ١٠٧)دا وتویەتی: (گومانیان وابوو کە ئیمان تەنها بریتییە لە ناسینی دڵ). و مەقریزی لە: (الخطط ٢/٣٤٩) وتویەتی: (هەر کەسێك خوا بناسێت و ئیمان بە زمان دەرنەبڕێت ئەوا تەکفیر ناکرێت، چونکە زانست بەهۆی بێ دەنگ بوونەوە لاناچێت لەکاتێکدا کەسەکە بڕواداره).

[2] مقالات الإسلاميين ١/٢١٤ والملل والنحل للشهرستاني ١/٧٤.

[3] الفصل لإبن حزم ٢/٢٦٦ وسير أعلام النبلاء ٦/٢٧ نقلا عن ابن حزم.

ئیبن حەزم وتویەتی: جەهم وتویەتی: ئیمان بریتیە لە گرێبەست و ڕازی بوونی دڵ، ئەگەرچی بەزمان کوفر بکات و بتەکان بپەرستێت یاخود بچێتە جولەکە یان ببێتە نەصرانی لە وڵاتی ئیسلامدا. هەرچەندە خاچ بپەرستێت و بیروباوەڕی سێکوچکەیی لە وڵاتی ئیسلام ڕابگەیەنێت و لەسەریشی بمرێت، ئەو کەسە باوەڕدارێکی تەواوە لەلایەن خوا و خۆشەویستیەتی و بەهەشتیشە./ الفصل لإبن حزم ٥/٧٣.

وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ﴾ النمل: ١٤. واتە: (جا ئەوانە هەر ڕق ئەستوریان کـرد و باوەڕیان پێ نەبوو، بـەزۆرداری و خۆبـەزلزانی، لـە کاتێکـدا لـە نـاخی دەروونیانـەوە هەستیان دەکرد کە حەقیقەت و ڕاستە). بـەم بۆچـوونە بێـت ئـەوا شـەیتان ئیمـان و باوەڕی کاملە، چـونکە خـوای ناسـیوە، خـوای پـاك و تـاك دەفـەرمووێت:﴿ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِيٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴾ الحجر: ٣٦.[١] واتە: ("شەیتان وتـی:" پـەروەردگارا، مۆڵـەتم بدە هەتا ئەو ڕۆژەی هەمووان زیندوو دەکرێنەوە).

٢- جەهم وتویەتی: ئیمان کەرت کەرت نابێت، واتە: دابەش نابێـت بـۆ گرێبەسـتی دڵ و وتنی زمان و کردار، هیچ کەس لەوەی تر گەورەتر و باشتر نییە لە بـارەی ئیمانـدا[٢]، ئیمـانی پێغەمبـەران و ئیمـانی ئوممـەت لـە یـەك ئاسـتدان، چـونکە زانیارییـەکان پلەبەندییان تێدا نییە[٣].

٣- جەهم بڕوای وابوو کە مرۆڤــ ناچارکراوە لە کردارەکانییدا و سەرپشك نییـە، نکـۆڵی کرد لە هەموو جۆرە توانا بەسەرداشکانێك[٤].

لە ڕاستیدا جگە لە خوای گەورە، هیچ کەسێك هیچ کردارو کردەوەیەکی نییـە. خـوای گەورە بکەرە، مرۆڤــ تەنها وەك خوازراو (مجاز) کردەوەکـانی دەدرێتـە پـاڵ، هـەروەك دەوترێت: دارەکە جوڵا، کەشتیەکە سوڕایەوە، خۆر ئاوابوو، ئەوەی ئەم کارانە بـە دارو کەشتی و خۆر دەکات خوای گەورەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خوای گەورە هێزێکـی بـۆ مرۆڤــ بەدیهێناوە کە کارەکەی پێ بکرێت و ویستێکی بە مرۆڤــ داوە بۆ ئەنجامدان، بەمەش هێزی هەڵبـژاردنی بـە مرۆڤـــ پێـداوە، وەك چـۆن درێـژی بـۆ بـەدیهێناوەو بەخشیووەو ڕەنگی بە پێ داوە تا پێی ڕەنگدار بێت[٥].

---

[١] شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٤٦٠-٤٦١.
[٢] مقالات الإسلاميين ٢١٤/١ والملل والنحل للشهرستاني ٧٤/١.
[٣] الملل والنحل للشهرستاني، سەرچاوەی پێشوو.
[٤] الفرق بين الفرق ٢١١ والملل والنحل للشهرستاني ٧٣/٢ والأنساب للسمعاني ٣٩٣/٣ وإعتقادات فرق المسلمين ١٠٤ والمواقف وشرحه ٣٩٨/٨ و خطط المقريزي ٣٤٩/٢.
[٥] مقالات الإسلاميين ٣٣٨/١. سەیری ئەمانەش بکە: الفرق بين الفرق ٢١١ وأصول الدين للبغدادي ٣٣٣ والتبصير في الدين ٩٠ وتبصرة الأدلة ٥٩٤/٢ والتمهيد للاميشي ٩٧ والملل والنحل

مرۆڤــ دەستەمۆ و ڕام کراوەو سەرپشك نییە، واتە: ناچارکراوەو هیچ ویست و توانــای نییە، ناتوانێت کردارێکی تر بکات غەیری ئەوەی کە کــردی، خــوای گــەورە هەنــدێك کردەوەی بۆ داناوەو لەسەری پێویست کردووە کە دەبێــت ئــەم کردەوانــە هــەر بکــات، خوای گەورە کردەوە لە مرۆڤــدا بەدیــدەهێنێت وەك چــۆن لــە شــتە بــێ گیانەکانــدا بەدیدەهێنێت.

خوای گەورە دایناوە کە فڵان ئەو کارە ئەنجامبــدات و داشــیناوە پاداشــت وەربگرێــت، لەسەر فیساریشی پێویســت کــردووە کــە ئــەو خراپەیــە بکــات و داشــیناوە کــە ســزا بدرێت[1].

قەدەرییەکان جەهمیان تەکفیر کرد لەســەر ئــەوەی نــاوبراو دەڵێــت خــوا بەدیهێنــەری کردەوەی بەندەکانە[2].

زانایان بەرپەرچی فیکرەی جەبرییەتیان داوەتەوە، بە بەڵگەی ئەوەی: بانگەشە دەکــات و سەردەکێشێت بۆ پەکخستن و لەکارخســتن و فــەرامۆش کردنــی کــارو پاڵدانــەوە بــە

---

للشهرستاني، سەرچاوەی پێشوو، والبدء والتأريخ ١٤٦/٥ وشرح الحور العين ٣١٠ والمنية والأمل ١٠٧.

جەهم وتویەتی: مرۆڤ توانای بەسەر هیچ شتێکدا ناشکێت، ناکرێت بە سیفەتی تواناداری وەسف بکرێت، بەڵکو لە کردەوەکانیدا ناچارکراوە، هیچ توانا و ویستێکی نییە و سەرپشك نییە، بەڵکو خوای گەورە کردەوەکانی تێدا دروست دەکات وەك چۆن لە سەرجەم بێ گیانەکانی تردا بەدیدەهێنێت، کردەوەکان بەشێوەکی خوازراو (مجاز)ی دەدرێنە پاڵ مرۆڤ وەك چۆن بە خوازراوی دەدرێنە پاڵ شتە بێ گیانەکان، هەروەك دەوترێت: دارەکەی بەریدا، ئاوەکە ڕۆیشت، خۆر هەڵات، خۆر ئاوابوو، هەور ئاسمانی داپۆشی، هەور بارانی باراند، ڕووی زەوی ڕازایەوە، زەوی سەوز هەڵگەڕا و شتی لێ شین بوو، جگە لەمانەش. پاداشت و سزاش ناچارین وەك چۆن کردارەکان ناچارین. و وتویەتی: جا کە بیرۆکەی جەبری و ناچاری چەسپا ئەو کاتە ڕاسپێرران و ئەرکداری (تکلیف)یش ناچارییە./ الملل والنحل للشهرستاني، سەرچاوەی پێشوو، و تأريخ المذاهب الإسلامية ١٠٢ نقلا عن الملل والنحل للشهرستاني.

[1] فجر الإسلام ٢٨٦. سەیری ئەمەش بکە: مناهج الإجتهاد في الإسلام ٤٩١.

[2] الفرق بين الفرق ٢١٢ والتبصير في الدين ٩١ وخطط القريزي ٣٤٩/٢.

قەدەر[1]، ئەگەر جەبرییەت ڕاست بوایە، ئەوا شەریعەتەکان پووچەڵ دەبوونەوە، فەرمان و ڕێگری (الأمر والنهي)یش پوچەڵ دەبوونەوە، بەمەش پاداشت و سزا بێ مانا دەمانەوەو پوچەڵ دەبوونەوە[2].

پەیامەکەی (عەبدوڵای کوڕی عەبباس) کە ڕووی گوفتاری کردۆتە جەبرییەکانی شام، هەروەها پەیامەکەی (حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالیب) (ڕەزای خوایان لێبێت) کە ناردبووی بۆ هەندێك لە دانیشتووانی بەصرە ئەوانەی کە بانگەشەی جەبرییەتیان دەکرد، هەر دوو پەیامەکە ڕاشکاون لە بەرپەرچدانەوەی ئەو کەسەی بڕوای بە جەبرییەت هەیە[3]، دوای ئەوان زانایان بە تێرو تەسەلی بەرپەرچی ڕاو بۆچوونی جەبرییەکانیان داوەتەوە.

٤- جەهم بڕوای بە بوونی سیفەتەکانی خوا نەبوو، بەڵکو سیفەتەکانی ڕەتکردۆتەوە[4]، ئەو سیفەتانەی کە سەردەکێشن بۆ وێچواندنی خوا بە بەدیهێنراوەکانی.

جەهم وتویەتی: ناڵێم: خوای گەورە شتە، چونکە ئەمە وێچواندنی خوایە بە شتەکان[5].

---

[1] فجر الإسلام ٢٨٧.

[2] شفاء العليل لابن القيم ٢٦٢ و نقله محمد سلام مدكور في منهاج الإجتهاد في الإسلام ٤٩٢. و سەیری ئەمەش بکە: تبصرة الأدلة ٥٩٦/٢، چەند بەڵگەیەکی تریشی تێدایە.

[3] ئیبن مورتەزا لە: (المنية والأمل ١٢٩-١٣٠) و ئەبو زەهرە لە: (تأريخ المذاهب الإسلامية ١٠٣)دا هەردوو پەیامەکەیان هێناونە.

ئیبن القیم لە کتێبەکەیدا (شفاء العليل ٢٦٢-٢٨١)دا باسی مێژگەرد و گفتوگۆیەکی تەصەوڕکراوی نێوان جەبریی و سوننیەکی کردووە. و ئەبو زەهرە لە: (تأريخ المذاهب الإسلامية ١٠٦) باسی هەندێك بەشی ئەو گفتوگۆیەی کردووە.

[4] الملل والنحل للشهرستاني ٧٣/١ وسير أعلام النبلاء ٢٦/٦ خطط المقريزي ٣٤٩/٢و ٣٥١ وفجر الإسلام ٢٨٧.

[5] مقالات الإسلاميين ٣٣٨/١ والفرق بين الفرق ٢١١ والتبصير في الدين ٩٠ والانساب للسمعاني ٣/ ٣٩٢-٣٩٣. والبدء والتأريخ ١٤٦/٥ وشرح الحور العين ٢٠٠ و مقدسي و نشوان وتویانە: (بەڵام خوا بەدیهێنەری شتە). واعتقادات فرق المسلمين ١٠٤.

وەسفی خوای نەدەکرد بە سیفەتی زیندوو (حي) و زانا (العالم) و ویستەر (مرید)، وتی: من وەسفی خوا ناکەم بە وەسفێك کە بەکارهێنانی بۆ غەیری خوا دروست بێت وەك: هەبوون (موجود) زیندوو و زانا و ویستەر (مرید) و هاوشێوەی ئەمانە.

بەڵام وەسفی خوای کرد بەوەی خاوەن توانایە، دروستکەرە، بکەرە، بەدیهێنەرە، ژیێنەرە، مرێنەرە، چونکە ئەم وەسفانە تایبەتن بەخوا[1].

تەنها سیفەتی کار (الفعل) و بەدیهێنان (خلق)ی بۆ خوا چەسپاند، بە دروستی نەزانی کە بەدیهێنراوان بەو سیفەتە وەسف بکرێن، جا ئەگەر ئەو دوو سیفەتە لە بەدیهێنراوان لاچوون ئەو کاتە بەدیهێنراوان سەرپشك نابن بەڵکو ناچار دەبن لە کردنی کردەوەکانیاندا، ئەمەش بناغەی فیکرەی جەهمە لە دانان بە جەبرییەتدا[2].

بەم بۆچوونەی لەگەڵ قەدەرییەکان کۆکە، موعتەزیلەکانیش ئەم بۆچوونەیان پەسەند کرد.

٥- جەهم وتویەتی: قورئان بەدیهێنراوەو دروستکراوە[3].

لەبەر ئەوەی جهم پێی وابووە فەرمایشتی خوا پەیدابوو و بەدیهاتووە، بۆیە بۆچوونی وابووە کە دروست نییە وەسفی خوا بکرێت بەوەی فەرمایشتی دەربڕیوە[4]. و دەیوت: فەرمایشتی خوا بەدیهاتووە، بەڵام دروستیش نییە خوای گەورە وەسف بکرێت بەوەی فەرمایشتی خۆی فەرمووبێت[5].

---

[1] الفرق بين الفرق، والتبصير في الدين، هەردوو سەرچاوەکەی پێشوو، والملل والنحل للشهرستاني ٧٣/١. و سەیری ئەمەش بکە: الأنساب للسمعاني، سەرچاوەی پێشوو، واللباب لإبن الأثير ٣١٧/١ والمواقف ٣٩٨/٨ وخطط القريزي، سەرچاوەی پێشوو ٣٤٩. و بڕوانە: فجر الإسلام، سەرچاوەی پێشوو.

[2] تأريخ الفرق الإسلامية للغرابي ٢٥ و ٣٢.

[3] مقالات الإسلاميين، سەرچاوەی پێشوو، والملل والنحل للشهرستاني ٧٤/١ والمواقف ٣٩٩/٨ وخطط المقريزي ٣٤٩/٢ و ٣٥١ وسير أعلام البلاء ٢٧/٦.

[4] الفرق بين الفرق ٢١٢.

[5] التبصير في الدين ٩١.

دانی نەناوە بەوەی خوای گەورە قسەکەر بێت، چونکە قسە لە سیفەتی بەدیهێنراوانـە، بۆیە خوای گەورەی پێ وەسف ناکرێت، بەهەمان شێوە ئەگەر سـیفەتی قسـەکردن بـۆ خوا بڕیار بدەین، ئەو کاتە پێویستە خوا ئامرازی قسەکردنیشی هـەبێت، بەمـەش بـە بەدیهێراوەکانی دەچێت، شتێکی ئەستەمە خوا بە بەدیهێنراوەکانی بچێت. جا مـادەم قورئان فەرموودە و قسەیە و دراوەتە پاڵ خوای گەورە، دروست نیە بدرێتە پـاڵ خـوای گەورە تەنها وەك ئەوە نەبێت کە بەدیهێنراوی خوایە، گەرنا سـەر دەکێشـێت بـۆ ئـەو وێچواندنەی کە بۆ خوای گەورە ئەستەمە، بۆیە قورئان بەدیهێنراوی خوایـە[1]. ئەمـە ڕای قەدەری و موعتەزیلەکانە، جەعدی کوڕی درهەمیش لە جەبرییەکانە.

٦- جەهم وتویەتی: زانستی خوا بەدیهاتوو و پەیدابووە[2].

ناوترێت: خوای گەورە هەر زانا بووە بە شتەکان بەرلەوەی بێنە خانەی بـوون[3]. خـوای گەورە نازانێت چی دەبێت هەتاوەکو ڕووداوەکە ڕوونەدات[4].

٧- جەهم بـۆ خـۆی ئـەم ڕایـە تایبەتـەی هـەبووە کـە بەهەشـت و دۆزەخ لەناودەچـن و نامێنن[5] و دانیشتوانەکانیشیان نامێنن و لەناودەچن[1].

---

[1] تأريخ الفرق الإسلامية للغرابي ٢٥.

[2] مقالات الإسلاميين، سەرچاوەی پێشوو، والفرق بين الفرق ٢١١ والفصل لإبن حزم ٢٩٣/٢ و ٧٣/٥ و التبصير في الدين ٩٠ والبدء و التأريخ ١٤٦/٥ و نشوان لە: (شرح الحور العين ٢٠٠) وتویـەتی: (گومانیان وابوو جیهان داهێنەرو پەیداکەرە) ئەمە شێواندنە. و لە کتێبی (اعتقادات فرق المسلمين ١٠٤)دا هاتووە: (خوای گەورە پەیداکەرە) وشەی (زانست) کـە لـە دوای (إن) هـاتووە فرێـدراوە. والمواقف وشرحه للسيد الشريف ٣٩٨/٨ وخطط المقريزي ٣٤٩/٢.

[3] مقالات الإسلاميين، سەرچاوەی پێشوو.

[4] التبصير في الدين ٩٠ والفصل لإبن حزم ٧٣/٥. و سەیری ئەمەش بکە: الملل والنحل للشهرسـتاني ٧٣/١ والمواقف ٣٩٨/٨.

[5] مقالات الإسلاميين، سەرچاوەی پێشوو، والتنبيه والرد ٩٨ چەند بۆچوونێکی تـری جهمیەکانیشـی تێدایە و ١٤٠، والفرق بين الفرق ٢١١ والفصل لابن حزم ١٤٥/٤ و ٧٣/٥ والتبصير في الـدين ٩٠ والبدء والتـأريخ ١٤٦/٥ والملـل والنحـل للشهرسـتاني ٧٤/١ وشـرح الحـور العـين ٣١٠ والمواقـف ٣٩٩/٨ والفرق الإسلامية للكرماني ٩١ وخطط المقريزي ٣٤٩/٢.

غەرابی وتویەتی: پێم وایە ناوبراو بۆ ئەم بۆچوونە چووە، چونکە چەسپاندنی هەرمانی بەردەوام بۆ پاداشت و سزای دواڕۆژ، بەشدار بوونە لە سیفەتێکی خوا کە بریتییە لە سیفەتی هەرمان (البقاء)، جا لە بەرئەوەی بەشداربوونی هەر شتێك لە بەدیهێنراوان لە هەر سیفەتێك لە سیفەتەکانی خوادا ئەستەمە، بۆیە مانەوەی خۆشی و ناخۆشی دواڕۆژیش ئەستەمە[٢].

٨- جەهم باوەڕی تۆکمەی هەبوو سەبارەت بە فەرمان کردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە[٣].

دەستی دایە چەك و دژی دەسەڵات جەنگی کرد. و لەگەڵ حارسی کوڕی سەریج لە دژی مسری کوڕی یەسار دەرچوو، سەلْمی کوڕی ئەحوزی مازنی کوشتی[٤]. وا دەردەکەوێت کە کوشتنەکەی سیاسی بوو بێت.

بەغدادی وتویەتی: شوێنکەوتووەکانی ئەمڕۆ لە ناوچەی (نەهاوند)ن، لە سەردەمی خۆمان ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی کبوسی شیرازی دیلی بۆیان دەرچوو، بانگی کردن بۆ مەزهەبی شێخەکەمان ئەبو حەسەنی ئەشعەری، هەندێکیان وەڵامیان دایەوە، لەگەڵ ئەهلی سوننەدا بوونە یەك دەست، سوپاس بۆ خوا لەسەر ئەمە[٥].

ئیسفەراییینی وتویەتی: زۆربەی شوێنکەوتووەکانی ئێستا لە دەوروبەری ناوچەی (ترمز)ن[٦].

---

[١] الفصل لإبن حزم، والمواقف، والفرق الإسلامية للكرماني، وخطط المقريزي، سەرچاوەکانی پێشوو.

[٢] تأريخ الفرق الإسلامية للغرابي ٢٥.

ئەمانەش ئاماژەیان بۆ ئەم ڕاو بۆچوونانە کردووە: أبو زهرة في تأريخ المذاهب الإسلامية ١٠٥ و د. حسين عطوان في الفرق الإسلامية في بلاد الشام ٨٣ و لاپەڕەکانی دواتری.

[٣] مقالات الإسلاميين ٣٣٨/١ وشرح الحور العين ٣٠٩. مقریزي لە: (الخطط ٣٤٩/٢)دا وتویەتی: تەنها کەسە کە بۆچوونی وایە دەرچون لە دژی حوکمڕانی ستەمکار دروستە.

[٤] الفرق بين الفرق ٢١٢ و التبصير في الدين ٩١.

[٥] الفرق بين الفرق ٢١٢.

[٦] التبصير في الدين ٩١.

ئەهلی سوننە ئەوانە تەکفیر دەکەن: لەبەر ئەوەی دەڵێن زانستی خوا پەیدابووە، خوا هیچ زانیاری نییە لەبارەی هیچ شتێك تا ڕوونەدات، فەرموودەی خوا بەدیهێنراوە[1].

ئەهلی سوننە تەکفیری ئەوانی کرد بەهۆی داننەنانیان بە سیفەتەکان و بڕوابوونیان بە بەدیهێنراوی قورئان، دان نەنان بە بینی خوا[2].

جا ئیبن مورتەزا وتویەتی: پاشماوەکەی بەهۆی مردنەکەی پچڕا، تا دواتر هەندێك لە جەبرییەکان هەندێ شتیان زیندوو کردەوە. ئێستا جهمیەت شوێنکەوتووی نییە(٣).

## موعتەزیلە

### هۆکاری ناونیان بەو ناوە

ڕایەکان جیاوازن لەبارەی هۆکاری ناونانی موعتەزیلەکان بەو ناوە، لەم بارەوە چەند ڕاو بۆچوونێك هەیە. گرنگترینیان ئەمانەن:

١- کاتێك پرسیار لە حەسەنی بەصری کرا (لە ساڵی ١١٠ك کۆچی دوایی کردووە) لەبارەی ئەنجامدەری گوناهی گەورە کە ئایا تەکفیر دەکرێت یان نا؟ حەسەن بیری کردەوەو وردبووەوە، جا بەر لەوەی ناوبراو وەڵامی پرسیارەکە بداتەوە (واصلی کوڕی عەتاء "کە لە ساڵی ١٣١ك کۆچی دوایی کردووە") وتی: من ناڵێم ئەنجامدەری گوناهی گەورە بەڕەهایی موسڵمانە یاخود بەڕەهایی کافرە، بەڵکو لە پلەیەکدایە لە نێوان ئەم دوو پلەیەدا، نە باوەڕدارە، نە کافرە.

جا لە مەجلیسی "حەسەنی بەصری" جیابووەوەو چووە لای کۆڵەگەیەك لە کۆڵەگەکانی مزگەوتەکە و هەوڵی چەسپاندنی وەڵامەکەی دەدا، جا حەسەن وتی:

---

[1] التبصیر في الدین، سەرچاوەی پێشوو.

[2] خطط المقریزي ٣٤٩/٢ و ٣٥١. و لە: الملل والنحل للشهرستاني ٧٤/١ والمواقف للإیجي وشرحه للسید الشریف ٣٩٩/٨ هاتووە: کۆکن لەگەڵ موعتەزیلەکاندا لە داننەنان بە بینینی خوا و چەسپاندنی بەدیهێنراوی فەرمایشتی خوا و پێویست بوونی زانیارییەکان بە عەقڵ بەر لەهاتنی شەرع.

[3] المنیة والأمل ١٠٧.

واصڵ لە ئیمە جیابووەوەوخۆی لە ئیمە کەنار گیر کرد. لەبەر ئەمە واصڵ و شوێنکەوتووەکانیان بە موعتەزیلە ناونران[1].

لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە: موعتەزیل و کەنارگیرەکە (واصڵی کوڕی عەتاء)ە، هەروەها عەمری کوڕی عوبەیدیش چووە (لە ساڵی ١٤٤ك کۆچی دوایی کردووە) پاڵی، جا ناوی موعتەزیلە لە شوێنکەوتووەکانیان نرا[2].

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: ئەو کەسەی خۆی جیاکردەوە، لە مەجلیسەکەی حەسەنی بەصری عەمری کوڕی عوبەید بوو[3].

هەروەها لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: کاتێك (واصڵی کوڕی عەتاء) و عەمری کوڕی عوبەید مەزهەبێکیان داهێنا و لە بازنەکەی حەسەنی بەصری جیابوونەوەو لە لایەکی تری مزگەوتەکە دانیشتن[4].

ئەم ناونانە شتێکی ئاساییە و ئاماژەش نییە بۆ پێداهەڵدان، یاخود سەرزەنشت کردن، هەروەها ئاماژەش نییە بە بنەمایەك لە بنەماکانی موعتەزیلە، بەڵام دواتر

---

[1] الملل والنحل للشهرستاني ٤٢/١.

ئەم هۆکارە لەم سەرچاوانەدا باسی لێوەکراوە: الفرق بين الفرق ١١٨ والتبصير في الدين ٥٨ والبدء والتأريخ ١٤٢/٥ والتمهيد للامشي ١٢٢ والغنية للشيخ عبدالقادر ١٠٣/١ والأنساب للسمعاني ٣٩٢/١١ مادة (المعتزلي)، والمواقف ٣٧٧/٨ والفرق الإسلامية للكرماني ٦ والمنية والأمل ١٢٢ ونقل عن الملل و النحل للشهرستاني. سەیری ئەمەش بکە: خطط المقريزي ٣٤٦/٢.

[2] شرح الأصول الخمسة ١٣٨ والفرق بين الفرق والتبصير و الملل و النحل و المنية والأمل ١٢٣ عن الملل و النحل للشهرستاني، و الأنساب للسمعاني ٣٩٣/١١.

[3] المعارف لإبن القتيبة ٤٨٣، و تيايدا هاتووە: (عەمری کوڕی عوبەید هەمان بۆچوونی قەدەرییەکانی هەبوو و بانگەشەشی بۆ دەکرد، بۆیە خۆی و هاوەڵانی لە حەسەن جیابوونەوەو بە موعتەزیلە ناونران). و الانساب للسمعاني، سەرچاوەی پێشوو، وشرح الحور العين ٢٥٩ عن المعارف لإبن القتيبة، و لە: (خطط المقريزي ٣٤٦/٢) هاتووە: (ابن منبە وتويەتی: عمروی کوڕی عبيد و هەندێك لە هاوەڵانی لە حسن جیابوونەوە بۆیە بە موعتەزیلە ناونران).

[4] إعتقادات فرق المسلمين ٢٨-٢٩. و نقله ابن المرتضى في المنية والأمل ١٢٢ عن المعارف. بەڵام من هیچ بنەمایەکی ئەو وتەیەم لە کتێبی (المعارف)دا بەدی نەکرد.

بووه سیفەتی سەرزەشت، ئەمەش دوای ئەوەبوو کە ڕاوبۆچوونەکانیان ئاشکرا کرد. بۆیە ئەم ناونانەش لە موعتەزیلەکان وا زوو بڵاوبووەوە و ناوبانگی دەرکرد، چونکە ناونانەکە لەلایەن "حەسەنی بەصری" بوو کە خاوەن پلەوپایەیەکی گەورەبوو لە دڵ و دەروونی قوتابییەکانی دا بەشێوەیەکی تایبەتی و لە دڵ و دەروونی موسڵمانان بەشێوەکی گشتی، وشەی پیاوێکی گەورە هەمیشە ناوبانگ دەردەکات[1].

ئەمەش هۆکارێکی بە ناوبانگە لە هۆکاری ناونانی موعتەزیلەکان بەو ناوە.

هەروەها وتراوە: ناونانی موعتەزیلەکان بەو ناوە لە دوای "حەسەنی بەصری" بوو، ئەمەش کاتێك ناوبراو کۆچی دوایی کرد و قتادە لە شوێنی دانیشت، لە دوایی دا عەمری کوڕی عوبەید لەگەڵ چەند کەسێکدا جیابوونەوە لە مەجلیسەکە، جا قتادە ناوی نان: موعتەزیلە[2].

٢- هۆکاری ئەم ناونانە سیاسییە، چونکە ئەو ناوە لەو کەسانە نراوە کە لە عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) جیابوونەوەو خۆیان بەدوور گرت لە دژایەتی کردنی عەلی، دژایەتی کردنی دژەڕاکانی عەلی، ئەمەش دوای ئەوەی بەیعەتیان دابوو و ڕازیبوون پێی، نمونەی ئەو کەسانەش: سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص و عەبدوڵای کوڕی

---

[1] تأريخ الفرق الإسلامية للغرابي ٥١.

[2] خطط المقريزي ٣٤٦/٢. و لە: (المنية والأمل ١٢٣)تیایدا هاتووە: (وتراوە: بۆیە ئەو ناوەیان لێنراوە چونکە قەتادە کە لە هاوەڵانی حەسەن بوو وتی: موعتەزیلەکان چ دەکەن؟ بۆیە بەو ناوە ناونران) و لە ١٢٤ گێڕانەوەکەی (عوسمانی تەویل)ی لە قتادەوە هێناوە.

ئەبو عەمری کوڕی عەلاء وتویەتی: قەتادە بە سەرو ژێری شاری بەصرەدا دەسوڕایەوەو بەبێ پێشەوا، جا چووە مزگەوتی بەصرە و بینی عەمری کوڕی عبید و هەندێك لە هاوەڵەکانی جیابوونەتەوە لەولاوە بازنەیەکیان پێکهێنانەوەو دەنگیان بەرز کردۆتەوە، جا قەتادە پێش نوێژی بۆ کردن وای زانی بازنەکەی حەسەنە، جا کە بەردەوام بوو لەگەڵیان زانی کە بازنەکەی حەسەن نییە، وتی: ئەمانە موعتەزیلەن و لێیان جیابووەوە، هەر لەو کاتەوە بە موعتەزیلە ناونراون./ وفيات الأعيان ٨٥/٤.

ئەمانەش باسی ئەم ڕووداوەیان کردووە: د. عرفان في دراسات في الفرق ١٠٥ نقلا عن وفيات الأعيان - ترجمة (قتادة)، وعيون الأخبار والجرح والتعديل ١٣٣/٢/٣، والمنية والأمل.

عومەری کوڕی خەتتاب و موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاری و ئوسامەی کوڕی زەید، ئەوانە وتیان: دروست نییە جەنگ لە دژی عەلی یاخود هاوشانی ئەو بکرێت.
ئینجا ئەوانە بە موعتەزیلە ناونران، دواتر بوونە پێشینەکانی موعتەزیلە[1].
وتراوە: کۆمەڵێك لە هاوەڵانی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) ناوی موعتەزیلەیان لە خۆنا، ئەمەش کاتێك بوو کە حەسەنی کوڕی عەلی (ڕەزای خوایان لێبێت) بەیعەتی بە معاوییە دا و کاروباری پێڕاسپارد، جا ئەوانە جیابوونەوە لە حەسەن و معاویە و ئەوانەی لەگەڵیانبوون و لە ماڵەکانیاندا مانەوەو وتیان: سەرقاڵی زانست و پەرستش دەبین، بەم هۆیەش بە موعتەزیلە ناونران[2].

٣- موعتەزیلە سەرەتاکان بریتی بوون لەو دونیا بەکەمزانانەی کە لە خەڵکی جیاببوونەوە. ئەمە ڕای (کولدزیهر)ە[3].

---

[1] المقالات والفرق للقمي ٤ وفرق الشيعة للنوبختي ٥.
ئەمە نزیکەی لەوەی (شێخ عبدالقادر) لە (الغنية ١/١٠٣) هێناویەتی: (لەبەر جیابوونەوە لە بۆچوونەکانی موسڵمانان، چونکە ئەو کات خەڵك لەبارەی ئەنجامدەری گوناهی گەورە ڕاجیابوون، هەندێکیان وتیان: بڕوادارن بەو باوەڕەی کە هەیانە، هەندێکی تریشیان وتیان: ئەوانە کافرن، "واصڵی کوڕی عەتاء" بۆچوونێکی سێیەمی داهێنا، بەمەش لە موسڵمانان جیابووەو کەناریگرت لە باوەڕداران، وتی: نە باوەڕدارن نە کافرن، بەمەش بە موعتەزیلە ناونران).
[2] التبيه والرد ٣٦.
[3] دراسات في الفرق ١٠٨ نقلا عن العقيدة والشريعة في الإسلام لكولدزيهر.
ئەم هۆکارانەوەو هی تریش لەم سەرچاوانەدا باس کراون: فجر الإسلام ٢٨٨ وتاريخ الفرق الإسلامية للغرابي ٤٨ وتاريخ المذاهب الإسلامية ١٢٥ ونشأة الفكر الفلسفي في الإسلام ٢/٣٧٣ و في علم الكلان - المعتزلة ١٠٥ و إسلام بلا مذاهب ٣٩٩ والمعتزيلة لعواد العتيق ١٤. و سەیری ئەمەش بکە: الغنية للشيخ عبدالقادر ١/ ١٠٣.

## پێنج بنەماکەی موعتەزیلە

لـەم بـارەوە ئـەبو حوسـەینی خـەیاتی موعتـەزیلی وتویـەتی: (هـیچ یـەکێك لـە موعتەزیلەکان شیاوی ناوی موعتەزیلە نییە تا بـڕوای بـە هـەر پێـنج بنەماکـە نـەبێت: خوابەیەکزانین، دادگەری، پلەیەك لە نێوان دوو پلەکە، پەیماندان و هەڕەشە کردن، فـەرمان بەچاکە و ڕێگری لە خراپە، جا ئەگەر ئەم پێنج تایبەتمەندییـە لـە کەسـێکدا بـە تـەواوی هاتنەجێ ئەوا موعتەزیلە)یە[1].

### بنەمای یەکەم: خوابەیەکزانین.

خوابەیەکزانین لە زاراوەی زانای کەلامدا: بریتییە لـە: (بـوونی زانسـت بـەوەی خـوای گەورە تاکە و بێ هاوەڵە لەو شتانەی کە شیاوی زاتی ئەون چ ئەو شتانەی بـۆی چەسـپاون و چ ئەو شتانەی بۆی ئەستەمن بەو شێوەیەی کە شیاوی ئەون، هەروەها داننان بەمەدا).

پێویستە ئەم دوو مەرجانە لەبەرچـاو بگیرێـن: زانسـت و دانپێـدانان، چـونکە ئەگـەر بشزانێت و دانی پێدانەنێت یاخود دانی پێدابنێت بە نەزانی، ئەوا نابێتە خوابەیەکگر[2].

موعتەزیلەکان ئەم شتانەیان لەسەر ئەم بنەمایە دامەزراندووە:

١- ڕەتکردنەوەی سیفەتی خوایی (سیفەتە مەعنەوییە) لەمێژینە و پەیوەستەکان بە زاتی خواوە، موعتەزیلەکان وتیان زات خودی سیفەتە یان سیفەت خودی زاتە، ئەمـەش بـۆ بەرپەرچدانەوەی فیکرەی فرەخواییە.

دەڵـێن قورئـان بـەدیهێنراو دروسـتکراوە، چـونکە سـیفەتی کـەلام لـەلای ئـەوان بەدیهێنراوە.

٢- ئەستەم بوونی ئەوەی بڕواداران لە ڕۆژی دواییدا خوای گەورە ببینن[1].

---

[1] الإنتصار ١٢٦-١٢٧. ونقله عنه: أبو زهرة في تأريخ المذاهب الإسلامية ١٢٥ و د.عرفان في دراسات في الفرق ١١٣ و د. أحمد محمد صبحي العتزلة ١١٩.
سەیری دانپێدانانی موعتەزیلەکان بکە بەم پێنج بنەمایە لەم سەرچاوانە: مقالات الإسلاميين ٣٣٧/١-٣٣٨ والانبيه والرد ٣٦ وشرح الأصول الخمسة ١٢٣ والبدء والتأريخ ١٤٢/٥.

[2] شرح الأصول الخمسة ١٢٨.

کاتێك باسی سیفەتەکانی خواو بینینی خوا دەکەین بە تێروتەسەلی ئەمە دەخرێتەڕوو. بەم بنچینەیە بەرپەرچی ئەوانەیان داوەتەوە کە ڕاجیاییە لە بابەتی خوابەیەکزانیدا و شتێك بۆ خوا بڕیار نادات کەچی پێویستە بۆ خوا بڕیاربدرێت و بۆی بچەسپێنرێت و شتێکی بۆ خوا چەسپاندووە کە پێویستە بۆ خوا بڕیار نەدرێت، جا ئەو کەسەیان بە کافر داناوە[٢].

بۆیە ئەم تاقمانەیان تەکفیرکرد: بێ دین (ملحد)ەکان، پەکخەرەکان (المعطلة)، ڕۆژگارپەرستەکان، وێچوێنەرەکان (المشبهة)[٣]، دوانە پەرستەکان (الثنوية).

## بنەمای دووەم: دادگەریی[٤].

دادگەری خوا: بریتییە لەو دانایی و حیکمەتەی عەقڵ پێویستی دەکات، کە بریتییە لە ئەنجامدانی کردار بەشێوەکی ڕاست و دروست و ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی[٥].

مەبەست لەوەی خوای گەورە دادگەرە ئەوەیە کە:

کردەوەکانی خوا هەر هەموویان چاکن و کردەوەی ناشرینی نییە و کەم و کوری توخنی ناکەوێت کە لەسەری پێویستە[٦].

ئەم مانایە لەلای موعتەزیلەکان ئەوە دەگەیەنێت: کە خوای گەورە کاری ناشرین ناکات[٧] و ناشیەوێت[١].

---

[١] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٢٧.

[٢] شرح الأصول الخمسة ١٢٥.

[٣] شرح الأصول الخمسة ١٢٤.

[٤] بە موعتەزیلە دادگەراکان یان بە دادگەران ناونراون، بەهۆی ئەوەی دان بەم بنەمایەدا دەنێن./ نشأة الفكر الفلسفي في الإسلام ٤٣٢/١.

[٥] الملل والنحل للشهرستاني ٣٧/١.

[٦] شرح الأصول الخمسة ١٣٢. ئەم پێناسەیە لە ٣٠١ بەم شێوەیە هاتووە: (کردەوەی ناشرین ناکات و هەڵیشی نابژێرێت، کەم و کوری توخنی ئەوە ناکەوێت کە پێویستە لەسەری، کردەوەکانی هەموویان چاکن).

[٧] شرح الأصول الخمسة ١٣٢ و ٣٠١.

دیاریکردنی ئاماژەی وتەی (کـاری ناشـرین ناکـات) هـەروەك (قـازی عەبدولجـەباری موعتەزیلە) وتویەتی: خوا زانایە بە ناشرینایەتی کاری ناشرین و پێویستیشی پـێ نییـە، زاناشە بەوەی پێویستی پێ نییە، جا زاتێك ئەمە حاڵی بێت بەهیچ شێوەیەك لە شێوەکان کردەوەی ناشرین هەڵنابژێت و نایەوێت. بەڵگەکانی بەم شێوەیەی خوارەوەی باس کردووە:

بەڵگە لەسەر ئەوەی خوای گەورە زانایە بە ناشـرینایەتی کـردەوەی ناشـرین، بریتییـە لەوەی خوای گەورە بە زاتی خۆی زانایە، ئەو زاتەی کە لە خودی خۆیدا زانایە بـۆی هەیـە هەموو ئەو زانیارییانە بزانێت بەو پێیەی کە شـیاوی ئـەوە، بۆیـە یـەکێك لـە ڕووەکـانی زانیاری ئەوەیە کە دەبێت ناشرینی کردەوەکە بزانێـت، پێویسـتە خـوای لەمێژینـە و بـێ سەرەتا زانابێت پێی.

بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە پێویستی بە کردەوەی ناشرین نییە و لێـی بـێ نیازە، ئەوەیە کە: خوای گەورە بێ نیازە و هەرگیز پێویستی بۆ ئەو لـە بنەڕتـدا دروست نییە.

بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە خوای گـەورە زانایـە و بـێ نیـازە و پێویسـتی بـەکردەوەی ناشرین نییە، ئەو بەڵگانەی سەرەوەن کە خرانەڕوو.

بەڵگەش لەسەر ئەوەی هەر زاتێك ئەمە حاڵی بێت، ئـەوا هـەرگیز کـردەوەی ناشـرین بەهیچ شێوەیەك لە شێوەکان ناکات و هەڵی نابژێرێت، ئەوەیە کە ئێمە بە پێویستیدەزانین لە بینەردا، ئەگەر یەکێکمان زانا بێت بەناشرینی کردەوەیەکی ناشرین و پێویستیشی پێی نەبێت، ئەوا بەهیچ شێوەیەك پەنای بۆ نابات و هەڵی نابژێرێت، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کـە زانایە بەوەی کارەکە ناشرینە و بەوەش کە خۆی پێویستی پێ نییە، جا ئەگەر یەکێك لـەو مەرجانە لاچوون ئەوا ئەو کاتە دروستە کردەوەیەکی ناشرین هەڵبژێرێت...

[1] شرح الأصول الخمسة ٤٥٩ و ٤٦٢. ئەم فەرمایشتە موعتەزیلەش: (کاری ناشرین ناکات و ناشیەوێت) لە: (المنية والأمل ٢٦)دا هاتووە.

خودی ئەم هۆکارە لە ئاست خوای لەمێژینەی بێ سەرەتاش هەر هەیە، بۆیە پێویستە هەرگیز خوای گەورە کردەوەی ناشرین هەڵنەبژێرێت، چونکە ڕێگەکانی بەڵگە جیا نین جا بینەر بیبینێت یان لێی شاراوە بێت[1].

قازی عەبدولجەبار بەهەمان شێوە بەڵگەکانی ئەم بۆچوونە: (خوای گەورە شتی ناشرینی ناوێت)[2]هێناوەتەوە، وەك:

١- ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلۡمٗا لِّلۡعِبَادِ﴾ غافر: ٣١. واتە: (جا وەنەبێت خوا بیەوێت ستەم لە بەندەکان و حەز بە تیاچوونیان بکات).

وشەی (ستەم: ظلما) نەناسراوە، دەربڕینی نەناسراو لە ڕستەی نەرێ (نفی)دا گشتییە، جا ڕووکەشی ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێت کە خوای گەورە ویستی لەسەر شتێك نییە کە ستەم بێت.

٢- ئەم فەرمایشتەی پەروەدگار دوای ئەوەی کە خراپە و گوناهەکانی ژماردووە: ﴿كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكۡرُوهٗا﴾ الإسراء: ٣٨. واتە: (هەموو ئەو شتانەی کە لە ئایەتەکانی پێشوودا باسمان کرد، خراپەکانی لای پەروەردگارت ناپەسەندو نابەجێیە).

ئەوەی ڕوونکردۆتەوە کە گوناهەکان هەموویان نەخوازراو و نەویستراون لەلایەن خواوە، جا کە خوا پەسەندیان ناکات، ئەوە دەگەیەنێت کە نایەوێت، چونکە ئەگەر بیویستبایە و لەهەمان کاتدا ڕقیشی لێبووبایەوە، ئەوا ئەو کاتە خوای گەورە دوو سیفەتی دژیەکی کۆدەکردەوە، ئەمەش ئەستەمە[3].

---

[1] شرح الأصول الخمسة ٣٠٢-٣٠٣ و ذکر ذلك كله عواد المعتق في المعتزلة ١٥٧ عن شرح الأصول الخمسة.

[2] سەیری وتەکەی بکە لە: شرح الأصول الخمسة ٤٥٩ و ٤٦٢.

[3] شرح الأصول الخمسة ٤٦٠-٤٦١.

موعتەزیلەكان دەیانووت خوای گەورە كاری ناشرین ناكات و ناشیەوێت، بێ چەند و چوون هەر دەبێت كردەوەكانی چاك و جوان بن و كەم و كوری توخنی ئەوە نەكەوێت كە لەسەری پێویستە.

ئەهلی سوننە دەمەتەقێی ئەو بۆچوونەی موعتەزیلەیان كردووە كە دەڵێن: (خوا كردەوەی ناشرین ناكات، كردەوەكانی خوا هەموویان چاكن)، بەم بەڵگانەی خوارەوە:

ئێمە لەوەدا لەگەڵ ئێوەدا كۆكین كە بەدیهێنان و كردەوەو قەزاو قەدەری خوای پایەبەرز هەمووی هەر خێرە، بەم بەڵگانە:

١- خوای گەورە خۆی پاك و دوور گرتووە لە ستەم، خوای پایەبەرز دەفەرمووێت: ﴿ مَا يُبَدَّلُ ٱلْقَوْلُ لَدَيَّ وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴾ ق: ٢٩. واتە: (ئیتر قسەو بڕیاری من ناگۆڕێت و هەڵناوەشێتەوە... من هیچ كات ستەمكاریش نیم لە بەندەكانم). ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە خوای گەورە كاری ناشرین ناكات، بەڵكو كردەوەكان هەموویان هەر جوانن.

٢- ناوە پیرۆزەكانی خوا گەواهیدەری ئەمەن، وەك: (قدوس)، جا (قدوس) بریتییە لەوەی پاك و بەرزە لە هەموو خراپە و كەم و كورییەك، هەروەك ڕاڤەكاران و زمانەوانان وادەڵێن[1].

ئەهلی سوننە دەمەتەقێی ئەم بۆچوونەی موعتەزیلیەشیان كردووە كە دەڵێن: (كەم و كوری توخنی ئەوە ناكەوێت كە لەسەر خوا پێویستە) بەمانەی خوارەوە:

ئەگەر مەبەست لە پێویست كراو شتێك بێت كە غەیری خوای گەورە لەسەر خوای گەورەی پێویست كردبێت، ئەوا ئەمە شتێكە كە ئێمە لەگەڵ ئەوەدا كۆك نین، لەبەر ئەوەی:

١- چونكە ئەمە ئەوە دەسەپێنێت كە خوای گەورە نابێت بكەرێكی سەرپشك بێت، ئەمەش پوچەڵە بەو بەڵگانەی كە گەواهیدەرن لەسەر ئەوەی كە خوای گەورە خاوەن

---

[1] المعتزلة لعواد المعتق ١٥٩ عن شفاء العليل لإبن القيم، و مجموع الرسائل والمسائل لإبن تيمية.

هەڵسوکەوت و ڕەفتاری ڕەها و بێ سنووره لەوەی هەرچی بیەوێت سەبارەت بە بەدیهێنراوەکانی دەیکات، وەك چۆن خوای گەورە پەروەردگارو بەدیهێنەرو خاوەنێکی سوپاسکراوە.

٢- چونکە ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کە دەبێت پێویستکارێك لەسەرووی خواوە هەبێت کە ئەم شتە بەسەر خوادا پێویست بکات، هیچ شتێك نیە شت لەسەر خوای پایەبەرز پێویست بکات.

ئەگەر مەبەست لە شتە پێویست کراوەکە ئەوەبێت کە خوای گەورە خۆی لەسەر خۆی پێویستی کردووە، ئەوا ئێمە لەگەڵ ئەوە کۆکین، هەندێك لە ئەهلی سوننە دەقیشیان لەسەر ئەمە هێناوە.

بەڵام ئەهلی سوننە ئەمە ناکەنە پێویستیەکی ناچاری، بەوەی ئەگەر نەیکات ئەوا کەم و کوری توخنی ئەو بکەوێت کە لەسەر خۆی پێویست کردووە، چونکە ئەم لەسەر خۆ پێویست کردنە بەخشندەییەکە لەخواوە، کەسێك بەخشندەیی لەسەرخۆ پێویست بکات سەرپشکە لەوەی چ دەبەخشێت. واتە: خوای گەورە ڕەحمەتی لەسەر خۆ پێویست کردووە، ئەمەش لە ڕووی قەربووەوە نیە، هەروەها لە ڕووی ئەوەش نیە کە غەیری ئەو لەسەری پێویست کردبێت، چونکە خوای گەورە لەم شتانە بەرزترە[1].

ئەگەر وترا: چۆن دروستە بڵێی هەموو کردەوەکانی خوا چاك و جوانن، کەچی خوای گەورە بکەری ئەو هەموو وێنە ناشرین و ناپەسەندانەیە؟

وەڵامەکەی ئەوەیە: موعتەزیلە مەبەستیان ئەوە نییە کە خوای گەورە کاری چاك دەکات، لە ڕووی دیدگا و دیمەنەوە تا عەقڵ ئەمە بە ئەستەم بزانێت، بەڵکو مەبەستیان ئەوەیە کە کاری چاك دەکات لەڕووی دانایی و حیکمەتەوە، بۆیە ئەم وێنانە لە ڕووی حیکمەتەوە هەموویان چاکن، چونکە دەکرێت کردەوە لەڕووی دیدگا و دیمەنەوە چاك بێت

---

[1] المعتزلة لعواد المعتق ١٦١-١٦٢ و نقل عن شفاء العليل و مدارج السالكين و كلاهما لإبن القيم، واقتضاء الصراط المستقيم لإبن تيمية.

کەچی لەڕووی حیکمەتەوە ناشرین بێت، بۆ نمونە: کەسێك جوان بڕوات بەڕێوە کەچی کۆششی ئەوەبێت موسڵمانێك بباتە لای حوکمڕانێکی ستەمکار.

دەشکرێت کردەوە لەڕووی دیدگا و دیمەنەوە ناشرین بێت، کەچی شتێکی چاك بێت لەڕووی دانایی و حیکمەتەوە، وەك: کەسێك لارو لەوێرانە بڕواتەڕێ و بچێت بەرەو ڕزگار کردنی بەندکراوێکی ستەم لێکراو[1].

موعتەزیلەکان کە دادگەرییان بە بنەما داناوە هۆیەك بووە بۆ ئەوەی لەم شتانەی خوارەوە بدوێن:

پێویستی بوونی بەهۆکار کردنی کردەوەکانی خوا، چاك و خراپ (حسن و قبح)ی کردەوەکان شتێکی عەقلیین و بەندەکان خۆیان کردەوەکانی خۆیان بەدیدەهێنن، پێویست بوونی لێبوردەیی خوایی، پێویست بوونی چاك و چاکتر (الصلاح والأصلح)، پێویست بوونی ڕەوانەکردنی پێغەمبەران لەسەر خوا.

## بە هۆ کارکردنی کردارو کردەوەکانی خوا:

کردار (الفعل): بریتییە لەو بەدیهێنراوانەی کە هاتوونەتە بوون و غەیری ئەویش توانای بەسەردا شکاوە[2].

ڕایەکان جیاوازن لەبارەی بەهۆکار کردنی کردەوەکانی خوا، لەم بارەشەوە بۆ چەند بۆچوونێك دابەش بوون:

١- پێویست بوونی بەهۆکار کردنی کردەوەکانی خوا و حوکمەکانی، چونکە خوای گەورە کارێك ناکات ئەگەر مەبەستێکی دیاریکراوی نەبێت، بۆیە لە پێناو مەبەستەکە خوای گەورە کردارەکەی کردووە، ئەمە بۆچوونی موعتەزیلەیە[3].

بەڵگەکانیشیان ئەمانەن:

---

[1] شرح الأصول الخمسة ١٣٢.

[2] شرح الأصول الخمسة ٣٢٤.

[3] تعليل الأحكام ٩٧ و تأريخ المذاهب الإسلامية ١٨٢.

أ- خوای گەورە دانایە و شتی بێهوودە ناکات، بەڵکو ئەندازەگیرییەکی باشی هەموو شتێکی کردووە[1].

ب- ئەگەر کردارەکانی خوا بەهۆکار کراو نەبوبان، ئەو کاتە پێویست دەبوو کە کەم و کوری بکەوێتە ناو کردەوەکانی خوا، بەبێ ڕاجیایی کەم و کوری بوونی نییە لە کردارەکانی خوادا[2].

موعتەزیلەکان لەمەوە دەگەن بە فیکرەی پێویست بوونی چاك و چاکتر (الصلاح والأصلح).

جا بەهۆی ئەوەی کە شتەکان چاك و خراپی خودییان هەیە و بەهۆی ئەوەی کە خوای گەورە شتێك ناکات حیکمەتی نەبێت، لەبەر ئەمە ئەستەمە خوای گەورە فەرمان بەشتێك بکات جگە لە شتی چاك یاخود ڕێگری لە شتی چاك بکات، بۆیە کردەوەی چاك و چاکتر (الصلاح والأصلح) بۆ خوا پێویستە[3].

٢- ڕەتکردنەوەی بەهۆکار کردنی کردەوەکانی خوا، لەو ڕووەی کە خوای گەورە بکەرێکی سەرپشك نەبێت لە کردارەکانیدا، چونکە مەبەست و نیاز تەنها لە کردەوەی بکەرێکدا بوونی هەیە کە سەرپشك بێت. ئەمە مەزهەبی زۆربەی فەیلەسوفەکانە.

بەرپەرچ دراوەتەوە: کە ئەمە وتەیەکە پوچەڵیەکەی دیارە، چونکە وەرگرتنەوەی سەرپشکی لە خوای گەورە شتێکە کە سروشتی عەقڵ پەسەندی ناکات و ڕەتی دەکاتەوە[4].

٣- کردەوەکانی خوا بەهۆکار ناکرێن. ئەمە ڕای ئەشعەرییەکانە.

---

[1] تأريخ المذاهب الإسلامية، سەرچاوەی پێشوو.
[2] تعليل الأحكام ٩٩.
[3] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٨٢.
[4] تعليل الأحكام ٩٧.

٤- کردەوەکانی خوا هەموویان بەپێی دانایی و حیکمەتن، خوای گەورە بەمەست ئەو کردەوانەی ئەنجامداوە بەبێ ئەوەی ناچارکرابێت، چونکە خوای گەورە سەرپشکە.

ئەمە ڕای ماتوریدیە.

بەتێروتەسەلی لەبارەی ئەمە دەدوێین لەکاتی ڕوونکردنەوەی ڕایەکانی ئەشعەریی و ماتوریدیەکان.

ماتوریدی و موعتەزیلەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە کردەوەکانی خوا بە هۆی حیکەمەتێکەوەن کە خوای گەورە خۆی ئەندازەگیری بۆ کردووەو ویستی لەسەر بووە، ناکرێت کردەوەکانی خوا هاکەزایی بن، ڕاجیاییی لە نێوانیاندا تەنها لە دەربڕینداییە، ئەگەرنا لە بۆچووندا کۆکن، موعتەزیلە بە پێویست (واجب) دەریانبڕیوە و ماتوریدیەکان ئەم چەمکەیان دوورخستۆتەوە.

بەڵام ڕاجیایی نێوان موعتەزیلە و ئەشعەرییەکان ڕاجیایەکی بنەڕەتییە، کە بنایتنراوە لەسەر چاك و خراپ (حسن و قبح)ی عەقڵی[1].

### *عەقڵ چاك و خراپی شتەکان دیاریدەکات:*

چاك و خراپی بەسێ جۆر مانا دەردەبڕدرێت:

- مانای یەکەم: ئەوەی کە سروشتی مرۆڤ وەریدەگرێت و ئەوەش کە ڕەتی دەکاتەوە، وەك: چاکی ڕزگار کردنی کەسی نغرۆ بوو، خراپی تۆمەتبارکردنی کەسی بێ تاوان[2]، چاکی شیرین، ناشرینی تاڵ[1].

---

[1] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٨٣.

[2] تشنيف المسامع بجمع الجوامع ١/٤٥.

شەربینی لە: (حاشيته على الجمع الجوامع - حاشية العطار ١/٨) هێناویەتی و دەڵێت: ئیبن حاجب ئەمەی دەربڕیوە (بە کۆك بوون لەگەڵ مەبەست و دژبوونی)، هەندێك کتێبی تر بە: (لە خۆگرتنی بەرژەوەندی و خراپە) دەریان بڕیووە، ئاکامی هەرسێ دەربڕینەکە یەك شتە، جا ئەگەر یەکی گرت لەگەڵ مەبەستەکە ئەوا بەرژەوەندی خاوەنەکەی تێدایە، کۆکە لەگەڵ سروشتەکەی، بەهۆی ئەوەی ویستی لەسەرە، بڕواشی وایە سوودی دەبێت، پێچەوانەکەشی لە بەرژەوەندی ئەودا نییە و کۆکیش

- مانای دووەم: سیفەتی تەواو و ناتەواو، وەك: باشی زانست، خراپی نەزانین[2].

چاك و خراپی، بەم دوو مانایە بەبێ ڕاجیایی عەقڵیین، واتە: عەقڵ سەربەخۆیە لـە پەیی بردن بە چاك و خراپییەکەیان، عەقڵ لەم پەیی پێبردنەدا پێویستی بـە شـەرع نییە.

- مانای سێیەم: ئەو شتەی کە ستایش و سەرزەنشتی بەپەلـە و هەنووکـەیی شـەرع و پاداشت و سزای داهاتوو پێویست دەکات و بـەدوای خۆیـدا دێنێـت. ئەمـە خـاڵی ململانێ و مشتومڕە لە نێوان موعتەزیلە و ئەوانی تردا.

موعتەزیلە و ئیمامی و زەیدییەکان بۆ ئەوەچوون کە چاك و خراپی شـتەکان عـەقڵین، واتە: عەقڵ سەربەخۆیە لە پەیی پێبردن، بێ ئەوەی شەرع ڕۆڵی هەبێت، یان ئەوەتا لەبـەر خودی کردەوەکە یان لەبەر سیفەتێك کە بۆ حوکمەکان دەگەڕێتـەوە یـاخود لەبـەر بـوونی چەند شتێکی تری لەبەرچاو گیراو بەپێی ڕاجیایی لە نێوانیان[3].

---

نییە لەگەڵ سروشتەکەی. مەبەست لە سروشت ئارەزوو نییە تا ڕەخنەی ئەوە بگیرێت و بوترێت لەوانەیە ئەو شتەی کۆکە لەگەڵ مەبەست، پێچەوانە بێت لەگەڵ سروشت، وەك ئەو چارەسەرەی کە نەخۆش حەزی لێ نییە، بەڵکو سروشتی مرۆڤ ئاراستەی بەرەو ئەوەیە کە سوود دەستبخات و زیان لابەرێت. و دەڵێت: بەم شێوەیە لە کتێبی (عبدالحكيم على المقدمات)دا هاتووە. بڕوانە: وتەکەی عەتار لە حاشیەکەیدا ٨١.

[1] شرح جلال الدواني على الجمع الجوامع - حاشية العطار، سەرچاوەی پێشوو، والمحصل للرازي ٢٠٢.

[2] تشنيف المسامع، و المحصل، هەردوو سەرچاوەکەی پێشوو، و عەتار لە: (حاشيته ٨١ عن السيد الشريف على المواقف) هێناویەتی: (واتە: خودی هەندێك سیفەت سیفەتی کەماله، خودی هەندێك سیفەتی تریش سیفەتی کەم و کورییە، دەوترێت: زانست باشە، واتە: هەر کەسێك خۆی زانستدار بکات ئەوا خاوەن پلەوپایە و کەمالە، نەزانین خراپە، واتە: هەرکەسێك نەزان بێت کەم و کوری هەیە بارودۆخی خراپە).

[3] تشنيف المسامع، و المحصل، هەردوو سەرچاوەکەی پێشوو، و سەیری ڕای ئیمامیەکان بکە لە: النافع شرح الباب الحادي عشر ٢٦. و وتەی زەیدیەکان لە: الأساس ٥١ و لە ٥٠ هاتووە کە وتیانە ڕاجیایی لە مەڕ دوو ماناکەی یەکەم نییە.

موعتەزیلە پێیان وایە توانا و دەسەڵاتی عەقڵ لە ئاستێکدایە کە لە توانای داهەیە چاك و خراپی شتەکان دیاری بکات، چونکە هەر شتێك سیفەتێکی تێدایە کە وای لێکردووە چاك یان خراپ بێت، جا ڕاستگۆیی سیفەتێکی خودی تێدایە کە وای لێکردووە چاك بێت، درۆش سیفەتێکی خودی تێدایە کە وای لێکردووە خراپ بێت، بۆیە هۆشمەندەکان بەشدارن و وەك یەکن، باوەڕدارو بێ باوەڕان کۆکن لەسەر ئەوەی کە ڕزگار کردنی کەسی نغرۆ بوو کارێکی چاکە و تۆمەتبارکردنی کەسی بێ تاوان کارێکی خراپە، ئەگەر حوکمی شەرعیان لەمەدا پێنەگات.

شەرع کە فەرمان کردنی شتێك دەکات لەبەر چاکیەکەیەتی و کە ڕێگری لە شتێك دەکات لەبەر خراپییەکەیەتی، شەرع ناتوانێت پێچەوانەی ئەمە حوکم بدات، چونکە فەرمان و ڕێگری شەرع پەیوەستن بەو چاکە و خراپەی لە خودی شتەکەدا هەیە[1].

هەر شتێك عەقل بە چاکی دابنێت ئەوا کردنی ئەو شتە پێویستە لەلایەن خواوەو خوای گەورە پاداشتی ئەنجامدەری کردەوەکە دەداتەوە، هەر شتێك عەقڵ بە خراپی بزانێت، ئەوا خوای گەورە فەرمانی کردووە بە نەکردنی و هەر کەسێکیش بیکات خوای گەورە سزای دەدات.

بەم پێیە وتویانە: ئەوانەی بانگەوازی پێغەمبەران و شەریعەتەکانی خوایان

---

باوەڕ بوون بەوەی کە عەقڵ بە بەڵگە دەهێنرێتەوە لە بارەی چاك و خراپی شتەکان، بەو واتایەی پێویستە لەسەر خوا پاداشت و ستایش بکات لەسەر کردەوەی باش و سزاو سەرزەنشت بکات لەسەر کردەوەی خراپ، ئەمە ڕای موعتەزیلە و دووانەپەرست و ئەوانەی بڕوایان بەگەڕانەوەی ڕۆح هەیە و براهیمە و خەواریج و کرامییەکانە./ نهاية الإقدام ٣٧١.

[1] فجر الإسلام. و سەیری: النافع، سەرچاوەی پێشوو بکە.

مامۆستا (موحەممەد سەلام مەدکور) لە (مناهج الإجتهاد فی الإسلام ٤٩٩)دا وتویەتی: (موعتەزیلەکان زیادەڕەوییان کرد لە ئەندازەکردنی توانا و دەسەڵاتی عەقڵ و سنووری زانست و زانیاریی مرۆیی.... ئەوان پێیان وایە عەقڵی مرۆڤ توانای وای پێدراوە کە لە باریدا هەیە بەڵگە بێنێتەوە لەسەر ئەو شتانەی بە خوای گەورە پەیوەستن، هیچ سنوورێك بۆ عەقڵ نییە جگە لە بەڵگەکانی عەقڵ نەبێت و هیچ هەڵە و خلیسکانێك بوونی نییە هەر کە بەڵگەکەی عەقڵ دروست دەرچوو، هەر بەم پێیەش قورئان تەئویل دەکەن).

پێگەیشتووە، ئەوا ئەرکدارن بەپێی ئەوەی کە لە شەریعەتەکەدا هاتوون، ئەوانەش کە شەریعەتەکانی خوایان پێ نەگەیشتووە ئەوا ئەرکدارن بەوەی کە عەقڵیان ئاراستەیان دەکات، جا لەسەریان پێویستە ئەو شتە بکەن کە عەقڵ بە چاکی دەزانێت، چونکە بەکردنی پاداشت وەردەگرن، هەروەها ئەوەش فەرامۆش بکەن کە عەقڵ بە خراپی دەزانێت، چونکە بەکردنی سزا وەردەگرن[1]. واتە: ئەو شتەی عەقڵ پەیی بە چاکییەکەی دەبات ئەوا کردنی پێویست دەبێت و ئەوەش کە عەقڵ پەیی بە خراپییەکەی دەبات نەکردن و فەرامۆش کردنی پێویست دەبێت[2].

بەڵام ئەشعەرییەکان بۆ ئەوەچوون کە شەرع چاك و خراپی شتەکان دیاری دەکات، نەك عەقڵ. مرۆڤ پاداشت و سزا لەسەر کردن و نەکردنی هیچ شتێك وەرناگیرێت تا بانگەوازی پێغەمبەری پێنەگات.

ماتوریدیەکان بۆچوونیان وایە کە عەقڵ چاك و خراپی شتەکان دیاری دەکات، بەڵام پاداشت و سزا وابەستەیە بەشەرعەوە. بە تێرو تەسەلی ڕاو بۆچوونی ئەشعەرییەکان و ماتوریدەکان دەخرێتەڕوو لە کاتی باس کردنی ڕاکانیان.

جا موعتەزیلەکان لە داننانبە بنەمای دادگەری مەبەستیان پاك ڕاگرتنی خوابووەو دوور گرتنی بووە لە ستەم، بۆیەش ویستی مرۆڤیان تا ئەندازەیەك بەرزکردەوە کە بەرپرس بێت لە ستەم.

کەچی ئەشعەرییەکان بۆ ئەوەچوون کە لە ڕاستەقینەدا ستەم نییە، چونکە خوای گەورە بکەری ڕاستەقینەیە، ئەمەش دادگەرییە، بەو واتایەی ڕەفتار لە موڵکی خۆیدا دەکات، چۆن بیەوێت وائەکات، فەرمان بەوەدەکات کە دەیەوێت. و وتنی ئەو بۆچوونەی کە پێی وایە مرۆڤ بەرپرسە لە بەدیهێنانی کردەوەی خۆی ئەمە تەسك کردنەوەی توانای خوای

---

[1] علم أصول الفقه لعبدالوهاب خلاف ٩٨-٩٩.

[2] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٨٢.

گەورەیە. بۆیـە وتویانـە: کردارەکـان لەلایـەن خـواوە بـەدیهێنراون و بەنـدەش بەدەسـتی دەخات[1].

ئەم ڕاجیاییە لە بە چاك و خراپ دانان هیچ شتێکی لەسەر کەڵەکـە نابێـت تـەنها بـۆ ئەوانە نەبێت کە شەریعەتی پێغەمبەرەکانیان پێ نەگەیشتووە، چونکە ئەمانـە ئەرکـدارن لەلایەن موعتەزیلەکان، لەلایەن ئەهلی سوننە و جەماعەتیش ئەرکدار نین[2].

***کردەوەکانی بەندە:***

کە موعتەزیلەکان خوایان بە پاك گرت، لە کردەوەی خراپ، ئـەم بۆچـوونەیان بەرهـەم هێنا کە کردەوەکان لە خودی مرۆڤــدا بەدینـەهێنراون بـەڵکو مرۆڤــ خـۆی دروسـتیان دەکات[3].

کردەوەکانی بەندە کردەوەی ڕاستەوخۆی سەرپشکییە[4]، وەك هەڵسوکەوت، هەستان و دانیشتنیان[1].

---

[1] تعليق د. عبدالكريم عثمان في هامش ١٣١ من شرح الأصول الخمسة.

[2] علم أصول الفقه لعبد الوهاب خلاف ٩٩ وتعليق د. شعبان محمد إسماعيل على إرشاد الفحول ٥٤/١.

[3] شرح الأصول الخمسة ٣٢٣ و ٣٤٠. و سەیری ئەمەش بکە: تبصرة الأدلة ٥٩٤/٢.

[4] کردەوەکانی بەندە لەلایەن موعتەزیلە دوو جۆرن:

یەکەم: کردەوە ڕاستەوخۆو سەرپشکییەکانی بەندە، کە ناکرێت ڕووبدەن تەنها بە مەبەست نەبێت، هەر بەشێك لەو کردەوەیە پێویستی بە نوێکاری و ویست بۆ هەبوون و بەرەو پیرچوونی هەیە، موعتەزیلەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە ئەم کردەوانە بەندە خۆی بەدیان دەهێنێت، تەنها (زیراڕی کوڕی عەمر) و (حەفصی فەرد) نەبن کە کۆك بوون لەگەڵ ئەهلی سوننەدا کە ئەم کردەوانەش هەر بەدیهێنراوی خوان.

دووەم: کردەوە خۆنەویستەکان (أفعال التولد): بریتییە لە هەر کردەوەیەك کە شیاوی ڕوودانە، بەبێ ئەوەی بکەرەکەی مەبەستی بوویێت و ویستی لەسەر بێت. موعتەزیلە سەبارەت بەم کردەوانەی جۆری دووەم ڕاجیان، جا موعتەزیلەکان تەنها ئەو کردەوانەیان داوەتە پاڵ مرۆڤ کە لە کەسی زیندووەوە سەرچاوەی گرتووە، هەروەك (بیشری کوڕی موعتەمر) و (قازی عەبدولجەبار) و جگە لەوانیش ئەمەیان وتوە./المعتزلة لعواد المعتق ١٦٨ و ئاماژەی بۆ سەرچاوەکانی کردووە. و

خوای گەورە کردەوەی بەندەکانی بەدیناهێنێت، بەڵکو بەندەکان خۆیان کردەوەکانیان بەدیدەهێنن. ئەمەش بێ توانایی خوا ناگەیەنێت، بەڵام خوای گەورە هێزێکی لە مرۆڤدا داناوە کە مرۆڤ بەهۆیەوە بتوانێت کردەوەکانی بەدیبهێنێت، جا خوای گەورە پێدەری ئەو هێزەیە، بۆیە خوا هێزو توانای تەواوی هەیە لەسەر سەندنەوەی ئەو شتەی بەخشیویەتی، کە خوای گەورە ئەمەی بەخشیووە بۆ ئەوەبووە کە ئەکداری و تەکلیف تەواو ببێت[2]، پاداشت و سزا جێبەجێ ببێت.

موعتەزیلە بەم بۆچوونەیان بەرپەرچی جەبرییەکانیان داوەتەوە کە دەڵێن مرۆڤ ناچارە لە کردنی کردەوەکانیدا و سەرپشك نییە، تەنانەت موعتەزیلەکان ئەم بۆچوونەی جەبرییەکانیان بە کوفر داناوە، چونکە پێیان وایە جەبرییەکان بەم بۆچوونەیان پێچەوانەی بنەمای دادگەری جوڵاونەتەوە ئەمەش بەوەی شتی ناشرین و ستەم و درۆ... هتدیان داوەتە پاڵ خوا، بۆیە بەم بۆچوونەیان کوفریان کردووە[3].

گێڕدراوەتەوە کە واصلی کوڕی عەتاء هەندێك لە هاوەڵانی ناردووە بۆ دەڤەری (خوراسان) بۆ گفتوگۆ و دەمەتەقێ کردن لەگەڵ جەهمی (جەبری)[4].

ئەمەش هەندێك لە بەڵگەکانیانن:

١- ئەم فەرمایشتەی پەروەردگار: ﴿ صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ ﴾ النمل: ٨٨. (قازی

---

پێناسەی هەردوو جۆری کردەوەکانی هێناوە لە: الإسكافي عن مقالات الإسلاميين في المعتزلة ، سەرچاوەی پێشوو ١٨٤.

سەیری وتەکەی ئیسکافی و جگە لەویش بکە لە: المقالات الإسلاميين ٩٣/٢ وقول ضرار وحفص في ٩١.

ئەهلی سوننە بۆچوونی وایە کە هەردوو جۆری کردەوە بەدیهێنراوی خوان./ تمهيد الأوائل ٣٣٤ وأصول الدين للغزنوي ١٦٩ والمعتزلة لعواد المعتق ١٩١ عن ابن حزم وابن تيمية.

[1] المعتزلة لعواد المعتق ١٦٩ عن المغني للقاضي عبدالجبار.

[2] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٢٧ و ١٨٤.

[3] شرح أصول الخمسة ١٢٤-١٢٥.

[4] فجر الإسلام ٢٩٧.

عەبدولجەباری موعتەزیلە) وتویەتی: خوای گەورە ڕوونی کردۆتەوە کە کارەکانی خوا هەر هەمووی ڕێك و پێك و بێ کەم و کورتین، ڕێك و پێکیش بریتییە لە تۆکمەیی و جوانی بەیەکەوە، ئەگەر کارێك تۆکمە بوو بەڵام جوان نەبوو، ئەوا ناکرێت بە کارێکی ڕێك و پێك وەسف بکرێت. ئایا نابینیت؟ ئەگەر یەکێکمان قسەیەکی ڕەوان بکات بەڵام شتی ناشرین و مانای بێ سەروبەری هەبێت، ئەگەرچی بە قسەیەکی تۆکمە دابنرێت ئەوا بە قسەیەکی ڕێك و پێك وەسف ناکرێت.

شتێکی زانراویشە کە کردەوەی بەندەکان: هەیانە جولەکایەتیە یان نەصرانیەتیە و هەشیانە کردەوەی ئاگرپەرستانەیە، هیچ یەکێك لەم سێ جۆرە کردەوانەی ڕێك و پێك نین، بۆیە دروست نیە خوا بەدیهێنەری ئەو کردەوانە بێت[1].

٢- هەندێك کردەوەی بەندەکان هەن ستەمن، جا ئەگەر خوای گەورە بەدیهێنەری ئەو کردەوانە بوایە ئەوا پێویست دەبوو کە خوای گەورە ستەمکارێکی زۆردار بوایە، خوای گەورە پاك و بەرزو دوورە لەم جۆرە شتانە[2].

بەڵام ئەشعەری و ماتوریدییەکان بۆ ئەوەچوون کە کردەوەی بەندەکان بەدیهێنراوی خوان، بەندە تەنها دەتوانێت بەدەستیان بخات، پاداشت و سزاکەی لەسەر ئەم بەدەستهێنانە دیاری دەکرێت.

بەتێروتەسەلی باسی واتای بەدەستهێنان (الکسب)ی کردەوە دەکەین لە کاتی خستنەڕووی ڕاوبۆچوونی ئەشعەری و ماتوریدی.

### میهرەبانی خوایی (لوتفی خوایی):

مەبەست لە میهرەبانی بریتییە لە هەر شتێك کە وا لە مرۆڤ بکات، گوێڕایەڵ بێت

[1] شرح أصول الخمسة ٣٥٨. چەند بەڵگەیەکی تریشی تێدایە کە لە قورئانی پیرۆزەوە هێناویەتی.
[2] شرح أصول الخمسة ٣٤٥. و عواد المعتق لە: (المعتزلة ١٧١ ولاپەڕەکانی تردا) باسی بەڵگەکانی موعتەزیلە و بەرپەرچەکانی زانایان بۆ ئەو بەڵگانەی کردووە.

و دووری بخاتەوە لە گوناه. جا ئەگەر خوا دادگەر بێت لە حوکمەکانیدا و میهرەبان بێت بە بەدیهێنراوەکانی و بەندەکانی ببینێت ئەوا ڕازی نابێت کوفر بکەن و ستەم و زۆرداری بۆ جیهان و بەدیهێنراوانی ناوێت، جا خوای گەورە شتێکی نەشاردۆتەوە لە بەندەکان کە بەکردنی ببێتە هۆی گوێڕایەڵی و چاك بوونیان[1].

موعتەزیلەکان دەڵێن میهرەبان و لوتف پێویستە لەسەر خوای گەورە، ئەگەر هاتوو خوای گەورە دواکەوتبوو لە ڕاسپاردن و ئەرکدار کردن، جا وەك یەکە ئەم لوتفە چ لە شتێکی فەرز یاخود سوننەتدا بێت[2].

---

[1] في علم الكلام - المعتزلة ١٤٥ و نقل عن الملل والنحل للشهرستاني. و بغدادي لە: (النافع ٣٢) وتویەتی: (میهرەبانی و لوتف بریتیە لەوەی کە بەندە لە چاکە و گوێڕایەڵی نزیك دەکاتەوەو دووری دەخاتەوە لە میهرەبانی).

لە: (نهاية الإقدام ٤٠٦)ی شەهرستانی دا هاتووە: (میهرەبانی و لوتف لەلایەن موعتەزلە بریتییە لە ڕێخۆشکردن بەرەو چاکە، ئەمە ئەو کردوەیەیە کە خوای گەورە زانیویەتی بەهۆیەوە بەندە گوڕایەڵی دەبێت، خوای گەورە توانای بەسەر هیچ میهرو لوتف و کردەوەیەکی لەوجۆرەدا نییە، چونکە ئەگەر توانای بەسەر هەبووایە ئەوا کافرەکان بڕوایان دەهێنا).

لە: (الإرشاد، للجويني، ٣٠٠)دا هاتووە: (میهربانی و لوتف لەلایەن موعتەزیلە بریتییە لەو کردەوەیە کە خوای گەورە دەزانێت بەهۆیەوە بەندە گوێڕایەڵی دەکات... بۆیە پێویستە خوای گەورە ئەوپەڕی میهرەبانی و لوتف بکات بە ئەرکدارەکان، بەڵام میهرەبانی و لوتف لە توانای خوادا نییە، چونکە ئەگەر ئەمەی بکردایە ئەوا بێ باوەڕو کافرەکان بڕوایان دەهێنا... بەڵام ئەوانەی لەسەر ڕێبازی ڕاستن ئەوا میهرەبانی و لوتف لەلای ئەوان بریتییە لە بەدیهێنانی توان لەسەر گوێڕایەڵ و پەرستش، ئەمەش هەردەم خوای گەورە توانای بەسەردا دەشکێت) وسەیری ئەمەش بکە: تبصرة الأدلة ٧٢٣/٢ والتمهيد للامشي ١١٥.

[2] المعتزلة لعواد المعتق ١٩٤ نقلا عن المغني للقاضي عبدالجبار، و تیایدا هاتووە: ئەگەر میهرەبانی و لوتفەکە پێش ڕاسپاردن و ئەرکدار کردن بێت ئەوا ئەو کاتە پێویست نابێت لەسەر خوا، چونکە لوتف دەبێتە هۆی لاچوون و سڕینەوەی هۆی ئەرکدار کردنەکە، لەو کاتیشدا ئەرکداری بوونی نییە، ئەگەر لوتف بەرامبەر بوو لەگەڵ لوتف لەو کاتەشدا لەسەر خوا پێویست دەبێت.

سەیری ڕاجیایی موعتەزیلەکان بکە سەبارەت بە بابەتی لوتف: مقالات الإسلاميين ٣١٣/١.

ئیمامیەکانیش بەهەمان شێوەی موعتەزیلەکان بۆچوونیان وایە میهرەبانی و لوتف پێویستە لەسەر خوای گەورە[1].

ئەهلی سوننە میهرەبانی و لوتفی خواییان بڕیار داوە بۆ هەر یەکێك لە بەدیهێنراوەکان کە خوای گەورە ویستی لەسەر بێت، بەڵام بەپێویستی نازانن لەسەر خوای گەورە، بەڵکو بە بەخشندەیی خوا دادەنێن، ئەو لوتفەش: ئەوەیە کە پێی دەوترێت سەرخستن بەرەو چاکە و دوورخستنەوە لە خراپە، ئەمەش ئەم فەرمایشتەی خوای پایەبەرزە: ﴿ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ لَاتَّبَعْتُمُ الشَّيْطَانَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ النساء: ٨٣. واتە: (جا ئەگەر فەزڵ و چاودێری خواو ڕەحمەت و میهرەبانییەکەی نەبوایە شوێنی شەیتان دەکەوتن، جگە لە کەمێکتان نەبێت). جا ئەم بەخشندەیە بریتییە لەو لوتف و میهرەبانییەی کە هۆکارێك بووە بۆ شوێن نەکەوتن و دوورکەوتنەوە لە شەیتان[2].

بەرپەرچی موعتەزیلەکانیان داوەتەوە بەوەی پێویست بوون لەسەر خوای گەورە شتێکی ئەستەمە، بەهۆی ئەستەم بوونی پێویستکەرێك لە سەرووی خوای گەورە کە شتی لەسەر پێویست بکات[3].

## چاکە و چاکترو باشە و باشتر (الصلاح والأصلح):

چاکە و باشە (الصلاح): بریتییە لەو کردەوە ئاراستەکارو بەرەو خێرەی کە بڕبڕەی جیهانە و هۆی مانەوەی جۆرەکانە لە دونیادا و سەرکێشە بۆ بەختەوەری هەمیشەیی لە داهاتوودا.

چاکترو باشتر (الأصلح): بریتییە لەوەی ئەگەر دوو خێر و چاکە هەبوون، یەکێکیان نزیکتر بوو لە چاکەی ڕەها، ئەوا ئەو چاکترە[4].

---

[1] الباب الحادي عشر والنافع عليه ٣٢ ومفتاح الباب ١٦٥.

[2] المعتزلة لعواد المعتق ١٩٦، وأشار إلى مدارج السالكين و الإبانة، وإقتضاء الصراط المستقيم.

[3] التبصرة في الدين ٧٢ و ٦١. و بڕوانە: المعتزلة لعواد المعتق، سەرچاوەی پێشوو کە وەریگرتووە لە: ئیسفەرایینی.

[4] نهاية الإقدام ٤٠٦.

موعتەزیلەکان بۆ ئەوەچوون کە خوای گەورە تەنها کاری چاکتر و خێر ئەنجامدەدات، لەڕووی حیکمەتیشەوە پێویستە بەرژەوەندی بەندەکان لەبەرچاو بگرێت[1].

سەبارەت بە چاکتر (الأصلح) ئەوا بۆ دوو بۆچوون دابەش بوون:

١- پێویستە لەبەرچاو بگیرێت وەك چۆن لەبەرچاوگرتنی (چاکی)ەکە پێویست بوو. ئەمە بۆچوونی زۆربەی موعتەزیلەکانە.

٢- پێویست نییە، چونکە شتی چاکتر کۆتایی نییە، هیچ شتێکی چاکتر نییە مەگەر لەو چاکتر هەر هەیە. ئەمە وتەی" بیشری کوڕی موعتەمر"ی موعتەزیلییە[2].

---

لە: (شرح الباجوري على الجوهرة ١٨٢) هاتووە: (پێویست بوونی چاکی: واتە پێچەوانەی خراپە، وەك ئیمان چۆن لەگەڵ کوفر بەرامبەرە، جا دەڵێن: ئەگەر دوو شت هەبوون یەکێکیان چاکە بووە، ئەوەی تر خراپە، ئەوا پێویستە لەسەر خوا شتە چاکەکە بکات نەك خراپەکە. پێویست بوونی چاکتر: واتە ئەوەی بەرامبەرە لەگەڵ چاك، وەك چۆن لای سەرەوەی بەهەشت بەرامبەرە لەگەڵ لای خوارەوەی، جا دەڵێن: ئەگەر دوو شت هەبوون یەکێکیان چاك و ئەویتریان چاکتر بوو ئەوا پێویستە لەسەر خوا چاکترەکە بکات نەوەك چاکەکە. دواتر موعتەزیلەکان ڕاجیاییان تێکەوت: جا موعتەزیلەکانی بەغداد بۆچوونیان وابوو کە پێویستە لەسەر خوا چاکی و چاکتر لەبەرچاو بگرێت لە کاروباری دونیا و دوارۆژدا، موعتەزیلەکانی بەصرەش بۆ ئەوەچوون کە پێویستە لەسەر خوا ڕەچاوی چاکی و چاکتر بکات تەنها لە ئاییندا، دواتر لەبارەی چەمکی چاکتر"أصلح" ڕاجیاییان تێکەوت، چەمکی ناوبراو لەلایەن بەغدادیەکان: بریتییە لەو کارەی کە حکمەت و مشورێکی بەرزی تێدایە، بەڵام لەلای بەصرییەکان بریتیە لە: بە سوودترین).

[1] الملل والنحل للشهرستاني ٣٩/١.

(نەزام وتویەتی: خوای گەورە ناتوانێت کردەوەیەك بکات بە بەندەکانی بە پێچەوانەی ئەو کردەوەیەی کە چاکترە بۆیان، ناتوانێت یەك گەردیلە لە خۆشی بەهەشتیەکان کەم بکاتەوە، چونکە خۆشی بەهەشتیەکان چاکترە بۆیان، بوونی کەم و کوری لەو شتەدا کە چاکترە ستەمە لەلایەن خوا، خوای گەورە لە توانایدا نییە سزای دۆزەخییەکان بە ئەندازەی یەك گەردیلە زیادو کەم بکات...)./ و الفرق بين الفرق ١٣٣. و سەیری ئەمەش بکە: الملل والنحل للشهرستاني ٤٧/١-٤٨ والتبصير في الدين ٦١.

[2] نهاية الإقدام ٣٩٧-٣٩٨ هەر یەك لە بۆچوونەکانی داوەتە پاڵ هەندێك لە موعتەزیلەکان، بەڵام لەم سەرچاوەنەدا بۆچوونی یەکەمی دراوەتە پاڵ زۆربەی موعتەزیلەکان و هی دووەمی دراوەتە پاڵ

ئەهلی سوننە وتویانە: خوای گەورە وەك سۆزو بەزەیی و بەخشندەیی خۆی چی چاكە ئەوە بە بەندەكانی دەكات، ئەمەش بەوەی نا كە پێویستە، كەمێك پێشتر بۆچوونی (ئیسفەراییینی)مان خستەڕوو بەوەی پێویست بوون لەسەر خوای گەورە ئەستەمە، بەهۆی ئەستەمی بوونی یەكێك لە سەرووی خواوەو شتی لەسەر پێویست بكات[1].

مامۆستا (موحەممەد سەلام مەدكور) وتویەتی: موعتەزیلە زیادەڕەوییان كرد لە پێوان و قیاس كردنی نادیار لەسەر دیار (الغائب علی الشاهد)، خوای گەورەیان ملكەچی یاساكانی ئەم جیهانە كرد، پابەندیان كرد بە دادگەری وەك چۆن مرۆڤ تەصەوری دەكات. لە بیریان چووە كە واتای دادگەری ڕێژەییە، تەصەوركردنی دەگۆڕێت بە گۆڕانی كات، بەهەمان شێوە (چاكی و خراپی: حسن و قبح) و (چاكە و چاكتر) ڕێژەیین[2].

---

بیشری كوڕی موعتەمر: مقالات الإسلامیین ٣١٣/١. و قول البشر و حجته في: الملل والنحل للشهرستاني ٥٧/١. و نقل عواد المعتق في المعتزلة ١٩٨ القولین عن نهایة الإقدام والمقالات.

[1] المعتزلة لعواد المعتق ١٩٩-٢٠٢ ونقل الإسفراییني والغزالي و ابن تیمیة. و سەیری وتەكەی (ئیسفترایینی) لە: التبصیر في الدین ٧٢. و سەیر وتەی ماتوریدیەكان بكە لە: أصول الدین للغزنوي ١٧٢.

دەردیر لە: (شرح الخریدة ٨٩) وتویەتی: ئەگەر هاتبوایە كردنی شتی چاكتر پێویست بووبایە لەسە خوای گەورە ئەوا هیچ ناخۆشیەك ڕووی نەدەدا، خوای گەورە كەسی كافری هەژاری سزادراوای لە دونیاو دواڕۆژدا بەدی نەدەهێنا، هیچ كات منداڵ كە ئەركدار نییە ئازاری نەدەبوو، هەندێك لە گیانلەبەرو باڵندەكان لەوپەڕی لاوازی و چەرمەسەریدا نەدەبوون، تەنانەت گەڕان بەدوای بەدەستهێنانی ڕێنموونی و هیدایەت و كاركردن بۆ دۆزینەوەی نەهێشتنی نەخۆشیەكان هیچ واتایەكی نەدەبوو بەهۆی گەیاندنی ئەوەی چاكترە بۆ بەندەكان، هیچ شتێكی تر سەبارەت بە بەرژەوەندی بەندەكان لە توانای خوای گەورەدا نەدەما، چونكە خوا ئەوەی پێویست بووە لەسەری چاكتر بووە ئەنجامی داوە. دەردیر لە (خریدة)دا وتویەتی:

ومن یقل فعل الصلاح وجبا على الإله قد أساء الأدبا

واتە: ئەوەی بڵێت كردنی كاری چاكتر پێویستە لەسەر خوا، ئەوا بەڕاستی بێ ئەدەبی نواندووە.

بڕوانە: شرح الباجوري على الجوهرة ١٨٣.

[2] مناهج الإجتهاد في الإسلام ٤٩٩.

**ڕەوانەکردنی پێغەمبەران لەسەر خوا پێویستە:**

ئەمەش لەبەر ئەوەیە ئەگەر خوا زانیبێتی کە چاك بوونی ئێمە پەیوەستە بەو شەریعەتەوە، ئەوا پێویستە لەسەری کە ئەو شەریعەتەمان پێ بناسێنێت، تا کەم و کورتی نەخاتە ناو ئەو شتەی کە لەسەری پێویستە، شتێکی دادگەرانەیە کە کەم و کورتی نەخاتە ناو شتێك کە لەسەری پێویستە[1].

جا ڕەوانەکردنی پێغەمبەران لە دادگەری خواوەیە، ئەگەر پێغەمبەرانی نەناردبوایە ئەوا کەم و کورتی دەخستە ئەو ئەرکەی کە لەسەری پێویست بووە.

غەزالی وتویەتی: موعتەزیلەکان وتویانە: ناردنی پێغەمبەران پێویستە[2].

باوکی عەلی موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهابی جوبائی و کوڕەکەی ئەبو هاشمی عەبدوسەلام کە لە موعتەزیلەی شاری بەصرەن، هەموو ئەرکەکانیان بە بەشێك لە میهرەبانی و لوتف داناوە، ناردنی پێغەمبەران و دانانی شەریعەت و سەرنج ڕاکێشان بۆ ڕێگەی هەرە ڕاستن هەموو ئەمانەیان بە لوتف داناوە[3].

بەڵام ئەهلی سوننە و جەماعەت بۆچوونیان وایە کە ناردنی پێغەمبەران لە بەخشندەیی خواوەیە بۆ بەندەکانی، تفتازانی وتویەتی: لەبەر ئەوەی ناردنی پێغەمبەران بەرژەوندی بێ ژمار لەخۆی دەگرێت، بۆیە بریتییە لە میهرەبانی و لوتف، ڕەحمەتێکە خوای گەورە بە هەر کەسێك لە بەندەکانی بیەوێت دەیبەخشێت، بەبێ ئەوەی ئەمە لەسەر خوا پێویست بێت، بەپێچەوانەی ڕای موعتەزیلەکان[4].

---

[1] شرح الأصول الخمسة ٥٦٣ و لا ٥٦٤.

[2] المعتزلة لعواد المعتق ٢٠٤ ونقل عن الإقتصاد في الإعتقاد للغزالي. وهو في الإقتصاد في الإتقاد ١٠٤.

[3] الملل والنحل للشهرستاني ١/٦٨.

[4] شرح المقاصد للتفتازاني ٥/٥ و بۆچوونەکەی موعتەزیلەی هێناوە. و بڕوانە: المعتزلة لعواد المعتق ٢٠٦ نقلا عن السفاريني.

## بنەمای سێیەم: بەڵێن و هەڕەشە (الوعد و الوعید)[1].

بەڵێن (الوعد): بریتییە لە هەر هەواڵێك كە مەبەست لێی گەیاندنی سوود بێت بە بەرامبەر یاخود دوورخستنەوەی زیان بێت لە کەسی بەرامبەر لە داهاتوودا.

هەڕەشە (الوعید): بریتییە لە هەر هەواڵێك كە مەبەست لێی گەیاندنی زیان بێت بە کەسی تر یاخود مەبەست لێی پێ لە دەستدانی سوودێك بێت لە داهاتوودا.

مەبەست لەو بنەمایە ئەوەیە: خوای گەورە پەیمانی بە گوێڕایەڵان داوە بەوەی پاداشتیان دەداتەوە، هەڕەشەی لە گوناهکاران کردووە بەوەی سزایان دەدات، شتێکی گومان هەڵنەگرە كە خوای گەورە پەیمان و هەڕەشەکەی خۆی جێبەجێ دەکات، درۆو قسە شکاندن دروست نییە بۆ خوای گەورە[2].

موعتەزیلەکان بڕوایان بە بەڵێن (وعد) هەیە: واتە پێویستە لەسەر خوا کە پەیمانی خۆی جێبەجێ بکات، پێویستە پاداشتی بەندە بداتەوە كە مردووە وەك دەرەنجام[3]، جا ئەگەر بەندەکەی لە دونیا دەرچوو و گوێڕایەڵ و تەوبەی کردبوو ئەوا شایەنی پاداشت و زیادەپێدانە[4].

بڕواشیان بە هەڕەشە هەیە: واتە: ئەگەر باوەڕدار گوناهی گەورەی ئەنجامدا و تەوبەشی نەکرد ئەوا شیاوی ئەوەیە بۆ هەتا هەتایە بخرێتە ناو ئاگری دۆزەخ، بەڵام سزاکەی سوکترە

---

[1] موعتەزیلەکان بە (الوعدیة والوعیدیة) ناونراون بەهۆی بڕوابوونیان بەم بنەمایە./ نشأة الفکر الفلسفي في الإسلام ١/٤٣٦.

[2] شرح الأصول الخمسة ١٣٤-١٣٦ وتیایدا هاتووە: (درۆ "الکذب": بریتییە لە هەموو هەواڵێك، كە هەواڵدەرێکی هەبێت و هەواڵدەرەکەش پێچەوانەی بجولێتەوە. قسە شکاندن "الخُلف": بریتییە لەوەی بڵێت شتێك دەکەم لە داهاتوودا پاشان نەیکات).

[3] شرح الأصول الخمسة ٦١٤، و نقل عنه عواد المعتق في: المعتزلة ٢١٢. و بڕوانە: الملل والنحل للشهرستاني ١/٣٩.

[4] الملل و النحل للشهرستاني، سەرچاوەی پێشوو.

لە سزای کافر[1].

موعتەزیلەکان بە بنەمای (پەیمان و هەڕەشـە) بەرپەرچـی مورجیئـەکانیان داوەتـەوەو تەکفیریان کردوون[2]، مورجیئەکان وتویانە: ئیمان لەگـەڵ گونـاه زیـانی نییـە، هـەروەك چاکەکردن لەگەڵ کوفر سوودی نییە، جا ئەگەر وتەی مورجیئەکان ڕاست بووایە ئـەوا ئـەو کاتە هەڕەشەی خوا شتێکی بێ مانا دەبوو[3].

موعتەزیلەکان لەسەر ئـەم بنەمایـە ئـەم شـتانەیان بینـاکرد: نکۆڵیـان کـرد لـەوەی شەفاعەتی پێغەمبەر موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) بۆ ئەنجامدەرانی گوناهە گەورەکانی ئوممەتەکـەی بێـت، بـەڵکو شـەفاعەتەکەی تـەنها بـۆ تەوبـەکارانی ئیمانـدارە، چـونکە چەسپاندنی شـەفاعەت بـۆ ئەنجامـدەری تاوانـە گـەورەکان پێچـەوانەی بنـەمای هەڕشـە (وعید)ە[4].

بەڵام ئەهلی سوننە لەبارەی پەیمان (وعد) وتویانە: ئەگەر خوای گەورە پەیمانی شـتێکی دا بە بەندەکانی، ئەوا جێبەجێ کردنی پێویست دەبێت بەهۆی پەیماندانەکە نـەوەك ئـەوەی کە مافی بەندەکان بێت، چونکە بەندە بە خودی خۆی هیچ مافێکی بەسەر خواوە نییە[5].

ئەگەر خوا پەیمانی دا بەوەی باوەڕداران دەخاتە بەهەشتەوە ئـەوا هـەرگیز پەیمانەکـەی ناشکێنێت، لەبەر ئەم فەرمایشتە: ﴿وَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥ﴾ الحج: ٤٧. ئەگـەر ئـەو شـتەی خوای گەورە پەیمان و بەڵێنی دا بە بەخشینی کەسـێك، بـەڵام دواتـر پەیمانەکـە جێبـەجێ نەکات و دوایخست، ئەو کاتە دەبێتە هۆی ئەوەی درۆو قسە شکاندن و نەزانی بدرێتە پـاڵ

[1] الملل و النحل للشهرستاني، سەرچاوەی پێشوو.

[2] شرح الأصول الخمسة ١٢٤-١٢٥.

[3] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٢٨.

[4] شرح الأصول الخمسة ٦٨٨-٦٩١ ومقالات الإسلاميين ٢/١٦٦.

[5] المعتزلة لعواد المعتق ٢١٧ نقلا عن منهاج السنة النبوية ١/٣١٥.

خوا، ئەمانە شتی پوچەڵن. پەیمان شکاندنیش کەم و کورتییە، پێویستە خوای گەورە لـەو شتانە بە پاك و دوور بگیرێت، ئەشعەرییەکان و ماتوریدییەکان کۆکن لەسەر ئەمە[1].

لە بارەی هەڕەشە (وعید) وتویانە: دروستە خوا لە گوناهکار خۆش ببێت، ئەنجامدەری گوناهە گەورەکان لە دۆزەخ بێنێتە دەرەوە، ئینجا هـیچ خواناسـێك بـۆ هەمیشـەیی لـە دۆزەخدا نامێنێتەوە[2].

بناغە لەمەدا ئەوەیە کە دروستە خوای گەورە لە هەڕەشەکەی پاشگەز بێتـەوە، بـەڵام دروست نیە لە پەیمانەکەی پاشگەز ببێتەوە[3]. جا لەلایەن ئەشعەرییەکان پاشـگەزبوونەوە لە هەڕەشـە (وعیـد)یش دروسـتە، چـونکە پاشـگەزبوونەوە لەمـەدا بـە کـەم و کـورتی دانانرێت، بەڵکو بە بەخششێك دادەنرێـت کـە دەبێتـە مایـەی سـوپاس کردنـی، شـاعیر ئاماژەی بەمە کردووە:

---

[1] شرح الجوهرة للباجوری ١٧١.

[2] المعتزلة لعواد المعتق ٢٣٣ نقلا عن منهاج السنة النبوية ٣٢٨/١.

لە: (العقیدة الطحاویة)دا هاتووە: (ئەوانەی لە ئوممەتی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) گوناهی گەورەیان کردووە بۆ هەمیشەیی لە ئاگری دۆزەخدا نامێننەوە، بەو مەرجەی لەسەر یەکتاناسی بمرن، ئەگەر تەوبەش نەکەن بەڵام خواناس بن. جا ئەمە لە ژێر ویست و حکمی خوادان، ئەگەر ویستی بە میهری خۆی لێیان خۆش دەبێت، هەروەك لە قورئانداباسی کردووە: ﴿وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ﴾ النساء: ٤٨ و ١١٦. ئەگەر ویستی لەسەر بێت بە دادگەری خۆی سزایان دەدات، دواتر بە ڕەحمەتی خۆی و تکای تکاکارە چاکەکان لە دۆزەخ دەریان دەهێنێت و دەیانخاتە بەهەشتەوە). (ئیبن ئەبولعیز) وەك شرۆڤەی ئەم وتەیەی (تەحاوی دەڵێت: ئەمە بەرپەرچی خەواریج و موعتەزیلەکانە، کە بۆچوونیان وایە ئەوانەی گوناهی گەورە دەکەن بۆ هەمیشەیی لە دۆزەخدا دەمێننەوە، بەڵام خەواریج تەکفیریشان دەکەن، موعتەزیلەش دەڵێن ئەوانە لە ئیمان دەرچوو وون و چوونەتە ناو کوفرەوە، بەڵکو پلەیەکیان هەیە لە نێوان ئەم دوو پلەیە...../ شرح العقیدة الطحاویة لابن أبي العز ٥٢٤.

[3] المعتزلة لعواد المعتق، سەرچاوەی پێشوو، نقلا عن تفسير الوسيط للواحدي لقوله تعالى:﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا ﴾ النساء: ٩٣.

وإني وإن أوعدته و وعدته     لمخلف إيعادي ومنجز موعدي[1]

واتە: هەرچەندە پەیمانی پێبدەم یاخود هەڕەشەی لێبکەم، ئەوا پەیمانەکەم دەگەیەنمەجێ و لە هەڕەشەکەم پاشگەز دەبمەوە.

بەڵام ماتوریدییەکان وتویانە ناکرێت لە هەڕەشە (وعید) پاشگەز ببێتەوە هەروەك چۆن نەدەکرا لە پەیمان (الوعد) پاشگەز ببێتەوە، بەم بۆچوونە ماتوریدییەکان کۆکن لەگەڵ موعتەزیلەکان[2].

بەم بەڵگانە:

١- خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴾ النساء: ٤٨. واتە: (بەڕاستی خوا خۆش نابێت ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیار بدرێت، بێجگە لەوە لە هەر گوناهێکی تر بیەوێت خۆش دەبێت).

ئەوانەی گوناهی گەورە دەکەن لە ژێر ویستی خوادان، ئەگەر بیەوێت لێیان خۆشدەبێت بە بەخشندەیی خۆی، ئەگەر بیەوێت بە دادگەری خۆی سزایان دەدات، دواتر لە ڕەحمەتی خۆی و تکای تکاکارە چاکەکان لە دۆزەخ دەریان دەهێنێت و دەیانخاتە بەهەشتەوە[3].

[1] شرح جوهرة التوحيد للباجوري ١٧١. و سەیری ئەمەش بکە: تمهيد الأوائل ٤٠١. ئەم دێرە شیعرە پێشتر لە بابەتی سەرهەڵدانی موعجیزەدا خرایەڕوو.

[2] شرح جوهرة التوحيد للباجوري ١٧٢. باجوری وتویەتی: لەسەر ڕاجیایی نێوان ئەشعەرییەکان و ماتوریدییەکان چەند شتێك بینا دەکرێت، بەپێی بۆچوونی ئەشعەرییەکان دروستە بڵێی: خوایەگیان لە گوناهی هەموو موسڵمانان خۆش بە. کەچی ئەم نزایە بەپێی ڕای ماتوریدییەکان دروست نییە. بۆیە بەدەر دەکەوێت کە ڕاجیایی نێوان ئەشعەریی و ماتوریدییەکان ڕاستەقینەیە ئەگەرچی هەندێك بڵێن تەنها ڕاجیاییەکە لە دەربڕین دایە./ شرح جوهرة للباجوري ١٧٢.

[3] المعتزلة لعواد المعتق ٢٣٤. ئاماژەی کردووە بۆ: شرح العقيدة الطحاوية.

۲- ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم): **(شفاعتي لأهل الكبائر من أمتي)**[1] واتە: تکاو شەفاعەتی من بۆ خەڵکانێکە لە ئوممەتی من کە گوناهی گەورەیان کردبێت.

## بنەمای چوارەم: پلەیەك لە نێوان دوو پلەکە، پلەی نێوان ئیمان و کوفر.

ئەم بابەتە پەیوەستە بە حوکمی ئەوەی کە گوناهی گەورەی کردبێت[2] و مردبێت بەبێ ئەوەی تەوبەی کردبێت، ئەمە ئەو بابەتەیە کە بەهۆیەوە (واصڵی کوڕی عەتاء) لە مەجلیسەکەی حسنی بصرِی جیابووەوە.

---

[1] المعتزلة لعواد المعتق ٢٣٨.

فەرموودەی: تکاو شەفاعەتی من بۆ خەڵکانێکە لە ئوممەتی من کە گوناهی گەورەیان کردبێت. رواه أحمد في مسنده وأبو داود والنسائي وابن حبان والحاكم في المستدرك، عن جابر. والطبراني في الكبير، عن ابن عباس. والخطيب في التأريخ، عن ابن عمرو عن كعب بن عجرة./ الجامع الصغير ٣٠١.

[2] گوناهی گەورە (الكبيرة): ئەو گوناهەیە کە بەهۆیەوە حەدو سنوور بەسەر بکەرەکەی جێبەجێ دەکرێت یان هەڕشە یاخود نەفرەت لە بکەرەکەی کراوە یان مایەی توڕەیی خوایە. و گوناهی بچوك (الصغيرة): ئەو گوناهەیە کە سنوور لێدەرکردنی بۆ دانەنراوە لە دونیادا، هەڕەشە لە بکەرەکەی نەکراوە لە دواڕۆژدا. / شرح العقيدة الطحاوية لابن أبي العز ٥٢٥. و سەیری ئەمەش بکە: البعد الحضاري ٥٤٣ لە (برادی) و جگە لەویشەوە.

تاقمە ئیسلامیەکان ڕاجیان لەبارەی دیاری کردنی گوناهە بچوك و گەورەکان، چەند بۆچوونێکیان لەم بارەوە هەیە کە ئەمانەن:

أ- هەموو گوناهێك بچوکە و زیان بە بکەرەکەی ناگەیەنێت، مادەم کەسەکە موسڵمانە. ئەمە بۆچوونی مورجیئەکانە.

ب- گوناهەکان هەموویان گەورەن، هەر گوناهێکی گەورەش کوفرە. ئەمە ڕای خەواریجەکانە.

پ- گوناهەکان هەموویان گەورەن، بەڵام بکەرەکەکە تەنها بەو گوناهانە تەکفیر دەکرێت کە کوفرن، وەك کورنووش بردن بۆ بت و فڕێدانی قورئانی پیرۆز بۆ ناو زبڵدان./ شرح الجوهرة للباجوري ٣١٨.

ئەمە ڕای ئەمانەیە: (ئەبو ئیسحاقی ئیسفەراینی و ئیمامی حەرەمەینە لە "الإرشاد" و ئیبن قوشەیریە لە "المرشد"دا). و (ئیبن فورك) ئەمەی لە ئەشعەرییەکان گێڕاوەتەوە و خۆیشی ئەم ڕایەی لە تەفسیرەکەیدا پەسەند کردووە.

ئەم بنەمایە پێی دەوترێت بابەتی: ناو و حوکمەکان (الأسماء والأحکام).
تاقمە ئیسلامییەکان لەمبارە چەند ڕایەکی جیاوازیان هەیە، کە ئەمانەن:
١- خەواریجەکان پێیان وایە کە ئەنجامدەری گوناهی گەورە کافرە.
٢- مورجیئەکان پێیان وایە باوەڕدارە. بەتێرو تەسەلی خرایەڕوو.
٣- حەسەنی بەصری بۆچوونی وایە کە نە باوەڕدارو نە کافرە بەڵکو دووڕووە. ئیبازییەکانیش بۆچوونێکی هاوشێوەی ئەمەیان هەیە.
٤- واصڵی کوڕی عەتاء و عەمروی کوڕی عوبەید، کە دوو شێخی موعتەزیلەن. بۆچوونیان وایە نە باوەڕدارو نە کافرو نە دووڕووە، بەڵکو لاسارە لە پلەیەکدایە لە نێوان دوو پلەکە کە: کوفرو ئیمانە[1]. بەڵام دروستە ناوی موسڵمان یان باوەڕدار بۆ

---

بە هەندێك لەو گوناهانە دەوترێت گەورەو بچوك ئەمە بە بەراورد لەگەڵ ئەو گوناهەی کە لەو گەورەترە.
ناوبراوان پێیان ناپەسەند بوو کە گوناه و سەرپێچی کردنی خوا بە گوناهی بچوك ناوبرێت، لە میانەی شکودار ڕاگرتنی گەورەیی و شکۆمەندی خوا، چونکە ئەم گوناهانە گەورەن لە ئاست لەبەرچاوگرتنی گەورەیی خوا. / مقدمة الزواجر عن إقتراف الكبائر لابن حجر الهيتمي. ونقل عنه السالمي في مشارق أنوار العقول ٢/٢٦٦. و سەیری ئەمەش بکە: لوامع الأنوار البهية ١/٣٦٥.
ت- گوناه دوو جۆرن: بچوك و گەورە. ئەمە وتەی زۆربەی ئەهلی سوننەیە بە بەڵگەی کۆمەڵێکی زۆری ئایەتە پیرۆزەکان و سوننەتی بەپێز./ شرح الجوهرة للباجوري ٣١٨. و سەیری کتێبەکەشمان بکە: الشورى بين النظرية والتطبيق ١١٤.
دەکرێت گوناهی بچوك حوکمی گوناهی گەورە بەدەستەوەبدات ئەگەر بکەرەکە بەردەوام بێت لەسەر کردنی، گوناهی بچوك نابێتە گوناهی گەورە بەڵام دەکرێت حوکمی گوناهی گەورە وەربگرێت، هەروەك (ئیبن حەجەری هەیتەمی) لە (شرح الأربعين النووية) ئەمەی وتوە. ئەگەرچی لە دەربڕینی هەندێکیاندا وا هاتووە کە گوناهی بچوك بە زۆر بەردەوام بوون لەسەری دەبێتە گەورە./ شرح الجوهرة للباجوري ٣١٨ ولوامع الأنوار البهية ١/٣٦٦.

[1] شرح الأصول الخمسة ١٣٧-١٣٨. و سەیری ئەمەش بکە: التنبيه والرد ٣٦-٣٧ والفرق بين الفرق ١١٧ والفصل لإبن حزم ٤/٧٩ وتبصرة الأدلة ٢/٧٦٦ بەتێرو تەسەلی ڕاوبۆچوون و بەڵگەکانی تاقمەکانی تێدایە. و دراسات في الفرق ١١٤.

ئەو کەسە بەکاربێت بۆ جیاکردنەوەی لە ناموسڵمانان، بەڵام ئەو بەکارهێنانە نە ستایش و نە سەرزەنشتە[1]. و ئەم بۆچوونەی موعتەزیلە مەزهەبی زەیدیەکانە[2].

٥- ئەشعەرییەکان و ماتوریدییەکان ڕایان وایە کە ئەنجامدەری گوناهی گەورە باوەڕدارەو گوناهە گەورەکە نایخاتە دەرەوەی بازنەی ئیسلام، جا ئەو کەسە لە ژێر ویستی خوادایە ئەگەر بیەوێت لێی خۆش دەبێت و دەیخاتە بەهەشتەوە، ئەگەر بشیەوێت سزای دەدات بەهۆی تاوانەکەی و دواتر دەیخاتە بەهەشتەوە[3].

ڕای ئیمامیەکانیش هەمان ڕای ئەشعەرییەکانە[4].

---

بۆچوونی ئیبازییەکان نزیکە لە بۆچوونەکەی حەسەنی بەصری، جا لە: (شرح عقيدة التوحيد لأطفش ١٩٦)دا هاتووە: (بزانە کە ئەوەی ئەنجامدەری گوناهی گەورەیە لەلای ئێمەی "ئیبازی وەهبی" ئەو کەسە کوفری دووڕوویی و لاساری و نیعمەت و کرداری کردووە. ئەمانە هەموویان یەك واتاو مەبەست دەگەیەنن. ئەمە مەزهەبی حسنی بەصریشە، بە ئەنجامدەری گوناهی گەورە ناوترێت باوەڕدار یان موسڵمان، چونکە دەکرێت ئیماندار یاخود باوەڕداری بۆ بەکاربێت هەر بەیەك مانا).

[1] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٢٨ نقلا عن ابن أبي الحديد المعتزلي.

[2] المعالم الدينية ١١٩.

[3] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٧٠ و ١٨٨ والتوحيد للماتريدي ٤٥ و ٣٣٥ وتبصرة الأدلة ٧٦٦/٢. بەتێرو تەسەلی ڕاکانی ئەمانە دەخرێتەڕوو لەکاتی باس کردنیان.

[4] توسی لە: (تجريد الإعتقاد) وتویەتی: (کەسی لاسارو گوناهبار "فاسق" باوەڕدارە چونکە پێناسەی باوەڕداریی لەخۆیدایە)، و حیللی لە: (كشف المراد ٤٥٤)دا بەم شێوەیە شرۆڤەی کردووە: خەڵکی لەم بابەتەدا ڕاجیا بوون، موعتەزیلەکان وتیان: کەسی لاسار نە باوەڕدارو نە کافرە، بەڵکو لە پلەیەکدایە لەنێوان ئەم دوو پلەیەدا. و حەسەنی بەصری وتویەتی: دووڕووە. زیدییەکان وتویانە: کافرە، چونکە کوفری نیعمەتی کردووە. خەواریج وتویانە: کافرە. ڕاستی ئەوەیە کە دانەر -واتە: توسی - بۆی چووە کە ئەمە مەزهەبی ئیمامی و مورجیئە و فەرموودەناس و هەندێك لە ئەشعەرییەکانە، کە پێیان وایە باوەڕدارە. بەڵگەش لەسەر ئەمە: ئەوەیە کە پێناسەی باوەڕدار بریتییە لەوەی بە دڵ دانی پێدادەنێت و بەزمان دەری دەبڕێت کە ڕازییە بە هەموو ئەو شتانەی کە پێغەمبەر هێناویەتی، کەواتە ئیمانەکە لە ناخیدا هەیە بۆیە باوەڕدارە.

ڕای موعتەزیلە لەبارەی ئەنجامدەری گوناهی گەورە ئەوەیە کە:

أ- باوەڕدار نییە، چونکە باوەڕدار ئەو کەسەیە کە تایبەتمەندی چاك و خێری تێدا کۆبووەتەوە، باوەڕدار ناوێکە بۆ ستایشکردن.

ب- دووڕوو نییە، چونکە دووڕوو خەسڵەتە باشەکانی تێدا نییە، شیاوی ناوی ستایشکراو نییە، بۆیە بە باوەڕدار ناونانرێت.

پ- بێ باوەڕو کافرێکی ڕەها نییە، چونکە شایەتمان و گشت کردارە چاکەکانی بوونیان هەیە لە کەسەکەدا، کە بەهیچ ڕووێك ناکرێت نکۆڵی لێبکرێت.

جا ئەگەر گوناهێکی گەورەی کردبێت و بەبێ تەوبەکردن بمرێت، ئەوا لە دۆزەخییەکانە و هەمیشە تیایدا دەمێنێتەوە، چونکە تەنها دوو دەستە لە دوارۆژدا هەن: ﴿فَرِيقٌ فِي ٱلۡجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِي ٱلسَّعِيرِ﴾ الشوری: ٧. واتە: (دەستەیەکیان بۆ بەهەشت بەرێ دەکرێن و دەچنە ناویە، دەستەکەی تریان بۆ ناو دۆزەخ ڕاپێچ دەکرێن). بەڵام خوای گەورە سزا لە سەر ئەوانە سوك دەکات، جێگەی ئەمانە بڵندتر دەبێت لە کافر[1].

ئەنجامدەری گوناهی گەورە لە پلەیەك دایە لە نێوان کوفرو ئیمان وەك ناو، ئەگەرچی سزای وەك کافرەکانە کە بۆ هەمیشەیی لە ئاگری دۆزەخدا دەبێت[2].

دەکرێت لە پاڵ ئەم بۆچوونەدا چەند مەرامێکی سیاسی بوونی هەبێت:

جا خەواریج عەلی و موعاویەیان تەکفیر کرد، لەگەڵ هاوەڵەکانیان کەبە دادوەریەکە ڕازی بوون، ئەوان دانیان بە خەلافەتی عەلی و موعاویەدا نەنا بەڵکو لە دژی جەنگان.

---

[1] الملل والنحل للشهرستاني ١/٤٢. دووڕووی بە لاسار ناوناوە، لە چەسپاندنی ناوی دووڕوو هاوڕایە لەگەڵ (قازی عەبدولجەبار) کە کەمێك پێش ئیستا خرایەڕوو. موعتەزیلەکان گوناهەکانیان دابەش کردووە بۆ دوو جۆر گەورەو بچوك، مافی مانەوەی هەمیشەیی لە ئاگری دۆزەخدا بۆ ئەنجامدەرانی گوناهە گەورەکان، بە پێچەوانەی خەواریجەکان کە هەر هەموو گوناهێك لەلای ئەوان گەورەیە و ئەنجامدەری گوناهی گەورە لەلای ئەوان شیاوی سزادرانە بە ئاگری دۆزەخ بۆ هەتا هەتایی. / الإرشاد للجويني ٣٨٩.

[2] المختار من كنوز السنة النبوية ٧٥.

مورجیئەش پێیان وایە هەموو گوناهکارێك باوەڕدارە، بۆیە دژی دەسەڵات نەبوون و یاخی نەبوون و ڕقیان لێ نەبوو.

بەڵام موعتەزیلەکان مامناوەند بوون لە نێوان خەواریج و مورجیئەکان، بەوەی پشتی هیچ یەکێك لە مانەیان نەگرت نە عوسمان نە بکوژەکانی، عەلی یاخود عائیشە لە جەنگی (جمل)، عەلی یان موعاویە لە جەنگی (صەففین)دا، دواتر ڕاجیابوون لەوەی کامەیان لاسارە[1].

موعتەزیلەکان وتویانە: ئەوەی ڕای جیایە لە بنەمای پلەیەك لە نێوان دوو پلەکە:

ئەگەر وتی: حوکمی ئەنجامدەری گوناهە گەورەکان هەمان حوکمی بتپەرستەکانە، ئەوا کوفری کردووە، چونکە پێچەوانەی ئاینی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) ڕەفتاری نواندووە.

ئەگەر وتی: حوکمی ئەو وەك حوکمی باوەڕدارانە لە گەورە کردن و خۆشویستنی لە پێناوی خوادا، ئەو کەسە لاسارە، چونکە نکۆڵی لە شتێك کرووە کە زانینی لە ئایندا پێویستە.

ئەگەر وتی: حوکمەکەی ئەو نە حوکمی باوەڕدارانە و نە حوکمی کافرەکانە. بەڵکو ناوی دەنێین باوەڕدار، ئەوا بەمەش هەڵەکارە[2].

## بنەمای پێنجەم: فەرمان بەچاکە و ڕێگریی لە خراپە.

فەرمان: بریتییە لەوەی یەکێك بە کەسێکی لە خۆی پلە نزمتر بڵێت: بکە.

ڕێگری: بریتییە لەوەی یەکێك بە کەسێکی لە خۆی پلە نزمتر بڵێت: مەکە.

چاکە: هەر کردەوەیەکە کە بکەرەکەی بزانێت چاکە یان ئاماژەی بۆ چاکیەکەی کرا.

خراپە: هەر کردارێکە کە بکەرەکەی بزانێت خراپە یاخود ئاماژە بۆ خراپیەکەی کرا[3].

---

[1] فجر الإسلام ٢٩١ ولاپەڕەکانی دواتری.

[2] شرح الاصول الخمسة ١٢٦.

[3] شرح الاصول الخمسة ١٤١.

مەبەست لە فەرمان کردن بەچاکە بریتییە لە شوێنکەوتن و کردنی چاکە و مەبەست لە ڕێگری کردن لە خراپە بریتییە لە لابردنی خراپە. جا ئەگەر مەبەستەکە هاتەجێ بە شتێکی ئاسان، ئەوا نابێت پەنا ببردرێتە بەر شتێکی سەخت، ئەمە شتێکە لە ڕووی شەرع و عەقڵەوە زانراوە[1].

هەموو موعتەزیلەکان بێجگە لە (ئەصەم) کۆکن لەسەر پێویست بوونی فەرمان کردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە، ئەمەش لەگەڵ بوونی توانا بە زمان و دەست و شمشێر، چۆن بۆیان کرا مەبەستەکە بپێکن[2].

هیچ ڕاجیاییەك نییە لە ناو ئوممەتدا لەسەر پێویست بوونی فەرمان کردن بەچاکە و ڕێگری کردن لە خراپە. بەم بەڵگانە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ﴾ آل عمران: ١١٠. واتە: ("بەڕاستی" ئێوە چاکترین ئوممەتێکن کە "بۆ سوودی" خەڵکی هێنراونەتە مەیدانەوە، چونکە فەرمان بەچاکە دەکەن و قەدەغەی خراپە دەکەن).

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: **(ليس لعين ترى الله يُعصى فتطرف حتى تغير أو تنتقل)** واتە: بۆ چاوێك نییە خوا ببینێت لەکاتێك کە تاوان دەکرێت ئەو خۆی لێ لابدات تا خراپەکە دەگۆڕێت یان لادەچێت.

جا یەکدەنگی لەسەر ئەمە دامەزراوە[1].

---

[1] شرح الاصول الخمسة ١٤٤ و دوای ئەمە وتویەتی: (لە ڕووی عەقڵییەوە، ئەگەر یەکێکمان توانی مەبەستەکە بێنێتەجێ بە هۆکارێکی ئاسان ئەوا دروست نییە پەنا بباتە بەر هۆکارێکی سەخت، لە ڕووی شەرعیشەوە ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە بەڵگەیە: ﴿وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَىٰ فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي﴾ الحجرات: ٩. خوای گەورە سەرەتا فەرمانی بە ئاشتەوایی کردووە لە نێوان دوو کۆمەڵەکە، دواتر فەرمانی بە شتەکانی تر کردووە پلە بە پلە تا دەگاتە جەنگ لەگەڵ کردنی). و بڕوانە: ٧٤١.

[2] مقالات الإسلاميين ١/٣٣٧.

موعتەزیلە و ئەهلی سوننە کۆکن لەسەر ئەوەی کە فەرمان کردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە فەرزی (کیفایەیە[٢])[٣].

بەڵام ڕاجیایی هەیە لە نێوان موعتەزیلەکان لەوەی ئایا پێویست بوونی فەرمان کردن بەچاکە و ڕێگری کردن لە خراپە بە عەقڵە یاخود بە نەقڵ، لەمبارەیەوە دوو بۆچوونیان هەن:

١- بە عەقڵ و بە نەقڵ دەزانرێت کە پێویستە، ئەمە بۆچوونی (أبو علی)ە.

٢- بە نەقڵ دەزانرێت تەنها لە یەك حاڵەتدا نەبێت، کە ئەویش ئەوەیە یەکێك ببینیت ستەم لەوەی تر دەکات، دڵت بەمە تەنگ دەبێت، بۆیە پێویستە لەسەرت ڕێگری لە ستەمەکە بکەی، بۆ ئەوەی ئەو زیانە لە کەسەکە دوور بخەیتەوە، ئەمە بۆچوونی (أبو هاشم)ە، و ڕای ڕاستی مەزهەبەکەیە[٤].

ئامانجی موعتەزیلەکان لەم بنەمایە بریتییە لە جێبەجێ کردنی کرداری ڕێسا و بنەماکانی دادگەری و ئازادی لە ڕەفتاری کۆمەڵایەتیدا، دادگەری لەلای ئەوان تەنها لە لادانی ستەم و ئازار لەسەر تاك کورت هەڵنایەت، بەڵکو بریتیە لە کرداری کۆمەڵی لە پێناو فەراهەم هێنانی کەشێکی پڕ لە یەکسانی و هەماهەنگی کۆمەڵایەتی، چونکە

---

[١] شرح الأصول الخمسة ١٤٢ و ٧٤١. و سەیری ئەمەش بکە: التنبیه والرد ٣٧.
قازی عەبدولجەبار وتویەتی: (بەڵام ئەوەی هەر لە بنەڕەتدا پێچەوانەی فەرمان کردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە ڕەفتاری کردووە، بڵێت: خوای گەورە هەر لە بنەڕەتدا ئێمەی ڕانەسپاردووە بە فەرمان کردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە، ئەوا ئەو کەسە بێ باوەڕە، چونکە ئەو کەسە شتێکی ڕەت کردۆتەوە کە بەپێویست زانراوە لە ئایینی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) و ئومەتەدا، ئەگەر بڵێت: ئێمە ئەرکدار کراوین بەوەی فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە بکەین بەڵام مەرجدارە بەوەی دەبێت ئیمام ئامادەبێت و هەبێت - کە ئیمامیەکانن - ئەوە هەڵەی کردووە)./ شرح الأصول الخمسة ١٢٦ و ١٢٤ و ٧٤١.

[٢] واتە: ئەگەر هەندێك پێی هەڵبستن و جێبەجێی بکەن ئەوا ئەرکەکە لە سەر هەمووان لا دەکەوێت. (وەرگێڕ).

[٣] المعتزلة لعواد المعتق ٢٧٠ نقلا عن ابن تیمیة

[٤] شرح الأصول الخمسة ١٤٢ و ٧٤٢.

ئەگەر کەشێکی وا هاتە کایە ئەوا فرسەت بۆ هەر تاکێـك فەراهـەم دەبێـت کـە هـەموو تواناکانی بەگەڕ بخات و ئامانجەکانی دەستەبەر بکات[1].

بـەهۆی ئـەم بنەمایـە موعتەزیلـەکان بەرپەرچـی خوانـەناس و بـێ بەنـدوبارو بـێ ئایینەکانیان دایەوە، بـەرگریان لـە ئیسـلام کـرد، بـە جۆرەهـا بەڵگـە، مێزگـەردەکان و کتێبەکانیان لەبارەی یەکخواناسیی و پێغەمبەرایەتی و ئیعجازی قورئان باشترین بەڵگـەن لەسەر ئەمە[2].

هەموو هۆکارو ئامرازە فیکرییەکانیان بـەکارهێنا بـۆ ڕووبـەڕوو بوونـەوەی دژەکـانی ئیسلام.

خێراتین تاقمی ئیسلامی بوو کـە فەلسـەفەی یۆنـانی لـە خـۆ گـرت و بـە ڕەنگێکـی ئیسلامی ڕەنگداری کرد، یەکەم کەس بوون لە موسڵمانان کە بە چەکی دوژمنەکانیان لـە خاوەن ئایین و فیکرە فەلسەفیەکانی تر خۆیان پڕ چەك کرد، دەمەتەقێیەکی زانسـتیانەیان لەگەڵ دژەکانیان دەکرد، هێرشی ئەوانەیان بەرپەرچ دایەوە کە خاوەن فیکـرەی جەبرییـەت بوون و نکۆڵیان لە بوونی خوا دەکرد، وەڵامی ئەو گومانانەشـیان دایـەوە کـە جولەکـە و نەصرانی و ئاگرپەستەکان وروژاندیان[3].

بەڵام زۆرێك ڕقیان لە موعتەزیلەکان دەبووەوە، لەبەر چەند هۆکارێك وەك:

١- زۆربەی ڕاکانیان پێچەوانەی ڕای فەرموودەناسان بوو، بۆیە فەرمـوودەناسان هێرشی زۆر توندیان دەکردە سەر ئەوان.

٢- بیروباوەڕی ئاسانی ئیسلامییان ئاراستە کرد بەرەو بیروباوەڕێکی فەلسەفی قووڵ.

٣- لەو ڕۆژگارەی کە دەسەڵاتیان هـەبوو لـە سـەردەمی (مـەئمون و موعتەصـیم)دا تەنها مێزگەردو گفتوگۆیان نەدەکرد، بـەڵکو گـرتن و ڕاوەدوونـانی زانایانیـان بـە

---

[1] دراسات في الفرق ١١٦ نقلا عن كوربان.

[2] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٢٩.

[3] فجر الإسلام ٢٩٩-٣٠٠.

ڕێگەیەك بۆ خۆ دانا، هەروەك ئەمە ڕوویدا لەگەڵ ئیمامی ئەحمەدی كوڕی حەنبەل و هەندێك پێشەوای تریش لەبارەی بابەتی (بەدیهێنراوی قورئان)، ئەمەش هۆكارێك بوو بۆ لاچوون و لەناوچوونی دەسەڵاتیان[١].

## پێڕو دەستەكانی موعتەزیلە:

موعتەزیلە دابەش بووە بۆ بیست پێڕو دەستە، بەم پێیەی ئەمانە باسیان كردووە: مەلَتی[٢]، بەغدادی[٣]، ئیسفەرایینی[٤]، ئیجی[٥]، كرمانی[٦]، مەقریزی[٧]، سەففارینی[٨].

ڕازی باسی كردووە كە حەڤدە پێڕو دەستەن[٩].

شەهرستانی دوازدە پێڕی لێ ژماردوون[١٠]، مەقدسی پازدە تاقمی لەوان ژماردووە[١١]، خوارزمی[١٢] و شێخ عەبدولقادر وتویانە: شەش پێڕن[١٣].

یەكێك لەوانەی لەبارەی چین و توێژەكانی موعتەزیلەی نووسیوە، (ئیبن مورتەزا)ە لە كتێبەكەیدا (المنية والأمل في شرح الملل و النحل).

ناودارترین دەستەو پێڕەكانی موعتەزیلە:

---

(١) فجر الإسلام ٣٠١.
(٢) التنبيه والرد ٣٦.
(٣) الفرق بين الفرق ١١٤
(٤) التبصير في الدين ٥٧.
(٥) المواقف ٣٧٨/٨.
(٦) الفرق الإسلامية للكرماني ٧.
(٧) خطط المقريزي ٣٤٥/٢.
(٨) لوامع الأنوار البهية ٧٦/١.
(٩) إعتقادات فرق المسلمين ٣٠.
(١٠) الملل والنحل للشهرستاني ٤٠/١-٧٢.
(١١) البدء والتاريخ ١٤٢/٥.
(١٢) مفاتيح العلوم ١٨.
(١٣) الغنية للشيخ عبدالقادر ١٠٤/١.

واصڵیەکان: بریتین لە شوێنکەوتووانی (واصلی کوڕی عـەتائی غـەزال کـە سـاڵی ١٣١ك کۆچی دوایی کردووە، قوتابی باوکی هاشمی کوڕی موحەممەدی کوڕ حەنەفیە بـووە. موعتەزیلایـەتی نـاوبراو لەسـەر چـوار ڕێسـا و بناغـە دامـەزراوە: بڕیـار نـەدان وڕەتکردنەوەی سیفەت، داننان بە بیرۆکەی قەدەر، هەروەها دانی نا بە پلەیـەك لـە نێوان دوو پلەکە، چونە ناو ئاگری دۆزەخ بۆ هەتا هەتا بۆ ئەو کەسانەی بڕیاردا کـە گوناهی گەورەیان کردبێت[1].

عەمرییەکان: بریتین لە هاوەڵانی عەمری کوڕی عوبەید[2]، کە ساڵی ١٤٢ك کۆچی دوایی کردووە.

---

[1] خطط المقريزي ، سەرچاوەی پێشوو. و بڕوانە: الفرق بين الفرق، والملل والنحل للشهرستاني، والتبصير في الدين، والمواقف، والفرق الإسلامية للكرماني، سەرچاوەکانی پێشوو.
داننان بە بە قەدەر واتە: کردەوەی بەندەکان بدرێتە پاڵ قەدەرەکانیان./ شرح المواقف للسيد الشريف،سەرچاوەکانی پێشوو، پێشتر خرایەڕوو

[2] عەمری کوڕی عوبەیدی کوڕی باب، خزمەتکاری خانەوادەی تەمیم، نیشتەجێی بەصرە بوو، زاهید و دونیا بەکەمزان و خواپەرست بوو، باپیرەی لە دیلەکانی (کابول) بوو. (ئیسحاقی کوڕی سوەیدی عەدوی) شاعیر خۆی بەری کردووە لە عمرو و هاوەڵەکەی (واصلی کوڕی عەتائی غزال) و لە خەواریجەکان و زیادەڕۆچووە شیعەکان، هەروەك دەڵێت:

برئت من الخوارج لسـت منهـم ... ومن الغزال وابن باب
ومن قـوم إذا ذكـروا عليـاً ... يردون السلام على السحاب

واتە: من بەریم لە خەواریج و (واصلی کوڕ عطائی غزال) و (عمروی کوڕی عبیدی کوڕی باب) و لەو کەسانەش کە باسی عەلیان لەلا دەکرێت سڵاوی هەورەکان وەردەگرنەوە (واتە کە باسی عەلیا لەلا دەکرێت ڕوویان وەردەگێڕن و خۆیان سەرقاڵ دەکەن. خوا زاناترە - وەرگێڕ).
سەیری ئەمە بکە: الفرق بين الفرق ١١٩-١٢٠ و پەراوێزی ٢٠. و لێکۆڵەری کتێبەکە باسی ئەوەی کردووە کە (مبرد) ئەو دوو دێرە شیعرەی سەرەوەی گێڕاوەتەوەو دواتریش ئەم دوو دێرە شیعرەی بە دوادا هێناوە:

ولكني أحب بكل قلبـي ... وأعلم أن ذاك من الصواب
رسول الله والصديق حباً ... به أرجو غداً حسن الثواب

هوزەیلیەكان: بریتین لە شـوێنكەوتووانی بـاوكی هوزەیـل موحەممـەدی كـوڕی هـوەزەیلی عەلاف، كە ساڵی ٢٣٥ك كۆچی دوایی كردووە.

نیزامیەكان: بریتین لە شـوێنكەوتووانی (ئیبراهیمـی كـوڕی سـەیاری نـەزام)، كـە سـاڵی ٢٣١ك كۆچی دوایی كردووە.

بیشریەكان: بریتین لە شوێنكەوتووانی بیشـری كـوڕی موعتەمـەر، سـاڵی ٢١٠ك كۆچـی دوایی كردووە.

جاحیزیەكان: بریتین لە شوێنكەوتووانی (ئەبو عوسمانی عەمری كوڕی بەجری جـاحز)، كـە ساڵی ٣٠٣ك كۆچی دوایی كردووە.

جوبائیەكان: بریتین لە شوێنكەوتووانی (ئـەبو عـەلی موحەممـەدی كـوڕی عەبـدولوەهابی جوبائی)، ساڵی ٣٠٣ك كۆچی دوایی كردووە.

بەهشەمیەكان: بریتین لـە شـوێنكەوتووانی (ئـەبو هـاشمی عەبدوسـەلامی كـوڕی عـەلی موحەممەدی جوبائی) كە ساڵی ٣٢١ك كۆچی دوایی كردووە.

هەر یەك لەم پێڕانە و ئەوانەی تریش چەند بۆچوونێكیان هەن، جیاواز لەوەی تر.

## ئـــەشعـــەرییـــــەكان

### شێخی مەزهەبەكە:

ئەشـعەرییەكان بـریتین لـە شـوێنكەوتوانی ئـەبو حەسـەنی ئەشـعەری عـەلی كـوڕی ئیسماعیلی كوڕی ئەبو بیشری ئیسحاق، بۆیە ناونراوە ئەشعەری، چـونكە ڕەچـەڵەكەكەی دەگەڕێتەوە سەر هاوەڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەبو موسى الاشعرى (ڕەزای خوای لێبێت) [1].

واتە: بەڵام من پڕ بەدڵ پێغەمبەر و أبوبكری صدیقم خۆشدەوێت و دەشزانم هەر ئەمەیە ڕاستی، هیوام وایە بەو خۆشویستنە پاداشتێكی چاك دەست بخەم.

بڕوانە: ژیاننامەی عەمری كوڕی عوبەید لە: تهذیب الكمال للمزي ٥/٤٣٦.

(١) ڕەچەڵەكی ئیمامی ئەشعەری لەم سەرچاوانە باس كراوە: تأریخ بغداد ١١/٣٤٦ و تبیین كذب المفتري ٣٤ عن الخطیب و غیره ١٠٢، والأنساب للسمعاني ١/٢٧٣.

ساڵی ٢٦٠ك لە شاری بەصرە لە دایك بووە[1]. لە شاری بەغداد نیشتەجێ بووە تا کۆچی دوایی کردنی لە ساڵی ٣٢٤ك[2].

و بڕوانە: الفهرست لإبن نديم ٢٥٧ والمنتظم لابن الجوزي ٢٩/١٤ واللباب لإبن الأثير ٦٤/١ والكامل ٣٩٢/٨ و وفيات الأعيان ٢٨٤/٣ وسير أعلام النبلاء ٨٥/١٥ والعبر ٢٣/٢ وطبقات الشافعية الكبرى للسبكي ٣٤٧/٣ و الجواهر المظية ٥٤٤/٢ و ٣٣/٤ وخطط المقريزي ٣٥٩/٢ و شذرات الذهب ٣٠٣/٢ وإتحاف السادة ٣/٢.

[1] تأريخ بغداد عن بعض البصريين، والأنساب للسمعاني، ونقله ابن عساكر في تبيين كذب المفتري ١٤٦ عن الوزان، وابن عساكر وتویەتی نازانم لەبارەی کاتی لە دایك بوونی ڕاجیایی هەبێت، و ابن الجوزي عن الوزان، وابن الأثير في الكامل، وابن خلكان في وفيات الاعيان، والذهبي في السير، والسبكي في طبقات الشافعية الكبرى، سەرچاوەکانی پێشوو، ونقله ابن كثير في البداية والنهاية ١٨٧/١١ و نقل في ٢٠٤ عن ابن الأثير، و نقل في ٢٠٦ عن ابن الجوزي، ونقله القرشي في الجواهر المضية ٥٤٥/٢ والزبيدي في إتحاف السادة، سەرچاوەکانی پێشوو، وتویەتی: ئەمە بەناوبانگترینیانە.

وتراوە لە ساڵی ٢٧٠ك لە دایك بووە./ اللباب لإبن الأثير، ووفيات الأعيان و سير أعلام النبلاء، سەرچاوەکانی پێشوو. والبداية والنهاية ١٨٧/١١ والجواهر المضية، وخطط المقريزي و إتحاف السادة، سەرچاوەکانی پێشوو.

لە کتێبی: (خطط المقريزي)دا هاتووە: ٦٦٦ك، ئەمە دەستکاری کردنێکی دیارە.

[2] تأريخ بغداد عن ابن حزم.

- ئەم سەرچاوانە ساڵی کۆچی دوایی کردنی ئەویان هێناوە: تبيين الكذب المفتري ٥٦ عن ابن حزم و ابن فورك، ورآه الأصح، و ١٤٧ عن الخطيب و ابن فورك و غيرهما. وذكر النسفي في تبصرة الأدلة ٣٦٠/١ وابن خلكان في وفيات الأعيان، والذهبي في العبر عن ابن حزم، وسير أعلام النبلاء، سەرچاوەکانی پێشوو، وهو الأقرب عند السبكي في الطبقات الشافعية الكبرى ٣٥٢/٣. و نقل تصحيح ابن عساكر له و ذكر ابن فورك. و ذكر ابن كثير في البداية والنهاية ١٨٧/١١ و صححه في ٢٠٤، والقرشي في الجواهر المضية ٥٤٥/٢ و نقل في ٣٤/٤ عن أبي المعين النسفي في تبصرة الأدلة. والمقريزي في الخطط، و نقله ابن عماد في شذرات الذهب عن ابن حزم، والزبيدي في إتحاف السادة ٣/٢ عن الخطيب، و في ٥ تأريخ وفاته عن ابن فورك والحافظ أبي يعقوب إسحاق بن إبراهيم القراب و أبي محمد بن حزم، وذكر تصحيح ابن عساكر له، وذكر أيضا أنه الأشهر.

مێژوونووسان چەند ڕایەکیان هێناوە لەبارەی کاتی کۆچی دوایی کردنی:

## هەندێك لە شێخەکانی:

ئەبو ئیسحاقی مەروەزی، کە شەرعناسێکی شافیعیە، لە ڕۆژانی هەینی لە بازنەکەیدا لە مزگەوتی مەنصور لە بەغداد دادەنیشت[1] و ئیبن سەریجی شـافعی[2] و ئـەبو خەلیفـەی جەمحی[3] و زەکریای کوڕی یەحیای ساجی، فەرموودەی لە ناوبراوەوە وەرگرتووە[1]، سەهلی

- سالّی ٣٣٠ك./ السمعاني في الأنساب، وابن الأثير في الكامل ٣٩٢/٨ والذهبـي في العبر ٢٣/٢ وابن كثير في البداية والنهاية ١٨٧/١١ و نقل في ٢٠٤ عن ابن الأثير و ابن خلكان و ابن عماد الدين و الزبيدي، سەرچاوەکانی پێشوو.
- سالّی ٣٣١ك./ ابن الجوزي في المنتظم ٢٩/١٤ و ابن الكثير في البداية والنهاية ٣٠٦/١١ عن المنتظم.
- سالّی سێ سەدو سی و نیو./ الخطيب في تأريخ بغداد عن بعض البصريين، والسمعاني، وابن عساكر في تبيين الكذب المفتري ٥٦ و وتویەتی: پێم وانیە ڕاست بێت. ونقله عن الوزان في ١٤٦، وابن الجوزي عن الأهوازي، وابن الأثير في اللباب والسبكي في طبقات الشافعية الكبرى ٣٥٢/٣، وابن خلكان و القرشي في الجواهر المضية ٥٤٥/٢ ونقل في ٣٤/٤ عن السمعاني والزبيدي، سەرچاوەی پێشوو.
- دوای سالّی سی./ الذهبـي في العبر، وابن عماد في شذرات الذهب.
- سی و شتێك./ ابن كثير في النهاية والبداية ١٨٧/١١ والمقريزي في الخطط.
- سی و سێ./ ابن خلكان عن ابن عساكر في التبيين عن بعض البصريين و صححه ابن عساكر، وقال الذهبـي في السير ٩٠: تا سالّی سێ سەد و سی و سێ مایەوە.
- لە نێوان سالّی سێ سەد و بیست و سی./ الخطيب في تأريخ بغداد ٣٤٧ وابن عساكر في تبيين كذب المفتري ٥٦ و ١٤٧ عن الخطيب و صححه السبكي في الطبقات الشافعية الكبرى ٣٥٢/٣.
- سالّی ٣٢٠ك./ القرشي في الجوهرة المضية ٣٤/٤ نقلا عن السمعاني. وهو مخالف لما ورد في الأنساب للسمعاني المطبوع، والزبيدي، سەرچاوەی پێشوو.
- دوای سالّی ٣٢٠ك./ السمعاني في الأنساب، و ابن الأثير في اللباب، هەردوو سەرچاوەکەی پێشوو.

[1] تأريخ بغداد ٣٤٧/١١ والأنساب للسمعاني ٢٧٤/١ واللباب لإبن الأثير ٦٤/١ و وفيات الأعيان ٢٨٤/٣ و طبقات الشافعية الكبرى للسبكي ٣٦٧/٣ والبداية والنهاية ١٨٧/١١ عن ابن خلكان، وخطط المقريزي ٣٥٩/٢ عن الخطيب، وإتحاف السادة ٣/٢-٤.

[2] البداية والنهاية، سەرچاوەی پێشوو.

[3] سير أعلام النبلاء ٨٦/١٥، سەرچاوەی پێشوو.

كوڕی نوح[2]، موحەممەدی كوڕی یەعقوبی موقریئ[3]، عەبدوڕەحمانی كوڕی خەلەفی زوبی میسری[4]. لە تەفسیرەكەیدا زۆر شتی گێڕاوەتەوە لە عەبدوڕەحمان[5].

ئەمانە هەندێكی ترن لە شێخەكانی: (ئەبو عەلی جوبائی موحەممەدی كوڕی عەبدولوەهابی كوڕی سەلام)، كە ساڵی ٣٠٣كماڵئاوایی كردووە، شێخی موعتەزیلەكان بووە، دایكی خۆی لێ مارەكرد، ئەشعەریی زانستی دەمەتەقێ و تێڕامان (الجدل والنظر) لە جوبائی وەرگرت، بەمەش بووە یەكێك لە پێشەواكانی موعتەزیلەكان[6].

حوسەینی كوڕی موحەممەد عەسكەری وتویەتی: ئەشعەری قوتابی جبائی بوو، جا ئەشعەریی خاوەن تێڕوانینێكی قووڵ بوو و لە گۆڕەپاندا دژەڕاكانی دەبەزاند و تێكدەشكاند، جبائیش بە توانا بوو لە دانان و نووسین، خاوەن پێنووس و قەڵەمێكی بەهێز بوو، بەڵام جوبائی لە گفتوگۆ و دەمەتەقێ دا بەهێز نەبوو، جا ئەگەر مێزگەرد و دەمەتەقێیەك پێش هاتبا، ئەوا جوبائی بە ئەشعەری دەوت: لە جیاتی من تۆ بڕۆ[7].

---

(1) البداية والنهاية، سەرچاوەی پێشوو، سير أعلام النبلاء، سەرچاوەی پێشوو، والعبر ٣/٢ وخطط المقريزي، وشذرات الذهب ٣٠٣/٢.

(2) سير أعلام النبلاء، و خطط المقريزي، هەردوو سەرچاوەكەی پێشوو.

(3) خطط المقريزي، سەرچاوەی پێشوو.

(4) خطط المقريزي، سەرچاوەی پێشوو.

(5) سير أعلام النبلاء، خطط المقريزي، هەردوو سەرچاوەكەی پێشوو.

(6) تبيين الكذب المفتري ٩١ عن العسكري بالأهواز. و سير أعلام النبلاء ٨٦/١٥ العبر ٢٣/٢ والمنتظم لإبن الجوزي ٢٩/١٤-٣٠ و طبقات الشافعية الكبرى للسبكي ٣٤٧/٣ والجواهر المضية ٥٤٥/٢ و تیایدا هاتووە: ئەشعەری پەروەردەی (مێردی دایكی بوو) كە ئەبو عەلی جوبائی بوو، ئەبو علی ئەشعەری پێگەیاند و فێری زانستی كەلامی كرد. هاوشێوەی ئەمە لە ٣٣/٤ هاتووە، وخطط المقريزي ٣٥٩/٢ وشذرات الذهب ٣٠٣/٢.

(7) طبقات الشافعية الكبرى للسبكي ٣٤٩/٣. و بڕوانە: تبيين كذب المفتري ٩١.

ئیبن عەساكر وتویەتی: ئەوەش كە دەڵێن كرچ و كاڵی هەبووە لە دانان و نووسینەكانی ئیمامی ئەشعەری... ئەمە مەبەست لێی حاڵەتی دەستپێك و سەرەتاكەی بووە. مەبەست لێی ئەو كاتە

ئەشعەری بۆ ماوەی چڵ ساڵ بەرگری کرد لـە موعتەزیلـەکان[1]، دواتـر لـە بیرۆکـەی موعتـەزیلایەتی پاشگەزبووەوە، لە ڕۆژی هەینی کورسـییەکی لـەناو مزگـەوتی گـەورەی بەصرە دانا لە ڕۆژی هەینی و لەسەری دانیشت و یەك بەدەنگی خۆی هـاواری کـرد: هـەر کەسێك منی ناسیبێت ئەوا منی ناسـیوە، ئـەوەش کـە منـی نەناسـیبێت ئـەوا خـۆمی پێدەناسێنم، من فلانی کوڕی فلانم، من بۆچوونم وابوو قورئان بەدیهێنراوە، خـوای گـەورە بە چاوەکان نابینرێت، بـەخۆم کـردەوە خراپـەکان دەکـەم، مـن تەوبـەم کـرد و پەشـیمان بوومەوەو ئەو بیرۆکە و فیکرەیەم فڕێدا و بەرپەرچی موعتەزیلەکان دەدەمەوە. لەو کاتەوە دەستی کرد بە بەرپەرچدانەوەیان[2].

---

نییە کە خوای گەورە بەخششی پێکرد و ڕێنموونی کرد، جا دانراوەکـانی بـاش و پوخـت کـراوەن، دەربڕین و وشە سازییەکانی ڕەوان و دروستن./ تبيين كذب المفتري ٩١-٩٢.

[1] تبيين كذب المفتري ٣٩ عن ابن عزرة و ٩١ عن العسكري، و المنتظم لإبن الجوزي ٢٩/١٤-٣٠ عن الوزان و الأهواز والسبكي، سەرچاوەی پێشوو، والبداية والنهاية ٢٠٦/١١ عن المنتظم.

[2] الفهرست لإبن النديم ٢٥٧ ووفيات الأعيان ٢٨٥/٣ وسير أعـلام النـبلاء ٨٦/١٥ و ٨٩ وطبقـات الشافعية الكبرى للسبكي ٣٤٧/٣-٣٤٨ وخطط المقريزي ٣٥٩/٢ وأشار إله إبـن كـثير في البدايـة والنهاية ١٨٧/١١. و سەیری ئەمەش بکە: إتحاف السادة ٣/٢.

ئیبن جەوزی لە: (المنـتظم ١٣/١٤)دا لـە ئەهوازیـەوە هێناویـەتی کـە وتویـەتی: سـاڵی ٣٧٥ك گوێبیستی ئەبو عەلی حومڕانی بووە وتویەتی: لە ڕۆژی هەینیدا بەبێ ئەوەی هەستی پـێ بکـەین ئەوا ئیمامی ئەشعەری لە دوای نوێژی هەینی چووە سەر مینبـەرو دوانگـەی مزگـەوتی گـەورەی بەصرە و پەتێکی بەدەستەوەبوو و لە ناوقەدی خۆی گرێدا و دواتر پەتەکەی پچڕاند و وتی: گەواهی و شایەتی بدەن کە من تۆبەم کرد و پەشیمانم لە فیکرەی موعتەزیلایەتی.

سەیری ئەم گێڕانەوانە بکە لە: تبيين لإبن عساكر ٤٠. و وتویەتی: حومڕانی کەسێکی نەناسراوە.

ئیبن عساکر لە کتێبی (التبيين ٣٩) وتویەتی: پرسیار لە (ئـەبو بـەکر ئیسـماعیلی کـوڕی ئـەبو موحەممەدی کوڕی ئیسحاقی ئەزدی قەیروانی -ڕەحمەتی لێبێت) کە بە (ئیبن عیـزە) ناسـراوە کـرا سەبارەت بە (ئەبو حەسەنی ئەشعەری -ڕەحمەتی لێبێت)، جا لە وەڵامدا وتی: ئەشـعەری شـێخ و ئیمام و جێگای پشت پێ بەستنی ئێمەیە، چڵ ساڵ لەسەر مەزهەبی موعتەزیلە بـوو، لـەو کـات پێشەوا بوو بۆ موعتەزیلەکان، پاشان بۆ ماوەی پازدە ڕۆژ بزربـوو و لـەماڵی خۆیـدا نەهاتـەدەرو خۆی پیشانی خەڵکی نەدا، دوای ئەو ماوەیە لە ماڵەکەی هاتەدەرو بـەرەو مزگـەوت کەوتـەڕێ و چووە سەر مینبەر، فەرمووی: ئەی خەڵکینـە، مـن کـە ئـەو مـاوە لـە بەرچـاوی ئێـوە بزربـووم

لە ئەبو بەكری صەیرەفی گێڕدراوەتەوە كە وتویەتی: موعتەزیلەكان سەری خۆیان بەرز كردبووەوە تا ئەو كاتەی خوای گەورە ئەشعەریی دەرخست، جا ئەشعەریی موعتەزیلەكانی لە كونەكانی سمسم گیر كرد[1].

هۆكاری پاشگەزبوونەوەی ئەبو حەسەنی ئەشعەری لە بۆچوونەكانی موعتەزیلە ئەوەبوو: كاتێك ئەشعەری ڕۆچوو لە بۆچوونەكانی موعتەزیلەكان و باش شارەزا بوو، ئەوا پرسیاری دەكرد لە مامۆستاكەی لە كاتی وانەكەیدا، بەڵام ئەشعەریی وەڵامێكی شیفا بەخشی دەست نەدەكەوت، بۆیە سەری سوڕما، لە ئەشعەریەوە گێڕدراوەتەوە كە وتویەتی: چەند شەوێك هەندێ شتم بە دڵدا دەهات سەبارەت بە بیروباوەڕەكانم، بەم هۆیە هەڵسام دوو ڕكعات نوێژم كرد و لە خوای گەورە پاڕامەوە كە ڕێنموونیم بكات بۆ سەر ڕێگەی ڕاست و دواتر خەوتم. جا پێغەمبەرم (صلى الله عليه وسلم) لە خەودا بینی، سكاڵای ئەو شتانەی خۆمم لەلاكرد، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: دەست بگرە بە سوننەت و ڕێ و شوێنی من، جا بەمە هۆشیار بوومەوەو هەڵسام بە بەراورد كردنی بابەتەكانی

---

هۆكارەكەی ئەوەبوو كە من ورد ببوومەوە لەوەی بەڵگەكان لەلای من یەكسان ببون و بۆم نەدەكرا ڕاستیەك بەسەر ناڕاستی و ناڕاستی بەسەر ڕاستیەكدا هەڵبژێرم و پەسەند بكەم، جا داوای ڕێنموونی و هیدایەتم كرد لە خوای گەورە، خوای گەورەش منی بێ هیوا نەكرد بەڵكو ڕێنمووی كردم بۆ ئەو بۆچوونانەی كە لەم كتێبانەدا دام ناوەو نووسیومە، من بیرو بۆچوونی پێشترم فڕێدا و خۆم لێ داماڵی وەك چۆن خۆم داماڵی لەم جلەم، جا جلێكی لەبەردابوو لەبەری كرد و فڕێیدا، كتێبەكانی دایە دەست خەڵك، بۆ نمونە كتێبی: (اللمع)، و كتێبی: (كشف الأسرار و هتك الأستار) كرچ و كاڵییەكانی موعتەزیلەی تێدا دەرخستووە.

[1] تأريخ بغداد ٣٤٧/١١ و الأنساب للسمعاني ٢٧٤/١ وتبيين كذب المفتري ٩٤. و وفيات الأعيان ٢٨٦/٣ و سير أعلام النبلاء ٨٦/١٥ و طبقات الشافعية الكبرى للسبكي ٣٤٩/٣ و خطط المقريزي ٣٥٩/٢.

زانستی کەلام لەگەڵ قورئان و سوننەت[1]، ئەوەی ئەم دوو سەرچاوەیە چەسپاندبوویان منیش چەسپاندم و ئەوەی ترم پشت گوێخست و فڕێمدا[2].

ئەو مێژگەرد و گفتوگۆ ناودارەی کە ڕوویدا لە نێوان (ئەبو حەسەنی ئەشعەری)و شێخەکەی (ئەبو عەلی جوبائی)یان بۆ ئێمەیان نەقڵ کردووە، لەبارەی ئەم وتەی شێخەکەی: کە دەبووت دەبێت خوای گەورە کاری چاکتر هەڵبژێرێت. کەچی ئەشعەری وتی: خوای گەورە هەرچی بیەوێت ئەوە دەکات[3].

---

[1] لە دەقی عەرەبییەکەدا قورئان و سوننەت نییە بەڵکو قورئان و هەواڵەکانە. بەڵام من هەواڵەکانم بە سوننەت لێکدایەوە. (وەرگێڕ).

[2] تبيين كذب المفتري ٣٨-٣٩ وأورد روايات هذه الرؤيا في ٣٨-٤٣. و بڕوانە: طبقات الشافعية الكبرى للسبكي ٣٤٨/٣ وتأريخ الفرق الإسلامية للغرابي ٢٢١ و نقل عن إبن عساكر والسبكي. باسی جیابوونەوەی ئەشعەری لە شێخی خۆی جبائی کراوە لە: الملل والنحل للشهرستاني ٢٨/١.

[3] سير أعلام النبلاء ٨٩/١٥.

ئەبو حەسەنی ئەشعەری پرسیاری لە (ئەبو عەلی جوبائی) کرد، لەبارەی سێ برا: یەکێکیان باوەڕدارو پارێزگارە، دووەمیان لاسارو گوناهکارو سەرپێچی کارە، سێیەمیان بچوك و منداڵە، هەر سێکیان مردن، جا حاڵ و بارودۆخیان چۆنە؟

جوبائی وتویەتی: ئەوەی دونیا بەکەمزان و خواناس بووە خوای گەورە پلە بەرزەکانی بەهەشتی پێبەخشیووە، ئەوەشیان کە بێباوەڕو خوانەناس بووە بردراوەتە دۆزەخەوە، بەڵام منداڵەکە لەبەر ئەوەی باڵغ نەبووەو بچوك بووە ئەوا لەوانەیە کە سەلامەتن و ئازارو سزا نادرێن.

ئەشعەری وتویەتی: جا باشە ئەگەر ئەو منداڵە بچوکە، بیەوێت بچێتە هەمان پلەی خواناسەکە و هەمان شوێنی پێبدرێت ئایا ڕێگەی پێدەدرێت؟

جوبائی وتویەتی: نا ڕێی پێنادرێت، چونکە پێی دەوترێت کە براکەت بەهۆی خواپەرستیە زۆرەکەی گەیشتووەتە ئەم پلانە، تۆش ئەی بچوك ئەم هەموو پەرستشەت نییە.

ئەشعەری وتویەتی: ئەگەر منداڵە بچوکەکە وتی: کەمتەرخەمیەکە لە منەوە نیە، بەڵکو تۆ منت نەهێشتەوە و توانات پێنەبەخشیم تا پەرستشی زیاتر بکەم.

جنایی وتویەتی: خوای گەورە پێی دەفەرمووێ: من دەمزانی ئەگەر تەمەنت زیاتر بووایە و زیاتر مابایەوە ئەوا تاوانت دەکرد، بەمەش شیاوی سزای بەئێش دەبوویت، منیش بەرژەوەندی تۆم لەبەرچاو گرت.

ئەم گفتوگۆ و مێزگەردە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خوای گەورە ویستی وابووە ڕەحمەتی خۆی بەسەر یەکێکدا ببارێنێت و سزای یەکێکی تر بدات، هەروەها کردارەکانی خوای گەورە هۆدار نین لە پێناو جێبەجێ کردنی ئامانجەکان.

ئیبن خەلکان وتویەتی: دواتر لە کتێبی (تفسیری مەزن) دانراوی شێخ (فخر الدین الرازی) لە سورەتی: (الأنعام) ئەوەم دۆزیەوەو بەرچاوکەوت: کاتێك ئەشعەری جیابووەوە لە مەجلیسی مامۆستاکەی (جوبائی) و مەزهەبی مامۆستاکەی فڕێدا، تەنانەت دژی بۆچوونەکانی مامۆستاکەی وەستایەوە. هەروەها زیاتر لە یەکتری دوورکەوتنەوە[1].

مامۆستا (غرابی) پێی وایە کە کرداری فڕێدانی مەزهەب و بنەماکانی موعتەزیلە لەلایەن ئەشعەرییەوە شتێکی نارۆشنە، چونکە ئەشعەری بۆ ماوەی چل ساڵ قوتابی موعتەزیلەکان بووە، ئەمەش وادەکات کە سەخت بێت بڕوا بەوە بکرێت، کە ئەشعەری بۆ

---

ئەشعەری وتویەتی: ئەی ئەگەر برا خوانەناس و بێ باوەڕەکە وتی: ئەی خوای جیهانیان، تۆ چۆن زانا بوویت بە حاڵی برا بچوکەکەم ئاواش زانا بوویت بە حاڵی من، بۆچی بەرژەوەندی برا بچوکەکەی منت لەبەرچاو گرت و هی منت فەرامۆش کرد.

جوبائی بە ئەشعەری وت: بەڕاستی تۆ شێتی.

ئەشعەری لە وڵامدا وتی: نا، بەڵکو کەری شێخ لە چاڵەکەدا گیری خوارد. جوبائی وەستا و قسەی پێ نەما.

ئەم سەرچاوانە ئەم گفتوگۆیەیان باسکردووە: الذهبي في سير أعلام النبلاء السابق بلفظ آخر، ونقلها ابن عماد في شذرات الذهب ٣٠٣/٢ عن ابن خلكان، والسبكي في طبقات الشافعية الكبرى ٣٥٦/٣ وقال: وحكاها الذهبي.

ئیسفەراییینی لە: (التبصير في الدين ٦١) ئەم گفتوگۆیەی هێناوە کە بەرپەرچی (نەزام)ی پێدراوەتەوە ناوبراو بۆچوونی وایە: پێویستە لەسەر خوای گەورە کارێك بە بەندە بکات کە مایەی سوود و چاکە بێت، جا لەو وەڵامەی (ئیسفەراییینی) هێناویەتی ئەوەی ڕوون کردووەتەوە کە ئەستەمە شت لەسەر خوا پێویست ببێت.

ونقلها الغرابي في تأريخ الفرق الإسلامية ٢٢٢ عن السبكي وابن خلكان، وأشار إلى الإسفراييني.

[1] وفيات الأعيان ٢٦٧/٤-٢٦٨ في ترجمة أبي علي الجبائي.

تەنها مێژگەرد و گفتوگۆیەك مەزهەبی موعتەزیلەی فرێدابێت و مامۆستاکەشی وەڵامی دڵنیابەخشی پێنەدابێت.

لەبەر ئەوە دەکرێت مامۆستا و قوتابیەکەی لە زۆرێك لە بابەتەکاندا ڕاجیاییان هەبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر لە چوار چێوەی مەزهەبدا دەمێننەوە، هەروەك (نەزام) ڕاجیایی هەبوو لەگەڵ (ئەبو هوزەیل)، هەروەها (ئەبو عەلی جوبائی) ڕاجیایی هەبوو لەگەڵ (ئەبو هوزەیل).

هەڵهێنجانی پوختەی ڕاستی بە ئاسانی شتێکی سەختە، چونکە شوێنکەوتوو و هاوەڵی هەر پێڕو تاقمێك دەمارگیرە بۆ هاوەڵانی مەزهەبەکەی، لە شان و باڵی دژەکانی کەم دەکەنەوەو بە شان و باڵی شوێنکەوتووانی مەزهەبی خۆیان هەڵدەدەن[1].

ئەبو حەسەنی ئەشعەری جیابووەوە لە شێخی خۆی ئەبو عەلی جوبائی، چووە پاڵ ئیبن کیلابی باوکی موحەمەدی عەبدوڵای کوڕی موحەمەدی کوڕی سەعیدی کوڕی کیلابی قەتتان، ئەشعەری بۆچوونەکانی لەسەر ڕێسا و بنچینەکانی ئیبن کیلاب داڕشت و هەندێ بابەتی ناوبراوی پەسەند کرد[2].

لە بنەماکانی موعتەزیلە جیابووەوە، مەزهەبێکی بۆ خۆی بڕیاردا، بەرپەرچی موعتەزیلەکانی داوە.

کاتێك ئەشعەری کتێبەکانی خۆی وەك: (اللّمع و کشف الأسرار) دایە دەست خەڵك و خستیە بەرچاو، دوای ئەوەی لە موعتەزیلەکان جیابووەوە، فەرموودەناسان و شەرعناسەکانی ئەهلی سوننە و جەماعەتیش ئەم کتێبانەیان خوێندەوە، لە دوایی دا ناوەڕۆکی ئەم دوو کتێبەیان بە تەواوی قبوڵ کرد و بە ڕێبازو ڕێگەی خۆیانپەسەند کرد، دانیان بەوەدانا کە ئەشعەری زۆر لە پێشە و زانایەکی ڕۆچووە لە ئاییندا، بۆیە ئەشعەرییان بە ئیمام دانا تا وای لێهات مەزهەبەکەیان درایە پاڵ ئەشعەری[3].

---

[1] تأريخ الفرق الإسلامية للغرابي ٣٢٣-٢٢٤.
[2] خطط المقريزي ٣٥٩/٢.
[3] تبيين كذب المفتري ٣٩.

کۆمەڵێك لە زانایان تەواو قووڵبوونەوە لە مەزهەبەکەی وەك: باقلانی، ئیبن فورك، ئەبو حەسەنی تەبەری.

دواتر کۆمەڵێکی تر لە زانایان مەزهەبەکەیان لە باقلانی و ئیبن فورکەوە وەرگرت، کە بریتی بوون لە هاوەڵانی شافعی وەك (ئیسفەراینی) و جگە لەویش، ئەوانە سەرکردە و ڕابەرەکانی ئەشعەرییەکانن و مەزهەبە[1] کەلامییەکەی ئیمامی ئەشعەریی لە ڕێی ئەوانەوە بڵاوبووەوە.

## ڕێبازە کەلامییەکەی ئەشعەری:

زانایان بۆچوونیان وایە کە مەزهەبی ئەشعەری بریتییە لەو مەزهەبەی کە پێشینان (سلف)ی ئەهلی سوننە و جەماعەت لەسەری بوونە.

ئیبن عساکر وتویەتی: ئەشعەری هیچ شتێکی لە ئایینی خوا دانەهێنا، بیدعەی لەگەڵ خۆ نەهێنا، بەڵکو دەستی گرت بە بۆچوونەکانی هاوەڵان و شوێنکەوتووان و ئیمامەکان، دواتر لەبارەی بنەماکانی ئاین، پشتی ئەو بۆچوونانەی گرت و ڕوونکردنەوەو شرۆڤەی زیاتری خستەڕوو...، لە میانەی شرۆڤەو ڕوونکردنەوەکەی پشتی بۆچوونی ئیمامەکانی گرت وەك: ئەبو حەنیفە، سوفیانی سەوری لە دانیشتووانی کوفە، ئەوزاعی و جگە لەویش لە دانیشتووانی شام، مالیك و شافیعی لە دانیشتووانی دووشارە پیرۆزەکە و حیجاز، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە فەرمووودەناسان و لەیسی کوڕی سەعد و جگەلەویش، بوخاری و موسلیم لە پارێزەرانی سوننەت (حفاظ السنن)[2].

---

[1] الجواهر المضية ٤/٣٣-٣٤.

[2] تبيين كذب المفتري ١٠٣.

ئەبو قاسم عەبدولکەریمی کوڕی هەوازنی قوشەیری کتێبێکی لە بارەی ئەشعەری نووسیوەو وتویەتی: فەرموودەناسان کۆکن لەسەر ئەوەی کە (ئەبو حەسەن عەلی کوڕی ئیسماعیلی ئەشعەری(ڕەزای خوای لێبێت)) یەکێك بووە لە ئیمامەکانی فەرموودەناسان، مەزهەبەکەی هەمان مەزهەبی فەرموودەناسان بووە، لەبارەی بنەمای ئایینەکان بەپێی ڕێبازی ئەهی سوننە دواوە، بەرپەرچی بیدعەچی و لادەرانی داوەتەوە، شمشێرێکی زاڵبووە لەسەر موعتەزیلە و شیعەکان و

سویکی وتویەتی: ئەشعەری ڕایەکی نوێی دانەهێنا، مەزهەبێکی دانەمەزراند، بەڵکو پێداگیری کرد لەسەر مەزهەبەکانی پێشینان، بەرگری کردووە لە ڕێی و شوێنی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم).

درانە پاڵ ئیمامی ئەشعەری لەو ڕووەوەیە کە ناوبراو چوارچێوەیەکی لەسەر ڕێبازی پێشان گرێدا و دەستی پێوەگرت، بەڵگەی لەسەر هێناوە، بەمەش ئەوەی شوێنی ئەشعەری کەوت و ڕێبازی ئەوی گرت لە بەڵگەکاندا ئەوا پێی دەوترا ئەشعەری....

شیخولئیسلام عیزەدینی کوڕی عەبدولسەلام باسی کردووە کە شافیعی و مالیکی و حەنەفی و حەنبەلییە پایەدارەکان لەسەر بیرباوەڕی ئەشعەرین، ئەبو عەمری کوڕی حاجب کە شێخی مالکیەکان بوو، لە سەردەمی خۆی هاوچەرخی ئەشعەری بوو، ڕێبازی ئەشعەری پەسەند کرد، جەمالەدینی حصیری شێخی حەنەفیەکان بەهەمان شێوە کۆك بوو لەگەڵ ئەشعەری[1]. و تەقی سوبکی ئەم دەقەی پەسەند کرد کە (تاج)ی باوکی هێنابووی[2].

---

بیدعەچیەکان لە ئەهلی قیبلە و ئەوانەش کە لە ئوممەت دەرچوون، هەر کەسێك توانج لە ئیمامی ئەشعەری بدات یان تانەی ئاراستە بکات و بەنەفرەتی بکات، ئەوا ئەو کەسە زمانە پیسەکەی ئاراستەی هەموو ئەهلی سوننە کردووە. دەستنووسەکانمان بەکارخستووە وەك گوێڕایەڵێەك لەم باسەدا، لە مانگی (ذي القعدة)ی ساڵی چوار سەد و سی و شەش.

چەند دەست نووسێکی تریشی تێدایە وەك: ئەبو عەبدوڵای خوبازی موقری و ئیمام ئەبو موحەممەدی جوەینی... و هەندێکی تریش.

ئەوەشیان ڕوون کردۆتەوە کە ڕێبازی ئەشعەری ڕێبازی ئەهلی سوننە و جەماعەیە، ئاین و بیروباوەڕەکەی جێگای ڕەزامەندی و قبوڵە./تبيين الكذب المفتري ١١٣-١١٤.

[1] طبقات الشافعية الكبرى للسبكي ٣٦٥/٣. و لە ٣٧٣ هاتووە کە وتویەتی: (ئیبن عەساکر) پارێزەری ئوممەت و ئەمینداری دامەزراوە وتویەتی: شەرعناسانی حەنەفی و مالکی و شافعی کۆکن لەگەڵ ئەشعەرییدا. زوبەیدی ئەمەی هێناوە لە: (إتحاف السادة ٥/٢).

[2] إتحاف السادة، سەرچاوەی پێشوو.

مایرقی وتویەتی: ئەبو حەسەن وەك زانایەکی کەلامناس یەکەم کەس نەبوو کە بەزمانی ئەهلی سوننەوە دوابێت، بەڵکو هەر لەسەر ڕێبازی ئەوانی ترچووە، ناسراوە لەسەر بەرگری کردن لە مەزهەبەکەی، ڕوونکردنەوەو بەڵگەی زیاتری بەخشی بە مەزهەبەکە، بۆچوونێکی لەخۆوە

ئیمام ئەبو حەسەنی ئەشعەری لە زاناکانی ئەهلی سوننەیە، هەر ئەویش بوو بووە برینێك لە جەستەی قەدەرییەکاندا[1].

## مەزهەبە فیقهییەکەی ئەشعەری:

لەبەر ئەوەی دانراو و نووسینی زۆر بوو، مەزهەبی ئەهلی سوننەی سەرخست، لەو دانراوانەیدا بەرپەرچی موعتەزیلەکانی دایەوە، بەم هۆیە مالیکی و شافیعیەکان و هەندێك لە حەنبەلییەکان پەیوەست بوون پێیەوە، هەر بەهۆی ئەم پەیوەست بوونەوە ئیمامی ئەشعەری درایە پاڵ مالیکییەکان و شافیعییەکان[2]، تەنانەت درایە پاڵ حەنەفیەکانیش.

لەبەر ئەمە وتراوە: مەزهەبەکەی حەنەفی بووە[3].

وتراوە: لەسەر مەزهەبی شافیعی بووە، شەرعی وەرگرتووە لەسەر دەستی (ئەبو ئیسحاقی مەروەزی)[4].

---

دانەهێنا، مەزهەبێکی بۆ خۆی دروست نەکرد، جا نابینیت مەزهەبی ئەهلی سوننە دراوەتە پاڵ مالیك، ئەوەی لەسەر مەزهەبی دانیشتووانی شاری مەدینە بێت پێی دەوترێت: مالکی. مالك لەسەر ڕێبازی ئەوانی پێشەخۆی چووە، زۆر بە توندی پابەند بوو بە شوێنکەوتنیان، بەڵام لەبەر ئەوەی مالك مەزهەبی کەسانی پێشەخۆی زیاتر ڕوونکردەوەو شرۆڤەی کرد ئەوا مەزهەبەکە درایەپاڵی، ئەبو حەسەنی ئەشعەریش بەهەمان شێوە هیچ جیاوازییەکی نەبوو، ئەویش تەنها بە شرۆڤە و زیاتر ڕوونکردنەوەی مەزهەبی پێشینان و دانانی کتێب لەوبارەوەو پشتگرتنی و سەرخستنی./طبقات الشافعية الكبرى للسبكي ٣٦٧/٣ في معرض ذكر تقريظ المايرقي المالكي للشيخ أبي الحسن الأشعري. وذكره الزبيدي في إتحاف السادة السابق.

[1] الفرق بين الفرق ٣٦٤.

[2] تبيين كذب المفتري ١١٧.

[3] الجواهر المضية ٥٤٥/٢ عن مسعود بن شيبة في كتاب التعليم، وأيضا في ٣٣/٤. وخطط المقريزي ٣٥٩/٢ عن مسعود بن شيبة في كتاب التعليم. وتعليق الكوثري على تبيين كذب المفتري ١١٧ الهامش.

[4] طبقات الشافعية الكبرى للسبكي ٣٥٢/٣ ورجحه، و وتویەتی: مامۆستا (ئەبو بەکری کوڕی فورك) دەقی لەم بارەوە هێناوە لە کتێبی (طبقات المتكلمين)، و مامۆستا (ئەبو ئیسحاقی

هەروەها وتراوە: مالیکییە[1].

کەوسەری هۆکاری ئەو کەمەند کێشەی خاوەن مەزهەبەکانی ڕوون کردۆتەوە کە هەر یەکەیان ئیمامی ئەشعەری بۆ لای خۆی کێش دەکات، ئەمەش لەبەر ئەوەبووە: کە ئیمامی ئەشعەری سەیری فیقهی مەزهەبەکانی کردووەو دەمارگیری بۆ هەندێك نەبووەو لە بەرامبەردا هەندێکی تری فەرامۆش نەکردووە، تەنانەت ئەو بۆچوونەی کە دەڵێت کۆششکار (مجتهد)ەکان لە بابەتە لاوەکیەکاندا هەموویان ڕاستپێکن. دراوەتە پاڵ ئیمامی ئەشعەری، ئەمەش هۆیەك بوو کە ئاسانکاری کرد بۆ ناوبراو تا وتەی ئەهلی سوننە لە دەوری بانگەوازە ڕاستەکەی کۆبکاتەوە، بەڵکو بە حەنبەلییەکانی دەوت: من لەسەر مەزهەبی ئەحمەدم، هەروەك لە کتێبی (الإبانة)دا بەدەردەکەوێت[2].

---

ئیستفراینی) لەو دەقەی کە وەریگرتووە لە شێخ (ئەبو موحەممەدی جوەینی) لە (شرح الرسالة) ئەم ڕایەی پەسەند کردووە.

بەهەمان شێوە (سوبکی) لە ٣٦٧/٣ وتویەتی: زیاد لە یەك کەسی ئەمیندارى دامەزارو باسی ئەوەیان کردووە کە ئیمامی ئەشعەری مەزهەبی شافعی لە (ئەبو ئیسحاقی مەروەزی) وەرگرتووە، (ئەبو ئیسحاقی مەروەزی)یش زانستی کەلامی لە ئیمامی ئەشعەری وەرگرتووە، هەر بۆیەش لە بازنەکەی ئەودا دادەنیشت. بڕوانە: إتحاف السادة ٤/٢.

[1] تبيين كذب المفتري، سەرچاوەی پێشوو، وطبقات الشافعية الكبرى للسبكي ٣٥٢/٣ و وتویەتی: ئەم ڕایە ڕاست نییە. و لە ٣٦٦ بەرپەرچی ئەم ڕایەی داوەتەوە. هەر دوو ڕایەکانی وەرگرتووە لە (مایرقی کلاعی) کە یەکێکە لە پێشەوا مالکیەکان.

زوبەیدی لە کتێبی (إتحاف السادة ٤/٢)دا ئەوەی هێناوە کە یەکێك لەوانەی وتویەتی ئیمامی ئەشعەری مالکییە (قازی عیاز)ە لە کتێبەکەیدا (المدارك)، و (کەلاعی یورقی) کە یەکێکە لە مالیکییەکان، کە ڕێنماییەکەی تێدایە.

[2] تبيين كذب المفتري، هامش ١١٧.

ئەشعەری لەو مەسەلەیەدا (واتە: بابەتە لاوەکیەکان - وەرگێڕ -) بۆچوونی وایە کە کۆششکار (مجتهد)ەکان هەموویان ڕاستپێکن، بەم بۆچوونەش ئیمامی ئەشعەر ڕای پێچەوانەی ڕای ئیمامی شافیعییە./ تبيين كذب المفتري ١١٥.

وتراوە ئەشعەری لە کتێبەکەیدا (الإبانة) لەسەر ڕای ئەحمەدی کوڕی حەنبەلە، هەروەك لە کتێبی ناوبراودا وتویەتی: (ئەم بۆچوونەی کە پەسەندە لەلامان، ئەو ئایینەی دینداری پێدەکەین: بریتییە

زوبەیدی وتویەتی: بۆچی نا، دەکرێت ئیمامی ئەشعەری زانا بێت بە هەر دوو مەزهەبەکە و فەتوای تێدا بدات، وەك: ئیبن دەقیقی عید و جگە لەویش لە زانا بلیمەتەکان، بەمەش بانگەشەی هەر دوو تاقمەکە ڕاست دەردەچێت[1].

**دانراوەکانی:**

شتێکی سەرسوڕهێنەر بوو لە زیرەکی و هێزو توانای تێگەیشتنیدا، چەندین دانراوی تۆکمەی هەن کە گەواهی دەدەن لەسەر زانستە فراوانەکەی[2].

ئیبن حەزم باسی کردووە کە ئەشعەری پەنجاو پێنج دانراوی هەن[3].

بەڵام ئیبن عەساکر باسی کردووە: کە ئیبن حەزم زیاتر لە نیوەی دانراوەکانی فەرامۆش کردووە، ئیبن فورك ناوی کتێبەکانی ئەشعەری باس کردووە کە زیاترە لەوەی ئیبن حەزم) باسی کردووە[4].

ئەبو حەسەنی ئەشعەری لە کتێبەکەیدا (العمد في الرؤية) وتویەتی: ئەم دانراوانە وەڵامی بێ باوەڕان دەدەنەوە لە کتێبەکانم، دوازدە کتێبن: (الموجز)، (خلق الأعمال)،

---

لە دەست گرتن بە کتێبی خواو سوننەتی بەپێزی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، هەروەها ئەوەش کە گێڕدراوەتەوە لە هاوەڵە بەرێزەکان و شوێنکەوتووان و پێشەوایانی فەرموودەناس، بەمەش ئێمە پارێزراو دەبین، هەمان ئەو بۆچوونەی کە "ئەبو عەبدوڵای ئەحمەدی کوڕی حەنبەل" خوا ڕووی جوان و گەش بکات پلەکەی بەرز بکات و پاداشتی زیاتر بکات پەسەندە لەلامان، چونکە ناوبراو ئیمامی چاکەکارە، سەرکردەی کامڵە، کە بەهۆی ئەوەوە خوای گەورە ڕاستی ڕۆشن کردەوە، گومڕای وەلانا، ڕێبازەکانی پێ ڕوون کردەوە، بەهۆی ئەوەوە بیدعەی بیدعەچیان و لەڕێ لادانی مەبەستی ناپاکەکان و گومانی گومانداڕانی پوچەڵکردەوە، جا ڕەحمەتی خوای لێبێت ئای لەو زانا پێشکەوتووەو ڕێزدارو مەزنە و خاوەن تێگەیشتنێکی گەورە)./ الإبانة للأشعري ٢٠-٢١.

[1] إتحاف السادة ٢/٤.

[2] سير أعلام البلاء ١٥/٨٦-٨٧.

[3] تأريخ بغداد، والأنساب للسمعاني، وتبيين كذب المفتري، ووفيات الأعيان، والعبر، والبداية والنهاية، وخطط المقريزي، وشذرات الذهب، سەرچاوەکانی پێشوو.

[4] تبيين كذب المفتري ٩٢.

(الصفات): کتێبێکی گەورەیە تێیدا لەبارەی پێڕەکانی موعتەزیلە و جەهەمیـەکان دواوە، (الرؤیة بالأبصار)... (إیضاح البرهان)، (اللمع فی الرد علی أهل البدع)، (الشرح والتفصیل)، (النقض علی الجبائي)... کتێبێکی تر لەبارەی (الصفات) گەورەترین کتێبمانە کە هەموو ئەو نووسینانەی ئێمەی هەڵوەشاندۆتەوە کە لە کۆندا نووسیبوومان و مەزهەبی موعتەزیلەمان پەسەند کردبوو، هەرگیز کتێبێکی هاوشێوەی ئەو کتێبە بۆ موعتەزیلەکان نەنوسراوە، دواتر خوای گەورە ڕاستی بۆ ئێمە ڕۆشن کردەوەو بەمەش لە مەزهەبی موعتەزیلە پاشگەز بووینەوە. و کتێبی (تفسیر القرآن).... [1].

ناوبراو کتێبی (الإبانة)، (مقالات الإسلامیین)ی هەیە، هەر دوو کتێبەکە چاپکراون و دەستاودەستی پێدەکرێت.

بەم کتێبانە بەرپەرچی ئەم تاقمانەی پێداوەتەوە: بێ باوەڕان، موعتەزیلەکان، ڕافیزیەکان، جەهەمیەکان، خەواریج، سەرجەم تاقم و پێڕە بیدعەچیەکانی تر[2].

### زانستەکەی:

مامۆستا ئەبو ئیسحاق ئیبراهیمی کوڕی موحەمەدی ئیسفەراینی شەرعناسی بلیمەت لە زانستی ئوصولدا وتویەتی: من لە پاڵ ئەبو حەسەنی باهیلیدا وەك دۆڵپێك وابووم لە پاڵ دەریایەك. و شێخ ئەبو حەسەنی باهیلی وتویەتی: من لە ئاست شێخ ئەبو حەسەنی ئەشعەریدا وەك دڵۆپێك وابووم لە پاڵ دەریایەك[3].

بە ئەبو بەکری کوڕی تەیبی باقلانیان وت: گوفتارو قسەی تۆ باشتر و ڕوونترە لە گوفتاری (ئەبو حەسەنی ئەشعەری - ڕەحمەتی خوای لێبێت -)، لە وەڵامدا وتی: بەڕاستی

---

[1] تبیین کذب المفتري ١٢٨ ولاپەڕەکانی دواتری، وسیر أعلام النبلاء سەرچاوەی پێشوو، و (ئیبن نەدیم و ئیبن خەلکان و مەقریزیش هەندێك لەو کتێبانەیان باس کردووە، ئیبن کەسیر لە: (البدایة والنهایة ١١/١٨٧) تەنها باسی کتێبی (الموجز)ی کردووە.

[2] تأریخ بغداد ١١/٣٤٦-٣٤٧ ووفیات الأعیان ٣/٢٨٥.

[3] تبیین کذب المفتري ١٢٥ وإتحاف السادة ٢/٤ عن ابن کثیر.

چاکترین حاڵ و بارودۆخی من ئەو کاتەیە کە تێبگەم لە وتە و گوفتاری (ئـەبو حەسـەنی ئەشعەری ڕەحمەتی خوای لێبێت )[1].

بە نوێکەرەوە (مجدد)ی سەدەی سێیەم دادەنرێت، کە ئاماژە پێدراوە لەو فەرموودەیەدا: (إن الله يبعث لهذه الأمة على رأس كل مائة سنة من يجدد لها أمـر دينهـا) واتـە: خـوای گەورە لە هەر سەدەیەك كەسێك ڕەوانە دەكات كە ئایین بۆ ئوممەت نوێ بكاتەوە. و (ئـيبن عساكر) ئەمـەی بـە ڕاسـت دانـاوە، بـە بەڵگـەی ئـەوەی كـە هەڵسـانی ئەشـعەری بـە سەرخستنی سوننەت، نزیكترە لـە كـرداری ئـایین نوێكردنـەوە، هـەر نـاوبراو بـوو خـۆی ئامادەكرد بۆ بەرپەرچدانەوەی موعتەزیلەكان و سەرجەم تاقمە بیدعەچییەكانی تر[2].

## شێوازی ژیانی:

خاوەن قەناعەت و پاك بووەو خۆی دوور گرتووە لە شـتی ناشـیاو و قەدەغـە[3]. لـەو دەستكەوتە دەیخوارد كە (بیلالی كوڕی ئەبو بوردەی عامری كوڕی ئەبو موسای ئەشعەری باپیرەی لە دوای خۆی بەجێهێشت بوو[4].

خەرجییەكەی لە سەرتاپای ساڵدا حەڤدە دیرهەم بووە[5]، هەر مانگێـك دیرهـەمێك و بڕێكی كەمی خەرج دەكرد[1].

---

(١) تبيين كذب المفتري ١٢٥-١٢٦ وأشار إليه الذهبـي في السير ٨٦/١٥ والزبيدي، سەرچاوەی پێشوو.

(٢) تبيين كذب المفتري ٥٣ و لا ١٠٣.

فەرموودەی: خوای گەورە بۆ ئەم ئوممەتە كەسێك ڕەوانە دەكات.... تاد، أخرجه أبوداود في سننه، والحاكم في المستدرك، والبيهقي في المعرفة، عن أبي هريرة وهو صحيح./ الجامع الصغير ١١٥.

(٣) العبر ٢٣/٢ وشذرات الذهب ٣٠٣/٢ عن العبر.

(٤) تأريخ بغداد ٣٤٧/١١ نقلا عن خادم أبي الحسن الأشعري، والأنساب للسمعاني ٢٧٤/١ و تبيين كذب المفتري ١٤٢ و وفيان الأعيان ٢٨٦/٣ عن الخطيب، وسير أعلام النبلاء ٨٩/١٥ وطبقات الشافعية الكبرى للسبكي ٣٥١/٣ وخطط المقريزي ٣٥٩/٢ وإتحاف السادة ٤/٢.

(٥) تأريخ بغداد، والأنساب للسمعاني، وتبيين كذب المفتري، و طبقات الشافعية الكبرى للسبكي، وخطط المقريزي، وإتحاف السادة، سەرچاوەكانی پێشوو.

گاڵتەو گەپیشی دەکرد[٢].

## پەرستش و بەندایەتیەکەی:

زۆر پەرستش کردنی ئیمامی ئەشعەری شتێکی دەگمەن و نامۆ بوو.

ئیبن عەساکر بە زنجیرە و سەنەدی خۆی لە (ئەبو حەسەن سەروی) گێڕاوەتەوە، کە وتویەتی: شێخ (ئەبو حەسەنی ئەشعەری) نزیکەی بیست ساڵ بە دەستنوێژی سێیەکی شەو نوێژی بەیانی دەکرد، ئەم پەرستشە زۆرەی خۆی بەکەس ڕانەدەگەیاند[٣].

هەروەها گێڕدراوەتەوە کە خزمەتکارەکەی وتویەتی: چەند ساڵێك لە شاری بەصرە خزمەتی ئیمامی (ئەبو حەسەنی ئەشعەری)م کرد، لە شاری بەغداد لە خزمەتی دابووم تاکو ماڵئاوایی کرد، بەڕاستی هیچ یەکێکم لەو پارێزگارتر نەبینی، ئەندامەکانی زۆر بەچاکی دەپاراست، هیچ شێخێکم نەبینیوە کە شەرمی زیاتر بێت لەم شێخە لە کاروباری دونیادا و چاکتریش لە کاروباری دواڕۆژدا[٤].

---

هەروەها لە کتێبی (وفيات الأعيان ٣/٢٨٦) هاتووە کە لە (هەر ڕۆژێك ئەو برەی خەرج کردووە) وەرگیراوە لە (الخطيب)، ئەمە دەستکاری کراوە، چونکە لە (الخطيب) و جگە لەویشدا هاتووە: (کە تێچوو و خەرجی ساڵێکی ئەوەندە بووە).

لە: (البداية والنهاية ١١/١٨٧)دا هاتووە: (کە خەرجییەکەی حەڤدە هەزار دیرهەم بووە) ئەمەش دەستکاری کردن و لە جێ لادانی ڕاستییە.

[١] طبقات الشافعية الكبرى للسبكي ٣/٣٥١ و إتحاف السادة، سەرچاوەی پێشوو.

[٢] الفهرست لإبن النديم ٢٥٧ و وفيات الأعيان ٣/٢٨٥ وسير أعلام النبلاء عن إبن خلكان، والبداية والنهاية، وخطط المقريزي، سەرچاوەکانی پێشوو.

[٣] تبيين كذب المفتري ١٤١. وسەیری ئەمەش بکە: طبقات الشافعية الكبرى للسبكي ٣/٣٥١، ونقله الزبيدي في إتحاف السادة ٢/٤ عن بندار خامه.

[٤] تبيين كذب المفتري، سەرچاوەی پێشوو.

## ڕاو بۆچوونەکانی:

شێخ ئەشعەری ڕاو بۆچوونەکانی خۆی لە کتێبەکانیدا خستووەتەڕوو، گرنگترین کتێبیشی لەو بارەوە ئەمانەن: (مقلات الإسلاميين، الإبانة، اللمع)، قوتابیان و شێخەکانی مەزهەبی ئەشعەری ڕاو بۆچوونەکانی ناوبراویان نەقڵ کردووە. هەندێك لەو ڕاو بۆچوونانە:

١- ئەو سیفەتانەی کە لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی بەپێزدا هاتوون بۆ خوای گەورەی بڕیارداوەو چەسپاندووە:

سیفەتەکانی خوا شیاوی زاتی خوای گەورەن، بە سیفەتەکانی بەدیهێنراوان ناچن، خوای گەورە توانادار (قادر)ە بە توانایەك کە وەك توانای بەدیهێنراو نییە، زانایە بە زانستێك کە وەك زانستی بەدیهێنراو نییە، بیسەرە بە بیستنێك کە وەك بیستنی بەدیهێنراو نییە... [1].

سیفەتەکانی خوا هەر بوو و بێ سەرەتان و پەیوەستن بە زاتی خوای پاك و بەرزەوە، نابێت بوترێت: سیفەتەکانی خوا بریتین لە زاتی خوا، سیفەتەکانی خوا غەیری زاتی خوان، سیفەتەکانی خوا بریتی نین لە خوا، جگە لە خواش نین[2].

ئەشعەر مام ناوەند بوو لە نێوان سیفەت لابەرەکان (نفات الصفات المعطلة) و ئەوانەی جەستە بڕیاردەدەن (المجسمة) و دەڵێن خوا زانستی هەیە وەك گشت زانستەکان، توانای وەك تواناکانی تره، بیستنی هەیە وەك ئامرازەکانی تری بیستن[3].

لەبەر ئەمە ئەشعەرییەکان بە سیفەتگەراکان (الصفاتية) ناونراون، بەهۆی بڕیاردان و چەسپاندنی سیفەتە بێ سەرەتا و لە مێژینەکان بۆ خوا[4].

---

[1] تبيين كذب المفتري ١٤٩ عن أبي المعالي بن عبد الملك، والملل والنحل للشهرستاني ٨٢/١.
[2] الملل والنحل للشهرستاني، سەرچاوەی پێشوو، وخطط المقريزي ٣٥٩/٢.
[3] تبيين كذب المفتري، سەرچاوەی پێشوو.
[4] الملل والنحل للشهرستاني ٨١/١ وخطط المقريزي ٣٦٠/٢.

٢- هەر خوا بەدیهێنەری ڕاستەقینەیە و لـە كـرداری بەدیهێنانـدا هـیچ هاوبەشـێكی نییە، هەموو كردەوەكانی بەندە خوای گەورە بەدیهێنەریـەتی، بەنـدەش بەدەسـتی دەهێنێت[١]. هەر كەسێك توانای بەدەستهێنانی هەبوو ئەوا ئەركدارە، بەم پێیـەش پاداشت و سزای بۆ دیاری دەكرێت[٢].

بەدەستهێنان (كسب) لەلایەن ئەشعەری بریتییە لە هاوتـەریب و جـووت بـوون لـە نێوان ئەو كردەوەیەی كە خوای گەورە بەدیهێنەریەتی و هەڵبژاردن و دەست نیشـان كردنەكەی بەندە[٣]. خوای گەورە وەك نەریت وا دایڕشـتووە كـە لـە كاتێـك بەنـدە توانا و ویستی هەبوو. ئەگەر كردەوەكەش بەدی بێت، كردەوەكە بە توانا و ویسـتی بەندەكە بەدی نایەت[٤].

بەم پێیەش بەدەسـتهێنان (كسـب)یش دەبێـت بـەدیهێنراوی خـوا بێـت وەك چـۆن كردەوەكـە بـەدیهێنراوی خوایـە، زانایـان وتویانـە كـە ئەمـە سەردەكێشـێت بـۆ جەبرییەت[٥].

كەواتە بۆچوونی ئەشعەری مامناوەندە لە نێوان جەهەمیە جەبرییـەكان كـە پێیـان وابوو بەندە ناچارە ناتوانێت هیچ شتێك بكات و هـیچ شـتێك بـە دەسـت بێنێـت،

---

[١] خطط المقريزي ٣٦٠/٢. و بڕوانە: تبيين كذب المفتري ١٤٩ والإنصاف للباقلاني ٤٥ و تمهيد الأوائل ٣٤١. بۆچوونی ئەشعەری لەبارەی بەدیهێنراوی كردەوەكان بە بەڵگەی نەقڵی و عەقڵییەوە لەم كتێبەدان: (اللمع ٦٩ و لاپەڕەكانی دواتر).

[٢] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٨٤.

[٣] تأريخ المذاهب الإسلامية، سەرچاوەی پێشوو. مقريزة لە: (الخطط ٣٦٠/٢)دا وتویەتی: بەدەستهێنان (كسب) بریتییە لەو كردەوەی كە لە شوێنی توانای بەندەدایە.

[٤] دراسات في الفرق ٢٦٩ عن المواقف، والإنصاف للباقلاني، و إحياء علوم الدين، والتبصير في الدين.

[٥] تأريخ المذاهب الإسلامية، سەرچاوەی پێشوو.

هـەروەها موعتـەزیلـەکان: کـە دەڵـێن بەنـدە توانـای بـەدیهێنان و دەستخسـتنی کردەوەیان هەیە[1].

٣- چاك و خراپ شەڕعینە واتە نازانرێت ستایش یان سەرزەنشت، پاداشـت یـان سـزا شیاوی چ کردەوەیەك دەبێت، تەنها لە ڕێگەی شەڕعەوە نەبێت[2].

شت کە چاکە لەبەر ئەوەیە کە خوای گەورە فەرمانی کردووە بە ئەنجامـدانی، شـت کە خراپە لەبەر ئەوەیە کە خوای گەورە قەدەغەی کردووە[3].

عەقڵ ئەو توانایـەی نییـە کـە حـوکمی خـوا بزانێـت، لـەبارەی کـردەوەی بەنـدە ئەرکدارەکان، تەنها لـە ڕێگـەی پەیامبـەران و کتێبـەکانی خـوا نـەبێت، چـونکە عەقڵەکان جیاوازن، هەندێك عەقڵ هەندێك کردەوە بە چاك دادەنێن کەچی هەندێك عەقڵی تر هەمان کردەوە بە خراپ دادەنێن، زۆربەی کات چاك و خراپی کردەوەکان لەسەر بنچینەی ئارەزوو بڕیاری لەسەر دەدرێت. پێـوەری چـاك و خراپـی شـتەکان لەلایەن ئەشعەرییەکان شەڕعە نەوەك عەقڵ.

---

[1] تبيين كذب المفتري، سەرچاوەی پێشوو.

[2] تشنيف المسامع ١/٤٥، باسی ئەشعەرییەکانی کردووە بە ناوی ئەهلی سوننە.

ئیبن سوبکی لە (جمع الجوامع)دا وتویەتی: (چاکی و خراپی "حسن و قبح" بە واتای گونجان و نەگونجانی لەگەڵ سروشتی مرۆڤ، سیفەتی کامڵی و ناتەواوی، بابەتێکی عەقڵییە، بە واتای سەرزەنشتکرانی هەنووکەیی و سزادانی داهاتووی، لەم ڕووەوە شەڕعییە، بەپێچەوانەی بۆچوونی موعتەزیلەکان).

سەیری وتەی ڕازی) بکە لە کتێبی (المحصول ١/١٢٣ و لاپەڕەکانی دواتری) لەبارەی ئەو وتانەی کوڕی سوبکی هێناویەتی، هەروەها سەیری ئەم دوو سەرچاوانەش بکە: (الفحول للشوكاني ١/٥٤) و (الإنصاف للباقلاني ٥٠) تیایدا هاتووە: (هەموو ڕێسا و یاساکانی شەرع واتا و ئاماژەی ئەوە دەدەن بەدەستەوە کە چاکە ئەو شتەیە کە شەرع بەچاك و پەسەند و دروستی داناوە، خراپەش ئەوەیە کە شەرع قەدەغەی کردووەو بە ناپەسەندی داناوە، مەبەست لەو شتانە لە ڕووی وێنەییەوە نییە).

[3] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٨٢.

بەم پێیە: مرۆڤــ پاداشت لەسەر کردنی هیچ کردەوەیەك، سزا لەسەر نەکردنی هیچ کردەوەیەك وەرناگرێـت. تـەنها ئـەو کاتـە نـەبێت کـە بانگـەوازی پێغەمبـەرانی پێگەیشتبێت و پێی ناساندبێت کە چـی لەسـەر پێویسـتە بیکـات و چ شـتێکیش فەرامۆش بکات، لەبەر ئـەم فەرمایشـتەی خـوای گـەورە: ﴿ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴾ الإسراء: ١٥. واتە: (ئێمەش سزای کەسمان نەداوە تـا پێغەمبـەرێکی بۆ دەنێرین). هەر کەسێك لە کەنارگیرییەکی تەواو ژیـانی بەسـەربرد و بانگـەوازو شەرعی پێغەمبەری پێنەگات ئەو کەسە ئەرکدار نییـە، هـیچ پاداشـت و سـزایەك وەرناگرێت. (ئەهلی فەترەت) بە هەمان شێوە وەکو ئەوانـەن، کـە بـریتین لەوانـەی ژیاون لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەرێك و پێش هاتنی پێغەمبەرێکی تر، ئەوانـە لەلایەن خواوە هیچ ئەرکێکیان پێ نەسپێردراوە[١].

٤- کردەوەکانی خوای گەورە هۆدار (تعليل) ناکرێن[٢]. ئەشعەرییەکان بـۆ ئەوەچـوون کە دروست نییە کردەوەکانی خوا هۆدار بکرێت[٣].

هەندێك لە بەڵگەکانیان:

أ- خوای گەورە دەفـەرموویت: ﴿ لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ ﴾ الأنبيـاء: ٢٣.[٤] واتە: (پرسیار ناکرێت لەوەی کە خوا دەیکات، لە کاتێکدا ئەوان پرسـیاریان لـێ دەکرێت و موحاسەبە دەکرێن).

---

[١] علم أصول الفقه لعبد الوهاب خلاف ٩٧-٩٨.

هەندێك لە زانا لێکۆڵەرەکان ئەو بەشەیان رەت کردۆتەوە، وتویانە: لە راسـتیدا دەگەرێتەوە بۆ ئێش و چێژ. لەبەر ئەمە رازی لە کۆتایی ژیانی دانی نا بەوەی لە کتێبەکەیدا (نهاية العقول)دا باسی کردووە: کە چاکی و خراپی دوو شتی عەقڵیین و چەسپاون لە کرەوەی بەندەکاندا، چونکە واتاکەیان سەر دەکێشێت بۆ ئێش و چێژ./ تشنيف المسامع ٤٥/١.

[٢] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٨٢.

[٣] تعليل الأحكام ٩٧.

[٤] تعليل الأحكام ١٠٢ بەدووری زانیووە بەلگەی پێبهێنرێتەوە، تاريخ المذاهب الإسلامية، سەرچاوەی پێشوو.

ب- ئەگەر کردەوەکە بۆ مەبەستێك بوو ئەوا دەبێت بکەرەکە ناتەواو بێت لە دەروونیدا، بە غەیری خۆی تەواو و کامڵ ببێت، خوای گەورە پاك و بەرزە لەو شتانە[1].

پ- ئەگەر کردەوەکە بۆ مەبەستێك بوو، ئەوا مەبەستەکە هۆیەك بووە کە دەستەوەسانی بکەرەکە دەردەخات[2]. واتە: مەبەستەکە پێویستی بە مەبەستێکی ترە، ئەوەی تریش پێویستی بە یەکێکی تر هەیە، بەمەش کرداری زنجیرەبەندیی (التسلسل) بەدوای خۆیدا دێنێت، کرداری زنجیرەییش پوچ و بێ بنەمایە[3].

دەربڕینەکانی ئەشعەرییەکان جیاواز بوون لەبارەی ڕوونکردنەوەی قەدەغە کردنی هۆدار کردنی کردەوەکانی خوا، کە ئایا کردەوە هۆدار کردن ئەستەمە یان ئەستەم نییە، بەڵام پێویستیش نییە؟.

هەندێك لە ئەشعەرییەکان وتویانە هۆدار کردنی کردەوەکانی خوا شتێکی ئەستەمە.

هەندێکی تر وتویانە: حەقیقەتی مەزهەبی ئەشعەرییەت ئەوەیە کە هۆدار کردنی کردەوەکانی خوا پێویست نییە، ئەم ڕایە بەرامبەر ڕای موعتەزیلەکانە کە دەڵێن پێویستە، ناوەڕۆکی ئەم بۆچوونە ئەوەیە کە دروستە هۆدارکردن، هەروەك چۆن هەندێك ئەمەیان دەربڕیوە بەوەی کردەوەکانی خوای گەورە هۆدارن و پەیوەستن بە بەرژەوەندییەکانەوە ئەمەش لە چاکە و بەخشندەیی خواوەیە[4].

---

[1] نظرية المقاصد للريسوني ٢٢٧ عن السبكي في الإبهاج ٦٢/٣، ونظرية المقاصد ٢٢٨ عن ابن عاشور في تفسيره التحرير والتنوير ٣٨٠/١. وذكره شلبي في تعليل الأحكام ٩٧ و ١٠٠.

[2] التحرير والتنوير،سەرچاوەی پێشوو، بەرپەرچی ئەم دوو بەڵگانەی داوەتەوە. و (ریسونی) لە (نظرية المقاصد) بەرپەرچی ئەم بۆچوونەی هێناوەو وەریگرتووە لە (ئیبن هەمام و صەدری شەریعە).

[3] تعليل الأحكام ١٠٠، چەند بەڵگەیەکی تریشی هێناوەو بەرپەرچیشی داوەتەوە.

[4] تعليل الأحكام ٩٧.

٥- هەر شتێك كە بوونی هەیە، دروستە ببینرێت، خوای گەورەش هەیە، بۆیە دروستە ببینرێت، لە ڕێی بەڵگەی دروستی نەقڵیەوە هاتووە لە قورئان و سوننەتدا كە باوەڕداران خوای گەورە دەبینن لە دوارۆژدا[١].

خودا دەبینرێت بەبێ چوارچێوەو سنوورو چۆنیەتی و ئاوێتەبوون[٢]، واتە: ناكرێت و دروست نییە خوای گەورە ببینرێت لە شوێن یان وێنە یاخود لە بەرامبەر یان بەهۆی بەیەككگەیشتنی تیشك، چونكە ئەم شتە ئەستەمن بۆ خوای گەورە[٣].

بۆچوونەكەی ئیمامی ئەشعەریی مام ناوەند بوو لە نێوان (موشەبیهەكان): كە بۆچوونیان وایە خوای گەورە وەك سەرجەم بینراوەكانی تر بە سنووورداری دەبینرێت و لە نێوان موعتەزیلە و جەهمییەكان و هاوڕاكانیان: كە پێیان وایە خوای گەورە بەهیچ شێوەیەك نابینرێت[٤].

٦- لەبارەی ئەو دەربڕینانەی كە لە قورئانی پیرۆزو سوننەتدا هاتوون و لە ڕووكەشدا وێچواندن (تشبیهی) لێ بەدی دەكرێت، وەك:

(الید) لەم فەرمایشتەی پەروەردگاردا: ﴿يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ﴾ الفتح: ١٠.

(الوجه) لەم فەرمایشتەدا: ﴿وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ﴾ الرحمن: ٢٧.

(الإستواء) لەم فەرمایشتەدا: ﴿ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ﴾ طه: ٥.

---

سوبكي لە: (الإبهاج ١٥٣٣/٣)دا وتویەتی: (زانایانی كەلام - مەبەستی ئەشعەرییەكانە - نەیان وتوە كردەوەكانی خوا هۆدارە بە بەرژەوەندییەكانەوە، چ بەوەی پێویست بێت یان دروست بێت، ئەمە شیاوی بنەماكانی زانایانی كەلامە...، وتویانە دروست نییە كردەوەكانی خوا هۆدار بكرێن)./ ونقله عنه الريسوني في: مقاصد الشريعة ٢٢٧.

[١] الملل والنحل للشهرستاني ٨٧/١ وخطط المقريزي ٣٦٠/٢ و سەیری وتەی ئەشعەری بكە لەم بارەوە لە كتێبی (الإبانة ٥١)و بۆچوونی لەبارەی بینینی خوا لە كتێبی (اللمع ٦١ ولاپەڕەكانی دواتری).

[٢] تبيين كذب المفتري ١٤٩.

[٣] الملل والنحل للشهرستاني، وخطط المقريزي، هەردوو سەرچاوەكەی پێشوو.

[٤] تبيين كذب المفتري، سەرچاوەی پێشوو.

(النزول) لەم فەرمایشتەی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم): **(ينزل ربنا تبارك وتعالى كل ليلة إلى السماء الدنيا حين يبقى ثلث الليل الآخر، فيقول: من يدعوني فأستجب له، ومن يسألني فأُعطيه، ومن يستغفرني فأغفر له)**[1].

ئەشعەری دوو بۆچوونی هەن:

**بۆچوونی یەکەم:** تەئویل نەکردن: خوای گەورە (ید)ێکی هەیە شیاوی زاتی پیرۆزی ئەوە، بەڵام مەبەست لە (ید) دەست نییە وەك دەستی بەدیهێنراوان، بەڵکو مەبەست لە (ید) سیفەتێکی پەروەردگارە، بەهەمان شێوە (الوجە) وەك سیفەتی بیستن و بینینە[2]. (الید) و (وجە) لە سیفەتە خەبەرییەکانن کە لە ڕێی نەقڵ بۆمان هاتوون، بۆیە پێویستە دانی پێدابنێین[3]، بەهەمان شێوە (الإستواء، والنزول) دوو سیفەتن لە سیفەتەکانی خوا، کرداری خوا لە عەرشدا پێی دەوترێت (الإستواء)[4].
ئیمامی ئەشعەری ئەم ڕێبازەی پەسەند کردووە لە کتێبەکەیدا (الإبانة)[5]، ئەمە ڕێبازی پێشینانە[1].

---

[1] فەرموودەی: پەروەردگارمان دادەبەزێت.... تا: في: صحيح البخاري في: ١٩ كتاب التهجد، ١٤ باب الدعاء والصلاة من آخر الليل، رقم ١١٤٥ بهذا اللفظ. وفي: ٨٠ كتاب الدعوات، ١٤ باب لدعاء نصف الليل، رقم ٦٣٢١. وفي: ٩٧ كتاب التوحيد، ٣٥ باب قوله تعالى: ﴿ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا۟ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ﴾ الفتح ١٥، رقم ٧٤٩٤.

[2] تبيين كذب المفتري ١٥.

[3] الملل والنحل للشهرستاني ٨٨/١ وخطط المقريزي ٣٦٠/٢.

[4] تبيين كذب المفتري، سەرچاوەی پێشوو.

[5] ئیمامی ئەشعەری لە کتێبی (الإبانة ٢١-٢٢)دا وتویەتی: (خوای گەورە "إستواء"ی کردووە لەسەر عەرش بەو شێوەیەی کە وتویەتی و بەو مانایەی کە خۆی مەبەستی بووە، جا "إستواء"ەکە پاك و دوور بووە لە بەیەکگەیشتن و جێگیربوون و پاڵدانەوەو ئاوێتە بوون و گوێزرانەوە... خوای پاك و پایەبەرز (وجە)ی هەیە بەبێ چۆنیەتی، هەروەك دەفەرمووێت: ﴿وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴾ الرحمن: ٢٧، خوای پاك و بەرز "يدين: دوو دەست"ی هەیە بەبێ چۆنیەتی، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَىَّ ﴾ ص: ٧٥، هەروەك

ئیمامی ئەشعەری بۆچوونێكی مام ناوەندی هەبوو لە نێوان موعتەزیلە و موشەبیهەكان، موعتەزیلەكان بڕوایان بە تەئویل هەبوو و دەیان وت: (الید) بەمانای توانا و بەخشش و نیعمەت دێت، (إستواء) بەمانای زاڵ بوون دێت، (النزول) واتە دابەزینی هەندێك لە نیشانە و فریشتەكانی پەروەردگار، موشەبیهەكان دەیان وت: (ید)ی خوای گەورە بریتییە لە دەست و ئەندام، و (وجه)ی خوای گەورە بریتییە لە ڕووخساری وێنەی خوا، (إستواء) بریتییە لە دانیشتن و ئاوێتەبوون لەگەڵ عەرشدا، (النزول) واتە: دابەزینی زاتی خوایە بە جوڵە و گوێزرانەوە لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی تر.. [٢].

زەهەبی وتویەتی: چوار دانراوی ئەشعەریم بینیوە لەبارەی بنەماكانی ئایین، كە تیایدا ڕێساكانی پێشینانی لەبارەی بابەتی سیفەتەكانی خوا خستووەتەڕوو و لەبارەیەوە وتویەتی: چۆن هاتووە ئاوا بەڕێدەكرێت. پاشان وتی: ئەمە لەلای من پەسەندە، ئایینداری بەم بۆچوونەوە دەكەم و تەئویل ناكەم[٣].

**بۆچوونی دووەم:** تەئویل كردن، واتە: تەئویل كردنی هەر دەربڕینێك بەشێوەیەك كە دەربڕینەكە ماناكە لە خۆی بگرێت.

جا ئیمامی ئەشعەری وەك موعتەزیلەكان: (ید) بە توانا مانا كردووە[٤].

---

دەشفەرموویێت: ﴿ بَلۡ يَدَاهُ مَبۡسُوطَتَانِ ﴾ المائدة: ٦٤، و خودا "دوو چاوی هەن" بەبێ چۆنیەتی هەروەك خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ تَجۡرِي بِأَعۡيُنِنَا ﴾ القمر: ١٤)، سەیری ١٠٨ و لاپەڕەكانی دواتری بكە كە بەتێروتەسەلی ئەم بابەتەی تێدایە.

لە پەیامەكەی بۆ دانیشتوانی (الثغر ٢٣٣) ڕەوانەی كردووە وتویەتی: (و "إستواء"ی خوا بە مانای زاڵبوونی نایەت بەسەر عەرشدا هەروەك چۆن قەدەرییەكان ئەمە دەڵێن).

[١] الملل والنحل للشهرستاني، سەرچاوەی پێشوو.

[٢] تبيين كذب المفتري، سەرچاوەی پێشوو.

[٣] سير أعلام النبلاء ٨٦/١٥.

[٤] تاريخ المذاهب الإسلامية ١٧٠ و باسی كردووە كە ئەم بۆچوونەی لە كتێبی (اللمع)دا پەسەند كردووە، كەچی من لە كتێبی (اللمع)دا بەدیم نەكرد.

لەبەر ئەمە ئەشعەرییەکان لەبارەی ئەم وشانەوە بۆ دوو ڕا دابەش بوون: یەکەم: نابێت تەئویل بکرێن، دووەم: تەئویل دەکرێن[1].

٧- ئیمان بریتییە لە دان پێدانان بە دڵ.

---

شەهرستانی لە (الملل والنحل ١/٨٨) باسی کردووە کە ئەشعەری وتەیەکی هەیە لەبارەی دروستی تەئویل کردن.

ئیجی لە (المواقف ٨/١١٠ و ١١١) باسی کردووە کە ئەشعەری لە یەکێك لە دوو بۆچوونەکانیدا تەئویل کردنی پەسەند کردووە.

زوبەیدی لە (إتحاف السادة المتقین ٢/٤) لە (ابن کثیر)ەوە هێناویەتی کە وتویەتی: (وتویانە شێخ "ئەبو حەسەنی ئەشعەری" سێ حاڵەتی هەن:

یەکەمیان: ئەو حاڵەتەی کە موعتەزیلە بوو، بێ گومان لەو حاڵەتە پاشگەز بووەوە.

دووەمیان: چەسپاندنی حەوت سیفەتە عەقڵییەکان کە بریتین لە: ژیان (الحیاة)، زانست (العلم)، توانا (القدرة)، بیستن (السمع)، بینین (البصر)، دووان (الکلام)، تەئویل کردنێکی لاوەکی وەك: (وجە)، (یدین)، (الساق) و هاوشێوەکانی ئەمانە.

سێیەمیان: چەسپاندنی سەرجەم سیفەتەکان بەبێ چۆنیەتی و وێچواندان و تێپەڕاندنیان بەپێی ڕێبازی پێشینان، ئەمە ڕێبازی ئەشعەرییە لە کتێبی "الإبانة" کە لە کۆتاییەکاندا داینا و "باقلانی" شرۆڤەی کرد و "ئیبن عەساکر" گواستیەوە، ئەمە ئەو ڕێبازەیە کە "باقلانی" و "ئیمامی حەرەمین" و هاوەڵە ئیمامەکانی پێشوو بۆ ئەو بۆچوونە چوون لە کۆتا بۆچوونەکانیاندا، خوا زاناترە.

د. عەبدوڕەحمانی کوڕی صالح مەحمود لە کتێبەکەیدا "موقف إبن تیمیة من الأشاعرة ١/٣٩١-٣٩٢"لە "زوبەیدییەوە" وەریگرتووەو دواتر وتویەتی: (ئەمە گواستنەوەیەکی ورد نییە، چونکە ئەشعەری لەبارەی سیفەتە خەبەرییەکان بۆچوونێکی وای نییە کە تەئویل کردنی ئەم سیفەتانە پەسەند بکات).

دەڵێم: ئەم وتەیەی کە دەڵێت: (ئەمە گواستنەوەیەکی ورد نییە) وتەیەکە ڕەتکراوەیە بەپێی ئەو شتانەی زانایان باسیان کردووە، ئەشعەرییەکان شارەزاترین خەڵکن سەبارەت بە وتەکانی شێخ ئەشعەری، دەکرێت ئەشعەرییەکان هەندێك شتیان لە ئیمامی ئەشعەری نەقڵ کردبێت کە دواتر خودی سەرچاوەکە نەمابێت کە لێی وەرگیراوە، ئەو شتەی لە ئیمامی ئەشعەرییەوە پێمان گەیشتووە کەمە، هەروەك پێشتر ئەوەمان خستووەتەڕوو.

[1] خطط المقریزي ٢/٣٦. و بڕوانە: المسامرة ٣٧.

دەربڕین بە زمان و کردەوەش بە ئەندامەکان لە لقەکانی ئیمانن.

ئەوەی بە دڵ دانی پێ دابنێت و بەڕاستی بزانێت، واتە: دان بنێت بە یەکتایی خواو پێغەمبەران و پەیامەکانیان ئەو کەسە باوەڕدارو ئیمانداره[1].ئەمە ڕای بەناوبانگی مەزهەبی ئەشعەرییە[2].

٨- ئەو باوەڕدارەی کە خوابەیەکگرەو گوناهی گەورەشی کردووە کە مرد و ماڵئاوایی کرد بەبێ ئەوەی تەوبە بکات، ئەوا حوکمەکەی بەخوا دەسپێرین گەر بیەوێت بە میهرەبانی خۆی لێی خۆش دەبێت یان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) شەفاعەتی بۆ دەکات یان بە دادگەری خۆی لەسەر گوناهەکە سزای دەدات و دواتر بە بەزەیی خۆی دەیباتە بەهەشتەوە، هیچ کەسێکی باوەڕدار بۆ هەتا هەتایە لە دۆزەخدا نامێنێتەوە[3].

ئەو کەسەی (فاسق)ە بەڵام لە ئەهلی قیبلەیە، باوەڕدارە بەو ئیمانەی هەیەتی، لاسارو گوناهبارە بە هۆی لاساری و کردنی گوناهی گەورە[4].

٩- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تکاو شەفاعەتێکی پەسەندکراوی هەیە، بۆ ئەو باوەڕدارانەی شیاوی سزادانن، بە فەرمان و ڕەزامەندی خوا تکاو شەفاعەتیان بۆ دەکات، تەنها تکا بۆ ئەوانە دەکات کە خوای گەورە پێی ڕازی بێت.

---

[1] الملل والنحل للشهرستاني ٨٨/١ وخطط المقريزي ٣٩٠/٢. وسەیری وتەی ئیمامی ئەشعەری بکە لە کتێبەکەیدا (اللمع ١٢٢).

[2] تبصرة الأدلة ٧٩٩/٢ والملل والنحل ٨٨/١ و چەند سەرچاوەیەکی تر کە لە لێکۆڵینەوەکەمدا باسم کردووە: مفهوم الإيمان عند الفرق الإسلامية ٣٠.

بەڵام ئەشعەری بە ڕاشکاوانە لە کتێبی (الإبانة) وتویەتی: ئیمان گوفتارو کردارە./ الإبانة ٢٧.

هەندێك لە ئەشعەرییەکان بۆ ئەوەچوون کە ئیمان بریتییە لە دانپێدان بە دڵ و زمان، کرداری ئەندامەکانی جەستە بە بەشێك نازانن لە ئیمان./ بڕوانە لێکۆڵینەوەکەم: مفهوم الإيمان سەرچاوەی پێشوو ٢٨ سەرچاوەکانیشی تێدایە.

[3] الملل والنحل للشهرستاني، وخطط المقريزي، دوو سەرچاوەکەی پێشوو، وتبيين كذب المفتري ١٥١.

[4] اللمع للأشعري ١٢٢.

ئەم بۆچوونەش مامناوەندە لە نێوان موعەزیلەکان: کە دەڵـێن پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) بەهیچ شێوەیەك هیچ تکاو شـەفاعەتێکی نییـە، ڕافیزەکـان: کـە دەڵـێن پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و عەلی (ڕەزای خوای لەسەر بێت) تکاو شەفاعەتیان هەیە بەبێ گەڕانەوە بۆ فەرمان و ڕەزامەندی خوا، تەنانەت ئەگەر تکـاو شـەفاعەت بۆ بێ باوەڕانیش بکەن تکاکەیان پەسەند دەکرێت[1].

١٠- هیچ کەسێك لە ئەهلی قیبلە تەکفیر ناکرێت.

ئەبو حەسەنی ئەشعەری لە کتێبەکەیدا (الإبانـة) وتویەتی: دان بەوەدا دەنێین کە هیچ یەکێك لە ئەهلی قیبلـە بـەهۆی ئەنجامـدانی گوناهێکـەوە تـەکفیر ناکـەین. مـادام بەحەڵاڵی دانـەنێت وەك: زینـا، دزی، خواردنـەوەی مـەیی، هـەروەك خەواریجـەکان بۆچوونیان وابوو و گومانیان بۆ ئەوە ڕۆیشت کە هەر کەسێك تـاوانی گـەورە بکـات کافرە، ئێمەش دەڵێین: هەر کەسێك گوناهێکی گەورە لە شێوەی ئەو گوناهانە بکات وەك: زینا، دزی، هاوشێوەکانیان و کردنی ئەو گوناهانـە بەحـەڵاڵ دابنێـت و بـڕوای وانەبێك کە حەڕامە ئەوا ئەو کەسە بێ باوەڕو کافرە[2].

ئیبن عەساکر بە زنجیرەو سـەنەدی خـۆی لـە (بـەیهقی ئـەبو بـەکر ئەحمـەدی کـوڕی حوسەینی کوڕی عەلی) گێڕاوەتەوە: کە وتویەتی: گوێبیستی (ئـەبو حـازم عومـەری کوڕی ئەحمەدی عەبدوی حافـز) بووم، دەیوت: گوێبیستی (ئەبو عەلی زاهـری کـوڕی ئەحمـەدی سەرخەسـی) بـووم دەیـوت: کاتێـك لـە مـالی مـن لـە شـاری بەغـداد سەرەمەرگی (ئەبو حەسەنی ئەشـعەری) نزیکبـووەوە، بـانگی منـی کـرد و منـیش چوومە لای، پێی وتم: شایەتی و گەواهی بدە کە من هیچ کەسێك لە ئـەهلی قیبلـە

[1] تبيين كذب المفتري ١٥١. لەبارەی بابەتی شەفاعەت سەیری: الإبانة ٢٤١.بکە.
[2] الإبانة ٢٦.

تەکفیر ناکەم، چونکە هەموویان ئاماژە بۆ یەك پەرستراو دەکەن، ڕاجیاییەکەش تەنها لە دەربڕینەکاندایە[1].

زەهەبی وتویەتی: دان بە هاوشێوەو نزیك لەوەدا دەنێم، هەروەها شێخەکەمان (ئیبن تەیمیە) لە کۆتا ڕۆژەکانی ژیانی دەیوت: هیچ یەکێك لە ئومەت تەکفیر ناکەم، دەیوت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: **(لا يحافظ على الوضوء إلا مؤمن)** واتە: کەسێك پارێزگاری لە دەستنوێژ ناکات مەگەر باوەڕدار نەبێت. هەر کەسێك بە دەستنوێژەوە پابەند بێت بە نوێژەکانەوە ئەوا موسڵمانە[2].

١١- ڕێبازی ئەشعەرییەکان لە بەڵگەهێنانەوە لە بواری بیروباوەڕدا پشت دەبەستێت بە نەقڵ و عەقڵ بەیەکەوە.

عەقڵی نەکردووەتە دادوەر بەسەر دەقەکان تا تەئویلیان بکات وەك موعتەزیلەکان، لە بەردەم ڕووکەشی دەقەکان نەوەستاون، وەك شەڕعناس و فەرموودەناسان، بەڵکو عەقڵیان کردووەتە خزمەتگوزاری ڕووکەشی دەقەکان[3].

## زانایانی مەزهەبی ئەشعەری

ئەو زانا ناودارانەی کە دراوەنەتە پاڵ مەزهەبی ئەشعەری، ئەمەش ناوی هەندێکیانە:

---

[1] تبيين كذب المفتري ١٤٨-١٤٩. وسير أعلام النبلاء ١٥/٨٨ و وتی: وتەیەکی ئەشعەریم بینی سەرنجی ڕاکێشام و بەدڵم بوو، ئەم وتویەی چەسپاوەو بەیهەقی گێڕاویەتیەوەو باسی کردووە.

[2] سير أعلام النبلاء، ، سەیری هەندێك لە وتەکانی ئیبن تەیمیە بکە لە کتێبی: (مجموع الفتاوى ٣/٢٨٢، ١٢/٤٦٦، ٣٥/١٠٠).

فەرموودەی: کەسێك پارێزگاری لە دەستنوێژ ناکات مەگەر باوەڕدار نەبێت، بەشێکە لەم فەرموودەیە: (خۆڕاگیرو چەسپاوبن، پێتان ناژمێردرێت، بزانن چاکترین کردەوەتان نوێژە، کەسێك پارێزگاری لە دەستنوێژ ناکات مەگەر باوەڕدار نەبێت)، رواه أحمد في مسنده وإبن ماجه والحاكم والبيهقي، عن ثوبان. ورواه إبن ماجة أيضا والطبراني عن عبدالله بن عمرو بن العاص. ورواه الطبراني عن سلمة بن الأكوع./ الجامع الصغير ٦٦.

[3] مناهج الإجتهاد في الإسلام ٥٠٥.

ئەبو بەکری حەسەنی باهلی، ئەبو بەکری قەفالی شاشی، ٣٦٥ك ماڵئاوایی کردووە. قازی ئەبو بەکری موحەممەدی کوڕی تەیبی کوڕی باقلانی بەصری، ٤٠٣ك ماڵئاوایی کردووە. ئەبو عەلی دەقاقی نیسابوری، ٤٠٥ك ماڵئاوایی کردووە. حاکمی نیسابوری باوکی عەبدوڵای موحەممەدی کوڕی بەیع، ٤٠٥ك ماڵئاوایی کردووە. موحەممەدی کوڕی حەسەنی کوڕی فورەکی ئەصفەهانی، ٤٠٦ك ماڵئاوایی کردووە. مامۆستا ئەبو ئیسحاقی ئیسفەراییني ئیبراهیمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئیبراهیم، ٤١٨ك ماڵئاوایی کردووە..[1].

[1] ئەمانە هەندێکی ترن لە زانا ئەشعەرییەکان: ئەبو نەعیمی ئەصفەهانی ئەحمەدی کوڕی ئیبراهیم، ٤٣٠ك ماڵئاوایی کردووە. ئەبو زەڕی هەرەوی حافز عەبدی کوڕی موحەممەد، ٤٣٤ك ماڵئاوایی کردووە. و ئەبو جەعفەریی سیمنانی حەنەفی موحەممەدی کوڕی ئەحمەدی دادوەری موسڵ، ٤٤٤ك ماڵئاوایی کردووە. و ئەبو فەتحی سەلیمی کوڕی ئەیوبی ڕازی، ٤٤٧ك ماڵئاوایی کردووە. و حافز ئەبو بەکری بەیهەقی ئەحمەدی کوڕی حوسەین، ٤٥٨ك ماڵئاوایی کردووە. و خەتیبی بەغدادی ئەحمەدی کوڕی عەلی، ٤٦٣ك ماڵئاوایی کردووە. و ئەبو قاسمی قوشەیری نیسابوری، عەبدولکەریمی کوڕی هەوازن، ٤٦٥ك ماڵئاوایی کردووە. و ئەبو موزەففەری ئیسفەراینی شاهفوری کوڕی تاهر، ٤٧١ك ماڵئاوایی کردووە. و ئەبو ئیسحاقی شیرازی ئیبراهیمی کوڕی عەلی، ٤٧٦ك ماڵئاوایی کردووە. و ئەبو مەعالی جوەینی عەبدولمەلیکی کوڕی عەبدوڵای ئیمامی حەرەمەین، ٤٧٨ك ماڵئاوایی کردووە. و ئیمام ئەبو حامدی غەزالی موحەممەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەحمەد، ٥٠٥ك ماڵئاوایی کردووە. تبيين كذب المفترى ١٧٧-٣٧٢ لەم سەرچاوەیدا ژیاننامەی زانا هەرە ناودارەکانی ئەشعەرییەکانی تێدایە تا سەردەمی دانەرەکەی. و سویکی لە: طبقات الشافعية الكبرى ٣/٣٦٨-٣٧٢ نـاوی ئەوانە و جگە لەوانەشی لە ئیبن عەساکرەوە نەقڵی کردووە.

سویوکی چەند چینێکی زۆرتری هێناوە لە چینی زانا ئەشعەرییەکان لەوانەی ئیبن عەساکر باسی کردووەو، سویکی ئەمانەشی زیاد کردووە:

ئەبو بەکر ئەبهەری. و ئەبو موحەممەدی عەبدوڵا کوڕی ئەبو زەیدی عەبدوڕەحمانی قەیرەوانی، ٣٨٦ك ماڵئاوایی کردووە. و ئەبو ئیسحاق ئیبراهیمی کوڕی عەبدوڵای قەلانسی. و ئەبو وەفائی کوڕی عەقیلی حەنبەلی. و دادوەری دادوەران دامغانی حەنەفی باوکی عەبدوڵای موحەممەدی کوڕی عەلی. و دادوەری دادوەران ئەبو بەکر ناصحی حەنەفی. و ئەبو وەلیدی باجی سولەیمانی کوڕی

# مـــاتـــوريـــديـــەكان

## شێخی مەزهەبەكە

ماتوریدیەكان بریتین لە شوێنكەوتوانی ئیمامی ئـەبو مەنصـوری كـوڕی موحەمــەدی كوڕی موحەمەدی كوڕی مەحمودی ماتوریدی[1]، حەنەفی[1]، كە بە (پێشەوای ڕێنیشاندەر: إمام الهدى) ناونراوە[2].

---

خەلەف، ٤٧٤ك ماڵئاوایی كردووە. و ئەبو عومەری كوڕی عەبدولبەری حافز، یوسفی كوڕی عەبدوڵا، ٤٦٣ك ماڵئاوایی كردووە. و ئەبو قاسمی كوڕی عەساكر، عەلی كوڕی حوسەین، ٥٧١ك ماڵئاوایی كردووە. و حافز ئەبو سەعدی كوڕی سەمعانی، عەبدولكەریمی كوڕی موحەممەد، ٥٦٢ك ماڵئاوایی كردووە. و حافز ئەبو تاهری سەلەفی عیمادەدین ئەحمەدی كوڕی موحەممەد، ٥٧٦ك ماڵئاوایی كردووە. و قازی عیازی كوڕی موحەممەدی یەحصەبی، ٥٤٤ك ماڵئاوایی كردووە. و ئیمام ئەبو فەتحی شەهرسانی موحەممەدی كوڕی عەبدولكەریم، ٥٤٨ك ماڵئاوایی كردووە. و ئیمام فەخرەدینی ڕازی، موحەممەدی كوڕی عومەر، ٦٠٦ك ماڵئاوایی كردووە. و سەیفەددینی ئامەدی، ئەبو حەسەنی عەلی، ٦٣١ك ماڵئاوایی كردووە. و شیخولئیسلام عیزەدینی عەبدولعەزیزی كوڕی عەبدولسەلام، ٦٦٠ك ماڵئاوایی كردووە. و شێخ ئەبو عەمری كوڕی حاجبی مالیكی، عوسمانی كوڕی عومەر، ٧٠٢ك ماڵئاوایی كردووە. و شێخ عەلی كوڕی عەبدولكافی سوبكی، ٧٥٦ك ماڵئاوایی كردووە. و شێخ صەفەدینی هیندی، ٧٥٠ك ماڵئاوایی كردووە. و قازی عەزودەدینی ئیجی شیرازی، ٧٥٦ك ماڵئاوایی كردووە./ طبقات الشافعية الكبرى للسبكي ٣/٣٧٠-٣٧٢ مستدركا على إبن عساكر.

زانایان بەردەوام بەدوای یەكدا لەسەر ڕێبازی ئەشعەری بەردەوام بوون كە ژماردنیان سەختە.

[1] الجواهر المضية ٣/٣٦٠ رقم الترجمة ١٥٣٢ وتاج التراجم ٢٤٩ رقم الترجمة ٢١٧ والفوائد البهية ٣١٩ رقم ٤١٢ وكشف الظنون ٢٦٢ و ٣٣٥ و٥١٨ و ٧٥١ و ١٤٠٦ و ١٤٠٨ و ١٥٧٣ و ١٧٨٢. وإتحاف السادة ٥/٢ و أشار الزبيدي إلى ترجمة القرشي في الجواهر المضية، و الإمام مجدالدين أبي الندى إسماعيل بن إبراهيم بن محمد الكناني البلبيسي القاهري في كتاب الأنساب، وذكره أنه يوجد بعض أحواله في إنتساب كتب المذاهب، وأورد حاصل ما ذكروه، و نقل كلام القرشي. وهدية العارفين ٣٦ والفكر السامي، ١٠٨/٢ والأعلام للزركلي ١٩/٧ ومعجم المؤلفين ٦٩٢/٣ ومقدمة كتاب التوحيد الذي حققه: د. فتح الله خليف.

ماتوریـدی دراوەتـە پـاڵ (ماتوریـد)، بـە (ماتوریـت)یش ناودەبرێـت، شـوێنێکە لـە سەمەرقەند[3] یان گوند و لادێیەکە لە سەمەرقەند[4].

## هەندێك لە شێخەکانی

١- ئەبو نەصری عیازی، کە بەو نازناوە ناوبانگی دەرکردووە[5]، کـە نـاوی ئەحمـەدی کوڕی عەبباسی کـوڕی حوسـەینە، کـە دەدرێتـە پـاڵ سـەعدی کـوڕی عوبـادەی ئەنصاری، شەڕعناس و پارێزگارو تێکۆشەرێکی سەمەرقەندی بوو[6].

شێخ ئەبو نەصر لە مەجلیسەکانیدا قسەی نەدەکرد تـا قوتابیەکـەی ئـەبو مەنصـوری ماتوریدی ئامادە نەبوایە، هەر کاتێك شێخی ناوبراو ئەبو مەنصوری ماتوریدی لـە دوور بینی بوایە ئەوا بە سەرسامیەوە تەماشای دەکرد و دەیـوت: ﴿وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخْتَارُ﴾ القصـص: ٦٨.[7] واتە: (هەر پەروەردگاری تۆیە هەرچیەکی بوێـت دروستی دەکات و هەڵی دەبژێرێت).

---

[1] كشف الظنون ٢٦٢ و ٣٣٥ و ٥١٨ وإتحاف السادة وهدية العارفين، دوو سەرچاوەکەی پێشوو.

[2] الجواهر المضية، وتاج التراجم، وإتحاف السادة، وهدية العارفين، سەرچاوەکانی پێشوو.

[3] إتحاف السادة ٢/٥ والفوائد البهية ٣٢٠ وضبط الكلمة بالحروف ونقله عن السمعاني. وفي الأنساب للسمعاني ١١/٥٥ هاتووە: ماتورید: شوێنێکە لە ناو سنووری سەمەرقند، سەمعانی وتویەتی: زیاد لە جارێك چوومەتە نەوێ. و لە: (اللباب لإبن الأثير ٣/١٤٠)دا هاتووە: کە شوێنێکە لە سمرقند. و لە: فكر السامي للحجوي ٣/١٠٩ هاتووە: (ماتوریدی: بە بۆرەیەکی سەروو، دەدرێتە پاڵ شوێنێك لە سەمەرقند، بەپێچەوانەی کمالی کوڕی أبی شریف کە وشەی (ماتوریدی) بە لەسەر "فتح"ی ڕێکخستووە. کە ئەمە بەڕاست لە "فوائد البهية"دا هاتووە). والأعلام للزركلي ٧/١٩.

[4] إتحاف السادة، سەرچاوەی پێشوو.

[5] الجواهر المضية ٣/٣٦٠ وتاج التراجم ٢٤٩ وإتحاف السادة ٢/٥.

[6] إتحاف السادة، سەرچاوەی پێشوو. ونقل ترجمة عن تأريخ سمرقند للإدريسي. وترجم له النسفي في تبصرة الأدلة ١/٣٥٦.

[7] تبصرة الأدلة ١/٣٥٩.

٢- ئەبوبکر ئەحمەدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی صالحی جوزجانی، خاوەنی کتێبی (الفرق والتمییز)[١].

٣- نەصیری کوڕی یەحیای بەلخی، ٢٦٨ك ماڵئاوایی کردووە.

زبیدی باسی کردووە: ئەم سێ شێخانە زانستیان وەرگرتووە لەسەر دەستی أبی سلیمان موسای کوڕی سلیمانی جوزجانی، ئەویش زانستی وەرگرتووە لەسەر دەستی ئەم دوو ئیمامانە: أبی یوسف و موحەممەدی کوڕی حسن[٢].

٤- موحەممەدی کوڕی مقاتیلی ڕازی، دادوەری ناوچەی (ڕەئی).

زبیدی وتویەتی: موحەممەدی کوڕی موقاتیل و نەصیری کوڕی یەحیا زانستیان وەرگرتووە لەسەر دەستی ئەم دوو ئیمامانە: "ئەبو موتیعی حاکمی کوڕی عەبدوڵای بەلخی و ئەبو موقاتیل حەفصی کوڕی موسلیمی سەمەرقندی. هەروەها موحەممەدی کوڕی موقاتیل زانستی لە موحەممەدی کوڕی حەسەنی وەرگرتووە. ئەم چوار شێخانە زانستیان وەرگرتووە لە ئەبو حەنیفە[٣].

### هەندێك لە قوتابیەکانی

ئەبو ئەحمەدی یەعازی لەسەر دەستی ئەبو مەنصوری ماتوریدی شارەزایی پەیداکرد لە گشت جۆری زانستەکاندا[٤]. و حەکیم قازی عیازی ئیسحاقی کوڕی موحەممەدی

---

[١] إتحاف السادة، سەرچاوەی پێشوو. کلنوی لە (الفوائد البهیة ٣١٩)دا وتویەتی: زانستی وەرگرتووە لەسەر دەستی أبوبکر أحمد الجوزجانی ئەویش لە سلیمانی جوزجانی و ئەویش لە موحەممەدەوە.

[٢] إتحاف السادة، سەرچاوەی پێشوو. تیایدا هاتووە: کە (نەصیر) بە (نەصر)یش ناوبراوە.

[٣] إتحاف السادة، سەرچاوەی پێشوو. و باسی کردووە کە (زەهەبی) لە کتێبەکەیدا ژیاننامەی موحەممەدی کوڕی موقاتیلی نووسیوە، لەبارەیەوە وتویەتی: فەرموودەی لە وەکیع و چینەکەی وەکیعی گێڕاوەتەوە.

[٤] تبصرة الأدلة ٣٥٩/١.

سەمەرقندی. و عەلی رەستەغفەنی. و ئەبو موحەممەد عەبدولکەریمی کوڕی موسای بەزدوی[1].

## نووسراو و دانراوەکانی

دانراوی زۆر نایابی دانا، بەرپەرچی درۆیەکانی خاوەن بیروباوەڕە پووچەکانی دایەوە[2]، بۆ نمونە: کتێبی (التوحید)[3]. کتێبی (المقالات)[4] و کتێبی (رد أوائل الأدلة للكعبي)[5]. کتێبی (بیان وهم المعتزلة)[6]. کتێبی (تأویلات القرآن)[7] کە ناونراوە بە (تأویلات أهل

---

(1) الفوائد البهية ٣١٩. و نسفی لە کتێبی (التبصرة، سەرچاوەی پێشوو) هێناویەتی: أبا الحسن الرستغفني.

(2) الفوائد البهية ٢١٩ و الفكر السامي ١٠٨/٢.

(3) تبصرة الأدلة ٣٥٩/١ والجواهر المضية ٣٦٠/٣ وتاج التراجم ٣٤٩. والفوائد البهية، والفكر السامي، والأعلام للزركلي، تیایدا هاتووە: دەستنووسە. و حاجي خليفة لە: كشف الظنون ١٤٠٦ و إسماعيل باشا لە: هدية العارفين ٣٦ ناوی ناوە: كتاب التوحيد و إثبات الصفات. وطبع بتحقيق: د. فتح الله خليف.

(4) تبصرة الأدلة، والجواهر المضية، وتاج التراجم، والفوائد البهية، وهدية العارفين، سەرچاوەکانی پێشوو. و كشف الظنون ١٧٨٢.

(5) تبصرة الأدلة، والجواهر المضية، وتاج التراجم، سێ سەرچاوەکەی پێشوو.

(6) تبصرة الأدلة، والجواهر المضية، وتاج التراجم، وهدية العارفين، و معجم المؤلفين، سەرچاوەکانی پێشوو. وكشف الظنون ٢٦٢. و لە:(الفواد البهية والفكر السامي والأعلام للزركلي)دا هاتووە: كتاب أوهام المعتزلة.

(7) ئەم ناوە (تأويلات القرآن) هاتووە لە: تبصرة الأدلة، والجواهر المضية، وتاج التراجم، سەرچاوەکانی پێشوو. و بەناوی (تأويلات أهل السنه) لەم سەرچاوانەدا هاتووە: (كشف الظنون ٣٣٥) حاجی خەلیفە وەسفی ئەم کتێبەی وەرگرتووە لە قورەیشی لە (جواهر المضية). و بەغدادی لە (هدية العارفين) ئەم کتێبەی بەناوی (تأويلات أهل السنة)ی هێناوە. و زەرکەلی لە کتێبی (الأعلام) وتویەتی: (کتێبی: "تأويلات القرآن"ی هەیە کە دەستنووسە، "تأويلات أهل السنة"شی هەیە بەشی یەکەمی لەچاپ دراوە). و (عومەر ڕیزا کەحالە) باسی کردووە کە ئەم دوو کتێبەی هەن: (تأويلات أهل السنة، وتأويلات القرآن). سەرنج بدە کە زەرکلی و کەحالە ئەم کتێبەیان بە دوو کتێب داناوە، کەچی لە ڕاستیدا یەك کتێبە بەڵام دووناوی هەیە، بە بەڵگەی ئەوەی حاجی خلیفە

السنة). نەسفی وتویەتی: (کتێبێکە لە بواری خۆیدا هیچ کتێبێك لە ئاستیدا نییە، تەنانەت هەموو ئەوانەی کتێبیشیان پێشتر لەوبارەوە نووسیوە ناگەن بە ئاستی ئەم کتێبە. ئای وتەی ئەو ڕەوانبێژە نووسەرانەی لەوبارەوە نووسیویانە چەند جوانە! کتێبی ڕاڤەی قورئان خونچەی گوڵی واتا و دەقە ئاڵۆزەکانی پشکواند، هەوری سەر ڕووی دەقە وێکچووەکانی لادا، بە جوانترین وەسف و ڕێك و پێکترین دارشتنی کرد بۆ حوکمەکانی و حەڵاڵ و حەرامەکەی، خوای گەورە پێشوازی لە سڵاوی ئەو بکات)[1]. کتێبی (شرح الفقه الأكبر) کە دراوەتە پاڵ ئەبی حەنیفە[2]. کتێبی (رد تهذيب الجدل) دانراوی کەعبی[3]. کتێبی (رد كتاب الكعبي في وعيد الفساق)[4]. کتێبی (رد أصول الخمسة)ی دانراوی ئەبو عومەری باهلی[5]. کتێبی ( رد كتاب الإمامة لبعض الروافض)[6]. کتێبی (الرد على أصول القرامطة)[7]. کتێبی (الرد على فروع القرامطة)[1]. کتێبی (مآخذ الشرائع في

---

باسی ئەو کتێبەی کردووە بە ناوی (تأويلات أهل السنة) کەچی وەسفی ئەم کتێبەی لە قورەیشی وەرگرتووە کە خاوەنی (جواهر المضية)یە کە ناوبراو بە ناوی (تأويلات القرآن)ی باس کردووە.

بەشی یەکەمی کتێبەکە چاپ کراوە بەناوی (تأويلات أهل السنة) بتحقيق د. إبراهيم عوضين و السيد عوضين، لە پێشەکیەکەدا وتویانە: ئەم کتێبە بە (تأويلات القرآن) ناودەنرێت، ئەنجومەنی باڵای کاروباری ئیسلامی لە قاهیرە ساڵی ١٣٩١ك-١٩٧١ز لە چاپی داوە. کەواتە کتێبی (تأويلات القرآن) بریتیە لە کتێبی (تاويلات أهل السنة).

[1] تبصرة الأدلة، سەرچاوەی پێشوو. قورەشی لە (جواهر المضية) ئەم وتەیەی لە سەرەتاوە تا دەگاتە (ئەم هونەرە)ی هێناوە.

[2] الأعلام للزركلي، باسی کردووە کە لە چاپ دراوە، و معجم المؤلفين، هەردوو سەرچاوەکەی پێشوو. أبو زهرة لە (تأريخ المذاهب الإسلامية ١٧٨)دا وتویەتی:(بە لێکۆڵینەوەی زانستی دەرکەوتووە کە ئەو "شرح"ە دانراوی "الليث السمرقندي" شەرعناسی حەنەفی ناسراوە).

[3] تبصرة الأدلة، سەرچاوەی پێشوو. وتاج التراجم ٢٥٠ و كشف الظنون ٥١٨ وهدية العارفين ٣٦.

[4] تبصرة الأدلة، وتاج التراجم، دوو سەرچاوەکەی پێشوو.

[5] تبصرة الأدلة، وتاج التراجم، والفوائد البهية و تیایدا هاتووە: دانراوی موحەممەدی باهلییە.

[6] تبصرة الأدلة، وتاج التراجم، والفوائد البهية، سەرچاوەکانی پێشوو.

[7] تبصرة الأدلة وتاج التراجم، دوو سەرچاوەکەی پێشوو. و لە (الفوائد البهية والأعلام)ی زرکلی هاتووە بە ناوی: الرد على القرامطة.

أصول الفقه)[2]. و كتێبی (الجدل) لـە زانسـتی بنـەماكانی فیقهـدا[3]. كتـێبی (الـدرر) لەبارەی بنچینەكانی ئایین[4]. كتێبی (عقيدة الماتريدية)[5].

نەسەفی وتویەتی: (هەر كەسێك دانراو و كتێبەكانی بینی بێت... هەڵوەستەی كردبێـت لەسەر هەندێك لەو شتە وردو مانا سەرنج ڕاكێش و بەڵگە هێنانـەوەی جـوان لـە شـوێنی خۆی و هەڵهێنجانیان لە سەرچاوەو كانگای خۆیان، شارەزا ببێت سـەبارەت بـەوەی چـۆن ڕەچاوی مەرجەكانی پابەنـد كـردن و پابەنـدبوونی كـردووە، شـێوازو ڕەوشـتی گفتوگـۆی بابەتیانەی پاراستووە لە هەڵوەشاندنەوەی بیروباوەڕی ئەوانەی لە خۆیان بایی بوون بە هۆی زیرەكی خۆیان، هەر بابەتێكی هاوڕێ لەگەڵ بەڵگەكەی خۆی خستووەتەڕوو بۆ ئـەوەی بـە یەقین و دڵنیاكەرەوەو سەلمـێنراو فێنكی و ئاسوودەیی بە سینە و دەروونەكان ببەخشێت، ئەو كاتە دەزانێت كە خـوای گـەورە كەرامـەت و توانـای تایبـەتی بـە ماتوریـدی داوە، پشتگیری كراوە لەلایەن خوای بێ نیازو خاوەن شكۆ بە كەرستەی سـەركەوتن و كۆشـش و بریسكەكانی ڕێنوێنی و ڕاست پێكان، ئەو زانستانەی كە لەلای ئەو كۆببونەوە لە زانسـتە ئـایینی و عەقڵیـەكانی تـر ئـەوا لـە زۆرێـك لـەو كەسـە بـەرزو زانسـتخوازانەی تـردا كۆنابنەوە)[6].

---

[1] تبصرة الأدلة وتاج التراجم، دوو سەرچاوەكەی پێشوو.

[2] تبصرة الأدلة، وتاج التراجم، والأعلام للزركلي، ومعجم المؤلفين، سەرچاوەكانی پێشوو. كشف الظنون ١٥٧٣ وهدية العارفين ٣٧. و لە: (فوائد البهية) و (الفكر السامي)دا هاتووە بەناوی: مآخذ الشرائع في الفقه.

[3] تبصرة الأدلة، وتاج التراجم، والفوائد البهية، والفكر السامي، سەرچاوەكانی پێشوو، وكشف الظنون ١٤٠٨. ئەم كتێبە ناوی (الجدل) هاتووە لە: هدية العارفين و الأعلام للزركلي.

[4] كشف الظنون ٧٥١ و هدية العارفين، دوو سەرچاوەكەی پێشوو.

[5] هدية العارفين،سەرچاوەی پێشوو.

[6] تبصرة الأدلة ٣٥٩/١.

ئیبن بەیازی لە: (إشارات المرام)دا وتویەتی: (ماتوریدی ئەم بنەمایانەی بە بەڵگە سەلمێنراو و بڕاوەكان لە كتێبەكانیدا خستووەتەڕوو، زۆر بە ڕێك و پێكی لق و پۆپەكانی دیاریكردووە بە

## ستایشکرانی لەلایەن زانایانەوە

بە جوانترین و ڕێك و پێكترین وەسف أبو مەنصوری ماتوریدی وەسف کراوەو ستایشی کراوە.

نەسەفی وتویەتی: ماتوریدی ئەو کەسەیە کە چووەتە قوڵایی دەریاکان و گەوهەرەکانی دەرهێناوە، بەڵگەکانی ئایینی خستەڕوو و بە ڕەوانبێژیی و جوانپێژیی و زانستە فراوانەکەی ڕازاوەیی زیاتری بە جوانی ئایین بەخشی، تەنانەت شێخ (أبو القاسم الحکیم) فەرمانی کرد کە کاتێ مرد لەسەر گۆڕەکەی بنوسرێت: (ئەمە گۆڕی ئەو کەسەیە کە زانستی بە هەناسەکانی وەرگرتووە، کۆششی خۆی خەرج کرد لە هەڵهێنجان و بڵاو کردنەوەی زانستدا، شوێنەوارو جێ دەستی لە ئاییندا ستایش کراوە، لە تەمەنی خۆیدا بەرهەمی ئەوەی چنی)[1]. دواتر نەسەفی دەڵێت: ئەم وتەیەی هەندێك لە ڕەوانبێژ نووسەکان وتویانە لەبارەی وەسفی ماتوریدی چەند جوان بووە: یەکێك بوو لە پێشەواو ئیمامە گەورەکان، یەکێك بوو لە کۆڵەگەکانی ئایین[2].

بەهەمان شێوە وەسف کراوە بەوەی یەکێکە لە زانا گەورەکان[3]، پێشەوای زانایانی

---

تیشکەکانی بەڵگە دڵنیاکەرەوەکان).

شێخ (زاهد کەوسەری) لەو پێشەکیەی بۆ کتێبی (إشارات المرام) نووسیویەتی، وتویەتی: (وڵاتانی ئەودیو ڕووبار "ما وراء النهر" سەلامەت و پاك بوون لە هەواو هەوەسبازی، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە سوننەت بەبێ ڕکابەر دەسەڵاتی تەواوی هەبوو بەسەر دەروونەکان، جا نەوە دوای نەوە شوێنەوارەکانیان دەگواستەوە، تا ئیمامی سوننەت "ئەبو مەنصوری ماتوریدی" لە وڵاتی "ما وراء النهر" هات، کە ناسراوە بە "پێشەوای ڕێنیشاندەر: إمام الهدی"، ناوبراو خۆی یەکلا کردەوە بۆ لێکۆڵینەوەو وردبینی کردن لە بابەتەکان و بەڵگەکانیان، بەهۆی دانراوەکانی ڕەزامەندی هەردوو لایەنی عەقڵ و شەرعی بەدەستهێنا). تأریخ المذاهب الإسلامیة ١٧٨ نقلا عن إشارات المرام والمقدمة.

[1] تبصرة الأدلة ٣٥٨/١.

[2] تبصرة الأدلة ٣٥٩/١.

[3] الجواهر المضیة ٣٦٠/٣.

کەلامە، ڕاستکەرەوەی بیروباوەڕی موسڵمانانە[1].

ئیمامێکی ڕێزدارو بەرگریکار بووە لە ئایین، بیروباوەری ئەهلی سوننەی بەهێز دەکرد، موعتەزیلە و بیدعەچییەکانی لەت لەت کردلە مێزگەردەکانی دا، لە گفتوگۆکانیدا دژەڕاکانی بێ دەنگکرد، جا بەڕاستی سەرخەری سوننەت و لەناوبەری بیدعەیە، زیندووکەرەوەی شەریعەتە.

زوبەیدی وتویەتی: لە وتەی هەندێك لە شێخە ڕێزدارەکانی تەریقەت بیستوومە کە وتویانە: ماتوریدی مەهدی ئوممەت بووە لە کاتی خۆیدا[2].

## ماڵئاوایی کردنی

ساڵی ٣٣٣ك[3]- ٩٤٤ز کۆچی دوایی کردووە، کەمێك دوای کۆچی دوایی کردنی ئەبو حەسەنی ئەشعەری[4]، گۆڕەکەی لە سەمەرقەندە[5].

---

[1] الفوائد البهية ٣١٩. و لە: الفكر السامي ١٠٨/٢ هاتووە: پێشەوای زانایانی کەلام. و لە: الأعلام للزركلي ١٩/٧ هاتووە: یەکێکە لە پێشەواکانی زانایانی کەلام.

[2] إتحاف السادة ٥/٢.

[3] الجواهر المضية ٣٦١/٣ وتاج التراجم ٣٥٠ والفوائد البهية ٣٢٠ وكشف الظنون ٢٦٢ و ٣٣٥ و ٥١٨ و ١٤٠٨ و ١٥٧٣ و ١٧٨٢ وهدية العارفين ٣٦ والفكر السامي ١٠٩ والأعلام للزركلي ١٩/٧ ومعجم المألفين ٦٩٢/٣ مێژووی لە دایك بوونی لەم دووانەدا هاتووە.

بەڵام لە: كشف الظنون ١٤٠٦ هاتووە: کۆچی دواییەکەی ساڵی ٣٣٢ك سێ سەد و سی و دوو بووە، ئەمە هەڵەیە، دەکرێت هەڵەی چاپ بووبێت.

[4] تبصرة الأدلة ٣٦٠/١ والجواهر المضية، سەرچاوەی پێشوو.

[5] الجواهر المضية للقرشي، سەرچاوەی پێشوو، دواتر قورشی وتویەتی: بە نووسینی شێخمان (أبی الحسن علی الحنفی) و بە نووسینی شێخمان (قطب الدين عبدالكريم) بينيم کە سێ سەد و سی و سێ بوو. و إتحاف السادة ٥/٢ نقلا عن القرشي، وذكر الحافظ قطب الدين عبدالكريم بن المنير الحلبي الحنفي.

لەم سەرچاوانەدا: تاج التراجم، هدية العارفين، والأعلام للزركلي، معجم الألفين، سەرچاوەکانی پێشوو. هاتووە: (کە لە سەمەرقند کۆچی دوایی کردووە).

## مەزهەبی ماتوریدی مەزهەبی ئیمامی ئەبو حەنیفەیە

ماتوریدییەکان مەزهەبەکەیان لە ئەبو حەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) وەرگرتووە[1].

(ئیبن بەیازی) کە یەکێکە لە زانایانی ماتوریدی وتویەتی: ماتوریدییەکان شوێنکەوتووی ئەشعەری نین لەبەر ئەوەی مەزهەبی ئەهلی سوننەی دەرخست هەروەك واگومان براوە، چونکە ماتوریدی درێژەپێدەری مەزهەبی ئیمامی أبو حنیفە و هاوەڵەکانیەتی کە ناوبراوان بەر لە ئەشعەریی مەزهەبی ئەهلی سوننەیان دەرخستووە[2].

ماتوریدی بنچینەی کتێبەکانی لەسەر چەند بابەتێك دامەزراندووە کە وەریگرتووە لە دەقەکانی ئیمامی أبو حنیفە، کتێبەکانیش بریتین لەمانە: (الفقە الأکبر، الرسالة، الفقە الأبسط، والعالِم والمتعلم، والوصیة المنسوبة إلی الإمام)، جا ماتوریدی بۆ ئەم کتێبانە سوودی بینیوە لە: دەربڕینێك، ئاماژەیەك یان مانایەك یاخود خوازراوێك (إقتضاء) یان مانای پێچەوانە (مفهوم المخالفة)[3].

## ئەهلی سوننە و جەماعەت

ئەگەر زاراوەی (ئەهلی سوننە و جەماعەت) بەکارهێنرا، ئەوا مەبەست پێی ئەشعەریی و ماتوریدییەکانن.

خەیالی لە حاشیەکەی لەسەر (شرح العقائد)دا وتویەتی: ئەشعەرییەکان بریتین لە (ئەهلی سوننە و جەماعەت)، ئەمە بۆچوونی بەربڵاوە لە وڵاتانی (خوراسان، عێراق، شام، زۆربەی وڵاتانی تر).

لە وڵاتی (ما وراء النهر) ناوی (ئەهلی سوننە و جەماعەت) بۆ ماتوریدییەکان، واتە: هاوەڵانی ئیمامی أبو منصور بەکاردێت.

کەستەلی لە (حاشیة)ەکەیدا وتویەتی: ئەوەی ناوبانگی دەرکردووە بە ئەهلی سوننە لە وڵاتانی (خوراسان، عێراق، شام و زۆربەی وڵاتان) ئەشعەرییەکانن: کە بریتین لە هاوەڵانی

---

[1] تبصرة الأدلة ١/٣١٠.

[2] إتحاف السادة ٢/٥.

[3] إتحاف السادة ٢/١٣.

(ئەبو حەسەنی ئەشعەری)، ئەشعەری یەکەم کەس بوو کە پێچەوانەی أبو علی جبائی جوڵایەوەو لە مەزهەبە کۆنەکەی پاشگەزبووەوەو هاتە سەر سوننەت، واتە ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، جەماعەت: واتە ڕێ و شوێنی هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێبێت). و لە وڵاتی (ئەودیو ڕووبار: ما وراء النهر) ئەم ناوە بەکاردێت بۆ ماتوریدییەکان: هاوەڵانی ئەبو مەنصوری ماتوریدی قوتابی (ئەبو نەصری عیازی) قوتابی (ئەبو بەکری جوزجانی) هاوەڵی (ئەبو سولەیمانی جوزجانی) هاوەڵی (موحەممەدی کوڕی حەسەنی شیبانی هاوەڵی ئیمامی ئەبو حەنیفە)[1].

سەفارینی ئەم تاقمەشی خستووەتە پاڵ ئەشعەری و ماتوریدییەکان وەك (ئەهلی سوننە و جەماعەت) کە: شوێنەوارگەرا (الأثرية)کانن، پێشەواکەیان ئەحمەدی کوڕی حەنبەلە (ڕەزای خوای لێبێت) [2].

## ڕاجیایی نێوان ئەشعەریەکان و ماتوریدییەکان

لە نێوان هەر دوو کۆمەڵی ناوبراودا ڕاجیایی هەیە لە هەندێك بابەتی بنچینەییدا وەك بابەتی پێکهێنان (تکوین)، بابەتی هەڵاواردن لە ئیماندا، بابەتی باوەڕو ئیمانی کەسی لاساییکەرەوە (مقلد).

زانا لێکۆڵەرەکانی هەر دوو کۆمەڵەکە هیچ کام ئەویتر تۆمەتبار ناکات بە گومڕایی و سەرگەردانی[3].

---

[1] إتحاف السادة ٦/٢. و سەیری ئەمە بکە لەو سەرچاوانەشدا: حاشية الخيالي أحمد بن موسى،ساڵی ٨٦٠ك ماڵاوایی کردووە، علی شرح العقائد النسفية للتفتازاني ٢١. وحاشية الكستلي مصلح الدين مصطفى، ساڵی ٩٠١ك ماڵئاوایی کردووە، علی شرح العقائد النسفية للتفتازاني ١٧.

[2] لوامع الانوار البهية ٧٣/١. لە پەراوێزدا چەند وەڵامێك هاتوون کە دەیەوێت لە دەرەنجامەکەدا ئەوە بسەپێنێت کە ئەهلی سوننە و جەماعەت تەنها شوێنەوارگەرا (الأثرية)کانیانن.

[3] إتحاف السادة، سەرچاوەی پێشوو، والروضة البهية فيما بين الأشاعرة والماتريدية لإبن أبي عذبة ٢٣.

(تەقیەدینی سوبکی) بۆ ئەوە چووە کە ڕاجیایی نێوان هەر دوو کۆمەڵەکە لە سێ بابەتدایە لە ئەنجامی ئەو هەڵهێنجانەی کردوویەتی لە (عقیدة)ی ئەبو جەعفەری تەحاویدا.

تاجی سوبکی کوڕی ناوبراو سێ بابەتی تری بۆ سێیەکەی دیکەی زیاد کردوون کە دەریهێناوە لە کتێبی ماتوریدییەکان.

جگە لە (تاج)، هەندێکی تر حەوت بابەتی تریان زیاد کردووە.

فازیل عەبدوڕەحیمی کوڕی عەلی حەنەفی لە کتێبەکەیدا (نظم الفرائد و جمع الفوائد) چل بابەتی بە بەڵگەکانیەوە بە تێرو تەسەلی خستووەتەڕوو، زۆر لەسەری دواوە.

زانای بلیمەت مەلا (عەلی قاری) لە (شرح الفقه الأكبر)دا ئەم بابەتەی بەتێرو تەسەلی خستۆتەڕوو.

زانای بلیمەت (بەیازی) لە کتێبەکەیدا (إشارات المرام من عبارات الإمام) پەنجا بابەتی هێناوە کە جێگای ڕاجیایین لە بابەتە لاوەکییەکانی زانستی کەلامدا، کە هەموو وتە و بۆچوونە پرش و بڵاوەکانی کۆکردۆتەوەو پوختی کردوونەتەوە[1].

شێخ موحەممەد ئەبو زەهرە وتویەتی: (زۆرێک بۆچوونیان وابوو کە ڕاجیایی نێوان ئەشعەری و ماتوریدییەکان ڕاجیاییەکی گەورە نییە، تەنانەت مامۆستا شێخ موحەممەد عەبدە لە نووسینی ڕوونکردنەوەکەی لەسەر "عقائد العضدية" بڕیاریداوە کە ڕاجیایی نێوان ماتوریدی و ئەشعەرییەکان لە (دە) بابەت تێپەڕی نەکردووە، ڕاجیاییەکەش تەنها لە دەربڕیندایە.

---

[1] إتحاف السادة ۲/۱۲-۱۳ پەنجا مەسەلەی ژماردووە. و کتاب نظم الفرائد و جمع الفوائد للعلامة عبدالرحيمى كوڕى بن علي الشهير بشيخ زاده، ساڵی ۹٤٤ك-۱٥۳۷ز ماڵئاوایی کردووە، ساڵی ۱۳۱۷ك لە میسر چاپ کراوە، ئیبن ئەبو عەزبەی حەسەنی عەبدولموحسین، ساڵی ۱۱۷۲ك-۱۷٥۸ز، کتێبەکەی خۆی نووسیوە: (الروضة البهية فيما بين الأشاعرة والماتريدية)، لە بەشی یەکەم باسی ئەو بابەتانەی کردووە کە ڕاجیاییان لەسەرەو ڕاجیاییەکەش تەنها لە دەربڕیندایە ئەویش حەوت بابەتن، لە بەشی دووەمیشدا ئەو بابەتانەی ژماردووە کە ڕاجیاییان لەسەرە و ڕاجیاییەکەش واتاییە ئەویش بە حەوت بابەتی ژماردووە.

بـەڵام لـە کـاتی لێکۆڵینـەوەی تێروتەسـەل و قـوڵ بـۆ ڕاو بۆچـوونی ماتوریـدی و ئەشعەرییەکان لە دەرەنجامدا ئەوە بەدەردەکەوێت کە جیاوازی هەیە لـە بیرکردنـەوەو ئـەو دەرەنجامەی دوو ئیمامەکەی دەستیان کەوتووە)[1].

هەندێك لەو ڕاجیاییە لـەم کتێبـەدا لـە دوو تـوێی بابەتـە بەراییـەکانی بیروبـاوەڕدا دەخەینەڕوو، ئەمەش لە کاتی بەراورد کردنی ڕاو بۆچوونی مەزهەبە جیاوازەکان.

## ڕاو بۆچوونەکانی ئەبو مەنصوری ماتوریدی

گرنگترین بۆچوونەکانی:

١- لەبارەی ناسینی خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ:

ماتوریدییەکان بۆچوونیان وایە کە دەکرێت بە عەقڵ پەیی بە پێویست بوونی ناسینی خوا ببرێت، چونکە ئەگەر عەقڵ دوور بێت لە هـەواو هـەوەس و لاسـایی کردنـەوە (تەقلیـد) و سـەیری ئاسمانـەکان و زەوی بکـات وەك چـۆن خـوای گـەورە فـەرمانی پێکردووە لە چەندین ئایەتدا، ئەگەر عەقڵ بەم کارە هەڵبستێت ئـەوا دەگاتـە بـاوەڕ هێنان بە خوای پاك و تاك.

ماتوریدی بۆچوونیان وایە عـەقڵ بەشـێوەیەکی سـەربەخۆ دەتوانێـت خـوای گـەورە بناسێت، بەڵام بۆچوونیشی وایە کە ناتوانێت سەربەخۆو بەتەنیا هەموو ئەو حوکمانە بناسێت کە بە مرۆڤـ ڕاسپێردراوە، ئەمە ڕای ئیمامی ئەبو حەنیفەشە.

موعتەزیلەکان بۆچوونیان وایە کە عەقڵ دەتوانێت پەیی بە پێوسـت بـوونی ناسـینی خوا ببات، پێویست بوون لەلایەن ئەو لایەنەوە نابێت کە پێویستکردنی بەدەستە کە خوای پاك و بەرزە.

ئەشعەرییەکان بۆچوونیان وایە کە ناسینی خوای گەورە بە شەرع پێویستە[2].

---

[1] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٧٩.

[2] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٧٩-١٨٢.

٢- ماتوریدی سیفەتە واتاییەکانی بۆ خوای گەورە چەسپاند، کە ئەمانەن: توانا، ویست، زانست، بیستن، بینین، دوان، ژیان. بەڵام وتویەتی: سیفەتەکانی خوا شتێکی جیاواز نین لە زاتی خوا، سیفەتەکان شتێك نین ڕاوەستاو و پەیوەست بن بە زاتی خوا و جیایش نین لە زاتی خوا، سیفەتەکان خاوەنی بوونی سەربەخۆ و جیا نین لە زاتی خوا.

ماتوریدی دەڵێت کە سیفەتەکان شتێکی جیاواز نین لە زاتی خوا، بەمەش خەریکە کۆك بێت لەگەڵ موعتەزیلەکان کە دەڵێن هیچ شتێك جگە لە زات نییە[1].

٣- ئەو دەقانەی لە قورئانی پیرۆزو ئەو هەواڵ و خەبەرانەی کە سیفەتە خەبەرییەکان لە خۆ دەگرن کە لە ڕووکەشدا وێکچواندیان لێ بەدەر دەکەوێت و باس لەوە دەکەن کە خوای گەورە خاوەنی: ڕووخسارو دەست و چاوە.... تاد. ماتوریدی ئەم دەقانەی تەئویل کردووە.

ئەم فەرمایشتەی خوا: ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ﴾ الأعراف: ٥٤. وتویەتی: دەکرێت ماناکەی ئەوەبێت کە مەبەستی بۆ چووە و دروستی کردووە بەڕێك و پێکی و جێگیرەوە.

---

شێخ عەلی ئەلقاری لە (شرح الفقه الاکبر ٢٣٧-٢٣٨)دا وتویەتی: (لەلایەن ماتوریدی و زۆربەی شێخەکانی عێراق ناسینی خوا لەسەر منداڵ پێویستە، ئەمەش لەبەر گشتگیری ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم): قەڵەم لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە: منداڵ تا بالغ دەبێت، واتە: هاتنە خوارەوەی مەنی لە نووستندا (إحتلام)....، لەلایەن ئەشعەرییەکان ناسینی خوای لەسەر پێویست نییە، لەبەر ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾ الإسراء: ١٥. واتە: (ئێمەش سزای کەسمان نەداوە تا پێغەمبەرێکی بۆ دەنێرین). بەرهەمی ئەو ڕاجیاییە بەدەر دەکەوێت لەبارەی ئەو کەسەی بانگەوازو پەیامی پێغەمبەری هەرگیز پێنەگەیشتووەو ئەو کەسەی مردووە بەبێ ئەوەی بڕوا بەخوا بێنێت، ئەو کەسانە لەلایەن ماتوریدییەکان سزا دەدرێن، لەلایەن ئەشعەرییەکان سزا نادرێن. بەهەمان شێوە هەمان بۆچوونیان هەیە لەبارەی ئەوەی کە لەو ماوەیە مردوون باوەڕیان نەهێناوە بەخوا کە پێغەمبەری تێدا نەهاتووە "فترة" لە نێوان پێغەمبەر عیسا "سڵاوی خوای لێبێت" و موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)). / سەیری ئەمەش بکە: الروضة البهية فيما بين الأشاعرة والماتريدية ٩٧.

[1] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٨٥-١٨٦.

ئەم فەرمایشتەی ڕاڤە کردووە: ﴿ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ ﴾ ق: ١٦. ئاماژەیە بۆ دەسەڵات و کامڵی توانای خوای گەورە.

ماتوریدی لەم بۆچوونەی کۆك و تەبایە لەگەڵ موعتەزیلە و ئەشعەرییەکان کە تەئویل کردن پەسەند دەکەن[1].

٤- خوای گەورە پاکە لەکاری ناشیاو، کارەکانی خوای گەورە هەموویان پڕن لە حیکمەت و دانایی، چونکە دانای زانایە وەك چۆن وەسفی خۆی کردووە.

خوای گەورە لە کردارەکانی ئەم حیکمەتە دەخوازێت، خوای گەورە لەوەی کە ئەم حیکمەتەی خواستووە ناچار کراو نییە، چونکە سەرپشکە و چی بیەوێت دەیکات، نا وترێت: کردنی کاری چاکە و چاکتر پێویستە لەسەر خوا، چونکە پێویست بوون پێچەوانەی ویستە، پێویست بوون ئەوە دەگەیەنێت کە جگە لە خوای گەورە مافی بەسەر خواوە هەیە. خوای گەورە لەبارەی ئەو کارانەی دەیکات پرسیاری لێ ناکرێت.

---

[1] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٨٧.

لە بابەتی (ئەو دەقانەی لە ڕووکەشدا وێچواندیان لێ بەدی دەکرێت) ئەوە دەخرێتەڕوو: کە هەڵوەستە کردن لە ئاست تەئویل کردنی (إستواء) ڕای ماتوریدیە لە (کتاب التوحید ٧٤) و لێکۆڵەرەکانی لە پێشەکیەکیدا ٤١، باسیان کردووە: ئەمە بۆچوونی غەزنەوییە لە ماتوریدییەکان لە کتێبەکەیدا (أصول الدين ٧٥) هاتووە: (ئیستوائی خوا لەسەر عەرش ڕاست و ڕەوایە، ئێمەش ئیمانمان هەیە و بڕوامان پێی هەیە بەو شێوەیەی کە خوای گەورە ویستویەتی و خۆمان سەرقاڵ ناکەین بە چۆنیەتیەکەیەوە).

ئەوەی بەدەر دەکەوێت ئەوەیە کە ماتوریدی دوو بۆچوونیان لەم بارەوە هەیە، (اللامشي) لە (التمهيد ٦٤) وتویەتی: (هەندێك لە شێخەکانمان وتویانە بڕوامان پێ هەیە - بە وێکچووەکان - خۆمان سەرقاڵ ناکەین بە تەئویل کردنیان، هەندێکیان وتویانە بە شێوەیەك تەئویلیان دەکەین کە تێك نەگیرێت لە گەڵ بەڵگەکانی خوا. ئەمەش وەك: إستواء بەکاردەهێنرێت و دەکرێت بە مانای جێگیر بوون بێتن دەشکرێت بە مانای زاڵ بوون بێت، بۆیە بە زاڵ بوون ڕاڤەی دەکەین بۆ ئەوەی تێکگیران دروست نەبێت).

پێویست بوون ئەوە دەگەیەنێت کە لێپرسینەوەی لەگەڵ بکرێت لەسەر ئەو کارانەی دەیکات[1].

٥- خراپی بە عەقڵ چەسپاوە، بەڵام سزا پەیوەستە بە شەرعەوە.

ئەم بۆچوونەی ماتوریدییەکانیان لە أبو حەنیفە گێڕاوەتەوە، سعدی کوڕی علی زنجانی شافعی کە یەکێکە لە ئەشعەرییەکان ئەم بۆچوونەی پەسەند کردوە، أبو خطابی حەنبەلیش ئەمەی پەسەند کردووە[2].

عەبدولوەهاب خەلاف ئەم ڕایەی پەسەند کردووەو وتویەتی: ئەمە مەزهەبێکی مام ناوەند و دادگەرە[3].

ماتوریدییەکان پێیان وایە شتەکان لە خودی خۆیان باشی و خراپیان هەیە، عەقڵ دەتوانێت پەیی بە خراپی و باشی هەندێك شت ببات، بەڵام هەرگیز عەقڵ ناتوانێت پەیی بە ئەرکە ئایینەکان ببات، چونکە دادوەر لە ئەرکە ئایینیەکان تەنها خوایە[4]، چونکە عەقڵەکان هەر چەندە پێبگەن لەوانەیە تووشی هەڵە بن، هیچ پەیوەست بوونێك لە نێوان حوکمەکانی خواو پەیی پێردنی عەقڵ نییە[5].

ئەمەش لەبەر ئەوەی پەیڕەوی ماتوریدی بەوە جیادەکرێتەوە کە لە پەیڕەوی ناوبراو دەسەڵاتێکی مەزن بەبێ زیادەڕەوی بە عەقڵ دراوە، بەڵام بە ئەندازەی موعتەزیلەکان پشتی پێ نابەستن.

---

[1] تأريخ المذاهب الإسلامية ٨٣. و وتەی شبلی لە (تعليل الأحكام ٩٧) هێناویەتی و وتویەتی: ئەمە دادگەرترین وتەیە و دوورترینیانە لە زیادەڕۆچوون. و سەیری ئەمەش بکە: نظم الفرائد وجمع الفوائد للعلامة عبدالرحيم بن علي الشهير بشيخ زاده ٣١.

[2] تشنيف المسامع ٤٦/١ ماتوریدییەکانی بە حەنەفی ناوناوە. ونقله عواد المعتق في المعتزلة ١٦٧ عن مدارج السالكين لإبن القيم ٢٣١/١.

[3] علم أصول الفقه لعبدالوهاب خلاف ٩٩.

[4] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٨٢.

[5] علم أصول الفقه لعبدالوهاب خلاف، سەرچاوەی پێشوو.

ئیمامی ماتوریدی پێی وایە کە عەقڵ سەرچاوەیەکە لە سەرچاوەکانی زانین (المعرفة)، بەڵام لە خلیسکانی عەقڵ دەترسێت، بۆیە بۆ خۆپاراستن لە خلیسکان پشتیان بەست بە نەقل لە پاڵ عەقڵدا، وتویەتی: (هەر کەسێك نکۆڵی لێبکات - پشت بەستن بە نەقل - و ویستی هەموو ئەو شتانە دەست بخات کە لە عەقڵ شاراوەن و مەبەستیشی وابوو کە شارەزا ببێت بە گشت حیکمەتەکانی پەروەردگاریتی بە عەقڵە کەم و کورتە سنووردارەکەی بەبێ ئاماژەی ئەو - پێغەمبەر - ئەوا ئەو کەسە ستەم لە عەقڵ دەکات، کارێك بە عەقڵەکەی دەکات کە لە توانایدا نییە).

دەرەنجامی ئەم وتەیە ئەوەیە: حوکمی عەقڵ لەو شتانەدا وەردەگرێت کە پێچەوانەی شەرع نەبێت، جا ئەگەر حوکمی عەقڵ پێچەوانەی شەرع بوو ئەوا ئەو کاتە پێویستە ملکەچی بنوێنرێت بۆ شەرع.

ئالێرەوە تێروانینی وابوو کە ئەو سەرچاوەیەی زانستی بیروباوەڕ پێویست دەکات بریتییە لە نەقڵ و عەقڵ بەیەکەوە.

بۆیە بۆچوونەکانی لە نێوان موعتەزیلە و ئەشعەرییەکان بوو[1].

٦- کردەوەی بەندەکان بەدیهێنراوی خوایە، چونکە خوای گەورە بەدیهێنەری هەموو شتێکە، خوای پاك و تاك دەفەرموویت:﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴾ الصافات: ٩٦.[2] واتە: (خوا ئێوەیش و هەموو ئەو شتانەی بەدیهێناوە کە ئێوە دەیانکەن). هەروەها

---

[1] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٧٩-١٨١ و ئەم وتەیەی لە کوسەری وەرگرتووە: (ئەشعەرییەکان لە نێوان موعتەزیلە و فەرموودەناساندان و ماتوریدییەکانیش لە نێوان موعتەزیلە و ئەشعەرییەکاندان). بڕوانە: مناهج الإجتهاد في الإسلام ٥٠٥.

[2] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٨٤.

دەفەرمووێت: ﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ ﴾ الزمر: ٦٢. واتە: (خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە).

ڕای ماتوریدی وەك ئەشعەرییە: بەوەی بەندە بە دەستهێنان (کسب)ی هەیە، سزاو پاداشت بەپێی بەدەستهێنانەکە دەبێت.

بەڵام ماتوریدی پێیان وایە بە دەستهێنان (کسب) لە ڕێگەی هێزێکەوەیە کە خوای گەورە بە بەندەی داوە، جا بەپێی بۆچوونی ماتوریدی بەندە دەتوانێت بەهۆی ئەو هێزەی تیایدا بەدیهێنراوە کردەوە بەدەست بهێنێت، دەشتوانێت بەهەمان هێز کردەوەکە بەدەست نەهێنێت، بەندە سەرپشکە لە بەدەستهێنان (کسب)دا، ئەگەر بیەوێت کارەکە دەکات و پەیوەست دەبێت بەو کردەوەیەی کە بەدیهێنراوی خوای گەورەیە، ئەگەر بیەوێت کارەکە فەرامۆش دەکات، بۆیە سزاو پاداشت بەم پێیە دەبێت.

ماتوریدی بۆچوونی ناوەندە لە نێوان موعتەزیلە و ئەشعەرییەکان.

موعتەزیلەکان وتویانە بەدیهێنانی کردەوە لە ڕێگەی هێزێکەوەیە کە خوای گەورە بە بەندەی بەخشیووە.

ئەشعەرییەکان وتویانە بەندە لە کردەوەدا هیچ توانایەکی نییە، بەڵکو تەنها بەدەستهێنانی هەیە، ئەم بەدەستهێنانەش بە هاوتەریب (إقتران)ە نەوەك بە کاریگەری بەندە بێت.

ماتوریدییەکان وتویانە بەدەستهێنان بە توانا و کاریگەری بەندەیە[1].

٧- ئیمان: تەنها بریتییە لە دانپێدانان و بەڕاستدانان بە دڵ.

ئەم وتەیەی ماتوریدی لە أبو حنیفەوە گێڕدراوەتەوە، ئەمە ڕای بەناوبانگی مەزهەبی ئەبو حەسەنی ئەشعەرییە[1]. پێشتر لە ڕاوبۆچوونەکانی ئەشعەرییدا خرایەڕوو.

[1] تأريخ المذاهب الإسلامية، سەرچاوەی پێشوو، سەیری ئەمەش بکە: التوحيد للماتريدي م ٤١ و أصول الدين للغزنوي ١٦٦ و ٢٩٧.

بە پێی ڕای ماتوریدییەکان و ئەشعەرییەکان کردەوە بەشێك نییە لە ئیمان و باوەڕ، بۆچوونیان وایە کە ئەنجامدەری گوناهی گەورە ناچێتە دەرەوەی بازنەی ئیمان، ئەگەر لێپرسینەوەو سزاشی هەبێت، دەشکرێت خوای گەورە بە ڕەحمەت و بەزەیی خۆی دایگرێت.

ماتوریدی دەقی هێناوە لەسەر ئەوەی (ڕای ڕاست ئەوەیە کە ئەو باوەڕدارانەی خاوەن گوناهن بەخوای گەورە بسپێردرێن، ئەگەر بیەوێت لێیان خۆش دەبێت بە چاکە و بەخشدەو شکۆیی خۆی و ئەگەر بیەوێت سزایان دەدات بە ئەندازەی گوناهەکانیان، بۆ هەمیشە لە ئاگری دۆزەخدا نامێننەوە، جا باوەڕداران لە نێوان ئومێد و ترس "الرجاء والخوف"دا دەبن، بۆ خوای گەورە دروستە سزای بەندە بدات لەسەر تاوانی بچوك و لە گوناهی گەورەش خۆش ببێت، هەروەك خوای گەورە دەفەرموویت:﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴾النساء: ٤٨. واتە: "بەڕاستی خوا خۆش نابێت ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیار بدرێت، بێجگە لەوە لە هەر گوناهێکی تر بیەوێت خۆش دەبێت")[٢].

## سەلەفیەت

وشەی (سلف) لە بنچینەی زمانەوانیدا: (سلف يَسلف سُلُوفا) واتە: تێپەڕی و بەسەرچوو و کۆتایی هات.

---

[١] تبصرة الأدلة ٢/٧٩٩ والتمهيد للامشي ١٢٨ والكليات للكفوي ٢١٣. ماتوریدی دەقی هێناوە لەم بارەوە لە کتێبەکەیدا (التوحيد ٣٧٣) و بڕوانە پێشکیەکەی م ٤٦. سەیری چەند سەرچاوەیەکی تر بکە لە توێژینەوەکەم لەبارەی: مفهوم الإيمان عند الفرق الإسلامية ٣٠.
هەندێك لە ماتوریدییەکان بۆچوونیان وایە کە ئیمان بریتییە لە دانپێدانان بە دڵ و دەربڕین بە زمان بەبێ کردار ئەندامەکان./ مفهوم الإيمان ٢٧ سەرچاوەی پێشوو و سەرچاوەکانی تێدا هاتووە.

[٢] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٨٨-١٨٩.

(سَلَف سُلاف: پێشینان): کۆیە، تاکەکەی (سالف: پێشین)ە، وەك: (خدم و خدام: خزمەتکاران): کۆیە، تاکەکەی، (خادم: خزمەتکار)ە. پاشان (سلف) کراوەتە کۆ لەسەر (أسلاف) وەك: (سبب و أسباب: هۆو هۆکان)[1].

السلف: باوباپیران و خزمانی پێشین دەگرێتەوە[2]. فەرمایشتەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ فاتیمە (ڕەزای خوای لێبێت) لەم بارەیەوە: (**... ولا أراني إلا قد حضر أجلي، وإنكِ أوَّلُ أهلي لحوقا بي، ونعم السلف أنا لكِ**)[3] واتە: من تەنها بۆ ئەوە دەچم کە سەرەمەرگم نزیك بووبێتەوە، تۆش یەکەم کەسی لە خانەوادەکەی من کە پێم دەگەی، بەڕاستی من چاکترین پێشینم بۆ تۆ.

السلف لە زاراوەدا بریتییە لە: هاوەڵان، شوێنکەوتووان، شوێنکەوتووی شوێنکەوتووان[4].

ئەمەش وەرگیراوە لەو فەرمایشتەی کە عەبدوڵای کوڕی مەسعود گێڕاویەتیەوە، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (**خير القروني قرني، ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم....**)[5] واتە: چاکترین چەرخ و نەوە چەرخ و نەوەی منە، دواتر ئەوانەی بەدوایاندا، پاشان ئەوەی بەدوایاندا دێن.

---

[1] المصباح المنير مادة (سلف) ٢٨٥. و لە: قاموس المحيط مادة (سلف) ١٠٦٠: (السلف: کۆیەکەی: "سلاف و أسلاف"ة). دەکرێت (سلاف): کۆی (سالف) یان (سلف) بێت.

[2] القاموس المحيط، سەرچاوەی پێشوو.

[3] من تەنها بۆ ئەوە دەچم کە سەرەمەرگم نزیك بووبێتەوە... تاد، هاتووە لە: صحيح مسلم ٤٤ كتاب فضائل الصحابة ١٥ باب فضائل فاطمة رقم ٢٤٥٠ عن عائشة (رضي الله عنها).

[4] شرح الجوهرة للصاوي ٤٣٠ وشرح الجوهرة للباجوري ٣٤٣ والسراج الوهاج لصديق حسن خان ١٢/١٠. و لوامع الأنوار البهية ٢٠/١.

[5] فەرموودەی:چاکترین چەرخ و نەوە چەرخ و نەوەی منە... تاد، بەم دەربڕینە هاتووە لە: صحيح البخاري ٥٢ كتاب الشهادات، ٩ باب لا يشهد على شهادة جور، رقم ٢٦٥٢، عن عبدالله بن مسعود. وللحديث ألفاظ وطرق عديدة عن عمران بن الحصين وعبدالله بن مسعود (رضي الله عنهما) ٥٢ كتاب الشهادات و ٦٢ كتاب فضائل أصحاب النبي (صلى الله عليه وسلم)، و ٨١ كتاب الرقائق و ٨٣ كتاب الإيمان والنذور، و أرقام أحاديثهما هي: عن عمران بن حصين رقم

نەوەوی دوای ئەوەی چەندین بۆچوونی خستووەتەڕوو لەبارەی دەست نیشانکردنی واتای (القرن) کە لە فەرموودەکـەدا هـاتووە، وتویـەتی: بۆچـوونی ڕاسـت ئەوەیـە کـە نـەوەی پێغەمبەر هاوەڵان بوونە، نەوەی دووەم: شـوێنکەوتووان، نـەوەی سـێیەم: شـوێنکەوتووی شوێنکەوتووان[1].

زۆربەی زانایان بۆچوونیان وایە کە هاوەڵێتی کردنـی پێغەمبـەر (صلی الله علیه وسلم) ئەوەندە بەرزو پیرۆزە هیچ کردەوەیەك بەو ئەندازەیە چـاك نییـە، ئەمـەش لەبـەر بینینـی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، سەبارەت بەوەی ئاوێتەی خۆشەویسـتی پێغەمبـەر (صلی الله علیه وسلم) و دەستپێشخەر بووەو زوو کۆچی کردووە بۆ لای پێغەمبـەر(صلی الله علیه وسلم)و سەری خستووە و ئەو بەشە شەرعەی کە لێـی وەرگرتـووە بـەجوانی و ڕێـك و پێکی لەبەری کردووەو بە کەسانی دوای خۆی ڕاگەیاندووە، هەر کەسێك کە لـە دوای ئـەو هاوەڵە وەسفکراو بێت ئەوا هاوشێوەی ئەو نابێـت لـە بـەرزی و چـاکی دا، چـونکە هـەر خەسڵەتێك لە خەسڵەتە ناوبراوەکان دەستەبەری خێر دەکات بۆ خاوەنەکـەی بـە ئەنـدازەی خێری ئەو کەسەی دواتر کاری پێدەکات، بۆیە پلەو پایـەی هاوەڵـان بەسـەر ئـەوانی تـردا زاڵە[2].

هەر تاقمێك لە تاقمە ئیسلامیەکان دەبینیت کە ڕاوبۆچوونەکانی سەرچاوەی گرتووە لە پێشینەی چاکەکان. بەڵام سەلەفییەکان ناوی پێشینان (سەلەف)یان وەك ناوی ناسـێنەریان

٢٦٥١ و ٣٦٥٠ و ٦٤٢٨ و ٦٦٩٥ عن عبدالله بن مسعود رقم ٣٦٥١ و ٦٤٢٩ و٦٦٥٨. والحديث في صحيح مسلم ٤٤ كتاب فضائل الصحابة من طرق: عن عمران بن حصين رقم ٢٥٣٥ و عبدالله بن مسعود رقم ٢٥٣٣ وأبي هريرة رقم ٢٥٣٤، وعائيشة رقم ٢٥٣٦. وفي الجامع الصغير ٢٤٦ رواه أحمد في مسنده والبخاري و مسلم والترمذي عن إبن مسعود.

[1] شرح النووي على مسلم (المنهاج) ١٨٢٠. سەیری ئەمانەش بکە: فتح الباري ٨/٧ و إرشاد الساري ٣٨٤/٤ و ٨٠/٦ و ٨١.

[2] فتح الباري ٩/٧.

بۆ خۆ بڕیاردا، ئەو سەلەفیانە حەنبەلین، لە سەدەی چواری کۆچی بەدەرکەوتن، قسەیان لەبارەی بابەتەکانی: خوابەیەکزانین، تەئویل، وێچواندن (تشبیە) کرد.

هەروەك خۆیان دەڵێن ڕاوبۆچوونەکانیان دەدەنە پاڵ ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ڕەزای خوای لێبێت) کە بیروباوەڕی پێشینانی زیندوو کردەوەو بەرگری لێکرد[1].

ڕاوبۆچوونی هەندێکیان وەك: (قازی ئەبو یەعلای موحەممەدی کوڕی حوسەینی حەنبەلی بەغدادی) ٤٥٨ك ماڵئاوایی کردووە، هەروەها (ابن الزاغوانی علی کوڕی عبیداللە الحنبلی) ٥٢٧ك ماڵئاوایی کردووە، خودی حەنبەلییەکان ڕەخنەی توونديان لە ڕاوبۆچوونیئەو دوانە دەگرت و نکۆڵیان دەکرد لەوەی ئەو بۆچوونانە بۆچوونی ئیمام ئەحمەد بن.

ئیبن جەوزی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەلی بەکری حەنبەلی (٥٩٧ك ماڵئاوایی کردووە)، کتێبی (دفع الشبه التشبيه)ی دانا کە تیایدا بەرپەرچی ئەو بۆچوونانەی داوەتەوە، هەندێك لە شەرعناسە حەنبەلییەکان وتویانە: (ابو یعلی بەشێوەیەك حەنبەلییەکانی لەکەدار کرد، کە بە ئاوی دەریاکان ناشوڕێتەوەوە). هەندێکیان وتویانە: (ئیبن زاغوانی لە کتێبەکەیدا "وێچواندنی نامۆی داهێناوەو کردووە" کە لە ئاستیدا کەسی وریاو هۆشیار سەری لێ دەشێوێت).

بەناپەسەند دانانی ئەم بۆچوونانە لەلایەن ئەو حەنبەلییانە و هاوشێوەکانیان بووە هۆی پەردە پۆش کردنیان لە سەدەی پێنجەم و شەشەم[2].

سەر لە نوێ ئەم مەزهەبە بەدەرکەوت لەسەر دەستی (شێخولئیسلام تەقیەدین ئەحمەدی کوڕی عەبدولحەلیمی کوڕی تەیمیە) ساڵی ٧٢٨ك ماڵئاوایی کردووە، هەروەها لەسەر دەستی قوتابیەکەی (ئیبن قەیم شمسەدینی موحەممەدی کوڕی ئەبو بەکری زەرعی دیمەشقی) ساڵی ٧٥١ك ماڵئاوایی کردووە.

---

[1] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٩٠.

[2] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٩٧. سەیری نمونەی ئەو وتانە و هاوشێوەکانی بکە لە کتێبی إبن الجوزي: دفع شبه التشبيه بأكف التنزيه ١٤ ولاپەڕەکانی دواتری.

دواجار لە دوورگەی عەرەبی لەسەر دەستی شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوهاب دەرکەوت، ساڵی ١٢٠٦ك ماڵئاوایی کردووە.

تا ئێستاش وەهابییەکان بە جۆش و خرۆشن بۆ ڕاو بۆچوونەکانیان، هەندێك لە زانا موسڵمانەکان لە ناوچە جیاوازەکانی وڵاتانی ئیسلامی هاوڕابوون لەگەڵیان[١].

## ڕاو بۆچوونەکانیان

١- سەلەفیەکان بۆچوونیان وایە، کە بیروباوەڕو بەڵگەکانی و حوکمەکان و ئەو شتانەی بە پوختی یان تێروسەلی پێیەوە پەیوەستن بە وردو درشتەوە ئەوا تەنها لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی بەپێز وەردەگیرێن.

عەقڵ تەنها بە ئەندازەی سنووری واتای دەربڕینەکان دەسەڵاتی هەیە لە تەئویل و ڕاڤەکردنی قورئانی پیرۆز، هەروەها لە چوارچێوەی ئەو شتەی هەواڵی زۆری لەسەر هاتووە.

عەقڵ دانپێدانەرو و پشتگیری دەقەکانە نەك ڕەت کردنەوەی دەقەکان، شوێن پێی نەقڵ هەڵدەگرێت و بەهێزی دەکات، عەقڵ بەتەنها ناکرێتە سەرچاوەی بەڵگەهێنانەوە چونکە گومڕا دەبێت.

سەبارەت بەو شێوازەی فەیلەسوف و زانایانی کەلام و موعتەزیلەکان و ئەشعەرییەکان و ماتوریدییەکان بەکاریان هێنا، کە ئاوێتە ببوو بە پەیڕەوی فەیلەسوفەکان و مەنتیقی یۆنان، ئەم شێوازە لەلای هاوەڵان و شوێنکەوتووان ناسراو نەبوو. چونکە ئەگەر بوترێت ئەمانە شێوازی پێویستن بۆ تێگەیشتن لە بیروباوەڕ سەردەکێشێت بۆ ئەوەی کە پێغەمبەر و پێشینان بەشێوەیەکی ڕاست و ڕەوان تێنەگەیشتوون لە بیروباوەڕو بەڵگەکانی بۆیە ئەم بەهانەیە پوچ و بێ بنەمایە.

---

[١] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٩٠.

ئیبن تەیمیە کە ڕێککاری کرد بۆ پەیڕەو و بەرنامەی سەلەفیەکان هۆشداری لەوبارەوە داوە[1].

٢- هەروەك (ئیبن تەیمیە) باسی کردووە، خوابەیەکزانین (التوحید)یان بۆ سێ بەش دابەش کردووە، کە ئەمانەن: خوابەیەکگرتن لە پەروەردگاریّتی دا، خوابەیەکگرتن لە پەرستراویّتی دا، خوا بەیەکگرتن لە ناوو سیفەتەکان دا.

أ- خوابەیەکگرتن لە پەروەردگاریّتی دا (یەکتایی خوا لە بەدیهێناندا): واتاکەی ئەوەیە: خوای گەورە بەدیهێنەرو پەروەردگاری هەموو شتێکە[2]، بەندە دان دەنێت بەوەی تەنها خوای گەورە بەدیهێنەرو ڕۆزیدەرو بەخشەرو توانای گرتنەوەی بەخششەکانی هەیە[3].

بەم بەڵگانە:

- خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ﴾ لقمان: ٢٥. و الزمر: ٣٨. واتە: (سوێند بەخوا ئەگەر پرسیار لە خوانەناسان بکەیت: کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، ئەوە بەدڵنیاییەوە دەڵێن: الله).

- خوای پاك و بێ وێنە دەفەرموێت:﴿ قُل لِّمَنِ الْأَرْضُ وَمَن فِيهَا إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٤﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٨٥﴾ قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ﴿٨٦﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٨٧﴾ قُلْ مَن بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٨﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ ﴾ المؤمنون: ٨٤-٨٩.[4] واتە: (پێیان بڵێ: باشە زەوی و ئەو کەسانەی کە لەسەری دەژین کێ خاوەنیانە، ئەگەر زیرەك و

---

[1] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٩٢. سەیری ئەمانەش بکە: مناهج الإجتهاد في الإسلام ٥٠٨ وموقف إبن تيمية من الأشاعرة ١/٥٤ و٦٩.

[2] مجموع الفتاوى لإبن تيمية ١١/٥٠. بڕوانە: موقف إبن تيمية من الاشاعرة ٣/٩٧٤.

[3] مجموع الفتاوى لإبن تيمية ١٤/٣٧٩.

[4] مجموع الفتاوى لإبن تيمية ١١/٥١.

هۆشیارن؟ ئەگەر شت دەزانن؟!. سەرەنجام هەر دان بەڕاستیدا دەنێن و دەڵێن: هەر خوا، خاوەنیانە، هەر پەروەردگار بەدیهێنەریانە، ئەوسا پێیان بڵێ: جا ئەوە بۆچی یادەوەری وەرناگرن؟. پێیان بڵێ: ئەی کێ پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکەیە و کێ پەروەردگاری عەرش و تەختی فەرمانڕەوای گەورەو فراوانە؟. سەرەنجام دەڵێن: هەر خوا پەروەردگاریانە، ئەوسا بڵێ: باشە ئاخر ئێوە لێی ناترسن؟ خۆتان ناپارێزن لە خەشم و قینی. بڵێ: کێ جڵەوی هەموو شتێکی بەدەستە، لە کاتێکدا هەر ئەو پەنا بەخشەو کەس ناتوانێت لە سزای ئەو زاتە، کەس پەنا بدات، ئەگەر ئێوە بزانن و شارەزا بن. "سەرەنجام بۆ ئەمەش" دەڵێن: هەموو ئەوانە بەدەست خوایە، تۆش بڵێ: کەواتە چۆن جادووتان لێدەکرێت؟ کە ئەمە دەزانن).

- پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: **(اللهم لا مانع لما أعطيتَ، ولا معطي لما منعتَ، ولا ينفع ذا الجد منك الجد)**[1] واتە: خوایەگیان" شتێك تۆ بیبەخشیت کەس توانای گرتنەوەی نییە، شتێك کە نەیبەخشیت و بیگریەوە کەس توانای بەخشینی نییە، هیچ هەوڵ و کۆششێك سوودی نییە مەگەر تۆ ویستت لەسەر نەبێت.

هەموو هاوبەشدانەرەکان دانیان بەو جۆرو بەشەی خوابەیەکزانین داناوە، هاوبەشدانەران دان دەنێن بەخوای ڕاستەقینە کە هاوێنەی نییە لە: زات و سیفەت و سەرجەم کردەوەکانی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان هاوبەش بۆ خوا بڕیار

---

[1] مجموع الفتاوى لإبن تيمية ٣٧٦/١٤.

فەرموودەی: خوایەگیان" شتێك تۆ بیبەخشیت کەس توانای گرتنەوەی نییە... تاد: صحيح البخاري في ١٠ كتاب الآذان باب الذكر بعد الصلاة، رقم ٨٤٤، عن المغيرة بن شعبة بهذا اللفظ. وورد بهذا اللفظ أيضا في صحيح البخاري في ٨٠ كتاب الدعوات ١٨ باب الدعاء بعد الصلاة، رقم ٦٣٣٠. و ٨٢ كتاب القدر ١٢ باب لا مانع لما أعطى الله رقم ٦٦١٥. و ٩٦ كتاب الإعتصام بالكتاب والسنة ٣ باب ما يكره من كثرة السؤال رقم ٧٢٩٢.

دەدەن لە پەرستراویێتی دا، خوای تـر لەگـەڵ خـوای گـەورە دەپەرسـتن، تكاكـارن یاخود هاوبەشی خوان[1]. هیچ موسڵمانێك لەم بابەتەدا ڕاجیایی نییە.

گشـت بـەدیهێنراوان و زانایـانی كـەلامیش دانیـان بـە یـەكتایی خـوا لـە پەروەردگاریێتی دا ناوە، بەڵام ئەمە بە تەنها بەس نییە، بەڵكو پێویستە دانبنـێن بە یەكتایی خوا لە پەرسـتراویێتی دا، ئەمـەش مـافی خوایـە لەسـەر بەنـدەكانی ئەوەیە بیپەرستن و هاوبەشی بۆ بڕیار نەدەن، هەروەك چۆن لە فەرموودەی ڕاسـت و دروستدا هاتووە[2].

ئیبن تەیمیە بۆچوونی وایە كە: بەهۆی ئەو توانایـەی كـە لـە بەنـدەدا هەیـە ئـەوا كردەوەكانی دەدرێتە پاڵی، هەمان ئـەو كردەوانـەش دەدرێنـە پـاڵ خـوا بـەهۆی ئەوەی خوای گەورە ئەو توانایەی لە مرۆڤـدا دروسـت كـردووە و خـوای گـەورە بەدیهێنەری هۆكارەكانە[3].

بەمەش بە ڕێژەیەكی زۆر (ئیبن تەیمیە) لەگەڵ موعتەزیلەكان هاوڕایە، بـەڵام لـە دوو شتدا ڕای لەگەڵ ئەوان جیایە:

یەكەم: موعتەزیلەكان بۆچوونیان وایە: پابەند بوون و بەیـەك پەیوەسـت بوونێـك هەیە لە نێوان فەرمان ویستی خوا، خـوای گـەورە كاتێـك فـەرمان بەشـتێك دەكات كە ویستی لەسەر بێت، شتێك قەدەغـە دەكـات كـە ویسـتی لەسـەر نەبێت، خوای گەورە ویستی لەسەر گوناهو تاوان نیە بۆیە فەرمانی پێناكات.

ئیبن تەیمیە بۆچوونی وایە هیچ پابەند بوون و بەیەك پەیوەست بوونێك نییە لـە نێوان فەرمان و ویسـتی خـوا، خـوای گـەورە ویسـتی لەسـەر كـاری بـاش و گوڕایەڵییە و فەرمانی پێدەكات، گوناهو تاوانی قەدەغە كـردووەو ویستیشـی

[1] مجموع الفتاوى لإبن تيمية ١١/٥٠-٥١.
[2] مجموع الفتاوى لإبن تيمية ١/٢٣.
[3] تأريخ المذاهب الإسلامية ٢٠٢.

لەسەر نییە[1].

دووەم: ئیبن تەیمیە جیاوازی کردووە لە نێوان (ڕازی بوون و خۆشویستن) و ویستدا، خوای گەورە گوناهو تاوانەکانی خۆش ناوێت، بەڵام ویستی لەسەرە.

ئیبن تەیمیە وتویەتی ئەمە ڕای زۆربەی ئەهلی سوننە و زۆرێك لە هاوەڵانی ئەشعەرییە، هەروەها ڕای سەرتاپای پێشینانە[2].

ئەم وتەیەی ئیبن تەیمیە کە دەڵێت خوای گەورە توانای لە بەندەدا دروست کردووە کە بەهۆیەوە دەتوانێت کاریگەری دروست بکات لەسەر شتەکان، زۆر نزیکە لە مەزهەبی ماتوریدی، بەڵام إبن تیمیە وتویەتی کە کاریگەری کردن لەسەر شتەکان بەهۆی ئەنجامدانیان دەبێت.

ماتوریدی پێی وایە کە کاریگەری لەسەر کردەوەکان بەو هێزەیە کە خوای گەورە لە ناخی مرۆڤدا دایناوە، کە دەتوانێت کردەوەکە بەدەست بهێنێت (کسب) بکات و لەوە تێپەڕ ناکات[3].

هۆدارکردنی کردەوەکانی خوا" واتە: ئایا خوای گەورە کردەوەیەکی کردووەو شتێکی بەدیهێناوە بەبێ پاڵنەرو هاندەر؟

- ڕاو بۆچوونی ئەشعەرییەکان ئەوەیە: کە خوای گەورە بێ هۆ و بێ هاندەرو پاڵنەر ئەم شتانەی بەدیهێناوە، چونکە ئەمە دەبێتە هۆی بەندوبار خستنە سەر ویستی خوای گەورە، خوای گەورە لەسەر کردەوەکانی لێی ناپرسرێتەوە.

---

[1] تأريخ المذاهب الإسلامية ٢٠٣.

[2] تأريخ المذاهب الإسلامية، سەرچاوەی پێشوو و ئاماژەی بۆ داوە: منهاج السنة ١/٢٢٦ ومجموعة الرسائل والمسائل ٥/ ١٠٢.

[3] تأريخ المذاهب الإسلامية، سەرچاوەی پێشوو.

بۆچوونی موعتەزیلەکان بریتیە لەوەی خوای گەورە لە فـەرمان و ڕێگرییەکانیـدا تەنها شتی چاك ئەنجام دەدات و تـەنها فـەرمان بـە شـتی چـاك دەکـات، خـۆی دەپارێزێت لە شتی خراپ و فەرمان کردن بە خراپە.

ئیبن تەیمیە هەردوو بۆچوونەکەی ڕەتکردۆتەوە.

- بۆچوونی ماتوریدیـەکان ئەوەیـە کـە خـوای گـەورە بـەدیهێنراوانی بـەدیهێناوە و فەرمانی بەو شتانە کردووە کە ڕەوان و ڕێگری لەو شتانە کردووە کـە خـراپن لـە حیکمەت و داناییەکی سوپاس کراو، ئەو حیکمەت و داناییەش لە خـوای گـەورە پێویست نییە بەڵکو تەنها بۆ ڕوونکردنـەوەی هـۆی بەیـدیهێنرانی بەدیهێنراوانـە لەلایەن خوای گەورە.

ئیبن تەیمیە ئەم بۆچوونەی پەسەند کردووەو وتویەتی ئەمە بۆچـوونی پێشـینانە، کۆمەڵێك لە هاوەڵـانی (ئـەبو حەنیفـە، مالیـك، شـافیعی، ئەحمـەد) و جگـە لەوانیش ئەم بۆچوونەیان پەسەند کردووە، هەندێك دەستە لە زانایانی کلامـیش ئەم بۆچوونەیان پەسەند کردووە[1].

ب- خوابەیەکگرتن لە پەرستراوێتی دا (یەکتایی خوا لە پەرسـتندا): مەبەسـت لەمـە ئەوەیە کە تـەنها پەرسـتش بـۆ خـوا بکرێـت و هاوبەشـی بـۆ بڕیـار نـەدرێت لـە پەرستندا[2]. بەم بەڵگانە:

- خوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِىٓ إِلَيْهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدُونِ﴾ الأنبیاء: ٢٥. واتە: (ئێمە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە، کە وەحیمان بۆ نەناردبێت کە: بێگومان هیچ خوایەك نییە جگە

---

[1] تأریخ المذاهب الإسلامیة ٢٠٣-٢٠٤. بڕوانە: موقف إبن تیمیة من الأشاعرة ٣/١٣١٠.
[2] مجموع الفتاوی لإبن تیمیة ١١/٥٠-٥١ و ١٤/٣٧٨.

لە من و دەبێت هەر من بپەرستن).

- خـوای بـێ وێنـە دەفـەرمووێت: ﴿ وَسْـَٔلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَآ أَجَعَلْنَا مِن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ ءَالِهَةً يُعْبَدُونَ ﴾ الزخرف: ٤٥. واتـە: (تـۆ لـەو پێغەمبەرانـەی کـە ناردوومانـە پـێش تـر بپرسـە، ئایـا جگـە لـە خـوای میهرەبـان خـوای ترمـان دیاریکردووە کە بەندایەتی بۆ بکرێت).

- خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ ﴾ النحل: ٣٦.[1] واتە: (سوێند بـەخوا بێگومـان ئێمـە لـەناو هەموو گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانەکردووەو پێمان ڕاگەیاندووە کـە پێیـان بڵێـت: تـەنها خـوا بپەرسـتن، خۆتـان دوورە پـەرێز بگـرن لـە هـەموو پەرستراوێکی تر).

زانایان بەرپەرچی دابەش کردنی خوابەیەکزانین و خوابەیـەکگرتنیان داوەتـەوە بـۆ (خوابەیەکگرتن لـە پـەروەردگارێتی دا)، (خوابەیـەکگرتن لـە پەرسـتراوێتی دا) بەوەی هەردوو جۆرەکە یەك شتن و جیاوازی نییە لە نێوانیان، بەم بەڵگانە:

- خوای باڵادەست دەفەرمووێت: ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا۟ بَلَىٰ﴾ الأعراف: ١٧٢. واتە: (ئایـا من پەروەردگاری ئێوە نـیم؟ هـەموو وتیـان: نابێـت تـۆ خـوای ئێمـە نـەبیت). نەیفەرمووە: من پەرستراوی ئێوە نیم؟ بەڵکو ڕازی بووە بەوەی ئەوان بڕوایـان بـە پەروەردگارێتی خوا هەیە، هەر کەسێك دان بنێت بـە پـەروەردگارێتی خـوا ئـەوا دانی ناوە بە پەرستراوێتی خوا، چونکە پەروەردگار جیا نیە لـە پەرسـتراو بـەڵکو خودی پەرستراوەکەیە.

- پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێت: (**إن الملكين يسـألان العبـد في قـبره، فيقولان له: من ربك؟**) واتە: دوو فریشـتە لـە گـۆڕدا پرسـیار لـە بەنـدە دەکـەن

[1] مجموع الفتاوى لإبن تيمية ٥٢/١١.

پەروەردگارت کێیە؟. بۆچی پێی نالێن: پەرستراوت کێیە؟ ئەمەش بەلگەیە لەسەر ئەوەی خوابەیەکگرتن لە پەروەردگاریێتی و پەرستراوێتی دا یەك شتە[1].

ئیبن تەیمیە وتویەتی (خوابەیەکگرتن لە پەرستراوێتی دا) دوو شت دەخوازێت:

یەکەمیان: تەنها خوای گەورە بپەرستێت، هەر کەسێك لە پەرستشدا کەسێك یان شتێك بکاتە هاوبەش بۆ خوای گەورە ئەوا هاوبەشی بڕیارداوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی:

هاوبەشدانەرانی عەرەب دانیاندەنا بەوەی کە تەنها خوای گەورە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە، هەروەك خوای گەور دەفەرموویێت: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ﴾ لقمان: ٢٥. و الزمر: ٣٨. واتە: (سوێند بەخوا ئەگەر پرسیار لە خوانەناسان بکەیت: کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، ئەوە بەدلنیاییەوە دەلێن: الله). لەگەلّ ئەوەشدا هەر بە هاوبەشدانەر ناوبران، چونکە لەگەلّ خوای گەورەدا شتی تریان دەپەرست.

دووەمیان: بەوپێیە خوای گەورە بپەرستێت کە خوای گەورە لە سەر زمانی پێغەمبەرانی دیاریکردووە.

ئیبن تەیمیە وتویەتی: (نزاو دوعا یەکێکە لە پەرستش و خواپەرستییەکان، هەر کەسێك بپارێتەوە لە بەدیهێنراوان وەك: مردوان و کەسانی ئامادەنەبوو و هاوار بکاتە ئەوان... ئەوا شتێکی نوێی لە ئاییندا داهێناوەو هاوبەشی بۆ خوا بڕیار داوەو ڕێبازی نا موسلمانانی گرتووە. هەر کەسێك بە خاترانەی

---

[1] الدرر السنية لأحمد بن زيني دحلان ٣٧.

حديث الملكين في مسند الإمام أحمد ٤٩٩/٣٠، أول مسند الكوفيين من حديث البراء بن عازب (رضي الله عنه)، رقم ١٨٥٣٤ و تیایدا هاتووە: (... ڕۆحی دەگەڕێنرێتەوە بۆ ناو لاشەکەی دوو فریشتە دێنە لای و دایدەنیشێنن، و پێی دەلێن: پەروەردگارت کێیە؟ دەلێت: پەروەردگارم "الله"یە. پێی دەلێن: ئایینت چییە؟ دەلێت: ئایینم ئیسلامە...).

قال المحقق المسند الشيخ شعيب إسناده صحيح، رجاله رجال الصحيح. ثم خرج من كتب كثيرة.

ئەم فەرموودەیە چەند گێڕانەوەیەکی تریشی هەیە لە موسنەدی ئەحمەد و جگەلەویشدا.

بەدیهێنراوان لە خوای گەورە بپارێتەوە یان بە بەدیهێنراوان خوای گەورە سوێند بدات، ئەو كەسە بیدعەچییە و خوای گەورە هیچ بەڵگەیەكی لەسەر ڕەوایی ئەو كارەی دانەبەزاندووە)[1].

ئیبن تەیمیە لەسەر بۆچوونەكەی سەبارەت بە (خوابەیەكگرتن لە پەرستراوێتی دا) ئەم شتانەی خوارەوەی بڕیارداوە:

١- قەدەغە كردنی نزیك بوونەوە لە خوای گەورە بەهۆی پیاوچاك و ئەولیاكان.

ئەگەرچی هەندێك لە پیاوچاكان خاونی كەرامەت بن، ئەوا وەك بەندەكانی تر ئەكدارن بە جێبەجێ كردنی ئەرك و فەرمانەكانی شەرع، ئەو كەرامەتە نابێتە هۆكاری نزیك خستنەوەی خاوەنەكەی لە خوای گەورە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی: **(يا معشر قريش - أو كلمة نحوها - إشتروا أنفسكم لا أغني عنكم من الله شيئاً، يا بني عبد مناف لا أغني عنكم من الله شيئاً، يا عباس بن عبدالمطلب لا أغني عنك من الله شيئاً، يا صفية عمة رسول الله** (صلى الله عليه وسلم) **لا أغني عنكِ من الله شيئاً، ويا فاطمةُ بنتُ محمد سَليني ما شئتِ من مالي، لا أغني عنك من الله شيئاً)**[2] واتە: ئەی كۆمەڵەی

---

[1] تاريخ المذاهب الإسلامية ٢٠٥. و ئاماژەی كردووە بۆ (قاعدة جليلة في التوسل والوسيلة لإبن تيمية). لەم بارەوە سەیری ئەم سەرچاوەیە بكە: قاعدة جليلة في التوسل والوسيلة في مجموع الفتاوى ١/٣١١-٣١٢.

[2] تاريخ المذاهب الإسلامية ٢٠٦.

لەم بارەوە سەیری ئەم سەرچاوەیە بكە: قاعدة جليلة في التوسل والوسيلة، في الجزء الأول مجموع الفتاوى ١٤٢-٣٦٨.

فەرموودەی: ئەی كۆمەڵەی قورەیش... تاد: بهذا اللفظ في: صحيح البخاري في ٥٥ كتاب الوصايا ١١ باب هل يدخل النساء والولد في الأقارب، رقم عن أبي هريرة. الحديث بلفظ مقارب في صحيح البخاري ٦١ كتاب المناقب ١٣ باب من إنتسب إلى آبائه في الإسلام والجاهلية، رقم ٣٥٢٧، عن أبي هريرة. و ٦٥ كتاب التفسير ٢ باب: ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴾ الشعراء:

قورەیش - یان وشەیەکی هاووێنەی ئەمە - نەفسی خۆتان بکڕنەوەو خۆتان ڕزگار بکەن من هیچم بۆ ئێوە پێناکرێت لەلای خوا، ئەی نەوەکانی (عەبدومەناف) هیچم بۆ ئێوە پێناکرێت لەلای خوا، ئەی (عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب) هیچم بۆ تۆ لەلای خوا پێناکرێت، ئەی صەفیەی پووری پێغەمبەری خوا هیچم بۆ تۆ لەلای خوا پێناکرێت، ئەی فاتیمەی کچی موحەممەد چەند داوا دەکەیت لە سەروەت و ماڵم پێت دەدەم، بەڕاستی هیچم بۆ تۆ لەلایخوا پێناکرێت.

٢- قەدەغە کردنی هاوار کردن و داوای یارمەتی و تەوەسول کردن بە مردوان و جگە لەوانیش.

ئیبن تەیمیە بۆچوونی وایە کە دەبێت و داوای یارمەتی تەنیا لە خوای گەورە بکرێت، هاوارکردن و داوای یارمەتی کردن لە غەیری خوای گەورە بە هەموو شێوەیەك قەدەغەیە. بەم بەڵگانە:

دووڕوویێك ئازاری موسڵمانانی دەدا، ئەبو بەکر (ڕەزای خوای لێبێت) وتی: دەبا هاوار بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ببەین لە دژی ئەو دووڕووە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرموو: **(إنه لا یستغاث بي، وإنما یستغاث بالله)** واتە: نابێت هاواری من بکرێت، بەڵکو دەبێت هانا و هاوار بۆ خوا ببرێت.

ئیبن تەیمیە ئەم وتەیەی (ئەبو یەزیدی بەستامی) هێناوە: (هاناو هاوار بردنی بەدیهێنراو بۆ بەدیهێنراوێکی تر وەك ئەوەیە کەسی نقوم بوو هانا و هاوار ببات بۆ کەسێکی تری نقوم بوو).

نزیك کەوتنەوە لە خوای گەورە بەهۆی مردوان قەدەغەیە، دروست نییە هاناو هاواریان بۆ ببەیت. ئیبن تەیمیە وتویەتی: (بۆمان نییە داوای شت بکەین لە

---

٢١٤، رقم ٤٧٧١، عن أبي هريرة. وهو في صحيح مسلم في ١ كتاب الإيمان ٨٧ باب قوله تعالى:﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴾ الشعراء: ٢١٤، رقم ٢٠٤، عن أبي هريرة.

پێغەمبەران و پیاوچاکان دوای مردنیان، ئەگەرچی زیندووش بن لە گۆڕەکانیاندا). ئەمەش بەڵگەکانیەتی:
(هیچ یەکێك لە پێشینان ئەم کارەی نەکردووە، هەروەها ئەمە ڕێخۆشکەرە بۆ هاوبەشدانان و بەندایەتی کردنی غەیری خوای گەورە).
وتویەتی: (داواکردن لە مردوویێك بەپێچەوانەی ئەوەیە کە داوای لێبکەیت کاتێك کە زیندووە، چونکە داواکردن لە کەسی زیندوو سەر بۆ هاوبەشدانان ناکێشێت).
دروست نییە نەزرو قوربانی بکرێت بۆ گۆڕەکان و مردووەکان. إبن تیمیە وتویەتی: (هەر کەسێك باوەڕی وابوو کە گۆڕ سوود یان زیانی هەیە ئەوە کەسێکی گومڕاو نەزانە).
هەروەها وتویەتی: (هەر کەسێك باوەڕی وابێت ئەو نەزرانە دەروازەی داواکردنی پێداویستیەکانە لە خوای گەورە و لابەری ناخۆشیەکانە و هۆی کرانەوەی دەرگای ڕزق و ڕۆزیە، هۆکاری شارپارێزییە، ئەو کەسە هاوبەشدانەرە و پێویستە بکوژرێت)[1].
زانایان بەرپەرچی ئیبن تەیمیەیان داوەتەوەو وتویانە: مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعەت بە ڕەوای زانیوە کە تەوەسل بکرێت بە پلەوپایەو پلەبەرزی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و پیاوچاکان، جا چ زیندوو یان مردوو بن. فەرو تەبەروکیان پێوەدەکرێت بەهۆی ئەوەی خۆشەویستی خوان، بەڵام سوودو زیان و بەدیهێنان تەنها کاری خوایە و هاوبەشی نییە[2]. ئەمانەش هەندێك

---

[1] تأريخ المذاهب الإسلامية ٢٠٦-٢٠٧ ونقل عن مجموعة الرسائل والمسائل ١/٥٥ لإبن تيمية.
بڕوانە: هاناو هاواربردن بۆ غەیری خوای گەورە و هاوارکرن و داوای یارمەتی کردن لە مردووان لە: قاعدة الجليلة في التوسل والوسيلة، في: مجموع الفتاوى ١/١٤٢-٣٦٨.
فەرموودەی: نابێت هاواری مـن بکرێت... تاد: في: المعجم الكبير للطبراني.
[2] رسالة فيما يتعلق بأدلة جواز التوسل بالنبي وزيارته(صلى الله عليه وسلم)، لأحمد زيني دحلان ١٨٠-١٨١.

له بەڵگەكانی ئەهلی سوننه و جەماعەتن:

- (عوسمانی كوڕی حەنیف) دەگێڕێتەوە: **(أن رجلا ضرير البصر، أتى النبي (صلى الله عليه وسلم)فقال: ادع الله أن يعافيني، قال: إن شئت دعوتُ، وإن شئت صبرت فهو خير لك. قال: فادعه. قال: فأمره أن يتوضأ فيحسن وضوءه، ويدعو بهذا الدعاء: اللهم إني أسألك وأتوجه إليك بنبيك محمد نبي الرحمة، إني توجهت بك إلى ربي في حاجتي لتقضى لي، اللهم فشفعه في)** واتە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)چاوئێشەی هەبوو و وتی: لە خوا بپاڕێوە تا شیفا و چارەسەری نەخۆشیەكەم بكات، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ئەگەر دەتەوێت بۆت لە خوا دەپاڕێمەوە، ئەگەر ئارام بگریت لەسەر نەخۆشیەكەت بۆت چاكترە. وتی: بۆم بپاڕێوە لە خوا. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی پێكرد كە دەستنوێژێك بە جوانی و ڕێك و پێكی بگرێت و دواتر ئەم نزایە بكات: خوایەگیان لێت دەپاڕێمەوەو ڕووی دڵم كردۆتە تۆ بەهۆی پێغەمبەرەكەت موحەممەد پێغەمبەری ڕەحمەت، پێغەمبەر من بەهۆی تۆ ڕووم كردۆتە خوای گەورە بۆ ئەوەی ئەونزایەم گیرا بكات و بۆمی جێ بەجێبكات، خوایەگیان پێغەمبەر بەتكاكارم پەسەند بكە.
- ئەبو سەعید خودری دەڵێت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: هەر كەسێك لەماڵی هاتە دەرەوەو چوو بۆ نوێژ كردن و وتی: خوایەگیان لێت دەپاڕێمەوە بە پلەوپایە و ڕێزی ئەوانەی كە لێت دەپاڕێنەوە... تاد.

ئەمە تەوەسل كردنە بەهەموو بەندەیەكی باوەڕدار، هاوەڵان لە كاتی چوونیان بۆ نوێژ بەم دوعایە دەپاڕانەوە[1].

---

[1] رسالة فيما يتعلق بأدلة جواز التوسل بالنبي وزيارته(صلى الله عليه وسلم)، لأحمد زيني دحلان ١٧٠. حديث عثمان بن حنيف بهذا اللفظ رواه الترمذي في سننه في ٤٩ كتاب الدعوات ١١٩ باب، رقم ٣٥٧٨، ٥/٥٦٩. وقال: حديث حسن صحيح غريب لا نعرفه إلا من هذا الوجه. ورواه ابن ماجه في سننه مع إختلاف لفظي يسير في: ٥ كتاب إقامة الصلاة والسنة فيها، ١٨٩ باب ما جاء في صلاة الحاجة رقم ١٣٨٥، ١/٤٤١ وفيه بعده، قال أبو إسحاق: هذا حديث صحيح. وهذا الحديث رواه

- ئەنەس گێڕاویەتیەوە کە: عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێبێت) هەر کاتێك دەبووە وشکەسالّی بە هۆی (عەباسی کوڕی عەبدولموتەلّیب) داوای بارانبارینی لە خوای مەزن دەکرد. جا دەیوت: خوایەگیان ئێمە بەهۆی پێغەمبەرەکەتەوە داوای بارانبارینمان لێ دەکردی، ئێستاش داوای باران بارین دەکەین لە تۆ بەهۆی مامی پێغەمبەرەکەتەوە، ئەنەس دەڵێت: خوای گەورە بارانی باراند[1].
- چەندین فەرموودەی ڕاست و دروست هاتوون کە ئەوە دەخەنەڕوو هاوەڵان تەبەڕوکیان کردووە بە ئارەقە و موو و پاشماوەی دەستنوێژی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

چەندان فەرموودەی تریش لە دوو صەحیحەکەدا و لە سەرچاوەکانی تریشدا هاتوون[2].

---

أيضا النسائي (في الكبرى) والبيهقي والطبراني بإسناد صحيح عن عثمان بن حنيف، وخرجه أيضا البخاري في تأريخه والحاكم في المستدرك بإسناد صحيح./ رسالة فيما يتعلق بأدلة جواز التوسل بالنبي(صلى الله عليه وسلم) وزيارته لأحمد بن زيني دحلان ١٧٥-١٧٦. الحديث في مسند أحمد ٤٧٨/٢٨ رقم ١٧٢٤٠، طبعة مؤسسة الرسالة، وقال المحقق شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح، رجاله ثقات. وذكر مخرجيه. وللحديث طريقان آخران فيه برقم ١٧٢٤١ و ١٧٢٤٢.

حديث أبي سعيد الخدري في سنن ابن ماجه، في: ٤ كتاب المساجد والجماعات، ١٤ باب المشي إلى الصلاة رقم ٧٧٨، ٢٥٦/١ ورواه ابن خزيمة في صحيحه. الحديث في مسند أحمد ٢٤٧/١٧ رقم ١١١٥٦، طبعة مؤسسة الرسالة، من طريق آخر، قال المحقق فيه شعيب: إسناده ضعيف، وقد روي موقوفا وهو أشبه. وخرجه.

[1] رسالة فيما يتعلق بأدلة جواز التوسل بالنبي(صلى الله عليه وسلم) وزيارته لأحمد بن زيني دحلان ١٧٨.

حديث أنس (رضي الله عنه) رواه البخاري في صحيحه في ١٥ كتاب الإستسقاء ٣ باب سؤال الإمام الإستسقاء إذا قحطوا رقم ١٠١٠، لا ٢١٦ و في: ٦٢ كتاب فضائل أصحاب النبي (صلى الله عليه وسلم)، ١١ باب ذكر العباس بن عبدالمطلب (رضي الله عنه) رقم ٣٧١٠، لا ٧٨١.

[2] السلفية لمحمد سعيد رمضان البوطي ١٥٤.

نەزانراوە کە لە سەردەمی پێشینان مشتومڕ کرابێت لەسەر ئەم بابەتە، بارودۆخەکە هەر بەو شێوەیە بوو بێ ئەوەی هیچ ڕاجیاییەك لە گۆڕێدا هەبێت تا ئیمام (إبن تیمیە) هات و جیاوازی کرد لە نێوان تەوەسول کردن بە پێغەمبەران و پیاوچاکان لەو کاتەی کە زیندوون و لەو کاتەش کە مردوون، بە دروستی زانی تەوەسول بە ناوبراوان بکرێت لەو کاتەی کە لە ژیانداد و بە نا دروستی زانی کە لە دوای مردنیان تەوەسولیان پێ بکرێت، سەرباری ئەوەی کە دەقەکان جیاکاریان نەکردووە لە نێوان ئەو دوو حاڵەتە.

ئەمە بابەتێکی کۆششکاری و ئیجتهادییە، کە نابێت ببێتە هۆی جیاوازی و لێك ترازانی ڕیزی موسڵمانان، نابێتە هۆکاری تاوانبارکردنی ئەوەی تر یان بە بیدعەچی دانانی، چ جای ئەوەی بە هاوبەشدانەر یان بە دەرچوو لە ئایین دابنرێت، چونکە هەموو لایەك کۆکن لەسەر ئەوەی تەوەسول بە پلەوپایە و ڕێزی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و پیاوچاکان دەکرێت کە لەلایەن خوا هەیانە نەوەك بە جەستە مادییەکەیان[1].

٣- قەدەغەکردنی سەردانکردنی گۆڕی پێغەمبەران و پیاوچاکان بە مەبەستی دەستخستنی فەڕو بەرەکەت.

ئیبن تەیمیە بۆچوونی وابووە کە سەردانکردنی گۆڕی پیاوچاکان بەمەبەستی دەستخستنی تەبەڕوك و زیاتر نزیك بوونەوە لە خوای گەورە دروست نییە. بەڵام ئەگەر سەردان کردنەکە بە مەبەستی پەندو ئامۆژگاری وەرگرتن بێت ئەوا دروستە، بەڵکو خێرو سوننەتە.

ئەم دوو کتێبانەش دوواون لەبارەی بابەتی تەوەسول: شفاء السقام في زيارة خير الأنام للإمام تقي الدين أبي الحسن علي بن عبد الكافي السبكي، المتوفى ٧٥٦ك، وشواهد الحث في الإستغاثة بسيد الخلق (صلى الله عليه وسلم)للشيخ يوسف بن إسماعيل النبهاني، المتوفى سنة ١٣٥٠ك-١٩٣٢م.

[1] السلفية لمحمد سعيد رمضان البوطي ١٥٤-١٥٦.

بەهەمان شێوە ناوبراو بۆچوونی وایە: سەرەدانکردنی گۆڕی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بە مەبەستی فەڕو بەرەکەت دەستخستن دروست نیە. بەم بەڵگانە:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەردوویەتی: **(اللهم لا تجعل قبري وثنا يعبد. إشتد غضب الله على قوم اتخذوا قبور أنبيائهم مسجدا)** واتە: خوایەگیان گۆڕەکەم نەکەی بە بتێك کە بپەرسترێت. بەڕاستی خوای گەورە زۆر لەو گەلانە تورەیە کە گۆڕی پێغەمبەرانیان کردۆتە مزگەوت.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە پێچەوانەی نەریتی خەڵك لە ماڵی خاتوو عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) نێژراو بەخاك سپێردرا بۆ ئەوەی گۆڕەکەی نەکرێتە زیارەتگە (مزار).

هاوەڵان کاتێك سڵاویان لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکرد دوای ماڵئاوایی کردنی مەبەستیان لەو سڵاوکردنە نزاو پاڕانەوە بوو، ئەوا ڕوویان دەکردە ڕووگە[1].

بۆچوونی ئیبن تەیمیە لەبارەی سەردان کردنی (ڕەوزەی پیرۆز) پێچەوانەی بۆچوونی زۆربەی زانایانە، چونکە زۆربەی زانایان پێیان وایە قەدەغە کردنی سەرەدانکردنی (ڕەوزەی پیرۆز) لە ترسی بتپەرستی بوو، ئەو مەترسیە لە گۆڕێدا نییە، دوای جێگیربوونی بنەماکانی ئیسلام لە دڵ و دەروون‌دا.

کە پێغەمبەر موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) بە پیرۆز دەگیرێت ئەوا خۆی لە خۆیدا بە پاك و پیرۆز گرتنی یەکتایی و ئەو واتایانەیە کە پێغەمبەر لەو پێناوەدا ڕەوانە کراوە.

[1] تأريخ المذاهب الإسلامية ٢٠٧-٢٠٨.

سەیری ئەمەش بکە: قاعدة جليلة في التوسل والوسيلة، في: مجموع الفتاوى، الجزء الأول ١٤٢-٣٦٨.

فەرموودەی: خوایەگیان گۆڕەکەم نەکەی بە بتێك کە بپەرسترێت... تاد. رواه مالك في موطئه.

سەردان کردنی ڕەوزەی پیرۆز بە بیرهێنانەوەی هەڵوێستەکانی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) لە جیهاد و ئارامگری و کارکردن لە پێناو پایەدارکردنی یەکتاناسی و ئایین.

نافیعی خزمەتکاری عەبدوڵای کوڕی عومەر دەڵێ: ئیبن عمر سڵاوی لە گۆڕی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەکرد، سەد جار یان زیاتر بینیومە هاتۆتە لای گۆڕی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، دەستی داناوەتە سەر شوێنی دانیشتنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەسەر مینبەرەکەی و دواتر بە دەم و چاوی خۆیدا هێناویەتی.

ئیبن تەیمیە گێڕاویەتیەوە: کە هاوەڵان دەچوونە لای ڕەوزەی پیرۆز پێش گەشت کردن و دوای گەڕانەوە لە گەشت.

بۆیە شێخ (ئەبو زەهرە) بۆچوونی وابووە: (زیارەت کردنی گۆڕی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بەمەبەستی فەڕو بەرەکەت شتێکی چاکە، ئەمەش ناچێتە ناو بازنەی تەبەڕوك کردن بە مەبەستی بەندایەتی هاوشێوەکانی، بەڵکو ئەمە یادکردنەوەو پەند وەرگرتنە لە ژیاننامە و ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)...، نزا لەلای گۆڕ نزایەك بە دڵێك پڕ لە ترس و عەقڵێکی ملکەچ، دەروون و نەفسێکی دڵسۆز، ویژدانێکی هۆشیار، بە ڕاستی ئەمە بە فەڕو بەرەکەتترین نزاو پاڕانەوەیە)[1].

ب- خوابەیەکگرتن لە ناو سیفەتدا. مەبەست لەمە ئەوەیە: خوای گەورە بەو شتانە وەسف بکرێت کە خوا خۆی و پێغەمبەرەکەی وەسفیان پێ کردووە، بە بێ لادان و پەکخستنی سیفەتەکان و بەبێ بڕیاردانی چۆنیەتی و وێنەدار کردن. إبن تیمیە ئەمەی وتوە لە کاتی ڕوونکردنەوەی مەزهەبی پێشینان[2].

---

[1] تأريخ المذاهب الإسلامية ٢٠٨-٢٠٩.

[2] مجموع الفتاوى لإبن تيمية ٢٦/٥.

ئیبن تەیمیە ئەم شتانەی بۆ خوای گەورە بڕیارداوە: (خۆشویستن و ڕق لێبوونەوە، توڕەبوون و ڕازی بوون، بانگ کردن، دوان، هاتنە خوارەوە بۆ لای خەڵکی لە ناو پۆلە هەورێکدا، جێگیر بوون لەسەر تەخت و عەرش، ڕووخسار "الوجه"، دەست "الید") بەبێ تەئویل و ڕاڤەکردن بەڵکو ملکەچ بوون بۆ ڕووکەشی ئەم شتانە.

بەڵام دەست (ید)ی خوای گەورە وەك دەستی بەدیهێنراوان نییە، هاتنە خوارەوەشی وەك هی پەیدابوان نییە، ڕووخسار (وجه)ی خوای گەورەش وەك ڕووخساری دروستکراوان نییە، ئیبن تەیمیە بۆچوونی وایە ئەمە مەزهەبی پێشینانە[1].

ئیبن تەیمیە هەندێك گێڕانەوەی لە: (مالیکی کوڕی ئەنەس، سوفیانی سەوری، سوفیانی کوڕی عەیینە، لەیسی کوڕی سەعد و ئەوزاعی جگە لەوانیشی) لەبارەی ئەوەی کاتێك پرسیاریان لێکراوە لەبارەی ئەو خەبەرانەی لەبارەی سیفەتەکانەوە هاتوون، هەموویان ئەو وەڵامەیان داوەتەوە: چۆن هاتوون ئاوا بەڕێیان دەکەین یان چۆن هاتوون ئاوا بەڕێیان دەکەین بەبێ چۆنیەتی بۆ بڕیاردان[2].

لە ئیبن عەبدولبەرەوە هێناویەتی: ئەهلی سوننە کۆك و یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە ئەو سیفەتانەی لە قورئان و سوننەتدا هاتوون دانی پێدابنێن و باوەڕی پێبێنین، بە مانای ڕاستەقینە ڕەفتار لەگەڵ ئەو سیفەتانە بکرێت نەك پەنا ببرێتە بەر مانای خوازراو (مجاز)ی، چۆنیەتی هیچ یەکێك لەو سیفەتانە دیاریی ناکەن و سیفەتێکی دیاریکراوی بۆ بڕیار نادەن[3].

---

[1] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٩٥-١٩٦.

[2] مجموع الفتاوى لإبن تيمية ٥/٣٩ و٨٦.

[3] مجموع الفتاوى لإبن تيمية ٥/٨٧.

بەڵام پێش ئـیبن تەیمیـە حەنبەلییـەکان ئـەم بۆچـوونەیان هـەبووە لـە سـەدەی چوارەمی کۆچی، حەنبەلییەکان وتویانە: ئەمە مەزهەبی پێشینانە.

زانـا پایەبڵنـدەکانی حەنبـەلی وەك ئـیبن جـەوزی بەرپەرچـی ئـەم بۆچـوونەی داوەتەوەو ڕەتیشی کردۆتەوە کە ئەمە مەزهەبی پێشینان بێت، چونکە بێ چەند و چوونی سەر دەکێشێت بۆ وێچواندن و جەستە بڕیاردان بۆ خوای گەورە[1].

ئەمانە و جگە لەوانەش بۆچوونیان وایە کە ئەو دەقانە تـەئویل بکـرێن کـە لـە ڕووکەشدا وێچواندن (تشبیە)ی لێ بەدەردەکەوێت، وەك: تەئویل کردنی (ید) بە هێز یان نیعمەت، تەئویل کردنی (إستواء) بە زاڵ بوون..، چـونکە زمـان ئـەو ڕاڤانـە لـەخۆی دەگرێـت و پەسـەندییان دەکـات، تـەئویل کـردن باشـترە لـە ڕاڤەکردنێکی ڕووکەشیانەی پیتاو پیت و نەزانینی چۆنیەتییەکەیان[2].

ئەوە دەخرێتەڕوو کە تەئویل کردنی ئەو دەقانەی لە ڕووکەشدا وێچـواندیان لـێ دەخوازرێـت مـەزبی موعتەزیلـەکان و ئەشـعەرییەکان و ماتوریدییـەکان و زەیدییەکان و ئیمامیەکان و سەرجەم موسڵمانانە.

---

[1] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٩٦. کەمێك پێشتر ئاماژەمان کرد بۆ وتەکەی (إبن جوزی).

[2] تأريخ المذاهب الإيلامية ١٩٨.

# دەروازەی سێیەم

## بنەماکانی ئایین لەلایەن مەزهەبە ئیسلامییەکان

دوای خستنەڕووی مەزهەبە ئیسلامییەکان لە بواری بیروباوەڕدا، ئەوە بەدەرکەوت کە ڕاجیایی هەیە لە نێوانیان لەبارەی بنەماکانی ئاین. مەبەست لە بنەماکانی ئاین: ئەو بنچینانەن کە باوەڕو ئیمان لەسەری دادەمەزرێن، بە لاچوونی هەریەك لەو بنچینانە ئیمانیش لادەچێت.

مەزهەبە ئیسلامیەکان لە ژماردنی ئەو بنەمایانە ڕاجیاییان هەیە، کە سەردەکێشێت بۆ گومان بردن بەوەی ڕاجیایی جەوهەری هەیە لە نێوان مەزهەبەکان لەم بارەدا. من تەنها ڕوونکردنەوە دەدەم لەسەر بنەماکانی ئاین لەلایەن سێ لەو مەزهەبانە کە ئەمانەن: ئەهلی سوننە و جەماعەت، شیعەی ئیمامی، موعتەزیلە، لە کاتی ڕوونکردنەوەی ئەو بنەمایانە دەبینین هەموو تاقمەکانی تر بۆ ئەو بنەمایانە دەگەڕێنەوە.

### ١ـ بنەماکانی ئایین لەلایەن ئەهلی سوننە و جەماعەت

بنەماکانی ئاین لەلایەن ئەهلی سوننە و جەماعەت شەشن، کە بریتین لەو بنەمایانەی لە فەرموودەکەی جبریلدا (سەلامی خوای لێبێت) هاتووە، کاتێك پرسیاری لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کرد لەبارەی ئیمان، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە وەڵامدا فەرمووی: **(أن تؤمن بالله، وملائكته، وكتبه، ورسله، واليوم الآخر، وتؤمن بالقدر خيره وشره)**[1] واتە: باوەڕت هەبێت بەخوا،بە فریشتەکانی، کتێبەکانی، پێغەمبەرەکانی، ڕۆژی دوایی، هەروەها بە قەدەر چ خێر یان شەڕ بێت.

---

[1] حديث جبريل (عليه السلام) في صحيح البخاري في ٢: كتاب الإيمان، ٣٧ باب سؤال الجبريل النبي (صلى الله عليه وسلم) عن الإيمان...، رقم ٥٠ عن أبي هريرة (رضي الله عنه) وورد عن أبي هريرة

### بنەمای یەکەم: باوەڕ بە خوا

بریتییە باوەڕ بوون بەوەی خوای گەورە هۆکاری بوونی بەدیهێنراوانە، تاك و تەنهایە و نە سیفەت و کردەوەکانیدا هاوشێوەی نییە، هاوێنەی نییە، خاوەنی هەموو سیفەتەکانی کاملی شکۆدارییە وەك: توانا و زانست و دادگەری..، پاك و بێ گەردە لە هەموو سیفاتە کەم و کورتەکان وەك: ستەم و بەدخویی...

### بنەمای دووەم: باوەڕ بە فریشتەکان

فریشتەکان جەستەیان نوورانییە، جەستەیان ماددە نییە، بوونی فریشتەکان چەسپاوە بەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ﴾ البقرة: ٢٨٥. واتە: (پێغەمبەرو ئیمانداران باوەڕیان هەیە بەوەی لەلایەن پەروەردگاریان هاتۆتە خوارەوە، هەموویان باوەڕیان هەیە بە خواو فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی).

خوای گەورە لەسەر ئێمەی پێویست کردووە کە باوەڕمان هەبێت بە فریشتەکان، نکۆڵی کردن لە بوونیان بێ باوەڕی و کوفرە، خوای پایەبەرز دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا﴾ النساء: ١٣٦. واتە: (ئەوەی باوەڕی نەبێت بە خواو بە فریشتەکانی و بەکتێبەکانی و بە پێغەمبەرانی و بە ڕۆژی دوایی، ئەوا بەڕاستی گومڕابووەو لەوپەڕی گومڕایی دایە).

سەبارەت بە وەسف و خەسڵەتەکانیان ئەوا ئێمە ئەرکدار نین بە لێکۆڵینەوە لێیان تەنها ئەوە نەبێت کە لە دەقێکی سەلمێنراو و بڕاوەوە هاتبێت، هەندێك لەو وەسف و خەسڵەتانە:

١- پارێزراون لە هەڵە. خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ﴾ التحريم: ٦. واتە: (نا فەرمانی خوا ناکەن لە هیچ شتێکدا کە فەرمانیان پێ بدات و هەرچی فەرمانێکیان پێ بدرێت ئەنجامی دەدەن).

---

أيضا في رقم ٤٧٧٧. وفي صحيح مسلم في ١ كتاب الإيمان، أول بيان الإيمان والإسلام...، رقم ٨ (٢)، عن عمر بن خطاب (رضي الله عنه) واللفظ لمسلم.

٢- چەندەها باڵیان هەیە، هەیانە دوو یان سێ یاخود چوار باڵی هەیە. خوای بێ وێنە دەفەرمووێت: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ جَاعِلِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُو۟لِىٓ أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ۚ يَزِيدُ فِى ٱلْخَلْقِ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ فاطر: ١. واتە: (سوپاس و ستایش بۆ خوایە، کە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەویە، فریشتەکانی کردووە بە فرستادەی خۆی کە خاوەن چەندەها باڵن، هەیانە دوو یان سێ یان چوار باڵە، لە دروست کردندا هەرچی بوێت زیادی دەکات، بەڕاستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە).

٣- توانایان هەیە خۆیان بنوێنن لە وێنەی مرۆڤدا. خوای پاك و تاك دەفەرمووێت: ﴿وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ مَرْيَمَ إِذِ ٱنتَبَذَتْ مِنْ أَهْلِهَا مَكَانًا شَرْقِيًّا ﴿١٦﴾ فَٱتَّخَذَتْ مِن دُونِهِمْ حِجَابًا فَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا﴾ مریم: ١٦، ١٧. واتە: (ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە قورئاندا باسی بەسەرهاتی مەریەم بکە، کاتێك کەنارگیری کرد لە کەس و کاری و شوێنێکی لە ڕۆژهەڵاتی "بيت المقدس" هەڵبژارد بۆ "خواپەرستی". ئینجا لە نێوان خۆی و ئەواندا پەردەیەکی ڕایەڵ کرد، ئێمەش جوبرەئیلی فریشتەمان نارد بۆ لای، وەکو بەشەرێکی تەواو "خۆی خستە بەرچاوی").

**ئەو کارانەی خوای گەورە بە فریشتەکانی سپاردووە زۆرن، لەوانە:**

١- داوای لێخۆش بوون بۆ باوەڕداران و نزاکردن بۆیان. خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَحْمِلُونَ ٱلْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِۦ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَىْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا فَٱغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا۟ وَٱتَّبَعُوا۟ سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿٧﴾ رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّٰتِ عَدْنٍ ٱلَّتِى وَعَدتَّهُمْ وَمَن صَلَحَ مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٨﴾ وَقِهِمُ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ وَمَن تَقِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمْتَهُۥ ۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾ غافر: ٧-٩. واتە: (ئەو فریشتانەی کە عەرش و تەختی پەروەردگار

هەڵدەگرن، ئەوانەش کە بە دەوریدا دەسوڕێنەوە، تەسبیحات و ستایش و سوپاسی پەروەردگاریان دەکەن، ئیمان و باوەڕی زۆر بەهێزیان پێیەتی، داوای لێ خۆش بوونیش دەکەن بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە، دەڵێن: پەروەردگارا! ڕەحمەت و میهرەبانی تۆ، زانست و زانیاری تۆ، هەموو شتێکت پێ گرتۆتەوە، کەوابوو خۆش ببە لەوانەی کە تەوبەیان کردووە و لە گوناهەکانیان پەشیمانن و شوێن بەرنامە و ڕێبازی تۆ دەکەون، هەروەها لە ئاگری دۆزەخیش بیانپارێزە. پەروەردگارا بیانخەرە ئەو باخ و باخاتەی بەهەشتی عەدەنەوە کە بەڵێنت پێداون، هاوڕێ لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە چاك و خواناسن، لە باوك و دایك و هاوسەران و نەوەکانیان، بەڕاستی هەر تۆ خوایەکی باڵادەست و دانایت. لە تۆڵەی هەموو گوناهەکان بیانپارێزە، خۆ هەر کەسێك لە تۆڵەی گوناهەکان بپارێزیت لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەوە ئیتر تۆ ڕەحمت پێ کردووە، هەر ئەوەشە سەرفرازی و سەرکەوتنی گەورەو بێ سنوور).

٢- هەڵگرتنی عەرشی پەروەردگار. خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَٱلْمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرْجَآئِهَاۚ وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَٰنِيَةٌ﴾ الحاقة: ١٧.واتە: (فریشتەکان لە گۆشە و کەناری "جیهانی نوێ"دا ئامادە دەبن، تەختی پەروەردگارت ئەو ڕۆژە هەشت فریشتە هەڵی دەگرێت بەسەر سەریانەوە).

٣- تۆمارکردنی کردەوەکانی مرۆڤ. پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿إِذْ يَتَلَقَّى ٱلْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٌ ﴿١٧﴾ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ ق: ١٧، ١٨. واتە: (کاتێك دوو فریشتە چاودێرەکەی ئادەمیزاد کە لەلای ڕاست و چەپیەوە دانیشتوون. هەر قسەیەکی لە دەم دەرچێت خێرا چاودێرێکی ئامادە" تۆماری دەکات).

٤- چاودێری کردنی مرۆڤ و پاراستنیان. خوای پەروەردگار دەفەرموویت:﴿لَهُۥ مُعَقِّبَٰتٌ مِّنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ يَحْفَظُونَهُۥ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ﴾ الرعد: ١١. واتە: (بۆ خوا هەیە فریشتەی بێ شومار کە بەنۆرە بەدوای یەکدا دێن تا چاودێری ئادەمیزاد بکەن لە بەرو پشت و لە هەموو لایەکەوە بیپارێزن بە فەرمانی خوا).

هـــەروەها ئـــەم فەرمایشـــتە:﴿ وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامًا كَاتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ﴾ الإنفطار: ١٠-١٢. واتە: (بێگومـــان ئێـــوە چـاودێرتان بەسـەر دانـراوە. لـە فریشتە بەڕێزە تۆمارکەرەکان. کە ئاگا و زانان بە هەموو ئەو کردەوەو ڕەفتارانـەی کە ئەنجامی دەدەن).

٥- هێنانە خوارەوەی کتێبە ئاسمانیەکان. خوای بـێ وێنـە دەفـەرموویێت:﴿ وَإِنَّهُ لَتَنزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ ﴾ الشـــــعراء: ١٩٢-١٩٤. واتـــە: (بـــە ڕاسـتی ئـەم قورئانـە لەلایـەن پـەروەردگاری هـەموو جیهانەکانەوە ڕەوانەکراوە. جوبرەئیلی ئەمین "فریشتەی وەحی" دایبەزانـدووە. بـۆ سەر دڵی تۆ ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) تا بچیتە ڕیزی ئەو کەسـانەی کـە خەڵکی بێداردەکەنەوەو لە خەوو غەفڵەت دایاندەچڵەکێنن).

٦- گیان کێشان. خوای مـەزن دەفـەرموویێت: ﴿ قُلْ يَتَوَفَّاكُم مَّلَكُ الْمَوْتِ الَّذِي وُكِّلَ بِكُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴾ السجدة: ١١. واتە: (جا پێیان بڵێ: فریشتەی گیان کێشـان کـە کـاری گیـان کێشـانتانی پـێ سـپێردراوە دەتانمرێنێـت، لـەوەودوا بـۆ لای پەروەردگارتان دەبرێنەوە).

٧- سەرپەرشـتی کردنـی بەهەشـت و پاراسـتنی بەهەشـتییەکان. خـوای باڵادەسـت دەفـــەرموویێت: ﴿ جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا وَمَن صَلَحَ مِنْ آبَائِهِمْ وَأَزْوَاجِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ ۖ وَالْمَلَائِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ ﴿٢٣﴾ سَلَامٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ ۚ فَنِعْمَ عُقْبَى الدَّارِ ﴾ الرعـد: ٢٣، ٢٤. واتە: (کە باخەکانی بەهەشتی - عەدنە-، بۆیان ڕازاوەتەوە، بـە شـادیەوە دەچـنە ناوی، هاوڕێ لەگەڵ هەر کەسێك چاك و پاك و خواناسە لە باووباپیران و هاوسـەران و نەوەکانیان، جا فریشتەکان دەچـن بـۆ سـەرەدانیان لـە هـەموو دەروازەکانـەوە. دەڵـێن: سـڵاوتان لێبێـت بـەهۆی خۆگرتنتانـەوە، کـەوابوو ئـای چـەندە جێگـە و ڕێگەیەکی خۆشتان بۆ خۆتان مسۆگەر کرد).

٨- سەرپەرشـتی کردنـی دۆزەخ و سـزادانی دۆزەخییـەکان. خـوای تـاك و تـەنها

دەفــــەرموویێت: ﴿وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًا حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَتۡلُونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِ رَبِّكُمۡ وَيُنذِرُونَكُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَاۚ قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنۡ حَقَّتۡ كَلِمَةُ ٱلۡعَذَابِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ الزمر: ٧١. واتە: (ئەوسا ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون، ڕاپێچ دەکرێن بەرەو دۆزەخ دەستە دەستە و تاقم تاقم دەگوێزرێنەوە، تا کاتێك دەگەنە بەر قاپییەکانی، بۆیان دەکرێتەوە، فریشتەی بەرپرس و سەرپەرشتیار سەرزەنشتیان دەکات و پێیان دەڵێت: باشە، مەگەر پێغەمبەران لە خۆتان ڕەوانە نەکرابوو بۆتان کە ئایەتەکانی پەروەردگاری خۆتان بەسەردا بخوێنێتەوە، یادەوەریتان بکات و داتان بچڵەکێنێت لە گەیشتنی ئەم ڕۆژە؟! بەدەم ئاخ و داخ و نالەوە دەڵێن: بەڵێ، بەڵام تازە، بەڵێ، سوودی نییە و بڕیاری سزاو ئازار دراوە بەسەر کافرو بێ بڕواکاندا).

خەسڵەت و ئەرکی تری جگە لەم خەسڵەت و ئەرکانەش کە لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی بەپێزدا هاتوون.

### *بنەمای سێیەم: باوەڕ بە کتێبە ئاسمانیەکان*

خوای پاك و بێ وێنە فەرمانی پێکردووین کە بەشێوەیەکی گشتی سەرجەم کتێبە ئاسمانیەکان بە ڕاست دابنێین و بڕوامان پێیان هەبێت، باوەڕمان وابێت کە ئەم کتێبانە بە ڕاست و دروست دابەزێنراون. خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَا ٱلتَّوۡرَىٰةَ فِيهَا هُدٗى وَنُورٞۚ يَحۡكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسۡلَمُواْ لِلَّذِينَ هَادُواْ﴾ المائدة: ٤٤. واتە: (بەڕاستی ئێمە کاتێك تەوراتمان نارده خوارەوە ڕێنموویی تیادا بوو، نوورو ڕووناکیش بوو، ئەو پێغەمبەرانەی کە هەمیشە ملکەچ و فەرمانبەردار بوون حوکمی ئەوانەیان پێدەکرد کە ببونە جولەکە).

هەروەها دەفــــەرموویێت: ﴿وَقَفَّيۡنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡإِنجِيلَ فِيهِ هُدٗى وَنُورٞ وَمُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَهُدٗى وَمَوۡعِظَةٗ لِّلۡمُتَّقِينَ﴾ المائدة: ٤٦. واتە: (ئینجا بەشوێن ئاسەواری هەموو پێغەمبەرانی "نەوەی

ئیسرائیلدا" عیسای کوڕی مەریەممان هێنا، کە ڕاستی تەوراتی دەردەخست و پشتیوانی لێ دەکرد و ئینجیلیشمان پێدا، کە هیدایەت و نوورو ڕووناکی تێدایە و پشتگیری تەوراتی پێش خۆیەتی، هیدایەت و ڕێنموویی و ئامۆژگارییە بۆ ئەو کەسانەی کە لە خوا دەترسن و پارێزکارن).

قورئانی پیرۆز بە چەندین خەسڵەت و تایبەتمەندی جیا دەکرێتەوە، بۆ نمونە:

خوای گەورە پارستنی قورئانی پیرۆزی لە ئەستۆ گرتووە، خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ دەفەرموویێت: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴾ الحجر: ٩. واتە: (بەڕاستی هەر ئێمە قورئانمان دابەزاندووە و بێگومان هەر ئێمەش پارێزگاری دەکەین).

هیچ کەم و کورتی و شتی پوچ بەسەر قورئانی پیرۆزدا نایەت، خوای مەزن دەفەرموویێت: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٌ ﴿٤١﴾ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴾ فصلت: ٤١، ٤٢. واتە: (بێگومان ئەو قورئانەش کتێبێکی زۆر بەنرخ و ناوازەو سەرکەوتووە. ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)شتێك بە تۆ ناوترێت، کە بە پێغەمبەرانی پێش تۆ نەوترابێت، بەڕاستی پەروەردگاری تۆ خاوەنی لێ بوردن و لێ خۆشبوونە بۆ باوەڕداران و تۆڵەسێنەری بە ئازارو بە ئێشە لە بێ باوەڕان).

خوای گەورە لەسەر ئێمەی پێویست کردووە کە کاری پێبکەین، چونکە هەموو ئامۆژگاری و ڕاسپاردە خواییەکان لە خۆ دەگرێت: خوای بێ هاوەڵ و هاوبەش دەفەرموویێت: ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ﴾ المائدة: ٤٨. واتە: (ئێمە قورئانمان هاوڕێ لەگەڵ هەموو حەقیقەت و ڕاستیەکدا بۆ تۆ دابەزاندووە، ڕاستی و دروستی کتێبەکانی پێش خۆیشی دیاری دەکات و چاودێرە بەسەر هەموویاندا).

## *بنەمای چوارەم: باوەڕ بە پێغەمبەران*

ئەوانە پوختە و هەڵبژێردراون لەناو بەدیهێنراوان، خوای گەورە ئەوانی دەستنیشان کردووە بۆ ئەوەی هەڵسن بە پرۆسەی مژدەدان و ترساندن، خوای گەورە دەفەرموویێت:

﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَـٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗاۚ وَإِن مِّنۡ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٞ ﴾ فاطر: ٢٤. واتە: (بێگومان ئێمە تۆمان ڕەوانە کردووە بە حەق و ڕاستییەکی تەواوەوە، تۆ مژدەدەری "ئیماندارانیت"، ترسێنەری "بێ بڕواکانیت" هیچ گەل و نەتەوەیەکیش نەبووە کە فرستادە و بێدار کەرەوەیەکی بۆ ڕەوانە نەکرابێت).

پێویستە باوەڕمان بەسەرجەم ئەو پێغەمبەرانە هەبێت کە ناویان لە قورئانی پیرۆزدا هاتووەو ئەوانەش کە ناویان نەهاتووە، دەبێت باوەڕیشمان بەوە هەبێت کە نکۆڵی کردن لە پێغەمبەرایەتی هەر یەکێکیان کوفرە، خوای گەورە دەفەرموویێت:﴿لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦ ﴾ البقرة: ٢٨٥. واتە: ("دەڵێین" هیچ جۆرە جیاوازییەك ناکەین لە نێوان هیچ پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرەکانی خوادا "لە باوەڕدا").

باوەڕیشمان وایە کە پێغەمبەران خاوەنی چاکترین و باشترین خەسڵەت و سیفەتی مرۆیی بوونە، پاك و دووریش بوونە لە ڕەوشتە نزم و پەست و کەموکورتەکان، خوای پایەبەرز دەفەرموویێت: ﴿وَجَعَلۡنَـٰهُمۡ أَئِمَّةٗ يَهۡدُونَ بِأَمۡرِنَا وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡهِمۡ فِعۡلَ ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِۖ وَكَانُواْ لَنَا عَٰبِدِينَ ﴾ الأنبياء: ٧٣. واتە: (هەموو ئەوانیشمان کردە پێشەواو بە فەرمانی ئێمە ڕێنموویی خەڵکیان دەکردو نیگامان بۆ کردن بە ئەنجامدانی کارو کردەوە چاکەکان و ڕاگرتنی نوێژ و زەکات دان، (بەڕاستی) ئەوان هەر ئێمەیان دەپەرست و هەر بەندایەتی ئێمەیان دەکرد).

باوەڕیشمان وایە کە پێغەمبەر موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) کۆتا پێغەمبەرو دوایین پەیامبەر بووە، خوای بێ هاوەڵ دەفەرموویێت: ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٖ مِّن رِّجَالِكُمۡ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴾ الأحزاب: ٤٠. واتە: (محمد باوکی هیچ کەس لە پیاوانتان نییە، بەڵکو پێغەمبەری خوایە و دواهەمینی پێغەمبەرانە).

### بنەمای پێنجەم: باوەڕ بە ڕۆژی دوایی

بریتیە لە باوەڕ بوون بە بوونی ژیانێکی تر جگەلە ژیانی ئەم دونیایە، کە مرۆڤ تیایدا سزا و پاداشتی کردەوەکانی کە لە دونیادا ئەنجامی داوە وەربگرێت، جا یان ئەوەتا بە خۆشی بەهەشت پاداشت وەردەگرێت یاخود سزا وەردەگرێت بە ئاگری دۆزەخ.

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن لَّن يُبۡعَثُواْۚ قُلۡ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبۡعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلۡتُمۡۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴾ التغابن: ٧. واتە: (ئەوانەی بێ باوەڕ بوون بە بۆچوونی خۆیان وتیان: هەرگیز زیندوو ناکرێنەوە، پێیان بڵێ: وا نیە، سوێند بە پەروەردگارم، بەڕاستی هەر زیندوو دەکرێنەوە، پاشان ئاگادار دەکرێن لە هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامتان دەدا ئەوەش بۆ خوا زۆر ئاسان و سادەیە).

ئەو کەسەی نکوڵی لە بوونی ئەم ڕۆژە دەکات بەبێ ڕاجیایی کافرو بێ باوەڕە، خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ ﴾ التوبة: ٢٩.واتە: ("ئەی ئیمانداران" دژی ئەوانەی کە باوەڕی "ڕاست و دروستیان" بەخواو بەڕۆژی قیامەت نییە بجەنگن).

بەم باوەڕە مرۆڤ لە دونیادا لێپێچینەوە لەگەڵ خودی خۆی دەکات، ئەمەش لەبەر ترسانی لە لێپرسینەوەی دوارۆژ.

### بنەمای شەشەم: باوەڕ بە قەزاو قەدەر چ خێرو چاکە یان خراپە بێت

ماتوریدییەکان بۆچوونیان وایە کە قەزا بریتییە لەوەی خوای گەورە ئەم بوونەوەرەی بەدیهێناوە بەوپەڕی ڕێك و پێکی و تۆکمەییەوە.

قەدەر: بریتییە لە زانستی بێ سەرەتا و هەربووی خوای گەورە سەبارەت بە بەدیهێنراوان، واتە: خوای گەورە هەر زانابووە بەوەی چاك یان خراپ، مایەی سوود یان زیان دەبن.

ئەشعەرییەکان ئەمەیان پێچەوانەوە کردووە، ئەمەش بەوەی پێناسەی قەدەریان بۆ قەزا کردووە، پێناسەی قەزاشیان بۆ قەدەر کردووە.

واتای باوەڕ پێبوونیان: ئەوەیە بڕوات وابێت کە هەر شتێك تووشی مرۆڤ دێت لە چاکە و خراپە ئەوا بە پێی ئەندازەگیری و زانست و ویستی خوای باڵادەستە.

ئەمەش مانای وانییە کە مرۆڤ لە ئەنجامدانی کردەوەکانیدا ناچارکراوە، چونکە ئەگەر مرۆڤ ناچار کراو بێت ئەوا پرۆسەی سزاو پاداشت پوچەڵ دەبێتەوەو هۆو حیکمەتی ڕەوانەکرانی پێغەمبەران نامێنێت.

## ٢- بنەماکانی ئایین لەلایەن شیعەی دوازدە ئیمامی

زۆربەی شیعەی دوازدە ئیمامی بۆچوونیان وایەکە بنەماکانی ئایین پێنجن، کە بریتین لەمانە:

خوابەیەکزانین، دادگەریی، پێغەمبەرێتیی، ئیمامەت، ڕۆژی دوایی[1].

### *خوابەیەکزانین*

بریتییە لە باوەڕ بوون بەوەی خوای بێ وێنە تاك و تەنهایە لە:

پەرستراوێتیدا، جگە لەو شتێکی تر نەپەرستێت.

لە پەروەردگارێتی دا، هیچ هاوبەشی لە بەدیهێناندا نییە.

کردەوەکانیدا، سەربەخۆیە لە بەدیهێنان و ڕۆزیدان و مردن و ژیان... .

پلەکان، یەکتایی خود (ذات)ی خوا، یەکتایی لە سیفەتەکاندا، یەکتایی لە کردەوەکاندا.

---

[1] أصل الشيعة وأصولها ١٤١ و لاپەڕەکانی دواتر.
نەصیر توسی لە (تجريد الإعتقاد ٣٢٧) باسی هەموو ئەم بنەمایانەی کردووە بێجگە لە (بنەمای دادگەر) نەبێت کە لە چوارچێوەی (بنەمای خوابەیەکزانین)دا باسی کردووە.

### دادگەریی

بریتییە لە باوەڕ بوون بەوەی خوای گەورە ستەم لەکەس ناکات، کارێك ناکات کە عەقڵی سەلامەت و تەندروست بە ناپەسەندی بزانێت. شیعەی دوازدە ئیمامی وەك موعتەزیلەکان بڕوایان بە خراپی و چاکی عەقڵی هەیە.

### پێغەمبەرایەتی

سەرجەم پێغەمبەران و پەیامبەران کە قورئانی پیرۆز بە دەق ناوی ئەوانی هێناوە ئەوا بەندەی ڕێزدارن، خوای گەورە ڕەوانەی کردوون بۆ بانگ کردنی خەڵك بۆ لای خوا. پێغەمبەر موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) کۆتا پێغەمبەرو دوایین پەیامبەرە، پارێزراویشە لە هەڵە.

خوای گەورە قورئانی پیرۆزی بۆ سەر پێغەمبەر موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) بۆ دەرخستنی موعجیزە و تەحەدا پێکردن و فێکردنی حوکمەکان، قورئان هیچ کەم و کورتییەکی تێدا نییە و دەستکاری نەکراوەو بۆی زیاد نەکراوە، ئەو هەواڵ و خەبەرانەش کە هاتوون و لە ڕووکەشدا ئەوە بەدەستەوە دەدەن کە قورئان کەم و کورتی تێدایە و دەستکاری کراوە ئەو خەبەرانە ڕیزپەڕو لاوازن، ئەمانە چەند هەواڵێکی تاقانەن کە نابنە هۆی دامەزراندنی زانین و کردار، جا یان دەبێت ئەم خەبەرانە تەئویل بکرێن یاخود لە دیوار بدرێن، هەروەك شێخ (کاشفولغەتا) ئەمەی وتووە.

ئیمامییەکان پێیان وایە هەر کەسێك باوەڕی بە پێغەمبەرایەتیەك هەبوو لە دوای موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) یان بانگەشەی پێغەمبەرایەتی یان دابەزینی سروش یان کتێبێکی کرد ئەوا بێ باوەڕە و پێویستە بکوژرێت.

### ئیمامەت

پلەو پۆستێکە خوای گەورە بە زانستی بێ سەرەتا و هەربووەکەی بە کەسێك دەبەخشێت وەك چۆن پێغەمبەر هەڵدەبژێرێت، خوای گەورە فەرمان بە پێغەمبەر دەکات کە ئیمام بە ئوممەت بناسێنێت و فەرمانیان پێبکات شوێنی بکەون.

باوەڕیان وایە خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەری کردووە کە بەدەق ئیمامی عەلی دەستنیشان بکات.

پێیان وایە کە لە هەموو چەرخ و سەردەمێك بوونی ئیمام پێویستە، هەرگیز زەوی بێ بەڵگە (ئیمام[1]) نابێت.

### ڕۆژی دوایی

بریتیە لەوەی خوای گەورە بوونەوەر زیندوو دەکاتەوە لەدوای مردن بۆ ژیانێکی تر بۆ وەرگرتنەوەی پاداشت و سزا، خوای پایەبەرز دەفەرمووێت: ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ﴾ الزلزلة: ٧-٨. واتە: (جا ئەوەی بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك خێرو چاکەی ئەنجام دابێت. ئەوەش کە بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك شەڕو خراپەی هەبێت دەیبینێتەوە).

مرۆڤەکە بەخودی خۆی و جەستە و ڕۆحەکەیەوە زیندوو دەبێتەوە بەشێوەیەك گەر یەکێك بیبینێت ئەوا دەڵێت ئەوە فڵانە کەسە[2].

## ٣- بنەماکانی ئایین لەلایەن موعتەزیلەکان

لەکاتی دوان لەسەر موعتەزیلەکان ئەوەمان خستەڕوو کە بنەماکانیان پێنجن، کە ئەمانە: خوابەیەکزانین، دادگەری، پلەیەك لە نێوان دوو پلەکە، پەیماندان بە باوەڕداران و هەڕەشە لە یاخی و بێ باوەڕان (الوعد و الوعید)، فەرمان بەچاکە و ڕێگری لە خراپە.

---

[1] بۆیە ئەوەی ناو دوو کەوانەکەم زیاد کرد، چونکە مەبەستیان لە بەڵگە لێرەدا ئیمامە. (وەرگێڕ).

[2] أصل الشیعة وأصولها ١٤١-١٥٧. سەیر ئەم بنەمایانە بکە لە: تجرید الإعتقاد للطوسي وشرحه کشف المراد للحلي ٣٠٥ ولاپەڕەکانی دواتر.

**بنەمای یەكەم: خوابەیەكزانین**

بریتیە لە باوەڕ بوون و دانـان بەوەی خوای گەورە تاك و تەنهایە و هاوبەشی نییە لـەو سیفاتانەی كە شیاوی ئەون چ بە بوون یان بە نەبوون، بەو پێیەی كە شیاوی خوایە.

لەسەر ئەم بنەمایە نكۆڵیان كرد لە بوونی سیفەتەكانی خوا، و ئەستەم بوونی بینرانـی خوا لە ڕۆژی دواییدا.

**بنەمای دووەم: دادگەریی**

بریتیە لە باوەڕ بوون بەوەی كردەوەكانی خوای گەورە هەموویان هەر چـاكن، كـردەوەی خراپ ئەنجام نادات، بەڕێك و پێكی ئەو شـتە جێبـەجێ دەكـات كـە پێویسـتە لەسـەری ئەنجامی بدات.

لەسەر ئەم بنەمایە ئەم بۆچوونانەیان داهێنا: خراپ و چـاكی عـەقڵی، میهـرو لـوتفی خوایی، چاكە و چاكتر (الصلاح والأصلح)، پێویست بـوونی نـاردنی پێغەمبـەران لەسـەر خوا.

**بنەمای سێیەم: بەڵێندان بە باوەڕداران و هەڕەشە لە یاخی و بێ باوەڕان (الوعد و الوعید)**

بریتیە لە باوەڕ بـوون بـەوەی خـوای گـەورە پـەیمانی داوە بـە گوێڕایـەڵ و خواناسـان پاداشتیان بداتەوە، هەڕەشەی كردووە لە بێ باوەڕان بەوەی سـزایان دەدات، خـوای گـەورە پەیمان و بەڵێن و هەڕەشەكەی خۆی جێبەجێ دەكات، دروست نییە بـۆ خـوای گـەورە درۆ بكات یان فەرمایشتی خۆی بشكێنێت.

بەپێی ئەم بنەمایە: نكۆڵیان كردووە لە تكـاو شـەفاعەتی پێغەمبـەر (صلى الله علیه وسلم)بۆ ئەوانەی گوناهی گەورەیان كردووە لە ئوممەت، شەفاعەتیان تەنها بۆ ئـەو كەسـانە كورت هەڵهێناوە كە باوەڕدارن و تەوبەیان كردووە.

### بنەمای چوارم: پلەیەك لە نێوان دوو پلەکە

ئەوەی گوناهی گەورەی کردووە باوەڕدار نییە وەك (مورجئەکان بۆچوونیان وایە باوەڕدارە) و بێ باوەڕیش نییە وەك خەواریجەکان دەڵێن بێ باوەڕە، بەڵکو لە پلەیەکدایە لە نێوان کوفرو باوەڕدا.

### بنەمای پێنجەم: فەرمان بەچاکە و ڕێگری لە خراپە

مەبەست لە فەرمان بەچاکە: بەرپاکردنی چاکەیە. مەبەست لە ڕێگری لە خراپە: لابردن و نەهێشتنی خراپەیە.

جا بەپێی ئەم بنەمایە: ڕووبەڕووی بێ دین و خوانەناسان بوونەوە جیهاد و تێکۆشانیان کرد لەگەڵ ئەوانەی پێچەوانەی حوکمی خوا جوڵاونەتەوە.

## بنەمای ئایینی و بنەمای مەزهەبی

بنەماکانی ئایینی دوو جۆرن: ئایینی و مەزهەبی.

أ- **بنەمای ئایینی:** بریتییە لەو بنەمایەی کە هەر کەسێك نکۆڵی لێ بکات دەچێتە دەرەوەی بازنەی ئیسلام.

ب- **بنەمای مەزهەبی:** بریتییە لەو بنەمایەی هەر کەسێك نکۆڵی لێ بکات دەچێتە دەرەوەی بازنەی مەزهەب، ناچێتە دەرەوەی بازنەی ئیسلام[1].

دوای ئەم ڕوونکردنەوەیە ئەو بنەمایانە دەخەینەڕوو کە ئەو مەزهەبانە لەسەری کۆکن، ئەو بنەمایانەش دەخەینەڕوو کە لە ڕووکەشدا بۆنی ڕاجیایی لێدێت کەچی لە ڕاستیدا لە دوای وردبوونەوە لێی بەدەردەکەوێت کە ئەو ڕاجیاییە ڕاستەقینە نییە.

## ئەو بنەما ئایینیانەی کە موسڵمانان لەسەری کۆکن

ئەهلی سوننە و جەماعەت و شیعەی ئیمامی و موعتەزیلە لەسەر ئەم بنەمایانە کۆکن، کە ئەمانەن:

---

[1] لەکاتی دوان لەبارەی تاقمی موعتەزیلە بەتێرو تەسەلی ئەمە خرایەڕوو.

١- باوەڕ بوون بە بوونی خوا، بەوەی خوای گەورە خاوەنی سەرجەم سیفاتە تەواو و کاملەکانە، پاك و دوورە لە هەر سیفەتێك لە سیفەتە کەم و کورتەکان.
٢- باوەڕ بوون بە پێغەمبەرایەتی بەشێوەیەکی گشتی و پێغەمبەرایەتی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) بەشێوەیەکی تایبەت و باوەڕ بوون بەوەی کە لەلایەن خواوە هێناویەتی و ڕایگەیاندووە.
ئەگەرچی موعتەزیلەکان ئەم بنەما و بنچینەیان لە چوارچێوەی پێنج بنەماکانیاندا باسیان نەکردووە، ئەوا ئەمە زانراوە لەو نووسراوانەی نووسیویانە لەبارەی سەلماندنی پێغەمبەرایەتی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) و ئیعجازی قورئان، تەنانەت لە گفتوگۆو مێزگەردو بەرگرییەکەیان لە شەریعەتی ئیسلام بەتوانا و عەقڵە تیژەکانیان.
پێشتر وتەی ئەوان لە بابەتی (چاك و خراپی عەقڵی) ئەوە خرایەڕوو: (ئەوانەی بانگەوازی پێغەمبەران و شەریعەتەکانیان پێگەیشتووە ئەرکدارن لەلایەن خواوە بەوەی هەڵسن بەو شتانەی ئەو شەریعەتانە داوایان لێدەکەن).
٣- باوەڕ بوون بە شێوەیەکی پوخت بە ڕۆژی دوایی و بەوەی کە خەڵکی سزاو پاداشت بەپێی کردەوەکانیان وەردەگرنەوە.

ئەم سێ بنەمایانە، بنەمای ئایینین لەلایەن سەرجەم ئەو تاقمانە، چونکە ئەو کەسەی بڕوای بە یەکێك لەو بنەمایانە نەبێت ئەوا بێ باوەڕە بەبێ ڕاجیایی ئەو کەسە دەچێتە دەرەوەی بازنەی ئیسلام.

## ئەو بنەمایانەی ڕاجیاییان لەسەرە

هەر تاقمێك لەو سێ تاقم و مەزهەبانە، چەند بنەمایەکیان باس کردووە، کە تاقمەکەی تر باسی نەکردووە، کە وا دەنوێنێت جیاوازی هەیە لە نێوان تاقمەکان.
بەڵام لەکاتی وردبینی کردن لەو بابەتەدا دەبینین هەندێك لەو بنەمایانە دەگەڕێنەوە بۆ یەکێك لەو سێ بنەمایانە کە کۆك و تەبان لەسەری و خرانەڕوو، هەندێك لەو بنەمایانەش

هەیانە بەهۆی شتێکی ترەوە دیاریکراوە، بەمەش دەبێتە بنەمایەکی مەزهەبی بەو واتایەی ئەوەی نکۆڵی لێبکات بەهۆیەوە لە مەزهەب دەردەچێت نەك لە ئاین.

ئەهلی سوننە و جەماعەت بەتەنها دەقیان هێناوە لەسەر ئەم بنەمایانە: (باوەڕ بوون بە فریشتەکان و کتێبە ئاسمانیەکان و قەدەر).

ئەوەی تەماشا بکات دەبنێت (باوەڕ بوون بە فریشتەکان و کتێبە ئاسمانییەکان) دوو بنەمان دەچنە ناو بازنەی باوەڕ بوون بە پێغەمبەرایەتی، جا ئەوەی باوەڕ بە پێغەمبەر موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) بێنێت ئەوا بێگومان باوەڕ بەو دوو بنەمایەش دێنێت.

بنەمای: (باوەڕ بوون بە قەدەر بە چاك و خراپیەوە) لەلای ئەهلی سوننە و جەماعەت، بۆیە پێداگیری لەسەر دەکەن لە وەڵامی جەبرییەکان کە باوەڕیان وایە مرۆڤ بە ڕەهایی ناچار کراوە، وەك وەڵامی قەدەری و موعتەزیلەکانیشکە باوەڕیان وایە مرۆڤ بەڕەهایی ئازدە... .

لەبەر ئەمە دەکرێت باوەڕ بوون بە قەدەر بە بنەمایەکی مەزهەبی دابنێین نەك بە بنەمایەکیئایینی.

شیعەی ئیمامی بە دەق (دادگەر، ئیمامەتیان) وەك بنەما دیاریکردووە.

ئەوەی بە وردی تەماشای بکات دەبینێت کە دەچێتە ناو چوارچێوەی باوەڕ بە خوا بوون و بەیەکزانینی[1].

سەبارەت بە ئیمامەتیش زانایان دوو بۆچوونیان هەیە:

**بۆچوونی یەکەم:** بنەما و بنچینەی ئایینە. بەپێی ئەم بۆچوونە ئیمامەت بنەمایەکی ئایینیە، ئەوەی باوەڕی پێ نەبێت دەچێتە دەرەوەی بازنەی ئایینی ئیسلام.

---

[1] پێشتر لەکاتی باس کردنی بنەماکانی مەزهەبی ئیمامیەت ئەوەمان خستەڕوو کە (نصر الطوسي) بنەمای دادگەری بردۆتە ناو چوارچێوەی بنەمای خوابەیەکزانین. و شێخ (کاشف الغطا) لە (أصل الشیعة وأصولها ١٥٣) لە کاتی ڕاڤە کردنی بنەمای دادگەری کە یەکێکە لە پێنج بنەماکانیان وتویەتی: (دادگەری بنەمایەکی سەربەخۆ نیە بەڵکو لە ڕاستیدا دەچێتە ناو چوارچێوەی خەسڵەت و سیفەتەکانی خوای مەزن... کە لایەنێکە لە لایەنەکانی خوابەیەکزانین).

**بۆچوونی دووەم:** بنەمای مەزهەبییە، ئەم بۆچوونە ئیمامەت بە بنچینە و بنەمایەکی مەزهەبی دادەنێت، ئەوەی باوەڕی پێ نەبێت لە ئایینی ئیسلام دەرناچێت، ئەو کەسەی باوەڕی پێ نەبێت نابێتە یەکێك لە شیعەی دوازدە ئیمامی. ئەمە بۆچوونی هەندێك لە زانا لێکۆڵەرەکانی شیعەی ئیمامیە.

شێخ (موحەممەد عەلی ناصر) کە یەکێکە لە زانا ئیمامیەکان دەڵێت: هەروەك زانا لێکۆڵەرەکانی شیعەی ئیمامی بۆچوونیان وایە کە ئیمامەت یەکێك نیە لە بنەماکانی ئاین، واتە بنچینەیەکی باوەڕ نییە، بنەمایەك نییە لە بنەماکانی ئایینی ئیسلام، بەڵکو بنەما و بنچینەیەکی مەزهەبییە لە بنەما و بنچینەکانی مەزهەبی شیعەگەری، بەو واتایەی ئەو کەسەی نکۆڵی لەو بنەمایە بکات نابێتە شیعە، هەڵەیە ئەگەر بوترێت نابێتە باوەڕدار یان موسڵمان[1].

کەسێك ورد ببێتەوە دەبینێت (بنەمای دادگەری) دەچێتە ناو خانەی باوەڕ بەخوا بوون و خوابەیەکزانین.

بە هەمان شێوە بەڵێن (وعد) و هەڕەشە (وعید) بنەمایەکە دەچێتە خانەی باوەڕ بەخوا بوون و باوەڕ بە ڕۆژی دوایی.

سەبارەت بە فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە، ئەمە شتێکی چەسپاوە لەلایەن گشت مەزهەبەکان، چونکە لە قورئانی پیرۆزدا دەقی لەسەر هاتووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ﴾ آل عمران: ١١٠. واتە: ("بەڕاستی" ئێوە چاکترین ئوممەتێکن کە بۆ (سوودی) خەڵکی هێنراونەتە مەیدانەوە، چونکە فەرمان بەچاکە دەکەن و قەدەغەی خراپە دەکەن و باوەڕی دامەزراوتان بەخوا هەیە).

لە سوننەتی بەپێزدا هاتووە، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)دەفەرموێت: **(من رأى منكم منكرا فليغيره بيده، فإن لم يستطع فبلسانه، فإن لم يستطع فبقلبه و ذلك أضعف**

[1] أصول الدين الإسلامي للشيخ محمد علي ناصر ٢٥.

**الإيمان)**[1] واتە: هەر کەسێك لە ئێوە خراپەیەکی بینی ئەوا با بەدەست بیگۆڕێت، ئەگەر نەیتوانی با بەزمان بیگۆڕێت، ئەگەر هەر نەیتوانی با بە دڵ پێی ناخۆش بێت بێگومان ئەمەش لاوازترین باوەڕە.

موسڵمانان کۆکن لەسەری، ئەمە بە یەکێك لەو شتانە دادەنرێت کە بە پێویست زانراون لە ئاییندا.

ئەم بنەمایانەی دەگەڕێنەوە بۆ ئەو بنەما ئایینیانەی کەموسڵمانان کۆکن لەسەری.

سەبارەت بە بنەمای پلەیەك لە نێوان دوو پلەکە (واتە پلەی لاساری لە نێوان هەر دوو پلەی باوەڕداری و بێ باوەڕی) ئەوە بنەمایەکی مەزهەبیە، موعتەزیلەکان ویستیان بەم بنەمایە بەرپەرچی خەواریجەکان بدەنەوە کە بۆچوونیان وایە ئەنجامدەری گوناهی گەورە کافرە، هەروەها بەرپەرچی مورجیئەکانیشی پێبدەنەوە کە دەڵێن ئەنجامدەری گوناهی گەورە باوەڕدارە... تاد[2].

دوای ئەمە:

بەدەردەکەوێت کە مەزهەبەکانی پێشتر کۆکن لەسەر هەر سێ بنەماکەی ئایین کە ئەمانەن: باوەڕ بوون بەخواو بەیەکزانینی، باوەڕبوون بە پێغەمبەرایەتی بەشێوەیەکی گشتی و پێغەمبەرایەتی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) بەشێوەیەکی تایبەتی، باوەڕ بوون بە ڕۆژی دوایی.

ئەم سێ بنەمایانە سێ بنەمای ئایینن، موسڵمان کۆکن لەسەر ئەوەی کە هەر کەسێك نکۆڵی لێبکات ئەوە لە ئایینی ئیسلام دەردەچێت.

چەند بنەمایەکی مەزهەبی هەن، هەر کەسێك نکۆڵی لێبکات ئەوا لە بازنەی

---

[1] فەرموودەی: هەر کەسێك لە ئێوە خراپەیەکی بینی ... تاد: أخرجه أحمد في مسنده ومسلم وأبو داود والترمذي والنسائي وإبن ماجه، عن أبي سعيد. وهو صحيح./ الجامع الصغير ٥٢٦. وأخرجه البيهقي بسنده في شعب الإيمان، سەرچاوەی پێشو. والحديث في صحيح مسلم في ١ كتاب الإيمان ٢٠ باب كون النهي عن المنكر من الإيمان....، رقم ٤٩، عن أبي سعيد الخدري.

[2] سەیری ئەم کتێبەمان بکە: أصول الدين الإسلامى ٥٨-٦٠.

مەزهەب دەردەچێت، نەك لە بازنەی ئایینی ئیسلام، کە ئەمانەن: بنەمای (باوەڕ بوون بە قەدەر) لەلای ئەهلی سوننە و جەماعەت، بنەمای (ئیمامەت) لەلایەن زانا لێکۆڵەرەکانی مەزهەبی دوازدە ئیمامی، بنەمای پلەیەك لە نێوان دوو پلەکە (المنزلة بين المنزلتين) لەلای موعتەزیلەکان.

بەم پێیە بەدەردەکەوێت ئەو ڕاجیاییەی مەزهەبەکان پێشتر خرایەڕوو لە سەر ژمارەی بنەماکانی ئاین تەنها ڕاجیاییەکەی وێنەییە و ڕاجیاییەکی ڕاستەقینە نییە.

بەپێی ئەو سێ بنەما ئاینیانەی کە موسڵمانان کۆکن لەسەری:

لێکۆڵینەوەکانی زانستی کەلام بۆ سێ تەوەر دابەش بوونە:

**خواناسی:** ئەو بابەتانە لە خۆ دەگرێت، کە لەو شتانە دەکۆڵێتەوە کە پەیوەستن بە خوای پەروەردگار دەکۆڵێتەوە.

**پێغەمبەرناسی:** ئەو بابەتانەن، توێژینەوە لەو شتانە دەکەن کە پەیوەستن بە پێغەمبەرانەوە.

**شتە بیستراوەکان:** ئەو بابەتانەن، کە حوکمەکانیان تەنها لە ڕێگەی بیستنەوە وەردەگیرێن[1].

لەم کتێبەماندا پشت بەو شێوە دابەشکارییە دەبەستین.

---

[1] شرح الجورة للباجوري ١٠٤.

# بەشی سێیەم

## حەقیقەتی ئیمان و باوەڕ
## ڕۆڵی لە کایەکانی ژیاندا

لە دوو دەروازە پێك دێت:

دەروازەی یەکەم:

حەقیقەتی ئیمان و باوەڕ.

زیادو کەم بوونی ئیمان.

ئیسلام.

ئیحسان.

دەروازەی دووەم:

گرنگی ئیمان و باوەڕ لە ژیاندا.

## دەروازەی یەكەم

## حەقیقەتی ئیمان و باوەڕ

دوای خستنەڕووی ڕاو بۆچوونی مەزهەبە ئیسلامییەكان لەبارەی بابەتی بیروباوەڕ، ئەوە ڕوون بووەوە كە ڕاجیاییەكە لە سەر پێناسەی چەمكی ئیمان و باوەڕ بووە. ئەمەش هاندەرە بۆ ڕوونكردنەوەی حەقیقەتی ئیمان و باوەڕ، ئەم شتانەی لەسەر ڕاجیاییەكە كەڵەكە دەبن لەلایەن خاوەن مەزهەبەكان.

### ئیمان لە زمانەوانیدا:

چەند واتایەكی جیاواز بۆ چەمكی ئیمان[1] هاتوون، لەوانە:

١- بەڕاستدانان و دانپێدانان (تصدیق[2]). بەر لە هاتنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) زمانەوانەكان لەسەر ئەمە كۆك بوون، ئەمە بۆچوونی باقلانیشە[3]، هەندێك لە

---

[1] معجم مقاييس اللغة ١٣٣/١ تيايدا هاتووە: (أمن): هەمزە، میم، نون، دوو بنچینەی لێك نزیكن: یەكەمیان بریتییە لە ئەمانەت و ئەمینداری كە پێچەوانەی خیانەت و ناپاكییە، واتاكەی بریتییە لە ئارامی دڵ، ماڵی ئارامیش لەوەوە هاتووە: كە هێمن و ئاسایشی هەیە. واتای دووەم: بەڕاستدانانە. هەر دوو واتاكە لێك نزیكن.

[2] القاموس المحيط مادة (الأمن)، وأصول الدين للبغدادي ٢٤٧ وتبصرة الأدلة ٢٥/١ وتمهيد الأوائل ٣٨٩ وشعب الإيمان للبيهقي ٣٥/١ عن أبي عبدالله الحليمي، والإيمان لأبي يعلى ١٥١ و لە باوكی عەبدوڵای (كوڕی بطة) نەقڵی كردووە، والتمهيد للامشي ١٢٧ والمواقف ٣٢٢/٨ وفتح الباري ٦٠/١ ولوامع الأنوار البهية ٤٠٣/١ وشرح عقيدة التوحيد لأطفش ١٩٩ والاساس لعقائد الأكياس ١٨٥.

[3] تمهيد الأوائل، سەرچاوەی پێشوو.

ئیبازییەکان بۆچوونیان وابووە کە مانای زمانەوانی چەمکی ئیمان تەنها دانپێدانان و بەڕاستدانانە[1]، ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەش لەوەوە هاتووە: ﴿ وَمَآ أَنتَ بِمُؤۡمِنٖ لَّنَا ﴾ یوسف: ١٧. واتە: ئەو شتانەی پێمان ڕاگەیاندی بە ڕاستی نازانی[2]. فڵان کەس باوەڕی وایە، واتە: بەڕاستی دەزانێت و دانی پێدادەنێت[3].

٢- وتراوە: داتاشراوە لە (أمن: ئارامی و دڵنیایی) کە پێچەوانەی ترسە[4].

ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەش لەوەوە هاتووە، کە دەفەرمووێت: ﴿ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ فَرِجَالًا أَوۡ رُكۡبَانٗاۖ فَإِذَآ أَمِنتُمۡ فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ ﴾ البقرة: ٢٣٩.[5] واتە: (ئینجا ئەگەر ترسان "کە نوێژەکەتان وەکو پێویست ئەنجام نەدەن بەهۆی جەنگ یان مەترسیەکەوە" دەتوانن بەدەم ڕۆیشتنەوە یان بە سواری ئەنجامی بدەن).

ئیبن حەجەر وتویەتی: ئەم بۆچوونە مایەی تێڕامانە. چونکە واتای هەردوو وشەی (أمن: ئارامی) و (تصدیق: بەڕاستدانان) لێك جیان، مەگەر سەرنجی واتایەکی خوازراوی بۆ بدرێت، بوترێت: دەیپارێزێت و ئارامی پێدەدات ئەگەر بڕوای پێبکات و بەڕاستی دابنێت، واتە: درۆکردن ئەوی پاراست[6].

## ئیمان لە زاراوەدا:

زانایان ڕاجیاییان هەبووە لەسەر حەقیقەتی ئیمان لە ڕووی شەرعیەوە، واتە: ڕایان جیابووە سەبارەت بە دەستنیشان کردنی ئەو شتەی ناوی ئیمانی دەکەوێتەسەر، لەم بارەشەوە چەند ڕاوبۆچوونێکیان هەیە، لەوانە:

---

[1] البعد الحضاري ٤٩٢ نقلا عن حاشية على كتاب الوضع لإبن أبي الستة.

[2] تمهيد الأوائل، والإيمان لأبي يعلى، والتمهيد للامشي، والمواقف، سەرچاوەکانی پێشوو. لوامع الأنوار البهية ١/٤٠٤.

[3] التمهيد للامشي، و شرح المواقف للسيد الشريف، دوو سەرچاوەکەی پێشوو.

[4] القاموس المحيط، سەرچاوەی پێشوو. والكليات للكفوي ٢١٢.

[5] شعب الإيمان للبيهقي ١/٣٥.

[6] فتح الباري ١/٦١.

**بۆچوونی یەکەم:** ئیمان: بریتییە لە دانپێدانان و بەڕاست دانـان بـە دڵ، دەربـڕین بـە زمان و ئەنجامدانی بە ئەندامەکان[1].

مەبەست لە دانپێدانان و بەڕاستدانانی بەدڵ: بریتییە لـە بەڕاسـت دانـانی پێغەمبـەر (صلی الله علیه وسلم) لەو شتانەی هێناویەتی و بەپێویستی داناوە، واتە: ئـەو شـتانەی لـە ئایین دەژمێردرێن، بەشێوەیەك مرۆڤ بزانێت و پێویسـت بـە پەنابردنـە بـەر تێڕامـان و بەڵگە هێنانەوە نەکات، وەك یەکتایی بەدیهێنەر، پێویسـت بـوونی نوێـژ، قەدەغـەبوونی مەیی و هاوشێوەکانی[2].

مەبەست لە بەڕاستدانانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەو شتانەدا ملکـەچ بوونـە بۆ پەیامەکەی، ئارام و دڵگوشاد بوونە لە پەنای بەرنامەکەیدا، بەبێ لاسـاری و ملنـەدان پەسەندی بکات و کارەکانی بەپێی ڕێسای پەیامەکە ڕێك بخات و ئـەنجامی بـدات[3]. بـە ڕاستدانان بریتییە لە دڵنیایی و یەقینی بێ گومان سەبارەت بەو شتانەی پێویست بوونیـان چەسپاوەو سـەلمێنراوە کـە لەلایـەن خـواوە لـە ڕێـی زمـان و فەرمایشـتی پێغەمبـەرە بەڕێزەکەیەوە (صلی الله علیه وسلم) هاتووە.

لەگەڵ دڵنیایی و یەقینی بێ گومان کە حوکمی عەقڵییە، شتێکی تری دڵی ببێت کـە بریتییە لە ڕازی بوون و حەسانەوەی دەروونی بەم بیروباوەڕە، بەوەی ئەم بیروباوەڕە لەلایەن هەواو هەوەسی مرۆڤـــەکە پەسـەند بێـت، خـوای مـەزن دەفـەرموویت: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾ النساء: ٦٥. واتە: (نەخێر، سوێند بـە پـەروەردگارت ئەوانـەی

---

[1] تبصرة الأدلة ٧٩٨/٢ ونقله عنه إبن ابي العز في شرح العقيدة الطحاوية ٤٥٩ و ٤٦٢ وشعب الإيمان للبيهقي ٤٨/١ والمواقف ٣٢٣/٨ وشرح المقاصد للتفتازاني ١٧٩/٥ وفتح الباري ٦١/١ وكفاية الطالب الرباني ٣٨/١ والغنية للشيخ عبدالقادر ٦٩/١.

[2] شرح المقاصد للتفتازاني ١٧٧/٥. سەیری ئەمانەش بکە: المواقف ٣٢٢/٨ والقول الفص ١٢ وشرح الجوهرة للباجوري ٩٢.

[3] شرح العقائد النسفية للتفتازاني وحاشية الكستلي عليه ١٥٢.

"لاقی بڕوا لێدەدەن" بڕوا ناهێنن هەتا لە هەموو کێشەیەکدا کە ڕوودەدا لە نێوانیاندا تـۆ نەکەن بە دادوەرو گوێڕایەڵێت نەکەن).

ئەم بەڕاستدانان و دانپێدانانـە بەشـی یەکـەمی ئیمـان و بـاوەڕە، بـەهیچ شـێوەیەك پشتگوێ ناخرێت و فەرامۆش ناکرێت، ئەگەر ئەم بەڕاسـتدانانە هاتـەجێ بناغـەی ئیمـان دێتەبوون، کەسەکە بەمە لەلایەن خواوە بڕیاری ڕزگـار بـوونی لـە ئـاگری بـۆ دەردەچـێت ئەگەر لەسەر ئەم بەڕاستدانان و دانپێدانانەی بمرێت، ئەگەرچی بەزمان دەری نەبڕێت و بـە کردەوە جێبەجێی نەکات. ئەگەر دانپێدان و بەڕاستدانانی دڵ لاچوو و نەما ئەوا ئیمـانیش بوونی نابێت و نامێنێت، بەمەش کەسەکە شایەنی سزای نەبڕاوەی ئاگری دۆزەخە.

بە بەڵگەی ئەوەی فیرعەون و گەلەکەی نیشانە و بەڵگـەکانی خوایـان بـە ڕاسـتدادەنا بەڵام پێشی ڕازی نەبوون، خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿ وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ﴾ النمل: ١٤.[1] واتە: (جا ئەوانەی هـەر ڕق ئەسـتوریان کـرد و باوەڕیـان پـێ نەبوو، بە زۆرداری خۆبەزلزانی، لـە کاتێکـدا لـە نـاخی دەروونیانـەوە هەسـتیان دەکـرد حەقیقەتە و ڕاستە).

بەڕاستدانان بە دڵ دوو شت دەگەیەنێت:

هەر کەسێك وشەی یەکتاناسی بەس بە زمان دەربڕی و بە دڵ بە ڕاستی دانـەنا. ئـەو کەسە باوەڕدار نییە، بەڵکو دووڕووە.

ئەگەر بە دڵ بەڕاستی بزانێت، کەچی بە زمان دەری نەبڕێت سەرباری ئەوەی تواناشـی هەیە، ئەو کەسە لەلایەن پێشینانی ئوممەت باوەڕدار نییە.

هەر کەسێك بە دڵ دانی نا بـە ڕاسـتی هەنـدێك شـتی بـاوەڕو، نکۆڵیشـی کـرد لـە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و پەیامەکەی و دوژمنایەتی پێغەمبەرو پەیامەکـەی کـرد وەك: جولەکەکان و جگە لەوانیش کە خوای گـەورە بـە بـێ بـاوەڕو کـافر نـاوی بـردوون،

---

[1] المختار من كنوز السنة النبوية ٨٦.

هەرگیز بە باوەڕدارو ئیماندار ناوی نەبردوون، هیچ حوکمێکی ئیمانیان تێدا نەهاتەجێ ئەوا ئەوانە بێ باوەڕو کافرن[1].

دەربڕین و دانپێدانان بە زمان ئەوە دەگەیەنێت:

هەر کەسێك توانای دەربڕینی ئیمانەکەی هەبێت، کەچی بە زمان دەری نەبڕێت، ئەو کەسە باوەڕدار نییە. پێشینان لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان کۆکن لەسەر ئەمە[2].

ئەنجامدانی بە ئەندامەکان، ئەوە دەگەیەنێت:

گشت کردەوەیەك دەچێتە ناو بازنەی ئیمان[3]. مەبەست لە کردەوە، سەرجەم کارە چاکەکان و پەرستش و بەندایەتی گوێڕایەڵی دەگرێتەوە، هەر لەو کردەوانەی جەستەیین یاخود دارایین جگە لەوانەش وەك: ڕۆژوو و نوێژو زەکات و پێخۆشبوونی خێرو چاکە بۆ موسڵمانان[4].

پێشینان کۆکن لەسەر ئەوەی ئەگەر کەسەکە بەدڵ دانی پێدانا و بە دەم دەری بڕی، بەڵام بە کردەوە کاری پێ نەکرد، ئەو کەسە سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی کردووەو شیاوی هەڕەشە و سزایە[5].

ئەمە ڕای بەناوبانگی پێشینان و زۆربەی ئیمامەکانە[6]. زەیدییەکان بە ئیمامەکانیانەوە ئەم بۆچوونەیان پەسەند کردووە[1]. ئەم وتەیە بە هەر سێ بەشیەوە هی مەزهەبی ئیبازی[2] و خەواریج و موعتەزیلەکانە[3].

---

(1) لوامع الأنوار البهية ١/٤٠٤.

(2) لوامع الأنوار البهية، سەرچاوەی پێشوو.

(3) جامع العلوم والحكم ١/١٠٤ ولوامع الأنوار البهية ٤٠٥ نقلا عن إبن رجب.

(4) نخبة اللآلي ٩٥.

(5) شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبى العز ٤٦٣.

(6) شعب الإيمان للبيهقي ١/٤٨ وشرح عقيدة إبن ابي زيد القيرواني للقاضي عبدالوهاب ٣٤٢ وفتح الباري ١/٦١. و البيهقي: ئەم بۆچوونەی لە عەلی کوڕی ئەبو تالیب (ڕەزای خوای لێبێت) نەقڵ کردووە./ شعب الإيمان، سەرچاوەی پێشوو. شافیعیش ئەمەی پەسەند کردووەو یەکدەنگی هاوەڵان و شوێنکەوتووان و ئەوانەی بەوان گەیشتوون هێناویەتی./ جامع العلوم والحكم، سەرچاوەی پێشوو.

بەڵام خاوەن مەزهەبەکان ڕاجیا بوون سەبارەت بەو کەسەی کردەوە فەرامۆش دەکات:

---

ئەمە ڕای ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ئیسحاقی کوڕی راهویە و ئەبو عوبەیدی قاسمی کوڕی سەلام و ئیمامەکانی تریشە جگە لەمانە. لە بوخاریان گێڕاوەتەوە کە وتویەتی: گەیشتووم بە زیاتر لە هەزار زانا لە شارە جیاوازەکان هیچ یەکێکیانم نەبینی ڕاجیایی هەبێت لەسەر ئەوەی ئیمان: گوفتارو ڕەفتارە، زیادو کەم دەکات./ فتح الباري ٦١/١. سەیری ئەمانەش بکە: لوامع الأنوار البهية ٤١٦/١ عن إبن عبدالبر في التمهيد، وشرح صحيح مسلم للنووي ١٤٦/١ عن إبن بطال. و قول ابي عبيد القاسم بن سلام في كتابه الإيمان ٥٣-٥٤ و٦٦. و اللامشي لە: التمهيد ١٣٠ ئەم ڕایەی لە هەندێك لەوانە نەقڵ کردووە. و یحیای کوڕی حمزة لە: المعالم الدينية ١١٧ وتویەتی: ئەمە مەزهەبی زۆربەی پێشینانە.

ئەمە ڕای ئەوزاعیشە./ جامع العلوم والحكم ١٠٤/١. و لەیسی کوڕی سەعد و داودی کوڕی عەلی و تەبەریش ئەم بۆچوونەیان پەسەند کردووە./ لوامع الأنوار البهية ٤١٦/١. ئەمە بۆچوونی ئیبن حەزمی زاهیریشە./ علم الكلام لإبن حزم ٨٣.

(١) أساس العقائد الأكياس ١٨٥.

(٢) الجامع للبسيوي ٢٣٥/١-٢٣٦. والموجز لأبي عمار ٧٣/٢ وشرح عقيدة التوحيد لأطفش ١٩٩، ونقل فرحات الجعبيري في البعد الحضاري ٤٩٣ ذلك عن الشماخي والمحشي والبرادي وأطفش.

(٣) التمهيد للامشي ١٣٠ والقول الفصل ١٦ والكليات للكفوي ٢١٣. و أبو يعلى لە: الإيمان ١٥٦ وتویەتی: (ئەمە بۆچوونی زۆربەی موعتەزیلەکانە).

لە کتێبی: كفاية الطالب الرباني ٣٨/١ ئەم بۆچوونەی دراوەتە پاڵ موعتەزیلەکان و زۆربەی فەرموودەناسان و زانایانی کەلام و شەرعناسەکان لەوانیش ئیبن حەبیب. و لە: الأساس لعقائد الأكياس ١٨٥ هاتووە: (ئەمە بۆچوونی ئیمامەکانمان سڵاویان لێبێت و زۆربەی موعتەزیلەکان و شافعی و هەندێك لە خەواریجەکانە). قازی عەبدولجەبار لە: (شرح أصول الخمسة ٧٠٧) و ڕەزای لە: (المحصل ٢٣٧) بۆچوونی موعتەزیلەکانیشی هێناوە سەبارەت بە ئیمان. و باجوری لە ڕاڤەکەیدا لەسەر کتێبی: (الجوهرة ٩٥) وتویەتی: (موعتەزیلە بۆچوونیان وایە کە کردار بەشێکی ئیمانە، چونکە دەڵێن ئیمان کردارو دەربڕین و دانپێدنانە، هەر کەسێك کردار فەرامۆش بکات ئەوا باوەڕدار نییە، چونکە بەشێکی ئیمانی فەرامۆش کردووە کە کردەوەیە و لەهەمان کاتدا کافر نییە، چونکە دانی پێداناوە، ئەو کەسە بەپێی بۆچوونی موعەتزیلەکان لە پلەیەك لە نێوان دوو پلەی باوەڕو کوفردایە، سزاکەی مانەوەی هەمیشەییە لە ئاگردا بەڵام کەمێك سزاکەی سووکترە لە هی کافر).

خەواریجەکان بۆچونیان وایە کە ئیمان واتە کردارو ڕەفتار، فەرامۆش کردنی کردار کەسەکە بێ بەش دەکات لە ئیمان و دەیباتە خانەی کوفرەوە.

موعتەزیلەکان بۆچوونیان وایە کە فەرامۆش کردنی کردەوە لەلایەن هەر تاکێك، ئەوا دەبێتە هۆی دەرچوونی لە ئیمان، بەڵام پێی کافر نابێت، بەڵکو لە پلەیەکدا دەبێت لە نێوان ئەم دوو پلەیەدا.

فەرموودەناسان بۆچوونیان وایە کە فەرامۆش کردنی کردەوە، نابێتە هۆی دەرچوونی خاوەنەکەی لە ئیمان، بەڵکو فەرموودەناسان حوکمی ئیسلامی لەسەر جێبەجێ دەکەن[1].

بەم پێیە: کردەوە نیوەی ئیمانە، واتە: بەشێکی ئیمانە، نەك مەرجێکی ئیمان[2].

جیاوازی نێوان وتەی پێشینان و موعتەزیلەکان ئەوەیە:

پێشینان کردەوەیان بە مەرجی تەواوی و کامڵ بوونی ئیمان داناوە، ئا لێرەوە بابەتی زیاد و کەمی ئیمان هاتە کایە. بەڵام موعتەزیلە کردەوەیان بە مەرجی دروستی ئیمان داناوە[3].

ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە یەکێکە لەو بەڵگانەی کە کردەوە دەچێتە ناو ئیمان: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا ﴾ الأنفال: ٢-٤.[4] واتە: (بێگومان ئیماندارانی ڕاستەقینە تەنها ئەوانەن: کە کاتێك ناوی خوا برا، دڵەکانیان دەترسێت و دەهەژێت، کاتێکیش ئایەت و فەرمانەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنرێتەوە، ئیمان و باوەڕیان زیاد دەکات، "لە هەموو

---

[1] القول الفصل، سەرچاوەی پێشوو. بەغدادی لە: أصول الدين ٢٤٩ فەرموودەناسانیشی هێناوە.

[2] شرح الجوهرة للباجوري ٩٥.

[3] فتح الباري ٦١.

[4] جامع العلوم والحكم ١/١٠٤-١٠٥ ونقله عنه السفاريني في لوامع الأنوار البهية ١/٤٠٥-٤٠٦. : الإيمان لأبي عبيد القاسم ٦٥ والإيمان لأبي يعلى ١٦٢ والبعد الحضاري ٤٩٦ نقلا عن الشماخي، والأساس لعقائد الأكياس ١٨٥.

كارو بارێكیشیاندا" هەر پشت بە پەروەردگاری خۆیان دەبەستن. ئەوانەن كە نوێژەكانیان بە چاكی ئەنجام دەدەن، هەندێكیان لەو ڕزق و ڕۆزیەی پێمان داون، دەبەخشن و خەرجی دەكەن. ئا ئەوانە هەر خۆیان ئیماندری ڕاستەقینەن).

باوەڕدار بەم كردەوانە دەبێتە باوەڕدار[1].

لەبەر ئەوەی ئیماندار ئەو كەسەیە ئەم كردەوانەی تێدا هاتبنەجێ، ئەم ئایەتە ئاماژەی كردووە بۆ كۆی ئیمان و باوەڕ، نوێژ ئاماژەیە بۆ ئەو پەرستشانەی كە بە جەستە ئەنجامدەدرێن، بەخشین ئاماژەیە بۆ ئەو پەرستشانەی بە سەروەت و سامان ئەنجام دەدرێن، داچڵەكانی دڵ و دەروون ئاماژەیە بۆ خۆڕاگری لە هەموو ڕوێكەوە و ئەنجامدانی پەرستشەكان و گەڕانەوە لە تاوانەكانیش دەگرێتەوە[2].

ئەمە بۆ كورت هەڵهێنانی ئیمانە لەو كردەوانە، هەر كەسێك ئەو خەسڵەتانەی لەم ئایەتەدا ئاماژەی پێدراوە تێیدا نەبن ئەوا باوەڕدار نییە[3].

**بۆچوونی دووەم:** پێی وایە ئیمان بریتییە لە دان پێدانان و بەڕاستدانان بە دڵ و دەربڕینی بە زمان بەبێ كردەوەی ئەندامەكان.

ئەمە بۆچوونی ئەبو حەنیفە[4] و هەندێك لە پێشەوا حەنەفیەكان[5] و هەندێك لە ئەشعەرییەكانە[1]، ئەم بۆچوونەیان داوەتە پاڵ زۆربەی زانایان[2]، نەصیرەددینی توسی لە كتێبی (التجرید) كە یەكێكە لە ئیمامیەكان ئەم بۆچوونەی پەسەند كردووە[3].

---

[1] الإيمان لأبي يعلى ١٦٢-١٦٣.

[2] شعب الإيمان للبيهقي ٤٣/١ وأشار إلى الحليمي.

[3] البعد الحضاري، سەرچاوەی پێشوو.

[4] الفقه الأكبر لأبي حنيفة - القول الفصل ٣٥٨ والمواقف ٣٢٣/٨ وشرح المقاصد للتفتازاني ١٧٨/٥ وشرح الجوهرة للباجوري ٩٥. و الطحاوي ئەم بۆچوونەی الإمام أبي حنيفة و هاوەڵانی گێڕاوەتەوە./ شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٤٦٢ ولوامع الأنوار البهية ٤١٦/١. و لە: المعتقد المنقد ١٩٩ ئەم بۆچوونەی لە ئەبو حەنیفە و هاوەڵانی هێناوە.

[5] العقائد النسفية وشرح التفتازاني عليها ١٥٣ و نخبة اللآلي ٨٩. و نسفي لە: تبصرة الأدلة ٧٩٨/٢ وتویەتی: ئەم بۆچوونە گێڕدراوەتەوە لە زۆربەی هاوەڵانی ئەبو حەنیفە. و لە: لوامع الأنوار البهية

بەم پێیە هەر کەسێك بە دڵ دانی پێدانا و باوەڕی هێنا بـەڵام بـە زمـان دەری نـەبڕی تەنانەت بۆ یەك جار لە ژیانیدا، ئەو کەسە باوەڕدار نییە لەلایـەن خـوای مـەزن، شـیاوی چونە بەهەشت و ڕزگاربوون نییە لە سزای هەمیشەیی ئاگری دۆزەخ[٤].

تەنها دانپێدنان بەدڵ نابێتە هۆی ڕزگار بوون لە ئـاگری دۆزەخ، بـە زمـان دەربڕینـی ئیمانیش بە تەنیا دووڕوویە، هیچ یەکێکیان بریتی نییە لـە ئیمـان، بـەڵکو هـەردووکیان ئیمان پێکدێنن[٥]. لەلای خاوەنانی ئەم بۆچوونە دەربڕین بەزمان نیوەی ئیمانە[٦].

---

٤٢١/١ و٤٢٢ هاتووە: حمادی کوڕی ئەبو سولەیمان و شەڕعناسە شوێنکەوتووەکانی لە کوفە ئەم بۆچوونەیان هەیە، هەروەها شەڕعناسە مورجیئەکانیش ئەم بۆچوونەیان پەسەند کردووە.

[١] المعتقد المنتقد ١٩٩ شرح الجوهرة للباجوري ٩٥ وشرح الجوهرة للصاوي ١٣٢. و ئوبەی و سەنوسی لە شرۆڤەکانیان لەسەر: صحيح مسلم ١٠٩/١ ئەم بۆچوونەیان هەیە.

[٢] القول الفصل ١٥.

[٣] تجريد الإعتقاد و شرحه كشف المراد للحلي ٤٥٤ ومفتاح الباب ٢١٢.

[٤] شرح العقائد النسفية للتفتازاني، سەرچاوەی پێشوو. باجوری لە: (شرحه على الجوهرة ٩٤)دا بەتێرو تەسەلی باسی کردووە: (هەر کەسێك بە دڵ باوەڕ بێنێت و بەزمان دەرنەبڕێت بەبێ ئەوەی پاساو و پەرچی لە پێش بێت، بەڵکو بۆشی دەکرا بە زمان دەربڕێت، ئەو کەسە لەلایەن خوا باوەڕدارە بەڵام سەبارەت بە حوکمە دونیاییەکان باوەڕدار نییە، بەڵام ئەو کەسەی پاساوی هەیە و ناتوانێت بە زمان ئیمان دەربڕێت لەو کاتە ئەگەر هاوبەڵگەیەك بەدەرکەوت لە سەر موسڵمان بوونی بەبێ هاتنە قسە وەك ئاماژەدان ئەوە ئەو کەسە باوەڕدارە. بەڵام ئەوەی نایەوێت بەزمان دەربڕێت، بەوەی داوای لێبکرێت شایەتمان دەربڕێت بەڵام دەری نەبڕێت ئەو کەسە بێ باوەڕە ئەگەرچی بە دڵ ملکەچ ببێت تەنانەت ئەم شێوە باوەڕە لە دواڕۆژدا سوودی بۆ نابێت، سەبارەت بەو کەسەی بە زمان ئیمان دەردەبڕێت و بەدڵیش باوەڕ ناهێنێت ئەو کەسە دووڕووەو لە دونیاد حوکمی موسڵمانانی بەسەردا جێبەجێ دەکرێت و وەك موسڵمان ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێت بەڵام باوەڕدار نییە لەلایەن خوا، تا ئەو ئەندازەیە ئەو دووڕووە وەك باوەڕدار ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێت کە پەیی نەبڕێت بە کوفرەکەی وەك: سووژدە بردنی بۆ بت، ئەگەرنا حوکمی کوفری بەسەردا جێبەجێ دەکرێت).

[٥] شرح صحيح مسلم للأبي والسنوسي ١٠٩/١.

[٦] نخبة اللآلي ٨٩ وشرح الجوهرة للباجوري ٩٥ شرح الجوهرة للصاوي ١٣٢.

بەمەرجیان داناوە کە دان پێدانان بە دڵ و دەربڕین بــە زمــان بەیەکــەوە بــن و تــەنها یەکێکیان بیٚ ئەوەی تر بەس نییە:

تەنها دان پێدانانی دڵ بەس نییە، خوای گەورە دەفەرموویٚت: ﴿ وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ﴾ النمل: ١٤. واتە: (لە ناخی دەروونیانەوە هەستیان دەکرد حەقیقەتــە و ڕاســتە). هــەروەها دەفەرموویٚت: ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ ﴾ البقرة: ٨٩. واتە: (کاتێــك ئــەوان پێغەمبەریان بۆ هات کە دەشیانناسی کەچی بڕوایان پیٚ نــەهێنا). بــیٚ بــاوەڕی و کــوفرو ناسینی پەیامی داوەتە پاڵ ئەوان.

سەبارەت بە دانپێدان بە زمان (دەربڕین بە زمان) بەتەنها بەس نییە، خوای پایەبــەرز دەفــەرموویٚت:﴿ قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا ۖ قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ وَلَٰكِن قُولُوٓا۟ أَسْلَمْنَا ﴾ الحجرات: ١٤. واتــە: (هەندێك لە بیابان نشینە عەرەبەکان وتیان: باوەڕمان هێنــاوەو موســڵمانین، پێیــان بڵــیٚ: نەخێر باوەڕتان نەهێناوە، بەڵام بڵێن بە ناچاری موسڵمان بووین). گومان لەوەدا نییە کــە ئەو عەرەبە دەشتەکیانە بە زمان باوەڕیان دەربڕی[1].

ئەوەی پشتی دەربڕین بە زمان دەگرێت، لەوەی بنچینەی ئیمانە ئەوەیە، خوای گــەورە زۆرتر سەرزەنشتی ئەو کەسەی کردووە ملنەدەرە و بــە زمــان بــاوەڕ دەرنابڕێــت و کــەمتر سەرزەنشتی کەسی نەزان و کەم تەرخــەمی کــردووە، ئیمــان یــەك شــتە ئەگەرچــی چــەند پێکهاتە و بەشێکیشی هەبێت[2].

سەبارەت بە کردەوە، هەروەك باجوری وتویەتی مەرجی تەواو و کامڵی باوەڕە، ئەمــە ڕای پەسەندە لەلای ئەهلی سوننە، هەر کەسێك کردەوەش بە ئــەنجام بگەیــەنێت ئیمــان و باوەڕی تەواوی دەستکەوتووە، هەر یەکێك کردەوە فەرامۆش بکــات. ئیمــانی کــامڵی لــە دەست چووە، بەو مەرجەی فەرامۆش کردنی کردەوە بە حەڵاڵ نەزانێت و سەرپێچی شــەرع نەکات یان گومانی لە شەرعی و ڕەوابوونی نەبێت، ئەگەر کردەوە فــەرامۆش بکــات بــەو

---

[1] كشف المراد في شرح تجريد الإعتقاد ٤٥٤.

[2] القول الفصل ١٥ ئەم بەڵگەیەی گێڕاوەتەوە لە خاوەنی ئەم بۆچوونە. بەڵام خۆی بۆچوونی وایە باوەڕ تەنها دان پێدانانە بە دڵ.

پێیەی پێی حەڵاڵ بێت ئەوا ئەو کەسە بێ باوەڕە، چونکە نکۆڵی لە شتێك کردووە کە لە ئاییندا بە پێویست زانراوە[1].

بەم پێیە کردەوە مەرجی ئیمانە، واتە: شتێکە لە دەرەوەی ئیمان، کردەوە مەرجە بۆ جێبەجێ کردنی حوکمەکانی موسڵمانان لەسەر کەسەکان وەك: میراتگرتن، ژن هێنان، نوێژکردن لە دوای و نوێژکردن لەسەری، ناشتنی لە گۆڕستانی موسڵمانان، داواکردن لێی بە کردنی نوێژو زەکات دان... دان پێدانان بە دڵ ئەگەر ئیمانیش بێت بەڵام شتێکی شاراوەو پەنهانە، پێویستی بە نیشانەیەکی دیارە بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگە لەسەر ئیمانەکەی و تا حوکمە دونیاییەکان بیگرێتەوە[2].

**بۆچوونی سێیەم:** ئیمان: تەنها دان پێدانانە بە دڵ.

ئەمە بۆچوونی ابو منصوری ماتریدییە، ئەم ڕایە لە أبو حنیفەش گێڕدراوەتەوە. حسینی کوڕی فضل البجلی ئەم بۆچوونەی پەسەند کردووە، ئەمە ڕای بەناوبانگی أبو الحسن الأشعرییە[3]. باقلانی دەقی لەسەر هێناوە[1]. ئەمە بۆچوونی مامۆستا أبی

---

[1] شرح الجوهرة للباجوري ٩٤.

[2] شرح الجوهرة للباجوري، سەرچاوەی پێشوو.

[3] تبصرة الأدلة ٧٩٩/٢، و غەزنەوی لە (أصول الدين ٢٥١) بۆچوونی ماتوریدییەکانی هێناوەو. بەغدادی لە (أصول الدين ٢٤٨) ئەم بۆچوونەی داوەتە پاڵ ئەبو حەسەنی ئەشعەری و ئیبن ڕاوندی و حوسێنی کوڕی فەزڵی بجیلی. و شەهرستانی لە: الملل و النحل ٨٨/١ مەزهەبی ئەشعەری لە پاڵ ئەم بۆچوونەی داناوە.

ئیجی وتویەتی: (ئەمە بۆچوونمانە)، سەید شەریف بەم وتەیەی ڕوونکردنەوەی بۆ داوە: (واتە شوێنکەوتووانی أبی الحسن) واتە ئەشعەری./ و تەفتازانی لە: شرح العقائد النسفية ١٥٤ وتویەتی: شێخ ئەبو مەنصوریش ئەم بۆچوونەی پەسەند کردووە. کوفەویش لە: (کلیات ٢١٣) هەمان ڕای هەیە.

ڕەیحاوی لە: نخبة الآلي ٨٩ وتویەتی: ئەمە بۆچوونی ئەبو مەنصوری ماتوریدی و زۆربەی ئەشعەرییەکانە. هاوشێوەی وتەی ڕەیحاوی هاتووە لە: المعتقد المنتقد ١٩٩. و تەهانوی لە: کشاف

إسحاقی إسفرايينيه، سالحی و إبن راوندی کە لە موعتەزیلەکانن ئەم ڕایەیان پەسەند کردووە[٢]. ڕازیش ئەم بۆچوونەی هەیە[٣]. تفتازانی ئەم بۆچوونەی داوەتە پاڵ زۆربەی زانایان[٤].

ئەگەر هەڵگرانی ئەم بۆچوونە تەنها دان پێدانان بە دڵ بە ئیمان دابنێن، ئەوە مانای وایە دەربڕین بە زمان و کردەوەی ئەندامەکان دوو بنەمای ئیمان نین، بەڵکو لق و پۆپی ئیمانن، هەروەك شهرستانی ئەمەی لە ئەشعەرییەوە هێناوە[٥].

---

إصطلاحات الفنون ٢٩٧/١ وتویەتی: ئەم بۆچوونە پەسەند کراوە لەلایەن زۆربەی ئەشعەرییەکان و و ماتوریدییەکانیش لەسەر ئەم بۆچوونەن و زۆربەی ئیمامەکانیش ئەم بۆچوونەیان هەیە وەك: حوسەینی کوڕی فەزڵ.. باجوری لە: شرح الجوهرة ٩٤ وتویەتی: ئەمە ڕای زانا لێکۆڵەرەکانی ئەشعەری و ماتوریدییەکانە.

[١] تمهيد الأوائل ٣٨٩-٣٩٠ والإنصاف ٢٢ و ٥٥. والمواقف ٣٢٣/٨ وكشاف إصطلاحات الفنون، سەرچاوەی پێشوو.

[٢] المواقف و شرح السيد الشريف عليه، وكشاف إصطلاحات الفنون، سەرچاوەی پێشوو. و لە: أصول الدين للبغدادي، سەرچاوەی پێشوو ئیبن ڕاوندیشی باسکردووە.

[٣] المحصل للرازي ٢٣٧.

[٤] شرح المقاصد للتفتازاني ١٧٧/٥ و لە: شرح العقائد النسفية ١٥٣: هێناویەتی ئەمە بۆچوونی زۆربەی زانا لێکۆڵەرەکانە. ڕەیحاوی لە: نخبة اللآلي ٨٩ هەمان شتی وتوە.

[٥] الملل والنحل للشهرستاني ٨٨/١. باقلانی لە: إنصاف ٥٥ وتویەتی: (شوێنی دانپێدانان دڵە: ئەویش بریتییە لەوەی دانبنێت بەوەی خوای گەورە تاك و تەنهایە و پێغەمبەر ڕاستە، هەموو ئەو شتانەی پێغەمبەر هێناویەتی بەڕاست دابنێت، ئەو شتەی لەسەر زمانە کە بریتیە لە دەربڕین و ئەو شتەش ئەندامەکان پێی هەڵدەستن بریتیە لە کردەوە، هەموو ئەوانە تەنها بەرجەستە کردن و ئاماژەیە بۆ ئەو شتەی کە لە دڵدایە. بۆیە دروستە لەلایەك وەك ڕووی ڕاستەقینە پێی بوترێت ئیمان و لەلایەك وەك ڕووی خوازراو پێی بوترێت، ئەمە واتای ئەوەیە: ئەگەر بەندە بەدڵ دانی نا بەو شتانەی باسمان کرد، بەزمان ئەو ئیمانەی دەربڕی و بەکردەوەش جێبەجێی کرد، ئەو بەندەیە ئیماندارێکی ڕاستەقینەیە لەلای خواو ئێمەش. بەڵام ئەوەی بە دڵ درۆ بکات و دان نەنێت بەوشتانەی باسمان کرد، کەچی بەزمان دانی نا بە یەکتاناسی پەرستشەکانی بە ئەندامەکانی ئەنجامدا، ئەمە باوەڕدارێکی ڕاستەقینە نیە، بەڵکو باوەڕدارێکی ناڕاست و خوازراوە، چونکە لە

ئەو کەسەی بـە دڵ دانـی پێـدابنێت، واتـە: دان بنێـت بـە یـەکتایی خـوا و بـەوەی پێغەمبەر لەلای خوای گەورە هێناویەتی، ئەو کەسە باوەڕدارە، تـەنها لـە نێـوان خـۆی و خوا باوەڕدارە، تەنانەت لەو کاتەدا بشمرێت ئەوا باوەڕدارێکی ڕزگـاربووە. لـەو کاتـە لـە بازنەی ئیمان دەچێتەدەر کە نکۆڵی بکات لە شتێك[1].

بەبێ ڕاجیایی هەر کەسێك بە دڵ دانی پێدانا و بە زمان دەری بڕی ئەوا لەلایەن خـواو خەڵکی ئەو کەسە باوەڕدارە[2].

هەر کەسێك بە دڵ دانی پێدا بنێت و بـەزمان دەری نـەبڕێت، بـەبێ ئـەوەی پاسـاو و بیانوی هەبێت، بەبێ ئەوەی ئەو کەسە ئیمان ڕەت بکاتەوە، بەڵکو وا بۆی چووەسەر، ئـەو کەسە لەلایەن خوا ئیماندارە و لە حوکمە دونیاییەکان ئیماندار نییە[3].

هەر کەسێك پاساوی هـەبوو و توانـای دەربڕینـی بـە زمـان نـەبوو وەك: لاڵ، ئەگـەر هاوبەڵگەیەك جگە لە دەربڕین بە زمان بەرپابوو لەسەر باوەڕدارییەکـەی وەك: ئامـاژەدان ئەو کەسە باوەڕدارە لە هەر دوو لایەوە[4]- واتە: لەلایەن خواو حوکمە دونیاییەکان - .

بەڵام ئەو کەسەی ڕەتیکردەوە کە بە زمان باوەڕ دەربڕێت دوای ئـەوەی داوای لێکـرا، ئەوا کەسەکە لەلایەن خواو لە دونیاشدا بە کـافر دادەنرێـت، چـونکە ئەمـە یەکێکـە لـە

---

حوکمە دونیاییەکان خوێن و ماڵ و سەروەتی پارێزراو دەبێت، لەبەر ئەوەی تەنها لە ڕووکەشدا باوەڕدارە و لەلای خوا باوەڕدار نییە).

[1] الملل والنحل للشهرستاني، سەرچاوەی پێشوو. وأصول الدين للغزنوي ٢٥٢.

[2] أصول الدين للغزنوی، سەرچاوەی پێشوو. و كفاية الطالب الرباني و حاشية الصعيدي عليه ٣٨/١ نقلا عن القاضي عياضي.

[3] شرح الجوهرة للباجوري ٩٤ وحاشية الصعيد، سەرچاوەی پێشوو.

[4] شرح الجوهرة للباجوري، سەرچاوەی پێشوو. وشرح المقاصد للتفتازاني ١٧٩/٥ ونخبة اللآلي ٨٩. لە: كفاية الطالب الرباني، سەرچاوەی پێشوو: لە قاضي عیاضەوە هاتووە: (بەبێ ئەو ڕایەی ناودارو بەناوبانگە ئەو کەسە باوەڕدارە).

نیشانەکانی دان پێدانەنان بە دڵ. جا هەر چەندە بە دڵ باوەڕیش بهێنێت مادەم بە زمان داوای لێکراو ئەویش نکۆڵی کرد ئەوا لە دوارۆژیشدا هیچ سوودێکی پێناگەیەنێت[1].

ئەو کەسەش کە بە زمان ئیمان دەردەبڕێت، بە دڵ ئیمان ناهێنێت وەك: دووڕوو، ئەو کەسە لە حوکمە دونیاییەکاندا وەك باوەڕدار ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێت و لەلایەن خوای گەورە باوەڕدار نییە[2]. تا ئەو کاتە لە دونیادا وەك باوەڕدار ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێت کە نیشانەیەکی کوفری لێ بەدی نەکرێت وەك: سووژدە بردن بۆ بت، ئەگەر نیشانەی لێ بەدەرکەوت ئەوا حوکمەکانی کوفری لەسەر جیبەجێ دەکرێت[3].

ئەگەر کەسەکە نە بە زمان ئیمانی دەربڕی و نە بە دڵ دانی پێدا نەنا ئەوا بێ باوەڕو کافرە[4].

کردەوەکان وەك: نوێژ، ڕۆژوو، پەرستشەکانی تر بنچینەی ئیمان نین لەلایەن خاوەنانی ئەم بۆچوونە[5].

بەڵگەکانی ئەم بۆچوونە:

١- ئەو ئایەت و فەرموودانەی ئاماژە دەدەن بەوەی دڵ شوێنی ئیمان و باوەڕە، بۆ نمونە:

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ أُوْلَـٰٓئِكَ كَتَبَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَـٰنَ ﴾ المجادلة: ٢٢.

واتە: (ئا ئەوانە خوا ئیمان و باوەڕی لە دڵیاندا چەسپاندووەو جێگیری کردووە).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَـٰنِ ﴾ النحل: ١٠٦. واتە: (لەکاتێکدا دڵی پڕە لە ئیمان و باوەڕ).

---

[1] شرح الجوهرة للباجوري، وشرح المقاصد للتفتازاني، ونخبة اللآلي، سەرچاوەکانی پێشوو.

[2] شرح الجوهرة للباجوري ٩٤ و لە: كفاية الطالب الرباني ٣٨/١ لە "قاضي عياض"ەوە هاتووە: (ئەگەر ئیمانی کەسەکە تەنها بە زمان بێت و لە سەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بووبێت ئەوا دووڕووە و لەو سەردەمەش بێت بێ دینە).

[3] شرح الجوهرة للباجوري، سەرچاوەی پێشوو.

[4] كافية الطالب الرباني ٣٨/١ نقلا عن القاضي عياض.

[5] تبصرة الأدلة ٧٩٩/٢. و أبو يعلى لە: الإيمان ١٥٧ ئەمەی لە ئەشعەرییەکانەوە هێناوە.

ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، کاتێك ئوسامە کەسێکی کوشت کە وتبوی: (لا إله إلا الله: هیچ پەرستراوێك نییە جگە لە "الله") پێی فەرموو : **(هلا شققت قلبه)** واتە: بۆچی دڵەکەی ئەوت لەت نەدەکرد ؟.

مادەم ئیمان کرداری دڵە، پێویستە تەنها لە دانپێدانان و بەڕاستدانانی دڵدا کورت هەڵبێنرێت، کە پێویستیەکە لە پێویستیەکانی ناسین. ئەمە واتای ئیمانە لە ڕووی زمانەوانی[1].

٢- خوای گەورە بەناوی ئیمانداران دواوە لەگەڵ موسڵمانان و دواتر کردەوەکانی لەسەر ئەوان پێویست کردووە، خوای پاك و پیرۆز فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ ﴾ البقرة: ١٨٣.[2] واتە: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ڕۆژووی ڕەمەزان لەسەرتان پێویست کراوە. هەر وەکو لەسەر گەلانی پێش ئێوەش پێویست کرابوو).

خوای گەورە پێشتر وەك ئیماندار لەگەڵیان دوواوە بەر لەوەی حوکمەکان پێویست بکرێن، ئەگەر حوکمەکان بەشێك بوون لە ئیماندار ئەوا بەر لە پێویست کردنی حوکمەکان ناوی ئەوانی بە ئیماندار نەدەبرد، پێویست بوونی هیچ یەکێك لە حوکمەکان دانەدەبەزی بەر لە پێویست بوونی ئیمان[3].

بەهەمان شێوە ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەش: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِۚ ﴾ المائدة: ٦. واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە: کاتێك ویستتان هەستن بۆ نوێژ: ئەوە سەرەتا ڕووخسارتان بشۆن، ئینجا

---

(١) المواقف وشرح السيد الشريف عليه ٣٢٤/٨. سەیری ئەمانەش بکە: شرح المقاصد للتفتازاني ١٨١/٥ وشرح العقائد النسفية للتفتازاني ١٥٤ ومشارق انوار العقول ١٩٩/٢ وشرح عقيدة التوحيد لأطفش ٢٠٠.

(٢) تبصرة الأدلة ٨٠٢/٢.

(٣) نخبة اللآلي ٩٦.

دەستەكانتان لەگەڵ ئەنیشكتاندا، پاشان دەستی تەڕ بهێنن بەسەر سەرتاندا، قاچەكانیش بشۆن لەگەڵ قولە پێتاندا).

هەروەها دەفەرموێت:﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا ﴾ النساء: ١٠٣. واتە: (بەڕاستی نوێژ لەسەر ئیمانداران فەرزە لە كاتی دیاریكراودا دەبێت ئەنجام بدرێت).

بەر لە دەستنوێژ هەڵگرتن و نوێژ كردن و ڕۆژوو گرتن، خوای گەورە بە ئیماندار ناوی بردن[1].

**پـــوختــــــە:**

لە میانەی خستنەڕووی ڕاو بۆچوونی ناودارترین پێڕو تاقمە ئیسلامیەكان لەبارەی ئیمان، ئەم شتانەی خوارەوەمان بۆ دەردەكەوێت:

ئم سێ ڕاو بۆچوونە ئەمڕۆ نرخی بۆ دادەنرێت و پشتی پێ دەبەسترێت لە ناو مەزهەبە ئیسلامییەكان و شوێنكەوتووی هەن، تەنانەت زۆربەی هەرە زۆری زانایان و شوێنكەوتووانی ئوممەت لە خۆیان دەگرن.

چەندین ڕاو بۆچوونی تر هەن كە خاوەنەكانیان نەماون، هیچ پاشماوەیەكیان نەماوە تەنها ئەوە نەبێت كە گێڕدراوەتەوە لەبارەی ئەوان لە كتێبەكاندا.

هەموو زانایان كۆك و تەبان لەسەر ئەوەی كە ئیمان بریتیە لە دان پێدانانی دڵ، بەڵام ڕاجیاییان هەیە سەبارەت بە بەكارهێنانی ناوی ئیمان بۆ دەربڕینی زمان و كردەوەی ئەندامەكان.

سەرجەم زانایان كۆكن لە پێویست بوونی هەموو پەرستشە فەرزەكان، هەروەها كۆكیشن لەسەر بە خێرو سوننەت دانانی سوننەتە شەرعییەكان.

ڕاجیایی هاوەڵانی بۆچوونی دووەم (ئیمان: بریتیە لە دان پێدانان بە دڵ و دەربڕینی زمان) لەگەڵ هاوەڵانی بۆچوونی یەكەم (ئیمان: بریتیە لە دانپێدانان بە دڵ و دەربڕین بە

---

[1] الإيمان لأبي يعلى ٢٣٩.

زمان و ئەنجامدانی بە ئەندامەکان) کە لە ئەهلی سوننە و جەماعەتن تەنها ڕاجیاییەکی وێنەییە. ئیبن ئەبولعیز ڕوونی کردۆتەوە: کردەوەکانی ئەندامەکان پەیوەستن بە ئیمانی دڵەوە یاخود بەشێکە لە ئیمان، لەبەر ئەوەی هەموویان کۆکن لەسەر ئەوەی ئەنجامدەری گوناهی گەورە ناچێتە دەرەوەی بازنەی ئیمان، بەڵکو لە ژێر ویستی خوادایە ئەگەر بیەوێت لێی خۆشدەبێت و ئەگەر بیشیەوێت سزای دەدات.

بۆیە وتویەتی: ڕاجیاییەکە تەنها لە دەربڕیندایە و پوچەڵی بیروباوەڕی لەسەر کەڵەکە نابێت[1].

مەبەستی زۆربەی فەرمووودەناسان و زانایانی کەلام شەرعناسان و موعتەزیلەکان لەوەی ئیمان لە سێ بنچینەکە پێك دێت، مەبەستیان ئیمانی کامڵە[2].

بەم پێیە:

بناغە لە ئیماندا بریتییە لە دانپێدان بە دڵ. ئەمە ئەو خاڵەیە کە هەمووان لەسەری کۆکن. ئەمەش خاوەنەکەی دەپارێزێت لە مانەوەی هەمیشەیی لە ئاگری دۆزەخدا.

بە زمان دەربڕین مەرجە بۆ بەسەردا جێبەجێ کردنی حوکمە دونیاییەکان.

کردەوەی ئەندامەکان خۆی لە خۆیدا ڕوونکارییە بۆ ئیمانی تەواو و کامڵ، چونکە گشت لایەك کۆکن لەسەر ئەوەی ئەگەر مرۆڤ بە دڵ دانی پێدابنێت و بە زمان دەری ببڕێت، ئەگەرچی بە ئەندامەکانیش وەك کردەوە جێبەجێی نەکات. ئەوا ئەو کەسە گوناهبارە و سەرپێچی خوایان کردووە، هەروەك پێشتر خرایەڕوو.

کەواتە ڕاجیاییەکە لە نێوان هەر سێ بۆچوونەکان ڕاجیاییەکی ڕاستەقینە نییە.

---

[1] شرح العقیدة الطحاویة لإبن أبي العز ٤٦٣ لە ڕوونکردنەوەیدا لەسەر هۆی ڕاجیایی نێوان ئەبو حەنیفە و ئەهلی سوننە.

[2] حاشیة الصعیدي علی کفایة الطالب الرباني ١/٣٨. سەیری: القول الفصل ١٦. بکە.

## زیادو کەم بوونی ئیمان

زانایان ڕاجیان لەبارەی ئەوەی ئیمان زیادو کەم دەکات؟ هەیانە بۆچوونی وایە زیـاد و کەم دەکات و هەشیانە ڕای پێچەوانەیە. ئیمامی ڕازی و زۆرێك لـە زانایـانی کـەلام ئـەم بابەتەیان بە لقێکی ڕاڤەی ئیمان داناوە[1].

ئیجی بەهەمان شێوە پشتگیری کردووەو وتویەتی: ئەگەر ئیمان تەنها بە دان پێـدانان ڕاڤە بکرێت ئەوا زیادو کەمی لەم لایەنەدا قبوڵ ناکات، ئەگەر بە کردەوەکان ڕاڤە بکرێت ئەوا زیادو کەمی قبوڵ دەکات[2].

### بۆچوونی یەکەم: ئیمان و زیادو کەم دەکات.

ئەمە مەزهەبی ئەهلی سوننەیە بە پێشین و پاشینان (سلف و خلـف)[3]. ئەشـعەری و موعتەزیلەکانیش ئـەم بۆچـوونەیان هەیـە[1]، زەیدییـەکانیش ئـەم بۆچـوونەیان پەسـەند کردووە[2]. هەندێك لە ئیبازییەکانیش بۆ ئەو بۆچوونە چوون[3].

---

[1] المحصل للرازي ٢٢٩ والمواقف وشرحه للسيد الشريف ٨/٣٣٠ نقلا عن الرازي.

[2] المواقف، . وشرح مسلم لأبي و السنوسي ١/١٠٩ و ١١١. بڕوانە: اصول الدين للبغدادي ٢٥٢.

[3] شرح صحيح مسلم للنووي ١/١٤٦ عن إبن بطال. لە ١٤٨ هاتووە ئەمە مەزهەبی پێشینان و فەرموودەناسانە. سقففاريني لە: لوامع الأنوار البهية ١/٤١١ لە ئیبن تەیمیەوە هێناویەتی کە وتویەتی: (مەزهەبی ئەهلی سوننە و فەرموودەناسان ئەوەیە کە پلەبەندی هەیە لە-ئیماندا، زۆربەشیان دەڵێن: ئیمان زیادو کەم دەبێت).

عەبدوڕەزاق لەموصەنەفەکەیدا وتویەتی: لەو شێخ و هاوەڵانەی پێیان گەیشتووم: سوفیانی سەوری، مالیکی کوڕی ئەنەس، عەبدوڵای کوڕی عومەر، ئەوزاعی، موعەمەری کوڕی ڕاشد، ئیبن جەریج، سوفیانی کوڕی عەیینە، گوێبیستیان بوومە کە وتویانە:ئیمان گوفتارو کردارەو زیادو کەم دەکات.

ئەمە ڕای ئیبن مەسعود، حوزەیفە، نەخەعی، حەسەنی بەصری، عەتاء، تاووس، موجاهید، عەبدوڵای کوڕی موبارەکە./ شرح صحيح مسلم للنووي ١/١٤٦ عن إبن بطال.

شافعي و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، ئیسحاقی کوڕی ڕاهویە، ئەبو عوبەید و ئیمامەکانی تریش ئەم بۆچوونەیان هەیە./ فتح الباري ١/٦١ ولوامع الأنوار البهية ١/٤١٦ عن التمهيد لإبن عبدالبر، وشرح المقاصد للتفتازاني ٥/٢١٠ والقول الفصل ٣٥٨.

زیاد بوونی ئیمان بە ئەنجامدانی پەرستشەکان، کەم بوونیشی بـە فـەرامۆش کردنیـان دەبێت[٤]، ئیمامی ئەحمەد لە موحەممـەدی کـوڕی موسـا دەگێڕێتـەوە: (ئیمـان گوفتـارو

لالکائی لە کتێبەکەیدا (شرح أصول إعتقاد أهل السنة والجماعة ١٤٥ و لاپەڕەکانی دواتر) ناوی زۆرێك لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان و شەرعناسەکانی هێناوە کە وتویانە ئیمان بە کاری چاك زیاد دەکات و بە کاری خراپ کەم دەبێت.

ئەمە مەزهەبی سەرجەم شەرعناسانە./ لوامع الأنوار البهية ٤٣٠/١. بوخاریش ئەم بۆچوونەی پەسەند کردووە./ صحيح البخاري ٢ كتاب الإيمان ١ باب قول النبي (صلى الله عليه وسلم): بني الإسلام على خمس. انظر بشرح فتح الباري ٦٠/١. تەبەریش ئەم بۆچوونەی پەسەند کردووە./ لوامع الانوار البهية ٤١٦/١ نقلا عن التمهيد لإبن عبدالبر. داودی کوڕی عەلیش هەمان ڕای هەیە./ لوامع الأنوار البهية، سەرچاوەی پێشوو، نقلا عن التمهيد. ئیبن حزمی زاهیریش شوێن داود کەوتووە لەم بۆچوونەدا./ علم الكلام لإبن حزم ٨٥. بەیهەقیش ئەم ڕایەی پەسەند کردووە./ شعب الإيمان للبيهقي ٦٠/١. نەوەویش ئەم بۆچوونەی سەرخستووە./ شرح صحيح مسلم للنووي ١٤٨/١. ئەمە ڕای شێخ عەبدولقادریشە./الغنية٦٩/١. ئیبن تەیمیەش پەسەندی کردووە./ لوامع الأنوار البهية ٤١١.

[١] شرح المقاصد للتفتازاني ٢١٠/٥ والقول الفصل ٣٥٨ والإنصاف للباقلاني ٥٧. و لە: لوامع الأنوار البهية ٤٣٠/١ هاتووە: (هەندێك لە زانا لێکۆڵەرە ئەشعەرییەکان بۆ ئەوەچوون وەك: قەلانسی و جگە لەویش). لە: مقدمة البحر الزخار لإبن المرتضى ٨٧ ئەم بۆچوونەی داوەتە پاڵ موعتەزیلەکان.

باجوری لە: شرح الجوهرة ١٠٠ ئەم بۆچوونەی داوەتە پاڵ زۆربەی ئەشعەرییەکان.

لە پەیامەکەی ئەشعەری کە بۆ دانیشتوانی دەڤەری (الثغر ٢٧٢) ڕەوانەی کردبوو، هاتووە: (ئەشعەری وتویەتی: زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی ئیمان بە کردەوەی چاك زیاد دەکات و بە کردەوەی خراپیش کەم دەکات، کەم بوونی ئیمان لەلای ئێمە گومان دروست بوون و نەزانی نیە سەبارەت بە دان پێدانانەکەمان، چونکە ئەمە کوفرە، بەڵکو کەم بوونە لە پلەی زانین و زیادی لە ڕوونکردنەوەو هەروەك نرخی پەرستشی ئێمە جیاوازە لە هی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەگەرچی هەموومان وەکو یەك ئەرکی سەرشانمان جێبەجێ دەکەین). لە پەراوێزی: باجوری، ئاماژەی بۆ کراوە.

[٢] مقدمة البحر الزخار لإبن المرتضى ٨٧.

[٣] الموجز لأبي عمار ٧٨/٢ وبهجة الأنوار ١٢٤ والبعد الحضاري ٤٩٨ ناقلا عن أبي عمار وخميس وأبي مهدي وأبي خزر.

[٤] الإيمان لأبي يعلى ٣٩٥-٣٩٧.

کرداره، زیادو کەم دەبێت، ئەگەر کاری چاکەت کرد زیاد دەبێت، ئەگەر کـاری چاکەشـت فەرامۆش کرد کەم دەبێت، ئیمان تەنها بە کردار دەبێت)[1].

**ڕووەکانی زیاد بوونی ئیمان:**

بۆ زیاد بوونی ئیمانی باوەڕدار، کە خوای گەورە فەرمانی پێکـردووە، چـەند ڕووێکـی هەن، لەوانە:

١- ئەو بەڕاستدانان و دانپێدانانەی پەیوەستە بە کردەوەی دڵەوە کامڵ و تەواوترە لەو دانپێدانانەی کرداری دڵی لەگەڵدا نییە.

ئەو زانستەی خاوەنەکەی کاری پێدەکات کامڵ و تـەواوترە لـەو زانسـتەی کـاری پـێ ناکات.

هەر کەسێك بزانێت خواو پێغەمبەرەکەی و بەهەشت و دۆزەخ ڕاست و هەقن، جا ئـەم زانینەی وای لێبکات کە خۆشەویستی و ترسی خوای لە دڵدا دروست ببێت، هیوای چوونە بەهەشت و ترسان لە ئاگری دۆزەخی هەبێت، جا زانینی ئەم کەسە تەواوترە لـەو کەسـەی کە زانینەکەی هیچ یەکێك لەو شتانەی بۆ پێویست نەکردوون[2].

٢- کردەوەکانی دڵ وەك: خۆشویستنی خواو پێغەمبەرەکەی و ترسان لە خـواو ئومێـد پێ هەبوونی، هەموو ئەو شتانە لە ئیمانن، خەڵك پلەبەندن لەم شتانەدا.

٣- کردەوەکـانی دەرو دەروون (الظـاهرة والباطنـة) لـە ئیمـانن، خـەڵکیش پلەبەنـدن تیایدا.

٤- مرۆڤــ کاتێك بە دڵ هەمیشە ئەو فەرمانانەی لـە یادیـدا ئامادەیـە و لـە بـیری ناچێت، ئەمە تەواو و کامڵترە لەو کەسەی تەنها بڕوای بـە دڵ هێنـاوەو بـەڵام بـێ

---

[1] الإيمان لأبي يعلى ١٥٣. سەیری ئەمانەش بکە: شعب الإيمان للبيهقي ٦٠/١ والمواقف ٣٣٠/٨ ولوامع الأنوار البهية ٤١٦/١-٤١٧.

[2] لوامع الأنوار البهية ٤١٤/١.

ئاگایە، چونکە بێ ئاگایی ئیمان کەم دەکاتە، بۆیە عومەیری کوڕی حەبیب (ڕەزای خوای لێبێت) وتویەتی: (ئەگەر یادو سوپاس و ستایشی خوامان کرد واتە ئیمانمان زیاد دەکات، ئەگەر بێ ئاگا بووین و فەرامۆشیمان کرد ئەوا ئیمانمان کەم دەکات).

ئەمانەش بەڵگەکانی زیادو کەم بوونی ئیمانن:

١- ئەم ئایەتانەی ئاماژەن بۆ زیادو کەم بوونی ئیمان، وەك:

خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا ﴾ الأنفال: ٢. واتە: (کاتێکیش ئایەت و فەرمانەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنرێتەوە، ئیمان و باوەڕیان زیاد دەکات).

خوای تاك و پاك لە هاوەڵ دەفەرموویت: ﴿ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنًا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴾ التوبة: ١٢٤. واتە: (کاتێکیش سورەتێك لە قورئان دابەزێنرا، هەندێك "لە دووڕووەکان بە گاڵتە پێکردنەوە" دەڵێن: کێتان بەم سورەتە باوەڕی زیاد کردووە؟! جا ئەوانەی کە باوەڕیان هێنابوو ئەوەندەی تر ئیمان و باوەڕیان پتەوتر دەکرد، ئەوانیش مژدە بەیەکتر دەدەن).

هەروەها دەفەرموویت: ﴿ لِيَزْدَادُوٓا۟ إِيمَٰنًا مَّعَ إِيمَٰنِهِمْ ﴾ الفتح: ٤. واتە: (سەرەڕای ئیمانداری و خواناسیان ئیمانیان زیاد ببێت).

ئەم ئایەتانە ئاماژەن بۆ ئەوەی کە ئیمان دەکرێت زیاد ببێت، مادەم شیاوی زیاد بوونە، ئەگەر زیاد بوونەکە نەما کەم دەبێتەوە[1].

٢- ئەو فەرمایشتە بەپێزانەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە ئاماژەن بۆ ئەمە، وەك:

[1] شعب الإيمان للبيهقي ١/٦٠. ئایەتەکان لە: الإيمان لأبي يعلى ٤٠١-٤٠٢ و شرح الجوهرة للباجوري ١٠٢. لە: المواقف للإيجي وشرحه الشريف عليه ٨/٣٣١: ئەم ئایەتەی هێناوە: ﴿ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا ﴾ وتویەتی ئایەتەکانی لەو شێوەیە، هەندێك لەو ئایەتانە باس کراون لە: شرح المقاصد للتفتازاني ٥/٢١٣ وشرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٤٧٩ والقول الفصل ٣٥٨.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموویێت: **(أكمل المؤمنين إيماناً أحسنهم خلقاً، وخياركم خياركم لنسائكم)** واتە: ئەو باوەڕدارە خاوەنی کاملترین و تەواترین ئیمانە کە جوانترین ڕەوشتی هەبێت، چاکترینتان چاکترینتانە بۆ ژنەکانتان.

حەلیمی وتویەتی: ئەم فەرمایشتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ڕەوشت جوانی لە ئیمانەوەیە، نەبوونی ڕەوشت جوانی کەم بوونی ئیمانە، کەواتە باوەڕداران جیاوازن لە پلەی ئیمانیاندا، هەیانە ئیمان و باوەڕی کاملترە لەوەی تر[1].

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموویێت: **(من رأى منكم منكراً فليغيره بيده، فإن لم يستطيع فبلسانه، فإن لم يستطع فبقلبه، وذلك أضعف الإيمان)**[2] واتە: هەر کەسێك لە ئێوە خراپەیەکی بینی با بەدەست بیگۆڕێت و قەدەغەی بکات، ئەگەر نەی توانی با بە زمان بیکات، ئەگەرنا با بە دڵ پێی ناخۆش بێت، بەڕاستی ئەمەش لاوازترین ئیمانە.

واتاکەی بەو ئاراستەیەیە کە بە دڵ پیێ ناخۆش بوون لاوازترین ئیمانە، لە بەرامبەریدا بە دەست گۆڕین و قەدەغەکردنی کاملترین پلەی ئیمانە، بە زمان گۆڕین لە دوای ئەو دێت.

٣- ئەو شوێنەوارانەی لە هاوەڵان و شوێنکەوتووانەوە هاتوون بەڵگەن لەسەر ئەوەی پەرستشەکان بەشێکی ئیمانن، ئیمانیش زیادو کەم دەکات، ئیمانداران پلەی ئیمانیان جیاوازە. وەك:

عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێبێت) وتویەتی: (ئەگەر ئیمانی ئەبو بەکر لەگەڵ ئیمانی هەموو خەڵکی سەر زەوی بپێورێت ئیمانی ئەبو بەکر گرانتر دەبێت)[3].

---

[1] شعب الإيمان للبيهقي ١/٦٠-٦١.

فەرموودەی: ئەو باوەڕدارە خاوەنی کاملترین و تەواترین ئیمانە... تاد: ترمذی و ئیبن حەببان لە صەحیحەکەیدا لە ئەبو هورەیرەوە هێناویانە./ الجامع الصغير للسيوطي ٨٩ و بە ڕاستی داناوە.

[2] شعب الإيمان للبيهقي ١/٦١.

[3] شعب الإيمان للبيهقي ١/٦٩ بە زنجیرەی خۆی گێڕاویەتیەوە. و بڕوانە: شرح المقاصد للتفتازاني ٥/٢١٣ والقول الفصل ٣٥٩ وشرح الجوهرة للباجوري ١٠٢.

جاری واهەبوو عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێبێت) دەستی پیاوێك یان دوو پیاوی دەگرت و دەیوت: (وەرن ئیمانمان زیاد بکەین)[1].

هاوشێوەی ئەم وتەیەی سەرەوە لە عەلی کوڕی ئەبو تالیب و موعازی کوڕی جەبەل و عەبدوڵای کوڕی مەسعود و عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە هاتووە (خوا لێیان ڕازی بێت)، بەیهەقی لە (شعب الإيمان) خستووەتیەڕوو.

بەڵگەی عەقڵی لەسەر زیادو کەم بوونی ئیمان، ئەگەر ئیمان پلە پلە نەبێت، ئەوا ئیمانی هەر تاکێك یاخود ئەو کەسەی شەکەت بووە لە گوناهکاریدا یەکسان دەبوو لەگەڵ باوەڕی پێغەمبەران و فریشتەکان، جا ئەم یەکسان بوونە بێ چەندو چوون پوچەڵە[2].

**بۆچوونی دووەم: ئیمان زیاد و کەم نابێت.**

ئیمان بریتییە لە دان پێدانانی دڵ، خودی دان پێدانانیش زیاد نابێت، هەر شتێك زیاد نەبێت کەمیش نابێت، تەنها کاتێك زیاد دەبێت کە هاوشێوەیەکی بخەیتە پاڵی. ئیمان زیاد نابێت بەپەرستش کردن و کەمیش نابێت بەهۆی گوناهکاری، چونکە دان پێدانان هەر هەمان ئەو دان پێدانانەیە کە هەبووە بەر لە کردنی کاری چاکە یاخود فەرامۆش کردنی.

ئەمە بۆچوونی ئەبو حەنیفە[3] و هاوەڵەکانی[1] و ماتوریدییەکان[2] و زۆربەی زانایانی کەلام و ئیمامی حەرەمەین[3] و هەندێك لە ئەشعەرییەکان[4] و بەسیوی لە ئیبازییەکان[5] ئەم بۆچوونەیان پەسەند کردووە.

---

[1] شعب الإيمان للبيهقي ٧٠/١ بە زنجیرەی خۆی گێڕاویەتیەوە، و سەفارینی لە: لوامع الأنوار البهية ٤١٢/١ بە دەربڕینێکی نزیك لەو شێوەیەی هێناوە لە ئیبن تەیمیەوە کە ئیمامی ئەحمەد لە ئەبو زەڕ گێڕاویەتیەوە. ئەم گێڕانەوەیە لە کتێبی: الإيمان لأبي يعلى ٤٠٤ و شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٤٨١، هاتووە.

[2] شرح المقاصد للتفتازاني ٢١٣/٥. والقول الفصل ٣٥٨ وشرح الجوهرة للباجوري ١٠٢.

[3] الفقه الاكبر لأبي حنيفة - شرحه القول الفصل ٣٥٨-٣٥٩ وشرحه لعلي القاري ١٤٤ وشرح الجوهرة للباجوري، سەرچاوەی پێشوو. دەقی وتەکەی ئەبو حەنیفە لە (الفقه الأكبر - شرح علي القاري)

هەندێك لە بەڵگەکانی ئەم بۆچوونە:

زیاد و کەم بوون واتە گومان هەبوون، گومان هەبوونیش کوفرە[٦].

هەڵگرانی ئەم بۆچوونە ئەو دەقانەیان بە چەندین جۆر تەئویل کردووە کە ئاماژەن بۆ زیاد و کەم بوونی ئیمان، هەندێك لەو تەئویلانە:

واتای زیاد بوونی ئیمان، بریتیە لە زیاد بوونی ڕووناکی و نوورو درەوشانەوەی ئیمان لە دڵ و دەرووندا بەهۆی کردەوەی چاکە، جا بەهۆی گوناهو تاوان نوورو ڕووناکیەکەی کەم دەکات، بەو پێیەی خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ ﴾ الصف: ٨. واتە: (ئەوانە دەیانەوێت بە فوو، بە قاڵەی دەم، نووری خوا بکوژێننەوە). هەروەها دەفەرمووێت: ﴿ أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾ الزمر: ٢٢. واتە: (ئایا ئەو کەسەی خوای میهرەبان سینەی گوشاد کردووە بۆ ئیسلام و لەسەر ڕێبازی نوورو ڕوناکی پەروەردگاریەتی).

بەڵام ئیمان لە خودی خۆیدا زیادو کەم نابێت[٧].

**بۆچوونی سێیەم: ئیمان زیاد دەبێت و کەم ناکات.**

ئەمە وتەی ئیمامی مالیکە، لە یەکێك لە گێڕانەوەکاندا.

---

ئەوەیە: (ئیمانی دانیشتوانی ئاسمان و زەوی زیاد و کەم ناکات لەو ڕووەی باوەڕی پێ هەیە، بەڵکو لەو ڕووە دان پێداهێنان و دڵنیایی و یەقین زیادو کەم دەکات). تبصرة الأدلة ٨٠٩/٢ وشرح المقاصد للتفتازاني ٢١١/٥ ولوامع الأنوار البهية ٤٣١/١.

[١] شرح العقائد للتفتازاني، والقول الفصل، ولوامع الأنوار البهية، سەرچاوەکانی پێشوو.

[٢] التمهيد للامشي ١٣٤ وأصول الدين للغزنوي ٢٥٤.

[٣] شرح صحيح مسلم للنووي ١٤٨/١.

[٤] شرح المقاصد للتفتازاني و القول الفصل، دوو سەرچاوەکەی پێشوو.

[٥] المحصل للرازي ٢٣٩. و ڕەیحاوی لە: نخبة اللآلي ٩٧ وتویەتی: (ئیمان لەلای ئێمە زیادو کەم ناکات بەڵکو بەهێزو لاواز دەبێت).

[٦] الجامع للبسيوي ٢٣٧/١. بڕوانە: بهجة الأنوار ١٢٤ (هەندێك لە گەلەکەمان).

[٧] تبصرة الأدلة ٨٠٩/٢.

هۆی ئەمەش: ئەوەیە ئەگەر ئیمان کەم بکات ئەوا هەمووی دەڕوات، بەمەش دەکەوینە ناو بازنەی خەواریجەکان کە بەهۆی گوناه کردنەوە باوەڕداران تەکفیر دەکەن[1].

مەشاریقەکان کە تاقمێکی ئیبازییەکانن ئەم بۆچوونەیان پەسەند کردووە[2]. سالمی ئیبازیش ئەم بۆچوونەی هەیە[3].

## ئیــــــســــــلام

وشەی (ئیسلام) لە بنچینەی زمانەوانیدا: بریتییە لە خۆبەدەستەوەدان و ملکەچ بوون[4].

لە زاراوەدا: زانایان ڕاجیاییان هەیە لەبارەی ئەوەی ئایا ئیسلام هەم ئیمانیشە؟ بە واتای داننان بەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە خواوە هێناویەتی، یاخود ئیسلام تەنها ملکەچ بوونە لە ڕووکەشدا؟.

ئەمەش ڕوون دەبێتەوە کاتێك بەرچاو ڕوونی دەکرێت سەبارەت بەوەی ئیسلام و ئیمان یەك واتایان هەیە یاخود دوو واتای جیاوازیان هەیە، لە خوارەوە دەخرێتەڕوو:

***ڕای یەکەم: ئیمان و ئیسلام یەك شتن.***

دوو ناوەکە، دوو ناوی هاومانان، هەر باوەڕدارێك موسڵمانە، هەر موسڵمانێکیش باوەڕدارە[5].

---

[1] شرح صحيح مسلم للأبي والسنوسي ١١٢.

[2] البعد الحضاري ٥٠٠.

[3] مشارق أنوار العقول ٢/٢٠٤. و لە: بهجة الأنوار ١٢٤ هاتووە: (هەندێك لە هاوەڵانمان بۆچوونیان وایە).

[4] القاموس المحيط مادة (السلم). و لە: معجم مقاييس اللغة ٣/٩٠ هاتووە: (سلم) سين، لام، ميم، زۆربەی بەشی بریتییە لە تەندروست باشی و سەلامەتی، لەوەشەوە هاتووە: ئیسلام بریتییە لە ملکەچ بوون، چونکە پارێزراو دەبێت لە ملنەدان و خۆ بەدەستەوەنەدان.

[5] تبصرة الأدلة ٢/٨١٢ وأصول الدين للغزنوي ٢٦١-٢٦٣.

ئەمە ڕای ئەبو حەنیفە[1] و ڕای نەسەفییە کاتێك ڕای ئەبو مەنصوری ماتوریدی دەربڕیوە[2]، هەروەها ڕای موعتەزیلەکان[3] و تەفتازانیە[4] و لە زۆربەی زانایانی نەقڵ کردووە[5]، ڕای بەیهەقیە[6] و داویەتە پاڵ زۆربەی ئەهلی سوننە: موحەمەدی کوڕی نەصری مەروەزی، ئیبن عەبدولبەر. ئەم ڕایە لە سوفیانی سەوریشەوە[7] گێڕدراوەتە. و ڕەحاوی[8] و ئیبن حەزمی زاهیری[9] و زەیدییەکان[10] و ئیبازییەکانە[11].

ئەمانەش بەڵگەکانی ئەم ڕایەن:

١- خوای تاك و بێ وێنە دەفەرمووێت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾ آل عمران: ١٠٢.[12] واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، لە خوا بترسن و پارێزگار بن بەشێوەیەکی وا کە شایستەی ئەو زاتەیە و هەمیشە پابەند و دامەزراو بن لەسەر ئیسلامەتی، بۆ ئەوەی هەر کاتێك مردن بە ئیمان و ئیسلامەتی نەبێت نەمرن). ئیسلامێتی بۆ باوەڕداران چەسپاندووە.

---

[1] الفقه الأكبر لأبي حنيفة - شرحه القول الفصل ٣٦١ وشرحه لعلي القاري ١٤٩.

[2] تبصرة الأدلة، سەرچاوەی پێشوو. سەیری ئەمەش بکە: أصول الدين للغزنوي ٢٦١ والكفياة للصابوني - القول الفصل ٣٦٢.

[3] شرح الأصول الخمسة ٧٠٥. هەروەها باسکراوە لە: الإيمان لأبي يعلى ٤٣٦ والمواقف ٣٢٦/٨ ومقدمة البحر الزخار لإبن المرتضى ٨٦.

[4] شرح المقاصد للتفتازاني ٢٠٧/٥.

[5] شرح المقاصد للتفتازاني، سەرچاوەی پێشوو. هەروەها ئەم ڕایەی لە زۆربەی زانایانەوە نەقڵ کردووە لە: القول الفصل ٣٦٢.

[6] شعب الإيمان للبيهقي ٥٠/١.

[7] جامع العلوم والحكم ١٠٧/١.

[8] نخبة اللآلي ٩٨.

[9] علم الكلام لإبن حزم ٨٢ و٨٥.

[10] مقدمة البحر الزخار لإبن المرتضى ٨٦.

[11] الجامع للبسيوي ٢٤٤/١ وبهجة الأنوار ١٢٤.

[12] تبصرة الأدلة ٨١٨/٢ وشرح المقاصد للتفتازاني ٢٠٩/٥.

٢- خوای پاك و بێ هاوەڵ دەفەرموویێت: ﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ ﴾ آل عمران: ٨٥. واتە: (ئەوەی بێجگە لە ئایینی ئیسلام پەیڕەوی هەر ئایینێکی تر بکات لێی وەرناگیرێت). ئیمان ئایینە، ئەگەر ئیمان جگە لە ئیسلام بووبا. ئەوە نەدەکرا لەو کەسە قبوڵ بکرێت کە ئیمانی هەڵبژاردووە[١].

٣- ئەم فەرمایشتەی خوای مەزن لە سەرگوزەشتەکەی نوح (سەلامی خوای لێبێت): ﴿ فَأَخْرَجْنَا مَن كَانَ فِيهَا مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۝٣٥ فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِّنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾ الذاريات: ٣٥، ٣٦. واتە: (جا هەرچی لەو ناوچەیەدا بوو لە ئیمانداران دەرمانکردن و ڕزگارمان کردن. لە ماڵە موسڵمانێك زیاتر بەدیمان نەکرد). جارێك بە "باوەڕداران" جارێك بە "موسڵمانان" ناوی بردوون، ئەم ناونانە تەنها بۆ جیاکردنەوەی ئایینی ئەوان بووە لە ئایینی کەسانی تر، شتێکی گومان هەڵنەگرە کە ئیمان و ئیسلام دوو ناون بۆ یەك ئایین[٢].

٤- ئەگەر دوو ناوەکە بۆ دوو شتی جیا بوونایە، ئەوە دەکرا یەکێك بەبێ ئەوەی تر ببێت، دەکرا ئیماندارێکی نا موسڵمان، موسڵمانێکی نا ئیماندار ببێت.

ئەگەر گریمان ئەوە هەبوو قسە چیە وەك حوکمی دونیایی سەبارەت بەو کەسەی کە باوەڕدارەو نا موسڵمانە یاخود موسڵمانە و نا ئیماندارە؟.

ئەگەر حوکمێك بۆ هەر یەکێك چەسپا ئەوا ئەوەی تر گومڕاییەکەی دەسەلمێنرێت، ئەگەر نەش چەسپا ئەوا قسەکە پوچ دەردەچێت[٣].

---

[١] تبصرة الأدلة ٢/ ٨١٨ وأصول الدين للغزنوي ٢٦٣ والقول الفصل ٣٦٢ نقلا عن التبصر. إيجي لە: المواقف ٣٢٦/٨ لەکاتی خستنەڕووی بەڵگەکانی موعتەزیلەکاندا باسی کردووە. هەروەها بڕوانە: شرح المقاصد للتفتازاني ٢٠٨/٥.

[٢] شعب الإيمان للبيهقي ١/ ٥٠. نەسەفی ئایەتەکەی باس کردووە لە: تبصرة الأدلة ٨١٨/٢. و خەتابی لە: معالم السنن ٣١٥/٤ باسی کردووە. ئیبن حەزم لە: علم الكلام ٨٢ و ڕەیحاوی لە: نخبة اللآلي ٩٨ باسی کردووە.

[٣] تبصرة الأدلة ٢/ ٨١٠. ئاماژەی بۆ کراوە لە: القول الفصل ٣٦٢ نقلا عن التبصرة.

***ڕای دووەم: ئیسلام و ئیمان دوو شتی جیاوازن.***

ئیسلام: بریتییە لە ملكەچ بوون و خۆبەدەستەوەدان، هەر پەرستش و گوێڕایەڵییەك بەندە ملكەچی خواو فەرمانی خوای بكات ئەوە ئیسلامە[1]. ئیمان: بریتییە لە خەسڵەتێك لە خەسڵەتەكانی ئیسلام، هەموو ئیمانێك ئیسلامە، بەڵام هەموو ئیسلامێك ئیمان نییە[2]. دەكرێت لە هەندێك بارودۆخدا موسڵمان باوەڕدار بێت، دەشكرێت لە هەندێك بارودۆخدا باوەڕدار نەبێت، كەچی باوەڕدار لە هەموو بارودۆخێكدا موسڵمانە، جا هەموو باوەڕدارێك موسڵمانە، بەڵام هەموو موسڵمانێك باوەڕدار نیە. بناغەی ئیمان دان پێدانانە بە دڵ، بناغەی ئیسلامیش خۆ بەدەستەوەدان و ملكەچ بوونە، دەكرێت مرۆڤ لە ڕووكەشدا ملكەچ بێت و لە دەرووندا ملكەچ نەبێت، دەكرێت لە دڵ و دەرووندا ڕاستگۆ بێت كەچی لە ڕووكەشدا ملكەچ نەبێت[3].

ئەمە ڕای خەتابییە و بە دروستی داناوە[4]، باوكی عەمرِوی كوڕی صەلاح پەسەندی كردووەو وتویەتی ئەم ڕایە كۆكە لەگەڵ ڕای زۆربەی زانایان لە فەرموودەناسان و جگەلەوانیش[5]. جیاكردنەوەی ئەو دوو چەمكەی لە پێشینانەوە هێناوە[6]. ئەمە ڕای باقلانیە[7] و نەسەفی داویەتە پاڵ هەندێك لە حەشەوییەكان[1] و ئەبو یەعلی[2] و ئیجی و

---

[1] تمهيد الأوائل ٣٩٢. و لە (القاموس المحيط، مادة "السلم") هاتووە: أسلم: ملكەچ بوو.

[2] تمهيد الأوائل، سەرچاوەی پێشوو. والإنصاف للباقلاني ٥٨.

[3] معالم السنن للخطابي ٣١٥/٤ ونقله عنه النووي في شرح صحيح مسلم ١٤٥/١.

[4] معالم السنن، سەرچاوەی پێشوو. و نقله عنه النووي في شرح مسلم، سەرچاوەی پێشوو.

[5] شرح صحيح مسلم للنووي ١٤٨/١ نقلا عن أبي عمرو بن صلاح.

[6] جامع العلوم والحكم ١٠٧/١، تیایدا هاتووە كە ئیبن ڕەجەب ئەوانەشی لەوانە ژماردووە كە ئەم ڕایەیان پەسەند كردووە: قەتادە، داودی كوڕی ئەبو هیند، باوكی جەعفەری باقر، زوهری، حەمادی كوڕی زەید، ئیبن مەهدی، شەریك، ئیبن ئەبو زیئب، ئەحمەدی كوڕی حەنبەل، ئەبو خەیسەمە، یەحیای كوڕی موعەییەن، جگە لەوانەش. سەرباری ڕاجیاییان لەسەر شێوەی جیاوازی لە نێوان دوو چەمكەكە دەكات. حەسەن و ئیبن سیرین دەیانوت: موسڵمان، دەترسان لە بەكارهێنانی وشەی: ئیماندار.

[7] تمهيد الأوائل ٣٩٢.

سەید شەریف لە ئەشعەرییەکان[3] بۆچوونیان وایە ئیمان و ئیسلام جیاوازن[4]، ئەمە بۆچوونی هەندێك لە موعتەزیلەکان و هەندێك لە ئیمامیەکانیشە[5].

بەڵگەی ئەم بۆچوونەش لەم خاڵانەدا دەخرێنەڕوو:

١- خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ وَلَـٰكِن قُولُوٓا۟ أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَـٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ ﴾ الحجرات: ١٤. واتە: (هەندێك لە بیابان نشینە عەرەبەکان وتیان: باوەڕمان هێناوەو موسڵمانین، پێیان بڵێ: نەخێر باوەڕتان نەهێناوە، بەڵام بڵێن بە ناچاری موسڵمان بووین، هێشتا باوەڕ نەچۆتە ناو دڵەکانتانەوەو تیایدا جێگیر نەبووە). باوەڕو ئیمانی عەرەبە دەشتەکیەکانی لابرد و تەنها بڕیاری موسڵمان بوونی ئەوانی دا، واتە: تەنها ملکەچ بوونیە و خۆیان بەدەستەوەداوە[6].

٢- یەکێکی خستوەتەسەر ئەوی تر، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَـٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتِ ﴾ الأحزاب: ٣٥. واتە: (بەڕاستی پیاوان و ئافرەتانی موسڵمان، پیاوان و ئافرەتای ئیماندار).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَـٰنًا وَتَسْلِيمًا ﴾ الأحزاب: ٢٢.[7] واتە:

---

(1) تبصرة الأدلة ٨١٧/١. لە: شرح المقاصد للتفتازاني ٢٠٩/٥ هاتووە: ئەمە ڕای حەشەویەکانە. هەمان قسە لە: القول الفصل ٣٦١ هاتووە.

(2) الإيمان لأبي يعلى ٤٣٧.

(3) المواقف وشرحه للسيد الشريف ٣٢٧/٨.

(4) شرح المقاصد للتفتازاني ٢٠٩/٥.

(5) مقدمة البحر الزخار لإبن المرتضى ٨٦.

(6) تمهيد الأوائل ٣٩٢ والإنصاف للباقلاني ٥٩ وتبصرة الأدلة ٨١٧/٢ بەڵگەی هەندێك لە (حشويەكان)ی گێڕاوەتەوە. هەروەها لە: قول الفصل ٣٦١، وشرح المقاصد للتفتازاني ٢٠٩/٥ هەندێك بەڵگەی لە حەشەوی و موعتەزیلەکانەوە هێناوە. ئەم ئایەتە زوهری بە بەڵگەی هێناوەتەوە هەروەك (خطابي) لە: معالم السنن ٣١٥/٤ باسی کردووە.

(7) شرح المقاصد للتفتازاني ٢٠٩/٥ عن الحشوية وبعض المعتزلة والقول الفصل ٣٦١ عن بعض الحشوية.

(بێگومان ئەو دژایەتیە باوەڕو ملکەچی نەبێت هیچی تری بۆ زیاد نەکرد).

لە ئایەتی یەکەمدا ئیمانی خستوەتەسەر ئیسلام، هیچ شتێك ناخرێتە سەر خۆی[1]. بەهەمان شێوە لە ئایەتی دووەمیش خراونەتە سەر یەك.

**٣-** فەرموودەکەی جبریل (سەلامی لێبێت)، ناوبراو پرسیاری لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کرد لەبارەی ئیمان، ئەویش فەرمووی: **(أن تؤمن بالله وملائكته وكتبه ورسله واليوم الآخر والقدر خيره وشره)** واتە: باوەڕت هەبێت بە خوا، فریشتەکانی، کتێبەکانی، پێغەمبەرەکانی، ڕۆژی دوای، بە قەدر چ خێر یان شەڕ بێت.

پرسیاری لێ کرد دەربارەی ئیسلام، فەرمووی: **(أن تشهد أن لا إله إلا الله و تقيم الصلاة وتؤتي الزكاة وتصوم رمضان وتحج البيت)** واتە: شایەتی بدەیت کە هیچ خوایەك نییە جگە لە "الله"، نوێژ بکەیت، زەکات بدەیت، ڕۆژوو بگریت، حەجی ماڵی خوا بکەیت.

ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئیمان و ئیسلامی لەیەك جیا کردەوە، یەکەمیان باوەڕدارە و دووەمیان موسڵمانە[2].

فەرموودەکە بنچینەی ئیمانی و باوەڕی ڕوونکردەوە کە بریتیە لە دانپێدانانی دڵ و دەروون، بنچینەی ئیسلامیشی ڕوون کردۆتەوە کە بریتییە لە ملکەچ بوون و خۆبەدەستەوەدان لە ڕووکەشدا.

باوکی عەمرِوی کوڕی صەڵاح وتویەتی: ئیمان و ئیسلام لە هەندێك خاڵدا کۆدەبنەوەو لە هەندێکی تریشدا لێك جیادەبنەوە، هەموو ئیماندارێك موسڵمانە، بەڵام هەموو موسڵمانێك ئیماندار نییە[3].

---

(١) الإيمان لأبي يعلى ٤٣٧.

(٢) تبصرة الأدلة ٢/ ٨١٧ وشرح المقاصد للتفتازاني ٥/٢٠٩ والإيمان لأبي يعلى ٤٣٧-٤٣٨ ونخبة الآلي ٩٨ والقول الفصل ٣٦١ والإنصاف للباقلاني ٥٥ والغنية للشيخ عبدالقادر ٧٠/١.

(٣) شرح صحيح مسلم للنووي ١٤٨/١ نقلا عن أبي عمرو بن صلاح.

*بۆچوونی سێیەم:*

ئیمان بریتییە لە ڕەگەزی دانپێدانانی دڵ، ئیسلام بریتییە لە ڕەگەزی کردەوە. هەروەك لەم فەرمایشتەی خوای گەورەدا هاتووە: ﴿ إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ﴾ الأحزاب: ٣٥. واتە: (بەڕاستی پیاوان و ئافرەتانی موسڵمان، پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار).

پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: **(الإسلام علانية، والإيمان بالقلب)** واتە: ئیسلامەتی بە ئاشکراییە، ئیمانداریش بە دڵە.

ئەگەر تەنها یەکێك لەو دوانە باس کرا، ئەوا مانا و حوکمی ئەوی تریش دەگرێتەوە، هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوانیاندا.

ئیسلام و ئیمان دوو چەمکن ئەگەر لەگەڵ یەك هاتن و کۆبوونەوە دوو مانای جیاواز لە یەکتر دەدەن بەدەستەوە، ئەگەر بەجیا هاتن یەك مانا دەدەن بە دەستەوە. ئەو دوو چەمکە وەك دوو چەمکی هەژارو نەدار وان، خوای باڵادەست دەفەرمووێت: ﴿ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ ﴾ المائدة: ٨٩. واتە: (نان و خۆراك دان بە دە کەسی هەژار). ئەمە هەژارو نەدار دەگرێتەوە واتە: چ ئەو هەژارەی هیچ نییە چ ئەوەش کە نەدارە و هەیەتی و بەشی ناکات.

ئەمە بۆچوونی ئیبن ڕەجەب[1] و ئیبن ئەبولعیزە[2].

---

[1] جامع العلوم والحكم ١/١٠٧-١٠٨ لە پەراوێزی کتێبی ناوبرودا هاتووە: فەرموودەی ئیسلام بە ئاشکراییە... تاد، لە موسنەدی ئەحمەددا لە ئەنەسەوە هاتووە. هەروەها ئیبن ئەبو شەیبە و ئەبو یەعلا و بەزارو باوکی عەبەید لە بەشی ئیمان گێڕاویانەتەوە. لێکۆڵەر (محقق)ی کتێبی ناوبراو کە شێخ شوعەیبە وتویەتی: لە زنجیرەکەیدا عەلی کوڕی مەسعەدە هەیە کە کەسێکی لاوازە. و بڕوانە: مجمع الزوائد ١/٥٢.

[2] شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٤٩٠ و ٤٩٢-٤٩٣.

## ئیحـــســـــان

الإحسان: چاوگی فرمانی (أحسن)، بۆ دوو مانا بەکاردێت:

١- بەخۆی سنوور شکێنی (تعدى) بکات: (أحسنت كذا)، ئەگەر چاك و تـەواوی کـرد بە ڕێك و پێکی.

٢- سنوور شکێنی بکات بە پیتی (جەر)، وەك دەوترێت: (أحســنت إلى فـلان) واتـە: سوودم پێگەیاند.

ئیحسان کە هاتووە لە فەرموودەکەی جبریل (وتی - واتە: جبریل - پێم بڵێ ئیحسـان چییە؟ فەرمووی - واتە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) - **(أن تعبد الله كأنك تراه، فـإن لم تكن تراه فإنه يراك)** واتە: بریتییە لەوەی خوا بپەرستی وەك ئەوەی خـوا ببینیـت، ئەگـەر نەشی بینی ئەوا ئەو تۆ دەبینێـت. بـە واتـای یەکـەم دێـت نـەك بـە واتـای دووەم، کـە دەگەڕێتەوە بۆ ڕێك و پێکی پەرستشەکان و لەبەرچاو گرتنی مافەکانی خوای پایەبەرز[1].

ئیحسان کە لە فەرمایشتی جبریلـدا هـاتووە سـێ پلـە لـە خواپەرسـتی و پەرسـتش دەگرێتەوە، کە ئەمانەن:

**پلەی یەکـەم:** پەرستش بکات بە جێبـەجێ کردنێکـی تـەواوی مـەرج و بنچـینەکانی، بەمەش ئەرکە شەرعیەکەی سەر شانی ڕاپەڕاندووە[2].

**پلەی دووەم:** ئەمە مەبەستی ئەو بەشەی فەرمایشـتەکەی پێغەمبـەرە (صـلی الله علیـه وسـلم) لە فەرموودەکـەی جبریلـدا: (خـوا بپەرسـتی وەك ئـەوەی خـوا دەبینیـت)، بەندەکـە خـوا دەپەرسـتێك وەك ئـەوەی خـوا دەبینێـت، ئەمـە پلـەی بینینـە (مشاهدة)یە. ئەمەی ئەو پلەی پێغەمبـەرە (صـلی الله علیـه وسـلم) کـە لەبارەیـەوە

---

[1] المفهم للقرطبـی ١٤٢/١ وعمدة القاري ٢٨٨/١.

فەرموودەی جبریل بریتییە لە فەرموودەکەی عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێبێت) لەبارەی باوەڕو ئیسلام و ئیحسان و نیشانەکانی بەرپابوونی دوارۆژ، باوە کەمێك پێش ئێستا خرایەڕوو.

[2] إرشاد الساري ١٤٠/١.

دەفەرموویێت: (وَجُعِلَت قُرَّة عيني في الصلاة) واتە: نوێژ چاو ڕۆشنكەرەوەی منە. ئەمەش بەهۆی تام و چێژ لێوەرگرتن[1].

**پلەی سێیەم:** ئەمەش مەبەستی ئەم بەشەی ترە لە فەرمایشتەكەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم): (ئەگەر تۆ نەیبینیت ئەو دەتبینێت)، خوای گەورە دەپەرستێت و حاڵەتێكی بەسەردا هاتووە كە هەست دەكات خوا ئەو دەبینێت.

ئەمە پلەی چاودێری (مراقبة)یە[2] یان پلەی دڵسۆزیی (إخلاص)ە[3]. ئەم فەرمایشتەی پەروەردگار ئاماژەی بۆ ئەوە كردووە: ﴿ ٱلَّذِى يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٢١٨﴾ وَتَقَلُّبَكَ فِى ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٢١٩﴾ ﴾ الشعراء: ٢١٨، ٢١٩.[4] واتە: (ئەو زاتەی كە دەتبینێت كاتێك هەڵدەستیت لە شەوگاردا و دەیپەرستیت. ئەو زاتە تۆ دەبینێت كە چۆن لە ڕیزی سوژدەبەراندا هەڵسوكەوت دەكەیت).

هەر سێ پلەی ناوبراو بریتین لە (ئیحسان)، ئەو ئیحسان و ڕێك و پێكیەی كە مەرجە بۆ دروستی پەرستشەكان پلەی یەكەمە.

دوو پلەی تریش خەسڵەتی بەندە تایبەتەكانن، كە زۆربەی بەندەكان ناتوانن پێی بگەن[5].

ئەم ڕاڤەیەی چەمكی (ئیحسان): (خوا بپەرستی وەك ئەوەی خوا ببینیت، ئەگەر نەشی بینی ئەوا ئەو تۆ دەبینێت). ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە بەندە خوای گەورە دەپەرستێت كە واهەست دەكات بەشێوەیەك لێی نزیكە وەك ئەوەی بیبینێت، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی كە بەندەكە ترس و بیم و ئەدەب و شكۆداری لە دەروونندا ئامادە بێت تا ئەو

---

[1] إرشاد الساري، سەرچاوەی پێشوو. قرطبي لە: المفهم ١٤٣/١ و العيني لە: عمدة القاري ٢٨٨/١ هێناویەتی.

[2] إرشاد الساري، والمفهم، وعمدة القاري، سێ سەرچاوەكەی پێشوو.

[3] جامع العلوم والحكم ١٢٩/١.

[4] المفهم للقرطبي، سەرچاوەی پێشوو.

[5] إرشاد الساري ١٤٠/١.

کاتەی لە پەرستشەکەیدایە، بەمەش دڵساغ و دڵسۆزانە پەرستشەکەی دەکات، ئەوپەڕی کۆششی خۆی خەرج دەکات لە جوان و ڕێك و پێك و کامڵ کردنی خواپەرستیەکەیەوە[1].

پێغەمبەر ئامۆژگاری هاوەڵانی دەکرد بە ئەنجامدانی ئەو جۆرە پەرستش و خواپەرستیە:

لە ئەبو زەڕەوە هاتووە کە وتویەتی: خۆشەویستەکەم (صلى الله عليه وسلم) ئامۆژگاری کردووم کە لە خوا بترسێم وەك ئەوەی لەبەرچاوم بێت ببینم، ئەگەر من نەشی بینم ئەو من دەبینێت.

فەرموودەی زەیدی کوڕی ئەرقەم بە بەرزکراوەیی ڕاوەستاو (مرفوع و موقوف) گێڕدراوەتەوە: (واهەست بکە کە خوا دەبینیت و ئەگەر تۆ ئەو نەبینیت ئەوا ئەو دەتبینێت).

دەگێڕدرێتەوە کە پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، فەرموودەیەکەم پێ بڵێ بە کورتی و پوختی، فەرمووی: **(صلِّ صلاة مودّع، فإنّك إن كنت لا تراه فإنه يراك)** واتە: نوێژ بکە وەك بەڕێکەر، ئەگەر تۆ خوا نەبینیت ئەو دەتبینێت[2].

لە فەرموودەدا هاتووە: **(أفضل الإيمان أن تعلم أن الله معك حيث كنت)** واتە: چاکترین باوەڕ ئەوەیە کە بزانیت لە هەر کوێیەك بیت خوا لەگەڵتە.

لە فەرموودی (قودسی)دا هاتووە: **(يقول الله عز وجل: أنا مع عبدي إذا ذكرني، وتحركت بي شفتاه)** واتە: خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ دەفەرمووێت: من لەگەڵ بەندەکەم

---

[1] جامع العلوم والحكم ١/١٢٦-١٢٧.

[2] جامع العلوم والحكم، سەرچاوەی پێشوو.

لە پەراوێزی: جامع العلوم والحكم ١/ ١٢٧ هاتووە: (فەرموودەی زەیدی کوڕی ئەرقەم ئەبو نەعیم گێڕاویەتیەوە لە کتێبی "الحليه ٨/ ٢٠٢" بە بێژەی: خوا بپەرستە وەك ئەوەی دەیبینیت...و فەرموودەی: نوێژ بکە وەك بەڕێکەر... تاد، تەبەڕانی لە کتێبی (الأوسط)دا لە ئەنەسەوە هێناویەتی، هەروەك لە کتێبی "مجمع الزوائد ١٠/ ٢٢٩" هاتووە کە بەشێکە لە فەرموودەیەکی عەبدوڵای کوڕی عومەر نەك لە فەرموودەی ئەنەس، هەروەك هەیسەمی و جگەلەویش وا دەڵێن. هەیسەمی وتویەتی: کەسی وا لە زنجیرە "سەنەد"ی فەرموودەکەدا هەیە من نایانناسم).

دام هەر کاتێك یادم بکات و باسی منی لەسەر لێوان بێت.

بەهەمان شێوە لە فەرموودەیەکی تری (قودسی)دا هاتووە: (**يقول الله عز وجل: أنا مع ظن عبدي بي، و أنا معه حيث ذكرني، فإن ذكرني في نفسه ذكرته في نفسي، وإن ذكرني في ملأ ذكرته في ملأ خير منه، وإن تقرب مني شبراً تقربت إليه ذراعاً، وإن تقرب مني ذراعاً تقربت منه باعاً، وإن أتاني يمشي أتيته هرولة**). واتە: خوای باڵادەست و خانەون شکۆ دەفەرموویت: من لە ئاست گومانی بەندەی خۆمم، لەگەڵی دام تا لە هەر کوێیەك یادم بکات، ئەگەر لە دەروونی خۆیدا یادم بکات، من لەلای خۆم یادی دەکەم، ئەگەر لە ناو دەستەیەکدا یادم بکات. یادی دەکەم لە ناو دەستەیەکی چاکتر لە دەستەکەی ئەو، ئەگەر یەك بست لێم نزیك ببێتەوە، باڵێك لێی نزیك دەبمەوە، ئەگەر ئەو باڵێك لێم نزیك ببێتەوە. ئەوا من شاباڵێك لێی نزیك دەبمەوە، ئەگەر بە ڕۆیشتن بەرەو من بێت من بە نیمچە ڕاکردن بۆی دێم.

هەر کەسێك ئەم حاڵەتە بەرپا بکات، لەو کاتەی زیکرو یاد و پەرستشی خوا دەکات. ئەوا دڵگوشاد و دەروون پاراو دەبێت بەخوای مەزن. ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم وتی: (بەرزترین پلە کەنارگرتنە بۆ خوا، دڵگوشاد و هۆگری ببیت بە دڵ و عەقڵ و ئەندامەکانت، تا وای لێدێت تەنها ئومێدت بە خوا بێت، مەترسیشت تەنها لە گوناهەکانت بێت).

مەعروفی کەرخی وتویەتی: (پشت بەخوا ببەستە تاوای لێدێت دەبێتە هاومەجلیس و هۆگرو تەنانەت ئەو لایەنەی کە سکاڵای خۆتی لەلا دەکەی)[1].

---

[1] جامع العلوم و الحكم ١/١٣٠-١٣٤، و لێکۆڵەر (محقق)ی کتێبی ناوبراو ئەو فەرموودانەی دەرهێناوەو لە پەراوێزی لاپەڕە ١٣١ و وتویەتی:

فەرموودەی: من لەگەڵ بەندەکەم دام هەر کاتێك یادم بکات... تاد، لە فەرموودەی ئەبوهورەیرە: ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا و بوخاری لە بەدیهێنانی کردەوەکان و ئیبم ماجەش گێڕاویانەتەوەو ئیبن حەبان بەڕاست و دروستی داناوەو حاکم و زەهەبیش بەهەمان شێوەی پشتی ڕای ئیبن حەبانیان گرتووە.

# دەروازەی دووەم

## گرنگی ئیمان و باوەڕ لە ژیاندا

باوەڕبوون بە خواو پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) شوێنەوارو کاریگەری گـەورەی هەیە لەسەر ژیانی موسڵمان. لە تاریکیەوە بـەرەو ڕوونـاکی دەیگوازێتــەوە، ژیـانی جیـا دەکاتەوە لەگەڵ ژیانی کەسێکی بێ باوەڕو هاوبەشدانەر. ئەمەش لەم خاڵانەی خـوارەوەدا بەدەر دەکەوێت:

١- باوەڕ بوون بە خوای پاك و بەرز، باوەڕ بوون بە یەکتایی خـوا ئەمــەش وادەکـات کـە مرۆڤــ بزانێت کە ئاسمانەکان و زەوی لە ژێر سەرپەرشتی پەروەردگاردان، خوای گـەورە چاودێریان دەکات و بەڕێوەیان دەبات و ڕزق و ڕۆزییان بۆ دابـین دەکـات، ئـەوە فێـری مرۆڤـــی باوەڕدار دەکات کە شتێك لەم بوونەدا نییــە کـە بـوونێکی سـەربەخۆی بـێ نیازی هەبێت.

کەسی هاوبەشدانەرو بێ باوەڕ ئەم جۆرە وتە و بۆچوونانە دەرنابڕێت.

٢- باوەڕ بەخوا بوون، سەربلّندی و ڕێزداری لــە دەروونــدا دروســت دەکـات. هـەر خـوای گەورە خاوەن توانا و هێزە، هیچ زیانگەیەنەر، سوودگەیەنەر، ژیێنەرو مرێنەر، بێجگە لە خوای گەورە نییە، بۆیە مرۆڤـــی باوەڕدار سەری کـەچ ناکـات بـۆ هــیچ کەسـێك، لەکەس ناپاڕێتەوە، لە شکۆی کەس ناترسێت بێجگە لە خوای گەورە.

مرۆڤـــی هاوبەشدانەرو بێ دین بۆچوونی وایە، کە جگە لە خوای گـەورە کەسـانی تـر

---

فەرموودەی: من لە ئاست گومانی بەندەی خۆمم... تاد، ئەمە لە فەرموودەی ئەبو هورەیرەیە: ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا و بوخاری و موسلیم و ترمذی و ئیبن ماجە گێڕاویانەتەوەو ئیبن حەببان بە ڕاست و دروستی داناوە.

حديث: أنا مع عبدي إذا ذكرني ... إلخ: رواه من حديث أبي هريرة، أحمد في مسنده والبخاري في خلق الأفعال العباد وابن ماجه وصححه ابن حبان، والحاكم ووافقه الذهبـي.

هەن، توانای سوود و زیان گەیاندنیان هەیە، بۆیە لە غەیری خوای گەورە دەپارێتەوەو لێی دەترسێت.

٣- ئیمان و باوەڕ خۆ بەکەمزانی، خاکی بوون لە دەروونی مرۆڤدا دروست دەکات. باوەڕدار شانازی بە ماڵ و سەروەت و سامان و سەربڵندی و لێهاتووی خۆی ناکات، بەڵکو دەڵێت: ئەمە بەخششێکی خوایە.

بەپێچەوانەی مرۆڤی بێ دین، هەر کە بەخشش و نیعەمەتێکی هەنووکەیی و خێرای پێدرا، خۆی بەگەورە دەزانێت و لووتی بەسەر ئەوانی تردا بەرز دەکاتەوە.

٤- ئەو مرۆڤەی باوەڕی بە یەکتایی خوا هەیە، دیدو تێڕوانینی وایە کە سەرکەوتن و بەرەو پلەی باڵاچوون تەنها لە ڕێگەی پاکسازی دەروون و کردەوەی چاك و چاکەکاری و پارێزگارییە.

بەڵام مرۆڤی هاوبەشدانەر دەڵێت: کوڕی خوا بووەتە قوربانی گوناهەکانمان یان ئێمە کوڕو خۆشەویستی خواین، بۆیە بەهۆی تاوانەکانمان سزامان نادات، داوای تکا لە گەورەو پارێزگارەکانمان دەکەین یاخود نەزرو قوربانی بۆ خواکانمان دەکەین.

تاکی بێ دینیش دەڵێت: لەبارەی کردەوەکانمان پرسیارمان لێ ناکرێت، هەوەس و ئارەزووی نەفس و دەروون خوای ئەوانەیە.

٥- باوەڕدار بێ هیوا نابێت، بەڵکو دڵنیا و بەهیوایە و دەروونی پڕە لە ئارامی و ئومێد، ئەگەرچی سوکایەتی پێ بکرێت و سزاش بدرێت.

بەڵام مرۆڤی هاوبەشدانەرو بێ دین: دڵی بەرگەی ناخۆشییەکان ناگرێت، لەوانەیە بێ ئومێدی بەرەو خۆکوشتن بیانبات.

٦- باوەڕدار خاوەن هێزێکی گەورەیە لە خۆڕاگیری و بەرەو پێشڤەچوون، ئارامگرتن و پشت بەخوا بەستن، جا ئەگەر دادوەر بوو تەنها ئامانجی بەرپاکردنی دادگەری و ڕەزامەندی خوایە، چونکە هێزێکی باڵای لە پشتەوەیە، پشتی دەگرێت و چاودێری و ڕێنوێنی دەکات.

بەڵام هاوبەشدانەرو بێ دین: چاوەڕێ ناکرێ ئەو هێزەی ببێت، ئەو کاتە ئەو خـۆڕاگری و پشت بەخوا بەستنەی نییە کە باوەڕدار هەیەتی.

٧- بڕوادار خاوەن بوێری و نەبەردی و چاونەترسیەکی زۆر گەورەیە. چونکە ئەوەی مرۆڤــ سوك و ڕیسوا دەکات دوو شتە:

أ- خۆشویستنی خۆی و ماڵ و سەروەت و خانەوادە.

ب- باوەڕ بوونی بەوەی جگە لە خوای گەورە یـەکێك هەیـە بیمرێنێـت، لەبـەر ئەمـە توانای هەیە کە بە فێڵ و تەڵەکەیەك خۆی لە مردن بدزێتەوە.

باوەڕدار بـڕوای بـەوە هەیـە کـە خـاوەنی مـاڵ و سـەروەت و سـامان و تەنانـەت خانەوادەو خودی خۆیشـی خـوای گەورەیـە، تـەنها خـوای گـەورە دەیمرێنێـت بـەو سەرەمەرگەی بۆی دیاریکردووە، بۆیە لەو کاتە لە هیچ کەس و جەنگێك ناترسێت، بەم پێیە هیچ کەسێك بوێرو چاونەترس نابێت لە باوەڕدار. بەپێچەوانەی کەسی بـێ دین و هاوبەشدانەر، کە لە پێکدانانی هێزەکان و توانای دوژمن دەترسێت.

٨- باوەڕ ئاست و ڕێزو پلەی مرۆڤــ بەرز دەکاتەوە، دەروون بەرزی و دڵنیایی و قەناعەت و بێنیازی تێدا دەڕوێنێت و دڵی پاك دەکاتەوە لە هەڵپە و ئارەزوو و سۆزداری پڕوپـوچ و خەسڵەتە ناشرینەکانی تر، ڕزق و ڕۆزی تەنها بە دەستی توانستی خوایە، سەرکەوتن و دۆڕان تەنها لە خواوەیە.

بەڵام کەسی بێ دین و هاوبەشدانەر بەندی ئارەزوو و خراپەیە، هەموو خواستی بریتییە لە بەدەستهێنان بە ڕێگەی ڕەواو ناڕەوا.

٩- باوەڕ مرۆڤــ دەبەستێتەوە بە یاسـا و ڕێسـاکانی خـواو وایـان لێـدەکات پارێزگـاری لێبکەن. ئەگەر موسڵمان ڕۆژو شەو بە تەنها بوو ئەوا دەزانێت کە چـاوێرێك چـاودێری دەکات و لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکات لەسەر شتی وردو درشت، بۆیە خێرا بەرەو چـاکە

دەچێت، فەرمان دەکات بە چاکە. ڕێگریش دەکات لە خراپە. ئاراستەکار و ڕێنـوێنی کارە دەروونیەکەی لەسەر چاکە هانی دەدات و ڕێگری لێ دەکات لە هەر خراپەیەك. بەڵام بێ دین و هاوبەشدانەر ئەم دیدو تێڕوانینەی نییە[1].

[1] مبادء الإسلام ٧١-٧٧.

## بەشی چوارەم

## خواناسی (الإلهيات)

**سێ دەروازەیە:**

**دەروازەی یەکەم:** بوونی خوای گەورەو بەڵگەکانی، ڕێکەوت، هۆکاری لادان و گومڕایی.

**دەروازەی دووەم:** ناوە چاك و جوان و پیرۆزەکانی خودا.

**دەروازەی سێیەم:** سیفاتەکانی خوا، ئەو شتانەی لەسەری کەڵەکە دەبن.

**یەکەم:** سیفەتە پێویستەکانی خوا:

سیفەتی خودی (نفسی): کە سیفەتی بوون (وجود)ە.

سیفەتە پێچەوانەکان (سلبی): لەمێژینە (القدم)، هەرمان (البقاء)، پێچەوانەی پەیدابوان (المخالفة للحوادث)، بەخۆوە ڕاوەستان (القیام بالنفس)، تەنهایی (الوحدانیة).

سیفەتە واتاییەکان (معانی): توانا (القدرة)، ویست (الإرادة)، بیستن (السمع)، بینین (البصر)، زانست (العلم)، دوان (الکلام)، ژیان (الحیاة).

**دووەم:** ئەو شتانەی بۆ خوای گەورە نەبوو و ئەستەمن.

**سێیەم:** ئەو شتانەی بۆ خوای گەورە دروستن، بینینی خوا.

قەزاو قەدەر.

# دەروازەی یەکەم

## بوونی خوای گەورەو بەڵگەکانی

باوەڕ بوون بە خوای پاك و پیرۆز، بنەمای یەکەمە لە بنەماکانی ئیمان، کە لە فەرموودەکەی جبریل هاتووە: **(أن تؤمن بالله...)** واتە: باوەڕ بێنیت بە خوا. هەروەها بنچینەی یەکەمە لە بنچینەکانی ئیسلام، هەروەك لە فەرموودەی ناوبراودا ئاماژەی پێکراوە: **(أن تشهد أن لا إله إلا الله...)** واتە: شایەتی بدەیت کە هیچ پەرستراوێك نییە جگە لە خوای گەورە. باوەڕ بوون بەخودا بناغەی سەرەکی سەرجەم باس و بابەتەکانی بیروباوەڕە.

لەبەر ئەمەبۆیە ئێمە دەچینە سەر باسەکانی بوونی خوا و سیفاتەکانی، لەمەشدا پشت بەو دوو ڕێگەیە دەبەستین کە سەر دەکێشێت بۆ دڵنیایی گومان بڕ:

**یەکەمیان:** پشت بەستن بە بەڵگەی نەقڵی و بیستراو لە: قورئانی پیرۆز، هەروەها سوننەتی بەپێزی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم). فەرمایشتە لاوازەکانیش فەرامۆش دەکەین.

**دووەمیان:** تێڕوانینی عەقڵی بێ لەکە و تەندروست، کە بناغەی لێکۆڵینەوەکانمانە لە بابەتی بیروباوەڕدا.

بەم شێوەیە بیروباوەڕی ئیسلامی دائەکوترێ و جێگیر دەبێت لە دەروونـدا لەسەر بناغەیەکی توندو تۆڵ، ئەو بناغەیەش پشت دەبەستێت بە بەڵگەی دڵنیاکەرەوەو سەلمێنراو کە مشتومڕ هەڵناگرن.

### بوونی خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ

دوای وردبوونەوەو ڕامان لە وردو درشتی کایەکانی بوونەوەر، زۆربەی خەڵکی باوەڕیان

بەخوای باڵادەست و خاوەن شكۆ هێنا، ئەمەش پاش ئەوەی عەقڵی خۆیان كردبووە دادوەر و دووریان خستبووەوە لە هەواو هەوەس.

گومڕابووەكان نكۆڵیان كرد لە بوونی خوا، بەپاساوی بانگەشە كردن بۆ ئازادی عـەقڵ، بە بەڵگەی ئەوەی هەستەكان پـەییان بـە خـوای گـەورە نـەبردووە، غـەیب پشـتی پـێ نابەسترێت لە چەسپاندنی بوونی خوادا...

بۆیە زانایان بەرپەرچی نكۆڵی كارانیان دایەوە، بە چەندەها بەڵگەی ڕاشكاوی نـەقڵی و عەقڵی، كە بوونی خوا بۆ ئەو كەسەی ژیرەو شتی لێكدەر دەكـات دەسـەلمێنێت، ئـەوەش دەسەلمێنێت كە خوای گەورە هۆكاری بوونی ئەم بوونەیە.

ئەمانەش گرنگترین ئەم بەڵگانەن:

## بەڵگەكانی بوونی خودا

زانایان چەندەها بەڵگەیان هێناوەتەوە لەسەر بوونی خـودا، وەك: بەڵگـەی پەیـدابوون، بەڵگەی پێویست بوون، بەڵگەی چاودێری و داهێنان، بەڵگەی بوونی، بەڵگەی ڕەوشتی.

### بەڵگەی یەكەم: بەڵگەی پەیدابوون

زانایانی كەلام ئەم بەڵگەیەیان لەسەر دوو پێشەكی دامەزراندووە:

**پێشەكی یەكەم:** جیهان بەدیهێنراو و پەیدابووە.

**پێشەكی دووەم:** هەر بەدیهێنراوێك پێویستی بە بەدیهێنەر هەیە.

**دەرەنجام:** ئەم جیهانە پێویسـتە بەدیهێنـەرێكی هـەبێت تـا بـەدیبهێنێت[1]، واتـە: بوونەكەی بەسەر نەبوونەكەی دا زاڵ بێت[2]، ئەویش خوای پاك و بەرزە.

---

[1] شرح الخريدة البهية للدردير ٤٤.
ئەم دوو پێشەكییە لەم سەرچاوانەدا هەن: إحياء علوم الدين للغزالي، بشرحه إتحاف السادة للزبيدي ٢/٩٠ والمواقف ٢/٨ والمسايرة لإبن همام، وشرحه المسامرة لإبن أبي شريف ١٧ وشرح الجوهرة للباجوري ١٠٤. سەیری: المطالب العالية للرازي ١/٢٠٠. بكە.

[2] المسامرة لإبن أبي شريف، سەرچاوەی پێشوو.
جیهان: بریتییە لە غەیری خوا، كە بوونەوەرە.

بۆ ئەوەی دروستی ئەو دەرەنجامەمان بۆ دەرکەوێت، ئەوا پێویستە بەڵگە بێنینەوە لەسەر دروستی هەردوو پێشەکیەکە.

## بەڵگەی پەیدابوونی جیهان

بریتیە لە گۆڕانی جیهان لە بارودۆخێکەوە بۆ بارودۆخێکی تر، کە دەکرێت بەم شێوەیە بیخەینەڕوو:

جیهان پێکهاتووە لە کرۆکەکان (جواهر) و ڕووپۆشەکان (أعراض).

هەر کرۆك و ڕووپۆشێك لە گۆڕاندایە.

کەواتە جیهان لە گۆڕاندایە[1]، گۆڕان بەڵگەی پەیدابوونە.

---

بەدیهێنراو و پەیدابوو: بریتییە لە هەر شتێك کە نەبووە و پاشان بەدیهێنراوە. بۆیە بە بەدیهێنراو ناونراوە، چونکە بەدیهاتووەو پەیدابووە پاش ئەوەی کە نەبووە، ئەمەش بەهۆی هۆیەك کە بەدیهێناوەو پەیدای کردووە./ المسامرة لابن أبي شريف، وإتحاف السادة، سەرچاوەی پێشوو.

پێناسەکەی جیهان لەم سەرچاوانەدا هاتووە: العقيدة النظامية للجويني ١٢٩ والإنصاف للباقلاني ٣٠ والتمهيد للامشي ٤٥ وتبصرة الأدلة ٤٤/١.

[1] شرح الخريدة البهية للدردير ٤٤-٤٥. سەیری ئەمانەش بکە: المسايرة لإبن همام، وشرحه المسامرة لإبن أبي شريف ١٨. ئەبو موعینی نەسەفی باسی کردووە: (جیهان لەلایەن سەرجەم زانایانی کەلام سێ بەشە: کرۆکەکان "جواهر" و جەستە و ڕووپۆشەکان "أعراض". ئیمام ئەبو مەنصوری ماتوریدی ڕازی نەبووە بەو جۆرە دابەشە، چونکە پێی وابووە تێکەڵیەکی تێدایە، بۆیە وتویەتی: جیهان دوو بەشە: خودەکان "أعيان" و ڕووکەشەکان "أعراض". خودەکانیش دوو بەشن: نا پێکهاتوو "غير متركبة" کە لەلای زانایان بە کرۆکەکان ناسراوە، پێکهاتوو "متركبة" کە لەلای زانایان بە جەستەکان ناسراوە، بەم پێیەش دەڵێت هەر جەستەیەك کرۆکە)./ تبصرة الأدلة ٤٤/١-٤٥.

کرۆك (جوهر): بریتییە لەوەی کە پشت بەخۆی دەبەستێت و بەخۆوە ڕاوەستاوە.

ڕووپۆش (عرض): بریتییە لەوەی سەربەخۆ نییە و پشت بە جگەلە خۆی دەبەستێت وەك: شیرنی، دەنگ، ڕەنگەکان، ساردی، ڕەقی. هەندێکیان بە عەقڵ پەییان پێدەبرێت، وەك: توانا، ویست، زانست./ شرح الخريدة للدردير ٤٣ وشرح الصاوي عليه.

جوەینی لە (الإرشاد ١٧) وتویەتی: (کرۆك "جوهر" بریتییە لەوەی شوێنێك داگیر دەکات، هەر شتێك شوێنێك داگیر بکات کرۆکە، ڕووکەشیش ئەو شت و واتایەیە کە بوونی وەستاوەتە سەر

ڕووپۆش (عرض)ەکان بەدیهێنراون بە بەڵگەی:

أ- گۆڕانی لە نەبوون بۆ بوون، بە پێچەوانەوە لە بوونەوە بۆ نەبوون، ئەمەش:

یان بە بینین وەك: جوڵان دوای وەستان، ڕووناکی دوای تاریکی، ڕەشی دوای سپێتی، گەرمی دوای ساردی، هاوشێوەو پێچەوانەی ئەم شتانە.

یان بە بەڵگە، ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەو شتەی کە بەردەوام بە ڕاوەستاو بینراوە وەك: چیاکان، دەکرێت بەهۆی بومەلەرزەوە بجولێت[1].

ب- پێویست بوونی بە زاتێك کە کاتی بەدیهاتنی دیاری بکات، چ پێش بوونی و چ دوای بوونی، ئەوا پێویستی بە پەسەندکەرێك هەیە کە وابکات لەو کاتەدا بەدیبێت، چونکە پەسەند کردن (ترجیح) بەبێ پەسەندکەر (مرجح) شتێکی نەشیاو نەبووە.

پ- پێویست بوونی بە جەستەیەك تا پێی هەڵسێت[2].

کرۆك (جوهر)یش بەهەمان شێوە بەدیهێنراون، لەبەر ئەوەی:

کرۆکیش پەیوەستە بە ڕووپۆشەوە لێی جیا نابێتەوە، بێ جوڵە و ڕاوەستان و ڕەنگ نابێت، هەروەك پێشتر باسمان کرد ڕووپۆشەکانیش بەدیهێنراون، ئەو شتەی پەیوەست بێت

---

کرۆك وەك: ڕەنگەکان، خواردنەکان، بۆنەکان، ژیان، مردن، زانستەکان، ویستەکان، ئەو توانایەی بەهۆی کرۆکەوە هەیە). هەروەها لە (الإرشاد ٢٣) وتویەتی: (کرۆکەکان "جواهر" لە زاراوەی خوانەناسان - فەیلەسوفەکان - بە هیۆلی و ڕووکەشەکان بە "أعراض" ناودەنرێن).

جەستە: ئەوەیە کە لە دوو کرۆك "جوهر" یان زیاتر پێکهاتووە./ المسامرة لإبن أبي شريف، سەرچاوەی پێشوو. و سەیری: تمهيد الأوائل ٣٧ والإنصاف للباقلاني ١٦ والإرشاد للجويني والتمهيد للامشي ٤٦.

هەندێك کرۆکەکان بە جەستەکان ناودەبەن وەك (ئیبن هەمام) لە زمانەوانیدا یەك مانایان هەیە./ المسامرة لإبن أبي شريف ١٨.

[1] شرح الخريدة للدردير والمسامرة لإبن أبي شريف، دوو سەرچاوەکەی پێشوو. و سەیری ئەمانەش بکە: تمهيد الأوائل والإنصاف، سەرچاوەی پێشوو. وشرح الجوهرة للباجوري ٨٨ وشرح أم البراهين للسنوسي والدسوقي عليه ١٥١.

[2] المسايرة لإبن همام، وشرحه المسامرة لإبن أبي شريف، دوو سەرچاوەکەی پێشوو.

بە شتی بەدیهێنراو بەهەمان شێوە بەدیهێنراوە.

ئەگەر سەلمێنرا کە کرۆك و ڕووپۆشەکان بەدیهێنراون ئەوا ئەو جیهانەی کە لەو دوانە پێکهاتووە بەهەمان جۆر بەدیهێنراوە[١].

بەم شێوەیە پێشەکی یەکەممان بۆ سەلمێنرا کە: (جیهان بەدیهێنراوە).

**بەڵگە لەسەر ئەوەی هەر بەدیهێنراوێك پێویستی بە بەدیهێنەرە:**

ئەگەر شتێکی دروستکراو دورست بوو بەبێ دروستکەر، ئەو کاتە پێویست دەبوو کە شتە دروستبووەکە خۆی خودی خۆی دروست کردبێت، دەبێت یەکێك لە دوو لا یەکسانەکە - واتە: بوون یان نەبوون - بەسەر ئەوەی تردا پەسەند بکرێت بەبێ هۆ، ئەمەش ئەستەمە[٢].

ئەگەر شتێك پەیدابوو بەبێ پەیداکەر، ئەوا پێویست دەبوو بوونەکەی پەسەند و زاڵ ببێت بەسەر نەبوونەکەیدا بەبێ ئەوەی پەسەندکەرێك هەبێت، شتێکی بەڵگە نەویستە کە ئەمە ئەستەمە.

واتای پەسەند کران بەبێ پەسەندکەر: بریتیە لەوەی شتێك لە ئاڕاستەیەکی دیاریکراو بڕوات، دواتر لە ئاڕاستەکەیدا دەربچێت و لابچێت بەبێ بوونی هیچ بگۆڕێك پوچەڵیەکەی دیارە، چونکە هەموو عەقڵمەندان دەزانن کە بۆ لادان و گۆڕانی شتێك لە بارو حاڵەتی پێشووی ئەوا پێویستی بە بگۆڕو کارتێکەرێك هەیە، تا ئەو بارودۆخ و حاڵەتە نوێیەی بەسەردا بسەپێنێت و حاڵەتە کۆنەکە لەناو ببات. ئەگەر تایەکانی تەرازو بەیەکسانی ڕاگیر کران کە هیچ لایەك شتێکی گرانی تێدا نەبێت، ئا لەو کاتەدا واگومان ببەیت لایەك پەسەند و گران بووە بێ هیچ کاریگەرییەکی دەرەکی وەك: پاڵدانی هەوا یان کەوتنە

---

[١] شرح الخريدة للدردير ٤٥.

[٢] شرح الخريدة للدردير ٤٥، و وتویەتی: ، (ئەمە بەڵگەی ناودارە لەلایەن ئەوان، لەبارەی ڕوونکردنەوەی پەیدابونی جیهان و پێویست بوونی بە بەدیهێنەر)، سەیری: ٥١ و حاشية الصاوي عليه. بکە.

خوارەوەی بەرد... ئەگەر بەخەڵکی ڕاگەیاندرا کە ئامێری ڕادیۆ هەواڵی جیهانی پێدای بەبێ ئەوەی کاز بە دەمەوانە (صمام)ەکەی بکەیت، ئەوا پێت پێ دەکەنن و تەنانەت بەزەییان پێتدا دەهاتەوە.

بەم پێیە دەڵێین: بەرلەوەی جیهان بێتە خانەی بوونەوە ئەوا نەبوون باڵی کێشابوو بەسەریدا، بۆیە نەبوون (عدم) پەسەندترە لە بوون (وجود)، لەبەر ئەوەی نەبوون پێش بوون بووە، بەڵام کاتێك ئەو جیهانە دروستکرا ئەوا بوونەکەی بەسەندتر بوو لە نەبوونەکەی، جا بوون و نەبوون دوو شتی یەکسانن، و پەسەند کردنی یەکێك بەسەر یەکێکی تردا بەبێ پەسەندکەر ئەوا شتێکی بەڵگە نەویستە کە ئەستەم و پوچەڵە.

وتنی ئەوەی کە نەبوون گۆڕاوە بۆ بوونی جیهان بەبێ ئەوەی ئەو بوونە هۆکارێکی هەبێت، ئەوە وەك بانگەشەکەی خاوەن تەرازو ڕادیۆکە پوچەڵ و ئەستەمە[1].

بەم شێوەیە پێشەکی دووەمیشمان بۆ دەسەلمێنرێت، کە بریتییە لەوەی: (هەموو بەدیهێنراوێك پێویستی بە بەدیهێنەرێك هەیە).

## بەڵگەی دووەم: بەڵگەی پێویست بوون (الوجوب)

بەدیهێنەری ئەم بوونەوەرە، یان حوکمەکەی پێویست (واجب) یان ئەستەم (مستحیل) یاخود شیاو (ممکن)ە. هەموو شتێك دەبێت یەکێك لەو سێ حوکمەی پێشوی بەسەردا بچەسپێت و حوکمی چوارەمی بۆ نییە، چونکە ئەمانە بەشەکانی حوکمی عەقڵین[2].

---

[1] كبرى اليقينيات الكونية سالی ١٣٩٠ك، ٨١ و٨٣. شرح الخريدة للدردير ٤٥. بڕوانە: (پەسەند كران بەبێ پەسەندكەر) لە: المطالب العالية للرازي ٧٥/١ ولاپەڕەكانی دواتری.

[2] حوكم: بریتییە لە چەسپاندنی شتێك یان نەهێشتنی، ئەمەش بەهۆی: شەرع یان داب و نەریت و عادەت یاخود عەقڵ دەبێت، كەواتە دەبێتە سێ بەش:

١- حوكمی شەرعی: (هۆی چەسپاندنی شەرعە)، وەك چەسپاندنی واجبێتی نوێژ.

٢- حوكمی ئاسایی و عادەتی (العادي): (هۆی چەسپاندنی بریتییە لە نەریت و عادەت و ئەزموون) وەك چەسپاندنی سیفەتی سوتاندن بۆ ئاگر.

١- ناکرێت بەدیهێنەری جیهـان شـتێك بێـت کـە شـیاوی نـەبوون و بـوونی ئەسـتەم (مستحیل) بێـت، چـونکە شـتی نەشـیاو و ئەسـتەم، هـەرگیز ناتوانرێـت بـوونی ئەندێشە بکرێت، چونکە نەبووی ڕووتە (عدم محض)، کەواتـە بەدڵنیاییـەوە کەسـێ شتێکی نەبێت پێی نابەخشرێت، جا چـۆن شـیاوی نـەبوون و ئەسـتەم (مسـتحیل) دەبێتە سەرچاوەیەك بۆ بوون؟

٢- ناکرێت و دروست نییە بەدیهێنەری جیهان شیاوی بوون (ممکن) بێت، چونکە تەنها کاتێك شیاوی بوون (ممکن) دێتە بوون کە هۆی بوونی هەبێت، جا ئەگەر هاتوو ئەو

---

٣- حوکمی عەقڵی: (هۆی چەسپاندنەکەی عەقڵە)، وەك چەسپاندنی سیفەتی جـووتی بـۆ ژمـارە (٢) و (٤) .... و حـوکمی عـەقڵی کۆڵەگـەی سـەرەکییە لـە لێکۆڵینەوەکـەمان لـە بـواری عەقیدەدا.

**حوکمی عەقڵی:**

دابەش دەبێت بۆ: ١- پێویست (واجب) ٢- ئەستەم (مستحیل) ٣- شیاو و دروست (ممکن و جائز).

١- پێویست (واجب): بریتیە لەوەی کە چەسپاوەو نەبوون قبوڵ ناکات یـاخود بریتیـە لـەوەی کـە عەقڵ ئەندێشە و تەصەوری نەبوونیەکەی ناکات. وەك پێویست بونی توانا بۆ خوای گـەورە، و پێویست بوونی سیفەتی جووتی بۆ (٤).

٢- ئەستەم و نەبوو (مستحیل): بریتیە لەو شتە نەبوەی کە لـە شـیاوی بـوون و چەسـپانی نیـە، چونکە ناکرێت هەرگیز ببێت، هەرگیز ناتوانرێت ئەندێشە بکرێت کە ببێت یاخود بریتیە لەوەی کە عەقڵ ئەندێشە و تەصەوری بوون وپەیدابوونی ناکات. وەك چەسپاندنی هاوبەش بۆ خوا، و پێشکەوتنی کوڕ بەپێش باوکی لە بووندا.

٣- شیاو و دروست (ممکن و جائز): ئەوەیە کە جارێك بوون و جارێکی تـر نـەبوون قبـوڵ دەکـات بەڵام لە دواییەك. بریتیە لەوەی کە لە عەقڵدا بـوون و نـەبوونی وەك یەکـە، ناهێتـە خانـەی بوونیش مەگەر بەهێزێکی پەسەندکەر نەبێت. وەك بوونی بەهەشت. و بوونی تـۆ ئێسـتا لـەم ژوورەدا)/ السنوسیة و شرحها للبـاجوري ٣٤ وشـرح أم الـبراهین للسنوسـي وحاشـیة الدسـوقي علیه ٣٠ وشرح الخریدة للدردیر وحاشـیة الصـاوي علیـه ٢٩-٣٣ و ٣٨-٤١ والمعتقـد المنتقـد ١٣-١٥ والكلیات للكفوي ٣٨٠.

هۆیەش چووە خانەی شیاوی بوون ئەوا لەوکاتەدا پێویستی بە هۆیەکی تر هەیە ... تاد بەم شێوەیە. ئەمەش خول (دور) و زنجیرەیی (التسلسل) پێویست دەکات، کە هەردووکیان پوچەڵن، هەروەك ڕوونیان دەکەینەوە پاش کەمێکی تر، جا هەر شتێکیش سەر بۆ ئەم دوانە بکێشێت ئەوا پوچەڵە، بەم پێیە پێویست بوو کە بەدیهێنەری ئەم جیهانە شیاوی بوون نەبێت.

٣- ئینجا کە سەلمێنرا و چەسپا بەدیهێنەری ئەم جیهانە نە شیاوی نەبوون و ئەستەم (مستحیل)ە و نە شیاوی بوون (ممکن)ە، ئەوا پێویست دەکات کە بەدیهێنەری ئەم جیهانە پێویستە بوون (واجب الوجود) بێت. کە بوونی نەوەستێتە سەر هۆیەك، بەڵکو هۆی هەموو هۆکارەکانە و هۆی بوونی جیهانە[١].

---

[١] بڕوانە: المواقف و شرحه للسيد الشريف ٤/٨ و حاشية الدواني و الكلنبولي عليه ٢٢٧/١ و شرح الجوهرة للباجوري ١٠٤ ونهاية الإقدام ١٥ و الرازي مفسرا ٢٨٢.
واتای چەمکی پێویستە بوون (واجب الوجود): بریتییە لەوەی کە هەرگیز نەبوونی باڵی بەسەردا ناکێشێت، هەر گیز نەبوون قبوڵ ناکات بە ئەزەلی و هەتا هەتایی./ شرح الجوهرة للباجوري ٤٧/١ و شرح الخريدة للدردير ٥٥.
ڕازی باسی کردووە کە زانایانی کەلام ڕاڤەی ئەوەی پێویستە بوونە بە خودی خۆی کردووە بە سێ شت:
أ- بەخودی خۆی شیاوی بوونە. ئەمەش واتای ئەوەیە زاتی ئەو هۆی بوونی ئەوە.
ب- نەبوونی بەسەردا نایەت یان ئەو زاتەیە کە نەبوون بۆ ئەو ئەستەمە.
پ- بوونی ئەو نەوەستاوەتە سەر هۆیەکی جیا لە خۆی یاخود بوونەکەی هۆدار نیە بە هۆیەکی جیاواز./ المطالب العالية للرازي ٢٨١/١.

## مانای خول (دور) و بەڵگەی پوچەڵیەکەی

خول ( الدور ): بریتییە لەوەی دوو شت هەبن و هەر یەکەیان هۆکاری بوونی ئەوی تر بێت[1]. وەك: ئەو وتەیەی کە دەڵێت: زەید عەمری بەدیهێناوەو، عەمریش زەیدی بەدیهێناوە.

بوونی هەریەك لە زەید و عەمر دەوەستێتە سەر ئەوی تر. ئەمەش خولی پوچەڵە[2]، بەڵکو هەر دووکیان هەر بە نەبوو دەمێننەوە تا هێزێکی کاریگەری دەرەکی کاریان تێدەکات.

### بەڵگەی پوچەڵی خول (دور):

پێویست دەکات کە هەر یەکێك لەو دوانە پێش ئەوەی تر بکەوێتەوە، واتە لەیەك کاتدا لە پاش و لەدوای هاوەڵەکەیتی.... ئەمەش مانای وایە کە شتەکە پێش بوونی خۆی هەبوو بێت تێکگیران و دژیەکبوونە[3].

---

[1] المواقف و شرحه للسيد الشريف ٤/١٥١ والمقاصد للتفتازاني ١١٢/٢ وشرح الخريدة للدردير ٥٦ وشرح الخريدة للباجوري ١٠٥ وشرح أم البراهين للسنوسي ١٥٥ والمطالب العالية ١٣٦ والمحصل للرازي ١٤٩ وكشف المراد ١١٧ والوسيلة في شرح الفضيلة ٤٦١.

[2] شرح الجوهرة للباجوري ١٠٥.

خولی پوچەڵ وەك یەکە چ: لە یەك پلەدا بێت، کە پێی دەوترێت (خولی ڕاشکاو)، وەك (أ) دەوەستێتە سەر (ب) و بەپێچەوانەوە.

یان لە چەند پلەیەکی جیاوازدا بن: کە ناو دەبرێت بە (خولی نادیار) وەك (أ) دەوەستێتە سەر (ب) و (ب) لەسەر (ج) و (ج) لەسەر (أ).

سەیری: التعريفات ٩٤ وشەی (الدور) بەم واتایە هاتووە لە: مقاصد الطالبين و شرحه لسعد الدين للتفتازانى ١١٢/٢ ومفتاح الباب ٨٦.

[3] المواقف ١٧٧ و المقاصد ٤٨/١ والدردير على الخريدة ٦١ و الباجوري على الجوهرة ٤٨/١ و الوسيلة في شرح الفضيلة للشيخ عبدالكريم بيارة چاپی بەغداد ساڵی ١٩٧٢، ٤٦١.

جا بوونی عەمر دەوەستێتە سەر زەید، بوونی زەیدیش دەوەستێتە سەر عەمر. ئەمەش مانای وایە کە بوونی عەمر دەوەستێتە سەر خودی عەمر، پاش لادانی لایەنی ناوەڕاست کە (زەیدە).

ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە پێش بوونی خۆ ببێت واتە: پێویست دەبێت عەمر لە پێش بوونی خۆی هەبێت، چونکە پێشکەوتوو (سابق) و پاشکەوتوو (مسبوق)ە، جا پێویست دەبێت عەمر هەبێت بەرلەوەی هاتبێتە خانەی بوون و ئەمەش بێ بنەماو پوچەڵە[1].

**نمونەی پوچەڵی خول (دور):**

بوونی هێلکە بەندە و پەیوەستە بە بوونی مریشکەوە. و بوونی مریشکیش پەیوەستە بە بوونی هێلکەوە. ئەگەر وامان دانا کە هیچ هۆیەك نییە بۆ بوونی هێلکە یان مریشکەکە ئەوا ئەوکاتە شتێکی بەڵگە نەویستە کە هەر دووکیان بەنەبووی دەمێننەوە، تا کارتێکەرێکی دەرەکی دێت و هێلکەکە و مریشکەکە دێنێتە بوون، ئا لەوکاتە خولەکە تەواو دەبێت.

**ئەگەر وترا:** هۆی بەدیهاتنی جیهان بریتییە لە: کارلێکی ناوەخۆیی ڕووتی ناو بوونەوەر، بەهۆی کاریگەری پاڵەپەستۆ و گەرما و ساردی لە ڕێگەی تێپەڕبوونی کات.

**وەڵامی دەدەمەوە:** ئەمە بریتییە لە خول (دور)ی پوچەڵ، چونکە واتاکەی بریتییە لەوەی: کە بوونی جیهان بەندە و بەستراوەتەوە بە بەشێکی وەك: (پاڵەپەستۆ و گەرما و ساردی....)، و بوونی هەندێك بەشی تر پەیوەستە بە جیهانەوە. ئەمەش مانای وایە: شتێکە پێش بوونی خۆی کەوتۆتەوە، ئەمەش پوچەڵە هەروەك پێشتر خستمانەڕوو[2].

---

[1] بروانە: شرح الجوهرة للباجوری ١٠٥.

[2] کبری الیقینیات الکونیة ٨٤.

## واتای زنجیرەیی (التسلسل) و بەڵگەی پوچەڵیەکەی:

زەنجیرەیی (التسلسل): بریتییە لەوەی شتی شیاو (ممکن) بۆ بوونی خۆی پێویستی بە هۆیەکی کارتێکەری هەبێت، ئەو هۆیە کارتێکەرەش پێویستی بەهۆیەکی تری کارتێکەر هەبێت، بەم شێوەیە تا ئەو ئەندازەیەی کۆتایی نایەت[1].

جا زنجیرەیی (تسلسل) واتە: بەدیهێنراوان لەیەکترەوە بەدیهاتوون، تا ئەو ئەندازەیەی کۆتایی نایەت، بەشێوەیەك کە هەر یەکە بەهۆی ئەوەی پێش خۆی بەدیهاتبێت و هۆی بەدیهاتنی ئەوەی پاش خۆیشی بێت، بەبێ ئەوەی ئەو زنجیرەیە سەرچاوە بگرێت لە هۆیەکی کۆکەرەوەو پێویستە بوون (واجب الوجود)[2].

### بەڵگەی پوچەڵی زەنجیرەیی (تسلسل):

١- گریمانە و بیرۆکەی زنجیرەیی (تسلسل) سەردەکێشێت بۆ بوونی چەندین خوای بێ کۆتا، کە هەر هەموو خواکانیش خاوەنی چەند سیفەتێك بن وەك: بەدیهێنراوی و هەژاری و دەسەوەسانی، کە ئەمەش پوچەڵە، چونکە پێچەوانەی پلەوپایەی خوایەتیە کە خاوەنی هەموو توانایەکە و دەوڵەمەند و بێ باکی ڕەهایە، چونکە دەسەوەسانی هەژار ناکرێت ببێتە بەدیهێنەری جیهان و داهێنەری ئەو شتە سەرنجڕاکێش و بێ کەم و کورتانە بێت[3].

٢- بیرۆکەی زنجیرەیی (تسلسل) بە بەڵگەی هەست و بینین بێ بنەماو هەڵوەشاوەیە، چونکە چەندین بەدیهێنراو هەبوون کە لەناوچوون و نەماون، جا ئەگەر ڕاست بووایە کە بوونەوەر بەشێوەیەکی زنجیرەییە بەبێ کۆتایی هاتن - بەشێوەیەك کە هەر بازنەیەك لەوەی پێشەخۆی هاتبێتە بوون و خۆیشی هۆی بوونی ئەوەی دوای خۆی

[1] المواقف وشرحه للسيد الشريف ٤/١٦٠.
[2] كبرى اليقينيات الكونية ٨٤.
[3] شرح الخريدة للدردير ٥٦. بڕوانە: المحصل للرازي ١٤٩.

بێت - ئەوا ئەو بوونەوەرانە لەناو نەدەچوون، چونکە بازنەی کۆتـایی تـەنها کـاری تێکراوەو وەك ئەوەی پێش خۆی هۆیەکی کارتێکەر نەبووە[1].

٣- بەڵگەی جێبەجیٚ کرد، ئەمەش ناودارترین بەڵگەی زانایانی کەلامـە، کـە بریتیـە لە:

گریمان ئەگەر تۆ دوو زنجیرەت دانا، یەکێکیان سەرەتاکەی لە ئێستادا دەستپێبکات تـا بیٚ کۆتایی هاتن. دووەمیشیان لە کاتی تۆفانەکە داتنا تا بیٚ کۆتـایی هـاتن. هـەر دووك زنجیرەکەت بەرامبەر یەك دانا بەوەی لە سەرەتاوە تاکەکانی هـەر دوو زنجیرەکـەت هێنانـە بەرامبەر یەك.

جا کە هەر بازنەیەکت لە ئێستاوە (لـەکاتی ئێسـتادا) خسـتەڕوو و لەبەرامبەریشـیدا بازنەیەکی تۆفانت وەك ئەو دانا ئەوا ...

بەدەر نییە لەوەی:

یان هەردوو زنجیرەکەی بەیەکەوە کۆتایی دێـن، ئـا لەوکاتـەدا هـەردووکیان کۆتاییـان دەبێت، ئەمەش پێچەوانەی گریمانەکەیە. ئەگـەر هـەردوو زنجیرەکـەش بەیەکـەوە کۆتـایی نەیەن - هەروەك وادامان نـابوو - ئـەوا پێویسـتە ناتـەواو (نـاقص) و تـەواو (کامـل) بەیەکسان دابنێین، کە بێگومان ئەمەش پوچەڵە.

جا ئەگەر زنجیرەی تۆفانەکە لە پێش ئێستادا کۆتـا هـات، ئـەوا ئـەو کاتـە تۆفانەکـە دەبێتە خاوەنی خاڵی کۆتایی، ئێستاش بەهەمان شێوە خاوەنی خاڵی کۆتاییە، چونکە بـە ئەندازەیەکی کۆتایی هاتوو تۆفانەکەی زیاترە کە بریتیە لـەکاتی تۆفانەکـە تـا ئێسـتا، و

---

[1] کبری الیقینیات الکونیة ٨٤ و لاپەڕەکانی دواتر. بڕوانە: موقف العقل و العلم و العالم من رب العالمين للأستاذ الشيخ مصطفى صبري ١٨٢/٢.

شتێكی زانرویشه كه شتێك به ئەندازەیەكی كۆتایی هاتوو زیاتر بێت له شتێكی كۆتایی هاتوو ئەوا ئەو شته زیادەیەش دەبێته خاوەنی خاڵی كۆتایی[1].

**نمونه لەسەر پوچەڵی گریمانەی زنجیرەیی (تسلسل):**

١- ئەگەر ژمارەیەكی ژمێریاری دوورو درێژت دانا، له تەنیشتیدا ئەندازەیەكی زۆر له (سفر) دابنێیت، جا تۆ خێرا بەرله هەموو شت تەماشای ژمارەی یەكەم دەكەیت، جا ئەگەر چاوت نەكەوێته سەر ژمارەی یەكەم، ئەوا هیچ نرخێك نادەیت بەو هەموو (سفر)ە، ئەگەر ئەو (سفرانه) نرخ و قیمەتیان پێشتر وەرنەگرتبێت له ژمارەیەك كه نرخ و قیمەتەكەی له خودی خۆیەوە دەستكەوتبێت، چونكه ئەو ژمارەی كه نرخەكەی خودییه و له خۆیەوە سەرچاوەی گرتووە هەر ئەمە ژیان و نرخ و قیمەت دەداته ئەو (سفر)انەی كه بەشێوەی زنجیرەیی ڕیزكراون له تەنیشتی ڕاستیەوە، كەواته زنجیرەی ئەو (سفر)انەی كه دەسپێكی له ژمارەیەكی قیمەتدارەوە نەبێت ئەوا هیچ نرخێكی نیه، ئەگەر واش دابنێین كه ئەو (سفرانه) زنجیرەیەكی بێ كۆتایی پێك دێنن ئەوا ئەو گریمانه هیچ نرخێكی پێ نابەخشێت.

٢- ئەگەر بانگەشەی ڕاستیەكی زانستیم كرد لەلای تۆ، و تۆش داوای بەڵگەت لێكرم، منیش وەڵامی تۆم دایەوە بەبەڵگەیەك كه پشتی بەستبێت به بەڵگەیەكی تر (واته: بەڵگەكەش پێویستی بەوە هەبێت بەڵگەی بۆ بهێنرێتەوە[2])، كاتێك تۆ پرسیار له بەڵگەكەی دووەم دەكەیت من وەڵامت بدەمەوە به بەڵگەیەكی تر كه ئەوەیش پشتی بەستبێت به بەڵگەیەكی تر .... بەم شێوەیه، ئەوا تۆ ئەم بانگەشەیەی من به درۆ دائەنێیت، بەڵكو بوونی ئەم ڕاستیه زانستیەش به درۆ

---

[1] شرح الجوهرة للباجوري ٤٨/١. و سەیری: الواقف وشرحه للسيد الشريف ١٦٧/٤ و لاپەڕەكانی دواتر. و المقاصد و شرحه للتفتازانی ١٢٠/٢ و لاپەڕەكانی دواتر. و كشف المراد ١١٩. و الوسيلة في شرح الفضيلة ٤٦١-٤٦٥ ٤٦١-٤٦٥.

[2] وەرگێڕ.

ئەزانیت.

جا هەموو ئەو بەڵگە زنجیرەییانە، کە خستمانەڕوو کە کۆتاییان نییە، ئەوا تەنها چەند سێبەرێکن کە چاوەڕوانی بنچینەو ڕەگی یەکەم دەکەن. جا ئەگەر ئەو ڕەگ و بنچینەیە نەبێت، ئەوا ئەو سێبەرانەش بوونیان نییە، بەهەمان جۆر ئەو ڕاستیەی بانگەشەی بۆ دەکرێت بوونی نییە[1].

جا کە گریمانەی خول (دور) و زنجیرەیی (تسلسل) پوچەڵیەکەیان دەرکەوت، ئەوا ئەو شتەش پوچەڵ دەبێت کە سەر دەکێشێت بۆ ئەم دوو گریمانە، ئەویش بریتیە لەوەی بەدیهێنەری ئەم جیهانە شیاوی بوون (ممکن) بێت، بەڵکو پێویستە لەوکاتەدا بەدیهێنەر پێویستە بوون (واجب الوجود) بێت.

ئەو بەڵگەیەش کە هەندێ لە فەیلەسوفەکانی خۆرئاوا باسیان کردووە لە چوارچێوەی ئەم دوو بەڵگەیە ناچێتەدەر، ئەمەش بەهێزترین و کاریگەرترین بەڵگەیە لەلای ئەوان، کە ناونراوە بە بەڵگەی بەدیهێنان (خلق) یاخود بەڵگەی گەردوونی[2].

---

[1] کبری الیقینیات الکونیە، سەرچاوەی پێشوو.

[2] پوختەی ئەو بەڵگەیە ئەوەیە: کە ئەو بوونەوەرو بەدیهێنراوانە پێویستیان بە بەدیهێنەرێك هەیە، چونکە ئێمە دەبینین کە بوونی هەر بوونەوەرێك پەیوەستە و دەوەستێتە سەر ئەوەی تر یان جگەلەوە دەوەستێتە سەر بوونەوەرێکی تر، بەبێ ئەوەی ئێمە پێویستیەك ببینین کە بوونی ئەو شتە بەخودی خۆی پێویست بکات.

سەیری: کتێبی (الله) دانراوی: عقاد: ١٩٢-١٩٣ بکە کە لەوبارەوە دواوە، و یەکێك لە ڕێگەکانی ئەو بەڵگەیەی خستوەتەڕوو کە بریتییە لە: بەڵگەی جوڵە (بەڵگەی: ئەو جوڵێنەرەی کە خۆی بێ جوڵەیە) و ناوەڕۆکی ئەم بەڵگەیە ئەوەیە: کە هەر شتێك بجوڵێت ئەوا پێویستی بە جوڵێنەر هەیە، و شتی جوڵاو پێویستە هێز لە غەیری خۆی بەدەست بخات، بەم شێوەیە تا عەقڵ لە خزمەت یەك جوڵێنەردا دەوەستێت، کە ئەو جوڵێنەرە بۆی دروست نیە جوڵەی بەسەردا بێت، چونکە لە دەرەوەی سنوری شوێن و کاتە، ئەویش خوای گەورەیە.

## بەڵگەی سێیەم: بەڵگەی چاودێری و داهێنان

ئەم بەڵگەیە دیارترین و ئاشکراترین بەڵگەیە لەسەر بوونی خوای گەورە. ئەمیش بریتیە لەو بەڵگەیەی کە (ئیبن روشد) لە کتێبی (مناهج الأدلة)دا باسی کردووە، و ئەوەشی خستوەتەڕوو کە دەکرێ:

أ- زۆرینە بیگرێتەبەر وەك ڕێباز و ڕێگە بۆ چەسپاندن و سەلماندنی بوونی خوای گەورە، جا لە میانەیدا تەنها ئەوە لەبەرچاو بگیرێت کە بە زانینی سەرەتا دەست دەکەوێت کە ئەویش لەسەر هەستەکان بنیاتنراوە.

ب- زانایان، ئەو شتانەی کە بە بەڵگە درکیان پێ دەکەن دەخەنەسەر ئەو شتانەی پەییان پێدەبرێت بە هەستەکان.

ئەم بەڵگەیە قورئانی پیرۆز هۆشداری لەبارەی داوەو سەرنجی بەلایدا ئاراستە کردووە، و هاوەڵانیش - خوا لێیان ڕازی بێت -گرتویانەتەبەر، و بەم شێوەیەی خوارەوە ئەو بەڵگەیە ڕوون دەکەینەوە:

### بەڵگەی چاودێریی:

ئەم بەڵگەیەش لەوەوە دیاردەکەوێت کە تا چەند گرنگی بە مرۆڤ دەدرێت و بوونەوەرو بەدیهێنراوان لە پێناوی ئەودا بەدیهێنراون و بۆی ڕام کراون. جا ئەم بەڵگەیە لەسەر دوو بنچینە دەوەستێت:

١- هەموو بونەوەرانی کە هەن کۆك و تەبان لەگەڵ بوونی مرۆڤ.

٢- بوونی تەبایی و گونجان پێویستیەکە لەلایەن ئەو زاتەی کە بکەرە و مەبەستی وابووەو ویستی لەسەر بووە، چونکە بوونی ئەم تەباییە ناهێتە کایە تەنها بە ڕێکەوتن نەبێت.

---

بڕوانە: (دراسات في الفرق و العقائد السلامية - د. عرفان، ١٧٤ و لاپەڕەکانی تریش): دوو ڕێگەی لەو پێنج ڕێگەیانەی خستۆتەڕوو کە قەشە (توما ئەکوینی) پوختی کردۆتەوە، ئەویش بریتین لە: بەڵگەی جوڵە، و بەڵگەی توانای بەدیهێنان (الامکان) و پێویستی (الوجوب).

گونجان و تەبایی بەوە دەبێت وەك گونجان و تەبایی ڕۆژو شەو و خۆر و مانگ لەگەڵ بوونی مرۆڤ، بەهەمان شێوە گونجانی ئەو کات و شوێنەی کە مرۆڤ تێیدایە، و گونجانی گیانلەبەر و ڕووەك و شتی بێ گیان و بارانەکان و ڕوبارو دەریا و ئاگرو هەوا....

بەهەمان شێوە چاودێری و گرنگی دان بەدەردەکەوێت لە ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ و گیانلەبەر. واتە: ئەندامەکانی تەواو ڕێك و گونجاون لەگەڵ ژیان و بوونی.

چەند ئایەتێك لەو ئایەتانەی کە ئەو بەڵگەیەیان ڕوونکردۆتەوە:

- ئەو فەرمایشتەی خوا: ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِى جَعَلَ فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجًا وَقَمَرًا مُّنِيرًا ﴾ الفرقان: ٦١. واتە: (زۆر گەورەو مەزنە ئەو زاتەی لە ئاسماندا چەندەها خولگەی گەورەی "بۆ هەسارە و ئەستێرەکان" بەدیهێناوە، هەروەها چرایەکی پڕشنگدار، کە خۆرە و مانگێکی ڕووناکیشی بۆ زەوی دابین کردووە).

- ﴿ أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ مِهَٰدًا ﴿٦﴾ وَٱلْجِبَالَ أَوْتَادًا ﴿٧﴾ وَخَلَقْنَٰكُمْ أَزْوَٰجًا ﴿٨﴾ وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ﴿٩﴾ وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِبَاسًا ﴿١٠﴾ وَجَعَلْنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشًا ﴿١١﴾ وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا ﴿١٢﴾ وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا ﴿١٣﴾ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلْمُعْصِرَٰتِ مَآءً ثَجَّاجًا ﴿١٤﴾ لِّنُخْرِجَ بِهِۦ حَبًّا وَنَبَاتًا ﴿١٥﴾ وَجَنَّٰتٍ أَلْفَافًا ﴿١٦﴾ ﴾ النبأ: ٦ - ١٦. واتە: (ئایا زەویمان وەك لانکە بۆ فەراهەم نەهێناون؟. "ئایا" کێوەکانمان وەك مێخ بۆ دانەکوتاون؟. "ئایا" ئێوەمان بە جووت دروست نەکردووە؟. خەوتنمان بۆ نەکردوون بەهۆی سرەوتن؟. "ئایا" شەوگارمان بۆ نەکردوون بە داپۆشەر وەك پۆشاك، تا تیایدا بشاردرێنەوە؟. "ئایا" ڕۆژیشمان بۆ نەکردوونەتە کاتی بەدەستهێنانی ڕزق و ڕۆزی؟. "ئایا" حەوت چین ئاسمانی بەهێزو پتەومان بە سەرتانەوە دروست نەکردووە؟. چرایەکی پڕشنگدارمان بۆ فەراهەم نەهێناون؟. "ئایا" لە هەورە گوشراوەکان بارانێکی زۆرمان نەباراندووە؟. تا بەهۆی ئەو بارانەوە جۆرەها دانەوێڵە و ڕووەك بڕوێنن. هەروەها چەندەها باخی چڕو پڕ لەیەك ئاڵاو بەدی نەهێناوە).

- ﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ أَنَّا صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا ﴿٢٥﴾ ثُمَّ شَقَقْنَا ٱلْأَرْضَ شَقًّا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا حَبًّا ﴿٢٧﴾ وَعِنَبًا وَقَضْبًا ﴿٢٨﴾ وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا ﴿٢٩﴾ وَحَدَآئِقَ غُلْبًا ﴿٣٠﴾ وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ﴿٣١﴾ مَّتَٰعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَٰمِكُمْ

﴿٣٢﴾ ﴾ عـبس: ٢٤ - ٣٢. واتە: (با ئادەمیزاد سەیری خواردنەکەی بکات و سەرنجی بـدات و بیری لێبکاتەوە. بێگومان ئێمـە ئاومـان بـۆ داباراندۆتـە خـوارەوە، چـۆن داباریـنێـك. لەوەودوا زەویمان بۆ لەت لەت کرد بە چەکەرەی ناسکی ڕووەك. ئینجا دانەوێڵەمان تیایـدا ڕوواند. هەروەها تـرێ و سەوزە و زەیتوون و دارخورمـایش. باخچـەی دەوردراو بـە داری خورما یان درەختی تر یاخود باخی چڕو پڕ. جۆرەها میوە، هاوڕێ لەگەڵ ئەو هەموو گـژو گیایانەی کە خواکردە و ماڵات دەیخوات لە لەوەڕگاکانـدا. (هـەموو ئەمانـەمان ئامـادە کردووە) تا خۆتان و ماڵاتەکانتان سوودی لێ وەربگرن).

**بەڵگەی داهێنان:**

بریتیە لە بەدیهێنانی کرۆك (جوهر)ی بوونەوەر و بەدیهێنراوان، ئەمەش وەك داهێنانی ژیان و هەستی پەیی پێبەر و عەقڵ لە بێ گیاندا. و ئەمانەش دەگرێتەوە: بوونی سەرجەم گیانلەبەر، ڕووەك و ئاسمانەکانیش دەچنە ناو ئەو بازنەوە. ئەم بەڵگەیە لەسەر دوو بنچینە دادەمەزرێت کە بەهێز بوونیان هەیە لە ناو فیترەتی خەڵکی کە بریتیە لە:

١- ئەو بوونەوەرانە بەدیهێنراون، جا ئێمە چەند جەسـتەیەکی بــێ گیـان دەبیـنین و دواتر ژیانی بەبەردا دەکرێت، ئەوا لەو کاتە بـە بێگومـان دەزانـین کـە ژیانـدەرێك هەیە و ژیان دەدات و دەبەخشێت ئەویش خوای بەرزو مەزنە.

سەبارەت بە ئاسمانەکان، بەهۆی بەردەوامی جوڵەکەی دەزانین کە فەرمانی پێکـراوە پارێزەری ئەو شتانە بێت کە لە ناویدایە و دەستەمۆ کراوە بۆ مرۆڤـــ، و شـتێکی بێ گومانە کە شتێك داهێنراو و فەرمان پێکراو بێت ئەوا بێ چەندو چوون لەلایـەن زاتێکی تر جگەلە خۆی دروست کراوە.

خـوای گـەورە فەرمووییـەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخْلُقُوا۟ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجْتَمَعُوا۟ لَهُۥ ﴾ الحج: ٧٣. واتـە: (بەڕاسـتی ئەوانـەی کـە هانـا و هاواریـان لێدەکەن لە جیاتی خوا، هەرگیز ناتوانن تاکە مێشێك دروست بکەن، هـەر چـەندە بۆ ئەوکارە کۆببنەوە).

٢- هەر داهێنراوێك داهێنەرێکی هەیە، جا کە یەکێك دەیەوێت بە تەواوی خوای گەورە بناسێت ئەوا پێویستە زانیاری دەست بخات و شارەزا بێت لە کرۆکی شتەکان، تا هەڵوەستە بکات لەسەر داهێنانی حەقیقی لە تێکڕای بوونەوەردا، چونکە ئەوەی شارەزای حەقیقەتی شتەکان نەبێت ئەوا نازانێت حەقیقەتی داهێنان چییە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ أَوَلَمْ يَنظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ ﴾ الأعراف: ١٨٥. واتە: (ئایا بۆ سەرنجیان نەداوە لەو هەموو دەسەڵاتە گەورەیەی خوا لە ئاسمانەکان و زەویداو ئەو هەمو شتانەی بەدی هێناون؟).

فەرموویەتی: ﴿ فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ ۝٥ خُلِقَ مِن مَّاءٍ دَافِقٍ ۝٦ ﴾ الطارق: ٥ - ٦. واتە: (با ئادەمیزاد تەماشا بکات و سەرنج بدات کە لەچی دروست کراوە؟!. دروستکراوە لە ئاوێکی هەڵقوڵاو "کە مەنی پیاوەو هێلکۆکەی ئافرەتە، هەردوو لایان، هەڵدەقوڵێن بۆ پێکهاتنی ئادەمیزاد، بەویستی خوا").

فەرموویەتی: ﴿ أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴾ الغاشية: ١٧. واتە: (ئایا ئەوە سەرنجی وشتر نادەن چۆن دروست کراوە؟!).

ئەمەش چەند نمونەیەك لەو ئایەتانەی قورئان کە هەر دوو بەڵگەکە بەیەکەوە کۆ دەکەنەوە:

أ- ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ۝٢١ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ فِرَاشًا وَالسَّمَاءَ بِنَاءً وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ فَلَا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ البقرة: ٢١-٢٢. واتە: (ئەی خەڵکینە پەروەردگاری خۆتان بپەرستن، ئەو زاتەی کە ئێوەو پێشینانی ئێوەشی بەدیهێناوە، بۆ ئەوەی ڕێبازی خواناسی و تەقواو پارێزکاری بگرنە بەر. هەر ئەو زاتەش زەوی کردووە بە فەرش و جێگای نیشتەجێ بوون و ژیان بۆتان، ئاسمانی وەك سەقفێك بەسەرتانەوە ڕاگیر کردووە، لە ئاسمانەوە ئاوی بۆ باراندوون، جا بەهۆیەوە جۆرەها بەرهەمی

(درەخت و گژوگیای) بەدەرهێناوە تا ببێتە ڕزق و ڕۆزی بۆتان، کەواتە شەریك و هاوتا بۆ خوا بڕیار مەدەن، کە خۆشتان دەزانن پەرستراو دەبێت بەدیهێنەر بێت).
ئەو فەرمایشتەی خوا کە ئەفەرموێت: ﴿ خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ ﴾ واتە: (ئێوەو پێشینانی ئێوەشی بەدیهێناوە). هۆشداری دان و سەرنج ڕاکێشانە بۆ بەڵگەی داهێنان.
ئەم فەرمایشتەیشی: ﴿ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً ﴾ واتە: (هەر ئەو زاتەش زەوی کردووە بە فەرش و جێگای نیشتەجێ بوون و ژیان بۆتان، ئاسمانی وەك سەقفێك بەسەرتانەوە ڕاگیر کردووە). هۆشداری دان و سەرنج ڕاکێشانە بۆ بەڵگە و ئاماژەی چاودێری.
ب- ﴿ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَـٰذَا بَـٰطِلًا سُبْحَـٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾آل عمران: ١٩١.[(١)] واتە: (ئەوانەی یادی خوا دەکەن لە کاتێکدا کە بەپێوەن یان دانیشتوون یان ڕاکشاوون (لەهیچ حاڵەتێکدا یادی ئەو زاتە فەرامۆش ناکەن)، هەمیشە بیر دەکەنەوە لە دروست بوونی ئاسمان و زەوی (دەڵێن): پەروەردگارا تۆ ئەم هەموو دروست کراوانەت بێ هودە و بێ ئامانج دروست نەکردووە، پاکی و بێگەردی شایستەی تۆیە، دە تۆش بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ).
زانایان لە چەرخی ئێستادا بەتایبەتی جەختیان کردۆتەوە لەسەر بەڵگەی زانستی، ئەمەش دوای ئەوەی چوارچێوەی زانست فراوان بوو، چەندین دەزگای داهێنراوی هاوچەرخ بەدەرکەوتن کە هۆیەك بوون بۆ ئاشکراکردنی ئاسۆکانی بۆشایی ئاسمان و

(١) مناهج الأدلة في عقائد الملة لابن رشد ١٥١-١٥٥ و نقله الدكتور عرفان عبدالحميد في: دراسات في الفرق ١٧٥.

هەڵوەستە کردن لەمەڕ نهێنییەکانی سروشت، پەیی بردن بە شاراوەکانی، ئەمەش بووە هۆی بانگهێشت کردنی زانایان لە سەرجەم مەیدانەکانی تا بدوێن لە بارەی توانا و داهێنان و گەورەیی خوایی گەورە و سەرسوڕمانی عەقڵی مرۆڤ لەبەرامبەر ئەو نهێنیانە کە لە هەموو بەدیهێنراواندا هەن.

ئەوەی لێرەدا باسی دەکەین، تەنها چەند تێڕوانینێکن لە هەندێ لە مەیدانەکانی زانستدا، هەڵوەستە کردنی زانایان لەمەڕ هەندێ لە نهێنییەکانی بوونەوەر، ئەمەش تەنها کلیلێکە بۆ عەقڵ و هۆش، تا پاڵی بنێت بۆ تێڕامان و وردبوونەوە لە کاروباری ئەو بوونەوەرە پانوپۆڕە، گومانیش لەوەدا نیە کە هەر بەشێکی بچوك لێی گۆیایە و ئاماژەدەرە بۆ پەروەردگارێتی (بەدیهێنەرایەتی) خواو تاك و تەنهاییەکەی.

فيا عجبا كيف يعصى الاله　　أم كيف يجحده الجاحد
و في كل شيء له آية　　تدل على أنه واحد

واتە: ئای چەندە سەرسوڕهێنە کە چۆن تاوان لەبەرامبەر خوا ئەکات یاخود نکوڵی کار نکوڵی لە بوونی دەکات، کەچی لە هەر شتێکدا بەڵگە و نیشانە هەیە، ئاماژە دەدات بۆ ئەوەی کە خوا تاك و تەنهایە.

چەند نمونەیەك لەو بەڵگە زانستیانە لەم بارەوە:

١- ئەستێرەکان، بریتین لە تۆپەڵەیەکی گڕگرتووی دوور لە هەسارەی زەوی.

جا نزیکترین ئەستێرە لە ئێمەوە بە ئەندازەی چوار ساڵ و چواریەکێکی ساڵی تیشکییە[1]. ڕووناکترین ئەستێرە کە لە ئاسماندا دەیبینین بریتیە لە ئەستێرەی

[1] ساڵی تیشکی: بریتییە لەو ماوەیەی کە تیشك دەیبڕێت لە ساڵێکدا، کە دەکاتە نزیکەی شەش ملیۆن ملیۆن میل، بۆ زانیاریش تیشك بە ئەندازەی (١٨٦) هەزار میل دەبڕێت لە یەك چرکەدا.

(شـعری الیمانیـة) کـە هەنـدێ لـە عـەرەب بـەر لـە ئیسـلام دەیانپەرسـت، ئـەو ئەستێرەیەش لە ئێمەوە دوورە نزیکەی هەشت ساڵ و نیوی تیشکی[1].

لەم دواییانەدا گەردونناسان ڕایانگەیاند کە ڕوانگەیان داوەتە سەر ئەسـتێرەیەك کـە دوازدە و نیو بلیۆن (بلیۆن: ملیۆن ملیۆنە) ساڵی تیشکی لە ئێوە دوورە[2].

پلەکانی گەرمی ڕووی ئەستێرەکان جیاوازن، بۆیە ڕەنگەکانیان جیاوازن لە سـورێکی تۆخەوە بۆ سورێکی کراوە تا پرتقالی بۆ زەرد تا سپی تا شین، جا ئەستێرە زەردەکـان پلەی گەرماییەکەیان لە ڕووەکەیاندا دەگاتە دەیان هەزار پلە.

پلەی گەرمی سەر ڕووی ئەسـتێرەی (شـعری الیمانیـة) دەگاتـە یـازدە هـەزار پلـەی سەدی.

سەبارەت بە قەبارەیشیان هەیانە دەگاتە قەبارەی خۆر، هەیشیانە بچوکترە یان زیاترە بە دەیان یان سەدان بەڵکو هەزاران و ملیۆنان جار.

٢- گەلە ئەستێرە (مجرة): مامۆستا (جامو) دەڵێت کە (هبل) بەڕێوبەری ڕوانگەی (مونت ولسن)، بە ڕوانگەکەی سەیری ماوەیەکی کردووە نزیکـە لـە (٥٠٠) ملیـۆن سـاڵی تیشکی، لەو ناوەندەدا نزیکەی (١٠٠ ملیۆن) گەلە ئەستێرەی دەرەکـی ژمـاردووە، لەوانەیە گەلە ئەستێرەی تریش هەبن دوورترین کە (هبـل) نـەی بینیبێـت. دەڵێـت: پانییەکەی گەلە ئەستێرەی ئێمە سەد هەزار ساڵی تیشکییە، بەخێراییـەکی زۆریـش دەسوڕێتەوە.

٣- بۆشایی گەردوون بەشێوەیەکی زۆر گەورە فـراوان دەبێـت. و ئەندازەکەشـی بەهـەمان شێوە - هەروەك سیر جیمس جینز - دەڵێت نزیکـەی سـەد و پێـنج میـل لـە یـەك چرکەدا، کە هەر دووریەکیش نزیکەی ملیۆنێك ساڵی تیشکییە[3].

---

[1] التفسیر العلمي للآیات الکونیة في القرآن ٥٦ و٥٩ و٦٢.

[2] بڵاوکراوەی هەواڵی گەردوونی لە بەڕێوبەرایەتی چاودێری زانستی - بغداد.

[3] التفسیر العلمي للآیات الکونیة ٥٦-٦٩.

٤- ئەم خۆری خۆمان، قەبارەكەی دەگاتە نزیكەی نیو ملیۆن و سێ سەد جاری قەبارەی زەوی. پێكهاتووە لە تۆپەڵێك بەردو ماددەی شل و گازە سووتێنەرەكان، كە پلەی گەرمی سەر ڕووەكەی دەگاتە شەش هەزار پلەی سەدی، و پلەی گەرمای چەقەكەی دەگاتە بیست ملیۆن پلەی سەدی.

هێزی گەرمییەكەی - بەهەمان شێوەی خۆر ئەستێرە گەورەكانیش -بەهۆی كارلێكی ناوەكی و نەوەویی گەرمە كە لە چەقەكەی دڵ ڕوودەدات، ئەمەش بەهۆی تێكشكانی گەردیلە لەناوەوەی خۆر، لەژێر كاریگەری گەرمای زۆر بەرز.

پریشكەی گڕەكەی دەگاتە (١٤٠كم) لەكاتی ئاسایی، بەڵام لە بارودۆخی تەقینەوەی بەردەوامدا ئەوا دووری پریشكە دوور هاوێژەكانی دەگاتە هەزاران میل[١].

٥- مانگ شوێنكەوتووی زەویە، بەئەندازەی (٢٨٦ هەزار میل) لێی دوورە، ئەگەر (٥٠) میل لێی دوور بووبا، ئەوا ئاو ڕووی زەوی دادەپۆشی بە قوڵایی میل و نیوێك و قەبارەی هەوا زیاتر درێژ دەبووەوە كە ئەمەش دەبووە هۆی ڕوودانی باو زریان لە هەموو ڕۆژێكدا... تاد. چونكە كێشندەی مانگ - لە حاڵی ئێستادا - ئاوی زەریاكان كێش دەكات تا شەست پێ لە هەندێك شوێندا، ڕۆژانە بەرەو ڕووی دەرەوە توێكڵی زەوی دووجار كێش دەكات بە ئەندازەی چەند ئینجێك[٢].

٦- زەوی بەدەوری خۆردا دەسوڕێتەوە بە خێرایی نزیكەی (٥ر١٨) میل لەیەك چركەدا، لەسەر خولگە درێژەكەی كە (٦٠٠) ملیۆن میلە.

---

[١] التفسير العلمي للآيات الكونية في القرآن ٦٥ و٧٣ و٧٥ و٨٥. و العلم يدعو للايمان چ ٤، ٥٥. و مع الله في السماء ١٤٦.

[٢] العلم يدعو للايمان ٥٧-٥٨.

مانگ لە خولگەی خۆیدا بە ئەندازەی ٢٣٠٠ میل لە كاتژمێرێك دا دەڕوات، و لەهەر سوڕانەوەیەكی مانگانەدا جارێك بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە، و بۆیە بەیەك ڕوو و لاتەنیشت بەرامبەر زەوی دەوەستێت، بەم هۆیە چەندین ڕووی ڕووناكی جیا جیا دەبینین، هەر لە كەوانەیی (هلال) و پڕشنگداری (بدر) و بەپێچەوانەوە.

زەوی بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە بە خێرایی (١٠٠٠) میل لەیەك کاتژمێردا (واتە: یەك جار لە ٢٤ کاتژمێردا).

ئەگەر وا دابنێین کە بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە بە ئەندازەی (١٠٠) میل لە یەك کاتژمێردا، ئەوا ئەوکاتە رۆژو شەوەکانمان دەیان جار درێژتر دەبن لەوەی ئێستا، و خۆریش رووەکەکان بە رۆژ دەسوتێنێت و لە شەویشدا دەبەستن.

ئەگەر وادابنێین کە زەوی بەدەوری خۆردا دەخولێتەوە بە خێرایی (٦ میل) لە چرکەیەکدا یان (٤٠) میل، ئەوا نزیکی و دووریمان لە خۆر وای دەکرد کە ژیانمان بەهیچ شێوەیەك نەبێت[1].

٧- ئەو ئاوەی کە (٤/٥) زەوی پێك دێنێت، ئەوا پێکهاتووە لە گاز: دوو گەردیلەی هایدرۆجین و گەردیلەیەکی ئۆکسجین $H_2O$، و هەوا لە چەند رەگەزێك، بە چەند رێژەیەکی دیاریکراوی زۆر گرنگ بۆ ژیان، کە ئەگەر جیاوازیان تێبکەوێت ژیان جێگیر نابێت.

٨- ژیانی مرۆڤ بەبێ خوێ خواردن نابێت، خوێش لە ترسناکترین دوو رەگەز پێکدێت، کە بریتین لە: صۆدیۆم کە دەکرێتە ناو پێکهاتەی مادەی تەقینەوە، کلۆر کە گازێکی خنکێنەری بکوژە (NACl).

---

[1] التفسير العلمي للآيات الكونية في القرآن ٦٧. و العلم يدعو للايمان ٥٥.

ئەگەر توێکڵی زەوی دە پێ ئەستور ببێت ئەوا ئۆکسجین لەناو دەچوو و ژیان نەدەبوو. ئەگەر دەریاکان چەند پێیەك لەوەی ئێستا قوڵتر بووبان، ئەوا ئۆکسجین و دووەم ئۆکسیدی کاربۆنی هەڵدەمژی و ژیان نەدەما. ئەگەر بەرگە هەوای زەوی تەنکتر بوایە لەوەی ئێستا، ئەوا نەیزەکەکان زۆر بە ئاسانی بەر زەوی دەکەوتن و زەوی دەسوتا،

چونکە نەیزەکەکان و تیر ئاگرەکان لە هەر رۆژێکدا بە ملیۆنان دە پرژێنە ناو هەوای دەرەکی، و هەر یەك لەو نەیزەکانە بە خێرایی شەش میل تا چل میل لە یەك چرکەدا دەبڕێت، جا ئەگەر ئەو بەرگە هەوایە رێگر نەبووایە ئەوا زەوی و ئەوەی لە ناویەتی دەسوتا، چونکە ئەگەر مرۆڤ تیرئاگرێکی بچوکی بەرکەوت کە خێراییەکەی حەفتا جار لە خێرایی گولە زیاترەو، ئەوا مرۆڤ پارچە پارچە دەکات تەنها بە گەرمایی رۆیشتنەکەی./ الاسلام يتحدى ٥٩.

٩- ئەگەر بە وردبینەوە تەماشای دڵۆپێك ئاوی سروشتی بكەیت، ئەوا جیهانێك لە ژیانی سەر سوڕهێنەر بەدی دەكەیت[١].

١٠- زەردەواڵە (الزنبور): كاتێك كوللە مەشكە (جندب) ڕاو دەكات، ئـەوا بـێ هۆشـی دەكات و هەڵی دەگرێت تا دەرخواردی بێچوەكانی بدات لەكاتی لە دایك بوونیان[٢].

١١- ئەگەر دوو مێش بەردەوام بێچـویان ببێـت و مـردن بەسـەر ئـەوان و بێچـوەكانیادا نەیەت، ئەوا دوای پێنج ساڵ، چینێك لە مێش لـە دەوری زەوی دروسـت دەبێـت بـە بەرزی (٥ سم). جا مێش یەك ڕەگەزە ئەی سەبارەت بە هـەموو بوونـەوەرەكانی تـر ئەگەر مردنیان بەسەردا نەیەت؟[٣].

١٢- مرۆڤــ، ئەو مەتەڵەیە كە عەقڵ دێنێتە سەر سوڕمان، لە چەند ڕەگەزێك پێك دێت كە ڕێژەكەی نزیكەی:- بەرمیلیكی بچوكی ئاوە، لەگەڵ ڕەگەزە كانزاییەكان كە چەند بزمارێكی بچوك پێك دێنن، سەری شقارتەیەكە لە كبریت، ئەندازەیەك لە گـەچ كـە دەتوانرێ دیواری پێ گەچ بكرێت، چەند ڕەگەزێكی تری كـەم كـە قیمەتەكـەی نیـو دینار ناكات، جا نهێنیەكەی شاراوە نییە لە جۆرێتی ماددەكان، بەڵكو نهێنیەكە لـە پێكهێنان و ڕێكوپێك كردنەكەیدایە، لەو گەردیلانەدایە كە خانە پێـك دێـنن، دواتـر پێكهاتە زیندوو و لەدایك بووەكانی جەستەی لێدەكەوێتەوە[٤].

---

[١] ئەمە چەند شتێكی سەرەتایین كە قوتابی لە زانستی كیمیادا دەیخوێنن.

[٢] الله - سعید حوی، چ ٣، ساڵی ١٩٧٢، ٧٦.

- هێلانەی هەندێ لە جاڵجاڵۆكەكان لە ژێر ئاودان لەسەر شێوەی باڵۆن، بە بڵقی ئاو فوی تێدەكات، كە لە ناو مووەكانی ژێر جەستەیدا هەڵی گرتووە، و لەو كاتەشدا بێچوەكانی لەدایك دەبن، و هەڵسانی بایەكانی كاریگەری لەسەر نابێت./ العلم یدعو للایمان ١١٩.

- شەمشەمەكوێرە - هێزی بینینی لاوازە - بەشەو دەفڕێت، كەچی خۆی بەهیچ شتێكدا نادات، چونكە چەند لەرەیە (هزة)ك دەنرێت و كاتێك ئەو لەرانە بۆی دەگەڕێنەوە كە خۆی بە جەستەیەكی بەرامبەردا دەدەن، بەو شێوەیە هەستی پێ دەكات بێ ئەوەی بەدی بكات، ئەمە وەك ڕادارە./ الله - سعید حوی ٩٨.

[٣] الله - سعید حوی ٩٢.

[٤] الطب محراب للایمان ٥٩.

- مرۆڤ دەتوانێ شت ببیسێت لە ڕێگەی چونە ژوورەوەی دەنگ بۆ ناو چاردی گوێچکەکەی و دواتر بۆ ناوەوەی گوێچك، و بەبەشێکدا تێپەڕ دەبێت کە بریتیە لە (٤٠٠٠) چەماوە، بە پیلکانەکانی مۆسیقا دەچێت، لەوێشوە دەنگ دەگوازێتەوە بەشێوەیەك لە شێوەکان بۆ مێشك[1]، بەڵام ئایا چۆن مرۆڤ لەو دەنگە دەگات کە بیستراوە؟ و چۆن ئەو دەنگە جۆراو جۆرانە لەیەکتری جیا ئەکرێنەوە؟ و کۆگای بیستن دەکەوێتە کوێوەی مێشکەوە....؟ هێشتان نەگەیشتوون پێی[2].

بەم جۆرە سەبارەت بە گشت هەستەکانی تر.

- ملیۆن ملیۆن خانە لەلاشەی مرۆڤ دا هەیە، و لاشە لە ماوەی یەك چرکەدا نزیکەی (١٢٥) ملیۆن خانە سەرف دەکات. ژمارەی گشتی خانەکانی شادەمارە ناوەندیەکان (مێشك: مخ. و مێشکۆکە: مخيخ. و قەدی مێشك: الجذع الدماغي) ئەندازە دەکرێت بە نزیکەی ١٤ ملیار (ملیار: یەکسانە بە هەزار ملیۆن) خانەی دەمار (خلية عصبية)، جا ئەم خانانە زاڵن بەسەر چالاکی و کارەکانی لەش، و چالاکی هزری و کەسی مرۆڤیش دەچێتە ناویەوە[3].

- پەنجەمۆر و نەخشەی سەر پەنجەی هەر کەسێك ئافرەت منداڵ یان پیاو، بە نەخشەی پەنجەی یەکێکی تر ناچێت، و بۆیە لێکۆڵینەوە لە تاواناکان پەنجە مۆر بەکار دێنن بۆ ئاشکرا کردنی ناسنامەی تاوانباران.

- ئەو کارە وردو سەرسوڕهێنانەی کە لە چاو، و هەستەکان، دروست بوونی مرۆڤ، پێکهاتنی خانە، و وەزارەتەکانی جەستە و جگەلەوانیشی ئەنجام دەدرێت، ئەوا پێنوس

---

[1] العلم يدعو للايمان ١١٩.

[2] الطب محراب للايمان ١٩١-١٩٢.

[3] الطب محراب للايمان ٩٤ و لاپەڕەکانی دواتر و٤٠-٤٢. رازی لە: المطالب العلية ٢١٨/١ ولاپەڕەکانی دواتریشی هاتنەبوونی مرۆڤ لە دڵۆپە ئاوێکەوە کردووەتە بەڵگە لەسەر بوونی خوای دانا و بە بەزەیی. ولە ٢٣٣ پێکهاتنی جیهان بەویەڕی رێك و پێکییەوە بە بەڵگەی هێناوەتەوە لەسەر بوونی خودا، وتەی زانا گەورەکانیشی لەو بارەوە هێناوەتەوە.

دەستەوەسان و بێ توانایە لەوەی وەسف و باسی بکات، چونکە هەر هەموویان مەتەڵی سەر سوڕهێن نهێنی سەرنج ڕاکێشن، و زۆر شتی شاراوە ماوە لە ناو دوو توێ بێ دەنگی و کپی، تا کاتی ئەوە دێت شتی تری لێ ئاشکرا بکرێت.

لەدوای ئەمەدا دەڵێین: ئەمە چەند نمونەیەکی کەمن[1] لەوەی زانایان باسیان کردووە لە تێڕوانینەکانیان بۆ ئەو بوونەوەرە پانوپۆڕە، کە مرۆڤ لە بەرامبەریدا بە سەرسوڕمان و مەندەهۆشەوە دەوەستێت و پرسیار دەکات لەبارەیەوە: کێ ڕێکی خستووەو بەڕێوەی دەبا؟ و کێ بەدی هێناوە؟ و کێ بەو شێوە شیاو و گونجاوە دەستەمۆی کردووەو ڕێکی خستووە؟ جا زانست ڕۆژ لە دوای ڕۆژ شتە سەر سوڕهێنەکانی ئەم سیستەمە کە بوونەوەر لەسەری بەڕێوەدەچێت ئاشکرا دەکات، جا ئایا ئەمە لە دەستکردی مرۆڤە کە خۆی بێ توانایە لە ئاست لابردنی شتی ناخۆش لەسەر خۆی؟ و دەستەوەسانە لە گۆڕینی ئەو شتانەی کە بارودۆخی زاڵن وەك: باران و باوبۆران و لافاو.... تاد.

کەسی ژیر پەیی بەوە دەبات کە ئەو هاوگونجانی ئەم پێکهاتە لاوەکیانە بەم شێوەیە، کە دەدرەوشێتەوە لە وێنەی ژیاندا، و ئەم گونجانە و ژیانە کە بەردەوامە بە درێژایی ڕۆژگار، کە نە ساردو سوڕی و نەخاوبوونەوەی تێدەکەوت، ئەوا هەموو ئەمانە دەستکردی سروشتی کەرو کوێر بن.

شرۆڤەو ڕاڤەی ڕاستەقینەی ئەم سیستەمە، بریتیە لەوەی کە باوەڕت هەبێت بە توانایەکی دەراسا و هێزێکی زاڵ و مەزنایەتی خوایی، کە دەستەکانی کردبێتەوە، جا بوونەوەر بەڕێوە ببات بەوشێوە سەر سوڕهێنەرەی کە دەیبینین.

بەڵگەی چاودێری و داهێنان هەندێ لە فەیلەسوفەکانی خۆرئاوا بەناوی بەڵگەی مەبەستی (الغائیة)یان ناوبردووە، کە ئەم بەڵگەیە بەدیهێنراو و بوونەوەر وەك بەڵگەیەك

---

[1] سەیری نمونەی تر بکە لەو کتێبانەی کە ئاماژەمان بۆ داوە. و سەیری کتێبی (الله یتجلی في عصر العلم لجماعة من العلماء. و مع الله في السماء: د. أحمد زکی، و الانسان ذلك المجهول: د. الکسیس کارل، و کتێبەکانی عبدالرزاق نوفل، و قصة الایمان لشیخ ندیم جسر. و الطریق الی النجوم لفان درویت وللی، وەرگێڕانی: د. عمر فروخ، و النجوم في مسالکها للدکتور جبنز.

دەخاتەڕوو لەسەر بوونی خوای بەدیهێنەر. ئەم بوونەوەرە مەبەستی بەدیهاتن و حیکمەتی دەستەمۆ کردن و بەڕێوەبردنی خۆیان نیشان دەدەن، چونکە سیستەم و مەبەست و گونجان و حیکمەت ئاشکران لە سروشت و ڕوخسارە جۆر بەجۆرەکانی دا، کە ئەمەش ڕێگەیەکی ڕوونە بۆ چەسپاندن و سەلماندنی بوونی خوا[1].

## بەڵگەی چوارەم: بەڵگەی بوونی (وجودی)

ئەم بەڵگەیە ناودەبرێ بە بەڵگەی داواکردنی بەرزی و بەڵگەی تەواو کردن (إستكمال) یاخود بەڵگەی نموونەی هەرە بەرز (المثل الأعلی).

قەشە (ئەنسلیم) لە وێنەی یەکەمیدا دایڕشتووە، کە سەرچاوەی گرتووە لە بنەمایەك کە دانی پێدانراوە لەلایەن باوەڕدار و یاخی و خوانەناسان بە گشتی، ئەویش بریتیە لەوەی: هزرو بیرۆکەی خوا لە ناو عەقڵدا بوونی هەیە، جا خوانەناسان نکۆڵی لە ئەندێشەکردنی خوا ناکەن، بەڵکو نکۆڵی لە بوونی خوا ئەکەن.

ئەوانەی دوای قەشە (ئەنسلیم) هاتن ئەو بەڵگەیەیان بەجوانی تۆکمە تر کرد، تا وای لێهات تەواو کامڵ بوو لە ناو چوارچێوەی فەلسەفەی دیکارت دا، تەنانەت وای لێهات بدرێتە پاڵی، جا ناوەرۆکی لە وێنەیەکی کۆکەرەوەدا بەم شێوەیەیە:-

عەقڵی مرۆڤ هەر کە ئەندێشەی شتێکی گەورە بکات، ئەوا ئەندێشەی شتێکی گەورەتر لەو دەکات، چونکە وەستان لە پلەیەك کە بێ توانایی و دەسەوەسانی تێدابێت پێویستی بەهۆ هەیە، عەقڵی مرۆڤیش هۆی بێ توانایی و دەسەوەسانیەکە نازانێت، چونکە هەر شتێکی تەواو و کامڵ هەبێت ئەوا عەقڵی مرۆڤ هەوڵی گەیشتن دەدات بەشتی لەو تەواو و کامڵتر، تا دەگاتە کۆتایی کۆتاییەکان، کە ئامانج و مەبەستی کامڵ بوونی ڕەهایە کە نە زیاد و نەکەم دەبێت. ئەم بوونە کامڵە ڕەهایە بەبێ چەندوچوون هەیە، چونکە وێنە کردنی بە عەقڵ و ئەندێشە کردنی کەمترە لە بوونە ڕاستەقینەکەی، چونکە لە ڕاستیدا بوونی هەیە. لەبەر ئەمە سیفەتی کاملی ڕەهای لێ دەسەنرێتەوە،

---

[1] الله - عقاد: ١٩٦-١٩٧. و دراسات في الفرق ١٧٩.

بەهۆی نەبوونی بوونەکەی، بەم هۆیە نابێتە خاوەنی هیچ پلەیەکی کامڵ و تـەواو، بـەڵکو تـەنها کەم و کورتی ڕەها دەمێنێتەوە کە کاملّی نییە. جا تەنها وێنە و ئەندێشە کردنـی ئەم کاملّیە بەڵگەی بوونەکەیەتی[1].

## بەڵگەی پێنجەم: بەڵگەی ڕەوشتی (الأخلاقی)

فەیلەسوفی ئەڵمانی (کنت) ئەو بەڵگەیەی پێوانە کـردووەو کێشـاویەتی. وێنەکەیشـی بەم جۆرەیە:

نیشانەی دوررخستنەوەو ڕێگری ڕەوشتی یان بەڵگەی پێویست بـوون یـاخود نیشـانەی ویژدان ناکرێت هەبێت بەبێ بوونی خوا، چـونکە چـۆن دەکـرێ خـودی مرۆڤـــ خواناسـی بکات بە حەق، لە کاتێکدا لە بوونەوەردا پێوانەیەکی نەبێت بۆ حەق و لە دەروونیـدا ئـەم بوونەی نەڕواندبێت؟ تەنانەت چۆن لە سروشتی مرۆڤـــدا ئـەوە جـێگیر دەبێـت، شـتێکی پێویست و فەرز کە لەلای پەسەند نییە لە پێشترە لەلای ئەو لـەوەی گوێڕایـەڵ ببێـت بـۆ هەواو هەوەسی خۆی کە لەلای خۆشەویستە، ئەگەر کەسیش پەیی بەو نهێنیە دەروونـی و ویژدانییەی ئەو نەبات؟

ئەگەر وترا: نەریتی کۆمەڵایەتیە کە ئەم هەستەی لە دەروونداچەسپاندووە، تا گـۆڕاوە بۆ ویستێکی قبوڵ کراوە، ئەوا لە وەڵامدا دەڵێم:

زانینی هۆ نابێتە هۆکاری پوچەڵی ئامانج و مەبەست یاخود نابێتە هۆکـاری لاچـوونی دانایی و حیکمەت، ئێمە دەزانین: کە شەمەندەفەر بەهۆی کوڵاندنی مەنجەڵەکەی دەڕواتـە ڕێ. ئەندازیار شیشەکەی درێژ کردۆتەوە، چـونکە بـەهۆی کـاریی درێـژ کردنەکـەوە ئـەو کرێیەی دەست دەکەوێت کە پێویستی پێیەتی، بینەری وێستگە جوڵـەی شـەمەندەفەرەکە دیاری دەکات، چونکە ئەگەر بەچاکی ئەنجامی بدەن پاداشت دەدرێـن، ئەگـەر کارەکـەیان فەرامۆش کردبێت سزا دەدرێن.

---

[1] الله - عقاد ۲۰۰. و سەیری: دراسات في الفرق و العقائد الاسلامية بکە ڕای قەشە ئەنسلم و دیکارت و سپینوزا و جگەلەوانیش لەوبارەوە خستوەتەڕوو لە ۱۷۰-۱۷٤.

بەڵام هەموو ئەو شتانەی باسمان کرد، مەبەستەکە پوچەڵ ناکەنەوە، و مانای وانییە ڕێڕەوی شەمەندەفەڕەکە بەتاڵە لە حیکمەت و کارەکەش هەموو بەبێ ڕامان ئەنجام دراوە[1].

### ڕێکەوت (المصادفة)

وتیان: کە ڕێکەوت بوونەوەری بەدیهێناوەو ئەوەی لەناویشیدایە بەڕێوەی بردووە بەم شێوەیەی کە هەیە.

وەڵامەکەیشی ئەوەیە: پێویستە جیاوازی بکەین لە نێوان دوو شت:

یەکەمیان: بەدیهێنانی شت. بیرۆکەی ڕێکەوت زۆر لێی دوور دەکەوێتەوە، چونکە سەر دەکێشێت بۆ بەڵگەی خولی پوچەڵ، هەروەك پێشتر خستمانەڕوو.

دووەمیان: ڕێکخستنی شت و ئاوێتە و پێکهێنانی. ئەمە ئەو بابەتەیە کە جێگای تێڕەوانین و توێژینەوەیە.

دارشتەی یاسای ڕێکەوت پیت بە پیت بریتییە لە:

(إن حظ المصادفة من الاعتبار يزداد و ينقص، بنسبة معكوسة مع عدد الامكانات المتكافئة المزدحمة) واتە: بەشی ڕێکەوت بەشێوەیەك ڕەوچاو دەکرێت کە زیاد و کەم دەبێت، بەشێوەیەکی پێچەوانە لەگەڵ ئەندازەی ئەو توانا و گونجانە هاوتاو چۆنیەکەی کەڵەکە بووە.

بەڵام جێبەجێ کردنی ئەم یاسایە، لەسەر ماددەی بێ گیان دەبێت، جا توێژینەوەی گریمانەکە لەسەر پەستانی گاز بۆ ناو دەفر یان بۆریچکەیەك یان گازێکی ئاوێتە (تێکەڵە) ئەوا دەکرێت شتێکی دروست بێت، بەڵام ئەم توێژینەوەیە لەسەر خانە و زیندەکانی تر

---

[1] الله - عقاد ٢٠٠-٢٠١. و بە تێرو تەسەلی سەیری ئەم بەڵگەیە بکە لە: دراسات في الفرق و العقائد الاسلامية ١٨٣-١٨٦.

دەوەستێت و ناکرێت، چونکە پەیوەندی خانە لەگەڵ دیاردەی ژیان شتێکی دەراسا و سەر سوڕهێنە، تا ئەو ئاستەی کە یاسای ڕێکەوت لەو بوارەدا هیچ کاریگەیەکی نییە[1].

تا لەو یاسایە بگەین و شارەزا ببین کە ئەم یاسایە جێگای نابێتەوە لە ژیاندا، ئەوا چەند نمونەیەك دەخەینەڕوو:

١- مامۆستا (کریسی موریسون) دەڵێت: دە پسولەی ژماردار بخەرە ناو یەك گونیە و توورەکە (کیس)ەوە و دواتر ڕایانکێشە، دەبینیت کە:

هەڵی ڕاکێشانی ژمارە (١) بەرێژەی (١) بۆ (١٠)ەیە، چونکە دەکرێت هەر ژمارەیەك بەختی ڕاکێشانی بەر بکەوێت.

هەڵی ڕاکێشانی ژمارە (١) و (٢) بە ڕیزبەندی بریتیە بە ڕێژەی (١) بۆ (١٠٠)ە.

هەڵی ڕاکێشانی ژمارە (١) و (٢) و (٣) بەدوای یەکدا بەرێژەی (١) بۆ (١٠٠٠)ە.

هەڵی ڕاکێشانی ژمارە (١) و (٢) و (٣) و (٤) ڕیزبەندی بە ڕێژەی (١) بۆ (١٠٠٠٠٠)ە.

بەم شێوەیە.... تا هەڵی ڕاکێشانی ژمارە (١) بۆ (١٠) ڕیزبەندی بە ڕێژەی (١) بۆ (١٠) ملیار دەبێت[2].

٢- گریمان ئێمە ئەندازەیەکی زۆر پیتمان هەبوو، تۆش هەزاران جار هەوڵت دا کە پیت دوای پیت لەو کۆگا گەورەیەدا ڕابکێشیت، و بەڕیزبەندی بێ پێش و پاش پیتەکانت بەدوای یەکدا نووسیەوە، ئایا ئەگەر چەند جار ئەمەت دووبارە کردووە، ئەوا ئەو پیتانە دیوانی (موتەنەبی) لێ دروست دەبێت یاخود دیوانی (الیادە)ی (هومیروس) یاخود قورئانی پیرۆزی لێپێك دێت.....؟

---

[1] الطب محراب للايمان ١٤.

[2] العلم يدعو للايمان ٥١. و الطب محراب للإيمان ١٥.

٣- مامۆستا (فرانك ئالّن) دەڵێت: پرۆتینەکان لە پێکهاتە سەرەکیەکانن لە گشت خانە زیندووەکاندا. جا پێك دێن لە پێنج ڕەگەزی سەرەکی کە بریتین لە: (کاربۆن و ئایدرۆجین و نایترۆجین و ئۆکسجین و کبریت).

ژمارەی گەردیلەکان لە بەشی پرۆتین دا دەگاتە (٠٠٠ر٤٠) گەردیلە، جا لەبەرئەوەی ڕەگەزە کیمیاییەکان لە سروشتدا (٩٢) ڕەگەزن و بەشێوەیەکی هەڕەمەکی بڵاوکراونەتەوە، ئەوا گریمانی کۆبوونەوەی ئەو پێنج ڕەگەزە، بۆ ئەوەی بەشێکی پرۆتین پێك بێنێت، دەکرێت حیساب بکرێت، بۆ زانینی ڕێژەی ئەو ماددەیەی کە پێویستە بە بەردەوامی ئاوێتە ببێت، تا ئەو بەشە پێك بێت، دواتر بۆ زانینی درێژی ئەو ماوەیەی کە پێویستە بۆ ئەوەی کۆبونەوەی گەردیلەکانی ناو یەك بەش.

زانای بیرکاری سویسری (تشارلز یوجین جای) هەڵسا بە حیساب کردنی ئەم هۆکارانە بەشێوەیەکی باش، لە دەرەنجامدا بۆی دەرکەوت:

ڕێکەوت و هەڵ بۆ دروست بوونی بەشێك لە تاکێکی پرۆتین فەراهەم نابێت مەگەر بەنیسبەت (١) بۆ $(١٠)^{١٦٠}$ (واتە: بەڕێژەی ١ بۆ ١٠ کە ١٦٠ جار جارانی خۆی کرابێتەوە) بەمەش ژمارەیەك دێتە کایە کە ناتوانرێت بوترێت یان بە وشە گوزارشتی لێ بکرێت.

دەبێت بڕی ماددەی پێویست بۆ ڕوودانی ئەم کارلێکە بە ڕێکەوت بەشێوەیەك بێت کە ئەو ماددانەی بەشێك لە پرۆتین پێك دێنن زۆر زیاترو فراوانتر بن بە ملیۆنان جار لە بوونەوەر.

دروست بوونی ئەم بەشە لەسەر ڕووی زەوی بەتەنها لە ڕێگەی ڕێکەوت بە ئەندازەی $(١٠)^{٢٤٣}$ (واتە: ١٠ × ٢٤٣).

زانای ئینگلیزی (ج.ب.لیثز) ئەو ڕێگەیانەی ژماردووە کە دەکرێت گەردیلەکان پێی دروست بن لە یەك بەشی سادەی پرۆتیندا، بۆی دەرکەوت کە $(١٠)^{٤٨}$ ڕێگە هەیە.

بۆیە شتێکی ئەستەمە بەپێی عەقڵ کە ئەو هەموو ڕێکەوتانـە دروسـت بـن تـا یـەك بەش لە پرۆتین دروست دەبێت. بەڵام پرۆتین تەنها ماددەیەکی کیمیـایی پشـگیر لـە ژیـان نەبێت هیچی تر نییـە، بـەڵام ژیانیشـی نایەتەبـەر تـا ئـەو نهێنیـە سـەر سـوڕهێنەرەی نەیەتەبەر، کە هیچ نازانین لە نهێنیەکەی، ئەویش بریتیە لە عەقڵی بیٚ کۆتا کە بریتیە لە خوای گەورە بەتەنها[1].

٤- زانایان دەڵێن کە (ئەلیکترۆن) لە گەردیلـە بـە دەوری (پرۆتـۆن) دەسـوڕێتەوە بـە خێرایی (١) لە بەرامبەر (١٠٠ خێرایی تیشك)، بەڵام بەتەواوی ناتوانرێت ئـەوە بزانرێـت کە (ئەلیکترۆنەکان) لە کاتێکی دیاری کراودا لە کوێن.

لەلایەن کێشەوە:

کێشی بەشەکانی گەردیلە بەم شێوەیەیە:

کێشی (پرۆتۆن): نزیکەی بەشێك لە ملیۆن ملیار ملیار غرامە.

کێشی (نیترۆن): کێشەکەی نزیکی کێشی (پرۆتۆنە).

کێشـی (ئـەلیکترۆن): جـا (پرۆتـۆن) نزیکـەی (١٨٣٧) جـار یەکسـانە بەکێشـی (ئەلیکترۆن).

لەلایەنی مەوداوە: مەودای گەردیلە بەم شێوەیەیە:

---

[1] الله يتجلى في عصر العلم، و. د. دمرداش: چ ٣، ساڵی ١٩٦٨، ٩-١٠.

مامۆستا (لیسز) لە بەشی (فزیولوجي) لە زانکۆی (ئۆکسفۆرد) لە ساڵی ١٩٣٦ لە وتاری سەرەتای ساڵانەیدا ئەمەی وت: هەر پرۆتینێك پێکهاتووە لە زنجیرەیەك کە بریتیەلە سـەدان یەکە، و هەر یەکەیەکیش لە چەندین گەردیلەیەك پێکهاتووە، چەقی یەکەکە بریتییە لە ترشێك لە ترشەکانی ئەمینی (نوشادری)، ئەویش ئەو ترشانەن کە بیستیان ناسراون، دەشکرێت هەریەکەیان شوێنێکی جیا بگرێت و بە ڕێژەو ڕیز بوونێکی جیاواز، بەڵام کە سەیری ئەکەین دەبینین هەموویان بەیەك ڕیز و ڕێژە بەبێ جیاوازی و کەموکوری ڕێکخراون، جا ئایا دەتوانیت ئەندازەی وردی پێکهاتەکە بەخەیاڵی خۆتدا بێنیت کە ڕاست بپێکیت لە ناو ئەو هەموو گریمانە لە ژمارە نەهاتووانەی کە ئاماژە دەکەن بۆ هەڵە پێکان؟.

گەردیلە شێوەیەکی بازنەیی هەیە، کە تیرەکەی یەکسانە بە بەشێك لە (سەد ملیۆن) لە (سەنتیمتر)، و تیرەی ناوك زۆر بچوکترە لە تیرەی گەردیلە بە (دە هەزار جار).

جا بۆشاییەکی گەورە هەیە لە نێوان (پرۆتۆنات) و (ئەلیکترۆنات)، کە سەر تیایدا سوڕ ئەمێنێت، جا ئەگەر (دە ملیۆن) گەردیلە بە تەنیشت یەکەوە کۆبکرێنەوە، ئەوا درێژی ئەندازەکەی دەگاتە یەك (ملیمتر).

یەك غرام لە (هایدرۆجین) (٦٠٠) هەزار ملیار ملیار گەردیلەی تێدایە[1].

٥- دکتۆر (واین ئۆلت) دەڵێت: ئایا ئامێری ڕادیۆ بە هۆی ڕێکەوتەوە هاتە کایە و داهێنرا یاخود لە ڕێگەی دروست کردن و داهێنان؟

دەڵێین: ئایا ئەو ئامێرەی ڕادار، کە هەیە لە جەستەی شەمشەمە کوێردا، کە پێویستی بە ئاگادار کردنەوەی نییە لە گیانلەبەر، تەنانەت پێویستی بە چاکردنەوەش نییە، لەدوای خۆیشی بۆ نەوەکانی دەمێنێتەوە بەپێی نەوەکان؟

ئایا هەموو ئەمە لە ڕێگەی ڕێکەوتەوە بووە یاخود لە ڕێگەی دروست کردن و داهێنان؟ بێگومان ئەزمونی زانستی مرۆڤ لە پێکهێنان و پەیی بردن بەهۆکارەکان سەرچاوە دەگرێت، بەم پێیە ئەوەی سەرقاڵی زانستەکانە: ئەوا شتێکی لۆژیکیە کە پێویستە خۆی یەکەم کەس بێت کە ملکەچی بوونی عەقڵێکی داهێنەر بێت کە زانست و توانستی بێ سنور بێت و لە هەموو شوێنێك ئامادە بێت و بە چاودێری خۆی دەوری بەدیهێنراوەکانی دابێت[2]. بۆیە:

بیرکارناسی گەورە (جوزیف برترند) وتی: ڕێکەوت نە ویژدان و نە مێشکی هەیە[3].

(بول کلارنس ئەبرسولد) وتی: ئەو سیستەمە ڕێك و پێکە هەستپێکراوەی کە لەو

---

[1] الطب محراب للایمان ١٤. و لاپەڕەکانی دواتری، سەیری بکە لەبارەی گەردیلە و پێکهاتە و کێش و مەودا و نهێنیە سەر سوڕهێنەکانی دەدوێت.

[2] الله یتجلی في عصر العلم ١٣٢.

[3] الطب محراب للایمان ١٤.

بوونەوەرەدا هەیە، ملکەچی یاسایەکە کە دەستکردی مرۆڤ نیە، تەنانەت موعجیزەی ژیان بەخۆی سەرەتای هەیە، هەروەك لە پشت ئەو ژیانەوە ڕێنمایی و بەڕێوەبردن و ئاراستە کردنێك هەیە کە لە مرۆڤ بەدەرە[1].

گەورە زانایەکی سروشتناس وتی: زانست هیچ ڕاڤەیەکی بۆ ڕاستییەکان پێ نییە، وتنی ئەوەی کە ئەو بوونەوەرە بە ڕێکەوت هاتۆتەبوون ئەوا بە دژایەتی و تێکگیران دادەنرێت لەگەڵ بیرکاری دا[2].

شادفاش وتی: دەکرێ پرسیار بکەین لە هەر کەسێکی کە باوەڕی بەخوا هەبێت یان نا، بەوەی چۆن ئەو هاوسەنگیە لە بەرژەوەندی ئەودا خراوەتەگەڕ، ئەگەر ڕاست بێت کە بە ڕێکەوتی ڕووت هاتبێتە بوونەوە؟[3].

ئەفلاتۆن لەو فەیلەسوفە سەرەتاییانە دانراوە، کە باوەڕی بەخوای گەورە هەبووە و باوەڕی وابووە کە خوای گەورە بەدیهێنەری جیهانە و بەڕێوبەری کاروبارەکانیەتی، و چەندین بەڵگەشی لەسەر ئەم بیروباوەڕەی خۆی هێناوەتەوە، گرنگترینیان: بەڵگەی سیستەمە، لەوبارەشەوە دەڵێت: ئەم جیهانە، نیشانەیەکە بۆ ئەوپەڕی جوانی و قەشەنگی و یاسایی دا. هەرگیز نابێت لە ئاکامی هۆکاری ڕێکەوتن بێت، بەڵکو عەقڵێك بەدیهێناوە، تەواو و خێرمەندە و هەموو شتێکی بە مەبەست و دانایی و حیکمەت ڕێکخستووە[4].

دەزگاکانی هەواڵ و لەناویاندا دەزگای هەواڵی (تاس)ی سۆفیەتی لە ساڵی ۱۹۵۹ ئەو هەواڵەی خوارەوەیان گواستەوە: کە (ئەلیکساندر ئوبارین) سەرۆکی پەیمانگەی کیمیای زیندەگەری لە ڕوسیا دوای (۳۷) ساڵ لێکۆڵینەوە لە بنچینەی ژیان و گەڕان بەدوای

[1] الله يتجلى في عصر العلم ١٣٢.
[2] الاسلام يتحدى ٦٠.
[3] الاسلام يتحدى ٥٦.
[4] قصة الايمان ٤٠. و دراسات في الفرق ١٩٥ نقلا عن قصة الإيمان. و سەیری: الأديان للدكتور رشدي عليان و سعدون الساموك ٧٧.

ئەوەی کە ئایا دەکرێت خانەی سەرەتا لە ڕێگەی کارلێکی کیمیای بدۆزرێتەوە، ڕایگەیاند: (ژیان ناکرێت لە نەبوون (عدم)ەوە سەرچاوە بگرێت یان لەکارلێکی کیمیایی لە دایك بێت و بە شێوەیەکی ناوەخۆیی بێتە کایە، و زانست نابێت بکۆڵێتەوە لەو شتانەی کە لە دەرەوەی سنورو چوارچێوەی ماددەن) [1].

دوای هەموو ئەمانە دەڵێین:

پاش ئەوەی گریمانی ڕێکەوت (ڕێکەوتن) نەما لە بەدیهاتنی بوونەوەر و ڕێکخستنە تۆکمەکەیدا، دوای ئەوەی بەڵگە بەرپاکرا لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە بەدیهێنەری بوونەوەرو بەڕێوبەری کاروبارەکانیەتی، ئەوا بە بەڵگەی عەقڵی و زانستی گومان هەڵنەگر چەسپێنرا، کە خوای گەورە پێویستە بوون (واجب الوجود)ە، و هەر خوای گەورەیە هۆی بەدیهاتنی بوونەوەران و سەرچاوەی ژیانبەخشی بەدیهێنراوانە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۝٣ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ﴾ الإخلاص: ١-٤. واتە: (ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)، ئەی ئیماندار) بڵێ: ئەو خوایەی کە ناوی - الله -یە خوایەکی تاك و تەنهایە "بێ هاوەڵ و هاوتایە". خوا زاتێکی پایەدارو دەسەڵاتدارە، نیازی بەکەس نیە هەمووان ئاتاجی ئەون، هەر ئەو دەتوانێت بەڵاو ناخۆشی لابەرێت و پێویستی و داخوازیەکانمان جێبەجێ بکات. هیچ کەسی لێ نەبووەو لە کەسیش نەبووە، هەرگیز هاوتاو هاوشێوەو دەسەڵاتدارێکی تر نیە کە لە بەرامبەریەوە بوەستێت و هاوشانی بێت).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ۚ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ۚ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَىْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ ۚ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفْظُهُمَا ۚ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْعَظِيمُ ﴾ البقرة: ٢٥٥. واتە: (خوا زاتێکە جگە لەو هیچ خوایەکی تر نیە کە شایەنی پەرستن بێت و هەمیشە زیندووەو ڕاگرو سەرپەرشتیاری "هەموو

[1] کبری الیقینیات الکونیة ١٣١.

دروستکراوەکانیەتی"، نە وەنەوز دەیگرێت و نــە خــەو - چــونکە ڕاگــرو سەرپەرشــتیاری بونەوەرە -، هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە هەر ئەو زاتە خاوەنیانە، کێیە ئەوەی "دەتوانێت" تکا بکات لەلای ئەو، بەبێ مۆڵەتی خۆی، دەشزانێت چی لە ئێستاو داهاتوو و ڕابووردودا ڕوویداوەو ڕوودەدات، هیچ کام لە دروستکراوانی زانست و زانیاری تــەواویان نییە دەربارەی زانیاری و زانستەکانی ئەو، مەگەر بەوەی کە خۆی بیەوێت فێریان بکــات، فەرمانڕەوایی و دەســەڵات و زانینــی ئــەو زاتــە هــەموو ئاسمانــەکان و زەوی گرتۆتــەوە و پارێزگاریان بەلای خوای گەورەوە هیچ گران نییە و ماندووی ناکات و هــەر خوایــە بــەرزو بڵند و گەورەیە).

### لە هۆشی کراوەدا جێگای بێ باوەڕی نابێتەوە

د. جون کلیفلاند کوسەران، وتی:

لۆرد کلیفی - یەکێکە لە زانا سروشتناسە هــەرە دیارەکــانی جیهــان - ئــەو ڕســتەیە بایەخدارەی وت: (ئەگەر بەشێوەیەکیووردو زۆر قــووڵ بــیر بکەیتــەوە، ئــەوا زانســتەکان ناچارت دەکەن کە باوەڕ بێنیت بە بوونی خوا)، بەپێویستی دەزانم کە تــەواوی ڕەزامەنــدی خۆم ڕابگەیەنم لەسەر ئەم وتەیە[1].

فەیلەسوفی ئینگلیزی (بیکۆن) دەڵێت:

(قوڵ بوونەوە لە فەلسەفە بە ئەندازەیەکی کەم مرۆڤــ بەرەو بێ باوەڕی دەبات، بــەڵام بە قوڵبوونەوەو ڕۆچوون لە فەلسەفە مرۆڤــ بەرەو ئایین دەباتەوە)[2].

د. وتــز ڕاگــری کۆلیــژی پزیشــکی لــە پــاریس و ئەنــدامی ئــەکادیمیای زانســت و کیمیایگەری دەڵێت: (ئەگەر هەر کاتێك لە کاتەکان وا هەستم کرد کە باوەڕی من بــەخوا لەرزی تێکەوتووە، ئەوا ڕووی خۆم ئەکەمە ئەکادیمیای زانستی بۆ چەسپاندنی).

---

[1] الله يتجلى في عصر العلم ٢١، و زانای سروشتناس (ئۆلیفر وندل) وتەیەکی نزیك لەو جۆرەی وتوە: ٥٢.

[2] الله يتجلى في عصر العلم ٣٥.

باسکال وتویەتی:

(تەنها دوو بەش لە خەڵکی پێویستە بە خاوەن عەقڵ ناویان بەرین: یەکـەم: ئەوانـەن کە خوا ئەناسن، دووەم: ئەوانەن دەکۆڵنەوە لە بوونی خوا چونکە نایناسن).

ئەنشتاین وتویەتی:

(باوەڕ بەهێزترین و بەنرخترین دەرەنجامی لێکۆڵینەوە زانستیەکانە).

بەهەمان شێوە وتویەتی:

(باوەڕ بەبێ زانست وەك کەسێکی شەل دەچێتە ڕێ. زانسـتی بـێ بـاوەڕ، وەك دەسـت کوتان و دەستگێڕانی کەسی کوێرە).

ئەدمون هربرت زەوی ناسێکی بەناوبانگە، و مامۆستایە لە زانکۆی (سوربون) دەڵێت: (ناکرێت زانست مرۆڤــ بەرەو بێ باوەڕی و ماددەگەرایی و گومانداری کێش بکات)[1].

ئەمەیە ڕاسـت پێکـان، چـونکە حـەق و ڕاسـتی شـاراوە نییـە لەلایـەن زانـا عـەقڵ ڕووناکەکان، ئەوانەی کە پەیی بەو بەڵگانە دەبەن کە کەمێك پێش ئێستا خستمانەڕوو، و ئەو بەڵگانەی کە بوونی خوای گەورە دەچەسپێنن و دەسەلمێنن.

بەڵام ئەوانەی نکۆڵی بوونی خوا دەکەن، بەبەڵگـەی ئـەوەی بـە هەسـتەکانیان پـەییان بەخوا نەبردووە، ئەوا ئەوانە وا ئەندێشە دەکەن کە تەنیا هەستەکان بریتین لـە سەرچـاوەی زانین.

بەڵام واقیعی ئەوان ئەو بانگەشەیەیان بەدرۆ دەخاتەوە:

باوەڕیان بە هێزی کێشندە و موگناتیسـی و کارەبـایی هەیـە، و باوەڕیـان بـە بـوونی (ئەلیکترۆن و پرۆتۆن و نیترۆن و عـەقڵ) هەیە، کەچی هیچ یـەکێك لەمانـەیان نـەبینیوە، تەنها شوێنەواری ئەوانیان بینیوە.

هەرچیش نکۆڵی بوونی خوای گەورە بکـات بـەوەی کـە نـەیبینوە، و باوەڕیشـی بـەو ڕاستیە زانستیانە بوو، ئەوا ئەو کەسە تەنها فێڵ لە خۆی دەکات، چونکە عـەقڵ پەیی بەو

---

[1] الطب محراب للإيمان ٢٥٧ وروح الدين الإسلامي ٦١.

شتانە بردووە نــەوەك هەســتەکان، چــونکە هەســتەکان هەنـدێ جـار بەهەڵـەدا دەچـن، و هەستەکانیش تەنها بریتین لە چەند ئامرازێك و ئامرازەکـانی حوکمیشـی داوەتـە دەسـت عەقڵ تا حوکمی خۆی دەربکات.

## هەڵخەڵتان و بەهەڵە داچوونی هەستەکان

ناکرێت پشت ببەسترێت بە هەستەکان، چونکە زۆرجار خاوەنەکەی هەڵ ئەخەڵـەتێنێت. نمونە لەمبارەوە زۆرن، لەوانە:

### هەڵخەڵتانی چاو:

١- ئەو دارەی نقومی ناو ئاو کراوە بینەر وا ئەزانێت شکاوە.

٢- چاو شوشەی صافی تەواو پاك نابینێت، لەگەڵ ئەوەی شتێکی بینراوەو هەیە.

٣- چاو دێرەکانی کتێب نابینێت کە زۆر لێی نزیك بوبێتەوە.

٤- زانایانی دەروونناسـی دەڵـێن: ئەگـەر بـەردەوام تەماشـای خاڵێکـت کـرد لەسـەر دیوارێك، دواتر تەماشای دیـوارێکی تـرت کـرد، ئـەوا هـەمان خـاڵ لـە دیـواری دووەمیشدا دەبینیت، کەچی ئەو خاڵە لە دیواری دووەمدا نییە.

٥- نەخۆش چەند تارمایی و زەلامێك دەبینێت کەسانی تر نایبینن.

### هەڵ خەڵەتانی گوێ:

١- گوێ دەنگی زۆر نزم نابیسێت هەروەك دەنگی زۆر تووندو تیـژیش نابیسـێت، وەك دەنگی کەڵە ئەستێرەکانی ئاسمان، هەروەك بۆمبای گەردیلەیی دەتەقێنرێتەوە ئـەوا گوێ تەنها ئاگای لە دەنگ و هاڕژنی یەکەم دەبێت، ئاگای لە تەقینەوەکانی دواتـر نابێت، سەرباری ئەوەی ئامرازەکان ژمارەی زۆر بەرزیان تۆمـار کـردووە، ئەمـەش لەبەر ئەوەی بەشی (ئەوتار کورتی) لە گوێدا تەنها لەرەیەکی دیـاریکراو ئـەتوانێت ببیسێت و ناتوانێت نزمتر یان بەرزتر لەمە ببیسێت.

٢- نەخۆش چەند دەنگێك دەبیسێت کە کەسانی تر نایبیستن.

**هەڵ خەڵەتانی دەست لێدان:**

ئەگەر ئاوی گەرم و شیلەتین و ساردت کردە ناو سێ دەفرەوە، و دواتر دەستت کردە ناو ئاوی گەرمەوەو پاشان خستتە ناو ئاوی شیلەتینەکە، ئەوا هەست بەسارد بوونی دەکەیت. ئەگەر لە شیلەتنەوە بگوازیتەوە بۆ ساردەکە ئەوا هەست بەسارد بوونی زۆر دەکەیت، ئەمەش لە هەڵ خەڵەتاندنی هەستی دەست لێدانە.

***هەڵ خەڵەتانی هەستی تامکردن:***

١- چەند ماددەیەك هەن کە بێ تامن و هەستی تامکردن ناتوانێت کاری لەسەر بکات.

٢- ئەگەر شتێکی زۆر شیرینت خوارد، دواتر شتێکت خوارد کە شیرینیەکەی کەمتر بوو لەوەی یەکەم، ئەوا هەست ناکەیت کە دووەمەکە شیرین بێت.

٣- نەخۆش تامی تاڵ دەکات لە ئاوی سازگار.

٤- هەر دوو هەستی دەست لێدان و تامکردن ناتوانن ترشەکان و پێکهاتە کیمیاییە سوتێنەرەکان بناسن[1].

ئەمانە و نمونەکانی تریش ئەوەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە کە زۆر جار هەستەکان هەڵ دەخەڵەتێن، ناکرێت پشتی پێ ببەسترێت لە ئاشکرا کردنی ڕاستیەکاندا، لەبەر ئەمەشە کە عەقڵ حوکمڕان و حوکمدەرە بەسەر هەستەکان دا.

کەواتە هەستەکان تەنها ئامڕازن.

ئینجا چۆن دەکرێت بوترێت: کە خوای گەورە بەر هەستەکان ناکەوێت، بۆیە پێویست نییە باوەڕی پێبهێنرێت؟ ئەم وتەیە تەنها کەسێکی نەزانی نەفام دەیکات کە هیچ عەقڵی نەبێت.

---

[1] نداء الروح - فاضل السامرائي، بغداد - چاپخانەی (الاسلامية) ٢٣-٢٧.

## هۆکارەکانی بێ باوەڕی و گومڕایی

باوەڕ بوون بە بوونی خوای گەورە، بریتیە لەهەمان ئەو بیروباوەڕە فیترِیەی کە خـەڵکی لەسەری بەدیهێنراوە. بنچینەی هەموو ئەو شتە لاوەکیانەیە کە دەچێتە نـاو چوارچـێوەی ئایینی ئیسلام.

بێ باوەڕی حاڵەتێکی لە ناکاوە کە بەسەر فیترەتدا دێت، و قورئانی پیرۆز هۆکارەکانی دیار کردووە، بەمانەی خوارەوە:

### ١- خۆ بەزلزانین:

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ نَرَىٰ رَبَّنَا ۗ لَقَدِ ٱسْتَكْبَرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ وَعَتَوْ عُتُوًّا كَبِيرًا ﴿٢١﴾ يَوْمَ يَرَوْنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ لَا بُشْرَىٰ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُجْرِمِينَ﴾ الفرقـان: ٢١ - ٢٢. واتە: (ئەوانەی کە بە ئومێدی دیداری ئێمە نین وتیان: ئەوە بۆ فریشـتە دانەبـەزێنرا بۆ لامان (تا دڵنیابین لە حەقیقەتی قورئان و پێغەمبەر) یـاخود پـەروەردگارمان بەچـاوی خۆمان ببینین، سوێند بەخوا بێگومان ئەوانە لە دەروونی خۆیاندا خۆیان بەگەورە دەزانـن، لە سنور ترازاون و سەرکەشیان بێ ئەندازەیە. ئەو ڕۆژەی کە فریشتەکان دەبینن هیچ جۆرە مژدەیەك بۆ تاوانباران نییە).

لەم ئایەتەدا: ئەوە ڕوون کراوەتەوە، کە خۆ بەزلزانین ئەوانی هانداوەو پاڵناوە بۆ ئەوەی وا ئەندێشە بکەن کە ژیان هەموو شتێکە و نەمانی لە دواوە نییە.

### ٢- لادان و یاخی بوون:

﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبْنِ لِى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَٰبَ ﴿٣٦﴾ أَسْبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبًا ۚ وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ﴾ غافر: ٣٦ - ٣٧. واتە: (فیرعەون بە هامانی وت: ئەی هامان بورجێکی بەرزم بۆ دروست بکە، بۆ ئەوەی هەندێ هۆکارم دەست بکەوێت!!. هۆکـاری بـەرز بوونـەوە بـۆ ئاسمانەکان، تا لەوێوە سەرکەوم و نهێنیەکانی شارەزا ببم سەردانێکی خوای موسا بکەم و

ببینم!! هەر چەندە من دڵنیام کە درۆزنە!!، ئابەو شێوە کارو کردەوە ناشرینەکان لای فیرعەون جوانکرا، لە ڕێبازی ڕاست و دروست لادرا). لە ئایەتەکەدا ئەوە ڕوونکراوەتەوە، کە ڕێبازی فیرعەون ڕێبازێکی هەڵەیە، یاخی بوونەکەی بووە هۆی دەرچوون لە ڕێگەی ڕاست، کە لەوێوە خوای گەورە دەناسرێت.

### ٣- ستەم:

﴿ فَقَدْ سَأَلُوا۟ مُوسَىٰٓ أَكْبَرَ مِن ذَٰلِكَ فَقَالُوٓا۟ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ بِظُلْمِهِمْ ﴾ النساء: ١٥٣. واتە: ئەوانە بەڕاستی داوای گەورەتریان لە موسا کرد، وتیان: دەمانەوێت خوامان بە ئاشکرا نیشان بدەیت، ئەوسا هەورە بروسکەیەك لێیدان لە سەرەنجامی ئەو ستەمە ناڕەوایە.

جا وشەی (بەهۆی ستەمیان) ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە ئەو پاڵنەرەی پاڵی پێوەناون تا ئەو جۆرە داوایە بکەن بریتیە لە ستەم، ستەمی دووری لە ڕاستی، چونکە ڕاستی دەناسێت و خۆیشی لێ نەناس دەکات.

ستەم (پێچەوانەی دادگەرییە) پاڵی بە بێ باوەڕانەوە نا تا تۆمەت بۆ باوەڕداران هەڵبەستن کە: خەیاڵاوی و خەڵەفاو درۆزنن و کەسانێکی هەست و نەست جۆش و خرۆش دراو.... هەر هەمان تۆمەت ئەمڕۆش دەیبینین کاتێك دەڵێن: ئەوانە زانستی نین، ڕاستگۆ نین، شڵەژاون، و هەڵ خەڵەتاون.

### ٤- نەزانین:

خوای پاك و بەرز دەفەرموێت: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ لَوْلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ أَوْ تَأْتِينَآ ءَايَةٌ ۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّثْلَ قَوْلِهِمْ ۘ تَشَٰبَهَتْ قُلُوبُهُمْ ۗ قَدْ بَيَّنَّا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾ البقرة: ١١٨. واتە: (جا ئەوانەی نەفام و نەزانن دەیان گوت: بۆ خوا لەگەڵ ئێمە گفتوگۆ ناکات؟! یان موعجیزەو نیشانەیەکمان بۆ نایەت؟! (شایەنی باسە)

کەسانی تریش پێش ئەمان هەمان قسەیان دەوت، ئەمانە دڵەکانیان چوونیەکەو لەیەك دەچێت (شێوازی دەربڕینیان جیاوازە)، بێگوکان ئێمە چەندەها بەڵگەو نیشانەی ئاشکراو رووغان دیاری کردووە بۆ ئەو کەسانەی کە ڕاستی خوازن و بەشوێن حەقیقەتدا دەگەڕێن).

لەم ئایەتەدا ئەوە روون کراوەتەوە کە ئەمە وتەی کەسانێکی نەزانە نەك زانایان، تەنانەت شتێکی نویٚ نییە، بەڵکو ئەمە بەردەوام لۆژیك و مەنتیقی تاکی بێ باوەڕە، بەهۆی وێکچوونی دڵەکانیان، و ئەوەشی چەسپاند کە ڕێگەی بەرەو خواچوون بریتییە لەو شوێنەوارو نیشانانەی ئاماژەن بۆی[1].

## زانست بانگەشە بۆ ئیمان و باوەڕ دەکات

ڕۆژێك لە ڕۆژان زانست بانگەوازی نەکردووە بۆ بێ باوەڕی و کوفر، چونکە ڕێبازو پەیڕەوێکی سەلامەت دەگرێتەبەر بۆ گەیشتن بە ڕاستیەکانی بوون و رووخسارەکانی بوونەوەر.

ڕۆژێك زانست نەیوتوە: ئەم سیستەمەی جیهانی لەسەر دەڕوات بە ڕێکەوت دروست بووە، چونکە ڕێکەوت پشێوییە. ئەو زانایەی شیکاری بکات لە تاقیگە یان لەگەڵ ڕوانگە ژیاوە یاخود هەڵسوکەوتی کردبێت لەگەڵ ژمارەدا ... دان نانێت بەهیچ شتێکی تر جگەلە سیستەم، و بەستنەوەی هۆ و هۆکار و پێشەکی و دەرەنجام بەیەکەوە، و بەدڵنیاییەوە دان دەنێت بەوەی کە یاساکانی سروشت وەك کێشندە و کارەبا و لاسلکی... جگەلەمانەیش ملیۆنان وێنە، هەموو ئەمانە تەنها بریتییە لە چەندین شوێنەوار کە ئاماژە و نیشانەن بۆ کارتێکەر و کاریگەرەکە کە خوای پاك و بەرزە... زانایان جەختی زۆریان لەم لایەنە کردۆتەوە بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا.

د. ماریت شانلی کونجدن، یەکێکە لە گەورە زانایانی سروشت ناس، دەڵێت: (هەموو ئەو شتانەی لە ناو بوونەوەردان شایەتی و گەواهی دەدەن لەسەر بوونی خواو تواناو مەزنایەتیەکەی، و کاتێك ئێمەی زانایان هەڵدەستین بە شیکردنەوەی ڕوکارەکانی بوونەوەر

[1] الله: سعيد حوى ١١-١٣.

و توێژینەوە لێی و ئەگەر ڕێگەی بەڵگە هێنانەوەش بەکاربێنین، ئەوا ئێمە تەنها سەرنجی شوێنەواری دەستی توانست و قودرەت و گەورەیی خوای گەورە دەدەین).

کاتێك (ئەنشتاین) لە کتێبخانەی ئەو زانکۆیەدا دانیشتبوو کە قوتابی بوو لێی، ڕۆژنامە نوسێك پرسیاری لێکرد: ئایا لە زانستەوەیە کە باوەڕت بەخوا هەبێت، ئەم بیروباوەڕەش هزرێکی بەرهەست نییە، بەڵکو شاراوەو غەیبییە، کە ملکەچی تاقیگەی زانست نییە؟

وەڵامی دایەوە: سەیری ئەم کتێبخانەیە بکە کە ملیۆنان کتێبی تێدان، ئایا هەر کتێبێك نووسەرێکی نییە؟

وتی: بەڵێ.

وتی: ئەگەر منداڵێك چووە ناو کتێبخانەوە، ئایا پەیی دەبات بەو زانست و زانیارییەی کە لەو کتێبانەدا هەیە؟

وتی: نا.

وتی: ئایا نووسەرەکانی دەناسێت؟

وتی: نا.

وتی: ئایا پەیی نەبردنی منداڵەکە بە کتێب و نووسەرەکانیان، دەبێتە بەڵگەیەکی زانستی لەسەر نەبوونی کتێبخانەکە؟

وتی: نا.

وتی: بەهەمان شێوە بوونەوەر بەو هەموو وێنەو ڕوخسارو یاسایانە وەك نموونەی پێشوە. کە عەقڵە سادە نەزانەکان پەیی نابەن و ڕانامێنن لە بەدیهێنەرەکەی، ئەوا ئەمە نابێتە بەڵگەیەکی زانستی لە سەر ئەوەی کە بوونی نییە. دواتر (ئەنشتاین) باسی وردی و ڕێك و پێکی ئەو سیستەمی بوونەوەری دەکرد کە سەرنجی داوەو هیچ کەلێنێك ناهێڵێتەوە بۆ گومان هەبوون لە بوونی خوای پایەبەرز.

لەوانەیە هەندێ کەس وای بۆ بچن کە ئەمانە تەنها چەند نمونەیەکن لە نمونەکان، چەند کەسێکی وای لەپشتەوە نەبووە کە سەرنج ڕاکێش بن لەناو ئەو ژمارە زۆرەی بێ باوەڕاندا.

بەڵام لە ڕاستیدا: زۆربەی زانایان ئەو مەزهەبەیان هەڵبژاردووەو جەختیان کردۆتەوە کە زانست ڕێگەی باوەڕە، زانای ئەڵمانی (د. دینرت) لێکۆڵینەوەیەکی بڵاوکردەوە، تیایدا بۆچوونی گەورە زانایانی ڕوونکردەوە لە چوار سەدەی کۆتایی و لە بیروباوەڕی ئەوانی کۆڵیوەتەوە و بۆی دەرکەوت لە دەرەنجامی لێکۆڵینەوە لەسەر (٢٩٠) زانا کە:

٢٤٢ زانا لە کتێب و لێکۆڵینەوەکانیاندا ئەوەیان ڕاگەیاندووە کە باوەڕیان بەخوا هەیە.

٢٨ زانا بەهیچ بیروباوەڕێك نەگەیشتوون.

هەروەها ٢٠ زانا بێ ئاین بوونە و گرنگیان بەلایەنی ئایینی نەداوە.

ئەمەش واتای وایە کە (٩٢ ٪)ی زانایان باوەڕیان بەخوا هەبووە.

ئەگەر بگەڕێیتەوە بۆ کتێبی (الله، بحث في نشأة العقيدة الالهية - عەقاد) و (عقائد المفكرين في القرن العشرين - عەقاد) و (العلم يدعو للايمان - کریس موریسۆن) و (الله يتجلى في عصر العلم) دانراوی کۆمەڵە زانایەکە، (قصة الايمان - شێخ نەدیم جسر)، ئەوا ناوی زۆرێك لە زانایان دەبینی کە جەخت دەکەنەوە لەسەر باوەڕ بوون بەخوای گەورە.

دواتر زۆرێك لەو زانایانەی کە تۆمەتبار کراون بە بێ باوەڕی و بێ دینی، ئەوا بە تێڕوانینی زانست بێ دین نەبوونە، بەڵکو بە تێڕوانینی کلێسا بێ دین و ئاین بوونە کە هەر کەسێك ڕای پێچەوانەی کلێسا بوویێت ئەو حوکمەی بەسەردا دراوە، وەك (تۆلستۆی) کە بێ دین بووە بە تێڕوانینی کلێسا، لەڕاستیدا باوەڕێکی قوڵی هەبووە بە خوای گەورە، هەروەك ئەمە لە کتێبەکەیدا (اعترافات تولستوي) دا دیارە.

ئەو زانایانەی کە بێ باوەڕ بوونە بەخوای گەورە، ئەو بێ باوەڕ بوونەیان دەرەنجامی لێکۆڵینەوەیەکی زانستی ورد نەبووە، بەڵکو لەبەر چەند شتێك بووە لەوانە:-

١- ئەو هەڵوەستە توندو تیژەی کلێسا لە بەرامبەر زانایان و پشتگیری نەکردنی هزری ئازاد، و حوکمی بێ باوەڕی و بێ دینیان بەسەر درا، و بەشێوازێکی زۆر

درندانە حوکمی سوتاندن و ناشرین کردن و کوشتن بەسەر دەیان کەسدا جێبەجێ کرا و کتێبەکانیان سوتێنران، و هەڕەشەی کوشتنیشیان کرد لەوەی کە ئەو کتێبانەی لەلا بێت.

لە کتێبی (قصة النزاع بين الدين و الفلسفة) دانراوی: د. تۆفیق تەویل چەند لیستێکی تێدا هەن ناوی ئەو زانایانەی تێدا نووسراوە کە زۆر بە درندەیی و دوور لە خەیاڵ سوتێنران، تا ئەمە لە هۆشی هەندێ لە زانایان جێگیر بوو کە بانگەشە کردن بۆ بێ دینی شتێکی زۆر پێویستە بۆ ڕزگار کردنی زانایان لەو درندەیی و ترسناکییە.

لە ڕاستیدا بێ دینی ئەو زانایانە وەك بنەمایەك نەبووە، بەڵکو هەڵوێستێك بوو لە بەرامبەر کلێسادا، تا ئەو کاتەی کە ئەو ترس و دڵەڕاوکێیە نەما ئەوا گەڕانەوە سەر هاندان بۆ باوەڕ هێنان، ئەمەش بە بەڵگەی ئەوەی کە ژمارەی ئەو زانایانەی کە باوەڕیان بە خوای گەورە هەیە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەبێت.

٢- هەڵوێستی ستەمکاری کلێسا لە بەرامبەر چەوساوەو کۆیلە و ستەم لێکراوان، بەوەی کە هەڵوێستی ناوبراو لە پاڵ پاشا و داگیرکار و دەرەبەگەکان بوو، و پاپاکانیش خاوەنی دەسەڵاتی ڕاستەقینە و سەروەت و سامان و پسولەی لێخۆش بوون... بوون.

ئەم هەڵوێستە زۆرێك لە هزرمەندانی پاڵنا بۆ بانگەوازی کردنی فڕێدانی کلێسا، هەڵبژاردنی بێ دینی بۆ ڕزگارکردنی ستەمدیدە و ژێردەستەکان لەو ستەم و ئازارەی کە دەیانچەشت.

٣- پەڵاویشتنی جولەکەی جیهانی لە ڕێگەی (ماسۆنیەت)، کە هزری بێ دینی دەچەسپاند بۆ زاڵ بوون بەسەر کۆمەڵگەی مەسیحی، و ئەم ئاراستەیە هەمان ئاراستەی ماسۆنیەتی بێ دینە کە زۆر بەڕوونی بەدەرکەوت لە کۆمەڵەی

(ئینسکلوپیدیا) و شوێنەکەوتوو و قوتابیـەکانی دا، و شۆڕشـی فەڕەنسـی لەسـەر شان و باڵی ئەوانەوە هەڵسا.

٤- بێ دینی لە هەموو کات و شوێنێکدا ڕێگەیەکـە بـۆ بـەڕەڵایی و خۆدزینـەوە لـە نمونەی بەرز، بۆیە بێ دینی پەناگەی هەواو هەوەسباز و ڕەوشت لادەرەکانە.

### پوختەی قسە:

ئەوەیە کە بێ دینی هەڵوێستێکی ڕەسەنی زانست نەبووە، بەڵکو چـەند بـارودۆخێکی تایبەتی دروست کردووە، بەڵام ڕێبازو پەیڕەوی زانستی خاڵی دەسـتپێکی ناسـین و بـاوەڕ هێنان بە خوای گەورەو ڕێز لێگرتنیەتی[1].

[1] العلم ليس كافرا ٨ و لاپەڕەکانی دواتر. و بڕوانە: ئاماری (دینرت) لە کتێبی: روح الدين الاسلامي ٦٠. و الطب محراب للايمان ٢٥٦. بکە.

## دەروازەی دووەم

## ناوە هەرەچاك و جوان و پیرۆزەكانی خودا

بێژەو دەربڕینی (ناوە پیرۆزەكانی خوا) لە چوار شوێنی قورئانی پیرۆزدا هاتووە:

١- ئـــەم فەرمایشـــتەی خـــوای گـــەورە: ﴿ وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَـٰٓئِهِۦ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ الأعـراف: ١٨٠. واتـە: (هـەر بـۆ خوایە هەموو ناوە جوان و پیرۆزەكان بەو ناوانە دوعا و نزا بكەن و هاناو هـاواریش بۆ ئەو زاتە بەرن، واز بهێنن لەوانەی كە لە ناوە پیرۆزەكانی خوادا لادان دەكەن، لە ئایندەدا پاداشتی ئەو كارو كردەوانەیان وەردەگرن، كە ئەنجامیان دەدا).

٢- خـــوای بـــێ وێنـــە دەفـــەرموێت: ﴿ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ أَوِ ٱدْعُوا۟ ٱلرَّحْمَـٰنَ ۖ أَيًّا مَّا تَدْعُوا۟ فَلَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴾ الإسـراء: ١١٠. واتە: (پێیان بڵێ: ئێوە لە نزاو دوعاتانـدا هـاوار لە "الله" بكەن یان بە سیفەتی پیرۆزی "الـرحمن" هانـای بـۆ بـەرن، بەهـەر نـاوو سیفەتێكی جوان هاوارو نزا بكەن دروستە، چونكە ئەو خـاوەنی هـەموو سـیفات و ناوە پیرۆزو جوانەكانە).

٣- خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴾ طه: ٨. واتە: ("الله" زاتێكە كە جگە لـەو خوایـەكی تـر نییـە، هەرچـی نـاوە پـیرۆزو سـیفاتە جوانەكان هەیە هەر شایستەی ئەوە).

٤- هـــەروەها دەفـــەرموێت: ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْخَـٰلِقُ ٱلْبَارِئُ ٱلْمُصَوِّرُ ۖ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴾ الحشـر: ٢٤. واتە: (هەر ئەو خوایە بەدیهێنەرو دروستكارە، نەخشەو وێنە كێشـەرە، ناوە پیرۆزو جوانەكان هەر شایستەی ئەون).

هۆی هاتن و دابەزینی ئایەتەکە:

پیاوێك لە نوێژەکەیدا پاڕایەوە لە خوای گەورە هاواری کرد و بە ناوی (الرحمن) هانای بۆ برد، جا "ئەبو جەهل" وتی: ئایا موحەممەد و هاوەڵانی واگومان نابەن کە یەك خوا دەپەرستن، ئەی ئەو کابرایە چیەتی و بۆچی لە دوو خوا دەپاڕێتەوە؟ جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ﴾ الأعراف: ١٨٠. وەك ناوەکانی: (الرحمن، الرحيم، الملك، القدوس، ناوەکانی تر)، جا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کابراکەی بانگ کرد و پێی فەرمو: هاواری خوا بکە یان بە ناوی (الرحمن) هانای بۆ ببە، سەرباری ڕازی نەبوونی هاوبەشدانەران[1].

ڕاڤەکارانی قورئان ڕاجیان لەبارەی واتای ئەو نزاو دوعایەی کە لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ أَوِ ٱدْعُوا۟ ٱلرَّحْمَـٰنَ ﴾ الإسراء: ١١٠. بۆیە ئەم چەند ڕایەیان هەیە:

ڕای یەکەم: نزاو دوعاکە بە مانای ناونانە (واتە: ناوی بنێن) بەمانای هاوار کردن نایەت، چونکە کار (فعل)ی (أدع) سنوور بەزێنی کردووە بۆ دوو بەرکار، دەڵێیت: ناوم لێنا زەید، دواتر ناوێکی فەرامۆش کردووە، چونکە پێویستی پێ نەبووە، جا دەوترێت: زەیدم بانگ کرد، (أو) بۆ سەرپشکی بوونە، جا بەم پێیە ماناکەی: ئەم دوو ناوەی هێناتان و خواتان پێ ناونا ﴿ فَلَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴾، چونکە مادەم هەموو ناوەکانی خوا جوان و پیرۆزن ئەوا ئەو دوو ناوانەش پیرۆزو جوانن چونکە ئەمانیش دوو ناون لە ناوەکانی خوان.

ئەمە ڕای زەمەخشەرییە[2].

---

[1] بحر العلوم للسمرقندي ٥٨٤/١. و سەیری ئەمەش بکە: تفسير الكشاف ٤٧٠/٢ عن ابن عباس، وتفسير ابن عطية ١٥٣/٦. هەموویان ئەم هۆیەیان لەبارەی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتەیان هێناوە: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴾ الأعراف: ١٨٠.

[2] تفسير الكشاف ٤٧٠/٢ ونقله الرازي في تفسيره ٧١/٢١ وابن حبان في البحر المحيط ٨٦/٦. و سەیری ئەمەش بکە: روح المعاني ١٢١/٩ ونقله عن الزمخشري ١٩٢/١٥.

جا نزاو دوعاکە بە مانای (ناوی لێبنێن) دێت، کە سنوور بەزێنی دەکات بۆ دوو بەرکار، کەواتە بەم شێوەیە دەبێت: ناوی پەروەردگارتان بنێن "الله" یان "الرحمن"، بەرکاری یەکەمی لابردووەو بەرکاری دووەمی هێشتووەتەوە بۆ ئەوەی بێتە هێماو بەڵگە لەسەر شوێنەکە[1].

ڕای دووەم: نزاو دوعاکە بەمانای هاوارو هانا دێت:

چونکە ئەوەی دیارە، لە هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکە، ئەوەیە کە کابرا دوعاکەی بریتی بووە لە (یا رحمن، یا رحیم) یاخود (یا الله، یا رحمن)، واتاکەی ئەوەیە: ئەگەر بە (الله) هاواری خواتان کرد ئەوا ئەمە ناویەتی، ئەگەر بە (رحمن)یش هانای بۆ بەرن ئەوا (رحمن) سیفەتیەتی.

ئەمە ڕای ئیبن حبانە[2].

ڕای سێیەم: ئەگەر ئایەتەکە بەرپەرچی هاوبەشدانەران بێت، ئەوا نزاکە بە مانای (ناونان) دێت، ئەگەریش بەرپەرچ بێت بۆ جولەکەکان، ئەوا بەمانای هاوارو هانا دێت[3].

جا ناوەکان (الأسماء) کۆی ناو (اسم)ە، لەبارەی مەبەستەکەشی لە ئایەتەکەدا ڕاجیایی هەیە، بەم شێوەیە:

بۆچوونی یەکەم: بریتین لەو دەربڕینە داڕێژراوانەی کە مانای فرەو جیا جیا دەدەن بە دەستەوە.

ئەمە بۆچوونی ئیمامی غەزالی[4]، ڕازی[5]، ئیبن عەتییە[1]، موحەممەد ئەتفەش[2] و زۆربەی زانایانە[3].

---

[1] التحرير والتنوير ١٥/٢٣٧.

[2] البحر المحيط لإبن حبان ٦/٨٦. سەیری ئەمەش بکە: روح المعاني ٩/١٢١ ونقله ابن حبان وغيره ١٥/١٩٢ والتحرير والتنوير ١٥/٢٣٧.

[3] روح المعاني ١٥/١٩٢، بە (وتراوە: قيل) هێناویەتی.

[4] المقصد الأسنى للغزالي ٣٠ وروح المعاني ٩/١٢٠ نقلا عن الغزالي.

[5] تفسير الرازي ١٥/٧٠.

ئەمەش لەبەر ئەوەی: (الحسنى) ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە ناوەكانی خوا بریتین لە جوانترین و پیرۆزترین و شكۆدارترین ناو، ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەم ناوانە هەڵقوڵاون، چەكەرەیان كردووە لە جوانترین و پیرۆزترین واتا[٤].

بۆچوونی دووەم: ناوەكان بریتین لە سیفەتەكان، وەك خوایەتی و ڕەحمەت و زانست و بەدیهێنان، سیفەتەكانی زات و كردار كە هاووێنەی ئەمانەن.

جا ئەمەش دەچێتە ناو ئەم بۆچوونەیان: ناوی لە وڵاتدا بڵاوبووەتەوە، واتە: سیفەت و هاوەڵناوەكانی یان باس و خواسی بڵاوبووەتەوە بە چاكەكاری و بەخشندەیی و بوێری[٥].

حسنى:

ڕاجیان لەبارەی تەفسیری ئەم چەمكە، بۆیە بۆ چەند بۆچوونێك دابەش بوون، وەك:

بۆچوونی یەكەم: حسنى: مێینە (تأنیث)ی (أحسن)ە، بۆیە وەسفی ناوەكانی پێكراوە چونكە حوكمەكەی حوكمی مێینەیە (مؤنث)ەكەی هەیە، هەروەك دەڵێیت: كۆمەڵە مێیە چاك و جوانەكە[٦].

بۆچوونی دووەم: حسنى: كۆی (أحسن)ە[٧].

بۆچوونی سێیەم: ناوە جوان و چاك و پیرۆزەكان: بریتین لە سیفەتە هەرە بەرزو پایەدارەكان[١]. ئەمەش بریتییە لە وەسف بە دادگەری و چاكەكاری و بەخشندەیی و جوانی و وێنەچوون بە بەدیهێنراوان[٢].

---

[١] تفسیر ابن عطیة ٦/١٥٣، یەكدەنگی لەسەر ئەم بۆچوونەی هێناوە.
[٢] تیسیر التفسیر لأطفش ٤/٢٦٣ وصححه.
[٣] روح المعاني ٩/١٢١.
[٤] روح المعاني ٩/١٢٠-١٢١.
[٥] روح المعاني ٩/١٢١ وتیسیر التفسیر لأطفش ٤/٢٦٤.
[٦] تفسیر الكشاف ٢/٥٣٠. : تفسیر ابن عطیة ٦/١٥٤ وتفسیر النسفي ٢/٣٥٧ والبحر المحیط لابن حبان ٦/٢١٥ وروح المعاني ٩/١٢٠ و ١٦/١٦٤ والتحریر والتنویر ٩/١٨٦.
[٧] تفسیر المنار ٩/٤٣١.

جوانی و پیرۆزی ناوەکان بە دووشتی هاوپێچە:

یەکەمیان: جوان و پیرۆزی ئەو ناوانە لە دیدی شەرعەوە، چونکە شەرع ئەم ناوانەی بەکارهێناوەو و دەقی لەسەر هێناوەتەوە[3].

دووەمیان: بەدەستەوەدانی واتای پیرۆزی و بەرزی و شکۆداری و گەورەیی پەروەردگاریتی و ئەو کردارانەی کە لەوپەڕی پیرۆزی و جوانیدان، کە ئەو کارانە تەنها لە خوای گەورە دەوشێنەوەو شیاوی ئەوە[4].

**جۆرەکانی ناوە پیرۆزەکانی خوا:**

ناوە پیرۆزەکانی خوا چەند جۆرە دابەشکردنێکی بۆ کراوە لە چەند ڕوویێکەوە:

**دابەش کردنی یەکەم:** بەکارهێنانی ئەم ناوانە بۆ جگە لە خوای گەورە، بۆ دوو بەش دابەش دەبێت:

یەکەمیان: ئەو ناوانەی کە دروستن بۆ جگە لە خوای گەورەش بەکاربهێنرێن، هەروەك دەڵێین: (الکریم، الرحیم، العزیز، اللطیف، الکبیر، الخالق).

ئەم وشە و دەربڕینانە دروستە بۆ بەندەکان بەکاربهێنرێن، ئەگەرچی بەکارهێنانی ئەو وشانە بۆ خوا واتای جیاواز دەدات بەدەستەوە، بەکارهێنانی بۆ بەندەکانیش مانایەکی جیاواز دەبەخشێت.

---

(1) بحر العلوم للسمرقندي ٥٨٤/١ و ٢٨٧/٢ و ٣٣٧ و ٣٤٧/٣ وتفسير النسفي ٤٦٤/٣ والنور للأصم ٣٨٩.

(2) تفسير الكشاف ١٣٢/٢ وشرح أسماء الله الحسنى للرازي ٤٥.

(3) تفسير ابن عطية ١٥٤/٦.

(4) تفسير ابن عطية، سەرچاوەی پێشوو، وتفسير الكشاف ١٣٢/٢ و ٤٧٠ و ٥٣٠ و تفسير الرازي ٧١/٢١ و تفسير النسفي ٢٨٣/٢ والبحر المحيط لابن حبان ٢١٥/٦. و سەیری ئەمانەش بکە: روح المعاني ١٩٣/١٥ وتيسير التفسير لأطفش ٢٧٩/٧ وتفسير المنار ٤٣٢/٩ والأسماء الحسنى لمحمد حسنين مخلوف ١٨.

بەڵام دەکرێت بەندوباری بخرێتەسەر، تایبەت بکرێت بەشێوەیەك کە بەکارهێنانی تەنها بۆ خوای گەورە دروست بێت، هەروەك دەڵێین: ئەی ئەو زاتەی لە هەموو بەبەزییەیەك بە بەزەیی تری، ئەی بەخشندەترین زات، ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی.

دووەم: دروست نییە بۆ جگە لە خوای گەورە بەکار بهێنرێت، هەروەك دەڵێین: الله، الرحمن[1].

**دابەش کردنی دووەم:** لە ڕووی باس کردنی بە تەنها، لەم ڕووەوە بۆ دوو جۆر دابەش دەبێت:

یەکەم: هەندێك ناو هەن دروستە بە تەنها بهێنرێن، هەروەك دەڵێین: (یا الله، یا رحمن، یا حي، یا حکیم) زۆربەی ناوە چاك و پیرۆزەکانی خوا.

دووەم: هەندێك ناو هەن ناکرێت بە تەنها بهێنرێن و بێ بەندوبار، هەروەك دەڵێین: مرێنەر و زیانگەیەنەر (ممیت و مضار). دروست نییە بەتەنها ئەم ناوانە بهێنرێن، بەڵکو پێویستە بوترێت: (یا محیي یا ممیت، یا ضار یا نافع) واتە: ئەی ئەو زاتەی ژیان دەبەخشیت و ژیان وەردەگریەوەو زیان گەیەنەرو سوود گەیەنەری[2]. ئەمەش وەك ئەدەب و حورمەت نواندن لە ئاست خوا و ڕێگرتن لە بەخەیاڵدا هاتنی شتێکی ناشایستە بۆ خوا[3].

## ئەگەر وترا:

حیکمەت لەوەدا چییە، کە خوای گەورە ڕێگری کردووە کە بەندەکانی ستایشی خۆیان بکەن هەروەك لەم فەرمایشتەدا هاتووە: ﴿فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡ﴾ النجم: ٣٢. واتە: (کەواتە

---

(١) تفسير الرازي ٧١/١٥. و سەیری ئەمانەش بکە: روح المعاني ١٢٣/٩ وتيسير التفسير لأطفش ٢٦٣/٤.

(٢) تفسير الرازي، و روح المعاني، سەرچاوەکانی پێشوو.

(٣) الأسماء الحسنى لمحمد حسنين مخلوف ١٩.

خۆتان بەچاك نەزانن و خۆتان بە باڵفتە دانەنێن). کەچی ستایشی خۆی کردووە بەو ناوە چاك و پیرۆزانە؟

## وەڵام:

بەوەی بەندە ئەگەرچی سیفەت و خەسڵەتی چاکی تێدا بێت، ئەوا هەر نا کامڵ و ناتەواوە، ئەگەر ناتەواویش بوو، ئەوا نابێت ستایشی خۆی بکات، خوای گەورە خاون دەسەڵات و توانای تەواو و کامڵە بۆیە وادەخوازێت، ستایشی خۆی بکات، بۆیە ستایشی خۆی کردووە، تا بەندەکانی بزانن و ستایشی بکەن[1].

## ژمارەو ڕێژەی ناوەکانی خوا:

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموویت: **(إن لله تسعة وتسعين إسماً، مئة إلا واحداً، من أحصاها دخل الجنة)**[2] واتە: خوای گەورە نەوەدو نۆ ناوی هەیە، لە سەد یەکی کەمە، هەر کەسێك لەبەری بکات دەچێتە بەهەشتەوە.

ئەم ژمارەو ڕێژەیە کە نەوەدو نۆ ناوە، بریتین لە ناوە چاك و پیرۆزەکانی خوا کە لە ئایەتەکەدا ئاماژەی پێکراوە[3].

---

[1] بحر العلوم للسمرقندي ٣٤٩/٣.

[2] لەم سەرچاوانەدا هاتووە: صحيح البخاري في: ٥٤ كتاب الشروط، ١٨ باب ما يجوز من الإشتراط والثنيا في الإقرار، رقم ٢٧٣٦، بهذا اللفظ، وفي: ٨١ كتاب الرقائق، ٦٨ باب لله مائة اسم...، رقم ٦٤١٠. وفي: ٩٧ كتاب التوحيد ١٢، باب إن للخ مائة اسم إلا واخداً، رقم ٧٣٩٢. وكل هذه الروايات عن أبي هريرة (رضي الله عنه). و صحيح مسلم: ٤٨ كتاب الذكر والدعاء، ٢ باب في أسماء الله تعالى...، رقم ٢٦٧٧، عن أبي هريرة. وفيه: وزاد همام عن أبي هريرة عن النبي (صلى الله عليه وسلم): (إنه وتر يحب الوتر) واتە: خوای گەورە تاکە و تاکیشی خۆش دەوێت. سنن الترمذي: ٤٥ كتاب الدعوات، ٨٢ باب رقم ٣٥٠٦، ٥٣٠/٥ عن أبي هريرة (رضي الله عنه) كما سيأتي، ولفظه (... مئة غير واحد ...) وأفاض ابن حجر في تخريجه في فتح الباري ٢١٨/١١ ومابعدها.

[3] تفسير ابن عطية ٦/١٠، ٣٩٤/١٤.

ترمزی فەرموودەکەی (ئەبو هورەیرە)ی گێڕاوەتەوە کە ژمارەی ئەو ناوانەی باسکردووە:

٣٥٠٣- یوسفی کوڕی حمادی بصری بۆی گێڕاینەوە، عبد الأعلی لە سعید ئەویش لە قتادەوە ئەویش لە أبی رافعەوە ئەویش لە أبو هریرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) بۆی گێڕاینەوە، ئەویش لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) کە فەرموویەتی: **(إن لله تسعة وتسعين إسماً، مئة إلا واحداً، من أحصاها دخل الجنة)** واتە: خوای گەورە نەوەدو نۆ ناوی هەیە، لە سەد یەکی کەمە، هەر کەسێك لەبەری بکات دەچێتە بەهەشتەوە.

یوسف وتویەتی: عەبدولئەعلا لە (هیشامی کوڕی حەسان)ەوە ئەویش لە موحەممەد، ئەویش لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) بۆی گێڕاینەوە لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم).

٣٥٠٧- ئیبراهیمی کوڕی یەعقوبی جوزجانی بۆی گێڕاینەوە، صەفوانی کوڕی صالح بۆی گێڕامەوە، وەلیدی کوڕی موسلیم بۆی گێڕاینەوە، شوعەیبی کوڕی حەمزە بۆی گێڕاینەوە، لە "ئەبو زناد" ئەویش لە "ئەعرج" ئەویش لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: **(إن لله تسعة وتسعين إسماً، من أحصاها دخل الجنة)** واتە: خوای گەورە نەوەدو نۆ ناوی هەیە، هەر کەسێك لەبەری بکات دەچێتە بەهەشتەوە، کە بریتین لەمانە:

١. هو الله الذي لا إله إلا هو: خوا ئەو زاتەیە کە هیچ پەرستراوێك جگە لەو نییە.
٢. الرَّحْمن: بە بەزەیی.
٣. الرَّحيم: بەخشندە.
٤. المَلِكُ: سەرۆك، پاشا.
٥. القُدُّوس: پاك. بێگەرد.
٦. السَّلام: بێ پەڵە، بێ کەم و کورتی.
٧. المُؤْمِن: دڵنیاکەر، بەڕاست دانەر.

٨. المُهَيْمِنُ: بەسەر ڕاگەیشتوو.
٩. العَزِيزُ: زاڵ، دەسەڵاتدار.
١٠. الجَبَّار: باڵادەست، ناچارکەر.
١١. المُتَكَبِّر: خۆبەگەورەزان.
١٢. الخَالِق: دروستکەر، بنیاتنەر.
١٣. البَارِيءُ: بەدیهێنەر.
١٤. المُصَوِّر: وێنەکێش.
١٥. الغَفَّار: لێبوردە.
١٦. القَهَّار: گەردن کەچکەر.
١٧. الوَهَّاب: بەخشەر.
١٨. الرَّزَّاق: ڕۆزی دەر.
١٩. الفَتَّاح: دەروو کەرەوە.
٢٠. العَلِيم: زانا.
٢١. القَابِض: وێکهێنەر، لێگرەوە.
٢٢. البَاسِط: فراوانکەر.
٢٣. الخَافِض: دانەوێن.
٢٤. الرَّافِع: بڵندکەر، بەرزکەرەوە.
٢٥. المُعِزُّ: زاڵکەر، عیززەت بەخش.
٢٦. المُذِلُّ: زەبوونکەر، سەرشۆڕکەر، مل پێکەچکەر.
٢٧. السَّمِيع: بیسەر.
٢٨. البَصِير: بینەر.
٢٩. الحَكَم: فەرمانڕەوا، حوکمڕان.
٣٠. العَدْل: دادگەر.

٣١. اللَّطِيف: وردبین، چاکەکاری پەنهان.

٣٢. الخَبِير: شارەزا، هەواڵدەر.

٣٣. الحَلِيم: هێدی، ئارام.

٣٤. العَظِيم: مەزن.

٣٥. الغَفُور: لێبوردە، گوناه پۆش.

٣٦. الشَّكُور: سوپاسگوزار.

٣٧. العَلِيُّ: بەرز.

٣٨. الكَبِير: گەورە.

٣٩. الحَفِيظ: پارێزەر.

٤٠. المُقِيت: بژێوگەیێن، دەسەڵاتدار.

٤١. الحَسِيبُ: لێپرسەرەوە.

٤٢. الجَلِيل: سیفەت بەرز.

٤٣. الكَرِيم: بەڕێز، ڕێزگر.

٤٤. الرَّقِيب: چاودێر.

٤٥. المُجِيب: وەڵامگۆ.

٤٦. الواسِع: فراوان.

٤٧. الحَكِيم: کاربەجێ، لێزان.

٤٨. الوَدُود: بەندەدۆست.

٤٩. المَجِيد: خاوەن شکۆ، پایەبەرز.

٥٠. البَاعِث: زیندووکەرەوە، نێرەر.

٥١. الشَّهِيد: ئاگادار، ئامادە.

٥٢. الحَقُّ: ڕاست، هەق، پایەدار.

٥٣. الوَكِيل: کارپێ سپێرراو، پشت و پەنا.

٥٤. القَوِيّ: بە توانا.

٥٥. المَتِين: بەهێز، قایم.
٥٦. الوَلِيّ: دۆست، یاریدەدەر.
٥٧. الحَمِيد: ستایش کراو، شایستەی سوپاس.
٥٨. المُحْصِي: ژمێرەر.
٥٩. المُبْدِيء: پەیداکەر.
٦٠. المُعِيد: گێڕەرەوە، زیندووکەرەوە.
٦١. المُحْيِي: ژیێنەر.
٦٢. المُمِيت: مرێنەر.
٦٣. الحَيُّ: زیندوو.
٦٤. القَيُّوم: هشوزگێڕ، ڕاوەستاو.
٦٥. الوَاجِد: هەبوو.
٦٦. المَاجِد: خاوەن پایەی بەرز.
٦٧. الوَاحِد: تاك، تەنیا.
٦٨. الصَّمَد: جێی مەبەست، حەوجێ پێبوو (جێی نیازو بێ نیاز).
٦٩. القَادِر: تواندار.
٧٠. المُقْتَدِر: خاوەن سەرچاوەی توانا.
٧١. المقَدِّم: پێشخەر.
٧٢. المُؤخِّر: دواخەر.
٧٣. الأوَّل: یەکەمین.
٧٤. الآخِر: دوامین.
٧٥. الظَّاهِر: دیار، ئاشکرا.
٧٦. البَاطِن: ون، پەنهان.
٧٧. الوَالِي: سەرپەرشتیکەر.

٧٨. المتَعَالِي: زۆربەرز، خۆ بە بەرزگر.

٧٩. البَرّ: چاکەکار.

٨٠. التَّوَّاب: تۆبە وەرگر.

٨١. المُنْتَقِم: تۆڵەسێن.

٨٢. العَفُوّ: چاوپۆشیکەر.

٨٣. الرَّؤُوف: میهرەبان.

٨٤. مَالِكِ المُلْك: خاوەن موڵك.

٨٥. ذو الجَلالِ والإكرام: خاوەن پایەی بەرزو رێز.

٨٦. المُقْسِط: دادپەروەر.

٨٧. الجَامِع: کۆکەرەوە.

٨٨. الغَنِيّ: دەوڵەمەند.

٨٩. المُغْنِي: دەوڵەمەندکەر، بێ نیازکەر.

٩٠. المَانِع: بەرگر، پێشگیری کەر.

٩١. الضَّارّ: زیان گەیێن (بە دوژمن و ناحەزانی).

٩٢. النَّافِع: سوود گەیێن (بە دۆست و خۆشەویستانی).

٩٣. النُّوْر: ڕووناکی.

٩٤. الهَادِي: ڕێ پیشاندەر.

٩٥. البَدِيع: داهێنەر، بێ وێنە.

٩٦. البَاقِي: هەرماو.

٩٧. الوَارِث: میراتگر.

٩٨. الرَّشِيْد: کارزان، شارەزا.

### ٩٩. الصَّبُور: ئارامگر[1].

ئەبو عیسا وتویەتی: ئەم فەرموودەیە دەگمەن و نامۆیە، زۆر کەس ئەم فەرموودەیەی بۆ مان گێڕاوەتەوە لە صەفوانی کوڕی صالح، جا ئەم فەرموودەیە تەنها لە ڕێی صەفوانی کوڕی صالحەوە ناسیومانە، ناوبراو لەلایەن فەرموودەناسانەوە باوەڕپێکراوە.

ئەم فەرموودەیە بە چەندین جۆر گێڕدراوەتەوە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) ئەویش لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم)، نەمان زانیوە کە زۆربەی ئەو گێڕانەوانەی باسی ئەم ناوانە دەکەن، سەنەد و زنجیرەی ڕاست و دروستیان هەبێت، تەنها ئەم فەرموودەیە نەبێت) [2].

چەند ناوێکی تر لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون لەسەر شێوەی ناو داڕێژراون و لە گێڕانەوەکەی (ترمذی)دا باس نەکراون، کە بیست و حەوت ناون:

(الرب، الإله، المحيط، الكافي، الشاكر، الشديد، القائم، الحاكم، الفاطر، الغافر، القاهر، المولى، النصير، الغالب، الخالق، الرفيع، المليك، الكفيل، الخلاق، الأكرم، الأعلى، المبين، الحفي، القريب، الأحد، الحافظ).

هەندێك لەو ناوانە بەخراوەپاڵی هاتوون، وەك: (الشديد) لەم فەرمایشتە : ﴿ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾ البقرة: ١٩٦. واتە: (خاوەنی سزاو تۆڵەی سەخت). و (الرفيع) لەم فەرمایشتەدا: ﴿ رَفِيعُ ٱلدَّرَجَٰتِ ﴾ غافر: ١٥. واتە: (ئەو پەروەردگارە پلەو پایەی زۆر بڵندە). و (العالم) لەم فەرمایشتەدا: ﴿ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ﴾ الحشر: ٢٢. واتە: (زانایە بەهەموو نهێنی و ئاشکراکان).

---

[1] واتای ئەو ناوانەم وەرگرتووە لە کتێبی: م. عەلی باپیر: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، بەرگی سێیەم: خوابەیەکگرتن لە ناوو سیفەت و پەرستراوێتی دا ٣٨٢-٣٨٧، نووسینگەی تەفسیر بەچاپی گەیاندووە ٢٠٠٧ز چ ١). (وەرگێڕ).

[2] سنن الترمذي في: ٤٥ كتاب الدعوات، ٨٢ باب، رقم الحديث ٣٥٠٦-٣٥٠٧.

ئەمەش وەك هەندێك لەو ناوانەی لە گێڕانەوەکەی (ترمذي)دا هـاتوون وەك: (المُحيـي) کـە لـەم فەرمایشـتەدا هـاتووە: ﴿ لَمُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ ﴾ الروم: ٥٠. واتـە: (مـردوان زینـدوو دەکاتەوە). و (المالك) کە لەم فەرمایشتەدا هاتووە: ﴿ مَٰلِكَ ٱلۡمُلۡكِ ﴾ آل عمران: ٢٦. واتـە: (خاوەنی هەموو شتێکە). و (النـور) کە لەم فەرمایشـتەدا هـاتووە: ﴿ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ النور: ٣٥. واتە: (نووو ڕەوناکی ئاسمانەکان و زەوییـە "نـورو ڕوونـاکی بەخشـە پێیان").

ئەم ناوانەی لەبەرامبەر ئەو ناوانـەن کـە لـە گێڕانەوەکـەی (ترمـذی)دا هـاتوون و لـە قورئانی پیرۆزدا بەشێوە داڕشتنی ناو نەهاتوون، بەهەمان شێوە بیست و حەوت ناون، کـە ئەمانەن:

(القابض، الباسط، الخافض، الرَّافـع، المُعِـزّ، المُـذِلّ، العـدل، الجليـل، الباعـث، المحصـي، المبـديء، المعيـد، المميـت، الواجـد، الماجـد، المقـدِّم، الـؤخِّر، الـوالي، ذو الجـلال والإكـرام، المقسط، المغني، المانع، الضار، النافع، الباقي، الرشيد، الصبور).

ئیبن حەجەر وتویەتی: ئەگەر گێڕانەوەکەی (ترمذي) ئـەم بیسـت و حـەوت نـاوەی کـە لەسەرەوە باسکران لێ دەربهێنرێت و ئەو بیست و حەوت ناوەی بخرێتەجێ کە لە قورئانـدا هاتووەو منیش خستمەڕوو، ئەوا نەوەدو نۆ ناو پێکدێن، کە هەر هـەموویان لـە قورئـانی پیرۆزدا بە شێوە داڕشتنی ناو هاتون، جێگاکانیشیان لە قورئـانی پـیرۆزدا دیـارن، تـەنها (الحفي) نەبێت کە ئەویش لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، لە وتەکەی ئیـبراهیم: ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيّٗا ﴾ مريم: ٤٧. واتە: (بەڕاستی ئەو زاتە زۆر منی خۆشدەوێت و ڕێزی بۆ داناوم).

وتویەتی: کەم کەس ئاگاداری ئەمە بووە[1].

---

[1] فتح الباري ١١/٢٢٢.

زانایان ڕاجیاییان هەیە، لەبارەی ئەو ژمارەو ڕێژەیەی كە لە فەرموودەكەدا هاتووە، ئایا مەبەست لەو ژمارەیە كورت هەڵهێنانی ناوە پیرۆزەكانە لەم ژمارەیەدا یاخود ناوە پیرۆزەكانی خوا لەم ڕێژەیە زیاترن؟ لەمبارەوە بۆ دوو ڕاو بۆچوون دابەش بوون:

ڕای یەكەم: ناوە چاك و پیرۆزەكان تەنها ئەو ڕێژەیەن و زیاتر نین. ئەمە ڕای (ئیبن حەزم)ە، بە بەڵگەی:

ڕووكەشی فەرموودەكە، چونكە دروست وادەركەوتووە، كە نەوەدو نۆ ناوەو بەس، بۆ هیچ كەسێكیش دروست نییە، كە بە دروست بزانێت، ناوێكی زیاتر لەو ناوانە بۆ خوای گەورە بڕیار بدات، چونكە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: **(مئة إلا واحداً)** واتە: لە سەد یەكی كەمە. جا ئەگەر دروست بووبایە، خوای گەورە ناوێكی زیاتری هەبووبایە، ئەوا ئەو كاتە دەبووە (١٠٠) ناو، ئەگەر ئەمەش ڕوویدابا، ئەوا ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر: **(مئة إلا واحداً)** واتە: لە سەد یەكی كەمە. دەبووە درۆ. هەر كەسێكیش ئەمە بە دروست بزانێت ئەوا بێ باوەڕە[1].

ڕای دووەم: ناوەكانی خوا زیاترن، لەو ڕێژەیەی باسكراوە، ئەمە بۆچوونی زۆربەی زانایانە، (خەتابی) و (باقلانی) و (ئیبن عەرەبی) دەقیان لەسەر هێناوە، (نەوەوی) هێناویەتی كە زانایان كۆكن لەسەر ئەم ڕایە، هەروەها وتویەتی لە فەرموودەكەدا ژمارەی ناوەكانی خوا كورت نەكراوەتەوە تەنها لەو ناوانەدا، ئەمەش بەدەستەوە نادات كە جگە لەم نەوەدو نۆ ناوە، خوای گەورە ناوی تری نەبێت، بەڵكو مەبەستی فەرموودەكە ئەوەیە، هەر كەسێك ئەم نەوەدو نۆ ناوە لەبەر بكات دەچێتە بەهەشتەوە، جا مەبەستی فەرموودەكە، هەواڵدانە لەبارەی ئەوەی هەر كەسێك لەبەریان بكات، ئەوا دەچێتە بەهەشت، مەبەستی كورت هەڵهێنانی ناوەكانی خوا نییە لەم ڕێژەیەدا. بە بەڵگەی:

---

[1] علم الكلام لابن حزم ٦٧ و فتح الباري ٢٢٤/١١ و الأسنى للقرطبي ٣٦.

أ- فەرموودەکەی (ئیبن مەسعود): (داوات لێدەکەم بە هەر ناوێك کە ناوی پیرۆزی تۆیە، خۆتت پێ ناو ناوە یاخود لە کتێبەکەتدا داتبەزاندووە یان فێری یەکێك لە بەدیهێنراوەکانی خۆتت کردووە یان لەلایەن خۆت، لە زانیاری پەنهانی خۆتدا هێشتۆتەوەو ئاشکرات نەکردووە).

ب- زۆربەی ناوەکان سیفەتن، سیفەتەکانی خواش گۆتا نایەن[1].

لەبارەی ئەم وشەیە (أحصاها) کە لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هاتووە چەند بۆچوونێك هەن، لەمانە:

١- مەبەست لەو وشەیە: بریتییە لە ژماردنی و لەبەرکردنی و باوەڕ پێبوون و بەگەورە زانین و خۆشویستن و پەند وەرگرتن لە ماناکانیان.

ئەمە لە یەکێك لە گێڕانەوەکانی فەرموودەکەی (بوخاری)دا هاتووە[2]: (...هەر کەسێك لەبەری بکات ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە...). و لە گێڕانەوەکەی (موسلیم)یشدا هاتووە: (...هەر کەسێك لەبەری بکات دەچێتە بەهەشتەوە).

جا (نەوەوی) ئەمەی بەڕاست و دروست داناوە[3]، هەروەها ئەمە بۆچوونی زۆربەی لێکۆڵەرانە[4].

٢- بەتەواوی بیانژمێرێت، واتە: تەنها هەندێکیان لەبەر نەکات و ئەوانی تر فەرامۆش بکات، بەڵکو بە هەر هەموو ناوەکان، لە خوای گەورە بپارێتەوە و ستایشی بکات.

---

[1] فتح الباري ٢٢٣/١١-٢٢٤. سەیری وتەی: النووي، بکە لە: شرحه على صحيح مسلم ٨/١٧، و مثله في تحفة الأحوذي ٢٦٠/٢ و المقصد الأسنى للغزالي ١٤٧-١٤٨. و ئەمە ڕای پەسەندکراوی: (أطفش)ە لە: تيسير التفسير ٢٦٤/٤. و آلوسي لە: روح المعاني ١٢٣/٩-١٢٤، ئەم ڕایەی پەسەند کردووە. و سەیری: الأسنى للقرطبي، سەرچاوەی پێشوو بکە.
فەرموودەی ئیبن مەسعود: داوات لێدەکەم بە هەر ناوێك کە هەتە.....تاد: أخرجه أحمد وصححه ابن حبان./ فتح الباري، سەرچاوەی پێشوو.

[2] تفسير ابن عطية ١٥٦/٦. ونقله ابن حجر في فتح الباري ٢٢٩/١١.

[3] شرح صحيح مسلم للنووي ٨/١٧.

[4] تيسير التفسير لأطفش ٢٦٤/٤ وتحفة الأحوذي ٢٦٠/٢.

٣- لە ئەستۆ گرتنیان، واتە: هەڵسان بە جێبەجێ کردنی واتای ئەو ناوانە، بەپێی ئەو مانایەی بەدەستەوە دەدەن، واتای ئەو ناوانە بە پێویست بزانێت بۆ خۆی و کاریان پێبکات.

جا ئەگەر بەندە وتی: (الرحمن الرحيم) دەزانێ کە تەنها خوای گەورە کانگای ڕەحمەتەوە، میهرەبانی هەر لەلایەن ئەو زاتەوە دەست دەکەوێت.

ئەگەر بەندە وتی: (الملك)، دەزانێت ئەوەی لە بووندایە و شیاوی هاتنە بوونیشە موڵکی ئەوە، بەشێوەیەك هەڵسوکەوت لەگەڵ پەروەردگاری دەکات، وەك چۆن بەندەیەکی سەرشۆڕ هەڵسوکەوت لەگەڵ خاوەن و دەسەڵاتدارو پادشاکەی دەکات.

کە بەندە وتی: (الرازق)، بەندە دەزانێت کە ڕزق و ڕۆزییەکەی بەدەست خوای گەورەیە بۆیە متمانە بە پەیمان و بەڵێنەکەی دەکات.

ئەگەر بەندە وتی: (المنتقم)، ترسی لێدەنیشێت لە ئاستی تۆڵەسەندنەوەی خوا، هەر ناوێك لە ناوەکانی خوا بەم شێوەیەی کە خرایەڕوو.

٤- واتاکانی لەبەر بکات[1]:

کاتێك بەندە وەسفی پەروەردگاری دەکات بە (الملك)، ئەوا جۆرەکانی دەسەڵات و موڵکی خوای گەورە، لە عەقڵیدا، ئامادەگی دەبێت.

ئەگەر بەندە وتی: (القدوس) ئەوا پاك و پیرۆزی خوا، لە سیفەت و کردەوەو ئەحکام و ناوەکانی لە عەقڵی مرۆڤدا ئامادەیی دەبێت و دوور دەبێت لە هەموو کەم و کورییەك... و بەم شێوەیە[2].

٥- کارپێکردنیان، جا ئەگەر بۆ نمونە وتی: (الحكيم) ئەوا هەموو شتێکی خۆی پێڕادەسپێرێت، چونکە هەموو شتەکانی بەپێی دانایی و حکمەتن.

---

[1] فتح الباري ١١/٢٢٨-٢٢٩ و شرح صحيح مسلم للنووي، سەرچاوەی پێشوو. و بڕوانە: شرح أسماء الله الحسنى للرازي ٧٩-٨٠ وتحفة الأحوذي ٢/٢٦٠ ولوامع الأنوار البهية ١/١٢٧.

[2] شرح الأسماء الله الحسنى للرازي ٧٩.

ئەصیلی دەڵێت: مەبەستی لە وشەی (أحصاها) ژماردنیان نییە، چونکە دەکرێت کەسێکی خراپ بیان ژمێرێت، بەڵکو مەبەست لێی کارپێکردنیانە[1].

## هەڵوەستە کردن لەبارەی ناوەکانی خوای گەورە

زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کە دروستە، ئەو ناوو سیفەتانە بۆ خوای گەورە بەکاربهێنرێن، کە شەرع ڕێی پێداوە.

کۆکیشن لەسەر ئەوەی نابێت ناو و سیفەتێك بۆ خوا بەکاربهێنرێت کە شەرع ڕێی پێنەدابێت.

بەڵام ڕاجیان لەبارەی بەکارهێنانی ئەو هاومانایانەی کە شەرع نە بە ڕێپێدان، نە بە ڕێگری کردن حوکمی لەسەر نەداوە، ئەو هاومانایانە یەکێکیش نەبوون لەو ناوە ناسێنەرانەی کە لە زمانەکاندا هاتوون، هەروەها ئەم هاومانایانە ئاماژە نەبوون بۆ کەم و کوری، بەڵکو ئاماژەبوون بۆ ستایش و پیداهەڵدان[2].

واتە: ڕاجیابوون سەبارەت بەناوە پیرۆزو چاکەکانی خوا، کە ئایا شیاوی داتاشران نین (توقیفی)ن؟ بەو واتایەی کە ناکرێت لە کردارە چەسپاو جێگیرەکانی خوا ناوی بۆ بتاشرێت، تەنها بەو مەرجە نەبێت کە ئەو ناوانە لە قورئان و سوننەتدا هاتبن[3]، جال لەم بارەوە بۆ چەند بۆچوونێك دابەش بوون، بۆ نمونە:

---

[1] فتح الباري ٢٢٩/١١ و چەند ڕایەکی تریشی هێناوە. و بڕوانە: أصول الدين للبغدادي ١٢١ و شرح صحيح مسلم للنووي، سەرچاوەی پێشوو، وتيسير التفسير لأطفش ٢٦٤/٤ وتحفة الأحوذي ٢٦٠/٢ والأسماء الحسنى لمحمد حسنين مخلوف ٢١. و سەیری واتاکانی وشەی (أحصاها) بکە لە: الأسنى للقرطبي ٣٢ و ١٠١.

[2] روح المعاني ١٢١/٩، و لە (أبكار الأفكار) (الآمدي) نزيك لەو واتايەی هێناوە.

[3] فتح الباري ٢٢٦/١١.

سفاريني لە: (لوامع الأنوار البهية ١٢٥/١)دا وتويەتی: (توقيفی: بريتيە لەوەی لە قورئان و سوننەتی صحيح يان حسندا هاتووە ياخود يەكدەنگی لەسەرە، چونكە لەم دوو سەرچاوەيەی پێشوو دەرناچێت، بە سوننەتی لاوازو قياس هيچ ناوێك ناچەسپێنرێت، چونكە ئەمە بابەتێكە لە بابەتە بيروباوەڕييەكان "العلميات"). و باجوری ئەمەی هێناوە، و "العلميات" شرۆڤەی كردووە بەوەی

**بۆچوونی یەکەم:** ئەم ناوانە شیاوی داتاشران نین، بەڵکو تاکە سەرچاوەیان سروشە.

ئەمە بۆچوونی ئیمام (ئەبو حەسەن ئەشعەری)[1]، مەزهەبی ئەشعەرییەکانە[2]، (ئیبن عەتیە)ش ئەم بۆچوونەی پەسەند کردووە[3]، هەروەها ئەم بۆچوونەی لە (باوکی قاسمی قوشەیری) و (زەجاج)ەوە هاتووە[4]، (ئیبن حەجەر)یش پەسەندی کردووە[5]، (ئەبو مەنصوری ماتوریدی)[6] و (ماتریدیەکان)[7] و زۆربەی زانایان[8] و شەرعناسان[9] و ئیبازییەکانیش ئەم بۆچوونەیان پەسەند کردووە[10].

خاوەنی (الجوهرة) وتویەتی:

واختير أن اسماه توقيفية كذا الصفات، فاحفظ السمعية[11].

واتە: ئەو بۆچوونە پەسەند کراوە کە ناو و سیفەتەکانی خوا شیاوی داتاشران نین، بۆیە ئەوەی بە نەقڵ هاتووە لەبەریان بکە.

---

وتویەتی: (واتە: بیروباوەڕییەکان، چونکە کەسەکە وابۆی دەچێت کە ناوەکەی یەکێکە لە ناوەکانی خوا)./ شرح جوهرة التوحيد للباجوري ١٥٤.

(١) المقصد الأسنى للغزالي ١٥٤ وتفسير ابن عطية ٦/١٥٤ والتحرير والتنوير ٩/١٨٨ عن ابن عطية.

(٢) شرح أسماء الله الحسنى للرازي ٣٣ و تيايدا هاتوە: (ئەمە مەزهەبی هاوەڵانمانە). و ابن حجر لە: (فتح الباري ١١/٢٢٦)دا بەم دەربڕینەی هێناویەتی: (ئەمە ڕای باوی هاوەڵانمانە).

(٣) تفسير ابن عطية، سەرچاوەی پێشوو.

(٤) فتح الباري ١١/٢٢٦.

(٥) فتح الباري، سەرچاوەی پێشوو.

(٦) التوحيد للماتريدي ٣٨ و ٣٨.

(٧) أصول الدين للغزنوي ١٨٠، و تيايدا هاتووە: (ناوەکانی خوا داناتاشرێن و جێگیرن و بە پێوان و قیاس وەرناگیرێن).

(٨) تفسير ابن عطية ٦/١٥٤ ولوامع الأنوار البهية ١/١٢٥ وشرح الجوهرة للباجوري ١٥٤.

(٩) تفسير ابن عطية، سەرچاوەی پێشوو، ونقله أيضا عن القاضي أبي محمد ٩/٢٢٠.

(١٠) تيسير التفسير لأطفيش ٤/٢٦٤ ومشارق أنوار العقول ١/٣٤٠، و نقله الجعبري في البعد الحضاري ٢٢٢ عن التلاتي والمحشي.

(١١) شرح الجوهرة للباجوري ١٥٤.

**ئەمانەش بەڵگەکانی ئەم بۆچوونەن:**

أ- خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ﴾ الأعراف: ١٨٠. واتە: (هەر بۆ خوایە هەموو ناوە جوان و پیرۆزەکان بەو ناوانە دوعا و نزا بکەن و هاناو هاوار بۆ ئەو زاتە بەرن)، ئەم ئایەتە ئاماژەو بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە خوای گەورە ناوی چاکی هەن، بۆیە لەسەر مرۆڤ پێویستە بەو ناوانە لە خوای گەورە بپاڕێتەوە[1].

ب- دروستە بوترێت: (یا جواد)، دروست نییە بووترێت: (یا سخی)، هەردووکیان هەر بەیەك مانا دێن کە بریتیە لە: بەخشندەیی و سەخاوەت، دروستە بووترێت: (یا عالم) واتە: ئەی ئەو زاتەی کە زانایە، دروست نییە بوترێت: (یا عاقل یا طبیب یا فقیە یا فاهم یا لبیب یا عارف) کەچی ئەم وشانە هەموویان لە زمانەوانیدا هاوواتای وشەی (العالم)ن، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بەکارهێنانی هەر ناوو سیفەتێك دەبێت بەپێی شەرع بێت و شەرع ڕێی پێبدات[2].

پ- مەرج بۆ دروست بوونی بەکارهێنانی هەر ناوێك بۆ خوای گەورە - ئەوەیە کە دەبێت ئەو ناوە تەنها پێداهەڵدان و ستایشی پوخت بێت و هیچ گومانێك هەڵنەگرێت - شتێکە تەنها کەمێك لە زانایان نەبن بە باشی نازانن، ئەو کاتەش ناوانێك دەهێنرێنە ناو ناوەکانی خوای گەورە، کە بەیەکدەنگی دروست نییە بۆ خوای گەورە بەکاربهێنرێن[3].

---

[1] تفسیر الرازي ١٥/٧٤.

[2] تفسیر الرازي، سەرچاوەی پێشوو.

[3] شرح الأسماء الله الحسنى للرازي ٣٣.

**بۆچوونی دووەم:** ئەگەر عەقڵ ئەوەی خستەڕوو، کە واتای وشەکە چەسپاو و جێگیرەو شیاوە بۆ خوای گەورە، ئەوا دروستە بۆ خوای گەورە بەکاربهێنرێن.

ئەمە بۆچوونی: موعتەزیلەکان[1]، کەڕامیەکان[2]، فەیلەسوفەکانە[3]. (قازی ئەبو بەکری)یش بۆ ئەم ڕایە چووە بە بەڵگەی:

بڵاوبوونەوەو باوبوونی بەکارهێنانی وشەی (خدا) (کە بە زمانی فارسی واتە: خوا) و (تکری) (کە بە زمانی تورکی واتە: خوا) ئەم ناوانە بەکاردەهێنرێن بەبێ ئەوەی بە ناپەسەند بزانرێت کەواتە یەکدەنگی هەیە لەسەر دروستی بەکارهێنانی[4].

خاوەنی هەر جۆرە زمانێك ناوێکی تایبەت بۆ خوای گەورە دادەنێت بە زمانی خۆی، هەروەك دەڵێن: (خدای)، ئەم وشەیە بە شێوەیەکی بەربڵاو بەکاردەهێنرێ بەبێ ئەوەی کەسێك بە ناپەسەندی بزانێت.

---

[1] تفسير ابن عطية ١٥٤/٦.

[2] فتح الباري ٢٢٦/١١ و شرح أسماء الله الحسنى ٣٣ وروح المعاني ١٢١/٩ وتفسير المنار ٤٤٤/٩. : لوامع الأنوار البهية ١٢٥/١ وشرح الجوهرة للباجوري ١٥٤ وكلاهما عن المعتزلة.

[3] تفسير المنار، سەرچاوەی پێشوو.

[4] روح المعاني ١٢١/٩-١٢٢ وشرح أسماء الله الحسنى للرازي ٣٣ و ٣٦ و ئالوسی لە باقلانیەوە هێناویەتی کە بۆچوونی یەکەمی پەسەند کردووە بریتیە لە هەڵوەستە کردن لە ئاست ناوە چاك و پیرۆزەکانی خوا، بە تێروتەسەلی لە کتێبی (شرح المواقف) وەریگرتووە کە پێچەوانەی ڕای موعتەزیلەکان.

بەڵام (ئیبن حەجەر) لە (فتح الباری ٢٢٦/١١) وتەی باقلانی هێناوە کە هەمان بۆچوونەکەی غەزالی پەسەند کردووە کە بریتییە لە: درێژە پێدان (التفصیل). بەڵام غەزالی لە: (المقصد الأسنى ١٥٤) باسی ئەوەی کردووە کە قازی ئەبو بەکر پێی وایە کە سیفەت و تایبەتمەندییە ڕەهاکان دروستە بۆ خوای گەورە بەکاربهێنرێن ئەگەر عەقڵ ڕێی پێدا تەنها ئەوە نەبێت کە شەرع قەدەغەی کردبێت یاخود مانایەکی بەدەستەوەدا کە ئەستەم بێت بۆ خوای گەورە. بەڵام ئەگەر ڕێگر نەبوو ئەوا دروستە بەکارهێنانیان.

ئەم سەرچاوانە ئاماژەیان بۆ ئەم بۆچوونەی باقلانیان کردووە: السفاريني في لوامع الأنوار البهية ١٢٥/١ والبجوري في شرح الجوهرة ٨٩.

بەرپەرچی دراوەتەوە: ئەگەر ئەمە شتێکی چەسپاو بووایە، ئەوا تەنها ڕەزامەندی شەرع لەمبارەوە بەس بوو، بۆ دروستی بەکارهێنانی ئەو ناوانە[1].

**بۆچوونی سێیەم:** درێژەپێدان (التفصیل). ئەمە بۆچوونی غەزالییە، بەپێی ئەم بۆچوونە دروستە سیفەتێك بۆ خوای گەورە بەکاربهێنرێت کە ئاماژە نەبێت بۆ زاتی خوا، بەڵکو ئاماژە بێت بۆ شتێکی زیاد لە زات، بەکارهێنانی ناوی بۆ خوای گەورە بە قەدەغە داناوە کە ئاماژە بە زاتی خوا دەکات[2]. ڕازی وتویەتی: ئەمە ڕای پەسەندە[3].

**ئەمانەش بەڵگەی ئەم بۆچوونەن:**

بوونی یەکدەنگی لەسەر ئەوەی کە دروست نیە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە ناوێك ناوبنێین کە باوکی ئەو ناوەی لێ نەنابێت یاخود خۆی ئەو ناوەی بۆ خۆی دەستنیشان نەکردبێت، بە هەمان شێوە هەر کەسێکی گەورەی تریش نابێت ناوێکی لێ بنێین، کە باوکی یان بەخۆی لە خۆی نەنابێت، جا مادەم ئەمە بۆ بەدیهێنراوان دروست نەبێت ئەی چۆن بۆ خوای گەورە دروست دەبێت[4].

واتای (ئیلحاد) لەم فەرمایشتەی خوای گەورەدا: ﴿ وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَـٰٓئِهِۦ ﴾ الأعراف: ١٨٠:

ئیلحاد لە زمانەوانیدا: بریتیە لە لادان و لاربوونەوە، (لحد)یش لەوەوە هاتووە: چونکە هەڵکەندنی گۆڕەکە لە ژێر لا تەنیشتێکی گۆڕدا دەبێت[5].

---

[1] لوامع الأنوار البهية، سەرچاوەی پێشوو.

[2] المقصد الأسنى للغزالي ١٥٤. و ذكر قول الغزالي في: روح المعاني ١٢٢/٩ وتفسير المنار ٤٤٤/٩ وأشار ظغلى الآلوسي و لوامع الأنوار البهية ١٢٥/١ وشرح الجوهرة للباجوري ١٥٤.

[3] شرح أسماء الله الحسنى للرازي ٣٣، ناوبراو وتویەتی: (و ڕای پەسەندکراوی شێخ غەزالی کە بریتییە لەوەی ناونانی خوا پێویستی بە ڕەزامەندی شەرع هەیە و وەسف کردنی خوا بە سیفەتێك پێویستی بە ڕەزامەندی شەرع نییە، ئەمە ڕای ڕاست و پەسەندە).

[4] فتح الباري ٢٢٦/١١.

[5] بحر العلوم للسمرقندي ٥٨٥/١ وشرح الأسماء الله الحسنى للرازي ٤٥ وتفسير ابن عطية ١٥٦/٦-١٥٧ وروح المعاني ١٢١/٩.

**لادان و ئیلحاد لە ناوەکانی خوادا لە چەند ڕوویێکەوە دەبێت**، بۆ نمونە:

١- بەکارهێنانی ناوە چاك و پیرۆزەکانی خوا بۆ جگە لە خوای گەورە، وەك چۆن کافرەکان ناو لە پەیکەرو بتەکانیان دەنێن خوا.

هەروەها وەك چۆن ناو لە بتەکانیان دەنێن (لات) کە لە (إله)یان داتاشیووە، (العزى) کە لە (العزیز)یان داتاشیووە، (المناة)یان لە (المنان)یان داتاشیووە.

موسەیلەمە ناوی (الرحمن)ی لە خۆ نابوو[1].

٢- ناونانی خوای گەورە بەو ناوانەی کە دروست نیە خوای گەورەی پێ ناوبنرێت، بەوەی ناوەکە مانایەکی خراپ بەدەستەوە بدات، وەك:

ئەی ڕوو سپی، ئەی سەخاوەتمەند، هاووێنەی ئەم نلوانە[2].

دروست نییە ئەم ناوانە بۆ خوا بەکاربهێنرێن:

(الزارع: جوتیار، ڕوێنەر)، ئەگەرچی لەم فەرمایشتەشدا هاتبێت: ﴿ ءَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلزَّٰرِعُونَ ﴾ الواقعة: ٦٤. واتە: (ئایا ئێوە دەیڕوێنن، یان هەر ئێمەین ڕوێنەرو بەرهەم هێنەر).

(الرامی: فڕێدەر، هاوێژەر)، ئەگەرچی لەم فەرمایشتەشدا هاتبێت: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ﴾ الأنفال: ١٧. واتە: (بەڵکو خوا فڕێیدا).

(المستهزيء: گاڵتەپێکەر)، ئەگەرچی لەم فەرمایشتەشدا هاتبێت: ﴿ ٱللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ ﴾ البقرة: ١٥. واتە: (خوای سزای گاڵتەجارییەکەیان لێدەستێنێت "دەیانکاتە پەندو گاڵتەجار").

---

[1] تفسیر الرازي ٧٥/١٥ وشرح أسماء الله الحسنى للرازي ٤٦ وتفسیر ابن عطیة، سەرچاوەی پێشوو، وتیسیر التفسیر لأطفش ٢٦٥/٤ وتفسیر المنار ٤٤٢/٩ ولوامع الأنوار البهیة ١٢٨/١.

[2] روح المعاني ١٢١/٩. وهو في تفسیر الکشاف ١٣٢/٢. و سەیری ئەمەش بکە: تفسیر النسفي ٦٢٠/١.

(الماكر: فێڵباز)، ئەگەرچی لەم فەرمایشتەشدا هاتبێت: ﴿ وَمَكَرُوا وَمَكَرَ اللَّهُ ﴾ آل عمـران: ٥٤.[1] واتە: ("دوژمنانی خوا" پیلانیان گێـڕا، خـوایش پیلانـەکانیان پووچـەڵ کردنەوە).

دروستە بڵێت: یا جواد، بەڵام دروست نییە بڵێت: یا سخی، چونکە خوای گەورە نـاوی (سەخی) لەخۆ نەناوە.

دروستە بڵێیت: (یا قوی)، بەڵام دروست نییە بڵێیت: یا شجاع[2].

دروستە بڵێیت: یا عالم، بەڵام دروست نییە بڵێیت: یا عارف، یا فقیه، یـا عاقـل، یـا لبیب، یا فطن، یا مدرك، کەچی ئەم ناوانە هاوماناى ناوی (عالم)ن[3].

دروستە خوای گەورە ناوبنێین بە: (جواد، قوی، عالم)، چونکە بـریتین لـە نـاوە چـاك و پیرۆزەکانی خوا، بەڵام ئەو ناوانەی کە هاوماناى ئەو سێ ناوەن، دروست نییە بـۆ خـوای گەورە بەکاربهێنرێن، چونکە خوای گەورە خۆی بەو ناوانە ناو نەناوە.

سـەبارەت بـەو چـەمك و ناوانـەی، کـە زانایـانی زانسـتی کـەلام بـۆ خـوای گـەورە بەکاریدەهێنن وەك: (پێویسـت: الواجـب، پێویسـتە بـوون: الواجـب الوجـوب، هـەبوون: الموجود، بەدیهێنەر: الصـانع، شـارەزا: المـتقن، باسـکراو: المـذکور، زات: الـذات، زانـراو: المعلوم، ڕاستی: الحقیقة، شت: الشيء، چەسپا و جێگیر: الثابت...)، ئەمانە لە ناوە چـاك و پیرۆزەکانی خوا نین، ئەگەر مەبەسـت لـە بـەکارهێنانی ئـەو ناوانـە بـۆ خـوای گـەورە هەواڵدان بێت بۆ ڕاستیەکان:

أ- ئەگەر مەبەست لە بەکارهێنانی ئەم ناوانە ئەوەبێت کـە خـوای گـەورە لـە خـود و زاتی خۆی دا بوونی پێویست بێت... تاد، ئەوا بێ گومان بەم شـێوەیە، دەڵـێین:

---

[1] روح المعاني ٩/١٣٢.

[2] بحر العلوم للسمرقندي ١/٥٨٥ و ڕای زجاجیشی هێناوە. و سەیری ئەمەش بکە: تفسیر الرازي ١٥/٧٤ والنور للأعصم ٤٥٤.

[3] الأسماء الحسنى لمحمد حسنين مخلوف ٢٢.

خوای گەورە بوونی پێویستە، زاتە، هەیە، بەدیهێنەری هەموو شتێکە، شارەزایە بەهەموو ئەو شتانەی بەدیهێناوە... .

بەم پێیە دروستە بەم سیفەتانە هەواڵ سەبارەت بەخوای گەورە بدەین.

ب- ئەگەر مەبەست لەو ناوانە، بریتی بێت لەوەی هاوارو هانا بۆ خوای گەورە ببرێت بەو چەمکانە، جا بەکارهێنانی ئەم وشە و چەمکانە لە نزاو پاڕانەوەکاندا دروست نییە. چونکە پێشینان دەیان وت: یا الله، یار رحمن، یا رحیم... سەرجەم ناوە پیرۆزەکانی تر، لە هیچ یەکێك لە پێشینان نەبیستراوە کە بڵێت: یا ذات، یا حقیقة، یا معلوم، یا مفهوم، لێم خۆشببە.

جا لە کاتی نزاو پاڕانەوە، دروست نییە ئەم جۆرە وشانە بەکار بهێنرێن، بەڵکو قەدەغە بوونی پێویستە[1].

## واتای هەندێك لە ناوە چاك و پیرۆزەکانی خوا:

**الله**: ئەو زانایانەی کە دوواون لەبارەی واتای ناوە چاك و پیرۆزەکانی خوا، کۆکن لەسەر ئەوەی کە هەموو ناوەکانی خوا جگە لە ناوی (الله)، ئەو ناوانەن کە دەچنە ژێر چەتری سیفەتە داتاشراوەکان.

لەبارەی ئەوەی ئایا وشەی (الله) داتاشراوە یان نا ئەوا بۆ دوو بۆچوون دابەش بوون:

**یەکەم**: ئەمە وشە و دەربڕینێکە کە لە بنچینەدا داتاشراو نییە، بەڵکو ناوێکی ناسێنەرە کە تەنها ئاماژەیە بۆ خوای گەورە، وەك سەرجەم ناوە ناسێنەرەکانی تر. ئەمە ڕای (شافیعی، ئەبو حەنیفە، حوسەینی کوڕی فوزەیلی بەجلی، قەفالی شاشی، خەتابی،

[1] تفسير الرازي ٧٣/١٥ وتفسير المنار ٤٤٣/٩. و آلوسي لە: (روح المعاني ١٢٢/٩)دا باسی کردووە: (بە یەکدەنگی ئەمانە چەسپاون: دروستکەر و ئەو زاتەی هەیە و پێویست و لەمێژینەیە و بێ سەرەتایە، وتراوە: هۆکار.... ).

ئەبو یەزید بەلخی، غەزالی) و زۆربەی زانا لێکۆڵەرەکانە، (ڕازی)یش ئەم بۆچوونەی پەسەند کردووە. ئەمە یەك لە دوو ڕاکەی (خلیل)، (سیبویه)، (مبرد)ە[1]، (ئیبازییەکان)[2] و (جوینی)ش ئەم بۆچوونەی بەڕاست داناوە[3].

هەندێك لە بەڵگەکانی ئەم بۆچوونە:

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ هَلۡ تَعۡلَمُ لَهُۥ سَمِيّٗا ﴾ مریم: ٦٥. واتە: هیچ شتێك لە بووندا نییە کە بەناوی "الله" بێت جگە لە خوا، بەمەش سەلمێنرا کە ئەو وشەیە ناوە، ئەگەر داتاشراو بووایە، ئەوا نەدەبووە ناو، بەڵکو دەبووە سیفەت.

شتێکی نەریتییە، کە دەوترێت: (الملك، القدوس، السلام) ناوی خوا (الله)ن، ناوترێت (الله) ناوی (الملك، الخالق، الباري)ە[4].

**دووەم**: بریتییە لەو وشەیەی کە لە ناوە داتاشراوەکانە.

ئەمە بۆچوونی زۆربەی موعتەزیلە و ئەدیبەکانە[5].

ئەمەش هەندێك لە بەڵگەکانیانن:

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ ﴾ الأعراف: ١٨٠. لەم ئایەتەدا هاتووە کە ناوەکانی خوای گەورە بە چاکی و جوانی وەسف کراون، کاتێك ناو بە چاك و جوان وەسف دەکرێت کە ناولێنراوەکەش ئەو سیفەتەی هەبێت، جا ناولێنراوەکە چاك دەبێت بەپێی سیفەتەکانی نەوەك بەپێی خودی خۆی، بەمەش پێویست دەبێت کە هەموو ناوەکانی خوا ئاماژە بن بۆ سیفەتەکانی خوا نەوەك بۆ زاتی ئەو.

وەڵامی ئەم بۆچوونە دەدەمەوە بەوەی:

---

[1] شرح أسماء الله الحسنى للرازي ١٠٦. وانظر قول الغزالي في كتابه المقصد الأسنى ٦٠.

[2] النور للأصم ٢٨٩ وتویەتی: پێم وایە ئەمە بۆچوونی هاوەڵکانمانە.

[3] الإرشاد للجويني ١٤٤.

[4] شرح أسماء الله الحسنى للرازي ١٠٧. وسەیری: النور للأصم. بکە.

[5] شرح أسماء الله الحسنى للرازي ١٠١.

لە ئایەتەکەدا ناوەکان دراونەتە پاڵ خوا (الله)، بۆیە دەبێت ئەو ناوە کە (الله) شتێکی بەدەر بێت لە ناوەکانی تر.

ناو کە بە چاك دادەنرێت لەبەر ئەوەیە چونکە ناولێنراوەکە ڕێزدارو باشە، جا ئەم ناوە کە (الله)یە ناوە بۆ زاتی خوا، بۆیە پیرۆزترین و ڕێزدارترین ناوە[1].

ئەوانەی ئەم بۆچوونەی دووەمیان هەیە چەند ڕایەکیان هەیە لە بارەی داتاشرانی وشەی (الله)، ئەمەش هەندێك لە ڕاکانیان:

١- ئەم وشەیە داتاشراوە لە (ألـه الرجـل إلى الرجـل يألـه إليـه) واتـە: لـە تـاو ئـەو کارەسات و چەرمەسەرییەی بەسەریدا هاتووە پەنای بۆ برد، (ألهـه) واتە: پـەنای دا و ئارامگەی پێدا، جا بەم پێیە بـە (إلـه) نـاو دەنرێـت، هـەروەك ئەگـەر یـەکێك ئیمامەتی و پێشەواتی خەڵك بکات پێی دەوترێت ئیمام.

لەبەر ئەوەی ئەمە ناوێکە بۆ زاتێکی گەورە، ناوەکەیان بە (أل) پێناساندن گـەورەو کردووە جا وتویانە (الإلاه)، دواتـر (همزە)یـان گـران کـرد لـەو وشـەیەدا کـە زۆر بەکاردەهێنرێت، جا لەبەر ئەوەی بوونی (همزە) لـە ناوەڕاسـتی وشـە گوشـارێکی زۆری هەیە (همزە)کەیان لابـرد، جـا ناوەکـە بـووە (الله) وەك چـۆن لـە قورئانـدا دابەزیووە.

ئەمە ڕای حارسی موحاسیبی و جگە لەویشە.

٢- داتاشراوە لە (لاه يلوه) ئەگەر بەرز بووەوە، خوای گەورە بەرزە بەبێ شوێن.

٣- داتاشراوە لە (تأله) کە بریتییە لـە پەرسـتن، دەوترێـت: (ألـه يألـه إلاهـة) واتـە: پەرستی، دەپەرستێ، پەرستن. لەبەر ئەوەی لە ڕاستیدا هـەر خـوا پەرسـتراوە بۆیـە

[1] شرح أسماء الله الحسنى للرازي ١٠٨-١٠٩.

ناونراوە (إله)[1].

بەروبوومی ئەم ناوە لە مرۆڤدا بریتیە لە پەرستن (تألە)، واتە دڵ و هیمەتی لە خۆشەویستی و پەرستنی خوادا ڕۆچوو بێت، جگە لە خوای گەورە کەسی تر نەبینێت، هیوای تەنها بە خوا بێت و تەنها لەویش بترسێت[2].

**الرحمن الرحیم:** دوو ناون کە لە وشەی (رحمة)ەوە[3] داتاشراون، کە داڕشتەی (مبالغە)ن[4].

جا (الرحمن) تایبەتترە لە (الرحیم)، جگە لە خوای گەورە کەس بەو ناوە نانرێت، بەڵام دەکرێت ناوی (الرحیم) بۆ جگە لەو بەکاربهێنرێت، جا دەوترێت: کەسێکی بە بەزەیی (الرحیم)ە، ناوترێت: (الرحمن)ە.

لەم ڕووەوە ناوی (الرحمن) وەك ناوی ناسێنەر (علم) مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت، ئەگەرچی لە وشەی (رحمة)یش داتاشرابێت، بۆیە خوای گەورە هەر دوو ناوەکەی بەیەکەوە کۆکردۆتەوە لەم فەرمایشتەدا: ﴿ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ أَوِ ٱدْعُوا۟ ٱلرَّحْمَٰنَ أَيًّا مَّا تَدْعُوا۟ فَلَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴾ الإسراء: ١١٠. [5] واتە: (پێیان بڵێ: ئێوە لە نزاو دوعاتاندا هاوار لە "الله" بکەن یان بە سیفەتی پیرۆزی "الرحمن" هانای بۆ بەرن، بەهەر ناوو سیفەتێکی جوان هاواری لێبکەن و نزا بکەن دروستە، چونکە ئەو خاوەنی هەموو سیفات و ناوە پیرۆزو جوانەکانە).

---

[1] شرح أسماء الله الحسنى للرازي ١٠٩-١١٧ چەند ڕوویێکی تری داتاشرانی وشەکەی باس کردووە. و سەیری ئەمەش بکە: الإرشاد للجويني ١٤٥ والنور للأصم ٢٨٩ والقاموس المحيط، والمصباح المنير، و كلاهما في مادة (أله)، والأسنى للقرطبي ٢٩٩.

[2] المقصد الأسنى للغزالي ٦٠.

[3] المقصد الأسنى للغزالي ٦١. . و سەیری ئەمەش بکە: شرح أسماء الله الحسنى للرازي ١٥٠-١٦٩.

[4] تحفة الأحوذي ٢/ ٢٦٠.

[5] المقصد الأسنى للغزالي، سەرچاوەی پێشوو. و سەیری ئەمەش بکە: النور للأصم ٢:٩١ و تحفة الأحوذي ، سەرچاوەی پێشوو.

وتراوە: (الـرحمن) بریتییـە لـەوەی بەبەزەییـە بـە هـەموو بـەدیهێنراوان لـە دونیـا و دوارۆژدا، (الرحیم): بریتیە لەوەی بە بەزەییە تایبەت بە باوەڕداران[1].

بەروبوومی ناوی (الرحمن) بریتییە لەوەی مرۆڤ بەزەیی بێتەوە بە بەندە بێ ئاگاکـانی خواو بە میهرەبانی ڕەفتاریان لەگەڵ بکات، بەچاوی ڕەحمەتەوە سەیری گوناهباران بکـات، نەوەك بەچاوی ئازاردان، بێزار نەبێت لەلابردنی گوناهەکان ئەمەش وەك بـەزەیی هاتنـەوە بە گوناهباران.

بەروبوومی ناوی (الـرحیم) لە مرۆڤـدا بریتییە لەوەی بەپێی توانای خۆی هەر هەژاری و نەداریی و پێویستیەکی بینی بەری لێبگرێت و بە سامانی خۆی پـڕی بکاتـەوە، ئەگـەر نەیتوانی بە سەروەت پڕی بکاتەوە، ئەوا بە دوعا پشـتی بگرێـت و یارمـەتی بـدات، تـا بەدەردەکەوێت کە بەژدارە لە لادانی ئازارەکە[2].

**القدوس:** پاك و دوور لە کەم و کوری و ناتەواوی و عەیبەکان، (فعول) لە دڕاشـتەی (مبالغە)یە[3].

**المؤمن:** ئەوەیە کە ئارامی و دڵنیایی و ئەمینی دەدرێتە پاڵ، ئەمەش لـە میانـەی کەڵك وەرگتن لە هۆکارەکان، و گرتنی ڕێگەکانی مەترسی.

دڵنیاکەرەوەی ڕەها (المؤمن المطلق) بریتییە لەوەی کە هـەموو ئـارامی و ئەمینییـەك لەلایەن ئەوەوە بێت، کە ئەویش بریتیە لە خوای گەورە[4].

ئەمە وەرگیراوە لە:

أ- ئیمان: کە بە مانای دان پێدانان دێت، واتە: پێغەمبەرانی بە ڕاسـتدانا بـەوەی بـە پیشاندانی دەرئاسا (موعجیزە) پشتی ئەوانی گـرت، ڕاسـتگۆیە لـەو بەڵێنەیـدا کـە بـە

---

[1] النور للأصم، سەرچاوەی پێشوو.

[2] المقصد الأسنى للغزالي ٦٢.

[3] تحفة الأحوذي، سەرچاوەی پێشوو. وهو في شرح أسماء الله الحسنى للرازي ١٨١ وقارن بما قال الإمام الغزالي في المقصد الأسنى ٦٥ والقرطبي في الأسنى ٢٢٩.

[4] المقصد الأسنى للغزالي ٦٧.

بەندەکانی داوە لەوەی پاداشتیان دەداتەوە.

ب- ئیمان: کە بە واتای ئارامی و هێمنی و ئەمینی دێت کە دژی ترسە. واتە: خـوای گەورە پارێزراویان دەکات لە سزای خۆی و دڵنیایان دەکاتەوە[1].

المهيمن: بەڕێوەبەرو ڕاپەڕێنەری بەدیهێنراوەکانە لە کاروبارو ڕۆزی و ئاکامیـان دا، لـە کـار ڕاپەڕادنەکـەی بـە چـاودێری کـردن و زاڵبـوونی و پاراسـتنی بەدیهێنراوەکانیـەتی. چـاودێری کـردن دەگەڕێتـەوە بـۆ زانسـت، زاڵبـوونیش دەگەڕێتـەوە بـۆ توانـای تـەواو، پاراستنیش دەگەڕێتەوە بۆ عەقلً، جا ناوی (المهـيمن) کۆکەرەوەی هەرسێ ئەو مانایانەیە، هیچ کەسێك ئەو سێ سیفەتانە بە کاملی کۆ ناکاتەوە، تەنها خوای گەورە نەبێت[2].

جا (المهيمن) بریتییە لەوەی هەڵدەستێت بە چاودێری و پاراستنێکی لە سنوربەدەر[3].

یان (المهيمن) بریتییە لە گەواهیدەر، چونکە خـوای گـەورە شـایەتیدەرو گەواهیـدەرە، لەسەر گوفتـارو کردارەکـانی بـەدیهێنراوەکانی. یـاخود بریتییـە لـە خـاوەنی بـەزەیی و میهرەبانی زۆر[4].

العزيز: زاڵ، هەرگیز ناشکێت. ئەم وتەیەی عەرەب لەوەوە هاتووە: (من عزَّ بزَّ) واتـە: هەرچی زاڵ بێت شت دەست دەخات[5].

غەزالی وتویەتی: هاوشێوەی ئەو نییە، سەرچاوەی پێداویستیە، گەیشتن پێی سـەختە. هەر زاتێك ئەو سێ مانایەی تێدا کۆ نەبێتەوە ناوی (العزيز)ی لێ نانرێت[6].

الرَّزَّاق: بەدیهێنەری ڕزق و ڕۆزییەکانە، ڕۆزی بەدیهێنراوانی دەدات.

---

[1] تحفة الأحوذي ٢/٢٦٠ وشرح أسماء الله الحسنى للرازي ١٨٥ والنور للأصم ٢٩٧.

[2] المقصد الأسنى للغزالي ٦٩.

[3] تحفة الأحوذي ٢/٢٦٠.

[4] شرح أسماء الله الحسنى للرازي ١٨٨. و بڕوانە ئەمەش: تحفة الأحوذي، سەرچاوەی پێشوو. النور للأصم ٢٩٨.

[5] أسماء الله الحسنى للرازي ١٩٠ و تحفة الأحوذي ٢/٢٦١ والنور للأصم ٢٩٩.

[6] المقصد الأسنى للغزالي ٦٩. و بڕوانە ئەمەش: الأسنى للقرطبی ٢٠٤.

دوو جۆر ڕۆزی هەیە: ڕۆزی دیار: کە بریتییە لە خواردن و خواردەمەنییەکان، بۆ لاشە و جەستەکانە. ڕۆزی شاراوە: بریتیە لە زانیاری و زانست، کە بۆ دڵەکانە[1].

الحكم: ئەو دادوەرەیە کە فەرمان و حوکمەکەی ڕەت ناکرێتەوە، پێداچوونەوە بۆ بڕیارەکەی ناکرێت.

بەروبوومی ئەم ناوە لە مرۆڤدا، بریتییە لەوەی بزانێت، کە پێنووس هەموو شتێکی نووسیوە، کە دەبێت و ئەمەش یەکلا کراوەتەوە، هەر هۆکارێك بەرەو ئەنجامەکەی ئاراستە کراوە.

خوای گەورە بۆ هەر ئەنجامێك هۆکارەکەی دیاریکردووە، جا ئەگەر هۆکارەکەی کەوتە کار، ئەوا هاتنەجێی ئەنجامەکە پێویست دەبێت، بە ئەندازەیکی دیاریکراو نە زیاد نە کەم.

ئەگەر مرۆڤ زانی ئەو شتەی کە لە قەدەردا بڕیاری لەسەر دراوە هەر دێتەبوون، ئەو کاتە داوای پوختەی ڕۆزییەکەی دەکات و دەروونی ئارام دەبێت و دڵی شڵەژاو نابێت[2]، دڵی دەزانێت کە هەرچی ڕووبەڕووی دەبێتەوەو تووشی دەبێت، هەر لە بێ سەرەتا و هەربوو (أزل)ەوە بڕیاری لەسەر دراوە، بۆیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: **(من عرف سرَّ الله في القدر هانت عليه المصائب)** واتە: ئەوەی پەیی بەنهێنی خوا ببات لە قەدەردا ئەوا کارەساتەکانی لەلا سووك دەبن و لەسەری گران نابن[3].

اللطيف: بریتییە لەوەی کە خاڵە وردو نادیارەکانی بەرژەوەندییەکان دەزانێت، بە ڕێگە و شێوازی نەرم و نیان ئەم بەرژەوەندییانە دەگەیەنێتە ئەوانەی شایەنن.

---

[1] المقصد الأسنى للغزالي ٧٩ و تحفة الأحوذي، سەرچاوەی پێشوو. و بڕوانە ئەمەش: شرح أسماء الله الحسنى للرازي ٢٢١.

[2] المقصد الأسنى للغزالي ٨٥-٨٩ و تحفة الأحوذي ٢٦١/٤.

[3] شرح أسماء الله الحسنى للرازي ٢٣٧.

ئەگەر وردبینی لە زانستدا، لەگەڵ نەرم و نیانی لە کرداردا، کۆبوونەوە مانای (اللطیف) دەبەخشن، تەصەوڕ ناکرێت ئەمە بە کاملی لە غەیری خوای گەورەدا بێتەجێ.

بەروبوومی ئەم ناوە لە مرۆڤدا بریتییە لە بەزیی هاتنەوە بە بەندەکانی خوا و نەرم ونیانی نواندن لەگەڵیان لە بانگەوازی کردن بۆ لای خوا و ڕێنموونی کردنیان بۆ بەختەوەری دوارۆژ، بەبێ گرتنەبەری توندو تیژی و دەمارگیری و دەمەقاڵێ.

چاکترین ڕووی نەرم و نیانی بریتیە لە خۆ ڕازاندنەوە بە خەسڵەت و ڕێژینی چاك و کردەوەی باش، چونکە ئەمە کاریگەری و کێشندەییەکەی گەورەترو باشترە لە وشەی ڕازاوە[1].

الحلیم: گوناهی گوناهکاران دەبینێت، کە پێچەوانەی فەرمانی ئەو ڕفتار دەکرێت، بەڵام تورە نابێت و پەلە ناکات لە تۆڵە سەندنەوەو سزادان سەرباری ئەوەی ئەوپەڕی توانای هەیە.

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُواْ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا مِن دَآبَّةٍ ﴾ فاطر: ٤٥. واتە: (خۆ ئەگەر خوا تۆڵەی لە خەڵکی بسەندایە لە سەرەنجامی کارو کردەوەی نادروستیاندا، هەرچی زیندەوەر هەیە لەسەر ڕووکاری زەوی نەدەما).

بەروبوومی ئەم ناوە لە مرۆڤدا زانراوە، کە نەرم و نیانی لە خەسڵەتە هەرە چاکەکانی بەندەکانە[2].

---

[1] المقصد الأسنی للغزالي ٩٢. و سەیری ئەمەش بکە: شرح أسماء الله الحسنی للرازي ٢٤٠ و أشار إلی الغزالي، و تحفة الأحوذي ٢٦١/٤.
دەوترێت: (لطف به و له یلطف "کنصر" لطفا): بەزەیی پێدا هاتەوە. و (لطف یلطف "ککرم"): بچوك و ورد بوو./ القاموس المحیط مادة (لطف) و تحفة الأحوذي، سەرچاوەی پێشوو.

[2] المقصد الأسنی للغزالي ٩٤. و سەیری ئەمەش بکە: شرح أسماء الله الحسنی للرازي ٢٤٢-٢٤٤ وتحفة الأحوذي، سەرچاوەی پێشوو، والنور للأصم ٣١٤.

المُقِيت: بەدیهێنەری ڕۆزی و خۆراکە، گەیەنەری ڕۆزییە بە جەستەکان، کە بریتییە لە خواردەمەنیەکان و خواردنەکان، ڕۆزی گەیەنەرە بە دڵەکان کە بریتییە لە زانیناریی و زانست.

یاخود بریتیە لە زاڵ بوو بەسەر شتەکان، ئەوەی تواناداره بەسەر شتەکاندا. زاڵ بوونیش بە توانادارى و زانست دەبێت. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ مُّقِيتًا ﴾ النساء: ٨٥. واتە: ئاگاداری توانادار. واتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ کۆبوونەوەی توانا و زانست بە یەکەوە[1].

یاخود بەمانای پارێزەرە[2].

الحسيب: دابینکەر (الکافی)، کاتێك خواردن و خواردنەوەو شتەکانی دەورووبەری مرۆڤی بەدیهێنا ئەوەندەی بە مرۆڤ بەخشی کە بەسی بێت[3].

بەروبوومی ئەم ناوە لە مرۆڤدا ئەوەیە کە تێبکۆشێت بۆ ئەوەی لە ڕووکەشدا ببێتە دابینکەری پێداویستی نەداران.

یان (الحسیب) بریتیە لە لێپرسەرەوە.

بەروبومیشی بریتییە لەوەی مرۆڤ لێپێچینەوە لەگەڵ خۆی بکات، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: **(حاسبوا أنفسكم قبل أن تحاسبوا)** واتە: لەخۆتان بپێچەونە بەر لەوەی لێپێچینەوەتان لەگەڵ بکرێت.

یاخود (الحسیب) بریتییە لە خاوەن پلەوپایە و شکۆ، ئەوەی کە هەموو بەشێکی لە شکۆداری هەیە[1].

---

[1] المقصد الأسنى للغزالي ١٠٢. و سەیری ئەمەش بکە: شرح أسماء الله الحسنى للرازي ٢٥٩-٢٦٠ وتحفة الأحوذي ٢٦١/٤ والنور للأصم ٣٣٩.

[2] شرح أسماء الله الحسنى للرازي، والنور للأصم، هەردوو سەرچاوەکەی پێشوو، وكلاهما عن أبي عبيدة معمر بن المثنى، وتحفة الأحوذي، سەرچاوەی پێشوو.

[3] المقصد الأسنى للغزالي ١٠٢ و شرح أسماء الله للرازي ٢٦٠ و تحفة الأحوذي، سەرچاوەی پێشوو.

بەروو بوومەكەی لە مرۆڤـدا بریتییە لـەوەی كـە مرۆڤ بزانێت شـكۆدارییەكەی لەوەیە خوای گەورە بناسێت و گوێڕایەڵی بكات.

الودود: بریتییە لەوەی باشەی بۆ هەموو دروستكراوەكانی دەوێت، چاكە لەگەڵیان.

ئەم شرۆڤەیە نزیكە لە واتای (الرحیم)، جیاوازی نێوانیان ئەوەیە كـە: ڕەحمـەت داڕژان پێویستی بە بوونی ڕەحم پێكراوێكی لاوازە، بەڵام (خۆشەویستی: الود) ئەمـەی پێویسـت نییە، بەڵكو بەخشندەیی سەرەتای دەرەنجامەكانی خۆشەویستیە[2].

بـەروبوومی ئـەم نـاوە لـە مرۆڤـدا، ئەوەیـە كـە خـەڵكی خۆشـبووێت، بـە ڕێگـە شەرعیەكان. هەروەك ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لـەوەوە هـاتووە كاتێك ددانە چوارینەكەی شكا لە جەنگی (أحد)دا فەرمووی: **(اللهم اهدِ قومي فإنهم لا يعلمون)**[3] واتە: خوایەگیان ڕێنموونی هۆزەكەم بكە چونكە نازانن.

خۆشەویستی لە خەڵكیەوە بریتیە لەوەی كە چی بۆ خۆی پێخۆشە، ئەوەشی بۆ خـەڵك پێخۆش بێت، پلەی لەوەش بەرزتر ئەوەیە كە خەڵكی پێش خۆی بخات.

هەروەك یەكێكیان وتی: (دەمەوێت ببم بەپردێك لەسەر ئاگر، بەدیهێنراوان بەسـەرمدا تێبپەڕن و ئازار نەخۆن)[4].

الصمد: جێگای مەبەستە، جێگای نیازە، بۆ هەموو پێویستیەك ڕووی تێدەكرێت[5].

العفو: لە گوناهەكان خۆش دەبێت و تاوانەكان دەسڕێتەوە.

نزیكە لە ناوی (الغفور)، بەڵام (مبالغە)ی زیاترە، (الغفران) واتـە داپۆشـین، (العفـو) واتە: سڕینەوە، سڕینەوەش قوڵترو بەهێزترە لە داپۆشین.

---

(1) شرح أسماء الله للرازي، سەرچاوەی پێشوو. و پێشتر فەرموودەی (لە خۆتان بپێچنەوە...) لە: (گرنگی بیروباوەڕدا) باسی ڕێگەكانی هاتنی كراوە.

(2) المقصد الأسنى للغزالي ١٠٩ و شرح أسماء الله الحسنى للرازي ٢٧٤.

(3) شرح أسماء الله الحسنى للرازي، سەرچاوەی پێشوو.

(4) المقصد الأسنى للغزالي، سەرچاوەی پێشوو.

(5) المقصد الأسنى للغزالي ١١٩. و سەیری ئەمەش بكە: شرح أسماء الحسنى للرازي ٣٠٤ و تحفة الأحوذي ٢٦٢/٤ والنور للأصم ٣٨٦.

بەرویوومی ئەم ناوە لە مرۆڤـدا بریتییە لەوەی لەو کەسە خۆش ببێت کە ستەمی لێکردووەو تەنانەت چاکەشی لەگەڵدا بکات[1].

[1] المقصد الأسنى للغزالي ١٢٤. بڕوانە ئەمەش: شرح أسماء الله الحسنى للرازي ٣٢٦ وتحفة الأحوذي، سەرچاوەی پێشوو. تەفسیری ئەم ناوانە لەم سەرچاوەیەشدا هاتووە: الإرشاد للجويني ١٤٣-١٥٥.

## دەروازەی سێیەم

## سیفەتەکانی خوداو
## ئەو شتانەی لەسەری کەڵەکە دەبن

لێرەدا زانایانی کەلام باسی ئەو شتانەیان کردووە کە بۆ خوای مەزن: پێویستە، ئەستەمە، دروستە.

### یەکەم: ئەو شتانەی پێویستن بۆ خوای بەرزو پیرۆز

هەندێك لە زانایانی کەلام ئەو سیفەتانەی بۆ خوا پێویستن دابەشیان کردووە، بەم شێوەیە:

١- سیفەتی خودی (نفسی): کە سیفەتی بوون (الوجود)ە.
٢- سیفەتە پێچەوانەکان (السلبیة): کە پێنجن: لەمێژینە و دێرینی (القدم)، نەمری و هەرمان (البقاء)، پێچەوانەی پەیدابوان (مخالفة الحوادث)، بێ نیازیی و بەخۆوە ڕاوەستان (القیام بالنفس)، تەنهایی (وحدانیة)،
٣- سیفەتە واتاییەکان (المعانی): کە حەوتن: توانا (القدرة)، ویست (الارادة)، بیستن (السمع)، بینین (البصر)، دوان (الکلام)، ژیان (الحیاة). ڕاجیاییان هەیە لەبارەی سیفەتی بەدیهێنان (تکوین)، لەجێی خۆی ڕوون کردنەوەی بۆ دەکەین[1].

---

[1] بڕوانە ئەم جۆرە دابەشکردنە لە: شرح خریدة البهیة للدردیر و حاشیة الصاوي علیه ٥٨ و لاپەڕەکانی دواتر، و شرح الجوهرة الباجوری ١٠٤ و لاپەڕەکانی دواتر، و رسالة في التوحید و الفرق المعاصرة لشیخ کمال الدین الطائي ٢٤ و لاپەڕەکانی دواتر.
بەشی چوارەمیش هەیە، کە بریتییە لە: (سیفەتە مەعنەوییەکان)، کە ئەمانەن: خوای گەورە: بە توانایە، ویستەرە (مرید)، بیسەرە، بینەرە، زانایە، قسەکەر، زیندووە. لەسەر ئەم بەشە زانایان ڕاجیاییان هەیە و نامانەوێت بچینە سەری. تەنها ئەوە نەبێت دەڵێن: سیفەتە مەعنەوییەکان بەرهەمی سیفەتە واتاییەکانن.

١

## - سیفەتی خودی (نفسی): سیفەتی بوون (الوجود)

بوونی خودای باڵادەست و خاوەن شکۆ

(صفة ثبوتية، يدل الوصف بها على نفس الذات، دون معنى زائد عنها) واتە: سیفەتێکی هەمیشەیی و جێگیرە، وەسفکردن خودی خوا بەم سیفەتە، ئاماژەیە بۆ خودی زاتی پاکی خوا نەوەك بۆ واتاو شتێکی زیاد و بەدەر لە زاتی خوا.

شرۆڤەکردنی پێناسەکە:

سیفەت (صفة): ڕەگەزە، هەموو سیفاتەکان لەخۆ دەگرێت.

هەمیشەیی و جێگیر (ثبوتية): ئەدرێتە پاڵ جێگیربوون (ثبوت)، چونکە ئەمە جێگیرو چەسپاوە لە هۆشدا. بەمەش سیفاتی پێچەوانە (الصفات السلبية) لەم چوارچێوەیە دەچنە دەر وەك: دێرینی و لەمێژینە (القدم) و نەمری و هەرمان (البقاء)...

بەهۆیەوە (بها): لەو سیفەتە دەتاشرێ و دروست دەبێت نەوەك بەخودی سیفەتەکە، بۆیە دەڵێین: خوا هەیە (موجود)ە، و ناڵێین: خوا بوون (وجود)ە.

---

دەسوقی لە حاشیەکەی لەسەر (أم البراهين ١١٩) وتویەتی: (واتە: سیفەتی بوونی "الكونية" کە باسکرا سیفەتێکی چەسپاوەو بە زاتەوە ڕاوەستاوەو پەیوەستە بە تواناوە. یەکێك لەو سیفەتانە بوونییە کە توانایە، ئەوەی تریشیان بەهەمان شێوە چەسپاوەو ناتوانرێت ببینرێت کە بریتییە لەوەی خوا تواناداره، لە بارەی سیفەتی "هەرمان: الباقي"یش هەمان قسە دەکات. بزانە ئەم سیفەتە مەعنەوییانە حەوتن، بۆ خوای گەورە پێویستن، بەیەکدەنگی ئەهلی سوننە و موعتەزیلە، سەبارەت بە چەسپاندنی و لادانی "حاڵ: بریتییە لەو هۆیەی کە لە نێوان بوون و نەبووندا هەیە. (وەرگێڕ)" ڕاجیاییەکە لەسەر واتای پەیوەست بوونەکەیەتی بە زاتی بەرزی خوا. جا ئەوەی بۆچوونی وایە حاڵ بوونی نییە - هیچ هۆیەك نییە لە نێوان بوون و نەبوون، هەروەك ئەشعەریی بۆچوونی وایە - وتویەتی: واتای ئەوەی خوای گەورە زانایە، بریتیە لەوەی زانستی هەیە، مانای وا نییە سیفەتێکی زیادەی تر لە دەرەوەی هۆشدا هەیە کە بوونی زانستەکە بچەسپێنێت. ئەوەانەش کە وتویانە حاڵ هەیە دەڵێن خوای گەورە زانایە بە سیفەتێکی جیا لەو زانستەی پەیوەستە بە زاتی خواوە، ئەم سیفەتە سەربەخۆ نییە و نەبووی تەواویش نییە بەڵکۆ هۆیەکە لە نێوان بوون و نەبوون، واتە: نەگەیشتووەتە پلەی بوون و داش نەبەزیوەتە ئاست پلەی نەبوون).

ئاماژەیە بۆ خودی زاتی خوا (علی نفس الذات): واتە ئاماژە ناکات بۆ شتێکی بەدەر لە زاتی خوا، چونکە زاتی خوای گەورە ئەندێشە ناکرێت بەبێ بوونی ئەم سیفەتە، بۆیە بە سیفەتی بوون (وجود)ی ناونراوە. بەمەش سیفاتی واتایی (معانی) و معنوی لەم سیفەتەدا دەردەچن.

بەبێ ئەوەی ئاماژە بکات بە واتا و شتێکی بەدەر و زیاد لە زاتی خوای (دون معنی زائد عنها): شرۆڤەی وتەی: ئاماژەیە بۆ خودی زاتی خوا (علی نفس الذات) [1].

---

[1] شرح الخريدة للدردير و حاشية الصاوی علیه ٥٤. و صاوی ئەم پێناسەیەی داوەتە پاڵ تفتازانی، سەیری ئەم پێناسەیە بکە لە: شرح الجوهرة للباجوري ١/١٠٧.
شێخ سەنووسی لە شەرحەکەی لەسەر (أم البراهين ٧٤-٧٥) وتویەتی: (لە مەزهەبی شێخ ئەشعەریی دا هەندێك نەرمی نواندن هەیە لە ژماردنی "بوون: وجود" وەك سیفەتی خودا، چونکە "بوون" لەلای ئەشعەری خودی زاتە، سیفەتێکی زیاد لە زاتی خوا نییە، زاتی خوداش سیفەت نییە، بەڵام لەبەر ئەوەی زاتی پیرۆزی خوا لە دەربڕین و بێژەدا پێی وەسف دەکرێت، بۆیە دەوترێت زاتی خودای بێ وێنە، بەم پێیە دروستە بەشێوەیەکی گشتی وەك سیفەت بژمێردرێت.
بەڵام لەسەر مەزهەبی ئەوانەی "بوون" وەك سیفەتێکی زیاد داناوە وەك: ئیمامی ڕازی، بەپێی ئەم مەزهەبە "بوون" بە یەکێك لە سیفەتەکان دادەنرێت بەبێ نەرمی نواندن.
هەیانە وەك سیفەتێکی زیاد لە زاتی خودایان داناوە لە باری پەیدابووندا نەك لە بێ سەرەتاو هەربووەوە، ئەمەش مەزهەبی فەیلەسوفەکانە).
دەسوقی لە حاشیەکەی لەسەر (أم البراهين ٧٥-٧٦) ئەم سێ بۆچوونەی سنوسی ڕاڤەکار هێناویەتی لەبارەی (بوون) پوختی کردۆتەوە لەم خاڵانەدا:
١- بوون خودی هەبووەکەیە لە کۆن و نوێدا. ئەمە مەزهەبی ئەشعەرییە.
٢- بوون شتێکی جیاو زیادە لە خود جا ئەو بونە بێ سەرەتا یاخود خاوەن سەرەتا بێت، بەو واتایەی بوون ڕێژەییە، ئەمە مەزهەبی ڕازییە.
٣- درێژەپێدان و لێك جیاکردنەوە لە نێوان بێ سەرەتا و خاوەن سەرەتا، بوون بۆ بێ سەرەتا خودی هەبووەکەیە، بۆ خاوەن سەرەتاش شتێکی جیاو زیادە لە هەبووەکە، ئەمە مەزهەبی فەیلەسوفەکانە.
دەسوقی دوو بۆچوونی تریشی هێناوە:
١- بوون حاڵەتێکی جێگیرە لە خودی خۆیدا، ئەمە بۆچوونی قازی و ئیمامی حەرەمەینە.
٢- بوون سیفەتێکی واتاییە، ئەمە ڕای کەڕامییەکانە.

**بوونی خوای گەورە بوونێکی تەواو و کامڵ و خودیی سەربەخۆیە**، واتە بە خۆی خۆی هەیە، هیچ هۆیەك کاریگەی تێ نەکردووە. لە تایبەتمەندییەکانی خودیی (ذاتـي) ئەوەیـە: کە نەبوون قبوڵ نەکات.

بوونی شتەکانی تر (هەموو شتێك جگەلە خوای گـەورە) ئـەوا بوونیـان بـە ناتـەواوی هەیە و شوێنکەوتوو (تبعی)ن، واتە: بوونی خۆیان لـە غـەیری خۆیـان دەسـت دەخـەن، و پەیوەستن بە بەدیهێنەرەکەیانەوە. چونکە لە تایبەتمەندیەکانی شوێنکەوتن (تبعی) بریتییە لەوەی کە لە نێوان دوو نەبووندا بێت، نەبوونی پێشوو نەبوونی داهاتوو[1].

پێشتریش بە تێروتەسەلی لـە باسـی یەکەمـدا دوایـن لەسـەر بابـەتی (بـوونی خـوای باڵادەست و خاوەن شکۆ).

هەندێك کەس تەنها بوونی خوا نەبێت بوونەکانی تر نابینن، ئەمەش بە یەکێتی بـوون (وحدة الوجود) ناودەبرێت. کەسانێك لەم بۆچوونەدا نغرۆ بوون، تەنانەت لە وتەی هەندێك ئەولیاکانیشدا گریمانەی یەکێتی و ئاوێتە بوون (الإتحاد والحلول) دەخوێنرایەوە، وەك: وتەی حەلاج، کە دەیوت: (من خوام)، هەندێکی تر دەیانوت: (تەنها خوا لە ژێر جوببەکەدایە)، ئەم دەربڕینە لە ڕووی شەرعیەوە دروست نییە، چونکە مانای نارێکە، بەڵام سەبارەت بـە صۆفیەکان جاری وا هەیە حاڵەتی وا بە سەریاندا دێت کە دەبێت ئەو ڕەفتارو گوفتارەیـان بەو هۆیەوە تەئویل بکرێت بەشێوەیەك کە لەگەڵ حاڵەتەکە بگونجێت. یەکێك لەوانەی کـە فەتوای کوشتنی حەلاجی دەرکرد لەسەر ئەو گوفتارەی پێشـتر کـە خسـتمانەڕوو جنیـدی بەغدادی بوو[2].

---

[1] کبری الیقینیات الکونیة ١١٣.

[2] شرح الجوهرة للباجوري ١٠٥. سەیری ئەمانەش بکە: خیر القلائد ٣٧-٣٩ وکبری الیقینیات الکونیة، سەرچاوەی پێشوو.

## ٢- سیفەتە پێچەوانەکان (الصفاة السلبية)

سیفەتە پێچەوانەکان، پێنجن: لەمێژینە و دێرینی (القِدَم)، نەمری و هەرمان (البقاء)، پێچەوانەی پەیدابووەکان (مخالفة الحوادث)، بێ نیازیی و بەخۆوە ڕاوەستان (القيام بالنفس)، تەنهایی (وحدانية)[1].

ئەم سیفەتانە بە سیفەتە هەرە گرنگ و بە سیفەتی بنەڕەتی (دایك) دادەنرێن، چونکە بە لابردنی پێچەوانەی ئەم پێنج سیفەتە خوای گەورە پاك و پیرۆز دەگیرێت لە هەموو کەم و کورتییەك[2].

کە دەوترێت سیفەتی (سلبی) مانای وانییە کە ئەو سیفەتانە لە خوای گەورەدا نین و ئەو سیفەتانە بۆ خوای گەورە بڕیار نادرێن، ئەگەرنا ئەو کات پێویست دەبوو کە سنوور بڕیار بدەین بۆ خوای گەورەو بڵێین کە لە ناوچوونی بەسەردا دێت و بە بەدیهێنراوان دەچێت، بەڵکو مەبەست لە (سلبی) ئەوەیە: کە هەر سیفەتێك لەو سیفەتانە شتێکی لەو شتانەی ڕەتکردۆتەوە کە شیاوی خوای گەورە نین[3].

جا سیفەتی لەمێژینە و دێرینی (القِدَم) پێچەوانەی ئەوەیە کە خوای گەورە سەرەتای هەبووبێت، سیفەتی نەمری و هەرمان (البقاء) پێچەوانەو دژی ئەوەیە کە خوای گەورە کۆتایی هەبێت.... بەم شێوەیە.

لە ڕاستی دا سیفەتە پێچەوانەکان لەم پێنج سیفاتەدا کورت نابنەوە، هەروەك ئەمانەش دەچنە ڕیزی سیفەتە پێچەوانەکان کە خوای گەورە کوڕ و خێزانی نییە، نە پێکهاتەیەکی سادە (بسیط) نە لێکدراو و ئاڵۆز (مرکب)ە، لە ناو شوێن و کاتدا نییە، ناکەوێتە تەنیشت و ڕووێکەوە، چەندی تریش بەڵام لەبەر ئەوە تەنها لەم پێنجانەدا

---

[1] لەقانی لە: (الجوهرة) و باجوری لە: (شرح الجوهرة ١/٥٠). و دەردیر لە: (الخريدة و شرحها و حاشية الصاوي عليه ٥٨). و تائی لە: (رسالة في التوحيد والفرق المعاصرة ٢٥) بەم ڕێژەیە دیاریان کردووە.

[2] شرح الجوهرة للصاوي ١٤٥.

[3] حاشية الصاوي على الدردير ٧٠. بڕوانە: شرح الخريدة للدردير ٥٥.

کورتیان کردۆتەوە، چونکە ئەمانە سەرچاوەی ئەوانی ترن[1].

زانایان ڕاجیا نین سەبارەت بەم سیفەتانە، تەنانەت سەرجەمیان ئەم سیفەتانە پەسەند دەکەن[2].

## ١- لەمێژینەیی و دێرینی (القِدَم):

سیفەتی لەمێژینە و دێرینی (القِدَم) بۆ خوای گەورە بە واتای ئەزەلی و هەر بووی دێت، واتە خوای گەورە سەرەتایەکی نییە کە لەوێوە بوون دەستی پێکردبێتئو مەبەست لەم سیفەتە درێژبوونەوە نییە بەپێی چەرخ و کات، چونکە کات و چەرخ دوو سیفەتی بەدیهێنراوەکانن[3].

---

[1] حاشية الصاوي على الدردير ٥٥-٥٦ و شرح الجوهرة للباجوري ١٠٧.

[2] شرح المقاصد للتفتازاني ٤/٦٩.

[3] المسامرة ٢٢ وشرح أم البراهين للسنوسي وحاشية الدسوقي عليه ٧٧.

باجوری لە: (شرح الجوهرة ١٠٨) وتویەتی: (لە بارەی لەمێژینەیی "القديم" و بێ سەرەتا "الأزل"، سێ بۆچوون هەن:

**بۆچوونی یەکەم:** لە مێژینە "القديم" ئەو هەبووەیە کە سەرەتای پەیدا بوونی نییە، بێ سەرتا "أزلي" ئەوەیە کە یەکەم بوونی بۆ نییە، جا چ نەبوو یان هەبوو بێت. بەم پێیە هەموو لەمێژینەیەك بێ سەرەتایە بەپێچەوانەشەوە نا.

**بۆچوونی دووەم:** لەمێژینە "القديم" ئەو هەبووەیە کە بەخۆوە ڕاوەستاوەو خۆی بوونی یەکەمە جگە لە خۆی یەکەمی بۆ نییە، بێ سەرەتا "أزلي" ئەوەیە جگە لە خۆی یەکەم بەبوون و نەبوون بۆی نییە خۆی یەکەمە، جا چ بە خۆوە ڕاوەستاو بێت یاخود پشت بە جگە لە خۆی ببەستێت. ئەمە وا بەدەردەکەوێت لە وتەکەی "سەعد".

**بۆچوونی سێیەم:** چ لەمێژینە و کۆن یاخود بێ سەرەتا هەر یەکێکیان بریتیە لەوەی خۆی یەکەمە و جگە لەخۆی یەکەمی بۆ نییە چ بە بوون یان نەبوون، چ بە خۆوە ڕاوەستاو بێت یان پشت بە جگە لە خۆی ببەستێت. بەپێی ئەم بۆچوونە لەمێژینە "القديم" و بێ سەرەتا "أزلي" هاومانان.

بەپێی بۆچوونی یەکەم: سیفەتە پێچەوانەکان بە لەمێژینەیی وەسف ناکرێن بەڵکو بە بێ سەرتایی وەسف دەکرێن، بەپێچەوانەی زاتی پاك و پیرۆزو سیفەتە چەسپاوەکانی خوا کە بە لەمێژینەیی و بێ سەرەتایی وەسف دەکرێن.

یان بە دەربڕینێکی تر: واتای لەمێژینە و دێرینی (القِدَم): نەبوون (عدم) پـێش بـوونی خوای گەورە نەکەوتۆتەوە، جا خوا سەرەتای نییە[1].

پێچەوانەی سیفەتی لەمێژینە و دێرینی (القِدَم): بەدیهاتن و پەیدابوونە.

**بەڵگەی عەقڵی لەسەر لەمێژینەیی و دێرینی (القِدَم) خوای پاک و بەرز:**

خوای گەورە ئەگەر دێرین و لەمێژینەو بێ سەرەتا نەبێت ئەوا ئەوسا دەبێتە بـدیهێنراو و لێکەوتە، چونکە یان بەدیهێنەرو لەمێژینەیە یاخود بەدیهێنراو لێکەوتەیە و ناوەنـد لـە نێوانیاندا نییە. و ئەگەر خوای گەورە بەدیهێنراو بوایە ئەوا پێویستی بە بەدیهێنەر دەبـوو تا بەدی بێنێت، بەدیهێنەرەکەش خۆیشی پێویستی بە بەدیهێنەر دەبوو... بـەم شـێوەیە. لەو کاتە خول (دور) و زنجیرەیی (تسلسل) پێویسـت دەبێـت و هـەر دووکیشـیان شـیاوی نەبوون و مەحاڵن، بۆیە پێویستە کە خوای گەورە کۆن و لەمێژینە بێت[2].

**بەڵگەی نەقڵی لەسەر لەمێژینەیی و دێرینی (القِدَم) خوای پاک و بەرز:**

ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەیە: ﴿ٱلۡأَوَّلُ﴾ لـە ئایـەتی: ﴿هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ﴾ الحديـد: ٣. واتە: (ئەو خوایە یەکەمینە و لەسـەرەتاوە هـەر هـەبووەو کـەس پـێش ئـەو نـەبووە، دواهەمینە و کۆتایە، کەس دوای ئەو نامێنێت "بەڵام ئەو هەر دەمێنێت").

---

بەپێی بۆچوونی دووەم: هەموو سیفەتەکانی خوا بەهیچ شێوەیەك بە لەمێژینەیی وەسف ناکرێن، بەڵکو بێ سەرەتایی وەسف دەکرێن، بەپێچەوانەی زاتی پاك و بڵندی خوا کە بە لەمێژینەیی و بێ سەرەتایی وەسف دەکرێت.

بەپێی بۆچوونی سێیەم: هەر یەك لە زات و سەرجەم سیفەتەکانی خوا بە لەمێژینەیی و بێ سەرتایی وەسف دەکرێن).

[1] المسايرة، وشرحه المسامرة، و شرحه لقاسم بن قُطلوبغا على ٢٢. لە: (الإرشاد للجويني ٣٢) هاتووە: لەمێژینە و کۆن "قديم" ئەو هەبووەیە کە یەکەم بوون بۆ ئەو نییە، بەڵکو خۆی یەکەمە و جگە لە خۆی یەکەمی بۆ نییە.

[2] شرح المواقف ٤٨٠، و المسامرة ٢٢ و شرح الخريدة للدردير ٦٠-٦١ و الباجوري على الجوهرة ١/٥٠ و الاقتصاد في الاعتقاد - امام الغزالي بيروت ساڵی ١٩٦٩، ٩٢.

### ئەندێشە کردن سیفەتی لەمێژینەیی و دێرینی (القِدَم):

شتێکی ئاسانە لەلای مرۆڤـــ کـە لـە سـیفەتی بـەزەیی و دادپـەروەری و شـکۆداری تێبگات... لەبارەی زاتی خوای گەورەدا، چونکە مرۆڤـــ لـە شـوێنەواری ئـەو سـیفاتانە تێدەگات، دەشتوانێت بەهۆی هەستەکانی پەیی بە واتاکـانی ببـات لـە ژیـانی دا، بـەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شتێکی ئەستەمە کە مرۆڤـ پەیی ببات بە سیفەتی لەمێژینـە و دێرینـی (القِدَم)، سیفەتی نەمری و هەرمان (البقاء)، چونکە هیچ وێنەیـەکی وای لـەلا نییـە لـە ژیانی دا، لەبەرئەوەی تایبەت و پەیوەستن بە زاتی خوای پاك و بەرز. بەڵام مانای وانییـە کە بەخەیاڵیش هەر ناتوانرێت ئەندێشەی ئەو دوو سیفەتە بکرێت، چونکە عەقڵ پێداگیری دەکات لەسەر چەسپاندنی ئەم دوو سیفەتە، هەروەك لە بەڵگـەی عەقڵیـدا ئـەوەمان ڕوون کردۆتەوە.

دەکرێ شتێك هەبێت عەقڵ پەیی نەبردبێت بەوەی ئەو شتە شیاوی بوونە یاخود هەیە، لە هەمان کاتیشدا عەقڵ خۆی بێ توانا بێت لە وێنا و ئەندێشە کـردن و پـەیی بـردن بـە ناوەرۆکەکەی، لە کۆنەوە فەیلەسوفەکان و سەرجەم زانایان وتویانە: (عدم وجدان للشيء لا يستلزم عدم وجوده في الواقـع) واتە: پەیی نەبردن بەشتێك مانای وانییە شتەکە لە واقیعدا بوونی نییە[1].

### ٢- نەمری و هەرمان (البقاء):

واتاکەی: ئەوەیە کە خوای گەورە هەمیشەیی و نـەمرە و هـەر دەمێنێـت، بوونەکـەی کۆتایی نییە، ناکرێت نەبوون و لەناوچوونی بەسەردا بێت[2].

پێچەوانەی نەمری و هەرمان (البقاء): لەناوچوون و نەمانە.

---

[1] كبرى اليقينيات الكونية ١١٨-١١٩.

[2] المسامرة ٢٤. لە: شرح الجوهرة للباجوري ٨٨، هاتووە: نەبوون بریتییە لە ناوچوون و فەنا بوون.

**بەڵگەی عەقڵی لەسەر نەمری و هەرمان (البقاء)ی خوای بێ وێنە:**

١- ئەگەر خوای گەورە نەمر نەبوایە، ئەوا مردنی بەسەردا دەهات، و تووشی لەناوچوون دەبوو. ئەگەر تووشی لە ناوچوون بوبایە ئەوا پێویست دەبوو بەدیهێنراو بێت، و ئەگەر بەدیهێنراو بوایە ئەوا پێویستی بە بەدیهێنەر دەبوو، و بەدیهێنەرەکەش پێویستی بە بەدیهێنەرێکی تر دەبوو... بەم شێوەیە، ئەو کاتە خول (دور) و زنجیرەیی (تسلسل) دروست دەبێت و هەر دووکیشیان پوچەڵن، هەر بۆیە هەرمان و نەمری خوای گەورە سەلمێنرا.

٢- ئەگەر خوای گەورە مردن و لەناوچوونی بەسەردا هاتبووایە ئەوا بێ سەرەتا و لەمێژینە نەدەبوو، ئەمەش پوچەڵە بەهۆی سەلماندن و چەسپاندنی ئەوەی کە خوای گەورە بێ سەرەتایە و لەمێژینەیە، لەبەر ئەمە ناکرێت کۆتایی هەبێت و لەناوچوونی بەسەردا بێت[1].

لەقانی لە (الجوهرة)دا وتویەتی:

وكل ما جاز عليه العدم　　عليه قطعاً يستحيل القدم[2].

واتە: هەر شتێك لە ناوچوونی بەسەردا بێت، نابێت بێ سەرەتا و لەمێژینە بێت.

٣- ئەگەر دروست بوایە خوای گەورە نەبوبایە، ئەوا لە ناوچوونی دوای ئەوەی کە هەبووە پێویستی بە هۆیەك دەبوو، و ئەمەش شتێکی شیاوی بوون نییە، چونکە پەسەند کران بێ ئەوەی بەسەندکەرێکی هەبێت ئەستەمە[3].

---

(١) شرح الخريدة للدردير وحاشية الصاوي عليه ٥٦-٥٧ وشرح الجوهرة للباجوري ١٠٧. سەیری ئەمانەش بکە: شرح أم البراهين للسنوسي و حاشية الدسوقي عليه ١٥٧.

(٢) شرح الجوهرة للباجوري ٨٨ و ١٠٨.

(٣) بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە دەڵێم: ئەگەر تەرازوویێك وەك نمونە وەربگرین کە بەتاڵ بێت، هیچ شتێکی تێدا نەبێت و تایەکانی تەرازووەکە بە یەکسانی و لە یەك ئاستدا دەوەستن، جا لە ناکاو تایەکی تەرازووەکە گران بوو و داکەت (پەسەند کرا) تایەکەی تریش بەرز بووەوە، بێ ئەوەی یەکێك هەبێت ئەم کارەی کردبێت یاخود شتێکی خست بێتە سەر تەرازووەکە، ئەمە لە ڕووی عەقلییەوە شتێکی

٤- ئەگەر دروست بێت كە خوای گەورە لەناو بچێت، ئەوا یان ئەوەتا لەناو دەچێت:

أ- بەخودی خۆی (بەوەی لەناوچوونی خۆی بە توانا و هێزی خۆی بێـت) ئەمـەش شتێكی پوچەڵە، چونكە سەلمێنرا كە خـوای گـەورە هـۆی بـوونی بوونەوەرانـە، لەناوچوون قبوڵ ناكات بەهیچ شێوەیەك، بۆیە پێویستە نەمرو هەمیشەیی بێـت هەروەك چۆن لەمێژینە و بێ سەرەتا بووە.

ب- بەهۆی نەبووێكی پێچەوانە كە دژی بێت، ئەمەش هەر پوچەڵە، چونكە دژەكە یان:

- كۆنە (قدیم): ئەو كاتە پێویستە خوای گەورە بەتەواوی لەگـەڵ ئـەو نەبوونـە لەناو بچێت هەر لەسەرەتاو لە بنەڕەتدا، چونكە دوو شتی پێچەوانەو دژیەك هەرگیز كۆنابنەوە كەچی ئەم یاسایە وەردەگێڕدراوە، بێگومان بوونی خـوای گەورەش سەلمێنرا.
- لێكەوتە و بەدیهاتوو (حادث)ە: ئەو كاتە پێویسـتە شـتە بەدیهاتووەكـە لـە دژەكەی كە كۆن و مێژینەیـە هەڵبچـێت، چـونكە شـتی كـۆن و لەمێژینـە بەهێزترە لە شتی بەدیهاتوو[1].

بەڵگەی نەقڵی لەسەر نەمری و هەرمان (**البقاء**)ی خوای بێ وێنە:

- خوای گەورەیە دەفەرمووێت: ﴿ وَٱلْآخِرُ ﴾ لە ئایەتی: ﴿هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْآخِرُ﴾ الحدید: ٣.

واتە: (ئـەو خوایـە یەكەمینـە و لەسـەرەتاوە هـەر هـەبووەو كـەس پـێش ئـەو نـەبووە، دواهەمینە و كۆتایە، كەس دوای ئەو نامێنێت "بەڵام ئەو هەر دەمێنێت").

---

پوچەڵە و نابێت بە بێ بوونی هیچ هۆكارو گرانایەتیەك ئەم تایەی تەرازووە دابكەوێت و ئەوەی تریش بەرز ببێتەوە. (وەرگێڕ).

[1] المسایرة وشرحە المسامرة ٢٤-٢٥ سەیری ئەمانەش بكە: الإقتصاد في الإعتقاد للغزالي ٣١ وشرح المواقف للسید الشریف ١٤/٨.

- خوای بێ وێنــه دەفــەرمووێت: ﴿ كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ ﴾ القصص: ٨٨. واتــه: (هەرچی شت هەیە تیاچووەو لەناوچووە جگە لەو زاتە).

- هەروەها دەفــەرمووێت: ﴿ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾ ﴾ الرحمن: ٢٦ - ٢٧. واتە: (هەموو ئــەو کەســانەی لەســەر ڕووی زەویــن، هــەر هــەمووی فەوتاوو تیاچووەو دەبێت بمرن. تەنها زاتی پەروەردگاری خاوەن بڵنــدی ڕێــزداری تۆیــە کــە دەمێنێتەوە).

## ٣- پێچەوانەی پەیدابوان (مخالفة الحوادث)

واتاکەی: ئەوەیە کە خوای گەورە بەهیچ یەکێك لە شتە بەدیهێنراوەکان ناچێت چ لــە بووندابن یان بەڕەهایی نەبووبن. جا مەبەست لێی: خوای گەورە نە تەن و جەستە (جِرْم) و نە ڕووکەش (عرض) و نە گشتی (الكلية) و نە بەشی (جزئية)، بەڵکو پێویستییەکانی ئەم ناوبراوانەش ناکرێت بۆ خوای گەورە بڕیار بدرێن[1].

تەن و جەستە (جِرْم) تایبەتمەندییەکەی ئەوەیە شوێنگرە (تحیّز)، و ڕووکــەش (عــرض) تایبەتمەندییەکەی ئەوەیە کە پشت بە جگەلــەخۆی دەبەســتێت، پێویســتی و تایبەتمەنــدی گشتی (الكليــة) بریتییە لە گەورەیی و تایبەتمەندی و پێویستی بەشــیی (جزئيــة) بریتییــە لە: بچوکی[2].

دژەکەی سیفەتی پێچەوانەی پەیدابوان: بریتییە لە هاوێنە و هاوشێوەبوونی پەیدابوان.

**بەڵگەی عەقڵی:**

١- ئەگەر خوای گەورە پێچەوانەی پەیدابوو و بــەدیهێنراوان نەبوایــە ئــەوا هاوێنــە و چوونیەك دەبوو لەگەڵیاندا، و ئەگەر هاوێنەو چوونیەك بوایە ئەوا ئەوکات دەچــووە خانەی پەیدابوانەوە، و ئەگــەر پەیــدابوو و بــەدیهێنراو بوایــە ئــەوا پێویســتی بــە پەیداکەر و بەدیهێنــەرێك دەبــوو، و بەدیهێنەرەکەیشــی پێویســتی بــە بەدیهێنــەر

---

[1] واتە: خوای گەورە هیچ شتێك نییە لەمانەی باسمان کرد.

[2] شرح الجوهرة للباجوری ١١٠. و شرح الخريدة للدردير ٥٨.

دەبوو... بەم شێوەیە، ئـەو کاتـەش خـول (دور) و زنجیرەیـی (تسلسـل) پێویسـت دەبوو، و هەر دووکیشیان بێ گومان پوچەڵن، بەم پێیە سەلمێنرا و چەسپا کە خوای گەورە پێچەوانەی پەیدابوانە.

٢- هەر شتێ لەمێژینە و بێ سەرەتا بوو ئەوا تیاچوون و لە ناوچوونی بۆ نییـە، هـیچ شتێکی پەیدابووش نیە تیانەچێت، چـونکە شـتێك لـەم پەیابوانـە بـێ سـەرەتا و لەمێژینە نین بۆیە پێویستە خوای گەورە پێچەوانەی پەیدابوان بێت[١].

بەڵگەی نەقلی:

ئەو فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ﴾ الشـوری: ١١.[٢] واتـە: (هـیچ شتێك نییە لە وێنەی ئەو زاتە "کە خوای بێ وێنەیە").

---

[١] شرح الجوهرة للباجوري. سەیری ئەمەش بکە: شرح أم البراهين للسنوسي وحاشية الدسوقي عليه ١٥٨.

[٢] سەبارەت بەم فەرمایشتەی خودا: ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ﴾ الشوری: ١١. پرسیارێکی بەناوبانگ هەیە، ئەویش ئەوەیە بەیەکەوە کۆکردنەوەی (ك و مثل) مانای ئەستەم بوون بۆ خوای گەورە بە خەیاڵدا دێنێت. چونکە (کاف) هەر بەمانای هاوشێوە دێت، کەچی ئەم هاوشێوە لابراوەو نەفی بەسەردا زاڵ کراوە، ئەمەش لە دوو ڕووەوە پوچەڵە:

یەکەم: مەبەستی ئایەتەکە لادان و نەفی کردنی هاووێنەی زاتی خوایە، نەوەك هاووێنەی هاووێنەی خوا.

دووەم: ڕەتکردنەوەی بوونی هاوشێوەو هاووێنە، وادەخوازێت کە خوای گەورە وێنەو شێوەی هەیە، ئەمەش شتێکی ئەستەمە.

بە شەش بڕگە، وەڵامی ئەم پرسیارە دەدەمەوە:

١- (کاف)ەکە زیادەیە و بۆ جەختکردنەوە نییە.

٢- (کاف)ەکە بۆ جەختکردنەوەیە لەسەر نەبوونی هیچ هاوشێوەیەك بۆ خوا، واتە هەرگیز هاووێنەی نییە، نەك خوا هاووێنەی نییە دواتر وا ئەندێشە بکرێت کە وێنەی هەر دەمێنێت بە نەمانی هاووێنەی.

٣- (مِثل) بە واتای (مَثَل: بە هەبوونی دوو لەسەر "فتحة") واتە هاوێنەی نییە لە سیفەتەکانیدا.

نەچواندنی خوای گەورە بە پەیدابوان، ئەم مەبەستە دەگەیەنێت[1]:

١- خوای گەورە ڕووکەش (عرض) نییە، چونکە:

أ- ڕووکەش پێویستی بە جەستە هەیە تا بەهۆیەوە دەربکەوێت و بێتە کایە، بۆیە هەرگیز پێش بوونی جەستە ناکرێت ڕووکەش هەبێت، ئەمەش سەلمێنرا کە خوای گەورە پێش هەموو شتێکە[2].

ب- لەبەر ئەوەی هەر شتێك پێویستی بە شتێکی تر هەبێت تا پێی ڕاوەستێت، ئەوە بەڵگەی پەیدابوونی شتەکەیە، ئەمە پێشتر لە کاتی خستنەڕووی بەڵگەکانی پەیدابوونی ڕووکەشەکان خرایەڕوو.

٢- خوای گەورە بەهەمان شێوە کرۆك (جوهر)یش نییە:

---

٤- بەمانای خود دێت، وەك: ﴿ فَإِنْ ءَامَنُواْ بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ ﴾ البقرة: ١٣٧. واتە: (جا ئەگەر ئەوان "جولەکە و گاورەکان" باوەڕیان هێنا، وەك ئەوەی ئێوە باوەڕتان پێ هێناوە).

٥- ئەمە دەچێتە چوارچێوەی (کنایە: باس کردنی شت بە پێچ و پەنا)، لەم ڕووەشەوە دوو ڕێگە هەن، ڕێگەی دووەم وەڵامی شەشەمە.

ڕێگەی یەکەم: ڕەتکردنەوەی هاوێنەی هاوێنە، مەبەست پێی ڕەتکردنەوەی هاوێنەیە، چونکە هاوێنەی هاوێنە پەیوەستە بە هاوێنەوە، ڕەتکردنەوەی پێویست و پابەندی (لازم) بەڵگەیە لەسەر ڕەتکردنەوەی پابەندکراو (ملزوم).

دووەم: ئەمە وەك ئەوەیە کە دوترێت: (مثلك لا يبخل: هاوێنەی تۆ ڕەزیل نییە)، واتە: چرووکی ناکەیت. جا مەبەست لەم فەرمایشتە ڕەت کردنەوەی بوونی هاوێنەیە بۆ خوای گەورە بە ڕەوانترین شێوە، ئەم شێوازەش جوانبێژترو ڕەوانبێژترە لە ڕاستەوخۆی دەربڕینی مەبەست، ئەمەش لەبەر ئەوەی چەسپاندنی شتەکەی بە بەڵگەوە لە خۆ گرتووە.

حاشية الصاوي على الدردير٦٠ وشرح الجوهرة للصاوي ١٦٤ عن تقرير النفراوي على المصنف. سەیری: شرح االجوهرة للباجوري ١٦٢-١٦٤. بکە.

[1] سەیری ئەم شتانە بکە لە: المسايرة وشرحه المسامرة وشرحه لقاسم بن قطلوبغا ٢٥-٣٧ وشرح الخريدة للدردير والصاوي عليه ٥٨ و ٦٧ والمواقف وشرحه للسيد الشريف ١٩/٩ ولاپەڕەکانی دواتر، وشرح المقاصد للتفتازاني ٤٣/٤ و لاپەڕەکانی دواتر، وأصول الدين للغزنوي ٦٧ وعقائد الإمامية ٣٦.

[2] المسايرة وشرحه المسامرة ٢٩.

أ- لەبەر ئەوەی ئەندێشەی پێکهاتن لە چەند بەشێك و مانای شوێن داگیر کردن دەبەخشێت.

ب- چونکە کرۆك (جوهر) پەیوەستە بە ڕووەکەشەوە، ڕووکەشیش پەیدابووە، کەواتە کرۆك (جوهر)یش پێویستە پەیدابوو بێت[1]. پێشتر ئەمە خرایەڕوو.

٣- خوای گەورە جەستە نییە[2]: لەبەر ئەوەی جەستە پێکهاتووە لە کرۆکەکان (جواهر) و ڕووکەشەکان (أعراض)، و پێشتر سەلماندمان کە هەر دوو ناوبراو پەیدابوو و بەدیهێنراون. بەپێچەوانەی: (مجسمە)کان کە باوەڕیان وابوو خوای گەورە جەستەیەکی حەقیقیە، بەڵام ڕاجیا بوون: هەندێکیان وتیان: لە گۆشت و خوێن پێکهاتووەو هەندێکی تریان وتیان: نورو ڕووناکیەکی درەوشاوەیە وەك داڕێژراوێکی سپی (السبیکة البیضاء) و هەندێکی تریان وتیان: لەسەر وێنەی گەنجێکی بێ مووە، و هەندێکی تر وتیان: لەسەر وێنەی بەساڵاچوو و پیرەمێردێکی ڕیش و قژ سپییە... پاك و بەرزی بۆ خوا لەو قسە پوچانەی لەبارەیەوە دەیلێن[3].

---

[1] المسایرة وشرحه المسامرة وشرحه لقاسم بن قطلوبغا ٢٥.

[2] المسایرة وشرحه المسامرة ٢٧ والمواقف وشرحه للسید الشریف ٢٥/٨. سەیری ئەو بەڵگانە بکە لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە جەستە نییە: المطالب العالیة للرازي ٢٥/٢.

- هەر شتێك کە هەیە، یا ئەوەتا شوێنگر (متحیز) یان شوێنگر (غیر متحزی) نییە.

ئەگەر شوێنگر بێت ئەوا دەبێتە دوو بەش: یەکەم: کرۆکی تاك (الجوهر الفرد): واتە ئەو بەشەی لەت و کەرت نابێت پێکهاتەی لێکدراو نییە. دووەم: جەستە، ئەو شتەیە کە لە چەند کرۆکی تاك پێکهاتووە.

ئەگەر شوێنگر نەبوو، ئەوا دەبێتە دوو بەش: ڕووکەش (العرض)، کە بوونی وەستاوەتە سەر جەستە. دووەم: خودای گەورە، کە بوونی نەوەستاوەتە سەر شوێن و پێویستی بە شوێن نیە./ شرح المسایرة لقاسم بن قطلوبغا ٣٠.

جەستە تایبەتترە لە کرۆك (الجوهر)،چونکە جەستە تایبەتە بە پێکهاتەی لێکدراوە بەڵام کرۆك هەم لە جەستە و هەمیش کرۆکی تاك (جوهر الفرد) پێکدێنێت./ حاشیة الصاوي علی الدردیر ٥٨ و سەیر ٢٠٩ ئەم کتێبە بکە.

[3] المواقف وشرحه للسید الشریف، سەرچاوەی پێشوو.

٤- خوای گەورە وێنە و ڕەنگ و بۆن و بارودۆخی دەروونی نییە، وەك: چێژو ئازار و شادی، چونکە ئەمانە تایبەتن بە جەستەوە.
بەپێچەوانەی مشبهەکان کە خوای گەورەیان بە بەدیهێنراوان چواندووە.
سەبارەت بەو دەقانەش لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی بەپێزدا هاتوون باس لە: ڕەزامەندی، تووڕەیی، دڵخۆشی و هاووێنەکانی دەکەن، پێویستە خوای گەورە بە پاك بگیرێت لەو شتانە بەو شێوەیەی دەیخەینەڕوو لەکاتی دوان لەسەر ئەو دەقانەی لە ڕووکەشدا وێچواندیان لێدەخوازرێت[١].
٥- خوای گەورە بە بچوکی یان گەورەیی وەسف ناکرێت (مەبەست لە گەورەیی، گەورەیی بەرهەست نەك گەورەیی واتایی و مەعنەوی)، هەروەك ئەو فەرمایشتەی خوای پاك و بەرز: ﴿ وَهُوَ ٱلْعَلِیُّ ٱلْكَبِیرُ ﴾ سبأ:٢٣.[٢] واتە: (هەر خوا بەرزو بڵندو گەورەیە).
٦- شوێنی نەگرتووە، چونکە ئەگەر خوای گەورە لەناو شوێندابوایە ئەو کاتە دەبوایە شوێنیش بێ سەرەتا و لەمێژینە بوایە. پێتریش ئەوە خرایەڕوو هیچ لەمێژینە و بێ سەرەتایەك نییە جگە لە خوای گەورە[٣].
ئەوەی لە فەرموودە قودسیەکەدا هاتووە: (**ما وسعني أرضي و لا سمائي، و انما وسعني قلب عبدي المؤمن**)[٤] واتە: زەوی و ئاسمان منیان لە خۆ نەگرت بەڵکو دڵی بەندەم منی لەخۆ گرت. مەبەستی ئەوەیە کە دڵی بەندەی من هەیبەت و ڕێزو شکۆ و ڕەحمەت و بەزیی منی لە خۆ گرت.
٧- خوای گەورە ناکەوێتە تەنیشت و لا (جهة)تێك، لەبەر ئەوەی:
أ- ئەگەر خوای مەزن لە تەنیشت و لایەك بوایە، ئەوا پێویست دەبوو ئەو تەنیشت و لایە لەمێژینەو بێ سەرەتا بوایە، پێشتریش ئەوەمان سەلماند کە جگە لە خوای

---

(١) المسايرة وشرحه المسامرة ٢٩.
(٢) حاشية الصاوي على الدردير ٥٨.
(٣) المواقف ٨/٢٠. و بڕوانە: سیفەتی بەخۆوە ڕاوەستان (القيام بالنفس).
(٤) حاشية الصاوي على الدردير ٥٨.

گەورە هیچ شتێك لەمێژینە و بێ سەرەتا نییە[1]. ناکرێت بوترێت: خوای گەورە لە سەر یان لە ژێر، لە لای ڕاست یان چەپ، پشت یان پێشی تەنەوەیە[2].

ب- لەبەر ئەوەی هەر شەش تەنیشت و لا، پەیدابوو و بەدیهێنراون، بە هاتنــە کایــەی مرۆڤــ و جگەلەویش کە لەسەر دوو پــێ دەڕۆن وەك: باڵنــدە، جـا واتــای ســەروو (فوق): بریتیە لە بەرامبەر بوونی لەگەڵ سەری مرۆڤــ واتــە لەســەری مرۆڤـــەوە بەرەو ژوور یان سنوری ئاسمان دەست پێدەکات لە ئاست خاڵی هەرە بــەرزی پشــتی ئەو گیانلەبەرەی کە لەسەر چوار پەل دەڕووات، ئا بەمە دەڵێن لای ســەروو، واتــای لای خواروو (السـفل): بریتییــە لــەو ئاســتەی کــە لــەلای زەوی یەکســانە لەگــەڵ پێیەکانی مرۆڤــ.

پاشان تەنیشت و لایەکان بەشێوەیەکی ڕێژەیی دیاری کراون و ڕاستەقینە نــین، جـا ئەگەر مێروو بە ڕووی ژوورەوەی بانێکدا بڕوات ئەوا ڕووی زەوی بۆ ئەو دەبێتە لای سەروو، چونکە بەرامبەر پشتیەتی. ئەگەر هەر شــتێکی پەیــدابوو بازنــەیی بوایــە وەك تۆپ ئەوا هیچ یەکێك لــەو تەنیشت و لایانە بوونیان نەدەبوو.

پ- خوای گەورە بێ سەرەتا هەر هەبووەو هیچ یــەکێك لــە بوونــەوەرانیش نــەبوون، چونکە جگەلــە خــوای گــەورە هــەموو شــتێك پەیــدابووە، هــەروەك بەڵگــەمان لەمبارەیەوە خستەڕوو[3].

ت- تەنیشت و لا تایبەتمەندی ئەو شتانەیە کە شوێنگرن، شوێنگرتنیش تایبەتــە بــە کرۆك (جوهر) و جەستەوە پێشتر ئەوەمان خستەڕوو کە خوای گەورە لــەم شــتانە پاکە.

---

[1] شرح المواقف للسيد الشريف ١٩/٨-٢٠.

[2] شرح الخريدة للدردير ٦٧.

[3] المسايرة وشرحه المسامرة ٣٠-٣١. سەیر بابەتی خوای گەورە لە هیچ شوێن و لایەك نییە بکە لە: المطالب العالية للرازي ٣٧/٢ والمحصل للرازي ١٥٧ وكشف المراد ٣١٩.

**ئەگەر وترا:** بۆچی دەستەکان بەرەو ئاسمان بەرز دەکرێنەوە؟ وەڵامی ئەدەمەوە: بەوەی کە ئاسمان ڕووگەی نزاو پاڕانەوەیە، هەروەك چۆن کەعبە ڕووگەی نوێژە[1].

جا خوای گەورە لە تەنیشت و لایەك نییە، بە پێچەوانەی بۆچوونی:

کرامیەکان: لای سەروویان بۆ خوای گەورە بڕیارداوە، بەبێ ئەوەی لەسەر عەرش جێگیر بووبێت.

ومشەبیهە) و موجەسیمەکان: بۆچوونیان وایە کە خوای گەورە جێگیر بووە لەسەر عەرش[2].

بە یەکدەنگی عەقڵمەندان ئەمە پوچەڵ و بێ بنەمایە[3].

---

[1] المسايرة ٣١. لە: (أصول الدين للغزنوي ٧١) هاتووە: (دەستەکان بۆیە بەڕووی ئاسماندا بەرز دەکرێنەوە، چونکە ڕووگەی نزاو پاڕانەوەیە، وەك ڕووکردنە کەعبە لە نوێژدا، دانانی ڕوو لەسەر زەوی لە کاتی کوڕنووشدا، ئەگەرچی خوای گەورە نە لە ناو کەعبەیەو نە لە ژێر زەویشە).

[2] سەرباری ئەوەی کە دەڵێن خوای گەورە جەستەی نییە، ئەوا زۆرێك لە حەنبەلیەکان باوەڕیان بەوەیە کە خوای گەورە لەلای سەرەوەیە و لەسەر عەرش وەستاوە. سەیری بەڵگە و وتەی زاناکانیان بکە لەم بارەوە لە: شرح العقيدة الطحاوية ٣/٢٥١ و لاپەڕەکانی دواتریش. و لوامع الأنوار البهية - سفاريني، جدة ساڵی ١٣٨٠ك، ١/١٩٠ و لاپەڕەکانی دواتری.

[3] المسايرة وشرحه المسامرة لقاسم بن قطلوبغا ٣٢-٣٣.

- سەرباری ئەوەی حەنبەلییەکان بە بۆچوونی خۆیان خوای گەورە بە پاك دەگرن لە جەستە، کەچی دەڵێن خوای گەورە لەلای سەرووەو لەسەر عەرش جێگیر بووە، ئەوەشیان باس کردووە کە نزیکەی بیست جۆر دەق هاتووە لەبارەی بەرزو بڵندی خوا لەسەر بەدیهێنراوەکانی و بەندەکانی، وەك:

أ- ڕاستەوخۆ ئاماژەدان بە لای سەروو بەهۆی ئامرازی (من) کە تایبەتە بۆ بڵندی خود، وەك ئەم فەرمایشتەی خوا: ﴿ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ ﴾ النحل: ٥٠. واتە: (ئەو فریشتانە لە پەروەردگاریان دەترسن کە فەرمانڕەوایە بەسەریانەوە).

ب-ڕاستەوخۆ دەربڕینی بەرز بوونەوە بۆ لای خوا، وەك: ﴿ تَعْرُجُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ ﴾ المعارج: ٤. واتە: (فریشتەکان و جوبریل بەرز دەبنەوە بۆ لای پەروەردگار).

پ-ڕاستەوخۆ ئاماژەدان بە بڵند بوون بۆ لای پەروەردگار، وەك: ﴿ إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ ﴾ فاطر: ١٠. واتە: (گوفتاری چاك و جوان و بەجێ بۆ لای ئەو زاتە بەرز دەبێتەوە).

٨- خوای گەورە ناچێتە ناو چوارچێوەی کات، و کاتی بەسەردا نایەت، واتە: بـوونی ئـەو بوونێکی کاتی نییە. بوونی کاتی: ئەوەیە بوونی تەنها لە ناو کاتدا ببێت و بەس[1].

٩- خوای مەزن وەسف ناکرێت بـە بـزوان و جوڵـان و جێگـۆڕین یـان وەسـتان و جـێگیر بوون[2].

١٠- خوای گەورە پاکە لە بوونی پەیوەندی نێوان خودی زاتی خوای گەورە: چونکە خـوای گەورە پێکهاتەیەکی بەش بەش نییە تا بەشەکانی پەیوەندی بەیەکترەوە بکەن و بلکێن بەیەکترەوە. یاخود زاتی خوای گەورە پەیوەندی بکات بە شتێکی تر: زاتی پاکی خوای گەورە نەلکاوە بە جیهانەوە، بەوەی زاتی خوای گەورە ئاوێتە ببێت لەگەڵ جیهـان یـان بێت و بچێت تیایدا[3].

سەبارەت بەو دەقانەش کە لە ڕووکەشدا مانای لکان و ئاوێتـە بـوون دەگەیـەنن، وەك لەم فەرموودە قودسیەدا هاتووە: : (**وما يزال عبدي يتقرب الي بالنوافل حتـى أحبـه، فاذا أحببته كنتُ سمعَه الذي يسمع به، و بصرَهُ الذي يُبْصِر به، و يده التي يـبطش بهـا و رِجله التي يمشي بها. و ان سألني أعطيته، وان استعاذ بي لَأُعِيذَنَّه**)[4] واتە: بەندەی من

ت- ڕاستەوخۆدەربڕینی ئەوەی ، وەك: ﴿ قُلْ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ ﴾ النحل: ١٠٢. واتە: (ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵێ: ڕۆحی پیرۆز "جوبریل، ئەم قورئانەی" لەلایەن پەروەردگارتەوە بەحەق و ڕاستی دابەزاندووە).

ج- بەڕاستەوخۆ دەبڕینی ئەوەی خوای گەورە هەموو شەوێك دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا... تاد.. بڕوانە ئەمانە: شرح العقيدة الطحاوية ٣٧٥ ولاپەڕەکانی دواتر، ولوامع الأنوار البهية ١/١٩٠ و لاپەڕەکانی دواتر.

[1] المواقف وشرحه للسيد الشريف ٨/٢٧.

[2] شرح الخريدة للدردير ٥٨.

[3] شرح الخريدة للدردير وحاشية الصاوي عليه ٥٨ و ٦٧.

[4] حاشية الصاوي على الدردير ٥٨.

فەرموودەی: بەردەوام بەندەی من.... تاد، بخاری فی: کتاب: الرقائق باب التواضع، فتح الباري ١١/٣٤٠ عن أبي هريرة (رضي الله عنه).

بەردەوام بەهۆی ئەنجامدانی سوننەتەکانەوە لێم نزیك دەکەوێتەوە تاکو خۆشمدەوێت، جا ئەگەر خۆشم ویست، دەبمە ئەو گوێیەی کە پێی دەبیستێ و ئەوو چاوەی کە پێی دەبینێ و ئەو دەستەی کە شتی پێ دەگرێت و ئەو لاقەی کە پێی دەڕوات و هاتوچۆی پێ دەکات. مەبەستی ئەوەیە: کە خۆشەویستی خوا هەموو کەسەکە دادەگرێت و ئاوێتە دەبێت لەگەڵ خۆشەویستی بەندە، ئاگای لە دەوروبەری نامێنێت و تەنها بۆ خوا دەڕوانێت.

ئەم فەرمایشتە دەبێت تەئویل بکرێت، بەوە لێك بدرێتەوە کە ڕووکەشی فەرموودەکە مەبەست نەبێت بەکو مەبەستی دەقەکە زاڵ بوونی خۆشەویستی خوایە بەسەر کەسەکە، تا ئەو کەسە وای لێهاتووە جگە لە خوای گەورە شتی تر نابینێت.

١١- خوای گەورە پاك و دوورە لە لێك ترازان و جیابوونەوە لە جیهان، چونکە پێکەوەلکان و جیابوونەوەو... هتد، سیفەت و تایبەتمەندی پەیدابوو و بەدیهێنراوەکانە و خوای گەورە پەیدابوو نییە[١].

١٢- خوای گەورە پاکە لە یەك گرتن و ئاوێتەبوون لەگەڵ کەسێکی تر، بەپێچەوانەی: بۆچوونی نەصرانیەکان، کە باوەڕیان وایە زاتی خوا یەکی گرتووە لەگەڵ جەستەی مەسیح[٢]. و بە پێچەوانەی زیادەڕۆچووە شیعەکان: بۆچوونیان وایە زاتی خوای گەورە ئاوێتە بووە لەگەڵ عەلی و کوڕو نەوەکانی. هەروەها بە پێچەوانەی زیادەڕۆچووە صۆفیەکان: کە باوەڕیان وایە زاتی خوای گەورە ئاوێتە و تێکەڵ بووە لەگەڵ ئەوانەی لە ڕێگای بەرەو خواچووندا گەیشتوونەتە کۆتایی و ئاکام[٣].

---

[١] شرح الخريدة للدردير وحاشية الصاوي عليه ٦٧.

[٢] وەك ئەمانەتی زانستی، ئەوا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بەوە بدەم کە دەقە عەرەبیەکە بەم شێوەیەیە: (النصارى القائلين باتحاد جسده بجسد المسيح) ئەم دەقە عەرەبیە وا ئەگەیەنێت کە خوای گەورە جەستەی هەیە (پەنا بەخوا)، بەڵام من وشەی (جسده) بە زاتی خوام لێك دایەوە، چونکە کرۆکی باسەکە خۆی لەخۆیدا پاکڕاگرتن و بەدوورگرتنی خوایە لەوەی کە جەستەی هەبێت. (نووسەر) وشەی جەستەی لێردا بەکارهێناوە گوزارشتە لە بیروباوەڕی نەصرانیەکان. (وەرگێڕ).

[٣] المواقف وشرحه للسيد الشريف ٨/٢٨-٣١ سەیری ئەمەش بکە: شرح الخريدة للدردير ٥٨.

باوەڕ بوون بەوەی خوای گەورە وێنە و هاوشێوەی بۆ نییە، بۆچوونی سەرجەم پێڕو تاقمە ئیسلامیەکانە: لە موعتەزیلەکان، ماتریدیەکان، ئەشعەرییەکان و شیعەکان، بێجگە لە (موشەبیهە و موجەسیمە) و هاوشێوەکانیان.

## ئەو دەقانەی کە لە ڕووکەشدا ئاماژەی وێچواندن (تشبیه)یان تێدایە

چەند دەقێك لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی بەڕێزدا هاتوون، کە چەند سیفەتێکی خبری[1] دەدەنە پاڵ پەروەردگار، ئەو سیفاتانە ئاماژەی وێچواندنیان تێدایە وەك وەستان و جێگیر بوون (استواء) و هاتن (مجيء) و دابەزین (نزول)... پاش کەمێکی تر دەخرێنەڕوو.

سەرباری کۆك بوون و یەکدەنگیان لەسەر ئەوەی خوای گەورە بە پاك و بەرز و دوور بگرن لەو شتانەی شایەنی زاتی پیرۆزی ئەو نین، ئەوا لەگەڵ ئەوەشدا لە بارەی ئەم دەقانەوە موسڵمانان دابەش بوون بۆ سێ ڕاو بۆچوون[2]، کە ئەمانەن:

---

[1] سیفەتە خەبەریەکان: لە سۆنگەی ئەوەوە کە سیفەتەکانی دیکەی خوای بێ وێنە عەقڵ دەزانێ کە دەبێ پەروەردگار ئەو سیفەتانەی هەبن و تارادەدەیەك عەقڵ پێیان ئاشنایە و لەگەڵ چەمك و واتاکانی دەگونجێ، بەڵام سیفەتە خەبەریەکان، مەرج نییە عەقڵ بە پێویستی بزانێ کە خوای کاربەجێ ئەو سیفەتانەی هەبێت، واتە: نە لە عەقڵدا جێگایان دەبێتەوە کە بزانێ چۆنن، نە عەقڵ پێویستیشیان دەکات، ئەگەر گریمان خوای گەورە بۆ خۆی نەیفەرمووبایە من ئەو سیفەتانەم هەیە، عەقڵ نەیدەزانی کە هەیەتی! کەواتە: بۆیە پێیان دەگوترێ سیفەتە خەبەریەکان، چونکە ئەو سیفەتانە لە ڕێگەی خەبەرو هەواڵی پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) بە ئێمە گەیشتوون و ئێمە دەزانین کە خوا ئەو کۆمەڵە سیفەتەشی هەیە، ئەگەرنا عەقڵ ئەو سیفەتانە پێویست ناکات). ئەم پێناسەیەم لە کتێبی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا: م. علی باپیر ٢١٧/٣ و ٢١٨) وەرگرتووە. (وەرگێڕ).

[2] ئیبن جەوزی لە (دفع شبه التشبیه ٧٩) وتویەتی: (بزانە خەڵکی لە ئاست سیفەتە خەبەرییەکان سێ جۆرن: یەکەم: دەڵێن ئەم سیفەتانە چۆن هاتوون ئاوا بەڕێیان دەکەین بەبێ تەئویل مەگەر زۆر پێویست بکات، هەروەك ناچارین ئەم فەرمایشتەی خوا تەئویل بکەین: ﴿ وَجَآءَ رَبُّكَ ﴾ الفجر: ٢٢. واتە: فەرمانی خوا. ئەمە مەزهەب و ڕێبازی پێشینانە. جۆری دووەم: دەڵێن دەبێت تەئویل بکرێن، ئەمەش کارێکی مەترسیدارە. جۆری سێیەم: دەڵێین بەپێی هەستەکان قسەی لەسەر بکرێت..).

## یەکەم: ڕاوەستان و خۆتیّ هەڵ نەقورتاندن (التوقف):

واتە: ڕاوەستانی تەواو و بیّ پەنابردنە بەر تەئویل کردن یان کەوتنە ناو وێچواندن (تشبیە)، ئەمە مەزهەبی پێشینانە[1]، ئەوانە باوەڕیان بەو سیفاتە خەبەریانە هەبووە، و وەك خۆی چۆنە بەڕێیان کردووەو تێیان پەڕاندووە، خۆیان تیّ هەڵ نەقورتاندووە بۆ زانینی ماناکەی یان تەئویل کردنی، لەگەڵ ئەوەی ئەو دەقانەی کە پاك و بەرزی دەسەلمێنن و دەچەسپێنن زۆر زیاتر و زاڵتر بوونە لەلای ئەوان، بەهۆی ڕوونی نیشانە و ئاماژەو زۆری و بۆریان، و شارەزا بوونیان لەوەی کە وێچواندنی خوای گەورە بە پەیدابوان شتێکی شیاوی بوون نیە و نادروستە. بۆیە زۆرێك لە پێشینان وتویانە: (چۆن هاتووە ئاوا بیخوێننەوە) واتە: باوەڕتان وابێت کە لەلایەن خوای گەورە دابەزێنراوە، و خۆتان هەڵ نەقورتێنن لە تەئویل و تەفسیر و شرۆڤەکەیدا[2].

لەبەر ئەوەی تەئویل کردن شتێکی گوماناوییە، قسەکردن لەسەر بنچینە لەبارەی سیفەتەکانی خوا دروست نییە، ئەمەش لە پێناو خۆ دوور گرتن لە لادان و لەڕیّ دەرچوون، بۆیە واتاکانی ئەم سیفەتانە بەخوای گەورە بسپێرین.

ئیمامی (مالکی کوڕی ئەنەس) وشەی (إستواء)ی لەم فەرمایشتە: ﴿ ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ ﴾ طه: ٥. بەم شێوەیە ڕاڤەی کردووەو وتویەتی: (الاستواء معلوم، وکیفیته مجهول، و السؤال عنها بدعة، والإيمان به واجب)[3] واتە: (استواء) زانراوە، چۆنیەتیەکەی نەزانراو و شاراوەیە، پرسیار کردن لەم بارەوە بیدعەیە، باوەڕ پێبوونی پێویستە.

لە زۆرێك لە گەورە شێخەکانی ماتریدییەکانەوە هاتووە کە خۆ سەرقاڵ کردن بە

---

[1] دراسات في الفرق ٢١١ نقلا عن إبن جوزي.

[2] مقدمة ابن خلدون ٤٣٤. سەیری ئەمانەش بکە: الملل والنحل للشهرستاني ٩٢/١ والغنية للشيخ عبدالقادر ٦٣/١ ودراسات في الفرق ٢٠٥.

[3] أصول الدين للبغدادي ١١٣. ئەم وتەیەی ئیمامی مالك چەند دەربڕینێکی لێك نزیکی هەیە، هەندێك لەو دەربڕینانە لەم سەرچاوانەدان: شرح أصول الإعتقاد أهل السنة والجماعة ٤٢/٣. والإتقان للسيوطي ٤٨٤ وشرح الجوهرة للباجوري ١٥٧ ودراسات في الفرق ٢٠٦. لة: المواقف ٢٤/٨ ئەم وتەیە لە ئەحمەدیش گێڕدراوەتەوە.

تەئویلکارییەوە بە ناپەسەند دەزانن، هەروەك وتویانە: بڕوامان وایە لەلایەن خواوە دابەزیون و خۆمان بە تەئویل کردنیانەوە سەرقاڵ ناکەین[1].

ئیبن ڕوشد لەمبارەیەوە دەڵێت: (سەرەتای چەرخی یەکەم گەیشتە گەورەیی و چاکەی تەواو، بەهۆی بەکارهێنانی ئەم وتانە - مەبەستی وتەی هاوشێوەی وتەکەی ئیمامی مالیکە [2]- بەبێ ئەوەی پەنابەرن بۆ تەئویل کردن). ئەم ڕاو بۆچوونە بەردەوام بوو تا ڕۆژانی (ئەحمدی کوڕی حەنبەل) و (یەحیای کوڕی موعین) و (ئیسحاقی کوڕی ڕاهویە)، ناوبراوان پشتی ئەم بۆچوونەیان گرت، بەڵام ئەمە زۆری نەخایاند، چونکە ئەم بۆچوونە ئەوەی لەخۆ دەگرێت کە: (ئاراستەکردن بۆ شتی نەناسراو کە هیچ مەبەست و ئامانجێکی دیاری نییە و لێی تێ ناگەین) تەنانەت (ئیبن حەزم) ئەم بۆچوونەی وەسف کردووە بەوەی (دەروازەیەکە کۆتایەکەی بە وێچواندن (تشبیه) دوایی دێت)[3].

### دووەم: کەوتنە ناو وێچواندن و قوڵبوونەوە تیایدا:

### موشەبیهەکان خاوەنی ئەم بۆچوونەن.

کەسانێ زاتی خوای گەورەیان بەشتی تر چواند بەهۆی باوەڕ بوونیان بەوەی گوایە خوای گەورە دەست (ید) و پێ (قدم) و ڕووی (وجه) و.... هەیە، بەمەش کەوتنە ناو بازنەی جەستە بڕیاردانی ڕاشکاوانە بۆ خوای گەورە، پێچەوانەی ئەو ئایەتانەیە کە بە ڕەهایی خوای گەورەیان پاکگرتووە لەو شتە ناشیاوانە.

هەشیان بووە لە بابەتی سیفاتدا کەوتۆتە ناو وێچواندنەوە وەك: چەسپاندنی لا و تەنیشت (جهة) و ڕاوەستان (استواء) و دابەزین (نزول) و دەنگ و پیت و هاوشێوەکانیان بۆ خوای گەورە، جا ئەو بۆچوونەیان سەری کێشا بۆ بڕیاردانی جەستە بۆ خوای گەورە،

---

[1] التوحيد للامشي ٥٨.

[2] وەرگێڕ.

[3] دراسات في الفرق ٢٠٧ و وتەکەی: إبن رشد، لە: فصل المقال ٦٥ هاتووە.

ئەمەش بەهۆی تووند دەست گرتنیان بە تەفسیرو شرۆڤەی پیت (حرف)ی بۆ ئەو ئایەت و فەرموودانەی کە لە ڕووکەشدا وێچواندن و جەستە ئەگەیەنن[1].

ئیبن جەوزی حەنبەلی (یەکێکە لەوانەی وێچواندن ڕەتدەکاتەوە) دەڵێت: (بزانە کە بەگشتی فەرموودەناسان "محدثين" ئەوەی تایبەتە بە سیفاتەکانی خوای گەورەوە بەشێوەی هەستی وەریان گرتووە، بۆیە کەوتوونەتە ناو وێچواندنەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەبوو کە تێکەڵی شەرعزانان نەبوو بوون، تا بزانن ئەو ئایەتانەی فەرواتا "متشابە"ن بەپێی حوکمی خۆی هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکرێت نەك بە ڕووکەش) [2].

ئەوانە چەند تاقم و پێڕێکن، بۆ نمونە: فەر موودەناسان و حەشەوییەکان و لەناو ئەواندا: موقاتیلی کوڕی سلیمان ساڵی ١٥٠ك ڕاڤەکری قوئان و موشەبیهەکانی شیعە، وەك: (هیشامی کوڕی حەکەم) کە لە ساڵی ١٧٩ك مردووە، و تاقمی (کەرامیة) شوێنکەوتووانی (ئیبن کەرامی سەجستانی) کە لە ساڵی ٢٥٥ك مردووە[3].

### سێیەم: تەئویل کردن (تأويل):

ئەمە بۆچوونی موعتەزیلە بوو و دواتر - لەگەڵ چەند دەستکارییەکی کەم - موسڵمانان بەگشتی بە شیعە و ئەهلی سوننە: ماتریدیەکان و ئەشعەریەکان، دەستیان بەم بۆچوونەوە گرت، و ئیمامی ڕازی لەمبارەوە دەڵێت: (هەموو پێڕو تاقمە ئیسلامیەکان دان دەنێن بەوەی: پێویستە ڕووکەشی هەندێ ئایەتی قورئان و هەواڵ تەئویل بکرێت) [4].

---

[1] مقدمة ابن خلدون ٤٣٤.

[2] تلبيس ابليس ١١٣.

[3] الملل و النحل - الشهرستانی ٩٢/١ و لاپەڕەکانی دواتر. و بڕوانە: دراسات في الفرق ٢١٣-٢١٥.

[4] أساس التقديس للرازي ٦٧. سەیری بۆچوونی ئیبازییەکان بکە لە: الموجز لأبي عمار ١٢٦ ولاپەڕەکانی دواتر.

باجوری وتویەتی: ئەگەر دەقێك لە قورئان و سوننەتدا هات و هەستی پێدەکرا لە ڕووکەشدا مانای لا و تەنیشت یاخود جەستە یان وێنە یاخود ئەندامی لێ بەدی دەکرا، ئەوا ڕاستڕەوان جگە لە مشەبهە و مجسمەکان کۆکن لەسەر تەئویل کردنی ئەم دەقانە[1].

لەبەر ئەوەی بە بەڵگەی عەقڵی لەلای ئەوان چەسپاوە کە خوای گەورە پاکە لە جەستە و تایبەتمەندیەکانی جەستە و شوێن و لا و تەنیشت (جهة)، هیچ ڕێگەیەك نییە بۆ نەهێشتنی وێچواندن (تشبیە) تەنها ئەو ڕێگەیە نەبێت کە بریتییە لە تەئویل کردنی ئەو سیفاتە خەبەریانەی کە لە دەقەکاندا هاتوون.

جویەنی وتویەتی: پشتکردنە تەئویل بە پاساوی خۆ دوورگرتن لە کەوتنە ناو شتێکی قەدەغە لە بیروباوەڕدا سەردەکێشێت بۆ لێ ئالۆز بوون و لە خشتەچوون و خلیسکانی خەڵکی سادە، تەنانەت دەبێتە هۆی ڕێ خۆشکردن بۆ هاتنی گومان بۆ ناو بیروباوەڕ و تیر بەتاریکیەوە نان سەبارەت بە مانای بەشێکی قورئانی پیرۆز[2].

زانایان کاتێك بینیان کردنەوەی دەرگای تەئویل زیانێکی گەورەی هەیە، چەندین یاسا و بنەمایان دانا بۆ تەئویل، تا سەر نەکێشێت بۆ یاری کردن بە دەقەکان بەپێی هەواو

---

[1] شرح الجوهرة للباجوري ١٥٧.
باجوری لە: (حاشیتە علی السلم ٢٤) وتویەتی: (بزانە دەقێك لە قورئان و سوننەتدا هات و لە ڕووکەشدا مانای ئەوەی لێ بەدی دەکرا کە خوای گەورە دەست یاخود هاوشێوەی ئەم ئەندامەی هەیە، لەو کاتەدا پێویستە تەئویل بکرێن: بەوەی لە مانا ڕووکەشیەکەی لادەدرێت، پێشین و پاشین لەسەر ئەمە کۆکن، بەڵام ڕاجیاییان هەیە لە دیاری کردنی مەبەستی دەقەکە، پێشینان مەبەستی دەقەکە دیاری ناکەن و بەڵکو بەخوای دەسپێرن، لەبارەی ئەم فەرمایشتەو هاووێنەکانی: ﴿ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ﴾ الرحمن: ٢٧، ﴿يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ﴾ الشوری: ١٠، دەڵێن: خوای گەورە ڕووخسارو دەستی هەیە بەڵام نەك وەك ڕووخسارو دەستی ئێمە، تەنها خوای گەورە دەزانێت کە مەبەستی لە دەست و ڕووخساری خۆی چییە، پاشان دەڵێن: خوای گەورە ڕووخسارو دەستی وەك ئێمە نییە، بەڵکو مەبەست لە ڕووخساری خوا، زاتی خوایە، مەبەست لە دەستی خوا، هێزو توانای خوایە).

[2] الإرشاد للجويني ٤٢، دواتر ١٥٥-١٦٤ چەندین دەقی قورئان و سوننەتی هێناوەو تەئویلەکانیشی خستوەتەڕوو.

هەوەس و بێ گوێدانە بنەماکانی شەریعەت و مەبەستەکانی[1].

شێخ (عیزەدینی کوڕی عەبدوسەلام) وتی: (ڕێگەو ڕێبازی تەئویل کردن بە مەرجی خۆیەوە نزیکترە لە ڕاستی و حەق لە ڕێگەکەی تر)[2].

شێخ (عیزەدینی کوڕی عەبدوسەلام) وتویەتی: (تەئویل کردن بەپێی مەرجەکانی، نزیکترینە لە ڕاستیەوە)، مەبەست لەوەی بەپێی مەرجەکانی: ئەوەیە کە لە چوارچێوەی زمانی عەرەب دەرنەچێت[3].

---

[1] دراسات في الفرق ٢١٩. و سەیر: المسايرة ٣٤ ولاپەڕەکانی دواتر، المواقف ٢٤/٨ و شرح الجوهرة للباجوري ١٥٧.

لامشی وتویەتی: (ئەم دەربڕینانە چەند واتاو ڕوویەکیان هەیە، پێویستە ئەو واتاو ڕووە دەستنیشان بکرێت کە گونجاو بێت لەگەڵ بەڵگەی سەلمێنراو و براوەی عەقڵی و ئەم فەرمایشتە یەك مانا هەڵگرە: ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ ﴾ الشورى: ١١، تا دژیەکی لە نێوان بەڵگەکانی خوا دروست نەبێت. "اليد" بۆ نیعمەت و هێزو دەسەڵات بەکاردێت، هەندێك جاریش بەمانای بەڵگە یاخود خۆشی و دەوڵەمەندی یان وەك ناو بۆ ئەندامێکی جەستە بەکاردێت. وشەی "العين" بۆ پاراستن یاخود وەك ناو بۆ ئەندامێکی جەستە بەکاردێ، جا چ "اليد" چ "العين" بەو مانایە ڕاڤە دەکرێن کە بگونجێت لەگەڵ بەڵگەی عەقڵ و ئایەتە یەك مانا هەڵگرەکە)./ التوحيد للامشي ٥٩ و تیایدا هاتووە: ئەمە لە هەندێك لە شێخەکانمان (واتە: ماتوریدییەکان) گێڕدراوەتەوە.

[2] المسايرة ٣٤.

[3] المسايرة ٣٧، تیادا هاتووە: (ئیمامی حەرەمەین لە کتێبی "الإرشاد" ڕێگەی تەئویلی پەسەند کردووە، بەڵام لە کتێبی "الرسالة النظامية" ڕێگەی سپاردنی ماناکان "تفويض" هەڵبژاردووە، کتێبی ناوبراو لە دوای کتێبی "الإرشاد" نووسراوە، ئەمەش وەك ئەوە دەگەیەنێت کە ئیمامی حەرەمەین لە تەئویل کردن پاشگەز ببێتەوە. ئیبن دەقیقی عید ڕێگەیەکی مام ناوەندی گرتووەو وتویەتی: ئەگەر تەئویلەکە بە شێوەیەك کرابوو کە مانایەکی وا هەڵبگرێت نزیك بێت لەو شێوەیەی عەرەب پێی دەدوێن ئەوا پەسەندە. ئەگەر تەئویلەکە دوور بوو ئەوا هەڵوێستەی لەسەر دەکرێت و وەرناگیرێت. ئیبن هەمام بۆچوونی وایە پێویستە بەشێوازێکی مام ناوەند تەئویل بکرێت، بەوەی ئەگەر دەقەکە کێشەی بۆ خەڵکی سادە دروست کرد ئەوا لەو کاتە پەنا ببرێتە بەر تەئویل باشە، ئەگەر پێویستیشی نەکرد تەئویل نەکرێت).

بڕوانە ئەمانەش: الإرشاد للجويني، سەرچاوەی پێشوو، العقيدة النظامية للجويني ١٦٦ وشرح الفقه الأكبر لعلي القاري ٧٠.

لە نمونەی ئەو تەئویلە پەسەندانەی كردوویانە بۆ دەقەكانی فرەواتا (متشـابە) و خـوای گەورە بە پاك دەگرێت لەو شتانەی لە زاتی پاك و پیرۆزی ناوەشێتەوە:

**ئەو دەقانەی كە لە ڕووكەشدا مانای شوێن و تەنیشت (جهة) دەگەیەنن:**

١- ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ﴾ طـه: ٥. (إسْـتَوَاء) بریتیـە لـە: زاڵ بـوون و دەسـت بەسەردا گرتن (اسـتیلاء)[1] و دەسـەڵاتدار و فـەرمانڕەوایی (الملـك). وەك شـاعیر

---

[1] غەزالی لە كتێبی (الإحیاء) وشەی (إستوی) بە زاڵ بوون ڕاڤەی كردووە، زوبەیدی لە (إتحاف السادة ١٠٦/٢-١٠٨) ڕوونكردنەوەی لەسەر داوەو ڕای زانایانی لەوبارەوە هێناوە. زبیدی لە ١٠٧ وتویەتی: ("ئیبن بەتاڵ" وتویەتی: لەبارەی مانای وشەی "إستواء" لەم ئایەتەدا زانایان ڕای جیایان هەیە، موعتەزیلەكان وتویانە: بریتییە لە زاڵ بوون بە دەسەڵات و تواناو هێز. هەندێك لە ئەهلی سوننە وتویانە: واتاكەی بریتیە لەوەی بەرز بووەتەوە، هەندێكی تر لە ئەهلی سوننە وتویانە: بڵندتر بوو، هەندێكی تریان وتویانە: بە مانای دەسەڵاتداری و فەرمانڕەوایی دێت. وتراوە: بریتیە لە تەواو بوون و لێبوونەوە لە ئەنجامدانی كارێك. دواتر بەرپەرچی موعتەزیلە و موجسمەكانی داوەتەوەو ئەو ڕایەی پەسەند كردووە كە دەڵێت بە مانانی بڵندتر بوون دێت). چەند وتەیەكی تر بە بەڵگەكانیەوە لە كتێبی ناوبراو خراوەتەڕوو. (إستواء) چەند ڕاڤەیەكی تریشی هەیە، كە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: أصول الدین للبغدادي ١١٢ والإتقان للسیوطي ٤٨٥ وكفایة الطالب الرباني ٤٩ و ٥٠.

هەروەها لەم سەرچاوانەشدا وشەی (إستواء) بە زاڵ بوون ڕاڤەكراوە: الإرشاد للجویني ٤٠ والإقتصاد في الإعتقاد للغزالي ٤٠ والتمهید للامشي ٦٤ والمواقف ٢٤/٨ والمسایرة وشرحه المسامرة وشرحه لقاسم بن قطلوبغا ٣٤-٣٥ وشرح الجوهرة للباجوري ١٥٧ والموجز لإبن عمار ١٣٢/١ عن إبن عباس، ومشارق أنوار العقول ٤٠٥/١ وشرح غایة المراد ٤٣. "جاحز" ئەم ڕاڤەیەی داوەتە پاڵ "ئیبن عباس" بەڵام "ئیبن تیمیە" بەرپەرچی داوەتەوە./ إتحاف السادة ١٠٦/٢.

لە كتێبی (الإرشاد ٤١-٤٢) هاتووە: (ئەگەر وترا: ئەم ئایەتە: ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ﴾ طە: ٥. بەبێ تەئویل كردن و بەپێ ڕووكەشەكە بەڕێ بكەن، لەبەر ئەوەی ئەم ئایەتە لەو شتانەیە كە فرەواتا (متشابە)ن تەنها خوای گەورە مەبەستیان دەزانێت؟ لە وەڵامدا دەڵێین: ئەگەر پرسیاركەر وا ڕاهێنرا كە وشەی "إستواء" وەك خۆی بەڕێ بكات بەپێی مانا زمانەوانیە ڕووكەشیەكەی كە بریتییە لە جێگیر بوون، ئەوە ئەمە دەبێتە هۆی جەستە بڕیاردان بۆ خوا. ئەگەر گومانیشی لە بوونی جەستە هەبێت بۆ خوا ئەوە هەر وەك ئەوەیە كە بڕوای بە بوونی جەستە

دەڵێت: قد استوى عَمْرو على العراق  من غير سيف و دم مُهْراق[1]

واتە: عەمر زاڵبوو بەسەر عێراقدا بەبێ شمشێر و خوێن ڕشتن.

٢- ﴿ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴾ النحل: ٥٠. لەلای سەرەوە بوون (فوقية) بریتییە لە: بەرزو بڵندی لە گەورەیی و مەزنیدا، واتە: فریشتەکان لە خوای گەورە دەترسن لەبەر بەرزی و بڵندێتیەکەی لە گەورەیی و مەزنیدا[2].

٣- ﴿ فَإِنِ ٱسْتَكْبَرُوا۟ فَٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْـَٔمُونَ ﴾ فصلت: ٣٨. لەلابوون (عندية): واتە هەڵبژاردن و ڕێزگرتن.

٤- ﴿ إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ ﴾ فاطر: ١٠. واتە: خوای گەورە پێی ڕازی دەبێت. گوفتار ڕووکەش (عرض)ە، و ڕووکەشیش نا گوازرێتەوە.

٥- ﴿ تَعْرُجُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ ﴾ المعارج: ٤. واتە: بەرز بوونەوە بۆ ئەو پلەیەی کە بە ئەنجامدانی پەرستش تیایدا نزیك دەبێتەوە.

---

هەبێت بۆ خوا. ئەگەر بەبێ گومان و دوودڵی دانی نا بە ئەستەم بوونی دیاردەی جێگیر بوونی بۆ خوای گەورە ئەوە بەم شتە لە مانا ڕووکەشیەکە لایداوە. ئەو کەسەش کە بانگەشەی بەرێکردنی ئەو شتانەی کردووە بە پێی ڕووکەشەکانیان نەیتوانیوە تاسەر لەسەر ئەم بۆچوونەی بێت. جا ئەگەر بەبێ دوودڵی لە واتای ڕووکەشییەکەی ئایەتەکە لادرا ئەوا پێویستە ئایەتەکە بەشێوەیەك واتا بکرێت کە گونجاو بێت لەگەڵ عەقڵ و شەرع).

ماتریدی لە کتێبی (التوحيد م ٤١ و ٧٤) پێی وایە تەئویل نەکرێت، غزنوی کە یەکێکە لە ماتوریدییەکان لە کتێبەکەیدا (أصول الدين ٧٥) هەمان بۆچوونی تەئویل نەکردنی هەیە. هەروەها "لامشي" لە (التمهيد ٦٤) دوو بۆچوونی ماتوریدی هێناوە: یەکەم: تەئویل نەکردنە، دووەم: زاڵ بوونە. لەکاتی خستنەڕووی بۆچوونەکانی ماتوریدی ئەمە خرایەڕوو.

[1] ئەم شاعیرە ناوی (ئەلعەبیس)ە، هەروەك هاوەڵەکەی ئیسماعیلی کوڕی عوباد ئاماژەی بەوە داوە، یاخود ئەو شاعیرە ناوی (ئەختەڵ)ە هەروەك جوهری ئاماژەی بۆ کردووە. (بیشر) ناوی تەواوی: بیشری کوڕی مەڕوانە./ إتحاف السادة ١٠٦/٢٣.

ئەم دێرە شیعرە لەم سەرچاوانەدا هاتووە: الإقتصاد في الإعتقاد للغزالي، والموجز لأبي عمار، والمسايرة، وشرح الجوهرة للباجوري، سەرچاوەکانی پێشوو. لە کتێبی (المواقف) عەمری لە جیاتی ناوی بیشر لە دێرە شیعرەکەدا هێناوە.

[2] شرح الجوهرة للباجوري ١٥٧.

٦- ﴿ ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ ﴾ الملك: ١٦. (من في السماء): واتە حوکم و دەسەڵاتەکەی یان ئەو فریشتەیەی ڕاسپێراوە بە سزا.

٧- ﴿ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ۝٨ فَكَانَ قَابَ قَوۡسَيۡنِ أَوۡ أَدۡنَىٰ ﴾ النجم: ٨. (الدنو): نزیك بوونەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە خوای گەورە بە پەرستش، نزیك بوونەوەش كە ئەندازە كراوە بە (دوو كەوان و كەمتریش) بۆ ئەوەیە عەقڵەكان بتوانن ئەندێشە و تەصەوری بكەن بەهۆی شتی بەرهەست.

٨- ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) كە بە كەنیزە لاڵەكەی فەرموو: (أين الله؟) واتە: خوا لە كوێیە؟، كەنیزەكە: ئاماژەی بۆ ئاسمان كرد، بەمەش ئیمانی دەربڕی.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پرسیاری كرد و فەرمووی (خوا لەكوێیە؟)، ئەمەی بۆ ئەوە بوو تا بیروباوەڕی ئاشكرا بكات، جا كە كەنیزەكە ئاماژەی كرد بۆ ئاسمان، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەوەی زانی كە كەنیزەكە بتپەرست نییە، ئاماژەی كەنیزەكەیشی بەوە وەرگرت كە خوا بەدیهێنەری ئاسمانە، بۆیە حوكمی باوەڕداری بەسەر كەنیزەكەدا[1].

---

[1] المواقف ٨/٢٤-٢٥.

زانایان ڕاجیان لەبارەی ئەو كەسەی كە بڕوای وایە خوای گەورە لە شوێن و لایەكدایە، لەم بارەوە چەند بۆچوونێكیان هەن:

١- تەكفیر ناكرێت. ئەمە بۆچوونی عزی كوڕی عبدالسلامە. النووی ئەم مەرجەی داناوە كە لەو كاتە تەكفیر ناكرێت كە لە خەڵكی سادە بێت، إبن جمره ئەم مەرجەی داناوە ئەگەر كەسەكە بۆی سەخت بوو بوونی شوێن و تەنیشت بۆ خوا بڕیار نەدات.

٢- درێژەپێدان (التفصيل): ئەگەر بڕوای وابوو خوای گەورە لەلای سەرووە، ئەوا تەكفیر ناكرێت، چونكە بەشێوەیەكی گشتی لای سەروو مانای ڕێزو شكۆیە. ئەگەر بڕوای وابوو خوای گەورە لەلای خوارووە ئەوا تەكفیر دەكرێت، چونكە لای خواروو كەمی و بێ نرخییە./ شرح الجوهرة للباجوري ١٦٥.

**ئەو دەقانەی کە لە ڕووکەشدا مانای جەستە دەگەیەنن:**

١- ﴿ وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا ﴾ الفجـــر: ٢٢. واتـــه: فـــەرمانی گشـــتگیری پەروەردگارت هـات کـە هـەموو جـۆرە سـزایەك لـە خـۆ دەگرێـت یـاخود سـزای پەروەردگارت هات[١].

٢- ﴿ وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا ﴾ البقرة: ٢١٠. واتە: هاتنی سزای خوا.

٣- ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم): (**ينـزل ربنا تبارك و تعـالى كـل ليلة الى السماء الدنيا حين يبقى ثُلُثُ الآخر فيقول: من يدعوني فأستجيب له، و من يسألني فأعطيه، و مَن يستغفرني فأغفر له**)[٢] واتە: پەروەردگاری پاك و بـەرزمان لە سێ یەکی کۆتایی هەموو شەوێ دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیـا، و دەفـەرمووێت: کێ لێم دەپاڕێتەوە تا وەڵامی بدەمەوە، کێ داواکاری هەیە تا پێی ببەخشـم، کـێ داوای لێ خۆش بوون دەکات تا لێی خۆش بم.

واتە: فریشتەی پەروەردگارمان دادەبەزێت و لە بری خوا دەڵێت.

---

[١] المواقف ٨/٢٤-٢٥. وشرح الجوهرة للباجوري ١٥٨. ونقله إبن عمار في الموجز ١/١٣٥ عن إبن عباس.

[٢] المواقف ٨/٢٤-٢٥ وشرح الجوهرة للباجوري ١٥٨.

فەرموودەی: پەروەردگاری پاك و پەرز... تاد: صحيح البخاری ١٩ كتاب التهجد ١٤ باب الدعاء والصلاة آخر الليل، رقم ١١٤٥ بهذا اللفظ عن أبي هريرة.

وورد عن أبي هريرة أيضا في: صحيح البخاري ٨٠ كتاب الدعوات ١٤ باب الدعاء نصف الليل رقم ٦٣٢١ وفي ٩٧ التوحيد ٣٥ باب قوله تعالى: ﴿ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُواْ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ﴾ فتح: ١٥. رقم ٧٤٩٤.

وفي صحيح مسلم ٦ كتاب صلاة المسافرين ٢٤ باب الترغيب في الدعاء، رقم ٧٥٨ عن أبي هريرة أيضا.

وأخرجه أبو داود والترمذي وإبن ماجه ومالك وأحمد... وغيرهم./ شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز، هامش ٢٦٩ لمحققه شعيب الأرناؤوط.

### ئەو دەقانەی كە لە ڕووكەشدا مانای وێنە (صورة) دەگەیەنن:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: **(اذا قاتل أحدكم أخاه فَليجتنبِ الوَجه، فإن الله خلق آدم على صورته)**. واتە: ئەگەر یەكێك بە كێشە چوو لەگەڵ براكەی با خۆی دوور بگرێت لەوەی ئازار بە دەموچاوی ببات، خوای گەورە ئادەمی لەسەر وێنەی خۆی دروست كردووە.

مەبەست لە وێنە (صورة): سیفەتە، وەك: سیفەتی بیستن، بینین، ژیان، زانست، واتە: بەشێوەیەكی گشتی هەمان سیفەتی هەن[1] [2].

### ئەو دەقانەی كە لە ڕووكەشدا مانای ئەندام (جوارح) دەگەیەنن:

١- ﴿ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ ﴾ الرحمن: ٢٧. (وجه) واتە: زاتی خوا[3].

٢- ﴿ يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ﴾ الفتح: ١٠. (اليد) واتە: هێزو توانا[4].

ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم): **(إن قلب بني آدم كلها، بين اصبعين من أصابع الرحمن كقلب واحد، يصرفه حيث يشاء)**[5]. واتە: دڵی هەموو ئادەمیزادەكان وەك یەك دڵ لە نێوان دوو پەنجەی خوادان، و چۆن ویستی لەسەر بێت بەوشێوەیە دەیگۆڕێت.

---

[1] شرح الجوهرة للباجوري ١٥٩.

فەرموودەی: ئەگەر یەكێكتان بەكێشە چوو لەگەڵ براكەی... تاد: صحيح مسلم ٤٥ كتاب البر والصلة ٣٢ باب النهي عن ضرب الوجه رقم ٢٦١٢ (١١٥)، عن أبي هريرة. ومسند الإمام أحمد ٢٤٤/٢.

[2] دەكرێ ڕاناوەكە لە وشەی (صورته) بۆ خودی ئادەم بگەڕێتەوە. (وەرگێڕ).

[3] شرح الجوهرة للباجوري ١٥٩ ومشارق الأنوار العقول ٤٠٢/١.

[4] شرح الجوهرة للباجوري ١٥٩.

[5] شرح الجوهرة للباجوري ١٥٩.

فەرموودەی: ئەگەر یەكێكتان بەكێشە چوو لەگەڵ براكەی... تاد: صحيح مسلم ٤٦ كتاب القدر ٣ باب تصريف الله تعالى القلوب، رقم ٢٦٥٤ عن عبدالله بن عمرو بن عاص.

مەبەست لە دوو پەنجە (اصبعين): دوو سیفەتن لە سیفەتەكانی خـوا، كـە بریتییـە لـە توانا (القدرة)، ویست (الارادة)[1].

بەمە ڕوون دەبێتەوە كە زۆربەی موسڵمانان لە پێشین (سلف) و پاشین (خلف) كـۆكن[2]

---

[1] بۆ ئەم تەئویلانە بڕوانە: المواقف و شرحه ٤٧٣ و المسامرة ٣٥-٣٦ و الباجوري على الجوهرة ٨١/١-٨٤.

[2] ئیجی لە (المواقف ٢٤/٨) وتویەتی: (هەرچەندە دوو بەڵگە دژیەكیش بن، ئەوا تا دەكرێت دەبێت كار بە هەردووكیان بكرێت، جا یان ڕووكەشەكان بە شێوەیەكی پوخت تەئویل دەكرێن و درێژەی مەبەستیش بەخوا دەسپێردرێت، هەروەك ئەمە ڕای زۆربەی پێشینانە... یاخود تەئویل دەكرێت و درێژەی مەبەست ڕوون دەكرێتەوەو دەوترێت: "الإستواء" واتە: زاڵ بوون.. ).

لە (جوهرة التوحيد)دا هاتووە:

وكل نص أوهم تشبيها　　أوله أو فوض ورم تنـزيها

باجوری ڕاڤەی ئەم دوو دێڕەی كردووەو وتویەتی:

كە دەڵێت (نص: دەق) بریتییە لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی بەپێز.

(أوله) واتە: مانا ڕووكەشیەكەی وەرمەگرە، بەڵكو واتای مەبەستی دەقەكە ڕوون بكەرەوە، ڕوونكردنەوەی مەبەستەكە بەوە دەبێت كە بە تێروتەسەلی تەئویل بكرێت و مەبەستی دەقەكە بخرێتەڕوو، ئەمە مەزهەبی پاشین (خلف): هەموو ئەوانە دەگرێتەوە لە دوای سەدەی پێنجەم، وتراوە لە دوای سەدەی سێیەم.

(أو فوض) واتە: دوای تەئویل كردنی پوخت، كە لادانە لە مانا ڕووكەشەكە، ئەوا مانای دەقەكە بەخوا بسپێرە، بەپێی ڕێبازی پێشینان: ئەوانەن كە لە پێش سەدەی پێنجەم بوون، وتراوە بریتین لە هاوەڵان و شوێنكەوتوان و شوێنكەوتوی شوێنكەوتووان.

ڕێبازی پاشین (خلف) زانایانەترو تۆكمەترە، چونكە ڕوونكردنەوەی زیاتر لەخۆ دەگرێت و بەربەرچی دژەكانیش دەداتەوە، هەر بۆیە دانەر (خاوەنی كتێبی: الجوهرة) لە شیعرەكەدا ڕێبازی پاشینی پێش پێشینان خستووە. ڕێبازی پێشینان سەلامەتترە، چونكە مرۆڤ پارێزراو دەبێت لە هەڵە كردن لە دەستنیشان كردنی مەبەست، كە دەكرێت مەبەستێك دەستنیشان بكرێت كەچی خوای گەورە لە دەقەكەدا ئەو مەبەستەی نەبوو بێت.

(ورم تنزيها) واتە: مەبەستت تەنها بە پاكگرتنی خوا بێت لەو شتانەی كە شیاوی ئەو نین و مەبەستی دەقەكانیش بە خوابسپێرە. لەوەی خستمانەڕوو ئەوە بەدەركەوت كە پێشین و پاشین كۆكن لەسەر تەئویل كردنی كورت و پوخت، چونكە هەردووكیان مانای ئەو دەقە لە ڕووكەشەكەی

لە پاکدانان و دوورگرتنی خوا لە وێچواندن (تشبیه)، لەگەڵ ئەوەشدا ڕاجیا بوون لەبارەی ڕێگەی تەفسیرو شرۆڤەی دەقە فرەواتا (متشابە)ەکان، ئەم ڕاجیایەش بە پێی چەرخ و سەدەی خۆیان بووە، کە تیایدا ژیاون، ئەویش تەنها ڕاجیاییەکی لاوەکی و شکلی بووە.

تەنها (موشەبیهەکان) لەمەدا ڕای جیاوازیان هەبووە، کە زاتی خوای گەورەیان بەوێنەی جەستە چواندووە، بەم هۆیەوە سیفەتی جەستەییان دەدا پاڵ خوای گەورە، بەڵام ئەو (مشبهانە) قیمەت و نرخ بۆ بۆچوونەکەیان دانانرێت لە تەرازووی ڕەخنەیی زانستی دا کاتێك بەراوردی دەقەکان دەکرێت، خوای گەورە فەردوویەتی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ مِنْهُ ءَايَٰتٌ مُّحْكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٌ ۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنْهُ ٱبْتِغَآءَ ٱلْفِتْنَةِ وَٱبْتِغَآءَ تَأْوِيلِهِۦ ۗ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ ۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾ آل عمران: ٧. واتە: (ئەو خوایە زاتێکە کە قورئانی بۆ سەر تۆ "ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)" ناردە خوارەوە، بەشێك لە ئایەتەکانی دامەزراو پایەدارو ڕوون و ئاشکران، ئەوانە بناغە و بنچینەی قورئانەکەن و هەندێکی تریشی واتای جۆراوجۆر هەڵدەگرن و بە ئاسانی نازانرێن، جا ئەوانەی لە دڵیاندا لاری و لادان هەیە، حەز لە حەق و ڕاستی ناکەن، ئەوانە شوێن ئەو ئایەتانە دەکەون کە مانای جۆراو جۆرو فراوانیان هەیە، بۆ ئەوەی فیتنە و ئاشوب و ناکۆکی و دووبەرەکی دروست بکەن یان بۆ ئەوەی لێکدانەوەی هەڵەی بۆ هەڵبەستن، لە حاڵێکدا کە لێکدانەوەی ئەو جۆرە ئایەتانە هەر خوا خۆی بە تەنهایی دەیزانێت).

---

لادەدەن کە شتێکی ئەستەم دەداتە پاڵ خوا، بەڵام ڕاجیان لە بارەی دیاری کردن و دیاری نەکردنی مەبەستی دەقەکە./ شرح الجوهرة للباجوري ١٥٦ و شرح الخريدة البهية للدردير ٦٨-٦٩.

### ٤- بێ نیازیی و بەخۆوە ڕاوەستان (القیام بالنفس):

بێ نیازیی و بەخۆوە ڕاوەستان (القیام بالنفس) دوو مانا دەگرێتە خۆ:

**یەکەمیان:** بریتیە لەوەی پێویستی بەشوێن نەبێت. شوێن دوو ڕاڤەی هەیە:

١- ئەو خودو زاتەی کە پێی ڕاوەستاوە، نەك بە واتای شوێن، چونکە ئەمـە زانـرا کـە پێچەوانەی پەیدابوانە.

٢- خود (ذات) و شوێن بەیەکەوە. (الغنیمی) وا دەڵێت.

**دووەمیان:** بریتییە لەوەی کە پێویستی بە بەدیهێنەر نییە تا پەیدای بکات[1].

پێچەوانەی سیفەتی بێ نیازی و بەخۆوە ڕاوەستان (القیام بالنفس) بریتیە لە: پێویست بوون بە غەیری خۆی.

**بەڵگەی عەقڵی:**

١- بەڵگە لەسەر ئەوەی کە پێویستی بە شوێن نییە:

أ- ئەگەر پێویستی بە شوێن هەبوایە، ئەوا شوێنگرتن دەبووە یەکێك لە سـیفەتەکانی، ئەگەر شوێنگرتن سیفەتی بوایـە، ئـەوا خـوای گـەورە بـە سـیفەتی واتـایی (معـانی) و مەعنەوی وەسف نەدەکرا، کەچی ئەو سیفەتانە پێویستن بـۆ خـوای گـەورە، بـەهۆی ئـەو بەڵگەنەی جەخت لەسەر بوونیان دەکەنەوە، ئەمەش پوچەڵە هەر بۆیە سەلمێنرا کـە خـوای گەورە پێویستی بە شوێن نییە[2].

ب- شوێنگر پێویستی بە شوێن هەیە، بە شێوەیەك کە بوونەکەی ئەستەم دەبێت بـەبێ شوێن. و شوێن پێویستی بە شوێنگر نییە، چونکە دەکرێت شوێن بەتاڵ و بۆش بێت، بۆیە ئەو کاتە گریمانەی پێویست بوون شیاوی بوون (ممکن) و پێویسـتی هـەبوونی شـوێن دێتـە کایە، کە هەردووکیان پوچەڵن[3].

---

[1] شرح الجوهرة للباجوري ١/١١٣.

[2] هەمان سەرچاوە، و الدردیر في شرح الخریدة ٦٢ و شرح أم البراهین للسنوسي وحاشیة الدسوقي علیه ١٥٩.

[3] المواقف و شرحه للسید الشریف ٨/٢٠.

٢- بەڵگە لەسەر ئەوەی کە پێویستی بە پەیداکەرێك نییە:

ئەگەر پێویستی بە پەیداکەرو بەدیهێنەرێك بوایە ئەوا ئەوسا دەبووە پەیدابوو و بەدیهێنراو، جا ئەمە چۆن دەبێت کاتێك پێشتر ئەوەمان خستەڕوو کە خوای گەورە پێویستە بوونە و بێ سەرەتا و بێ کۆتایە بە زات و سیفاتەوە؟

**بەڵگەی نەقڵی:**

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴾ فاطر: ١٥. واتە: (ئەی خەڵکینە ئێوە هەژارو نەدارن و هەمیشە ئاتاجی خوان، هەر تەنها خوایە کە بێ نیازە و شایەنی سوپاسە).

هەروەها دەفەرمویێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ العنكبوت: ٦. واتە: (بەڕاستی خوا بێ نیازە لە هەموو خەڵکی).

**ئەگەر وترا:** چۆن ئەندێشە و تەصەوڕ دەکرێت کە خوای گەورە لە هیچ شوێنێکدا جێگیر نەبووبێت، شوێنگر نەبێت؟

**وەڵامەکە بریتییە لە:** ئەندێشە و تەصەوڕ کردنی شوێن بۆ هەر جەستەیەك، لە دەرەنجامی تێڕوانین و خوێندنەوەیە بۆ بارو حاڵەتی جەستەکان کە دەیبینین شوێنێکیان گرتووە، بەڵام پێوانە کردنی خوا لەسەر جەستەکان تا بسەلمێنین شوێنگرە، ئەوا بێگومان پێوانەیەکی پوچەڵە، چونکە هیچ هۆیەکی کۆکەرەوە نییە لە نێوان بنچینە (ئەصڵ)ولق و پۆپ (فرع) دا، لەبەر ئەوە:

عەقڵی مرۆڤ سنوردارە، کەم توانایە لە پەیی بردن بە زۆر شت، هەر چەندە بڕیار دەدات لەسەر بوونی چەند شتێکی زۆر وەك: ڕۆح، عەقڵ، لە ناو جەستەدا، کارەبا لەو تەلانەی کە بۆ پێدا ڕۆیشتنی ئامادەکراوە... تاد، ئەگەر چی کرۆك و حەقیقەتەکەی نەزانراوە و نهێنیەکەی پەیی پێی نابردرێت.

کەواتە عەقڵی مرۆڤ ناتوانێت پەیی بە زۆر شتی دەوروبەری ببات، جا کەواتە چۆن دەتوانی ئەندێشەی بکات کە خوای گەورە ناچێتە ناو شوێنەوەو شوێنگر نیە؟ لەگەڵ

ئەوەی کە عەقڵ بەبێ گومان دانی ناوە بەبوونی خوای گەورە، کەچی ناتوانێت پەیی بە خودی خوا ببات و تەصەوری بکات و تێی بگات؟

ئەوە بەسە بۆ مرۆڤ باوەڕی هەبێت بە بوونی خوای گەورە و سیفەتەکانی، دواتر دۆش دادەمێنێت و سەرسوڕمانی دایدەگرێت لە ئاست تێگەیشتن و ئەندێشە کردنی. ئا ئەمەیە ڕاستی باوەڕ بوون بە غەیب بوون، خوای گەورە فەرمانی بە بەندەکانی کردووە کە باوەڕیان پێی هەبێت[1].

**٥- تەنهایی** (وحدانية).

واتاکەی: بریتییە لە تەنهایی خوا لە زات و سیفەت و کردەوەدا.

**خوا بەیەکزانین لە زاتدا:** بریتیە لە ڕەت کردنەوەی چەندێتی لکاو (کم المتصل) کە بریتیە لە پێکهاتن، واتە: پێکهاتنی زات لە چەند بەشێك. ڕەتکردنەوەی چەندێتی جیا (کم المنفصل) کە بریتیە لە زۆرتر بوون لە یەك (تعدد)، واتە دوو خوا یان زیاتر هەبن.

**خوا بەیەکزانین لە سیفەتەکان دا:** چەندێتی جیا (الکم المنفصل) نەفی دەکرێت، کە بریتیە لە بوونی دوو سیفەت لە یەك ڕەگەز وەك بوونی دوو توانا و زیاتر. ڕەت کردنەوەی چەندێتی جیا (الکم المنفصل)، کە بریتیە لە چەسپاندنی سیفەتی خوا بۆ غەیری خوا بەهۆی وێکچوونی سیفەتەکە، وەك ئەوەی زەید توانایەکی هەبێت شتی پێ بەدیبێنێت و شتیش لە ناوبەرێت وەك توانای خوای گەورە یان تایبەت کردنی ویست بە هەندێ شتی شیاوی بوونن (ممکنات).

**خوا بەیەکزانین لە کردەوەدا:** تەنها چەندێتی جیا (کم المنفصل)[2] ڕەت دەکاتەوە،

---

[1] کبری الیقینیات الکونیة ١٢٠-١٢١.

[2] چەندی جیا (کم المنفصل) لە کردەوەدا: ئەگەر وا تەصەوڕمان کرد خوای گەورە چەندین کردەوەی هەن، ئەوا ئەمە شتێکی چەسپاوە، چونکە کردەوەکانی زۆرن لە بەدیهێنان و ڕۆزیدان و زیندوو کردنەوە... ئەگەر وا تەصەوڕمان کرد کە غەیری خوای گەورە بەژدارە لە کردەوەیەك لەم کردەوانەدا، ئەوا ئەو تەصەورە شتێکی پوچەڵکراوەیە بە یەکتایی خوا لە کردەوەکانی دا. شرح الجوهرة للباجوري ١/٥٤ و حاشیة الصاوي علی الدردیر ٦٤.

که بریتیه له چەسپاندنی کردەوەی بەدیهێنان و دروست کردن بۆ غەیری خوای گەورە[1].

---

[1] شرح الجوهرة للباجوري ١١٤ و شرح الخريدة للدردير ٥٩ و كفاية الطالب الرباني وحاشية العدوي عليها ١/٤٠ و رسالة في التوحيد و الفرق المعاصرة: الطائي ٣٩-٤٢.

هەندێك له زانایان خوابەکزانین و یەکتاناسیان دابەش کردووەته سەر سێ بەش:

١- خوابەیەکگرتن له پەروەردگاریێتی دا: واتای ئەوەیە: که هیچ بەدیهێنەر، ڕۆزیدەر، ژیێنەر، مرێنەر، پەیداکەر، لەناوبەر جگه له خوای گەورە نییه.

٢- خوابەیەکگرتن له پەرستراوێتی دا: واته: پەرستش و بەندایەتی و ملکەچی و خۆشەویستی و زەبونی تەنها بۆ خوای گەورە بێت.

٣- خوابەیەکگرتن له سیفەتەکاندا: بریتیه لەوەی: خوای گەورە بەو شتانه وەسف بکرێت که خۆی و پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) وەسفی ئەوی پێکردوە، ئەو سیفەتانه بۆ خوای گەورە بڕیار دەدرێن که خوای گەورە بۆ خۆی بڕیاری داوە بەبێ ئەوەی چۆنیەتیی و شێوەکەی دەستنیشان بکرێت. و بەبێ لادان و پەکخستنی سیفەتەکان، هەروەها ئەو شتانەش بۆ خوای گەورە بڕیار نادرێن که خوای گەورە بۆ خۆی بڕیار نەداوەو بەبێ ئەوەی لادان له ناو و ئایەتەکاندا بکرێت./ لوامع الأنوار البهية ١/١٢٨-١٢٩.

ئیبن ئەبولعیز له (شرح العقيدة الطحاوية) ئەم جۆره دابەشەی هێناوەو، باسی ئەوەشی کردووە که سیفەت لابەرەکان "نفاة الصفات" وەك جەهمی کوڕی صفوان و هاوڕاکانی سیفەت لابردنیان هێنایه ناو چواچێوەی خوابەیەکزانینەوە، وتیان: بڕیاردانی سیفەت بۆ خودا دەبێته هۆی بوونی چەند زاتێکی پێویسته بوون. إبن أبي العز: بەرپەرچی ئەم بۆچوونەی داوەتەوەو وتویەتی: ئەم بۆچوونه دیاره پوچەڵه، چونکه سەلماندنی زاتێکی بێ سیفەت ئەندێشه ناکرێت که بوونی دەرەکی هەبێت...

کۆمەڵێك دژی خوابەیەکگرتن نەبوون له پەروەردگاریێتی دا، لەلای کەسه دید تیژەکان به بەڵگەی دژیەکی "تمانع" ئەمه سەلمێنراوە. قورئانی پیرۆز ڕوونی کردۆتەوە که خوابەیەکگرتن له پەرستراوێتی دا خوا بەیەکگرتن له پەروەردگاریێتیش دەگرێته خۆی بەڵام به پێچەوانه نا، چونکه هاوبەشدانەرە عەرەبەکان بڕوایان به خوابەیەکگرتن هەبوو له پەروەردگاریێتی دا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ﴾ لقمان: ٢٥، واته: (سوێند بەخوا ئەگەر پرسیار له خوانەناسان بکەیت: کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، ئەوە به دڵنیاییەوە دەڵێن:"الله" دروستی کردوون). کەچی هەر بێ باوەڕ و هاوبەشدانەر بوون./ شرح العقيدة الطحاوية٢٤ ولاپەڕەکانی دواتر، شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب پشتی بەم جۆره دابەشه بەست.

پێچەوانەی ئەم سیفەتە: بریتییە لە فرەیی و زۆر بــوون لـــــە زات و سـیفات (لكـاو و جیا) و كردەوەدا بەجیا بوونە (انفصالا).

## بەڵگەی ڕەتكردنەوەی هەر پێنج چەندێتییەكان

**یەكەم: بەڵگەی ڕەتكردنەوەی چەندێتی لكاو لە زاتی خوادا:** (واتە: خوای گەورە پێك نەهاتووە لە چەند بەشێكی لێكدراو).

ئەگەر خوای گەورە لە چەند بەشێك پێك هاتبوایە، ئەوا ئەو كاتە پێویستی بەو بەشانە دەبوو كە لێی پێكهاتووە و پێویستی بەوەش دەبوو كە ئـەو بەشـانەی پێـك هێنـاوە، جـا

ژمارەیەكی زۆری زانایان ئەم جۆرە دابەش كردنەی خوابەیەكزانینیان ڕەت كردەوە، وەك: شێخ ئەحمەدی كوڕی زەینی دەحلان، لە كتێبكەیدا (الدرر السنية في الرد على الوهابية. فتنة الوهابي. أدلة جواز التوسل بالنبي (صلى الله عليه وسلم)). وشێخ "عەبدوڵای كوڕی عەلوی حەداد" لە: (مصباح الأنام) و ئیبراهیم ڕوفاعی ڕاوی لە: (الأوراق البغدادية في الحوادث النجدية). و ئەمینی حەق مەولانا شای فەزڵی ڕەسول لە كتێبەكەیدا: (سيف الجبار المسلول) و داودی كوڕی سلەیمانی بەغدادی لە كێبەكەیدا: (المحنة الوهبية في رد الوهابية)، جگە لەوانەش. ئەم كتێبانە لە چاپ دراون، كتێبخانەی حەقیقەت لە ئەستەنبۆڵ وێنەی لەبەر گرتۆتەوە.

هەندێك لەو شتانەی ئەو زانایانە باسیان كردووە كە دژی ئەم جۆرە دابەشەن ئەوەیە: ئەم جۆرە دابەشە پاڵی بە وەهابییەتەوە نا كە موسڵمانان تەكفیر بكەن، هیچ جیاوازییەك نیە لە نێوان خوابەیەكزانین لە پەرستراوێتی و پەروەردگارێتی دا، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ﴾ الأعراف: ١٧٢. واتە: (من پەروەردگاری ئێوە نیم؟). نەی وتوە: من پەرستراوی ئێوە نیم. تەنها باسی خوابەیەكزانین لە پەروەردگارێتی دا بۆ ئەوانی كردووەو بەس، جا هەر كەسێك دانی نا بە پەروەردگارێتی دا ئەوا دانی ناوە بە خوابەیەكزانین لە پەرستراوێتی دا، چونكە پەروەردگار جیا نیە لە پەرستراو، بەڵكو خودی خوای پەرستراوە. لە فەرموودەشدا هاتووە: (دوو فریشتە لە گۆڕدا لە بەندە دەپرسن: پەروەردگارت كێیە؟) نەیان وتوە: پەرستراوت كێیە؟ هەر دوو جۆری خوا بەیەكزانین لە پەرستراوێتی و پەروەردگارێتی دا یەك شتن. ئەو شتەی كافرو هاوبەشدانەرەكانی خستووەتە ناو كوفر تەنها ئەم وتەیە نیە: ﴿ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰ ﴾الزمر:٣. واتە: (ئێمە ئەو بت و شتانە نا پەرستنین تەنها لەبەر ئەوەی لە خوا نزیكمان بخەنەوە)./ الدرر السنية لأحمد بن زيني دحلان٣٧-٣٩.ئاماژەمان بۆ هەندێك لەوشتانە كرد لەكاتی قسەكردن لەسەرمەزهەبی سەلەفیەت.

لەوکاتەدا خوای گەورە دەبێتە پەیدابوو، بێگومان ئەمەش گریمانەیەکی پوچەڵە، لەبەر ئەوەی پێشتر ئەوەمان سەلماند، کە خوای گەورە پێچیەوانەی پەیدابوانە[1].

**دووەم: بەڵگەی ڕەتکردنەوەی چەندێتی جیا لە زاتی خوادا:** (خوای گەورە تاك و تەنهایە و هیچ هاوشێوەو هاوبەشی نییە کە بەشدار بێت لەگەڵیدا لە بەڕێوەبردنی بوونەوەردا).

ئەگەر خوای گەورە تاك و تەنها نەبووایە ئەوا دەبوایە زۆر خوا هەبوویان، بەوەی دوو خوا یان زیاتر هەبوویان، ئینجا ئەگەر دوو خوا یان زیاتر هەبوویان ئەوا یان دەبوایە کۆك و تەبابویان لەگەڵ یەکدا یاخود ناکۆك و دژیەك دەبوون:

١- ئەگەر هەر دووکیان کۆك بوویان[2] لەسەر بەدیهێنانی شتێك، بۆ نمونە:

أ- ئەوا یان بەیەکەوە ئەو شتە بەدیدێنن، ئەو کاتە پێویست دەبوو کە دوو هێزی کاریگەری تەواو کۆببنەوە لەسەر یەك شوێنەوار، بێگومان ئەمە پوچەڵە.

ب- یان ئەوەتا بە ڕیزبەندی بەدیبهێنن (بەوەی خوای یەکەم لە سەرەتادا بەدی بهێنێت و خوای دووەمیش دووبارە هەمان شت بەدی بهێنێتەوە)، ئەو کاتیش بەدەستهێنانی هەمان ئەنجام (تحصیل حاصل) دێتە کایە، شتێکی بەڵگە نەویستە کە ئەم گریمانەیە پوچەڵیەکەی دیارە.

پ- یان ئەوەتا یەکێك لە خواکان شتەکە بەدی دەهێنێت، لەوکاتەدا بەدیهێنەرەکە دەبێتە خوا و ئەوەی دووەم خوا نییە بەڵکو پوچەڵە.

---

[1] شرح المقاصد للتفتازانی ٣١/٤ وشرح الخریده للدردیر ٥٩.

[2] اللامشي لە: التوحید ٥٢، دەڵێت: (ئەگەر کۆك بن لەسەر دروست کردنی شتەکان، ئەوا ئەم کۆك بوونە یان بەڵگەی دەستەوەسانی هەر دووکیانە یاخود بەڵگەی دەستەوەسانی یەکێکیانە، چونکە ئەو زاتەی کە بکەرەو سەرپشکە لە کارەکانیدا تەنها لەو کاتەدا کۆك دەبێت لەگەڵ ئەوەی تردا کە دەستەوەستان و ناچار کراو بێت، زاتی دەستەوەستان و لاواز هەرگیز شیاو نییە ببێت بە خودا).

ت- یان ئەوەتا هەر یەك لە دوو خوا بەشێك لە شتەكە بەدی بێنن، ئەو كاتیش دەستەوەسانی و بێ توانایی دەدرێتە پاڵ هەردوو خوا، چونكە كاتێك توانای یەكێكیان تایبەت دەبێت بە بەشێك ئەوا دەبێتە ڕێگر لە بەردەم ئەوەی خواكەی تر توانای بەسەر ئەو بەشەدا بچێت، واتە هەر یەكەیان تواناى بەسەر بەشەكەی خۆیدا دەشكێت و هیچ یەكیشیان ناتوانن كاریگەری لە بەشەكەی تر بكەن، بۆیە هیچ یەكێك ناتونێت ڕێگە لەوەی تر بگرێت، بێگومان ئەمەش بێ تواناییە، و هەموو ئەو گریمانانە پوچەڵن و ئەو ڕێگانەی كە سەریش دەكێشن بۆ ئەم گریمانانە بەهەمان جۆر پوچەڵن، بۆیە گریمانی بوونی دوو خوای كۆك و تەبا لە بنەڕەتدا پوچەڵە. ئەم بەڵگەیە پێی دەوترێت بەڵگەی هاودەنگی (برهان التوارد)، لەبەر دروستبوونی هاودەنگیان لەسەر شتەكە.

٢- ئەگەر هەردوو خوا ناكۆك بوون لەگەڵ یەكتر، بەوەی یەكێ بیەوێت جیهان بەدی بێنێت و ئەوەی تریش بیەوێت جیهان هەر بە نەبوویی بمێنێتەوە:

أ- یان ئەوەتا ویستی هەر دوو خوا بەیەكەوە جێبەجێ دەبێت، ئەو كات پێویست دەبێت كە دوو ئاراستەی تەواو دژیەك كۆببنەوە، ئەمەش شتێكی بەڵگە نەویستە كە پوچەڵە[١].

ب- یان ئەوەتا ویستی یەكێكیان جێبەجێ دەبێت، لەو كاتەشدا ئەوەی ویستەكەی جێبەجێ نەبووە ئەوا پێویست دەبێت كە بێ توانایی بدرێتە پاڵی، ئەوەی تریش بێ توانایی دەدرێتە پاڵی بەهۆی وێكچوونیان. لە (باقلانی و ئیبن رشد) هاتووە: ئەوەی فەرمانەكەی جێبەجێ بووە، ئەو خوایە و ئەوەیتر خوا نییە.

---

[١] لەبەر ئەوەی هاتنەجێ مەبەستی هەر یەكێك لە خواكان، دەستەوەسانی ئەوانی ترە، چونكە ئەو شتە لەلایەن خوایەكی تر هێنرایە بوون كە خۆی ویستی لەسەر نەبووە، لەمەشدا هەر دووكیان دەستەوەسانن، زاتی لاوازو دەستەوەسان خوا نییە./ الإنصاف للباقلاني ٩٢ والوسيلة ٤٨٤.

پ- ئەگەر ویستی هیچ یەکێکیان جێبەجێ نەبوو، ئەوا پێویستە بێ توانایی بدرێتە پاڵ هەر دوو خواکە، ئەو کاتە پێویست دەبێت کە دوو شتە دژیەکەکە بەیەکەوە لا بچن، ئەمەش بێ بنەماو پوچەڵە.

بۆیە هەموو ئەو شتانەش پوچەڵن سەربکێشن بۆ ئەمە کە بریتیە لە بوونی دوو خوای ناکۆك. ئەو بەڵگەیە پێی دەوترێت بەڵگەی تێکگیران (برهان التمانع)، بەهۆی تێکگیران و ناکۆك بوونیان.

جا کەواتە بوونی دوو خوای کۆك و تەبا یاخود ناکۆك و ناتەبا پوچەڵ بووەوە، دەبێت خوا تاك و تەنها بێت[1].

دەکرێ ئەم بەڵگەیە دەربڕین بەوەی ئیمامی غەزالی لە کتێبی (احیاء علوم الدین)دا وتویەتی: (﴿ لَوْ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَا ﴾ الأنبياء: ٢٢. واتە: (ئەگەر لە هەر دووکیاندا - لە ئاسمان و زەویدا- چەند خوایەکی تر هەبوایە غەیری (الله)، ئەوە کاول و وێران دەبوون و بەسەریەکدا تێکدەچوون). و شرۆڤەکەی بریتییە لەوەی کە ئەگەر دووبن - هەر یەکەیان خاوەنی سیفەتی خوایی بن، وەك ویست و توانای تەواو - و یەکێکیان ویستی لەسەر شتێك بێت: جا ئەگەر ئەوەی دووەمیش ناچاربوو یارمەتی ئەوەی یەکەم بدات، ئەوا دووەمەکە تێکشکاو بێ توانایە، و خوایەك نییە کە بە توانا بێت، ئەگەر ئەوەی دووەم توانای سەرپێچی کردنی ئەوەی یەکەمی هەبێت و ویستەکەی ئەویتر جێبەجێ نەکات، ئەوا ئەو کاتە ئەوەی دووەم بە توانا و تێکشکێنەرە، و ئەوەی یەکەمیش لاواز و بێ توانایە بۆیە نابێت خوابێت)[2].

**سێیەم: بەڵگەی ڕەتکردنەوەی چەندێتی لکاو لە سیفەتەکانی خوادا:**

---

[1] شرح الجوهرة ١١٥ و المقاصد و شرحه للتفتازاني ٤/٣٥-٣٧. و شرح الخريدة للدردير وحاشية الصاوي عليه ٥٩-٦٠ والتمهيد للامشي ٥٢ وأصول الدين للغزنوي ٦٤ ونهاية الإقدام للشهرستاني ٩٢ والوسيلة ٤٨٤.

[2] إحياء علوم الدين ١/١١٣-١١٤. و المسامرة ٤٥ عن الغزالي.

ئەگەر خوای گەورە دوو سیفەتی لەیەك ڕەگەزدا هەبوو، بۆ نمونە وەك بوونی دوو توانا:
یان ئەوەتا یەك لەو دوو توانایە تەواو و کاملە، لەو کاتیشدا توانای دووەم بێ هـودە و بێ کەڵکە.

یان ئەوەتا هـەر دوو تواناکـە نـا تـەواون، بـێ هـودەیی و کـەم و کـورتی بـۆ خـوادا ئەستەمن.یاخود ئەوەتا هەر دوو توانا تەواو و کاملن، ئەو کات پێویست دەبێـت کـە دوو هێزی کاریگەر کۆببنەوە لەسەر یەك شوێنەوار، ئەمەش پوچەڵە، بۆیە گریمانی بـوونی دوو سیفەت لەیەك ڕەگەز شتێکی پوچەڵە.

**چوارەم: بەڵگەی ڕەتکردنەوەی چەندێتی جیا لە سیفەتەکانی خوادا:**

ئەگەر هەر شتێك جگەلە خوای گەورە سیفەتێکی هەبوو کە بە سیفەتی خـوا بچـێت، ئەوا ئەو کاتە خوا بە پەیدابووەکان دەچوو. ئەگەر بە پەیدابوان بچێت ئەوا دەبێـت خـواش پەیدا بووبێت.

ئەگەر پەیدابوو بێت پێویستی بـە پەیداکـەرێك هەیـە، پەیداکەرەکـەی پێویسـتی بـە پەیداکەر هەیە... بەم شـێوەیە ئـەو کاتـە پێویسـتە گریمانـەی خـولی (دور) و زنجیرەیـی (تسلسل) ڕوودات، کە هەر دووکیشیان پوچەڵن.

بەم پێیە ئەو وتەیە پوچەڵ دەرچوو کە دەڵێت سیفەتی هاوشێوەی سیفەتی خوای گەورە بوونی هەیە.

**پێنجەم: بەڵگەی ڕەتکردنەوەی چەندێتی جیا لە کردەوەکانی خوادا:**

ئەگەر کردەوەیەك لە کردەوەکان هەبێت هی جگە لە خوای گەورە - وەك بـەدیهێنان و لەناوبردن - ئەوا دەبووە هاوەڵ و هاوبەشـی خـوا، بـوونی هاوبـەش بـۆ خـوا ئەسـتەمە، هەروەك پێشتر خرایە ڕوو لە باسی ڕەتکردنەوەی چەندێتی جیا (الكم المنفصـل) لـە زاتـی خوادا[1].

---

[1] ئەبو ئیسحاقی ئیسفرایینی وتویەتی: ڕاستڕەوان (أهل الحق) کۆکن لەسەر ئەوەی کە بۆچوونی زانایانی کەلام لەبارەی خوابەیەکزانین لەسەر دوو شت وەستاوە: یەکەم: بڕوا بوون بەوەی هەر لە بیردا وێنا بکرێت ئەوا خوای گەورە پێچەوانەیەتی، دووەم: زاتی خوای گەورە هاوشێوەی هیچ

**بەڵگەی نەقڵی لەسەر تەنهایی خوای پاك و بێ وێنە:**

- ئەو فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ ﴾ الإخلاص: ١ - ٤. واتە: ("ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)، ئەی ئیماندار" بڵێ: ئەو خوایەی کە ناوی - الله- یە خوایەکی تاك و تەنهایە "بێ هاوەڵ و هاوتایە". خوا زاتێکی پایەدارو دەسەڵاتدارە، نیازی بەکەس نییە هەمووان ئاتاجی ئەون، هەر ئەو دەتوانێت بەڵاو ناخۆشی لابەرێت و پێویستی و داخوازیەکانمان جێبەجێ بکات. هیچ کەسی لێ نەبووەو لە کەسیش نەبووە، هەرگیز هاوتاو هاوشێوەو دەسەڵاتدارێکی تر نییە کە لە بەرامبەریەوە بوەستێت و هاوشانی بێت).

- ﴿ وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ البقرة: ١٦٣. واتە: (خوای ئێوە خوایەکی تاك و تەنهایە، جگە لەو زاتە خوایەکی تر نییە، هەر ئەو خوایەش بەخشندە و میهرەبان و بەبەزەییە).

زاتێکی تر نییە و بێ سیفەت نییە. سورەتی (الإخلاص) بەسە وەك بەڵگە، چونکە سورەتی ناوبراو هەر هەشت بنچینەکانی کوفری پوچەڵ کردۆتەوە:

فرەیی بە مانای پێکهاتەی لێکدراو و ژمارە، بۆ خوای گەورە بەم فەرمایشتە ڕەتکرانەوە: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾ الإخلاص: ١. واتە: (ئەو خوایەی کە ناوی - الله -یە خوایەکی تاك و تەنهایە "بێ هاوەڵ و هاوتایە").

کەم و کورتی بە واتای پێویستی پێ بوون، هەروەها کەمی بە مانای سادەیی، بەم فەرمایشتەی خوای گەورە ڕەت کراونەتەوە: ﴿ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴾ الإخلاص: ٢. واتە: (خوا زاتێکی پایەدارو دەسەڵاتدارە، نیازی بەکەس نییە هەمووان ئاتاجی ئەون، هەر ئەو دەتوانێت بەڵاو ناخۆشی لابەرێت و پێویستی و داخوازیەکانمان جێبەجێ بکات).

هۆو ئەنجام، بەم فەرمایشتەی خوای گەورە ڕەتکراونەتەوە: ﴿ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴾ الإخلاص: ٣. واتە: (هیچ کەسی لێ نەبووەو لە کەسیش نەبووە).

هاوشێوەو هاووێنەی نییە بەم فەرمایشتە: ﴿ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌ ﴾ الإخلاص: ٤. واتە: (هەرگیز هاوتاو هاوشێوەو دەسەڵاتدارێکی تر نییە کە لە بەرامبەریەوە بوەستێت و هاوشانی بێت)./ حاشية الصاوي على الدردير ٦٠. وشرح الجوهرة للباجوري ١١٨.

- ﴿ وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۖ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ ﴾ محمد: ١٩. واته: (ئەی ئینسان!! دەی کەواتە چاك بزانە و دڵنیابە جگەلە خوا، هیچ خوایەکی تر نییە).

- ﴿ لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا ﴾ الأنبياء: ٢٢. واته: (ئەگەر لە هەر دووکیاندا (لە ئاسمان و زەویدا) چەند خوایەکی تر هەبوایە غەیری - الله -، ئەوە کاوڵ و ویران دەبوون و تێکدەچوون بەسەر یەکدا).

- ﴿ مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾ المؤمنون: ٩١. واته: (هەرگیز خوا کەسی نەکردووە بە ڕۆڵەی خۆی و هیچ خوایەکی لەگەڵدا نییە، چونکە ئەو کاتە هەر خوایەك دەچوو بەلای دروستکراوەکانی خۆیەوە و هەندێکیان خۆیان بڵند دەکرد بەسەر هەندێکی تردا (ئەوسا بوونەوەر تێکدەچوو)، پاکی و بێگەردی بۆ زاتی خوایە لەبەرامبەر ئەو شتانەوە کە "خوا نەناسان" هەڵی دەبەستن و دەیڵێن).

* * *

### ٣- سیفەتە واتاییەکان :

بریتین لە حەوت سیفەت: توانا (القدرة)، ویست (الارادة)، ژیان (الحیاة)، بیستن (السمع)، زانست (العلم)، بینین (البصر)، دوان (الکلام) [1].

---

[1] ماتوریدییەکان سیفەتێکی تریان بۆ سەر ئەو حەوت سیفەتە زیاد کردووە کە بریتیە لە سیفەتی بەدیهێنان (تکوین)، مەبەستی ماتریدیەکان لەمە: سیفەتێکی بێ سەرەتا و لە مێژینەی خوایە و پەیوەستە بە زاتی پیرۆزییەوە، بەڵام ئەگەر ئەم سیفەتە پەیوەست بوو بە بوونەوە ئەوا بە هێنانە بوون (إیجاد) ناودەبرێت، ئەگەر پەیوەستیش بێت بە نەبووەوە بە لە ناوبردن (اعدام) ناودەبرێت، ئەگەر بە ژیانەوە پەیوەست بێت بە ژیاندن (إحیاء) ناودەنرێت، بەم شێوەیە سیفەتەکانی کردار لەلای ماتریدییەکان کۆنن، چونکە دەچنە خانەی پێکهێنانەوە (تکوین) کە ئەویش بێ سەرەتا و لەمێژینەیە. بەڵام ئەشعەرییەکان ئەمەیان ڕەت کردۆتەوەو وتویانە سیفەتەکانی کردەوەکان: بریتین

مەبەست لەوەی ئەوانە سیفاتی واتایین: هەر یەك لـەم سـیفەتانە واتایـەکی پەیوەسـتە بەزاتی خوای پاك و بەرزەوە.

بۆیە ناونراوە سیفەتی زاتی: چونکە لێی جیا نابێتەوە.

کە دەوترێت بوونی (وجودی)ە: واتە بوونەکەی لە خودی خۆیدایە و بـێ سـەرەتایە وەك زانستی خوا یاخود پەیدابووە وەك زانستی ئێمە[1].

لەسەر ئەم بەشەیە کە موعتەزیلە و ئەشعەری و هاوڕاکانیان مشتومڕیان هەیە، بـەڵام لەسەر سـیفەتی خـودی (سـیفەتی بـوون) و سـیفەتە پێچـەوانەکان لـە نێـوان مەزهەبـە ناوبراوەکان ڕاجیایی نییە[2].

لەو پەیوەست بوونانەی کە جێبەجێ کاری ئەو فەرمانانەن کە پەیوەستن بە پەیدابوون./ شرح الجوهرة للباجوري ١٣٥.

واتە: سیفەتەکانی: بەدیهێنان، پەیداکرن، ڕۆزیدان، ژیاندن، مراندن، بەدبەخت کردن، خۆش بەخت کردن، وێنە کردن، جگە لەم سیفەتانە و سیفەتەکانی تری کردەوەش هەموویان لەلای زانا لێکۆڵەرەکانی ماتریدی یەك سیفەت پێك دێنن کە سیفەتی پێکهێنانە (تکوین)، کە لەم فەرمایشتەی خوادا ئاماژەی بۆ کراوە: ﴿ كُن فَيَكُونُ ﴾ یس: ٨٢. واتە: (ببە ڕاستەوخۆ شتەکە دەبێت). ئەم سیفەتە لەلای ماتریدییەکان لەمێژینە و بێ سەرەتایە. جیهان بە هەموو بەشەکانیەوە لە ڕێی ئەم سیفەتە هاتۆتە بوون. بەڵام ئەم سیفەتە ئەگەر بە بوونی شتێکەوە پەیوەست بوو بە بەدیهێنان ناودەنرێت، ئەگەر بە مردنی شتێك پەیوەست بوو بە مراندن ناودەبرێت، ئەگەر بەوێنەی شتێك پەیوەست بوو بە وێنەکردن ناودەبرێت، ئەم سیفەتە زیادە و جیاوازە لە سیفەتی توانا و ویست.

بەڵام لەلای ئەشعەرییەکان سیفەتی کردەوەکان پەیدابوو و بەدیهاتوون، چونکە بریتیە لە پەیوەست بوونی توانا بە توانراو (مقدور)./ شرح الخريدة للدردير وحاشية الصاوي عليه ٨٨-٨٩. سەیری بابەتی سیفەتی بەدیهێنان بکە لەم سەرچاوانە: شرح العقائد النسفية للتفتازاني ٩٦ وشرح الفقه الأكبر لعلي القاري ٤٢ وأصول الدين للغزنوي ١١٢.

[1] شرح الخريدة للدردير و حاشية الصاوي عليه ٧٠ و شرح الجوهرة للصاوي ١٦٥ و الوسيلة ٤٩١.

[2] شرح المقاصد للتفتازاني ٦٩/٤.

## مشتومڕ و کێشە لەسەر سیفەتە واتاییەکان:

هەموو موسڵمانان بە فەیلەسوف و زانایانی کەلامەوە، کۆکن لەسەر ئەوەی خوای گەورە یەکە و تاکە، خاوەنی هەموو ئەو سیفەتانەیە کە تەواو و کامڵن و پەیوەستن بەزاتی خوای پاك و بەرزەوە، ئەو سیفەتانەش کە خوای گەورە خۆی پێ وەسف کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕاجیا بوون لە ڕاڤە کردنی سیفەتە واتاییەکان، بۆ دوو بۆچوون:

**ڕای یەکەم:** ڕای زۆربەی ئەشعەرییەکان[1] و ماتوریدیەکانە[2]، کە بریتییە لەوەی:

خوای گەورە بیسەرە بەو سیفەتەی کە ناو دەبرێن بە بیستن (سمع)، بینەرە بەو سیفەتەی کە ناو دەبرێت بە بینین (بصر)، جا بەم شێوەیە لە تەواوی سیفەتەکانی تر خوای گەورە زانایە بە سیفەتی زانین (علم)، بەتوانایە بە سیفەتی توانین (قدرة)، دەدوێت بە سیفەتی دوان (الکلام)، زیندووە بە سیفەتی ژیان (حیاة) [3].

ئەم سیفەتانە:

١- بێ سەرەتان، واتە: پەیدابوو نین، چونکە خوای پایەبەرز پێویستە بوون (واجب الوجود)ە، بۆیە شتی پەیدابوو بە خودی خۆی ڕاوەستاو و بێ نیاز نییە.

٢- ڕاوەستاون بە زاتی خواوە، واتە: بوونێکی دەرەکی سەربەخۆ نین و جیابووەوە نین لە زاتی خوا.

٣- ئەو سیفەتانە شتێك نین غەیری زاتی خوای گەورە، خودی زاتی خوای گەورەش نین، بەڵکو زیادن لەسەر زاتی خوای گەورە[4]. واتە: وێنا ناکرێت کە هەر یەکە لە زاتی

---

(1) المواقف ٨/٤٥ والمسايرة ٧٠ وشرح غاية المراد ٣٢.

(2) المقاصد وشرحه للتفتازاني ٤/٦٩.

(3) المواقف ٨/٤٥ وشرح المقاصد للتفتازاني ٤/٦٩ ومسايرة وشرحها المسامرة ٧٠ وشرح غاية المراد ٣٢.

(4) المسامرة ٧٠ و المواقف ٨/٤٤-٤٥. شرح المقاصد للتفتازاني ٤/٤٩. إبن أبي شريف لە: المسامرة ٧٢ وتویەتی: ناڵێین سیفەتەکانی خوا نە خودی خوان و نە غەیری خوان، (چونکە دوو شتی غەیری یەکتر بریتین لەوەی کە لە بووندا لەیەکتر جیان، بەشێوەیەك کە دەکرێت یەکێك هەبێت بەبێ بوونی ئەوەی تر).

پیرۆزی خودای گەورەو سیفەتەکانی یەکێکیان لەوەی تریان بترازێن لـە ڕووی بوونـەوە[1]، ئەگەرچی لە ڕووی واتا زات جیا بێت لە واتای سیفەت[2].

ئا بەوشێوەیە ئەمە نابێتە هۆی بوونی گریمانەی چەند خوایەك، چونکە لێك تـرازان لـە نێوان سیفەت و زاتدا نییە، هیچ گوێزرانەوەو هەڵوەشانەوەیەك لە نێوانیان دا نییە[3].

هەندێ لە بەڵگەکانیان، ئەمانەن:

١- خوای گەورە لە کتێبەکەی دا و لەسـەر زمـانی پێغەمبەرەکـەی ئـەو سـیفەتانەی پاڵداوەتە لای خۆی، و مەبەست لە واتای وشەی زانا (علیم) لە زماندا: بریتییە لەو زاتـە کە زانستی هەیە، واتای بەتوانا (قدیر): بریتییە لە زاتێـك خـاوەن توانـا بێـت.... تـاد، هەموو ئەو سیفەت و هاوەڵناوانەی کە داتاشراون. تەنانەت لەلایـەن زانایـانی زمانزانـەوە ئەستەمە: زانایەك هەبێت بەبێ زانست، هەروەك ئەستەمە زانست هەبێت بـەبێ زانـراو، ناشکرێت واتای هیچ یەکێك لەم وشانە ڕەت بکرێتـەوە مەگـەر بـە بەڵگەیـەکی عـەقڵی سەلمێنراو نەبێت، هیچ شتێکی وا دەست نەکەوت کـە شـیاوی گومـانیش بێـت چ جـای بوونی بەڵگە[4].

٢- ئەگەر سیفەتی زانست خودی زات بوایە، سیفەتی توانا خودی زات بوایە، هەروەك ئەوانی تر دەڵێن، ئەوا ئەوسا پێویست دەبو کـە سـیفەتی زانسـت خـودی سـیفەتی توانـا بوایە، هەردووکیان هەر یەك واتایان دەگەیاند، ئەمەش بێگومان پوچەڵە، هەمان حاڵـەت لەسەر هەموو سیفەتەکانی تریش جێبەجێ دەبێت، کۆمەڵانێك بانگەشەی ئەوەیان کردووە

---

[1] المسامرة ٧٢ و الصاوي على الدردير ٨٩.

[2] حاشية محمد محيي الدين عبدالحميد على المسامرة ٧٢.

[3] لەبەر ئەمە پێویست بوو کە نەصرانیەکان بەکافر دابنرێن، چونکە بڕوایان وابوو کە زات لەگەڵ سیفەت دوو شتی لەیەك جیان، دەکرێت گوێزرانەوەو لێکترازان لە نێوان زات و سیفەتدا ببێت./شرح رمضان أفندي على العقائد النسفية، استنبول ١٢٢-١٢٣، و حاشية الصاوي على الدردير ٨٩ و دراسات في الفرق ٢٤٠.

[4] المسامرة ٧١-٧٢.

که بریتین له خودی زاتی خوای گەوره[1].

٣- ئەگەر سیفەتی زانستی خوای گەوره خودی زات بوایه، ئەوا سیفەتی زانست - بۆ نمونه - دەبووه پێویسته بوون، پەرستراو، بەدیهێنەری جیهان، خاوەنی هەموو سیفەتێکی تەواو و کامڵ، بێ گومان ئەمەش پوچەڵه[2].

**ڕای دووەم:** ئەمە مەزهەبی موعتەزیلەکان[3]، فەیلەسوفەکان[4]، شیعەی ئیمامیەکان[5]، ئیبازییەکان[6]، جەهەمیەکانه[7].

که بریتییه له ڕەتکردنەوەی سیفەته زیادەکان جگه له زاتی خوا:

خوا زانایه بەزاتی خۆی بەبێ زانست، به توانایه به زاتی خۆی بەبێ هێز و توانا، بیسەره بەزاتی خۆی بەبێ بیستن... [8]، ئەوانه وتیان: تەنها یەك زات بێ سەرەتاو لەمێژینەیه و دروست نییه چەند زاتێك بەیەکەوه لەمێژینەو بێ سەرەتابن[9].

---

[1] المواقف و شرحه للسيد الشريف ٨/٤٦-٤٧.

[2] المقاصد و شرحه للتفتازاني ٤/٧٢ و٧٤ وشرح قاسم بن قطلوبغا على المسايرة ٧٢.

[3] المواقف ٨/٤٥ و٤٧ والمقاصد للتفتازاني ٤/ ٦٩ و٧٢ والإقتصاد في الإعتقاد للغزالي ٧٥ والمسامرة ٧١ وشرح قاسم بن قطلوبغا على المسايرة ٧٠-٧١ ومشارق أنوار العقول ٣٤٧/١ وشرح غاية المراد ٣١.

[4] الإقتصاد في الإعتقاد للغزالي ٧٥ والمواقف ٤٥/٨ والمقاصد للتفتازاني ٤/ ٦٩ و٧٢ والمسامرة ٧٠.

[5] المواقف ٨/ ٤٥ و٤٧ والمسامرة ٧٠ ومشارق أنوار العقول ٣٤٧/١ و تيايدا هاتووه: ئەمه ڕای هەموو شیعەکانه. و عقائد الإمامية ٣٩

[6] الموجز لأبي عمار ١٤٨/٢ ومشارق أنوار العقول ٣٤٧/١ وشرح غاية المراد ٣١ والبعد الحضاري ٢٢٩ و لاپەڕەکانی دواتر.

[7] التنبيه والرد ١٢١ و ١٢٥ و١٣٥.

[8] الإقتصاد في الإعتقاد للغزالي ٧٥ والمواقف ٤٥/٨ والمسامرة ٧١ والبعد الحضاري ٢٣٨.

[9] الإقتصاد في الإعتقاد للغزالي ٧٥ وحاشية محمد محيي الدين عبدالحميد على المسايرة ٧٠.

بەڵام موعتەزیله تێکگیران له مەسەلەی ڕەتکردنەوەی هەر دوو سیفەتی دوان و قسەکردن (كلام) و ویست (ارادة)، چونکه ئەو دوو سیفەتەیان به سیفەتی واتایی دانا به جیا له زاتەوه، و وا بۆی چوون که دوو سیفەتن پەیدابوو و بەدیهێنراون بەخودی خۆیان ڕاوەستاون - بەزاتی خواوه

ئەم بەڵگانەیان بۆ پشتگیری ڕای خۆیان هێناوەتەوە:

بوونی چەند شتێکی لەمێژینە و بێ سەرەتا - زات و سیفەت - بە یەکدەنگی کوفرە، بەم هۆیەش بوو حوکمی کوفر بەسەر نەصرانیەکاندا درا، کاتێ بڕوایان هێنا بە سێ زاتی لەمێژینەو بێ سەرەتا.

بەرپەرچی ئەم بەڵگەیە دراوەتەوە: بەوەی کە کوفرە ئەگەر بڕوا بهێنرێت بە بوونی چەند زاتێکی لەمێژینە و بێ سەرەتا، کوفر نییە کاتێ بوونی زاتێکی بێ سەرەتا و لەمێژینە دەسەلمێنرێت لەگەڵ بوونی چەند سیفەتێکی لەمێژینەی بێ سەرەتا[1].

---

ڕانەوەستاون - جا سیفەتی ویست شت بەدی دێنێت بەبێ بوونی شوێن، بەڵام سیفەتی دوان (کلام) لە جەستەی بێ گیاندا پەیدا دەکات، بۆیە بەو سیفەتە دەدوێت ./ بڕوانە: المواقف و شرحه ٤٩٣ و٤٩٦ و الاقتصاد في الاعتقاد ١٥٠ و ابن قطلوبغا ٧١ و شرح المقاصد ٩٤/١ و١٠٠. الاقتصاد في الاعتقاد.

بەڵام فەیلەسوفەکان تەنها لەبارەی سیفەتی کەلام تێکگیراون و مشتومڕیان هەیە، وتویانە: خوای گەورە قسەکەرو وتەبێژە، بەو واتایەی: لە زاتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) بیستنی چەند دەنگێکی ڕێکخراو بەدیدەهێنێت ئەمەش یان ئەوەتا لە نوستندا یاخود لە حاڵەتی بێ داریدا، و ئەو دەنگانە بوونێکی دەرەکیان نییە، هەروەك کەسی نوستوو کە هەندێ کەس ئەبینێت یان هەندێ دەنگ دەبیستێ کە لە دەرەوەدا هیچ بوونیان نییە، بەڵکو تەنها لەناو دەماغی نوستوەکەدا بوونی هەیە. بەرپەرچی ئەو ڕایە دراوەتەوە بەوەی:

أ- ئەگەر خوای گەورە بێژەرو قسەکەر بێت بە دوان و قسەکردنی کەسێکی غەیری خۆی، ئەوا ئەو کاتە پێویست دەبوو کە بجوڵێت و دەنگی هەبێت بە جوڵە و دەنگی غەیری خۆی، و ئەمەش مەحاڵە و شیاوی بوون نییە.

ب- ئەگەر زانیاری پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) گێڕایەوە بۆ سەر خەونی پڕوپوچ، ئەوا ئەو کاتە زانیاری و زانستەکەی نابێتە زانست و زانیاری، بەوهۆیەش دەبێت هەموو شەرع ڕەتکەینەوە، چونکە متمانەی پێ ناکرێت./ حاشیه محمد محیی الدین علی المسامره ٧٠-٧١ والاقتصاد في الاعتقاد ٧٨-٧٩.

[1] المواقف و شرحه للسید الشریف ٨/ ٤٧-٤٨ وتویەتی ئەمە بەرپەرچدانەوەی بەڵگەی موعتەزیلەکان و شیعەکانە. و المقاصد وشرحه للتفتازاني ٤/٨٠-٨٢ وشرح الخریدة للدردیر وحاشیة الصاوي علیه ٨٢-٨٣.

ئەگەر سیفەتەكان ڕەتبكرێنەوە ئەوا خوایەتی دەبێتە هزرو فیكرێكی ڕووتی بێ ناوەڕۆك، كە وەك ئەوە وایە هەر نەبوو بێت[1].

فەخری ڕازی وتویەتی: (ئەوەی خوا بە بەدیهێنراوان دەچوێنێت بت دەپەرستێت، ئەوەش كە سیفەتەكانی خوا ڕەت دەكاتەوە نەبوو دەپەرستێت).

ئیبن تەیمیە وتویەتی: (چەسپاندنی بوونی زیندووی زانای بەتوانای دانای بیسەری بینەر، بەبێ بوونی ژیان و زانست و توانا و دانایی و بینین و بیستن، بەربەرەكانێی عەقڵە وەك چەسپاندنی نوێژكەر بەبێ بوونی نوێژ، ڕۆژگر بەبێ بوونی ڕۆژوو و ڕاوەستاو بەبێ ڕاوەستان) [2].

سەید شەریفی جورجانی وێنەی مەزهەبی موعتەزیلە و هاوڕاكانیانی كردووە بەم وتەیەی خۆی: (ئەگەر وتت: چۆن ئەندێشەو تەصەوڕ دەكرێت سیفەتی شتێك بریتی بێت لە خودی حەقیقەتی شتەكە، لەگەڵ ئەوەی كە وەسفكراو و سیفەت خۆیان گەواهی دەدەن لەسەر جیاواز بوونیان؟ بەڕاستی ئەمە تەنها وتەیەكی خەیاڵاویە، ناكرێت بڕوای پێ بكرێت، وەك سەرجەم بابەتە خەیاڵاویەكانی تر، كە ناكرێت بڕوای پێ بكرێت؟ بۆیە پێویست ناكات هەڵسین بە هێنانەوەو خستنەڕووی بەڵگە لەسەر پوچەڵیەكەی.

دەڵێم: ئەوەی كە ئەوان باسیان كرد ماناكەی بریتی نییە لەوەی كە زاتێك هەیە و خاوەن سیفەتە و هەمووشیان یەكیان گرتووە، هەروەك تۆ وای بۆچوویت، بەڵكو مانای بریتیە لەوەی: كە زاتی خوا ئەوەی لێ ساز دەبێت كە بەهۆی زات و سیفەت بەیەكەوە ساز دەبێت. بۆ نمونە: زاتی تۆ ناتوانێت شتەكانت بۆ ئاشكرا بكات، بەڵكو پێویستی بە سیفەتی زانست هەیە، كە بەتۆوە ڕاوەستاوەو پەیوەستە، بە پێچەوانەی زاتی خوای گەورە

---

[1] دراسات في الفرق ٢٤٢ و٢٤٥.

[2] دراسات في الفرق ٢٤٢ و وتەكەی ڕازیشی تێدایە. د. عیرفان عەبدولحەمید لە پەڕاوێزی ٢٤٦ ئەم وتەیەی (ئیبن تەیمیە)ی هێناوە كە وەریگرتووە لە كتێبەكەی (النبوات ٤٢) و ڕوونكردنەوەی لەسەر داوە: جیاوازی لە نێوان ڕەتكردنەوەی ڕووتی سیفەت لەلایەن فەیلەسوفەكان كە سەردەكێشێت بۆ لەكارخستنی تەواوی ئەو سیفەتانە، لەگەڵ ڕەتكردنەوە میانڕەوەكەی موعتەزیلەكان، كاتێك وتویان سیفەتەكان خودی زاتی خوان و جیا نین.

که بۆ ئاشکرا کردنی شتەکان و دەرخستنیان پێویستی بە سیفەتێك نییە کەبە زاتی ئەوەوە پەیوەست بێت، بەڵکو هەموو واتاکان بەگشتی لە پێناو زاتی ئەو ئاشکران، جا بەم پێیە زاتی خوا دەبێت بریتی بێت لە حەقیقەتی زانستەکەی، بەهەمان شێوە تواناکەی دەبێت بریتی بێت لە خودی زاتی خوا، کەواتە زاتی خوای گەورە کارتێکەرو کاریگەر بێت بە خودی زاتەکە، نەوەك بە سیفەتێکی زیادی جگەلە زات، هەروەك ئەمە لە خودی ئێمەدا هەیە جا بەم دانانە دەبێت توانا خود وحەقیقەتی زات بێت، بەم پێیە دەبێت زات و سیفەتەکان لە حەقیقەت دا یەکگر و ئاوێتەبن، و بە واتا و چەمك لەیەك جیابن، و سەرچاوەی ئەمە ئەگەر بێتەجێ: دەگەڕێتەوە بۆ ڕەتکردنەوەی سیفەتەکات و لەگەڵ هاتنە کایەی بەرهەم و دەرەنجامەکانی سیفاتەکان تەنها لە زاتدا)[1].

**پێم وایە:** ئەو ڕاجیاییە لە نێوان تاقمە ئیسلامیەکان بەوە کۆتایی دێت کە دان دەنێن بە یەکتایی خوای گەورە و پاك و بەدوور گرتنی لە هەموو ئەو شتانەی کە شیاوی ئەو نین. ئەم ڕاجیاییە سەر ناکێشێت بۆ تەکفیر کردنی هیچ یەکێك لە تاقمەکان.

بەڵام سیاسەتی موعتەزیلە لە سەردەمانی (مەئمون و موعتەصیم و واسیق)، ئاراستەیەکی توندی وەرگرت دژی دژەڕاکانیان، بەمەش درزی ڕاجیایی لە نێوان هەر دوو لا زیادی کرد.

بەڵام کاتێك مەشخەڵەکان ڕووناك بوونەوە، گوفتارەکان لە یەکتر جیاکرانەوەو پاڵفتە کران، دەروونەکان ئارام بوونەوە، زانایانی کەلام ڕایان گەیاند کە ئەم ململانێیە نابێتە هۆکاری تەکفیر کردنی هیچ لایەك.

ئیمامی (دەوانی لە حاشیەکەیدا لەسەر (العقائد العضدية) دەڵێت: (بزانە مەسەلەو بابەتی زیاد بوونی سیفەت و زیاد نەبوونی لەو بابەتانە نییە کە بەهۆیەوە تەکفیری یەکێك لە لایەنەکان بکرێت. گوێم لە هەندێ لە پیاوچاکان و دەروون سازو پاکەکان بووە کە وتویانە: لەلای من بابەتی زیاد بوون یان زیاد نەبوونی سیفات، پەیی پێنابردرێت مەگەر

---

[1] شرح المواقف ٤٧/٨.

بەهۆی دەرکەوتن و کەشف نەبێت، هەر کەسێ ئەم بابەتە بداتە پاڵ غەیری کەشف، ئەوا ئەو شتەی بۆ دەردەکەوێت کە زاڵبووە بەسەر تێڕوانینن و هزرو فیکریەکەی، من هیچ زیانێك نابینم لەو مەسەلەیەدا لەوەی چ ڕەت بکاتەوە یان بیچەسپێنێ)[1].

تەنانەت پێشەوا (موحەممەد عەبدە) ڕێگری کردووەو فەرمانی کردووە بە خۆ دوورگرتن لە خۆ هەڵقورتاندن لەو بابەتەدا، چونکە لێکۆڵینەوە لەو بابەتەدا لە مەبەستی شەرع دوورە، لەوبارەوە وتویەتی:

(سەبارەت بە بابەتی زیادبوونی سیفات لەسەر زات.... کە یەکێکە لەو بابەتانەی دروست نییە موسڵمان لێی قوڵ ببێتەوە، چونکە عەقڵی مرۆڤەکان ناتوانن پێی بگەن، بەڵگە هێنانەوەش لەسەر هەر بەشێکی ئەم بابەتە بە وشەو بێژەی هاتوو لاوازی عەقڵ دەسەلمێنێت و فریودانە بە شەرع، چونکە بەکارهێنانی زمان تەنها لە لایەنی حەقیقی دا کورت هەڵنایەت، چونکە ئەگەر لەو لایەنەدا کورت بوبایەوە ئەوا بارودۆخی زمان ڕەچاوی بوونەوەرەکانی نەدەکرد بە ناوەڕۆك و لایەنە شاراوەکانیان، بەڵکو ئەوانە ڕێبازی فەلسەفین ئەگەر چاکترینیشیان تیایدا گومڕا نەبێت، ئەوا تاقمێك تیایدا نەگەیشتووە بەشتێکی دڵگیرو دڵنیاکەرەوە)[2].

زۆریش بەخێرایی بەسەر ئەو ڕاجیاییەدا تێپەڕین، تا بۆ خوێنەر ڕاستی وتەی ئیمامی (دەوانی) دەربکەوێت، شارەزای ڕێبازی زانایانی کەلامیش ببێت لە ڕاڤەکردنی سیفاتدا.

**هۆکاری سەرهەڵدانی کێشەو مشومڕ:**

توێژەران دوو ڕای جیاوازیان هەیە، لەبارەی هۆکاری سەرهەڵدانی کێشەو مشتومڕ لە سیفەتەکانی خوادا:

**یەکەمیان:** کێشە و مشتومڕ لەو بابەتە سەری هەڵدا بەهۆی کاریگەری بیانی و دەرەکی، بەڵام ڕاجیابوون لەسەر ئەم سەرچاوەیە، کە بەهۆی:

---

[1] حاشية الدواني على العقائد العضدية ١/٣٠٠-٣٠١. و بڕوانە: خير القائد ٤٥.

[2] رسالة التوحيد للشيخ محمد عبده ٥٢.

١- زانستی کەلامی مەسیحی بوو. بەتایبەتی لە ڕێگەی کتێبەکانی قەشەی دیمەشقی (یوحەننا)، بە بەڵگەی: بوونی ڕووی لێکچوون لە نێوان هزری مەسیحی و ئیسلامی، بەوەی زیاتر لە هزرێکیان پێك دەچێت لە چارەسەر کردنی ئەم کێشەیەدا، ئەوەی پشتی ئەم ڕایە دەگرێت:

ئەوەیە کە (شەهرستانی) وتویەتی لەکاتی بەرپەرچدانەوەی (ئەبو هوزەیلی عەلاف): (ئەگەر "ئەبو هوزەیل" ئەو سیفەتانە بچەسپێنێت وەك چەند ڕووێکی زاتی خوا، ئەوا ئەو بۆچوونەی بریتیە لە خودی سێ خواکەی نەصرانیەکان).

٢- جولەکایەتی، بەبەڵگەی:

وتەی موعتەزیلەکان، کە دەڵێن: (قورئان بەدیهێنراوە)، وەرگیراوە لە وتەی جولەکەکان، کە دەڵێن (تەورات بەدیهێنراوە).

ئیبن ئەسیر لە کتێبەکەیدا (الکامل) دەڵێت: (یەکەم کەس کە ئەو بیرۆکەیەی (قورئان بەدیهێنراوە)، بڵاوکردەوە (لوبەیدی کوڕی ئەعصەم) بوو، دواتر خوشکەزاکەی (تالوت) ئەو بیرۆکەیەی لێ وەرگرت، کتێبی نووسی لەبارەی قورئان بەدیهێنراوە. بۆیە یەکەم کەس بوو ئەمەی کردووە لە ئیسلامدا، جا ئەو (تالوت)ە بێ دین بوو، بۆیە بێ دینی بڵاو دەکردەوە).

ئیبن قوتەیبە باسی کردووە کە: (یەکەم کەس باسی ئەو بیرۆکەیەی کرد کە (قورئان بەدیهێنراوە) بریتی بوو لە (مغیرە)ی کوڕی (سەعید عیجلی)، و ناوبراو یەکێك بوو لە شوێنکەوتووانی (عەبدوڵای کوڕی سەبەئی جولەکە).

٣- فەیلەسوفەکان:

بەهۆی بوونی پەیوەندی هزری و فیکری لە نێوان فەیلەسوف و زاناکانی کەلام، بەتایبەتی لە نێوان موعتەزیلە و فەیلەسوفەکانی یۆنانی.

**دووەمیان:** ئەم کێشەو مشتومڕە وەك دەرەنجامێك سەریهەڵدا بەهۆی گەشەی هزری لەناو خودی ئیسلامدا، بە بەڵگەی ئەوەی:

١-کێشەکە سەرییهەڵدا بەهۆی گفتوگۆو دەمەتەقێی ئایینی، لەنێوان ڕیزەکانی خەواریجەکان ڕوویدا لەبارەی حوکمی ئەنجامدەری تاوانی گەورە، کە ئەمەش سەری کێشا بۆ لێکۆڵینەوە لە کێشەی بابەتی قەزاو قەدەر، دواتر کێشەو مشتومڕی سیفەتەکانی خوا.

٢- پابەندبوون و وابەستەبوون و وەرگرتنی سیفەتە خەبەریەکان کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون پیت بە پیت وەکو خۆیان، ڕاڤە کردنی ئەو سیفەتانە بە واتای ڕاستەقینە نەك خوازراو، ئەمەش گەشەی سەند لە کێشەیەکی زمانەوانیەوە بۆ کێشەیەکی فەلسەفی بە واتا زاراوەییەکەی[(١)].

**مێژووی کێشەو مشتومڕەکە:**

وتراوە: یەکەم کەس کە سیفەتەکانی خوای گەورەی ڕەت کردەوە (جەعدی کوڕی دیرهم) بوو، (جەهمی کوڕی صەفوان)یش ئەمەی لەوەوە وەرگرت، (جەعد) فیکرەی خۆی لەسەر دوو بنچینە دامەزراند، کە بریتین لە:

أ- لایەنی زمانەوانی: وتی: هاوێنە بوون (المماثلة) بریتییە لە: بەژداربوون لە ناو (إسم). دەیوت: خوای گەورە بە سیفەتێك وەسف ناکەم لە کاتێکدا دروست بێت غەیری خوای گەورە پێی وەسف بکرێت وەك: سیفەتی زیندوویی و زانایی و ویست.... بۆیە (جەهم) سیفەتی توانا و بەدیهێنانی دایە پاڵ خوای گەورەو بۆی چەسپاند، چونکە هیچ یەکێك لە بوونەوەر بەمانە وەسف ناکرێن.

٢- لایەنی فەلسەفی: (جەهم) جەبری بوو، بۆیە توانا و هێزی مرۆڤی نەفی کرد و نکۆڵی لێکرد، بڕوای وابوو کە مرۆڤ ناچارکراوە لە هەموو کارەکانی دا.

موعتەزیلەکانیش هاتن و سیفەتەکانی خوایان ڕەتکردەوە. (واصلی کوڕی عەتاء) کە بە شێخی موعتەزیلە دادەنرێت، یەکەم موعتەزیلی بوو کە سیفەتەکانی ڕەتکردەوە، وتی:

---

(١) دراسات في الفرق ٢٢٧-٢٣١. و ئاماژەی داوە بۆ: الملل والنحل للشهرستاني ٦٣/١ والكامل ابن أثير ٤٩/٧ و عيون الأخبار لابن قتيبة الدينوري ١٤٨/١.

(هەر کەسیّ بڕوای بەبونی واتا یان سیفەتێکی لەمێژینە و کۆن هەبوو ئەوا بڕوای وایە دوو خوا هەن)[1].

## سیفەتە واتاییەکان و پەیوەست بوونەکانی

سیفەتە واتاییەکان، حەوت سیفەتن: توانا (القدرة)، ویست (الارادة)، زانست (العلم)، ژیان (الحياة)، بیستن (السمع)، بینین (البصر)، دوان (الكلام).

واتای پەیوەست بوون: بریتییە لەوەی سیفەتەکە شتێك بخوازێت سەرباری پەیوەست بوون و ڕاوەستانی بەزاتی خواوە، وەك: سیفەتی زانست، دەخوازێت زانراو هەبێت، تا زانستەکەی پێی دەربکەوێت، سیفەتی ویست، دەخوازێت ویستراو هەبێت، تا پێی تایبەت بکرێت، سیفەتی توانا دەخوازێت توانراوێك هەبێت، تا لە میانەیدا پڕۆسەی بەدیهێنان و لە ناوبردن جێبەجێ ببێت، سیفەتی بیستن، دەخوازێت بیستراوێك هەبێت، سیفەتی بینین دەخوازێت بینراوێك هەبێت، سیفەتی دوان، دەخوازێت واتایەك، هەبێت تا مەبەستی دیاری بکرێت. بەڵام تەنها سیفەتی ژیان هیچ شتێکی زیاد ناخوازێت، بەڵکو تەنها بە زاتی خوای گەورە پەیوەستە، چونکە سیفەتی ژیان مانای چالاك بوونی کرداری پەیی بردن دەگەیەنێت بەو شتەی ژیانی تێدایە و ئەمەش پێویستی بەوە نییە پەیوەست بێت بە شتێکی ترەوە[2].

دەکرێت سیفەت بە شتی پێویست (واجب) و ئەستەم (مستحيل) شیاوی بوون (ممكن) پەیوەست ببێت، ئەمەش هەر دوو سیفەتی زانست و دوان دەگرێتەوە. یان سیفەتەکە تەنها بە شتی شیاوی بوون (ممكن) پەیوەست ببێت، ئەمەش هەر دوو سیفەتی توانا و ویست دەگرێتەوە. یاخود بە شتی پێویست (واجب) و شیاوی بوون (ممكن) پەیوەست ببێت، ئەمەش وەك سیفەتی بیستن و بینین[3].

---

[1] دراسات في الفرق ٢٣٢-٢٣٦.

[2] شرح الخريدة للدردير ٧٨-٨١ وحاشية الصاوي عليه، وشرح الجوهرة للصاوي ١٩٤-١٩٥.

[3] شرح الخريدة للدردير ٧٢ و شرح أم البراهين للسنوسي وحاشية الدسوقي عليه ٩٩.

### ١- توانا (القدرة)

سیفەتێکی بێ سەرەتا و هەر بووە، کە لە میانەیدا هەموو شتە شیاو بوونەکان بەدیدەهێنرێن و لەناویش دەبرێت[١].

پێچەوانەکەی بریتییە لە: دەسەوەسانی و بێ توانایی.

**بەڵگەی عەقڵی:**

أ- ئەگەر خوای گەورە خاوەنی توانا نەبێت، ئەوا دەبوایە بێ توانا بوایە.

ئەگەر بێ توانا بوایە، ئەوا هیچ شتێك لەو پەیدابوانە کە بە شێوەیەکی زۆر قەشەنگ و تووندو توکمە و ڕێك و پێك دروست کراون نەدەهاتنە بوون، بێگومان گریمانی نەبوونی ئەو پەیدابوانە پوچەڵە هەر بە بەڵگەی بینین[٢].

ب- خوای گەورە دروستکەرو لە مێژینەو بێ سەرەتایە، ئەم بەدیهێنراوانەی بەدیهێناوە، دروست بوونی بەدیهێنراو لە لایەن زاتێکەوە تەنها لە ڕێگەی توانا دەبێت، جا کەواتە توانا پێویستە بۆ خوای گەورە[٣]. هاتنە بوونی شتێکی پەیدابوو لەلایەن زاتێکی بێ سەرەتا تەنها لە ڕێگەی تواناوەیە.

پ- ئەگەر خوای گەورە بێ توانا بوایە، ئەوا بە کەموکورتی و کرچ و کاڵی وەسف دەکرا، بوونی کەموکوری بۆ خوا ئەستەمە.

ت- ئەگەر بێ توانا بوایە، ئەوا خوا کەموکورتی دەبوو، ئەگەر بە کەموکورتی وەسف کرا، ئەوا پێویستی بەیەکێك دەبوو کە کاملی بکات و کەم و کورتییەکانی نەهێلێت، تەواوکەرەکەی خۆیشی پێویستی بە تەواوکەرێك هەیە.... بەم شێوەیە

---

[١] شرح الدردير على الخريدة ٧٨.

[٢] بڕوانە: حاشية محيي الدين عبدالحميد على المسامرة ٥٨ وأصول الدين للغزنوي ٩٦ وشرح أم البراهين للسنوسي وحاشية الدسوقي عليه ١٦٧.

[٣] شرح الجوهرة للباجوري ١٢٢. المقاصد وشرحه ٤/٩٢-٩٥.

ئەو کاتە گریمانی خول (دور) و زنجیرەیی (تسلسل) خۆی دەسەپێنێت، بێگومان هەر دوو گریمانەکەش پوچەڵن.

**بەڵگەی نەقلی:**

ئەو فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾ البقرة: ١٠٩. واتە: (بێگومان خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە).

هەروەها دەفەرموویت: ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعْجِزَهُۥ مِن شَىْءٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا ﴾ فاطر: ٤٤. واتە: (وەنەبێت خوا هیچ شتێك دەستەوەسانی بکات لە ئاسمانەکان، یان لە زەویدا، چونکە بەڕاستی ئەو زاتە هەمیشە و بەردەوام زانایە و بەدەسەڵات و توانایە).

**پەیوەست بوونی سیفەتی توانا:**

١- سیفەتی توانای خوای گەورە تەنها پەیوەستە بە شتی شیاوی بوون (ممکن)، پەیوەست نییە بە شتی پێویست (واجب) و ئەستەم (مستحیل)[١]. واتە: سیفەتی توانای خودا تەنها کار لە شتی شیاو (ممکن) دەکات، چونکە شتی شیاو دێتە بوون و لەناو دەچێت، واتە: بوون و نەبوون پەسەند دەکات.

بەڵام شتی پێویست (واجب): هیچ کاریگەریەك پەسەند ناکات، چونکە هەیە و نەبوون پەسەند ناکات. بەهەمان شێوە شتی ئەستەمیش (مستحیل): هیچ کاریگەریەك قبوڵ ناکات، چونکە نەبووەو بوون پەسەند ناکات[٢].

---

[١] المسامرة ٦٢ وشرح الجوهرة للباجوري ١٢١. و سەیری ئەمانەش بکە: المواقف و شرحه للسيد الشريف ٨/٦٠ وشرح أم البراهين للسنوسي وحاشية الدسوقي عليه ٩٨.

[٢] شرح الجوهرة للباجوري ١٢١.

**ئەگەر کەسێك پرسیاری کرد:** ئایا خوای گەورە توانای بەدیهێنانی خوایەکی هاوێنەی خۆی هەیە؟ یان شتێکی لەو جۆرەو دەتوانێت کاریگەری دروست بکات لەسەر شتی پێویست (واجب) و ئەستەم (مستحیل)؟

**ئەمە وەڵامەکەیەتی:** ئەوەی تۆ وتت ئەگەر بە شێوەی پرسیاریش هاتبێ، کەچی لە ڕاستیدا پرسیار نییە، بەڵکو بریتیە لە ڕێکخستنی قسەیەکی بۆش و پوچ، چونکە ئەگەر خوای گەورە هاوەڵێکی بۆ خۆی بەدیهێنابوایە ئەوا ئەو هاوەڵە نەدەبووە پێویستە بوون (واجب الوجود)، چونکە نەبوون (عدم) پێش ئەو هاوەڵە کەوتۆتەوە.... جا ئەم پرسیارە وەك وتەی کەسێکە کە پێت بڵێت:

گەر سەخت نەبێت لەبەر خاتری من لەبەردەممدا ڕاوەستە و ونیش بە لەیەك ساتدا؟ جا ئەمە پرسارێکە هیچ واتا و سودێکی نییە، بەڵکو وەك گشت وتە بێ سەروبەرو تێکەڵ و پێکەڵەکانی ترە، قسەکەرەکە وتەیەکی وای نەوت کە وەڵامدانەوەی پێویست بێت، بەڵکو ئەندێشەیەکی خەیاڵاویە وەك پرسیاری منداڵێك وایە کە بۆش و بەتاڵە و هیچ مانایەکی نییە.

تەنانەت پرسیارکەرەکە پێویستی بەوە هەیە فێری ئەوە بکرێت کە شتی ئەستەم (مستحیل) و پێویست (واجب) و شیاو (ممکن) چییە، جا وەڵامی تۆ بۆ پرسیارەکە دەبێت فێرکردنی کەسێکی نەزان بێت نەك وەڵامدانەوەی پرسیارکەرەکە[1].

باجوری وتویەتی: بۆیە سەنوسی لە (شرح الصغری) زۆر بەتووندی هێرشی کردۆتە سەر (ئیبن حەزم) ڕەخنەی لێ گرتووە، لەسەر ئەو وتەیەی: کە وتویەتی خوای گەورە توانای هەیە کە منداڵێك بۆ خۆی بڕیار بدات، ئەگەرنا دەبوایە خوا بێ توانا بوایە[1].

---

[1] شرح الجوهرة للباجوري ٥٨ و سەیری ئەم ڕەخنە توونده بکە لە: شرح أم البراهين للسنوسي (العقيدة الصغرى) ١٠٤.

٢- سیفەتی توانا (القدرة) دوو جۆر پەیوەست بوونی هەیە:

أ- پەیوەست بوونێکی گونجاوی لەمێژینە و بێ سەرەتایە (تعلق صلوحي قديم). واتە: توانای خوای گەورە لە کۆن و بێ سەرەتاوە گونجاو بووە بۆ ئەوەی شتی شیاو بێنێتە بوون و لەناوی ببات، بەردەوام ئەو توانایەی هەر هەیە و گونجاوە لە کۆن و بێ سەرەتاوە بۆ ئەوەی بوونەوەر بێنێتە بوون و لەناویان ببات.

ب- پەیوەستبوونێکی جێبەجێکەری پەیدابووە (تعلق تنجيزي حادث). واتە: خوای گەورە شتی شیاو (ممكن) دێنێتە بوون و لەناوی دەبات و لە ژێر توانای ئەو دەرناچن[٢].

٣- سیفەتی توانا ئەرکی جێبەجێ کردنی ئەو شتەیە کە سیفەتی ویست (إرادة) دیاری کردووە، وەك هێنانەدی شتی شیاو (ممكن) لە نەبوونەوە بۆ بوون، ئەگەر سیفەتەکە ئاراستەکرا بۆ بەدیهێنانی، بەڵام ئەگەر ئاراستە کرا بۆ گۆڕینی لە بوونەوە بۆ نەبوون، ئەمەش ئەگەر سیفەتی ویست بڕیاری دا بێت[٣].

## ٢- ویست (الارادة)

سیفەتێکی هەربوو و بێ سەرەتایە، شتی شیاو (ممكن) تایبەت دەکات بە بەشێك لەو شتانەی کە دروست و ڕەوان بۆی، لە بوون یان نەبوون، ئەندازە و کات، و شوێن و ئاراستەکەی[٤]. (مشيئة)یش هەمان مانای هەیە[٥].

---

[١] شرح الجوهرة للباجوري ٥٨ و سەیری ئەم ڕەخنە توونده بکە لە: شرح أم البراهين للسنوسي (العقيدة الصغرى) ١٠٤.

[٢] شرح الجوهرة للباجوري ١٢٠-١٢١ وشرح السنوسي للباجوري ٦٣ ورسالة في التوحيد للطائي ٤٣٢.

[٣] رسالة في التوحيد للطائي ٤٧.

[٤] شرح الخريدة للدردير ٧٢.

[٥] شرح الجوهرة للباجوري ١٢٢. هەندێك کەس جیاوازی کردووە لە نێوان (إرادة) و (مشيئة)./ بڕوانە: شرح الفقه الأكبر لعلي القاري ٣٩.

پێچەوانەشی: زۆر لێکردن و ناچار کردن (الإكراه)، واتە: بێ ویستی[1].

**بەڵگەی عەقڵی:**

١- خوای گەورە سەرپشك بووە لە دروست کردوونی جیهان، هەر زاتێك سەرپشك بووبێت دەبێت خاوەنی ویست (إرادة) بووبێت، کەواتە پێویستە خوا خاوەن ویست (إرادة) بێت[2].

٢- ئەگەر خوای گەورە خاوەن ویست نەبوایە، ئەوە دەبوو ناچارکراو بوایە.

ئەگەر ناچارکراو بوایە، ئەوا بێ توانا دەبوو.

ئەگەر بێ توانا بوایە، ئەوا هیچ یەکێك لەم بوونەوەرانە نەدەبوون.

نەبوونی ئەو بوونەوەرانە هەر بە بەڵگەی بینین شتێکی پوچەڵە، بەم جۆرەی سەلمێنرا کە خوای گەورە خاوەن ویستە[3].

٣- ئەگەر خوای گەورە خاوەن ویست نەبوبا، ئەوە دەبوو ناچارکراو بوایە، پاڵدانی ناچار بوون بۆ لای خوا کەم و کورتییە، بێگومان ئەمەش پوچەڵە.

٤- ئەگەر خوای گەورە ناچار کراو بوایە ئەوا نەدەبوو خاوەن توانا بوبا، چونکە پەیوەست بوونی توانا بەستراوەتەوە بە پەیوەست بوونی سیفەتی ویست (واتە: مەبەست بۆ ئەنجامدانی کار)، کەواتە سیفەتی توانا پەیوەستە بەو شتەی کە سیفەتی ویست پێیەوە پابەند بووە.

**بەڵگەی نەقڵی:**

ئەو فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴾ البروج: ١٦. واتە: (هەرچی بیەوێت ئەنجامی دەدات، هەرچی بیەوێت کەس ناتوانێت بهێنێتە ڕێی).

---

[1] شرح الخريدة للدردير ٨٦.

[2] شرح الجوهرة للباجوري ١٢٤ و شرح المقاصد ١٢٨/٤.

[3] شرح الخريدة للدرير ٧٣.

خوای بێ وێنەدەفەرمووێت:﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ﴾ البقرة: ١٨٥. واتە: (خوا ئاسانکاری بۆ ئێوە دەوێت و نایەوێت "پەرستن و فەرزەکانتان" لەسەر قورس و گران بکات).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾ يس: ٨٢. واتە: (بێگومان هەر کاتێك فەرمانی خوا دەرچوو، ویستی شتێك جێبەجێ بکات و بهێنێتە دی، پێی دەڵێت ببە؟! ئەویش دەستبەجێ بێ دواکەوتن پێش دێت و ئەنجام دەدرێت و دروست دەبێت).

### پەیوەست بوونی سیفەتی ویست:

سیفەتی ویست وەك سیفەتی توانایە لە پەیوەست بووندا. کە تەنها بە: شیاو (ممكن) پەیوەست دەبێت نەك پێویست (واجب) و ئەستەم (مستحيل)[1].

---

[1] شرح الجوهرة للباجوري ١٢٣ وشرح أم البراهين للسنوسي وحاشية الدسوقي عليه ٩٨.
بەپێی قسەکەی: شیاوی بوون (ممکن) چاك و خراپ دەگرێتەوە، واتە: خوای گەورە ویستی لەسەر چاك و خراپ هەیە، بەپێچەوانەی بۆچوونی موعتەزیلەکان کە دەڵێن ویستی خوا لەسەر کاری ناشرین و خراپ نییە، واتە: خوا کاری چاکی دەوێت، بەڵام هی خراپی ناوێت./ شرح الجوهرة للباجوري ١٢٤. سەیری ئەمەش بکە: الإنصاف للباقلاني ١٥٢.
گێڕدراوەتەوە کە (قازی عەبدولجەباری هەمەدانی) یەکێکە لە شێخەکانی موعتەزیلە چووتە لای (صاحبی کوڕی عوبادە)، (صاحب) مامۆستا (ئەبو ئیسحاقی ئیسفرایینی) لا بووە کە یەکێکە لە ئیمامەکانی ئەهلی سوننە، کاتێك (قازی) مامۆستای ناوبراوی بینی وتی: پاك و بێ گەردی بۆ ئەو زاتەی لە شتی خراپ پاك و دوورە. ڕاستەوخۆ مامۆستا وتی: پاك و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی کە لە موڵك و ژێردەسەڵاتی ئەو چی بیەوێت هەر ئەوە ڕوودەدات. (قازی) وتی: ئایا پەروەردگارمان دەیەوێت سەرپێچی بکرێت؟ مامۆستا لە وەڵامدا وتی: ئایا خوای گەورە بە گوناهو سەرپێچی تێکدەشکێ و ناچار دەکرێت؟ (قازی) وتی: چی دەڵێت: ئەگەر خوا منی ڕێنموونی نەکرد و گومڕای کردم ئایا کارێکی چاك یاخود خراپی کردووە؟ مامۆستا وتی: ئەگەر لە شتێك قەدەغەت بکات کە هی خۆتە ئەوە کارێکی خراپی کردووە، ئەگەر شتێکیشی پێ نەدای کە هی خۆیەتی ئەوا خۆی ئەو کەسە دەستنیشان دەکات کە ڕەحمەت و بەزەیی خۆی پێدەبەخشێت. (قازی) بێ دەنگ بوو و دەمی وەك تەڵەی تەقیو لێهات./ شرح الجوهرة للباجوري ١١٤. چیرۆکەکە بە بەڵگە و

سیفەتی ویست دوو جۆر پەیوەست بوونی هەیە:

أ- پەیوەست بوونێکی شیاو و گونجاوی لەمێژینە و بێ سەرەتا (تعلق صلوحي قديم)، ئەوەش ئەوەیە کە ئەم سیفەتە هەر لە بێ سەرەتاوە گونجاوە بۆ بڕیاردان لەسەر شتی شیاو (ممكن) کە ببێت یان نەبێت، بڕیاری دەوڵەمەندی یان هەژاری بدات لەسەر فلانە کەس[1].

ب- پەیوەست بوونێکی جێبەجێ کاری لەمێژینەو بێ سەرەتایە (تعلق تنجيزي حادث). واتە: سیفەتی ویست (ارادة) لە کۆن و بێ سەرەتاوە لەباریدا هەیە پەیوەست ببێت بە تایبەت کردنی ڕووداوەکان بە کاتەکانیانەوە[2]، بەو سیفەتانەی کە شتەکە بەهۆیەوە پەیدا دەبێت لە دەرەوەدا[3].

جا خوای گەورە لە بێ سەرەتاوە: ویستویەتی کە تۆ ببیت، موحەممەدیش وەك نێردراوی خۆی ڕەوانە بکات.

---

دەربڕینەکانییەوە لە: شرح الفقه الأكبر لعلي القاري ٩٧، هاتووە. بڕگەی یەکەمی تا ئەم ڕستەیە: پاك و بێ گەردی بۆ ئەو زاتەی کە چی بیەوێت هەر ئەوە ڕوودەدات لە موڵك و بەدیهێنراوان و لەژێر دەسەڵاتەکەیدا، لە: شرح العقائد النسفية للتفتازاني ١١٤ وشرح المقاصد للتفتازاني ٢٧٥/٤.

(١) شرح الجوهرة للباجوري ١٤٤.

(٢) المسايرة ٦٤.

(٣) شرح الجوهرة للباجوري ٥٩/١.

مەبەست لە جێبەجێ کاری لە سیفەتی ویست بریتە لە تەواو پەیوەست بوونی سیفەتی ناوبراو بە شتێکی شیاو لە شتە شیاوەکان (ممكنات)، جا ئەو شتە شیاوە هاتبێتە بوون یاخود هێشتان نەهاتبێتە بوون، دەکرێ ویستی مرۆڤ پەیوەست بێت بە کارێك لە کارەکان، کەچی جێبەجێی ناکات و چەند ساڵێکی زۆر دوای دەخات، جا ئەمە پێی دەوترێت ویستی جێبەجێ کاری، واتە: تەنها گونجانی تەواو نیە، بەڵکو ئاراستە کردنێکی جێبەجێ کارییە بۆ مەبەستێکی دیاریکراو/ کبرى اليقينيات الكونية ١٢٦.

## ویستی خوا بە ڕەزامەندی خواوە پەیوەست نییە

ڕاڤەکاری (العقیدة الطحاویة) ئەوەی باس کردووە، کە ئەوەی ئەهلی سوننە و جەماعەت ڕایان لەسەرە ئەوەیە کە: خوای گەورە ویستی لەسەر ئەوەیە کە کەسی بێ باوەڕ کوفر بکات، بەڵام ڕازیش نییە بە کوفرو خۆشیشی ناوێت، جا کوفری دەوێت و ویستی لەسەرە وەك ڕێسایەکی بوون (کونی)، بەڵام وەك ئایین پێی ڕازی نییە[1].

---

[1] بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەو بابەتە چەند دێڕێك لە کتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت) دانراوی (م. علي باپیر) دەخەمەڕوو، کە بەڕاستی کتێبێکی ناوازەو بەهێزە، خوای گەورە پاداشتی بداتەوە بە چاکە، جا دانەر لە کتێبی ناوبراوا لە (بەرگی سێیەم ٣٩٨-٤٠٠) دەڵێت : (ئەم واقیعە و هەر واقیع و کارو کارەسات و ڕووداوی چاك یان خراپ هەر بەویستی خواو بەگوێرەی نەخشەو بەرنامەیەك کە خوا دایناوە دێنەدی، بەڵام هەر ئەو خوایەی کە ئەو یاسا سروشتیانە (القوانین التکوینیة)ی داناون کە بەپێی وان هەموو شتێك (چاك و خراپ) دێتەدی، هەمان خواش چەند یاسایەکی شەرعی (القوانین التشریعیة)ی داناون، کە فەرمانمان پێدەکەن ڕاپەڕێن و هەر واقیعێك و هەر دیاردەیەك کە لەگەڵ بەرنامەو شەرعی خوادا نەگونجاون لابەرین. ئینجا دەبێ بزانین کە ویست و ڕەزامەندی (الارادة و الرضی)ی خودا مەرج نیە هەموو دەمێ پێکەوە گونجاوو پەیوەست بن، بەڵکو جاری وایە لێك دەترازێن و دژی یەکدی دەوەستن، بۆ وێنە خوا لە قورئانێ دا دەفەرمووێ: (مەی مەخۆنەوە)، بەڵام ویستی وایە کە شەراب خۆرەکان بیخۆنەوە، لێرەدا ویست و ڕەزامەندی خوا لێك جودان! کەواتە: مەرج نییە هەر واقیعێك کە بەویستی خوا دروست بوو، بەپێی ڕەزامەندی خواش بێ، بەڵکو دەبێ بۆ ئەوەی داخۆ فڵان واقیع یان فڵان کردەوە خوا پێی ڕازییە یان نا، لە بەرنامەکەیدا بۆی بگەڕێین، چونکە بەرنامەو ئایینی خوا هەموو دەمێ لەگەڵ ڕەزامەندی دا پێکەوە جووتن و لێك ناترازێن. کەواتە پوختەی قسان: لەبەر ئەوەی خوا بەدیهێنەرو پەروەرگاری هەموو شتێکە، ناگونجێ هیچ شتێك بەبێ ویست و توانای وی دروست بێ و هەرچی پەیدا دەبێ چاك و خراپ هەر بەپێی ویستی خواو بەهۆی توانای وییەوەیە، بەڵام مەرج نییە هەرچی بەپێی ویستی خوا پەیدابوو، (خوای لێ ڕازی بێت).

بەپێویستی دەزانم بۆ پتر ڕوون بوونەوەی مەبەست وێنەیەك بێنینەوە (لە ژیانی ڕۆژانەماندا) بۆ چۆنیەتی لێك جوێ بوونی (ویست و ڕەزامەندی):

بابێك دوو کوڕی هەن پێیان دەڵێ: ڕۆڵەکانم ئەوە باڵغ بوون و لەمڕۆ بەدواوە پیاون و تەکلیفی شەرعیتان لەسەرە، جا داواتان لێدەکەم موسڵمانی چاك بن و بێفەرمانی خواو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مەکەن، هەر کامێکتان پیاوی چاك بێ و بێ فەرمانی خوا نەکات، با لە ماڵی مندا

قەدەرییەکان و موعتەزیلەکان لەمەدا ڕایان جیاواز بوو، بۆچوونیان وابوو کە خوای گەورە ویستویەتی کەسی بێ باوەڕ باوەڕ بێنێت، بەڵام کافرەکە کوفری هەڵبژاردووە، جا لەبەر ئەوە ئەو دوو تاقمە بۆ ئەم ڕایە چوون، تا نەڵێن: ویستی کافر کوفر هەڵبژێرێت و سزاشی دا لەسەر کوفرەکەی، جا ئەوانە وەك ئەو کەسەیان لێهات کە پەنای بۆ گەرمای ئاگر بردووە، لەبەر شتێك هەڵاتن تا ڕزگاریان ببێت کەچی کەوتنە ناو شتێکی خراپتر، بەپێی بۆچوونەکەی ئەوان ئەوا پێویست دەبێت کە ویستی کافرەکە زاڵ ببێت بەسەر ویستی خوای گەورە، خوای گەورە ویستویەتی باوەڕ بێنێت - بە پێی بۆچوونی ناوبراوان - بەڵام کافر کوفری هەڵبژاردووە، بەم جۆرە ویستی کافرەکە هاتەجێ و ویستی خوای گەورە نەهاتەجێ، ئەمەش خراپترین بیروباوەڕو بۆچوونە، وتەیەکی بێ بەڵگەیە، بەڵکو ئەمە پێچەوانەی بەڵگەیە[1].

عەمری کوڕی هەیسەم گراویەتیەوەو وتویەتی: لە کەشتیەکدا لەگەڵ کەسێکی قەدەری و یەکێکی ئاگرپەرست (مجوسی) گەشتمان کرد، جا قەدەریەکە بە ئاگرپەرستەکەی وت: موسڵمان بە. لەوەڵامدا ئاگرپەرستەکە وتی: تا خوا ویستی لەسەر نەبێت موسڵمان

---

بێنێتەوە، بەڵام هەر کامێکتان بێ فەرمانی و سەرخەری بکات و ڕێی خوارو خێچ و هەڵەت و هەڵدێر بگرێ، لێی تورە دەبم و لەماڵی خۆم وەدەری دەنێم، پاشان نەڵێن ئاگادار نەبووین و نەمانزانی!! پاشان دوای ماوەیەك یەکیان ڕێی چاکە و خواپەرستی گرت و یەکیشیان سواری کەری شەیتانی بوو و نەهاتە ژێربار، جا هەرچەندە بابەکە چەند جاری دیکەش ئامۆژگاری کرد و ئاگاداری کردەوەو ترساندی، بەڵام فایدێی نەبوو!! تا لە ئاکامدا بابەکە کوڕە بەدفەڕەکەی لە ماڵێ وەدەرنا!! جا سەرنج بدەین! بێگومان هەم مانەوەی کوڕە گوێڕایەڵ و موسڵمانەکە و هەم دەرکرانی کوڕە بەدفەڕو لاسارەکەش، هەردووکیان بەویستی بابەکە هاتنەدی، بەڵام دیارە بابەکە هەرچەندە لە مانەوەی کوڕە چاکەکەدا ڕەزامەندی هەبوو، بەڵام لە دەرکرانی کوڕە بەدکارەکەیدا ڕەزامەندی نەبوو، واتە مانەوەی کوڕە چاکەکەی پێ خۆش بوو، بەڵام دەرکرانی کوڕە بەدەکەی پێ خۆش نەبوو، کەواتە: ڕاستە جاری وایە ئینسان شتێك دەکات و ویستی لەسەر پەیدابوونی شتێکە، بەڵام پێی خۆش نییە و لێی ڕازی نییە!). بەکەمێك دەستکارییەوە (وەرگێڕ).

[1] شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٣٢١.

نابم. قەدەریەکە وتی: خوا ویستی لەسەرە، بەڵام شەیتان ویستی لەسەر نییە. ئینجا ئاگرپەرستەکە وتی: خوا ویستی و شەیتانیش ویستی بەڵام ویستی شەیتان هاتەجێ. بەڕاستی ئەو شەیتانە بەهێزە. لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: کە ئاگرپەرستەکە وتویەتی: من لەگەڵ بەهێزترینیانم.

عەرەبێکی دەشتەکی ڕاوەستا لەلای کۆمەڵێك خەڵك کە (عەمری کوڕی عەبید) لەناویاندا بوو، وتی: ئەی خەڵکینە، وشترەکەم دزراوە، بۆم لە خوا بپاڕێنەوە تا وشترەکەم بۆ بگەڕێنێتەوە. جا (عمروی کوڕی عبید) وتی: خوایەگیان تۆ ویستت لەسەر نەبووە کە وشترەکەی بدزرێت بەڵام وشترەکە هەر دزرا، خوایە داوات لێدەکەم بۆی بگەڕێنیتەوە. عەرەبە دەشتەکیەکە پێی وت: پێویستیم بە نزاو پاڕانەوەکەی تۆ نیە. وتی: بۆچی؟ وتی: دەترسم هەروەك چۆن خوای گەورە ویستی نەدزرێت بەڵام هەر درزا، بەهەمان شێوە خوای گەورە بیەوێت بیگەڕێنێتەوە بەڵام نەگەڕێتەوە[1].

سەرچاوەی ئەو گومڕاییەش بریتی بوو لە وەك یەك دانان و یەکسان کردنی ویست و خواست (الإرادة و المشیئة) و ڕەزامەندی و خۆشویستن (الرضا والمحبة)یە.

جا جەبرییەکان و قەدرییەکان ئەم چەمکانەیان وەك یەك دانا، دواتر ڕاجیاییان تێکەوت:

جەبرییەکان وتیان: هەموو بوونێك بە قەزاو قەدەری خوایە بۆیە خۆشەویستە و جێگای ڕەزامەندییە.

قەدەریەکانیش وتیان: لەبەرئەوەی تاوان و خراپە لەلایەن خوای گەورە خۆشەویست نین و مایەی ڕەزامەندی ئەو نین، بۆیە تاوان و خراپەکان بە قەدەرو قەزای خوا نین، کەواتە تاوان و خراپە لەدەرەوەی ویستی خوای گەورەن و خوای گەورە بەدییان ناهێنت.

---

[1] هەمان سەرچاوە ٣٢٣.

بەڵام ئەهلی سوننە و جەماعـەت جیاوازیـان کـردووە لـە نێـوان ویسـت (مشـیئة) و خۆشویستن (محبة)، چەند بەڵگەیەکیان هێناوەتەوە لەسەر ویست، وەك:

١- خوای پاك و بـەرز دەفـەرموویّت: ﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴾ الإنسـان: ٣٠، و التكوير: ٢٩. واتە: (ویستی ئێوەش نایەتەدی مەگەر کاتێك خـوای پـەروەردگاری جیهانیان بیەوێت).

٢- خـــوای گـــەورە دەفـــەرموویّت: ﴿ مَن يَشَإِ ٱللَّهُ يُضْلِلْهُ وَمَن يَشَأْ يَجْعَلْهُ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ الأنعـام: ٣٩. واتە: (بێگومان ئەوەی خوا بیەوێت گـومڕای دەکـات، و ئەوەش کە بیەوێت دەیخاتە سەر ڕێبازی ڕاست و ڕەوان).

٣- خوای بێ وێنە دەفەرموویّت: ﴿ فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ ۖ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِى ٱلسَّمَآءِ ﴾ الأنعـــــام: ١٢٥.[1] واتە: (جا ئەو کەسەی خوا بیەوێت هیدایەتی بدات، ئەوە سینەی سـاف و پاك و ئامادە دەکات بـۆ ئـایینی ئیسـلام، ئـەو کەسـەش خـوا بیــەوێت گـومڕای دەکات، ئەوە دڵی دەگوشێت و سنگی توووند دەکات و هەناسەی سوار دەبێت، هەر وەك ئەوەی بەرەو ئاسمان بەرز دەبێتەوە).

[1] سەرچاوەی پێشوو ٣٢٤.
واتای ئەم ئایەتە: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴾ ئەوەیە کە ئەگەر بەدیهێنراوان کۆببنەوە لەسەر ئەوەی تەنها یەك گەردیلە لە جیهاندا بجوڵێنن یاخود ڕایوەستێنن بەبێ ویستی خوا ئەوا ناتوانن کارێکی لەو شێوەیە بکەن، تەنانەت ناشتوانن پێچەوانەی ویستی خوا ڕەفتار بکەن، هەروەك خوای بێ وێنە دەفەرموویّت: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴾. خوای پاك و بێ گەرد هەروەك چۆن بێ سەرەتایە دەسپێکی نییە، بەهەمان شێوە خاوەن ویستێکی بێ سەرەتایە، هەر بەم سیفەتە بێ سەرەتاو دەسپێکەی ویستویەتی ئەم شتانە لەو کاتانەدا ببن کە بۆیان ئەندازە کراوەو دیاریکراوە، شتەکان لەو کات و ئەندازەی بۆیان دیاریکراوە، بێ پێشکەوتن و دواکەوتن هاتنەبوون./ شرح الفقه الأکبر لعلي القاري ٣٩. سەیری: العقیدة الطحاویة لإبن أبي العز ١٣٣ شتێکی نزیك لەوەی خرایەڕوو تیایدا هاتووە.

چەند بەڵگەیەکیان هێناوەتەوە لەسەر خۆشویستن و ڕەزامەندی، وەك:

١- خـــودای مـــەزن دەفـــەرموویت: ﴿ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْفَسَادَ ﴾ البقـرة: ٢٠٥. واتـــە: (بێگومان خوا فەسادو خراپە و تاوانی ناوێت).

٢- خوای بیٚ هاوەڵ و هاوبـەش دەفـەرموویت: ﴿ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ ﴾ الزمـر: ٧. واتە: (ڕازی نابێت کە بەندەکانی بیٚ باوەڕ بن و ڕێبازی خوانەناسی بگرن).

٣- ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە لەدوای ئەوە هاتووە کە ڕێگری کردووە لە هاوبـەش دانـان و سـتەم و کـاری خراپـە و خۆبـەزل زانـین: ﴿ كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكْرُوهًا ﴾ الإسراء: ٣٨. واتە: (هەموو ئەو شتانەی کە لە ئایەتەکانی پێشوودا باسمان کرد، خراپەکانی لای پەروەردگارت ناپەسەندو نابەجێیە).

٤- ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، کـە دەفـەرموویت: **(ان الله کـره لكم ثلاثاً: قيل و قال، وكثرة السؤال، و اضاعة المال)** واتە: خوای گەورە سـێ شـتی بۆ ئێوە بە ناپەسەند داناوە، قسەو قسـەڵۆك، و پرسـیاری زۆر، بـەفیڕۆدانی مـاڵ و سامان.

٥- پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویت: **(إن الله يحب أن يؤخذ برخصـه، كمـا يكره أن تؤتى معصيته)**[1] واتە: خوای گەورە پێی خۆشە ئەو شتانە ئەنجام بدەن کە مۆڵەتی پێداوە، هەروەك چۆن پێی ناخۆشە سەرپێچی ئەو بکەن.

[1] سەرچاوەی پێشوو ٣٢٥.
فەرموودەی: خوای گەورە سێ شتی بۆ ئێوە بە ناپەسەند داناوە... تاد: صحيح البخاري و صحيح مسلم وأحمد والدارمي وغيرهم.
فەرموودەی: خوای گەورە پێی خۆشە ئەو شتانە ئەنجام بدەن کە مۆڵەتی پێداوە... تاد: رواه أحمد و غيره بسند صحيح./ سەیری دەرهێنانی ئەم دوو فەرموودەیە بکە لە پەڕاوێزی: شرح العقيدة الطحاوية.

**ئەگەر وترا:** چۆن خوا ویستی لەسەر شتێك دەبێت، کەچی خۆشی ناوێت و پێشی ڕازی نییە؟ ئەی چۆن دەیوێت و پێکی دێنێت؟ و چۆن ویستی لەسەر ئەو شتە و ڕق لێ بوونەو پەسەند نەکردیشی بەیەکەوە کۆ دەبێتەوە؟ وەڵامی دەدەمەوە:

**وەڵام:** ویست دوو جۆرە: ئەو شتەی کە بە خودی خۆی ویستراوە، ئەو شتەی کە بە خودی خۆی ویستراو نییە.

ئەو شتەی کە بە خودی خۆی ویستراوە: ئەو شتەیە لە خودی خۆیدا خوشەویستە، هەموو ئەو شتانەی کە چاکن، جا ویستی مەبەست و ئامانجەکانە.

ئەو شتەی کە بە خودی خۆی ویستراو نەبێت: ئەو شتانەن کە دەکرێ بە خودی خۆیان ویستراو نەبن، کە تەماشای خودی شتەکە دەکرێت هیچ بەرژەوەندیەکی تێدا بەدی ناکرێت. ئەگەر هۆکارێك بێت بۆ مەبەست و ئامانجەکەی، ئەوا بە خودی خۆی ویستراو نییە، بەڵکو لەڕووی قەزای خوداو گەیشتن بە مەبەست و ئامانجەکەی ویستراوە. جا هەردوو شتەکە کۆ دەبنەوە: ڕق لێ بوونەوەو و ویستنی، ڕق لە شتێك بوونەوەو لەهەمان کاتدا ویستنی یەکتر ڕەت ناکەنەوە، چونکە لە ڕووی پەیوەست بوونەوە جیاوازن. نمونەی ئەمەش وەك دەرمانی نەویستراو و ناخۆشەویستە، ئەگەر دەرمان وەرگرەکە زانی کە چارەسەرو شیفاکەی لەو دەرمانەدایە، بڕینی ئەندامە داخوراوەکەی ئەگەر زانی بەو بڕینە لاشەکەی ساغ و سەلامەت دەبێت، بڕینی ڕێگایەکی سەخت و گران ئەگەر زانی دەیگەیەنێتە مەبەست و خۆشەویستەکەی.

تەنانەت کەسی عاقڵ ئەو شتە نەویستراو و ناخۆشە پەسەند دەکات، بە گومانە زاڵبووەکەی ئەگەر سەرەنجامەکەی لێ شاراوە بێت، ئەی چی دەڵێی بۆ ئەو زاتەی کە هیچ شتێکی لێ شاراوە نییە.

خوای گەورە کە ڕقی لە شتێکە مانای وا نییە کە ویستی لەسەر نەبێت وەك هۆکار بۆ هێنانەدی ئامانجێك کە هاتنە کایەی خۆشەویستترە لە بەفیڕۆچوونی، بۆ نمونە: خودای بێ وێنە" شەیتانی بەدیهێنا کە کەرستەی خراپە و گەندەڵ بوونی ئایین و کردارو بیروباوەڕو ویستەکانە، هۆکاری بەدبەخت بوونی زۆرێك لە بەندەکانە، لەگەڵ ئەوەشدا شەیتان

هۆکاری دەرکەوتنی زۆر شتە لەناو بەندەکانی کە لەلایەن خودا خۆشەویستە: بۆ نمونە: تا بۆ بەندەکان دەربکەویت کە خوای گەورە توانای بەدیهێنانی شتی دژیەکی هەیە، هەروەها: هۆکاری دەرکەوتنی شوێنەواری ناوەکانی خودا وەك ئەو ناوانەی مانای: دەسەڵات و زاڵ بوونی ئەو هەڵدەگرن، بۆ نمون: (گەردن کەچکەر "القهار"، تۆڵەسێن "المنتقم")، هەروەها دەرکەوتنی شوێنەواری ئەو ناوانەی کە سۆزو بەزەیی و خۆشەویستی و لیّ خۆشبوونیان هەیە[1].

## ٣، ٤- بیستن (السمع) و بینین (البصر)

**سیفەتی بیستن (سمع):** سیفەتێکی هەربوو و بیّ سەرەتایە، کاریشی بریتییە لە پەیی بردن بە هەموو شتێکی بیستراو، ئەگەر ئەو شتە بیستراوەش شاراوە بێت[2].

ئەمە سیفەتێکە شتی بیستراو ئاشکرا دەکات بەبیّ ئامرازو ئامێر. جا هیچ شتێك شاراوە نابێت لەلایەن سیفەتی بیستنی خوای گەورە ئەگەر زۆر نادیریش بێت، بەبیّ بوونی زەردەواڵەکانی گوێچکە (أصمخة) و دەنگ و بانگ (آذان).

پێچەوانەی ئەم سیفەتەش: بریتییە لە نەبیستن و کەڕ بوون.

---

[1] شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٣٢٧-٣٢٩. لە: شرح المقاصد للتفتازاني ١٣٧/٤ هاتووە: مەزهەبی ڕاسترەوان ئەوەیە کە هەر شتێك خوا بیەوێت دەبێت، هەر شتێکیش ببێت ئەوە خوا ویستویەتی، ئەگەرچی ڕەزامەندیشی لەسەر نەبێت و فەرمانی پیّ نەکرد بێت بەڵکو ڕێگری لیّ کرد بێت، ئەمە ئەو ڕایەیە کە بەناوبانگە و لە پێشینانەوە هاتووە: هەرچی خوا بیەوێت دەبێت، ئەوەش کە خوا ویستی لەسەر نەبێت نابێت، موعتەزیلەکان ڕایان وانەبووە... .

[2] المسامرة ٦٨ و (ڕازی) وتویەتی: موسڵمانان کۆکن لەسەر ئەوەی خودای مەزن بیسەرو بینەرە، بەڵام سەبارەت بە واتای ئەم دوو سیفەتە، دوو بۆچوونیان هەیە:
یەکەم: ئەمانە دوو سیفەتی جیان لە سیفەتی زانست، ئەمە بۆچوونی زۆربەی ئەشعەری و موعتەزیلە و کەرامییەکانە.
دووەم: بریتییە لەو زانستەی پەروەردگار تایبەت بە بیستراو و بینراوەکان، ئەمە بۆچوونی فەیلەسوفەکان و کەعبی و أبی حسین البصرییە./ المحصل للرازی ١٧١. سەیری: کشف المراد ٣١٤. بکە.

سيفەتی بينين (بصر): سيفەتێكی هەربووی بێ سەرەتای ئەزەلييە، كاری ئەم سيفەتە پەيی بردنە بەهەموو بينراوێك، ئەگەر بينراوەكە زۆر ورديش بێت[1].

ئەمە سيفەتێكە شتی بينراوی پێ ئاشكرا دەكرێت بەبێ ئامراز، جا شتێكی بينراو هەرچەندە زۆر ورديش بێت ئەوا لەلايەن ئەو سيفەتە شاراوە نابێت، و تاريكی ڕێگەی بينينی لێ ناگرێت، بێ ڕەشێنە و پێڵوەكان دەبينێت.

پێچەوانەی ئەم سيفەتەش: بريتيە لە نەبينين و كوێری.

ئەم دوو سيفەتە سنوردار نين، بەپێچەوانەی گوێچكە و چاوی مرۆڤ.

پەيی بردن بە بوونەوەرەكان بەهۆی هەر دوو سيفەتی بيستن و بينين جيايە لە پەيی بردن بەهۆی سيفەتی زانستەوە، هەروەك پەيی بردن بە بينين جيايە لە پەيی بردن بە بيستن[2]، حەقيقەتی هەر يەك لەم سيفەتانە بەخوا دەسپێردرێت، حەقيقەتی ئەم سيفەتانە وەك ئەوە نييە كە لەلای ئێمە باوی هەيە لەوەی بينين ڕوونترە لە زانين، بەڵكو هەموو سيفەتەكانی خودا تەواو و كاملن، زيادو كەمی و ونبون شتی جگە لەمەش لە خوای گەورە ئەستەمە[3].

**بەڵگەی عەقلی:**

أ- سيفەتی بيستن و بينين دوو سيفەتی كاملن، بەديهێنراو و پەيدابوانيش بەم دوو سيفەتە وەسف دەكرێن، كەواتە خوای گەورە شايەنترە كە بەو دوو سيفەتە وەسف بكرێت. ئەگەرنا ئەو كاتە پێويست دەبێت كە بەديهێنراو وەسف بكرێت بە چەند سيفەتێكی كامڵ كەچی بەديهێنەر ئەو دوو سيفەتە نەبێت[4].

ب- ئەگەر خوای گەورە وەسف نەكرێت و خاوەنی سيفەتی بيستن و بينين نەبێت، ئەو كات پێويست دەبێت كە بەپێچەوانەی ئەو دوو سيفەتە وەسف بكرێت، ئەگەر

---

[1] المسامرة، سەرچاوەی پێشوو.

[2] شرح الخريدة للدردير ٨١ وشرح الجوهرة للباجوري ١٣٢.

[3] شرح الجوهرة للباجوري ١٣٢.

[4] المسامرة ٦٩.

سەلمێنرا کە خوای گەورە خاوەنی دوو سیفەتی پێچەوانەی دوو سیفەتە ناوبراوەکەیە، ئەوە کەم و کورتی دەدرێتە پاڵ خودا، بوونی کەم و کورتی بۆ خودا ئەستەمە[1].

کەواتە سەلمێنرا کە خوای گەورە بیسەرو بینەرە.

پ- ئەگەر سەلمێنرا خودا نابیستێ و نابینێ، ئەوا کەم و کورتی دەدرایە پاڵ خودا.

ئەگەر خودا کەم و کورتی هەبوو، ئەوا پێویستی بە یەکێك دەبوو کە تەواو و کاملی بکات، تەواوکەرەکەش پێویستی بە یەکێکی تر دەبوو تا تەواو و کاملی بکات.... بەم شێوەیە، ئەو کات گریمانەی خول (دور) و زنجیرەیی (تسلسل) پێویست دەبوو، هەردووکیشیان پوچەڵن.

**بەڵگەی نەقلی:**

خوای پاك و بێ وێنە دەفەرموویێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴾ الحج: ٧٥، لقمان ٢٨. واتە: (بەڕاستی خوا بیسەرو بینایە).

هەروەها دەفەرموویێت: ﴿ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴾ الشورى: ١١. واتە: (هیچ شتێك لەوناچێت، هەر ئەویش بیسەرو بینایە).

**پەیوەست بوونی سیفەتی بیستن و بینین:**

زانایان ڕاجیان لەبارەی ئەو شتەی سیفەتی بیستن و بینین پێیەوە پەیوەست دەبێت، لەم بارەوە دوو بۆچوونیان هەیە:

**بۆچوونی یەکەم:** سیفەتی بیستن و بینین پەیوەست دەبێت بەهەموو بەدیهێنراوان: دەنگ و خودەکان (أصوات و ذوات). ئەمە ڕای سەنوسی[2] و دردیرە. سیفەتی بیستن و بینینی خودا لە پەیوەست بووندا جیاوازە لەگەڵ بینین و بیستنی ئێمە، چونکە بیستنی ئێمە پەیوەستە بەهەندێك لە بەدیهێنراوان کە بریتین لە بیستراوەکان، بینینی ئێمەش

[1] المسامرة ٦٩ وشرح أم البراهين للسنوسي وحاشية الدسوقي عليه ١٧٠ وأصول الدين للغزنوي ٩٨.

[2] شرح أم البراهين للسنوسي وحاشية الدسوقي عليه ١٠٩ وشرح الجوهرة للباجوري ١٣١ نقلا عنه.

پەیوەستە بە هەندێك لە بەدیهێنراوان وەك جەستە و ڕەنگەکان[1].

بەپێی ئەم بۆچوونە، سیفەتی بیستن و بینین - بەهەموو ئەو شتانە پەیوەستن کە هەن - سێ جۆر پەیوەست بوونیان هەیە:

أ- پەیوەست بوونێکی جێبەجێکەری لەمێژینەیە، بریتییە لە پەیوەست بوون بـە زات و سیفەتەکانی خودا.

ب- پەیوەست بوونێکی گونجاوی لە مێژینە، پەیوەست بوون بە ئێمە بەر لەوەی بێینـە بوون.

پ- پەیوەست بوونێکی جێبەجێکەری پەیدابوو، بریتیە لـە پەیوەسـت بـوون بـە ئێمـە دوای ئەوەی هاتینە بوون[2].

**بۆچوونی دووەم:** سیفەتی بیستن تەنها پەیوەستە بە بیستراوەکان. سیفەتی بینین تەنها پەیوەستە بە بینراوەکان. ئەمە ڕای سەعدی تەفتازانیە[3]. بەڵام بۆچوونی ناوبراو دوو ڕاڤە هەڵدەگرێت:

أ- ئەگەر مەبەستی ناوبراو لەو شتانەی کە ئێمە گوێبیستی دەبین دەنگەکان بێت، ئـەو شتانەی کە دەیبینین خودەکان و ڕەنگەکان بێت. ئەوا بەم مەبەسـتەی ڕای جیـاوازە لەگەڵ سنوسی و هاوڕاکانی.

ب- مەبەستی لەو شتانەی خودا دەیان بیسـتێت، بەیدیهێنراوەکانـە لـە: دەنگـەکان و شتەکانی تریش، ئەو شتانەش خودا دەیانبینێت بەدیهێنراوەکانـە لـە: خودەکـان و شتەکانی تریش. بەم پێیە ناوبراو هاوڕایە لەگەڵ سەنوسی[4].

زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی سیفەتی بیستن و بینین پەیوەست نابن بـەو شـتانەی نـەبوو (معدم)ن، لەبەر ئەوەی پەیوەست بوونی ئەم دوو سـیفەتانە بـە شـتی نـەبوو پێچـەوانەی

---

[1] شرح الخريدة للدردير ٨٠.
[2] شرح الجوهرة للباجوري ١٤٩.
[3] شرح الجوهرة للباجوري ١٣٢.
[4] شرح الجوهرة للباجوري ١٣٢، و ١٤٨.

عەقڵ و ژیرییە، چونکە ئەگەر بە نەبووەوە پەیوەست بن ئەوا ئەو کاتە نەبووش دەبێتە هەبوو و یەك حوكمیان دەبێت[1].

**٥- زانست (العلم)**

سیفەتێکی هەربووی بێ سەرەتایە، لەکاتی پەیوەست بوونی بە زانیاری، ئەوا زانیارییەکە دەردەخات[2].

دژەکەی ئەو سیفەتەش: بریتیە لە نەزانین، ئەو شتانەی دەچنە ریزیەوە وەك: گومان و دودڵی و ئەندێشە و وڕبوون و بێ ئاگایی و لەبیرچوونەوەو بەهەڵەداچوون[3].

**بەڵگەی عەقڵی:**

أ- کارەکانی خوای گەورە لەوپەڕی رێکوپێکی و جوانی و توندو تۆڵی دان، ئەمە شتێکی دیارو بەرچاوە بۆ کەسێك کە تەماشای ئاسۆکان و خودی مرۆڤ و زیندەوەرەکانی کردبێت، بێگومان ئەوەی کاری رێك و پێك و قەشەنگ بێت ئەوا زانایە.

چونکە هەر کەسێ رستەیەکی بینی کە پێکهاتبێت لە وشەی شیرین و قەشەنگ و پاراو و هەڵگری چەند واتایەکی ورد، بێگومان بەبێ چەندوچوون زانیویەتی کە نووسەرەکەی زانایە[4].

ئەگەر خوای گەورە زانا نەبوایە، ئەوا دەبوو نەزان بوایە.

ئەگەر نەزانیش بوایە، ئەوا ئەو جیهانە بەو سیستەمە وردو رێك و پێکە نەدەبوو، کە نیشانە و بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەدیهێنەرەکەی شارەزاییەکی تەواوی هەیە لەسەر ئەوەی چ شتێك چاکە بۆ جیهان.

---

[1] کبری الیقینیات الکونیة ١٢٨ و ١٤٠.

[2] شرح العقائد النسفیة ٨٣.

[3] رسالة التوحید للطائي ٤٨.

[4] المواقف و شرحه للسید الشریف ٦٥/١، و المقاصد و شرحه ١١٠/٤. سەیری ئەمانەش بکە: شرح الجوهرة للباجوري ١٢٧، المسامرة ٥٩، المطالب العالیة ١٠٧/٣، کشف المراد ٣٠٩، المعالم الدینیة ٦٩، شهرساني لە (نهایة الإقدام ٦٧) دەڵێت: ئەمە رێبازی شێخ ئەبو حەسەنی ئەشعەریە.

بەم پێیە سەلمێنرا کە خوای گەورە زانایە.

ب- ئەگەر خوای گەورە نەزان بوایە، ئەوا کەم و کورتی لە زاتی خوادا دەبوو، بوونی کەم و کورتی بۆ خوای گەورەدا شتێکی ئەستەمە[1].

پ- ئەگەر کەموکورتی لە خوادا هەبوایە ئەوا پێویستی بە یەکێك دەبو تا کاملی بکات، و ئەوەی کە کاملیشی دەکات پێویستی بەیەکێکی تر هەیە تا کاملی بکات .... بەم شێوەیە، ئەوکاتە گریمانەی خول (دور) یان زنجیرەیی (تسلسل) پێویست دەبێت، و هەردوو گریمانەکەش پوچەڵن، کەواتە سەلمێنرا کە خوای گەورە خاوەن زانستە[2].

**بەڵگەی نەقڵی:**

خوای پاك و بەرز دەفەرموویت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴾ لقمان: ٢٣. واتە: (بێگومان خوا ئاگادارە بەهەموو ئەو شتانەی کە لە سینەو دڵ و دەروونەکاندا حەشاردراون).

خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾ البقرة: ٢٩. واتە: (هەر خۆیشی بەهەموو شتێك زاناو ئاگادارە).

خوای بێ وێنە دەفەرموویت: ﴿ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ﴾ المائدة: ١٠٩، ١١٦. واتە: (بەڕاستی خوایە هەر خۆت ئاگات لە هەموو نهێنی و شاراوەکانە و بەهەموو پەنهانێك دەزانیت).

خوای تاك و پاك لە هاوەڵ و هاوبەش دەفەرموویت: ﴿ وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۚ وَمَا تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعۡلَمُهَا وَلَا حَبَّةٖ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡأَرۡضِ وَلَا رَطۡبٖ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ﴾ الأنعام: ٥٩. واتە: (کلیلی هەموو شاراوەکان و زانینی هەموو نهێنیەکان بەدەست خوایە و هەر لای ئەوە، کەس نایزانێت جگەلەو زاتە هەرچی لەسەر وشکانیە خوا پێی دەزانێت، هەروەها هەرچی لە

[1] شرح قاسم بن قطلوبغا على المسايرة ٦٠ وأصول الدين للغزنوي ٩٥.

[2] شرح الجوهرة للباجوري ٦٢.

دەریاکانیشدا هەیە ئاگای لێیەتی و هیچ گەڵایەك ناکەوێتە خوارەوە خـوا پێـی نـەزانێت، هەروەها دەنکێك یان تۆوێك لە تاریکیەکانی زەویدا نییە، ئەو دەنکە چ شێدار بێـت یـان وشك بێت، هیچ شتێك نییە لە خوا پەنهان بێت و لە (لوح المحفوظ)دا، یاخود لە دۆسـیە و دەزگای تایبەتدا تۆمار نەکرابێت).

**پەیوەست بوونی سیفەتی زانست:**

١- سیفەتی زانست بە هەموو چەمکەکان چ ئەوانەی هەن چ ئەوانەی نـین پەیوەسـتە، واتـە: بـە شـتە شـیاو (ممکـن) و پێویسـت (واجـب) و ئەسـتەم (مسـتحیل)ەکان پەیوەستە[1]، کەواتە خوای گەورە زانایە بە بە وردو درشتی شتەکان[2].

٢- پەیوەست بوونەکەی سیفەتی زانست جێبەجێ کاری لەمێژینە و بێ سەرەتایە: لە بێ سەرەتاوە خـوای گـەورە زانایـە بـە شـتتەکان کـە لەسـەر چ بـارێکن. ئینجـا پەیدابوونی ئەو شتانەی کە لە ڕابردوودا هـەبوون یـاخود کـە لـە ئێسـتادا هـەن یـان لـە داهاتوودا پەیدا دەبن، هەموو ئەوانە تەنها چەند قۆنـاغێکن لـە زانیـاری، چـونکە هـیچ گۆڕانکارییەك پێویست ناکات لە پەیوەست بوونەکەی سیفەتی زانست دا، چـونکە گـۆڕان سیفەتی زانراوە نەك پەیوەست بوونی سیفەتی زانست.

سیفەتی زانست: پەیوەست بوونی گونجاوی (صلوحی) نییە، چونکە ئەگەر شـیاو بوایـە خودا هەندێك شت بزانێت و هەندێکی تریش نەزانێت ئەوا خودا بە نـەزان وەسـف دەکـرا، چونکە شتێك شیاوی زانین بێت نابێتە زانا. هەروەها سـیفەتی زانسـت، جێبـەجێ کـاری پەیدابوو نییە، چونکە ئەگەر وابوبایە ئەوا دەبوایە پێش زانـین خـوای گـەورە بـە نـەزانین وەسف بکرابایە[3].

---

[1] المسامرة ٦٢، المواقف و شرحه للسيد الشريف ٧٠/٨، شرح المقاصد ١١٨/٤، شرح الجوهرة للباجوري ١٢٦، شرح أم البراهين للسنوسي وحاشية الدسوقي عليه ١٠٦.

[2] شرح الجوهرة للباجوري ١٢٦.

[3] شرح الجوهرة للباجوري ١٢٦ تبعا للسنوسي وصححه، رسالة في التوحيد للطائي ٤٨.

### ٦- دوان (الكلام)

سیفەتێکە نیشاندەری هەموو زانیاریەکانە.

ڕاجیایی زانایانی کەلام لە دیاریکردنی ئەم سیفەتە دەخەینەڕوو.

دژی ئەم سیفەتەش: لاڵییە.

**بەڵگەی عەقڵی:**

ئەگەر خوای گەورە نەیتوانیبا بدوێت، ئەوا پێویست بوو بە پێچەوانەی ئەم سیفەتە وەسف کرابایە، کە لاڵییە.

وەسفکرانی خودا بەوەی لاڵ بێت ئەوا کەم و کورتییە، ئەمەش شتێکی پوچەڵە، چونکە نەك خوا تەنانەت بەدیهێنراویش ڕازی نابێت بە کەم و کورتی، کەواتە سەلمێنرا کە خودای گەورە خاوەنی سیفەتی دوانە[1].

پێغەمبەران (سڵاوی خوایان لێبێت) کۆکن لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە دەدوێت، بەشێوەیەکی متەواتیرو سەلمێنراو لە ناوبراوانەوە هاتووە کە خوای گەورە خاوەنی سیفەتی دوانە، لەم بارەشەوە وتویانە: خوای گەورە فەرمانی بەمە کردووە، ڕێگری لەمە کردووە، هەواڵی بەم شێوەیە داوە، جا ئەمانە لە شێوەکانی دوان و قسە کردنن[2].

**بەڵگەی نەقڵی:**

خوای پایەبەرز دەفەرموێت: ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمًا﴾ النساء: ١٦٤. واتە: (بەڕاستی خوای گەورە خۆی لەگەڵ موسادا گفتوگۆی یەکسەری و ڕاستەوخۆی ئەنجامداوە).

خوای بێ وێنە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحۡيًا أَوۡ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ أَوۡ يُرۡسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذۡنِهِۦ مَا يَشَآءُ ﴾ الشورى: ٥١. واتە: (کەس بۆی نییە هیچ

---

[1] رسالة في التوحيد للطائي ٥٣، شرح المقاصد للتفتازاني ١٤٣/٤-١٤٤ وأصول الدين للغزنوي ١٠١.

[2] المواقف وشرحه للسيد الشريف وحاشية عبد الحكيم عليه ٩١/٨.

کات "لە دونیادا" خوای گەورە وتوێژی ڕاستەوخۆی لەگەڵدا بکات مەگەر لە ڕێگەی وەحی و نیگاوە، یان لە پشتی پەردەوە، وەك موسا، یان نێردراوێکی وەك فریشتە - جوبرەئیل - دەنێرێت کە بە گوێرەی فەرمان و مۆڵەتی خوا چی پێ سپێردراوە دەیگەیەنێت، بەڕاستی ئەو زاتە خوایەکی بڵندو داناو کاربەجێیە).

**ڕاجیایی زانایانی کەلام، لەبارەی سیفەتی دوانی خودای بێ وێنە:**

لە نێوان موسڵمانان بە تێکڕای مەزهەبەکانەوە ڕاجیایی نییە، لەسەر ئەوەی خوای گەورە وتەبێژو قسەکەرە، بەڵکو ڕاجیایی لە واتای وتەکە و بێ سەرەتا بوون یاخود پەیدابوونیەتی[1].

زانایانی زانستی کەلام ڕاجیا بوونە سەبارەت بە سیفەتی دوان (کلام)ی خوای گەورە بۆ چەند ڕایەك[2]، بە ناوبانگترین ڕاو بۆچوونی ئەمانەن: ئەهلی سوننە، موعتەزیلەکان، شیعەی ئیمامی، حەنبەلییە بیدعەچییەکان، کەرامییەکان:

**١- ئەهلی سوننە و لەوناویشیاندا ئەشعەری و ماتریدیەکان:**

وتویانە کە وتەی پەروەردگار دوو جۆرە:

أ - **وتەی نەفسی**: ئەمە لە ڕاستیدا وتە و قسەیە، کە بەهۆی چەند بێژەو دەربڕینێك دەردەبڕدرێت، لە ڕەگەزی دەنگەکان و پیتەکان نییە، بەڵکو سیفەتێکی هەربوو بێ سەرەتایە و پەیوەستە بە زاتی خوای گەورە، ئەوەی دوور دەخاتەوە کە خوای گەورە هێزی دوان و قسەی نەبێت، هەروەك چۆن کەسی لاڵ و منداڵ ناتوانن بە قسە بێن، خوای گەورە بەم سیفەتە فەرمان دەکات و شت قەدەغە دەکات و هەواڵ

(١) شرح المقاصد ٤/١٤٤. المحصل للرازي ١٧٢.

(٢) سەیری حەوت بۆچوون بکە لەبارەی سیفەتی (دووان) لەم سەرچاوانەدا: شرح العقیدة الطحاویة لإبن أبي العز ١٧٢ ونقلها عنه علي القاري في شرح الفقه الأكبر ٥٨.

دەدات و جگە لەمانەش[1]. ئەم سیفەتە سـیفەتێکی لەمێژینـەی بـێ سـەرەتایە، (چونکە شتی پەیدابوو بە زاتی خواوە وابەسـتە و پەیوەسـت نابێـت) کەچـی ئـەم سیفەتە پەیوەستە بە زاتی خواوە[2].

وتەی نەفسی و خودی، بریتییە لە:

دەربڕین: چونکە دەربڕینەکان دەگۆڕێن بەهۆی کات و شوێن و هۆزو گەلەکان[3]، بـەڵام واتای نەفسی و خودی ناگۆڕێت، بەڵکو دەکرێت شت دەربڕیت بـەهۆی ئامـاژە و نووسـین، هەروەك دەربرین و داواکاری نیشانەن لەسەر واتای وتەی نەفسـی و خـودی، واتـای وتـەی خودی ناگۆڕێت ئەگەرچی دەربرینەکان بگۆڕێن، ئەم وتەیە بە ئاماژەکانین ناگۆڕێت[4].

وتەی نەفسی بریتی نییە لە زانست: لەوانەیە مرۆڤـ لەبارەی شـتێکەوە هـەواڵ بـدات کە نایزانێت، بەڵکو شتێکی پێچەوانەی دەزانێت یان گومانی لێی هەیە[5].

بریتی نییە لە ویسـت: چـونکە لەوانەیـە مرۆڤـ فـەرمان بەشـتێ بکـات کـە خـۆی نایەوێت، وەك ئەوەی بەندەکەی تاقی دەکاتەوە، ئایا پێی دەبەخشێت یان نا[6]؟

---

[1] شرح المقاصد ١٤٤/٤. المواقف وشرحه للسيد الشريف ٩٣/٨ وشرح الجوهرة للباجوري ١٢٩.

[2] المواقف وشرحه للسيد الشريف ٩٣/٨ و٩٥.

[3] دەربڕینەکان بە پێی کات دەگۆڕێن، بۆ نمونە (ناردن) بەر لە ڕوودانی دەبێتە (دەینێرین)، دوای ڕوودانی دەبێتە (ناردمان).

دەربڕینەکان بە شوێنیش دەگۆڕێن، چونکە ئەگەر ئاماژە بۆ نزیك بێت بە (هذا) دەبێت، ئەگەر ئاماژەکە بۆ شوێنکی نەدوور نە نزیك بەڵکو مام ناوەند بێت بە (ذاك) دەبێت، ئەگەر ئاماژەکە بۆ دووریش بوو بە (ذالك) دەبێت.

دەربرینەکان بە گۆڕانی گەلانیش دەگۆڕێن: بۆ نموونە بە عـەرەبی (قورئان)، بە سریانی (زەبور)، بە عیبری (تەورات)، بە یۆنانی (ئینجیل) دەردەبڕن./ حاشية عبدالحكيم على شرح المواقف ٩٣/٨-٩٤.

[4] المواقف وشرحه للسيد الشريف ٩٣/٨-٩٤.

[5] المواقف وشرحه للسيد الشريف ٩٣/٨-٩٤، المسامرة ٧٧.

[6] المواقف و شرحه، سەرچاوەی پێشوو.

وتەی نەفسی وێنەیەکی زانستی خودییە لە دەرووندا، هەروەك زانست وێنەیەکی زانراوە، بۆیە وتەی پەروەردگار کۆتایی بۆ نییە وەك زانستەکەی[1].

وتەی نەفسی لە ڕووی زمانەوانیەوە چەسپاوە، چونکە شتێکی بڵاو و باوە کە ناوی وتە بەکاردێنن بۆ واتایەکی ئامادە و هەبوو لە دەرووندا، هەروەك دەوترێت: (فی نفسی کلام: وتەیەك لە دەروونمدا هەیە) و (زورت في نفسي مقالة: وتەیەکم لە ناخی خۆمدا گۆڕیم)، هەروەك لە وتەی (أخطل)دا هاتووە:

إن الكلام لفي الفؤاد و إنما      جُعل اللسان على الفؤاد دليلاً

واتە: بەڕاستی وتە لە دڵ و دەروندایە، بەڵام زمانیش کراوە بە ڕێنیشاندەر و ئاماژە بۆ دڵ و دەروون.

لە قورئانی پیرۆزیشدا هاتووە: ﴿ وَيَقُولُونَ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ ﴾ المجادلة: ٨.[2] واتە: (لە دەروونی خۆیاندا دەڵێن).

**ب- وتەی بێژەیی و دەربڕین (لفظي)**: ئەمە پێکهاتووە لە پیت و دەنگ، ڕایان وایە ئەم جۆرەی دووەم پەیدابووە و بە زاتی خواوە پەیوەست و وابەستەی نییە، کە بریتین لە قورئانی پیرۆزو گشت کتێبە دابەزێنراوەکانی تر[3].

قورئانی پیرۆز بەو واتایەی کە وتەی نەفسییە، ئەوا پەیدابوو و بەدیهێنراو نییە، بەڵام قورئان بە واتای وتەی بێژەیی و دەربڕین (لفظي) کە ئێمە دەیخوێنینەوە ئەوا بەدیهێنراوە. بەڵام ناکرێت و نابێت بوترێت: قورئان بەدیهێنراوە. مەبەست لێی ئەو بێژەو دەربڕینەیە کە دەیخوێنینەوە، تەنها لەوکاتە دروستە کە بۆ فێربوون بێت، چونکە لەوانەیە وا خەیاڵ بکرێت کە قورئان وەك فەرمایشتی نەفسی خودا بەدیهێنراوە، لەبەر ئەمەش بوو

---

[1] من تعليقات السيد محمد رشيد رضا على رسالة التوحيد لمحمد عبده ٤٥.
[2] شرح المقاصد ٤/١٥. و شرح الجوهرة للباجوري ١٣٠، الإنصاف للباقلاني ١١٠، تمهيد الأوائل ٢٨٤.
[3] المواقف و شرحه للسيد الشريف وحاشية عبدالحكيم عليه ٨/٩٣-٩٤.

(ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) ئەشکەنجەدرا و بەندکرا تا بڵێت قورئان بەدیهێنراوە، کەچی ناوبراو ئەمەی نەوت[1].

**٢- موعتەزیلەکان و شیعەی ئیمامی:**

وتە و قسەی خودا پێکهاتووە لە پیت و دەنگ، وابەستە و پەیوەست نییە بە زاتی خوا، بەڵام خوای گەورە بەدیدەهێنێت لە غەیری خۆیدا وەك تۆماری پارێزراو (اللوح المحفوظ) یان لە فریشتە جوبرەئیل یاخود لە پێغەمبەردا، کەواتە وتەی پەروەردگار پەیدابوو و بەدیهێنراوە[2].

بوونی سیفەتی دوان بۆ خودا، لەلای موعتەزیلەکان واتای ئەوە دەگەیەنێت: خوای گەورە وتە و قسە لە چەند جەستەیەکدا بەدیدەهێنێت، ئەمەش لەبەر ئەوەی ناوبراوان گومانیان وابوو وتە و قسە تەنها لە ڕێگەی پیت و دەنگەکانەوە دەبێت، بۆیە وتە و فەرمایشتی خودا بەدیهێنراو و پەیدابووە[3].

موعتەزیلەکان بۆچوونیان وایە کە وتە تەنها لە پیت و دەنگ پێکدێت، بۆیە نابێت خوا بە وتەبێژو قسەکەر وەسف بکرێت بەوەی وتە شتێك بێت پەیوەست بێت بەزاتی خودا، چونکە ئەگەر وا گومان ببرێت کە دوان سیفەتی لەمێژینە و بێ سەرەتای خودایە ئەوا ئەو کاتە پێویست دەبێت کە پەیدابوو و بەدیهێنراویش بە زاتی خوداوە وابەستە و پەیەوەست ببێت[4].

---

(١) شرح الجوهرة للباجوري ١٣٠، و أصول الدين للغزنوي ١٠١.

(٢) المواقف ٨/٩٢-٩٣، شرح المسامرة لقاسم بن قطلوبغا ٧٩، المسامرة ٧٧. تمهيد الأوائل ٢٨٧، الشيعة بين الأشاعرة و المعتزلة لهاشم الحسني ١٨٩ نقلا كشف الحق للعلامة الحلّي ١٨ و١٩ و توحيد الصدوق ٢٨٨ و أوائل المقالات للشيخ المفيد ١٩.

(٣) شرح الجوهرة للباجوري ١٣٠. وحاشية الدسوقي على شرح أم البراهين ١١٤.

(٤) حاشية الدسوقي على شرح أم البراهين ١١٤.

موعتەزیلەکان و ئیمامییەکان[1] و زەیدییەکان[2] و ئیبازییەکان وتویانە: وتەی خودا بە زاتی خوداوە وابەستەو پەیوەست نییە، بەڵکو بە جگە لە زاتی خوداوە وابەستەو پەیوەستە.

ئەشعەرییەکان بەرپەرچیان داوەتەوە:

بەوەی ئەو قسە و بۆچوونە بە ناپەسەند نازانین، بەڵکو ئێمەش ڕای ئێوەمان هەیە، بەڵام ناوی دەنێین وتەی بێژەیی (لفظي)، دانیش دەنێین بەوەی ئەم جۆرەی دوان پەیدابووەو پەیوەست نییە بە زاتی خوداوە، بەڵام بڕوامان وایە لە پاڵ وتە و دوانی ناوبراو وتە و دوانی نەفسی هەیە، کە بە بێژەکان (ألفاظ) دەری دەبڕین، دەڵێین ئەمە دوانی ڕاستەقینەیە[3].

بەڵام موعتەزیلەکان وتیان: ئەوەی کە ئێوە ناوی دەنێن (وتە و دوانی نەفسی) ئەگەر واتاکەی هەواڵ بێت دەگەڕێتەوە بۆ سیفەتی زانست، ئەگەر فەرمان (أمر) یان ڕێگری (نهی) بوو ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ سیفەتی ویست[4].

کاتێ موعتەزیلە ئەو ڕاو بۆچوونانەیان پەسەند کرد، وتیان: قورئانی پیرۆز فەرمایشتی بەدیهێنراوی خوایە.

هەروەها ئیمامییەکان[5]، زەیدییەکان[6]، ئیبازییەکانیش[1] بۆچوونیان وابوو قورئان بەدیهێنراوە.

---

[1] كشف المراد ٣١٥، الباب الحادي عشر وعليه النافع ١٦، مفتاح الباب ١٢٤، الشيعة والمعتزلة لهاشم الحسني نقلا عن كشف الحق للعلامة الحلي ١٨ و١٩ وتوحيد الصدوق ٢٢٨، خلاصة علم الكلام ١٢٣.

[2] المعالم الدينية ٧٧، والأساس لعقائد الأكياس ١٤٨، خلاصة علم الكلام، سەرچاوەی پێشوو.

[3] المواقف و شرحه للسيد الشريف ٩٣/٨، المسامرة ٧٧، شرح المسايرة لقاسم بن قطلوبغا ٧٩.

[4] كبرى اليقينيات الكونية ١٣١.

[5] خلاصة علم الكلام ١٣٤.

[6] سەرچاوەی پێشوو.

موعتەزیلە تێڕوانینیان وابوو کە بۆچوونی ئەهلی سوننە، کە پێی وابوو قورئان فەرمایشت و وتەی خوایە و بەدیهێنراو نییە، ئەوا لەوانەیە نەصرانیەکان بە بەڵگەی بێننەوە یان وەك هۆکارێك بەکاری بێنن بۆ بڵاو کردنەوەی گومان، تا موسڵمانان ناچار بکەن بۆ باوەڕ هێنان بەوەی: مەسیح خوایە یاخود مەسیح لەمێژینە و هەربووە.

لە (یوحنا)ی (دمشقي) گێردراوەتەوە کە خزمەتکاری ئومەویەکان بوو تا سەردەمی هیشامی کوڕی عبدالملك، یوحنا هەندێ لە مەسیحیەکانی فێردەکرد، بۆ ئەوەی مشتومڕو دەمەتەقێ لەگەڵ موسڵماناندا بکەن، جا دەیوت: (ئەگەر موسڵمانێك پێی وتی: چی دەڵێی سەبارەت بە مەسیح؟ تۆش بڵێ: وشەی خوا (كلمة الله)یە. دواتر با نەصرانیەکە لە موسڵمانەکە بپرسێت: ئایا مەسیح بەچی ناونراوە لە قورئاندا؟ لەو کاتەدا نەصرانیەکە با هەموو وتەکانی موسڵمانەکە ڕەت بکاتەوە تا موسڵمانەکە وەڵامی دەداتەوە، لەو کاتەشدا ناچار دەبێت کە بڵێت: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلْقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِّنْهُ ﴾ النساء: ١٧١. واتە: (بەڕاستی مەسیح، عیسای کوڕی مەریەم جگە لەوەی کە فرستادەی خوایە "شتێکی تر نەبووە"، لە دایك بوونەکەی بە فەرمانی خوا بووە کە لە مەریەمدا "بەرجەستە بوو"، عیسا ڕۆح و گیانێکی "تایبەتە" لەلایەن خواوە بەخشراوە). ئەو کاتە با نەصرانیەکە بپرسێت لە بارەی ئەوەی کە: فەرمانی خوایە تایبەت لەلایەن ئەو بەخشراوە (كلمة الله و روحه)، کە ئایا بەدیهێنراوە یان بەدی نەهێنراوە؟ ئەگەر وتی بەدیهێنراوە، ئەوا با بەرپەرچی بداتەوە بەوەی: کە خوای گەورە هەر هەبووە و هیچ وشە (كلمة) و (ڕۆح) نەبوون. ئەگەر ئەمەت وت ئەوا موسڵمانەکە

[1] شرح عقيدة التوحيد لاطفش ٢٠٥، مشارق أنوار العقول ٥٨/٢، الحق الدامغ ٩٧. جعبري لە (البعد الحضاري ٣٥٢-٣٥٤) باسی ڕاجیایی نێوان زانایان و ئیبازیەکانی کردووە لەسەر بابەتی بەدیهێنراوی قورئانە.

دەبەزێت، چونکە هەر کەسێك کە بۆچوونی وابێت شتێکی بێجگە لە خودا بێ سەرەتا و هەربووە ئەوا لەلای موسڵمانان ئەو کەسە بە خوانەناس و بێ باوەڕ دادەنرێت)[1].

کاتێك موعتەزیلە بۆ ئەوەچوون کە قورئان بەدیهێنراوە، ئەوا لە ڕاستیدا بۆ بەرپەرچ دانەوەی نەصرانیەکان نەبوو، بەڵکو ئەم بۆچوونەی موعتەزیلەکان لە بابەتێکی فەلسەفی سەرچاوەی گرت کە لەوەی پێشتر خستمانەڕوو لەبارەی بۆچوونی ئەوان لەمەڕ سیفەتی دوان (کلام) ڕوون دەبێتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا موعتەزیلەکان ڕایان وابوو: وتنی ئەوەی کە قورئان بەدیهێنراو نییە، لەوانەیە سەر بکێشێت بۆ هەمان ئەو بۆچونەی کە نەصرانیەکان سەبارەت بە مەسیح هەیانە، بۆ باوەڕ بوون بە هەبوونی چەند شتێکی هەربوو و بێ سەرەتا (تعدد القدماء)، هەروەك ئەمە زانراوە لە بۆچوونی موعتەزیلەکان لەبارەی ڕەتکردنەوەی سیفەتەکان، وەك پێشتر خرایەڕوو.

بەڵام سەبارەت بە ئایەتی: ﴿ إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ مِّنۡهُ ﴾ النساء: ١٧١. واتە: (بەڕاستی مەسیح، عیسای کوڕی مەریەم جگە لەوەی کە فرستادەی خوایە "شتێکی تر نەبووە"، لە دایك بوونەکەی بە فەرمانی خوا بووە کە لە مەریەمدا "بەرجەستە بوو"، عیسا ڕۆح و گیانێکی "تایبەتە" لەلایەن خواوە بەخشراوە). ئینجا مەبەست لە دەستەواژەی (كَلِمَتُهُ) لە ئایەتەکە بریتییە لەوەی: کە عیسا هاتۆتە بوون بە وشەی (ببە: کن) بەبێ ئەو مادەی کە نەریت وایە مرۆڤ لێی پەیدا ببێت، بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿ إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾ يس: ٨٢. واتە: (بێگومان هەر کاتێك فەرمانی خوا دەرچوو، ویستی شتێك جێبەجێ بکات و بێنێتەدی، پێی دەڵێت ببە، ئەویش دەستبەجێ

[1] تأريخ المذاهب الإسلامية ١٥٩ و ئەم دەقەی وەرگرتووە لە کتێبی (تراث الاسلام) و بوطي لە (كبرى اليقينيات الكونية، سەرچاوەی پێشوو) ئاماژەی بۆ داوە.

و بێ دواکەوتن پێش دێت و ئەنجام دەدرێت و دروست دەبێت). هەروەها دەفـەرمووێت: ﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾ آل عمـران ٥٩.
واتە: (بەڕاستی نمونەی دروستبوونی عیسا لەلایەن خواوە" وەك نمونەی ئادەم وایـە کـە لـە خاك دروستی کرد و لەوەو دوا فەرمانی دا و پێی وت: ببە (بە ئینسان) ئەویش بوو).

ئیمامی غەزالی وتویەتی: هەموو لە دایك بووێك هۆکارێکی نزیك و دووری هەیە، جا هۆکاری یەکەم کە هۆکاری نزیکە: بریتیە لە تـۆواو (منـی)، دووەم: وتنـی وشـەی (ببـە: کن)ە. کاتێ بەڵگە ئاماژەی دا بۆ ئەوەی کە هۆکاری نزیك نـەبووە سـەبارەت بـە عیسـا (سەلامی خوای لێبێت)، ئەوا پەیدابوونی عیسای داوەتە پاڵ هۆکاری دوور، کە بریتییـە لـە فەرمانی (ببە: کن)، ئەمەش وەك ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی کە هۆکاری نزیك لە پەیـدابوونی عیسادا بوونی نەبووە. خوای پاك و بەرز بەم فەرمایشتە ڕوونی کردۆتـەوە: ﴿ أَلْقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرْيَمَ ﴾ النسـاء: ١٧١. واتە: لە مەریەمدا بەرجەستەی کردووەو تیایدا بەدیهێنا، وەك ئـەو تۆواوەی فڕێدەدرێتە ناو ڕەحمەوە[(١)].

## بنچینەی ڕاجیایی لە نێوان موعتەزیلە و ئەهلی سوننە لەسەر بابەتی دوان (کلام):

تەفتازانی لە (شرح المقاصد)دا لە کاتی ڕوون کردنەوەی بنچـینەی ڕاجیـایی لـە نێـوان موعتـەزیلـە و ئـەهلی سـوننەدا وتویـەتی: (لـە کـاتی لێکۆڵینـەوە لـەم ڕاجیاییـەدا بەدەردەکەوێت ئەم ڕاجیاییە دەگەڕێتەوە بۆ چەسپاندن یان نەچەسـپاندنی وتـەی نەفسـی، ئایا قورئان فەرمایشتی نەفسییە یان ئەوەیە کە پێکهاتووە لـەو پیتانـەی کـە بـریتین لـە وتەی بەرهەست، ئەگەرنا هیچ ڕاجیاییەکیان نییە لە بارەی پەیـدابوونی وتـەی بەرهەسـت "بێژەیی" و هەربوویی و بـێ سەرەتایی وتــــەی نەفسـی - واتـە: بـەو مەرجـەی وتـەی

(١) روح المعاني ٢٤/٦، ١٦٠/٣. وتەکەی غزالی لەم کتێبەیدا هاتووە: الرد الجميل الإلهية عيسى بصريح الإنجيل ٥٨-٥٩.

نەفسی بچەسپێت -)[1].

کەواتە ئەو ڕاجیایەی کە هەیە لە نێوان ئەهلی سوننە و موعتەزیلە کورت هەڵدێت لە ناونان و پێناسەکردنی وتەی نەفسی.

موعتەزیلە دەڵێن ناکرێت بە وتەی نەفسی بوترێت وتە و قسە، بەڵکو ئەگەر واتاکەی فەرمان (أمر) یان ڕێگری کردن (نهی) بوو ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ سیفەتی ویست، ئەگەر هەواڵ بێت ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ سیفەتی زانست.

واتە: دەربرینەکانی قورئانی پیرۆز ئەو واتایانەی هەن کە فەرمان و ڕێگری و هەواڵ لە خۆدەگرن و ئاراستەی خەڵکی کراون، جا واتای ئەم دەربرینانە ئەگەر فەرمان و ڕێگری بێت ئەوا لەلای موعتەزیلەکان بە ویست ناودەبرێت، ئەگەر هەواڵیش بێت ئەوا بە زانست ناودەبرێت.

بەڵام ئەهلی سوننە دەڵێت: ئێمە ناوی دەنێین: وتەی نەفسی، سیفەتێکی سەربەخۆیە و پەیوەستە و وابەستەیە بە زاتی خواوە و پاشکۆی سیفەتی ویست و زانست نییە[2].

---

[1] شرح المقاصد ٤/١٤٦. و سەیری: المواقف و شرحه للسید الشریف ٨/٩٥ و المعتقد الایماني شرح منظومة الشیباني ١٥-١٦، وما بین الشطرین من تفسیر هو لعلي القاري في شرح الفقه الأكبر ٥٢.

تەفتازانی لە (شرح العقائد النسفیة ٩٢) وتویەتی: (بە هەوڵدان بۆ دیاری کردنی خاڵی ڕاجیاییەکە، بەدەردەکەوێت کە ئەم ڕاجیاییە لە نێوان ئێمە و ئەواندا دەگەڕێتەوە بۆ چەسپاندن و نەچەسپاندنی وتەی نەفسی، ئێمەش ناڵێین پیت و دەنگەکان هەربو و بێ سەرەتان، موعتەزیلەکانیش ناڵێن: وتەی نەفسی بەدیهێنراوە. بەڵگەی ئێمە یەکدەنگی ئەو هەواڵە متەواترانەن کە لە پێغەمبەرانەوە هاتوون لەسەر ئەوەی خوای گەورە خاوەن سیفەتی دووانە، ئەمەش تەنها ئەوە دەگەیەنێت کە خوای گەورە وتەبێژو قسەکەرە، ئەستەمە کە بێژەی پەیدابوو بە زاتی خواوە پەیوەست بێت، بۆیە وتەی نەفسی بێ سەرەتا و هەربووە...). ونقله عنه علي القاري في شرح الفقه الأكبر ٤٩.

[2] كبرى اليقينيات الكونية ١٣١. المواقف وشرحه للسيد الشريف ٨/٩٥.

هەندێك وتویانە: ڕاجیاییەکە تەنها لە دەربڕیندایە[1].

**٣- حەنبەلیە بیدعەچییەکان:**

وتویانە فەرمایشتی خوای گەورە پێکهاتووە لە پیت و دەنگ، پەیوەستە بەزاتی پـاکی بەرزی خواوە، بێ سەرەتاو هـەربووە، تەنانـەت هەنـدێکیان بـە نـەزانی زۆر زیادەڕەویـان کردووە، بەوەی وتویانە ڕووپۆش و بەرگی قورئانیش بێ سەرەتاو هەربووە چ جـای خـودی قورئان[2].

ئەم بۆچوونە، پوچەڵە، چونکە دروست بوون و هاتنـە کایـەی هـەر پیتێـك نایەتـەجێ تەنها لەدوای کۆتایی هاتنی پیتی پێش خۆیدا نەبێت، بەم جۆرەش پیتی یەکەم نامێنێـت و ئەوەی کە لەدوای ئەویشدا هاتووە دەبێتە یەکەم. زانیمان ئەو شتەی کە لە ناودەچـێت و کۆتایی دێت یان سەرەتای هەبێت، ئەوا هەرگیز نابێت کـە هـەربوو و بـێ سـەرەتا بێـت، بـەڵکو دەچـێتە ڕیـزی پەیـدابوو و بەدیهێنراوانـەوە[3]، ئـەو شـتەی بـەدەر نـەبێت لـە پەیدابووەکان ئەوا خۆیشی پەیدابووە.

**٤- کەڕامییەکان:**

ئەم تاقمەش کۆك و هاوڕابوون لەگەڵ حەنبەلیەکان لەوەی وتەی خودا لە پیت و دەنـگ پێکهاتووە، بەڵام ناویان نا فەرمایشتی خـوا، دانیـان نـا بـەوەی کـە پەیـدابووە، وتیـان:

---

[1] ئەبو یەعقوب وارجلانی ڕوونکردنەوەی داوە لەسەر بەڵگەی هەر دوولا، چ ئەوەی پێی وایە قورئـان بەدیهێنراوە چ ئەوەی پێی وایە بێ سەرەتا و هەربووە. باسی ئـەوەی کـردووە کـە ئـەوەی دەڵێـت قورئان بەدیهێنراوە، ئەوا مەبەستی پێی خوێندنەوەی قورئان و لە سینە هەڵگرتن بووە، ئەوەش کە پێی وایە قورئان بێ سەرەتا و هەربووە مەبەستیان پێی زانسـت و سـیفەتی قورئـان بـووە. شـێخ (إبراهیم أطفش) سەرنجی لەسەر داوەو وتویەتی ڕاجیاییەکە تەنها لە دەربڕیندیە./ البعد الحضـاري ٣٩٥.

[2] المواقف و شرحه للسید الشریف ٩٢/٨، المسایرة ٧٧، شرح المسامرة لقاسم بـن قطلوبغـا ٧٩، شـرح الفقه الأكبر لعلي القاري ٣٨.

[3] شرح المسایرة لقاسم بن قطلوبغا، والمواقف وشرحه للسید الشریف، دوو سەرچاوەکەی پێشوو.

پەیوەست و وابەستەیە بە زاتی خـوای گـەورە، چـونکە پێیـان وابـوو کـە دروسـتە شـتی پەیدابوو وابەستەی زاتی خوا بێت، بێگومان ئەمە بۆچـوونێکی پوچـەڵە[1]، چـونکە ئـەو شتەی وابەستەی پەیدابوو بێت ئەویش پەیدابووە، پێشتر خستمانەڕوو کە سەلمێنرا خـودای گەورە هەربوو و بێ سەرەتایە.

## پەیوەست بوونی سیفەتی دوان (کلام):

سیفەتی دوان (کلام) پەیوەستە بە شتی پێویست (واجـب)، شـیاو (ممکـن) و ئەسـتەم (مستحیل)[2]، چونکە پەیوەست بوونی ئەم سیفەتە بریتیە لـە پەیوەسـت بـوون لـە ڕووی واتا و ڕوونکردنەوە یان فەرمان و (أمر) و ڕێگری کردن (نهی)، ڕوونکردنـەوەو فـەرمان و ڕێگری خوای گەورە بەتەواوی باسی شتی پێویسـت (واجـب) و شـیاو (ممکـن) و ئەسـتەم (مستحیل)ی لەخۆ گرتووە، هەروەك ئایەتەکانی قورئـانی پـیرۆز گـەواهی لەسـەر ئەمـە دەدەن[3].

---

[1] المسامرة، المواقف، شرح المسايرة لقاسم بن قطلوبغا، سەرچـاوەکانی پێشـوو. تـەفتازانی لـە (شرح المقاصد ٤/١٤٥) وتویەتی: (کەڕامییەکان بۆچوونیان وایە پیتە بیستراوە ڕێکخراوەکـان سـەرباری ئەوەی بەدیهێنراون ئەوا هەر پەیوەستن بەزاتی بەرزی خوداوە، ناوبراوان پێیان وایـە قسـەی خـودا جیایە لە فەرمایشتی خودا، فەرمایشتی خودا بریتییە لە توانای خودا لەسەر هاتنە دوان، ئەمەش هەربوو و بێ سەرەتایە).

[2] شرح أم البراهين للسنوسي ١١٢.

[3] کبری اليقينيات الكونية ١٣٦-١٣٧.

فەرمایشتی خودا یەك سیفەتە و فرە سیفەت نییە، بەڵام چەند بەشێکی ڕەچاوکاریی (إعتباری) هەیە: لە ڕووی پەیوەست بوونی فەرمایشتەکە بە داوای ئەنجامدانی کارێك بۆ نمونە نوێژ: ئەوا فەرمایشتەکە دەبێتە فەرمان. لە ڕووی پەیوەست بوونی بە داوای نەکردنی زینا: فەمایشتەکە دەبێتە ڕێگری. لە ڕووی پەیوەست بوونی بەوەی فیرعەون فڵانە شتەی کردووە: فەرمایشتەکە لێردەدا دەبێتە هەواڵ، لە ڕووی پەیوەست بوونی بەوەی کەسی گوێڕایەڵ بەهەشتی پێدەدرێت: دەبێتە پەیمان. لە ڕووی پەیوەست بوونی بەوەی گوناهبار دەچێتە دۆزەخەوە: هەڕەشەیە. جگە لەم نمونانەش. پەیوەست بوونی فەرمایشتی خودا بە جگە لە فەرمان و ڕێگری پەیوەست بوونێکی جێبەجێکاری هەربووە، بەڵام لە ڕووی پەیوەست بوونی بە فەرمان و ڕێگرییەوە: ئەگەر بوونی ئەو

### ٧- ژیان (الحیاة):

سیفەتێکی هەربوو و بێ سەرەتایە، دروستی سیفەتی زانست و ویست و سەرجەم سیفاتە واتاییی و (معنوی)ەکانی تر پێویست دەکات[1]. کە ژیان پاڵ دەدەینە پاڵ پەروەردگار مانای بەو شێوەیە نییە وەك کەسێکی سروشتگەرا بۆی دەچێت، چونکە سیفەتی ژیانی خوا بریتی نییە لە هێزی هەست و خۆراك پێدان و ئەو هێزەی پاشکۆی هاوسەنگی جۆریە کە سەرچاوەیە بۆ هەموو هێزەکانی ژیانداری[2]، هەروەك خوای گەورە بەبێ گیان و ڕۆح دەژیەت بەپێچەوانەی پەیدابوانەوە کە ژیانیان وابەستەیە بە ڕۆحەوە[3].

دژەکەی ئەم سیفەتەش، مردنە.

**بەڵگەی عەقڵی:**

أ- خودا زانا و خاوەن توانایە، هەر بوونێکی زانا و خاوەت توانا زیندوێتییەکەی سەلماوە، کەواتە ژیان بۆ خودا پێویستە[4].

---

شتەی فەرمانی پێکراوە یاخود ڕێگری لێ کراوە بە مەرج نەگیرێت ئەوا لەم ڕووەشەوە فەرمایشتەکە (جێبەجێکاری هەربووە). ئەگەر بوونی ئەو شتەی فەرمانی پێکراوە یاخود ڕێگری لێ کراوە بە مەرج بگیرێت، ئەوا پەیوەست بوونەکەی دەبێتە پەیوەست بوونێکی گوناجوی بەر لەوەی فەرمان پێکراو و ڕێگری لێکراوەکە بوونی ببێت، هەروەها دەبێتە جێبەجێکاری پەیدابوو دوای ئەوەی فەرمان پێکراو و ڕێگری لێکراو دێنەبوون./ شرح الجوهرة للباجوري ١٣٠.

[1] شرح الخريدة للدردير وحاشية الصاوي عليه ٧٢.

ڕازی باسی کردووە کە تێکڕای عەقڵمەندان کۆکن لەسەر ئەوەی خوای گەورە زیندووە، بەڵام ڕاجیاییان هەیە لە بارەی چۆنیەتی زیندوو بوونەکەی، لەم بارەوە دوو ڕایان هەیە:

یەکەم:سیفەتە، ئەمە ڕای زۆریەی زانایانە، کە بریتین لە ئەشعەرییەکان و موعتەزیلەکان.

دووەم: واتای ئەوەیە کە شتێکی ئەستەم نییە کە خودا زانا و توانادار بێت، تەنها زاتی خودایە کە نەبوون ڕەت دەکاتەوە. ئەمە ڕای زۆریەی فەیلەسوفەکان و ئەبی حسنی بصری و موعتەزیلییەکانە./ المحصل للرازي ١٦٧، كشف المراد ٣١٣.

[2] المسامرة ٦٢.

[3] حاشية الصاوي على الدردير ٧٢.

[4] المواقف وشرحه ٨/٨٠، المقاصد و شرحه ٤/١٣٨، و شرح الجوهرة للباجوري ١٢٩، المحيط بالتكليف ١٢٨.

ب- ژیان سیفەتی کامڵیە، پێچەوانەی ئەو سیفەتە کەم و کورتیە، خوای گەورەش پاکە لە کەم و کورتی[1].

پ- ئەگەر خوای گەورە وەسف بکرێت بە سیفەتێك بە پێچەوانەی سیفەتی ژیان، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە خودا ژیان بەخش نییە، چونکە کەسێك خۆی شتێکی نەبێت چۆن دەتوانێت ببەخشێت[2].

بوونی جیهان بەو ڕێك و پێکی و تۆکمەییە تەنها لەلایەن خودایەکی زیندووی خاوەن تواناوە بەدیدەهێنرێت[3].

**بەڵگەی نەقڵی:**

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ﴾ البقرة: ٢٥٥. واتە: (خوا زاتێکە جگە لەو هیچ خوایەکی تر نییە کە شایەنی پەرستن بێت و هەمیشە زیندووە و ڕاگرو سەرپەرشتیاری هەموو دروست کراوەکانیەتی").

ئەم فەرمایشتە: ﴿ هُوَ ٱلۡحَيُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۗ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ غافر: ٦٥. واتە: (ئەو زاتە هەمیشە و بەردەوام زیندووە، جگەلەو خوایەکی تر نییە، کەوابوو هاناو هاوارو نزاتان ڕوو لەو بێت، ملکەچ و فەرمانبەرداری بەرنامە و ئاینەکەی ئەو بن).

**پەیوەست بوونی سیفەتی ژیان:**

سیفەتی ژیان پەیوەست نییە چ بەو شتانەی کە هەن (موجود)ن چ ئەوانەی نەبوو (معدوم)ن، جا پێویستی بەشتێکی زیاد نییە تا یارمەتی بدات[1] بەڵکو ئەم سیفەتە بەخۆی بێ نیازە، هەروەك پێشتر لە باسی پەیوەست بوونی ئەم سیفەتەدا خستمانەڕوو.

---

[1] شرح المسايرة لقاسم بن قطلوبغا ٦٢.
[2] رسالة في التوحيد للطائي ٤٩.
[3] أصول الدين للغزنوي ٩٣.

## دووەم: ئەو شتانەی بۆ خوای گەورە نەبوو و ئەستەمن

ئەستەمە بۆ خوای گەورە دژەکانی ئەو سیفەتە پێویستانەی کە پێشتر خستمانەڕوو و سەلماندمان، کە بریتین لە:

نەبوون دژی بوون، پەیدابوون دژی بێ سەرتا بوونە، لە ناوچوون و فەوتان دژی هەرمانە، هاوشێوەبوون و وێکچوون بە بەدیهێنراوان دژی پێچەوانە بوونە لەگەڵ بەدیهێنراوان، پێویست بوون بە شوێن دژی بەخۆوە ڕاوەستان و بێ نیازییە، فرەیی دژی یەکتاییە، دەستەوەسانی دژی توانایە، ناچاریی دژی سیفەتی ویستە، نەزانین دژی زانین و زانستە، مردن دژی ژیانە، نەبیستن دژی بیستنە، کوێری دژی بینینە، لاڵی دژی دوانە[٢].

**بەڵگە لەسەر ئەمە:**

هەموو شتێکی بەرامبەر لەگەڵ شتێکی تر یان شتەکە خۆیەتی یاخود دژو پێچەوانەیەتی.

خوای گەورە شیاوی ئەم سیفەتە پێویستانەیە، ئەگەر وەسف نەکرێت بەم سیفەتانە ئەوا پێویستە کە بە دژو پێچەوانەی ئەم سیفەتانە وەسف بکرێت، ئەم سیفەتە دژانەش کەم و کورتین، بوونی کەم و کورتی بۆ خوای گەورە شتێکی ئەستەمە.

کەواتە بوونی ئەو سیفەتە دژو پێچەوانانە شتی نەبوو و ئەستەمن بۆ خوای گەورە[٣].

## سێیەم: ئەو شتانەی بۆ خوای گەورە دروستن

بۆ خوای گەورە دروستە کە هەر کارێك شیاوی بوون (ممكن) بێت بیکات یان نەیکات[٤]، وەك: بەدیهێنان، ڕەحمەت، سزا، مراندن و زیندوو کردنەوە....

---

[١] شرح أم البراهين للسنوسي وحاشية الدسوقي عليه ١٠٨.

[٢] شرح الخريدة للدردير ٨٦ و شرح أم البراهين وحاشية الدسوقي عليه ١٢٠ و شرح الجوهرة للباجوري ١٦٣-١٦٥ تبعا للسنوسي، و رسالة في التوحيد للطائي ٢٧.

[٣] شرح السنوسية للباجوري ١١٤، شرح الخريدة للدردير، سەرچاوەی پێشوو.

[٤] شرح أم البراهين وحاشية الدسوقي عليه ١٤٦.

هیچ شتێك لەسەر خوای گەورە پێویست نابێت، بەڵکو خوای گەورە کاراو ئەنجامدەری سەرپشکە بە ویستی خۆی چۆن دەیەوێت ئاوا هەڵسوکەوت لە موڵك و بەدیهێنراوانی خۆیدا دەکات، هیچ کەسێك بەژدار نیە لەگەڵیدا لە بەڕێوەبردنی بوونەوەردا، هیچ کەسێك لە ژێر سەرپەرشتی و دەسەڵاتی ئەو دەرناچێت و بەدەر نییە.

کردەوەکانی خوای گەورە هەموویان سەرتاپایان دانایی و حیکمەت و دادگەری و ڕاستپێکانن، جا ئەو دانایی و حیکمەتە بزانرێت یان نەزانرێت[1]، ئەمە بۆچوونی زۆربەی زانایانە.

بەڵام موعتەزیلەکان ڕایان جیاواز بوو بەوەی وتویان هەندێك کاری شیاوی بوون لەسەر خوای گەورە پێویستە، موعتەزیلەکان وتویان ئەنجامدانی کاری چاك و چاکتر (الصلاح والأصلح) لەسەر خوا پێویستە.

براهمەکانیش ڕایان جیاواز بوو کاتێك وتیان ڕەوانەکردنی پێغەمبەران لەلایەن خواوە شتێکی ئەستەمە، سەرباری ئەوەی پرۆسەی ڕەوانەکردنی پێغەمبەران دەچێتە چوارچێوەی ئەو شتانەی شیاوی بوونن[2].

**بەڵگەی عەقڵی: لەسەر ڕای زۆربەی زانایان:**

ئەگەر ئەنجامدانی هەر شتێکی شیاوی بوون لەسەر خوای گەورە بە عەقڵ پێویست بوو یان بە عەقڵ ئەستەم بوو، ئەوا ئەو کاتە شیرازەی حوکمە عەقڵیەکان تێکدەچوو، شیاوی بوون (ممکن) دەبووە پێویست (واجب) یان ئەستەم (مستحیل)، بێگومان ئەمەش پوچەڵە[3].

---

[1] رسالة التوحيد للطائي ٢٧ و غاية المرام في عقائد أهل الاسلام للحاج حمدي الأعظمي ٣٠.

[2] حاشية الجوهرة للباجوري ١٦٦ عن الأمير الشنواني.

[3] شرح السنوسية للباجوري ١١٥، باجوری وتویەتی: ئەوانەی شتی شیاوە بوونیان گوایە بەپێی عەقڵ لەسەر خوایان بەپێویست زانی موعتەزیلەکان بوون، بەهۆی ئەوەی ئەنجامدانی کاری چاك و چاکتریان لەسەر خوای گەورە بە پێویست دەزانی. هەر موعتەزیلەکان بوون کە هەندێك شتی شیاوی بوونیان بە ئەستەم زانی بۆ خوا گوایە بە بەڵگەی عەقڵی ئەمەیان کردووە.

**بەڵگەی نەقڵی:**

خوای بێ وێنە دەفەرموویێت: ﴿ وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخْتَارُ ﴾ القصص: ٦٨. واتە: (پەروەردگاری تۆیە هەر چیەکی بوێت دروستی دەکات و هەڵی دەبژێرێت).

خوای مەزن دەفەرموویێت: ﴿ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ إِن يَشَأْ يَرْحَمْكُمْ أَوْ إِن يَشَأْ يُعَذِّبْكُمْ ﴾ الإسراء: ٥٤. واتە: (ئەگەر بیەوێت ڕەحمتان پێ دەکات یان ئەگەر بیەوێت سزاتان دەدات).

خوای زانا و خاوەن توانا دەفەرموویێت: ﴿ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ یونس: ١٠٧. واتە: ("ئەی ئینسان" ئەگەر خوا تووشی ناخۆشی و زیانێکت بکات، ئەوە هیچ کەس ناتوانێت فریات بکەوێت و لەسەرتی لابەرێت جگە لەو زاتە، یاخود ئەگەر بیەوێت تووشی خێرو خۆشیەکت بکات، ئەوە هیچ کەس ناتوانێت بەری فەزڵ و بەخششی خوا بگرێت، هەر کام کە بیەوێت لە بەندەکانی بەهرەوەری دەکات (لە نازو نیعمەتی بێ شومار) ئەو زاتە هەمیشە لێ خۆشبوو و میهرەبانە).

لە ڕووی عەقڵییەوە دروستە باوەڕداران خوای گەورە لە دوارۆژدا ببینن.

## بینینی خوای پاك و بەرز

### باوەڕداران لە ڕۆژی دواییدا خوای گەورە دەبینن

تاقم و پێڕەکانی موسڵمانان ڕایان جیاواز بووە لەبارەی بینینی خوای بێ وێنە لە ڕۆژی دواییدا ڕایان جیاواز بووە، لەم بارەوە دوو بۆچوونیان هەن:

**بۆچوونی یەکەم:**

بینینی خوای گەورە شتێکی دروستە، ئەمە ڕای ئەشعەرییەکان و ماتریدییەکان و زۆربەی موسڵمانانە.

وتویانە: خوای گەورە دەبینرێت بەبێ هیچ چۆنیەتیەك لەو چۆنیەتیانەی کە لە بینینی جەستەکاندا پێویستە، بەبێ ئەوەی بینەر بەو بینینەی دەوری خوا بدات، بەڵکو بەندە سەرسام و مەندەهۆش دەبێت لەبەر گەورەیی و شکۆداریەکەی، تەنانەت وای لێدێت ناویشی نازانێت، هەست بە بوونەوەری دەوروبەریشی ناکات، چونکە عەقڵ لەوێدا

دەستەوەسان و بێ توانا دەبێت لە تێگەیشتن، هەموو شتێك دەپوكێتەوە لە ئاست گەورەیی خوای پاك و بەرز[1].

**بەڵگەی نەقڵی ئەم بۆچوونە:**

١- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ۝ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴾ القيامة ٢٢-٢٣.

(نَاضِرَةٌ): واتە: جوان و قەشەنگە، (نَاظِرَةٌ): لە تەماشاكردنەوە هاتووە، واتە: بینین.

چونكە ئەگەر (النظر): سنووری بەزاند (تعدی) بە (إلی) ئەوا بە واتای بینین دێت، هەروەك لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿ انظُرُوا إِلَىٰ ثَمَرِهِ إِذَا أَثْمَرَ ﴾ الحدید: ٩٩.

ئەگەر (النظر): بەخودی خۆی سنوور بەزێنی (تعدی) بكات، ئەوا بەمانای چاوەڕوانی دێت، هەروەك لەم فەرمایشتەی خوای پایەبەرزدا هاتووە: ﴿ انظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ ﴾

---

[1] شرح الجوهرة للباجوري ١٩٣. وشرح الخريدة للدردير و حاشية الصاوي عليه ٩٠-٩١، المسايرة على المسامرة ٤٣: (بینین جۆرێكە لە زانستی تایبەت، كە خوای گەورە لە تاكی زیندوودا بەدی دەهێنێت، مەرجدار نییە بە بەرامبەر بوون و هەر مەرجێكی تر). بڕوانە ئەمانەش: التوحيد للماتريدي م٣٩ و٧٧، أصول الدين للغزنوي ١١٦ والإنصاف للباقلاني ١٧٦ وعلم الكلام لإبن حزم ٧٥.

ئیمامی ئەشعەری لە (الإبانه ٢٥) وتویەتی: (دان دەنێین بەوەی خوای گەورە لە دواڕۆژدا دەبینرێت، وەك چۆن مانگ لە شەوی چواردەدا دەبینرێت، ئا بەم شێوەیە باوەڕداران خوای بێ وێنە دەبینن، هەروەك لە چەند گێڕانەوەیەكدا لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) هاتووە) هاوشێوەی ئەم دەربڕینە هاتووە لە: رسالة إلى أهل الثغر ٢٣٧.

لە هاوەڵان ئەمانەی خوارەوە دانیان ناوە بەوەی خوار دەبینرێت: ئەبو بەكر، عەلی كوڕی ئەبو تالیب، ئیبن مەسعود، موعازی كوڕی جەبەل، ئەبو موسای ئەشعەری، ئیبن عەبباس، ئیبن عومەر، ئەبو هورەیرە، زەیدی كوڕی سابت، حوزەیفە، موعاویە، عەممار... لە شوێنكەوتووانیش: سەعیدی كوڕی موسەیەب، تاووس، موجاهید، عیكرەمە، عەبدوڕەحمانی كوڕی ئەبو لەیلا، قەتادە، ئیبن موبارەك، شافیعی، ئەحمەدی كوڕی حەنبەل، ئەبو سەور، ئیسحاقی كوڕی ڕاهویە، تەبەری، ئیبن خوزەیمە، عەبدوڕەحمانی كوڕی ئەبو حاتەم.... جگە لەمانەش./ بڕوانە ناوی ئەم هاوەڵانە و گێڕانەوەكانیان لە: شرح أصول إعتقاد أهل السنة والجماعة ١٣٢/٣ ولاپەڕەكانی دواتر.

الحديد: ١٣. واته: (چاوەڕێیەكمان بكەن تا لە نووری ڕوخسارتان بەهرەوەر ببین). ئەگەر بە (في) سنوور بەزێنی (تعدي) بكات، ئەوا بەمانای زۆر بیركردنەوەو پەندوەرگرتن دێت، هەروەك لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿ أَوَلَمْ يَنظُرُوا۟ فِى مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ الأعراف: ١٨٥. و بۆ نمونە، دەڵێیت: (نظرت في الكتاب والأمر: تەماشای پەرتوكەكەم كرد و لەم كارە ڕامام) واتە: تێفكریم و لێی وردبوومەوەو پەندم لێ وەرگرت.

بەمانای میهرەبانیش دێت ئەگەر سنوور بەزێنی (تعدی) كرد بە (لام)، بۆ نمونە: (نظر السلطان لفلان: حوكمڕان تەماشای فڵانە كەسەی كرد) واتە: بە چاوی میهرەبانیەوە بۆی ڕوانی[1].

٢- ئەم فەرمایشتەی خوای پاك و بەرز: ﴿ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ﴾ یونس: ٢٦. (الْحُسْنَى): بەهەشتە، و (وَزِيَادَةٌ): بریتیە لە بینینی خوای پاك و بەرز، هەروەك چەسپاوە بە فەرموودەی ڕاست كە (صوهەیب) گێڕاویەتیەوە[2]، وتویەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ﴾ یونس: ٢٦. واتە: (بۆ ئەوانەی چاكەیان كردووە، پاداشتی چاكترو بەهەشتی بەرین و زیاتریش ئامادەیە بەچەندەها قات). جا فەرمووی: **(إذا دخل أهل الجنةِ الجنة و أهلُ النارِ النار، نادى منادٍ: يا أهل الجنة ان لكم عند الله موعداً، يريد أن ينجزَكُموه، فيقولون: وماهو؟ ألم يُثقل موازينَنا، ويُبَيض وجوهنا، ويُدخلنا الجنة، و يُجرنا من النار؟ قال فيكشف لهم الحجاب، فينظرون اليه، قال: فوالله ما أعطاهم شيأً أحب**

---

[1] شرح العقائد العضدية للدواني ١٧٦/٢، المواقف و شرحه للسيد الشريف ١٣٠/٨-١٣١، الإرشاد للجويني ١٨٢، شرح العقيدة الطحاوية ٢٠٩، حادي الأرواح لابن القيم ٢٣٠، أصول الدين للبغدادي ١٠٠. بەراوردی كردووە لەگەڵ ئەوەی ئەشعەری لە (الإبانه ٣٥) باسی كردووە.

[2] شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٢١١ و لوامع الأنوار البهية ٢٤١/٢ ولاپەڕەكانی دواتر، شرح الجوهرة للباجوري ١٩١، الغنية للشيخ عبدالقادر ٦٢.

ئەبو بەكر (خوای لێ ڕازی بێت) وتویەتی: (الزياده) واتە: تەماشاكردنی خوای گەورە./ الإنصاف للباقلاني ٤٧.

الیهم من النظر الیه ولا أقر بأعینهم)[1] واتە: دوای ئـەوەی بەهەشـتیەکان چـوونە بەهەشت و نیشتەجێ بوون و خەڵکی دۆزەخیش چوونە دۆزەخەوە، ئەوا بانگـدەرێك بانگدەکات: ئەی دانیشـتووانی دۆزەخ خـوای پایەبـەرز پـەیمانێکی بـەئێوە دابـوو دەیەوێت پاداشتتان بداتەوە بەم هۆیەوە، جا دانیشتووانی بەهەشت دەڵـێن: دەبێـت چی بێت؟! ئەدی کردەوە چاکەکانمانی گـران نـەکردووە و ڕوومـانی گـەش و جـوان نەکردووە؟! ئەدی نەیخستووینەتە بەهەشتەوەو، و لەدۆزەخ ڕزگاری نـەکردین، وتـی: ئینجا پەردە لا دەچێت، تەماشای خوای گەورە دەکەن و دەیبینن، و وتـی: سـوێند بـەخوا هـیچ شـتێکیان نـەدراوەتێ و خۆشەویسـتر بـێ لـە تەماشـا کردنـی پەروەردگاریان، و چاویان بە هیچ شتێك ئۆقرە ناگرێت بـە ئەنـدازەی ئـەم تەماشـا کردنە.

٣- ئەم فەرمایشتەی خوای پاك و بەرز: ﴿لَن تَرَىٰنِي﴾ الأعـراف: ١٤٣. بە بەڵگە هێنانەوە ئەم فەرمایشتە، لەسەر بینینی خوا، لە چەند ڕوێکەوەیە دەبێت:

أ- گومـان نابرێـت بـە موسـا کـە لەگـەڵ خـوای گـەورە دوواوەو نێـردراو و پێغەمبەریـەتی، شـارەزاترین کەسـی سـەردەمی خـۆی بـووە سـەبارەت بـە پەروەردگار، پرسیار بکات و داوای شتێك بکات کە بـۆ خـوای گـەورە نەشـیاو

---

[1] شرح العقیدة الطحاویة لإبن أبي العز ٢١١ ولوامع الأنوار البهیة ٢٤١/٢ ولاپەڕەکانی دواتر.
زانایان وتویانە: وێچواندنەکە بۆ بینینەکەیە، کە کردرای بینەرە نەوەك بۆ بینراوەکە، واتاکەی بریتییە لەوەی: ئێوە پەروەردگارتان دەبینن بەشێوەیەك گومان ناهێڵێت و دوودڵی لەناودەبات، وەك چۆن مانگ دەبینن بەبێ گومان و دوودڵی./ لوامع الأنوار ٢٤٣/٢.
فەرموودەکەی صوهەیب لەم سەرچاوانەدا هاتووە: مسند أحمد و اللفظ لە ٣٣٣/٤. وصحیح مسلم: کتاب الایمان ٧٨ باب اثبات رؤیة المؤمنین في الآخرة ربهم سبحانه رقم ١٨١، وسنن الترمذي: کتاب صفة أهل الجنة، باب ما جاء في رؤیة الرب تبارك و تعالى ٢٣٠/٧ و سنن ابن ماجە: المقدمة، باب فیما أنکرت الجهمیة ٦٧/١.

بێت، تەنانەت ئەمە هەر زۆر نەبوو و ئەستە[1]، چونکە ناکرێت هیچ یەکێك لـە پێغەمبەران نە شارەزا بێت سەبارەت بە حوکم و یاساکانی ناسینی خواو[2]. جا چۆن دەکرێت کەسی موعتەزیلی - کە نکۆڵی دەکات لە بینینی خوا، هـەروەك دەخرێتەڕوو - لە موسا زیرەکترو شارەزاتر بێت، لەبارەی ئـەوەی کـە چ شـتێك پێویستە و چ شتێکیش نەبوو و ئەسـتەمە بـۆ خـوای گـەورە، لەگـەڵ ئـــەوەی ئامانج و مەبەست لە ڕەوانەکردنی پێغەمبەران (صلى الله عليه وسلم) بانگـەوازی کردن بووە بۆ بیروباوەڕی ڕاست و ڕەوان و کارو کردەوەی چاك[3].

ب- خوای پاك و بەرز فەرموویەتی: ﴿ لَن تَرَىٰنِي ﴾ الأعراف: ١٤٣. نەیفـەرمووە: مـن نابینرێم یان بینینی من دروست نییە یاخود من شتێکی بینراو نیم.

جیاوازی لە نێوان هەر دوو وەڵامەکـە ڕوون و ئاشـکرایە، ئایـا نابینیـت کـە کەسـێك بەردێکی لە دەمدابوو و کەسێکی تر واگومانی برد خواردەمەنیە، وتی: بدەرە منیش، جا وەڵامی ڕاست ئەوەیە: کە ناخورێت. بەڵام ئەگەر خواردەمەنی بوو، دروسـتە بوترێـت: تـۆ نایخۆیت. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە بینراوە بەڵام تواناو هێزی موسـا - لەم دونیایەدا - بەرگەی ئەو بینینە ناگرێت بەهۆی لاوازی توانای مرۆڤــ لەم دونیایەدا لە بەرامبەر بینینی خوای پاك و بەرز. جا ئـەم فەرمایشـتەی خـوای گـەورە ئەمـە ڕوون دەکاتــەوە: ﴿ وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِي ﴾ الأعـراف: ١٤٣. واتە: (بەڵام سەیری ئەم چیایە بکە، جا ئەگەر مایەوە لە جێگەی خۆیـدا ئـەوا لـەوەو دوا تۆش من دەبینیت). بە موسای ڕاگەیاند کە چیاکە لەگەڵ ئەو هێـزو توونـدو تۆکمەییــەی

[1] شرح العقيدة الطحاوية ٢١٣، حادي الأرواح ٢٢٣، المسايرة شرح المسامرة ٤٠، الإنصاف للباقلاني ١٧٧، تمهيد الأوائل ٣٠٢، أصول الدين للبغدادي ٩٩، الإرشاد للجويني ١٨٣.

[2] شرح الجوهرة للباجوري ١٩٥، سەيرى: المواقف ١١٧/٨. بكە.

[3] المسامرة ٤١، شرح العقائد العضدية للدواني ١٦٨/٢، الإبانة للاشعري ٤١.

كە هەیەتی ئەوا بەرگە ناگرێت لە بەرامبەر درەوشانەوەكە لەم دونیایەدا، جا چـی دەڵێـی بۆ ئەو مرۆڤـــەی كە بەلاوازی دروست كراوە[1].

٤- ئەم فەرمایشتەی خوای پاك و بەرز: ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَـٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَـٰرَ ﴾ الأنعام: ١٠٣. واتە: (دەزگای بینایی ناتوانێت ئەو زاتە ببینێت، زانیاری ئەو خوایـە هەموو شتێكی گرتۆتەوە).

ڕووی بە بەڵگە هێنانەوەی ئەم ئایەتە: خوای گەورە ئەمەی باس كـردووە لـە میانـەی پێداهەڵـدان و سـتایش، زانراویشـە پێداهەڵـدان و سـتایش بـە سـیفاتی چەسـپاو و ڕەتكەرەوەیش دەبێت، ئەگەر شتێكی بوونی بوو وەك: ڕەتكردنەوەی وەنەوزە و نوسـتن كـە ئەمەش بەدەرخستنی تەواوی ڕاگرایەتی و سەرپەرشتارییە، ڕەتكردنەوەی مردن، تەواوی و كامڵی ژیان دەگەیەنێت. ڕەتكردنـەوەی مانـدوێتی و بێـزاری تـەواوی و كـامڵی توانـا و دەسەڵات دەگەیەنێت... .

ئایەتەكە بەڵگەیە لەسەر تەواوی و كامڵی گـەورەیی خـوا، ئاماژەیـە بـۆ ئـەوەی كـە گەورەترە لە هەموو شتێك و دەشبینرێ، بەڵام لەبەر ئەوەی خوای گەورە سـنوردار نییـە و بێ سنورو جێگەیە، ئەوا چاو ناتوانێت پـەیی پـێ ببـات و دەوری بـدات، خـوای گـەورە فەرموویەتی: ﴿ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا ﴾ طـە: ١١٠.[2] واتە: (هـەرگیز نـاتوانن ئاگـاداری زانست و زانیاری بێ سنوری ئەو زاتە پەیی پێ ببەن).

٥- ئەم فەرمایشتەی: كاتێك هەندێك لە خـەڵكی بـە پێغەمبـەری خوایـان وت: ئایـا پەروەردگارمان لە دوارۆژدا دەبینین؟ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: **(هل تضارون في القمر ليلة البدر؟)** واتە: ئایا بە بینینی مانگی چواردە لەشـەودا سـەغڵەتتان

[1] حادي الأرواح ٢٢٣ و شرح العقيدة الطحاوية ٢١٣ و بڕوانە چەند لایەنێكی تریش جگەلەوەی من باسم كردن. و بڕوانە: الإبانة للأشعري ٤٣.

[2] حادي الأرواح ٢٢٨ وشرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٢١٤، سەیری چەند لایەنێكی تریش بكە جگەلەوەی من باسم كردن. بڕوانە: التذكرة للقرطبي ٤٩٢ ولاپەڕەكانی دواتر.

دەکات. وتیان: نا ئەی پێغەمبەری خوا، جا فەرمووی: (**فهل تضارون في الشمس ليس دونها سحاب؟**) واتە: ئایا بە بینینی خۆر کە دەوری بە هەور نەگیرابێت سەغڵەتتان دەکات. وتیان: نا ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: (**فانكم ترونه كذلك**)[1] واتە: جا خوای گەورە بەڕۆشنی و بێ گومان وەك وێنەی ئەمانە دەبینن.

ئیبن قەییم لە کتێبی (حادي الأرواح) گێڕەڕەوەکانی ئەم فەرموودەیەی ژماردووە کە گەلەك زۆرن[2](نزیکەی سی هاوەڵ گێڕاویانەتەوە)[3].

پاش ئەوەی (نەسەفی) ناوی "بیست و یەك" کەسی لە هاوەڵان هێناوە، وەك: ئیبن عومەر، ئیبن مەسعود، ئیبن عەبباس، صوهەیب، ئەنەس... وتویەتی: هەموو ئەوانەی فەرموودەیان لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گێڕاوەتەوە لەسەر چەسپاندنی بینینی خودا، هەر کەسێك دان نەنێت بە بینینی خوا ئەوا مەبەستی بەدرۆخستنەوەی گێڕەڕەوەکانی هەبووە[4].

هاوەڵان یەکدەنگ و کۆك بوون لەسەر ئەوەی خوای گەورە لە دوارۆژدا دەبینرێت، ناوبراوان زۆر بەجۆش و خرۆش بوون و دەپاڕانەوە کە خوای گەورە خۆشی و چێژی بینینی خۆی بەوان ببەخشێت و باوەڕیان بەمە هەبوو، ئەمەش بەهۆی چەند ئاماژەیەك لە حاڵی

---

[1] شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٢١٦ ولوامع الأنوار البهية ٢/٢٤٣.
فەرموودەی: هەندێك لە خەڵكی بە پێغەمبەری خویان وت... تاد: صحيح البخاري، واللفظ له، ٩٧ كتاب التوحيد، ٢٤ باب قول الله تعالى: ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ ﴾ القيامة، رقم ٧٤٣٧. وفي صحيح مسلم: ١ كتاب الإيمان، ٧٩ باب معرفة طريق الرؤية، رقم ١٨٢، وكلاهما عن أبي هريرة رضي الله عنه.

[2] حادي الأرواح ٢٣١ و لاپەڕەکانی دواتر، و لوامع الأنوار البهية ٢/٢٤٣.

[3] شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٢١٧.

[4] تبصرة الأدلة للنسفي ١/٤٠٠، نقله اللامشي في التمهيد ٨٠.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و کۆمەڵێك لە دەربڕینە ڕاشکاوەکانی کە گەلێك زۆرن[1].

مالیك (ڕەزای خوای لەسەر بێت) وتویەتی: کە خوای گەورە دوژمنەکانی بێ بەش کردن لە بینینی خۆی ئەوا خۆشەویستەکانی شاد کرد بە بینینی، ئینجا ئەگەر باوەڕداران خوای گەورە نەبینن لە دواڕۆژدا ئەوا سەرزەنشتی بێ باوەڕان نەدەکرا بە بێ بەش کرانیان لە بینینی خوا، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ كَلَّآ إِنَّهُمۡ عَن رَّبِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ لَّمَحۡجُوبُونَ ﴾ المطففين: ١٥.[2] واتە: (نەخێر، ڕزگار بوونیان نییە، چونکە بەڕاستی ئەو ڕۆژە بەربەست هەیە لە نێوان تاوانباران و پەروەردگاریاندا و بێ بەش دەبن لە بینینی ئەو زاتە). شافیعی وتویەتی: (کاتێ تاوانباران بەهۆی تاوانەوە لە بینینی خوا بێ بەش بوون، ئەوا ئەمە بەڵگەیە کە خۆشەویست و وەلیەکانی خوا بە ڕەزامەندی پەروەردگار، پەروەردگار دەبینن)[3].

**بەڵگەی عەقڵی:**

أ- خوای گەورە هەبوو و هەیە، هەر شتێکیش هەبێت دروستە ببینرێت، کەواتە دروستە خوای پاك و بەرز ببینرێت[4].

ب- وەك چۆن دروستە خوای پاك و بەرز بەبێ چۆنیەتی و شێوازو وێنە بناسرێت، بەهەمان شێوە دروستە بەبێ چۆنیەتی و شێوازو وێنە ببینرێت[5].

---

[1] باقلانی لە (الإنصاف ١٨١) یەکدەنگی هاوەڵانی بەشێوەیەکی گشتی هێناوە لەسەر دروستی بینینی خوا، باسی ئەوەشی کردووە کە ڕاجیاییەکە تەنها لە بابەتە لاوەکییەکاندا بووە. غەزالی لە (الإقتصاد فی الإعتقاد ٤٦) وتویەتی دەکرێ یەکدەنگی هەبوویێت لە ناو هاوەڵان لەم بارەوە، ئەمەش بەهۆی بەجۆش و خرۆش بوونیان بۆ چێژ وەرگرتن لە بینی زاتی پیرۆزی خوا. سەیری ناوی ئەو کەسانە بکە کە لە نزاکانیدا بە کوڵ ئەم داوایەیان کردووە لە: حادي الأرواح ٢٥٨.

[2] شرح الجوهرة للباجوري ١٩١.

[3] شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٢١٢ وحادي الأرواح ٢٢٨. سەیری وتەکەی شافیعی بکە لە کتێبەکەیدا: أحكام القرآن ٤٠ و لەم سەرچاوەیەشدا: شرح إعتقاد أهل السنة والجماعة ١٨٤/٣.

[4] شرح الجوهرة للباجوري ١٩١، الإنصاف للباقلاني ١٨١، تمهيد الأوائل ٣٠٢.

[5] المسامرة ٤٣.

**بۆچوونی دووەم:**

دروست نییە خودا ببینرێت بە چاوەکان. ئەمە ڕاو بۆچوونی جەهمی[1]، موعتەزیلە[2]، خواریج[3]، ئیبازی[4]، ئیمامی[5]، نەجاری[6]، زیدی[7]، ڕاوەندییەکانە[8].

**بەڵگەی نەقڵی ئەم بۆچوونە:**

ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەیە ﴿ لَن تَرَىٰنِي ﴾ و ئەم فەرمایشتە: ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَـٰرُ ﴾ الأنعام: ١٠٣.[9]

بەرپەرچیان دراوەتەوە: بەوەی ئەم دوو ئایەتە، وەك بەڵگە پشتی بۆچوونی ئەوان ناگرن بەڵکو بەڵگەن لە دژیان[10].

زەمەخشەری - کە یەکێکە لە موعتەزیلەکان - وا گومانی برد کە ئامرازی (لن) لە ئایەتەکەدا مەبەستی ئەوە دەگەیەنێت، کە بۆ هەتایی و هەرگیز خوای گەورە نابینن، بەم جۆرەی ڕاڤەی کردووە تا پشتی ئەو بۆچوونەی خۆیان بگرێت لەوەی کە دەڵێن ئەستەمە خوای گەورە ببینرێت. بەڵام بەرپەرچی دراوەتەوە بەم بەڵگانەی خوارەوە:

---

[1] التنبيه والرد ١١٦، الإنصاف للباقلاني ١٧٦، الملل والنحل للشهرستاني ٧٤/١، المواقف ٣٩٩/٨، خطط المقريزي ٣٤٩/٢ و٣٥١، شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٢٠٧.

[2] الإبانة للأشعري ٥٥، الإنصاف للباقلاني ١٧٦، التمهيد للامشي ٨٢، شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٢٠٧، المواقف ١١٥/٨، شرح المسايرة لقاسم بن قطلوبغا ٣٧.

[3] الإنصاف للباقلاني ١٧٧، التمهيد للامشي، شرح المسايرة لقاسم بن قطلوبغا، شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز، سەرچاوەکانی پێشوو.

[4] مشارق أنوار العقول ٣٦٢/١، شرح غاية المراد ٣٦، الحق الدامغ ٢٥، البعد الحضاري ٣٠٢.

[5] كشف المراد ٣٣٢١، الباب حادي عشر وشرحه النافع ٢٢، مفتاح الباب ١٣٨. لە پوختەی (علم الكلام ٢٢١) چەند دەقێك هاتووە کە ئاماژە بەوە دەدات بینینی خودا لە دوارۆژدا تەنها بە دڵە.

[6] الإنصاف للباقلاني ١٧٦، التمهيد للامشي ٨٢.

[7] الأساس لعقائد الأكياس ٧٩، المعالم الدينية ٨٢.

[8] التوحيد للامشي ٨٢.

[9] ڕاڤەی ئەم دوو ئایەتە پێشتر خرایەڕوو. (وەرگێڕ).

[10] شرح الطحاوية لإبن أبي العز ٢١٢.

أ- کە ئامرازی ( لن) مەبەستی هەتا هەتایی و هەمیشەیی (تأبید) ناگەیەنێت، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەیە کە: خوای گەورە هەواڵی داوە لەبارەی جولەکەکان کە هەرگیز ئاواتی مردن ناخوازن، خوای گەورە لەم بارەوە فەرموویەتی: ﴿ وَلَن يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ﴾ البقرة: ٩٥. واتە: (هەرگیز بەهۆی ڕەفتاری نادروست و دەست پێشخەری ناپەسەندیانەوە ئاواتی مەرگ ناخوازن). لەگەڵ ئەوەی جولەکەکانیش لە دواڕۆژدا ئاواتی مردن دەخوازن تا لە سزا ڕزگاریان ببێت: ﴿ وَنَادَوْا يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُم مَّاكِثُونَ ﴾ الزخرف: ٧٧. واتە: (دۆزەخیەکان هاوار دەکەن، ئەی مالك "کە فریشتەی سەرپەرشتیارە": دەبا پەروەردگارت بمانکوژێت). ئەگەر ئامرازی ( لن ) بۆ هەتا هەتایی و هەمیشەیی و دونیا و دواڕۆژی گرتبایەوە وەك چۆن موعتەزیلەکان واگومیان بردووە، ئەوا نەدەبوو جولەکەکان لە دواڕۆژدا ئاواتی مەرگ و مردن بخوازن.

ب- ئامرازی ( لن ) بۆ جەخت کردنەوەیە، بە ئاماژەو بەڵگەی فەرمایشتی (أبدا: هەرگیز)، (ئیبن مالیك) وتویەتی:

ومَن رأى النفي بلَن مؤبَّدا    فقولَه اردُدْ وسواه فاعضُدا

واتە: هەرکەسێ بۆچوونی وابێت ئامرازی ( لن) لە پاڵ وشەی هەرگیز (أبدا) بە مانای نەرێ و ڕەتکردنەوەی هەمیشەییە، ئەوا وتەکەی ڕەتکەرەوەو پشتگیری پێچەوانەی وتەکەی ئەو بکە.

ئەگەر مەبەستیشی ئەوە بێت کە هەتا هەتایە خوای گەورە نابینن ئەوە مەبەستی نەبینینە لە دونیادا نەوەك لە دواڕۆژ، بە بەڵگەی ئامرازی ( لن) لە ئایەتی پێشوودا ﴿ وَلَن يَتَمَنَّوْهُ ﴾ البقرة: ٩٥.[1]

---

[1] شرح الطحاوية لإبن أبي العز ٢١٤، والمواقف وشرحه للسيد الشريف ١٤٢/٨، شرح العقائد العضدية للدَّوَّاني ١٨٠-١٨١، وأصول الدين للبغدادي ٩٩.

**بەڵگەی عەقڵی:**

ئەگەر خوای گەورە بینراو بوایە، ئەوا دەکەوتە بەرامبەر بینەر، ئەوکاتــە دەهاتــە نــاو شوێن و جێگەدا.

بەرپەرچیان دراوەتەوە: بەوەی شوێن و جێگە بۆ خوای بێ وێنە ئەستەمە، چونکە بینین جۆرێکە لە دەرکەوتن و زانیاریە بۆ بینەر، خوای گەورە وەك هێزێك لە بینــەردا ئامــادە و دروستی دەکات، بەبێ ئەوەی ئەندازەی پەیی پێ بردنەکە کەم ببێتەوە، مەرجیش نییە لــە بینینەکەدا: بینراو بکەوێتە بەرامبەر بینەر یان شوێنگر بێت، جگە لەمانەش[1].

**لە کۆتاییدا:**

ئەم ڕاجیاییە شتێکی مەترسیدار نییە، مادەم هەردوو تاقمەکــە خــوای گــەورە بــەپاك دەزانن لە جێگە و شوێنگرتن و جەستەدار کردن.

---

[1] شرح الجوهرة للباجوري ١٩٢، المسامرة ٤١ و٤٣، شرح العقائد العضدية للدواني ١٧٨/٢، شرح الخريدة للدردير ٩٣. بەڵام ڕاڤەکاری (العقيدة الطحاوية)، لەو کەسانەیە کە سیفەتی بەرزی (العلو) بۆ خوای گەورە دەچەسپێنن، پاش ئەوەی بەڵگەی لە قورئان و سوننەتەوە هێناوەتەوە لەسەر بینینی خوای گەورە، ئەوا لە ٢١٩ وتویەتی: (لەم دەقانە بەڵگەی ئەوە دەست دەکەوێت کە خوای گەورە لەلای سەرەوەی بوونەوەرو بەدی هێنراوەکانیەتی، ئەگەرنا ناچێتە عەقڵەوە خوای گەورە ببینرێت بەبێ ئەوەی لە بەرامبەر بینەر بێت، هەرچی بڵێ خوای گەورە دەبینرێت بەبێ ئەوەی پێویست بەوە بکات خوای گەورە لە شوێندا بێت، ئەوا با پێداچوونە بۆ عەقڵی خۆی بکات، جا یا ئەوەتا ململانێ لەگەڵ عەقڵی خۆی دەکات یاخود شتێ لە عەقڵی دا هەیە. ئەگەر وتی: خوای گەورە دەبینرێت بەبێ ئەوەی لە بەرامبەرو لە پشتەوەو لە پێشەوەو لە لەلای چەپ یان ڕاستی یان لای ژوورەوەی یان ژێرەوەی بێت ئەوا هەر کەسێ کە گوێبیستی بێت بە فیترەتی سەلامەت و پاکی خۆی بەرپەرچی دەداتەوە). بڕوانە: حادي الأرواح ٢٦٩. ئەمە بۆچوونی (حەشەویەکانە) کە شوێن و جێگەیان بۆ خوای گەورە بڕیارداوە/ الاقتصاد في الاعتقاد للغزالي ٤٤.
لە ڕووی عەقڵییەوە دروستە خودا ببینرێت، لە ڕووی بەڵگەی بیستراوەوە پێویستە، بۆچوونی ئەوانەی دەڵێن خوا دەبینرێت و ئەوانەش دەڵێن نابینرێت بە بەڵگەکانییەوە لەم سەرچاوەدا هەیە: نهاية الإقدام ٣٥٦، الإرشاد للجويني ١٦٦.

ئەو تاقمەی نکۆڵی لە بینینی خوا دەکات، ئەوە بەو نکۆڵی کردنـەی مەبەسـتی پـاك ڕاگرتن و بەدوور گرتنی خوای گەورەیە لە جێگە و شوێنگرتن و جەستەدار کردن.

ئەو تاقمەش کە بۆچوونی وایە خوای گەورە دەبینرێت، ئەوا بۆچـوونی وایـە کـە دەق و بەڵگەکان زۆر ڕاشکاون لەبارەی بینرانی خودا، بۆیە ئەم تاقمەش بینینـی خـوای گـەورەی چەسپاند، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خوای گەورە بەپاك دەزانێت لە شوێن و جەستە، ئەم تاقمە وتویەتی: (خوای گەورە بێ چۆنیەتی و دەورەدران دەبینرێت).

دواتر ئەو بینینەی کە چەسپاندوویانە بۆ خوا ئـەوا بۆچـوونیان وایـە لـە دوارۆژدایـە. هەروەك زانراوە کە بارودۆخی ژیانی دوارۆژ بە بارودۆخی ژیانی دونیا ناچێت.

### بینینی خوای گەورە لە دونیادا:

ئوممەت یەکدەنگ و کۆك بووە لەسەر ئەوەی کە هیچ کەسێك لە دونیادا خـوای گـەورە نابینێت.

بەڵام ڕاجیابوونە لە بارەی ئەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خـودای لـە دونیـادا بینیـووە، هەنـدێکیان دەڵـێن بینویـەتی، هەندێکیشـیان وتویانـە نـەیبینیوە، هـەر دوو تاقمەکەش بەڵگەی نەقڵیان بەدەستە.

لەبەر ئەوەی ئەم ڕاجیاییە هەبووە، ئەوا هاوەڵان هەر یەکەیان ڕایەکی لـەم دوو ڕایـەی هەبووە، دەکرێ بینی بێتی یان نەیبینی بێـت، ئـەوا پێویسـت ناکـات پێـداگیری بکرێـت لەسەر یەکێك لەم دوو ڕایە[1].

❊❊❊

---

[1] شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٢٢٢، و نقل عن القاضي عياض. بڕوانە وتەکەی (قازی عیاز) لە: الشفا ١٩٥.

## قەزاو قەدەر[1]

زانایانی کەلام لە لێکدانەوەو ڕاڤەی قەزاو قەدەر ڕاجیاییان هەیە، بۆیە لەم بارەوە بۆ چەند ڕاو بۆچوونێك دابەش بوونە، بۆ نمونە ماتوریدییەکان دەڵێن:

قەزا: بریتییە لەوەی خوای گەورە شتەکان بەدی بهێنێت بە وردەکاری و ڕێك و پێکی و لێزانییەکی تەواو.

قەدەر: بریتییە لە ئەندازە گیری کردنی خودا بۆ هەر بەدیهێنراوێك لە گشت لایەنێکیەوە، لە باشی یان خراپی، سوود یان زیان... تاد، واتە: زانستی هەربوو و بێ سەرەتای خودایە بە سیفەتەکانی بەدیهێنراوان.

بەم پێیە: قەزا دەبێتە پەیدابوو، چونکە سیفەتی کار (ئاوەڵکار)ە. لەبەرئەوەی قەزا بەدیهێنانە، بەدیهێنانیش ئاوەڵکارە.

قەدەر لە مێژینەو بێ سەرەتا دەبێت، چونکە بۆ سیفەتی زانست دەگەڕێتەوە، سیفەتی زانستیش یەکێکە لە سیفەتەکانی زاتی خودا.

بەڵام ئەشعەرییەکان بۆچوونیان ڕێك پێچەوانەی بۆچوونەکەی ماتریدیەکانە، بەوەی پێناسەی قەزا بۆ قەدەر و پێناسەی قەدەر بۆ قەزایان داناوە[2].

---

[1] اللامشي لە (التمهيد ١١٣) وتویەتی: (بابەتی: قەزاو قەدەر، هیدایەت دان و گومڕا کردن، بریتین لە خودی بابەتی بەدیهێنرانی کردەوەکان، چونکە مەبەستمان ئەوەیە: کە کوفرو و گوناهەکانی تر بە قەزاو قەدەری خودایە، واتە: خوای گەورەی بەدیان دەهێنێت، چونکە قەزا بە بەدیهێنان دێت، هەروەك لەم فەرمایشتەدا هاتووە: ﴿ فَقَضَىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَاتٖ ﴾ فصلت: ١٢).

[2] شرح الجوهرة للباجوري ١٨٨-١٨٩، لوامع الأنوار البهية ٣٤٥/١، حاشية العدوي على كفاية الطالب الرباني ٥٣/١ عن إبن قاسم، رسالة في التوحيد للطائي ١٢٣، و پێناسەی ئەشعەریەکان بۆ ئەم دوو چەمکە لە: شرح الموقف للسيد الشريف ١٨٠/٨. سەیری وتەی ماتریدییەکان بکە لە: أصول الدين للغزنوي ١٨٤. بەهەمان شێوەی ماتوریدییەکان (سەدویکشی) پێناسەی بۆ (قەدەر) کردووە، هەروەها (عەمری تەلانی) هەمان پێناسەی ماتوریدییەکانی بۆ چەمکی (قەزا)ی کردووە، هەر دوو ناوبراو ئیبازین. (موحەممەد ئەتفەش) کە یەکێکە لە ئیبازییەکان هەمان پێناسەی ئەشعەرییەکانی کردووە بۆ چەمکی قەزاو قەدەر./ البعد الحضاري ٤٢١-٤٢٢.

قەزاو قەدەر دەگەڕێنەوە بۆ سیفەتی زانست و سیفەتی ویست و پەیوەست بوونی سیفەتی توانا، بەڵام لەبەر گەورەیی و مەترسیداری نەشارەزایی و نەزانی لەم بابەتەدا ئەوا زانایانی كەلام بەڕاشكاوی لەم بارەوە دوواون[1].

## باوەڕ بوون بە قەزاو قەدەر و پەیوەندی بە بیرۆكەی جەبر

باوەڕ بە قەزاو قەدەر بنەمایەكە لە بنەماكانی باوەڕ. ئەمەش لە فەرموودەی ڕاست و دروستهاتووە، كاتێك (جبریل) هاتە لای پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) و پرسیاری لێ كرد لە بارەی ئیسلام و باوەڕ بە مەبەستی شارەزا كردنی موسڵمانان لە حوكمەكانی ئایینەكەیان، جبریل وتی: (**فأخبرني عن الایمان؟ قال: أن تؤمن بالله و ملائكته و كتبه و رسله و الیوم الآخر، و تؤمن بالقدر خیره و شره، قال: صدقت**) واتە: پێم بڵێ باوەڕ چییە؟ لەوەڵامدا فەرمووی: باوەڕت هەبێت بەخواو فریشتەكانی و كتێبەكانی و پێغەمبەرانی و بە ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر چ چاكە یان خراپە بێت. وتی: ڕاستت وت. موسلیم گێڕاویەتیەوە.

مەبەست لە باوەڕ بوون بە قەزاو قەدەر بریتییە لە:

١- بەڕاست دانان و دان پێدانانی بەوەی خوای گەورە بە هەربوو و بێ سەرەتا زانایە بە بەدی هێنراوان، ئاگادارە بەوەی كە لە داهاتوودا پێش دێت، بۆ نمونە: لە هەربوو و بێ سەرەتاوە زانیویەتی و ئاگادار بووە بەوەی تاكو بەویست و ڕەزامەندی تەواوی خۆی هۆكارەكان دیاری دەكات و دەیگرێتەبەر، دواتر پاداشت یان سزای دەدات لەسەر كارەكەی.

٢- بەڕاست دانان و باوەڕ بوون بەوەی كە بوونەوەرو بەدی هێنراوان بە ویستی خوای گەورەو بەپێی زانستە بێ سەرەتاو هەربووەكەی هاتوونەتە بوون. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نُحْيِ الْمَوْتَىٰ وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ ۚ وَكُلَّ شَيْءٍ

[1] شرح الجوهرة للباجوري ١٨٩.

أَحۡصَيۡنَٰهُ فِيٓ إِمَامٖ مُّبِينٖ ﴾ يس: ١٢. واتە: (بێگومان هەر ئێمە مردوان زیندوو دەكەینەوە، هەرچی كردویانەو دەیكەن تۆماری دەكەین لەگەڵ ئاسەوارەكانیشیاندا، هەموو شتێكمان لە كتێبێكی ئاشكرادا "تۆمارگەی تایبەتدا" بەوردی تۆمارو ئامار كردووە).

كەواتە بەم پێیە هیچ پەیوەندیەك نییە لە نێوان قەزا و قەدەرو بیرۆكەی جەبر و سەرپشكی (اختيار)، چونكە سیفەتی زانست ئەركی دەرخستنی ئەو شتانەیە كە لە داهاتوودا ڕوودەدەن.

ئیمامی نەوەوی لە (شەرحی صەحیح موسلیم)دا وتویەتی: (خەتابی وتویەتی: زۆرێك لە خەڵكی لەوانەیە واگومان ببەن كە واتای قەزاو قەدەر بریتیە لەوەی خوای پاك و بەرز بەندە ناچار دەكات لەسەر كردنی ئەو شتەی كە خوای گەورە ئەندازەگیری بۆ كردووەو بڕیاری لەسەر داوەو زانیویەتی كە دێتەجێ، و واتاكەی بەو شێوەیە نیە كە ئەوان وای بۆ چوون، بەڵكو مانای بریتیە لە: هەواڵدان لە بارەی ئەوەی كە خوای پاك و تاك زانابووە بەوەی بەندە چ دەكات ئەمەش بە ئەندازەگیری لەلایەن پەروەردگارەوە، و خێرو خراپەشی بۆ بەندە بەدیهێناوە)[1].

پرسیار لە (عەبدوڵای كوڕی عومەر) كرا لەبارەی ئەو كەسەی گوناهی گەورە ئەنجام دەدات، لەگەڵ ئەنجامدانی گوناهەكانیش پاساوی ئەوە دێنێتەوە دەڵێت ئەمە لە زانستی خوادا هەبووە، جا (ئیبن عومەر) توڕەبوو و وتی: بەڵێ خوای گەورە پێشتر زانیویەتی بەڵام ئەم زانینە پاڵنەر نەبووە تا ئەو گوناهەكە بكات[2]، بەڵكو خوای گەورە بە زانستە هەربوو و بێ سەرەتاكەی دەزانێت كە خەڵكی ڕێگەی جیا جیا هەڵدەبژێرن، ئەو

---

[1] بڕوانە ئەمانە: كبرى اليقينيات الكونية ١٦٨-١٦٩، رسالة في التوحيد للطائي ١٢٣، لوامع الأنوار البهية ١/٣٤٥.
فەرموودەكە: پێم بڵێ باوەڕ چییە... تاد: صحيح مسلم: ١ كتاب الإيمان، أول باب بيان الإيمان والإسلام والإحسان، رقم ٨، عن عمر بن خطاب (رضي الله عنه).
بڕوانە وتەی (نەوەوی) لە: شرح صحيح مسلم ١/١٩٩ بهامش إرشاد الساري للقسطلاني.
[2] رسالة في التوحيد للطائي ١٢٤.

ڕێگەیەشیان بۆ ئاسان دەکات کە هەڵی دەبژێرن، لەسەر ئەو شتەش دەیانهێڵێتەوە.

زانست و زانینی پەروەردگار مانای ناچار کردنی بەندە نییە لە هەر کارێکدا، بۆ نمونە مامۆستا پێشتر دەزانێت کە ئەو قوتابیە وانەکانی فەرامۆش بکات، ئەوا لە تاقیکردنەوەدا سەرکەوتوو نابێت. ئینجا دەکرێت ئەو قوتابییەی سەرکەوتوو نەبووە، ڕەخنە لە مامۆستا بگرێت و پێی بڵێت: کە پێشتر زانیت من سەرکەوتوو نابم ئەمە هۆکار بوو کە سەرکەوتوو نەبم؟ تەنانەت هیچ کەسێك قسەی لەم جۆرە ناکات.

جا زاستی پەروەردگار سیفەتێکی دەرخەرە، کە کاریگەری وەك سیفەتی توانا نییە، کەواتە ماناکەی بریتی نییە لە ناچار کردنی بەندە لەسەر شتێك.

## دەست گرتن بە هۆکارەکان و باوەڕ بوون بە قەزاو قەدەر

باوەڕ بە قەزاو قەدەر تێك ناگیرێت، دژی دەست گرتن نییە بە هۆکارەکانەوە، بەڵکو پێویستە مرۆڤ هەوڵ و کۆشش بکات.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ فَٱمۡشُواْ فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦۖ وَإِلَيۡهِ ٱلنُّشُورُ ﴾ الملك: ١٥. واتە: (بگەڕێن بەهەموو گۆشەو کەنارێکدا، لەو ڕزق و ڕۆزیەش بخۆن کە پێشکەشتان دەکات، دڵنیاشبن کە سەرەنجام گەڕانەوەتان بۆ لای ئەو زاتەیە). جا تەمبەڵی قبوڵ نییە و ناکرێت پاڵ بدەیتەوەو بشڵێیت بە تەمای خوای.

خوای بێ وێنە، فەرمانی بە مرۆڤ کردووە کە خۆی بەرەو تیاچوون نەبات، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ ﴾ البقرة: ١٩٥. واتە: (خۆتان بەرەو تیاچوون مەبەن).

هەروەها فەرمانی پێداوە کە تێ بکۆشێت لە پێناوی خوادا، خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿ وَجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ التوبة: ٤١. واتە: (جیهادو تێکۆشان بکەن بەماڵ و سامان و گیانتان لە پێناوی خوادا). خوای بێ هاوەڵ و هاوبەش

فەرموویەتی: ﴿ خُذُواْ حِذْرَكُمْ ﴾ النساء: ٧١.[1] واتە: (ئەوەی خۆتان پێدەپارێزن بیگرنە دەست و ئامادە باش بن).

## دەرکەوتنی بابەتی قەزاو قەدەر

بابەتی قەزاو قەدەر لەلایەن سەرجەم زانایانی موسڵمانەوە وروژێنرا، کاتێك بینیان بەڵگەکانی قورئان و سوننەت و عەقڵ لە ڕووکەشدا تێکگیرانیان لەم بارەوە هەیە[2].

لەو بەڵگانەی کە لە ڕووکەشدا بەڵگەن لەسەر ئەوەی مرۆڤ ناچار کراوە:

أ- خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿ قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا ﴾ التوبة: ٥١. واتە: ("ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)" بڵێ: هەرگیز لەوە زیاترمان بۆ پێش نایەت جگە لەوەی کە خوا بۆی نوسیوین).

ب- خوای بێ وێنە دەفەرموویت: ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴾ الصافات: ٩٦. واتە: (خوای گەورە بەدیهێنەری ئێوەو کردەوەکانیشتانە).

پ- پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموویت: **(الشقيُّ من شَقِيَ في بطن أمه، و السعيد مَن وُعِظَ بغيره)** واتە: بەدبەخت ئەوەیە کە لە سکی دایکی دا بەدبەختە، و خۆش بەختیش کەسێکە پەند بەهۆی کەسانی تر وەردەگرێت.

ت- نمونە لە بەڵگەی عەقڵی: ئەگەر بڵێین بەندە خۆی سەرپشکە، بەدیهێنەری کردەوەکانیەتی، ئەوا دەبا توانای خوای گەورە دیاریکراو نا گشتگیر بوایە، ئەو کاتە بەندە دەبووە هاوبەشی خوا لە بەدیهێنانی جیهاندا.

ئەو بەڵگانەی جەخت دەکەنەوە لەسەر ئەوەی بەندە سەرپشکە نەك ناچار کراو، بۆ نمونە:

أ- خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ ﴾ المدثر: ٣٨. واتە: (هەموو کەس بارمتەی دەست پێشخەری خۆیەتی).

---

[1] سەرچاوەی پێشوو ١٢٣.

[2] إبن رشد لە (مناهج الأدلة ٢٢٣) وتویەتی: (ئەگەر لەبارەی ئەم بابەتەوە ورد ببیتەوە لە بەڵگەکانی نەقڵ و عەقڵدا بۆت دەردەکەویت کە تێکگیراون).

ب- خـوای باڵادەسـت و خـاوەن شـکۆ دەفـەرمووێت: ﴿ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ ﴾ الكهف: ٢٩. واتە: (ئەوەی دەیەوێت با باوەڕ بێنێت و ئـەوەی دەیـەوێت با کافرو بێ باوەڕ بێت).

پ- نمونە لە بەڵگەی عەقڵی: ئەگەر وتمـان مرۆڤـ ناچـار کـراوە، ئـەوا مانـای وایـە تواناکەی هیچ کاریگەریەکی نییە، ئەگەر مرۆڤـ خاوەن توانای کاریگـەر نـەبێت ئەوا هیچ واتایەك بۆ فەرمان و ڕێگری و پاداشت و سزاکان نامێنێتەوە[1].

## ڕێبازو مەزهەبەکانی موسڵمانان لەبارەی قەزاو قەدەر

زانایان کردەوەکانیان بۆ دوو بەش دابەش کردووە:

١- **کردەوە ناچاریی و خۆنەویستەکان (إضطراري):** بریتین لەو کردەوانەی کـە مرۆڤـ دەستی تێدا نییە، توانای بەسەردا ناشکێت، تیایدا سەرپشك نییـە، وەك: جوڵـەی لەرزینی دەست و جوڵەی کۆ ئەندامی دەمار و دەزگای هەرس.

گشت تاقمە ئیسلامیەکان کۆکن لەسەر ئەوەی ئەم کردەوانە بـەدیهێنراون لەلایـەن خواوە، بەندە هیچ ڕۆڵێکی تیایدا نییە، مرۆڤـ هیچ پاداشتێك یان سزا لەسەر ئـەم کردەوانە وەرناگرێت.

٢- **کردەوە سەرپشکی و خۆویستەکان (إختياري):** بریتین لەم کردەوانـەی کـە مرۆڤـ توانای بەسەردا دەشکێت، سەرپشکە تیایدا، وەك: ڕۆیشتن و قسەکردن.

تاقمە ئیسلامیەکان لەسەر ئەم کردەوانە ڕاجیاییان هەیە، چەند تێڕوانین و مەزهەبێکی جیایان هەیە لەم بارەوە، کە بریتین لەمانە[2]:

---

[1] بڕوانە: دراسات في العقائد - د. عرفان ٢٤٥ و دواتریش.
فەرموودەی: بەدبەخت ئەوەیە کە بەدبەختە لە ...تاد: صحيح مسلم: ٤٦ كتاب القدر، ١ باب كيفية الخلق الآدمي...، رقم ٢٦٤٥، عن إبن مسعود (رضي الله عنه).

[2] شرح الجوهرة للباجوري ١٦٧-١٦٨ و١٧٨، كبرى اليقينيات الكونية ١٦٩ و رسالة في التوحيد للطائي ١٢٧.

**یەکەم: مەزهەبی جەبریەکان:** شوێنکەوتووی جعدی کوڕی درهم و جهمی کوڕی صفوانی راسبین. ئەمانە پێیان وابوو کە مرۆڤ توانا و خاوەن ویست نییە، سەرپشك نییە، وتویانە: مرۆڤ ناچارە لە هەر کارێکدا کە دەیکات، وەك: پەڕەی مریشکە لە باوەشی بادا.

دەڵێن خوای گەورە کردەوەکانی لە مرۆڤدا دروست کردووە، بە هەر دوو جۆرییەوە چ ئەو کردەوانەی مرۆڤ تیایاندا خۆویست و سەرپشکە چ ئەو کردەوانەش کە خۆنەویست و ناچارە، ئەمەش وا بە ئەندێشەی هەندێك کەسدا دەهێنێت کە ئەو کردەوانە خۆویستن و مرۆڤ تیایدا سەرپشکە کەچی وا نییە، تەنها لە ڕووی خوازراو (مجازی)یەوە پاڵ دەدرێنە لای مرۆڤ، واتە ناوی بێ ناوەرۆکە، هەروەك پاڵدەدرێتە لای شتی بێ گیان و ڕووەك، دەڵێن: ڕووەك خۆراکەکەی هەرسکرد، بەردەکە جولاً.

پێیان وابوو: سزاو پاداشت، ڕاسپاردن (تکلیف)ی شەرعی هەمووی ناچارییە.

بە بەڵگەکانی پێشتر بەڵگەیان هێنایەوە کە لە ڕووکەشدا مانای ناچار کراوی مرۆڤیان دەگەیاند[1].

بەرپەرچیان دراوەتەوە:

بەوەی دەبێت ئەم دەقانە تەئویل بکرێن، تا ڕێك بکەون و کۆك بن لەگەڵ ئەو دەقانەی لەگەڵیان تێك دەگیرێن، ئەو دەقانەی کردەوەیەك دەدەنە پاڵ بەندە کە شایەنی سزاو پاداشت و سوپاس و سەرزەنشت وەرگرتن بێت، چونکە خوای گەورە

---

[1] پێشتر قسە لەسەر مەبەهەب و بۆچوونەکانی جەبریەکان کرا لە میانەی دەروازەی مەزهەبە ئیسلامییەکان، سەیری ئەم سەرچاوانەش بکە کە پێشتر ناومان بردن: مقالات الإسلاميين ٣٣٨/١، الفَرق بين الفرق للبغدادي ٣٣٣، الملل و االنحل للشهرستاني ٧٣/١، التبصير في الدين ٩٠، المواقف وشرحه للسيد الشريف ٣٩٨/٨، خطط المقريزي ٣٤٩/٢، شرح الجوهرة للباجوري ١٧٥، مشارق أنوار العقول ١٨٦/٢، دراسات في الفرق ٢٦٣، تأريخ المذاهب الإسلامية ١٠٢، مقدمة مناهج الأدلة ١٠٥.

ستەمی لەسەر خۆی قەدەغە کردووە، تەنها لەسەر ئەو کردەوەیە لێپرسینەوە لەگەڵ بەندە دەکرێت کە بە ویست و ڕەزامەنی خۆی ئەنجامی دابێت.
خوای پاك و تاك دەفەرموویت: ﴿ يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَادِلُ عَن نَّفْسِهَا وَتُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾ النحل: ١١١. واتە: (ڕۆژێك دێت کە هەموو کەس خەمی خۆیەتی، بەرگری لەخۆی دەکات، پاکانە بۆ خۆی دەکات، "گوێ بەکەسی تر نادات، ئەو ڕۆژە" هەر کەسە پاداشتی کردەوەکانی دەدرێتەوە و ئەو خەڵکە ستەمیان لێ ناکرێت).
قسەی ئەمانە سەر دەکێشت بۆ ئەوەی کە هیچ کەسێك ڕاسپێرراو (مکلف) نییە، بە جێبەجێ کردنی فەرمانەکان و ڕێگری کردن لە خراپەکان، هیچ واتایەك بۆ ڕەوانەکردنی پێغەمبەران نامێنێتەوە، هیچ سودێکیش ناهێڵێت لەوەی پاداشتی چاکە و سزای خراپە بدرێت.

**دووەم: مەزهەبی موعتەزیلەکان:** ئەمانە کۆکن لەسەر چەند بابەت و بۆچوونێك، لەوانە:

١- بەندەکان خۆیان کردەوەکانیان بەدیدێنن و دروست دەکەن بە توانایەك کە خوای گەورە لە بەندەکاندا بەدیهێناوە[1]، خوای گەورە هیچ ئەندازەگیری و بەدیهێنانێکی نەکردووە بۆ کردەوەی بەندەکان چ بە دروست کردن چ بە لە ناوبردن.

٢- خوای مەزن لە هەربوو و بێ سەرەتاوە زانایە بە کردەوەکانی بەدیهێنراوەکانی، هەر زاناشە بەوەی کە کێ باوەڕ دێنێت، کێ بێ باوەڕ دەبێت. بەم بۆچوونەی موعتەزیلەکان جیان بەتایبەت لە قەدەریەکان - شوێنکەوتووانی معبد الجهني و غيلان الدمشقي - ئەوانەی کە نکۆڵیان دەکرد لە بوونی زانستی هەربوو و بێ سەرەتای خوای بێ وێنە، قەدەریەکان پێیان وایە کە خوا زانا نییە سەبارەت بە کردەوەی بەندەکان تا دوای ئەنجامدرانی.

[1] شرح الجوهرة للباجوري ١٦٨ و ١٧٥.

٣- مرۆڤــ بکەرو ئەنجامدەری سەرپشکە، بەو توانا پەیدابووەی کار دەکات کە خـوای گەورە بە چاودێری خۆی پێی بەخشیوە، جا بەندەش چۆن ویستی بوو ئاوا تواناکـەی ئاراستە دەکات.

٤- فەرمان و ویستی خوای گەورە پەیوەستن بەیەکەوە.

خوای گەورە دەیەوێت کە بـەتاك و تـەنهای بـزانین و باوەڕمـان بـە پێغەمبـەرانی هەبێت، نوێژ ئـەنجام بـدەین.... بەهـەمان شـێوە فەرمانیشـمان پـێ دەکـات بـە ئەنجامدانی کارە ناوبراوەکان، نایەوێت تاوان و کوفر ئەنجام بدەین و فەرمانیش بـەو شتانە ناکات، بەڵکو هەموو کارەکان مرۆڤــ لە ویستی و کاری خۆیەتی.

ئەمانەی خوارەوە بەڵگەی موعتەزیلەکانن:

ئەگەر خوای گـەورە کـردەوەی بەنـدەکانی بـەدیهێنابا، ئـەوا بەنـدەکان سەرپشـك نەدەبوون، چونکە:

أ- ئەوا ڕاسپێرران (تکلیف)ی شەرعی بە جێبەجێ کردنی فەرمانەکان و ڕێگری کـردن لە خراپەکان پوچەڵ دەردەچوون.

ب- سزاو پاداشت پوچەڵ دەبوونەوە.

پ- سوودی ڕەوانەکردنی پێغەمبەران نەدەما[1].

---

[1] لە بەشی مەزهەبە ئیسلامییەکان قسەکرا لەسەر بۆچوون و مەزهەبی موعتەزیلەکان. سەیری ئەم سەرچاوانەش بکە: دراسات في الفرق و العقائد ٢٦٨-٢٦٩، مذهب الإسلاميين لعبدالرحمن البدوي ٤٨/١ و لاپەڕەکانی دواتر، مقدمة مناهج الأدلة ١٠٦.

دەردیر لە (شرح الخريدة ٦٢-٦٣) وتویەتی: (بەم پێیە ئەو بۆچوونەی جەبرییەکان پوچەڵ بووەوە کە دەڵێن بەندە هیچ هێزێکی هاوڕێ لەگەڵ کردەوەکەیدا نییە، بەڵکو بەندە ناچار کراوە چ لە دەرو دەروون، وەك ئەو تاڵە مووە وایە کە لە هەوادایە و با دەیجوڵێنێت و مووەکەش هیچی بەدەست نییە. بۆچوونی قەدەرییەکانیش پوچەڵ دەکاتەوە کە پێیان وایە هێزی پەیدابووی بەندە بەپێی ویستی بەندەکە کاریگەری دروست دەکات. بێ گومان جەبرییەکان کافرن، چونکە مەزهەبی ئەوان لە دەرەنجامدا ڕاسپێررانی مرۆڤ ڕەتدەکاتەوە کە پێغەمبەران "سڵاوی خوایان لێبێت" هێناویانە. ڕاجیاییش هەیە لەسەر ئەوەی قەدەرییەکان کافرن یان نا، ڕای ڕاست ئەوەیە کە کافر نین، هەر چەند ناوبراوان بەپێی بۆچوونەکانیان بەوە پەیوەست دەبن کە هاوبەش بۆ خودا بڕیار بدەن، بەڵام

ئەم بۆچوونەی موعتەزیلەش بەرپەرچ دراوەتەوە، بەوەی:
ئەو کردەوانەی بەندە بە ویست و ڕەزامەندی خۆی دەیان کات و تیایاندا سەرپشکە، ئەوا ئەم کردەوانەی هەر لەلایەن خوداوە بەدیهێنراون، بەم بەڵگانەی خوارەوە:
خودای مەزن دەفەرموویت: ﴿ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا ﴾ الفرقان: ٢. واتە: (هەموو شتێکی دروست کردووە بە ئەندازەو نەخشەی ڕێك و پێکی بۆ هەموو شتێك داناوە). هەروەها دەفەرموویت: ﴿ وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴾ الصافات: ٩٦.[1]
واتە: (خوای گەورە بەدیهێنەری ئێوەو کردەوەکانیشتانە). هەروەها ئەو بەڵگانەش کە ئەشعەرییەکان دەیهێننەوە، کە پاش کەمێکی تر دەخەینەڕوو.

**سێیەم: مەزهەبی ئەشعەریەکان:** ئەو کردەوانەی بەندە تیایاندا سەرپشکە ئەوا خودا ئەو کردەوانەشی بەدیهێناوە، بەندە هیچ کاریگەرییەکی نییە لە بەدیهێنانی کردەوەکانی دا، خوای گەورە هێز لە بەندەدا دروست دەکات بۆ ئەوەی بتوانێت کردەوە ئەنجام بدات.

---

لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێن خوای گەورە بەندەی بەدیهێناوەو توانا و ویستی بەندەکەشی بەدیهێناوە، بەم پێیەش کردەوەی بەندە لە ڕاستیدا کردوەوەی خوایە).

[1] باقلانی لە کتێبی (الإنصاف ١٤٤ و لاپەڕەکانی دواتر) مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعەتی ڕوونکردۆتەوەو وتویەتی تەنها خوای گەورە بەدیهێنەری مرۆڤ و کردەوەکانیەتی...، هەروەها بەرپەرچی بۆچوونەکانی موعتەزیلەکان، نەجارییەکان، جەهمییەکان و ڕافیزەکانی داوەتەوە بەوەی خوای گەورە کردەوەی بەندەکان بە توانای بەندەکانیشەوە بەدیهێناوە.... بەڵگەکان و گفتوگۆیەکانی هێناوە. لە ئیبن فورك (ڕەزای خوای لێبێت) گێڕاوەتەوە کە لەگەڵ (صاحبی کوڕی عوباد)دا بوو لە ناو باخ و بێستانێکدا، ناوبراو هەندێك لەو بۆچوونانەی هەبوو، دەستی برد و بەری دارێکی لێکردەوەو بە (ئیبن فورك)ی وت: ئایا من نەبووم کە بەری ئەو دارەم لێکردەوە؟ (ئیبن فورك) لە وەڵامدا پێی وت: ئەگەر وا دەزانیت کە تۆ جیابوونەی بەری دارەکەت لە دراەکە بە دیهێناوە، دە بتوانە وەك خۆی بەیەکیان بگەیەنە و بیانگێڕەوە بۆ دۆخی جاران، صاحبی ناوبراو دەم کوت بوو و توانای وەڵامدانەوەی نەبوو.

کەواتە کردەوە لەلایەن خواوە بەدیدەهێنرێت و بەندەش ئـەنجامی دەدات و دەسـتی دەخات (کسب)ی دەکات[1].

بەدەستهێنان و دەست خستن (کسب) بریتییە لەوەی توانای بەنـدە هاوتـەریب بێـت لەگەڵ کردەوەی خوای گەورە، بەو واتایەی:

ئەگەر بەندە ویستی کردەوەیەك لە کردەوەکان ئەنجام بدات، ئەوا خـوای گـەورە لـە هەمان ساتدا توانا لە بەنـدەدا دروسـت دەکـات بـۆ ئەنجامـدانی، بەمـەش بەنـدە کردەوەکە دەست دەخات نەك دروستی بکات[2].

---

[1] لە بەشی مەزهەبە ئیسلامییەکان قسەکرا لەسەر بۆچوون و مەزهەبی ئەشعەرییەکان. وسەیری ئەمانەش بکە: دراسات في الفرق ٢٦٩، تأريخ المذاهب الإسلامية ١٨٤.

سەرباری ئەوەی ئەشعەرییەکان بۆچوونیان وایە کە کردەوەی چاك و خراپ هەر لە خواوەیە، بەڵام دەشڵێن وا بە ئەدەبترو جوانترە کە تەنها کاری چاك بدرێتە پاڵ خودا، کردەوەی خراپیش وەك بەدەستهێنان بدرێتە پاڵ خودی مرۆڤ، ئەگەرچی وەك بەدیهێنان بدرێتە پاڵ خودا، خوای مەزن دەفەرموویێت: ﴿ مَّآ أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ۖ وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفْسِكَ ﴾ النساء: ٧٩. واتە: بەدەستهێنان. ئەم فەرمایشتەی خودای بێ وێنە ڕاڤەی دەکات: ﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ ﴾ الشورى: ٣٠. واتە: (هەر بەڵاو نەهامەتییەکتان بەسەر هاتبێت، ئەوە دەرەنجامی ئەو کارو کردەوانەیە کە بە ئارەزووی خۆتان دەتان کرد). سەبارەت بەم فەرمایشتەش: ﴿قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ النساء: ٧٨. واتە: (بڵێ: هەر هەمووی "هەرچی پێش دێت" لەلایەن خواوەیە). ئەوە گەڕانەوەیە بۆ ڕاستییەکە. ڕامێنە لە وتەکەی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێت): ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَنِى فَهُوَ يَهْدِينِ ﴿٧٨﴾ وَٱلَّذِى هُوَ يُطْعِمُنِى وَيَسْقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴾ الشعراء: ٧٨-٨٠. واتە: (ئەوەی دروستی کردووم هەر ئەو ڕێنموویم دەکات. ئەو زاتەش خۆی خۆراکم پێدەبەخشێت و تینوێتیم دەشکێنێت. کاتێکیش کە نەخۆش دەکەوم، ئەوە هەر ئەوە چارەسەرم دەکات و شیفام بۆ دەنێرێت). ئیبراهیم (سڵاوی خوای لێبێت) نەیوتوە: خودا منی تووشی نەخۆشی کرد، ئەمەش وەك ئەدەب نواندنە، گەرنا هەموو کردارێك هەر لە خواوەیە./ شرح الجوهرة للباجوري ١٦٨، الإنصاف للباقلاني ١٥٢.

[2] مقدمة مناهج الأدلة ١٠٨، بغدادی لە (أصول الدين ١٣٣-١٣٤) وتویەتی: (هەندێك لە هاوەڵانمان نمونەی هێناوەتەوە لەسەر بەدەستهێنان "کسب" بە بەردی گەورە، کە دەکرێت یەکێك نەتوانێت هەڵیگرێت، کەچی یەکێکی تر دەتوانێت بەردەکە هەڵبگرێت، ئەگەر هەر دووکیان بەیەکەوە

یاخود بەدەستهێنان (کسب) بریتییە لەوەی ئەگەر بەندە بڕیاری دا و سووربوو لەسەر ئەنجامدانی کارێك ئەوا خوای گەورە کردەوەکەی تێدا بەدیدەهێنێت[1].

ڕۆڵی توانای بەندە بریتییە لە دەست خستنی کردەوەکە، ڕۆڵی توانای خودای مەزن بریتیە لە بەدیهێنانی کردەوەکە. بەم پێیە: خودای گەورە توانایەکی دەستخەری بە مرۆڤ داوە کە هیچ کاریگەرییەکی لە بەدیهێنانی کردەوەدا نییە، خودای گەورە ئەو توانا بەدیهێنراوە بە بەندە دەبەخشێت، بەمەش بەندە دەتوانێت کردەوەکە بە توانای خودا دەست بخات، ئا ئەمەیە خاڵی مەبەست و ڕاسپێرران و سزاو پاداشت[2]، خودای بێ وێنە دەفەرمووێت: ﴿ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ ﴾ البقرة: ٢٨٦. واتە: (هەر کارێکی چاك ئەنجام بدات لەسەر خۆیەتی و هەر خراپەیەکی کردبێت تەنها یەخەی خۆی دەگرێت و لەسەر خۆیەتی). ئایەتەکە بە ڕاشکاوی پرۆسەی بەدەستهێنان "کسب" دەسەلمێنێت.

ئەمە بۆچوونی: ئیبازییەکانیشە، کە هاوڕان لەگەڵ ئەشعەرییەکان و دەڵێن: خودای گەورە کردەوەکانمان بەدیدەهێنێت، ئێمەش بەدەستیان دێنین، ئێمە سزاو پاداشت لەسەر بەدەستهێنانەکە وەردەگرینەوە نەوەك لەسەر ئەوەی خودا کردەوەکانمانی

---

دەستیاندا بەردەکە و هەڵیان گرت ئەوا خۆی لە خۆیدا کەسی دووەمەکە بەردەکەی هەڵگرتووە، چونکە بە تەنیاش هەر دەیتوانی هەڵی بگرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لاوازەکە هەر پێی دەوترێت بەرد هەڵگر چونکە ئەویش بەشدارە لە هەڵگرتنەکەدا ئەگەرچی بەبێ ئەویش بەردەکە هەر هەڵبگیرێت. بەهەمان شێوە بەندە ناتوانێت بە تەنها خۆی کردەوەی خۆی ئەنجام بدات، ئەگەر خوای گەورە بیەوێت کردەوەیەك بێنێتە بوون کە بەندە بەدەستی دێنێت و "کسب"ی دەکات، ئەوا خودای گەورە دەتوانێت بەبێ بەدەستهێنانی بەندەکەش کردەوەکە بەدیبهێنێت. جا بوونی کردەوەکە لە ڕاستیدا بە کرداری خودایە، سەرباری ئەوەی بەندە ئەنجامدەری ڕاستەقینەی کردەوەکە نییە، ئەوا بەندەکە هەر بکەرە. بە ڕاستی ئەمە وتەیەکی بەجێ و ژیرانەیە).

[1] طوالع الأنوار ٢٠٠.

[2] البعد الحضاري ٤٥٣.

بەدیهێناوە[1].

ماتوریدییەکان[2]، ئیبن تەیمیە[3]، ئیبازییەکانیش[4] تیۆری بە دەستهێنانی کردەوەیان پەسەند کردووە. ئەم بۆچوونەیان میانڕەو و مامناوەندە لە نێوان بۆچوونی جەبریەکان و معتزلەکان[5].

ئەمانەش بەڵگەکانیان:

أ- خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا﴾ الفرقان: ٢. واتە: (هەموو شتێکی دروست کردووە بە ئەندازەو نەخشەی ڕێك و پێکی بۆ هەموو شتێك داناوە). خودای بێ وێنە دەفەرمووێت: ﴿خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ﴾ (الأنعام: ١٠٢، الرعد: ١٦، الزمر: ٦٢، الغافر: ٦٢) واتە: (بەدیهێنەری هەموو شتێکە). کردەوەش دەچێتە ڕیزی شتەکان، کەواتە کردەوەش دروستکراو بەدیهێنراوی خوایە.

ب- ئەگەر بەندە بەدیهێنەری کردەوەکانی بوایە و سەرپشك و سەربەخۆش بوایە، ئەوا پێویست بوو بە تێروتەسەلی زانابوایە بە بەدیهاتنی کردەوەکەی، شتێکی ئەستەمە مرۆڤ دەوری هەموو ڕووەکانی کردەوە بدات، چونکە جار وایە بەندە لە کاتی بێ

[1] مشارق أنوار العقول ١٧١/٢.

[2] التوحيد للماتريدي م ٤١ و ٢٢٥، غەزنەوی لە (أصول الدين ١٨٩) وتویەتی: (بزانە ڕێبازی ڕاست ئەوەیە کە کردەوەی چاك و خراپ لە خوداوە بزانین، بەهەمان شێوە کردەوەی چاك و خراپ لە بەندەشەوە بزانین، بەندە سەرپشکە لەوەی چ کردەوەیەك هەڵدەبژێرێت و ئەنجامی دەدات، بەڵام لە ڕووی تواناو ویستەوە سەرپشك نییە... نابێت بەندە پاساو بۆ خۆی بێنێتەوەو بڵێت: قەزاو قەدەر بەم شێوەیە ئەو کردەوانەی پێکردم جا تاوانی من چییە؟ پێویستە لەسەر بەندە ڕەچاوی جێبەجێ کردنی فەرمانەکان و ڕێگری کردن لە خراپەکان بکات). بڕوانە ڕای ماتریدییەکان لە: مقدمة مناهج الأدلة ١١١.

[3] ئیبن تەیمیە وتویەتی: (بەندە ویست و توانا و کرداری هەیە کە خوای گەورە پێی بەخشیووە، جا کردەوەکان بۆ خودا ڕاستەقینەن بەڵام بۆ بەندە بە دەستهێنانە، خوای گەورە کردەوەکان بەدیدەهێنێت)./ خلاصة علم الكلام ١٦٣ عن العقيدة الواسطية لإبن تيمية.

[4] البعد الحضاري ٤٦٤.

[5] مشارق أنوار العقول ١٧١/٢.

ئاگایی و بێ هۆشیدا کردەوە ئەنجام دەدات بە شێوەیەکی ڕێك و پێك و تۆکمە، کەچی ئاگاشی لێ نییە. کەواتە پێویست بوو کە سەرچاوەی کردەوەکان خوای پاك و بەرز بێت[1].

دوای خستنەڕووی ڕای جەبرییەکان و ئەوانەش باوەڕیان بە تیۆری بەدەستهێنانی کردەوە هەیە، بەدەر دەکەوێت کە هەر دوو کۆمەڵەکە بۆچوونیان وایە کە خوای گەورە بەدیهێنەری کردەوەیە، بەڵام ئەوە هەیە کە جەبرییەکان دەڵێن کردەوە بە توانای هەربوو و بێ سەرەتای خودا بەدیهاتووە، بەپێچەوانەوە ئەوانەی باوەڕیان بە تیۆری بەدەستهێنانی کردەوە هەیە، دەڵێن خودای گەورە بە توانای پەیدابوو کردەوە لە بەندەدا بەدیدەهێنێت لەو کاتەی بەندە کردەوەیەك دەستنیشان دەکات[2].

**چوارەم: مەزهەبی ئیمامی:** شێخ (موزەفەر) بەم شێوەیە بۆمان وێنە دەکات:

(کردەوەکانمان لەلایەك، لە ڕاستیدا کردەوەی ئێمەن، ئێمەش هۆکاری سروشتیانین، لەژێر توانا و ویستی ئێمەدان، لەلایەکی ترەوە ئەندازەی بۆ کراوە لەلایەن خوای گەورە و لەژێر دەسەڵاتی ئەو دایە، چونکە هەر خوایە کە بەدیهێنەری بوونەوەرو بوون و بەخشەریەتی، جا ئێمەی ناچار نەکردووە لە کردەوەکانماندا تا ئەو سزایەی لە بەرامبەر تاوانەکانمان پێمان دەدات ستەم کردن بێت لێمان، چونکە ئێمە توانامان هەیە و سەرپشکین لە ئەنجامدانی کردەوەکانماندا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەدیهێنانی کردەوەکانی بە ئێمە نەسپاردووە، تا وای لێبێت لە ژێر دەسەڵاتی دەربچێت، بەڵکو بەدیهێنان و فەرمان تەنها بۆ خوایە، هەر ئەویشە توانای بەسەر

---

[1] دراسات في الفرق ٢٧٣.

[2] خلاصة علم الكلام ١٦٦، لەم خاڵەوە هەندێك بۆچوونیان وایە کە ئەوانەی باوەڕیان بە تیۆری بەدەستهێنانی کردەوەیان هەیە بەهەمان شێوە ئەوانیش جەبریین.

هەموو شتێکدا هەیە و دەوری بەندەکانی داوە)[1].

ئەمە ئەو مانایەیە کە لە ئیمامەکان گێردراوەتەوە: بەندە نە ناچارکراوەو نە سەرپشکە، بەڵکو لەو نێوەندەدایە[2].

جیاوازی نێوان بۆچوونی ئیمامییەکان و بۆچوونی ئەشعەرییەکان ئەوەیە، ئیمامییەکان بۆچوونیان وایە مرۆڤ خۆی کردەوە دەستنیشان دەکات و بەدیدەهێنێت، بەڵام ئەمەش بەو توانا مرۆییەیە کە خودای گەورە پێی داوە. بەڵام ئەشعەرییەکان دەڵێن: مرۆڤ کردەوە دەستنیشان دەکات، بەڵام خودا کردەوەکە بەدیدەهێنێت لە ڕێگەی بەدیهێنانی توانای پەیدابوو هاوڕێ لەگەڵ ویست و هەڵبااردنی کردەوەکە[3].

**پێنجەم: مەزهەبی (ئیبن روشد):** إبن رشد پێی وایە ئەو تێکگیرانەی کە لە دەقەکاندا هاتووە بە هەڕەمەکی و بێ هودە نییە، بەڵکو مەبەستێکی خوای یاسادانەر بووە، تا بەو زانایانە ڕابگەیەنێت کە توانای تێگەیشتنیان هەیە لە قورئان و سوننەت بە شێوەیەکی دروست چارەسەری ئەم کێشەیە بکەن، بەشێوەیەك کە ئەو گومانە لا ببات، کە لەوانەیە بووبێتە هۆی پەرتبوونی نێوان ئەوانەی موشتومڕ دەکەن.

ناوبراو ڕای وایە: ناکرێت مرۆڤ تەواو ناچار کراوبێت، ناشبێت بە ڕەهایی سەرپشك بێت، بەڵکو ڕاستی لە میانڕەو بووندایە لە نێوان دوو ڕاو بۆچوونەکە، بەم پێیە دەبێت کە دان بنێین بەوەی مرۆڤ لە کردەوەکانی نە تەواو سەرپشکە نە بەڕەهاییش ناچاریش کراوە، دەشوەستێتە سەر دوو هۆکار: ویستێکی ئازاد، کە لەهەمان کاتدا پەیوەستە بە هۆکاری دەرەکی کە بەردەوام لەسەر یەك ئاراستە

---

[1] عقائد الامامية ٤٤.

[2] عقائد الإمامية سەرچاوەی پێشوو، الشيعة بين الأشاعرة و المعتزلة للحسني ٢١٢، و بڕوانە: أصول الدين الاسلامي لمحمد علي ناصر ٤٠ و لاپەڕەکانی دواتر، و عقائد الامامية الاثني عشرية للسيد إبراهيم الزنجاني ٣٦-٣٧.

[3] خلاصة علم الكلام ١٦٥-١٦٦.

دەڕوات کە خوای گەورە لە بوونەوەردا بەدیهێناوە[1].

مامۆستا مەحمود قاسم بۆچوونی وایە کە ئـەم چارەسـەرە لـە هـەر چارەسـەرێکی تـر نزیکترە لە عەقڵ و ڕەزامەندی شەرع[2]، کە زانستی سەردەمیش هەر بـۆ ئـەوە دەچـێت، کە نکۆڵی لە ئازادی هەڵبژاردن (اختیار) ناکات، بڕواشی هەیە بە بوونی یاسای گشـتی و ڕێك و پێك لە سروشتدا[3].

**پرسیارو وەڵام:**

ئەگەر وترا بە دیهێنانی بوونەوەران لایـەن خـواوە بـە ئەنـدازەی دیـاری کـراو بـەپێی زانستی پێشووتری، ئەوە دەگەیەنێت کە: مرۆڤــ ناچارکراوە لە کارەکانیدا.

وەڵامەکەی بریتییە لەوەی: ئەو کردارانـەی کـە خۆنەویسـت و ناچـارین مرۆڤــــ پێـی ڕاسپێرراو ئەرکدار نییە، هەروەك پێشتر خرایەڕوو.

سەبارەت بەو کردارانەی کە بەندە تیایاندا سەرپشکە ئەوا بەدیهێنراون، هەروەك پێشتر لە ڕای ئەشـعەریەکاندا خرایـەڕوو، ئەمـە مانـای وا نییـە کـە مرۆڤــــ لـە ئەنجامـدانی کارەکانیدا ناچار کراوبێت، ئەمەش بەوەی:

مرۆڤــ لە کردەوەکانیدا سەرپشکە بەو وەسفەی کردەوەکانی بەدەست دەخـات نـەوەك بەو وەسفەی بەدیهێنەری کردەوەکانی بێت.

لەبەر ئەوەی بەدەستهێنانی کردەوە (واتە: خۆڕازاندنەوەت پێ) لەسەر دوو شت بەندە:

أ- بوونی سەرجەم بنەماکانی کردەوە لە دەرەوەی مرۆڤــ چ ماددی چ مەعنەوی.

---

[1] مقدمة مناهج الأدلة ١١٨-١١٩.

[2] هەمان سەرچاوە ١٠٤.

[3] هەمان سەرچاوە ١١٩.

ب- کە ئەو کردەوانە بەدەست دەهێنی ئـەوا بـەهۆی پـاڵنرانی تۆیـە بـۆ کردەوەکـە.

کەواتە تۆ دەتەوێت و ویستت لەسەرە و سەرپشکی بەو وەسـفەی دەسـت خـەری و پاڵ نراویت بە ئاراستەی کردەوەکەدا، نەك بەو وەسفەی کە بەدیهێنەرو پەیداکـەری بنەما و ڕەگەزەکانی کردەوەی.

ئەمە ڕوون دەکەینەوە بەم نمونە بەرهەستە:

دەست لەگەڵ ئەو هەموو خوێنبەرو دەمـارو توانایـەی تێیدایـە، لـە بـەدیهێنراوەکانی خوای گەورەیە.

کاغەز بە شێوەو تایبەت مەندییەکانییەوە، خوای گەورە بەدیهێناوە.

پێنووس بەوەی شیاوە بۆ نووسین، خوای گەورە بەدیهێناوە.

هەموو ڕەگەزە ناوبراوەکان بەیەك گەیشتن بۆ ئەوەی نووسینێك لەسەر پەڕاو (تێنووس) بکێشن و بنووسن، کە ئەویش هەر خوای مەزن بەدیهێناوە. کەواتـە مانـای وایـە خـوای گەورە بەدیهێنەری کردەوەکانی مرۆڤـــە.

بۆ ئەوەی بتوانی بنووسیت پێویستە لە دەروونی خۆتـدا سـوور بیـت لەسـەر نووسین، ویستی تۆ پاڵنەر بێت بۆ جێبەجێ کردنی، ئا لەو کاتەدا خوای گـەورە ڕێگـە دەدات بـەو توانایەی لە دەستەکانتیدا داینـاوەو بە مەرەکەبەکە کە چۆنت دەوێـت ئاراسـتەی بکـەیت، ڕێگە دەدات بە پەڕاوەکە کە کارتێکراو بێت بە مەرەکەبەکە بەو شێوەیەی کە نووسـینەکە ئەنجام دەدرێت، ئا لەو کاتەدا بە نووسەر ناودەبرێیت، ئەو کردەوەیە دەدرێتە پاڵ تـۆ. جـا مەبەست و سووربوون و بەدەست هێنانی کـردەوە لـە تۆوەیـە، ئەمـەش بـە نهێنـی ئـەو ویستەی کە خودا لە تۆیدا داناوە.

بەدیهێنانی کردەوەو هۆکارەکانی لە خواوەیە، لێ پێچـینەوەو دادگـایی کـردن لەسـەر مەبەست و دەست خستنی کردەوەکە دەبێت، نەك لەسەر خودی بەدیهێنانی هۆکارەکـان و کردەوە.

وەك ئەو کەسەی بە ئوتومبیلەکەی خۆی بە کەسـێکدا دەکێشـێت و دەیکوژێـت، جـا

بەتایبەت لەسەر خودی کردەوەکە داداگایی ناکرێت چونکە خاوەنی ڕاستەوخۆی کردەوەکە بریتیە لە ئوتومبیلەکە، بەڵکو لەسەر بەدەست هێنانی کردەوەکە لێی دەپێچرێتەوە.

ئەو کەسەی کرێکارەکانی هێناوە تا کۆئاو (حەز)ێك یاخود بیرێکی بۆ هەڵکەنن لە چەقی ڕێگای گشتی، ئەم کەسە لەسەر ئەوەی سزا نادرێت کە بکەرە، چونکە ئەو نەیکردووە بەڵکو کرێکارەکان کردوویانە، بەڵکو لەسەر بەدەستهێنانی کردەوەکە سزا دەدرێت.

خوای بێ وێنە لەسەر بەدەستهێنان (کسب)ی کردەوەکە لێپێچینەوە لەگەڵ بەندەدا دەکات، واتە لەسەر ئەو پاڵنەرو سووربوونە دەروونیەی کە هاندەری ئەنجامدانی کارەکەیە، بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای مەزن: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ ﴾ البقرة: ٢٨٦. واتە: (خوای گەورە ئەرك ناخاتە سەر هیچ کەسێك مەگەر بەقەدەر توانای خۆی نەبێت، هەر کارێکی چاك ئەنجام بدات قازانجی تەنها بۆ خۆیەتی و هەر خراپەیەکی کردبێت تەنها یەخەی خۆی دەگرێت). خودای تاك و بێ هاوەڵ دەفەرموێت: ﴿ ٱلْيَوْمَ تُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ ﴾ غافر: ١٧. واتە: (ئەمڕۆ هەموو کەس پاداشتی کارو کردەوەی خۆ وەردەگرێت). هەروەها دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْسِبُونَ ٱلْإِثْمَ سَيُجْزَوْنَ بِمَا كَانُوا۟ يَقْتَرِفُونَ ﴾ الأنعام: ١٢٠. واتە: (بەڕاستی ئەوانەی گوناهو تاوان ئەنجام دەدەن لە ئایندەدا سزاو تۆڵەی گوناهو تاوانەکانیان یەخەیان پێ دەگرێت). ئەم ئایەتانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە سزاو پاداشت پەیوەستە بە بەدەستهێنانی کردەوە لەلایەن مرۆڤەوە، واتە: هاندران و پاڵنرانی بەرەو ئەو شتەی فەرمانی پێکراوە جێبەجێی بکات و ئەو شتەش کە فەرمانی پێکراوە ڕێگری لێ بکات. خوای گەورە ویستویەتی بەدیهێنانی کردەوەکە و توانا بەسەردا شکانی بەندەکە پەیوەست بێت بە ئاراستە و پاڵنەری دەروونیانەوە، تا ببێتە شێوە تۆمارێك و ئەو پاڵنەرانەی تێدا تۆمار بکرێن کە بەرجەستە بوونە لە شێوەی کردەوەدا.

**ئەگەر وترا:**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ ﴾ النحل: ٩. واتە: (خۆ ئەگەر خوا بیویستایە هیدایەتی هەر هەمووانی دەدا بە گشتی). هەروەها دەفەرموویت: ﴿ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَن فِي ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴾ یونس: ٩٩. واتە: (خۆ ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە - دەیتوانی بە زۆر و بەناچاری - هەر هەموو دانیشتووانی سەر ڕووی زەوی باوەڕ بهێنن، جا ئایا تۆ "ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)، ئەی ئیماندار" ئەتەوێ زۆر لە خەڵکی بکەی بۆ ئەوەی بڕوادار بن؟!). ئەمە ئەوە دەسەلمێنێت کە ویستی مرۆڤ لە دەستی توانستی خوای گەورەدایە.

**وەڵام:** واتای ئەم ئایەتانە ئەوەیە: خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ ئەگەر بیویستایە ئەوا بە میهری خۆی وای لە بەندەکانی دەکرد کە باوەڕ هەڵبژێرن، هەواو هەوەسیان ڕەت بکەنەوە، بەڵام خوا ئەمەی نەویست، بەڵکو ویستی وابوو کە مرۆڤ لە نێوان دوو ڕێگە و لادا دابنێت و هەر یەکەشیان کێشی بکات بۆ لای خۆی، کە بریتین لە: نەفس بە ئارەزوو و هەواو هەوەسەکەی و عەقڵ بە دانایی و لێزانیەکەی. تا واتای ڕاسپێرران و ئەرکداری (تکلیف) و تێکۆشان لەگەڵ دەروون لە پێناوی خودا بە ڕۆشنی دەربکەوێت، ئەگەر ئاوا نەبووایە خودا پاداشتی بۆ گوێڕایەڵان و خۆڕاگرانی سەر ڕێگەی ڕاست ئامادە نەدەکرد، سزاو ئازاریشی بۆ تاوانکارە لە ڕێ دەرچووەکانی دانەدەنا.

ئالێرەوە خوای گەورە ویستی مرۆڤی لە نێوان میهرو سزای خوای دانا. جا هەر کەسێ باوەڕی بە خواو پەیامداری پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) هەبێت، نەفسی خۆی ڕاهێنا لەسەر ئەوەی ڕووبەڕووی حەق و ڕاستی نەبێتەوە، تێکۆشا دژی ئارەزووەکانی، ئەوا خوای گەورە سەری دەخات و یارمەتی دەدات.

خودای بێ وێنە دەفەرموویت: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴾ محمد: ١٧. واتە: (ئەوانەش ڕێبازی هیدایەت و ئیمانداریان گرتۆتە بەر بە گوفتاری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هیدایەت و دینداریان گەشە دەکات و پەرەدەسێنێت، خوایش شارەزایی و

پارێزکار و دڵنیایی زیاتری پێبەخشین. خودای مــەزن دەفــەرموویێت: ﴿ وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْاْ هُدًى ﴾ مريم: ٧٦. واتە: (ئەوانــەی ڕێبــازی هیدایــەتیان گرتۆتەبــەر خــوا زیــاتر هیدایــەتیان دەدات). هــەروەها دەفــەرموویێت: ﴿ يَهْدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِهِۦ ﴾ المائدة: ١٦. واتە: (خوا بەو قورئانە پیرۆزە هیدایەت و ڕێنموویی ئەو کەسانە دەکات کــە: شــوێن ڕەزامەنــدی خوا کەوتوون، بەرەو ڕێبازەکانی ئاشتی و ئاسوودەیی و لە تاریکیەکانی دەریاندەهێنێت و ڕزگاریان دەکات و دەیانخاتە ناو ڕووناکیەوە).

بەڵام ئەوەی لاڕێی کــردن و دوژمنایــەتی خــواو پێغەمبەرەکــەی کــرد بێــت، بووبێتــە خزمەتکاری هەوەس و ئارەزووەکانی، کاتێك ئامۆژگاری کراو بەخششەکانی خــوای بــەبیر هێنرایەوە ئەوا گوێچکەکانی کەڕ دەکردن لە ئاستی دا، نموونەی ئەو کەسانە ئاوێتە دەکرێن لە گومڕایی و سەر لێشێواویدا، خوای پایەبــەرز فەرموویــەتی: ﴿ سَأَصْرِفُ عَنْ ءَايَٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَإِن يَرَوْاْ كُلَّ ءَايَةٍ لَّا يُؤْمِنُواْ بِهَا وَإِن يَرَوْاْ سَبِيلَ ٱلرُّشْدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا وَإِن يَرَوْاْ سَبِيلَ ٱلْغَيِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا ﴾ الأعــراف: ١٤٦. واتــە: (ئەو کەسانەی بە ناحەق فیز دەکەن لە زەویدا و خۆیان بە گەورە دەنــوێنن (لــە خــەڵکی)، لەمەودوا ڕووی دڵیان وەردەچەرخێنم لە تێگەیشتنی ئایــەت و فەرمانــەکانم، خــۆ ئەوانــە ئەگەر هەر بەڵگەو نیشانەیەك ببینن ئەوە باوەڕی پێ ناکەن، ئەگــەر ڕێبــازی بەرژەوەنــدی دنیاو قیامەت ببینن ئەوە نایگرنەبەر، خۆ ئەگەر ڕێبــازی ئــارەزوو پەرســتی و گــومڕایی ببیــنن، ئــەوە دەیگرنەبــەر و پــەیڕەوی دەکــەن). هــەروەها دەفــەرموویێت: ﴿ يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهْدِي بِهِۦ كَثِيرًا ﴾ البقرة: ٢٦. واتە: (زۆرێکی پێ گومڕا دەکــات و زۆرێکــی تریشی پێ هیدایەت و ڕێنموویی دەکات، بەڵام دیارە جگەلە لارو وێرو یاخی و تاوانبــاران کەسی تر گومڕا ناکات).

ئەم یاسایە خواییە ڕاڤەکاری ئــەم فەرمایشــتەی خــوای گەورەیــە: ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِي مَن يَشَآءُ ﴾ فاطر: ٨. واتە: (بەڕاستی خوا بیەوێت هــەر کــەس گــومڕا بکــات

دەیکات، هەر کەسێکیش هیدایەت بدات دەیدات). هەروەها دەفەرمووێت: ﴿ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴾ الرعد: ٣٣. واتە: (جا هەر کەس بەهۆی کارو کردەوەی خراپیەوە خوا ون بکات، ئیتر کەس نییە هیدایەتی بدات).

مەبەستی ئەوەیە کە: خوای گەورە بێ توانا نییە لەوەی هۆکارەکانی ڕێنموویی و هیدایەت بخاتە دڵی گومڕاترین بێ باوەڕەوە، هۆکارەکانی گومڕایش بخاتە دڵی چاکترین بەندە باوەڕدارەکانی.

بەڵام خوای گەورە بە بەخشندەیی و میهرو چاکەی خۆی لەسەر خۆی پێویست کردووە کە: کەس گومڕا نەکات مەگەر یەکێك پشت لە هۆکارەکانی ڕێنوویی و هیدایەت بکات، هۆکارەکانی هیدایەت نزیك بخاتەوە لە هەر کەسێك کە پێداگیری لەسەر وەڵامدانەوەی بانگەوازو جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خوای گەورە بکات[1].

---

[1] ئەهلی سوننە پێی وایە: ڕێنمووییی خوای مەزن بۆ بەندەکانی لە دوو ڕووەوەیە:

**یەکەم**: لە ڕووی ڕۆشن کردنەوەی ڕاستی و نزا بۆ کردنی و بەڵگەر لەسەر بەرپاکردنی. دروستە لەم ڕووەوە هیدایەت دان بدرێتە پاڵ پێغەمبەران و هەر بانخوازێکی تر کە بانگەوازی دەکات بۆ لای خودا، لەبەر ئەوەی ئەوانە ڕێڕوون کەرەوەو ئاراستەکاری بەندەن. ئەمەش ڕاڤە و تەئویلی ئەم فەرمایشتەی خودای گەورەیە کە دەربارەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: ﴿ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ الشورى: ٥٢. واتە: بەڕاستی تۆ بانگەوازی دەکەیت بۆ لای خودا. ئەم جۆرە هیدایەتە لەلایەن خودا سەرجەم ڕاسپێرراو ئەرکدارەکان (مكلفين) دەگرێتە خۆ.

**دووەم**: ڕێنمووی و هیدایەت درانی بەندەکان لەلایەن خواوە بە هۆی بەدیهێنانی هیدایەت لە دڵ و دەروونیاندا، هەروەك خودای گەورە باسی کردووە: ﴿ فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ ﴾ الأنعام: ١٢٥. واتە: (جا ئەو کەسەی "خێری تێدا بێت" و خوا بیەوێت هیدایەتی بدات، ئەوە سینەی ساف و پاك و ئامادە دەکات بۆ ئایینی ئیسلام). جا ئەم ڕێنمووی و هیدایەتە تایبەتە بەوانەی بانگەوازو هیدایەتیان وەرگرتووە. هەر بۆ زیاتر جەخت کردنەوەی ئەم فەرمایشتەی خودای بێ وێنە ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ وَٱللَّهُ يَدْعُوٓا۟ إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَٰمِ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ يونس: ٢٥. واتە: (خوای گەورەش بانگەواز دەکات بۆ بەهەشتی پڕ لە ئاشتی و شادی و ئاسایش، هەر کەسێك ئەو زاتە بیەوێت ڕێنمووییی دەکات بۆ ڕێگە و ڕێبازی ڕاست و دروست).

مەبەستی ئەم فەرمایشتە: هیدایەتدان و ڕێنمووی کردنی دڵ و دەروونەکانە کە تەنها خودای باڵادەست و خاوەن شکۆ توانای بەسەردا هەیە. لەبەر ئەمە لەبارەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

**ئەگەر وترا:**

ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴾ الإنسان: ٣٠. واتە: (ئێوە چیتان پێناکرێت و هیچ کارێکتان پێ ئەنجام نادرێت، مەگەر خوا ویستی لەسەر

---

دەفەرموویێت: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِى مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ ﴾ القصص: ٥٦. واتە: (بەڕاستی ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تۆ ناتوانیت ئیمان و باوەڕ ببەخشیت بەو کەسەی خۆشت دەوێت، بەڵکو خوا هەر کەسێکی بوێت دەیخاتە سەر ڕێگەی ڕاست و ئیمانی پێ دەبەخشێت). کەچی خوای گەورە وەسفی پێغەمبەری کردووە (صلى الله عليه وسلم) بەوەی هیدایەت دەری خەڵکە بۆ سەر ڕێگای ڕاست. ئەو ڕێنموویی و هیدایەتدانەی خودای گەورە داویەتە پاڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بریتیە لە ڕێگەی ڕوونکردنەوەو بانگەوازی کردن، ئەو هیدایەتدانەی نەداوەتەوە پاڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە پەیوەستە بە دڵ و دەروون گوشاد کردن و وەرگرتنی ڕاستییەوە.

گومراکردنی گومڕابووان لەلایەن خوداوە، بە واتای ئەوەیە کە گومڕایی و لادان لە ڕاستی لە دڵیاندا بەدیبهێنێت. پێویستە ئەم دوو فەرمایشتە بەو واتایە ڕاڤە بکرێن: ﴿ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِى ٱلسَّمَآءِ ﴾ الأنعام: ١٢٥. واتە: (ئەو کەسەش خوا بیەوێت گومڕای بکات، ئەوە دڵی دەگوشێت و سینگی توند دەکات و هەناسەی سوار دەبێت، هەر وەك ئەوەی بەرەو ئاسمان بەرز بێتەوە). هەروەها دەفەرموویێت: ﴿ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ﴾ النحل: ٩٣. واتە: (ئەوەی بیەوێت ڕێبازی هیدایەت بگرێت ڕێنموویی دەکات، ئەوەش ڕێبازی گومڕایی بگرێتەبەر موڵەتی دەدات و زۆری لێ ناکات). خودا هەر کەسێك گومڕا بکات ئەوە بە دادگەری خۆیەتی، هەر کەسێکیش هیدایەت بدات بە چاکە و بەخششی خۆیەتی.

قەدەرییەکان و موعتەزیلەکان پێیان وایە: هیدایەت و ڕێنموویی تەنها بە واتای ڕێپیشاندان و نزاو ڕوونکردنەوەی ڕاستی دێت، هیدایەت دانی دڵ و دەروون نییە. گومڕا کردن لەلای ناوبراوان دوو جۆرە: یەکەم: بوترێت: خودا بەندەیەکی گومڕا کرد بەو واتایەی خودا ناوی لەو کەسە ناوە گومڕا بوو. جۆری دووەم: بەو واتایەی خودا سزای کەسەکەی دا لەسەر گومڕا بوونەکەی. بەغدادی ئەم بۆچوونەی قەدەرییەکان و موعتەزیلەکانی بە هەڵە داناوە لە ڕووی زمانەوانی و واتاوە.

دوو خواپەرستەکان (الثنوية) پێیان وایە: ڕێنموویی و هیدایە لەلایەن نوورەوەیە، گومڕابوونیش لە تاریکییەوەیە.

ئاگرپەرستەکان بۆچوونیان وایە: هیدایەت دان لە خواوەیە، گومڕا بوونیش لە شەیتانەوەیە (کە بە ئەهریمەن ناودەبرێت)./ أصول الدين للغزنوي ١٤٠-١٤٢ و ٨٣.

بێت). ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە مرۆڤـ هیچ ویستێکی نییە، مەگەر بە ویست و ڕەزامەندی خوای گەورە نەبێت.

**وەڵامەکەی:** ئایەتەکە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە مرۆڤـ نەدەبووە خاوەنی ویست لە ناخی خۆیدا و نەشی دەتوانی سەرپشك بێت و ئەو ڕەفتارە بکات کە خۆی دەیەوێت ئەگەر خوای گەورە ئەو نهێنییە مەزنەی لە ناخی مرۆڤـ دانەنابوایە[1].

**ئەگەر وترا:**

ویستی خوای گەورە تەواو و ڕەهایە، جا چۆن دەکرێت ئەندێشەی ئەوە بکەین کە مرۆڤـ خاوەن ویست بێت لە پاڵ ویستی خوادا، پاش ئەوەی دانماننا بەوە کە مرۆڤـ خاوەنی ویستی ئازاد و سەرپشکە؟.

**وەڵامەکەی:** ئەوەیە کردەوە خۆنەویست و ناچارییەکان، مرۆڤـ هیچ توانا و ویستێکی بەسەردا ناشکێت، بەڵام ئەو کردەوانەی کە مرۆڤـ سەرپشکە و بە ویستی خۆی ئەنجامی دەدات، ئەوا ئەو کردەوانە چەقی ڕاسپێرران و ئەرکدارین. جا خوای پایەبەرز ویستی وابووە تۆ ویستت هەبێت، کەواتە ویستی خوای گەورە لەگەڵ هەموو ئەو شتانەدایە کە مرۆڤـ ئەنجامی دەدات و هەڵی دەبژێرێت، بەم پێیەش تێکگیران نییە لە نێوان ویستی خوای گەورە و ئەوەی مرۆڤـ بە ویستی تایبەتی خۆی دەست نیشانی دەکات و ئەنجامی دەدات.

گریمان ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەر شتێك نەبوو کە تۆ هەڵت بژاردبوو بەویستی خۆت، واتای وایە خوای گەورە ویستی لەگەڵ ویستەکەی تۆ دا نییە، ئەو ویستەی کە تۆی ئاراستە کردووە بۆ ئەو کارە، ئەمەش پێچەوانەیە لەگەڵ ئەوەی پێشتر سەلمێنرا کە خوای گەورە ویستویەتی تۆش خاوەن ویست بیت، بەم پێیە ئەو گریمانە پوچەڵ بووەوە کە پێی وایە خودا ویستی لەسەر ئەو شتە نییە کە بەندە دەیەوێت.

---

[1] کبری الیقینیات الکونیة ١٦٦ و لاپەڕەکانی دواتر، بڕوانە: رسالة القضاء و القدر للشیخ محمد متولي الشعراوي.

**بۆ نموونە:** خزمەتکارێکت هەیە، دەتەوێت شارەزای ڕاستگۆییەکەی ببیت لە خزمەت و هەڵسوکەوت و مامەڵەکەیدا، بۆ ئەم مەبەستە ئەندازەیەك پارەی پێ دەدەی، تا پێداویستیەکان بکڕێت لە بازار، بە ئازادییەکی تەواو هەڵسوکەوت بە پارەکە دەکات، بێ ئەوەی چاودێرێکی لەسەر بێت.

تۆ ویستوتە لەو کارەدا خزمەتکارەکە ئازاد بێت، لەوەی هەر شتێك بکات یان نەیکات، بەڵکو خزمەتکارەکە تەنها بە قسەی دەروونی بکات، تۆش ویستوتە کە خزمەتکارەکە بە ئازادی هەڵسوکەوت بکات تا لایەنە شاراوەکانی بزانیت، جا چ ناپاکی بکات لە سپاردەکەی یان سپاردەکەی بپارێزێت، ئەوا تۆ هەر دوو دەرەنجامەکەت مەبەستە، جا ئەو دەرەنجامەت پێ خۆش بێت یان پێت ناخۆش بێت.

بەم پێیە دەرەنجامی ویستی مرۆڤ لە ئاست ویستی خوای گەورە وەك ویستی خزمەتکارەکەیە لە ئاست ویستی گەورەکەی، تەنها ئەو شتە لە موڵکی خوداو بوونەوەردا ڕوودەدات، کە خوای گەورە ویستی لەسەر بێت، ئەمەش دژ نییە لەگەڵ ئەوەی کە خودا ویستی بە بەندە داوە، تا ئەو شتە دەست بخات کە دەیەوێت بەبێ ناچار کردن، تا لایەنە شاراوەکەی بەندە لە هەڵسوکەوتەکەیدا بەرجەستە ببێت و دەربکەوێت، بەمەش شایەنی پاداشت یان سزای خوایی بێت[1].

---

[1] کبری الیقینیات الکونیة ١٦٢.

دەڕدیر لە (شرح الخریدة ٦١-٦٢) وتویەتی: (ئەگەر وتت: ئێمە توانای بەدیهێنانی کردەوەمان نەبێت، کەواتە چۆن دەبێت کردەوە بدرێتە پاڵ ئێمە، چۆن دەبێت ئەرکدار بین بە کردەوەو ڕووی گوفتارمان تێبکرێت بەو هۆیەوە، خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿ وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ ﴾ التوبة: ١٠٥. واتە: (بەو خەڵکە بڵێ: ئێوە هەرچی دەتوانن لەکارو کردەوە ئەنجامی بدەن، چونکە خوا کارو کردەوەتان دەبینێت). ئەم دەقانە لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی بەپێزدا گەلەك زۆرن.

دەڵێین: کە کردەوەکان دەدرێنە پاڵمان لە ڕووی بەدەستهێنان "کسب"ەوەیە، نەك لە ڕووی داهێنان و دروست کردن. ڕوونکردنەوەش لەسەر ئەمە، توانای خودا شتەکانی لە نەبوونەوە هێنایە بوون بە ویستی خۆی، ئەم دەرخستن و هێنانە بوونەش بە بەدیهێنان و دروست کردن ناودەبرێت، ئەمە

مەبەستی پەیوەست بوونی توانای هەربوو و بێ سەرەتا، سەبارەت بە توانای ئێمە ئەوا پەیوەست بووە بە هەندێك لە کردەوەکان، ئەویش ئەو کردەوانەن کە خۆویستن و مرۆڤ تیایاندا سەرپشکە، واتە: ئەو کردەوانەی کە بە مەبەست و ویستی خۆمان دەیکەین ئەمەش بەدیهێنان نییە. ئەم پەیوەست بوونەی مەبەستەکەمان بە کردەوە بەو شێوەیەی کە دەمانەوێت بریتیە لە بەدەستهێنان "کسب". پەیوەست بوونی توانای خودا بە کردەوەکە بریتییە لە بەدیهێنانی کردەوەکە، پەیوەست بوونی توانای ئێمە بەو پێیەی دەمانەوێت بریتیە لە بەدەستهێنان نەوەك بەدیهێنان. کردەوە خۆویست و سەرپشکییەکانمان دوو توانای پێوە پەیوەست بوونە، توانای هەربوو و بێ سەرەتا، توانای پەیدابوو، جا توانای پەیدابوو هیچ کاریگەرییەکەی نییە لەسەر کردەوەکە تەنها بەراورد کردن نەبێت. خودا لەو کاتەی بەندە سور دەبێت لە سەر ئەنجامدانی کارەکە ئەوا کردەوەکە دروست دەکات نەك بەو هۆیەوە دروستی بکات، بۆ نمونە: سووتان لەو کاتەی ئاگر دەگاتە دار، جا لەو لایەنەی خودا نارەزوو و مەبەستی بۆ ئێمە دروست کردووەو هاوڕێ لەگەڵیدا هەر کە کردەوەکەی بەدیهێنا ئەوا تواناشمان پێدەبەخشێت، مەبەستمان ئەوەیە کە ئەو کردەوەمان دەدرێتە پاڵ و ڕووی گوتارمان تێدەکرێت بەو هۆیەوە، چونکە لە ڕووکەشدا وا بەدەر دەکەوێت کە ئەمە کردەوەی بەندەیە. ئەگەر تەماشای بەڵگەی یەکتایی خودا بکرێت ئەوا بۆ تەماشاکەر دەردەکەوێت کە تەنها خودایە کردەوە بەدیدەهێنێت، ئەگەر وانەبوایە ئەوا پێویست دەبوو خودا هاوبەشی هەبوبا. بەم شێوەیە زانرا کە پەیوەست بوونی توانای بەندە بریتییە لە بەراورد کردنی توانای پەیدابوو لەگەڵ کردەوەکە بێ ئەوەی کاریگەری هەبێت، هەر بەم شێوەیە کردەوەکان دەدرێنە پاڵ بەندە، وەك لەم فەرمایشتە پیرۆزەدا هاتووە: ﴿ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ ﴾ البقرة: ٢٨٦. واتە: (هەر کارێکی چاك ئەنجام بدات قازانجی تەنها بۆ خۆیەتی و هەر خراپەیەکی کردبێت تەنها یەخەی خۆی دەگرێت). سزاو پاداشت لەسەر کردەوەکان بە چاکە و بەخشش و دادگەری خودا دیاری دەکرێت. تا لەو کاتە بەندە بە سەرپشك کراو ناودەبرێت، لەو کاتەی خودای بێ وێنە کردەوەکە بەدیدەهێنێت بەبێ ئەوەی توانای مرۆڤ هاوڕێ و هاوتەریب بێت لەگەڵیدا تا لەو کاتەدا بە ناچارکراو ناودەبرێت، خودای مەزن بە چاکە و بەخشندەیی خۆی لەگەڵ ئێمەی کردووە بەوەی لەو حاڵەتەدا ئێمەی بە ئەرکدار دانەناوە، ئەگەر ویستی لەسەر بوویا ئەوا ئەرکداری دەکردین).

# بەشی پێنجەم

# پێغەمبەرایەتی

لە سێ دەروازە پێك دێت:

**دەروازەی یەکەم:** پێویستی مرۆڤ بە ڕێنمایی و هیدایەتی پێغەمبەرایەتی، گفتوگۆو مشتومڕ کردن لەگەڵ ئەوانەی نکۆڵی لە پێغەمبەرایەتی دەکەن.

**دەروازەی دووەم:** پێغەمبەرایەتی بەشێوەیەکی گشتی: پێغەمبەرو پەیامبەر لە زمانەوانی و زاراوەدا، حوکمی ناردنی پێغەمبەران، سەلماندنی پێغەمبەرایەتی، پێغەمبەرایەتی بە هەڵبژاردن و دەستنیشان کردن دەبێت لەلایەن خودای گەورەوە، پێغەمبەران و پەیامبەران مرۆڤن، ژمارەو ڕێژەی پێغەمبەران، ئەرکی پێغەمبەرایەتی، پێویستی باوەڕ بوون بە پێغەمبەران و پەیامبەران، قورئانی پیرۆزو کتێبە ئاسمانییەکانی تر.

سیفەت و خەسڵەتەکانی پێغەمبەران و پەیامبەران: پارێزراوی، ڕاگەیاندنی بەرنامەی خودا، زیرەکی و ژیری، نێرینە بوون، پاك و سەلامەت بوون لە کەم و کورتییەکان. سروش: جۆرەکانی، چۆنیەتی دابەزینی، شتێکە لە دەرەوەی سنووری دەروون و نەفس، چەند گومانێکی بێ بنەما لەبارەی

**سروش. موعجیز، حوکمی باوەڕ پێبـوونی، سـەرجەم کـارە دەرئاساکانی تر.**

**دەروازەی سێیەم: پێغەمبەرایەتی بەشێوەیەکی تایبـەت: سـەلماندنی پێغەمبەرایەتی موحەممەد** (صلى الله عليه وسلم): **سەلماندنی، موعجیزەکانی، ڕووەکانی ئیعجازی قورئان.**

**چەند گەواهیدرێکی تر لەسـەر پێغەمبەرایـەتی موحەممـەد** (صـلى الله عليـه وسـلم)، **خەسـڵەتەکانی، هەمـە لایـەنی شەریعەتەکەی، هاتنی پێغەمبەر لە کاتێکـدا کـە ماوەیـەکی زۆر بـوو پێغەمبـەران نـەهاتبوون، ئـەو مژدانـەی دراون لەبارەی هاتنیەوە لە کتێبەکانی پێشوو، ئینجیلی برنابا.**

**پەیامەکەی پێغەمبەر** (صلى الله عليه وسلم) **تەواوکەرو کۆتایی شەریعەت و پەیامەکانە، پەیامەکەی گشتگیرە.**

**پلەوپایـەی پێغەمبـەر** (صـلى الله عليـه وسـلم)، **تکـاو شـەفاعەتەکەی، بنـەماکانی بانگەوازەکـەی، لـە بەرامبـەر پێغەمبەری خـوادا چـیمان لەسـەر پێویسـتە** (صـلى الله عليـه وسلم).

# دەروازەی یەکەم

## پێویستی مرۆڤ بە ڕێنمایی و هیدایەتی پێغەمبەرایەتی

تێکڕای عەقڵمەندان کۆکن لەسەر ئەوەی عەقڵی مرۆڤـــیەکێکە لە ڕێگەکانی گەیشـتن بە زانست و زانیاری.

بەڵام دوو دەستەو تاقم بەرهەڵستی ئەم ڕاستیەیان کرد:

**دەستەی یەکەم**: دان دەنێت بە بوونی عەقڵدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ نرخێك بـۆ پەیی پێردن و زانیارییە عەقڵییەکان دانانێت. ئەمە مەزهەبی فەیلەسوفە سۆفستائیەکانی یۆنانە، ئیسماعیلییەکانیش ئەم بۆچوونەیان هەیە کە دەڵێن بوونی مامۆستایەکی خـوایی بۆ یارمەتی و پشتگیری پێویستە، ئەو مامۆستایەش بریتیە لە ئیمامی پارێزراو لە هەڵـە چ بە ئەنقەست یاخود بە ڕاست، تەنها ئیمام ڕاست و پوچەڵ لەیەك جیادەکاتـەوە، ڕاسـتی تەنها لەسەر ئیمام وەستاوە.

بەهەمان شێوە ئەمە مەزهەبی هەندێك لە خۆ بـە صـۆفی زانەکانـە، کـە پێیـان وایـە خورپە (ئیلهام) ڕێگەی زانین و گەیشتنە بە زانیاری، نەوەك عەقڵ.

عەقڵگەراکان بەرپەرچی ئەم ڕایەیان داوەتەوە، وەك: (غەزالی) لە هەر دوو کتێبەکەیدا (القسطاس المستقيم) و (مشكاة الأنوار)، ناوبراو ئەوەی ڕوون کردۆتەوە کە عەقڵ پەیی بە زانیارییـەکان دەبـات، لـە ڕاسـتی شـتە بەرهەسـت و عەقڵییـەکان دەگـات، حـوکمی دڵنیاکەرەوەی ڕاست لەم بارەوە دەردەکات، وەك چۆن عەقڵ حـوکم لەسـەر ژمـارە دەدات هەر چەند زۆریش بێت.

ئیبن حەزمیش لە بەرپەچی ئەوانەی دەڵـێن (خورپـە) ئیلـهام تاکـە ڕێگـەی زانسـت و زانینە نەوەك عەقڵ، وتویەتی: ئەوانەی پڕوپاگەندەی ئەوە دەکەن کە (خورپـە) ئیلـهامیان بۆ دێت لەبارەی کە کەسانی تر جگە لەوان بە عەقڵی سەرەتا پەیی پێ نابەن، کەچـی دوو

کەس لەوانەی بانگەشەی ئیلهام دەکەن لەسەر شتێك کۆك نین کە گوایە بە خورپە (ئیلهام) پەییان پێ بردووە، ئەگەر هەر کەسێکیش زۆر بەجوانی ڕووخساری بانگەشەی برازێنێتەوە ئەوا هەر هیچ ڕاستیەکی پێ ناچەسپێت و هیچ پوچەڵی و بەتاڵێکیشی پێ نافەوتێت[1].

**دەستەی دووەم:** نکۆڵی لە عەقڵ دەکات بەو چەمکەی پێشوو کە پێی وایە ڕێگەیەکە بۆ گەیشتن بە زانیارییەکان، بۆچوونیان وایە کە:هەستەکات تەنها هۆکارن بۆ زانین و دەستخستنی زانیاری، ئەوەش کە بە عەقڵ ناو دەبرێت هەر دەگەڕێتەوە بۆ هەستەکان. ئەم تاقمە و شوێنکەوتووانی ئەم ڕێبازە ناسراون بە هەستگەرا یان ئەزموونگەرا یاخود ماددەگەراکان. ئەم ڕێبازە لەم دواییانەدا دەرکەوت لە ئەوروپادا، گرنگرین هەڵگرانی ئەم بۆچوونە ئەوانەن: فرەنسیس بیکۆن، لە ساڵی ١٦٢٦ز مردووە، جون لوك،ساڵی ١٧٠٤ز مردووە، دیڤید هیوم، ساڵی ١٧٧٦زمردووە، ئەم ڕێبازە شوێنکەوتووی لە هەموو دونیادا پەیدابوو.

---

[1] کتێبەکەمان: أصول الدين الإسلامي ١٧٧، لە کتێبی ناوبراودا ئاماژە کراوە بۆ: القسطاس المستقيم، والإحكام لإبن حزم ١٤/١ و ئاماژە بەت چەند سەرچاوەیەکی تریش دراوە.
تاقمە سۆفستائیەکان ئەمانەن:
أ- گوماندارەکان (اللا أدرية): وتویانە: ئێمە گومانمان هەیە، گومانیشمان لەوە هەیە کە گومانمان هەیە، ئا بەم شێوەیە.
ب- دژگەرا (العنادية): وتویانە: هەر بابەتێك کە پێویستی بە بەڵگە نەبێت یاخود هەر بابەتێکی تیۆری ئەوا دژێکی هەیە بە ئەندازەی خۆی بەهێزەو پەسەند کراوە لەلایەن بیرو هۆشەوە.
پ- ڕێژەگەرا (العندية): وتویانە: ڕێبازی هەر کۆمەڵێك ڕاستە، ئەگەر بە بارودۆخی ئەوان بیپێویت و هەڵەیە ئەگەر بە بارودۆخی غەیری ئەوان بیپێویت. دەکرێت دوو شتی دژیەك ڕاست بن ئەگەر هەر یەکەیان بدرێتە پاڵ کەسێك و بە بارودۆخی یەکێك بپێورێت، ڕاستی لە خودی هیچ شتێکدا نییە.
سەیری ئەم تاقمانە بکە لەم سەرچاوانەدا: حاشية الطوسي على محصل أفكار المتقدمين والتأخرين ٤٠، الفصل لإبن حزم ٤٣/١، المعالم الدينية ٤٩.

زانایان بەرپەرچی ئەم دوو تاقمەیان داوەتەوە بە لێکۆڵینەوەی زانستی، کە لە میانەی لێکۆڵینەوەکاندا سەلماندوویانە عەقڵ توانای پەیی پێبردنی هەیە بێ یارمەتی وەرگرتن لە هەستەکان، نموونەشیان هێناوەتەوە بە دیاردەی (تلبثائي) واتە: گواستنەوەی فیکرو هزر یاخوددیاردەی هەست کردن و پەیپێبردن بە فیکرو هزری کەسێکی تربێ ئەوەی هەستەکان هیچ ڕۆڵێك ببینن لەمەدا یان دیاردەی ڕەوانی بینین (الإستشفاف أو الجلاء البصري) کە هەست کردنە بە شتەکان یان ڕووداوەکان بێ ئەوەی هەستەکان هیچ ڕۆڵێك ببینن، ئەم لێکۆڵینەوانە لەلایەن چەندین کۆنگرەوە دانیان پێدانراوە[1].

سەرجەم مەزهەبە ئیسلامیەکان کۆك بوون لەسەر گرنگی عەقڵ لە پرۆسەی پەیی پێبردندا، کەچی دانیان بەوەشدا ناوە کە عەقڵ بە تەنها ناتوانێت پەیی بە زۆربەی شتەکاندا ببات، وەك: بابەتی باوەڕبوون بەخودا و سیفەتەکانی، ئەو شتەی بۆ خودا پێویستە، ئەو شتانەی بۆ خودا دروستن، ئەو شتانەی بۆ خودا نەبوو و ئەستەمە، هەروەها چ شتێك بۆ پێغەمبەر پێویست و دروست و ئەستەمە، لەبارەی ڕۆژی دوای، لەبارەی حوکمی بابەتەکانی تری بیروباوەڕ. هەروەها وەك بابەتی ڕەوشت، حوکمە کردارییەکان، ئەو کردەوانەی چاك یاخود خراپن.

لەبەر ئەوەی خەڵك ڕای جیاوازی هەیەلەبارەی ئەم بابەتانەوە، دەکرێت شتێك لە بەرژەوەندی خەڵکانێکدا بێت کەچی هەمان شت مایەی زیان بێت بۆ کەسانێکی تر، دەکرێت هەندێك ڕەفتار لەلایەن خەڵکانێك چاکەکاری و گەورەیی بێت کەچی هەمان ڕەفتار لەلای کومەڵە خەڵکێکی تر بێ ڕێزی و بێنرخی بێت، بۆیە ئیسلام ئەرکی یاسادانانی بۆ عەقڵی مرۆڤەکان جێ نەهێشتووە، چونکە ئەمە سەردەکێشێت بۆ گەڕەلاوژێ و ئاژاوە. هەر لەبەر ئەمەش بوو کە ڕێنمایی پێغەمبەرایەت بۆ مرۆڤ پێویست بوو.

---

[1] کتێبەکەمان: أصول الدين الإسلامي ۱۷۹.

## گفتوگۆومشتومڕکردن لەگەڵ ئەوانەی
## نکۆڵی لە پێغەمبەرایەتی دەکەن

خەڵکانێك بۆچوونیان وایە مرۆڤ پێویستی بە ڕێنمایی و هیدایەتی پێغەمبەرایەتی و سروش و نیگای پەیام نییە. گوایە مرۆڤ دەتوانێت تەنها پشت بەخۆی و بە عەقڵەکەی ببەستێتلە ڕێکخستنی ژیانیدا.

**ئەوانەی نکۆڵی لە پێغەمبەرایەتی دەکەن، دوو پێڕن:**

**پێڕی یەکەم:** نکۆڵی لە پێغەمبەرایەتی دەکات، چونکە نکۆڵی لە بوونی خوا دەکات، شتێکی زانراوەکە کەسێك نکۆڵی بکات لەڕەوانەکاریپێغەمبەران کە خوای گەورەیە، ئەوا هەر بێ چەندو چوونی نکۆڵی دەکات لە پێغەمبەرو پەیامبەرەکانی خودا.

گفتوگۆو مشتومڕ کردن لەگەڵ ئەم پێڕەدا بەوە نابێت لەسەر سەلماندنی پێغەمبەرایەتی دەمەتەقێیان لەگەڵ بکرێت، بەڵکو دەبێت لەسەر سەلماندنی بوونی خوای پاك و بێ وێنە گفتوگۆیان لەگەڵ بکرێت[1]. پێشتر قسە لەسەر ئەمە کراوە لە بەشی خواناسی.

**پێڕی دووەم:** دان دەنێت بەبوونی خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ و باوەڕیشی پێ هەیە، بەڵام نکۆڵی لە پێغەمبەرایەتی دەکات، تەنها پشت بە عەقڵی خۆی دەبەستێت لە دیاریکردنی چاکە و خراپە.

زۆرێك لە بەراهیمەکانی هیند، صابئەکان، هەندێ لە فەیلەسوفەکان لە ڕیزی پێشەوەی ئەم پێڕە دەگرن، هەندێك لە بە ڕواڵەت موسڵمانەکانیش بە فەلسەفەی ئەوان کاریگەر بوون وەك: ئەبو حەسەینی ئەحمەدی کوڕی یحیای ڕاوەندی، ساڵی ٢٤٥ك مردووە.

**ئەوانەی نکۆڵی لە پێغەمبەرایەتی دەکەن، هەندێك لە بەڵگەکانیان ئەمانەن:**

١- ئەوەی پێغەمبەران دەیهێنن لە دوو حاڵەت بەدەر نییە یان ئەوەتا عەقڵ دەیزانێت یان نایزانێت.

---

[1] تبصرة الأدلة ١/٤٤٦ و ٤٤٨.

ئەگەر پێغەمبەر ئەو شتەی هێنا كە عەقڵ دەیزانێت ئەوا هیچ سوودێكلە ڕەوانەكرانی نەبووە، چونكە عەقڵ بەسە، ئەگەر ڕەوانەكرانی پێغەمبەران بە ئامانج و مەبەستێكی ڕاست و دروست نەبێت ئەو كاتە دەبێتە شتێكی پڕو پووچ.

ئەگەر شتێكی هێنا كە عەقڵ نایزانێت، ئەوا عەقڵ بۆی هەیە پەسەندی نەكات و ڕەتی بكاتەوە، چونكە شتێك پەسەند كراوە كە عەقڵ پەیی پێی ببات[1].

**وەڵام:** ئەم بەڵگەیە ڕوونە كە پوچەڵ و بێ بنەمایە، چونكە هەر كەسێك شارەزای پەیامە ئاسمانیەكان بێت، ئەوا دەزانێت كە هەر دوو لایەن لەخۆی دەگرێت چ ئەوەی عەقڵ دەیزانێت چ ئەوەش كە نایزانێت.

جا ئەوەی عەقڵ دەیزانێت ئەوا ئەركی ئەم پەیامە ئاسمانیانە جەخت كردنەوە بووە لەسەری.

سەبارەت بەوەش كە عەقڵ نایزانێت - كە زیاترینیانە - ئەوا پەیامە ئاسمانیەكان ڕۆڵی ڕێبەرو ڕێنوێنی كەری عەقڵ دەبینن، ئەو زانیارییانە دەبەخشێت لە هەگبەی عەقڵدا نییە، عەقڵ ئاراستە دەكات بۆ شتی چاك و بە سوود[2].

٢- پێغەمبەر لە ڕەگەزی ئەوانەیە كە بۆ لایان ڕەوانەكراوە، بەبەرز دانان و بە گەورە زانینی تاكێك لەناو هاوڕەگەزەكانی و هاوشێوەكانی ستەمە و دەرچوونە لە دادپەروەری و دانایی، ئەمەش شتێكی نەشیاو و نادروستە بۆ خوای دانای باڵادەست و خاوەن شكۆ[3].

**وەڵام:**

أ- خوای گەورە بۆی هەیە بە فەزڵ و بەخششی خۆی یەكێك هەڵبژێرێت لە بەدیهێنراوەكانی، وەك چۆن بۆی هەیە جیاوازی نەكات لە نێوانیاندا و یەكسانیان

---

[1] الإرشاد للجويني ٣٠٣. تبصرة الأدلة للنسفي ١/٤٤٤، ئەمە بەڵگەی بەراهیمەكانە.

[2] كشف المراد ٣٧٥.

[3] تمهيد الأوائل ١٢٧. تبصرة الأدلة ١/٤٤٤.

بکات، چونکە ئەمە دادگەریی و ڕاستی سەرپەرشتی خودایە. خوای گەورە لەپێناو ڕەگەز هیچ کەسێك پایەدار ناکات بەسەر کەسێکی تردا لەناو هاوڕەگەزەکانی، بەڵکو لەبەر ئەمە پایەداری دەکات کە شیاوی پەمام هەڵگرتنە و دڵسۆزە لە کۆششەکانیدا[1].

ب- بەپێی بەڵگەکەی ئێوە پێویست دەبێت کە خوای گەورە دادگەر نەبێت، چونکە خوای گەورە لە هەندێك بەدیهێنراوەکانی زانست و هێزو عەقڵ و هەستی تەواوی پێداوە، لە هەندێکی تریشیاندا نەزانی و کوێری وکەم ئەندامی و نەخۆشی درێژ خایەنی بەدیهێناوە.

ئێوە وا ناڵێن، بەڵکو دەڵێن ئەمە بۆ بەرژەوەندی هەر دوو لاکەیە و ڕێگەیەکە بۆ سوودێکی گەورە، و خوای گەورە زاناترە پێی. هەر بەم پێیە کە خوای گەورە پەیامبەران ڕەوانە دەکات بۆ بەرژەوەندی هەردوولا، چ ڕەوانەکراو چ ئەوانەی بۆیان ڕەوانە کراوە،لوتف و میهرێك بێت بۆیان بۆ ڕامان لە بەڵگەی عەقلی، کە فەرمانیان پێکراوە بۆی بگەڕێنەوەو کاری پێبکەن[2].

٣- لە دانایی و کارزانی خوا ناوەشێتەوە پێغەمبەرو پەیامبەر ڕەوانە بکات بۆ لای ئەوانەی کە دەزانێت باوەڕی پێ ناهێننن و بەدرۆی دەخەنەوە، بۆیە خوا هەرگیز پێغەمبەر ڕەوانە ناکات، چونکە هەڵەیە.

**وەڵام:**

بەپێی بەڵگەی ئێوە:

أ- دروستە پێغەمبەر ڕەوانە بکرێت بۆ لای ئەوانەی کە دەزانرێت هەندێکیان لەناویاندا هەن بانگەوازەکە پەسەند دەکەن و سوودی لێ وەردەگرن.

ب- خوای گەورە کەسێك بەدینەهێنێت کە بزانێت ڕێگەی بێ باوەڕی دەگرێتەبەر.

---

(١) تمهيد الأوائل ١٢٨-١٢٩.

(٢) تمهيد الأوائل ١٢٩-١٣٠.

پ- خوای گەورە عەقڵەکان بە بەڵگە نەهێنێتەوەو نەیانکات بە بەڵگە، هەروەها خوای مەزن ئەو شتانەش کە لە عەقڵدا دایناوە لە سەر ئەو کەسەی کە نکۆڵی لە عەقڵ و بەڵگەکانی دەکات و عەقڵەکەی بەگەڕ ناخات[1].

ئەگەر وتتان: زۆرێك عەقڵیانبە بەڵگە هێناوەتەوە.

دەڵێین: زۆرێکیش باوەڕیان بە پێغەمبەران هێناوە[2].

٤- ئەگەر خوای گەورە پێغەمبەرانی ڕەوانە کردووە بۆ ئەوەی خەڵکی لە تاریکیەوە دەربێنن و بەرەو ڕووناکیان ببەن، ئەوا مەبەست و دانایی خوای گەورەی باشتر پایەدار دەبوو ئەگەر عەقڵەکانی ناچار کردبا بۆ باوەڕ هێنان پێی.

**وەڵام**: بەپێی بەڵگەی ئێوە پێویست دەبێت کە بوترێت باشتر وابوو، کارەکە لێزانتر دەبوو ئەگەر هاتبایە خوای گەورە بانگی خەڵکی نەکردبایە بۆ باوەڕ هێنان پێی لە ڕێگەی بەڵگەی عەقلی، بەتایبەتی کە خوای گەورە دەشزانێت کەسانێك هەن لەناو بەندەکانی دا ناتوانن بەڵگە بێننەوەو بەڵگە هێنانەوەیان لەلا ڕۆشن نییە.

جا واباشتر بوو کە کە عەقڵەکانیان ناچار بکات بۆ باوەڕ هێنان بەخودا، ئەرکی تێڕامان و بەڵگە هێنانەوەیان نەخاتە سەر شان، بە میهرو بەخشندەیی خۆی بەزیی بە هەر هەموویان بکات کە بەهۆیەوە مل بۆ باوەڕ شل بکەن وەك فریشتەکان[3].

٥- یەکێك لەو شتانەی پەیامە ئاسمانییەکانپوچەڵ دەکاتەوە، ئەوەیە کە بینیمانە چەند کەسێکلەوانەی بانگەشەی پەیامداریان کردووە، ئەوا بەڵگە بە نەشیاوە عەقلیەکان دێننەوە لەسەر ڕاستی پەیامەکان، وەك: (شەق بوونی دەریا، بەدیهێنانی وشتر لە بەرد، بوونی گۆپاڵ بە مار، چاك کردنەوەی لاڵ و بەڵەکی زکماك، ڕۆیشتن لەسەر ئاو، بەقسە هێنانی گورگ و وردە بەرد... و هاوشێوەکانیان)[4].

**وەڵام**:

ئەستەمی ئەو کارانە لە دیدی ئێوەدا دەرناچێت لەوەی:

---

[1] تمهيد الأوائل ١٤٢. تبصرة الأدلة ٤٤٤/١ و ٤٦٤.

[2] الفصل لإبن حزم ١٣٨/١.

[3] الفصل لإبن حزم ١٣٨/١.

[4] تمهيد الأوائل ١٣٥.

یان لە چوارچێوەی توانای خوای گەورە دابێت یاخود لە داب و نەریتەکان بێت.

ئەگەر وتیان: ئەمە لە چوارچێوەی دەسەڵاتی خوای گەورەدا نییە، ئەوا بەمە بێ باوەڕ بوونە و دەرچوونە لە ئایینەکەیان، لەسەریشیان پێویست دەبێت کە بڵێین خوای گەورە ئادەم و سەرجەم بوونەوەرەکانی تری بەدی نەهێناوە[1]. هەروەها بەڵگەش بەرپا نەدەبوو لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە بەدیهێنەرو خاوەن فەرمان و دەسەڵاتە و چۆن بیەوێت ئاوا فەرمان و ڕێگری بەسەر بەندەکانی دەکات، خودای گەورە بۆی هەیە یەکێك لە بەندەکانی هەڵبژێرێت تا پێناسەی فەرمان و ڕێگری خودا بکات، بەرنامەی خودا بە بەندەکان ڕابگەیەنێت، ئەمە کارێکی ئەستەم نییە[2].

ئەگەر وتیان ئەمە شتێکە بەپێی نەریت ناکرێ ببێت.

پێیان دەوترێت: جا چ شتێك ڕێگرە لەوەی خوای گەورە نەریتەکان تێك بشکێنێت و دەرئاساو موعجیزە بەرپا بکات لەسەر دەستی پێغەمبەرانی وەك بەڵگەیەکی درەوەشاوە و گومان هەڵنەگر لەسەر ڕاستگۆییان و دروستی بانگەوازەکەیان.

٦- مرۆڤ خۆی دەتوانێت تەنها بە زانست کاروباری ژیان و گوزەرانی ڕێکبخات.

**وەڵام:** بە دان پێدانانی زاناکان، سەرباری گەشەسەندنی زانست ئەوا هێشتان هەر دەستەوەسانە لە ئاست ئاشکرا کردنی زۆرێك لە نهێنییەکانی بوونەوەرو مەتەڵەکانی ژیان. پاشان زۆرێك لەو تیۆرانەی دوێنێ سەلمێنراو بوون ئەمڕۆ بەبێ بنەما و پوچەڵ دەرچوون.

ئەگەر وا دابنێین کە زانست دوای پێگەیشتنی و کامڵ بوونی دەتوانێت بەختەوەری و ڕێکخستنی ژیانی مرۆڤ دەستەبەر بکات. ئەوا شتێکی نکوڵی لێنەکراوە کە زانست ناتوانێت ئەو دەسەڵاتەی بەسەر دەروونی مرۆڤدا هەبێت کە پێغەمبەرایەتی و یاساو

---

[1] تمهيد الأوائل ١٣٥-١٣٦.

[2] نهاية الإقدام للشرهستاني ٤٢١.

ڕێسا خواییەکان هەیانە، بۆیە پێغەمبەرایەتی دەسەڵات و ڕۆڵی سەرەکی دەبێت لە پاکسازی کردن بۆ دەروونەکان و ئاراستەکردنیان بۆ خێرو خۆشەویستی و ئاشتی[1].

٧- ئەو ڕێساو یاسایانەی مرۆڤ دایاندەنێت و لە سروشی ئەزموونی خۆی وەریاندەگرێت، هەروەها پێداویستییە هاوچەرخەکانی پێویستیان بە ڕێنمایی و هیدایەتی پێغەمبەرایەتی نییە.

**وەڵام:** زاڵ بوونی یاسا دەستکردەکانی مرۆڤ بەسەر دەروونی مرۆڤایەتی زۆربەی کات تەنها زاڵ بوونێکی ڕووکەشی، تەنانەت جێبەجێ کردنی ئەم یاسا دەستکردانەش زۆربەی کات لەلایەن تاکەوە بەشێوەیەکی ڕووکەشی دەبێت، هەر کاتێك چاوی یاسا نەیبینێت تاك لێی ڕا دەکات، بەڵکو زۆرێك لەو کەسانە دەنازن بە لێهاتوویان لەبواری ساختەکاری و خۆدزینەوە لە دەستی سزاو دەسەڵاتی یاسا.

لە کاتێکدا یاسا ئاینیەکان دەسەڵاتیان هەیە، بەسەر لایەنی دەروونی کەسی دیندار، زاڵ دەبێت بەسەر دڵ و هەستەکانیدا، ئاین بە دەرو و دەروون (ظاهر وباطن) جێبەجێ دەکات، چونکە بڕوای وایە کە دانەری ئاین و داڕێژەی یاساکانی: ﴿ يَعۡلَمُ خَآئِنَةَ ٱلۡأَعۡيُنِ وَمَا تُخۡفِي ٱلصُّدُورُ ﴾ غافر: ١٩. واتە: (ئەو خوایە هەمیشە چاوە خیانەتکار و ناپاکەکان دەناسێت و دەزانێت چی لە دڵ و دەروون و سینەکاندا حەشاردراوە).

جێبەجێ کردنی یاساکانی ئاین هۆی ڕەزامەندی و سۆزو بەخششی خوایە، سەرپێچی کردنیشی هۆکارە بۆ بۆ تورەیی و سزاکەی.

پەیام و نامە ئاسمانییەکان، بریتین لە بەخشش و میهرو ڕەحمەتی خوایی بۆ مرۆڤایەتی، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيۡمَٰنَۚ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا ﴿١٦٣﴾ وَرُسُلٗا قَدۡ قَصَصۡنَٰهُمۡ عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُ وَرُسُلٗا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ﴿١٦٤﴾ رُّسُلٗا

[1] کتێبەکەمان: أصول الدين الإسلامي ١٩٦.

مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾ ﴾ النساء: ١٦٣ - ١٦٥. واتە (بەڕاستی ئێمە "وحی" و نیگامان بۆ تۆ ناردووە هەر وەکو چۆن نیگامان بۆ نوح و پێغەمبەرانی دوای ئەو ناردووە، هەروەها نیگامان ناردووە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و "هەندێك" لە کوڕانی یەعقوب و عیسا و ئەیوب و یونس و هاروون و سولەیمان، زەبوریشمان بە داود بەخشیووە. بێگومان بەسەرهاتی هەندێ لە پێغەمبەرانمان بۆ گێڕاویتەوە، بەسەرهاتی هەندێکی تریشمان بۆ نەگێڕایتەوە، بەڕاستی خوای گەورە خۆی لەگەڵ موسادا گفتوگۆی یەکسەری و ڕاستەوخۆی ئەنجامداوە. پێغەمبەرانمان "ڕەوانەکردووە" کە مژدەدەرن (بە ئیمانداران) و ترسێنەرن بۆ "یاخیەکان"، تا خەڵکی هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نەمێنێت دوای ئەوەی خوا پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانە کردوون، بێگومان هەمیشە و بەردەوام خوا باڵادەست و دانایە).

*****

## دەروازەی دووەم

## پێغەمبەرایەتی بەشێوەیەکی گشتی

### وشەی پێغەمبەر و پەیامبەر لە زمانەوانیدا:

وشەی (النبِي) لە بنچینەی زمانەوانیدا: بە هەمزە، بێ هەمزە هاتووە[1]:

١- جا ئەگەر وشەکە هەمزەدار بوو (النبِيء) ئەوە یان ئەوەتا:

أ- لە (النَّبَأ) هاتووە، کە بریتییە لە هەواڵ، جا پێغەمبەر بە (فَعِيْل) بە واتای ناوی بکەر دێت: واتە: (المُنبِىء) و هەواڵ لە خوای گەورە بە بەندەکانی دەدات. یاخود (فَعِيل) بە واتای ناوی بەرکار، واتە: هەواڵ پێدراو (المُنبأ، المُخبَر)، چونکە فریشتە لە خواوە سروش و نیگا بە پێغەمبەر ڕادەگەیەنێت[2].

ب- لە (النبِيء) هاتووە، کە بریتیە لە ڕێگەی ڕوون و ڕۆشن، چونکە پێغەمبەران ئەو ڕێگایەن کە بەندە دەتوانێ بەهۆیانەوە بە خوای گەورە بگات[3].

٢- ئەگەر وشەکە بێ هەمزە بوو (النبِي) ئەوە یان ئەوەتا:

أ- هەمزەکەی سووك کراوە.

ب- داتاشراوە لە (النبْوَة) و (النَّباوة)، واتە: بەرزی و بڵندی. ئەمەش بەهەمان شێوە بە (فعيل) بەناوی بکەر یاخود بەناوی بەرکار هاتووە، چونکە پێغەمبەر پلەی بەرزترە لە کەسانی تر یاخود بەرزکەرەوەی پلەیە[1].

---

(١) نافع بە هەمزە خوێندویەتیەوە، زۆربەی زانایان بێ هەمزە خوێندویانەتەوە./ المسامرة ٢٣٢.

(٢) المسامرة ٢٣٢. هاوشێوەی ئەمە هاتووە لە: لوامع الأنوار البهية ٤٩/١.

(٣) لوامع الأنوار البهية ٤٩/١.

وشەی پەیامبەر (الرسول) لە زمانەوانیدا: وەرگیراوە لە:

أ- وتەیەی کە دەوترێت دەڵێن: (جاءت الابل رَسَلاً) واتە: وشترەکان بە ڕیز هاتن بەدوای یەکدا، جا پەیامبەر ئەو کەسەیە کە شوێن هەواڵی ئەو زاتە دەکەوێت کە ڕەوانەی کردووە[2].

ب- لە بەدوای یەکدا هاتنی شیر، کە بێ پچڕان دێت، چونکە پەیامبەر ئەو زاتەیە کە سروش و نیگای بۆ سەر دادەبەزێت بە دوای یەکدا[3].

## وشەی پێغەمبەر و پەیامبەر لە زاراوەدا:

قورئانی پیرۆز ئەو دوو وشەی بەیەکەوە لە یەك فەرمایشتدا هێناوە: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٖ وَلَا نَبِيٍّ ...﴾ الحج: ٥٢. واتە: ("ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)" پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکی پەیامدارو بێ پەیامان ڕەوانە نەکردووە). زانایان ڕاجیان لەسەر ڕوونکردنەوەی ئەم دوو چەمکە و چەندین بۆچوونیان لەم بارەوە هەیە،ئەمانەش گرنگترینیانن:

**بۆچوونی یەکەم:**

پێغەمبەر: خوای گەورە شەریعەت و بەرنامە (واتە: یاسا و حوکمەکان)ی بۆ ڕەوانە کردووە جا چ فەرمانی پێ کردبێت بانگەوازی بۆ بکات و بەخەڵکی ڕایبگەیەنێت یان نا، جا ئەگەر فەرمانی پێکرا بە ڕاگەیاندن و بانگەواز کردن، ئەوا ئەو کاتە پێغەمبەرە و پەیامبەریشە.

جیاوازی نێوانیان بریتیە لە فەرمان پێکران بە ڕاگەیاندن و ڕانەگەیاندنی[1].

---

[1] المسامرة ٢٣٢. القاموس المحيط مادة (النبأ)، لوامع الأنوار البهية ٤٩/١، المواقف ٢١٧/٨-٢١٨، شرح المقاصد للتفتازاني ٥/٥، أصول الدين للبغدادي ١٥٤.

[2] لسان العرب مادة (رسل).

[3] أصول الدين للبغدادى ١٥٤.

پێغەمبەر گشتگیرترە لە پەیامبەر، واتە: پێویستە هەموو پەیامبەرێك پێغەمبەر بێت، بەپێچەوانە پێویست نییە هەموو پێغەمبەرێك پەیامبەر بێت[٢].

ئەم بۆچوونە بەناوبانگە[٣]، ئەمە بۆچوونی زۆربەی زانایان و سەرجەم ئەشعەرییەكانە[٤]، مەهدەوی و قازی عیازیش لە كتێبەكەی (الشفا) ئەم ڕایەی بە ڕاست داناوە، لەم بارەشەوە وتویەتی: (ئەو بۆچوونەی كە ڕاستە و چەندین زانای زۆرو زەبەندی لەسەرن ئەوەیە، كە هەر پەیامبەرێك پێغەمبەرە، بەڵام هەر پێغەمبەرێك پەیامبەر نییە[٥].

**بۆچوونی دووەم:**

پێغەمبەر بریتیە لەو مرۆڤەی خوای گەورە ڕەوانەی كردووە، بۆ ئەوەی ئەو پەیامە ڕابگەیەنێت و بانگەوازی بۆ بكات، كە لەلایەن خواوە بۆی دابەزیوەو پەیامبەریش هەمان

---

[١] المسامرة ٢٣١، شرح الخريدة للدردير ١٧، شرح الجوهرة للباجوري ٣٣.

[٢] شرح الخريدة للدردير وحاشية الصاوي عليه ١٧، شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ١٥٥، لوامع الأنوار البهية ٤٩/١ و٢٥٨/٢. باجوری لە (شرح الجورة ٣٣) وتویەتی: (لە نێوان دوو چەمكەكە گشتی و تایبەتی ڕەها هەیە، چونكە هەموو پەیامبەرێك پێغەمبەرە، بەڵام بەپێچەوانەوە نا)، و لە (شرح الطحاوية ١٠٥) دا هاتووە: (بەڵام وەك خودی پەیام ئەوا فراوانترە، چونكە پێغەمبەرایەتی بەشێكە لە پەیام، لەبەر ئەوەی پەیام و پێغەمبەرایەتی و شتی تریش لە خۆ دەگرێت، بە پێچەوانەی پەیامبەران كە پێغەمبەران شتی تر لەخۆ ناگرن، بەڵكو بەپێچەوانەوە پەیامبەران بەشێكن لە پێغەمبەران، جا پەیام وەك خودی خۆی زۆر فراوان گشتگیرترە و وەك پەیامبەر تایبەت و دیاریكراوە).

[٣] المسامرة ٢٣١، لوامع الأنوار البهية ٤٩/١، حاشية الصاوي على الدردير ١٧، لە (شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ١٥٥): وەسفی كراوە بە چاكترین پێناسە.

[٤] حاشية االمرجاني ١٢/١، حاشية الكلنبوي ٩/١، كفاية الطالب الرباني ١٦/١.

[٥] الشفا ١/ ٢٥١، تفسير القرطبـی ٤٤٧٢/٧ نقلا عن الشفا.

مانای هەیە، کەواتە هیچ جیاوازییەك نییە لەنێوانیان، بەڵکو هەردووکیان یەك واتایان هەیە[1].

ئیبن هەممام ئەم بۆچوونەی داوەتە پاڵ هەندێ زانای لێکۆڵەر[2]، ئەم بۆچوونە مەزهەبی زۆربەی موعتەزیلەکانە[3].

بەرپەرچی ئەم بۆچوونە بەم بەڵگانە دراوەتەوە:

١- خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ وَلَا نَبِيٍّ ... ﴾ الحج: ٥٢. واتە: ("ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)" پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکی پەیامدارو بێ پەیامان ڕەوانە نەکردووە...). ئەگەر پێغەمبەر وەك پەیامبەر بووبایە ئەوا لەم ئایەتەدا خوای گەورە پێغەمبەری نەدەخستە پاڵ پەیامبەر، چونکە ڕەتکردنەوەی شتێك پێویست دەکات هاوەشێوەکەیشی ڕەت بکرێتەوە[4].

٢- فەرمایشتی ئەبو زەڕ، کە دواتر دەخرێتەڕوو، لەبارەی ژمارەو ڕێژەی پێغەمبەران و پەیامبەران ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە پەیامبەران جیاوازن لە پێغەمبەران، بەپێی بۆچوونی دووەم دەبێت پێغەمبەر و پەیامبەر یەك بن، ئەمەش پێچەوانەی فەرموودەکەیە[5].

لەم بارەیەوە چەند بۆچوونێکی تریش هەن کە ماوە نییە بۆ باس کردنیان[6].

---

[1] المسايرة و شرحه المسامرة ٢٣١ و حاشية الصاوي على الدردير ١٧ و أعلام النبوة للماوردي ٣٨ و المقاصد للتفتازاني ٥/٥، شرح الجوهرة للباجوري ٣٣ نقلا عن السعد التفتازاني، خير القلائد ١٢٠ نقلا عن التفتازاني.

[2] المسايرة و شرحه المسامرة ٢٣١.

[3] حاشية المرجاني ١٢/١ و حاشية الكلنبوي ٩/١.

[4] حاشية الكلنبوي على الدَّوَّاني ٩/١.

[5] المسامرة ٢٣٢، شرح المقاصد ٦/٥، حاشية الكلنبوي، سەرچاوەکانی پێشوو. فەرموودەکەی ئەبو زەڕ لە چوارچێوەی بابەتی: (باوەڕ بە پێغەمبەران و پەیامبەران) دەخرێتەڕوو.

[6] سەیری ئەمانە بکە: حاشية الكلنبوي على الدواني ٩/١، حاشية المرجاني على الدواني ١١/١-١٣، أعلام النبوة ٣٨، شرح المقاصد للتفتازاني ٥/٥، تفسير القرطبي ٤٤٧٢/٧، تفسير البيضاوي ٣٣٠، المسامرة ٢٣١.

## حوکمی ڕەوانەکردنی پێغەمبەران و پەیامبەران

ڕاجیایی هەیە لەسەر حوکمی ڕەوانە کردنی پەیامبەران و پێغەمبەران، لەم بارەوە دوو بۆچوون هەن:

**١- دروستە:** بەپێی عەقڵ دروستە خوای گەورە پێغەمبەران و پەیامبەران ڕەوانە بکات هەر لە ئادەمەوە تا پێغەمبەری سەروەرمان موحەممەد (صلى الله عليه وسلم). ڕەوانەکردنی پێغەمبەران و پەیامبەران لەسەر خوا پێویست نییە، هەروەك ئەستەمیش نییە، بەڵکو ڕەوانەکردنی پێغەمبەران و پەیامبەران بریتیە لە چاکە و بەخششی خوایی. ئەمە بۆچوونی ئەشعەرییەکانە[1].

**٢- پێویستە:** ڕەوانەکردنی پێغەمبەران و پەیامبەران لەسەر خودا پێویستە. ئەمە بۆچوونی موعتەزیلەکان و فەیلەسوفەکانە. ئەم بۆچوونەی موعتەزیلەکانیش لەسەر ڕێسای پێویست بوونی ئەنجامی کاری چاك و چاکترەوە بنیاتنراوە، سیستەمەی سەرکێشی بۆ چاکسازی مرۆیی بەشێوەیەکی گشتی لە دونیاو دوارۆژ تەنها بەهۆی ناردنی پێغەمبەرانەوە دەبێت. هەر شتێکیش بەرەو چاکە بچێت ئەوا پێویستە لەسەر خودا جێبەجێی بکات، پێشتر وەڵامدانەوەی ئەشعەرییەکانمان لەوبارەووە خستەڕوو لەکاتی دوان لەسەر بابەتی (چاك و چاکتر) لەلای موعتەزیلەکان[2].

---

[1] شرح الجوهرة للباجوري ١٩٨، الإنصاف للباقلاني ٦١، لە کتێبی (نهاية الإقدام ٤١٧) شەهرستانی دا هاتووە: (ئەشعەرییەکان و کۆمەڵێك لە ئەهلی سوننە بۆچوونیان وایە کە بوونی پێغەمبەرایەتی بە عەقڵ دروستە، بە واقعیش هەبووەو لەبەرچاو بووە، شتێکی ئەستەمیش نییە بەهۆی ئەوەی عەقڵ دەتوانێت ئەندێشەی بکات و سەلماندوویەتی کە ئەستەم نییە).

[2] شرح الجوهرة للباجوري ١٩٨، لە کتێبی (نهاية الإقدام ٤١٧) شەهرستانی دا هاتووە: (موعتەزیلەکان و کۆمەڵێك لە شیعەکان بۆچوونیان وابووە کە بوونی پێغەمبەرایەتی پێویستە وەك میهرو لوتفێکی خوایی).

بۆچوونی فەیلەسوفەکان لەمەدا ڕێسای هـۆدارکردن یـاخود سروشـت بنیـاتنراوە، جـا دەڵێن: کە خودا هەیە پێویستە بەو هۆیەوە یاخود بەهۆی سروشتەوە جیهان ببێت، بەهۆی بوونی جیهانیشەوە پێویستە یەکێك هەبێت چاکسازی بۆ بکات.

ئەشعەرییەکان بەرپەرچی ئەم بۆچوونەیان داوەتەوە کە پێی وایە ناردنی پێغەمبـەران و پەیامبەران پێویستە، بەوەی خودای مـەزن چـی بیـەوێت ئـــەوە دەکـات و ناچـار کـراو نییە[1].

**٣- ئەستەمە:** ناردنی پێغەمبەران و پەیامبەران بۆ خودا ئەسـتەمە. ئەمـە بۆچـوونی سمنیەکان و براهمەمەکانە. پێیان وابووە کە ناردنی پێغەمبەران و پەیامبەران کارێکی پڕو پوچە و لە زاتی دانا و کارزان ناوەشـێتەوە، چـونکە عـەقڵ پێویسـتی بـە پێغەمبـەران و پەیامبەران نییە، ئەگەر شتێك عەقڵ پێی چاك بوو ئەوا پێویستە لەسەری ئەنجامی بـدات ئەگەر پێغەمبەر فەرمانیشی پێ نەکات. ئەگەر شـتێك عـەقڵ پێـی خـراپ بـوو دەبێـت فەرامۆش بکرێت ئەگەرچی پێغەمبەریش قەدەغەی نەکات. جا ئەگەر شتەکە نە چاك نـە خراپ بوو، ئەوا ئەگەر پێویستی پێبوو ئەوا با بیکـات ئەگـەر پێویستیشـی پێنـەبوو بـا فەرامۆشی بکات[2].

لــە چوارچـێوەی بابــەتی: (گفتوگـۆو مشـتومڕ کـردن لەگـەڵ ئەوانـەی نکـۆڵی لــە پێغەمبەرایەتی دەکەن) بەرپەرچیاه ئەم گومانە درایەوە.

## ڕێگەی سەلماندنی پێغەمبەرایەتی

سەلماندنی پێغەمبەرایەتی تەنها کاتێك دەبێت کە دوو شت بەیەکەوە کۆ ببنەوە:

**یەکەم:** بانگەشە کردنی پێغەمبەرایەتی.

**دووەم:** دەرخستنی دەرئاساو موعجیزە.

---

[1] شرح الجوهرة للباجوري ١٩٨.

[2] شرح الجوهرة للباجوري ١٩٨، لە کتێبی (نهاية الإقدام ٤١٧) شەهرستانی دا هاتووە: (بەراهیمەکان و صابیئەکان بۆچوونیان وابوو کە پێغەمبەرایەتی بەپێی عەقڵ ئەستەمە). عوسمانی کلیسي لە (خير القلائد ١٢٦) ئەم حوکمانەی باس کردووە.

جا هەر كەسێ بانگەشەی پێغەمبەرایەتی كرد و مـوعجیزەی دەرخسـت وەك بەڵگـەی ڕاستێتی بانگەشەكەی، ئەوا ئەو كەسە پێغەمبەرە[1].

دواتر بە تێروتەسەلی دەخرێتەڕوو.

## پێغەمبەرایەتی

### بە هەڵبژاردن و دەستنیشان كردن دەبێت لەلایەن خودای گەورەوە

پێغەمبەرایەتی فەزڵ و بەخششێكی خوایە هەر بەندەیـەك كـە خـوای گـەورە ویسـتی لەسەر بێت پێی دەبەخشێت، جا كەواتە ئەو پلەیە بە دەست نایەت بـەڵكو دەبەخشـرێت، هەر چەندە بەندە پەرستشی زۆرو سـەخت بكـات و پاكسـازی بـۆ دەروون و ڕۆح بكـات و جەستەش دووربگرێت لە شتی نزم و خـراپ، ئـەوا هـەر ئـەو پلەیـەی دەسـت ناكـەوێت، بەهەمان شێوە بە میرات و زیرەكی بەدەست ناهێنرێت، كۆمەڵگەش هـیچ كاریگـەریی و ڕۆڵێكی نییە لەمەدا[2].

خـوای پـاك و بـەرز دەفـەرمووێت: ﴿ ٱللَّهُ يَصۡطَفِي مِنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلٗا وَمِنَ ٱلنَّاسِ﴾ الحج: ٧٥. واتە: (هەر خوا بەویستی خۆی لە فریشتەكان و لە خەڵكیش فرسـتادە هەڵدەبژێرێت).

خوای بێ وێنەدەفـەرمووێت: ﴿قُلۡ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلۡقَآيِٕ نَفۡسِيٓۖ إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّۖ ﴾ یونس: ١٥. واتە (ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵێ: من بۆم نیە لەخۆمەوە بیگۆڕم، من شوێنی هیچ شتێك ناكەوم، جگە لەوە نەبێت كە بە وەحی پێم دەگات).

---

[1] المسامرة ٢٤٠، شرح المواقف للسيد الشريف ٢٤٣/٨، المقاصد وشرحه للتفتازاني ٢٧/٥، شرح العقائد النسفية للتفتازاني ١٦٨، شرح العقائد العضدية للدواني ٢٧٧/٢، كشف المراد ٣٧٧، المعالم الدينية ٩٦.

[2] لوامع الأنوار البهية ٢٦٧/٢، شرح الجوهرة للباجوري ٢١١، المواقف وشرحه للسيد الشريف ٢١٨/٨، شرح المقاصد للتفتازاني ٥/٥ و٨، نهاية الإقدام ٤٦٢.

هەروەها دەفەرموویێت: ﴿ يُنَزِّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ أَنْ أَنذِرُوٓا۟ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱتَّقُونِ ﴾ النحل: ٢. واتە: (پەروەردگار، خۆی فریشتەکان بە ڕەحمەت و ژیانەوە "کە وەحی ئاسمانە" دەنێرێت بۆ هەر کەسێك کە بیەوێت لە بەندەکانی "کە پێغەمبەرانن"، فەرمانیان پێدەدات کە: خەڵکی بێدار بکەنەوە لەوەی کە بەڕاستی جگەلە من هیچ خوایەکی تر نییە، لەبەر ئەوە لە خەشم و قینم خۆتان بپارێزن).

## پێغەمبەران و پەیامبەران مرۆڤـن

پێغەمبەران و پەیامبەران مرۆڤـن، دەخۆن و دەخۆنەوە، دەخەون و نەخۆش دەکەون، خەمبار دەبن و شتیشیان لەبیر دەچێتەوە، برسیی و تینوو دەبن، ژن دەهێنن و تـوڕەش دەبن، ماندوو دەبن و ڕاوێژیش دەکەن.... هاوێنەی ئەو سیفەتە مرۆییانەی کە نابنە هۆی کرچ و کاڵی و کەم و کورتی بۆیان.

لەبەر ئەمە خودای گەورە ئەوانی هەڵبژاردووە لە هەمان ڕەگەزی ئەوانەی کە بۆیان ڕەوانە دەکرێن، تا پەیوەندییەکی پتەویان لەگەڵیان هەبێت، هەست بکەن بە شتەکانی ئەوان، ئاگاداری ئێش و ئازاریان بن، بەڵگەی گومان بڕیان لەسەر بەرپا بکەن، ڕێگەی ڕاستیان بۆ ڕوون بکەنەوە. بەپێی ئەم بەڵگانە:

### یەکەم: لە قورئانی پیرۆز:

أ- خـوای گـەورە دەفـەرموویێت: ﴿ لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾ التوبـة: ١٢٨. واتە: ("ئەی خەڵکینە" سوێند بەخوا بەڕاستی پێغەمبەرێکتان بۆ ڕەوانەکراوە کە هەر یەکێکە لە خۆتان، زۆر سەختە بەلایەوە تووش بوونتان بەبەڵاو ناخۆشی، زۆر بە تەنگیشتانەوەیە و پەرۆشە لەسەرتان، زۆر دڵسۆزی ئیماندارانە و میهرەبان و دلۆڤانە بۆیان).

ب- خوای پاك و بەرز دەفەرموویێت:: ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ﴾ الكهف: ١١٠، و فصلت: ٦. واتە ("ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)" پێیان

بڵێ: بەڕاستی من تەنها ئادەمیزادێکم وەك ئێوە، بەڵام ئەوەندە هەیە وەحی و نیگام بۆ دێت).

پ- خوای مەزن دەفەرموویێت: ﴿قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ وَلَوۡ كُنتُ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُ﴾ الأعراف: ١٨٨. واتە ("ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)" پێیان بڵێ: کە من ناتوانم، هیچ قازانج یان زیانێك بەخۆم بگەیەنم، مەگەر ویستی خوای لەسەر بێت، خۆ ئەگەر غەیب و شاراوەکانم بزانیایە، ئەوە چاکەی زۆرم کۆدەکردەوە بۆ خۆم و هیچ ناخۆشیەکیشم تووش نەدەبوو).

ت- خوای بێ وێنە دەفەرموویێت: ﴿ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلٗا مِّن قَبۡلِكَ وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ أَزۡوَٰجٗا وَذُرِّيَّةٗۚ ﴾ الرعد: ٣٨. واتە (سوێند بەخوا بێگومان پێشچ تۆ پێغەمبەرانی ترمان ڕەوانەکردووە و هاوسەرو نەوەشمان پێداون).

ج- خوای تاك و بێ هاوەڵ دەفەرموویێت: ﴿ قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمۡ عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ وَلَآ أَقُولُ لَكُمۡ إِنِّي مَلَكٌۖ إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّۚ ﴾ الأنعام: ٥٠. واتە (ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵێ: من پێتان ناڵێم گەنجینەکانی خوا لای منە، هەروەها لە نهێنی و شاراوەکانیش هیچ نازانم و ئاگادار نیم و پێتان ناڵێم بەڕاستی فریشتەم، بەڵکو تەنها شوێنی ئەوە دەکەوم کە بەوەحی و نیگا پێم دەگات).

### دووەم: لە سوننەتی ڕێزداری پێغەمبەر *(صلى الله عليه وسلم)*:

أ- فەرمایشتی ئەبو مەسعود کە وتی: کەسێك هاتە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و لەگەڵی دوا، جا کەسەکە دەلەرزی، ئەویش پێی فەرموو: **(هَوِّن عليك، فاني لست بمَلِك، انما أنا ابن امرأة تأكل القَديد)**[1]، واتە: ئاسایی بە و مەشڵەژێ، من پادشا نیم، بەڵکو من کوڕی ئافرەتێکم نانە ڕەقەی دەخوارد.

---

[1] فەرموودەی: أبی مسعود: سنن ابن ماجە - كتاب الأطعمة - باب القديد ٢/١١٠١.

ب- ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم): **(إنما أنا بشرٌ مثلكم أنسى كما تنسون، فاذا نسيتُ فذكّروني)**[1] واتە: منیش وەك ئێوە مرۆڤم شت لەبیر دەكەم، هەروەكو چۆن ئێوەش شت لەبیر ئەكەن، ئەگەر شتێكم لەبیر كرد ئێوە بیرم بخەنەوە.

پ- خاكی و خۆبەكەم زانینی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ژیاننامەكەی بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مرۆڤە و هیچ یەكێك ناتوانێت نكۆڵی لەمە بكات.

ت- بەندایەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ خوای گەورە لە فەرمایشت و نزاكانیدا دیارە، هەروەك لەم فەرمایشتەدا هاتووە: **(اللهم اني عبدك وابن عبدك، ابن أمَتِك، ناصيتي بيدك، ماضٍ فيَّ حكمُك، عَدْلٌ فيَّ قضاؤك)**[2] واتە: خوایە من بەندەتم كوڕی بەندەتم كوڕی كەنیزەك و كۆیلەتم. نسیب و نێوچەوان و چارەنوسم بەدەست تۆیە و حوكم و بڕیارت بەسەرمدا ڕابوردووە.هاووێنەی ئەم دەقانەگەلەك زۆرن.

## سوودەكانی تووش بوونی پێغەمبەران بە دیاردە مرۆییەكان

پێشتر ئەوە خرایەڕوو كە پێغەمبەران مرۆڤن، تووشی دیاردە مرۆییانە دەبنەوە، وەك: چەرمەسی، نەخۆشی، لەبیرچوونەوە، هەژاری... تاد، كە سەرجەم خەڵكی تر تووشی دەبن، بەڵام تووش بوونی پێغەمبەران بەم دیاردانە چەند سوودێكی هەیە كە پوختی دەكەینەوە لەم خاڵانەی خوارەوە:

**١- گەورە كردنی پاداشتەكانیان:** لەبەرئەوەی چەرمەسەری و نەخۆشی چەندین پاداشتی گەورەی لەسەر كەڵەكە دەبن، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: **(أشد**

---

[1] فەرموودەی: منیش وەك ئێوە مرۆڤم... تاد: صحيح البخاري: ٨ كتاب الصلاة، ٣١ باب التوجه نحو القبلة، رقم ٤٠١، بهذا اللفظ، عن عبدالله بن مسعود. وفي صحيح مسلم: ٥ كتاب المساجد ١٩ باب السهو في الصلاة، رقم ٥٧٢، عن عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه).

[2] فەرموودەی: خوایە من بەندەتم... تاد:رواه أحمد في مسنده ٤٥٢/١.

**الناس بلاءً الأنبياء، ثم الأمثل فالأمثل)**[1] واتە: پێغەمبەران لە هەموو خەڵکی ناخۆشی و چەرمەسەری زیاتر دەبینن پاشان ئەوانەی دوای ئەوان و دواتر ئەوانی تر.

پێشەوا قوشەیری وتویەتی: هەموو کەسێك شایەنی تاقیکردنەوەی سەخت و چەرمەسەری نییە، چونکە تاقی کردنەوەو چەرمەسەری بۆ ئەولیاکانە، بەڵام چەرمەسەری هەر زوو کەسانی بێگانە فەرامۆش دەکات و وازیان لێ دێنێت[2].

هەرچەندە خوای گەورە لە تاوانیدا هەیە کە پاداشتەکانیان زیاد بکات بەبێ تاقیکردنەوەو ئێش و ئازار، بەڵام کارزانی و حیکمەتی خوایی وادەخوازێت بەهۆی تاقیکردنەوەوە پاداشتەکانیان زیاد بکات: ﴿ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ ﴾ الأنبياء: ٢٣.[3] واتە: (پرسیار ناکرێت لەوەی کە خوا دەیکات).

**٢- یاسادانان:** لەبیرچوونەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە نوێژدا یاسادانانە بۆ خەڵکی، فێریان دەکات چۆن کرنووشی لەبیرچوونە (سهو) ببەن، چونکە ئاماژەو مانای کردەوە بەهێزترە لە ئاماژەی وتە[4].

٣- دڵدانەوە بە بارودۆخی پێغەمبەران، کاتێك تووشی کارەساتێك دەبین کە بەسەر پێغەمبەرانیشدا هاتووە،وەك: نەخۆشی و دەرد، کەمی سەروەت و سامان، ئازاردرانیان

---

[1] شرح أم البراهين للسنوسي ١٨٥-١٨٦، شرح السنوسية للباجوري ١٣٠. شرح الخريدة للدردير ١٠١.

فەرموودەی: پێغەمبەران لە هەموو خەڵکی ناخۆشی... تاد: أحرجه أحمد و البخاري والترمذي و ابن ماجه، عن سعد، وهو صحيح./ الجامع الصغير ٦٩. بكه.

[2] شرح السنوسية للباجوري ١٣٠.

[3] شرح الخريدة للدردير ١٠١، شرح أم البراهين للسنوسي وحاشية الدسوقي عليه ١٨٥-١٨٦.

[4] شرح الخريدة للدردير ١٠١، شرح أم البراهين للسنوسي وحاشية الدسوقي عليه ١٨٥، شرح السنوسية للباجوري ١٣٠.

لەلایـەن خەڵکیـەوە، سـەرباری پلـە بـەرزی و شـکۆداریان، ئـەوا کەسـەکە بەمـە دڵـی دەدرێتەوەو ئارامگر دەبێت لەسەر ئەو ناخۆشیەی بەسەریدا هاتووە[1].

٤- بۆ ئاگار کردنەوەی خەڵکی جگە لە پێغەمبەران لە ئاست بێ نرخی دونیا لەلایـەن خوای گەورە، کاتێك دەبینن پێغەمبەران پشتیان لە دونیا کردووەو خۆیان دوور گرتووە لە چێژو خۆشیەکانی[2].

سەرزەنشتی دونیا لە هەندێك دەقدا هاتووە، بەڵام مەبەستی لەو دونیایەیە کە مرۆڤـ سەرقاڵ و بێ ئاگا دەکات لە یادی خوای گەورە، پێویستە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبـەریش (صلی الله علیه وسلم) هەر بە هەمان مەبەست ڕاڤە بکرێت: **(ألا ان الدنيا ملعونة، ملعـون ما فيها، الا ذكر الله وما والاه و عالم أو متعلم)** واتە: بێگومـان دونیـا نەفرەتیـە، ئـەوەی تیایدایە بەهەمان شێوە نەفرەتیە، تەنها یادی خواو ئەوەی هاوشێوەی ئەو چاکن و زانـا و زانستخواز نەبن. وەك: یـادی خـوا واتـە: (سـبحان الله) و (الحمـد لله) و (لا الـه الا الله) کردن.

بەڵام دونیایەك کە مرۆڤـ بێ ئاگا نەکات لە یادی خـوای گـەورە، ئـەوا سەرزەنشـتی ناکرێت بەڵکو ستایشی دەکرێت، پێویستە ئـەم فەرمایشـتەی پێغەمبـەر (صلی الله علیـه وسلم) بەم پێیە لێك بدرێتەوە: **(نِعْمَ الدنيا مطيّةُ المؤمن، بها يصل الى الخير، و بها ينجو من الشر)** واتە: دونیا چاکترین وڵاخی سوارییە بۆ باوەڕدار، کە بەهۆیەوە چاکە ئـەنجام دەدات و خۆی دوور دەگرێت لە خراپە.

بەمەش دەزانرێ: دونیا بەخودی خۆی نە سەرزەنشت کراو، نە ستایش کراوە[3].

---

[1] شرح الخريدة للدردير وحاشية الصاوي عليه ١٠١-١٠٢، شرح أم البراهين للسنوسي وحاشية الدسوقي عليه ١٨٥، شرح السنوسي للباجوري ١٣١.

[2] شرح الخريدة للدردير ١٠١، شرح أم البراهين للسنوسي ١٨٥، شرح السنوسية للباجوري ١٣١.

[3] شرح السنوسية للباجوري ١٣٢، شرح أم البراهين للسنوسي، سەرچاوەی پێشوو.

فەرموودەی: بێگومان دونیا نەفرەتیە... تاد: سنن الترمذي، كتاب الزهد، باب الدنيا ملعون ما فيها إلا ذكر الله أو عالم أو متعلم، عن أبي هريرة ٨٠/٧، وقال حديث حسن غريب.

## ژمارەو ڕێژەی پێغەمبەران

خوای گەورە ئەندازەی کێشاوە بۆ سەرجەم ئەو شتانەی کە خەڵکی پێویستیان پێی هەیە، لە لێهاتووی و زیرەکی و توانا جیا جیاکان، تا ژیان و گوزەرانێکی خۆش و بەختەوەریان بۆ فەراهەم بکات، ئەم شتانەی دابەش کردوو لە نێوان تاکەکان بەو ئەندازەیەی کە پێویستیان پێ هەیە، بۆ نمونە پیاوانی هێزی سەربازی و دارتاش و ئاسنگەر و جوتیار و خاوەن پیشەکان گەلەك زۆرن، بەڵام ژمارەی کەسانی خاوەن کەسایەتی سەرکردایەتی و زانستی زۆر کەمن، تەنانەت ئەوانەی خاوەنی شێوەیەك لە تواناو لێهاتووین لەیەك بواردا زۆر کەمن، لەبەر ئەمە ڕێژەی ئەوانەی ڕابەرایەتی هزریی جیهان دەکەن و ڕێنموونی کارن بۆ سەر ڕێگەی ڕاست، کە پێغەمبەران و پەیامبەرانن کەمن، چونکە کارەکەیان پێویستی مرۆڤ دابین دەکات و دەبێتە مایەی سوود بۆ مرۆڤایەتی بۆ چەندین نەوەی داهاتوو و دوور.

ئەگەر ئەو فەرموودەیە وەربگرین، کە ڕێژەی پێغەمبەران بە (١٢٤٠٠٠) و پەیامبەران بە (٣١٣) دیاری دەکات. ئەوا دەبینین ئەو ڕێژەیە بە بەراورد لەگەڵ گەلانی جیهان زۆر کەمە، هەر لە سەرەتای بەدیهێنانی مرۆڤ تا سەردەمی پێغەمبەری سەروەرمان موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)، تەنانەت هەر پێوانە ناکرێت لەگەڵ ئەو نەوانەی لە داهاتوودا دێن[1].

بەڵام پێویستە لە باوەڕ هێنان بە پێغەمبەران، ڕێژەیان دیاری نەکرێت و لە ژمارەیەکی دیاریکراو کورت نەکرێتەوە، چونکە:

١- بەڵگەیەکی سەلمێنراو و بڕاوە (قطعي) لە قورئانەوە نەهاتووە، دیاری کردنی ڕێژەیان پێچەوانەی ڕووکەشی ئەم ئایەتەیە: ﴿مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ﴾ غافر: ٧٨. واتە: (هەیانە سەرگوزەشتە و بەسەرهاتیانمان بۆ گێڕاویەتیەوە، هەشیانە سەرگوزەشتە و بەسەرهاتیمان بۆ نەگێڕاویەتیەوە). ئەو

[1] مبادء الاسلام ٣٣.

فەرموودەیەی لەوبارەوەش هاتووە لە بارەی ڕێژەی پێغەمبەران فەرموودەیەکی لاوازە، چونکە: هەواڵی یەك کەسە، یەك کەس گێڕاویەتیەوەو هاودەم (قرینة)یەکی لەگەڵدا نەهاتووە کە بیگەیەنێتە پلەی سەلمێنراو و بڕاوە، چونکە هەواڵی یەك کەس گومان هەڵدەگرێت، لە بواری بیروباوەڕدا هیچ بایەخێك بۆ هەواڵی گوماندار دانانرێت.

٢- ئەگەر ژمارەی پێغەمبەران و پەیامبەران لەو ڕێژە دیاری بکرێت، ئەوا لەوانەیە ببێتە هۆی بە پێغەمبەر دانانی کەسێك کە پێغەمبەر نییە یاخود کەسێك بە پێغەمبەر دانەنرێ کە پێغەمبەرە[١].

[١] المسايرة وشرحها المسامرة ٢٢٥. شرح المقاصد للتفتازاني ٥/٦١-٦٢، شرح العقائد النسفية ١٦٩-١٧٠، شرح الخريدة للدردير ١١١، لوامع الأنوار البهية ٢/٢٥٨.

ئەو فەرموودەیەی لەبارەی ڕێژەی پێغەمبەرانەوە هاتووە لە موسنەدی ئەحمەد (ڕەزای خوای لێبێت) لە فەرموودەی ئەبو زەڕ (ڕەزای خوای لێبێت) هاتووە، کە دەڵێت، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ژمارەی پێغەمبەران چەندە؟ فەرمووی: (مئة ألف و أربعة و عشرون، الرسل من ذلك ثلاثة و خمسة عشر جما غفيرا) واتە: سەدو بیست و چوار هەزار، سێ سەدو پازدەیان لەناو ئەو ڕێژە زۆرەدا پەیامبەرن.

تەبەرانی لە (المعجم الكبير)دا بە دەربڕینی (أربعة و عشرون ألفاً) گێڕاویەتیەوە، ئەوەی دەریخست کە گێڕانەوەکەی ئیمامی ئەحمەدا دیار نەبوو.

خولگەی ئەم فەرموودەیە لەسەر عەلی کوڕی یەزیدە کە لاوازە./ المسامرة ٢٢٦.

ئەم فەرموودەیە دەربڕینێکی تری هەیە کە لە (صحيح إبن حبان): سەدو بیست و چوار هەزار پێغەمبەر، سێ سەدو سێزدە پەیامبەر. لە گێڕانەوەیەکی تردا: سێ سەدو چواردە پەیامبەر. هەروەها لە گێڕانەوەیەکی تردا: سێ سەدو پازدە پەیامبەر./ كفاية الطالب الرباني ١/١٧. لوامع الأنوار البهية ٢/٢٥٨.

وەلیەددینی عێراقی دواوە لەسەر ئەم فەرموودەیە، کۆمەڵێك لەوانەی فەرموودە لەبەرکار (حفاظ)ن بەپەرچی (ئیبن حبان)یان داوەتەوەو ڕەخنەیان لێ گرتووە لەوەی کە ئەو فەرموودەیەی لە ڕیزی فەرموودە ڕاستەکان هێناوە./ لوامع الأنوار البهية ٢/٢٦٤، ئەو فەرموودەیە چەند دەربڕین و سەندێکی تر هەن لە (موسنەدی ئەحمەد)، (بەزار)، تەبەرانی لە (الأوسط)دا کە لە (مجمع الزوائد)دا باسی کردووە،/ المسامرة ٢٢٦ و (قاسمی کوڕی قوتلوبوغا) هەواڵەکەی لە گێرەڕەوکانیەوە هێناوە کە (ئیسحاقی کوڕی ڕاهویە، ئیبن ئەبی شەیبە، موحەممەدی کوڕی ئەبو عومەر، ئەبو یەعلا)./ شرح المسايرة لقاسم بن قطلوبغا ٢٢٥.

بەڵام قورئانی پیرۆز ناوی بیست و پێنج لە پێغەمبەرانی هێناوە، کە ئەمانەن: (ئادەم، ئیدریس، نوح، هود، صالح، ئیبراهیم، لـوط، ئیسماعیل، ئیسحاق، یـەعقوب، یوسـف، شوعەیب، ئەیوب، ذو الكفل، موسا، هارون، سولەیمان، داود، ئیلیاس، ئەلیەسع، یـونس، زەکریا، یەحیا، عیسا و موحەممەد (صلی الله علیه وسلم))[1].

## کاری پێغەمبەران و ڕەوانە کرانیان بۆ هەموو گەلانی جیهان

پێغەمبەران و پەیامبەران ڕێنمایی مرۆڤــ دەکەن بۆ سەر ڕێگای ڕاست، خـاوەنی ئـەو یاساو ڕێسایانەن کە پاکسازی دەکەن، چارەی کێشە ماددی و ڕۆحییەکان دەکەن، مـژدەی بەهەشت بە کەسی پارێزگارو لە خـواترس دەدەن، هەڕەشـەی ئـاگری دۆزەخ لـە کەسـانی گەندەڵ و بێ باوەڕ دەکـەن، ئـەو پێداویسـتیە دونیایانـە بـۆ خـەڵکی دابـین دەکـەن کـە پێویستیان پێ دەبێ لە کاروباری دین و دونیادا.

خوای گەورە پێغەمبەرانی بۆ گشت گەلانی جیهانی ڕەوانە کردوون، جـا هـەر گـەلێك پەیامبەری خۆیان هەبووە، ئەگەرچی خوای گەورە ناوەکانیانی بەئێمە ڕانەگەیاند بێت، بـە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە:

أ- ﴿وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ﴾ فـاطر: ٢٤. واتــە: (بێگومـــان هــیچ گـــەل و نەتەوەیەکیش نەبووە فرستادە و بێدارکەرەوەیەکی بۆ ڕەوانە نەکرابێت).

ب- ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ﴾ النحـل: ٣٦. واتە: (سوێند بەخوا بێگومان ئێمە لەناو هەر گـەل و نەتەوەیەکـدا پێغەمبــەرێکمان ڕەوانە کردووەو پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێیـت: تـەنها خـوا بپەرسـتن، خۆتـان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو جۆرە پەرستراوێکی تر).

پ- ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبْعَثَ فِي أُمِّهَا رَسُولًا يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا ۚ وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي الْقُرَىٰ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَالِمُونَ﴾ القصـص: ٥٩. واتە: (پەروەردگاری تـۆ

[1] شرح الخريدة للدردير ١١٠-١١١.

هیچ وڵات و شارێکی کاوڵ نەکردووە، تا لە پایتەختەکەیدا پێغەمبەرێکی نەناردبێت کە ئایەتەکانی ئێمەی بەسەردا بخوێنێتەوە، وەنەبێت ئێمە شارو وڵاتانمان کاول کردبێت بەبێ هۆ، مەگەر کاتێك نەبێت کە دانیشتووانی ستەمکار بوون).

تێکڕای ئەم دەقانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی ڕەوانە کردنی پێغەمبەران، کورت نەبۆتەوە لە گەلێکی دیاریکراو یان لە شوێنێکی دیاریکراودا، وەك: دوورگەی عەرەبی.

## پێویستی باوەڕبوون بە پێغەمبەران و پەیامبەران

بڕواهێنان بە پێغەمبەران و پەیامبەران، بەڕاست دانانی هەموو ئەو هەواڵ و خەبەرەکانیان، گوێڕایەڵ بوون بۆ فەرمان و ڕێگرییەکانیان، پێویستە لەسەر گشت موسڵمانێك:

أ- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴾ البقرة: ١٣٦.[1] واتە: ("ئەی پەیڕەوانی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) ئێوە" بڵێن: ئێمە باوەڕمان بەخوا هێناوەو بەو قورئانەش کە دابەزیوە بۆمان و بەوەش کە دابزیوە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و نەوەکانی یەعقوب، هەروەها بەو پەیامەی بۆ موسا و عیسا هاتووەو بەو پەیامانەی کە بۆ پێغەمبەران بەگشتی ڕەوانە کراوە لەلایەن پەروەردگاریانەوە و ئێمە جیاوازی ناکەین لە نێوان هیچ کام لەو پێغەمبەرانەدا، ئێمە هەموومان تەنها تەسلیمی فەرمانی پەروەردگارین).

ب- خوای بێ وێنە دەفەرموێت: ﴿كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦ ﴾ البقرة: ٢٨٥. واتە: (هەموویان باوەڕیان هەیە بە خواو فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی (دەڵێن) هیچ جیاوازیەك ناکەین لە نێوان هیچ پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرەکانی خوادا "لەباوەڕدا").

---

[1] لوامع الأنوار البهية ٢٦٣/٢.

پ- خوای گەورە پاداشتێکی گەورەی ئامادە کردووە بۆ ئەوانەی باوەڕیان بە سەرجەم پێغەمبەران هێناوە، لەمبارەوە فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَلَمْ يُفَرِّقُواْ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ أُوْلَٰٓئِكَ سَوْفَ يُؤْتِيهِمْ أُجُورَهُمْ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ النساء: ١٥٢. واتە: (ئەوانەی باوەڕیان بەخواو پێغەمبەرەکانی هێناوەو هیچ جۆرە جیاوازیەکیان نەکردووە لە نێوان هیچ کامیانداو باوەڕیان بە هەموویان هەیە، ئا ئەوانە لە ئایندەدا خوای گەورە پاداشتی خۆیان دەداتێ، خوای گەورەش هەمیشە و بەردەوام لێخۆش بوو میهرەبانە).

**بە درۆخستنەوە یاخود بەکەم و کورت دانانی پێغەمبەران کوفرە**

پێغەمبەران هەموویان لەیەك شتدا کۆدەبنەوە، کە بریتییە لە: پێغەمبەرایەتی.

لەبەر ئەمە سەرجەم زانایانی ئیسلام کۆکن لەسەر ئەوەی کەسێك بێ باوەڕە ئەگەر پێغەمبەرێك بە درۆ بخاتەوە کە پێغەمبەرایەتیەکەی دیاربێت، بەهەمان شێوە هەر کەسێ توانج و تانەوتەشەر لە پێغەمبەرێك بدات یان وابزانێت کەموکورتی هەیە ئەوا ئەو کەسە بێ باوەڕەو پێویستە بکوژرێت بەدەقی ئەم فەرمایشتە: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيْنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١٥٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ حَقًّا ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٥١﴾ ﴾ النساء: ١٥٠- ١٥١. واتە: (بێگومان ئەوانەی باوەڕ بەخواو پێغەمبەران ناهێنن و دەیانەوێت جیاوازی بکەن لە نێوان خواو پێغەمبەرەکانیدا "گوایە باوەڕیان بەخوا هەیە، بەڵام باوەڕیان بە پێغەمبەر نییە"، (یاخود) دەڵێن: باوەڕ دەهێنین بەهەندێك لە پێغەمبەران و باوەڕ بەهەندێکیان ناهێنین و دەیانەوێت لەو نێوانەدا ڕێگە و بەرنامەیەك بۆ خۆیان بەدەست بێنن. ئا ئەو جۆر کەسانە بەڕاستی هەر بێ باوەڕن و بۆ بێ باوەڕان سزایەکی سەر شۆڕکەرمان ئامادە کردووە).

## قورئانی پیرۆزو کتێبە ئاسمانیەکانی تر

بنچینە و ڕەگ و ڕیشە سەرەکیەکانی پەیامە ئاسمانیەکان، بیروباوەڕو ئامانجەکانیان یەك شتن، کە ئەمانەن: ڕێنمایی و ئاراستەکردنی مرۆڤ بۆ ڕێگای چاکەکاری و سەرکەوتن. خوای پایەبەرز دەفەرموویت: ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِيٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ أَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِ﴾ الشورى: ١٣. واتە: (ڕێبازی ئایین و بەرنامەی ژیانی بۆ داناون، ئەوەی کە فەرمانی پێکردووە بە - نوح -، هەر بەو شێوەیە قورئانیشی بۆ تۆ ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) وەحی و نیگای کردووەو بە ئیبراهیم و موسا و عیساشمان ڕاگەیاندووە کە ڕێبازی ئایین و یەکخواناسی بەرنەدەن و لەسەری پایەدار بن).

خوای بێ وێنە دەفەرموویت: ﴿فَإِن تَنَٰزَعْتُمْ فِى شَىْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾ النساء: ٥٩. واتە: (خۆ ئەگەر لە شتێکدا بوو بەکێشەتان دەربارەی حوکمی خوایی، ئەوە ئەو کێشەیە بگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم)).

بۆیە قورئانی پیرۆز داوای کردووە کە باوەڕ بەهەموو پێغەمبەران و پەیامبەران و پەیامەکانیان بێنین:﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ﴾ البقرة: ٤. واتە: (و ئەوانەی باوەڕ دەهێنن بەو "پەیامەی" کە بۆ تۆ "ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)" دابەزێنراوە و بەو پەیامانەش کە بۆ "پێغەمبەران"ی پێش تۆ دابەزێنراوە).

بەڵام ئەو باوەڕەی کە بەپێی شەرع لە ئێمە داواکراوە، کە هەمان بێت بە کتێبە ئاسمانیەکان (وەك: ئینجیل و تەورات و زەبور) ئەوا مەبەست لێی ئەوەیە کە بڕوامان وابێت ئەم کتێبانە لەلایەن خواوە هاتوون و ڕاست بوونە و تەنها بۆ ئەو مەبەستە هاتوون، کە قورئانیش بۆ تەواو کردنی هاتووە. هەرچی لەو کتێبانە هات و پێچەوانەی قورئانی پیرۆز بوو، ئەوا بێ هیچ گومانێك دەستکاری کراوەو بایەخی بۆ دانانرێت.

ئا لێرەوە پێویستە گرنگترین ئەو جیاوازیانە بخەینەڕوو کە قورئان لەگەڵ کتێبە ئاسمانیەکانی تر هەیەتی لەم خاڵانەی خوارەوەدا:

١- ئەو کتێبانەی کە پێش قورئان دابەزیون ئەوا وێنەو دانە (نسخە) ڕەسەنەکەی نەماوە، بەڵکو تەنها وەرگێڕدراوەکەی ماوە.
بەڵام قورئان بە دەربڕین و وشەکانی پارێزراوە، کە خوای گەورە بۆ پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) ڕەوانە کردووە، بەمشێوەیەش بە موتەواتیری بە ئێمە گەیشتووە.

٢- وتەی هەندێ خەڵکی وەك شەرعزناسان و ڕاڤەکاران یاخود مێژووناسان لەگەڵ ئەم کتێبانە ئاوێتە بووە.
بەڵام قورئانی پیرۆز هیچ وتەیەکی تێکەڵ نەبووە و تەنانەت فەرمایشتی پێغەمبەریشی (صلی الله علیه وسلم)تێکەڵ نەکردووە. بۆیە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە سەرەتای دابەزینی قورئان ڕێگری کرد لە نووسینی فەرمووده، تا تێکەڵ نەبێت بە فەرمایشتەکانی قورئانی پیرۆز. هەروەك زانراوە کتێبەکانی (تەفسیر) و (فەرموودە) و (فیقه) تەواو سەربەخۆن و جیان لە قورئانی پیرۆز.

٣- هیچ کەسێك نەیتوانیوە، بە بەڵگەیەکی مێژووی هیچ یەکێك لەو کتێبانەی کە هەن بسەلمێنێت کە دابەزیوە بۆ ئەو پێغەمبەرەی کە کتێبەکەی دەدرێتە پاڵی.
هەروەك نەتوانراوە ئەو کاتەش دیاری بکرێت کە کتێبەکەیتێدا دابەزیوە.
سەبارەت بە قورئان، ئەوا مێژوو بە بەڵگە ئەوەی بڕاندۆتەوە کە بۆ سەر موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) دابەزیوەو هەندێك لە ئایەتەکانیشی شوێن و کات و هۆکاری دابەزینیان دیاریکراوە.

٤- ئەو زمانە کۆنانەی کتێبە ئاسمانیە کۆنەکان، بۆ ماوەیەکی زۆررە لە ناوچوون و کەسێك نابینین کە پێی بدوێت و تەنانەت ئەوەی تێشی دەگات زۆر کەمە.
بەڵام زمانی قورئانی پیرۆز، زمانێکی زیندووەو تا ئێستا سەدان ملیۆن موسڵمان لە گشت شوێنە جیا جیاکانی جیهان پێی دەدوێن.

٥- یاسا و ڕێساکانی سەرجەم کتێبە کۆنەکان - هەروەك لە کاتی خوێندنەوەیدا

بەدەردەکەوێت - تایبەت بوونە بەو کات و گەلەی کتێبەکەی تیایدا دابەزیوەو بۆ دابین کردنی پێداویستیەکانی ئەو قۆناغ و بەپێی بارودۆخەکە دابەزیوە.

لە کاتێکدا یاساو حوکمەکانی قورئان گشتین بۆ سەرجەم خەڵکی و بۆ هەموو سەردەمێك دەشێن.

٦- کتێبە کۆنەکان ئەگەرچی بانگەوازی تێدایە بۆ چاکە و خێرو چاکسازی و ڕەوشت بەرزی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموو لایەنەکانی چاکەکاری و پلەبەرزی لەخۆ نەگرتووە.

بەڵام قورئانی پیرۆز هەموو لایەنەکانی چاکەی لەخۆ گرتووە بە کاملی، جا لە کتێبەکانی پێشوودا هاتبێت یان نا.

٧- دەستکاری کتێبە کۆنەکان کراوەو شتانێك لەو کتێبانەدا هەن کە یەکناگرێت لەگەڵ عەقڵا، بەڵکو لەسەر ستەمەوە دامەزراوەو شتی پڕوپوچ لەخۆی دەگرێت.

بەڵام قورئان، هەر هەمووی چاکەیە و پاك و دوورە لە هەموو شتێکی خراپ و ناشیاو نابەجێ و شتێکی نییە لەگەڵ عەقڵ تێك بگیرێت[1].

٨- شەریعەتە کۆنەکان زیاتر تایبەتمەند بوون بە چارەسەری ڕۆحی، بەڵام شەریعەتی ئیسلامی سەردێرو بنەمای وای دارِشت کە چارەسەری کێشەکانی مرۆڤ دەسەتەبەردەکات، پێداویستیە ماددی و ڕۆحیەکانی لە هەموو کات و شوێنێك دابین بکات.

ئا ئەمە ئەو تایبەتمەندیانە بوون کە بەهۆیەوە فەرمان بەخەڵکی کراوە، تەنها شوێنی قورئان بکەون.

---

[1] سەیری: مبادء الاسلام ٨٠-٨٣.

سەیری ئەو بەشەی کتێبی (إظهار الحق) بکە، کە (رحمة الله الهندي) نووسیویەتی لەسەر دەستکاری کرانی کتێبە ئاسمانییەکانی پێش قورئانی پیرۆز.

## سیفەت و خەسڵەتەکانی پێغەمبەرایەتی

خوای گەورە هەندێ لێهاتووی تایبەتی، بەشێوازێکی فیترەتـی، لـە سروشـتی هەنـدێ خەڵکیدا داناوە وەك هێزو هۆنراوەو هونەر.... کە بەهۆیەوە لە خەڵکی تر بـەهێزتردەبێ و لێهـاتووی و کارامـەیی بـەرزی بـە پێغەمبـەران و پەیامبـەران داوەبـۆ ڕابەرایـەتی و سەرکردایەتی کردنی خەڵك و ڕێنمایی کردنیان بۆ ڕێگای ڕاست، بۆیـە نـاوبراوان خـاوەنی هەموو سـیفەتێکی چـاکن، دوورن لـە هـەر کـەموکورتی و کـرچ و کاڵییـەك کـە لـەوان ناوەشێتەوە.

ئەو سیفەتانەی بۆ پێغەمبەران و پەیامبەران پێویستن ئەمانە: پـارێزراوی، ڕاگەیانـدنی بەرنامەی خودا، زیرەکی و ژیری، نێرینە بوون، پاك و سەلامەت بوون لە ناتەواویو کەم و کورتییەکان[1].

---

[1] زانایان ڕاجیان لە ژماردن و دیاریکردنی ئەو سیفەتانەی بۆ پێغەمبەران پێویستن، سەنوسی تەنها سێ سیفەتی باس کردووەن: ڕاستگۆیی، دەستپاکی، ڕاگەیاندنی بەرنامەی خوا./ أم البراهين وشرحها للسنوسي وحاشية الدسوقي عليه ١٧٣.

دەردیر لە (شرح الخريدة ٩٦) سیفەتی چوارەمی زیاد کردووە کە بریتییە لە (زیرەکی و ژیری)، ناوبراو دەڵێت:

وصف جميع الرسل بأمانة      والصدق والتبليغ والفطانة

واتە: سەرجەم پێغەمبەران وەسف بکە بە: دەسپاکی، ڕاستگۆیی، ڕاگەیەنەری بەرنامەی خوا و زیرەکی و ژیری.

لەقانی لە (اجوهره التوحيد) باسی ئەم چوار سیفەتەی کردووە./ شرح الجوهرة للباجوري ٢٠٠.

لەلای زانایانی کەلام سیفەتی پارێزراوی سیفەتی ئەمانەتیش دەگرێتەوە./ حاشية الدسوقي على شرح أم البراهين ١٧٨.

مەبەست لە دیاریکردن و ژماردنی ئەو سیفەتانەی پێویستن بۆ پێغەمبەران تەنها ڕوون کردنەوەیە، لە هەندێ لق و پۆپەکانی ئەم سیفەتانە تێك ئاڵان و ئاوێتە بوون هەیە، ئەو سیفەتانەی من خستوەتەڕوو لە وتەی زۆربەی زانایان هەڵمهێنجاوە، هەروەك دەخرێتەڕوو، ئەو جۆرە جیاکردنەوەو باسکردنە تەنها بۆ ڕوونکردنەوەیە.

## سیفەتی یەکەم: پاریزراویی (العصمة)

پارێزراوی (العصمة) لە زمانەوانیدا: بریتیە لە پاراستن.

لــە زاراوەشــدا: بریتیــە لــەوەی خــودا گونــاه لــە پێغەمبــەران و پەیامبەرانــدا بەدینەهێنێت[1].

یاخود میهرەبانی بەخششێکی خواییە. کە مرۆڤــ بەرەو چاکە کێش دەکـات و دووری دەخاتەوە لە خراپە. لەگەڵ ئەوەشدا کەسەکە هەر سەرپشك و خاوەن ویستە، تـا پرۆســەی تاقیکردنەوەکە هەر بێتەجێ[2].

جا گوناهو تاوان یان گەورە یاخود بچوك دەبێت.

### جۆری یەکەم: پاریزراوی لە گوناهی گەورە

گوناهە گەورەکان چەند پێناسەیەکی جیا جیایان هەیە، ڕاسترینیان:

---

[1] لە (شرح العقائد العضدية للدواني ٢٧٩/٢) و (المواقف ٢٨٠/٨) هاتووە: (ئەمە لەلایی ئێمە، بەپێی ئەو بنچینەیەمان کە شتەکان هەر لەسەرەتاوە دەدەینە پاڵ بکەری سەرپشك، بە پێچەوانەی بۆچوونی فەیلەسوفەکان...)، لە (المسامرة ٢٢٧-٢٢٨) هاتووە: (پارێزرااوی بریتییە لە پابەند کردنی تواناو هێز بە گوێڕایەڵییەوە، هەر کەسێك پارێزراو بێت خودا توانای ئەنجامدانی خراپەی تێدا بەدیناهێنێت)، إبن همام لە پوختەکردنی ئەم پێناسەیەدا پێناسەیەکی تری لەگەڵ باسکردووەو وتویەتی: پارێزراوی بریتیە لە نەبوونی توانای ئەنجامدانی گوناهو تاوان یاخود بەدیهێنانی کۆسپێکە کە ڕێگرە لە کردنی خراپەکە و پێویست بەوە ناکات پەنا ببرێتە بەر فەرامۆش کردنی گوناهەکە، چونکە هەر لە بنەڕەتدا ئارەزووی ناکات و لەگەڵ ئەوەشدا هەر سەرپشکە. پێناسەی دووەم دەگونجێت لەگەڵ بۆچوونی ئیمام "أبی المنصور الماتریدی" کە دەڵێت: پارێزراوی تاقیکردنەوە پەکناخاات و لانابات. واتە هەرچەندە پارێزراویش بێت مادەم سەرپشکە ئەوە هەر تاقی دەکرێتەوە. خاوەنی کتێبی "البداية" وتویەتی: واتاکەی - بۆچوونی ئەبی منصور الماتریدی - ئەوەیە کە پارێزراو بوون خاوەنەکەی ناچار ناکات لەسەر پەرستش و گوێڕایەڵ بوون و بێ تواناشی ناکات لە کردنی گوناهو تاوان. بەڵکو میهرو بەخششێکی خوداییە کە کەسەکە پاڵدەنێت بۆ کردنی کاری چاکە... بۆ تاقیکردنەوە)./ التحرير و شرحه التقرير والتحبير ٢٢٣/٢.

[2] المسامرة ٢٢٩، مفتاح الباب ١٧٥.

**گوناهی گەورە** بریتییە لە: هەموو ئەو تاوانانـەی کـە بـەهۆی ئەنجامـدانی سـنوور (حەدی) لیَ دەردەکریێت یاخود هەڕەشەی ئاگری دۆزەخ لە ئەنجامدەرانی کرابوو یان مایەی نەفرەت یاخود تورەیی خودا بێت.

**گوناهی بچووک** بریتییە لەو: تاوانانەی کە سزاو سـنووری دونیـایی لەسـەر نـەبێت و هەڕەشەش لە بکەرەکەی نەکرابێت لە دوارۆژدا[1].

گوناهە گەورەکان: کوفر یاخود درۆ یان هەر گوناهێکی تـری گـەورە. پـارێزراو بـوونی پێغەمبەران لەم جۆرە گوناهە گەورانە تێروتەسەلی بریتیە لە:

**یەکەم: پارێزراو بوون لە کوفر:**

زۆربەی موسڵمانان کۆکن، لەسەر ئەوەی کـە پێغەمبـەران (سـەلامی خـودان لێبێـت) پارێزراون لە کوفر، بەر لەوەی سروش و نیگایان بۆ بێت و پـاش سـروش بـۆ هاتنیشـیان، تەنانـەت لـە تەمـەنی منداڵیشـدا هـەر پـارێزراون لـە کـوفر، چـونکە لـەم تەمەنـەدا شوێنکەوتووی دایك و باوکیانن، ئەوانیش باوەڕیان بەخوا هەبووەو ڕاستیان ناسیوە، بۆیـە لە تەمەنی منداڵیشدا هەر دوور بوونە لە کوفر وەك دایك و باوکیان[2].

---

[1] شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٣٥٦، و کتێبەکەمان: الشورى بين النظرية والتطبيق ١١٤-١١٥.

[2] شرح المسايرة لقاسم بن قطلوبغا ٢٢٧-٢٢٨، ئیجی لە (المواقف ٢٦٤/٨) یەکدەنگی ئوممەتی هێناوە لەسەر پارێزراو بوونی پێغەمبەران بەر لە پێغەمبەرایەتی و دوای پێغەمبەرایەتیش لە کوفر. هەروەها سەیری ئەمانەش بکە: شرح العقائد لعضدية للدواني سەرچاوەی پێشوو، شرح العقائد النسفية للتفتازاني ٤٩/٥، ولوامع الأنوار البهية ٣٠٤/٢.
تاقمی ئەزاریقە لە خەواریجەکاان پێیان وابووە گوناه کردن بۆ پێغەمبەران دروستە، کەچی تاقمی ناوبراو پێیان وایە هەموو گوناهێکیش کوفرە، تەنانەت بۆچوونیان وابوو کە دروستە خوا پێغەمبەرێك ڕەوانە بکات کەچی بشزانێت دوای پێغەمبەرایەتییەکەی کوفر دەکات./ المواقف

**دووەم: پارێزراو بوون لە درۆ کردن:**

ڕاستگۆیی (الصدق): بریتییە لەوەی حوکمی هەواڵەکە کۆك و پڕاو پڕ بێت لەگەڵ بارودۆخ و واقیعدا. جا ڕاستگۆیی، سێ جۆرە:

١- ڕاستگۆیی لە بانگەشەی پەیامداریدا.

٢- ڕاستگۆیی لەو حوکم و ڕێسایانەی کە لەلایەن خواوە هێناویانە و بە خەڵکەکەی ڕادەگەیەنن.

٤- ڕاستگۆیی لە هەموو ئەو فەرمایشتانەی دەیڵێن لەبارەی کاروباری دونیاوە[1].

پێچەوانەکەیشی: درۆیە.پێغەمبەران هەرگیز درۆ بە ئەنقەست ناکەن، هەروەك چۆن بەڵگەی سەلمێنراو و دەرئاسا بەرپابوو لەسەر ڕاستگۆیی پێغەمبەران لە بانگەشەی پەیامدارییان و ئەو شتانەی لە خوداوە بە بەندەکان ڕادەگەیەنن، ئەمە ڕاستییەکە هەموو ئاییندارەکان لەسەری کۆکن، زۆربەی زانایان پێیان وایە کە ئەستەمە پێغەمبەران درۆ بکەن بە هۆی لەبیر چوونەوەو هەڵە کردنەوە. و ئەم ڕایە جێگەی پشت پێبەستنە و ڕاست و دروستە، هەروەك زانا لێکۆڵەرەکان ئەمەیان سەلماندووە[2].

---

وشرحه للسيد االشريف ٨/٢٦٤، المقاصد وشرحه للتفتازاني ٥/٤٩-٥٠، لوامع الأنوار سەرچاوەی پێشوو.

[1] شرح الخريدة للدردير ٩٧، رسالة في التوحيد للطائي ٦٧.

هەروەك پێشتر خرایەڕوو ڕاستگۆیی یەکێکە لە چوار سیفەتەکان لەلای (دەردیر، لەققانی)، سێ جۆری ڕاستگۆیی هەیە، بەڵام وتویانە ناوبراوان وتویانە ڕاستگۆیی تەنها دوو جۆری یەکەمە، هەروەها جۆری سێیەمی ڕاستگۆیی لە بەشە لاوەکی و لق و پۆپەکانی سیفەتی دەستپاکییە./ حشية الدسوقي على شرح أم البراهين للسنوسي ١٧٣، شرح الجوهرة للباجوري ٢٠٢.

[2] المواقف وشرحه للسيد الشريف ٨/٢٦٣، تیایدا هاتووە: ڕاجیایی هەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەران بەهۆی لەبیرچوونەوەو هەڵەوە دەکرێت درۆ بکەن، لەم بارەوە وتویەتی: (مامۆستا "ئەبو إسحاق" و زۆرێك لە پێشەواکان ئەمەیان بە ئەستەم زانیوە، چونکە بەڵگەی دەرئاسا و موعجیزەدار بەرپا بووە لەسەر ڕاستگۆییان لە گەیاندنی حوکمەکان، ئەگەر درۆکردن دروست بوویا بۆ پێغەمبەران ئەوا ئاماژە و مانای موعجیزەکە کەم و کورت و کرچ و کاڵ دەردەچوو، بێگومان ئەمەش پوچەڵە، "قازی ئەبو بەکر" بەدروستی زانیوە بەو مەرجەی لە موعجیزەدا نەبێت، چونکە موعجیزە

بەڵام درۆکردن لە هەر شتێکی تر جگە لە ڕەوانەکردن و ڕاگەیانـدنی بەرنامـەی خـودا تەنها گوناهەکە لە گوناهەکان، هەروەك خرایەڕوو[1].

**بەڵگەی عەقڵی لەسەر ڕاستگۆیی پێغەمبەران:**

أ- ئەگەر دروست بووبا بۆ پێغەمبەران درۆ بکەن، ئەوا ئەو کاتە هەواڵی خوای گـەورە درۆی تیدەکـەوت، ئەمــەش هــەرگیز نابێـت و ئەسـتەمە، چـونکە خـوای گـەورە ڕاستگۆیی ئەوانی بە چەندین موعجیزەو دەرئاسایەك سەلماندووە[2].

ب- درۆ تاوان و گوناهە، پێغەمبەرانیش لە تاوان پارێزراون.

---

سەلمێنەری ڕاستی پەیام و مەبەستی پێغەمبەرەکەیە، بەڵام درۆکردن بەهۆی لەبیر چوونەوەو هەڵەی زمان دروستە بۆ پێغەمبەران، چونکە هیچ مەبەستێك هەڵناگرێت، هەر بۆیە لەو حاڵەتەدا درۆ نابێتە هۆی پەیدابوونی کەم و کورتی لە مەبەست و واتاکەدا). هەروەها لە (شرح العقائد النسفیه ١٧٠)ی تەفتازانیدا هاتووە: (پێغەمبەران پارێزرون لە درۆ کردن بەتایبەت لەو شتانەدا کە پەیوەستن بە شەریعەت و ڕاگەیاندنی حوکمەکان و ڕاستەڕێ کردنی ئوممەت، جا بە یەکدەنگی زانایان پێغەمبەران بە ئەنقەست درۆ ناکەن، زۆربەی زانایانیش پێیان وایە بە هۆی لەبیر چوونەوەش هەر درۆ ناکەن. جا "کەستەلی" ڕوونکردنەوەی داوە لەسەر ئەم دەقە:"بە یەکدەنگی زانایان پێغەمبەران بە ئەنقەست درۆ ناکەن، زۆربەی زانایانیش پێیان وایە بە هۆی لەبیر چوونەوەش هەر درۆ ناکەن": ئەمە لەبارەی درۆکردنی پێغەمبەران کە پەیوەست بێت بە ڕاگەیاندنی پەیامی خوا، چونکە موعجیزە بەڵگەی سەلمێنەری بەرپاکرد لەسەر ڕاستگۆییان، بەڵام "قازی ئەبو بەکر" ئەم حوکمەی تایبەت کردووە بەوەی پێغەمبەران بە ئەنقەست درۆیان بۆ دروست نییە و لە گەیاندنی پەامیشدا بۆیان دروست نییە، ناوبراو بە دروستی زانیوە پێغەمبەران درۆ بکەن بەهۆی لەبیرچوونەوەو هەڵەوە لەو شتانەی تایبەت پەیوەندییان بە ڕاگەیاندنی بەرنامە خودا هەیە، چونکە هیچ مانایەکی موعجیزەدار نییە لەسەر پرێزراو بوونیان لەم لایەنەوە)./ سەیری ئەمانەش بکە: شرح العقائد العضدیة للدواني ٢٧٩/٢، شرح المقاصد للتفتازاني ٥٠/٥، التقریر والتحبیر ٢٢٤/٢، لوامع الأنوار البهیة ٣٠٧/٢، الوسیلة ٦٩٥.

[1] حاشیة الکستلي ١٧٠.

[2] المواقف ٢٦٣/٨، شرح الخریدة للدردیر ٩٧، رسالة في التوحید للطائي ٦٧، لوامع الأنوار البهیة ٣٠٧/٢، شرح الجوهرة الجوهرة ٢٠٢.

پ- ئەگەر درۆیـان بکردبـا، خـەڵکیش ئـەوەی بزانیایـە کـە درۆزنـن، ئـەوا سـوودی پەیامبەرایەتی و پەیامداری نەدەما[1].

**بەڵگەی نەقڵی لەسەر ڕاستگۆییان:**

أ- خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ ۝١ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ۝٤﴾ الـنجم: ٣-٤.[2] واتە: (قسەو گوفتاریشـی "ئـەوەی کـە قورئانـە" لـە ئـارەزوو بـازی و هـەواو هەوەسەوە نییە. ئەمەی کە ڕای دەگەیەنێت تەنها نیگاو وەحی خواییە).

ب- خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَصَدَقَ ٱلۡمُرۡسَلُونَ﴾ یـس: ٥٢. واتـە: (پێغەمبەرانیش لە هەواڵدانیان ڕاستیان کردووە).

پ- خوای گەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَلَوۡ تَقَوَّلَ عَلَيۡنَا بَعۡضَ ٱلۡأَقَاوِيلِ ۝٤٤ لَأَخَذۡنَا مِنۡهُ بِٱلۡيَمِينِ ۝٤٥ ثُمَّ لَقَطَعۡنَا مِنۡهُ ٱلۡوَتِينَ ۝٤٦ فَمَا مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ عَنۡهُ حَٰجِزِينَ ۝٤٧﴾ الحاقـة: ٤٤ - ٤٧. واتـە: (خـۆ ئەگەر موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) هەندێك قسەو گوفتار بـەدەم ئێمـەوە هەڵبەسـتایە. ئەوە بەهێزو دەسەڵاتی خۆمان دەمانگرت. لـەوەدوا ڕەگـی دڵـی دەپچـڕێنین و دەیـبڕێنین. ئەوسا هیچ کەسێك نییە لە ئێوە بەرەبەست و بەرگری بکات لە ئێمە).

ت- لە فەرموودەدا هاتووە، وتیان: ئەی پێغەمبـەری خـوا (انـك تـداعبنا) واتـە: تـۆ گاڵتەمان لەگەڵ دەکەی، ئەویش فەرمووی: **(إني لا أقول الا حقا)** واتە: من تەنها قسـەی ڕاست و دروست دەکەم.

ئینجا ئەو شتەی لە ڕووکەشدا وائەگەیەنێت کە پێغەمبەران جار جار درۆیان کـردووە، هەروەك لەبارەی بەسەرهاتی پێغەمبەر ئیبراهیم (سەلامی خـوای لێبێـت) هـاتووە، کاتێـك بتەکانی شکاند و تەنها بتە گەورەکەی هێشتەوە، جا کە پرسـیاری لـێ کـرا:﴿ قَالُوٓاْ ءَأَنتَ فَعَلۡتَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ ۝٦٢ قَالَ بَلۡ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمۡ هَٰذَا فَسۡـَٔلُوهُمۡ إِن كَانُواْ يَنطِقُونَ ۝٦٣﴾ الأنبیـاء: ٦٢ - ٦٣. واتە: (وتیان: باشە، ئەی ئیبراهیم ئایا تۆ ئەمەت

---

[1] الرسالة في التوحيد للطائي، سەرچاوەی پێشوو.

[2] شرح الخريدة للدردير ٩٧.

کردووه به خواکانمان؟!. ئیبراهیم وتی: نەخێر" هەر کاری ئەو بتە زلەیە، دە لێیان بپرسن ئەگەر قسە دەکەن و تێ دەگەن). جا ئەمە کە بە ڕووکەش بە درۆ دەرئەکەوێت ئەوا تەئویل دەکرێت و لێك دەدرێتەوە کە مەبەستی پێغەمبەر ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێت) سەرزەنشت کردن و گاڵتە پێکردنیان بووە، چونکە تەنها و تەنها پێغەمبەر ئیبراهیم لەلای بتەکان بوو جا چ سوودێکی هەیە بپرسن کێ بتەکانی ئێمەی شکاندووە[1]؟

وتراوە واتای فەرمایشتەکەی ئیبراهیم ئەوەیە: کە لە بتەکان بپرسن، چونکە ئەگەر بدوێن درۆ ناکەن، جا ئەگەر نەدوێن ئەوا ئیبراهیم ئەنجامدەری کارەکە نەبووە. لە ناوەرۆکی ئەو قسەیەشدا پێغەمبەر ئیبراهیم دان دەنێت بەوەی کە خۆی بکەرەکە بووە. ئەم وتەیەی لەبواری توانج و پەلارە (معاریض)ە و لە پەلار تێگرتنیشدا هیچ نرخێك بۆ درۆ دانانرێت، هەر ئەمەشە کە (قورتوبی)[2] بەڕاستی داناوەو قسەی تریش لەم بارەوە گوتراوە[3].

### سێیەم: پارێزراو بوون لە گوناهە گەورەکانی تر:

لێرەدا بارودۆخی ئەنجامدانی گوناهی گەورە، لەلایەن پێغەمبەران و پەیامبەران، چ پێش یاخود پاش نیگا و سروش بۆ هاتنیان ڕوون دەکەینەوە.

---

(1) حاشية الصاوي على الدردير ٩٧، تفسير البيضاوي ٣٢١.

وحديث المداعبة: سنن الترمذي: كتاب البر، باب ما جاء في المزاح ٢٠٦/٦ وهو حديث حسن صحيح.

(2) تفسير القرطبي ٤٣٤٠/٦.

(3) تفسير البيضاوي، سەرچاوەی پێشوو.

### قۆناغی پێش پێغەمبەرایەتی:

پێغەمبەران بەر لە قۆناغی پێغەمبەرایەتی پارێزراون لەو گوناهە گەورانەی، کە دەبنە هۆی دوورکەوتنەوەی خەڵکی لێیان، ئەمەش وەك خراپەکاری و داوێن پیسی دایکان و باوکانی پێغەمبەران کە دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوە خەڵکی لە پێغەمبەران[1].

سەبارەت بە گوناهە گەورەکانی تر، زۆربەی ئەشعەرییەکان و کۆمەڵێك لە موعتەزیلەکان و ئیبازییەکان پێیان وایە دەکرێت ئەنجامی بدەن، چونکە موعجیزەداری پێغەمبەران مانای ئەوە بەدەستەوەنادات کە پێش پێغەمبەرایەتی نابێت گوناه بکەن.

زۆربەی موعتەزیلەکان دەڵێن: ئەستەمە پێغەمبەران گوناهی گەورە بکەن، چونکە ئەنجامدانی گوناهی گەورە دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵك لە ئەنجامدەری گوناهەکە دووربکەونەوە، هۆکارێکیشە بۆ ئەوەی خەڵك شوێنی نەکەون بەمەش بەرژەوەندی ڕەوانەکرانی پێغەمبەران نامێنێت[2].

### قۆناغی پێغەمبەرایەتی:

پێغەمبەران لە ئەنجامدانی تاوانی گەورە بە ئەنقەستپارێزراون، ئەمە بۆچوونی زۆربەی پێشەواو گەورە زانا لێکۆڵەرەکانە. بەهەمان شێوەش پارێزراون لەگوناهی گەورە بەهۆی لەبیر چوونەوە یان تەئویلی هەڵەوە، ئەمە بۆچوونی ڕاست و دروستە[3].

---

[1] المواقف ٨/٢٦٥، شرح العقائد النسفية للتفتازاني ١٧١، شرح االعقائد العضدية للدواني ٢/٢٧٩، نقلا عن شرح العقائد.

[2] المواقف وشرحه للسيد الشريف ٨/٢٦٥، شرح العقائد النسفية للتفتازاني ١٧١، وتەی ئیبازییەکان لەم سەرچاوەیدا هاتووە: مشارق أنوار العقول ٢/٢٥.

[3] المواقف وشرحه للسيد االشريف ٨/٢٦٤-٢٢٦٥، تیایدا هاتووە: (زۆربەی زانا لێکۆڵەرەکان پێیان وایە لە قوناغی پێغەمبەرایەتی دا پێغەمبەران هەرگیز بە ئەنقەست گوناه ناکەن تەنها حەشەوییەکان ڕایان لەم بارەوە جیاواز بوو. سەبارەت بەوەش کە ئایا دەکرێت پێغەمبەران لە قۆناغی پێغەمبەرایەتیدا گوناهی گەورە بکەن بەهۆی لەبیرچوونەوەو تەئویلی هەڵەوە، زۆربەی زانایان وتویانە دەکرێت، بەڵام ڕای پەسەندکراو ئەوەیە کە ناکرێت گوناهی گەورە بکەن). سەیری ئەمانەش بکە: المسايرة وشرحها المسامرة ٢٣٢، شرح العقائد النسفية للتفتازاني ١٧٠-١٧١، شرح المقااصد للتفتازاني ٥-٥١، والوسيلة ٦٩٥، مشارق أنوار العقول ٢/٢٥.

زەیدییەكان و ئیمامییەكان وتویانە بەهیچ شێوەیەك گوناه كردن بۆ پێغەمبەران دروست نییە، دواتر بەتێرو تەسەلی دەخرێتەڕوو.

## جۆری دووەم: پارێزراوی لە گوناهە بچوكەكان

گوناهە بچوكەكان دوو جۆرن:

أ- ئەو گوناهە بچوكانەی كە ئەنجامدەرەكەی دەباتە ڕیزی كەسانی بێ نرخ و كەم، وەك دزینی دەنكێك یاخود پارویێك یاخود تەرازوبازی كردن بە خورمایەك.

جا پێغەمبەران لەم جۆرە گوناهانە پارێزراون، پێش پێغەمبەرایەتی[1].

بە هەمان شێوە قۆناغی پێغەمبەریەتیش لەو گوناهە بچوكانە پارێزراون، ئەم جۆرە كارە بێ نرخانە چ بە ئەنقەست چ بەهۆی لەبیرچوونەوە ئەنجام نادەن، بۆچوونەكان كۆكن لەسەر ئەمە[2].

ب- گوناهە بچوكەكانی تر:

پێغەمبەران پێش ڕەوانەكرانیان وەك پێغەمبەر، چ بە ئەنقەست و چ بەهۆی لەبیر كردنەوە لەو جۆرە گوناهانە پارێزراو نین.

بەڵام دوای ڕەوانەكرانیان و لە قۆناغی پێغەمبەرایەتی پارێزراون، لەوەی بە ئەنقەست ئەم جۆرە گوناهانە بكەن، بەڵامدەكرێ بەهۆی لەبیرچوونەوە گوناهی لەوجۆرە ئەنجام بدەن، بەڵام بەردەوام نابن لەسەر گوناهەكە و خوای گەورەش بەردەوامیان ناكات لەسەر ئەم حاڵەتە، بەڵكو ئاگادار دەكرێنەوەو ئەوانیش بە ئاگا دێنەوە. ئەمە بۆچوونی زانا لێكۆڵەرەكان و فەرموودەناسان و پێشینە چاكەكانە[3]، لەبەر ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر

---

[1] المواقف وشرحه للسيد الشريف ٢٦٥/٨، شرح العقائد النسفية للتفتازاني، شرح العقائد العضدية للدواني، سەرچاوەكانی پێشوو، المسامرة ٢٣٣-٢٣٤.

[2] المواقف و شرحه للسيد الشريف، شرح العقائد النسفية للتفتازاني، الوسيلة، مشارق أنوار العقول، سەرچاوەكانی پێشوو، المسامرة ٢٣٣.

[3] شرح العقائد العضدية للدواني ٢٧٩/٢، شرح المقاصد للتفتازاني ٥١/٥، و المواقف و شرحه للسيد الشريف ٢٦٥/٨، لوامع الأنوار البهية ٣٠٤/٢-٣٠٥، المسايرة و شرحها المسامرة ٢٣٢. چەند ڕاو

(صلی الله علیه وسلم): **(إنما أنا بشرٌ أنسی کما تنسَون، فاذا نسیت فـذّکروني)**[1] (منیش مرۆڤم شت لەبیر دەکەم چۆن ئێوە شت لەبیر دەکەن، جا ئەگەر شتێکم لەبیر کرد بەبیرم بێننەوە)، ئەمە بۆچوونی ئەشعەرییەکانە.

موعتەزیلەکان بۆچوونیان وایە کە دروستە پێغەمبەران گوناهی بچوك بکەن، هەندێکیان پێیان وایە بە هۆی لەبیرچوونەوە و هەندێکی تریش پێیان وایە بەهۆی تەئویلی هەڵەوە دروستە یاخود بۆیە ئەنجامدانی ئەم گوناهانە هۆکاری کەم کردنەوەی پاداشتە زۆرەکانیانە[2].

پارێزراوی پێغەمبەران لەلای موعتەزیلەکان تەنها لە ئەنجامدانی گوناهی گەورەیە چ بە ئەنقەست چ بەهۆی لەبیر چوونەوە، ناوبراوان پێیان وایە گوناهی بچوك زیان بە پارێزراوی پێغەمبەران ناگەیەنێت[3].

زەیدییەکانیش هەمان بۆچوونی موعتەزیلەکانیاان هەیە و دەڵێن: گوناهی گەورە دروست نییە بۆ پێغەمبەران، بەپێچەوانەوە گوناهی بچوك دروستە[4].

ئیمامییەکان بۆچوونیان وایە: پارێززراو بوونی پێغەمبەران لەسەر جەم گوناهە بچوك و گەورەکان[5]، پێش پێغەمبەراتی و کاتی پێغەمبەرایەتی پێویستە[6].

---

بۆچوونێکی تر هەن لەم سەرچاوانەدا و لە: شرح العقائد النسفیة للتفتتازااني ١٨١، الوسیلة ٦٩٥. لە (شرح المقاصد)دا هاتووە: (ئیمامی حەرەمەین) و (ئەبو هاشم) کە یەکێکە لە موعتەزیلەکان بۆچوونیان وایە دروستە پێغەمبەران گوناهی بچوك بە ئەنقەست بکەن.

[1] المسایرة و شرحها المسامرة ٢٣٤. کەمێك بەر لەمە سەرچاوەی فەرموودەکەمان خستەڕوو.

[2] کشف المراد ٣٧٦.

[3] خلاصة علم الکلام ٢٦٧.

[4] المعالم الدینیة ٩٥.

[5] کشف المراد ٣٧٦، والباب الحادي عشر وشرحه النافع ٣٧، مفتاح الباب ١٧٦، خلاصة علم لکلام ٢٦٧، المواقف وشرحه للسید االشریف ٨/ ٢٦٥.

[6] سەرچاوەکانی پێشوو جگە لە: کشف المراد.

## بەڵگەی پارێزراوی پێغەمبەران

زانایان بەڵگەی زۆریان هێناوەتەوە لەسەر پارێزراوی پێغەمبەران، وەك:

١- ئەگەر پێغەمبەران گوناهیان ئەنجام دابوویا، ئەوا دروست نەدەبوو خەڵکی شوێنیان بکەون لەبەر گوناهەکانیان، سەرباری ئەوەی شوێنکەوتنیان پێویست و فەرزە، بە بەڵگەی یەکدەنگی زانایان، هەروەها بەپێی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿ قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ ﴾ آل عمران: ٣١. واتە: ("ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە ئیمانداران" بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت دە شوێنی من بکەون و لە فەرمانی من دەرمەچن).

٢- ئەگەر گوناهیان بکردایەن ئەوا شایەتی و گەواهییەکەیان وەرنەدەگیرا، چونکە بە یەکدەنگی زانایان کەسی لاسارو تاوانکار شایەتی لێ وەرناگیرێت، بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای پایەبەرز: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ ﴾ الحجرات: ٦. واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر کەسێکی متمانە پێ نەکراو هەواڵێکی گرنگی بۆ هێنان" خێرا بڕوای پێ مەکەن، بەڵکو سەرنج بدەن، لێی بکۆڵنەوە تا بۆتان ڕوون دەبێتەوە). ئەو کەسەی شایەتی لێ وەرنەگیرێت لەسەر شتێکی بێ بایەخی لەناوچووی دونیا، چۆن گوێ بۆشایەتیەکەی دەگیرێت لە ئایینی تۆکمە و پیرۆزدا کە تا ڕۆژی دوایی بەردەوام دەبێت؟.

٣- ئەگەر گوناهیان ئەنجام دابوویا، ئەوا پێویست دەبوو ڕێگریان لێ بکرێت و بەتووندی قەدەغە بکرێن، لەبەر ئەوەی بەشێوەیەکی گشتی فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە پێویستە. بێگومان ڕێگری کردن لە پێغەمبەران ئازاردانیانە، ئازار دانیشیان بە یەکدەنگی زانیایان حەرامە، هەروەك خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموویت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمۡ عَذَابٗا مُّهِينٗا ﴾ الأحزاب: ٥٧. واتە (بێگومان ئەوانەی ئازاری خواو پێغەمبەرەکەی

دەدەن خوا نەفرینی لێ کردوون لـە دونیـا و قیامەتـدا سـزایەکی زۆر خەجالـەت و سەرشۆڕکەریشی بۆ ئامادە کردوون).

٤- ئەگەر گوناهیان کردبووبا، ئەوا شیاوی سزاو لۆمەو سەرزەنشت دەبـوون، چـونکە بەشێوەیەکی گشتی دەچوونە ژێر ئەم فەرمایشـتەی خـوای گـەورە: ﴿وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾ الجن: ٢٣. واتـە: (ئـەوەی لـە خـواو پێغەمبەرەکەی یاخی ببێت ،ئەوە با دڵنیا بێت کە دۆزەخی بـۆ ئامـادە کـراوە بـۆ هەمیشە و هەتا هەتایی). ئەم فەرمایشتە: ﴿أَتَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبِرِّ وَتَنسَوۡنَ أَنفُسَكُمۡ وَأَنتُمۡ تَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ البقرة: ٤٤. ("کەی ئەوە ڕاستە" فەرمانی چاکە بە خەڵکی بدەن و خۆتان فەرامۆش بکەن؟! لە کاتێکدا خـۆ ئێـوە کتێبـی خـوا - تـەورات - دەخوێننەوە). بەڵام پێغەمبەران بە یەکـدەنگی زانایـان لـەم جـۆرە شـتانە دوورن، چونکە شتی زۆر قێزەونن.

٥- فەرمایشتەکەی خوای گەورە لـەبارەی ئیـبراهیم و ئیسـحاق و یـەعقوب: ﴿إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ﴾ الأنبياء: ٩٠. واتە: (بەڕاستی ئەوانە چـالاك و گورج و گۆڵ بوون لە ئەنجامدانی هەموو خێـرو چـاکەیەکدا). هـەموو جـۆرێکی چاکە دەگرێتـەوە، چ کردنـی چـاکە چ خـۆ دوورگـرتن لـە خراپـە، هـەروەها ئـەم فەرمایشتە: ﴿وَإِنَّهُمۡ عِندَنَا لَمِنَ ٱلۡمُصۡطَفَيۡنَ ٱلۡأَخۡيَارِ﴾ ص: ٤٧. واتە: (بەڕاستی ئەوانە لای ئێمە لەو کەسانەن کە هـەڵمان بـژاردوون و پەسـەندمان کـردوون). مەبەسـتی ئەوەیە: کە لە هەموو بوارو کاروبارێکدا هەڵبژێراو و کارپەسەند بوونە، بۆیە نابێت گوناهیان لێ بپشکوێتەوە[1].

٦- ئەگەر دروست بووبایە بۆ پێغەمبەران کـە ناپـاکی بکـەن لەگـەڵ خـوای گـەورە، بەهۆی ئەنجامدانی کارێکی حەڕام یاخود ناپەسەن (مکروه)، ئەوا ئەو کارە حەڕامە

---

[1] المواقف و شرحه للسيد الشريف ٨/٢٦٥-٢٦٧، شرح المقاصد للتفتازاني ٥/٥١-٥٢، چەند بەڵگەیەکی تریان تێدایە لەترسی درێژبوونەوە نەمان هێناوە.

یاخو ناپەسەندە دەبووە پەرستش و گوێڕایەڵی، چونکە خوای گەورە فەرمانی بەئێمە کردووە، گوێڕایەڵیان ببین و شوێن کردارو گوفتاری ئەوان بکەوین بەشێوەیەکی گشتی. جا هەر شتێك ئەوان ئەنجامیان داوە، ئێمەش فەرمانمان پێکراوە ئەنجامی بدەین، هەر شتێکیش فەرمانمان پێکرا بێت ئەوا گوێڕایەڵییە، چونکە خوای گەورە فەرمان بە خراپە ناکات[1].

### ئەو شتانەی لەبارەی پێغەمبەرانەوە هاتوون و لە ڕووکەشدا بە گوناه دەردەکەون:

جا ئەوەی بە ڕێگەی تاکە کەسی (ئاحاد) هاتووە ئەوا ڕەت دەکرێتەوە، چونکە هەڵە خستنە پاڵی گێرەرەوەکان ئاسانترە لەوەی ئەنجامدانی تاوان بخرێتە پاڵ پێغەمبەران.

بەڵام ئەوەی بەڕێگەی (تەواتر) هاتووە، ئەوا پێویستە ڕاڤەی تری بۆ بکرێت کە لە مانا ڕووکەشییەکەی لای بدات بە شێوەك کە بگونجێ لەگەڵ پارێزراوی پێغەمبەران، بەڵام ئەگەر ئەم ڕاڤە و شیکردنەوەیەی بۆ ئەنجام نەدەدرا دەکرێت بەم شێوە ڕاڤەی بکات:

پێش پێغەمبەرایەتی بووە یاخود وەلانانی چاکترین و ئەنجامدانی ئەوە بووە کە چاکەی کەمترە یان گوناهی بچوکن کە بەهۆی لە بیرچوونەوە ئەنجامیان داوە[2].

نمونەی ئەو دەقانەی کە لە ڕووکەشدا گوناهو تاوان دەدەنە پاڵ پێغەمبەران:

**یەکەم:** ئەوەی لەبارەی سەرگوزەشتەی ئادەم (سەلامی خوای لێبێت) لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە:

خوای بێ وێنە دەفەرموێت: ﴿وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ﴾ طـه: ١٢١. واتە: (ئا بەم شێوەیە ئادەم یاخی بوو لە پەروەردگاری و فریوی خوارد و ڕێگای لێ تێکچوو).

---

[1] شرح الخريدة للدردير ٩٧، شرح أم البراهين للسنوسي وحاشية الدسوقي عليه ١٧٦، شرح السنوسية للباجوري ١٢٦، شرح الجوهرة للباجوري ٢٠١.

[2] المواقف وشرحه للسيد الشريف ٢٦٨/٨، شرح المقاصد للتفتازاني ٥٣/٥، شرح العقائد للتفتازاني و العصام عليه ١٧١-١٧٢، شرح العقائد العضدية للدواني ٢٧٩/٢.

جا یاخی بوون و فەرمان شکاندن لە گوناهە گەورەکانە، بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای مەزن: ﴿وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾ الجن: ٢٣. واتە: (ئەوەی لە خواو پێغەمبەرەکەی یاخی ببێت ئەوە با دڵنیا بێت کە دۆزەخی بۆ ئامادە کراوە بۆ هەمیشەیی و هەتا هەتایی).

سەر لێشێواوی و فریخواردن (غواية) شوێنکەوتنی شەیتانە، بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای تاك و پاك لە هاوەڵ: ﴿إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ﴾ الحجر: ٤٢. واتە: (جگە لەوانەی کە شوێنت کەوتوون لە سەرکەش و یاخی و سەرگەردانەکان). هەروەها ئەم فەرمایشتە: ﴿فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ﴾ البقرة: ٣٦. واتە: (شەیتان لە خشتەی بردن و لەو شوێنە بەدەر کردنی دان). دەرکرانی "ئادەم و حەوا" لە بەهەشت بەهۆی ئەوەی شەیتان لە خشتەی بردن، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو کارەی ئەنجامیان داوە گەلەك گەورە بووە.

ئادەم ئەو فەرمانەی شکاند کە قەدەغەی کردبوو لە دارەکە بخۆن، ئەنجامدانی شتی قەدەغەش گوناهو تاوانە.

**وەڵام:**

ئەمە بەر لە پێغەمبەرایەتی بوو، چونکە ئادەم لە بەهەشتدا هیچ ئوممەتێکی نەبووە، بەڵکو دوای دەرکرانی لە بەهەشت بووە پێغەمبەر، بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای پایەبەرز: ﴿ثُمَّ ٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ﴾ طه: ١٢٢. واتە: (پاش ئەوە خوا بە ڕەحمەتی خۆی هەڵیبژارد بۆ پێغەمبەرایەتی). جا دەستنیشان کردنی ئادەم وەك پێغەمبەر دوای ئەنجامدانی تاوانەکە بووە.

ئەنجامدانی ئەم تاوانە بەهۆی لەبیرچوونەوە بوو، بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا﴾ طه: ١١٥. واتە: (کەچی بیری چوو، لە حاڵێکدا نەمانبینی پێشتر بڕیاری کردنی ئەو سەرپێچیە بدات).

یاخود هەڵەیەك بووە، بەوەی ئادەم (سەلامی خوای لێبێت) واگومانی بردووە کە خودی دارێك قەدەغە کراوە دواتر لێی تێکەڵ بووە لەگەڵ دارێکی هاوشێوەی دەرەکە[1].

**دووەم**: ئەوەی لە سەرگوزەشتەکەی موسادا (سەلامی خوای لێبێت) هاتووە کاتێك میسرییەکەی کوشت: ﴿فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِ﴾ القصص: ١٥. واتە: (موساش بۆکزێکی لە کابرادا و کوشتی).

کوشتنی کابرا میسرییەکە دەستدرێژی بوو، بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ: ﴿قَالَ هَٰذَا مِنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾ القصص: ١٥. واتە: (موسا پەشیمان بۆوە لەبەر خۆیەوە وتی: ئەم کارە شەیتان پێی کردم). هەروەها ئەم فەرمایشتە: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَٱغْفِرْ لِي﴾ القصص: ١٦. واتە: (وتی: پەروەردگارا مـن بەڕاستی ستەمم لەخۆم کرد کاتێك لە دەستم دەرچوو، ئەو کابرایەم کوشت، لێم ببورەو ببەخشە). و ئـەم فەرمایشـتە: ﴿قَالَ فَعَلْتُهَآ إِذًا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ﴾ الشعراء: ٢٠. واتە: (ئەو کاتە ئەوەمکرد، لە نەزانەکان بووم "نەم دەزانی بەوە دەمرێت").

**وەڵام**:

کاتێك میسرییەکەی کوشت هێشتان نەببوو بە پێغەمبەر.

دەکرێت بە هەڵە کەسەکەی کوشتبێت.

ئەو وتانەی کە پێغەمبەر موسا (سەلامی خوای لێبێت) کردوویەتی دەکرێت لێکی بدەینەوە بەوەی لەبەر خاکی بوون و خۆبەکەم زانی و بۆ پەروەردە کردنی دەروون بووە[2].

**سێیەم**: ئەو دەقانەی لەبارەی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) هاتوون، بۆ نمونە:

١- خوای بێ وێنە دەفەرموویت: ﴿لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ﴾ الفتح: ٢. واتە: (داوای لێ خۆش بوونیش بکە بۆ گوناهەکانت). خوای مەزن

---

[1] المواقف وشرحه للسيد الشريف ٨/٢٦٨-٢٦٩، شرح المقاصد للتفتازاني ٥/٥٣، شرح لمسايرة لقاسم بن قطلوبغا ٢٣٢.

[2] المواقف وشرحه للسيد االشريف ٨/٢٧١، شرح المقاصد للتفتازانى ٥/٥٥.

دەفەرمووێت: ﴿وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ﴾ غافر: ٥٥، محمد: ١٩. واتە: (سوێند بەخوا بەڕاستی خوا تەوبەی قبوڵ کرد لە پێغەمبەر..). خوای بێ هاوەڵ و هاوبەش دەفەرمووێت: ﴿لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ﴾ التوبة: ١١٧. واتە: (تا خوا لە هەموو گوناهی ڕابردوو و ئایندەشت خۆش ببێت). خوای گەورە لەو فەرمایشتانەدا تاوانی خستۆتە پاڵ پێغەمبەر و لێشی خۆش بووە، جا کاتێك تەوبە دێتە گۆڕێ کە تاوان هەبێت.

**وەڵام:**

بەوەی ئەو گوناهانە پێش پێغەمبەرایەتی بوونە.

یان مەبەست لێی ئەوەبووە کە هەڵەی کردووە یان کردەوەی چاکی ئەنجامداوەو هەوڵی ئەنجامدانی چاکترەکەی نەداوە یاخود گوناهی هۆزەکەی دراوەتە پاڵی، چونکە سەرۆکی هۆزەکە لەوانەیە کردەوەی ئەندامان و شوێنکەوتووانی هۆزەکەی بدرێتە پاڵی. واتە: تا خوای گەورە لەبەر خاتری تۆی لە تاوانی ڕابردوو و داهاتووی ئومەتەکەت خۆش بێت، داوای لێخۆش بوون بۆ ئومەتەکەت بکە، خودای بێ وێنە لە ئومەتی پێغەمبەر خۆشبووە[1].

٢- خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ۝١ أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ ۝٢﴾ عبس: ١- ٢.

واتە: (ڕووی گرژ کرد و ڕووی وەرگێڕا. لەبەر ئەوەی نابینایەك هات بۆ لای).

**وەڵام:**

سەرزەنشتی کراوە لەسەر ئەوەی دەبا شتی چاکتری ئەنجام دابا، هەرچەندە ئەو کارەش کە پێیەوە سەرقاڵ بوو چاك بوو، چونکە ئەو کاتە زیاتر و ڕێکتر دەبوو لەگەڵ ڕەوشتە مەزنەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، کەسێك هاوشێوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەو کارە لەهەمان حاڵەتدا بکات بەهەمان شێوە سەرزەنشت دەکرێت[2]، جا پێغەمبەر لە کۆشش (اجتهاد)ەکەیدا هەڵەی کرد، بەوەی ڕووی گرژ کرد لە بەرامبەر (إبن

[1] المواقف ورشحه للسيد الشريف ٢٧٩/٨، شرح المقاصد للتفتازانى ٥٨/٥.

[2] المواقف وشرحه للسيد الشريف ٢٧٩/٨، شرح المقاصد للتفتازاني ٥٩/٥.

یاخود هەڵەیەك بووە، بەوەی ئادەم (سەلامی خوای لێبێت) واگومانی بردووە کە خودی دارێك قەدەغە کراوە دواتر لێی تێکەڵ بووە لەگەڵ دارێکی هاوشێوەی دەرەکە[1].

**دووەم:** ئەوەی لە سەرگوزەشتەکەی موسادا (سەلامی خوای لێبێت) هاتووە کاتێك میسرییەکەی کوشت: ﴿فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيۡهِ﴾ القصص: ١٥. واتە: (موساش بۆکزێکی لە کابرادا و کوشتی).

کوشتنی کابرا میسرییەکە دەستدرێژی بوو، بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ: ﴿قَالَ هَٰذَا مِنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ﴾ القصص: ١٥. واتە: (موسا پەشیمان بۆوە لەبەر خۆیەوە وتی: ئەم کارە شەیتان پێی کردم). هەروەها ئەم فەرمایشتە: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمۡتُ نَفۡسِي فَٱغۡفِرۡ لِي﴾ القصص: ١٦. واتە: (وتی: پەروەردگارا من بەڕاستی ستەمم لەخۆم کرد کاتێك لە دەستم دەرچوو، ئەو کابرایەم کوشت، لێم ببورەو بمبەخشە). و ئەم فەرمایشتە: ﴿قَالَ فَعَلۡتُهَآ إِذٗا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ﴾ الشعراء: ٢٠. واتە: (ئەو کاتە ئەوەمکرد، لە نەزانەکان بووم "نەم دەزانی بەوە دەمرێت").

**وەڵام:**

کاتێك میسرییەکەی کوشت هێشتان نەببوو بە پێغەمبەر.

دەکرێت بە هەڵە کەسەکەی کوشتبێت.

ئەو وتانەی کە پێغەمبەر موسا (سەلامی خوای لێبێت) کردوویەتی دەکرێت لێکی بدەینەوە بەوەی لەبەر خاکی بوون و خۆبەکەم زانی و بۆ پەروەردە کردنی دەروون بووە[2].

**سێیەم:** ئەو دەقانەی لەبارەی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) هاتوون، بۆ نمونە:

١- خوای بێ وێنە دەفەرموویێت: ﴿لِّيَغۡفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ﴾ الفتح: ٢. واتە: (داوای لێ خۆش بوونیش بکە بۆ گوناهەکانت). خوای مەزن

[1] المواقف وشرحه للسيد الشريف ٨/٢٦٨-٢٦٩، شرح المقاصد للتفتازاني ٥/٥٣، شرح لمسايرة لقاسم بن قطلوبغا ٢٣٢.

[2] المواقف وشرحه للسيد االشريف ٨/٢٧١، شرح المقاصد للتفتازانى ٥/٥٥.

دەفەرموویت: ﴿وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ﴾ غافر: ٥٥، محمد: ١٩. واتە: (سوێند بەخوا بەڕاستی خوا تەوبەی قبوڵ كرد لە پێغەمبەر..). خوای بێ هاوەڵ و هاوبەش دەفەرموویت: ﴿لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ﴾ التوبة: ١١٧. واتە: (تا خوا لە هەموو گوناهی ڕابردوو و ئایندەشت خۆش ببێت). خوای گەورە لەو فەرمایشتانەدا تاوانی خستۆتە پاڵ پێغەمبەر و لێشی خۆش بووە، جا كاتێك تەوبە دێتە گۆڕێ كە تاوان هەبێت.

**وەڵام:**

بەوەی ئەو گوناهانە پێش پێغەمبەرایەتی بوونە.

یان مەبەست لێی ئەوەبووە كە هەڵەی كردووە یان كردەوەی چاكی ئەنجامداوەو هەوڵی ئەنجامدانی چاكترەكەی نەداوە یاخود گوناهی هۆزەكەی دراوەتە پاڵی، چونكە سەرۆكی هۆزەكە لەوانەیە كردەوەی ئەندامان و شوێنكەوتووانی هۆزەكەی بدرێتە پاڵی. واتە: تا خوای گەورە لەبەر خاتری تۆی لە تاوانی ڕابردوو و داهاتووی ئوممەتەكەت خۆش بێت، داوای لێخۆش بوون بۆ ئومەتەكەت بكە، خودای بێ وێنە لە ئوممەتی پێغەمبەر خۆشبووە[1].

٢- خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ۝١ أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ ۝٢﴾ عبس: ١- ٢. واتە: (ڕووی گرژ كرد و ڕووی وەرگێڕا. لەبەر ئەوەی نابینایەك هات بۆ لای).

**وەڵام:**

سەرزەنشتی كراوە لەسەر ئەوەی دەبا شتی چاكتری ئەنجام دابا، هەرچەندە ئەو كارەش كە پێیەوە سەرقاڵ بوو چاك بوو، چونكە ئەو كاتە زیاتر و ڕێكتر دەبوو لەگەڵ ڕەوشتە مەزنەكەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، كەسێك هاوشێوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەو كارە لەهەمان حاڵەتدا بكات بەهەمان شێوە سەرزەنشت دەكرێت[2]، جا پێغەمبەر لە كۆشش (اجتهاد)ەكەیدا هەڵەی كرد، بەوەی ڕووی گرژ كرد لە بەرامبەر (إبن

[1] المواقف ورشحه للسيد الشريف ٢٧٩/٨، شرح المقاصد للتفتازاني ٥٨/٥.

[2] المواقف وشرحه للسيد الشريف ٢٧٩/٨، شرح المقاصد للتفتازاني ٥٩/٥.

أم مکتوم)ی نابینا، کاتێك هات پرسیاری لێکرد لە بارەی ئاینن، چونکە پێغەمبەر پێی وابوو کە سەرکردەکانی قوڕەیش لەوانەیە ڕووی دڵیان بۆ بەرەو ئەو بێت و موسڵمان بن. و لەوانەیە ئەگەر ڕوویان لێ وەربگێڕێت ببێتە هۆی زیاتر دوور کەوتنەوەیان لە ئیسلام.

بۆیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زیاتر سەرقاڵ بوو بەوان نەك بە (ئیبن ئومی مەکتوم)ی نابینا کە موسڵمان بوو بۆ ئەوە هاتبوو، زانیاری زیاتر دەست بخات لەسەر ئایینی ئیسلام. بۆیە چاکتر وابوو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕووی گرژ نەکردبا و ڕووی وەرنەگێڕابا لە نابیناکە بەڵکو پێویست بوو زیاتر نەرم و نیان بووبا لەگەڵی لەبەر ئەو پلەوپایەی هەیەتی ئەویش موسڵمانێتییە.

٣- خوای بێ وێنە دەفەرموێت:﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ﴾ التوبة: ٤٣. واتە: (خوا لێت خۆش بێت "ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)" بۆ مۆڵەتت پێدان).

**وەڵام:**

ئەمە نەرمو نیانیە لە دواندندا و سەرزەنشت کردنە لەسەر کارێکی باش و فەرامۆش کردنی کاری لەوباشتر، تەنانەت ئەمە ڕێنمایی کردنە بۆ ئەوەی دووربین تر بێت و تێشووی زیاتری چاکە ئامادە بکات[1]. جا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مۆڵەتی دا بە هەندێ کەس کە بیانو و پاساوی درۆیینیان هێنایەوە (کە واباشتر بوو ئەو پاساوانەی لەوان قبوڵ نەکردبا) بەمەش دواکەوتن لە جەنگی (تەبوك) و ئەو کەسەی شتی چاکتر بۆ شتی ئاسایی لە بارودۆخی جەنگدا فەرامۆش بکات ئەوا سەرزەنشت دەکرێت.

٤- خوای پایەبەرز دەفەرموێت: ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾ لَّوْلَا كِتَٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٦٨﴾﴾ الأنفال: ٦٧ - ٦٨. واتە: (بۆ هیچ پێغەمبەرێك نەبووە کە دیلی هەبێت، هەتا کاتێك چاك پایەدار و جێگیر دەبێت لە زەویدا، "مەگەر" کەل و پەل و شتومەکی دونیاتان دەوێت؟! لە کاتێکدا

(1) شرح المقاصد للتفتازاني ٥٩/٥.

خوا "سەرفرازی" ئەو جیهانی دەوێت و قیامەتی مەبەستە و خوا باڵادەست و دانایە. خۆ ئەگەر بڕیارێك لەلایەن خوای گەورە پێش نەکەوتایە "کە مرۆڤ هەتا پەیامی خوایی پێ نەگات، خوا سزای نادات" لەسەر ئەو شتانەی کە وەرتان گرت "لە بەرامبەر ئازاد کردنی دیلەکانەوە" ئەوە سزایەکی زۆر گەورەتان تووش دەبوو).

**وەڵام:**

ئەمەش بەهەمان شێوە سەرزنشت کردنە لەسەر کردنی کاری چاك و فەرامۆش کردنی چاکتر، لێرەدا کاری چاکتر پایەداری و جێ پێ جێگیربوونە، پێش دابەزینی ئەم ئایەتە (فدیە: ئەو شتەی لەبەراام ئاازد کردنی دیلەکان وەردەگیرێت) حەرام نەکرابوو،بەڵکو حوکمی حەرام بوونی (فدیە) لەم ئایەتە وەردەگیرێت، واتای ئەم ئایەتەش: ﴿ لَّوْلَا كِتَٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ الأنفال: ٦٨. ئەوەیە ئەگەر پێشتر دەستکەوتەکان حەڵاڵ نەبوان ئەوا سزا دەدران لەسەر ئەو شتەی وەرتانگرتووە لە بەرامبەر ئازاد کردنی دیلەکان[١]،کاتێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕاوێژی کرد لەسەر ئەوەی کە (فدیە) وەربگرێت لە بەرامبەر ئازاد کردنی گیراوەکانی جەنگی بەدر، کە حەفتا کەسی خانەدانی هۆزی قورەیش بوون، ئەوا زۆربەی ڕاوێژ پێکراوان، ڕایان لەگەڵ وەرگرتنی (فدیە) بوو، لەبەرامبەر ئازاد کردنیان نەك کوشتنیان، جا پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) کۆششی کرد و پشتی ڕای ئەوانی گرت، چونکە بەزەیی هاتەوە بە حاڵی گیراوەکان، بەو هیوایەی کە موسڵمان ببن یاخود لە ڕەچەڵەکیان کەسانی موسڵمان بەدەر بکەون و تاکو موسڵمانانیش سوودمەندبن لەو پارەو سامانەی لەبەرامبەر ئازاد کردنی دیلەکان وەردەگرن، جا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەڵەی کرد لە کۆششەکەیدا، وا باشتر بوو زیاتر ئیسلام سەر بخرێ و جێگیر بکرێ، نەك ئازادکردنی گیراوەکان، لە بەرانبەر سامانێکی دیاریکراودا.

---

[١] المواقف وشرحه للسید الشریف ٢٧٨/٨. و سەیری نمونەی تر بکە لە سەرچاوەی ناوبراو و: شرح المواقف، شرح المقاصد، شرح المسایرة لقاسم بن قطلوبغا ٢٣٢-٢٣٣.

دوای هەموو ئەمانە: ئەوا خوای گەورە پێغەمبەرەکەی لە سەر هەڵە نەهێشتووەتەوەو بەردەوامی نەکردووە، چونکە ئەگەر لەسەر هەڵەی هێشتبایەوە، ئەوا ڕاست و هەڵە لە شەرعدا وەك یەك دەبوون، ئەمەش دەبووە هۆی گومرایی و گومان تەنینەوە بە شەریعەت و بەرنامەی خوایی.

هەر کاتێك خوای گەورە ڕای ستی بۆ پێغەمبەر ڕوون دەکردەوە، ئەوا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەگەڕایەوە بۆ سەر ڕای ڕاست، جا سروش هیچ شتێك لە هەڵە یان سەرزەنشتکرانی پێغەمبەری نەشاردۆتەوە بەڵکو هەمووی تۆمار کردووە[1].

## حیکمەتی تۆمار کردنی هەڵەی پێغەمبەران:

**ئەگەر وترا:** حیکمەت چییە لە تۆمار کردنی هەڵەی پێغەمبەران لە قورئاندا، کە بە درێژایی ڕۆژگار دەخوێنرێتەوە، لەگەڵ ئەوەی کە خوای گەورە لێبوردەیە و گوناهو تاوان دەپۆشێت، تەنانەت خوای گەورە فەرمانیشی بە ئێمە کردووە تاوانی تاوانکار بپۆشین؟

**وەڵام:**

تۆمار کردنی هەڵەکانیان بەڵگە و ئاماژەیە لەسەر:

١- ڕاستگۆیی پێغەمبەران، ئەو پەیامەش کە ڕای دەگەیەنن بە فەرمانی خوای پاك و بەرزە بێ ئەوەی هیچ شتێکی لێ بشارنەوە.

٢- پێغەمبەران سەرباری نرخ و بەهاو شکۆیی و زۆری گوێڕایەڵییەکەیان، ئەوا بەردەوام پەنا دەبەنە بەر خوای گەورە بە داوای لێخۆش کردن و کوروزانەوەو پاڕانەوە لە بەرامبەر کەمترین هەڵە، جا بۆیە پێویستە لەسەر خەڵکی (کە پلەو پایەیان زۆر نزمترە لە پێغەمبەران) لە هەموو کات و ساتێکدا پەنا بەرنە بەر خوای پاك و تاك و داوای لێخۆش بوونی لێ بکەن.

٣- گوناهە بچوکەکان نابنە هۆی توانج دان لە ئیمان و باوەڕ، چونکە مرۆڤ پێی کافر نابێت[1].

---

[1] مناهل العرفان ٢/٢٨٨.

## سیفەتی دووەم: ڕاگەیاندنی بەرنامەی خوا

بریتییە لە گەیاندن و ڕاگەیاندنی یاسا و حوکمەکان بەو خەڵکانەی کە پێغەمبەریان بۆ ڕەوانەکراوە[2]، تا ڕێنماییان بکەن بۆ بەختەوەری دونیاو دواڕۆژ، هەر یەکێك لەم پێغەمبەرانەش هیچ شتێکیان لەو خەڵکە نەشاردۆتەوە لەمەدا چ بە ئەنقەست چ بە هەڵە[3].

ئەو شتەی بۆ پێغەمبەرانڕەوانە کراوە سێ بەشە:

١- بەشێك فەرمان بە پێغەمبەران کراوە، بڵاوی نەکەنەوەو بە نهێنی بیهێڵنەوە، چونکە تایبەت بە خۆیان و پەروەردگاریان، هیچ پیتێکیانلەم بەشە ڕانەگەیاندووە.

٢- لە بەشێکدا پێغەمبەران سەرپشککراون، لە ڕاگەیاندن و ڕانەگەیاندنی.

٣- لە بەشێکدا فەرمانیان پێکراوە بە ڕاگەیاندنی، هیچ پیتێکیان لەم بەشە نەشاردۆتەوە.

ئەم بەشەی کۆتایی ئەو بەشەیە کە بەو کەسانەیان ڕاگەیاندووە کە بۆ لایان ڕەوانەکرابوون، چونکە فەرمانیان پێکرابوو و پێویستیش بوو لەسەریان ڕایبگەیەنن[4].

**بەڵگەی عەقڵی لەسەر پێویست بوونی ڕاگەیاندنی بەرنامەی خودا:**

١ ئەگەر پێغەمبەران شتێکیان شاردبایەوە کە فەرمانیان پێکراوە ڕایبگەیەنن، ئەوا لەسەر ئێمەش پێویست دەبوو کە زانست بشارینەوە، چونکە خوای گەورە فەرمانی بە ئێمە کردووە شوێنیان بکەوین، لەگەڵ ئەوەی کە فەرموودەی ڕاست و ڕاشکاو هاتووە نەفرەت لەو کەسە دەکات کە زانست دەشارێتەوە[5].

---

(1) شرح المقاصد للتفتازاني ٥/٦٠.

(2) شرح الخريدة للدردير ١٠٠.

(3) رسالة في التوحيد للطائي ٦٨.

(4) شرح لخريدة للدردير وحاشية الصاوي عليه ١٠١، شرح الجوهرة للباجوري ٢٠٣، رسالة في التوحيد للطائي، سەرچاوەی پێشوو.

(5) شرح الجوهرة للباجوري ٢٠٣.

٢- ئەگەر شتێكیان شاردبایەوە كە فەرمانیان پێكراوە ڕایگەیەنن، ئەوا بەمە دەبوونە ناپاك و خیانەتكار، كەچی پارێزراون لەوەی ناپاكی بكەن[١].

٣- پێغەمبەران موژدەدەرو ترسێنەرن، بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ﴾ النساء: ١٦٥. واتە: (پێغەمبەرانمان "ڕەوانە كردووە" كە مژدەدەرن "بە ئیمانداران" و ترسێنەرن بۆ "یاخیەكان"). و موژدەدان و هەڕەشە، تەنها بە ڕاگەیاندنی پەیامی خوای گەورە تەواو دەبێت.

٤- ئەگەر ئەو شتەیان شاردبایەوە كە فەرمانیان پێ كراوە ڕایگەیەنن، ئەوا نەفرەت لێكراو دەبوون بەدەقی ئایەتی قورئانی پیرۆز: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلْهُدَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِى ٱلْكِتَٰبِ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ ﴾ البقرة: ١٥٩.[٢] واتە: (بەڕاستی ئەوانەی بەرنامە و ڕێنموونییەكانی ئاشكرای ڕەوانە كراوی ئێمە دەشارنەوە كە ناردوومانە، دوای ئەوەی لە كتێبەكاندا بۆ خەڵكیمان ڕوون كردۆتەوە، ئا ئەوانە خوا نەفرینیان لێدەكات).

**بەڵگەی نەقڵی:**

خوای مەزن دەفەرموێت:﴿ مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ﴾ المائدة: ٩٩. واتە: (پێغەمبەر هیچی لەسەر نییە جگە لە ڕاگەیاندنی پەیامی خوا).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ﴾ المائدة: ٦٧.[٣] واتە: (ئەی پێغەمبەرو فرستادە(صلى الله عليه وسلم)، هەرچی فەرمان و پەیامێكت بۆ دابەزیووە لەلایەن پەروەردگارتەوە رای بگەیەنە، خۆ ئەگەر بەوكارە هەڵنەستایت، ئەوە مانای وایە پەیامەكەت "بەتەواوی" نەگەیاندووە).

[١] شرح الخريدة للدردير ١٠٠، رسالة في التوحيد للطائي ٦٩، لوامع الأنوار البهية ٣٠٨/٢.
[٢] شرح الخريدة للدردير ١٠٠-١٠١.
[٣] شرح الخريدة للدردير، رسلة في لتوحيد للطائي، دوو سەرچاوەی پێشوو.

## سیفەتی سێیەم: زیرەکی و ژیری (الفطَانة)

الفطانة: بریتییە لە وریایی و تێگەیشتن[1] و زیرەکی و ژیری عەقڵ و بیرتیژی[2] و بەهێزی ڕاو بۆچوون[3].

هەر پێغەمبەرو پەیامبەرێك پێویستە ئەو سیفەتەی تێدا بێت، چونکە ناکرێت گێل یاخود خەڵەفاو و گەوج بێت[4].

**بەڵگەی عەقڵی لەسەر پێویست بوونی ئەم سیفەتە بۆ پێغەمبەران:**

١- لەبەرئەوەی پێغەمبەران ڕەوانەکراون، بۆ بەرپاکردنی بەڵگە لەسەر خەڵکی و پوچەڵ کردنەوەی گومانی ئەوانەی دەمەتەقێ و گفتوگۆ و مشتومڕ دەکەن، ئەمەش بەکەسێکی گەوج و گێل ناکرێت[5].

٢- لەبەر ئەوەی پێغەمبەران بەڕێوەبەرو پێشەوای خەڵکین، سەرچاوەی چارەسەری کێشەکانی خەڵکن[6].

٣- لەبەر ئەوەی ئێمە فەرمانمان پێکراوە کە شوێنیان بکەوین، لە کردارو گوفتاردا، بۆیە ناکرێت ئەو کەسەی خەڵکی تر شوێنکەوتووی ئەون گێل بێت.

٤- گەوجێتی و گێلی سیفەتی ناتەواوی و کەم و کورتین، کە ئەمەش دەبێتە مایەی ناشرینی و ناڕێکی پلەو پایەی بەرزی پێغەمبەران[7].

---

[1] شرح الجوهرة للباجوري ٢٠٢.

[2] شرح الخريدة للدردير ١٠٠.

[3] لە (شرح المقاصد)ی تەفتازانی دا هاتووە: (ئەمانە لە مەرجەکانی پێغەمبەرایەتین: کاملی عەقڵ، زیرەکی، ژیری، بەهێزی ڕاوبۆچوون، ئەگەر لە منداڵیشدا بێت وەك: عیسا و یەحیا "سڵاوی خوایان لێبێت")، بەهەمان شێوە لە (لوامع الأنوار البهيه ٢٦٧/٢).

[4] شرح الخريدة للدردير ١٠٠، شرح الجوهرة للباجوري ٢٠٢، لوامع الأنوار البهية، سەرچاوەی پێشوو.

[5] شرح الخريدة للدردير، شرح الجوهرة للباجوري، سەرچاوەکانی پێشوو، رسالة في التوحيد للطائي ٧٠.

[6] المسامرة ٢٢٦.

[7] شرح الخريدة للدردير ١٠٠، رسلة في التوحيد للطائي، سەرچاوەی پێشوو.

**بەڵگەی نەقڵی:**

١- خــوای گــەورە دەفــەرموویێت: ﴿فَفَهَّمْنَٰهَا سُلَيْمَٰنَ ۚ وَكُلًّا ءَاتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا﴾ الأنبيـاء: ٧٩. واتە: (جا ئێمە لە سولەیمانمان گەیاند، بەڵام هەر یەكە"لەم بـاوك و كوڕە" بەهرەوەرەمان كردبوو لە حیكمەت و دانایی و عیلم و زانست).

٢- خوای بـێ وێنـە دەفـەرموویێت: ﴿وَشَدَدْنَا مُلْكَهُۥ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْحِكْمَةَ وَفَصْلَ ٱلْخِطَابِ﴾ ص: ٢٠. واتە: (ئێمە پاشایەتیەكەمان بەهێز كـردو حیكمـەت و دانـایی و قسـەو فەرمانی بەجێمان پێ بەخشی).

٣- خوای زانا و خـاوەن توانـا دەفـەرموویێت: ﴿وَجَٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ﴾ النحـل: ١٢٥. واتە: (گفتوگۆو مشتومڕیان بە جـوانترین شـێوە لەگـەڵ بكـە). واتـە بـەو ڕێگەیەی كە نەرم و نیانترینە بۆیان، گفتوگۆ و دەمەقاڵێ تەنها بـە كەسـێكی ژێـر دەكرێت.

## سیفەتی چوارەم: نێرینە بوون

زانایـان ڕاجییـان لەسـەر ئـەوەی كـە ئایـا سـیفەتی نێرینـە بـوون مەرجـە بـۆ پێغەمبەرایەتی، لەم بارەوە دوو بۆچوونیان هەن:

**بۆچـوونی یەكـەم:** نێرینـەبوون مەرجـە بـۆ پێغەمبەرایـەتی، ئەمـە ڕای زۆربـەی زانایانە،بەم پێیە دروست نییە ئافرەت ببێتـە پێغەمبـەر، بـەڵكو هەنـدێ لـە زانایـان[1] یەكدەنگی (إجماع)یان هێناوە لەسەر ئەمە. بەڵگەكانی ئەم مەرجە ئەمانەن:

---

(١) پێشەوا جەلالەددینی جاروڵا وتویەتی: زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعەت كۆكن لەسەر ئەوەی نێرینە بوون مەرجێكی پێغەمبەرایەتییە، بەپێچەوانەی ڕای ئەشعەری./ شرح المسايرة لقاسم بن قطلوبغا ٢٣٠. (كرمانی) یەكدەنگی نەقڵێ كردووە لەسەر ئەوەی نابێت ئافرەت ببێتە پێغەمبەر./حاشية المرجاني على شرح العقائد العضدية ٩/١. بەیزاوی و جگە لەویش: یەكدەنگیشی هێناوە لەسەر ئەوەی (مەریم) پێغەمبەر نەبووە./ المسامرة ٢٣١. و تفسير البيضاوي ٦٨.

أ- خــوای گــەورە دەفــەرموویت: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِم ﴾ یوسف: ١٠٩.[١] واتە: (ئێمە کەسمان نەناردووە لە پێش تۆدا جگە لە پیاوانێك کـە هەڵمان بژاردوون لە خەڵکی شارو شوێنەکان و نیگایان بۆ دەنێرین). پەیامداری بـۆ ئەو پیاوانە چەسپاند کە خودا سروش و نیگـای بـۆ نـاردوون، پەیامـداری غـەیری پیاوانیشی ڕەتکردووەتەوە، بۆیە مێینە نابێتە پێغەمبەر[٢].

ب- خوای بـێ وێنـە دەفـەرموویت:﴿وَلَوۡ جَعَلۡنَٰهُ مَلَكٗا لَّجَعَلۡنَٰهُ رَجُلٗا ﴾ الأنعـام: ٩. واتە: (خۆ ئەگەر فریشتەمان بکردایـە بـە فرسـتادە، ئـەوە لـە شـێوەی پیاوێکـدا دەماننارد).

پ- پێغەمبەرایەتی و پەیامبەرایەتی پێویستی هەیە بە: دەرکـەوتن و دیـار کـەوتن و چوونە شوێنە قەرەباڵغەکانی خەڵك، ئەو شوێنانەی لێی کۆدەبنـەوەو پێویسـتی بـە دەرخستنی موعجیزە، بەڵام مێینەیی پێویسـتی بـە خـۆ داپۆشـین هەیە،ئـەم دوو لایەنەش جیاوازن[٣].

ت- ئافرەت دروست نییـە بکرێنـە ئـەمیرو حـوکمڕان و دادوەرو پـێش نوێـژخوێن بـە یەکدەنگی زانایان، کەواتە لەپێشترە کە نەبنە پێغەمبەر[٤].

**بۆچووونی دووەم:** پێی وایە نێرینـە بـوون مـەرج نییـە بـۆ پێغەمبەرایـەتی، ئەمـە بۆچوونی (ئەشعەری)[٥] و (قورتوبی[٦]) و هەندێ لە (ئەهلی زاهر) و فەرموودەناسـانە[١]، بەم پێیە وتیان (مەریم) پێغەمبەرە، بەم بەڵگانەی خوارەوە:

---

[١] شرح المسايرة لقاسم بن قطلوبغا ٢٣٠.

[٢] لوامع الأنوار البهية ٢/٢٦٥.

[٣] شرح المسايرة لقاسم بن قطلوبغا ٢٣٠، عن الصابوني الذي صحح هذا القول. ولوامع الأنوار البهية ٢/٢٦٦.

[٤] شرح المسايرة لقاسم بن قطلوبغا، سەرچاوەی پێشوو.

[٥] شرح المسايرة لقاسم بن قطلوبغا عن الإمام جلال الدين جار الله، لوامع الأنوار البهية، دوو سەرچاوەکەی پێشوو.

[٦] لوامع الأنوار البهية، سەرچاوەی پێشوو.

خـوای بـێ وێنـه دەفـەرموویێت: ﴿وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَـٰبِ مَرْيَمَ﴾ مـریم: ١٦. واتـه: (ئـەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) له قورئاندا بەسەرهاتی مەریەم یاد بکه). خوای گەوره لـه ڕیزی پێغەمبەران باسی کرددووه[٢].

خوای گەوره (جبریل)ی ڕەوانه کرد بـۆ لای (مـەریم): ﴿فَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهَا رُوحَنَا﴾ مـریم: ١٧.[٣] واته: (ئێمەش جوبرەئیلی فریشتەمان نارد بۆ لای).

خوای گەوره هەڵیبـژارد، هـەروەها دەفـەرموویێت: ﴿وَإِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ يَـٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰكِ﴾ آل عمـران: ٤٢.[٤]واته: ("یادیان بهێنەوه کاتێك" جبریلی فریشته وتی: ئـەی مەریەم بەڕاستی خوا تۆی هەڵبژاردووه).

هەندێ ڕایان وابوو که دایکی موساش پێغەمبەر بووه[٥]، بەم بەڵگەی خوارەوه:

خوای گەوره سروش و نیگای بـۆ نـاردووه، خـوای مـەزن لـەم بـارەوه دەرفـەموویێت: ﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ﴾ القصص: ٧. واته: (ئێمه دایکـی موسـامان ئاگـادار کرد، که شیری بداتێ).

بەڵام زۆربەی زانایان بەرپەرچی ئـەم گومانـەیان داوەتـەوه بـەوەی: خـوای گـەوره کـه (مریم)ی هەڵبژارد و (جبریل)ی ڕەوانەکرده لای ئەوا سروش و نیگای وەك شـەریعەتی بـۆ نەهێنا، چونکه ئایەتی ناوبراودا هیچ ئاماژەیەکی بەمه نەدراوه[٦].ئەو سروش و وەحیـەی بۆ دایکی موساش هاتووه، تەنها به مانای خورپەی دڵ و خرانـه دڵ (ئیلـهام) دێـت، وەك ئەم فەرمایشتەی خوای گەوره: ﴿وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ﴾ النحـل: ٦٨. واته: (پـەروەردگاری تۆ "ئەی ئینسان" نیگاو ئیلهامی کردووه بۆ هەنگ).

---

[١] المسايرة ٢٣٠.

[٢] شرح المسايرة لقاسم بن قطلوبغا ٢٣٠-٢٣١، وتویەتی ئەمه بەڵگەی ئەشعەرییه.

[٣] شرح المسايرة لقاسم بن قطلوبغا ٢٣١، وتویەتی ئەمه بەڵگەی ئەشعەرییه. والمسامرة ٢٣١.

[٤] المسايرة، سەرچاوەی پێشوو.

[٥] لوامع الأنوار البهية ٢/٢٦٦.

[٦] المسامرة ٢٣١.

## سیفەتی پێنجەم: پاك و سەلامەت بوون لە ناتەواوی و کەم و کورتییەکان

مەبەست لەو مەرجە، ئەم شتانەی خوارەوەیە:

أ- پێویستە پاك و سەلامەت بێت لە هەموو ناتەواوی و کەم و کورتییەکی جەستەیی. دەبێت تەواوترین و کاملترین کەسی سەردەمی خۆی بێت، لە کاتی ڕەوانەکرانی (واتە لەو کاتەی کە بە پێغەمبەر لەلایەن خواوە بۆ خەڵکی ڕەوانە دەکرێت).

لەوانەیە کەسێ بەرهەڵستی بکات بەو گرێ و تێگیرانەی کە لە زمانی پێغەمبەر موسادا (سەلامی خوای لێبێت) هەبووە، وەڵامەکەی ئەوەیە:

ئەمە بەر لە ڕەوانەکرانی بوو بە پێغەمبەر، دواتر بەهۆی نزاو پاڕانەوەکەی لەم بارەوە خوای گەورە گرێیەکەی زمانی کردەوە، بەم بەڵگانەی خوارەوە: کاتێ خوای گەورە سروش و نیگای ڕەوانەکرد بۆ پێغەمبەر موسا (سەلامی خوای لێبێت) و فەرمانی پێکرد بانگەواز بکات بۆ لای خوا، ئەوا پێغەمبەر موسا پاڕایەوە: ﴿وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةً مِّن لِّسَانِي ﴿٢٧﴾ يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي ﴿٢٨﴾﴾ طه: ٢٧ - ٢٨. واتە: (گرێی زمانم بکەرەوەو زمانم گۆیا و پاراو بکەتا لە قسەو گوفتارو مەبەستم تێبگەن). جا خوای گەورە وەڵامی دایەوە: ﴿قَالَ قَدۡ أُوتِيتَ سُؤۡلَكَ يَٰمُوسَىٰ﴾ طه: ٣٦.[1] (ئەی موسا هەموو داخوازیەکانت بەجێیە و پەسەندە و هەموویانت پێدرا).

ب- پێویستە پاك و سەلامەت بێت لەو کەم و کورتیانەی کە قێزەونن لەلایەن سروشتی مرۆڤـ، وەك: دەردو نەخۆشیەکان، وەك بەڵەکی و گەڕی[2].

دەکرێ هەندێ کەس بەرهەڵستی لەمە بکات، بەوەی نموونە بێنێتەوە بە تاقیکردنەوەکەی ئەیوب (سەلامی خوای لێبێت) کە تووشی نەخۆشیەکی پێستی بوو کە خەڵکی لەبەری هەڵدەهاتن، وەڵامەکەی ئەوەیە:

---

[1] المسايرة وشرحها المسامرة ٢٢٦.

[2] المسامرة ٢٢٦، المقاصد وشرحه للتفتازاني ٥/٦١، لوامع الأنوار البهية ٢/٢٦٧.

ئەو نەخۆشـیەی پـێش پێغەمبەرایـەتی بـوو[1]، پـاش ئـەوەی بـوو بـە پێغەمبـەر نەخۆشیەکەی نەما، خـوای پـاك و تـاك فەرموویـەتی: ﴿فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ فَكَشَفْنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرٍّ﴾ الأنبِياء: ٨٤. واتە: (جـا ئێمـەش نزامـان گـیرا کـرد و بەهاواریـیـەوە چـووین و هەموو ناخۆشی و نەخۆشیەکمان لە کۆڵ کردەوە)،

پ- پێویستە پیشەو کـاری نـزم نـەکات وەك پیشـەی کەڵەشـاخ (حجامـة[2]) کـردن. هەروەها دوور بێت لە کـاریٚ نەشـیاو و کـەم نـرخ وەك خـواردن لەسـەر ڕێگـە[3]. ئەمەش لەسەر ئەوە خەملێنراوە کە دەکرێت داب و نەریتی سـەردەمی پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) ئەو شتەیەیان بە ناپەسەند دانابێت[4].

ت- پێویسـتە کەسـێکی وشـك[5] و ڕووگـرژو دڵ ڕەق نـەبێت[6]. دڵ ڕەقـی هۆکـاری دوورکەوتنەوەیە لە خوای گەورەو سەرچاوەی گوناهو تاوانەکانە، چـونکە دڵ پارچـە گۆشتێکە ئەگەر چاك بوو هەموو لاشە چاك دەبێت و ئەگەر خراپ بوو ئەوا هەموو

---

[1] المسايرة و شرحها المسامرة ٢٣٢.

[2] کەڵەشاخ (حجامة) کردن: بریتیە لە هەڵمژینی خوێن لە جەستەی مرۆڤ بەهۆی ئامێری تایبەت، بە عەرەبی پێی دەگوترێت (حجامة) و بە کوردی پێی دەگوترێت (کەڵەشاخ) بەهۆی ئەوەی کە لە کۆنەوە لە کوردەواری شاخی ئاژەڵ واتە (قۆچیان) بۆ ئەم مەبەستە بەکارهێناوە، بەڵام ئەمڕۆ کەرستەی پزیشکی تایبەت پەیدابووە بۆ ئەم مەبەستە. حیجامە: لە ڕووی پزیشکی بریتیە لە کرداری هەڵمژینی خوێن، لە چەندان شوێنی تایبەت لە جەستەدا، بەهۆی بەتاڵ کردنەوەی هەوا لەو شوێنە بە بەکارهێنانی (کاسە)یان پەرداخی تایبەت، بەهۆی ئاگرکردنەوە لەناو پەرداخەکەدا یان بەهۆی ڕاکێشان و بەتاڵ کردنی هەوا بەهۆی ئامێری تایبەت (پەمپ). (بە دەستکارییەکی زۆر کەمەوە وەرم گرتووە لە کتێبی: کەڵەشاخ ٨، ئامادەکردنی: حاجی عبدالجلیل، چ ٢٠٠٨، چاپخانەی ڕۆژهەڵات/ هەولێر). (وەرگێڕ).

[3] المسايرة و شرحها المسامرة ٢٢٦، المقاصد وشرحه للتفتازاني ٦١/٥، لوامع الأنوار البهية ٢٦٧/٢، الوسيلة ٦٩٣.

[4] المسايرة و شرحها المسامرة ٢٣٢.

[5] المسايرة وشرحها المسامرة ٢٢٦.

[6] المقاصد وشرحها للتفتازاني ٦١/٥، لوامع الأنوار البهية ٢٦٧/٢.

لاشە خراپ دەبێت، هەروەك لە فەرموودەی ڕاست و دروستدا هاتووە: **(ان أبعد الناس من الله القلبُ القاسي)**[1] واتە: بەڕاستی دوورترین کەس لە خوای گەورە کەسی دڵ ڕەقە.

لەبەر ئەوەی دڵ ڕەقی و توندی و نەرم و نیان نەبوون دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوەی خەڵکی لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، لەم بارەیەوەی خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ﴾ آل عمران: ١٥٩. واتە: (خۆ ئەگەر توڕەو قسە ڕەق و بێ بەزەیی بویتایە، ئەوە هەمووان لە دەورت بڵاوەیان دەکرد).

ئەو سیفەتانەی کە خستمانەڕوو، پێویستن بۆ پێغەمبەران، مەبەست لەم سیفەتانەش ئەوەیە کە پێغەمبەران دەبێت گەیشتبنە پلەی تەواو کاملی مرۆیی و سەلامەت و دووریش بن لە هەموو ناتەواویەکی مرۆیی، چونکە پێغەمبەرایەتی بەرێزترین پلەو پایەیە لەناو بەدیهێنراواندا، بۆیە هەموو ئەو سیفەتانەی پێویستە تیایدا بن کە شایەنی شکۆداری ئەو پلەیە بن، بەم پێیەش هەر سیفەتێکی پێچەوانەی ئەمانە لە پێغەمبەراندا نابێت[2].

بۆیە: شتێکی ئەستە کە پێغەمبەران پێچەوانەی ئەو سیفەتانەیان هەبێت کە پێویستن بۆ ئەوان، کەوایە ئەستەمە بۆیان:

ئەوەی پێچەوانەی پارێزراویە، وەك: ناپاکی و درۆ کردن و کوفرو تاوان کردن. ئەوەی پێچەوانەی ڕاگەیاندنی بەرنامەی خودایە، وەك: شاردنەوەی ئەو شتانەیە کە فەرمانیان پێکراوە بە ڕاگەیاندنی. ئەوەی پێچەوانەی زیرەکی و ژیرییە، وکو: گێلی و بێ ئاگایی و ساویلکەیی[3]. ئەوەی پێچەوانەی سەلامەتییە، وەك: ئەوکەموکورتیانەی

---

[1] المسامرة ٢٢٦.

فەرموودەی: بەڕاستی دوورترین کەس... تاد: سنن الترمذي: كتاب الزهد، باب أبعد الناس من الله القلب القاسي ١٣٠/٧، وقال حديث حسن، ورواه االبيهقي.

[2] المسامرة ٢٢٧.

[3] شرح الخريدة للدردير ١٠٠-١٠١، شرح الجوهرة للباجوري ٢٠٤.

کەسایەتی ناشرین دەکەن و دەبنە هۆی لەکەدار کردنی دانایی و حیکمـەتی ڕەوانـەکرانیان وەك مژدەدەرو ترسێنەر.

## سروش (الوحي)

**سروش (وحی) لە زمانەوانیـدا:** أبو إسحاق وتویەتی: بنچینەی سروش لـە زمانەوانیـدا بەشێوەیەکی گشتی بریتییە لە ئاگادار کردن و زانیاری پێدان و پێڕاگەیانـدن بـە نهێنـی. بۆیە خورپەر و خرانە دڵ (ئیلهام) بە سروش ناودەبرێت، زهری وتویەتی: ئامـاژەو نیشـانە بـۆ کـردنیش بـە سـروش ناودەنرێـت، نووسـینیش بـە سـروش ناودەنرێـت.... هـەروەها ڕاگەیاندنیش بە واتای سروش دێت، هەرچەندە ئامرازەکانی ڕاگەیاندنەکەش جیاواز بن[1].

---

[1] لسان العرب مادة (وحي).

وشەی سروش لە قورئانی پیرۆزدا ئەم مانا زمانەونیانە دەبەخشێت:

أ- وتەی نهێنی و شاراوە، خوای گەورە فەرمووویەتی: ﴿يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا﴾ الأنعام: ١٢٢. واتە: (کە بەردەوام قسەی زل و ڕازاوە دەدەن بە گوێی یەکدا " کە خۆیان و خەڵکی" پێ سەرگەردان و گومڕا دەکەن). مەبەستی ئەوەیە کە بەنهێنی قسە بۆ یەکتری دەکەن.

ب- خورپە و خرانە دڵ و نیگا (الالهام)، خوای پاك و بەرز فەرموویەتی: ﴿ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ ﴾ النحل: ٦٨. واتە: (پەروەردگاری تۆ "ئەی ئینسان" نیگاو ئیلهامی کردووە بۆ هەنگ).

پ- ئاماژە (الاشارة)، خوای بێ وێنە فەرموویەتی: ﴿فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُوا۟ بُكْرَةً وَعَشِيًّا﴾ مريم: ١١. واتە: (ئاماژەی بۆ کردن بەیانیان و ئێواران تەسبیحات و ستایش بکەن).

ت- فەرمان (أمر)، خوای زانا و خاوەن توانا فەرموویەتی: ﴿بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ﴾ الزلزلة: ٥. واتە: (بەهۆی ئەوەی پەروەردگارت "ئەی ئینسان" ڕایگەیاندووە و فەرمانی بۆ دەرکردووە).

سەیری: المفردات للراغب، مادە (لوحی). بکە.

هەروەها (قازی عیاز) لە (الشفاء ٢٥٢/١) دوو ڕای هێناوەتەوە لەبارەی بنچینەی وشەی (وحی): یەکەمیان: خێرابوون، وەك پەیام وەرگرتنەکەی پێغەمبەر، چونکە زۆر بەپەلە بوو، هەروەها وەك خورپە و خرانە دڵ (ئیلهام) و هێڵ بەهۆی خێرایی جوڵەی دەست... دووەمیان: نهێنی و شاردنەوەیە، وەك: (نیگای نهێنی و قسە خستنە دڵ و چرپە چرپی شەیتانەکان).

**سروش (وحی) لە زاراوەدا:** بریتییە لەوەی خوای گەورە ئەو کەسەی هەڵیبــژاردووە لــە ناو بەندەکانی ئاشنا بکات کە دەیەوێت لە جۆرەکانی ڕێنمایی و زانسـت، بــە ڕێگەیــەکی نهێنی و نامۆلەلایەن نەریتی مرۆیی[1].

پرسیار لە (زهری) کرا لە بارەی سروش (وحی)، لە وەڵامدا وتی: بریتیە لەوەی خــوای گەورە بۆ پێغەمبەران دەنێرێت و لە دڵیاندا جــێگیری دەکــات، پێغەمبەرەکــەش ئــەویش دەری دەبڕێت، دەینووسێت، هەروەها بریتییە لە فەرمایشتی خوا. جۆرێکی سروش هەیــە کــە پێغەمبــەر دەری نابڕێــت و هــیچ کەســێکیش ناینوســێت و فــەرمانیش ناکــات بــە نووسینی، بەڵکو بە زمان بۆ خەڵکی دەیخاتەڕوو، پێیان ڕادەگەیــەنێت کــە خــوای گــەورە فەرمانی پێکردووە کە بۆ خەڵکی ڕوون بکاتەوەو بە خەڵکی بگەیەنێت[2].

ئەگەر بەزمانی شەرع وشەی سروش و وەحی بەکارهات ئەوا ڕاستەوخۆ سەرنج دەچێت بەرەو فێرکردنی نهێنی و پەنهاان کە لە خواوەیە بۆ پێغەمبــەرانی، جــا ســروش لــە ڕووی واتای زاراوەییەوە زۆر تایبەتترە لە واتــا زمانەوانییــەکانی بەتایبــەت لــە ڕووی چــاوگ و سەرچاوەکەیەوە[3].

## جۆرەکانی سروش (وحی)

ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە هەموو جۆرەکانی سرش (وحي) لە خۆی گرتــووە: ﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآيِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ إِنَّهُۥ عَلِيٌّ حَكِيمٌ﴾ الشورى: ٥١. واتە: (کەس بۆی نییە هیچ کات "لە دونیــادا" خوای گەورە وتو وێژی ڕاستەوخۆی لەگەڵدا بکات مەگەر لە ڕێگەی وەحی و نیگــاوە یــان لە پشتی پەردەوە، "وەك موسا" یان نێردراوێکــی وەك فریشــتە "جبریــل" دەنێرێــت کــە

---

[1] مناهل العرفان ١/٥٦.

[2] الاتقان ١٢٠، وفيه أخرجه أبي حاتم من طريق عقيل عن الزهري.

[3] المختار من كنوز السنة النبوية ١.

بەگوێرەی فەرمان و مۆڵەتی خوا چی پێ سپێردراوە دەیگەیەنێت، بەڕاستی ئەو زاتە خوایەکی بڵند و داناو کاربەجێیە).

ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێت کە هیچ کەسێك بەدەر لەم سێ جۆرە[1] نەیتوانیوە لەگەڵ خوای گەورە بدوێت:

**جۆری یەکەم:** بە سروش و نیگا. واتە: یان بەرێگەی سروشەوە بووە، کە بریتییە لە:

أ- خورپە و خرانە دڵ (ئیلهام): هەروەك خوای گەورە نیگای کرد بۆ دایکی موسا کە شیری پێبدات، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم)دەفەرموویێت: **(إن روح القدس نفثَ في روعي: ان نفساً لن تموت حتى تستكمل أجَلَها و تستوعب رزقها...)** واتە: (جبریل شتێکی خستە دڵ و دەروونی منەوە: کە هیچ کەسێك نامرێت تا ماوەکەی تەواو نەبێت و ڕۆزیەکەشی تەواو بەدەست نەخات...).

ب- خەون بینین لەکاتی خەوتندا: هەروەك خوای گەورە سروش و نیگای نارد بۆ ئیبڕاهیم، لەکاتی خەوتندا کە کوڕەکەی ئیسماعیل سەر ببڕێت. هەروەك دەستپێکی سروش هاتن بۆ پێغەمبەر موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) بریتی بوو لە بینینی خەونی چاك لە کاتی خەوتندا، ئەمە لە فەرموودەی ڕاست و دروستدا هاتووە.

**جۆری دووەم:** لە پشتی پەردەوە (من وراء حجاب). واتە: گوێبیستی فەرمایشتی خوای گەورە ببێت بەبێ هۆکارێکی گەیەنەر.وەك چۆن خوای گەورە وایکرد موسا بێ هۆکار گوێبیستی فەرمایشتەکەی بێت. بەهەمان شێوە ئەو فریشتانەش کە خوای گەورە لەگەڵیان دووا لەبارەی بەدیهێنانی ئادەم (سەلامی خوای لێبێت).

---

[1] ئیمامی رازی لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا ۱۸۷/۲۷ وتویەتی: (بزانە هەر یەکێك لەم سێ جۆرە بریتییە لە سروش، بەڵام ئەوەندە هەیە کە خوای گەورە جۆری یەکەمی تایبەت کردووە بەناوی سروش (وحی)، چونکە ئەوەی ڕاستەوخۆ بەشێوەی خورپە و خرانە دڵ (ئیلهام) دەکەوێتە دڵەوە بەیەك تەوژم ئەوا شایەنتر بوو کە بە تایبەت ناوی سروشی لێ بنرێت. ئەمە ئەو قسەیە لە بارەی لێك جیاکردنەوەی ئەو سێ جۆرە لەیەك تری). سەیری چەند وتەیەکی تریش بکە لەم سەرچاوانە: سبل الهدی والرشاد ۳۵۲/۲.

**جۆری سێیەم:** نێردراوێك دەنێرێت (أو يرسل رسولاً). واتە یان نێردراوێك لە فریشتەکان دەنێرێتە لای پێغەمبەرکە، ئەو کاتە فریشتەکە سروش و نیگاکە بە پەیامبەرە مرۆڤەکە دەگەیەنێت. و نێردراو و پەیامبەری فریشتەکانیش جبریلە (سەلامی خوای لێبێت) [1].

**شێوازەکانی دابەزینی جبریل** (سەلامی خوای لێبێت) **بۆ لای پێغەمبەر موحەممەد** (صلى الله عليه وسلم)

دابەزینی جبریل بۆ لای پێغەمبەر موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) بە چەند شێوازێکی جیا جیا:

أ- بەشێوەو وێنەی ڕاستەقینەی فریشتەیی خۆی بێتە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

ب- لەسەر شێوەی پیاوێك بێتە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و لەگەڵی بدوێت، هەروەك لە فەرموودەی ڕاست و دروستدا هاتووە: **(وأحياناً يتمثّل لي الملك رجلاً فيكلمني، فأعي ما يقول)** واتە: (هەندێ جار فریشتە لەشێوەی پیاوێك لەگەڵم دەدوێت و لێی تێدەگەم)، ئەبو عەوانە لە صحیحەکەیدا ئەم زیادەیەی هێناوە: (ئەم جۆرە ئاسانترو سوکترینیانە لەسەر شانم).

جا بەوشێوەیە ئامادەبوان دەیبینن و گوێبیستی دەبن، هەروەك لەو فەرموودەیەی کە عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێبێت) گێڕاویەتیەوەو وتویەتی: جارێك لە خزمەت پێغەمبەر دانیشتبووین، ڕۆژێك لە ڕۆژان، لە ناکاو پیاوێکمان هاتە بەرچاو، جل و بەرگی زۆر سپی و مووی ڕیشی زۆر ڕەش بوو، نیشانەی ڕێبواری لێ نەدەبینراو هیچ کەس لە ئێمە نەیدەناسی، تا لە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دانیشت و هەردوو ئەژنۆی

---

[1] سەیری ئەم سەرچاوانە بکە: تفسير الرازي ١٨٦/٢٧، تفسير القرطبى ٥٨٧٣/٨، روح المعاني للآلوسي ٥٤/٢٥، زاد المعاد ١٨/١، الاتقان ١٢٠.

فەرموودەی: جبریل شتێکی خستە دڵ و دەروونی منەوە... ئەبو نەعیم لە (الحلیە)دا گێڕاویەتیەوە. فەرموودەکە لاوازە./ الجامع الصغیر ١٣٨. (الروع) واتە: عەقڵ و دڵ.

فەرموودەی: سەرەتا سروش بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە خەونی چاك و ڕاستەقینە دەستی پێکرد... تاد: صحيح البخاري: ١ كتاب بدء الوحي، ٣ باب، رقم ٣، عن عائشة (رضي الله عنها).

خۆی بە هەردوو ئەژنۆی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نووساند هەر دوو دەستەکانی دانا سەر هەردوو ڕانەکانی خۆی و ئەو پیاوە نەناسراوە گوتی: (ئەی موحەممەد پێم بڵێ ئایینی ئیسلام چییە؟..) تاد.

پرسیاری لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کرد لەبارەی ئیسلام و ئیمان و نیشانەکانی دوارۆژ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەڵامی دەدایەوە، تا کابرا نەناسراوەکە تەواو بوو لە پرسیارەکانی و ڕۆیشت، جا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی ئەوە (جبریل) بوو هاتبوو فێری ئایینی پیرۆزی ئیسلامتان بکات.

پ- بەنهێنی بێتە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەبێ ئەوەی هیچ کەسێ ببیینێت، شوێنەواری کاریگەرو کارتێکران لەسەر ڕووخساری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەدەر بکەوێت.

پێغەمبەر وەسفی بارودۆخی خۆی دەکات، لە کاتی دابەزینی سروش و نیگا، دەفەرموێت: **(أحياناً يأتيني مثل صلصلة الجرَس، و هو أشَدُّه عليّ، فيفصم عني، وقد وعيت عنه ما قال)** واتە: (هەندێ جار سروشم بۆ دێت وەك زرنگ و هوڕی زەنگ، دواتر ئەم دەنگە زرنگە کۆتایی دێت و منیش دوای کۆتایی هاتنی لە قسەکانی تێگەیشتم).

خەتابی وتویەتی: مەبەست ئەوەیە کە دەنگێکی بەدوای یەکدا هاتوو دەبیستێت، ئەو دەنگە لەگەڵ یەکەم بیستندا جێگیر نابێت لە دەروونی دا، تا بە باشی لێی تێنەگات و ئینجا جێگیر دەبێت.

حیکمەت لەوەی زڕنگی زەنگەکە پێش سروش هاتنەکە دێت، ئەوەیە کە گوێچکەکان ئامادە بکات بۆ سروش و نیگا و هیچ شتێکی تر سەرقاڵی نەکات.

لە فەرموودەی ڕاست و دروستدا هاتووە هەروەك کەمێك پێشتریش خستمانەڕوو، کە ئەو جۆرو شێوازەی هاتنی سروش سەخترین و گرانترین جۆرەکانی سروش و نیگایە کە بۆی هاتووە.

وتراوە: تەنها ئەو کاتە بەو شێوەیە سروش بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەهات

کە ئایەتی هەڕەشە و پەیماندان بە سزا دادەبەزین[1].

پاش کەمێکی تر بەتایبەت لەبارەی باردۆخی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەکاتی سروشدا دەدوێین، بەڵام لە ژێر ناونیشانی (سروش شتێکە لە دەرەوەی دەروونە).

## چۆنیەتی سروش و شێوازی دابەزینەکەی بۆ سەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

زانینی چۆنیەتی سروش و نیگا، نهێنیەکە لەو نهێنیانەی کە عەقڵ ناتوانێ پەیی بە چۆنیەتیەکەی ببات، فریشتەش لە خوای گەورەوە دەبیسێت، ئەوا بە پیت و دەنگ لێی نابیستێت، بەڵکو خوای گەورە زانیارییەکی پێویست بۆ بیسەر دروست دەکات، جا هەروەك چۆن فەرمایشتی خوای گەورە لە وتەی مرۆڤ ناچێت، ئەوا بەهەمان شێوە ئەو بیستنەش کە بۆ مرۆڤ دروستی دەکات ئەوا لە وەك بیستنی دەنگەکانی تر نییە[2].

بە دوو ڕێگە سروش (وحی) دادەبەزێت بۆ سەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم):

---

[1] الاتقان و زاد المعاد، هەردوو سەرچاوەکەی پێشوو، و إشارد الساري ١/٥٨ و شرح صحيح مسلم للنووي بهامش إرشاد الساري ٩/١٨٣.

فەرموودەی: هەندێ جار فریشتە لەشێوەی پیاوێك...تاد: صحيح االبخاري ١ كتاب بدء الوحي، ٢ باب، رقم ٢، بهذا اللفظ، عن عائيشة (رضي الله عنها). و ٥٩ كتاب بدء االخلق، ٦ باب ذكر الملائكة، رقم ٣٢١٥، عن عائيشة (رضي الله عنها). وصحيح مسلم ٤٣ كتاب الفضائل، ٢٣ باب عرق النبي (صلى الله عليه وسلم) في البرد وحين يأتيه الوحي، رقم ٢٣٣٣، عن عائشة (رضي الله عنها).

فەرموودەی: کاتێك ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بووین لە ڕۆژێك لە ڕۆژەکان... تاد: صحيح مسلم ١ كتاب الإيمان، أول باب الإيمان والإسلام والإحسان...، رقم ٨، عن عمر بن خطاب (رضي الله عنه).

فەرموودەی:هەندێ جار سروشم بۆ دێت وەك زرنگ و هوڕی زەنگ... تاد: ئەم فەرموودەیە پێشتر خرایەڕوو و لەوێ ئاماژە بە سەرچانی کراوە.

[2] إرشاد الساري ١/٥٩.

یەکەم: پێغەمبەر لە وێنەی مرۆیی خۆی چۆتەدەر بۆ سەر وێنەی فریشتە، بەو شێوەیە سروشەکەی لە جبریل وەرگرتووە.

دووەم: فریشتەکە هاتۆتە سەر وێنەی مرۆڤ تا پێغەمبەر لێی وەربگرێت[1].

لە هەردوو حاڵەتدا سەختی و قورسییەکی زۆر هەیە بۆ سەر سروشتی مرۆیی، بۆیە لە کاتی سروش دابەزیندا، پێغەمبەر دەچووە حاڵەتی ئامادە نەبوون (غیبة) و بەرۆح و هۆش و دەروون سەرقاڵی سروش وەرگرتن دەبوو و ئاگای لەلاشەکەی نەدەما و هەروەك ئاهو ناڵەی لێ بەرز دەبووەوە[2].

دەکرێ هۆش (بیر) ئەندێشەی تێکەڵ بوون و پەیوەندی پێغەمبەر لەگەڵ فریشتە بکات، هەروەك چۆن هۆش (بیر)ئەندێشەی بوونی خەواندنی موگناتیسی دەکات، کە (د. مسمر)ی ئەڵمانی لە سەدەی هەژدەم ئاشکرای کرد، تەنانەت بەڵگەی وای لەسەر هێنایەوە کە زانایان بەشێوەیەکی زانستی دانیان پێداناوە، ئەمەش دوای ئەوەی هەزاران کەسیان تاقی کردەوەو ئێستا لە خۆرئاوا پشتیوانی زۆری هەن، خول و کتێب و نەخۆشخانەی تایبەت بەمە هەن کە خەڵکی بۆ چارەسەر رووی تێدەکەن.

لە نواندنی موگناتیسی دا مامۆستا خەوێنەرەکە بە ڕێنماییەکانی بەسەر نێوەندگیر (وسیط)دا زاڵ دەبێت، جا ڕوولێنەرەکە دەچێتە خەوێکی قوڵەوە، چی بیەوێت پرساری لەبارەیەوە لێ دەکات و وەڵامی ڕاستەوخۆی دەست دەکەوێت، هەروەها دەکرێ فەرمانی پێبکات بەکردن یان نەکردنی شتێك، جا نێوەندگیرەکە جێبەجێ دەکات ئەگەر دوای بەهۆش هاتنەوەش بێت. و پێویستە لە نێوان هەردوو کەسەکە (واتە مامۆستاکە و

[1] الاتقان ١١٨، الوحي المحمدي ٨٣ وتەی ئیبن خەلدونیشی تێدایە، إرشاد الساري ٥٩/١، سبل الهدى ةالرشاد ٣٤٢/٢.

[2] إرشاد الساري ٦٠/١.

نێوەندگیرەکە)[1] کە سروشتیان جیاوازە یەکێکیان بەهێزتر بێت لەوەی تر، مرۆڤ ناتوانێت ئەو ئەزموونە بەخۆی لەسەر خودی خۆی جێبەجێ بکات.

نواندنی موگناتیسی وا دەکات کە تێگەیشتن لە چۆنیەتی سروش ئاسان تر بێت، لەبەر ئەوەی پەیوەندی کردنی فریشتە بە پێغەمبەر، کاریگەری خۆی هەیە، لەبەر بوونی ئامادەباشی تایبەت تیایاندا، جا فریشتە هێزی پێدان و کارتێکردنی هەیە، چونکە رۆحانی رووت و پوختە، پێغەمبەریش ئامادەباشی وەرگرتنی هەیە لەو فریشتەیە، لەبەر پاك و پوخت بوونی لایەنی رۆحی و دەروونیەکەی و لەبەر ئەوەی پاکیەکەی گونجاوە لەگەڵ پاکی فریشتەکە، کاتێکیش فریشتەکە زاڵ دەبێت بەسەر دەروون و هۆشی پێغەمبەردا، ئەوا پێغەمبەر لە حاڵەتی سروشتی خۆی دەردەچێت و نیشانەکانی لەسەر رووی دەردەکەون و سروش و نیگاکە لە فریشتەکە وەردەگرێت و ئەوەی وەریگرتووە لە دڵیدا جێگیر دەبێت و کاتێ حاڵەتەکە کۆتایی هات، ئەوا دەبینێت کە بەتەواوی سروشەکە لەسەر رووی دڵی نەقشاوەو لەبیری ناکات[2].

پاشان ئێمە شتێك نابینین کە ببێتە هۆی نەبوونی پەیوەندی نێوان فریشتە و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، بە بەڵگەی ئەوەی:

زانستی سەردەم هەندێ ئامێری بۆ ئێمە فەراهەم کردووە، بەهۆیانەوە پەیی بەو شتانە دەبەین، کە پێشتر پەیی پێنەبراو و نەناسراو بوون. هەروەك ئامێر هەیە کە پێکدادانی تیشکەکانی بوونەوەری لە بۆشایی ئاسماندا تۆمار کردووە، هەندێك ئامێریش هەیە کە دەنگی مێشی فڕیو تۆمار دەکات، لە دووری چەند میلێك و هەروەك ئەوەی لەلای گوێچکەی تۆ دەفڕێت، ئینجا بەهۆی ئەو ئامێرە پێشکەوتووە سەردەمیانە، دەتوانرێت

---

[1] وەرگێڕ.

[2] مناهل العرفان ١/٥٩-٦٠، چەندین نمونەی تێدایە لەسەر ئەزموونی نواندنی موگناتیسی، و النبأ العظیم ٧٥-٧٦.

درك و پەیی ببرێت بەوەی کە ئێمە ناتوانین بە ڕێگە ئاساییەکان و نەریتییەکانی خۆمان بیبیستین.

هەروەها ئەم هێزە نا ئاساییەی بیستن، تەنها تایبەت نییە بە ئامێرە زانستییە هاوچەرخەکان، بەڵکو خوای گەورە بە هەندێ لە گیانلەبەرانی بەخشیوە:

بۆ نمونە سەگ دەتوانێت، بۆنی ئەو گیانلەبەرە بکات. کە بەڕێگادا تێپەڕبووە، ئەو هەستەی سەگ دەقۆزرێتەوە بۆ دۆزینەوەی تاوانباران، بۆ نمونە: ئەو قوفڵەی کە تاوانبار شکاندوویەتی، ئەوا ئەو سەگەی ڕاهێنانی پێکراوە بۆنی دەکات و دواتر شوێنەوارەکانی دەپشکێنێت و تاوانبارەکە لە نێوان هەزاران کەسدا دەدۆزێتەوە.

ئەگەر جانەوەری مۆرانەی باڵدارت لەسەر پەنجەرە دانا ئەوا دەنگێك دەنێرێت کە خێزانەکەی لە ئەندازەیەکی دوورەوە گوێبیستی دەبێت و ئەویش بە ڕێگەیەکی تایبەت وەڵامی دەداتەوە.

کولله مەشکە (جندب) باڵ و پێیەکانی لێك دەخشێنێت و بە ڕێگەیەکی نا ئاسایی دەنگ دەردەکات و ئەو دەنگە لە دووری نیو میلدەبیسترێت.

هەروەها کوللەی سەوز (أبي النطيط) توانایەکی نائاسایی هەیە، دەتوانێت شت ببیستێت و هەست بەو جوڵە و کارلێکە بکات کە لە نیو گەردیلەی هایدرۆجین ڕوودەدات...

چەندین نمونەی زۆر هەن، بەڵگەن لەسەر ئەوەی چەند ڕێگە و هۆکاری تری نابینراو هەن کە خاوەن هەستە تایبەتەکان هەیانە، جا ئەگەر ئەمە وابێت، ئەوا هیچ نامۆیی لەوەدا نییە پێغەمبەر بانگەشەی ئەوە بکات، کە دەنگێك لە خوای گەورەوە دەبیستێت خەڵکی نایبیستن، مادەم چەندین دەنگ و جوڵە هەبن لەو بوونەوەرەدا کە مرۆڤ

نابیبستێت، کەچی ئامێرەکان تۆماری دەکەن، هەروەها مادەم هەندێ دەنگ و پەیام هەبن کە هەندێ گیانلەبەر بیبیستن و هەندێکی تر نەیبیستن[1].

## سروش شتێکە لە دەرەوەی دەروونە

باوەڕ بوون بە سروش بناغەی باوەڕ بوونە بە پێغەمبەرایەتی، کە ئەمەش تاکە ڕێگایە کە بیروباوەڕو حوکمە شەرعیەکان و جگەلەوانیشی پێدا هاتووە.

بۆیە زۆرێك لە دوژمنانی ئیسلام زۆر گرنگیان بە وروژاندنی گومان داوە دەربارەی سروش وەك لاسایی کردنەوەی بێ باوەڕە نەزان و نەفامەکانی قورەیش، گێل و گەلحۆکانی هاوبەشدانەران چەندین قسەو قسەلۆکی هەڵبەستراویان دەوروژاند بەمەبەستی لەکەدار کردنی پێغەمبەری مەزن (صلى الله عليه وسلم)، ئەمەش بەوەی کە وتیان: جادوگەرە یان شێتە یاخود شاعیرە.

تەنانەت هەندێ لە ڕۆژهەڵاتناسەکان[2] و جگەلەوانیش وتیان: سروش تەنها بریتیە لە گوفتارو خورپەو ئیلهاماتی دەروون.

**بەڵام ئێمە بڕوامان وایە کە:** سروش بریتی نییە لە تێگەیشتن و بەرهەمی هەستکردنی ناوەوەو ئاماژەکانی دەروون و سیماناسی خێرا (فراسة)، کە زۆربەی جارەکان بە مەشق و ڕاهێنانی ڕۆحی و بیرکردنەوەی بەردەوام کاریگەر دەبێت، واتە: بریتی نییە لە نیگای دەروونی، کە بریتییە لەو خورپە و ئیلهامانەی کە بەسەر خاوەنەکەیدا دادەڕژێنەوە، لەکاتی ئامادەباشی بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی دەروون و ئاماژەو نهێنیە دەرکەوتووەکانی[3].

لەبەرئەوەی بە نیگای دەروونی زانیاری تەواو و دڵنیایی کامڵ ناهێتە کایە، گومانیش لەوەدا نییە کە مرۆڤ بەو چەندحاڵەتە دەروونیانەی ناگاتە پلەی پێغەمبەرایەتی.

---

[1] الاسلام يتحدّى ٩٦-٩٧.

[2] سەیری: تأريخ الأدب العربي لبروكلمان ١٣٤/١. بکە.

[3] الكلام عن الوحي النفسي في : الوحي المحمدي ٦٦.

بەڵکو سروش بریتییە لە (شتێکی لەناکاو و بەدەر لە سروشتی مرۆیی)[1]، بەدەرە لە نەفس و دەروون و ملکەچی هیچ کاریگەریەك نابێت کە بەسەریدا دێت، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەلایەن زاتی خوای گەورەوە وەری دەگرێت، لە ڕێگەی ئەو فریشتەیەی کە بەوکارە ڕاسپێرراوە.

هەر کەسێکیش وردبین بێت لە بیرکردنەوە لە چۆنیەتی سروش و دیاردەو نیشانەکانی و ئەو دیاردانەی کە بەسەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دا دێن، بەهۆی سروشەوە، پەیی بەوەدەبات،کە سروش پەیوەست نییە بەهەواو ئارەزووی دروون و نەفس.

ئەمەش لەو شتانەی خوارەوەدا دەر دەکەوێت[2]:

١- کاتێك جبریل هاتە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ئەشکەوتی (حیراء) و فەرمانی پێکرد کە بخوێنێتەوە - کەچی ئەو نەخوێندەوار بوو - هەروەك لە (صەحیحی بوخاری)دا لە (باب: كيف كان بدء الوحي الى رسول الله (صلى الله عليه وسلم)) هاتووە، کە جبریل پێی وتووە: بخوێنە[3]، فەرمووی: من خوێندەوار نیم،

---

[1] إرشاد الساري ١/٦٠.

[2] سەیری ئەمانە بکە: الوحي المحمدي ٨٩ ولاپەڕەکانی دواتر، مناهل العرفان ١/٥٦ ولاپەڕەکانی دواتر و ٢/٢٨٥ و لاپەڕەکانی دواتر، النبأ العظيم ٢٠ ولاپەڕەکانی دواتر، الظاهرة القرآنية ١٦٥ ولاپەڕەکانی دواتر، مباحث في علوم القرآن ٢٢ ولاپەڕەکانی دواتر، كبرى اليقينيات الكونية ١٩٨ ولاپەڕەکانی دواتر، الرسول لسعيد حوى ٢/١٣ ولاپەڕەکانی دواتر.

[3] فەرمانی خوێندنەکە فەرمانی پێکهێنانە (تكوين)یە نەك فەرمانی ڕاسپاردن و ئەرکداری (تكليف)ی بێت، واتاکەی بریتیە لەوەی: ببە بە خوێنەر، بۆیە لە کەرەتی سێیەمدا وتی: ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ﴾ العلق: ١. واتە: ببە خوێنەر بەناوی خواو بەویستی خوا و بەوەی خوای گەورە یارمەتیت دەدات، نەك بەخۆت و تواناکەت، چونکە دەزانێت کە نەخوێندەواریت، بەڵام خوای گەورە ویستی مرۆڤ لە پارچە گۆشتێك بەدیبێنێت و ئامرازی بینین و بیستنی پێ ببەخشێت، بەهەمان شێوە خوای گەورە ویستویەتی ببیتە خوێنەری ئەو پەیامەی لە ڕێگەی سروش بۆت دەنێرێت تا بەسەر خەڵکیدا بخوێنیتەوە، بەم جۆرە دەبیتە خوێنەر./ الوحي المحمدي هامش ٨٥.

پێغەمبەر دەفەرمووێ (جبریل[1]) منــی گرت و توند بەخۆیەوە گوشیم هەتا ئــازارم پێگەیشــت و لەدواییــدا بەریــدام، دووبــارە وتــی: بخوێنــە، منــیش دووبــارە وتم: خوێندەوار نیم، بۆ جــاری دووەم بەخۆیــەوە گوشــیم تــا ئــازارم پێگەیشــت ئینجــا بەریدام، سێبارە پێی وتم: بخوێنە، منــیش وتم خوێنــدەوار نــیم، بــۆ جــاری ســێیەم بەخۆیەوە گوشیم، ئینجــا وتــی: ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ ﴿٣﴾﴾ العلق: ١-٣. واتە: ("ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)" بخوێنــە بــەناوی ئــەو پەروەردگارەتــەوە کــە هــەموو شــتێکی دروســت کــردووە. ئادەمیزادی لە چەند خانەیەکی هەڵواسراو - لەناو منداڵدانــدا - دروســت کــردوە. بخوێنە، لەکاتێکدا هەر پەروەردگاری تۆ بەخشندەیە).

پێغەمبەر ئەو چەند ئایەتانەی لەگەڵ خۆ بردنەوە، دڵیشی زۆر بــە خێرایــی لــێ دەدا و دەچێتەوە بۆ لای (خەدیجەی کچی خوەلیــد) - ڕەزای خــوای لــێ بێــت - و دەفــەرمووێ: دامپۆشن، دامپۆشن، دایدەپۆشن، تا ئەو ترسەی لــێ دەڕەوێتــەوە، دوایــی هەواڵەکــە بــۆ خەدیجە باس دەکات، دەفەرمووێ (**لقد خشيت على نفسي**) واتە: لە خۆم ترسام.

لە گێڕانەوەیەکی تردا هــاتووە: (**فَجَئِثْــتُ منــه رُعْبــاً**) واتــە: (زۆر لێــی ترســام). لــە گێڕانەوەیەکی تردا: (**فَجُئِثْتُ منه هويت الى الأرض**). واتە: (زۆر لێی ترسام و بــە زەویــدا کەوتم).

بۆیە خەدیجەی خێزانی هیچ هۆکارێکی دەست نەکەوت تا پێغەمبــەر دڵنیــا بکاتــەوەو خۆیشی لێی دڵنیا بێت، تەنها ئەوە نەبێت کە بیباتە لای شــارەزاترین کــەس لــەوبوارەدا لەناو عەرەبەکان و ڕاوێژی پێ پێبکات، ئــەویش ئــامۆزای بــوو، نــاوی (وەرەقــەی کــوڕی نەوفل) بــوو، کــە کتێبــەکانی جولەکــە و نەصــڕانیەکانی خوێندووەتــەوەو تێگەیشــتووەو

بۆیە جبریل پێغەمبەری گوشی تا سەرنجی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە کاروباری دونیا لابدات و بیخاتە سەر ئەو پەیامەی پێی دەدرێت، بۆیە سێ جار پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دووبارەی کردۆتەوە چونکە بۆ پیشاندانی زۆری ئەو حاڵەتەیە./ إرشاد الساري ٦٣/١.

[1] وەرگێڕ.

لەبەری کردووە، ئەو دڵنیای کردنەوەو وتی: (هـذا النـاموس الـذي نـزل الله علـى موسـى) واتە: ئەوە ئەو فریشتەیە کە خوا ناردوویەتی بۆ لای موسا (سەلامی خوای لێبێت).

دوای ئەمە ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە: کاتێك (جبریل) پێغەمبەری لـە بـاوەش گرتـووەو بەتووندی گوشیویەتی و سێ جار فەرمانی پێکردووە بخوێنێت، ئەمە جەخت لەسـەر ئـەوە دەکاتەوە سروش وەرگرتنی شتێکی دەرەکی بـووە نـەك دەروونـی یـاخود خـەیاڵی، بۆیـە پێغەمبەر وای بۆچوو کە (جبریل) ئازاری پـێ گەیانـدووە، لەبـەر ئەمـە خێـرا چـووە لای خەدیجە تا ڕووداو و ترس و لەرزەکەی پێ ڕابگەیـەنێت، جـا لـە ترسـان دڵـی دەلـەرزی و لەخۆی دەترسا کە بمرێت. لەبـەر ئـەو شـتە مەترسـیدارەی بینیویـەتی، بۆیـە فـەرمووی: **(زملوني زملوني)** واتە: دامپۆشن و بم پێچن. پەنای بۆ خۆ پێچان و خۆپۆشین بــرد، تـا ئارام و ئاسوودە بێت، بۆیە دایان پۆشی تا ترس و لەرزەکەی لێ نەما.

ئینجا دوای تێپەڕ بوونی ماوەیەك دووبارە سروش بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دادەبزێت و فەرمانی پێ دەکات: ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ ۝ قُمْ فَأَنذِرْ ۝﴾ المدثر: ١-٢. واتـە: (ئـەی ئەو کەسەی خۆت پێچاوەتەوە، ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)، هەسـتە و خـەڵکی بێدار بکەرەوە). پێغەمبەری خـوا لـەو فەرمانـەی کـە پێیکـراوە ورد دەبێتـەوەو بەسـەر سوڕمانیەوە بە خەدیجە دەڵێت: **(لقد أمرني جبريل أن أُنذر الناس، فمَن ذا أدعـو، ومَـن ذا يستجيب؟)** واتە: (جبریل فەرمانی پێکردووم کە خەڵکی ئاگادار بکەوە، جـا بـانگی کـێ بکەم و کێ ئاگادار بکەمەوە، دەبێ کێ وەڵامم بداتەوە).

ئەمانـە بەڵگـەن لەسـەر ئـەوەی سـروش شـتێکی دەرەکییـە و لـە نـاخ و دەروونـی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سەرچاوەی نەگرتووە، بەڵکو سروش لـە خـواوە لـە ڕێگـەی جبریلەوە بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هاتووە.

٢- ئەو دیاردانەی بەسەر پێغەمبەردا دەهاتن لەو کاتەی سروشی بۆ دەهات، گـەواهی ئەوە دەدات کەسروش سەرچاوەی نەگرتووە لە قسەوباسی دەروون، وەك:

أ- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زرنگ و دەنگێکی توندی بەگوێدا دەهات، وەك دەنگی زەنگی یەك لەدوای یەکی تووندو تیژ. پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: **(أحياناً يأتيني مثل صلصلة الجَرَس، و هو أشَدُّه عليّ، فيفصم عني، و قد وعيت عنه ما قال)**[1] واتە: هەندێ جار سروشم بۆ دێت وەك زرنگ و هوڕی زەنگ، دواتر ئەم دەنگە زرنگە کۆتایی دێت و منیش دوای کۆتایی هاتنی لە قسەکانی تێگەیشتم.

ب- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کاتێك سروشی بۆ دەهات لە ڕۆژی زۆر ساردو سوڕدا هەموو جەستەی دەبووە ئارەقە:

عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: (پێغەمبەرم بینیوە کە لە ڕۆژێکی زۆر سارد دا سرووشی بۆ دابەزیوە، دواتر کە سروشەکە تەواو بووە، ئارەقە لە ڕووخساری دەهاتە خوارەوە)[2].

---

[1] فەرموودەی: هەندێ جار سروشم بۆ دێت وەك زرنگ و هوڕی زەنگ، کەمێك پێشتر خرایەڕوو.
لە (مسند أحمد ٢٢٢/٢) هاتووە:(عەبدوڵای کوڕی عەمر (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: پرسیارم کرد لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە: ئایا هەست بە سروش (وحی) دەکەیت؟ فەرمووی: (نعم أسمع صلاصل، ثم أسكت عن ذلك، فما من مرة يُوحى الي،إلا ظننت أن نفسي تفيض) واتە: (بەڵێ، گوێم لە زرینگ و هوڕەو دەنگی بەهێز دەبێت، منیش لەم حاڵەتە بێ دەنگ ئەبم، هەر جارێکیش کە سروشم بۆ دێت ئەوا هەست دەکەم کە دەروونم پەرش و بڵاو دەبێت).

[2] فەرموودەی: پێغەمبەرم بینوە سروشی بۆ هاتووە... تاد، صحيح البخاري، كتاب بدء الوحي، ٢ باب، رقم ٢.

لە صەحیحی موسلیم: ٤٣ كتاب الفضائل، ٢٣ باب باب عرق النبي في البرد حين يأتيه الوحي، رقم ٢٣٣٣، لە عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) هاتووە کە وتویەتی: (لە بەرەبەیانی زۆر سارد دا سروش بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هاتووە، دوای تەواو بوونی ڕووخساری ئارەقی لێ دەچۆڕا). لە: صحيح مسلم، كتاب التوبة، ١٠ باب في حديث الإفك...، ٢٧٧٠، لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێت) هاتووە: (تاوەکو خوا سروشی نارده سەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەو ترس و لەرزەی کە لە کاتی دابەزینی سروش دایدەگرت لەوێشدا دایگرت، بە ئەندازەیەك وەك وردە مرواری ئارەقەی لێدەچۆڕا، لە ڕۆژی سەرماو سۆڵەی زستانە، لە قورسایی و سەختی ئەو وشەیەی دادەبەزیە سەری). وهو في صحيح البخاري: ٥٢ كتاب الشهادات، ١٥ باب تعديل النساء

پ- پێغەمبەر سەری دادەکەوت و ڕووخساری ڕەش هەڵدەگەڕا:

عوبادەی کوڕی صامت وتویەتی: (ئەگەر سروش بهاتایە بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەوا بەمە ئازار دایدەگرت و ڕووخساریشی ڕەش هەڵدەگەڕا)[1].

بۆیە بەهۆی ئەو ئازارەی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دووچاری دەبووەوە لەکاتی سروش دا، ئەوا ڕووخساری بە جلێك دادەپۆشی و سەرئێشەی دەگرت، ئاهو ناڵەی لێدەهات بەهۆی سەختی سروشەوە

لە یەعلای کوڕی ئومەیە هاتووە: کە پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کاتێك لە (جعرانـة) بوو، کەوا (جوبە)یەکی لەسەر شان بوو بۆنێکی خۆشی لێ دەهات یان وتی: مەیلەو زەرد بوو، جا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا فەرمانم پێدەکەی چی بکەم لە عومرەکەمدا؟ جا سروش دابەزی بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و بە جلێك پێغەمبەر داپۆشرا، منیش زۆرم پێ خۆش بوو کە پێغەمبەرم (صلى الله عليه وسلم) بینیبوایە لەو حاڵەتەی سروشی بۆ دەهات، عومەر وتی: ئایا پێت خۆشە سەیری پێغەمبەر بکەیت لەو حاڵەتەی سروشی بۆ دێت؟ وتم: بەڵێ. جا عومەر لایەکی جلەکەی هەڵدایەوەو منیش تەماشام کرد، پێغەمبەر دەنگێگی لێدەهات جا پێم وابوو وتی: وەك (پرخەی وشتری لاو). جا کاتێك سروشەکە تەواو بوو و حاڵەتەکە کۆتایی هات، فەرمووی: (أين السائل

---

بعضهن بعضا، رقم ٢٦٦١، عن عائشة. وفي ٦٤ كتاب الغازي، ٣٤ باب حديث الإفك، رقم ٤١٤١، عن عائشة. و في ٦٥ كتاب التفسير - سورة النور، ٦ باب ﴿وَلَوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُم﴾ النور: ١٦، رقم ٤٧٥٠، عن عائشة.

[1] فەرموودەی: ئەگەر سروش بهاتایە بۆ پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)... تا: صحيح مسلم ٤٣ كتاب الفضائل، ٢٣ باب عرق النبي(صلى الله عليه وسلم) في البرد...، رقم ٢٣٣٤.

لە گێڕانەوەیەکی تردا لە (عوبادەی کوڕی صامتەوە) هاتووە: (کە سروش دەهات بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەوا سەری دادەگرت و هاوەڵانیش سەریان دادەگرت، جا کە سروش کۆتایی دەهات سەری بەرز دەکردەوە).

**عن العمرة؟ اخلع عنك الجبة، واغسل أثر الخَلوف عنك، وأنقِ الصفرة، واصنع في عمرتك كما تصنع في حجك)** واتە: (ئەوەی پرسیاری لەبارەی عومرەکرد لە کوێیە؟ ئەو کەوا (جبە)یـە داکەنە، بۆن و ڕەنگەکە لابەرە، چیت کرد لە کاتی حەج کردنتدا، هەمان شتیش بکـە لـە عومرەکەتدا)[1].

ت- هاوەڵان دەنگێکی توونـدیان لـە ڕووخسـاری پێغەمبـەرەوە دەبیسـت، لـەکاتی سروش دابەزیندا، وەك: دەنگی هەنگ کـاتێ لەلانەکـەی دەردەچـێت. عومـەری کوڕی خەتتاب (خـوا لێـی ڕازی بێـت) وتویـەتی: (کاتێـك سـروش دەهـات بـۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، دەنگێکی وەك دەنگی هـەنگی بیسـتووە لـەلای ڕووخساری پێغەمبەر)[2].

ج- جەستەی پێغەمبەر لەکاتی سروش هاتن، قورستر دەبوو:

لە صـەحیحی بوخاریـدا لـە ئـیبن عەبباسـەوە (خـوا لێـی ڕازی بێـت) هـاتووە: (پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) جەستەی قـورس دەبـوو بـەهۆی ئـەو سروشـەی بەسەریدا دادەبەزی)

ئەم فەرموودەیە بە تەواوی پاش کەمێکی تر دەخرێتەڕوو.

لە کتێبی (زاد المعاد) دا هاتووە: باس لە حاڵەتی دابەزینی سروش بۆ سـەر پێغەمبـەر (صلی الله علیه وسلم) دەکات: (هەتا ئەگەر پێغەمبەر (صلی الله علیـه وسـلم) لەسـەر پشـتی وڵاخی سواریەکەی بووبا، لـەکاتێك کـە سروشـی بـۆ دەهـات، ئـەوا وڵاخەکـە بەچـۆکدا دەکەوت، بەهۆی ئەو سروشە موبارەکەی کە دادەبەزی بـۆ پێغەمبـەر، تەنانـەت جارێـك سروش بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هات و ڕانی موبـارەکی لەسـەر ڕانـی "زەیـدی

[1] فەرموودەی: یعلای کوڕی ئومەییە: پیاوێك... تاد: صحیح البخاري: ٢٦، کتاب العمرة، باب یفعل في العمرة ما یفعل في الحج، رقم ١٧٨٩.

[2] فەرموودەی عمری کوڕی خەتتاب: کاتێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)... تاد: صحیح الترمذي: باب التفسیر من سورة المؤمنون.

كوڕی ثابت" بوو جا ڕانی پێغەمبەر قوڕسایی زیاد كرد بەهۆی سروش هاتن، تەنانەت زۆر نەمابوو ڕانی زەید بهاڕێت)[1].

ئەمەش ڕاستێتی ئەو فەرمایشتەی خوای گـەورە پشـت ڕاسـت دەكاتـەوە: ﴿إِنَّا سَنُلْقِي عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا﴾ الزمل: ٥. واتە: (ئێمە فەرمووده و گوفتارێكی سـەنگین دادەبەزێنینـە سەرت).

تەنها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) توانای بەرگە گرتنی ئەو قوڕسـاییەی هەیـە، تـا جەستەكەی لێڕابێت و ئامادە ببێت بۆ هەڵگرتنی ئەركی پێغەمبەرایەتی.

هەموو ئەو دیاردانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە سـروش شـتێكی سەربەخـۆو جیایـە و بەشێك نییە لە دەروونی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، چونكە قسەی دەروون و ئیلهام و خورپە و تێڕوانین پێویست بەو هەموو دیاردانە ناكات لەوەی كەسەكە تووشی: ئێش و ناڵە ناڵ و ڕەش هەڵگەڕانی ڕووخسارو ئارەقە جەستەی دابپۆشێت لە ڕۆژێكی زۆر سارد دا...

٣- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هۆشیاری تەواو و لە بـەركردنێكی ڕێـك و پێـك و تۆكمەی هەبوو، بۆ ئەو شتانەی بە سروش بۆی دادەبـەزین، چ لـە كـاتی دابـەزینی سروش و چ لە دوای دابەزین.

جبریل ساڵێ جارێك قورئانی بەسەر پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) دەخوێنـدەوە، ئەمـە ناچـێتە نـاو چوارچـێوەی ئـارەزووەوە و بـەهیچ شـێوەیەك بـە بەشـێك لـە ئیلهاماتی دەروون دانانرێت.

[1] زاد المعاد ١٨/١.

حديث الرض في صحيح البخاري في ٥٦ كتاب الجهاد والسير، ٣١ باب قوله تعالى: ﴿لَّا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ﴾ النساء: ٩٥، رقم ٢٨٣٢، عن سهل بن سعد الساعدي. و ٦٥ كتاب التفسير، ١٨ باب ﴿لَّا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ﴾ النساء: ٩٥. رقم ٤٥٩٢، عن سهل بن سعد الساعدي.
سەیری: إرشاد الساري ٦١/٥. بكە.

لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێت: **(أحياناً يأتيني مثل صلصلة الجرَس، و هو أشَدُّه عليّ، فيفصم عني، و قد وعيت عنه ما قال، وأحياناً يتمثل لي الملك رجلاً، فيكلمني، فأعي مايقول)** واتە: هەندێ جار سروشم بۆ دێت وەك زرنگ و هوڕی زەنگ، دواتر ئەم دەنگە زرنگە کۆتایی دێت و منیش دوای کۆتایی هاتنی لە قسەکانی تێ ئەگەیشتم، هەندێ جاریش فریشتەکە لە شێوەی پیاوێك دێتە لام و قسەم لەگەڵ دەکات و منیش لێی تێدەگەم. پێشتر ئەم فەرموودەیە خرایەڕوو.

جا لە هەر دوو ئەو حاڵەتانەی کە لە فەرموودەکەدا خرانەڕوو، پێغەمبەر بە تەواوی هۆشیاریەوە تێدەگەیشت لەو پەیامەی کە بە سروش بۆی دەهات.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە سەرەتادا کە سروشی بۆ دەهات جوڵەی بە زمانی دەکرد و لاسایی جبریلی دەکردەوە لە کاتی سروش خوێندنەوەدا، جا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەترسی ئەوەی نەوەك لەبیری بچێتەوە ئەوەی دەکرد، بەڵام خوای گەورە پێغەمبەرەکەی دڵنیا کردەوە بەوەی خەمی لە بەرکردنەکەی نەبێت بەڵکو خوای گەورە سروشەکە لە دڵیدا جێگیرو پارێزاو دەکات و هیچ پێویست بە زمان جوڵاندن ناکات، خوای پاك و بەرز دەفەرمووێت: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾﴾ القيامة: ١٦ - ١٩.[1] واتە: (پەلە

---

[1] خوای بێ وێنە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَعْجَلْ بِٱلْقُرْءَانِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰٓ إِلَيْكَ وَحْيُهُۥ ۖ وَقُل رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا﴾ طه: ١١٤. واتە: ("ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم)" نەکەیت لە خوێندنەوەی قورئاندا پەلە بکەیت" لە پێش ئەوەی وەحی و نیگای ئەو قورئانە تەواو ببێت بۆ لای تۆ "چونکە ئێمە نایەڵین فەرامۆشی بکەیت" نزا بکە و بڵێ: پەروەردگارا، بەردەوام زانست و زانیاری زۆرترو زیاترم پێ ببەخشە).

لە صەحیح البخاری - بەشی سەرتای سروشدا: لە سەعیدی کوڕی جوبەیر لە ئیبن عەبباسەوە هاتووە: لەبارەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ﴾ القيامە: ١٦. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تووشی گرانی و سەختی دەبوو، بەهۆی قورسی قورئان کە بۆی دادەبەزی و لێوە موبارەکەکانی بەم هۆیەوە دەجوڵاند، ئیبن عەبباس وتی: منیش لێوەکانم ئەجوڵێنم وەك چۆن پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەیجوڵاندن. و سەعید وتی: منیش لێوەکانم

مەکە و زمانت مەجولێنە، بۆ ئەوەی پەلە بکەیت لە وەرگرتنیدا. بەڕاستی لەسەر ئێمەیە کۆکردنەوەو خوێندنەوەی. جا کاتێك ئێمە دەیخوێنینەوە تۆش شوێنمان بکەوە لە خوێندنەوەیدا. پاشان بەڕاستی ڕوون کردنەوەشی لەسەر ئێمەیە).

---

دەجولێنم وەك چۆن ئیبن عەبباس لێوەکانی دەجولاند، دەڵێت جا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لێوەکانی دەجولاند بەم هۆیە خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاند: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾﴾ القيامة: ١٦-١٧. وتی - واتە: (ئیبن عەبباس -: واتە لە سینەی تۆدا کۆ دەکرێتەوە، ئینجا بیخوێنەوە. ﴿فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ﴾ واتە: بێ دەنگ بە و گوێی بۆ بگرە. ﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ﴾ القيامة: ١٩. دواتر لەسەر ئێمەیە کە بیخوێنینەوە. جا دوای ئەوە ئەگەر جبریلی هاتیویا لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەوا پێغەمبەر تەنها گوێی ئەگرت، جا کە جبریل دەردەچوو، ئەوا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەیخوێندەوە وەك چۆن جبریل بۆی خوێندبوویەوە.

وهو في صحيح مسلم ٤ كتاب الصلاة ٣٢ باب الإستماع للقراءة رقم ٤٤٨ عن سعيد بن جبير عن إبن عباس.

لەبەر ئەمە جبریل (سڵاوی خوای لێبێت) لە هەموو شەوێك لە مانگی ڕەمەزاندا، دەهاتە لای پێغەمبەر و قورئانی پێ ئەوت. لە (صحيح البخاري - كتاب الفضائل القرآن - باب: كان الجبريل يعرض القرآن على النبي (صلی الله علیه وسلم)) لە عائیشەوە ئەویش لە فاتیمە (سڵاوی خوای لێبێت) هاتووە: (پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەنهێنی پێی وتم کە جبریل ساڵێ یەکجار قورئانی بەسەردا مندا ئەخوێندەوە، بەڵام ئەم ساڵ دوو جار قورئانی بەسەردا منیدا خوێندۆتەوە، تەنها بۆ ئەوە ئەچم کە سەرمەرگم نزیك بۆتەوە).

ئیبن کەسیر وتویەتی: ئا بەم شێوەیە بوخاری بە هەڵواسراوی گێڕاویەتیەوە، لە چەند شوێنێکی تردا زنجیرەکەی بەتەواوی خستۆتەڕوو بەهەمان شێوە لە ئیبن عەبباسەوە (ژمارە ٤٩٩٧) وئەبو هورەیرە (٤٩٩٨) و ئەبو داود و نەسائی و ئیبن ماجە گێڕاویانەتەوە.

مەبەستی لەوەی کە هەموو ساڵێ جارێك قورئانی بەسەردا ئەخوێندەوە: بریتیە لە بەرامبەر کردنی لەگەڵ ئەوەی خوای گەورە بۆی ناردووە، تا ببێتە هۆکاری جێگیرو چەسپاوتر بوون و تا لەبیری نەکات. /انظر معارضة جبريل النبي بالقرآن (صلی الله علیه وسلم) في: فضائل القرآن لإبن كثير وهو ذيل تفسيره ٢٦-٢٧.

٤- پچڕان و دابڕانی سروش لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، کەچی گەلێك زۆر حەزی دەکرد سروشی بۆ بێت، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە سروش شتێکی جیاوازو بەدەرە لە دەروون و فیکر، لە زاتی موبارەکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) سەرچاوە ناگرێت و شتێك نییە ملکەچی ویستی ئەو بێت، بەڵکو تەنها کاتێك سروش دادەبزێت کە خوای گەورە ویستی لەسەر بێت بێ ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هیچ ڕۆڵێکی هەبێت، نمونەش لەسەر پچڕانی سروش:

أ- دوای ئەوە جبریل ئەم چەند ئایەتانەی دابەزاند: ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ...﴾ سورەتی: العلق. بۆ ماوەی سێ ساڵ سروش پچڕا، لە هەندێ فەرمایشتدا هاتووە بۆ ماوەی دوو ساڵ و نیو پچڕاوە[1]. بەم هۆیە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) زۆر خەمبار و دڵگران بوو، تەنانەت چەند جارێك هەوڵی دا خۆی لە لوتکەی کێوی بەرزدا فرێبداتە خوارەوە، هەروەك بخاری گێڕاویەتیەوە[2].

ب- سروش بۆ ماوەی یەك مانگ پچڕاوە، هەروەك لە (صحیح البخاري - باب حدیث الافك من کتاب الغازي) هاتووە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) زۆر پێی خۆشبوو سروشی بۆ بێتەوە، تا ئەو قەیرانە چارەسەر بکات، لە ڕووداوی

(١) إرشاد الساري ٦٧/١.

(٢) لە (صحيح البخاري ٩١ كتاب التعبير ١ باب أول ما بديء به رسول الله من الوحي والرؤيا الصالحة، رقم ٦٩٨٢) هاتووە، عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) گێڕاویەتیەوە: (بەشێوەیەك سروش و نیگا پچڕا - بەو شێوەیەی پێمان گەیشتووە - پێغەمبەر زۆر پێی دڵ گران بوو، بەشێوەیەك کە پێغەمبەر چەندین جار هەوڵی دا خۆی لە لوتکەی کێوە بەرزەکان فرێبدایە خوارەوە، جا کە هەر لە لوتکەی کێوەکە نزیك دەکەوتەوە بۆ ئەوەی خۆ تێ فرێبدات ئەوا جبریل ڕێگەی لێ دەگرت، دەیوت: ئەی محمد تۆ بەڕاستی پێغەمبەری خوای، جا بەمە دەروونی ئارامی دەگرت و دەگەڕایەوە ماڵەوە، بەڵام هەر کە ماوەی پچڕانی سروش زیاتر درێژ ئەبووەوە ئەوا هەمان هەوڵی پێشووی ئەدایەوە، جا کە دەگەیشتە لوتکەی کێوەکە ئەوا جبریل بۆی دەردەکەوت و ڕێگری لێ دەکرد و هەمان شتی پێ دەوت)/ سەیری: إرشاد الساري ١٢١/١٠. بکە.

(ئیفك)دا بەرپا بوو کە دووڕووەکان دایکی باوەڕداران عائیشەیان (خوا لێـی ڕازی بێت) تۆمەتبار کرد بە کاری خراپە، هەتا وای لێهات پێغەمبـەر (صـلی الله علیـه وسـلم) پێی فەرموو: (**یا عائشة، إنه بلغـني عنـك كـذا وكـذا، فـإن كنـتِ بريئـة فسيبرئك الله، وان كنتِ ألمتِ بذنبٍ فاستغفري الله**) واتە: ئـەی عائیشـە هـەواڵی ئاواو ئاوام پێگەیشتووە، جا ئەگەر تۆ بێ تاوان بیـت، ئـەوا خـوای گـەورە ئـەوە دەسـەلمێنێت و ڕای دەگەیـەنێت و ئەگـەر تـاوانێکیش ئەنجامـداوە ئـەوا داوای لێخۆش بوون بکە لە خوای گەورە. ئینجا دوای یەك مانگ پاش قسەو باسـێکی زۆری خـەڵکی ئـەم چـەند ئایەتـەی سـوڕەتی (النـور) دابـەزین: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ﴾ النور: ١١. دابەزین و پاکانە و بێ تاوانی ئەویان سـەلماند. هـەروەك لـە فەرموودەی باسکراودا هاتووە: (ماوەی یەك مانگ تێپەڕی هـیچ سروشـێکی بـۆ نەهات لەبارەی منەوە)[١].

جا کەسێك کە ورد بێتەوە وای دەبینێت کە ئەو مانگە درێژترە لە چـەندین سـاڵ کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تیایدایە چـاوەڕوانی هـاتنی سروشـی کـردووە لەگەڵ دوو دڵی و گومانێکی زۆرەوە، جا ئەگەر سروش شتێکی دەرەکـی نەبوایـە ئەوا هەر زوو پێغەمبەر (صـلی الله علیـه وسـلم) بانگەشـەی هـاتنی دەکـرد، هـەر لەوکاتەی کە هەواڵی ڕووداوەکە بڵاودەبووەو مەسەلەکەی یەکلایی دەکردەوە.

پ- سەرباری ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی خۆش بوو کە ڕووگە (قبلـة) بگۆڕێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا سـروش شـازدە یـاخود حەڤـدە مـانگ نەهاتـە خوارەوە. سەبارەت بە گۆڕانی ڕووگە لە (بیت المقدس) بـۆ (کەعبـە)، دوای ئـەو ماوەیـە سـروش دابـەزی: ﴿قَدۡ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجۡهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبۡلَةً

[١] فەرموودەی: ئەی عائیشە پێم گەیشتووە... تاد: صحيح البخاري ٦٤ كتاب المغزي باب حديث الإفك رقم ٤١٤١ عن عائشة (رضي الله عنها).

﴿تَرْضَىٰهَا ۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾ البقـرة: ١٤٤.[1] واتـە: ("ئـەی پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم)" بەڕاستی چاوگێڕان و هەڵسوڕانی ڕووخسارت ڕوو بە ئاسمان دەبینین، سوێند بەخوا ئێمەش رووت وەردەچەرخێنین بۆ ڕووگەیەك پێـی ڕازی خۆشنوود بیت، دە ڕووت وەربچەرخێنە بەرەو لای کەعبە "المسجد الحرام").

٥- لە هۆکارەکانی دابەزینی هەندێ ئایەتی قورئانی پـیرۆز، ئـەوەبوو کـە پێغەمبـەر (صلی اللە علیە وسلم) لە هەندێ کاتدا پرسیاری لێ دەکرا، کەچی هیچ وەڵامێکی پێ نەبوو، بۆیە بێ دەنگ دەبـوو، جـاری واهـەبوو بـێ دەنگیەکـەی ماوەیـەکی زۆری دەکێشا.

جا ئەگەر ئایەت لەو بارەیەوە دابەزیبووبا، ئـەوا بـانگی ئـەو کەسـەی دەکـرد کـە پرسیاری کردبوو، ئەو ئایەتەی بەسەردا دەخوێنـدەوە کـە لـە قورئانـدا دابـەزیوەو پەیوەندی بە پرسیارەکەیەوە هەیە.

هەندێ کات وابـووە کـە پێغەمبــەر (صلی اللە علیـە وسـلم) وەڵـامی پرسـیارەکەی دەدایەوە، کەچی سروش بە پێچەوانەی وەڵامەکەی ئەو وەڵامی دەدایەوە، تەنانـەت کەمێك ڕەخنە و گلەییشی لێ دەکرد.

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە سروش شتێکی دەرەکییە و پەیوەندی بە دەروونەوە نییە، چونکە ئەگەر سروش شتێکی دەروونی بووبا، ئەوا کاتێك پرسـیاری لێـدەکرا

[1] لە (صحيح الترمذي بشرح عارضة الأحوذي ٨٥/١١ باب التفسير) هاتووە: لە بەرائی کوڕی عازبەوە، وتویەتی: کاتێك پێغەمبەری خودا (صلی اللە علیە وسلم)کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە، بۆ ماوەی شازدە یان حەڤدە مانگ ڕوو دەکردە بەیتولمەقدیس لە نوێژەکانیدا، پێغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم)پێی خۆش بوو ڕوو بکاتە کەعبە، جا خوای گەورەم ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ ۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا ۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾ البقرة: ١٤٤. بۆیە پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) دوای هاتنی ئەم ئایەتە ڕوو کردە ڕووگەی نوێ کە کەعبەی پیرۆزە، پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم)ئەمەی زۆر پێخۆش بوو). كما ذكر هذه المدة البخاري في صحيحه ٦٥ كتاب التفسير ١٢ باب ﴿سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ﴾ البقرة: ١٤٢، رقم ٤٤٨٦، عن البراء بن عازب أيضا.

پێویست نەدەبوو چاوەڕێی وەڵام بکات یاخود وەڵامی یەکەمی ڕاست بکاتەوە.

٦- ڕێگری کردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە نووسینی فەرمایشتەکانی لە سەرەتای سروش دابەزین، نەوەك تێکەڵ بێت بە قورئانی پیرۆز، چونکە بە تەواوی دەیزانی: قورئان فەرمایشتێکە خوای گەورە بە دەربڕین و ماناکەیەوە بە سروش بۆی ناردووە، ئەو ناتوانێت یەك پیتیش بگۆڕێت.

جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان شێوازی قورئان، چونکە قورئان فەرمایشتی پەروەردگاری مرۆڤە، لەگەڵ شێوازی فەرمووده، ئەگەر فەرموودەکە هی ڕەوانترین و جوانپێژترین کەسیش بێت لە خەڵکی.

٧- بابەتی سروش: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەخوێندەوار بووەو نووسین و خوێندەواری نەزانیوە[1]، لە ژینگەیەکی دەشتەکیانەی بت پەرستی ژیاوە، زانیاری و زانستی دانیشتوانەکەی سادەو سەرەتایین کە هیچ نرخ و بەهایەکی نییە و هەر بەراورد ناکرێت بەوەی ڕۆم و فارسەکان هەیان بووە.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەچووە ئەشکەوتی (حیراء) بە گۆشەگیری و کەنارگرتن لە خەڵکی بەندایەتی دەکرد، هیچ زانیاریەکیشی نەبووە، تەنها ئەوە نەبێت کە لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکەی فێری بووە.

ئا لەو بارودۆخ و حاڵەدا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە ڕێگەی سروشەوە قورئانی پیرۆزی بۆ دادەبەزێت، قورئان چەندین ڕاستی مێژووی و گەردوونی و تیۆری کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و جگە لەمانەش کە چارەسەری لایەنە جیا جیاکانی ژیان دەکەن لە خۆ دەگرێت، کە پێشتر هزرو فیکر بۆی نەچووەو بە خەیاڵی دا نەهاتووە، یاخود یەکێك گرنگی پێدا بێت یان هەر یەکێك لە هەر ژینگەیەك و لە هەر چەرخێکدا گرنگی بەو لایەنانە دابێت.

[1] بڕوانە کتێبەکەمان: أمیة الرسول محمد (صلی الله علیه وسلم).

ئەم ڕاستیانەش وردو دیارن - دواتر لە ئیعجازی قورئاندا لەبارەیەوە دەدوێین - کە هیچ کەسێك بۆی نییە نکۆڵی لێ بکات، تەنانەت حیبرەکانی جولەکەش ئەوانەی کە دەمەتەقێ و گفتوگۆیان لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) دەکرد ئەوا سەریان سوڕدەما، کە دەیان بینی قورئان هەواڵی نەوەکانی ئیسرائیل و پێغەمبەرەکانیان دەخاتە بەرباس.

هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە لە ناوەندە سەرەتاییەکەدا ناتوانێت ئەو یاساو ڕاستیە زانستی و غەیبی و شاراوانە لە خودی دەروون و فیکری خۆیەوە بهێنێت. بەڵکو پێویستە سەرچاوەیەکی هەبێت لە دەرەوەی دەروونی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) کە بریتیە لەو سروشەی لەلایەن خواوە بۆی دێت.

٨- پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) مرۆڤە. چەندین ئایەت پێشتر خرانەڕوو لەسەر ئەوەی پێغەمبەران و پەیامبەران مرۆڤن، بەڵام ئەوەندە هەیە سروشیان بۆ دێت، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَاْ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ﴾ الکهف: ١١٠، فصلت: ٦. واتە: ("ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) پێیان" بڵێ: بەڕاستی من تەنها ئادەمیزادێکم وەك ئێوە، بەڵام ئەوەندە هەیە وەحی و نیگام بۆ دێت).

دەسپێکردنی چەندین ئایەت بە وشەی (قل) کە زیاتر لە سێ سەد جار لە قورئاندا دووبارە بۆتەوە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿اقْرَأْ﴾ العلق: ١. واتە: (بخوێنە).

خوای بێ وێنە فەرموویەتی: ﴿ وَٱتْلُ ﴾ الکهف: ٢٧. واتە: (دەوری بکەرەوە).

خوای زانا و خاوەن توانا فەرموویەتی: ﴿وَرَتِّلِ﴾ المزمل: ٤. واتە: (دەوری بکەرەوە بە وردی).

ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە یەکێك هەیە ڕێنوێنی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) دەکات، تا ئاواو ئاوا بڵێت، بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کە قورئانی پیرۆز بە

دەربڕین و ماناکانیەوە لەلایەن خوای گەورەوە هاتووەو موحەممەدیش (صلی الله علیه وسلم)هیچ دەستێکی تێدا نەبووە.

٩- پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) جیاوازی کردووە لە نێوان ئەزموونی مرۆیی خۆی کە دەکرێ لە هەندێ شتدا پێکابێتی و لە هەندێ شتدا بە هەڵەدا چووبێت، لەگەڵ ئەو دڵنیاییەی کە سەرچاوە دەگرێت لە سروش و نیگا، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی سروش لەلایەنی دەرەکییەوە بووە، بە شێوەیەکی گومان هەڵنەگرو دڵنیاکەرەوە، بۆیە تەنها لەسەر خەڵکی ئەوە پێویستە کە شوێنی بکەون. ڕووداوی موتوربەکردنی دار خورماکان گەواهیدەرن لەسەر ئەم ڕاستییە[1].

---

[1] لە (صحیح مسلم: کتاب الفضائل، ٣٨ باب وجوب إمتثال ما قاله شرعا...) لە (موسای کوڕی تەڵحە) ئەویش لە باوکیەوە هێناویەتی، دەڵێت: (لەگەڵ پێغەمبەر خوا (صلی الله علیه وسلم) بەلای کۆمەڵێك دا ڕۆیشتین کە لەسەر دار خورماکانەوە بوون، فەرمووی: (ما یصنع هؤلاء؟) واتە: ئەوانە خەریکی چین. وتیان: دار خوماکان موتوربە دەکەن، تۆی نێر لەگەڵ مێ تێکەڵ دەکەن جا موتوبەر دەکرێت، جا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ما أظن یغني ذلك شیئاً) واتە: پێم وانییە ئەمە هیچ سوودێکی ببێت. دەڵێت: ئەم قسەیەی پێغەمبەریان بەوان گەیاند ئەوانیش وازیان لە موتوربە کردنەکە هێنا. ئەم هەواڵەیان بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گەیاند سەبارەت بەمە فەرمووی: (إن کان ینفعهم ذلك فلیصنعوه فإني انما ظننتُ ظنّاً فلا تؤاخذوني بالظن، ولکن اذا حدثتکم عن الله شیئاً فخذوا به، فإني لن أکذبَ علی الله عزوجل) واتە: ئەگەر ئەو کارەی سوودی بۆ ئەوان هەیە با بیکەن چونکە ئەوە تەنها بۆچوونێکی کەسی من بوو با بەهیچی لەسەر من حیساب نەکەن، بەڵام گەر شتێکم لە خواوە پێ وتن ئەوا دەستی پێوە بگرن، چونکە بێگومان درۆ بەناوی خوای باڵادەست و خاوەن شکۆوە ناکەم).

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: (أنتم أعلم بأمر دنیاکم) واتە: ئێوە شارەزاترن بە کاروباری ژیانی دونیاتان. و لە گێڕانەوەی (ابن ماجة: في سننه: کتاب الرهون، باب تلقیح النخل ٨٥٢/٢ )دا هاتووە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (إن کان شیئاً من أمر دنیاکم فشأنکم به، و إن کان من أُمور دینکم فإليّ) واتە: ئەگەر کاروباری دونیاکەتان بوو ئەوە خۆتان ڕایپەڕێنن، ئەگەر لە کاروباری ئاینتان بوو ئەوە بۆمن بگەڕێنەوە.

١٠- سەرزەنشت و گلەیی چ توند بێت چ نەرم، لـە قورئـانی پـیرۆزدا لـە پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) کـراوە، وەك ئـەو فەرمایشـتەی خـوای گـەورە: ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ﴾ عبس: ١. واتە: (ڕووی گـرژ کـرد و وەرگێـڕا). هـەروەها دەفـەرمووێت: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ﴾ التوبة: ٤٣. واتە: (خوا لێت خۆش بێت "ئـەی پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم)" بۆ مۆڵەتت پێدان). خوای پایەبەرز دەفەرمووێت: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ الأنفال: ٦٧...تـاد. واتە: (بۆ هـیچ پێغەمبەرێك نەبووە کە دیلی هەبێت، هەتا کاتێك چاك پایەدار و جێگیر دەبێت لە زەویـدا). ئـەو شـتانەی کـە خسـتمانەڕوو (لـەکاتی دوان لەسـەر: پـارێزراوی پێغەمبـەران)، بەڵگـەبوون لەسـەر ئـەوەی کـە پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) ڕاگەیەنەری بەرنامەی خوایە و ئەو پەیامەش کـە لـەرێی سروشـەوە بـۆی هـاتووە شتێکی دەرەکی بووە، چونکە ئەگەر دەروونی بوایە یـاخود دەسـتکردی پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) بوایە. ئەوا شتێکی لەوانە باس نەدەکرد کە سەرزەنشتی خـۆی تیادابێت.

١١- هەڕەشـەی تونـد و ئاگـادار کردنـەوەی ترسـێنەر لەلایـەن خـواوە ئاراسـتەی پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) کراوە، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە خـوای گـەورە سەرچاوەو کانگای سروشەو دەروونـی پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) پەیوەنـدی پێیەوە نییە، هەروەها بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کەسێکی فەرمان پێکراوە بەڕاگەیاندنی ئەو شتەی پێی سـپێردراوە لەلایـەن خـوای مەزنەوە.

خـوای پـاك و بـەرز دەفـەرمووێت: ﴿وَلَوْلَآ أَن ثَبَّتْنَٰكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا ﴿٧٤﴾ إِذًا لَّأَذَقْنَٰكَ ضِعْفَ ٱلْحَيَوٰةِ وَضِعْفَ ٱلْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا ﴿٧٥﴾﴾ الاسراء: ٧٤-٧٥. واتە: (خۆ ئەگەر ئێمە تۆمـان پایـەدارو دامـەزراو نەکردایە، ئەوە بەڕاستی نزیك بوویت کـەمێك بەلایانـدا مـەیل بکـەیت و بـەدڵی ئەوان بکەیت؟!. ئەو کاتە ئیتر دوو بەرامبەری "هاوەڵگەران" لـە دونیـاداو بـەدوو

بەرامبەری ئەوان لە دوای مردن سزاو ئازارمان پێ دەچەشتیت، پاشان کەسیشت دەست نەدەکەوت فریات بکەویت و لەدەستی ئێمە ڕزگارت بکات).

خوای بێ وێنە دەفەرموویت: ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِنَّهُ لَتَذْكِرَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾﴾ الحاقة: ٤٤ - ٤٨.

زەمەخشەری لەبارەی ڕاڤەی ئەم چەند ئایەتەی سورەتی (الحاقة) وتویەتی: (ئەوەیە: خۆ ئەگەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) شتێکی بەدەم ئێمە هەڵبەستایە لەخۆیەوە کە ئێمەش نەمان فەرموو بێ، ئەوا زۆر بەهێواشی دەمانکوشت، هەروەك چۆن پاشاکان ئەمە دەکەن بەرامبەر ئەو کەسەی کە درۆ بەدەمیانەوە دەکەن، زۆر بەپەلەو بەتووندی تۆڵەی لێ دەستێننەوە تا ئەو دیاردەیە بنبڕ بکەن، خوای گەورەش ئەم نموونەیەی وێنا کردووە تا سەخت و ناڕەحەتتر بێتە بەرچاو، کە بریتیە لەوەی دەیگرێت و پاشان لە ملی دەدات، خوای گەورە بەتایبەت باسی دەستی ڕاستی کردووە نەك چەپە[1]، چونکە ئەگەر بکوژەکان ویستیان لە پشتە ملی کەسێك بدەن ئەوا بەدەستی چەپ دەیگرن، بەڵام ئەگەر ویستیان لە پێشەوەی گەردەنیەوە سەری بپەڕێنێت ئەوا ئەو حاڵەتە ناخۆش و ناڕەحەتترە بۆ ئەو کەسەی کە دەکوژرێ، چونکە لەکاتی کوشتنەکەیدا شمێشرەکە دەبینێت کە بەدەستی ڕاستی بکوژەوەیە و سەری ئەوی پێ پەلدەدرێت)[2].

١٢- ئەگەر قورئانی مەزن لە خودی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و زیرەکی و بلیمەتیەکەی سەرچاوەی گرتبێت، ئەوا شانازی بوو کە بیداتە پاڵ خۆی، چونکە هیچ کەسێك نییە کە دەگمەنترین بەرهەمی عەقڵ و بەهرەو توانای خۆی بداتە پاڵ

---

[1] ئەوە وێچواندن (تشبیە)ە، چونکە ئەندامی ماددی یاخود هەر شتێك بچێتە چوارچێوەی کات و شوێن ئەوا بۆ خوا ئەستەمە، ئەمەش لە سەلمێنراوە عەقڵییەکانە. (وەرگێڕ).

[2] تفسير الكشاف للزمخشري ٢٦٦/٣.

جگە لە خۆی یاخود بانگەشەی خوایەتی دەکرد نەك پێغەمبەرایەتی، جیاوازییەکی زۆریش هەیە لە نێوان ئەو دوو پلەیە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەر دەم ئەوەی دووپات دەکردەوە کە ئەو مرۆڤە و بەندەی خوایە، شەونوێژی دەکرد و دەپاڕایەوە و دەیلاواندەوە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە نزاکەیدا دەفەرمووێت: **(اللهم اغفر لي خطيئتي و جهلي، و اسرافي في أمري، وما أنت أعلم به مني، اللهم اغفر لي جدِّي وهزلي، وخَطئي وعَمدي، وكلّ ذلك عندي، أنت المقدِّم وأنت المؤخر، وأنت على كل شئٍ قدير)**[1] واتە: خوایەگیان" لە تاوانەکان و نەزانیم خۆش ببە، هەروەها لە زیادەڕەویشم لە کارەکانمدا و ئەوەش کە تۆ پێی زاناتریت لەمن خۆش ببە. خوایەگیان" لەو شتانەم خۆشببە کە بە ڕاست و بە فشە و بە هەڵە و بە ئەنقەست کردوومە، هەموو ئەو کارانە لە منەوە سەرچاوەیان گرتووە، بەڕاستی تۆ پێشخەرو دواخەری، تۆ بەسەر هەموو شتێکدا دەسەڵاتت هەیە[2].

١٣- کاتێك سروش بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هات فەرمانی پێکرد بخوێنێتەوەو خەڵکی ئاگادار بکاتەوە، جا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) سەری سوڕما لەو کارە لەناکاوە و گومان گرتی و پرسیاری لەخۆی دەکرد، دەبێت ئەمە چی بێت؟ ئەمە دەروونە یان شتێکی ترە؟ لەو کاتەدا ئەم فەرمایشتە دابەزی: ﴿ فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ مِّمَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ فَسْـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقْرَءُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكَ ۚ لَقَدْ جَآءَكَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴾ يونس: ٩٤. واتە: (جا ئەگەر تۆ "ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)" دەربارەی ئەو شتانەی کە بۆمان دابەزاندوویت لە شك و گومان دایت، ئەوە پرسیار بکە لەو کەسانەی کە پێش تۆ

---

[1] فەرموودەی: خوایەگیان" لە تاوانەکان و نەزانیم خۆش ببە... تادصحیح مسلم: ٤٨ کتاب الذکر و الدعاء، ١٨ باب التعوذ من شر ما عمل ومن شر ما لم يعلم، رقم ٢٧١٩، عن أبي موسى االأشعري.

[2] دەقی کوردی ئەم فەرموودەیەم لە ٩٢٤/٢ (پوختەی صەحیح موسلیم: زکی الدین عبدالعظیم عبدالتوی المنذري، وەرگێڕانی: لیژنەیەك) وەرگرتووە. (وەرگێڕ).

لە تەوڕات شارەزان و دەیخوێننەوە، سوێند بەخوا بەڕاستی حەق و ڕاستیت لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆ هاتووە، کەوابوو بەهیچ شێوەیەك گومانت نەبێت و مەچۆرە ڕیزی گوماندارانەوە).

بۆیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)لەدوای هاتنی ئەم ئایەتە فەرمووی: **(لا أشكّ و لا أسأل)**[1] واتە: گومان نابەم و پرسیاریش ناکەم.

هەموو ئەو شتانە وایان کرد پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دڵنیا و دڵ دامەزراو بێت و پاڵنەرێکیش بوو بۆ بەرگە و ئارامگرتن لەسەر ناخۆشییەکان، بۆیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەرگیز لێی پاشگەز نەبووەوە، تەنانەت هەوڵە فریودەرەکانی قوڕەیشییەکان ڕەت کردەوە کە دەیان ویست هەڵی بخەڵەتێنن بە سەروەت و سامان دەسەڵات، خۆی و هاوەڵەکانی بەرگەی ناخۆشیەکانیان گرت، کە چیاو شاخەکانی دادەنواند، دژایەتی خزم و هۆزو عەرەب و جگەلەوانەشی کرد، جەنگێکی گەرمی دژ بە بیروباوەڕی ئەوان ڕاگەیاند، خوای گەورەش سەریخست بەسەر دوژمنەکانیدا و پەیامی ئیسلامی لەسەر زەوی بەرپاکرد، بەم هۆیەش هیچ کۆسپێك هەرچەند گەورەبێت لە بەردەمیدا نەما، ستەمکارەکان بە چۆکداهاتن لە بەرامبەریدا هەرچەند یاخی و زۆریش بەدەسەڵات بوون.

---

[1] الظاهرية القرآن ١٨٨ نقلا الحديث عن السيوطي. و: ئیبن کەسیر لە تەفسیرەکەیدا (٤٣٢/٢) لە قتادەوە هێناویەتی کە وتویەتی: ئیبن عەبباس و سەعیدی کوڕی جوبەیر و حەسەنی بەصری هەمان شتیان وتوە.

فەرموودەی: گومان نابەم و پرسیاریش ناکەم. عەبدوڕەزاق و ئیبن جەریر لە قەتادەوە گێڕاویانەتەوە.

## چەند گومانێك دەربارەی سروش[1]

هەندێك کەسی شتیان دەربارەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)هەڵبەستیوەو وتویانە: سروش بریتییە لە خەون بینین یان چەند هەڵبەستراوێکی کەسی درۆزن یاخود چەند خەیاڵێکی شاعیرانە یان وتەی کەسێکی شێت. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)زانستی وەرگرتووە لە (بوحەیرا) و (وەرەقەی کوڕی نەوفل) و (حەدادی ڕۆمی).

ئەم گومانانە و بەرپەرچەکانی بە تێرو تەسەلی لە خوارەوەدا دەخرێنەڕوو:

١- وتراوە: سروش جۆرێکە لە خەون بینین. قورئانی پیرۆز ئەم گومانەی باس کردووە: خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ بَلْ قَالُوٓاْ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍۭ بَلِ ٱفْتَرَىٰهُ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ ﴾ الأنبياء: ٥. واتە: (بەڵکو دەیان وت: خەون و خەیاڵی بێ سەرو بنە یاخود هەڵی بەستووە، بەڵکو کەسێکی شاعیرە).

ئەم گومانە بەرپەرچ دراوە بەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەر لە یەکەم کاتی دابەزینی سروشەوە وشیار بووە بە بەردەوامی.

ئەو گێڕانەوەیەی کە لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتوو[2]، ئەوەی سەلماندووە سروش لە پڕێکدا بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هاتووە لەو کاتەی کە وشیار بووەو ورد بوەتەوەو سەرنجی بوونەوەرو بەدیهێنەرەکەی داوە، لەو کاتە جبریل پێی وتووە: بخوێنە، سێ جار پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم)دەگوشێت تا ئازاری پێگەیشت ئینجا بەریدا، دواتریش چووەتە لای خەدیجە بە ترس و لەرزو دڵە ڕاوکێوە، دەیفەرموو:(**زمّلوني زمّلوني**) واتە: داپۆشن، داپۆشن. دواتر هەواڵەکەی بە خەدیجە ڕاگەیاند....

---

[1] بروانە ئەم سەرچاوانە: الوحي المحمدي ٩٠ و لاپەڕەکانی دواتر، مناهل العرفان ٣١٧/٢ و لاپەڕەکانی دواتر. الظاهرة القرآنية ١٨٢، مباحث في علوم القرآن ٣٨ ولاپەڕەکانی دواتر، الرسول: سعيد حوى ١٤/٢.

[2] صحيح البخاري ١ كتاب بدء الوحي، ٣ باب، رقم ٣، عن عائشة (رضي الله عنها). وصحيح مسلم ١ كتاب الايمان، ٧٣ باب بدء الوحي...، رقم ١٦٠، عن (رضي الله عنها).

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەگەر سروش تەنها جۆرێك بووبا لە خەون بینین ئەوا ئەو ترس و لەرزەی لێ نەدەما لە دوای وشیار بوونەوەدا.

ئەو دیاردە و حاڵەتانەی کە بەسەر پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) دەهاتن لەو کاتەی سروش و نیگای بۆ دەهات، وەك پێشتر خستمانەڕوو، ئەو گومانە پوچەڵ دەکاتەوە، تەنانەت ئەو سەرزەنشت و هەڕەشەیە و جگەلەوانەش کە ئاراستەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەکران بەڵگەن لەسەر ئەوەی سروش تەنها جۆرێك نەبووە لە خەون بینین، بەڵکو سروش ڕاستییە.

٢- وتراوە: سروش تەنها چەند هەڵبەستراوێکی کەسێکی درۆزنە، لەم ئایەتەی کەمێك پێشتر خستمانەڕوو خوای گەورە ئاماژەی بۆ ئەو گومانە کردووە.

ئەم گومانە بەرپەرچدراوەیە بە گەواهی و شایەتی عەرەب کە پێش پێغەمبەرایەتی داویانە بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، تەنانەت ناویان نابوو ڕاستگۆی ئەمیندار، تەنانەت پارەو سامانە بەهادارەکانیان لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)دادەنا.

بەهەمان شێوە لە دوای ڕەوانەکرانی وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەلایەن گشت عەرەبەکان بە دۆست و دوژمنەکانیەوە گەواهی ڕاستگۆیی بۆ دراوە. بە بەڵگەی پرسیارەکەی هیڕقلی پاشای ڕۆم کە ئاراستەی ئەبو سوفیانی کرد، لەبارەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، هەروەك لە (صەحیحی بوخاری[1])دا هاتووە: (وتی - واتە هیڕقل -: بەر لەوەی دەست بە بانگەوازەکەی بکات، تۆمەتبارتان دەکرد بە درۆ کردن؟ وتم - واتە: ئەبو سوفیان -: نا تۆمەتبارمان نەدەکرد....).

کاتێك (هیڕقل) پرسیارەکانی تەواو بوو لەو پرسیرانەی لە ئەبو سوفیانی کرد، ئەوا بەخۆی وەڵامی پرسیارێکی خۆی دایەوە: (پرسیارم لێ کردی کە ئایا تۆمەتبارتان دەکرد بەر لەوەی دەست بەو بانگەوازەی بکات، تۆش وتت نا، کەواتە بێگومان دەزانم ئەو

[1] ئەو پرسیارانەی هرقل لە ئەبو سفیانی کرد، هاتووە: صحیح البخاري ١ کتاب بدء الوحي، ٦ باب، رقم ٧، عن إبن عباس عن أبي سفیان.

کابرایــە مــادام درۆ بــۆ خــەڵکی هەڵنەبەســتێت ئــەوا هــەرگیز درۆ بــۆ خــوای گــەورە هەڵنابەستێت).

ئەو شتانەی کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، وەك: هەواڵی ڕابردوو و داهاتوو و چەندین یاسای ڕۆشن کە شیاون بۆ هــەموو کــات و شــوێنێك بــە گــەواهی دانــی هــەموو خــاوەن عــاقڵەکان. هەموو ئەو شتانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئەم شــتانە هــی کەســێك نــین کــە درۆزن بێت.

ئەوەشمان سەلماند لەکاتی قسە کردن لەسەر بابەتی پارێزراوی پێغەمبــەران و ئیعجــازی قورئان هەر لەم کتێبەدا، هەر کەسێ دەیەوێت با بۆی بگەڕێتەوە.

٣- وتراوە: سروش تەنها جۆرێکە لە خەیاڵی شــاعیران، قورئــانی پــیرۆز لــەو ئایــەتی کەمێك پێشتر خرایەڕوو ئاماژەی بۆ ئەم گومانە کرد.

ئەم گومانە بەرپەرچی دراوەیە: بەو سوربوونەوەو ترسەی کە پێغەمبــەری (صـلى الله عليه وسلم) دادەگرت، لەکاتی دابەزینی ســروش و نیگــا، جــا ئــەم حاڵەتــە بەســەر ڕووخساری شاعیر دەرناکەوێت ئەگەر ویستی هۆنراوەیەك بهۆنێتەوە. لەبەر ئــەوەی موعجیزەی هەرە مەزن کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هێناویەتی بریتیە لە قورئانی پیرۆز لە شێوازەکەی و بواری یاسادانان و هەواڵدانەکەی... عــەرەب لــە سەردەمی دابەزینی قورئاندا سوارچــاکی مەیــدانی ڕەوانبێــژی و جوانپێــژی بــوون کەچی کاتێك گوێبیستی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بوون کــە دەخوێندرایــەوە ئــەوا تێکشکان و سەریان سوڕما، تەنانەت قورئــانی پــیرۆز تەحــەدای ئــەوانی کــرد کــە بتوانن وێنەیەکی بهێنن، بەڵام نەیانتوانی هــەروەك لــە بابــەتی ئیعجــازی قورئــان دەخەینەڕوو.

٤- وتراوە: ئەو کەسەی بانگەشەی ئەوە دەکات سروشی بــۆ هــاتووە شــێتە: قورئــانی پیرۆز ئاماژەی بۆ کردووە: ﴿مُعَلَّمٌ مَّجْنُونٌ﴾ الدخان: ١٤. واتە: (فێرکراوێکی شــێتە!!). هەروەها خوای بێ وێنــە دەفــەرموێت: ﴿قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ الَّذِيَ أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ﴾

الشعراء: ٢٧. واتە: ("وتیـان" بەڕاسـتی ئـەو پێغەمبـەرەی بـۆ ئێـوە ڕەوانـەکراوە شێتە).

هەر ئەو بارودۆخ و حاڵەتەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کاتێ کـە سروشـی بـۆ دەهات بەچاکترین شێوە بەرپەرچی ئەم گومانە دەداتـەوە، بـەوەی هۆشـی تـەواو و چوست و چالاك و بەگوڕو تـین و کـۆ ئەنـدامی دەمارەکـانی زۆر بـەهێز بوون.کـە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە خەدیجەی فەرموو: (زملوني) واتـە: دامپۆشـن. ئەمە تەنها ئەوە دەگەیەنێت کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چووەتە ناو خەوگـە و پێخـەف، تـەنها بـۆ ئـەوەی بحەسـێتەوە دوای ئـەو دیمەنـە مەترسـیدارەی کـە بینیوویەتی.

هەر لەبەر ئەمە خوای گەورە فەرمانی پێ دەکات هەڵسێت بە ئاگـادار کردنـەوەی خەڵك: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ۝١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ۝٢﴾ المدثر: ١-٢. واتە: (ئەی ئـەو کەسـەی خـۆت پێچـاوەتەوە، ئـەی موحەمـەد (صـلی الله علیـه وسـلم)، هەسـتە و خـەڵکی بێـدار بکەرەوە).

شتێکی گومان هەڵنەگرە کەسی شێت ناتوانێـت ئـەو شـەریعەتە کامـڵ و هەمـە لایەنە بهێنێت کە هـەموو بوارەکـانی ژیـان لـەخۆی دەگرێـت، چـونکە تـەنها بـە عەقڵێکی تەواو ڕۆشن و دید فراوان دەکرێت.

٥- ئەگەر وترا: ڕووخسار سور هەڵگەڕان و ڕەنگ پەڕین، دەکرێ بەوە لێـك بدرێتـەوە کە بریتیە لە دیاردەی گرژ بوون (أعراض التشنج).

بەرپەرچی دەدرێتەوە: بەوەی دیاردەی گرژ بوون دەبێتە هۆی ئەوەی کە تاك ئیفلـیج ببێت و لەرز بیگرێت بۆ ماوەیەکی کـاتی بـێ بـەش دەبێـت لـە هێـزە عـەقڵی و جەستەیی. بەڵام حالەتەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە کاتێك کە سروشـی بۆ دادەبەزی گەواهیدەرن لەسەر: ئەوەی تەنها ڕووخساری پێغەمبەر (صلی الله علیـه وسـلم) گۆڕانی بەسەردا دەهـات و لەهـەمان حاڵەتـدا لـە بـارودۆخێکی ئاسـایی و

ئازادی عەقڵی دابوو، بەشێوەیەك کە یادەکەی بەتەواوی بەکار دەهێنێت لەو کاتەی سروشی بۆ دێت، بەڵام کەسی توشبوو بە نەخۆشی گرژ بوون هۆش و یادی نامێنێت لەو کاتەی کە نەخۆشیەکە دەیگرێت.

پاشان ئەو دیاردە جەستەییانە کە بەدیار دەکەون لەسەر ڕووخساری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەو کاتەی سروشی بۆ دادەبەزێت، تەنها لەیەك کاتدا بەدەردەکەون ئەویش لەو ساتەیە کە سروش بۆ دێت.

بارودۆخی نەخۆشی هاوشان نابێت لەگەڵ ئاڕەقە کردن و نابێتە هۆی دەرکەوتنی دەقێکی قورئانی کە بەخودی خۆی موعجزەیە. دەکرێت ئەو دەقە قورئانیە سوڕەتێکی درێژ بێت وەك سوڕەتی (الأنعام) یاخود دەقێك بێت کە ڕێسای زۆر وردی تێدان وەك دەقی میرات، کە بە وردترین دەقە یاساییەکان جیهاندادەنرێت.

٦- هەندێکیش بۆ ئەوەچوون: پێغەمبەر زانست و زانیارییەکەی لە بوحەیرای ڕاهیب و ورەقەی کوڕی نەوفل و حەدادی ڕۆمی وەرگرتووە. بوحەیرای ڕاهیب - یەکێکە لە شوێنکەوتووانی (ئاریوس) لە یەکخواناسیی دا و نکۆڵی دەکرد لە خوایەتی عیسای مەسیح و بیروباوەڕی سێکوچکەیی (تثلیث) - کاتێك لە بوصرا کە دەکەوێتە شام بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گەیشتووە، گوایە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەو سروشە لەویوە فێربووەو وەرگرتووە.

لەم دێڕانەی خوارەوەدا بەرپەرچی ئەم گومانانە دەدرێتەوە:

أ- بوحەیرای ڕاهیب تەنها یەك جار بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گەیشتووە، ئەوکاتیش پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ ئەبو تاڵیبی مامی دابوو کە لەگەڵ کۆمەڵێك لە پیاوەکانی قوڕەیش دا سەفەری شامیان کرد. ئەو کاتە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تەمەنی نۆ ساڵ بوو، وتراوە تەمەنی دوازدە ساڵ بووە. بوحەیرای ڕاهیب کاتێك لە خەڵوەتگە و پەرستگەکەیدا خەوتبوو، لە خەونیدا بینی کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ کاروانێکدا دێت و هەندێ هەوریش سێبەری لێ دەکەن، بەم هۆیەوە خواردنی ئامادەکرد بۆ ئەو

کەسانەی قورەیشی بوون، کەچی پێشتر بەلای ڕاهیبی ناوبراویشدا تێپەڕدەبوون، بەڵام گرنگی پێ نە دەدا و تەنانەت تەماشای ئەوانیشی نەدەکرد، بەڵام ئەوجارە گۆڕاوە، ڕاهیب بانگی ئەوانی کرد بۆ خوانەکە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەهۆی تەمەن بچووکیەکەی لەلای کاروانەکە مایەوە، جا ڕاهیبەکە وتی: هیچ کەسێك لە ئێوە با بەجێ نەمێنێت و هەمووتان وەرن بۆ خوانەکە، پێیان ڕاگەیاند کە گەنجەکە واتە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەجێ ماوە، ئینجا پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) هێنا، ڕاهیبەکە زۆر بە خەستی و تیژی سەرنجی دەدا و سەیری هەندێ شتی جەستەی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) دەکرد، دوای نان خواردن ڕاهیبەکە بانگی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) کرد و سوێندی دا بە (لات و عوزا)، چونکە گوێی لێببوو کە هۆزەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سوێند بەم دوانە دەخۆن، پێی فەرموو: **(لا تسألني باللات و العزى، فوالله ما أبغضت شيئاً قط بغضهما)** واتە: بە (لات و عوزا) سوێندم مەدە، سوێند بەخوا ڕقم لە هیچ شتێك نییە بەو ئەندازەیەی ڕقم لەوانە. بوحەیرا پێی وت: جا سوێندت دەدەم بەخوا، ئەوەی لێت دەپرسم وەڵامم بدەرەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: **(سلني ما بدا لك)** واتە: چیت دەوێت لێم بپرسە. ناوبراو پرسیاری لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کرد لەبارەی حاڵ و بارودۆخی لەکاتی خەوتن و چۆنیەتی هەڵسوکەوتی و کاروبارەکانی، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) وەڵامی دەدایەوە، وەڵامەکەی کۆك بوو لەگەڵ ئەو سیفەتانەی بوحەیرا دەیزانی، دواتر بوحەیرا سەیری پشتی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) کرد، بینی مۆری پێغەمبەرایەتی لە نیوان هەر دوو شانەکانی دایە. بوحەیرا پرسیاری لە مامی کرد لەبارەی باوکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەویش وەڵامی دایەوە: ئەوە کوڕی منە، بوحەیرا وتی: نابێت باوکی ئەو کوڕە زیندوو بێت. ئینجا وتی: ئەوە برازامە. بوحەیرا لە کۆتاییدا پێی وت:

بیگەڕێنەوە بۆ شارەکەی خۆی و لە جولەکەکانی بپارێزە، ئەو برازایەت پلەو پایەیەکی گەورەی دەبێت. جا خێرا ئەبو تالیب گەڕاندییەوە بۆ مەککە[1].

ئەو بەسەرهاتە گێڕانەوەی تریشی هەیە[2]، لە سەرجەم گێڕانەوەکاندا (صلی الله علیه وسلم) هیچ ئاماژەیەك نەهاتووە لەبارەی ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شتێکی لەبارەی بیروباوەڕو ئاینەکەی لە بوحەیرا بیستبێت.

هەروەك ئەمگەشتەی کورت بوو - سەرباری ئەوەی کە بچوك بوو، مامیشی لەگەڵدابوو، تا بە بوحەیرا گەیشت - هەموو ئەو شتانە یاسا و شەریعەت فێری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ناکات و کلیلی نهێنیە شاراوەکانی پێ نادات، بەڵکو وتەکەی بوحەیرا جەخت دەکاتەوە لەسەر پێغەمبەرایەتی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)،بەتایبەتی کاتێك پرسیاری لە حاڵ و بارودۆخی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) دەکرد، دەبینی کە وەڵامەکانی کۆکن لەگەڵ ئەو زانیارییانەی، کە عیسا و موسا موژدەیان لەبارەوە دابوو سەبارەت بە خەسڵەتەکانی پێغەمبەر، بۆیە پێشبینی ئەوەی کرد کە پلەو پایەیێکی گەورەی دەبێت لە داهاتوودا.

---

[1] سیرة ابن هشام - قصة بحيرا الراهب.

[2] وممن رواه الحاكم في مستدركه ٢/ ٦١٥-٦١٦ وقال هذا حديث صحيح على شرط الشيخين ولم يخرجاه. ولكن علق الذهبي عليه بقوله: قلت: أظنه موضوعا فبعضه باطل./ سەیری: هامش المستدرك. بکە.

رواه الترمذي في صحيحه/ سەیری بکە: بشرح عارضة الأحوذي ١٠٦/١٣ وقال: حسن غريب لا نعرفه الا من هذا الوجه.

واستقصى طرق وروايات القصة الحافظ إبن كثيرفي السيرة النبويّة ٢٤٣/١ ولاپەڕەکانی دواتری، وتویەتی: بەهەموو ئەندازەیەك (مرسلە- کەسی یەکەمی سەنەدەکە پەڕی بێت - وەرگێڕ -)، هەروەك هەندێ کەس باسیان کردووە کە ئەو بەرسەرهاتە ڕوویداوە لەو کاتەی تەمەنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دوازدە ساڵان بووە و دەکرێ (ئەبو موسا) ئەمەی لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەرگرتبێت، بەمەش زیاتر بەهێز دەبێت یاخود لە گەورە هاوەڵان وەری گرتووە یان ئەو بەسەر هاتە ناودارو بەناوبانگ و بڵاو بووە، بۆیە بەو شێوەیەی کە بڵاو بووە ئەویش وەری گرتووە.

ب- سەبارەت بە (وەرەقەی کوڕی نەوفل): ئـەوەی چەسپاوە لـە گێڕانـەوە ڕاسـت و دروستەکاندا ئەوەیە کە خەدیجە (خوا لێی ڕازی بێت) پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) برد (دوای ئەوەی جبریل "سڵاوی خوای لێبێت" هاتـە لای لـە ئەشـکەوتی "حراء"). بۆ لای (ورقەی کوڕی نوفلی کوڕی أسد)ی کە کوڕە مـامی خۆیـەتی و لە سەردەمی نەفامییدا بووە بە نەصرانی و کابرایەکی خوێندەوار بووە، بە عیبری لەبارەی ئینجیل نووسیویەتی و بە ساڵاچوو و کوێربووە. خەدیجـە پـێ وت: ئـەی ئامۆزام گوێ بگرە بزانە برازاکەت (موحەممەد)[1] چی دەڵێ؟! وەرەقە لێـی پرسـی ئەی برازام چ دەبینی؟ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چـی بینیبـوو و چـی بیستبوو بۆی گێڕایەوە، ئینجا (وەرەقە) پێی وت: ئەوە ئەو فریشتە (ناموس)ەیـە - واتە ئەمینداری سروشە جبریل - کە خـوا ڕەوانـەی کـردووە بـۆ سـەر موسـا (سەلامی خوای لێبێت)، خۆزگە لەم ڕۆژگارەدا گەنج بویام! خۆزگە زیندوو بویام ئەو کاتـەی کـە گەلەکـەت دەریـان دەکـردی!. پێغەمبـەر (صلی الله علیـه وسـلم) دەفەرمووێ: (أو مُخرجيّ هم؟!) واتە: یانی دەرم دەکەن؟! (وەرەقە) دەڵێت: بـەڵێ دەرت دەکەن، چونکە هەر پیاوێك لە پێش تۆدا هاوشـێوەی ئـەو پەیامـەی تـۆی هێنابێت ئەوا دژایەتی کراوە، ئەگەر من بەم ڕۆژە بگەم (کە تۆ بانگەوازی خـۆتی تێدا ڕادەگەیەنی[2]) کە هۆزەکەت دژایەتیت دەکـەن، زۆر چـاك پشـتگیریت لـێ دەکەم. دوایی زۆری پێ نەچوو (وەرەقە) کۆچی دوایی کرد[3].

ئینجا (وەرەقە) بـە تـەنیا بـە پێغەمبـەر (صلی الله علیـه وسـلم) نەگەیشـتووە - هەروەك لە گێڕانەوە ڕاست و دروستەکان دا هـاتووە - بـەڵکو خەدیجـەی لەگـەڵ

---

[1] خۆم زیادم کردووە بۆ بەرچاو ڕوونی زیاتری خوێنەر. (وەرگێڕ).

[2] وەرگێڕ.

[3] الحديث متفق عليه./ اللؤلؤ والمرجان فيما اتفق عليه الشيخان ٣٢. وهو في صحيح البخاري ١ كتاب بدء الوحي، ٣ باب، رقم ٣، عن عائشة (رضي الله عنها). وفي صحيح مسلم: ١ كتاب الإيمان، ٧١ باب بدء الوحي...، رقم ١٦٠، عن عائشة (رضي الله عنها).

دابووە، پاشان (وەرەقە) بە بەراورد کردنی ئەو شتەی بەسەر پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) هاتووە لەگەڵ بارودۆخی موسا و عیسادا زانیویەتی شتەکە چییە، بۆیە بە پێغەمیەری (صلی الله علیه وسلم) وت: ئەوە ناموسە، واتە: ئەمینداری سروش جبریلە، چونکە سروش بۆ هەموو پێغەمبەران هەر یەکە، تەنانەت پێشبینی وەدەر نانی پێغەمبەریشی (صلی الله علیه وسلم) کرد کاتێك بانگی هۆزەکەی دەکات و خۆزگەی خواست لەوکاتەدا پشتی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) بگرتایە.

هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئەو سروشەی بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و پێغەمبەرانی پێشوو هاتووە لەلایەن خواوە بووەو هەر خوای گەورەشە کە پێغەمبەری فێرکردووەو نیگای پێ بەخشیوەو ڕێنمایی کردووە، (وەرەقەی کوڕی نەوفل) هیچ ڕۆڵێکی نەبووە لەمەدا تەنها ئەوە نەبێت کە بڕوای هێناوە بەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەبێتە پەیامبەر بۆ گشت خەڵکی، ئینجا چۆن؟ دەکرێ (وەرەقە) ببێتە سەرچاوەی زانستی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)؟.

پ- شتێکی چەسپاوە کاتێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە بوحەیرا گەیشتووە ئەبو تاڵیبی مامی لەگەڵیدا بووەو کاتێکیش گەیشتووە بە (وەرەقە) خەدیجەی لەگەڵ دابووە، ئەم بەیەك گەیشتنەش نهێنیەکی پارێزراو نەبووە، ئینجا بۆچی مێژوونوسان باسی زانستی ئەو دوو مامۆستایەیان نەکردووە؟ بۆچی هەر دوو یاوەرەکەی پێغەمبەر (خەدیجە و ئەبو تاڵیب) هەمان سوودیان بەدەست نەدەهێنا کە پێغەمبەر موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) بەدەستی هێنا؟ بێگومان بێ دەنگ بوونی مێژوو لەمەڕ ئەمە بەسە بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگەی پوچەڵی ئەو بانگەشە بێ بنەمایە، کە هیچ واتایەك هەڵناگرێت.

ت- دواتر ئایا (بوحەیرا) و (وەرەقە) لەو ئاستە زانستیە دابوویان، کەواتە بۆچی ئەو پەیامەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هێنای ئەوان نەیاندەهێنا؟ بۆ نمونە

قورئانی پـیرۆز، بۆچـی خۆیـان بانگەشـەی پێغەمبەرایـەتیان نـەکردووە؟ بـەڵکو مژدەیاندا بە پێغەمبەرایەتی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم).

ج- گریمان ئەگەر ڕاسـت بوایـە پێغەمبـەر (صـلی الله علیـه وسـلم) ئـەو شـتانەی لـە (بوحەیرا) یان (وەرەقە) وەرگرتووە، ئەوا هەر نەبێ قورەیش تۆمـەتباریان دەکـرد بەمە، لەکاتێکدا دەیان ناوو ناتۆرەیان بـۆ هـەڵ دەبەسـت. و تۆمـەتباریان کـرد بەوەی لەلایەن (حەدادی نەصڕانی ڕۆمی) فێر بووە کە لـە (مەککـە)دا شمشـێری دروست دەکرد، پێغەمبەریش هەندێ جـار لـەلای ڕادەوسـتا تـا کارەکـانی ئـەو ببینێت، بەڵام خوای گەورە بەرپەرچی ئـەو تۆمەتانـەی دایـەوە بـەم فەرمایشـتە پیرۆزە: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌۗ لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَـٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ﴾ النحل: ١٠٣. واتە: (سـوێند بـەخوا ئێمە بەڕاستی دەزانین بێ باوەڕان دەڵێن: ئەم قورئانە تەنها کەسێك فێری دەکات، "بەمەرجێك" زمانی ئەو کەسەی ئەوان دەڵێن قورئان فێری موحەممـەد دەکـات، عەجەمیە و عەرەبی نییە و ڕەوان نییە، لەگەڵ ئـەوەدا ئـەم قورئانـە بـە زمـانی عەرەبی پاراو و ڕوون و ئاشکرا داڕێژراوە).

چ- سروشتی نەصڕانیەت، کە ئایینی (بوحەیرا و وەرەقـە و حـەدادی ڕۆمـی)ە کـۆك نییە لەگەڵ ئەو پەیامەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هێناویەتی، ئینجا چـۆن دەکرێ ببێتە سەرچاوەیەك بۆ ئایینەکەی و قورئانی پیرۆز؟.

ح- لە قورئانی پیرۆزدا چەند هەواڵێکی غەیبی و شاراوە هەن، هەنـدێکیان لـە دوای مردنی (بوحەیرا و وەرەقە) هاتنەدی، ئینجا چۆن ئەندێشـە و تەصـەور دەکرێـت قورئان لـە زانیاریـەکانی ئـەوان کـە گوایـە بـە پێغەمبـەریان داوە، سەرچـاوەی گرتبێت؟

هەروەك شتێکی زانراویشە کە چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەپێی ڕووداو بارودۆخی لەناکاو دەهاتن.

خ- ئەگەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەو شتانە لە بوحەیراو جگەلەویش وەرگرتبا، ئەوا هەر خودی شوێنکەوتووانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەو شتەیان نەقڵ دەکرد و دەیانگواستەوە هیچ شتێك نییە بچوك و گەورە کە نەیان نووسی بێت، ئەگەر چەسپاویش نەبێت لەلایان، چونکە ئەو شتانە بەجێ دەهێڵن بۆ گێڕەوانی هەواڵ و سەنەد.

د- لە فەرموودە ڕاست و دروستەکاندا نەچەسپاوە کە پێغەمبەر موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) چاوەڕوانی ئەوەی کردبێت کە سروشی بۆ بێت، ئەگەر شتێکیش لەوبارەوە لە پێغەمبەرەوە هاتبێت ئەوا دەیان نووسی.

ر- هەروەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە زاناکانی جولەکە و ڕاهیبە نەصرانیەکان نەگەیشتووە، نەش چەسپاوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پەیوەندی پێوە کردبن، لێکۆڵەرانیش جەختیان لەسەر ئەمە کردۆتەوە.

ز- قورئانی پیرۆز بەو حوکمانەی کە گومان لە ڕاستی و دروستیاندا نییە، بەدوای یەکدا لە ماوەی بیست و سێ ساڵ دابەزیون، فرەلایەنن و قسە لەسەر هەموو بوارێك دەکەن لە مامەڵە و حوکمڕانی و هەواڵی غەیبی و شاراوە جگە لەوانەش کە چارەسەری هەموو لایەنەکانی ژیان دەکەن، بێ گومان عەقڵ بڕیاری ئەوە دەدات کە لە دانیشتن و چاوپێکەوتنێکی سادەی خێرا لەگەڵ ڕاهیبێکدا وەرناگیرێت، دوای ئەمەش عەقڵ چۆن دان دەنێت بەدروستی ئەو هەموو حوکمە زۆرو هەواڵە غەیبیانەی دوای ئەو دانیشتە؟ هەموو ئەوانە بەڵگەن لەسەر ئەوە کە ئەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هێناویەتی لە خوای گەورەوە وەری گرتووە؟، خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ دەفەرموویێت: ﴿ وَمَا كَانَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ أَن يُفْتَرَىٰ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ یونس: ٣٧. واتە: (وەنەبێت ئەو قورئانە لەلایەن کەسێکەوە دارێژرابێت و هەڵبەسترا بێت جگە لەخوا، بەڵکو ڕاستی و ڕەوانی کتێبە ئاسمانیەکانی پێش خۆیشی دووپات دەکاتەوە، هەروەها ڕوون کەرەوەی بیروباوەڕو

ئەرکەکانـە، بەڕاسـتی هـیچ گومـان لـەوەدا نییـە کـە ئـەم قورئانـە لەلایـەن پەروەردگاری هەموو جیهانەوە ڕەوانە کراوە).

٧- ئەگەر وترا (سۆلۆن)ی فەیلەسوفی یۆنـان بەرنامەیـەکی داهێنـاوە، ئـەوا شـتێکی سەیر نابێت کـە بلـێین پێغەمبـەر شـەریعەتەکەی داهێنـاوەو هـەلقولاوی هـزرو زیرەکیەکەیەتی.

ئەمەش بەرپەرچی ئەم گومانەیە:

سۆلۆن یەکێکە لە فەیلەسوفەکانی یۆنان، لە سەدەی حەوتەمی پێش زایینی ژیاوە، دایکیشی لە ڕەچەڵەکی (بستراتوس)ی کۆتا پادشای (ئەسینایە).

لـە پیـاوانی جـەنگ بـووە، سـەرمایەداریش بـووە، هەنـدێ پلـەی کـارگێڕی و سەرکردایەتی سەربازی لە وڵاتەکەی وەرگرتووە، لە ساڵی ٥٩٤ پ.ز وەك سەرۆکی گەل بەیەکدەنگی هـەموو حیزبـەکان هەڵبـژێردرا و دەسـەڵاتی ڕەهایـان پێـدا لـە سیسـتەم و یاسـای وڵاتـدا، کـە پـێش ئـەو (زراکـوت) دانـابوو، جـا سـۆلۆن بەرنامەیەکی نوێی دانا و حکومەت جێبەجێی کرد. بەڵام ئـەو بەرنامەیـە نوێیـەی سۆلۆن تەنها بریتی بوو لە ڕێك و پێك کـردن و بـژارکردنی یاسـاکانی پێشـوو کـە گەلێك دایڕشتبوو خاوەنی گەورەترین فەلسەفە و ژیارو پێشکەوتن بوو لەو کاتـەدا، سۆلۆن ڕۆشنبیرو فەیلەسوف و سەرکردەی گەورەترین هێزی ڕێکخراو و گـەورەترین دەوڵەت بوو لە جیهاندا.

ئینجا کەی پێغەمبەر موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)ئەو شـتانەی هـەبووە، بـەڵکو نەخوێندەوار بووەو توانای نووسینی نـەبووەو شـارەزای سیاسـەت و سـەرکردایەتی هێزەکانی سەربازی نـەبووە. ئـەو یاسـا و ڕێسایانەشـی کـە هێنـای ئـەوا پێشـتر هاوشێوەیان نەبووە لە دوورگەی عەرەبیدا وەك ئەو یاسایانەی لـە یۆنـان و ڕۆمـان هەبوون، چونکە لەناو دوورگەی عەرەبیدا چەندین هـۆزی پەرتـەوازەبوونیان هـەبوو کە هیچڕژێم و سیستەمێك کۆیانی نەکردبووەوەو یەك یاسا و حوکمرانیان نەبووە.

کەواتە ئەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هێناویەتی سروش بووە، لەلایەن خوای پاك و بەرزەوە هاتووە، ئەو سروشەش بیروباوەڕو ئاداب و یاسا و حوکمەکان لە خۆ دەگرێت، لە هەموو ئەو بوارانەی خەڵکی پێویستیان پێی هەیە، هەر لەبەر ئەمەشە قورئان شیاوە بۆ هەموو کات و شوێنێك.

## موعجیزە (دەرئاسا):

**موعجیزە، لە زمانەوانیدا:** وەرگیراوە لە دەستەوەسانی و بێ توانایی (االعَجْز) کە پێچەوانەی توانایە (القدرة)[1].

**لە زاراوەدا:** بریتییە لەو شتەی کە ئامانج و مەبەست لێی دەرخستنی ڕاستگۆیی ئەو کەسەیە کە بانگەشە ئەوە دەکات کە پێغەمبەری خوایە[2].

---

[1] شرح المقاصد ١١/٥، شرح الجوهرة للباجوري ٢٢٠. لە (تبصرة الأدلة ٤٦٨/١) هاتووە: (پیتی "ه" کە خراوەتە سەر وشەی "عجز" بۆ زیاتر جەخت کردنەوەیە، وەك چۆن چووەتە سەر وشەی "العلامة، النسابة، الراوية"، جا ئەم پیتە کە چووەتە سەر وشەکە بۆ زیاتر جەخت کردنەوەیە لەسەر دەستەوەسانی ئەوانەی پەیام و سروش و دەرئاساکەیان بۆ هاتووە).

[2] المواقف وشرحه للسيد الشريف ٢٢/٨-٢٢٣.

یەکێك لە پێناسەکانی موعجیزە، ئەوەیە: کارێکی دەرئاسایە، پەیوەستە بە تەحەدا کردنەوە، بەڵگەیە لەسەر ڕاستی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی و پەیامبەرایەتی، بێ ڕووبەڕوو بوونەوە./ المحصل للرازي ٢٠٧، شرح الجوهرة للباجوري ٢٢٠.

یاخود: بریتییە لە کارێکی دەرئاسا، کە لەسەر دەستی ئەوەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات ڕوودەدات لە کاتی تەحەداکردنی نکۆڵی کاران، بەشێوەیەك کە کەس نەتوانێت هاوشێوەی ئەو کارە بهێنێت و ئەنجام بدات./ شرح العقائد النسفية ١٦٦.

صاڵحی لە (سبل السلام ٥٥٩/٩) وتویەتی: (زانا لێکۆڵەرەکان وتویانە: موعجیزە کارێکی دەرئاسایە و پەیوەستە بە تەحەدا کردنەوە، بەڵگەیە لەسەر ڕاستگۆیی پێغەمبەران "درودو سڵاوی خوایان لەسەر بێت"، ئەم کارە دەرئاسایە چۆن تەحەدای پێدەکرێت ئاوا ڕوودەدات، بێ ئەوەی کەس بتوانێت ڕووبەڕووی ببێتەوە). کاتێك مەرجی پەیوەست بوون بە تەحەدا کردنی باس کردووە وتویەتی: (هەندێك لە زانایان تەحەداکردنیان بە مەرج دانەناوە، چونکە زۆربەی ئەو کارە دەرئاسایانەی لەسەر دەستی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕوودراون تەحەدایان لەگەڵ نەبووە،

## مەرجەکانی موعجیزە

زانا لێکۆڵەرەکان ئەو مەرجانەیان داناوە، بۆ ئەوەی کارە دەراساکە پێی بوترێت موعجیزە[1]:

١- پێویستە شتێك بێت لەلایەن خوای گەورەوە، تا ڕاستگۆیی ئەو کەسە بسەلمێنێت کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات.

جا ئەم شتتەش ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

أ- فەرمایشت: وەك قورئانی پیرۆز.

---

ئەوانەش کە دەڵێن تەحەداکردن مەرجە، وتویانە: ئەو کارە دەرئاسایانەی تەحەداکردنیان لەگەڵدا نەبووە بە موعجیزە دانانرێن، بێگومان ئەم بۆچوونەش پوچەڵە).

لە کتێبی (المواقف وشرحه للسید الشریف ٢٢٩) هاتووە: (ئایا مەرجە دەبێت تەحەدا کردنەکە ڕاشکاوانە بێت، هەروەك هەندێك لە زانایان پێیان وایە؟ لە ڕاستی دا مەرج نییە تەحەداکردنە ڕاشکاوانە بێت، بەڵکو تەنها هاوبەڵگەکان بەسن، بۆ نمونە: بەو کەسەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات بوترێت: ئەگەر تۆ پێغەمبەری دەسا موعجیزەیەکمان بۆ بێنە، جا پێغەمبەرەکە موعجیزەکەی هێنا بەوەی لە خوا پاڕایەوەو خوای مەزنیش داواکەی بۆ جێبەجێ کرد، جا دەرکەوتنی موعجیزەکە بەڵگەیە لەسەر ڕاستگۆییەکەی، هەروەها وەك تەحەداکردنی لێدێت).

لەبەر ئەمە باجوری لە (شرح الجوهرة ٢٢١) وتویەتی: (مەبەست لە موعجیزەکانی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم)بریتین لە کارە دەرئاساکان، کە لەسەر دەستی پیرۆزی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕوودراون جا تەحەدایان پێکرابێت یاخود نا).

[1] ئەمانە باسی ئەم هەشت مەرجانەیان کردووە: الباجوري في الجوهرة ٢٢١، السالمي في مشارق أنوار العقول ١٢/٢ نقلا عن الباجوري.

ئەم مەرجانە بێجگە لە مەرجی هەشتەم هاتوون لە: المواقف و شرحه للسید الشریف ٢٢٣/٨-٢٢٧.

سەیری هەندێك لەو مەرجانە بکە لەم سەرچاوانەدا: أصول الدین للبغدادي ١٧٠-١٧١، الإرشاد للجویني ٣٠٨، االعقیدة النظامیة ٢١٨، تبصرة الأدلة ٤٦٩/١، المقاصد وشرحه للتفتازاني ١١/٥، المسامرة ٢٤٠-٢٤٢، سبل الهدی والرشاد ٥٥٩/٩، کشف المراد ٣٧٧، رسالة التوحید ٩٩، رسالة في التوحید للطائي ٧٣-٧٤، حجة الله علی العالمین في معجـزات سیـــدالمرسلین ٨ و لاپەڕەکانی دواتر، الیواقیت و الجواهر للشعراني ١/ ١٥٦-١٦١.

ب- کردار: وەك هەڵقوڵانی ئاو لە نێوان پەنجەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

پ- فەرامۆش کردن (ترك): وەك چۆن ئاگر پێغەمبەر ئیبراهیمی (سەلامی خوای لێبێت) نەسوتاند.

٢- پێویستە دەرئاسا بێت، شتێکی بەدەر بێت لەوەی خەڵکی خوویان پێوەگرتووەو بۆتە داب و باوو نەریتیان و جار جار ئەنجامی دەدەن.

ئەم مەرجە ئەوە دەگەیەنێت شتێك کە دەرئاسا نەبێت ناکرێت ببێتە موعجیزە، وەك ئەوەی یەکێك بڵێت: بەڵگەی ڕاستگۆیی من هەڵاتنی خۆرە لەو شوێنەی لێی هەڵدێت و ئاوابوونیەتی لەو شوێنەی لێی ئاوا دەبێت.

٣- پێویستە لەسەر دەستی کەسێك دەربکەوێت کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی یان پەیامبەرایەتی دەکات.

واتە: خاوەنی کارە دەرئاساکە دەبێت سەرقاڵی بانگەواز کردن بێت بۆ ئایین، کە مایەی بەختەوەری دونیاو دوارۆژە. بەم پێیەش ئەم شتانەی خوارەوە ناچنە ناو چوارچێوەی موعجیزە:

أ- ڕیسواکردن (الاهانة): بریتییە لەو شتە دەرئاسایەی بەدەر دەکەوێت لەسەر دەستی کەسی لاسارو گوناهبار یاخود بێ باوەڕ وەك بەدرۆخستنەوەیەك بۆی، هەروەك چۆن لەسەر دەستی موسەیلەمەی درۆزن بەدەرکەوت کاتێك تفی کردە ناو چاوی کوێری کەسێك تا چاك ببێتەوە، کەچی ئەو چاوەشی کە کوێر نەبوو لە بینین کەوت.

ب- پلەبەندی (استدراج): بریتییە لەو شتە دەرئاسایەی بەدەر دەکەوێت لەسەر دەستی کەسی لاسارو گوناهبار یاخود بێ باوەڕ، تا زیاتر بەسەرگەردانی خۆی سەرسام ببێت و گومڕاتر بێت، تا ئەو کاتەی فەرمانی خوایان بۆ دێت و ئەوانیش لە بێ ئاگایی دان، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُوا۟ بِمَآ أُوتُوٓا۟ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ۚ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ الأنعام: ٤٤-٤٥.

واته: (ئینجا کاتێك ئەو بەرنامە و ڕێبازەی کە یادیان خرابووەوە فەرامۆشیان کرد، ئێمەش دەروازەکانی هەموو شتێکمان بۆ واڵا کردنەوە و "نازو نیعمەتمان بەسەردا ڕژاندن" هەتا کاتێك دڵخۆش و شادومان بوون بەوەی کە پێیان درا، ئیتر لەناکاو گرتمانن و هەموویانمان سەرگەردان و ڕیسواکرد ئینجا ئەوان بێ ئومێد بوون و بەغەم و پەژارەیەکی زۆرەوە تیاچوون. ئینجا ئیتر ئەو گەلەی ستەمیان کرد و بێ بڕوابوون بنبڕ کران "جا ئەو کاتە بوونەوەر هاوڕێ لەگەڵ ئیمانداران و فریشتەکاندا دەڵێن: سوپاس بۆ پەروەردگاری هەموو جیهان").

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: **(اذا رأيت الله يعطي العبد في الدنيا وهو مقيم على معاصيه ما يحب فانما هو استدراج) ثم تلا هذه رسول الله** (صلى الله عليه وسلم): ﴿ فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ ﴾ الآية، والآية التي بعدها[1].

واته: ئەگەر بينيت، خوای گەورە نازو نيعمەت بە بەندەيەكی بەخشی لە دونيادا، بەندەكەش تا حەز بكات هەر لەسەر تاوان بمێنێتەوە، ئەوە چاك بزانە ئەمە: پلە پلە نزيك بوونە (استدراج)ە، پاشان هەر دوو ئايەتەكەی خوێند.

پ- يارمەتی (المعونة): بريتييە لەو شتە دەرئاسايەی كە لەسەر دەستی كەسێكی سادە و ئاسايی دەردەكەوێت كە دەبێتە هۆی ڕزگار بوونيان لە تەنگ و چەڵەمەيەك.

ت- كەرامەت[2]: ئەو شتە دەرئاسايەيە لەسەر دەستی كەسێكی چاك و لە خواترس و پارێزگار دەردەكەوێت.

---

[1] فەرموودەی: ئەگەر بينيت، خوای گەورە نازو نيعمەت بە بەندەيەكی بەخشی...: أخرجه أحمد و ابن جرير و ابن أبي حاتم و ابن المنذر و الطبراني في الكبير و أبو الشيخ و ابن مردويه و و البيهقي في الشعب عن عقبة بن عامر عن النبي (صلى الله عليه وسلم)./ الدرر المنثور ١٢/٣. وهو في الجامع الصغير ٤٤ وفيه هو حديث حسن ولم يذكر الآية.

[2] كەرامەت: بريتييە لە كارێكی دەرئاسا لەسەر دەستی وەلی و خۆشەويستێكی خوا بەدەر دەكەوێت و پەيوەست نييە بە بانگەشەی پێغەمبەرايەتی.

وەلی: بریتییە لەو خواناسەی کە شارەزاییەکی تەواوی سەبارەت بە خواو سیفەتەکانی هەیە و بەپێی توانای بەردەوامە لەسەر ئەنجامدانی پەرستشەکان و خۆی دوور دەگرێت لە تاوانەکان و خۆیی سەرقاڵ ناکات بە هەواو هەوەس بازی و ئارەزوو تێر کردن.

هۆکاری دەرکەوتنی کەرامەت باوەڕ و پارێزکاری و تەقوایە، خوای گەورە لەم فەرمایشتەیدا وەسفی وەلییەکانی خۆی دەکات: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٤﴾﴾ یونس: ٦٢- ٦٤. واتە: (ئاگاداربن کە بەڕاستی چاکان و خۆشەویستانی خوای میهرەبان نەترس و بیم روویان تێدەکات، نەغەم و پەرژارە و دڵتەنگی دایان دەگرێت. "ئەو بەختەوەرانە" ئەو کەسانەن باوەڕی بەتین و دامەزراوو پڕسۆزیان هێناوە بە پەروەردگاریان و خۆشیان دەپارێزن لە خەشم و قینی خوا. هەر بۆ ئەوانە مژدەی "کامەرانی و بەختەوەری" لە ژیانی دنیادا "کە مژدەی قورئان و فەرموودەیە" لە قیامەتیشدا "مژدەکان دەبنە واقع و هەموو مژدە قورئانیەکان بە زیادەوە دێنەجێ"، بێ گومان ئەو بەڵێنانەی خوا هەر دێنەدی و هیچ گۆڕانێکیان بەسەر نایەت، ئا ئەوەیە سەرفرازی و کامەرانی گەورەو مەزن).

زۆربەی موسڵمانان لە پێشین و پاشینەوە و ئەبو حوسەینی بەصری کە یەکێك بوو لە موعتەزیلەکان، ئەمەیان چەسپاندووەو بڕوایان پێی هەبووە، تەنانەت ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل سەرزەنشتی ئەو کەسەی کردووە نکۆڵی لێ بکات و بە گومڕای داناوە، هەندێ لە موسڵمانان بۆ چوونیان وایە نکۆڵی کردن لەو شتانە لاساری و بیدەعەچێتییە، ئەماانەی خوارەوە بەڵگەکانیان:

أ- قورئانی پیرۆز: بۆ نمونە:

مەریەم بێ جووت بوون لەگەڵ پیاو سکپڕبوو.

کەوتنە خوارەوەی خورمای گەییو بۆ مەریەم (سڵاوی خوای لێبێت) لە دارخورمای وشك، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهُزِّىٓ إِلَيْكِ بِجِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ تُسَٰقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا﴾ مریم: ٢٥. واتە: (ئەو دار خورمایەش "کە پاڵت پێوەداوە" کەمێك ڕایوەشێنە خورمای گەییوت بەسەردا دەبارێت).

بوونی ڕزق و ڕۆزی لەلایەن مەریەم بێ هۆکار، خوای بێ وێنە دەفەرموێت: ﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا قَالَ يَٰمَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ آل عمران: ٣٧. واتە: (هەر کاتێك زەکەریا دەچوو بۆ سەردانی لە شوێنی خواپەرستیەکەیدا دەیبینی ڕزق و ڕۆزی

و نازو نیعمەتی جۆراوجۆری لایە، زەکەریا وتی: ئەی مەریەم ئەو هەموو ڕزق و ڕۆزییەت لە کوێ بوو؟! مەریەم لەوەڵامیدا وتی: ئەوە لەلایەن خواوەیە، ئەو بۆم دەنێرێت).

مانەوەی یارانی ئەشکەوت (أصحاب الكهف) سێ سەد و نۆ ساڵ بێ خواردن و خواردنەوە، خوای پاك و تاك دەفەرموویت: ﴿ وَلَبِثُواْ فِي كَهۡفِهِمۡ ثَلَٰثَ مِاْئَةٖ سِنِينَ وَٱزۡدَادُواْ تِسۡعٗا ﴾ الكهف: ٢٥. واتە: (ئەوسا ئیتر یارانی ئەشکەوت سێ سەد ساڵی تەواو "هەتاوی" لە ئەشکەوتەکەیاندا مانەوە "ئەگەر بەساڵی مانگی حیساب بکەیت" نۆ دانە ساڵی تریشیان خستە سەر "واتە دەکاتە ٣٠٩ ساڵ خەویان لێکەوت").

وەزیرەکەی سولەیمان (سڵاوی خوای لێبێت) (ئاصفی کوڕی برخیا) کاتێك تەختی (بلقیس)ی لەیەك چاوتروکاندا لەو ماوە دوورەدا هێنا: ﴿ قَالَ ٱلَّذِي عِندَهُۥ عِلۡمٞ مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبۡلَ أَن يَرۡتَدَّ إِلَيۡكَ طَرۡفُكَۚ ﴾ النمل: ٤٠. واتە: ("بەڵام یەکێك لە پیاوچاکان" کە زانست و زانیاری لە "نهێنیەکانی" کتێبی تەورات هەبوو وتی: من بۆت دەهێنم بەچاو تروکانێك).

ب- ڕێژەیەکی زۆر لە کەرامەت لە ژمارەیەکی زۆری هاوەڵانەوە هاتووە کە ناکرێ نکۆڵی لێ بکرێت، بۆ نمونە:

کاتێك عومەری کوڕی خەتتاب (خوای لێ ڕازی بێت) سوپایەکی نارد بۆ ناوچەی نەهاوەند بە فەرماندەیی یەکێك بەناوی (سارية)، جا کاتێك عومەر (لە مەدینە) وتاری دەدا، ئەوا لەسەر دوانگە (منبر) هاواری دەکرد: (يا سارية الجبل) واتە: ئەی (ساریە) پشت بە چیاکە ببەستە. ئینجا دواتر نوێنەری سوپاکە هاتە مەدینە ئیمامی عومەر پرسیاری بارودۆخەکەی لێکرد: ئەویش وتی لەگەڵ دوژمنەکان ڕووبەڕوو بووینەوەو ئێمەیان تێکشکاند، لەوکاتە کەسێك هاواری دەکرد: ئەی (ساریە) پشت بە چیاکە ببەستە، ئەی (ساریە) پشت بە چیاکە ببەستە، ئێمەش پشتمان دا بە چیاکە بەمەش خوای گەورە ئەوانی تێکشکاند.

کاتێك خالیدی کوڕی ولید (خوای لێ ڕازی بێت) گەمارۆی قەڵایەکی تووندو تۆڵی دا، دانیشتووانی قەڵاکە وتیان ئێمە خۆمان بەدەستەوە نادەین تا خالید ژەهر نەخواتەوە، خالید ژەهرەکەی خوارد و هیچ زیانی بۆی نەبوو.

پ-چەسپاندنی کەرامەت بۆ وەلی چەسپاندنی موعجیزەیە بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، چونکە هیچ کەسێك نابێتە وەلی تا ڕاستگۆ و ساغ نەبێت لە ئایینەکەیدا، ڕاستگۆییەکەیشی بریتیە لە داننان بە زمان و دڵ بە پەیامی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ملکەچ بوون بۆ فەرمانەکان و ڕێگرییەکانی، لەبەرئەوەی وەلی ئەگەر بانگەشەی سەربەخۆیی کرد و خۆی بەشوێن کەوتووی پێغەمبەر دانەنا، ئەو کەسە نابێتە وەلی، ئەو دەرئاسا و کەرامەتەش کە دەردەکەوێت لەسەر دەستی پلەی ویلایەت نییە، بەڵکو وەك پلەبەندیی (استدراج)ە.

ت- کەرامەت شتێکی شیاوە بۆ بوون، بوونی شتە شیاوەکانیش پەیوەستن بە توانای هەمەلایەنی خوای گەورە، هەر شتێکیش شیاوی بوون بێت پەکی توانای خوای گەورە ناخات.

ئەوانەی نکۆڵیان لە کەرامەت کردووە: (ئەبو ئیسحاقی ئیسفەرایینی و (حلیمی) کە لە ئەشعەرییەکانن و زۆربەی موعتەزیلەکان و ئیبن حەزمی زاهیری، ئەمەش بەڵگەکانیانن:

کەرامەت بە موعجیزە دەچێت و جیاوزییان نییە، ئەگەر کەرامەت هەبێت ئەوا مانای وایە موعجیزە بەڵگە نییە لەسەر پێغەمبەرایەتی، بۆیە دەرگای سەلماندنی بوونی کەرامەت داخراوە.

بەڵام بەرپەرچی ئەم بەڵگەیەیان دراوەتەوە بەوەی:

١- کەرامەت بە دەقی قورئان چەسپاوە، کەواتە بەتەواتور هاتنی کەرامەت لە هەموو سەردەمێکدا ڕاستە و ناکرێت نکۆڵی لیٚ بکرێت.

٢- موعجیزە بەو تایبەتمەندیانەی خوارەوە لە کەرامەت جیا دەبێتەوە:

أ- موعجیزە بەوە جیا دەکرێتەوە کە تەحەدای پیٚ دەکرێت، بەڵام تەحەددا بە کەرامەت ناکرێت.

ب- موعجیزە پەیوەستە بە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی، بەڵام کەرامەت پەیوەست نییە بە بانگەشەی پێغەمبەرایەتیەوە، خاوەن کەرامەت بانگەشەی پێغەمبەرایەتی ناکات، بەڵکو شوێنکەوتوو و دەستگرە بە ڕێبازو شەریعەتی پێغەمبەر، ئەگەر خاوەن کەرامەت بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بکات ئەوا شیاوی نەفرەت و ریسوا کردن دەبێت، بەم پێیە کەرامەت و موعجیزە تێکەڵ نابن.

پ- پێغەمبەران لە توانایاندا هەیە هەر کاتێك داوای موعجیزە بکەن، ئەوا موعجیزەکە ڕوودات، چونکە خوای گەورە ئەمەی پیٚ بەخشیون، ئینجا ئەو داوا کردنەی پێغەمبەران چ بە ویستی خۆیان یان بە پێشنیاری ئوممەت بێت. بەڵام سەبارەت بە کەرامەت دەکریٚ وەلی بتوانێت هەندیٚ جار بیخاتەڕوو و هەندیٚ جاریش نەتوانێت.

ت- پێغەمبەران موعجیزەکانیان وەك بەڵگە دەهێننەوە بەسەر هاوبەش دانەران لەبەر ئەوەی دڵیان ڕەقەو بڕوا بەخوای پاك و تاك ناهێنن، بەڵام ئەولیاکان کەرامەت وەك بەڵگە بەسەر دەروونی خۆیاندا دەخەنەڕوو تا دەروونیان ئارام و دڵنیا بێت و نەشڵەژێت و لەکاتی نەبوونی ڕزق هەڵپە نەکات، چونکە نەفس هەردەم فەرمان بەخراپە دەکات و نکۆڵی دەکات و هاوبەش بڕیار دەدات و گومان دەنێتەوە و دڵنیا نییە لەو ڕزقەی کە خوای گەورە پێیداو.

ج- هەرچەندە ژمارەیەکی زیاتری موعجیزە بە پێغەمبەران بدرێت، ئەوا چاکتر واتای پێغەمبەرایەتی و گەورەییان دەدرەوشێتەوە، جا ئەوانەی خاوەن کەرامەتن هەرچەندە کەرامەتیان زیاتر بێت ئەوا پارێزکارتر دەبێت نەك ئەو کەرامەتەی بریتی بێت لە فریودانی نهێنی یاخود پلەبەندی(استدراج) یان پاداشتیان تەنها ئەو کارە دەرئاسایە بێت لەلایەن خواوە و هۆیەك بێت بۆ نەمانی پلەو پایە مەزنەکەیان لەلایەن خوای گەورە.

٤- ئەو دەرئاسایە پێش بانگەشە کردنی پێغەمبەرایەتی نەکەوێت، بەڵکو یان دەبێت هاوتا یاخود کەمێك دوا بکەوێت لە بانگەشەکە، بەشێوەیەك دواکەتنەکە لە نەریتی باو دەرنەچێت.
لەبەر ئەوەی موعجیزە گەواهی و شایەتیەکە لەلایەن خواوە دەدرێت لەسەر ڕاستگۆیی ئەو کەسەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات، ناشبێت شایەتیش بە پێش بانگەشە بکەوێت.
بەم پێیە: دەرئاسایە ڕێخۆشکەرەکان (إرهاص: داتاشراوە لە وشەی "أرهصت الحائط" واتە: دیوارەکەم دروست کرد)، جا دەرئاسای ڕێخۆشکەر بریتییە: لەو دەرئاسایانەی ڕێخۆشکەرن بۆ پێغەمبەرایەتی و دەست پێکن بۆی، وەك: ئەو هەورانەی سێبەریان لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەکرد پێش ڕەوانەکرانی وەك پێغەمبەر. هەروەها لەت کردنی سینەی. قسە کردنی عیسا لە بێشکەدا. ئەم کارە دەرئاسایە ڕێخۆشکەرانە کەرامەتن،چونکە پێغەمبەران بەر لە پێغەمبەرایەتی پلەیان لە پلەی ویلایەت کەمتر نییە.
٥- پێویستە شتە دەرئاساکە کۆك بێت لەگەڵ بانگەشەی پێغەمبەرایەتیەکە.

---

بگەڕێوە بۆ ئەم سەرچاوانە: شرح العقائد النسفية للتفتازاني ١٧٥ و ١٧٧، شرح المقاصد للتفتازاني ٧٢/٥ و ٧٥، الإرشاد للجويني ٣١٦، تبصرة الأدلة ٥٣٦/١، شرح العقائد العضدية للدواني ٢٨٢/٢، شرح الخريدة للدردير وحاشية الصاوي عليه ١١٣، لوامع الأنوار البهية ٣٩٢/٢ و ٣٩٣ و ٣٩٤ و ٣٩٦ باسی مەرجەکانی وەلی کردووە، الرسالة القشيرية ١٥٨ و لاپەڕەکانی دواتر، كتاب الفرقان بين أولياء الرحمن و أولياء الشيطان لإبن تيمية، شرح الجوهرة للباجوري ٢٥٣، حجة الله على العالمين في معجزات سيد المرسلين، اليواقيت والجواهر ١٦٠/١-١٦٢. رسالة التوحيد لمحمد عبده ٢٣٦، الفرقان لإبن تيميه ٨٩، المواقف وشرحه للسيد الشريف ٢٨٨/٨، سبل الهدى والرشاد ١٠/ ٨١٠ و ٨١١، أصول الدين للغزنوي ١٦٢، الإرشاد للجويني ٣١٦، التمهيد للامشي ٩١، المحصل للرازي ٢٢١، الفصل لإبن حزم ١٠٩/٥، شرح العقائد النسفية لرمضان أفندي ٢٨٩-٢٩٠، اللمع للطوسي ٣٩٣.

واتە: هەر شتێکی دەرئاسا دژو پێچەوانەی بانگەشەکە بێت موعجیزە نییە، هەروەك یەکێك بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بکات و بڵێت بەڵگەی ڕاستگۆیی من: لەت بوونی دەریایە، کەچی چیا لەجیاتی دەریالەت ببێت.

٦- دەرئاساکە بەدرۆخەرەوەی بانگەشە کارەکە نەبێت.

هەر شتێکی دەرئاسا بانگەشە کارەکە بەدرۆ بخاتەوە، ئەوا ئەو دەرئاسایە پێی ناوترێت موعجیزە، بۆ نمونە ئەگەر بانگەشە کارەکە وتی بەڵگەی ڕاستگۆیی من: بە دەنگ هاتنی ئەو شتە بێگیانەیە، جا شتە بێگیانەکە بەدەنگ بێت و بڵێت بانگەشە کارەکە درۆزنە، ئەمە نابێتە موعجیزە.

٧- کەس نەتوانێت ڕووبەڕووی دەرئاساکە ببێتەوە.

بەم پێیەش ئەم شتە دەرئاسایانە ناچنە ناو چوارچێوەی موعجیزە:

جادوو: چەند ڕێسایەکە بە خوێندنەوە بەدەست دەهێندرێت و بەگرتنەبەری ئەو ڕێسایانە کاری نامۆ ئەنجام بدرێت.

پێشبینی (الکهانة): بریتییە لە پێشبینی کردنی شتی شاراوەو غەیبی بەبێ بەڵگە.

چاوبەستی (الشعوذة): بریتییە لە شت شاردنەوە لە دەستدا و چاو پێی هەڵخەڵەتاندن، وا دەزانرێ ڕاستەقینەیە کەچی ڕاستەقینە نییە. هەروەك جادووگەرانیش دەتوانن کاری وا بکەن.

٨- نابێت ئەو کارە دەرئاسایە لەو سەردەم و ڕۆژگارەدا بێت کە کاری دەرنەریت و دەرئاسایی ڕووبدەن، وەك: هەڵاتنی خۆر لە خۆرئاواوە، چونکە ئەو شتە دەرئاسایەی سەرهەڵدەدات لەکاتی دەرکەوتنی نیشانەکانی قیامەت و کۆتایی ئەرکدارییەکان نابێتە بەڵگە لەسەر ڕاستێتی بانگەشەکە، چونکە سەردەم و ڕۆژگارەکە بریتیە لە سەردەمی هەڵوەشانەوەی نەریت و عادەت، واتە هەموو ڕووداوەکان دەرنەریت و دەرئاسان لەو سەردەمدا.

## موعجیزەی پێغەمبەر بەڵگەی ڕاستگۆییەکەیتی

مەبەست لە دەرکەوتنی موعجیزە بریتییە لەوەی بزانرێت پێغەمبەر یان پەیامبەرەکە ڕاستگۆیە، هەروەك ئەوەش دەگەیەنێت کە خوای گەورە بە ڕاستی دادەنێت، ئەمە وەك ئەوە وایە - هەروەك (ئیمامی حەرەمەین) وتویەتی - کە خوای گەورە بفەرموێت: کردم بە پێغەمبەر یاخود پەیامبەرایەتیم لەناخیدا دامەزراند[1].

## موعجیزەی هەرپێغەمبەرێك لەو لایەنەدابووە کە خەڵکی سەردەمەکەی دەستی باڵایان تیادا هەبووە

موعجیزەکانی پێغەمبەران کە داب و نەریت و عادەتیان شکاندووە، ئەوا دژەکانیان دەستەوەسان کردووە لەوەی بتوانن ڕووبەڕوو ببنەوە، لەگەڵ ئەوەی دژەکان تەواو پێگەیشتوون لەو بوارەی موعجیزەکە تیایدا ڕوویداوەو گرنگی زۆر بەو لایەنە دەدن و پێداویستی تەواویشیان لەبەر دەستە.

[1] شرح المقاصد ٥/١٨، نهاية الإقدام ٤٢١.
نمونەی ئەمە وەك ئەو کەسەیە کە لەبەردەم جەماوەرێکی زۆرەوەو بە ئامادەبوونی پادشایەکی داپۆشراو بانگەشەی ئەوە بکات کە نوێنەری پاشاکەیە. جا ئەگەر بانگەشەکەرەکە لە ناو ئەو جەماوەرە هەڵسا و وتی: خەڵکینە من نوێنەرو پەیامبەری ئەم پاشایەم بۆ ئێوە، بەڵگەی ڕاستگۆیی منیش ئەوەیە ئەگەر داوا لە پاشا بکات داپۆشەرو پەردەکە بجوڵێنێت ئەوا دەیجوڵێنێت، دوای ئەمە وتی: ئەی پاشا، ئەگەر من ڕاستگۆیم لەوەی بانگەشەی پەیامداری تۆ دەکەم ئەو داپۆشەرو پەرددەیە بجوڵێنە، جا ڕاستەوخۆ پەردەکە جوڵا، ئەوا بەدڵنیاییەوە دەزانرێت کە بەم پەردە جوڵاندنە پاشاا ویستویەتی ڕاستگۆیی بانگەشەکەرەکە بسەلمێنێت. جا ئەم پەردە جوڵاندنەی لەلایەن پادشاوە جێگەی بە ڕاست دانان دەگرێتەوە. جا ئەو شتانەی کە ڕاستی موعجیزەکە دەسەلمێنن بریتین لە کۆبوونەوەی ئەم چەند شتانە: دەرئاسا بوون و نەریت شکاندن، پەیوەست بوون بە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی، نەبوونی ڕووبەڕوو بوونەوە، گشت ئەم شتانە بەڵگەن لەسەر ڕاستگۆیی بانگەشەکەرەکە، وەك ئەوەیە بە گوفتار دان بە ڕاستگۆییەکەیدا بنرێت./ نهاية الإقدام ٤٢١-٤٢٢.

بۆیە موعجیزەی هەر پێغەمبەرێك، لە هەمان ئەو لایەنەدا بووە، کە خەڵکی سەردەمەکە دەستێکی باڵایان تیایدا هەبووەو داهێنانیان تێدا کردووەو لەپێناویدا تیاچوونەوەو شانازیشان پێی کردووە، گەلی داود بە مۆسقا بە ناوبانگ بوون، کەچی نەیانتوانی ڕووبەڕووی موعجیزەی پێغەمبەر داود (سەلامی خوای لێبێت) ببنەوە کە دەنگە خۆش و ئاوازەکەی بوو.

گەلی موسا بە جادووگەری بەناوباگ بوون، کەچی نەیاتوانی ڕووبەڕووی موعجیزەکەی موسا (سەلامی خوای لێبێت) ببنەوە کاتێك گۆپاڵ (عصا)کەی دەبووە مار.

گەلی عیسا لە زانستی پزیشکیدا باڵادەست بوون و ناوبانگیان بە زانستی ناوبراو دەرکرد بوو، کەچی نەیاتوانی ڕووبەڕووی عیسا (سەلامی خوای لێبێت) ببنەوە کاتێك مردووی زیندوو دەکردەوەو بەڵەك و لاڵی زکماکی چاك دەکردەوە.

عەرەبەکان کە گەلی پێغەمبەر موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) بوون، بە ناوبانگ بوون بە ڕەوانبێژی و جوانبێژی، کەچی نەیانتوانی ڕووبەڕووی موعجیزەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)ببنەوە، کە قورئانی پیرۆزە لە بواری ڕەوانبێژی دا[1].

## حوكمی باوەڕ بوون بە موعجیزە

بڕوا بوون بەوەی خوای گەورە پشتگیری پێغەمبەران و پەیامبەرانی کردووە بە موعجیزەکان پێویستە، دروست نییە مرۆڤ هیچ جۆرە بۆچوونێکی تر پێچەوانەی ئەمە پەسەند بکات، چونکە سەلماندنی پێغەمبەرایەتی تەنها بە کۆبوونەوەی دوو شت دەبێت:

**یەکەمیان:** بانگەشە کردنی پێغەمبەرایەتی.

**دووەمیان:** دەرخستنی موعجیزە، تا ڕاستگۆییەکەی دەربکەوێت لەبەردەم ئەو خەڵکانەی کە بۆیان ڕەوانەکراوە.

[1] المقاصد وشرحه ١٨/٥، الإنصاف للباقلاني ٦١-٦٢، أعلام النبوة للماورديب ٥٧، المواقف وشرحه للسيد الشريف ٢٥٢/٨، البرهان للزركشي ٩٨/٢، سبل الهدى والرشاد ٥٧٣/٩ الغنية للشيخ عبدالقادر ٨٤/١.

خوای بێ وێنه دەفەرمووێت: ﴿ وَتِلْكَ حُجَّتُنَآ ءَاتَيْنَٰهَآ إِبْرَٰهِيمَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ ﴾ الأنعام: ٨٣.
واته: (ئەو وتوێژو لێكۆڵینەوانه بەڵگەو نیشانەی ئێمە بوون، كاتێك بەخشیمانن بە ئیبراهیم لەسەر گەلەكەی و زاڵ بوو بەسەریاندا).

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێت: **(ما من الأنبياء من نبي الا قد أعطي من الآيات ما مثله آمن عليه البشر، وإنما كان الذي أوتيتُ وحياً أوحى الله إليّ. أرجو أن أكون أكثرهم تابعاً يوم القيامة)**[1] واته: له پێغەمبەراندا هیچ پێغەمبەرێكیان نەبووه كه بەڵگەی وای پێنەبەخشرا بێت كه وێنەی ئەوه خەڵك ئیمانی پێهێناوه ئەوەی منیش هێناومه وەحییه خوا ناردویەته سەرم، خوازیارم له هەموویان شوێنكەوتووم زیاتر بێت[2].

ئەو ڕێگەی كه خوای گەوره ڕاستگۆیی پێغەمبەران پیشانی بەندەكانی دەدات، وەكو ئەو ڕێگەیەیه كه یەكتایی خۆی بەوان ناساندووه له ڕێگەی بەڵگه ڕێنیشاندەرەكانی، جا پێناساندن چ به گوفتار چ به كردار وەك یەكه[3].

## گومانێك و بەرپەرچەكەی

هەندێ له لێكۆڵەره هاوچەرخەكان نكۆڵی دەكەن له موعجیزەكان، بەم بەڵگانەی خوارەوه:

أ- دەرچوونه لەو نەریت و باوەی كه مرۆڤ خوی پێوه گرتووەو بینراوه.

---

[1] فەرموودەی: له پێغەمبەراندا هیچ پێغەمبەرێكیان نەبووه... تاد: صحيح البخاري ٩٦ كتاب الإعتصام بالكتاب والسنة، ١ باب قول النبي (صلى الله عليه وسلم) بعثت بجوامع الكلم، رقم ٧٢٧٤، عن أبي هريرة (رضي الله عنه). وفي صحيح مسلم، واللفظ له، في ١ كتاب الإيمان، ٧٠ باب وجوب الإيمان برسالة نبينا محمد (صلى الله عليه وسلم) إلى جميع الناس...، رقم ١٥٢، عن أبي هريرة (رضي الله عنه).

[2] دەقی كوردی ئەو فەرموودەیەم وەرگرتووه له: (پوختەی صحيح موسليم: زكي الدين عبدالعظيم عبدالتوی المنذري. وەگێڕانی: لیژنەیەك. ١/٣٠). (وەرگێڕ).

[3] نهاية الإقدام ٤٢٥.

ب- لەبەر ئەوەی زانستی سەردەم و بنەماکانی توێژینەوە، وا بە پێویست دەزانن، کە لەم بارەدا پشت بە گێڕانەوەو خەبەرەکان نەبەسترێت.

بەرپەرچی ئەم بۆچوونە ئەوەیە:

١- بێگومان رێگەی چەسپاندن و سەلماندنی موعجیزەکان شتێکی دروست و ڕاستە، هەندێك لەو موعجیزانەی لە قورئانی پیرۆزو هەندێکی تریشیان لە فەرموودەی ڕاست و دروستدا هاتوون کە دەکرێت بگەنە پلەی تواتر.

جا نکۆڵی کردن لەو موعجیزانە نکۆڵی کردنە لە قورئانی پیرۆزو گێڕانەوە ڕاستەکانی فەرموودەی بەپێز، تەنانەت دەبێتە هۆی نکۆڵی کردن لە هەموو ئەو هەواڵە ئاییني و نا ئایینیانەی کە بە ڕێگەیەکی ڕاستی موتەواتر پێمان گەیشتوون، تەنانەت ئەگەر لە نەوەی پێش خۆشمانەوە بێت.

٢- فەرامۆش کردنی موعجیزەکان و باوەڕ پێ نەهێنانیاان، هەنگاوی یەکەمە بۆ نکۆڵی کردن لە شتە شاراوەو غەیبیەکان و لەسەرووی هەمووشیانەوە بڕوابوون بەخوا. بەمەش ڕووخاندنی شەریعەتی ئیسلامی لە بناغەیەوە دێتە ئارا.

٣- یاسا و ڕێساکانی بوونەوەر خۆی لە خۆیدا موعجیزەن، چونکە بەدیهێنانی مرۆڤ و پێکهاتە سەیرو سەمەرەکەی بەشەکانی موعجیزەیە، بەهەمان شێوە بەدیهێنانی دارو ئاو و بێ گیان و گیاندارەکانی تر هەر هەموویان بەخودی خۆیان موعجیزەن. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو کەسەی ئەو شتانەی بەدیهێناوەو سەرپەرشتی کردووە بەو شێوە ئیعجاز بەخشە، کە خوای گەورەیە، توانای هەیە کە شێوازی ئەو شتانە بگۆڕێت، جا موعجیزە دەچێتە چوارچێوەی ئەو شتانەی شیاوی بوونن نەك ئەستەم، ئەمەش شتێکی زانراوەو پێویست بە بەڵگە ناکات.

٤- یەکدەنگی نەوە یەك لەدوای یەکەکان لەسەر بوونی موعجیزە، هەر لەبەر ئەمەش باوەڕیان بە پێغەمبەران و پەیامبەران هێنا.

# دەروازەی سێیەم

## پێغەمبەرایەتی بەشێوەیەکی تایبەت:
## پێغەمبەرایەتی سەروەرمان موحەممەد
## (صلی الله علیه وسلم)

### سەلماندنی پێغەمبەرایەتی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)

پێشتر ئەوە خرایەڕوو کە پێغەمبەرایەتی تەنها بە کۆبونەوەی دوو شت دەبێت:

**یەکەم:** بانگەشە کردنی پێغەمبەرایەتی.

**دووەم:** دەرخستنی موعجیزە.

هەر کەسێك بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کرد و موعجیزەی دەرخست، ئەو کەسە پێغەمبەرە.

ئەو دوو شتانەش پێغەمبەرایەتی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) دەسەلمێنن، تەنانەت ئەو شتانە بنچینەی سەرەکین لە سەلماندنی پێغەمبەرایەتی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) و هەندێ شتی تریش هەن کە گەواهیدەرو جەخت کەرەوەن لەسەر پێغەمبەرایەتی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم).

ئێستاش هەردو ئەو شتانە کە پێغەمبەرایەتی پەیامبەری مەزنی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) دەسەلمێنن ڕوون دەکەینەوە، کە بریتین لە:

### یەکەم:بانگەشە کردنی پێغەمبەرایەتی

بە شێوەی تەواتور لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) هاتووە بێ ڕاجیایی کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بەشێوەیەکی ئاشکرایی و بینراوی کردووە.

## دووەم: دەرخستنی موعجیزە

لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) چەسپاوە کە موعجیزەی دەرخستووە.

## موعجیزەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

موعجیزەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دوو جۆرن[1]:

**جۆری یەکەم**:ئەم جۆرەیان وەك موعجیزەکانی پێغەمبەرو پەیامبەرانی پێشوو ماوە کورت بوونە، نەماون و فەوتاون بە تێپەڕبوونی ڕۆژگارەکانیان و بەمردنی ئەوانەی بینیان، ئەوەی دەشیەوێت لێیان بکۆڵێتەوە، ئەوا هیچ شتێکی بەردەست ناکەوێت تەنها لە هەواڵ و خەبەرەکاندا نەبێت، وەك موعجیزەکانی موسا (سەلامی خوای لێبێت) لە: هەڵگەڕانی گۆپاڵ بۆ مار، شەق کردنی دەریا.هەروەها موعجیزەکانی موسا کە لاڵ و بەڵەکی زگماکی چاك دەکردەوەو مردووی زیندوو دەکردەوە... تاد.

هەندێك لەو جۆرە موعجیزانە هەیانە بە دەقی قورئانی پیرۆز بۆمان چەسپاوە یان لەڕێگەی هەواڵی موتەواتر بۆ ئێمە هاتوون، بۆ نمونە:

١- لەت بوونی مانگ بە دەقی قورئانی پیرۆز چەسپاوە: ﴿ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ ۝١ وَإِن يَرَوْا۟ ءَايَةً يُعْرِضُوا۟ وَيَقُولُوا۟ سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ ۝٢﴾ القمر: ١- ٢. واتە: (ڕۆژی قیامەت نزیك بۆتەوەو مانگیش لەت بوو. خۆ ئەگەر ئەوانە هەر موعجیزەو بەڵگەیەك ببینن پشت هەڵدەکەن و دەڵێن: جادوویەکی بەردەوامە).

فەرموودە لەسەر ئەمە گەلەك زۆرن، لە صەحیحی بوخاری و موسلیم و سەرچاوەکانی تریش بە چەندین ڕێگە هاتوون.

٢- هەڵقوڵانی ئاو لە نێوان پەنجەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کاتێك ئەو خەڵکەی کە لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بەدوای ئاودا دەگەڕان بۆ

---

[1] سەیری ئەم سەرچاوانە بکە کە لەسەر موعجیزەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)دواون: المواقف وشرحه للسيد الشريف ٢٥٦/٨، المقاصد وشرحه للتفتازاني ٢٥/٥، الإنصاف للباقلاني ٦٢، تبصرة الأدلة ٤٨٧/١، سبل الهدى والرشاد ٥٧٤/٩ و ج ١٠، شرح الجوهرة للباجوري ٢٢٩، وحجة الله على العالمين في معجزات سيد المرسلين.

دەستنوێژ بەڵام دەستیان نەکەوت، جا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) داوای کرد دەفرێکی بۆ بێنن کە ئاوی تێدابێت، بۆیان هێنا دەستی موبارەکی خستە ناو ئەو دەفرەوە، بەمەش ئاو هەڵقوڵا لەنێوان پەنجەکانی دەستی، خەڵکەکە تا دوایین کەسیان دەستنوێژیان شۆرد.

ئەم موعجیزەیە چەندین جار دووبارە بووەتەوە، هەروەك لە صەحیحی بوخاری و موسلیم و سەرچاوەکانی تریشدا چەسپاوە.

٣- چاك بوونەوەی نەخۆش، بەدەست پێداهێنانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەروەك لە صەحیحی بوخاری و موسلیم و چەند سونەنێکدا لە چەندین ڕووداوی جیا جیادا هاتووە.

٤- هەواڵدانی بە ڕوودانی ڕووداو بەر لەوەی ڕووبدات، ئەم جۆرەش گەلەك زۆرە، بۆ نمونە:

أ- ئەبو داود لە سەوبانەوە هێناویەتی، وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: **(یوشِك الأمَمُ أن تَداعی علیكم، كما تَداعی الأكلةُ اِلی قصعتها، فقال قائل ومن قِلّة نحنُ یومئذ؟ قال: بل أنتم كثیر، ولكنكم غُثاءٌ كغُثاء السیل، ولیَنْزِعَنَّ الله من صدور عدوكم المَهابةَ منكم، ولَیَقْذِفَنَّ الله في قلوبكم الوهن، قال قائل: یارسول الله وما الوهن؟ قال: حب الدنیا وكراهیة الموت)**[1] واتە: نزیکە ڕۆژێك بێ کە کۆمەڵانی کافر لێتان کۆ ببنەوەو دەستتان بۆ درێژ بکەن، وەك چۆن کە کۆمەڵە خەڵکێك لەسەر سفرەی خواردنەکەیان دادەنیشن و هەر یەکەیان دەستی بۆ درێژ دەکات و بەشی خۆی دەپچڕێنێت. یەکێك وتی: ئایا لەم ڕۆژەدا ئێمە کەمین، لەبەر کەمی ژێرە وامان لێدێت؟ فەرمووی: نەخێر ئێوە زۆرن، بەڵام وەك کەفی سەر ئاو وان، خوا ترسی ئێوەی

[1] فەرموودەی: نزیکە ڕۆژێك بێ کە کۆمەڵانی کافر... تاد: أبو داود: ٣١ كتاب الملاحم، ٥ باب تداعي الأمم على الاسلام، رقم ٤٢٩٧، عن ثوبان.

لە دڵی دوژمنانتاندا دەردێنیٚ و بێهێزی دەخاتە دڵی ئێوەوە، یەکێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بیٚ هێزی (وهن) چیە؟ فەرمووی: خۆشویستنی دونیاو ڕق لیٚ بوونەوە لە مردن.

ئەو کەسەی سەیری بارودۆخی موسڵمانان بکات دوای توانەوەو نەمانی دەسەڵاتیان لەسەر زەوی، دەبینێت جیهان زۆر تامەزرۆیە و پیلانی گەلەك زۆر لە ئارادایە لە دژی موسڵمانان لەگەڵ زۆریی ژمارەی موسڵمانان.

ب- پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (**صِنْفَان مِن أهل النار لم أرَهما: قومٌ معهم سياط كأذناب البقر، يَضربون بها الناس، ونساءٌ كاسياتٌ عارياتٌ مُمِلاتٌ مائلات، رؤوسهُن كأسنِمة البُخْت المائلة، لا يدخُلْنَ الجنة، ولا يجِدْنَ ريحها، وانَّ ريحها لَيوجدُ من مَسيرة كذا وكذا**)[1] واتە: دوو دەستە لە ڕیزی خەڵکانی ناو دۆزەخن کە نەمدیون: خەڵکانێك کە قەمچیان پێیە، هەروەك کلکی مانگا لە خەڵکی دەدەن. و ئافرەتانێك کە پۆشتەن، بەڵام وەك ڕووت "جلەکانیان یان تەنگ و تەسکە یان تەنکە یاخود کورتە" ڕووتن و لادەرن لە ڕاستی و هاندەری ئافرەتانی تریشن، بەفیزو لارو لەنجەوە دەڕۆن بە ڕێوە، قژیان وەك کۆپارەی حوشتر بەرز کردۆتەوە کە کۆپارەکە ئەوەندە قەبەیە لە قەڵەویدا لاردەبێتەوە، ئەوانە نەدەچنە بەهەشت و نەبۆنیشی دەکەن لە کاتێکدا کە بۆنی بەهەشت لە دووری ئەوەندە و ئەوەندەوە دێت.

ئەوەی لە دوای چەند سەدەیەکی سەرەتاوە تەماشای ئوممەتی ئیسلام بکات. ئەوا جۆری یەکەمی بەبەرچاو دەکەوێت، لەوەی ستەم بڵاوبوەتەوەو خەڵکی ئازار

---

[1] فەرموودەی: دوو دەستە لە ڕیزی خەڵکانی ناو دۆزەخن... تاد: صحیح مسلم: ٣٧ كتاب اللباس و الزينة، ٣٤ باب النساء الكاسيات العاريات...، رقم ٢١٢٨، عن أبي هريرة (رضي الله عنه). و ٥١ كتاب الجنة و صفة نعيمها وأهلها، ١٣ باب النار يدخلها الجبارون...، رقم ٢١٢٨م (٥٢)، عن أبي هريرة (رضي الله عنه).

البخت: وشتری خوراسانین. تاکەکەی بریتیە لە: بختي و بختية.

دەدرێن و لەم سەردەمەشماندا دەبینێت كە فەرموودەكە وێنەیەكی وردی كێشاوە بۆ ڕووت و قوتی و بەرەڵایی و فیتنەی ئافرەتان.

٣- ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) : **(لَيَأْتِيَنَّ على الناس زمانٌ، لا يبقى منهم أحد الا أكل الربا، فإن لم يأكله، أصابه من غباره)**[١] واتە: سەردەمێك دێت بەسەر خەڵكیدا، هیچ كەسێك نابێت سوو (ڕیبا) نەخوات، ئەگەر یەكێك هەوڵیش بدات نەیخوات ئەوا تۆزی سووەكەی بەرئەكەوێت.

شتێكی زانراوە كە ژیانی ئێستای ئابوری و خەرجی و لایەنەكانی تریش لەسەر سوو (ڕیبا) وەستاوە، ئەم فەرموودەیەش هەواڵی ئەو بارودۆخەی ئێمەی داوە تیایداین.

٤- بوخاری و مسلیم لە ئەبو هورەیرەوە (خوای لێ ڕازی بێت) گێڕاویانەتەوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: **(لا تقوم الساعة تخرجَ نارٌ من أرض الحجاز، تُضيء أعناق الابلِ ببُصْرَى)**[٢] بوصرا: شارێكە لە شام. واتە: (قیامەت هەڵناسێت، تا ئاگرێك لە خاكی حیجازەوە دەرنەچێت، لە بوصرا ملی حوشتری پێ ڕووناك نەبێتەوە)[٣].

---

[١] فەرموودەی: سەردەمێك دێت بەسەر خەڵكیدا... تاد: أخرجه أبو داود وابن ماجه و الحاكم في المستدرك عن أبي هريرة (رضي الله عنه) وهو صحيح./ الجامع الصغير ٤٦١.

[٢] فەرموودەی: (قیامەت هەڵناسێت، تا ئاگرێك دەرنەچێت... تاد: بوخاری و موسلیم هاوبەشن لە گێڕانەوەیدا./ اللؤلؤ واالمرجان ٨١٣. رواه البخاري في صحيحه: ٩٢ كتاب الفتن، ٢٤ باب خروج النار، رقم ٧١١٨، عن أبي هريرة (رضي الله عنه). ومسلم في صحيحه: ٥٢ كتاب الفتن وأشراط الساعة، ١٤ باب لا تقوم الساعة حتى تخرج نار من أرض الحجاز، ٢٩٠٩، عن أبي هريرة (رضي الله عنه). و بهذا اللفظ في سنن أبي داود: ٥٢ كتاب الفتن، ١٤ باب لا تقوم الساعة حتى تخرج نار من أرض الحجاز، رقم ٢٩٠٩، عن أبي هريرة (رضي الله عنه).

[٣] دەقی كوردی ئەو فەرموودەیەم وەرگرتووە لە: (پوختەی صحیح موسلیم: زكی الدین عبدالعظیم عبدالتوی المنذري. وەگێڕانی: لیژنەیەك. سەیری ٢/١٠٠٦ بكە). بە كەمێك دەستكارییەوە. (وەرگێڕ).

هەواڵیان پێداوین لەبارەی گڕکانێکی زۆر گەورە لەو شوێنەی کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەواڵی لەبارەوە دابوو، پێشەوا نەوەوی وتویەتی: بە شێوەیەکی تەواتر هەواڵی ئەم ڕووداوە لە دانیشتووانی شامەوە هاتووە. سەمهودی وەسفی بومەلەرزەو و دەنگ و ئاگرە سامناکەکەی کردووە، ئەم ڕووداوە لەسەردەمی سەمهودی بووە واتەساڵی ٦٥٤ك. هەروەها قەستەڵانی وەسفی ڕووداوی ئەم ئاگرەی کردووەو وتویەتی: (ڕووناکی ئەم گرکانە هەموو شتەکانی گرتەوەو ڕووناکی کردەوە، تەنانەت بەشێوەیەك حەرەمی مەکە و شاری مەدینەی ڕووناك کردبووەوە، وەك ئەوەی خۆری لێ هەڵاتبێت، لە بڵێسەی ئەو ئاگرکانەئاگری لێدەرچوو، بەشێوەیەك وای لێهات ڕووناکی خۆر کە لەسەر زەوی ڕەنگی زەردە ئەوا لە بەر کاریگەر بوون بەو گرکانە ڕەنگی سۆری بەسەردا زاڵ ببوو، مانگیش وا دەردەکەوت کە گیراوە). سەمهودی لە (تأریخ المدینة) و قازی سینان و قاشانی و ئیبن کەسیرو جگە لەوانەش باسی ئەو ئاگرەیان کردووە[1].

جۆری دووەم: ئەم جۆرە هەر بەردەوامە، لە هەموو کاتێك نمایشی خۆی دەکات، ئەویش قورئانی پیرۆزە.

لێرەدا دەچینە سەر هەندێ لایەنەکانی قورئانی پیرۆز کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی موعجیزەی پێغەمبەرمانە (صلی الله علیه وسلم) و لەلایەن خواوە هاتووە.

## قورئانی پیرۆز

وشەی (قورئان) **لە زمانەوانیدا:** چاوگی (قرأ)ەیە، وەك (غفران) کە چاوگی (غفر)ەیە. خوای پاك و بەرز دەفەرموویت: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾﴾ القیامة: ١٦ - ١٩. واتە: (پەلە مەکە و زمانت مەجوڵێنە،

---

[1] الرسول: سعید حوی ٢/١٣٠ جا ئەم نمونانەش دڵۆپێکن لە دەریایەك و مشتێکن لە خەرواڵێك.

بۆ ئەوەی پەلە بکەیت لە وەرگرتنیدا. بەڕاستی لەسەر ئێمەیە کۆکردنـەوەو خوێندنـەوەی. جا کاتێك ئێمە دەیخوێنینەوە تۆش شوێنمان بکـەوە لـە خوێندنەوەیـدا. پاشـان بەڕاسـتی ڕوون کردنەوەشی لەسەر ئێمەیە).

**لە زاراوەشـدا:** بریتییـە لـە فەرمایشـتی خـوای پایەبـەرز، کـە دابـەزێنراوە بۆسـەر پێغەمبەر موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)، لە دوو توێی دوو بەرگدا نووسراوە، بەشێوەیەی موتەواتر لە پێغەمبەرەوە هاتووە کە گومان هەڵناگرێت، لـە سـورەتی (الفاتحة) دەسـتی پێکردووە و بە سوڕەتی (الناس) کۆتایی هاتووە، خوێندنەوەی پەرستش و بەندایەتییە[1].

ئەم قورئانە پیرۆزە هیچ ناڕاستی و نادروستی و ناتـەواوی ڕووی تـێ ناکـات لـە هـیچ کاتێکدا و لە هیچ لایەکەوە، بەرنامـەو شـەریعەتی نـەمرەو شـیاوە بـۆ هـەموو کـات و شوێنێك.

قورئانی پیرۆز موعجیزەو دەرئاسایە، مرۆڤـ دەستەوەسانە لەوەی بتوانێت وێنەیـەکی هاوشێوەی بێنێت. لێرەشدا پێویستە بەڵگە بخەینەڕوو لەسەر دەرئاسا بـوونی قورئـان، تـا پێغەمبەرایەتی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) و ڕاستی ئیسلامان بۆ دەربکەوێت.

### ئیعجازی قورئان

ئیعجاز: بریتییە لە چەسپاندنی دەستەوەسانی و بێ توانایی بۆ بەرامبەرو دەرووبەر.

دەوترێت: قورئان مرۆڤـی دەستەوەسان کردووە، واتە: سەلماندی کە مرۆڤـ ناتوانێـت وێنەیەکی هاوشێوەی قورئان بێنێت.

موعجیزە و دەرئاسا بوونی قورئان نایەتەجێ تەنها بەم سێ شتە نەبێت:

١- تەحەداکردن، بریتییە لە داواکردنی بەرەنگار بوونەوەو بەرِوودا وەستان.

٢- بوونی ئەو شتە پێویستە کە تەحەداکارتەحەدای پێ دەکات.

٣- نەبوونی هیچ ڕێگرێك لە بەردەم ململانێکە.

---

[1] فتح الغفار لابن نجيم ١/١٠، جمع الجوامع بشرح البناني ١/٢٢٣، علم الأصول الفقه لعبدالوهاب خلاف ٢٢.

ئەگەر ململانێکار بانگەشەی بردنەوەی کرد و ململانیّ کارەکـەی تـر نکـۆڵی لیّکـرد، ئینجا دووبارە ئەوەی یەکەم تەحەدای نکۆڵی کارەکەی کرد و ئەویش نەیتوانی ڕووبـەڕووی ببێتەوە، ئەوا ئەوەی یەکەم دەستەوەسانی هی دووەمی سەلماند، ئەمەش بەهۆی:

تەحەداکردنی یەکەمەوە،

پێداگیری دووەم لەسەر پوچەڵی بانگەشەکەی،

نەبوونی هیچ کۆسپ و ڕێگرییەك یان پاساوێك لە بەردەم ئەنجامدانی ململانێکە.

**هاتنەدی مەرجەکانی ئیعجاز لە قورئانی پیرۆزدا**

بۆ ئەوەی ڕاستی و دروستی مـوعجیزە بـوونی قورئـانی پـیرۆز ڕوون بکرێتـەوە، ئـەوا پێویستە هەموو مەرجەکانی ئیعجاز کە پێشتر خستمانەڕوو لەسەر قورئان بخەینـەڕوو تـا موعجیزە بوونی بە ڕۆشنی دەربکەوێت، بەم شێوەیەی خوارەوە:

**١- تەحەددا کردن: کە بریتیە لە داواکردنی بەرەنگار بوونەوەو بەرِوودا وەستان:**

قورئانی پـیرۆز تەحـەدای عەرەبـەکانی کـرد، بـیّ توانـایی و دەستەوەسـانی ئـەوانی سەلماند،ئەگەر چی سوارچاکی مەیدانی ڕەوانبێژی و جوانبێژی و شیعرو پەخشانن، خـوای بـیّ وێنــە دەفــەرموویّت: ﴿ أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُۥ ۚ بَل لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾ فَلْيَأْتُوا۟ بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِۦٓ إِن كَانُوا۟ صَٰدِقِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾ الطور: ٣٣-٣٤. واتە: (یـان دەڵـێن: ئـەم قورئانـە خـۆی هەڵبەسـتووەو دایرێشتووە، نەخێر وانییە، هەر ئیمان و باوەڕیان نییە "ئـەگینا چـۆن وادەڵـێن". - دەی کەواتە خۆ ئەوانیش قسەزان و لێزانن - دەبا فەرمایشتێکی ئاوا وەك ئەم قورئانـە بهێـنن ئەگەر ڕاست دەکەن؟!).

خوای مەزن تەحەدای کردن بەوەی دەسوڕەت، هاوشـێوەی دەسـوڕەتی قورئـانی پـیرۆز بێــنن، خــوای مــەزن دەفــەرمویّت: ﴿ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَٰتٍ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٣﴾ فَإِلَّمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَكُمْ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلْمِ ٱللَّهِ وَأَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٤﴾ ﴾ هـود: ١٣ - ١٤.

واتە: (بەڵکو - لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا - ئەوان دەڵێن کە موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) قورئانی هەڵبەستووە، پێیان بڵێ: جا ئێوەش دە سورەتی هەڵبەستراوی وێنەی ئەم قورئانە بێنن، هەرکەسیش لەخوای گەورە بەدەر، دەتوانن، بانگ بکەن - بۆ هاوکاریتان پەنای بۆ بەرن - ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن. جا ئەگەر "خوانەناسان" نەهاتن بەدەم ئەو داوایەتانەوە، ئەوە ئیتر چاك بزانن و دڵنیا بن کە بەڕاستی ئەم قورئانە هەر بە ئاگاداری خوای گەورە دابەزێنراوەو بشزانن جگە لەویش خوایەکی تر نییە، ئایا ئیتر ئێوە "ئەی بێ باوەڕان" ملکەچ نابن).

تەحەدای کرد بەوەی تەنها یەك سوڕەتی هاوشێوەی یەك سوڕەتی قورئان بێنن: ﴿ وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا وَلَن تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾ البقرة: ٢٣ - ٢٤. واتە: (جا ئەگەر ئێوە لە دودڵی دان و گومانتان لەم "قورئانە پیرۆزە" هەیە کە دامانبەزاندووە بۆ بەندەی خۆمان موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) ئەگەر بۆتان دەکرێت ئێوەش هەوڵ بدەن سوڕەتێکی وەك ئەو بێنن، هاوپەیمان و هاوکارەکانیشتان جگە لە خوا "بۆ ئەو مەبەستە" بانگ بکەن ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن. خۆ ئەگەر نەتانتوانی و هەرگیز ناشتوانن "کەواتە باوەڕبهێنن" خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی: سووتەمەنیەکەی خەڵك و بەردە، کە بۆ بێ باوەڕو خوانەناسان ئامادە کراوە).

کاتێك مرۆڤ و جنۆکە دەستەوەسان بوون، ئەوا خوای گەورە تەحەدای کردن بە شێوەیەکی گاڵتە ئامێزو ڕیسواکردن: ﴿ قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَىٰ أَن يَأْتُوا بِمِثْلِ هَٰذَا الْقُرْآنِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴾ الاسراء: ٨٨. واتە:(ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵێ: سوێند بەخوا ئەگەر هەموو ئادەمیزاد و

پەریەکان کۆببنەوەو - هەوڵی بەردەوام بدەن تا - قورئانێکی وەك ئەمە دانێن و بهێننە- مەیدان - ناتوانن کاری وابکەن، ئەگەر چی هەموو لایەکیان ببنە پشتگیر و یارمەتیدەری یەکتری).

ئەم تەحەدایە تەنها تایبەت نەبوو بەسەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، بەڵکو ئەم تەحەدایە بەردەوامە تا ڕۆژی دوایی[1].

**٢- بوونی ئەو شتە پێویستە کە تەحەدداکار تەحەددای پێدەکات:**

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بانگەشەی کرد، کە پێغەمبەری خوایە و کتێبی خوا (قورئانی پیرۆز)ی بۆ ئەوان هێناوە، گاڵتەی بە پەرستش و عەقڵی ئەوان دەکرد، بۆیە ئەوانیش پێداگیریان کرد لەسەر ئەوەی هاوێنەی قورئان یاخود هاشێوەی بەشێکی قورئان بێنن، تا بەڵگەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تەفروتونا بکەن و چیتر نەڵێت قورئان لەلایەن خواوە هاتووە.

**٣- نەبوونی هیچ ڕێگرێك لە بەردەم ململانێکە:**

هیچ ڕێگرێك لە بەردەم عەرەبەکاندا نەبووەو نییە کە ڕووبەڕووی ببنەوە، ئەمەش لەچەند لایەنێکدا ڕوون و ئاشکرایە:

ا- لایەنی زمانەوانی: عەرەبەکان سەرکردەو ڕابەری ڕەوانبێژی و ڕوونبێژی و جوانبێژی بوون بەهۆی هۆنراوەو پەخشانەکانیان، قورئانیش بە زمانی ئەوان دابەزی بوو.

ب- لایەنی واتا: خاوەنی تێڕاوانینی تیژو ئەزموون و شارەزایی و زیرەکی بوون، هەروەك وتارو هۆنراوەو شوێنەوارەکانیان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن.

پ- لایەنی کات: قورئان بەیەك جار دانەبەزی بەڵکو لە ماوەی (٢٣ساڵ) دابەزی، تا

---

[1] سەیری تەحەدای قورئانی پیرۆز بکە لە: إثبات النبوة ٢١، کتێبەکەمان: التحدي في آيات الإعجاز.

ماوەی ڕووبەڕوو بوونەوە فراوان بێت[1].

عەرەبەکان ئەوەیان دەزانی کە ڕووبەڕوو بوونــەوەی قورئــان بــە داڕشــتنی ســورەتێك، بەهێزترو باشترە لەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەدرۆ بخەنەوەو، کاریگەریشی زیاتر دەبێت لەسەر پەرتەوازە کردنی شوێنکەوتووانی، بەڵام ئەوان دەستەوەسان بــوون لەمــەدا، سەرباری ئەوەی عەرەبەکان زمان پاراوترین وتاریبێژترین ســەرکردەی ڕەوانبێــژی بــوون بــۆ ماوەیەکی دووورو درێژ، بەڵام ڕێگەیەکی تریان گرتەبەر، ئەویش بریتی بوو لە تێکۆشان و ڕووبەڕوو بوونەوە بە شمشێرو دەرچوون لە وڵات و بــەفیڕۆدانی پــارەو ســامان لــە جــەنگی زیانبەخش[2].

ئەمەش خۆی لەخۆیدا تــەنها دانپێــدانانێکی تــەواوە بــەوەی قورئــانی پــیرۆز کتێبــی پەروەردگارە، کە ناتەواوی و نادروستی لە هیچ کاتێك و لایەکەوەڕووی تێ ناکات.

## ڕووەکانی ئیعجازی قورئانی پیرۆز

قورئانی پیرۆز کتێبی یاساو ڕێسا دانانــە بــۆ خــەڵکی، بەمــەش ژیــانێکی ســەربڵندو ڕێزداری بنیاتدەنێ و ئامانجیشی ئاوەدان کردنەوەی زەوییە.

مەبەستی سەرەکی قورئان تەنها ڕەگ و ڕیشــە داکوتــانی تیــۆرە زانســتیەکان نــەبووە یاخود کاری تەنها خوێندنەوەی هەواڵی پێشینان یان وێنەیەکی وێــژەیی و ئــەدەبی شــێواز دەگمەن نەبووە، بەڵکو باسی نیشانەکانی خوای گەورەی کردووە لە بوونەوەردا بەو شێوازە بەرزە تا فێــری بــێ بــاوەڕان بکــات کــە قورئــان فەرمایشــتی خوایــە و لــەخودی خۆیــدا

[1] علم الأصول الفقه لعبدالوهاب خلاّف ٢٥-٢٧، محاضرات في أصول الفقه للشيخ بدر متولي عبدالباسط ١٢٩/١.

[2] الاتقان ٧١٠-٧١١، المواقف وشرحه للسيد االشريف ٢٤٤/٨، المقاصد وشرحه للتفتازاني ٢٧/٥، شرح العقائد العضدية للدواني ٢٧٨/٢، نهاية الإقدام ٤٤٩، سبل الهدى والرشاد ٥٨١/٩، النبأ العظيم ٨٥.

موعجیزەیە، ئەمەش جەخت کردنەوەیە لەسەر باوەڕ پێهێنانی و پەند و ئامۆژگاری وەرگرتن لە چیرۆك و بەسەرهاتەکان.

قورئانی پیرۆز لە چەندین لایەنەوە موعجیزەیە کە بریتین لەمانە:

## ڕووی یەکەم:ڕوونبێژی و ڕەوانبێژی و جوانبێژ دەربڕینەکانی و داڕشتە سەر سوڕهێنەکەی

زانایان ڕاجیان لەبارەی دیاریکردنی ئەم لایەنە بەم شێوەیە:

١ - ئیعجازی قورئان لەوەدایە کە لە بەرزترین و بڵندترین پلەی ڕەوانبێژی و جوانبێژی دایە، هەروەك ڕەوانبێژانی عەرەب بە لێهاتووییەکەیان و زانایانی ڕەوانناسی زمان بە تواناکانیان و شارەزاییان لەو بوارەدا پەییان بەم ڕاستییە بردووە. زۆربەی زانایان بۆچوونیان وایە ئەمە لایەنی ئیعجازی ڕەوانبێژی قورئانی پیرۆزە[1].

گشت زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کە بنچینە و بناغەی ڕەوانبێژی بوونی هەرە بەهێزی هەیە، جا هەر کەسێك کەمترین توانای جیا کردنەوەی هەبێت و شارەزا بێت لە داڕشتنی وتەدا نکۆڵی لەمە ناکات و دانی پێدا دەنێت[2].

تێکڕای وشەکانی قورئانی پیرۆز ڕوون و ڕەوانن، گوێچکە گران ناکەن، دەربڕینەکانی

---

[1] المقاصد وشرحه للتفتازاني ٢٨/٥. "ئیجی" لە (المواقف) و "سەید شەریف" لە (شرح المواقف ٢٤٤/٨) باسی کردووە: (مەبەست لەوەی قورئانی پیرۆز لە پلەی هەرە بەرزی ڕەوانبێژی دایە ئەوەیە کە هاووێنەی نییە لە شێوەی داڕشتن و پێکهاتەکەی، پلەکانی ڕەوانبێژی بێ توانا بوون لە ئاست ڕەوانبێژییەکەی قورئاندا، ئەمە بۆچوونی "جاحز" و زمانناسانی عەرەبە). هەروەها باسی ئەوەشی کردووە: (زانایان بە چەند شێوەیەك باسی ڕەوانبێژی قورئانیان کردووە، باشترینیان ئەوەیە کە دەڵێت: ڕەوانبێژی بریتییە لە دەربڕین بە بێژە و وشەی جوان و قەشەنگ "واتە: پوختە بێت و دوور بێت لە کەم و کورتی پێکهێنەرو ڕەگەزو ناتەواوییەکانیان" کە واتای ڕاست و دروست بەدەستەوە بدات "واتە: شیاوی ئەو حاڵ و بارودۆخە بێت کە قسەکەی تێدا کراوە" بەبێ زیاد و کەمی لە مانا و ڕوونکردنەوەدا. جا هەر چەندە بەرزی و پیرۆزی و بریسکە و ڕۆشنی واتاکان زیاد ببێت و هاوتا بێت لەگەڵ مەبەستەکە ئەوا قسەکە ڕەوانبێژتر دەبێت).

[2] المواقف، سەرچاوەی پێشوو.

ڕێکن لەگـەڵ داخـوازی بارودۆخـەکان لـە بـەرزترین پلـەی ڕەوانبێـژی دان، ئەمـەش لـە ویچـواندنەکان (تشـبیهات) و خواسـتن (اسـتعارة) و خـوازراو (مجـاز) و سـەرجەم شـێوە جیاوازەکانی بەدەر دەکەوێت[1].

٢- ئیعجـازی قورئـان لـە ڕێکخسـتن و شـێوە دارشـتنە سـەیرو شـێوازە سـەر سوڕهێنەکەیدایە.

بۆ ڕێکخستن و شێوە دارشتن، دوو مانا هەیە:

**مانای یەکەم:** هۆنرانەوەو شـێوە داڕشـتن (نظـم) بریتییـە لـە ڕێکخسـتنی وشـەکان و خستنە پاڵ یەك و هۆنینەوەیان. جا ئەم شێوەیەی قورئان جیـاوازە لەگـەڵ شێـوە بـاوو و نەریتییەکەی وتەی عەرەب، لە:

دەسپێکیدا: واتە: لە سەرەتای سوڕەت و چیرۆکەکاندا، بـۆ نمونـە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ﴾، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ﴾، ﴿ٱلْحَآقَّةُ ۝١ مَا ٱلْحَآقَّةُ ۝٢﴾، ﴿عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ ﴾.

دواییەکەیدا:بۆ نمونە: ﴿يَعْمَلُونَ ﴾، ﴿يَفْعَلُونَ﴾.

لە جاکەرەوەکانی: واتە لە کۆتایی ئایەتەکان، کە وەك سەرروای وتەی عەرەبەکانە.

ئەم شتانەی باسکران لە قورئاندا هەن، بەشێوەیەك کە عەرەبەکان شتی لەو جۆرەیـان لە قسەکانیان بەرچاو نەکەوتبوو و دەستەوەسـانیش بـوون لـە بەرامبەریـدا. هەنـدێ لـە موعتەزیلەکان بۆچوونیا وایە ئیعجازی ڕەوانبێژی قورئان لە مەدایە[2].

**مانای دووەم:**شێوە دارشتن و ڕێکخستن بریتییە لە کۆکردنەوەی ئەو وشـانەی مانایـان ڕێك و پێکن، بەو پێیەی عەقڵ دەخوازێت مەبەستەکان دەستنیشان دەکـەن. جـار شـێوە دارشتن و ڕێکخستنی قورئان لە ڕەوانبێژیدا و گونجانی لەگەڵ بارودۆخەکە گەیشتە ئاستێك

---

[1] علم أصول الفقه لعبدالوهاب خلاف ٣١.

[2] المواقف وشرحه للسيد الشريف ٨/ ٢٤٤، المقاصد وشرحه للتفتازاني ٥/٣٠.

کە بەدەر بوو لە سنووری توانای مرۆڤـــ. عبـدالقاادر الجرجـانی پێـی وایـە ئەمـە ڕووی ئیعجازی ڕەوانبێژی قورئان[1].

لەبەر ئەمە سەرباری ئەوەی کە خانەدانانی عەرەب زۆر زیرەك بوون لـە بـواری نهێنـی وشەکان و گەلەك دژایەتی ئیسلامیان دەکرد کەچی هەر نەیانتوانی لە بـواری ڕەوانبێژیـدا توانج و ڕەخنە ئاراستەی قورئانی پیرۆز بکـەن، بـە پێچـەوانەوە وتیـان قورئـان جـادوو و سیحرە، بێگومان ئەمە نەریت و شێوازی هەر کەسـێکە کـە بـێ توانـا بێـت لـە ئاسـتی ڕەوانبێژییەکەیدا و سەرسام بێت بە ڕوونبێژو جوانبێژییەکەی، دانیان بەوەش نا کە ئەمـە لە تـوخم و ڕەگـەزی وتـار یـاخود شـیعری شـاعیران نییـە. هـەروەك ئەمـە دواتـر ڕوون دەکرێتەوە[2].

٣- قورئان پیرۆز بە هەردوو ئەو لایەنەی کە خرایـەڕوو: شـێوە دارشـتن و ڕێکخسـتنە نامۆو دەگەمەنەکەی، ڕەوانبێژییە هەرە بەرزەکەی، هەر دووکیـان بەیەکـەوە نـەك تـەنها یەکێك لەم دوانە دەرئاسـان و مـوعجیزەی قورئـان دەخەنـەڕوو. ئەمـە بۆچـوونی (قـازی باقلانی)یە[3].

ئەو کەسەی لە مێژووی زمانەکان دەکۆڵێتەوە، دەبینێت کـە بـە پلەبەنـدی زمانـەکان گەشەیان کردووە، بەڵام زمانی عـەرەبی هـیچ گەشـەیەکی پلەبەنـدی بەخۆیـەوە نـەبینی کاتێك قورئانی پیرۆز هات، بەڵکو لە نیمچە تەقینـەوەو هـەڵقوڵانێکی لـەناکاو دەچـوو، زمانی عەرەبی لە شێوەزاری نەفامیەوە گواسـتەوە بـۆ زمـانێکی ڕێـك و پێـك و تۆکمـە لەڕووی هونەری، لەگەڵ ئەوەشدا جگە لە شێوەزاری حیجـازی دەربڕینـە بیانیـەکانی تـری بەهیچ شێوەیەك بەکارنەهێنا. ئەمەش وەك ئەوە وایە کە هەموو سەروەت و سامانی وشە

---

[1] المقاصد وشرحه للتفتازاني، سەرچاوەی پێشوو، تیایدا هاتووە: عبدالقاهر وتویەتی: شێوە داڕشتە بریتییە لە دەربڕینی واتا لە چوارچێوەی وشەکان بەپێی ئەو مەبەستەی وتەکەی لە پێناودا دەکرێت.

[2] المقاصد وشرحه للتفتازاني ٣٢/٥.

[3] المواقف وشرحه للسيد الشريف ٢٤٥/٨، المقاصد وشرحه للتفتازاني ٣٠/٥، الإنصاف للباقلاني ٦٢، تمهيد الأوائل ١٧٧ و١٨٥.

و دەربڕینەکانی هێناوەو بەشێوەیەکی نامۆو دەگمەن دایڕشتووە، بەمەش کودەتایەکی گەلەك زۆر گەورەی لە وێژەو ئەدەبی عەرەبیدا کردووە بەهۆی گۆڕینی ئامرازی هونەری دەربڕین، جا لە هەردوو ڕووی ئەدەبی و زمانەوانی جیاوازیەکی تەواوی هێنایە کایە لە نێوان زمانی سەردەمی نەفامی و زمانی سەردەمی ئیسلام[1].

شێخ (مودودی) هیندی وتویەتی:(ئەگەر زمانی عەرەبی بخوێنیتەوە، بەجوانی لەم زمانە بکۆڵیتەوەو وێژەو هۆنراوەکانی بەوردی بخوێنیتەوە، بۆت دەردەکەوێت، زمانێك نییە هاوشانی بێت، بەڵکو باشترین زمانە بۆ دەربڕینی بیروباوەڕو بەرنامەی گشتی و جیهانی، تەنانەت بۆ دیاریکردنی مانای خواناسین و کارتێکردن لە گیان و دەروون‌دا، دەبینیت بەچەند ڕستەیەکی کورت و بچوك، گەورەترین ماناو مەبەست دەگەیەنێ و بەجوانیش کار دەکاتە سەر سۆزو دەروون. مانای قورئانی پیرۆز پێویستی بەزمانێکی لەو جۆرەیە، ئا لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت، کە بۆچی خوای گەورە زەوی عەرەبی دیاریکرد بۆ ئەوەی ببێتە کانگای ئەو پەیامە گەورەو پێغەمبەرایەتی جیهانی)[2].

---

(1) الظاهرة القرآنية ٢٣٢-٢٣٤.

(2) مبادء الاسلام لأبي الأعلى المودوي ٤٧.

سەیری ئەم سەرچاوانە بکە کە بەتێرو تەسەلی لەم بارەوە دواوە: الاتقان ٢/١١٦-١٢٥ و چەندین ڕاو بۆچوونی هێناوە وەك بۆچوونی: (جاحز، نەزام، باقلانی، ڕازی، زەملەکانی، ئیبن عەتییە، ڕاکشی، ئەصفەهانی، سەکاکی، تەوحیدی، خەتابی، زەرکەشی، ڕەمانی، قازی عیاز) و جگە لەوانەش.

هەندێ کتێبی لەم جۆرە لە چاپ دراون، (د. عومەر مەلا حوەیش) لە کتێبەکەیدا (تطور دراسات إعجاز القرآن وأثرها في البلاغة العربية) باسی بۆچوونی ناوبراوانی کردووە وەك شرۆڤەیەك بۆ کتێبەکانیان لەسەر بابەتی ئیعجاز. سەیری ئەمانەش بکە: إعجاز القرآن للرافعي، النبأ العظيم ٨٠.

## شێوازی قورئانی پیرۆز

شێوازی قورئان[1] ڕێگایەکە کە تەنها قورئان ئەو ڕێگەیەی بەکارهێناوە لـە دارشـتنی فەرمایشتەکانی و دەستنیشان کردنـی دەربڕینـەکانی، قورئـانی پـیرۆز وەك کتێبێـك بـە زمانی عەرەبی و ئەو شێوازەی عەرەبی هۆگر بـووە، جـا لـە پیتـەکانی زمـانی عـەرەبی وشەکانی قورئان پێکهاتووەو لـەو وشـانەش ئـەوان ڕسـتەکانی پێکهـاتوون و دارێـژراون، لەسەر یاسا گشـتیەکانی عەرەبـەکان لـە دارشـتنی وشـەو ڕێکخسـتنی ڕسـتەدا قورئـان دانراوە، لەگەڵ ئەمەشدا بە شێوازە تاقانە و دەگمەنو بێ هاوتاکەی دەستەوەسانی کردن.

نمونەی ڕوونکردنەوەی زمانەوانی لە هەر زمانێکدا وەك هەر پیشەیەکە لە پیشەکان.جا بەرگدروەکان لە نێوان خۆیاندا جیاوازن و پلە پلەن، هەیانە بێ توانایە و هەشـیانە زیرەکـە یاخود هەیانە لاوازە و هەشیانە بەهێزە، ئەم جیاوازیەش لە دەرەنجامی جیاوازی کەرستەی جل و بەرگە درواوەکە نییە یان ئەو ئامێرو ئامرازە گشـتییانەی کـە لـەکاری بەرگدرویـدا بەکاردێن، بەڵکو جیاوازیەکە لەو ڕێگە تایبەتیەوە سەرچاوەی گرتووە کە هەر یـەکێك لـە بەرگ درووەکان گرتوویانەتـە بـەر لـە دیـاریکردنی کەرسـتەکان و شـێوازی ڕێکخسـتن و دروینیان و بەکارهێنانی یاساکانی ئەو پیشەیە لە شێوەو ئەندازەکەیدا.

لەبەر ئەمە دەربڕینی قورئانی نهێنی سەرِ سوڕهێنی خۆی هەیە، لە پێشینان ئەوانـەی کە هەڵهێنجانیان کردووە لەو مەیدانەدا (خەتیبی ئیسکافی، ٤١٢ك مـردووە) پـەیی بـەو نهێنییەی بردووە، جا لە کتێبەکەیدا (درة التنزيل و غرة التأويل)، نهێنی دەربڕینـی پیتـی (ف) لەگەڵ بێژەی (کلوا) ڕوون دەکاتەوە کە لە فەرمایشـتی خـوای گـەورەدا هـاتووە لـە سـوڕەتی (البقـرة: ٥٨): ﴿وَإِذْ قُلْنَا ٱدْخُلُوا۟ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ فَكُلُوا۟ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ﴾، واتـە: (یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کاتێك وتمان: بچنە ئەم شارەوە "کـە قودسـە"، جـا هەرچـی حەزی لێدەکەن لەوێ بیخۆن). ناوبراو دواوە لەبارەی نهێنی دەربڕینی (و) لە جیـاتی (ف) لەگەڵ بێژەی (کلوا) لە فەرمایشتی پەروەردگار لە سوڕەتی (الأعـراف: ١٦١): ﴿وَإِذْ قِيلَ

---

[1] سەیری بابەتی شێوازی قورئان و حەوت تایبەتمەندییەکانی بکە لە: مناهل العرفان للزرقاني ١٩٨/٢ ولاپەڕەکانی دواتر.

لَهُمُ اسْكُنُوا هَٰذِهِ الْقَرْيَةَ وَكُلُوا مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ ﴾ واتــه: (یــادی ئــەو کاتــه بکەرەوە کە پێیان وترا: لەم شارەدا "کە قودسە" نیشتەجێ بن و لەو بەروبومانەی کە بـە دەورو پسشتیدا هەیە لە هەر شوێنێك ویستتان بە ئارەزووی خۆتـان لێـی بخـۆن). لەگـەڵ ئـەوەی هـەر دوو ئایەتەکـە بـاس لەیـەك بەسـەرهات دەکـەن و پیتەکـەش یـەك مانـا دەگەیەنێت. ناوبراو وتویەتی:

لە بنچینەدا هەر فـەرمانێك کـە شـتی دەخرێتەسـەر، کـە پێیـەوە پەیوەسـتە، ئـەوا وەڵامەکەشی بەسەرەتاکەیەوە پێ پەیوەست دەبێت. یەکەم لەگەڵ دووەم بەمانای مـەرج و پاداشت دێت، خۆی لە بنەڕەتدا وایە دووەم بخرێتە سەر یەکەم بە "ف" نەك بە "و"، ئـەم فەرمایشتەش لەم جۆرەیە: ﴿وَإِذْ قُلْنَا ادْخُلُوا هَٰذِهِ الْقَرْيَةَ فَكُلُوا ﴾ جا خواردن پەیوەستە بە چوونە ژوورەوە، چوونە ژووریش بەستراوەتەوە بە خـواردن، خـواردن پەیوەسـتە بـە چـوونە ژوورەوە، بە پێچەوانەی ﴿ وَإِذْ قِيلَ لَهُمُ اسْكُنُوا هَٰذِهِ الْقَرْيَةَ وَكُلُوا ﴾ لەبـەر ئـەوەی نیشتەجێ بوون بریتییە لە مانەوە بۆ ماوەیەکی درێژ، چونکە خواردن پەیوەست نییـە بـە نیشتەجێ بوون، لەبەر ئەوەی دەکرێ یەکێك بچێتە نـاو باخێکـەوە لێـی بخـوات و پێیـدا تێپەڕ بێت جا مادام دووەم پەیوەست نەبوو بە یەکەمەوە ئەوا خرانە سەر (عطـف) بە "و" پێویستە نەك بە "ف"[1].

### تایبەتمەندییەکانی شێوازی قورئانی پیرۆز

ئەو تایبەتمەندیانەی قورئانی پیرۆز هەیەتی وایکردووە سروشتێکی موعجیزەیی هەبێت لە زمان و ڕەوانبێژییەکەی، ئەمانەی خوارەوەش نمونەی هەندێك لەو تایبەتمەندیانەن:

**تایبەتمەندی یەکەم**: جوانی دەربڕینەکانی قورئـان بەشـێوەیەکی سـەر سـوڕهێن و دڵڕفێنە، کە لە سیستەمی دەنگی و جوانییە زمانەوانییەکەی دەدرەوشێتەوە. مەبەست لە سیستەمی دەنگی قورئان: ڕێك وپێکی و تۆکمەیی و پێکهاتنە قەشەنگەکەیەتی، هەر لـە

[1] بڕوانە: درة التنزيل وغرة التأويل ١٠.

جوڵە (حركة) و وەستان (سكون) و درێژکردنەوە (مد) و مینگە (غنة) و پەیوەندی (إتصال) و وەستانی بێ هەناسە خواردنەوە (سكتة) و و هەماهەنگی و ڕێکخستنێکی ئاوازەو زۆر جوانی هەیە.

هەر کەسێك ئەگەر عەرەبیش نەبێت، گوێ بگرێت بۆ کۆمەڵەی دەنگی قوئان، هەست بە ئاوازێکی نامۆ و ژەنینێکی سەر سوڕهێن دەکات، کە زۆر بەرزترە لە جوانی و قەشەنگیەکەی، بەراورد ناکرێت لەگەڵ هیچ جۆرێك لەو ئاواز و ژەنینانەی مۆسیقا و لاواندنەوەکانی هۆنراوەو شیعر، چونکە ئاوازو دەنگسازییەکانی مۆسیقا هاوشێوەو لێك نزیکن، بەڵام گوێچکە ساردوسوڕ و ماندوو دەبێت لە بیستنی، تەنانەت لەبەر ئەوەی کێشەکانی هۆنراوە چەند جۆرێکی دیاریکراون و سەرواکان لە یەك چامەدا زۆربەی کات وێکچوون و بە یەك چەشن بەسەریدا زاڵە بیسەر لێی وەڕس و بێزار دەبێت.

بەڵام ئەوەی گوێ دەگرێ لە ئاوازی قورئان هەرگیز وەڕس و بێزار نابێت، چونکە هەردەم گوێبیستی ئاوازی جۆراوجۆر و دەنگسازی نوێی بەپێی بارودۆخی جیاواز دەبێت، کە هەر شێوازێك لەو جۆرە ئاوازانە ژێیەکانی دڵ دەهەژێنن و دەلەرزێنن.

هەر ئەو جوانی و قەشەنگییە دەنگییە، یەکەم شت بوو کە گوێچکەکانی عەرەب لەبارەی قورئان هەستیان پێکرد، لەکاتی دابەزینی قورئان و ئەو قەشەنگییە دەنگیە هاوشێوەی نەبوو، بۆیە وا بەخەیاڵی عەرەبەکاندا هات کە قورئان شیعر یان جادووە.

مەبەست لە جوانی زمانەوانی قورئان، بریتیە لەو وەسفە زیاد و تایبەتمەندانەی کە پیتەکانی قورئان و ئەو ڕێکخستنەی وشەکانی هەیەتی، ئەمەش کاتێك مافی پیت و وشەکانی قورئان دەدەیت لە دەربڕین لە دەرچەکانی و بەهەمان ئەو شێوەیەی کە سیفەتی پیتەکەیە، هەروەك دیاریکراوە لە ڕێساکانی زانستی جوان خوێندنەوەی قورئان (قواعد علم التجويد).

لە کۆبوونەوەی سیستەمی دەنگی و جوانیە زمانەوانییەکەی چوارچێوەو قالبێکی دەربڕین و بێژەیی سەرسوڕهێن دروست بوو، کە زمانپاراوی خێڵە عەرەبە جیاوازەکانی تێدا ئاوێتە بووە، بە شێوەیەکی ئاسان و سوك.

بێگومان جوانی زمانەوانی و سیستەمی دەنگی و بەڵگەی ئیعجازی، لەلایەکی ترەوە پەرژینێکی توندو تۆکمە بوو بۆ پاراستنی قورئان، کە ئامرازەکانی بیستنی بۆ لای خۆی کێش دەکرد و سەرنجی دەوروبەری بەرەو خۆی ئاراستە دەکرد، بۆیە بەردەوام جێگەی خۆی کردەوە لە زمان و گوێچکەکانی بوونەوەردا و هیچ کەسێکیش ئەو بوێرییە بەخۆی نادات کە گۆڕانکاری تێدا بکات.

**تایبەتمەندی دووەم:** قورئان خەڵکی سادە و تایبەتی ڕازیکردووە.

خەڵکی سادە و تایبەت چۆنیەکهەست بە جوانی قورئانی پیرۆز دەکەن، چ قورئان بخوێننەوە یان چ بەسەریاندا بخوێنرێتەوە چێژ لە تامە خۆشەکەی وەردەگرن و هەر یەکەش بە ئەندازەی توانای خۆی لێی تێدەگات.

بەڵام وتەی مرۆڤ وانییە، چونکە ئەگەر هەوڵیدا خەڵکی تایبەت و زیرەك ڕازی بکات، بەوەی پەنا بەرێتە بەر بەکارهێنانی وشەی نامۆو شێوازی ئاماژەیی، ئەوا لەو حاڵەتەدا خەڵکی سادەو گشتی لێی ڕازی نابن چونکە لێی تێناگەن.

هەروەها ئەگەر هەوڵی ڕازی کردنی خەڵکی سادەو گشتی دا بەوەی پەنابەرێتە بەر ئەوەی وتە و وشەو ڕستەتانەی ڕوون و ڕاشکاو بن و ڕاستییەکان بە ڕەهایی و ئاشکرایی بخاتەڕوو ئەوا خەڵکی تایبەت لێی ڕازی نابن، بەهۆی دابەزینی بۆ ئاستێك کە خۆشیی و تامی تێدا نییە و ئەوان کە خاوەن توانای تایبەت و زیرەکن چێژو تامی عەقڵی و دەروونی لێ وەرناگرن.

**تایبەتمەندی سێیەم:** قورئان عەقڵ و سۆزو عاتیفەی ڕازیکردووە، چونکە لەیەك کاتدا بەیەکەوە دڵ و عەقڵ بەیەکەوە دەدوێنێت.

بۆ نمونە لەو کاتەی کە قورئانی پیرۆز بەڵگەی عەقڵی دێنێتەوە لەسەر زیندوو بوونەوەو هەڵسانەوە لەگۆڕ، بەشێوەیەك بەڵگەکە دەخاتەڕوو کە دڵ و دەروون دەلـەرزێنێت و سـۆزو عاتیفە تەڕو پاراو دەکات. خوای پاك و بەرز دەفـەرموویت: ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَٰشِعَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاهَا لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰٓ ۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ فصلت: ٣٩. واتە: (لە بەڵگەو نیشانەکانی خوا ئەوەیـە کـە دەبینیـت زەوی کـش و ماتە، جا کاتێك باران بەسەریدا دەبارێنین دەخرۆشێت و گەشـە و نـەش و نومـا دەکـات، چونکە بەڕاستی ئەو زاتـەی کـە زەوی زینـدوو کـردەوە، مـردوانیش زینـدوو دەکاتـەوە، بێگومان ئەو خوایە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە).

هــەروەها دەفــەرموێت: ﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ ﴿٦﴾ وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَٰهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ ﴿٧﴾ تَبْصِرَةً وَذِكْرَىٰ لِكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ ﴿٨﴾ وَنَزَّلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً مُّبَٰرَكًا فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ جَنَّٰتٍ وَحَبَّ ٱلْحَصِيدِ ﴿٩﴾ وَٱلنَّخْلَ بَاسِقَٰتٍ لَّهَا طَلْعٌ نَّضِيدٌ ﴿١٠﴾ رِّزْقًا لِّلْعِبَادِ ۖ وَأَحْيَيْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا ۚ كَذَٰلِكَ ٱلْخُرُوجُ ﴿١١﴾﴾ ق: ٦-١١. واتە: (ئایا ورد نەبوونەتەوە لەو ئاسمانـەی کـە بەسـەریانەوەیە: چـۆنمان دروستکردوەو ڕازاندوومانەتەوە بەجۆرێك هیچ کـەم و کـووڕی و کـەلێنێکی تێـدا نییـە. هەروەها زەویمان ڕاخستووەو بڵاومان کردۆتەوەو کەژو کێومان لەسەری دامەزرانـدووەو لـە هەموو جۆررە ڕووەکێکی جوان و ڕازاوەمان تیادا ڕوانـدووە. ئەمانـە هـەر هـەمووی بـۆ ڕۆشنکردنەوەی دڵ و یادخستنەوەیە بۆ هەموو ئەو بەندانەی کـە بـەلای ئێمـەدا دێنـەوەو ڕەزامەنـدی ئێمـەیان مەبەسـتە. لـە ئاسمانـەوە ئـاوێکی بـەپیت و بەرەکـەتمان هـەردەم دابەزاندووە، جا بەهۆی ئەوەوە چـەندەها بـاخ و دانەوێڵـەی ئـەو کشـتوکاڵانەی کـە درەو دەکرێن دەڕوێنین. هەروەها دارخورمـای قەشـەنگ و بڵنـد سـەری هەڵـدا، کـە هێشـووە خورمای جوان و لەسەر یەك ڕیزکراو دەگرێت. ئەمەش بـۆ ئـەوەی ببێتـە ڕزق و ڕۆزی بـۆ بەندەکان.. هەر بەو ئاوی بارانە شوێنە مردووەکان زیندوو دەکەینەوە، هەر ئاوەهایش لـە دوای مردن ئێوە لە خاك دێنە دەرەوە).

ئەم شێوازە بەتواناو تۆکمەیە عەقڵی ڕازیکرد و تام و چێژی بە سۆزو عاتیفـە بەخشـی لە یەك کاتدا، خوای گەورە لە ئایەتی یەکەمدا فـەرمووی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحۡيَاهَا لَمُحۡىِ ٱلۡمَوۡتَىٰٓ ﴾ هەروەها لە ئایەتی کۆتاییدا فەرمووی: ﴿كَذَٰلِكَ ٱلۡخُرُوجُ ﴾.

ئای لەو جوانیە دڵڕفێن و سەر سامکەرە، ئای لەو ئیعجازە نایاب و پڕشـنگدارە، کـە بەیەکجار ڕووبەڕووی عەقڵ و دڵی مرۆڤــ دەبێتەوە بە پڕشنگدارترین بەڵگە و بـەتامترین نمونەی خراوەڕوو لەو چەند وشە کەمەدا.

کاتێك قورئان باسی بەسەرهاتنی یوسف (سەلامی خوای لێبێت) دەکـات وەك نمونەیـەك، ئەوا پەندی زۆر گرنگ دەخاتەڕوو، لەمیانەیـدا بەڵگـەی درەوشـاوە پـێش چـاو دەخـات، لەسەر پێویست بوونی داوێنپاکی و شەڕەف پاراستن و ئەستۆپاکی و دەسـتپاکی، هـەروەك خوای گەورە لە بەشێکی بەسەرهاتی نـاوبراودا دەفـەرمووێت: ﴿وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِى هُوَ فِى بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ وَقَالَتۡ هَيۡتَ لَكَۚ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ رَبِّىٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَاىَۖ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ یوسف: ٢٣. واتە: (جـا ئـەو ئافرەتـەی کـە یوسـف لـە ماڵیـدابوو هەوڵیدا یوسف لە خشتە ببات و دڵی ڕابکێشـێت بـۆ لای خـۆی، هـەموو دەرگاکانیشـی داخست و وتی: وەرە پێشەوە خۆت ئامادە بکە، یوسف وتـی: پـەنا دەگـرم بـەخوا کـاری واناکەم، چونکە پەروەردگارم دەرووی لێ کردوومەتەوە، هەروەها مێردەکەشت چاك ڕەفتار بووە لەگەڵمدا "چۆن خیانەتی لێدەکەم" چونکە من دڵنیام ستەمکاران سەرفراز نابن).

چاك بڕوانە، چۆن سێ پاڵنـەری گـومڕایی قبـوڵ کـران، بەرامبـەر بـە سـێ پاڵنـەری داوێنپاکی لە وێنەیەکی بەسەرهاتەکەدا، کە هەڵگری دەمەتەقێ و مشتومڕێکی تونـدی بەچـێژو سـەرنج ڕاکـێش بـوو لـە نێـوان سـەربازی خـواو سـەربازی شـەیتان، هـەردوو پاڵنەرەکانیشی لە دوو تای تەرازوودا دایناون لە بەردەم عەقڵی خاوەن ویژدان.

ئا بەوشێوەیە قورئانی پیرۆز دەبینیت کە ناوەڕۆکەکەی ئاوێتەیەکی بـەتام و سـازگارە، کە وا دەکات دەروونەکان ئاسانتر بتوانن بەڵگە عەقڵییەکان هـەرس بکـەن، ئاسوودەشـی

دەکات بەچەند سەرنجدانێکی سۆزدارو عاتیفەیی، کە عـەقڵ و سـۆزو عـاتیفـە بەیەکـەوە ئاراستە دەکات بۆ ڕێنمایی و هیدایەتی مرۆ و خێرو چاکەی مرۆڤـایەتی.

جا ئەمە وەك وتەی مرۆڤ نییە، چونکە کاتێـك مـافی عـەقڵ دەدات، ئـەوا مـافی سۆزو عاتیفە نادات بەڵکو دەست قایە لە ئاستیدا، ئەگـەر مـافی سـۆزو عاتیفەشـی دا، ئەوا مافی عەقڵ و ژیری پێشێل دەکات، هەروەك شتێکی زانراوە لە نەریت و عادەت کـە شێوازەکانی پەخشان بۆ دوو جۆر دابەش دەبەن: شێوازێکی زانستی و شێوازێکی وێژەیی و ئەدەبی.

جا زانستخوازان ڕازی نابن بەشێوازی ئەدەبی، بەهەمان شێوە قوتابیانـــی ئـەدەبی و وێژەییش ڕازی نابن تەنها بە شێوازی زانسـتی، مرۆڤـــیش هەرچـەندە بـەتوانابێت ئـەوا ناتوانێت ببێتە خاوەنی ئەو دوو هێزە بەیەکسانی، گریمان ئەگەر واش دابنێین کـە ئـەو دوو هێزە لە یەك کەسـدا کۆدەبنـەوە، ئـەوا پێویسـتە بـزانین کـە بەیەکـەوەو بەیـەك تـەوژم کارناکەن، بەڵکو بەشێوەیەکی جێگـرەوەو بەنۆبـەت کـار دەکـەن: ﴿ مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِى جَوْفِهِۦ ﴾ الأحزاب: ٤. واتە: (خوا دوو دڵی دروست نەکردووە لـە دەروونـی هـیچ کەسێکدا).

تەنها قورئان تاکە فەرمایشـتە لـە نـاو هـەموو جۆرەکـانی ئاخاوتنـدا خـاوەنی ئـەو تایبەتمەندیەیە، چونکە قورئان پەیامێکە دابەزێنراوە لەلایەن زاتێکی بەتواناوە کـە ڕۆح و جەستەی لە قورئانەکەیدا کۆکردۆتەوە.

**تایبەتمەندی چوارەم:** دارِشتنی قورئان و یاساکانی هۆنینـەوەی لەوپـــەڕی چـاکی و بەرزیدایە.

قورئانی پیرۆز، لە پەیوەندی و پێکەوە لکانی وشەو ڕستە و ئایەت و سـوڕەتەکانی لـە پلەیەکی ئەوەندە بەرزدایە کە هیچ ئاخاوتن و وتەیـەکی تـری پێناگـات، ئەگەرچـی ئـەو ئاخاوتنـە درێـژ بێـت و ئامـانجی جۆراوجـۆری هـەبێت و لەیـەك بابـەتی هەمەڕەنگـدا دارِێژرابێت.

قورئانی پیرۆز دارِێژراوێکی تاقانەیە، کە سەرنجی چاوەکان بەرەو لای خۆی دەبات.

ئا ئەمە سورەتی (فاتحة)یە، لێی ورد بەرەوە چۆن پێکەوە لکاوەو بەشێوەیەکی تۆکمە بەیەکەوە بەستراوە، بەوپەڕی جوانی لە واتایەکەوە دەچێتە سەر واتایەکی تر، مەبەستێك بەجێ دێڵێت و مەبەستێکی تر دەخاتەڕوو.

بەناوی خوای گەورە دەستپێکراوە، هەروەك چۆن دادوەر هەر حوکمێك لە حوکمەکان کە دەخوێنێتەوە سەرەتا بەناوی پاشای خاوەن شکۆ دەیخوێنێتەوە، بۆ ئەوەی دادوەر ئەو لایەنەی کە دەسەڵاتی لێوەدەست خستووە لە دەرکردنی حوکمەکانی دا ڕابگەیەنێت، پاشان چووەتە سەر بەڵگە هێنانەوە بەوەی یارمەتی دەبێت تەنها لەخواوە داوابکرێت، ئەمەش بەوە ڕوون دەکاتەوە کە ناوەکە پاڵدەداتە لای ناوی خوای گەورە، کە ناوی زاتی پەروەردگارەو کۆکەرەوەی هەموو سیفەتە کامڵەکانە، تەنانەت وەسفی ناوی خوای گەورە دەکات بە: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾الفاتحة: ٣. واتە: (کانگای ڕەحمەت و سۆزو بەزەییە).

پاشان چووەتە سەر ئەوەی کە هەر خوای پەروەردگار شایەنی هەموو سوپاس و ستایشێکە، مادەم بە بەڵگەوە خستمانەڕوو کە هەر خوا یارمەتیدەرە.

دواتر چووەتە سەر ئەو شتەی کە بریتیە لە داوای یارمەتی کردن تەنها لە خوا و پشت ئەستووری کردووە بەسێ بەڵگەی تر کە وەك سیفەت لەکاتی ستایش دراونەتە پاڵ ناوی خوای مەزن: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ۝﴾ الفاتحة: ٢-٤. واتە: (سوپاس و ستایش هەر شایستەی خوایە و بۆ خوایە، کە خاوەن و پەروەردگاری هەموو جیهانیان و هەموو بوونەوەرە. بەخشندەو دلۆڤانە، کانگای ڕەحمەت و میهرەبانیە "ڕەحمەتی لە دونیادا هەموو شتێکی گرتۆتەوە، بەڵام لە قیامەتدا تەنها بۆ ئیماندارانە").

چووەتە سەر ڕاگەیاندنی یەکتایی خوای گەورە لە پەرستراویتی و پەروەردگاریتی: ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ﴾ الفاتحة: ٥. واتە: (خوایە" تەنها هەر تۆش دەپەرستین و هەر لە تۆش داوای یارمەتی و پشتیوانی دەکەین"لە کاروباری دین و دونیاماندا، بەتایبەت لەو کاروبارانەدا بەتۆ نەبێت، بەکەسی تر لە بەندەکانت ناکرێت"). مادەم تەنها خوای

گەورە یارمەتیدەری ڕاستەقینەیە و شایەنی هەموو سوپاس و ستایشێکە ئەوا پێویستە بەتەنها بزانرێ.

لەدوای ئەمە باسی ئارەزووی هەرەبەرزی مرۆڤـی کردووە کە بریتییە لە هیدایەت و ڕێنمایی وەرگرتن بۆ سەر ڕێبازی ڕاست، تەنانەت هیچ ڕێگەیەك نییە بۆ گەیشتن بەو ئارەزوو و ئامانجە تەنها ڕێگەی خوای گەورە نەبێت، بە ئاماژەكانی پێشوو كە بەڵگەی بەرزو بڵند و شكۆداری خوای گەورە بوون: ﴿ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴾ الفاتحة: ٦. واتە: (خوایە بەردەوام ڕێنموویيمان بفەرموو بۆ ئەم ڕێبازی ڕاست و دروستی ئیسلامە).

دوای هەموو ئەو شتانەی پێشوو، چووەتە سەر دابەش كردنی بوونەوەر بەپێوەری هیدایەت بۆ سێ بەش، تا مرۆڤ بەدوای هیدایەتی ڕاست بكەوێت و هۆشیارو دوورە پەرێز بێت لە كەوتنە ناوچاڵی گومڕایی: ﴿ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾ الفاتحة: ٧. واتە: (كە بەرنامەو ڕێبازی ئەوانەیە لە نازو نیعمەتی خۆت بەهرەوەرت كردوون، نەمانخەیتە سەر ڕێبازی ئەوانەی خەشم و قینیان لێگیراوە "بەهۆی ئەوەوە دەیزانن و لایانداوە"، هەروەها نەمانخەیتە سەر ڕێبازی ئەوانەش" كە سەرگەردان و گومڕان "بەهۆی لاساری و یاخی بوون و نەزانینەوە").

ئەوەتا خەڵكی لە پێش چاوی تۆن، هەیانە نیعمەتی لەگەڵ كراوە، بەوەی ڕاستی و شوێنكەوتووانی ڕاستی ناسیووە، هەشیانە خەشم و قینی گیراوە، بەوەی ڕاستیان نەناسیوەو لێشی لادەدەن، هەشیانە گومڕابووەو ڕازیشە ئاژەڵ ئاسا بە پلیكەكانی ژیاندا سەربكەوێت، لەناو چڵكاوی گومڕایی و نەزانی و سەرگەردانی، خۆی ماندوو ناكات بەوەی هەڵسێت بە لێكۆڵینەوە لە ڕاستی تا ڕێزدارو شەرەفمەند ببێت بە ناسینی و بەختەوەریش ببێت بە شوێنكەوتنی.

كاتێك سەیری سوڕەتی (البقرة) و سوڕەتەكانی دواتری دەكەین، دەبینین بەشێوەیەك پێكەوە بەستراونەتەوە، وەك ئەوەی سوڕەتی (الفاتحة) پوختە بێت و سوڕەتەكانی تریش درێژە پێدەری بابەتەكانی سوڕەتی ناوبراو بن، واتە سوڕەتی (الفاتحة) وەك ناونیشان وایە بۆ هەموو سوڕەتەكانی تر. جا هیدایەت و ڕێنماییكران بۆ ڕێگەی ڕاست، كە ڕێگەی

ئەوانەیە کە خوای گەورە بەخشش و نیعمەتی لەگەڵ کردوون لە پێغەمبەران و پیاوچاکان و شەهیدان، سورەتی (البقرة) و سورەتەکانی دواتری بەتێروتەسەلی لەوبارەوە دواون، بەوەی کە وردەکارییەکانی ئەو هیدایەت و ڕێنماییکردنە بۆ ئێمە هاتووە بەشێوەیەکی تەواو و هەمەلایەنە.

قورئان لە مەبەستێکەوە دەچێتە سەر مەبەستێکی تر بە شێوەیەکی دڵگیرو سەر سوڕهێنەر.

بەپێچەوانەی مرۆڤەکان کە زۆربەی کات هەڵدەکەن لە ڕێکخستنی مەبەستەکانیان، لەکاتی دەربڕیندا، بەڵکو کە دەریش دەبڕن وەك شتێکی پەرش و بڵاو و هەڵوەشاوە دەیخەنەڕوو کە زۆرجار شاعیرانیش لەسەر ئەمە ڕەخنەیان ئاراستە دەکرێت، بەوەی زۆر بە ناشرینی هەر لە یەك چامەدا ئەوا مەبەستێك جێدەهێڵن و دەچنە سەر مەبەستێکی تر.

بۆ نەهێشتنی ئەم کەم و کورتییە، نووسەرو زاناکان ناچار بوون کە پەنا بەرنە بەر بەکارهێنانی ناونیشان و ئامازە و ئامرازەکانی هۆشداری و بەکارهێنانی دەربڕینی "پاشان" (أما بعد) و هاوشێوەی ئەمانە و ئامرازەکان و دابەش کردنی کتێب بۆ چەند بەشێك و هەر بەشێکیش لەچەند خاڵێك پێکدێت.

**تایبەتمەندی پێنجەم:** لێزانی و توانا دەراساکەی قورئان لە گۆڕانکاری کردن لە دەربڕین و وتەسازییدا و داڕشتنی بەشێوە هونەرە هەرە بەرزەکانی ئاخاوتندا.

یەك واتا بەچەند دەربڕینێك و ڕێگەی جیا جیا دەخاتەڕوو، بەتوانایەکی دەرئاسا کە لە ئاستیدا هەناسەی تواناداراني بواری ڕەوانبێژی دەپچڕێت، بۆ نمونە:

قورئان داوای جێبەجێ کردنی فەرمانێکی کردووە بەم چەند شێوازانەی خوارەوە:

١- ڕاستەوخۆ دەقی ڕاشکاوی فەرمان و داخوازی هێناوە، وەك ئەو فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا﴾ النساء: ٥٨. واتە: (بێگومان خوا فەرمانتان پێدەدات کە هەموو ئەمانەتەکان "سپاردەکان"

بگەڕێننەوە دەست خاوەنەكانیان و هەر كاتێكیش دادوەریتان كرد لە نێوان خەڵكیدا، دادپەروەرانە فەرمانڕەوایی بكەن).

٢- یاخود هەواڵدان بەوەی ئەنجامدانی ئەو كارە پێویستە لەسەر ئەوانەی ڕاسپێرراو ئەركدار (مكلف)ن، وەك ئەم فەرمایشتە: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ﴾ البقرة: ١٨٣. واتە: (ڕۆژووی ڕەمەزانتان لەسەر پێویست كراوە).

٣- هەواڵدان بەوەی ئەو كارە لەسەر شانی خەڵكیە، وەك: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا﴾ آل عمران: ٩٧. واتە: (جا خوای گەورەش بڕیاری داوە لەسەر خەڵكی حەج و سەردانی "بیت الحرام" بكەن بەتەنها ئەوانەی كە توانای "دارایی و تەندروستیان هەیە").

٤- ئاگادار كردنەوەی كەسی ڕاسپێرراو و ئەركدار بەو كارەی كە لەسەری پێویستە، وەك: ﴿ وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَاثَةَ قُرُوءٍ﴾ البقرة: ٢٢٨. واتە: (ژنانی تەڵاقدراو، دەبێت تا سێ جار عادەتی مانگانە چاوەڕێ بكەن "شونەكەنەوە"). مەبەستی ئەوەیە كە ئارام گرتن پێویستە تا ماوەی دیاریكراو تێپەڕ دەبێت.

٥- هەواڵدان لەبارەی دەسپێك بەو واتایەی كە شتەكە جێبەجێ بكرێت لەلایەن كەسانی ترەوە، وەك: ﴿وَمَن دَخَلَهُ كَانَ آمِنًا﴾ آل عمران: ٩٧. واتە: (هەروەها ئەوەی بچێتە ناوی پێویستە ئەمین و ئاسوودە بێت). مەبەستی ئەوەیە: كە پێویستە لەگەڵ دوێنراوان ئاسایش و ئارامی ئەو كەسانە بپارێزن كە لە ناو حەرەمی ماڵی خوادان (بیت الله الحرام).

٦- داواكردنی ئەنجامدانی كارەكە بە شێوەی كاری داخوازی (فعل الأمر)، وەك: ﴿حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ وَالصَّلَاةِ الْوُسْطَىٰ﴾ البقرة: ٢٣٨. واتە: (كەمتەرخەمی مەكەن و پارێزگاری لە ئەنجامدانی نوێژەكاندا بكەن بەتایبەتی نوێژی ناوەند).

یاخود بە پیتی لامی فەرمان (لام الأمر)، وەك: ﴿ ثُمَّ لْيَقْضُوا تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُوا نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ﴾ الحج: ٢٩. واتە: (لەوەودوا با چڵك و ئارەق و موو و نینۆك لە خۆیان دووربخەنەوە "ئیحرام بشكێنن"، هەروەها وەفا بكەن بە

نەزرەکانیان و جێبەجێی بکەن و بەدەوری ماڵی دێرین و بەنرخی خوا "کەعبـە"دا، با "تەواف" بکەن).

٧- ئاگادار کردنەوە لەبارەی کارێکیئەو کـارە خێـرو چـاکەیە، وەك: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَٰمَىٰ ۖ قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ﴾ البقـرة: ٢٢٠. واتـە: (هـەروەها پرسـیارت لێدەکـەن دەربارەی هەتیوان "کە چۆن بن بۆیان" پێیان بڵێ: چاکسازی و پەروەردەکردنیان لە هەموو شت چاك و پەسەندترە).

٨- وەسف کردنی کار بە شێوەی ناونیشـان بـەوەی (چـاکەیە)، وەك: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰ﴾ البقـرة: ١٨٩. واتە: (بەڵکو چاکە ئەوەیە کـە ئـەو کەسـەی لـە خـواترس و پارێزکار بێت).

٩- وەسف کردنی کار بە سەپاندن، وەك: ﴿قَدْ عَلِمْنَا مَا فَرَضْنَا عَلَيْهِمْ فِىٓ أَزْوَٰجِهِمْ﴾ الأحزاب: ٥٠. واتە: (بەڕاستی ئێمە ڕێ و شوێنمان بۆ ئەوان "واتە ئیمانداران" ڕوون کردۆتەوە بەرامبەر هاوسەرانیان). مەبەستی لـە پێـدانی مـارەیی و دابـین کردنـی بژێویانە.

١٠- پەیمان دان و پاداشت ئامـادەکردن لەبەرامبـەر ئەنجامـدانی کـاری چـاکە، وەك: ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥ وَلَهُۥٓ أَجْرٌ كَرِيمٌ﴾ الحديد: ١١. واتە: (ئایا کێیە ئەوەی قەرزی چاك دەدات بـەخواو مـاڵ و سـامانی دەبەخشـێت لـە پێنـاوی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوادا، ئینجا خوایش پاداشتی بێ سنوری دەداتێ و بۆی چەند بەرابەر دەکات، هەروەها پاداشتی بەرێزو بەنرخی بۆ ئامادە دەکات).

١١- کـار ڕێکخسـتن بـەپێی مـەرجی پێشـەخۆیی، وەك: ﴿فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْىِ﴾ البقرة: ١٩٦. واتە: (جا ئەگەر ڕێتان لێگیراو ئەرکەکانتان بۆ ئـەنجام نـەدرا، ئەوا دەتوانن ماڵاتێك بکەن بەقوربانی بەگوێرەی توانا).

١٢- هێنانی کارو فەرمان بە شێوەی نەفی و خراوەپاڵ (معطـوف) و لـەدوای ئـامرازی پرسـیار، وەك: ﴿أَفَمَن يَخْلُقُ كَمَن لَّا يَخْلُقُ ۗ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ النحـل: ١٧. واتـە:

("باشـە ئـەی هۆشمەنـدەکان" ئایـا ئـەو زاتـەی ئـەو هـەموو دروسـتکراوە سـەر سورهێنەرانەی بەدیهێناوە، وەکو ئەو کەسە وایە کە ناتوانێت هیچ بەدی بهێنێـت، ئایا ئەوە بۆ لێکی نادەنەوەو یادەوەری وەرناگرن). مەبەستی لەوەیە بیر بکەنەوە.

١٣- هێنانی کار لە دوای بەهیوا بوون، وەك: ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ البقرة: ١٨٥. واتە: (بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری خوابن).

١٤- هێنانی وەسفێکی زۆر ناشرین لەسەر فەرامۆشکردنی کارو فرمـان، وەك: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ﴾ المائدة: ٤٤. واتە: (جا ئەوەی حوکم داوەری بەو بەرنامەیە نەکات کە خوا دایبەزاندووە، ئا ئەوانە بێ باوەڕن).

هەر لەم بـارەوە تەماشـای دەربڕینـەکان بکـەن لـەبارەی ڕێگـری (النهـي) و ڕێپێـدان (الاباحة)...

جا ئەم گۆڕانکارییە لە دەربڕین و داڕشتنی جیا جیا بەرگێکی پـان و پـۆڕی لەوپـەڕی جوانی و قەشەنگی بەبەر قورئاندا کردووە، خوێنەرەکەی هەر چەند بیخوێنێتەوەو گوێی بۆ بگرێت ئەوا ماندوو و بێزار نابێت.

ئەم فرە دەربڕین و گۆڕانکاریە وشەییە هونەرێکە لـە هونـەرەکانی ئیعجـازی شـێوەیی (الأسلوبي).

**تایبەتمەندی شەشـەم:** قورئان کورتبڕی و ڕەوانبێژی و ڕوونپێژی بەیەکەوە کۆکردۆتەوە، لەگەڵ ئەوەی دوو ئامانجی نزیکن لە یەکتری و لە ئاخـاوتنی هـیچ یـەکێك لـە خەڵکیـدا کۆنابنەوە، بەڵکو ئاخاوتنی خەڵکی یان کورتبڕە یاخود ڕوونپێژە.

کورتبڕ (مجمل)[1]: ماناکەی ڕوون نییە، وەك: وشەی (مختار)کە لە بەینی بکەرو بـەرکار دێت و دەچێت، هەروەها وشەی (القرء) کە هەم بـە مانـای خـوێن بیـنین و هـەمیش بـە مانای پاکژی دێت.

[1] مجمل: بریتییە لەوەی کە بەخودی دەربڕینەکە مەبەستەکە بەدیار نەکەوتووە، بەڵکو پێویستی بەوەیە هەر لە خودی ڕستە کورتبڕەکەدا بە ئاماژەیەکی تر ڕوون بکرێتەوە، جا ئەمە: بەهۆی کەڵەکە بوونی واتای یەکسان وەك هاوبەش (مشترك). یاخود بەهۆی نامۆیی دەربڕینەکە وەك

دەربڕینــی ڕوون (مــبین): واتاکــەی ڕوونــە، پێویســتی بــە ڕوونکردنــەوەی تــر نییــە، مەبەستێکی سەربەخۆ جیا لە نـاوکۆ (سـیاق)ی ڕسـتەکە دەگەیـەنێت، وەك: ﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا ﴾ المائدة: ٣٨. واتە: (دەستی پیاوی دزو ئافرەتی دز ببڕن).

یان ئەوەتا وشەکە مانایەکی ڕۆشنی هەیە پێویستی بـە ڕۆشـن کردنـەوە نییـە یـاخود واتایەکی ناڕوونی هەیە پێویستی بە ڕوونکردنەوەیە. بەڵام دەبینین وشەی قورئان واتاکـەی ڕوونە، بەشێوەیەك کە دەروون و نەفس ماندوو ناکات بۆ گەڕان بـەدوای واتـاو توێژینـەوە کردن هەر لە یەکـەم سـاتدا، ئەگـەر بـە تیـژی بـۆی بڕوانیـت، ئـەوا مانـای نـوێی لـێ دەردەکەوێت، کە هەر هەموویان ڕاست و دروستن یان دەکرێت ڕاسـت و دروسـت بـن. جـا هەر کە زیاتر لێی قووڵببیەوە ئـەوا زانیـاری و نهێنـی زیـاترت بـۆ ئاشـکرا دەبێـت بـە ئەندازەی ئەوەی کە تاچەند ڕاست دەپێکی لـە تێڕوانینەکـەت و تـا چـەند ئامادەباشـیت تێدایە.

هەر لەبەر ئەم نهێنیە هەموو خاوەن مەزهەبـەکان بـەجیاوزی ئاراسـتە و ڕەوتیانـەوە، ئەوا ئەو شتەیان لە قورئانی پیرۆزدا دەستکەوت کە چارەسەری دەروونیانە.

بـەڵام وتـەی مرۆڤـــ وانییــە، ئەگــەر ئــەوان پــەنایان بــردە بــەر ڕوونکردنــەوەی مەبەستەکانیان، ئەوا دەربڕینەکانیان کورت دەردەچن و بـەو ئەندازەیـە فـراوان نـابن کـە دەســتبدەن بــۆ هــەڵهێنجان و تــەئویل، ئەگــەر پەناشــیان بــردە بــەر کــورتبڕی ئــەوا مەبەستەکانیان بەڕوونی دەرناکەوێت. تەنانەت لەوانەیە ئەو وتانەیان بـبن بـــە مـەتـەڵ و خەڵك بە ئاسانی تێیان نەگات.

---

وشەی (هلوع) کە واتاکەی: (بریتیە لەو کەسە کە لەکاتی ناڕامیدا کە تووشی ناخۆشیەك دەبێت بەخێرایی دەڕوات، زۆر بەخێرایی کاری خێرو چاکە قەدەغە دەکات). یاخود بەهۆی گۆڕانی مانا ڕووکەشییەکەی بۆ ئەوەی کە نەناسراوە وەك نوێژ و زەکات و سوو (ریبا). بڕوانە: شرح التلويح على التوضيح للتفتازاني ١/١٢٧.

**تایبەتمەندی حەوتەم:** کورتبڕی قورئان لەگەڵ پڕ واتایی دەربڕینەکەی.

لە قورئانی پیرۆزدا ڕوونکردنەوەکان مەبەستدارو کورتبڕن، بەوەی ئەو پێداویستیانەی مرۆڤ دابین دەکەن کە دەبنە هۆکار بۆ ڕێنمایی و هیدایەت، بەبێ ئەوەی دەربڕینەکە لە ماناکە زیاتر بێت یاخود دەقەکە کەم و کورت بێت، لەوەی نەتوانێت پێداویستیەکانی هیدایەتدانی مرۆڤایەتی بەرەو ڕێگەی ڕاستی و ڕەوانی پەروەردگار دابین بکات.

لەگەڵ ئەوەشدا واتاکەی قورئان لە وێنەیەکی تەواو و کامڵدا بەڕوونی بەدەرکەوت. بۆیە (إبن عطیة) وتویەتی: (ئەگەر تەنها یەك بێژە و دەربڕین لە - قورئانی پیرۆزدا - لابدەین و دواتر بەناو زمانی عەرەبیدا بگەڕێین بۆ دۆزینەوەی وشەیەکی باشتر، ئەوا دەستمان ناکەوێت).

بەڵام کەسانی ڕەوانبێژ لەناو خەڵکدا، ئەگەر ویستی گرنگی بدات بە کورتبڕی و دەربڕینەکانی پوخت و کورت بن و خۆ دوور بگرێت لە زیادەو پاشماوەکانی ئاخاوتن ئەوا پەنادەباتە بەر کورتبڕی لە مانادا، لەوانەیە لەکۆتاییدا وتەکەی وەك مەتەڵ لێبێت.

هەروەها ئەگەر ویستی ماناکە بەتەواوی و بێ کەموکورتی دەربڕێت، ئەوا پەنادەباتە بەر درێژبڕی، بۆ ئەوەی مەبەستەکەی بەبێ کرچ و کاڵی و بەتەواوی دەربڕێت.

ئەگەر گریمان دامانناکەسێکی ڕەوانبێژ بۆی کرا کە لە ڕستەیەك یاخود دوو ڕستەدا ئەو دوو مەبەستەی کە کورتبڕی و واتا بەخشیی تەواوە بەدەست بێنێت، ئەوا بێگومان لەدوای ئەم یەك دوو ڕستەیە هەر زوو ماندوێتی و شەکەتی یەخەی دەگرێت لە سەرتاپای وتەکانی تریدا ناتوانێت ئەم دوو مەبەستە بپێکێت.

ئەوەی تەماشای بەرهەمی بەهێزترین شاعیرو نووسەرو تاریێژەکان بکات، زۆر بەجوانی ئەمەی بەرچاو دەکەوێت، کە تەنها لە چەند دەربڕین و دێڕێکدا توانیویانە دەربڕینێکی کۆگیرو هەم واتایەکی ڕۆشن بخەنەڕوو.

هەتا پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) سەرباری ئەوەی کۆوشە (جوامع الکلم)ی پێدرابوو، دەروون و دڵی بە نووری پێغەمبەرایەتی ڕووناك کرابووەوە، فەرمایشتەکانی زۆر

بەرزتر بوون لـە وتـەی گشـت مرۆڤــەکان، کەچـی جیاوازییـەکی زۆر هەیـە لـە نێـوان فەرمایشتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و قورئانی پیرۆز.

## ڕووی دووەم: دەسەڵات و کاریگەری قورئان و دەستگرتنی بەسەر کۆی دڵ و دەروونەکان.

خوێنەری قورئان بێ تاقەت نابێت و بیسەرەکەیشی لێی بێزار نابێت، بەڵکو هەرچـەند زیاتر گرنگـی بـە جـوان خوێندنەکـەی بـدات ئـەوا شـیرینایەتیەکەی زیـاتر دەبێـت، زۆر دووبارەکردنەوەکەشی خۆشەویستی بۆی زیاتر دەبێت، جا کە دەنگی قورئـان لـە دەرگـای گوێیدا و پێی نایە ناو ئامرازی بیستن، ئەوا پوختەیەك لە چێژو شیرینایەتی دەخاتە دڵـەوە کە بەهۆیەوە دڵ گوشاد دەبێت و خۆشی و موژدە بەدەروونەکان دەبەخشێت[1].

**بەڵگە:**

١- شەوانە سەرانی کوفر بە پەنهانی و بەشڵەژاوی، پێخەفیان پشتگوێ دەخست و تـام و چێژی نووستنیان فەرامۆش دەکرد، بۆ ئەوەی گوێ بگرن لە قورئان خوێندنی پێغەمبــەر (صلى الله عليه وسلم) لـە شـەوو نوێـژەدا یـان لـە نوێـژی بەیانیـدا، بـەم گوێگرتنـە دڵ و دەروونیان خۆش و ئاسوودە دەبوون.

زوهری دەڵێ: ئەبو جەهل و ئەبو سوفیان و ئەخنەسی کوڕی شریق شـەوێك دەچـن بـۆ ئەوەی گوێ لە قورئان خوێندنەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بگـرن، پێغەمبــەریش (صلى الله عليه وسلم) لە ماڵی خۆیدا سەرگەرمی شەونوێژە، جا هەر یەکێکیان لە شـوێنێك دانیشتوون و گوێیان هەڵخستووە، هیچ کامیشـیان بەشـوێنی ئـەوەی تـری نـەزانیوە، تـا

[1] الشفا ١/٢٧٣ و٢٧٦ و الاتقان ٧١٩ نقلا عنه و عن غيره. سبل الهدى والرشاد ٩/٥٨٧، علم أصول الفقه لعبدالوهاب خلاف ٣١. خەتابی وتویەتی: دەڵێم ڕوویەکی تر هەیە لە ئیعجازی قورئان، کە خەڵکی پشتیان تێکردووە تەنها چەند خەڵکێکی ڕیزپەڕو تاك و توکێك دەیزانن، ئەویش بریتیە لە کاریگەری قورئان لەسەر دڵەکان... / بڕوانە: ثلاث رسائل في اعجاز القرآن ٧٠.

سپێدەی بەیانی گوێیان هەڵخستوەو، دواتر ڕۆیشتوونەوە، بەڵام کە لە ڕێگادا یەکتریان بینیوە، هەر کامێك لۆمەو سەرکۆنەی ئەوی دیکەی کردوە، بەیەکتریشیان وتوە: با جارێکی دیکە شتی وا دووبارە نەبێتەوە، چونکە ئەگەر بێ عەقڵ و کەم فامەکانمان بەو شتە بزانن گومان دەکەوێتە دڵیانەوەو وادەزانن کە ئێمەش کاریگەر بووینە بە (موحەممەد)، دوایی دەڕۆن.

پاشان بۆ شەوی دووەم بەهەمان شێوە هەر یەکە هاتەوە شوێنەکەی خۆی، دووبارە گوێیان هەڵخست بۆ قورئان خوێندنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، تا سپێدەی بەیانی، دواتر ڕۆیشتوونەوە، لە ڕێگادا بەیەکتر دەگەنەوە، بەهەمان جۆری شەوی یەکەم قسە بەیەکتری دەڵێن و دەڕۆن.

هەروەها کاتێك شەوی سێیەم هات، هەر یەکێك لە ناوبراوان، شوێنی خۆی گرتەوەو گوێی هەڵخست بۆ قورئان خوێندنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، تا سپێدەی بەیانی، دواتر ڕۆیشتن، سێبارە لە ڕێگادا یەکتریان بینیەوە، وتیان: پەیمان لەگەڵ یەکتر دەبەستین، کە جارێکی دی ئەوە دووبارە نەکەینەوە، پاشان ڕۆیشتنەوە.

کاتێك بووە بەیانی ئەخنەسی کوڕی شریق گۆچانەکەی دەست دەداتێ و دەچێ بۆ لای ئەبو سوفیان لە ماڵی خۆی پێی دەڵێ: هەواڵم پێبدە ئەی ئەبو حەنزەڵە ڕات چییە دەربارەی ئەوەی کە لە (موحەممەد)ت بیست؟! ئەویش دەڵێ ئەبو سەعلەبە سوێند بەخوا هەندێ شتم بیست تێی گەیشتم و مەبەستەکەشم زانی، هەندێ شتیشم بیست کە تێی نەگەیشتم و نەشم زانی مەبەستی چییە؟!.

ئەخنەس دەڵێ: سوێند بەوەی کە تۆ سوێندت پێ خوارد منیش بەهەمان شێوە.

وایی ئەخنەس لەلای ئەبو سوفیان هەڵدەستێ و دەچێ بۆ لای ئەبو جەهل لە ماڵی خۆیدا و پێی دەڵێت:

ئەبو حەکەم تۆ ڕات چییە دەربارەی ئەوەی کە لە موحەممەدت بیست؟ ئەبو جەهل دەڵێت: چیم بیست و ڕام چی بێت؟ ئێمەو نەوەی عەبدومەناف لەسەر برا گەورایەتی و قسە ڕۆیشتوویەتی پێشبڕکێمان بووە، ئەوان خواردنیان بەخشیوە، ئێمەش خواردنمان

بەخشیوە، ئەوان یارمەتی لێقەوماوانیان داوە، ئێمەش یارمەتیمان داون، ئەوان ماڵیان بەخشیوە، بەهەمان شێوە ئێمەش وامان كردووە، هەتا كاتێك وامان لێهات ئێمەو ئەوان هاوسەنگ بین، وەك دوو ئەسپ كە پێشبڕكێی پێ دەكرێ، لەیەك ئاستدان و هیچ كامیان پێش ئەوەی دی ناكاتەوە، نەوەی عەبدومەناف وتیان: ئێمە پێغەمبەرێكمان هەیە سروش لە ئاسمانەوە بۆ دێتە خوار، جا ئێمە پێغەمبەرێكی وا لە كوێ بێنین؟ سوێند بەخوا هەرگیز باوەڕی پێ ناهێنین و بەڕاستی نازانین، دوایی ئەخنەسی كوڕی شریق بەجێی دەهێڵێت[1].

٢- وەلیدی كوڕی موغەیرە هاتۆتە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) قورئانی بەسەردا دەخوێندەوە، وەك ئەوەی دڵی وەلید نەرم بووبێت بۆ قورئان، ئەم هەواڵە گەیشتە ئەبو جەهل.

ئەبو جەهل) هاتە لای پێی وت: ئەی مامە هۆزەكەت بۆچوونیان وایە كە هەندێ لە ماڵ و سامان كۆ بكەنەوە بۆ تۆ، ئەگەر بچیتە لای موحەممەد بۆ ئەوەی ئەو شتەی پێ فڕێبدەی كە وەریگرتووە.

وتی: قورەیش دەزانێ كەمن یەكێكم لە كەسە دەوڵەمەندەكان.

ئەبو جهل وتی: قسەیەكی لەبارەوە بكە تا هۆزەكەت بزانێت كە تۆش بانگەوازی موحەممەدت ڕەتكردۆتەوەو بە پەسەندی نازانی.

وتی: چی بڵێم، سوێند بەخوا هیچ یەكێك لە ئێوە شارەزاتر نییە لە من سەبارەت بە شیعر، ئەمە نە هۆنراوە هۆنینەوەو نە چامەیە، شیعری جنۆكەكانیش نییە، بەخوا بەهیچ جۆرێك لەو جۆرانە ناچێت كە دەوترێت، لە ڕاستیدا قسەكەی شیرینایەتیەكی تایبەتی

---

[1] السيرة النبوية لإبن كثير١/٥٠٥-٥٠٦ (وهي من كتابه البداية و النهاية)، ورواية الزهري نقلها إبن كثير ن البيهقي عن الحاكم بسنده إلى الزهري. وهذا في سيرة إبن هشام ٦٦/٢، المطبوعة مع روضة الأنف، تحقيق: طه عبدالرؤوف سعد، سبل الهدى والرشاد٢/٤٧٠.

هەیە و بناغەی زۆر فراوان و تۆکمەیە و هەر قسەکەی سەردەکەوێ و هیچ شتێك ناتوانێت بەسەریدا زاڵ بێت و ئەو شتانەی لەژێریدان تەختیان دەکات.

پێی وت: هۆزەکەت لێت ڕازی نابن تا تۆمەت و شتێکی بۆ هەڵنەبەستیت.

ئەویش وتی: ماوەم بدە تا بیر بکەمەوە، کاتێك تەواو بوو لە بیرکردنەوەکەی، وتی: ئەمە جادوویەکی کاریگەرو کارتێکەرە، کار لە بەرامبەر دەکات و بەرامبەر وەریدەگرێت، لەبەر ئەمە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿ ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ﴾ المدثر: ١١.[1] واتە: (واز لەمن و ئەو کەسە بهێنە کە بەتەنهایی دروستم کردووە "و هیچی نەبووە").

هەروەها ئەم بەسەرهاتە چەند گێڕانەوەیەکی هەن و بەچەند ڕێگەیەکی جیاواز هاتووە[2]، لە هەندێکیاندا هاتووە وەك ئەوەی (قورتوبی) هێناویەتی کە وەلید وتویەتی: (... ئەم قسەیە سەردەکەوێ و هیچ شتێك ناتوانێت بەسەریدا زاڵ بێت، مرۆڤ ناتوانێت ئەو جۆرە قسەیە بکات)، کاتێك قورەیش هاتن بۆ لای (وەلید) پێیان وت: (ئەم قسەیە چییە؟ "ولید" کەمێك وەستا و بیری کردەوەو ڕووی گرژ بوو، وتی: تەنها جادووگەرێکە، نابینن بەو قسانەی ژن و مێرد و منداڵ و کۆیلەکان لێك جیا دەکاتەوە؟. خوای گەورە ئەم ئایەتانەی نارده خوارەوە وەك بەرپەرچی (وەلید) هەروەك دەفەرموێت: ﴿إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ ﴿١٨﴾ فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿١٩﴾ ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ نَظَرَ ﴿٢١﴾ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ وَٱسْتَكْبَرَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ ﴿٢٤﴾ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا قَوْلُ ٱلْبَشَرِ ﴿٢٥﴾ سَأُصْلِيهِ سَقَرَ ﴿٢٦﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سَقَرُ ﴿٢٧﴾﴾ المدثر: ١٨-٢٧. واتە: (بەڕاستی ئەو بیری کردەوەو پەیامەکەی هەڵسەنگاند "بەڵام هەڵەیە". بەکوشت چێ و سەرەوە نگوون بێت، چۆن هەڵسەنگاندنێکی کرد. پاشان هەر

---

[1] لباب النقول في أسباب النزول للسيوطي في أسباب نزول الآية ١١ سورة المدثر. والرواية أخرجها الحاكم وصححها عن إبن عباس (رضي الله عنهما)، وإسنادها صحيح على شرط البخاري.

[2] بڕوانە ئەم سەرچاوانە: السيرة النبوية لإبن كثير ٤٩٨/١ -٥٠١، سيرة إبن هشام ١١/٢، تفسير القرطبی ٦٨٦٥/١٠-٦٨٦٦، الشفا ٢٦٢/١، تفسير إبن كثير ٤٤٢/٤-٤٤٣.

بەکوشت چیّ بۆ خۆی و هەڵسەنگاندنێك کە کردی بۆ قورئان. ئینجا بیری لێکـردەوەو ورد بووەوەو تەماشای دەوروبەری کرد. ئینجا ناوچاوی هێناوەوە یەك و ڕەش داگیرسا. پاشـان ڕووی وەرگێڕاو خۆی بەزلزانی. بەهەموو عەقڵیەوە وتی!! ئـەم قورئانـە جگـە لـە جـادوو نەبێت کە وەردەگیرێت هیچی تر نییە!!. ئەمە هەر قسەی بەشەرەو هیچی تر؟! "ئـەو بـیّ ویژدانە بەسەریەوە ناچێت" دەبێت بیگەیەنمە دۆزەخ. جا تۆ نازانیت دۆزەخ چییە؟).

٣- لە (عتبة)ی کوڕی (ربیعة)ەوە هاتووە، کە لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) دواوە لەبارەی ئەو ئایینەی هێناویەتی و ناکۆکە لەگەڵ ئایینی هۆزەکەی، جـا بـەم هۆیـە پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) ئـەم ئایەتانـەی ﴿حمٓ ۝١ تَنزِيلٌ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٢ كِتَٰبٌ فُصِّلَتۡ﴾ تا ئایـەتی ١٣: ﴿فَإِنۡ أَعۡرَضُواْ فَقُلۡ أَنذَرۡتُكُمۡ صَٰعِقَةً مِّثۡلَ صَٰعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ﴾ فصلت: ١٣. واتە: (جا ئەگەر لەگەڵ ئەم هەموو باسی دەسەڵات و توانایی و زانایی خوای گەورەدا پشتیان هەڵکردو گوێیان نەگرت، پێیان بڵێ: من ئاگادارتان دەکەم لەوەی شـریخە و بروسکە و کارەساتێکتان بەسەر بێت، وەك ئەوەی کە بەسەر عاد و سەمود هات). لـەم حاڵەتەدا (عوتبە) دەمی پێغەمبـەری (صلی الله علیە وسلم) گـرت و پـەنای بـۆ بـرد بـە خزمایـەتی و سـوێندیدا، بـەوەی وازی لـیّ بێنێـت، بـەم هۆیـە (عوتبـە) نەچـووە لای خانەوادەکەی و خۆی لەوان بەدوور گرت[1].

هەروەها لە گێڕانەوەیـەکی تـردا هـاتووە: پێغەمبـەر (صلی الله علیە وسلم) قورئـانی دەخوێند و (عوتبە)ش گوێی بـۆ دەگـرت و هـەر دوو دەستەکانیشـی لـە دوای پشـتیەوە دانابوو و پاڵی پێدابوو، تا گەیشتە شوێنی سوژدە لەو سورەتەدا، دوایی پێغەمبـەر (صلی الله علیە وسلم) سووژدەی برد، (عوتبە) نەیزانی چ وەڵامێکی بداتەوە، دواتر گەڕایـەوە نـاو

[1] السیرة النبویة لإبن کثیر ٥٠٢/١.

خانەوادەکەی و نەچووە ناو هۆزەکەی تا خۆیان نەهاتن بۆ لای، (عوتبە) داوای لێبووردنی لێکردن و وتی: سوێند بەخوا قسەیەکم بیست هەرگیز پێشتر شتی وام نەبیستوە، بۆیە نەمزانی چی پێ بڵێم[1].

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە.

دواتر (عوتبە) هەڵساو بەرەو لای هاوەڵەکانی، بەیەکتریان وت: سوێند بەخوا دەخۆین (ئەبو وەلید) بەڕوویێکی جیاواز لەوەی پێی چووە لای گەڕایەوە، کاتێك لەلای دانیشتن، وتیان: ئەی (ئەبو وەلید) چیت پێیە؟

وتی: سوێند بەخوا قسەیەکم بیست هەرگیز پێشتر شتی وام نەبیستوە، بەخوا نە شیعرە، نە جادویە، نە فاڵچێتییە، ئەی کۆمەڵی قورەیش بەقسەم بکەن و بیخەنە ئەستۆم، لەو پیاوەو لە کارەکەی بگەڕێن و هەقتان بەسەریەوە نەبێت، سوێند بەخوا ئەو قسەیەی لێم بیست هەواڵێکی مەزنی دەبێت، جا ئەگەر عەرەب (واتە: جگە لە ئێوەی قورەیش)[2] فەوتاندیان، ئەوە بەهۆی غەیری خۆتانەوە لە کۆڵتان بوەتەوە، بەڵام ئەگەر بەسەر عەرەبدا سەر بکەوێت، ئەوە موڵکی ئەو هی ئێوەیە و دەسەڵاتی ئەو هی ئێوەیە، ئێوە بەهۆیەوە بەختەوەرترین کەس دەبن.

وتیان: ئەی (ئەبو وەلید) بەخوا بەزمانی خۆی جادووی لێکردووی!.

ئەبو ولید وتی: ئەمە ڕای منە لەبارەیەوەو خۆشتان چیتان پێ باشە وابکەن![3].

عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی عەبدوشەمسی کوڕی عەبدومەناف لەوانە بوو کە بە کافری لە جەنگی بەدردا کوژرا.

٤-ئیبن سەنجر بەسەنەدەکەی کە دەگاتە (شورەیحی کوڕی عوبەید) گێڕاویەتیەوە، وتویەتی:

---

[1] الشفا ١/٢٧٤-٢٧٥.

[2] خۆم زیادم کردووە. (وەرگێڕ).

[3] السيرة النبوية لإبن كثير ١/٥٠٤-٥٠٥.

عومەری کوڕی خەتتاب وتویەتی: چوومەدەر بەدوای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کەوتم - پێش ئەوەی موسڵمان بم - بینیم پێش من گەیشتووەتە مزگەوت، منیش لە پشتیەوە ڕاوەستام، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەستی بە قورئان خوێندن کرد بە خوێندنی سورەتی (الحاقة)، منیش سەرم سوڕدەما لە ڕێکستن و ئەو چۆنیەتیەی قورئانی پێ هۆنراوەتەوە، وتم: سوێند بەخوا ئەم کابرایە شاعیرو هونەرمەندە، هەروەك قورەیش ئەم ناوو ناوەیان بۆ هەڵبەستبوو، جا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ۝ وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ قَلِيلًا مَا تُؤْمِنُونَ ۝﴾ ٤٠ - ٤١. واتە: (بەڕاستی ئەم قورئانە لە زاری پێغەمبەرێکی بەڕێزەوە پێتان ڕادەگەیەنرێت. دڵنیابن کە ئەم قورئانە گوفتاری شاعیر نییە، ئەوە بۆ زۆر کەمتان باوەڕ دەهێنن؟!). ئیمامی عمر دەڵێت: وتم: ئەم کابرایە فاڵچییە، زانی چی لە دەروونمدا هەیە، ئەم ئایەتی خوێندەوە: ﴿وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ قَلِيلًا مَا تَذَكَّرُونَ﴾ الحاقة: ٤٢، تا کۆتایی سورەتەکە. واتە: (گوفتاری فاڵچی و زێوانیش نییە، ئەوە بۆ زۆر کەمتان یادەوەری وەردەگرن).

بەم هۆیە ئیسلام هەموو شوێن و پێگەیەکی لە دڵی مندا داگیر کرد[1].

٥- ئیسلام بوونی عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێبێت)، پوختەی گێڕانەوەکە (ئیبن ئیسحاق) لە کتێبەکەیدا (السيرة) بەم شێوەیەی هێناوە: عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێت) بە ڕق و توڕەییەکی زۆرەوە شمشێرەکەی لە کالانێ دەرهێناوەو بەرەو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵانی بەڕێکەوت کە لە ماڵێکدا بەیەکەوە کۆ ببوونەوە لە نزیك (صفا).

ئینجا نوعیمی کوڕی عەبدوڵا لە ڕێگەدا بە عومەر دەگات و پێی دەڵێت بۆ کوێ دەچیت؟ عومەریش مەبەستی خۆی پێی ڕادەگەیەنێت. ئەویش هۆشداری دەداتە عومەر لە هەمبەر (بەنی عەبدومەناف)، دەڵێت تۆ چارەسەری ماڵی خۆت بکە! (مەبەستی لە:

---

[1] الروض الأنف ٢/٩٩-١٠٠.

سەعیدی کوڕی زیدی کوڕەمام و زاواکەی، هەروەها خوشکەکەی فاتیمەی کچی خەتاب کە ژنی سەعیدە) هەڵگەڕاونەتەوە لە ئاینی باوو باپیرانیان.

ڕاستەوخۆ دوای بیستنی ئەمە عومەر دەچێتە لایان و گوێی لێدەبێت کە خەبابی کوڕی ئەرت قورئان بەسەر هەردووکیاندا دەخوێنێتەوە، بۆیە (عومەر پاڵێك بە دەرگاکەوە دەنێت و دەچێتە ژوورەوەو لە سەعیدی زاوای و فاتیمەی خوشکی دەدات و لەگەڵ لێدانەکە فاتیمە کەمێك بریندار دەبێت، دواتر ئەو پەڕەی قورئانەکەی تێدا نووسرا بوو وەردەگرێت - دوای گفتوگۆ کردنیان - کە سورەتی "طه"ی تێدا نووسرابوو، کاتێك هەندێکی خوێندەوە وتی: ئای ئەو فەرمایشتە چەند بەرزو پیرۆزە.

دواتر چووە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شایەتمان دێنێ و موسڵمان بوونی خۆی ڕادەگەیەنێت، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) (الله أکبر) دەکات بەمەش هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەزانن کە (عومەر) موسڵمان بووە.

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: کە (عومەر) وتویەتی: (کاتێك قورئانم بیست دڵم بۆی نەرم بوو و گریان دایگرتم ئەمەش وایکرد بێمە ناو ئیسلامەوە)[1].

چەند گێڕانەوەی تر هەن، هەر هەمووشیان کۆکن لەسەر ئەوەی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) کاتێك موسڵمان بووە گوێبیستی هەندێ لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز لە سورەتی (طه) بووە.

٦- هاوبەش دانەران کۆڵیان نەدا و تێدەکۆشان لە ڕێگە گرتن لەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چیتر قورئان لەناو کەعبە و شوێنی قەرەباڵغ و بازارەکاندا نەخوێنێت، تەنانەت ئامۆژگاری خەڵکیان دەکرد کە گوێ بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەگرن، خوای گەورە لەبارەی ئەو هاوبەش دانەرانە فەرموویەتی: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَسۡمَعُواْ لِهَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ وَٱلۡغَوۡاْ فِيهِ لَعَلَّكُمۡ تَغۡلِبُونَ﴾ فصلت: ٢٦. واتە: (بێ باوەڕان دەیانوت: گوێ مەگرن بۆ ئەم قورئانە و بیکەن بەگاڵە و هەراو هۆریا بۆ ئەوەی ئێوە زاڵ بن و بیبەنەوە). تا

[1] سيرة إبن هشام ٢/٩٥-٩٧ ، السيرة النبوية لإن كثير ٢/٣٢-٣٩، بيان إعجاز القرآن للخطابي ٧٠.

هاوبەشدانەران گوێی بۆ نەگرن، چونکە ئەگەر گـوێ بـۆ قورئـان بگـرن ئـەوا گـەورەیی و پێگەی قورئانیان بۆ بەدەر دەکەوێت بەمەش دێنە ناو ئیسلامەوەو موسڵمان دەبن.

٧- ئەبو بەکر (خوا لێی ڕازی بێت) کاتێك قورئانی دەخوێنـد، خـۆی بـۆ نـەدەگیرا و دەگریا، منداڵ و ئافرەتان لەدەوری کۆدەبوونەوەو گوێیان بۆ دەگرت و چێژیان لێوەردەگرت و پێی کاریگەر دەبوون، ئەمەش وای لە قوڕەیش کرد کە ڕێگـری بکـەن، لـەوەی أبـوبکر نوێژ لە ناو کەعبەدا بکات، دواتر أبوبکر لەماڵی خۆی نوێژەکەی دەکـرد، لـەوێش خـەڵك هەر گوێی بۆ دەگرت و قورەیشیش هەوڵی ڕێگتنی دەدا[1].

٨- کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، لە کاتی حەجدا قورئانی خوێندەوە، بەسەر چەند کەسێك لە پشتیوانان (أنصار)، ئەوا چەند کەسەکە، باوەڕیـان پێـی هێنـاو و کـاتێ گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە، ئایینی خۆیان ئاشـکراکرد، بەمـەش وای لێهـات ماڵێـك لـە ماڵەکان نەما کە قورئانی تێدا نەبێت.

لە هەندێ کەس گێڕدراوەتەوە کە وتویانە: شارو وڵاتەکان بە شمشێر ڕزگار کران، بـەڵام شاری مەدینە بە قورئان ڕزگار کرا[2].

٩- لە کەسێکی نەصڕانی گێردراوەتـەوە، کـە بـەلای قـــورئان خـــوێنێکدا چـووە - قورئانی بەدەنگ دەخوێند - کەسە نەصڕانیەکە ڕاوەسـتاوەو گریـاوە، پێـی وتـرا: بۆچـی دەگریای؟ وتی: بۆ ئەو خەمناکی و بریقەی ڕێکخستن و جوانی تۆکمەییەکەی قورئان[3].

جا مەبەست لە خەمناکی بریتییە لەو خەفەتەی کە بـەهۆی بیسـتنی قورئـان تووشـی بووە، کە بەهۆیەوە دڵی لەت و جەستەی ملکەچ بووە.

---

[1] فەرموودەی: ئەبو بەکر (خوای لێ ڕازی بێت) کاتێك قورئانی دەخوێند.. تا: صحيح البخاري: ٦٣ كتاب مناقب الأنصار، باب هجرة النبي (صلى الله عليه وسلم) وأصحابه إلى المدينة، رقم ٣٩٠٥، عن عائيشة (رضي الله عنها).

[2] بيان اعجاز القرآن ٧١.

[3] الشفا ١/٢٧٤.

مەبەستیشی لە بریقەداری ڕێکخستن بریتیە لـە شـێوازی هۆنرانـەوەی قورئـان و ڕێـك هاتنەوەی وشە و واتاکانی لەگەڵ یەکتردا.

١٠- ئەبو عوبەید باسی کردووە کە عەرەبێکی دەشتەکی گوێبیستی پیاوێك بـوو کـە ئـەم ئایەتـەی دەخوێنـد: ﴿ فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴾ الحجر: ٩٤. واتـە: (هـەر فەرمانێکت پێدراوە "ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) بە ڕێك و پێکی" ئەنجامی بدەو گوێ مەدە بە بوختان و ڕەفتاری موشریك و هاوەڵگەڕان). ڕاستەوخۆ عەرەبەکە سـوژدەی برد، وتی: لەبەر ڕەوانبێژییەکەی سووژدەم برد[1].

١١- یەکێك گوێی لە کەسێك بوو کە ئەم ئایەتەی دەخوێند: ﴿ فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴾ یوسف: ٨٠. واتە: (ئینجا کاتێك کە نا ئومێد بوون لە پاشا، لە کەنارێکەوە بۆ خۆیان دەستیان کرد بە چپەو ڕا گۆڕینەوە). وتی: گـەواهی و شـایەتی دەدەم کـە هـیچ بەدیهێنراوێك ناتوانێت قسەی لەو شێوەیە بکات[2].

١٢- جوبەیری کوڕی موتعیم گوێی لە پێغەمبـەر بـوو (صلی الله علیه وسلم) کاتێـك سورەتی (الطور)ی لە نوێژی شێوان (مغرب)دا دەخوێند، کاتێك گەیشتە ئەم ئایەتـە: ﴿ أَمۡ خُلِقُواْ مِنۡ غَيۡرِ شَيۡءٍ أَمۡ هُمُ ٱلۡخَٰلِقُونَ ۝٣٥ أَمۡ خَلَقُواْ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ۝٣٦ أَمۡ عِندَهُمۡ خَزَآئِنُ رَبِّكَ أَمۡ هُمُ ٱلۡمُصَۣيۡطِرُونَ ۝٣٧ ﴾ الطور: ٣٥ - ٣٧. واتە (ئایا ئەوانە بەبێ هیچ شتێك، هیچ هۆیەك،، هاتوونەتە کایەوە؟! یان هەر خۆیـان دروسـتکارن؟!. یـان ئـەو بـێ باوەڕانە ئاسمانەکان و زەویان دروستکردووە؟ نەخێر ئەوانە هەر دڵنیـا نـابن. یـان ئەوەیـە گەنجینەی ڕزق و ڕۆزییەکانی پەروەردگاری تۆیان بەدەستە؟! تا ئاوا بوێرو لـە خـوا یـاخی بن). جوبەیر وتی: زۆر نەمابوو دڵم بفڕێت. لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: ئەوە یەکەم شت بوو کە ئیمانی لە دڵی مندا جێگیر کرد[3].

---

[1] الشفا ١/٢٦٢، سبل الهدی والرشاد ٩/ ٥٧٨.

[2] هەردوو سەرچاوەکەی پێشوو.

[3] الشفا ١/٢٧٤.

هەروەها ئەبو عوبەید وتویەتی:

كە جوبەیر وتویەتی: (وەك ئەوەی دڵم هەژێنراوە) كاتێك گوێبیستی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوو كە لە نوێژەكەیدا لەگەڵ هاوەڵانی دەیكرد ئەم ئایەتانەی دەخوێند: ﴿ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَاقِعٌ ۝ مَا لَهُۥ مِن دَافِعٍ ﴾ الطور: ٧ - ٨.[1] واتە: (بەڕاستی سزاو ئازاری پەروەردگاری تۆ ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) هەر پێش دێت. كەسیش ناتوانێت بەری بگرێت و دەستی پێوە بنێت و نەهێڵێت).

١٣- لە هەندێ كەس گێڕدراوەتەوە كە ئەگەر قورئانی بەدەستەوە بگرتایە، ئەوا لەبەر گەورەیی و شكۆداری قورئان ڕاستەوخۆ لەخۆدەچوو (دەبووورایەوە)[2].

هەندێ لە پیاوچاكان: كاتێك قورئان دەخوێنرا دەچوونە حاڵەتێكی ویژدانی بەرزەوەو هاواریان لێ هەڵدەستا، جاری واش هەبوو سەری دەكێشا بۆ لەخۆچوون و جل دڕاندن، وێنەی ئەو حاڵەتانەش بە ناپەسەند دانانرێن. هەر كەسێك تامی نەكردبێت نازانێت[3].

١٤- هەندێك كەس لەگەڵ بیستنی چەند ئایەتێكی قورئان ڕاستەوخۆ مردوون، چەندین كتێب و دانراوی تایبەت لەبارەی ئەو كەسانە دانراوە[4].

نمونەی لەو جۆرە گەلەك زۆرن ماوە ڕێگە نادات بە دوورو درێژی لەبارەیەوە بدوێین.

ئەمە كاریگەرییەكی تایبەتی هەیە لەسەر كەسانی زمانزان و ڕەوانبێژ، ئەگەرچی ئێمە هەستی پێنەكەین لەبەر زاڵبوونی زمانی بێگانە و بڵاوبوونەوەی نە شارەزایی بە زمانی

---

فەرموودەی: زۆر نەمابوو دڵم بفڕێت... تاد: صحیح البخاري: ٦٥ كتاب التفسیر - سورة الطور، ١ باب، رقم ٤٨٥٤ عن جبیر بن مطعم.

فەرموودەی: یەكەم شت بوو لە دڵمد جێگیر بوو... تاد: صحیح البخاري: ٦٤ كتاب المغازي، ١٢ باب، رقم ٤٠٢٣ عن جبیر بن مطعم.

[1] الأموال لأبي عبید القاسم بن سلام ١٦٤.

[2] معترك الأقران في إعجاز القرآن للسیوطي ٢٤٤/١.

[3] نسیم الریاض ٥٢٤/٢.

[4] البرهان للزركشي ١٠٦/٢، الاتقان للسیوطي ١٢٣/٢.

عەرەبی لەناو خودی عەرەبەکان، بەڵام کاتێك قورئان دابەزی نەیانتوانی ڕووبەڕووی ببنەوە بەڵکو بەپێچەوانەوە چێژو تامی شیرینایەتیەکەیان کرد، ئەمەش ئەوانی هەڵنا بۆ باوەڕ هێنان بە قورئانی پیرۆز.

تەنانەت یەکێك لە سیفەتەکانی هاوەڵان - خوا لێیان ڕازی بێت - ئەوەبووە کە ئەگەر کەسێك بەشەو بە لای ماڵەکانی ئەواندا گوزەری بکردایە، دەنگێکی وەك دەنگی مێشە هەنگی دەبیست لەبەر خوێندنەوەی قورئان.

تەنانەت هاوەڵ هەبووە کە هەموو شەوەکەی بێدار کردووەتەوە، تا وای لێهاتووە خێزانەکانیان سکاڵایان کردووە لەلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

هاوەڵیش هەبووە شەوی بێدار دەکردەوە بە یەك ئایەت، کە لەسەر یەك دەیخوێندەوەو لێ ورد دەبووەوە.

لە هەموو کاتێکدا قورئانیان دەخوێند، چ بە ڕاوەستان یاخود بە دانیشتنەوە، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ آل عمران: ١٩١. واتە: (ئەوانەی یادی خوا دەکەن لە کاتێکدا کە بە پێوەن یان دانیشتوون یاخود ڕاکشاون "لە هیچ حاڵەتێکدا یادی ئەو زاتە فەرامۆش ناکەن"، هەمیشە بیر دەکەنەوە لە دروست بوونی ئاسمان و زەوی).

هاوەڵان لەکاتی خوێندنەوەی قورئاندا تەزوو بەپێستیاندا دەهات، خوای گەورە لەوبارەوە دەفەرموویت: ﴿ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ الزمر: ٢٣.[1] واتە: (خوا جل جلالە جوانترین و پیرۆزترین فەرمایشتی ناردۆتە خوارەوە کە ئەم قورئانەیە، "لە جوانی دارشتنیدا" بابەتەکانی لەیەك دەچن، هەندێك باسیشی بەشێوازی جیاواز تیادا دووبارە بۆتەوە، جا کارکردی ئەم قورئانە ئەوەیە کە: تەزوو دەهێنێت بەگیان و پێستی ئەو کەسانەدا کە ترسی پەروەردگاریان لە دڵ

---

[1] الوحي المحمدي ١٢٢.

و دەروونندا هەیە، پاشان گیان و پێست و دڵیان نەرم و ئامادە و چالاك دەبێت بۆ یادی خواو خواپەرستی).

هەروەها ئەصمەعی گێڕاویەتیەوە کە گوێی لە وتەی کەنیزەکێك بووەو بۆیە پێی وتوە: "خوا بتکوژێت، بەڕاستی وتەکەت لەوپەڕی ڕەوانبێژیدایە؟ کەنیزەکەش وتی: ئایا ئەم وتەیەو هاوێنەکانی بەرەوان دادەنرێن، لەپاش ئەو ڕەوانبێژییەی کە لەم فەرمایشتەی خوا هەیە: ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِى وَلَا تَحْزَنِىٓ ۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾ القصص: ٧. واتە: (ئێمە دایکی موسامان ئاگادار کرد، کە شیری بداتێ "و پێمان وت" جا کاتێك مەترسیت پەیداکرد لەوەی کە پێی بزانرێت فڕێی بدەرە ڕووباری "نیلەوە"، نەبترسە "لەوەی تووشی بەڵا ببێت" نەخەفەتیشی بۆ بخۆ، چونکە ئێمە بەڕاستی دەیگێڕینەوە بۆ لات و لە ئایندەشدا دەیکەین بە یەکێك لە پێغەمبەرە پەیامدارەکان). خوای گەورە لەیەك ئایەتدا دوو فەرمان و دوو ڕێگری و دوو هەواڵ و دوو مژدەی کۆکردۆتەوە"[1].

مەبەستی کەنیزەکە لە دوو فەرمانەکە ئەمانەیە: شیری پێ بدە، فڕێی بدە. مەبەستی لە دوو ڕێگری (نهی)ەکەش: نەترسێ، خەفەت مەخۆ.

هەروەها مەبەستی لە دوو هەواڵەکە: ئاگادارمان کرد، کاتێك مەترسیت لێپەیدابووە لەوەی زیانی پیبگات. و دوو مژدەکەش: دەیگێڕینەوە، دەیکەین بە پێغەمبەر.

---

[1] الشفا ٢٦٣/١.

**ڕووی سێیەم: هەوڵدانی قورئان سەبارەت بە چەندین ڕووداو و شتی شاراوەو غەیبی، کە تەنها خوای گەورە دەیان زانێت[1]، چ لە ڕابردوو چ ئێستا چ داهاتوو بێت.**

**١- هەواڵی داوە لەبارەی شتە شاراوەو غەیبییەکانی ڕابردوو:**

قورئانی پیرۆز باسی بەسەرهاتی پێغەمبەرانی پێشووی بۆ ئێمە کردووە، وەك: ئادەم، نوح، هود، صالح، یەعقوب، یوسف، ئیبراهیم .... و باسی ئوممەتەکانی ئەوانیشی کردووە.

دوای ئەوەی بەسەرهاتی (نوح)ی گێڕاوەتەوە، فەرموویەتی: ﴿ تِلْكَ مِنْ أَنبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهَا إِلَيْكَ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَا أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَٰذَا فَاصْبِرْ إِنَّ الْعَاقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ ﴾ هود: ٤٩. واتە: (ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) ئەو باسانەی بۆمانکردییت، لە هەواڵە نادیارەکانە کەبۆت دەنێرین، نەتۆ دەتزانی و نە هۆزو نەتەوەکەشت پێش ئەم باسەی ئێمە، جا خۆگرو بە ئارام بە، چونکە بەڕاستی پاشەڕۆژ بۆ خواناس و پارێزگارانە).

هەروەها دوای گێڕانەوەی بەسەرهاتی لە دایك بوونی مریم (سەلامی خوای لێبێت) و لە ئەستۆ گرتنی بەخێوکردنەکەی لەلایەن (زکریا)، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ ذَٰلِكَ مِنْ أَنبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَامَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴾ آل عمران: ٤٤. واتە: (ئەو شتانەی باسکران چەند هەواڵێك بوون لە غەیبەوە، ئێمە لەڕێگەی "وەحی" سروش و نیگاوە بەتۆی دەگەیەنین، خۆ تۆ - ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)- لەوێ نەبوویت کاتێك پێنوسەکانیان هەڵدەدایە - ئاوەوە، پێنوسی کێ سەرکەوت و ئاو نەیبرد - ئەویان مەریەم پەروەردە بکات، تۆ لەوێش نەبوویت کاتێك کێشەیان بوو - لەسەر ئەوەی کێ بەخێوی بکات -).

[1] الشفا، سەرچاوەی پێشوو، الإنصاف للباقلاني ٦٣، تمهيد الأوائل ١٨٥، المواقف ٢٤٥/٨، المقاصد ٣٦/٥، سبل الهدى والرشاد ٥٨٨/٩، إثبات النبوة ١٢٣، علم أصول الفقه لعبداالوهاب خلاف ٣٠.

بــە تێــرو تەســەلی لــەبارەی چیرۆکیـیوســف (ســەلامی خــوای لێبێــت) دواوە، دواتــر دەفـــــەرموویت: ﴿ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ ۖ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ أَجْمَعُوٓا۟ أَمْرَهُمْ وَهُمْ يَمْكُرُونَ ﴾ یوسف: ۱۰۲. واتە: (ئــەی موحەمــەد (صلى الله عليه وسلم) ئــەم بەســەرهات و سەرگوزەشتەیەی یوسف - سڵاوی خوای لێبێت - کــە بــۆت نیگــا دەکــەین لــە هــەواڵ و بەسەرهاتە شاراوەکانە، خۆ تۆ لەلای براکــانی یوســف نــەبوویت، کاتێــك کــە هــەموویان بڕیاریاندا و پیلانیان گێڕا).

ئەمانە چەند بەســەرهاتێکی ڕاســتەقینەن، کــە زۆربــەی هەواڵــەکان لەمبارەیــەوە لــە کتێبەکانی (تەورات و زەبور و ئینجیل)دا هاتبوون، دوای ئەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەم بارەوە گفتوگۆی لەگەڵ جولەکەکان کرد، ئەوا جولەکەکان دانیان نــا بــە ڕاســتی هەواڵەکە، هەروەك لە سەرگوزەشتەی (یوسف) و نەوەکانی ئیسرائیلدا هــاتووە، تەنانــەت جولەکەکان بەو هەواڵەی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هێنابووی تێکشکان، چــونکە چاك دەیانزانی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەخوێندەوارەو هیچ شــارەزاییەکی نییــە سەبارەت بە کتێب و هەواڵەکانی جولەکە.

هەروەك کتێبە مێژووییە کۆنەکان و ئەو هەڵکەندراوانەی ئێستا دۆزراونەتەوە بەڵگــەن لەسەر بوونی ئەو گەلانە و پاشاکانیان. هــەروەها ئــەو هەواڵانــەیان کــە نەقشــکراون لــە شوێنەوارە بیناسازییە نێژراوەکانیان، هەموو ئەمانە هەواڵەکانی قورئانیــان پشــت ڕاســت کردووەتەوە.

**٢- هەواڵی داوە لەبارەی ئەو شتە شاراوەو غەیبیانەی ئامادەنە و هەن:**

أ- قورئان دواوە لەبارەی: فریشتە، جنۆکە، بەهەشت و دۆزەخ و ئەو سیفەتانەی کە پەیوەستن بە خوای گەورەوە.

ب- قورئان ڕووی ڕاستەقینەی مزگــەوتی (ضــرار)ی ڕوونکــردەوە، کــە دووڕوەکــان دروستیان کردبوو، بەمەبەستی پەرت کردنی موسڵمانان و تەڵە دانانەوە بۆیــان، لەوبارەوە خوای گەورە ئەم ئایەتــەی دابەزانــد: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مَسْجِدًا ضِرَارًا

وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًا بَيْنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا لِّمَنْ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبْلُ ۚ وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّا ٱلْحُسْنَىٰ ۖ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴾ التوبة: ١٠٧. واتە: (ئەو "دووڕوانەی" کە مزگەوتێکیان دروست کردووە لەبەر زەرەردان و بڵاوکردنەوەی بێ باوەڕی و دووبەرەکی لەنێوان ئیمانداران بۆ چاوەڕوان کردنی هاتنی ئەو کەسانەی کە پێشتر دوژمنایەتی و جەنگیان دژی خواو پێغەمبەرەکەی دەکرد و بێگومان سوێند دەخۆن کە: ئێمە تەنها مەبەستمان چاکە بووە، "لە کاتێکدا" خوایش شایەتی دەدات کە ئەوانە درۆزنن).

٣- ئاشکرا کردنی بارودۆخی ناشرین و قێزەونی دووڕووان بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرمووێت: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعْجِبُكَ قَوْلُهُۥ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيُشْهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِى قَلْبِهِۦ وَهُوَ أَلَدُّ ٱلْخِصَامِ ﴿٢٠٤﴾ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِى ٱلْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ ٱلْحَرْثَ وَٱلنَّسْلَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْفَسَادَ ﴾ البقرة: ٢٠٤-٢٠٥. واتە: (هەندێ کەس هەن قسەو گوفتارو دەم پاراویان لەبارەی ژیانی ئەم دونیایەوە سەرسامت دەکات، خوایش بەشایەت دەگرێت و دەڵێت: دڵ و زمانم یەکسانن، لە کاتێکدا ئەو سەرسەختترین کەسە لەهەموو جۆرە دوژمنایەتیەکدا. هەر کاتێك ئەو جۆرە کەسە پشتی هەڵکرد و دەسەڵاتی پەیداکرد" هەوڵ و کۆشش دەدات لە زەویدا تا ئاشوب بەرپا بکات و خراپە بڕوێنێت و کشتوکاڵ لەناو ببات و پاکتاو کردنی ڕەگەزی ئەنجام بدات، بێگومان خوا فەسادو خراپە و تاوانی ناوێت).

**٣- هەواڵی داوە لەبارەی شتە شاراوەو غەیبییەکانی داهاتوو:**

أ- قورئان هەواڵی داوە لەبارەی سەرکەوتنی ڕۆم. (ترمذي) لە (نیاری کوڕی مکرم الأسلمي) گێڕاویەتیەوە کە وتویەتی: کاتێك ئەم ئایەتانە دابەزین: ﴿الٓمٓ ﴿١﴾ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ﴿٢﴾ فِىٓ أَدْنَى ٱلْأَرْضِ وَهُم مِّنۢ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ ﴿٣﴾ فِى بِضْعِ سِنِينَ ﴾ الروم: ١-٤.واتە: (الم، ڕۆمەکان تێکشکێنران "بەدەستی فارسەکان". لە نزیکترین و نزمترین وڵاتیاندا، بەڵام لە ئایندەدا "نۆرەیان دێتەوە" ڕۆمەکان دوای شکستیان سەردەکەونەوە. لەچەند ساڵێکدا "لە چەند

ساڵێکی داهاتوودا نێوان ٣-٩") کاتێك ئەم ئایەتانە دابەزین فارسەکان سەرکەوتنیان تۆمارکردبوو و ڕۆمەکانیش شکستیان خواردبوو، موسڵمانانیش پێیان خۆش بوو ڕۆمەکان بەسەر فارسەکاندا سەر بکەون، چونکە موسڵمانان و ڕۆمەکان خاوەنی کتێبی ئاسمانین، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ ﴿٤﴾ بِنَصْرِ اللَّهِ يَنصُرُ مَن يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴿٥﴾﴾ الروم: ٤-٥. واتە: (ئەو ڕۆژە ئیمانداران خۆشحاڵ و شاد ئەبن. بەسەر کەوتنی خوا، هەر کەسێك یان هەر دەستەیەك ئەو زاتە بیەوێت، سەری دەخات، هەر ئەو خوایەش خاوەنی دەسەڵاتی بێ سنورەو زۆریش دلۆڤان و میهرەبانە). بە پێچەوانە قورەیشیەکان پێیان خۆش بوو هەر فارسەکان سەر بکەون، چونکە ئەوان و فارسەکان خاوەن کتێب نین، باوەڕیان بە زیندوو بوونەوە نییە، جا کاتێك خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند، (أبوبکر) دەرکەوت و لە ناو شاری مەککە هاواری ئەکرد: ﴿الم ﴿١﴾ غُلِبَتِ الرُّومُ ﴿٢﴾ فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُم مِّن بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ ﴿٣﴾ فِي بِضْعِ سِنِينَ﴾ الروم: ١-٤.

هەندێ لە قورەیشیەکان بە ئەبو بەکریان وت: ئەمە با لە نێوان ئێمەو ئێوەدا بێت، هاوەڵەکەی ئێوە بڕوای وایە ڕۆم سەر دەکەوێت بەسەر فارسدا لە چەند ساڵێکی داهاتوودا، دەی بۆچی گرەوی لەسەر نەکەین؟ ئەبو بەکر وتی: باشە دەیکەین، ئەمە پێش حەڕام کردنی گرەو بوو. ئینجا (ئەبو بەکر) گرەوی کرد لەگەڵ هاوبەش دانەران، هەروەها ماوەکەیان دیاریکرد، بە ئەبو بەکریان وت: لەسەر چەند گرەو بکەین؟ چونکە وشەی (بضع) بۆ سێ تا نۆ ساڵە، تۆ ساڵێکی مامناوەند دیاری بکە لە نێوان خۆت و ئێمەدا کە کۆتا ماوە بێت. ئەبو بەکر وتی: شەش ساڵ دیاری دەکەین. (نیار) دەڵێت: کاتێك شەش ساڵ تێپەڕین بەر لەوەی ڕۆم بەسەر فارس سەربکەون، ئەوا هاوبەش دانەران ئەو بەشە پارەو سامانەیان برد کە ئەبو بەکر لەگەڵ ئەوان گرەوی لەسەر کردبوو. جا کە ساڵی

حەوتەم هات ڕۆم بەسەر فارس سەرکەوت، موسڵمانانیش ڕەخنەیان لـە أبـوبکر گرت بەوەی (بضع)ی بەشەش ساڵ دیاریکرد، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی: (في بضـع) واتە: سێ تا نۆ. (نیـار) دەڵێـت: (لـە کـاتی ڕوودانـی ئـەم ڕووداوە خەڵکێکی زۆر موسڵمان بـوو)[1]. هـەروەها لـە تەفسـیری قورتوبیـدا[2] چـەند گێڕانەوەیەکی تری تێرو تەسەل هاتوون.

ب- خوای گەورە ڕووی فەرمایشتەکەی ئاراستەی پێغەمبەر (صلى الله عليـه وسـلم) کردووە بەوەی دەچێتە ناو شاری مەککە، کەچـی هێشـتا پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) ئەو هێزەی نەبوو کە بچێتە نـاو شـاری مەککـە و ڕزگـاری بکـات: ﴿لَقَدْ صَدَقَ اللَّهُ رَسُولَهُ الرُّؤْيَا بِالْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِن شَاءَ اللَّهُ آمِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ﴾ الفـتح: ٢٧. واتـە: (سـوێند بەخوا بێگومان خوا خەونی پێغەمبەرەکەی بەڕاستی و وەك خۆی هێناوەتـە دی کە دەفەرمووێت: بەم زووانە ئێوە بەهەموو ئارامی و ئاسوودەییەکەوە بەویستی خوا دەچنە ناو کەعبەی پیرۆزەوە، "عەمرە بەجێدەهێنن" سەرتان دەتاشن یـان کورتی دەکەنەوە بەبێ ئەوەی ترس و بیمتان لە کەس هەبێت).

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێش ئەوەی بچێتە (حدیبیە) لە خەونیدا بـینی: خۆی و هاوەڵانی بە ئارامی و ئاسوودەیی چوونەتە ناو شاری مەککەوەو هەندێ سەریان تاشیوەو هەندێکی تریش سەریان کورت کردووە. دواتر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خەونەکەی بۆ هاوەڵانی گێڕایەوە، هاوەڵانیش بەم هەواڵە دڵخۆش بوون، وا پێشبینیان کرد کە لەو ساڵەدا دەچنە مەککـەوە. و وتیـان: بێگومـان خەونی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليـه وسـلم) ڕاسـت و دروسـتە. بـەڵام کـاتێ پرۆسەی چوونە ناو شاری مەککە دواکەوت هەنـدێ لـە دووڕووەکـان ڕەخنـەیان

[1] صحيح الترمذي بشرح عارضة الأحوذي ١٢/٧٠-٧٢. قال الترمذي: هذا حديث صحيح حسن غريب.
[2] تفسير القرطبي ٥٠٨٤/٧.

گرت وەك عەبدوڵای کوڕی ئوبەی و عەبدوڵای کوڕی نوفەیل و ڕوفاعەی کوڕی خەرس و وتیان: بەخوا نە سەر دەتاشین و نە کورتی دەکەین و نە کەعبەش دەبینین!، خوای گەورە ئەم ئایەتی دابەزاند: ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ﴾ الفتح: ٢٧. هەواڵی بەوان دا کە موسڵمانان دەچنە ناو شاری مەککەوە بەڵام نەك لەم ساڵەدا بەڵکو لەکاتێکی تردا، هەروەها خەونەکەی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) ڕاستە[1].

پ- هەروەك قورئانی پیرۆز هەواڵی داوە، لەبارەی ئەوەی کە خوای گەورە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەپارێزێت و کەس ناتوانێت بە پەنهانی بیکوژێت، هەرچەندە پیلان بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دابرێژن و سورین لەسەر لەناوبردن و کوشتنی، خوای پایەبەرز دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ وَٱللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ المائدة: ٦٧. واتە: (ئەی پێغەمبەرو فرستادە، هەرچی فەرمان و پەیامێکت بۆ دابەزیوە لەلایەن پەروەردگارتەوە "بێ دوودڵی" ڕایبگەیەنە، خۆ ئەگەر بەو کارە هەڵنەسایت، ئەوە مانای وایە پەیامەکەیت "بەتەواوی" نەگەیاندووە "دڵنیاش بە" خوا دەتپارێزێت لە شەڕو خراپەی خەڵکی).

لە صەحیحی ترمزیدا هاتووە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) وتویەتی: کە پاسەوانی دەکرا لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تاکو ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿وَٱللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ المائدة: ٦٧. ئینجا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سەری لە کوڵانگەدا دەرهێناو بە پاسەوانانی فەرموو: **(يا أيها الناس انصرفوا**

---

[1] روح المعاني ٢٦/١٢٠، تفسير القرطبى عن قتادة ٩/٦١٠٩-٦١١٠.

**فقد عصمني الله)**[1] واتە: ئەی خەڵکینە چیتر پاسەوانی مەکەن و بگەڕێنەوە ماڵەکانتان لەبەر ئەوەی خوای گەورە دەمپارێزێت. ئەم فەرمایشتە بەچەند گێڕانەوەیەکی تریش لە (عەبدوڵای کوڕی شەقیق)ەوە هاتووە.

تەنانەت لە جەنگی "ئوحد" نزیکترین موسڵمان لە ڕیزەکانی دوژمن پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوو، هەتا ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت) وتویەتی: (کاتێك جەنگ گەرم دەبوو و پێکدادان توندتر دەبوو، ئێمە بە پێغەمبەری خوا خۆمان دەپاراست و هیچ یەکێك لە موسڵمانان بە ئەندازەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە دوژمن نزیك نەبوو).

هەروەها لە جەنگی (حونەین)دا موسڵمانان سەرەتا تێکشکان و ڕوویان لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)کرد، ئەویش لەسەر گوێدرێژە سپیەکەی بوو، کوڕەمامی پێغەمبەر (ئەبو سوفیانی کوڕی حارسی کوڕی عەبدولموتەلیب) ڕێشمەی گوێدرێژەکەی ڕادەکێشا، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دابەزی و داوای سەرکەوتنی کرد و فەرمووی: **(أنا النبِي لا كذِب، أنا ابن عبد المطلب)**[2] واتە: من پێغەمبەرم درۆ ناکەم، من نەوەی عبدالمطلبم، پاشان ڕیزی موسڵمانانی ڕێکخست.

هەواڵدانی قورئانی پیرۆز هاتەجێ، هیچ یەکێك لە دوژمانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەیاتوانی بگەن بە مەرامی خۆیان سەبارەت بە کوشتن و لەناوبردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، سەرباری زۆری و تواناداری

---

[1] صحيح الترمذي بشرح عارضة الأحوذي ١١/ ١٧٤، باب التفسير. سەیری ئەو نمونانە بکە لەوەی خوای گەورە پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) پاراستووە: الشفا ٣٤٦/١ ولاپەڕەکانی دواتر، تفسير إبن كثير ٧٧/١-٧٩.

[2] فەرموودەی: بەرەو ل پێغەمبەر چوون ... تاد: صحيح البخاري: ٥٦ كتاب الجهاد، ٩٧ باب من صف أصحابه عمند الهزيمة، رقم ٢٩٣٠، بهذاا اللفظ، عن البراء بن عازب، وانظر الحديث فيه أيضا رقم ٢٨٦٤ و ٢٧٤٢ و ٣٠٤٢ و ٤٣١٥ و ٤٣١٦ و ٤٣١٧ وكلها عن براء بن عازب. وهو في صحيح مسلم: ٣٢ كتاب الجهاد، ٢٨ باب غزوة حنين، رقم ١٧٧٦، عن البراء.

بۆسەکانی دوژمنان لە هەموو کاتێکدا، سەرباری ئەوەش کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەمیشە لە ڕیزەکانی پێشەوە بووە لە جەنگدا، خاوەنی بوێرییەکی کەم وێنە بووەو ڕووبەڕووی هاوبەش دانەران بووەتەوە بە جەنگ و قسە وتن بەخواکانیان، کەچی زۆربەی ئەو سەرۆك و پاشایانەی کە ئەگەر دوژمنانەکانیان بۆسەیان بۆ دانیبێن ئەوا ئامانجەکەیان پێکاوەو کوشتویانە.

ت- ئەم فەرمایشتە: ﴿ سَيُهْزَمُ ٱلْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ﴾ القمر: ٤٥. واتە: (لە ئایندەیەکی نزیکدا لەشکرو کۆمەڵیان شکست دێنێت و هەڵدێن). لە شاری مەککە دابەزی، هێشتان فەرمان بە (جیهاد) نەکرابوو، چونکە لە ساڵی دووەمی کۆچی فەرمان کرا بە جیهاد، ئەم ئایەتە هەواڵی دەدا لەبارەی تێکشکانی هاوبەشدانەران و سەرکەوتنی موسڵمانان، تەنانەت ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) - لە گێڕانەوەی (ئیبن ئەبی حاتەم و ئیبن مەردویە) - لە کاتی دابەزینی ئەم ئایەتەدا دەیووت: کامە کۆمەڵەیە شکست دەخوات مەبەستی لەکامەیە؟ دەڵێت کاتێك جەنگی "بەدر" هات، دەمبینی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەو ئایەتەی دەفەرموو.

ئەم شتە شاراوەو غەیبیانە کە قورئانی پیرۆز باسی کردوون، جگە لەناوبراوان، زۆر شتی نهێنی تریش هەن، کە بەشێوەیەکی سەلمێنەر هەواڵی لەبارەوە هاتووە، ڕۆژگارو ڕووداوەکان لەبارەی ڕاستێتی ئەمانە بۆ ئێمە هاتوونەتە دوان، جا ئایا ئەم شتانە کەسێکی نەخوێندەوار لەخۆیەوە هێناویەتی، سەرباری ئەوەی سەلمێنراوە کە ناوبراو نەخوێندەوار بووەو توانای نووسینی نەبووە، تەنانەت لەو سەردەماندا خەڵك هۆگرو ئاڵودە نەببوو بە خوێندەوەو فێربوونی کتێبەکان، خوای گەورە لەم فەرمایشتەدا ئەوە ڕەتکردووتەوە پێغەمبەر خوێندەوارو توانای نووسینی هەبێت: ﴿ وَمَا كُنتَ تَتْلُواْ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَٰبٍ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴾ العنکبوت: ٤٨.[1] واتە: (تۆ ئەی

[1] الإنصاف للباقلاني، سەیری کتێبەکەمان بکە: أمیة الرسول محمد (صلی الله علیه وسلم).

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێش ناردنی ئەم قورئانە هیچ کتێبێکت نەدەخوێندەوە، بەدەستی خۆیشت هیچ شتێکت نە نووسیووە، "چونکە نەخوێندەوار بوویت" خۆ ئەگەر شتێکی وات ئەنجامبدایە، لەو کاتەدا نەفام و دەم بەتاڵەکان دنیایان پڕ دەکرد لە شك و گومان).

بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەو هەواڵانەی وەرگرتووە، لە سەرچاوەیەکی زانستی باوەڕپێکراو کە قبولی هەڵە ناکات، ئەو سەرچاوەیەش بریتی بوو لە سروش و نیگا کە لەلایەن خوای بەدیهێنەرەوە هاتووە، کەسێکی خاوەن ژیری و عاقڵیش دان بەوەدا نانێت کە ئەم شتانە بەرهەمی بلیمەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوونە، چونکە کەسێك کە پێشبینی بۆ داهاتوو دەکات، ئەوا یارمەتی وەردەگرێت لە ئەزموونی ڕابردووی، وەك چرایەك کە بەڕووناکیەکەی هەنگاوەکان لەمیانەی ڕووداوەکانی داهاتوو ئاشکرا دەکات، دوای ئەمەش زۆر بە هۆشیاری و وریایی حوکم دەدات و ناتوانێت ئەو پێش بینی و قسەیەش کە دەکات بەیەکجاری بیبڕێنێتەوە، چونکە ئەگەر بڕاندیەوە یان ئەوەتا:

کەسێکی سەرەڕۆیە و گوێ نادات بەوەی دەیڵێت، ڕاست بێت یان درۆ، ئەمە حاڵ و بارودۆخی بەخت گرەوەو جادوگەرو ئەستێرە ناسەکانە.

یاخود کەسێکە لە خواوە پەیمانی وەرگرتووەو خوای گەورەش هەرگیز پەیمان شکێنی ناکات، ئەمە ڕێ و شوێن و ڕێبازی پێغەمبەران و پەیامبەرانە.

ئەو هەواڵدانە لەبارەی داهاتوو، ئەو پێشبینیانەی کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون، بەڵگەی سەلمێنەرن لەسەر ئەوەی قورئان لەلایەن خواوە هاتووە لەسەرزمانی پێغەمبەرە بەرێزەکەی و بۆ ئەوەی بسەلمێنرێت کە جۆرێك نییە لەو پێشبینیە بێ بنەمایانەی کە جادووگەرو ئەستێرەناسان دەیڵێن.

**ڕووی چوارەم: ئەو ڕاستییە زانستیانەی قورئان کە زانستی سەردەم جەختیان لەسەر دەکاتەوە[1]:**

قورئانی پیرۆز دیدو تێڕوانینی خەڵکی ئاراستە کردووە بۆ بوونەوەرو یاساکانی و ئەو بەدیهێنراوانەی لەخۆی دەگرێت، تا جەخت بکاتەوە لەسەر ئەوەی هەموو ئەو شتانە بە دەستی توانستی خوای پایەبەرزبەدیهێنراون، بۆیە تەنها شتێك کە لەسەر هەر تاکێکپێویستە، بریتیە لەوەی ملکەچی فەرمانی خوای گەورە بێت.

ئینجا نموونەی ئەو ڕاستیە زانستیە بڵاوانەی کە زانستی سەردەم باسی کردووەو جەختی لەسەر کردووەتەوە بە ڕاستیە چەسپێنراوەکانی، ئەمانەن:

١- زانا گەردوون ناسەکان لە وەتەی چەند سەدەیەکی پێش زایین تا دەرکەوتنی ڕوانگە گەردوونییەکان (مراصد الفلكية) بەسەر دوو دەستەدا دابەش ببوون:

**یەکەمیان:** ڕای وابوو کە گۆی زەوی جێگیرەو چەقی جیهانە و هەسارە گەڕۆکەکان بەدەوریدا دەسوڕێنەوە.

**دووەمیان:** ڕای پێچەوانەی هی یەکەمە. واتە: بۆچوونی وابوو کە خۆرجێگیرەو زەوی و هەسارە گەڕۆکەکانی تر بەدەوریدا دەسوڕێنەوە.

بەڵام قورئانی پیرۆز تێڕوانینەکەی جێگیرە، بەوەی کە گشت تەنە ئاسمانیەکان دەجوڵێن و مەلە دەکەن لە خولگەکەیاندا، خوای پەروەردگار دەفەرموویێت: ﴿ وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ۝٣٨ وَٱلۡقَمَرَ قَدَّرۡنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلۡعُرۡجُونِ ٱلۡقَدِيمِ ۝٣٩ لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ وَكُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ۝٤٠﴾ یس: ٣٨ - ٤٠. واتە: (خۆریش لەگەردش و سوڕانەوەی خۆیدا بەردەوامە بەرەو سرەوت دەچێت، یاخود بەدەوری چەقی خۆیدا دەسوڕێتەوە، بێگومان ئەمە توانای زاتێکی باڵادەست و زانا دەردەخات- کە هەموو شتێکی بەرێکوپێکی دروست کردووە -. هەروەها کات و شوێنی هەڵهاتنی مانگیشمان دیاری کردووە- هەر

---

[1] علم أصول الفقه لعبدالوهاب خلاف ٢٩.

شەوێك لەکاتێکی دیاری کراو و شوێنێکی دیاریکراو هەڵدێت - ڕاددەی ئـەو ڕووناکیـەش کە دەکەوێتە سـەری جیـاوازە، تـا- سـەرەنجام هـەموو مانگێـك لـە ڕواڵەتیـدا - وەك چیلکەیەکی ووشکی باریك دەنوێنێت. نەخۆر بۆی هەیـە بـەمانگ بگـات - لـە هێـڵ و ڕێڕەوی خۆی دەربچێت - نە شەویش پێش ڕۆژ دەکەوێت، بەڵکو هەریەکـەیان لەخولگـەی تایبەتی خۆیاندا مەلەدەکەن و بەئاسانی دەسوڕێنەوە).

دواتر ڕوانگە سەردەمییەکان داهێنران و دیدو تێڕوانینی قورئانی مەزنیان پشت ڕاسـت کردەوە، بەوەی هەر تەنێك کە لە بۆشایی ئاسماندایـە، ڕانەوەسـتاوەو بـەڵکو لـە جوڵـەی بەردەوام دایە.

٢- خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴾ الذاريات: ٤٧. واتـە: (ئێمە ئاسمانمان بەدەستی قودرەتی خۆمان دروست کـردوو، بـەردەوامیش گـەورە و فراوانی دەکەین). بەڵگەو ئاماژەیە لەسەر ئـەوەی بوونـەوەر لـە فـراوان بـوونێکی بەردەوام دایە، (سیر جیمس جینز) دەڵێت: (ئەندازەی ئەو فراوان بوونە سەدو پێـنج میلە لە چرکەیەکدا، هەر دووریەکیش ئەندازەکەی یـەك ملیـۆن سـاڵی تیشـکییە، هەروەها قەبارەی بۆشاییی جیهانی ئێستا نزیکەی دە ئەوەندەی قـەبارەی خۆیـەتی لەو کاتەی کە دەستی بە فراوان بوونەکەی کردووە، واتە هەر دووریەکیش لـە سـێ دوورییەکان کەمێك زیادی کردووە لەئەندازە بنچینەییەکەی)[1].

تەنانەت بابەتی فراوان بوونی گەردوون ئێستا بووەتە یەکێك لـە شـتە سـەلمێنراوەکان، ئەنشتاینی بەهەڵەدا برد، (هابـل)ی زانـای سروشـتناس ئـەوەی دەرخسـت کـە هەسـارە گازییەکان (الكواكب السديمية) دوور دەکەونەوە لە هەسـارەی ئێمـە، جـا لەمـەوە زانـای بیرکاری بەلژیکی (لومتر) تیۆری فراوانبوونی گەردوونی هەڵهێناجا.

٣- خوای بێ وێنە دەفەرموویت: ﴿وَٱلۡجِبَالَ أَوۡتَادٗا﴾ النبـأ: ٧. واتـە: ("ئایـا کێوەکانمـان وەك مێخ بۆ دانەکوتاون"). قورئانی پیرۆز ئـەم ڕاسـتیەمان بـۆ دەخاتـە بەرچـاو،

---

[1] التفسير العلمي للآيات الكونية ٦٩.

تەنانەت بەڕاشکاوانە ئاماژە دەکات بۆ وردترین تیۆرەکانی زەویناسی (جیۆلۆجی)، کە دەڵێت چیاکان ڕەگیان هەن و داکوتراون لە زەویدا بەشێوەیەك کە قەبارەی ئەو بەشەی لە ژێر گڵ و زەوییدایە دوو ئەوەندەی ئەو قەبارەیە کە لەسەر زەوییە.

٤- خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿ أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا ﴾ الأنبياء: ٣٠. واتە: (ئایا ئەوانەی بێ باوەڕ بوون نەیان بینیوەو بۆیان ڕوون نەبۆتەوە بەڕاستی ئاسمانەکان و زەوی یەك پارچە بوون لەوەودوا لێکمان جیاکردنەوە). ئەم ئایەتە ئەمە دەردەخات کە پێشتر ئاسمانەکان و زەوی یەك پارچە و تۆپەڵە بوون، دواتر دابەش کران بۆ سەر ئەم بەشانە. و تیۆرە هاوچەرخەکانیش باس لەوە دەکەن کە تەنە ئاسمانیەکان پێشتر یەك تۆپەڵە گاز بوونە.

٥- خوای زانا و خاوەن توانا دەفەرموویت: ﴿فَمَن يُرِدِ اللَّهُ أَن يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ ۖ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاءِ ﴾ الأنعام: ١٢٥. واتە: (ئەو کەسەی "خێری تێدا بێت" و خوا بیەوێت هیدایەتی بدات، ئەوە سینەی ساف و پاك و ئامادەی دەکات بۆ ئاینی ئیسلام، ئەو کەسەش خوا بیەوێت گومڕای بکات، ئەوە دڵی دەگوشێت و سینگی تووند دەکات و هەناسەی سوار دەبێت، هەروەك ئەوەی بەرەو ئاسمان بەرز ببێتەوە). ئایەتی ناوبراو ئاماژە دەکات بەوەی کە هەر کەسێك بە ئاسماندا بەرز ببێتەوە، هەست بە سینگ وێك هاتنەوەو دڵ تەنگی دەکات و کرداری هەناسەدانی سەخت دەبێت، جا لە کاتی دۆزینەوەی چینە بەرزەکانی هەوای بە هۆی فڕۆکە و مووشەکەکانەوە... زانایان ڕایان بۆ ئەوەچووە: ئۆکسجین کەمە لە چینەکانی هەوای ئاسماندا، ئەمەش دەبێتە هۆی سینگ گوشین و دڵ تەنگ بوون، هەر لەبەر ئەمەشە فڕۆکەوانان ئامێری هەناسەدانی دەستکرد بەکاردێنن بۆ نەهێشتنی سینگ گوشین و ئاسانی ئەنجامدانی کرداری هەناسەدان.

٦- خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً ۖ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِ مِن بَيْنِ

فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَآئِغًا لِّلشَّـٰرِبِينَ ﴾ النحل: ٦٦. واتـە: (بەڕاسـتی لـە حەیواناتـدا پەندو چاوڕووناکی هەیە بۆ ئێوە. ئەوەتا ئێمە لەوەی کە لە سکی ئەو جینسـە دەر ئەچێ لە مابەینی پیسی و خوێندا شیرێکی سافی گەوارتان دەرخـوارد ئـەدەین بـۆ ئەوانەی شیر دەخۆنەوە). ئەوە دەردەخـات کـە شـیری پـاك و خـۆش بـۆ ئەوانـەی دەیخۆنەوە لـە نێـوان پیسـایی (پاشماوەکـان) و خوێندێتـە دەرەوە. ئـەم ڕاسـتیەش زانستی سەردەم ڕوونتری دەکاتەوە کاتێك دانی ناوە بـەوەی کـە: شـیر بـەر لـەوەی بچێتە ناو ئامرازی شیردان (گوان[1])، بەدوو پرۆسەی پوختەکردندا تێپـەڕ دەبێـت: یەکەمیان پوخت و پاك کردنەوەی لە پیسایی و پاشماوەی زیانبـەخش، ئەمـەش لـە دوای هــەرس کردن و هـاتنی شـیری شـل بـۆ نـاو ڕیخۆڵـەکان، جـا لـەو کاتـەدا مەمیلەکانی نـاو ڕیخۆڵـەکان هەڵدەسـتن بـە مـژینی کەرسـتە خۆراکییـەکان، کـە فڕێدراونەتە ناو خوێن و پیساییەکەش هـەر لـەناو ڕیخۆڵەکانـەوە ماوەتـەوە دواتـر فڕێدەدرێتە دەرەوەی جەستە، بەڵام مادە مـژراوەکان کـە فڕێدراونەتـە نـاو خـوێن دەبێت بە دوو بەش، بەشێکیان دەبێتـە خـۆراك و وزە بـۆ بوونـەوەرە زیندووەکـە، بەشێکی تریش ڕژێنە شیرییەکان لە خوێن پاکی دەکەنـەوەو دەینێـرن بـۆ ئـامرازی شیردان وەك شیرێکی پوخت[2].

ئەم ڕاستیانەو چەندین ڕاستی تری زانستی فرەن لەو پەیامەی کە پێغەمبـەر (صلی الله علیـە وسـلم) هێناویـەتی لەکاتێکـدا خـۆی نەخوێنـدەوار بـووەو لـە کـەش و هەوایـەکی پەڕاوێزخراو و دوور لە گەلانی جیهان ژیاوە، ئەمانە گشتیان مەشخەڵی ڕۆشنکەرەوەن بـۆ هزری زانستی ئازاد، خەڵکیش پێشتر لە گشت ناوچە جیا جیاکانی جیهان ئاگـاداری ئـەو ڕاستیانە نەبوونە، تا ئەو کاتەی ئامرازەکـانی زانسـتی سـەردەم دەرکـەوتن وەك ئـامێرو تاقیگە و ڕوانگە گەردوونیەکان... هەر لەگەڵ دەرکەوتنی ئەو ئـامێرە پێشـکەوتوانە دان

---

[1] وەرگێڕ.

[2] الرسول - سعید حوی ٣٨/٢ و لاپەڕەکانی دواتر، تەماشای چەند نمونەیەکی تریش بکە لەم بارەوە، هەروەها سەیری چەند دیاردەیەکی تری ڕاستەقینە بکە لە: التفسیر العلمي للآیات الکونیة.

بە ڕاستییە درەوشاوەکانی قورئانی پیرۆز دەنرێت کە هیچ لێڵی و ناڕوونی تێدا نییە، بەڵکو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ڕوونتر دەردەکەون.

قورئانی پیرۆز تەنیا لەبەر ئەم چەند بابەتە زانستیەی کە تێیدایە و چەند نمونەیەکمان لێ باس کرد موعجیزە نییە و بەس، بەڵکو ئیعجازی قورئان دەدرەوشێتەوە لەوەی کە دژی ئەو ڕاستیانە نەبووە کە زانست سەلماندوویەتی و نکۆڵی نەکردووە لە ڕاستیە زانستیە گومان هەڵنەگرەکان.

**گومانێک و بەرپەرچەکەی:**

**ئەگەر وترا:** تیۆرە زانستییەکان دەکرێ گۆڕانیان بەسەردا بێت، ئێمە قورئانی پیرۆز ملکەچ ناکەین بۆ ئەو جۆرە لێکدانەوەو تەفسیرانە، چونکە لەوانەیە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە دەربکەوێت کە تیۆرە کۆنەکە هەڵە بووە.

**وەڵام:** لە ڕاستیدا ڕاڤەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بەو شتانەی زانست ئاشکرایان دەکات بەپێی ڕێساکانی تەفسیرو مەرجەکانی لە زماندا و جگەلەوانەش ئەمانە تەنها بریتین لە جۆرێك لە جۆرەکانی تێگەیشتن بۆ ئەو ئایەتانە، ئەگەر دەرکەوت تیۆرەکە هەڵەیە ئەوکات دەردەکەوێت کە تەفسیرەکەش هەڵەیە، بەڵام ئەگەر ئایەتەکە تەفسیری نوێی لەخۆی هەڵنەگرت، ئەوا نابێت بەپێی تیۆرە نوێیەکە تەفسیر بکرێت، بەڵکو دەبێت چاوەڕوانی دەرەنجامی لێکۆڵینەوە بکات، تا هەڵەی تیۆرە نوێیەکە دەردەکەوێت[1].

**ڕووی پێنجەم: تێکگیران لە واتاو حوکمەکانی قورئانی پیرۆزدا نییە:**

هەموو ئەو شتانەی لە دوو توێی قورئانی پیرۆزدان، کە لە نزیکەی شەش هەزارو دوو سەد ئایەتدا کۆدەبنەوە، بابەتی فرەو هەمەلایەن بۆ هەموو بوارەکان لەخۆ دەگرێت، بۆ ئەوەی پێداویستیەکانی مرۆڤ دابین بکات و چاکسازی بۆ مرۆڤ فەراهەم بێنێت.

پێکهاتە و ناوەڕۆکی قورئان دوو جۆرە:

---

[1] علم الأصول الفقه لعبدالوهاب خلاف ٣١، محاضرات في أصول الفقه لبدر المتولي عبداالباسط ١٣٢/١.

**جۆری یەکەم:** حوکمەکانی قورئان، سێ جۆرن:

١- حوکمە بیروباوەڕییەکان: لەبارەی ئەوەی پێویستە لەسەر کەسی ڕاسپێرراو (مکلف) باوەڕ بە خواو فریشتەکان و کتێبەکان و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی هەبێت.

٢- حوکمە ڕەوشتییەکان: پێویستی خۆڕازاندنەوە بە ڕەوشتی چاك و خۆ دارنین لە ڕەوشتی خراپ.

٣- حوکمە کردارییەکان: ئەمەش دەبێتە دوو جۆر:

أ- حوکمە پەرستشی و بەندایەتییەکان: بۆ ڕێکخستنی پەیوەندی مرۆڤ بە پەروەردگارییەوە، هەر لە چۆنیەتی نوێژ کردن و زەکات داان و حەج کردن و بە ڕۆژوو بوون...، ئەو ئایەتانەی لەم بارەوە دەدوێن نزیکەی (١٤٠ ئایەتن).

ب- حوکمەکانی هەڵسوکەوت کردن (مامەڵەکردن)، کە ئەم جۆرانە دەگرێتەخۆ:

- حوکمەکانی باری کەسێتی کە پەیوەستە بە خێزان و مارەیی و تەلاقدان، نزیکەی (٧٠ ئایەت) لەم بارەوە هاتوون.
- حوکمەکانی شارستانی، کە پەیوەستە بە کرین و کرێ و بارمتەو دەستەبەری و هاوبەشداری... تاد، ئایەتەکانی ئەم بوارە (نزیکەی ٧٠ ئایەتە).
- حوکمەکانی تاوان، کە پەیوەستە بە سزاو و سنوورەکان، بۆ پاراستنی ژیان و ماڵ و شەرەف و مافی خەڵك، نزیکەی (٣٠ ئایەت) لەم بارەوە هاتوون.
- حوکمەکانی دادبینی (مرافعات)، پەیوەستە بە دادوەری و شایەتیدان و سوێند خواردن، بۆ بەرپابوونی دادگەری، ئایەتەکانی ئەم بوارە نزیکەی (١٣ ئایەتن).
- حوکمەکانی دەستووری، پەیوەستە بە سیتەمی حوکمڕانی و بنچینەکانی، نزیکەی (١٠ ئایەت) لەسەر ئەم بابەتە هاتووە.
- حوکمەکانی نێودەوڵەتی، کە پەیوەستە بە مامەڵەی دەوڵەتی ئیسلامی لەگەڵ دەوڵەتەکانی تر، هەروەها چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەوانی موسڵمان نین لەناو دەوڵەتی ئیسلامیدا، ئایەتەکانی ئەم لایەنە نزیکەی (٢٥ ئایەتن).

- حوکمەکانی ئابووری و دارایی، کە پەیوەستە بە مافی داواکارو فەرامۆش کراو لە ماڵی دەوڵەمەند، هەروەها ڕێکخستنی داهات و خەرجییەکان. ئایەتەکانی تایبەت بەم بابەتە نزیکەی (١٠ ئایەتن)[1].

**جۆری دووەم:** جگە لە حوکمەکان، کە بریتییە لە سێ بەش:

١- ڕێنموونی کردن و هاندان بۆ ڕامان و وردبوونەوە لە پێکهاتەکانی ئاسمانەکان و زەوی لە پێناو زانینی نهێنییەکانی بوونەوەر، بەم کردارە دڵ پڕ دەبێت لە باوەڕ و گەورەیی و شکۆیی خودا، ئەمەش تەنها لە ڕێگەی ڕامان و بەڵگە هێنانەوە دەبێت، ئەمە ڕێگەیەکی ڕێزدارە کە ئاسۆکان بەڕووی زانایان و جگەلەوانیش دەکاتەوە تا پەیی بە بوون و توانای خودا ببەن، غەیرە موسڵمانان زۆر سوودیان وەرگرت لەم ڕێگەیە کاتێك چوونە قوڵایی بوونەوەر، پەییان بە نهێنییەکانی برد و لە بوارە جیا جیاکانی ژیاندا بەکاریان هێنا.

٢- بەسەرهاتی پێشینان چ وەك تاك چ وەك گەل، قورئانی پیرۆز ئەم چیرۆکانەی باس کردووە بۆ پەندو ئامۆژگاری لێ وەرگرتن، هەروەها بۆ چاك و پوخت کردنی خەڵك و پاك کردنەوەیان لە خراپە و گەندەڵی.

٣- ئاگادار کردنەوەو ترساندن یاخود بەڵێن و هەڕەشە، قورئانی پیرۆز لەم بارەوە دوو ڕێگەی هەیە:

**یەکەم:** بەڵێن و هەرەشەکردن هەر لە دونیادا، بەڵێن بە موسڵمانان دەدات بیانکاتە جێنیشن لەسەر زەوی و پایەدارو سەربەرزیان کات، خوای باڵادەست دەفەرموێت: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾ النور: ٥٥.
واتە: (خوا بەڵێنی دڵنیابەخش و تەواوی داوە بەوانەی باوەڕیان هێناوە لە ئێوەو کارو کردەوە چاکەکانیاان ئەنجامداوە بەڕاستی لە ئایندەیەکی نزیکدا جێنشین و پایەداریان دەکات لە زەویدا).

[1] أصول الفقه لعبداالوهب خلاف ٣٢-٣٣، الوجيز في أصول الفقه للدكتور عبدالكريم زيدان ١٣٠ نقلا عن خلاف، الإسلام عقيدة وشريعة لمحمود شلتوت ٥٠٠ و ٥٠٢.

هەرەشە لە بێ باوەڕان دەکات بە کەم کردنـەوەی دەسـەڵاتیان و برسـێتی و تـرس، خـوای مـەزن دەفـەرموویت: ﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرۡيَةً كَانَتۡ ءَامِنَةً مُّطۡمَئِنَّةً يَأۡتِيهَا رِزۡقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتۡ بِأَنۡعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلۡجُوعِ وَٱلۡخَوۡفِ بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ﴾ النحل: ١١٢. واتە: (خوا نموونەی هێناوەتـەوە "بە دانیشتووانی" شارێك کە ژیانیان بە هێمنی و ئاسـوودەیی دەبـردە سـەر، لـە هـەموو لایەکـەوە ڕزق و ڕۆزی جـۆراو جۆریـان بـۆ دەهـات "بـەڵام لـە جیـاتی سوپاسگوزاری" ناشوکرو قەدر نەزانی نازو نیعمەتەکانی خوا بـوون، ئینجـا خـوای گەورە پۆشاکی برسێتی و ترسی کردە کاڵای باڵایان و تاڵاوی نەداری و ترسـی پـێ چەشتن لەسەر ئەنجامی ئەو ئیش و کارە "ناپوخـت و نارێکانـەدا" کـە دەیـانکردە پیشەیان).

دووەم: هاندان و ترساندن بە خۆش و ناخۆشییەکانی دوارۆژ.

خـوای بـێ وێنـە دەفـەرموویت: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدۡخِلۡهُ جَنَّٰتٍ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١٣﴾ وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدۡخِلۡهُ نَارًا خَٰلِدًا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٤﴾﴾ النسـاء: ١٣-١٤.[1] واتـە: (ئـەو کەسـەی فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرەکـەی بکـات، ئـەوە خـوا دەیخاتـە نـاو باخـەکانی بەهەشتەوە: کە چەندەها ڕووبار بەژێر درەختەکاانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیـانی نەبڕاوە تیایدا، بێگومان هـەر ئەوەشـە سـەرفرازی گـەورەو دەستکـەوتی بـێ سنوور. - بەڵام - ئـەوەی یـاخی بێـت لـە خـواو پێغەمبەرەکـەی و دەرچێت لـە سنوورەکانی، ئەوە خوا دەیخاتە ناو ئاگرێکەوە کە بۆ هەمیشە تیایدا دەمێنێتـەوەو سزایەکی سەرشۆڕکەرو ڕیسواکەری بۆ هەیە).

ماوەی هاتنە خوارەوەی قورئانی پیرۆز بیست و سێ ساڵی خایەند، کەچی تێکگیران لە قورئاندا دروست نەبوو:

**أ- لە ڕەوانبێژی دەربڕینەکانیدا:** لە قورئاندا ئـەوە بـەدی ناکـەین کـە دەربڕینێـك ڕەوانبێژو یەکێکی تر ناڕەوان، چونکە هەر دەربڕینێکی قورئانی پیرۆز تەواو کۆك و تەبایە

[1] الإسلام عقیدة وشریعة ٥٠٠ و ٥٠١، تبصرة الأدلة ٥٢٢/١.

لەگەڵ ئەو حاڵەی لەبەری دابەزیوە، هەروەك هەر بڕگەیەك لە قورئاندا لەو شوێنەدایە کە پێویستە لێی بەکار بێت.

ئەو ئایەتانەی باسی حوکمەکان دەکەن، وەك ئایەتەکانی میرات شێوازی وتاردان و کاریگەری تیایدا ڕەچاو نەکراوە، بەپێچەوانەی ئەو ئایەتانەی کە سووکایەتی دەکەن بە هاوبەشدانان و بتەکان یان ئەو جۆرە ئایەتانەیکە بەڵگەن لەسەر توانای خوای گەورە یاخود ئایەتە ترسێنەرەکان کە باس لە ڕۆژی دوایی دەکەن بەشێوەیەکی زۆر بەرچاو شێوازی کارتێکردن و ویژدان بزوێنی تێدا ڕەچاوکراوە، چونکە هەر شوێنێك قسەی خۆی دەوێت.

**ب- لە حوکمەکان و بەڵگە خستنەڕووەکانی دا:** هیچ واتایەك یاخود حوکمێك نییە لە قورئاندا تێکبگیرێت و دژ بێت لەگەڵ واتایەك و حوکمێکی تر، ئەوەش لە قورئانی پیرۆزدا هاتووەو لە ڕووکەشدا تێکگیراوە، ئەوا پاش تێڕامان و ورد بوونەوە ئەوا تێکگیران هەر هیچ پێگەیەکی نییە، بۆیە توێژەرەوانی قورئان ئەمەیان پشت گوێ نەخستووەو بەتێرو تەسەلی باسیان کردووە. بۆیە خوایی مەزن دەفەرموویت: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴾ النساء: ٨٢.[1] واتە: (ئەوە بۆ ئەوانە سەرنجی قورئان نادەن و لێکی نادەنەوەو لێی ورد نابنەوە؟ خۆ ئەگەر

---

[1] علم أصول الفقه لعبدالوهاب خلاف ٢٨، محاضرات في أصول الفقه لبدر االمتولي عبدالباسطط ١٣٢/١.

لە (المواقف وشرحه للسيد الشريف ٢٤٥/٨)دا هاتووە: ( وتراوە: ڕووێك لە ڕووەکانی ئیعجازی قورئان بریتیە لەوەی تێکگیرانی تێدا نییە سەربارى ئەوەی دوورو درێژە، ئەم ئایەتەیان وەك بەڵگە هێناوەتەوە: ﴿وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴾ النساء: ٨٢. واتە: "خۆ ئەگەر لەلایەن کەسێکی ترەوە بوایە، جگەلە خوا، بێگومان جیاوازی و دژایەتیەکی زۆریان تێدا دەدۆزیەوە").

لەلایەن کەسێکی ترەوە بوایە، جگەلە خوا، بێگومان جیاوازی و دژایەتیەکی زۆریان تێدا دەدۆزیەوە).

## ڕووی شەشەم:تا ڕۆژگار بمێنێت قورئانی پیرۆز هەر دەمێنێت:

هیچ زیادە و کەمێك ڕووی تێناکات، چونکە خوای گەورە پەیمانی پاراستنی قورئانی داوە، هەروەك دەفەرموێت: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴾ الحجر: ٩.[1] واتە: (ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوە، هەرخۆشمان دەیپارێزین و چاودێری دەکەین).

---

[1] الشفا للقاضي عياض ٢٧٥/١ و الاتقان ١٢٣/٢ نقلا عن القاضي عياض. و سبل الهدى والرشاد ٥٨٩/٩.

هەندێك بۆچوونیان وایە کە قورئانی پیرۆز بۆیە دەرئاسا و موعجیزەیە، بەوەی ورەو توانای دژەکانی خەسێنراوە، بەوەی خوای گەورە ورەو توانای ئەوانەی کە یەکگربوونە دژ بە قورئان سارد کردۆتەوەو تواناکانی ئەوانی خەساندووە، گوایە ئەگەر وا نەبوایە ئەوا دەیانتوانی کارێکی لەوجۆرە بکەن. سەرباری ئەوەی ئەم بۆچوونەشیان هەیە ئەوا لەهەمان کاتدا ڕاجیان لەسەر چۆنیەتی توانا پەکخستنەکە، لەم بارەوە دوو بۆچوونیان هەیە:

أ- خوای گەورە توانای مرۆڤ و جنۆکەکانی پەکخستووە ئەگەرنا توانای کارێکی لەو جۆرەیان هەبووە، بەوەی خوای گەورە پاڵنەرەکانی توانای ئەوانی پەکخستووە، بە تایبەت لە کاتی فەراهەم بوونی هۆکارەکان بۆیان وەك: توانج لێدان و هێنانە خوارەوەیان لە پلە بەرزەکان و فەرمان پێکردنیان بەوەی ملکەچ بن. ئەمە ڕای (ئەبو ئیسحاقی ئیسفرایینی)ە کە لە ئەشعەرییەکانە و بۆچوونی (نەزام)ە کە یەکێکە لە موعتەزیلەکان.

ب- خوای گەورە تواناکانیانی پەکخستووە بەوەی ئەو زانستانەی لەوان سەندۆتەوە کە پێویستن بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی قورئان، واتە: هێنانی وێنەیەکی قورئان پێویستی بە چەند زانستێکە بۆ ئەوەی ئەو توانایانە دروست بن، جا ئەوان ئەم زانستانەیان هەبوو بەڵام خودا لەوانی سەندەوە، بۆیە توانا کارێکی لەو جۆرەیان نەما. ئەمە بۆچوونی مورتەزایە کە یەکێکە لە شیعەکان./ المواقف وشرحه للسيد الشريف ٢٤٦/٨.

زۆربەی زانایان بەرپەرچی ئەو بۆچوونەیان داوەتەوە بەوەی: ئەگەر مەبەست لە ئیعجازی قورئان ئەوە بێت کە توانای دژەکانی خەسێنراوە و سنوردار کراوە، ئەوا واباشتر دەبوو کە زیاتر گرنگی نەدرابا بە ڕەوانبێژی و جوانبێژییە بەرزەکەی، تا هەر بە سادەییەکەی خۆی قوڵتر نەریتشکێنی بکردبا و بوویا بە دەراسایەکی سەلمێنراوتر... .

هەروەها خوای زانـاو خـاوەن توانـا دەفـەرموویّت: ﴿ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ﴾ فصلت: ٤٢. واتە: (هیچ ناحەقی و نادروستی و ناتەواویەك ڕووی تێناكات لە هیچ كاتێك و لایەكەوە).

ئایا لەدوای خستنەڕووی لایەنەكانی ئیعجازی قورئان: كەسی ژیرو عاقڵ هـەر دەڵێـت كە موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) ئەم قورئانەی لە بەرهەمی هزرو بلیمـەتی خـۆی بـووە یـاخود بـە پشـت بەسـتنی بـە (بوحـەیرا) و (وەرەقـە) و جگەلـەوانیش دایهێنـاوەو هۆنیویەتیەوە...؟

ئەگەر عەقڵ بە ویژدانەوە وەڵام بداتەوە ئەوا هەر ئەو ڕاستییە مەزنە بڕیار دەدات كـە بریتیە لەوەی: قورئانی پیرۆز دەرئاسا و موعجیزەیە و لەلایەن خوای باڵادەسـت و دانـاوە دابەزێنراوە.

## چـەند گەواهییـەكی ترلەسـەر پێغەمبەرایـەتی پەیامبـەری مـەزن موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)

دوای تەواو بوون لە ڕوون كردنەوەی هەر دوو بنچـینە سـەرەكیەكانی پێغەمبەرایـەتی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)، كە بریتین لـە: بانگەشـەی پێغەمبەرایـەتی و دەرخسـتنی موعجیزە، كە ئەمانـەش بەسـن بـۆ ئـەوەی پێغەمبەرایـەتی نـاوبراو بسـەلمێنن، لەگـەڵ ئەوەشدا ئەم دوو بنچینەیە تۆكمەتر دەكەین بە خستنەڕووی چـەند لایـەنێكی تەواوكـەر، بەو پێیەی گەواهی بدات لەسەر پێغەمبەرایـەتی موحەممـەد (صلى الله عليه وسلم)، ئـەم گەواهیدەرانەش بریتین لەمانە:

**گەواهی یەكەم:** ئەو تایبەتمەندی و سیفەتانەی كە لە پێغەمبـەردا (صلى الله عليه

سەیری ئەم سەرچاوەیە بكە كە لەسەر ئەم بابەتە دواون: شرح المقاصد للتفتازاني ٣١/٥، المواقف وشرحه للسيد الشريف ٢٤٩/٨، الإتقان ٧١٢، سبل الهدى والرشاد ٥٨٢/٩.

وسلم) هەبوون چ پێش ئەوەی ببێت بە پێغەمبەر یاخود لەکاتی بوونی بە پێغەمبەر یان دوای ڕەوانەکرانی وەك پێغەمبەر، (جاحز) کە لە موعتەزیلەکانە و (غەزالی) کە لە ئەشعەرییەکانە[1] ئەم ڕێڕەوە گەواهیدەرییەیان پەسەند کردووە، ئەم سیفەتانەش بریتین لە:

أ- سیفەتە پیرۆزەکانی، تایبەتمەندییە چاکەکانی، ڕەوشتە بەرزەکەی، وەك:

ڕاستگۆیی و دەستپاکی، هەرگیز درۆو فێڵ و ناپاکی نەکردووە، تا ناوبراوە بە ڕاستگۆی دەستپاك، هەروەها دەیانکرد بە ئەمینداری ماڵ و سەروەتیان، تەنانەت (نەزری کوڕی حارس) بەقورەیشی وت: (لە ڕاستیدا موحەممەد گەنجێکی تازە پێگەیشتوو بوو، کەچی لە هەمووتان زیاتر جێگای ڕەزامەندی و ڕاستگۆترینتان بوو، لە هەمووتان دەستپاك تربوو، تا چووە قۆناغی پیریەوەو ئەو پەیامەی بۆ ئێوە هێنا ئەو کات وتتان جادووگەرە، نا بەخوا موحەممەد جادووگەر نییە)[2].

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) زۆر بەسۆزو میهرەبان بووە بۆ ئوممەتەکەی، تا خوای گەورە پێی فەرموو: ﴿فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَاتٍ﴾ فاطر: ٨. واتە: (تۆ بە خەفەتیانەوە خۆت مەفەوتێنە). هەروەها دەفەرموویێت: ﴿ فَلَعَلَّكَ بَاخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ ﴾ الکهف: ٦. واتە: (جا تۆ لەوانەیە لە خەم و پەژارەدا لە سەرەنجامی ڕەشی ئەوانە خۆت لەناوبەریت و لە داخ و خەفەتدا بمریت). هیچ کەسێکی ئازار نەداوە، نە بەدەست نە بە زمان. هەروەها هیچ کەسێکی بەدەستی موبارەکی خۆی نەکوشتووە - سەرباری ئەو مەردایەتی و بوێرییەی کە هەیبووە، تەنها (ئوبەی کوڕی خەلەف)ی بەدەستی خۆی کوشتووە. زۆر ئازاری دەچەشت لەبەرامبەر ئەو شتانەی کە دەیبینی لە ناو هۆزەکەی لە تاڵانکاری، دزی، کوشتن، هەوڵی چاکردنی کێشەی نێوان دوو کەسی دەدا. زۆر میهرەبان و دلۆڤان

---

[1] المواقف وشرحه للسید الشریف ٢٥٩/٨، المحصل للرازي ٢٠٨، تیایاندا هاتووە: غزالی لە کتێبەکەیدا "االنقذ من الضلال" باسی کردووە. سەیری ئەمانەش بکە: المقاصد وشرحه للتفتازاني ٣٧٧/٥ و ٣٩، تبصرة الأدلة ٤٨٨/١.

[2] سەیری وتەی (نضر) بکە لە: تهذیب سیرة ابن هشام ٦٩/١، الشفا ١٣٥/١، إظهار الحق ٢٥٧/٢.

بوو، هاوبەشی خەمی نەخۆش و برینداران دەبوو ،و پشتی هەژارانی دەگرت، برسیانی نـان دەدا.

دوای ئەوەی خەدیجە پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) هێـورکردەوە لـەو تـرس و دڵـە ڕاوکێیەی دایگرتبوو کـاتی جبریلـی (سـەلامی خـوای لێبێـت) بـینی بـوو، پێـی وت: (تـۆ پەیوەندی خزمایەتی دەگەیەنی، یارمەتی کەسانی لێقەوماو دەدەی، ئەوەی خەڵك لە هیچ شوێنێك دەستی ناکەوێت تۆ دەیکەی بە موڵکیان و میوانداری میوانان دەکەی، کەسـێك کە بەڵای بەسەردێ تۆ پشتگیری و هاوکاری دەکەی)[1].

بەخشندەو چـاوتێر بـووە: بەخشـندەو دڵفـراوان و دەسـتکراوە بـووەو ڕێـزی زۆری لـە ڕێبواران و هەژاران دەگرت، تا خـودای گـەورە لەسـەر ئەمـە سـەر زەنشـتی کـرد: ﴿وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ﴾ الإسـراء: ٢٩. واتە: (ئەوەندەش دەست بڵاو مەبە "هیچت بەدەستەوە نەمێنێت").خۆڕاگرو ئارامگر بووە لەسـەر ناخۆشـییەکان، بەتایبـەتی دوای ڕەوانـەکرانی وەك پێغەمبەر.

زۆر دونیـا نەویسـتبووە، تەنانـەت هـۆزی قـوڕەیش مـاڵ و سـەروەت و سـامان و سەرۆکایەتیان پێبەخشی تەنها لەبەرامبـەر ئـەوەی واز لـە بانگەوازەکـەی بێنێـت بـەڵام دەستی لە پەیام و بانگەوازەی هەڵنەگرت.

خۆبەکەمزان و خاکی بوو لەگەڵ هەژارو نەداراندا.

لە بوێریدا تاقانە و بێ هاوتا بووە، سەرباری بەهێزییەکەی ئەوا لێبوردە بوو.

نەرم و نیان و وەفادارو دادگەر بوو.

[1] فەرموودەی: سوێند بەخودا، خودا سەرشۆڕت ناکات... تاد: صحیح البخاري ١ باب کیف کان بدء الوحي إلی رسول الله (صلی الله علیه وسلم)، ٣ باب، رقم ٣، بهذا اللفظ، عن عائشة (رضي الله عنها). وفي صحیح مسلم: ١ کتاب الإیمان، ٧١ باب بدء الوحي إلی رسول الله (صلی الله علیه وسلم)، رقم ١٦٠، عن عائشة (رضي الله عنها).

كەسێكی خاوەن شـەرم و شـكۆو حورمـەت بـوو: هـەرگیز جەسـتەی خـۆی بـەڕووتی دەرنەخستووە بۆ كەسی بەرامبەر، سەرباری ئەوەش كە لە سەردەمی نەفامیدا نـەریتێكی باوبووە لە ناوخەڵكیدا.

قسەو فەرمایشتی شیرین و ڕەوشتی نەرمونیان و ڕووخۆش بووە، هـەر كەسـێك چـاوی پێ كەوتبێت یاخود لەگەڵی دانیشت بێت خۆشی ویستووە. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) كەسێكی پاك و خاوێن و كەشخەو جوان بووە.

نە لـە پـێش پێغەمبەرایـەتی و نـە لـەكاتی پێغەمبەرایـەتی هـەرگیز كـاری خراپـی نەكردووە، ڕێبازە پەسەندەكەی گۆڕانكاری بەخۆوە نەبینی هەر لە سـەرەتای تەمـەنی تـا كۆتاییەكە.

ب- هـــەروەها دەروون پـــاك و پوخـــت بـــوو: ڕق و كینـــە، خۆپەرســـتی، گومـــان و هاوبەشدانان بوونی نەبووە لە دەروونیـدا. زۆر ڕقـی دەبـووەوە لـە بتپەرسـتی و پەیكـەر پەرستی، سەرباری ئەوەی كە كەش و هەوای كۆمەڵگاكەی لەسەر بتپەرستی گەشەی كـرد بوو، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەرگیز سوێندی بـە بتـەكان نـەخواردووە، بەڵگـەش لەسەر ئەمە ئەوەیە كە (ئیبن هشام) گێڕاویەتیـەوە لـە بەسـەرهاتی (بوحـەیرای ڕاهیـب) كاتێك پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) سوێندا بە (لات و عوزا)، چونكە گـوێی لێببـوو كە هۆزەكەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) سوێند بەم دوانـە دەخـۆن، بـەڵام پێغەمبـەر (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرموو: **(لا تسألني باللات و العزى، فوالله مـا أبغضـت شـيئاً قط بغضهما)** واتە: سوێندم مەدە بە (لات و عوزا)، سوێند بەخوا ڕقم لەهیچ شتێك نییـە بەو ئەندازەیەی ڕقم لەوانە.

پ- ڕێك و پێكی جەستەكەی: چ لـە ڕووی جـوانی ڕووخسـاری جەسـتەكەی، لـەوەی ئەندامەكانی سەلامەت و پاك بوونە لە نەخۆشی قێـزەون، لـە ڕووی هێـزی جەسـتەییەوە تۆكمە بووە، (ركانە) ململانێكارێكی بـەناوبانگ بـوو كەچـی پێغەمبـەر (صلی الله علیه وسلم) بەزاندی.

یان لەلایەنی زیرەکییەوە، خاوەنی دڵێکی ژیرو زیرەکیەکی بەهێزو بیرێکی تیـژ بـووە، هەر کەسێ چاوی پێکـەوتبا ترسـی لێدەنیشـت، جـا پێغەمبـەری (صـلی الله علیـه وسـلم) ناسیبووبا، یان نا.

ت- بەرزو پیرۆزی نەژادو ڕەچەڵەکی: پێغەمبەر (صـلی الله علیـه وسـلم) لـە بـەرزترین و بەڕێزترین ماڵـەکانی قورەیشـە، کـە هـۆزی قورەیشـیش بـەڕێزترین هـۆزی عەرەبەکانـە بەگشتی.

ج- پیرۆزی و ڕێزداری نیشتمانەکەی: پێغەمبـەر (صـلی الله علیـه وسـلم) لـە مەککـەی پیرۆزەوە لە پاکترین شوێن لەسەر زەویدا چاوی بـەدونیا هـەڵهێناوە، کـە حـەرەم و مـاڵی هەرە بەنرخ و موبارەکی خوای گەورەی لێیە. جا نمونەی ئەم سیفەتانە تەنها لە کەسـێکدا کۆدەبنەوە کە پێغەمبەر بێت[1].

لەبەر ئەوەی خوای گەورە ئەو پێداویستانەی مرۆڤـ پێویستی پێی هەیـە، لـە توانـاو لێهاتوویـیە جیاوازەکان، دابەشی کردووە لەنێوان تاکەکاندا، بۆیە دەبیـنین هەنـدێکیان لـە هەندێکی تریان بەهێزترن لـە ڕووی توانـای جەسـتەیی، هەنـدێکی تـر بـەهێزن لـەبواری هونەردا، هەشیانە خاوەنی بیرێکی تیژە لە بیرکاری یـان ئەنـدازەیی یـاخود وتـاردان یـان هۆنینەوەی هۆنراوە، هەنـدێك کەسـیش هـەن شـتی وا دادەهێـنن کـە خـەڵکی سـەریان دەسوڕمێ لە ئاستیدا، بەشێك لە خەڵکیش هەن کە خوای گەورە بەتایبەت هەڵیبـژاردوون بۆ ئەوەی بەرنامەی خوا بەخەڵکی ڕابگەیەنن، کە بریتین لە پێغەمبەران و پەیامبەران.

ئەگەر هەندێك خەڵك لە سروشتی خۆیاندا توانایەکی تایبـەتیان هـەبێت کـە پێـی لـە خەڵکی تر جیا بکرێنەوە. ئەوا پێغەمبـەران تایبەتمەندییـەکی تایبـەتیان پێـدراوە، چـەند

---

[1] المواقف وشرحه للسيد الشريف ٢٥٩/٨، المقاصد وشرحه للتفتازاني ٣٧/٥، شرح العقائد العضددية للدواني ٢٧٨/٢، المسايرة و شرحها المسامرة ٢٤٥-٢٤٩، "قاضي عياض" له "الشفا" و "صالحي" له "سبل الهدى والرشاد" بە تێرو تەسەلی دوواوە لەسەر ڕەوشتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

سیفەتێکیان هەن کە پێیان لە خەڵکی جیا دەکرێنەوە، کردارو هرزریان دەگمە کە خـەڵکی لەناو خۆیاندا پێیئاشنا نەبوونە، خوای گەورە ئامادەباشی تەواوی لەواندا بەدیهێناوە، بـۆ بەرگە گرتن و لە ئەستۆ گرتنی ئەو ئەرکە سەختە، کـە بریتیـە لـە گەیانـدنی ڕێسـاکانی خوایی بە مرۆڤـــایەتی.

لەبەر ئەمە شتێکی سەیر نییە کە خوای گەورە لە پەیامبەران و پێغەمبەرانـدا چـەند سیفەت و خەسڵەتێکی وا بەدی بێنێت کە ئامادەیان بکات بۆ ئـەوەی بـبن بـە پێشـڕەو و سەرکردەی جیهان و ڕێنیشاندەری مرۆڤـــایەتی بەرەو ڕێگەی ڕاست[1].

سیفەتی بەرزو بەهێزو ڕەوشتی چاك و پیرۆز لە پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) کۆبوونەوە، بەر لـەوەی ببێتـە پێغەمبـەر (وەك پێشـتر خرایـەڕوو)، دوای بوونیشـی بـە پێغەمبەر، تەنانەت قورئـانی پـیرۆز وەسـفی دەکـات: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾ القلم: ٤، واتە: (بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشت خوویەکی زۆر جوان و پەسەند و بێ وێنـە و مـەزنیت). هەروەها لەبارەی ڕەوشتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پرسیار لە عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) کرا، لە وەڵامدا وتی: **(كان خلقه القرآن، يرضا برضاه، ويسخط بسخطه)**[2] واتـە: ڕەوشتی پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) قورئـان بـوو، ڕەزامەنـدی و توڕەییەکـەی بـە قورئانەوە پەیوەست بوو.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چاکترین نمونەی بەرزو چاکەیە لەگشت بوارێکدا، خـوای مـەزن دەفـەرموویت: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾ الأحزاب: ٢١. واتـە: (سوێند بەخوا بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا چاکترین نمونەی تـەواو و ڕێکوپێـك هەیـە). تەنها پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) سەرمەشقی هەرە چاك، موسڵمانان پێیان وایـە کـە تەقواو لە خواترسان و چاکی و بەدەستهێنانی بەهەشت لەلایەن خوای گەورە بە گرتنەبەری ڕێوشوێن و ڕێبازی ئەودەبێت.

---

[1] مبادء الاسلام للمودودي ٣٢-٣٤.

[2] الشيفا للقاضي عِياض ٩٦/١.

کۆبوونەوەی ئەو سیفەت و خەسڵەتانە لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، تـەنها بریتییە لە گەواهییەکی تەواو، لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەری ڕاستەقینەیە.

**گەواهی دووەم:** ئەو شتانەی کە بەرنامەو شەریعەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەخۆی دەگرێت، کە پەیوەستن بـە لایەنـەکانی: بیروبـاوەڕ یـان ڕەوشـت یـاخود حوکمـە گشتیەکان، لایەنە وردەکانی تری ڕێساو یاساو حیکمەتـەکانی[1]، هـەروەها ئـەو ڕێـك و پێکـی و دادپـەروەری و نـەرم و نیانییـەی کـە لـە شـەریعەتی نـاوبراودا هەیـە، وای کردووەگوناجاو بێت بـۆ گشـت ڕۆژگـارو سـەردەمەکان، هـەروەك دوژمنـەکان گـەواهیان لەسەرداوە، (گەورەیی هەر شتێك لەوەدایە کە دوژمنان گەواهی بۆ بدەن).

سەرباری ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەخوێندەوار بووەو نووسینی نـەدەزانی تا کۆچی دوای کرد، لە ناو هۆزێکدا گەشەی کـرد کـە نـەزانی تیایـدا زاڵ بـوو، هـەرگیز پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کرداری نووسین و فێربـوون و پـەروەردە وەرگرتنـی ئـەنجام نەداوە[2]، بەڵکو پێش بوونی بـە پێغەمبـەر ڕۆژانێکـی دوورو درێـژی بەسـەر دەبـرد بـە تەنیایی لە ئەشکەوتی (حیراء) ورد دەبوەوەو ڕامـانی دەکـرد لـە گـەورەیی و شـکۆداری خوای گەورە.

ناوەرۆکی قورئانی پیرۆز، کـە کـەمێك پێشـتر خرایـەڕوو، ئـەوە دەگەیـەنێت قورئـان گشتگیرەو بەرنامـەی هەمەلایـەنی هەیـە بـۆ گشـت بوارەکـانی ژیـان، هـیچ کەسـێکی بلیمەتیش ناتوانێت تەنها یاسایەکی هاوشێوە بێنێت ئەگەر چی جڵەوی زانسـت و هـزری بەدەست بێت، هۆکارەکانی یاسادانانی بۆ فەراهەم ببێت، چـونکە قورئـان لەلایـەن خـوای زانا و کارلەجێوە هاتووەو لەڕێی سروشەوە دایبەزاندۆتـە سـەر پێغەمبـەر (صلی الله علیه وسلم) تا بەخەڵکی ڕابگەیەنێت.

---

[1] شرح المقاصد للتفتازاني ٥/٣٩، شرح العقائد العضدية للدواني ٢/٢٧٨.

[2] شرح العقائد العضدية للدواني، سەرچاوەی پێشوو، المسامرة ٢٤٩، نهاية الإقدام ٤٥٠.

**گەواهی سێیەم:** سەرباری ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەژارو نەدار بوو، پشتیوانی کەم بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دژایەتی هاوبەشدانان و هاوبەشدانەران و ستەمکارانی جیهانی کرد و گاڵتەی بە بۆچوونەکانی ئەوان و سوکایەتی بە خەونەکانی کردن، دەوڵەتەکانی ڕووخاندن، ئایینەکەشی بە ئاسۆکاندا بڵاوبووەوە، لە بەرامبەریشدا ئایینەکانی تر کورت هەڵهاتن، دوای ئەمە دەوڵەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فراوان بوو و خۆرئاواو خۆرهەڵاتی ڕزگار کرد و حوکمڕانی لێکرد، بەمەش دوژمن سەرباری زۆری و بۆرییەکەی چ لە ڕووی ژمارە چ لەڕووی کەرستەکانی جەنگ و بۆسە دانانەوە بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵانی و سووربوونیان لەسەر لە ڕەگ دەرهێنانی بانگەوازی ئیسلام، کەچی هەر نەیانتوانی ئەم مەرامە گڵاوەی خۆیان بەدی بێنن و خۆر ئیسلام خامۆش و کپ بکەن.

بێگومان ئەمەش یارمەتی و پشتگیرییەکی خوایی بوو بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و ئەوانەی لەسەر بانگەوازو ڕێبازی ئەوون[1]، خوای بێ وێنە دەفەرمووێت: ﴿وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ الروم: ٤٧. واتە: (ئەوسا ئیتر سەرخستنی ئیمانداراغان بە ئەرکی خۆمان زانی و سەرکەوتنمان پێ بەخشین).

**گەواهی چوارەم:** هاتنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دوای ئەوەی کە ماوەیەکی زۆر بوو هیچ پێغەمبەرێك نەهاتبوو، گومڕایی بەخەستی بڵاو ببوەوە. عەرەبەکان بتیان دەپەرست، فارسەکانیش ئاگریان دەپەرست و بەگەورەیان دەزانی و بەڕەڵایی پیشەیان بوو، تورکەکانیش شارەکانیان تێکدەدا و خەڵکیان ئازار دەدا، هیندیەکانیش مانگایان دەپەرست و بەردیان بەخوا دەزانی، جولەکەکانیش دڵیان پڕبوو لە ڕق و کینە و خۆپەرستی و هاوبەشدانان، هەروەها نەصرانیەکانیش لەنێوان خوابەیەکزانی و هاوبەشداناندا مابوونەوە.

---

[1] شرح القاصد للتفتازاني ٣٩/٥، تبصرة الأدلة ٤٩٤.

ئەمە بارودۆخی خەڵکی بوو لەسەر زەوی، بۆیە پێویست بوو کەسێك هەبێت،تا ئەم بێ دینیە ڕابماڵێت و هەڵگری مەشخەڵ و ئاڵای چاکسازی و لەخواترسان بێت، ئەم کەسەش تەنها دەبێت لەو کەسانە بێت، کە خوای گەورە نووری پێغەمبەرایەتی پێ بەخشیبێت[1].

**گەواهی پێنجەم**: ئەو مژدانەی لە کتێبەکانی پێغەمبەرانی پێشوودا هاتوون[2]:

لەبەر ئەوەی کتێبە ئاسمانیەکان یەك سەرچاوەیان هەیە، ئەویش خوای پایەبەرزە، یەك ئامانجیشیان هەیە، ئەویش بریتییە لە: چاك کردن و ڕاستەڕێ کردنی خەڵك، بۆ ئەوەی خوای گەورە بپەرستن. بڕوابوون بە کتێبەکانی و پێغەمبەرانی خودای بە بنەمایەك لە بنەماکانی ئایینی داناوە. لە کتێبە پێشووەکاندا چەندین مژدە هەن، کە هەواڵ دەدەن بە دەرکەوتنی و هاتنی پێغەمبەر موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)، تەنانەت قورئانی پیرۆز باسی کردووە کە عیسا (سەلامی خوای لێبێت) مژدەی داوە بە پێغەمبەرێك لە دوای خۆی دێت ناوی ئەحمەدە، خوای بێ وێنە لەوبارەوە دەفەرموویێت: ﴿وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ﴾ الصف: ٦. واتە: (هەروەها مژدەدەریشم بە پێغەمبەرێك کە دوای من دێت و ناوی ئەحمەدە).

زانای لێکۆڵەر (عەبدولحەکیم سیالکوتی) لە پەراوێزەکەی خۆی لەسەر پەرتووکی (البیضاوی)وتویەتی: (پێویستە تەصەوڕ بکرێ کە هەر پێغەمبەرێك دەربڕینێکی خراوەڕو ئاماژەیەکی پلە پلەیی هێناوە کە تەنها زانا ڕۆچووەکان دەیزانن، ئەمەش لەبەر حیکمەتێکی خواییە. زانایان وتویانە: هەر کتێبێك لە ئاسمانەوە هاتووە بە ڕاستەوخۆی و بەڕاشکاوی باسی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) نەکردووە بەڵکو ئاماژەی بۆ کراوە، چونکە ئەگەر بە ڕاستەوخۆ ئاماژەی بۆ کرابووبا و خەڵکی سادە و ساویلکەش بیزانیبایە

[1] شرح المقاصد للتفتازاني ٥/٤٠، المواقف وشرحه للسيد الشريف ٨/٢٦٠ عن الرازي، تبصرة الأدلة ١/٤٨٢.

[2] المواقف وشرحه للسيد الشريف، شرح المقاصد للتفتازاني، سترضاوەکانی پێشوو.

ئەوا سەرزەنشتی زاناکانیان نەدەکرا لەسەر شاردنەوەی ئەو ڕاستییە، دواتر ئەو ئاماژانە نا ڕۆشنتر بوون بەهۆی گوێزرانەوە لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر لە "عیبرانی"ەوە بۆ "سریانی"، هەروەها لە "سریانی" بۆ "عەرەبی")[1].

لایەنێك لەو مژدانە دەخەمەڕوو کە لە (زەبور و تەورات و ئینجیل)دا هاتوون.

## لە "زەبور"دا:

١- داود وتی: (خوایەگیان" داهێنەری سوننەت ڕەوانە بکە، تا خەڵکی بزانن ئەو مرۆڤە) واتە: موحەممەد ڕەوانە بکە، تا خەڵکی بزانن کە لە ڕاستیدا عیسا مرۆڤە.

٢- وتویەتی: (شمشێرەکەت بەدەستەوە بگرە ئەی خاوەن هێزی مەزن، چونکە بەرنامەو شەریعەتی تۆ پەیوەستە بە شکۆداری دەسەڵاتەکەت، تیرەکانت نیشانە دەپێکن، گەلان لە ژێر دەسەڵات و فەرمانی تۆدا کۆدەبنەوەو مل کەچ دەکەن).

ئەم دەربڕینانە لە یەکێك لە وەرگێڕدراوە عەرەبیە کۆنەکاندا هاتوون، کە (نسفی: ٥٠٨ك ماڵئاوایی کردووە) و تەفتازانی[2] (٧٩٢ك کۆچی دوایی کردووە) نەقڵیان کردووە.

هەروەها (ڕەحمەتوڵای هیندی) لە کتێبە مەزنەکەیدا (إظهار الحق)[3]، لە مژدەی شەشەمدا، کە لە (زەبور)دا (چل و پێنجەمینە) پارچەیەکی درێژی هێناوە، کە لە هەژدە ئایەت پێکهاتووە، تیایدا باس لە سیفەتەکانی ئەو پێغەمبەرە کراوە کە مژدەی لەبارەوە داوە، بەتەواوی بەسەر پێغەمبەر موحەممەددا (صلى الله عليه وسلم) جێبەجێ دەبێت، ئەو پارچەیەشی دەڵێت: (شمشێرەکەت بەدەستەوە بگرە ئەی خاوەن هێزی مەزن...) تیایدا هاتووە بە چەند دەربڕینێکی تر. جا ئەو سیفەتانەی کە تیایدا باسیان کراوە ئەمانەن:

کەسێکی چاکە و باشترین مرۆڤە، نازو نیعمەت لە لێوەکانی دەبارێت، پیرۆزو بەفەرو موبارەکە، شمشێر بەدەست و بەهێزە، ڕاستگۆ و لەسەرەخۆیە، ڕاسترەوە، ڕێنماییکارو هیدایەت دەرە، گەلەکە دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی ئەو، چاکەی خۆش دەوێت،

---

[1] إظهار الحق ٢/٢٢٠.

[2] تبصرة الأدلة للنسفي ٤٩٨/١، شرح المقاصد للتفتازاني ٤٣/٥.

[3] إظهار الحق ٢/٢٥٥.

ڕقی لە گوناهە، کچی پاشاکان خزمەتی دەکەن، نەوەکانی گەل بۆی ملکەچ دەبن، نەوەکانی گەورەی زەوی، دیاری پێشکەشی دەکەن، ناوەکەی نەوە دوای نەوە لە یاد دەمێنرێت و باسی لێوە دەکرێت، گەلان ستایشی دەکەن تا ڕۆژگار هەتا هەتایە.

جا (ڕەحمەتوڵای کوڕی خەلیلی هیندی) بەتێرو تەسەلی باسی ئەو سیفەتانەی کردووە کە لە پێغەمبەر موحەممەددا (صلی الله علیه وسلم) هاتوونەتە جێ، ئەمەشی پشتڕاست کردووەتەوە بە بەڵگەی تۆکمە و بەهێز.

## لە "تەوڕات"دا:

١- لە (سیفری[1] پێنجەم)دا هاتووە: (خوا لە کێوی "طور سیناء"یەوە هات و لە "سەیعیر" درەوشایەوەو لە چیاکانی "فاران" ڕایگەیاند).

مەبەستی هەواڵدانە لەبارەی هاتنی (تورات) بۆ (موسا) لە کێوی (طور سیناء) و دابەزینی (ئینجیل)ە بۆ سەر عیسا لە (سەیعیر)، چونکە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێبێت) لە گوندی (ناصرة) لە شارۆچکەی (سەیعیر) نیشتەجێ بوو، هەروەها دابەزینی قورئانە بۆ سەر موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) لە شاری مەککە، لەبەر ئەوەی (فاران) دەکەوێتە سەر ڕێگەی مەککە پێش شاری (عەدن) بە دوو میل و نیو، ئەمە بریتی بوو لە خانوو، کە تا ئەمڕۆش هەر ماوە لەسەر لای چەپی ڕێگەی عێڕاق بۆ مەککە.

لە (تەورات)دا هاتووە: کە ئیسماعیل لە چۆڵەوانی "فاران" نیشتەجێ بووە، واتە: لە بیابانی عەرەبیدا[2].

---

[1] سیفر واتە کتێب یاخود کتێبی گەورە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَمَثَلِ ٱلْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًا﴾، هەروەها ناوە بۆ بەشێك لە تەوڕات. بڕوانە (قاموسی ڕستە "س، ف، ر"، ٣/١١٨٠، مەلا مەحموودی گەڵاڵی). (وەرگێڕ).

[2] شرح المقاصد للتفتازاني ٤٢/٥، تبصرة الأدلة ٤٩٧/١، الفصل لإبن حزم ١٩٤/١، تلخيص المحصل ٢١١.

هەر بەهەمان شێوە ئەمە لە (بابی سی و سێ) لە (سیفری: إستثناء) واتــە: (ســیفری: التثنية) هاتووە لە وەرگێڕدراوە عەرەبیەکەدا کە لە ساڵی ١٨٤٤زچاپکراوە: (٢ وتویەتی: پەروەردگار لە کێوی سیناوە هات، لە "ساعیر"یشــەوە ڕۆژی بۆمــان هــەڵێنا، لــە فــاران بەیاننامەی خۆی ڕایگەیاند، هەزاران پەیڤی پاك و پاككرەوەی تێدایە، ڕێبازو ڕەوشــتێكی ڕۆشن و ڕووناكیشی لەگەڵدایە).

"فاران" چیایەکە لە چیاکانی شاری مەککە، هەروەك لەبارەی بــارودۆخی ئیســماعیل (سڵاوی خوای لێبێت) لە بابی بیست و یەك لــە ســیفری (تکــوین)دا هــاتووە: (٢٠خــوای لەگەڵدا بوو، گەورە بوو و نەش و نمای کرد لە چۆڵەوانیدا، بووە گەنج، تــیری دەهاوێشــت، ٢١ لە چۆڵەوانی "فاران" نیشتەجێ بوو، دایکەکەی ئافرەتێکی لە میسرەوە بۆ هێنا).

گومان لەوەدا نییە کە ئیسماعیل (سەلامی خــوای لێبێــت) لــە شــاری مەککــە جــێگیر ببوو[1].

٢- لە (سیفری پێنجەم)دا هاتووە:(خوای پایەبەرز بە موسا "ســڵاوی خــوای لێبێــت" فەرمووە: پێغەمبەرێکی وەك تۆ لە نەوەی براکانیان بۆیان دەنێرم، فەرمایشتی من بەسەر زوبانی ئەودا دێت، ئەوەی من فەرمانی پێ دەکەم بەوان ڕادەگەیەنێت، ئەو کەســەش کــە قسەی پێغەمبەر قبوڵ ناکات ئەو کەسەیە کە بەزمانی من قسە دەکات مــن تۆڵــەی لــێ دەستێنم).

مەبەست لە نەوەی براکانی، نەوەی ئیسرائیلە کە نەوەکانی ئیسماعیلن هەروەك ئەمــە شتێکی زانراوە، ناشکرێت بە کەسێك لێکبدرێتەوە کە دوای موسا هاتووە، چونکە موســا خاوەنی شەریعەتێکی تەواوکاری بووە، کە بەرژەوەندی هەردوو دونیای تێــدا بــووە. بۆیــە دەبێت بڵێین ئەو کەسە پێغەمبەر موحەممەدە (صلى الله عليه وسلم)[2].

---

[1] إظهار الحق ٢/٢٥٠.

[2] شرح المقاصد للتفتازاني ٤٢/٥، تبصرة الأدلة ٤٩٧/١، الفصل لإبن حزم ١٩٤/١، تلخيص المحصل ٢١١.

٣- لە ئایـەتی (٢١) بـابی (٣٢) لـە (سـیفری: إسـتثناء)دا هـاتووە: (ئـەوان بـەبێ خوایەکی پەرستراو هێرشیان کردە سەر مـن، توڕەیـان کـردم بـە پەرسـتراوە پوچـەکانیان، منیش هێرشیان دەکەمە سەر، بەگەلێکی نەزان تورەیان دەکەم).

مەبەست لەگەلی نەزان: عەرەبە، چونکە لەو پەڕی نەزانی و گـومڕایی دابـوون، هـیچ جۆرێك لە زانستی شەرعی و عەقلّی لەلای ئـەوان دەسـت نەدەکـەوت و تـەنها شـتێکیان دەزانی ئەویش پەرستنی بت و پەیکەر بوو، جولەکەکان زۆر قین لە دلّ بوون بەرامبـەر بـە عەرەبەکان لەبەر ئەوەی لە نەوەکانی هاجەرە بوون کە لە بنچـینەدا کـەنیزەك بـووە، جـا مەبەستی ئایەتەکە: ئەوەیە کە نەوەی ئیسرائیل هێرشیان کردە سەرم بـە هـۆی پەرسـتنی چەند پەرستراوێکی پوچ، بۆیە منیش هێرشیان دەکەمە سەر بە هەلّبژاردنی ئەوانـەی کـە پلە نزم و نەزانن، خوای گەورە پەیمانەکەی بەجێ گەیاند، لە ناو عەرەبەکاندا پێغەمبـەری (صلی الله علیه وسلم) ڕەوانەکرد، کە ئەوانی هیدایـەت و ڕێنمـایی کـرد بـۆ سـەر ڕێگـەی ڕاست[1].

٤- لە (سیفری یەکەم)دا هـاتووە: (خـوای پایەبـەرز بـە ئیبراهیمـی "سـلاّوی خـوای لێبێت" فەرموو: هاجەرەی خێزانت کوڕێکی دەبێت، لە نەوەی ئەو کوڕەدا یـەکێك پەیـدا دەبێت کە دەسەلاّتی دەڕوات، هەمووانی بۆ ملکەچ دەبن)[2].

## لە "ئینجیل"دا:

١- لە (صیحاحی چواردە)دا هاتووە: (مـن بـۆ ئێـوە داوا لـە بـاوکم[3]دەکـەم، تـا " فارقلیت"ێکتان پێ ببەخشێت، بۆ ئەوەی هـەتا هەتایـە لەگەلّتانـدا بێـت، " فارقلیـت" ڕۆحی ڕاستی و دلّنیاییە).

تەفتازانی ئەمەی لە یەکێك لە وەرگێڕدراوەکانی عەرەبی هێناوە[1].

---

[1] إظهار الحق ٢٤٩/٢.

[2] شرح المقاصد للتفتازاني ٢٤٩/٢.

[3] مەبەستی ئەوەیە کە عیسا دەلّێت من داوا لە خوای باوکم دەکەم. پەنا بەخوا. (وەرگێڕ).

هەروەها (ڕەحمەتوڵای هیندی) ئەمەی وەرگرتووە لە وەرگێڕدراوەكانی عەرەبی، لە ساڵی ١٨٢١ و ١٨٣١ و ١٨٤٤ لە لەندەن لە چاپ دراون، لە (بابی چواردە، ئینجیلی یوحنا)دا هاتووە: (١٥، ئەگەر ئێوە منتان خۆش دەوێت ئەوا ئامۆژگارییەكانم لە گوێ بگرن، ١٦ منیش داوا دەكەم لە باوكم " فارقلیت"ێكی ترتان پێی ببەخشێت، بۆ ئەوەی بۆ هەتا هەتا لەگەڵتاندا بێت، ١٧ ڕۆحی ڕاستییە و جیهان توانای قبوڵ كردنی نییە، چونكە نای بینێت و نایناسێت، كەچی ئێوە دەیناسن لەبەر ئەوەی لەلای ئێوە نیشتەجێ و جێگیر دەبێت)[٢].

جا ئەو وتەیەی: (بۆ ئەوەی هەتا هەتا لەگەڵتاندا بێت) ئەوە دەگەیەنێت كە پێغەمبەرایەتی كۆتایی دێت، شەریعەتەكەی گشتگیر دەبێت و خەڵكی لەدوای هاتنی ئەو پێویستیان بەپێغەمبەرێكی تر نابێت، خەڵكی فێر دەكات، هەموو پێداویستیەكانیان دابین بكات، ئەو وتەیەی عیسا فەرمووی بۆیان باس دەكات.

٢- لە (صیحاحی پازدە)دا هاتووە: (سەبارەت بە " فارقلیت"ی ڕۆحی پیرۆز كە باوكم ڕەوانەی دەكات بەناوی من فێرتان دەكان و شارەزاتان دەكان، هەموو پێداویستیەكانتان بۆ دابین دەكات، ئەو شتانە بیری ئێوە دێنێتەوە كە من پێم وتن.

دواتر وتی: من ئەو شتەم پێ ڕاگەیاندن بەر لەوەی ڕۆحی پیرۆز بێت، ئەمەش بۆ ئەوەبوو بڕوای پێ بێنن).

بەناوی من: واتە بە پێغەمبەرایەتی، هەروەها (فارقلیت) واتە: ئاشكراكەری شاراوەكان[٣].

بەهەمان شێوە (ڕەحمەتوڵای هیندی) ئەمەی لە وەرگێڕدراوە ناوبراوەكە هێناوە، بابی ١٥ و ١٦ (٢٦ جا كە " فارقلیت" هات كە من بۆ ئێوەی ڕەوانە دەكەم، ئەو فارقلیتە

---

(١) شرح المقاصد للتفتازاني، تلخيص المحصل، سەرچاوەكانی پێشوو.

(٢) اظهار الحق ٢/٢٧٨.

(٣) شرح المقاصد للتفتازاني ٥/٤٢-٤٣، تبصرة الأدلة ١/٤٩٨، تلخيص المحصل ٢١١.

لەلایەن خوای باوكەوە دێت كـە ڕۆحـی ڕاسـتییە، نـاوبراو شـایەتی بـۆ مـن دەدات، ۲۷ ئێوەش شایەتی دەدەن، چونكە ئێوە هەر لە سەرەتاوە لەگەڵم دابوون).

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت كە پێغەمبەر موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) شـایەتی دەدات لەسەر ڕاستگۆیی و مرۆڤــ بوونی عیسا (سەلامی خوای لێبێت) و ئەوەش دەسـەلمێنێت كـە عیسـا (سـەلامی خـوای لێبێـت) بانگەشـەی خوایـەتی نـەكردووە كـە خـراپترین نـەزانی و گومراییە، هەروەها دایكی عیسا لـە تۆمـەتی زینـا بـەدوور دەگرێـت و پاكایـەتی ئـەو پاكیزەیە دەسەلمێنێت، ئەمە لە قورئاندا بەوپەڕی ڕۆشنی باسی لێوەكراوە[1].

۳- لە (صیحاحی شازدە)دا هاتووە: (بە ڕاستی و بەدڵنیاییەوە پێتان دەڵێم: ڕۆیشتنی من لەلای ئێوە خۆی لە خۆیدا هەواڵێكە بۆ ئێوە، چـونكە ئەگـەر ئێـوە بـەجێ نـەهێڵم و نەڕۆم بۆ لای باوكم، ئەوا " فارقلیت"تان بۆ ناهێت، بەڵام ئەگەر من لـەلاتان بـڕۆم ئـەوا "فارقلیط"بۆ لاتان دەنێرم، جا ئەگەر هات ئەوا دەبێتە مایـەی سـوود بـۆ دانیشـتووانی جیهان و دینداریان لەناودا بڵاو دەكاتەوەو سەركۆنەیان دەكات و هەڵوێسـتەیان پێـدەكات لەسەر هەڵە و چاكە).

پاشان وتی: (ئەگەر ڕۆحی ڕاستی و دڵنیایی و یەقینتان بــۆ هـات، ئـەوا ڕێنمـایی و فێرتان دەكات، مشورتان بۆ دەخـوات، هــەموو جۆرەكـانی چـاكە و ڕاسـتی بـیری ئێـوە دەخاتەوە، چونكە ئەو لەخۆیەوە قسەیەك ناكات كە خـۆی دایهێنابێـت)[2]. (ڕەحمـەتوڵای هیندی) بەهەمان شێوە باسی ئەو مژدەیەی كردووە بەپشت بەستن بە وەرگێڕدراوە عەرەبیە ناوبراوەكان - كەمێك پێش ئێستا خرانەڕوو - لە دوایین بابی ئینجیلـی یوحنـا (دەروازەی شازدە): (۷ من پێتان دەڵێم: بۆ ئێوە چاك و خێرترە كە مــن بـڕۆم، چـونكە ئەگــەر مـن نەڕۆم ئەوا " فارقلیت" نایەت بۆ ئێوە، هەر كە من ڕۆیشتم ئەوا بۆتان ڕەوانە دەكـات، ۸ ئینجا كە هات ئـەوا سـەركۆنەی دانیشـتووانی جیهـان دەكـات لەسـەر هەڵـەو چـاكە و

---

[1] إظهار الحق ۲۸۳/۲.

[2] شرح المقاصد للتفتازاني ٤٣/٥.

حوکمیان، ٩ سەرکۆنەیان دەکات لەسەر هەڵە، لەبەر ئەوەی باوەڕیان بەمن نەهێناوە، ١٠ و سەرکۆنەیان دەکات لەسەر چاکە لەبەر ئەوەی من دەگەڕێمەوە لای باوکم و ئێوە دوای ئەمە من نابینن، ١١ هەروەها سەرکۆنەشیان دەکات لەسەر حوکم، هەموو بەشەکان و سەرکردەکانی ئەم جیهانە ملکەچ دەکات، ١٢ من قسەیەکی زۆرم هەیە بۆ ئێوە تا پێتان بڵێم، بەڵام ئێوە ئێستا توانای هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی ئەو قسانەتان نییە، ١٣ ئەگەر رۆحی ڕاستی هات ئەوا هەر ئەو هەموو ڕووەکانی ڕاستیتان فێردەکات، چونکە لە خۆیەوە قسە ناکات، بەڵکو بەو شتانە قسە دەکات کە دەبیستێت، هەواڵیش دەدات بەوەی چی پێش دێت، ١٤ ئەو رۆحی ڕاستیە ڕێزدارو شکۆدارم دەکات، چونکە مافی من دەسەنێتەوەو پێتان ڕادەگەیەنێت، ١٥ هەر شتێك هی باوك بێت هیی منیشە، بۆیە لەبەر ئەمە وتم: ئەوەی بەشی منە رۆحی ڕاستی وەریدەگرێت و پێتان ڕادەگەیەنێت)[1].

(ڕەحمەتوڵای هیندی) وتویەتی[2]: لە ڕاستیدا " فارقلیت" لەلای نەصرانیەکان بریتییە لە: (پایەدارو یارمەتیدەرو بریکارو تکاکار)، گشت ئەو واتایانە جەخت دەکەنەوە لەسەر ڕاستێتی پێغەمبەرایەتی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم). بنچینەی بێژەو دەربڕینەکە بە یۆنانی (بیرکلوطوس)ە[3] کە مانایەکی نزیك دەدات لە مانای: موحەممەد و ئەحمەد.

عیساش (سەلامی خوای لێبێت) بە (عیبرانی) دەدوا نەك بە (یۆنانی)، دەربڕینەکەی عیسا (سەلامی خوای لێبێت) کە وشەی پێغەمبەرە لە دوای خۆی نەماوە، بەڵام تەنها

[1] إظهار الحق ٢٧٩/٢.

[2] إظهار الحق ٢٧٩/٢ و لاپەڕەکانی دواتری.

[3] شێخ (عەبدولوەهاب نەجار) خاوەنی کتێبی (قصص الأنبیاء) لە ڕۆژهەڵاتناسی ئیتاڵی (کارلو نلینو) پرسی دەربارەی وشەی (بیرکلوطوس) کە لە ئینجیلدا هاتووە، ڕۆژهەڵاتناسی ناوبراو وەڵامی دایەوە: کە لە ڕاستیدا قەشەکان دەڵێن ئەو وشەیە بە واتای (سەربڵندکەر) دێت. عبدالوهاب پێی وت: من پرسیار دەکەم لە د.کارلو نلینو کە خاوەنی دکتۆرایە لە ئادابی زمانی کۆنی یۆنانی و پرسیار لە قەشەیەك ناکەم، وتی: واتاکەی بریتییە لەوەی کە زۆر سوپاسی دەکرێ، عەبدولوەهاب لێی پرسی: ئایا ئەمە کۆکە لەگەڵ کرداری بەچاکتردانان (تفضیل) کە لە وشەی سوپاس (حمد)ەوە دادەتاشرێ؟ وتی: بەڵێ. / الرسول - سعید حوی ٢٨٧/٢.

دەربڕینە یۆنانیەکە (بیرکلرطوس) ماوە لـە وەرگێڕداروەکـەی (یۆحنـا) دا هەیـە، کـە لـە (عیبری) بۆ سەر (یۆنانی) وەرگێڕدراوە، کاتێکیش (ئینجیلی یۆحنا) لە یۆنانیەوە بۆ سەر زمانی عەرەبی وەرگێڕدا ئەوا بووە (فارقلیت). جا عیسا (سـەلامی خـوای لێبێـت) مـژدەی دەدا بەهاتنی (فارقلیت) لەدوای خۆی، ئەمەی خوارەوە ئەمە دووپات دەکاتەوە:

أ- هەندێ لە نەصرانیەکان لە سەدەکانی سەرەتای بڵاوبوونـەوەی نەصـرانییەتدا، هـەر یەکەیان بانگەشەی ئەوەیان کردووە کە ئەو ڕۆحی ڕاستیی (فارقلیت)ە، ئەو ئـەو کەسـەیە پەیمانی هاتنی دراوە لەلایەن عیسا (سڵاوی خوا لێبێت)،هەروەك (ولیـەم میـور) ئەمـەی باس کردووە.

هـەروەها خـاوەنی کتـێبی (لُـبّ التـواریخ) وتویـەتی: (جولەکـە و مەسـیحییەکانی هاوچەرخی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم). چاوەڕێی ئەو پێغەمبەرەیان دەکرد کە پـەیمانی هاتنی لەبارەوە درابوو، ئەم پلەوپایە و سوودە مەزنە بەخشرا بە موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)، چونکە ڕای گەیاند کە ئەو پێغەمبەرە چاوەڕوان کراوەکەیە).

کاتێك نامەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گەیشتە دەستی نەجاشی (کـە نەصـرانی بوو) وتی: (خوای گەورە دەکەم بەشایەتیدەر ئەوە ئـەو پێغەمبەرەیـە کـە ئـەهلی کتـاب چاوەڕێیان دەکرد) جا نەجاشی لە وەڵامدا بۆی نووسی: (شایەتی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری خوای، ڕاستگۆو سەلمێنەری ڕاستگۆیی ئەوانی پێش خۆتی، من پەیمان و بەیعەتم بـە تـۆ و کوڕە مامەکەت دەدەم- واتە: جعفری کوڕی أبـو طالـب -، لەسـەر دەسـتی ئـەو "واتـە جعفری کوڕی أبو طالب[1]" ملکەچی خوای جیهان بووم و موسڵمان بووم).

بەهەمان جۆر لە نامەکەی (مەقوقس) پاشای قیبتییەکانـدا ئەمـە بـەڕوونی هـاتبوو، کاتێك وەڵامی نامەکەی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) دایەوە کە بۆی ڕەوانەکرا بوو.

---

[1] لێرەدا ڕاناوەکەم بۆ (جەعفەری کوڕە مامی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)) گەڕاندەوە، چونکە ئەو لەوکاتدا لە وڵاتی حەبەشە بوو. ناوی (جەعفەر (ڕەزای خوای لێبێت)) خۆم زیادم کرد بۆ زیاتر ڕوون بوونەوەی دەقەکە. (وەرگێڕ).

هەروەها ئەو وتەیەی (جارودی کوڕی عەلاء) - کە یەکێك بوو لە زاناکانی نەصرانیەکان - کاتێك لەگەڵ هۆزەکەی چووە لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)[1].

هیرقل گەورەی ڕۆم (هەروەك لە فەرموودەی بوخاریدا هاتووە: باب بدء الوحي) چاوەڕێی دەرکەوتنی پێغەمبەری دەکرد، بەهەمان شێوە زانا نەصرانیەکان چاوەڕێی دەرکەوتنی پێغەمبەریان دەکرد، هەروەك ئەمە بەڕوونی لە سەرگوزشتەی موسڵمان بوونی سەلمانی فارسیدا (خوا لێی ڕازی بێت)دیاردەکەوێت.

نەجاشی و مەقوقس و جارود و هیرقل لە زانایانی نەصرانیەکان بوون و جەختیشیان دەکردەوە لەسەر ئەوەی کە نەصرانیەکان چاوەڕێی دەرکەوتنی پێغەمبەر دەکەن، چونکە وەسف و خەسڵەتی لە کتێبەکانی ئەواندا وەك ئینجیل و کتێبەکانی تر باسی لێوەکراوە.

گشت ئەوانەی ناومان بردن هیچ کامیان نەترساون لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، چونکە ئەوان خاوەنی دەوڵەت و لەشکری بەهێز بوون، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) لە سەرەتای بانگەوازدابوو و خۆی و هاوەڵانی دەچەوسێنرانەوەو دەترسان لەوەی خەڵکی پەلاماریان بدەن.

ب- ئەم وتەیەی عیسا: (ئەگەر من نەڕۆم ئەوا " فارقلیت" نایەت بۆتان) ئەمە ئاماژەو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هاتنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەندە بە ڕۆیشتنی عیسا (سەلامی خوای لێبێت).

پ- ئەو وتەیەی عیسا: (سەرکۆنەی دانیشتووانی جیهان دەکات) ئەمە وەك دەقێکی ڕۆشن وایە کە ئاماژە دەکات بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، چونکە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) سەرکۆنە و سەرزەنشتی جیهانی کرد، بەتایبەت سەرکۆنەی جولەکەکانی کرد لەسەر ئەوەی باوەڕیان بە عیسا (ڕەزای خوای لێبێت) نەهێناوە، (سەرکۆنەیان دەکات لەسەر هەڵەکە، ئەو هەڵەیەش ئەوەیە کە باوەڕیان نەهێناوە بە عیسا).

---

[1] إظهار الحق ٢/٢٧٩-٢٨١.

ت- پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) لە خۆیەوە قسەی ناكات و هەڵنابەستێت، بەڵكو قسە و هەواڵەكانی سروشن.

ج- هەروەك پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) ڕێزو حورمەتێكی زۆری گرتووە لە عیسا (سەلامی خوای لێبێت)، تەنانەت ئەمە شتێكی چەسپاوە بە دەقی قورئانی پیرۆز بەوەی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) گەلەك ڕێزو حورمەتێكی بۆ عیسا (سەلامی خوای لێبێت) داناوە بەشێوەیەكی تایبەت و بۆ پێغەمبەران (سەلامیان خوایان لێبێت) بەشێوەیەكی گشتی، ئەمە شتێكی ئاشكراو زانراوە.

مژدەكانی كتێبە ئاسمانیەكان سەبارەت بە دەركەوتنی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) گەلەك زۆرن.

تەفتازانی وتویەتی: (لە "تلخیص المحصل"دا وتویەتی: نمونەی ئەم دەق و بەڵگانە گەلەك زۆرن لە كتێبەكانی پێغەمبەرانی پێشوودا، ئەو نووسەرانەی توێژینەوەو هەڵوەستە دەكەن لە سەر كتێبەكانیان ئەوا ئەمانە دەخەنەڕوو. هیچ دژڕایەك ناتوانێت ئەم جۆرە بەڵگەو دەقانە پشتگوێ بخات یاخود بڵێت ئاماژەیە بۆ پاداشایەك یاخود پێغەمبەرێكی تر، تەنانەت ناشتوانێت بیشارێتەوە. هەروەها "ئەبو حوسەینی بەصری" لە كتێبی "غرر الأدلة"دا بەڵگەی وای كۆكردۆتەوە لە دەقەكانی "تەورات"دا لەسەر ڕاستێتی پێغەمبەرایەتی موحەممەد (صلى الله علیه وسلم))[1].

---

[1] شرح المقاصد للتفتازاني ٥/٤٣. سەیری مژدەكان بكە لەم سەرچاوانەدا: إثبات النبوة النبي للنبي للهاروني الزیدي ١٥٧، و شێوە دەربڕینەكەی "تلخیص المحصل" بەم شێوەیەیە: (نمونەی ئەم مژدانە لەو دوو كتێبە و سەرجەم كتێبەكانی پێغەمبەرانی تر گەلەك زۆرن، ئەگەر باس بكرێن كتێبەكە زۆر درێژ دەبێت، هیچ دژەڕایەك ناتوانێت ئەم مژدانە ڕەتكاتەوە یاخود ناتوانن بڵێن ئەم مژدانە بۆ پێغەمبەرێكی تر یان پاشایەكی تر هاتوون، تەنانەت ناشتوانن بیشارنەوە).

### ئینجیلی (بەرنابا):

سەبارەت بە ئینجیلی (بەرنابا)، ئەوا ئەو ئینجیلە مژدە دەدات بە هاتنی پێغەمبەر موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)، (د. خليل سعادة) کە ئینجیلی ناوبراوی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی دەڵێت:

(ئەو پێغەمبەرەی چاوەڕان کراوە "مسیا و یوسع" نییە بەڵکو " موحەممەد"ە، بێژەو دەربڕینی " موحەممەد"ی بە ڕاشکاوی هێناوەو چەندین جار دووپاتیشی کردۆتەوە لەو بەشانەی کە پاشکۆی خراوەتە سەر، دەریشی بڕیوە کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە، کاتێکیش ئادەم لە بەهەشت دەرکرا لەسەر دەرگاکەی بینی کە چەند دێرێك نووسراوە بە نوور: لا اله الا الله محمد رسول الله)[1].

هەروەها لە هەر دوو بەشی (چل و سێیەم) و (چل و چوارەم)دا وتەی زۆر هەن لەسەر مژدەدان بە هاتنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، چونکە قوتابیەکانی عیسا (سەلامی خوای لێبێت) داوایان لێکرد، کە بەڕاشکاوی ناوی ئەو پێغەمبەرەیان پێبڵێت، بۆیە ئەویش بەڕاشکاوی باسی ئەو شتانەی کرد کە پلەوپایە ڕاستەقینەکەی موحەممەد دەردەخات.

ئەگەرچی زۆربەی نەصرانیەکان ئەم ئینجیلەیان ڕەت کردەوە بەبێ پاساو، لەگەڵ ئەوەشدا بەڵگەکان گەواهیدەرن لەسەر ڕاستی ئەم ئینجیلە، هەروەك ئەمە ڕوون دەکەینەوە.

بەرنابا لە قەشەکانی نەصرانیەکانە، نامە هەڵگرێکە لە نامە هەڵگرەکانیان، هەروەها بە کۆدەنگی نەصرانیەت، ناوبراو بنچینەیەکە لە بنچینەکانی بانگەشەی مەسیحیەتی سەرەتا، ئینجیلی برنابا هەر بەناوی ئەو دۆزرایەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی (بەرنابا) یەکێك بووە لە هاودەم و هاوڕێکانی عیسا لە خۆشی و ناخۆشیدا. کەچی ئینجیلەکانی تر بە هی حەوارییەکان دانانرێن، بەڵکو لە دەست نووس و دانانی ئەو

---

[1] مقدمة خليل سعادة لإنجيل برنابا ص: م.

نامەگەیەنەرو پەیامبەرانەیە کە لە دوای عیسا لە جیاتی حەوارییەکان بانگەوازی مەسیحیەت ڕادەگەیەنن[1].

جا ئینجیلی برنابا چەند خاڵ و شتێکی جەوهەری و پڕبایەخ دەسەلمێنێت و دانی پێدا دەنێت، بەمەش جیا دەکرێتەوە لە چوار ئینجیلە بەناوبانگەکانی تر، ئەم خاڵە جەوهەرییانەش بریتین لە:

أ- ئەم وتەیەی عیسا کە تیایدا هاتووە: یوسع (واتە: عیسا[2]) نکوڵی کردووەو ڕەتی کردۆتەوە کە ئەو خوا و کوڕی خواش بێت، ئەم لەبەردەم شەش سەد هەزار سەربازو دانیشتوانی جولەکە بە ئافرەت و پیاو منداڵەوە ئەوەی ڕەتکردۆتەوە (واتە: لە ئینجیلی برنابادا ئەوە هاتووە کە عیسا نکوڵی کردووە لە بیروباوەڕی سێکوچکەیی "تثليث").

ب- ئەو کوڕەی کە ئیبڕاهیم سور بوو لەسەر ئەوەی بیکاتە قوربانی بۆ خوا، بریتییە لە ئیسماعیل نەك ئیسحاق، لەبەر ئەوەی لە ڕاستیدا کاتی سەر بڕینەکە هی ئیسماعیل بوو.

پ- ئەو پێغەمبەرەی چاوەڕان کراوە (یوسع) نییە بەڵکو (موحەممەد)ە، ناوی موحەممەدی هێناوە بە دەربڕینی ڕاشکاو و چەندین جاردووپاتی کردۆتەوە ... (کەمێك پێشتر ئەم دەقەمان خستەڕوو).

ت- عیسا (سەلامی خوای لێبێت) لە خاچ نەدراوە بەڵکو بەرز کراوەتەوە بۆ ئاسمان، ئەوەی کە لە خاچ دراوە (یهوذا)ی ناپاك بووە، کە لێیان تێکچووەو هێنراوەتە سەر شێوەی عیسا، ئەم دەقە کۆکە لەگەڵ دەقی قورئان: ﴿وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَكِن

---

[1] محاضرات في النصرانية للشيخ محمد أبي زهرة ٥٧.

[2] وەرگێڕ.

شُبِّهَ لَهُمْ ﴾ النساء: ١٥٧.[1] واتە: (نەکوشتوویانە و نە لەقەنارەو خاچیان داوە، بەڵکو لێیان تێکچووەو "کەسێکی تریان کوشتووە لە بری ئەو").

**مێژووی ئینجیلی (برنابا):**

پاپا (جیلاسیوس) - پلەی پاپایەتی لە ساڵی ٤٩٢ز وەرگرت - واتە پێش لە دایك بوونی پێغەمبەر موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) فەرمانێکی دەرکرد تیایدا خوێندنەوەی چەند کتێبێکی قەدەغە کرد، یەکێك لەو کتێبانە ناوی (ئینجیلی بەرنابا) بوو[2].

دوو دانە لەو ئینجیلە دۆزرانەوە، یەکێکیان بە زمانی ئیتاڵی و ئەویتریان بە زمانی ئیسپانی بوو.دانە ئیسپانیەکە: (د. هلم) وەریگرت لە شارۆچکەی (هدلی) سەربە (همبشیر)، پاشان ڕۆژهەڵاتناس (سایل) دەستی خست، دوای (سایل) ئەوا (د.منکهوس) ئەندامی کۆلیژی ئۆکسفۆردی پاشایەتی وەریگرت و وەریگێڕا بۆ سەر زمانی ئینگلیزی، پاشان دانە ڕەسن و ئەصڵییەکە هاوڕێ لە گەڵ وەرگێڕدراوەکە لەساڵی ١٧٨٤ دایە دەستی (د. هویت) کەوت، لە دوای ئەمە ئەو ئینجیلە شوێنەوارەکانی وون بوو و نەما.

هەروەها دانە ئیتاڵیەکە: یەکەم کەس کە دۆزیەوە (کریمر)ی ڕاوێژکاری پاشای بروسیا بوو، کە ئەو کات لە شاری (ئەمستردام) دادەنیشت، جا ساڵی ١٧٠٩ لە کتێبخانەی یەکێك لە کەسە بەناوبانگ و ناودارەکانی شاری ناوبراو (کریمەر تولەند) ئەو دانەیەی بە قەرز وەرگرت، دوای چوار ساڵ بە دیاری پێشکەشی (برنس ئایوجین سافوی) کرد، پاشان ئەو دانەیەی ناوبراو لە ساڵی ١٧٣٨ لەگەڵ سەرجەم کتێبەکانی (برنس) گوێزرانەوە بۆ کتێبخانەی کۆشکی پادشایەتی لە ڤیەننا، تا ئێستاش هەر لەوێیە.

(سایل) باسی ئەوە دەکات لە دانە ئیسپانییە وونبوەکەدا نووسراوە: کە پیت بەپیت وەرگێڕدراوە لە ئیتاڵیەوە بۆ ئیسپانی، هەروەها پێشکیەکیشی بۆ نووسراوە لەسەر ئەوەی کە ڕاهیبەکە چۆن دانە ئیتاڵیەکەی دۆزیوەتەوە، بەسەرهاتەکەشی بەم شێوەیە: ڕاهیبی

[1] مقدمة الدكتور خليل سعادة ص: م و محاضرات في النصرانية ٦٢-٦٤.

[2] مقدمة الدكتور خليل سعادة لانجيل برنابا ص: ل. ومقدمة محمد رشيد رضا لانجيل برنابا ص: ر.

لاتینی (فرامرینو) چەند نامەیەکی (ئیرینایوس)ی دۆزییەوە، لەناو ئەم نامانەدا چەند نامەیەك هەبوون کە توانجیان لە قەشە (بولسی پەیامبەر) دەدا، جا (ئیرینایوس) ئەم توانج لێدانەی دەگەڕاندەوە بۆ ئینجیلی قەشە (بەرنابا)، بەم هۆیە ڕاهیب (فرامرینو) وێڵ بوو بەگەڕان بەدوای دۆزینەوەی ئینجیلی (بەرنابا)، جا وا ڕێکەوت کە ببێتە کەسێکی نزیك لە (سکتسی پاپای پێنجەم). ڕۆژێك بەیەکەوە چوونە ناو کتێبخانەی پاپا، جا پاپا خەوێکی سوکی بەسەرداهات، بەمەش (فرامرینو) پێی خۆشبوو کاتەکە بە خوێندنەوە بەسەر ببات تا ئەو کاتەی پاپا وشیار دەبێتەوە لە خەو، یەکەم کتێب کە دەستی لە سەردانا (ئینجیلی بەرنابا) بوو، بەمەش زۆر دڵ خۆش بوو، ئینجیلی ناوبراوی لەژێر یەکێك لە باڵەکانی شاردەوەو چاوەڕێی کرد تا پاپا لە خەوەکەی هەڵسا، جا کە خەبەری بووەوە ئەوا (فرامرینو) داوای ڕێگە پێدانی لێ کرد و ڕۆیشت، زۆر بەجوانی ئینجیلەکەی خوێندەوە بە عیشقێکی گەلەك زۆر، دوای ئەمە بەهۆی کاریگەری ئەو ئینجیلەموسڵمان بوو[1].

ئەو شتانەی دروستی و ڕاستی ئینجیلی برنابا دەسەلمێنن، سەرباری ئەوەی کە هەندێ لە زاناکانی ئەوروپا نکۆڵی لێ دەکەن، ئەمانەن:

١- دانەیەکی ئینجیلی برنابا لە کەش و هەوایەکی پوختی مەسیحی دۆزرایەوە، تەنانەت لە کۆگای سەرۆکێکی ترسناکی ئایینی (پاپا) دۆزرایەوە کە ڕاهیبەکە ئاشکرای کرد، دواتر گوازراوەتەوە بۆ ڕاوێژکارێکی مەسیحی لە ڕاوێژکارەکانی پاشادی بروسیا، دواتر بۆ کۆشکی پادشایەتی لە ڤیەننا، کە دەستی هیچ موسڵمانێکی پێنەگەیشتووە.

٢- نە لە ڕابردوو نە لە ئێستادا، زانایانی موسڵمان نەیانخوێندووەتەوە، چونکە مێژگەردەکان لە نێوان زانایانی موسڵمان و نەصرانیەکان، لە ڕۆژهەڵات و ئەندەلوس، لە هەموو سەردەمێکدا هەر هەبووە، ئەمەش بەسە کە (ئیبن حەزم)ی

[1] مقدمة الدكتور خليل لانجيل برنابا ص: د، هـ.

ئەندەلوسی و (ئیبن تەیمیە)ی دانیشتوانی ڕۆژهەڵاتی شام و نیشتەجێی شام کە لەوبارەوە نووسیویانە لە بەرپەرچی نەصڕانیەکان کە چەندین کتێب و لێکۆڵینەوە لەخۆ دەگرێت.

هیچ یەکێك لەو زانایانەمان نەبینی باسی ئینجیلی برنابا بکەن، سەرباری ئەوەی کە بەڵگەی سەرکوتکەری نەصڕانیەکانی تێدایە، هەروەك (د. مرجلیوپ) لێی کۆڵیوەتەوە لە ئەنجامدا سەلماندوویەتی کە کتێبەکانی موسڵمانان باسی ئەو ئینجیلەیان نەکردووە[1].

٣- زۆربەی ئەو دەروازانەی کە ئینجیلی برنابای لێ پێکهاتووە، لەلای موسڵمانان ناسراو نەبووە و شێوازی دەربڕینەکانی ئینجیلی ناوبراو زۆر دوورن لە شێوازی دەربڕینی موسڵمانان بەگشتی و عەرەبەکان بەتایبەتی - هەروەك هەندێ لە قەشەکان ئەمەیان لە گۆڤاری ئایینی ڕوون کردەوە -، بۆیە ناکرێ بوترێت دەستکردی موسڵمانانە، هەروەك هەندێ ئەو بانگەشەیەیان کرد.

موسڵمان کە ناوی خوای گەورە دەهێنێت، ئەوا ڕاستەوخۆ ستایشی دەکات، ئەگەر ناوی پێغەمبەرانی هێنا سڵاواتیان لەسەر لێ دەدات، تەنها بەو ناوانە ناو لە فریشتەکان دەنێت کە قورئانی پیرۆز یاخود سوننەتی بەرێز هێناویەتی، بۆیە موسڵمان لە جیاتی (میکایل) ناڵێت (میخایل)، تەنانەت ناوی "ئیسرافیل"لە بیر ناکات و ناویشی نانێت (ئوریل)، ناڵێت (الله سبحان) چونکە هەموو موسڵمانێك وشەی (سبحان الله)ی لەبەرە، چونکە یەکێکە لە زیکرەکانی ئایین. تەنانەت ئەگەر ئینجیلی ناوبراو لە دەستکردی موسڵمانان بوایە ئەوا هەرگیز ناوی (سورەت)یان لە بەشەکانی نەدەنا، چونکە موسڵمانان بە عەرەب ئەوانی تریشەوە، وشەی (سورة) بۆ جگەلە سورەتەکانی قورئانی پیرۆز بەکار ناهێنن[2].

---

[1] مقدمة محمد رشيد رضا ص: ت ومحاضرات في النصرانية ٦١.

[2] مقدمة السيد محمد رشيد رضا لإنجيل برنابا ص: ش، ت.

٤- بەڵگەی زۆر بەهێزی تێدایە، ڕێبازی ڕوون و بیرکردنەوەیەکی بـەرزی تێـدا گەڵاڵـە بووە، لایەنە شاراوەکانی ژیـانی پێغەمبـەر عیسـای (سـەلامی خـوای لێبێـت) ڕوون کردووەتـەوە، هـەروەها وێکچـونێکی زۆر هەیـە لـە نێـوان هەنـدێ لـە پارچـە نووسینەکانی ئەم ئینجیلە و ئینجیلەکانی تر[1].

٥- ئەگەر ڕەچەڵەکی ئەم ئینجیلە ڕاست و دروست نەبوایە ئەوا ڕاهیب (فرامرینو) کە دۆزیەوە قەناعەتی بۆ دروست نەدەبوو، دواتر هەر بەم هۆیەشەوە موسـڵمان بـوونی خۆی ڕابگەیێنێت.

## نموونەیئەوموژدانەی کە ڕاشکاوانە ئاماژە دەدەن بەناوی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم):

ئـەوەی هەنـدێ لـە لێکۆڵـەران نکۆڵیـان لێکـردووە، ئەوەیـە کـە ئینجیلـی (برنابـا) بەڕاشکاوانە ناوی پێغەمبەر (موحەممەد (صلی الله علیه وسلم))ی هێناوە، بۆیە هەندێ لـەو لێکۆڵەرانە وتیان: نابێت ئەم کتێبانە پێش دەرکەوتنی ئیسلام هەبووبن.

لەبەر ئەوەی وا باوبووە کە مژدەدان بەشێوەی ئاماژەو نیشانە و نازناو بێت. بـەڵام لـە ڕاستیدا وانییـە، چـونکە دەکرێـت مـژدە بـە نیشـانەو ئامـاژە و نازنـاو بێـت هـەروەك لایەنێکمان لەوبارەوە خستەڕوو کە وەرمان گرتبـوو لـە کتێبـەکانی (زەبـور و تـەورات و ئینجیل).

هەروەها دەشکرێت مژدەکە ڕاشکاو بێت، هەروەك لە ئینجیلی (بەرنابا) و لـە دانـەی لەبەرگێراوی ئینجیل بە پێنووسی (حمیری)دا هاتووە، شێخ (موحەممەد بیرم) لـە کەسـێکی ئینگلیزی گەڕۆکەوە ئەوەیگێڕاوەتەوە، کە لە کتێبخانەی پاپادا لە (ڤاتیکـان) دانەیـەکی لە ئینجیلی نووسراو پێش هاتنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)بـە پێنووسـی (حمـیری) بینیوە، کە عیسا (سەلامی خوای لێبێت) فەرموویەتی: (ومبشرا برسول یأتي من بعدي اسمه

[1] الرسول، سعید حوی ٢/٢٨٠.

أحمد) واتە: "هەروەها مژدەدەریشم بە پێغەمبەرێك كە دوای من دێت و ناوی ئەحمەدە".
ئەمەش پیت بە پیت كۆكە لەگەڵ دەقی قورئانی پیرۆز لە سورەتی (الصف، ئایەتی ٦).

بەڵام لە هیچ موسڵمانێكەوە نەهاتووە كە شتێكی لەو شێوەیەی بینیبێت لەو ئینجیلانەدا بەوەی مژدەی ڕاشكاوانەی تێدا هاتبێت، بەمەش ئەوە بەدەر دەكەوێت كە لە كتێبخانەی (ڤاتیكان)دا پاشماوەی ئەو ئینجیل و كتێبانە ماون كە لە سەدەكانی سەرەتادا قەدەغە كرابوون، چونكە ئەگەر ئەو ئینجیلانە دەربكەویبان ئەوا هەموو ئەو گومانە دەڕەوینەوە كە لە دەوری ئینجیلی (بەرنابا) و ئینجیلەكانی تردا هەیە[1].

هەروەها زۆر مژدەی تر هەن لە (زەبور، تەورات، ئینجیل)دا، باس لە دەركەوتن و هاتنی پێغەمبەرێك دەكەن دوای عیسا (سەلامی خوای لێبێت)كە ئەویش موحەممەدە (صلى الله عليه وسلم)، ئێستا هەموو ئەو مژدانە ناخەینەڕوو لەبەر ئەوەی بابەتەكە درێژ دەبێت.

ئەو كەسەش دەیەوێت زیاتر بەدواداچوون بكات ئەوا سەرنجی ڕادەكێشین بۆ كتێبی (اظهار الحق) دانراوی (ڕەحمەتوڵای كوڕی خەلیلی هیندی) كە لەو كتێبەدا باسی مشتومڕی نەصرانیەكان كراوە لەبارەی پێنج بابەت، كە خولگەی مشتومڕن لەنێوان موسڵمانان و نەصرانیەكان، كە بریتین لەمانە:

١- سەلماندنی ئەوەی كە تورات و ئینجیل دەستكاری كراون.

٢- هەڵوەشاندنەوە (النسخ).

٣- پوچەڵی بیروباوەڕی سێكوچكەیی (تثليث).

٤- قورئانی پیرۆز فەرمایشتی خوایە، بەشێوەی موتەواترو گومان هەڵنەگر پێمان گەیشتووە.

٥- پێغەمبەرایەتی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) و سەلماندنی ئەوەی كە كۆتا پێغەمبەرە.

---

[1] مقدمة محمد رشيد رضا لإنجيل برنابا ص: ت.

لە کاتی خوێندنەوەی کتێبی ناوبراودا دەردەکەوێت، کە دانەر گشت دەقەکانی تەورات و ئینجیل (عهد القدیم و الجدید)ی بە ڕاڤەکانیانەوە لەبەردەست بووەو زانیاری لەسەر هەبووەو بەشێوەیەکی تۆکمەو ڕێك و پێك توێژینەوەی لەسەر هەر دووکیان کردووە، ئەمەش وای کردووە کە هەڵوەستە بکات لەسەر زۆرێك لە شتە لاوەکی و وردەکان.

هەروەها هۆکاری نووسینی ئەم کتێبەش: ئەوەبووە کە کاتێك بەریتانیا هیندی داگیر کرد، ئەوا بانگخوازە نەصرانییەکان زۆر بەتووندی هێرشیان کردە سەر ئیسلام و کتێب و پەیامیان نووسی و جەختیشیان لەسەر ئەو پێنج خاڵانەی سەرەوەدەکردەوە، بەمەش زانا پایەبەرزەکانی موسڵمانان ڕووبەڕووی ئەو هێرشانە بوونەوەو دژیان وەستان. لە کۆتاییدا مێزگەردێك بەسترا لە نێوان (فندو)ی قەشە کە بەتواناترین و بەهێزترین بانگخوازی نەصرانیەت بوو و بە تواناترینیان بوو لە قسەکردنی بە عەرەبی و فارسی لەگەڵ دانەر (ڕەحمەتوڵای هیندی)، لەم مێزگەردەدا گەورە پیاوانی هیند لە دادوەرو موفتی و گەورە پیاوە ئایینیە ئینگلیزییەکان ئامادە بوون، ئەم مێزگەردە بەسترا لە شارۆچکەی (ئەکبەر ئاباد) لە مانگی ڕەجەب ساڵی ١٢٧٠ك.

جا قەشەیەکی تر بەناوی (فرنج) یارمەتی قەشە (فندو)ی دەدا. هەروەها بەڕێز موحەممەد وەزیرخان یارمەتی شێخ (ڕەحمەتوڵا)ی دەدا.

مێزگەردەکە بە بابەتی دەستکاری و هەڵوەشانەوە (النسخ والتحریف) دەستی پێکرد، شێخ (رحمة الله) سەرکەوت، قەشە (فندو) و هاوەڵەکەی سەرشۆڕ بوون و پاشەکشەیان کرد، هەروەها بەڵگەکانی هەر دوولا نووسرانەوە، بەڵام مێزگەردەکە تەواو نەکرا.

دواتر شێخ (ڕەحمەتوڵا) بەڕێکەوت بۆ مەککە بەمەبەستی حەج کردن، لەوێ چاوی بە بەڕێز (ئەحمەد زەینی دەحلان) کەوت و هەواڵی مێزگەردەکەی پێدا، بەمەش بەڕێز (ئەحمەد زەینی دەحلان) داوای لێکرد کە کتێبەکەی بە هەر پێنج بەشیەوە وەربگێڕێتە سەرزمانی عەرەبی.

ئینجا لـەو کاتـەدا شـێخ (ڕەحمـەتوڵا) ئـەم کتێبـە (إظهـار الحـق)ی نووسـی، بەشـی شەشەمیشی بۆ زیـادکرد کـە تـەورات و ئینجیلـی (عـهـد القـديم و الجديد)یشـی لـەخۆ دەگرێت[1].

لێرەدا چەندین کتێبی بەڕێزو بەهێزی تر هەن کە باس لەو مژدانە و جگـە لەوانـەش و گفتوگۆ و دەمەتەقێ دەکەن لەگـەڵ نەصـرانیەکان لـەبارەی بابەتـە بیروباوەڕییـەکان، لـە گرنگترینی ئەم کتێبانە:

١- الجواب الصحيح لمن بدل دين المسيح، إبن تيمية.

٢- هداية الحيارى من اليهود و النصارى، إبن قيم الجوزية.

٣- الأجوبة الفاخرة عن الأسئلة الفاجرة، القرافي.

٤- الفارق بين المخلوق و الخالق، عبدالرحمن بك باچه چی زاده.

٥- أعلام النبوة، الماوردي.

٦- حجة الله على العالمين في معجزات سيد المرسلين، النبهاني.

❊❊❊

[1] سەیری پێشەکی کتێبی: (اظهار الحق) بکە.

## پەیامەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تەواوکەرو کۆتایی شەریعەتەکانە

پێغەمبەر موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)، دوایین پێغەمبەرو پەیامبەرە، بەم بەڵگانەی خوارەوە:

أ- خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴾ الأحزاب: ٤٠. واتە: (موحەممەد باوکی هیچ یەکێك لە پیاوانی ئێوە نەبووە، بەڵام نێردراو و دوا پێغەمبەری خوایە).

ب- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویت: **(مَثَلي و مَثَلُ الأنبِياء من قبلي، كمَثَل رجل بنى بنياناً فأحسنه وأجمله، الا موضع لبنة من زاوية من زواياه، فجعل الناس يطوفون به، ويعجبون له، ويقولون: هلا وضعت هذه اللِبنة؟ قال: فأنا اللِبنة، وأنا خاتم النبِيين)**[1] واتە: نمونەی من و پێغەمبەرانی پێش من وەك نمونەی پیاوێك وەهایە کە بینایەکی دروست کردووەو زۆر چاك و جوانی کردووە، تەنها جێگای یەك خشت نەبێت، لە سوچێك لە سوچەکانیدا، خەڵك بەدەوریدا دەگەڕێن و سەرسام دەبن و دەڵێن: ئەی ئەم خشتە بۆچی دانەنراوە؟ فەرمووی ئەو خشتەم و سەرمۆری پێغەمبەرانم[2].

سەبارەت بەو فەرموودە ڕاست و دروستانەی کە دەدوێن لەبارەی ئەوەی کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێبێت) **پێش** هاتنی ڕۆژی دوایی دێتە سەرزەوی، ئەوەی لەوبارەوە

---

[1] فەرموودەی: نمونەی من و پێغەمبەرانی پێش من.... تاد: صحيح البخاري: ٦١ كتاب المناقب، ١٨ باب خاتم النبِيين، رقم ٣٥٣٥، عن أبي هريرة (رضي الله عنه). وفي صحيح مسلم: ٤٣ كتاب الفضائل، ٧ باب ذكر كونه خاتم (صلى الله عليه وسلم) النبيين، رقم ٢٢٨٦ (٢٢)، عن أبي هريرة (رضي الله عنه)، واللفظ لمسلم.

[2] دەقی کوردی ئەو فەرموودەیەم وەرگرتووە لە: (پوختەی صحيح موسليم: دانانی زکی الدين عبدالعظيم عبدالتوى المنذري. وەگێڕانی: لیژنەیەك. سەیری ٧٤٢/١ کە). بە کەمێك دەستکارییەوە. (وەرگێڕ).

چەسپاوە ئەوەیە کە شەریعەتێکی نوێ ناهێنێت، بەڵکو کار بە شەریعەتی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) دەکات و دانی پێدادەنێت و جەختی لەسەر دەکاتەوە[1]، لەبەر ئەمە کاتێ پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لێبێت) دادەبەزێت خاچ دەشکێنێت، بەراز دەکوژێت، سەرانە (جزية) وەرناگرێت[2].

لەبەر ئەمەش بوو کە پەیام و شەریعەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کۆتایی و دوایین شەریعەت و هەڵوەشێنەرەوەی ئەوانەی پێشەخۆی بووە.

ئەمەش ڕاستێتی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە دووپات ئەکاتەوە: ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُ ﴾ آل عمران: ١٩. واتە: (بەڕاستی دین و ئایینی پەسەند لای خوا تەنها ئاینی ئیسلامە).

ئەم فەرمایشتە: ﴿ وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴾ آل عمران: ٨٥. واتە: (جا ئەوەی بێجگە لەئاینی ئیسلام پەیڕەوی هەر ئاینێکی تر بکات لێی وەرناگیرێت، لە قیامەتیشدا لە خەسارەتمەندو زەرەرمەندانە).

هەروەها ئەم فەرمایشتەیش: ﴿ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا ﴾ المائدة: ٣. واتە: (ئەمڕۆ ئایین و بەرنامەکەتانم بە کۆتایی گەیاندو نازو نیعمەتی خۆمم بۆ تەواو کردن و ڕازیم بەوەی کە ئیسلام ببێتە بەرنامەو ئاینتان).

سەبارەت بەو حوکمانەش کە خوای گەورە لەسەر زمانی پێغەمبەرانی گەلانی پێشوو وەك شەریعەت بۆ ئەوانی بڕیارداوەو لە قورئانی پیرۆز و سوننەتیشدا باسکراون، ئایا ئەو حوکمانە دەبنە شەرع بۆ ئێمە یان نا؟

ئەم بابەتە: شەریعەتی گەلانی پێش خۆمان (شرع من قبلنا) لە زانستی (أصول الفقه)دا تاوتوێ دەکرێت، پوختەکەیشی ئەوەیە:

---

[1] شرح العقائد النسفية للتفتازاني ١٦٩، شرح الجوهرة للباجوري ٢٣٣، ولوامع الأنوار البهية ٢٧٧/٢، أصول الدين للبغدادي ١٦٢. وسەیری بابەتی:حوکم کردنی عیسا بە شەریعەتی محمد(صلی الله علیه وسلم) بکە لە: أصول الدين للغزنوي ٢٠٧.

[2] لوامع الأنوار البهية، سەرچاوەی پێشوو.

أ- ئەو حوکمانەی کە بۆ گەلانی پێش ئێمە وەك شەریعەت بۆیـان هـاتووە، بەهـەمان شێوە لەسەر ئێمەش پێویست کراون، سەبارەت بەمە ڕاجیایی نییە لـەوەی کـە بەهـەمان شێوە بە شێکە لە شەریعەتی ئێمە، وەك ئەو فەرمایشتەی خـوای گـەورە: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ ﴾ البقـرة: ١٨٣. واتـــە: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ڕۆژووی ڕەمەزان لەسەرتان پێویست کراوە، هـەروەکو لەسەر گەلانی پێش ئێوە پێویست کراوە).

ب- ئەو حوکمانەی کە وەك شـەریعەت بـۆ گـەلانی پـێش ئێمـە هـاتبوون بـەڵام لـە شەریعەتی ئێمەدا هەڵوەشێنراونەتەوە بەهۆی حوکمێکی نوێوە، لەمەشدا ڕاجیایی نییـە و نابێتە بەشێك لە شەریعەتی ئێمە، بۆ نمونە ئەو حوکمەی لە شەریعەتی موسـادا (سـەلامی خوای لێبێـت) هاتووە: (گوناهبار لە گوناهەکەی پـاك نابێتـەوە تـا خـۆی نـەکوژێت) ئـەم حوکمە لەسەر ئێمە لاچووە، چونکە هەڵوەشێنراوەتەوە بە حوکمی تۆبەکردن.

پ- ئەو حوکمەی کە لە شەریعەتی پێش ئێمەدا هاتووەو بەڵام لە شەرعی ئێمەدا هیچ حوکمێك نەهاتووە لەسەر ئەوەی حوکمی پێشوو ڕەت بکاتەوە یان وەریبگرێـت و جـەختی لەسەر بکاتەوە، لەم بارەوە زانایان دوو بۆچوونێکیان هەیە:

**بۆچوونی یەکەم:** پێی وایە دەبێتە بەشێك لە شەریعەت و شەرع بۆ ئێمە، چونکە هیچ بەڵگە لەبارەی هەڵوەشاندنەوەی حوکمی شەرعی پێشوو نەهاتووە، ئەو حوکمەی پێشووش بەشێکە لەو پەیامەی کە پێغەمبەران هێناویانـە، ئەمـە ڕای حەنەفیـەکان و هەنـدێ لـە مالیکیەکان و شافیعیەکانە.

**بۆچوونی دووەم:**نابێتە شـەرع بۆمـان، چـونکە شـەریعەتی ئێمـە هەڵوەشـێنەرەوەی سەرجەم شـەریعەتە ئاسمانییەکانـە بەگشـتی، تـەنها کاتێـك دەبێتـە شـەرع بۆمـان کـە شەریعەتی ئێمە دانی پێدابنێت.

بۆچـوونی یەکـەم ڕاسـت و دروسـتە: لەبـەر ئـەوەی شـەریعەتی ئێمـە ئـەو بەشـەی هەڵوەشاندۆتەوە لە شەریعەتەکانی تر کە پێچەوانەی شەریعەتی ئێمەیە.

لەبەر ئەوەش كە قورئانی پیرۆز، حوكمێكی شەرعی پێشوو بۆمـان دەخاتـەڕوو، بـەبێ ئەوەی دەق بێنێت لەسەر هەڵوەشانەوەی، ئەوا ئەو خسـتنەڕووەی قورئـان خـۆی لەخۆیـدا یاسادانانە بۆ ئێمە بەشـێوەیەكی ناڕاسـتەوخۆ، چـونكە حـوكمێكی خواییـە و پێغەمبـەر (صلی الله علیه وسلم) بەئێمەی ڕاگەیاندووە.

هەروەها لەبەر ئەوەی قورئان سەلمێنەری (تەورات و ئینجیل)ەو ڕێكە لەگەڵیانـدا، جـا هەر حوكمێك لەم دوو سەرچاوەیەدا هەبوو و قورئـان هـەڵی نەوەشـاندبووەوە ئـەوا دانـی پێداناوە[1].

هۆكاری ئەوەی كە ئیسلام كۆتا پەیام و دوایین شەریعەتە، شەریعەتەكانی پـێش خـۆی كۆتایی پێ هێنا، ئەمانەن:

١- پەیام و شەریعەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕوونە و ئاشـكرایە، زانسـتخواز لە هەر كات و شوێنێكدا ویستی لەسەر بێت دەتوانێت سوودی لێببینێت، بۆ پڕكردنـەوەی پێداویستیەكانی.

٢- پێویست بەوە نییە كە شەریعەتێك بـۆ شـەریعەتی ئیسـلام زیـاد بكرێـت یـاخود شەریعەتی ئیسلام دابتاشرێت و كەم بكرێتەوە، چونكە ئیسـلام گیرفـانی بـەتاڵ نییـە لـە چارەسەر، بەڵكو چارەسەری هەموو كەم و كورتی و ناتەواویەكی پێیە.

گەورەترین بەڵگەش لەسەر كامڵی و تـەواوی شـەریعەت و پـەیامی ئیسـلام، بریتیـە لەوەی حوكمی خۆی داوە لەبارەی سەرجەم ئەو كێشە زۆرانەی كە لەژمار نایەن، تەنانـەت حوكمیشی پێیە لەبارەی سەرجەم لایەنەكانی ژیانی مرۆڤـــ و ئـەو لایەنانـەی موسـڵمان بەرەو ڕووی دەبێتەوە، هەر لەسەردەمی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) تا ئەمڕۆ.

بەڵكو ئەمڕۆ پێویست بەبوونی هەندێ مرۆڤـــی بـاش و خوانـاس هەیـە كـە كـار بـۆ بڵاوكردنەوەی شەریعەتی ئیسلام بكەن، تا ئەو چارەسـەرە ڕەسـەنە پێشـكەش بـە جیهـان بكات، بۆ بنبڕكردنی ئەو دەردو نەخۆشیانەی تووشی گەلانی دونیا بوونە.

---

[1] أصول الفقه لعبدالوهاب خلاف ٩٣-٩٤.

٣- پێغەمبەرایەتی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) تایبەت نەبووە بە کات و شوێن و وڵات و هۆزێك بەڵکو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ گشت خەڵکی سەر زەوی ڕەوانە کراوە[١].

***

## گشتگیری پەیامەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)

پەیامی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ تێکڕای خەڵکە، بە گشت ڕەنگ و ڕەگەزو زمانە جیاوازەکان، بەم بەڵگانە:

أ- خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴾ الأنبیاء: ١٠٧. واتە: ("ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) " ئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە ببێتە ڕەحمەت و بەرەکەت بۆ هەموو جیهانەکان).

خوای بێ وێنە دەفەرموویت:﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ﴾ سبأ: ٢٨. واتە: (ئێمە تەنها بۆ هەموو خەڵکی نەبێت، تۆمان ڕەوانە نەکردووە، لە کاتێکدا مژدەدەرو ترسێنەریت بۆیان).

هەروەها دەفەرموویت: ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ﴾ الأعراف: ١٥٨. واتە: ("ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) " بڵێ: ئەی خەڵکینە بەڕاستی من پێغەمبەرو فرستادەی خوام بۆ ئێوە بەگشتی).

ب- جەنگی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ خاوەن کتێب و سەپاندنی سەرانە (جزیە) لەسەریان، ئەو ڕزگار کردنی وڵاتان کە خەلیفەکانی ڕاشیدین پێی هەڵسان تا ئایینی ئیسلام جێگەی ئایینەکانی تر بگرێتەوە.

کەچی پێغەمبەرانی پێشوو بەتایبەت بۆ گەلی خۆیان ڕەوانە کرابوون، ئەمە شتێکی ڕوونە لە قورئانی پیرۆزدا، خوای گەورە دەفەرموویت:

---

[١] مبادیء الاسلام للمودودي ٦٠.

﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ﴾ الأعراف: ٥٩. واتە: (سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە - نوح - مان ڕەوانە کرد بۆ سەر قەومەکەی).

﴿وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًاۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ﴾ الأعراف: ٦٥. واتە: (بۆ قەومی "عادیش" "هود"ی برایانمان نارد، وتی: ئەی گەل و عەشیرەتم هەر خوا بپەرستن).

﴿وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًاۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ﴾ الأعراف: ٧٣. واتە: (بۆ سەر قەومی "ثمود"یش صالّحی برایانمان نارد "ئەویش پێی وتن": ئەی گەلەکەم خوا بپەرستن).

﴿وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ﴾ الأعراف: ٨٠. واتە: (یادی "لوط پێغەمبەریش" بکە کاتێك بە قەومەکەی وت).

﴿وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا﴾ الأعراف: ٨٥. واتە: (بۆ هۆزی مەدیەنیش "شعیب"ی برایانمان نارد).

﴿ثُمَّ بَعَثْنَا مِنۢ بَعْدِهِم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ﴾ الأعراف: ١٠٣. واتە: (پاشان دوای ئەو "پێغەمبەرانەی کە باسکران" موسامان هاوڕێ لەگەڵ موعجیزەی جۆراو جۆردا بۆ سەر فیرعەون و دارو دەستەکەی ڕەوانەکرد).

هەروەها خوای مەزن لەبارەی عیسا (سەلامی خوای لێبێت) دە فەرمووێت: ﴿وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ آل عمران: ٤٩. واتە: ("لە ئایندەدا ڕایدەگەیەنێت" بەنەوەی ئیسرائیل کە من پێغەمبەرێکم).

لە فەرموودەی ڕاست و دروستدا هاتووە: (**أُعطيت خمساً لم يُعْطَهُنَّ أحدٌ من قبلي: كان كل نبي يُبعث إلى قومه خاصة، وبُعثتُ إلى كل أحمر و أسود...**) واتە: پێنج شتم پێ بەخشراون کە هیچ پێغەمبەرێك پێی نەدراون: هەر کام لە پێغەمبەرەکانی تر تەنیا بۆ هۆزو قەومەکەی خۆی نێردراوە، بەڵام من بۆ گشت سوور پێست و ڕەش پێستێك - واتە بۆ تێکڕای خەڵکی - نێردراوم. لە باسەکانی داهاتوودا ئەم فەرموودەیە بەتەواوی دەخرێتە ڕوو.

بەم پێیە: هەر كەسێك شوێنی پێغەمبەر موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) بكەوێت ئـەوا شوێنی گشت پێغەمبەران كەوتووە، هەر كەسێكیش نكـۆڵی بكـات لـە پێغەمبەرایـەتی موحەممـەد (صلى الله عليه وسلم). ئـەوا نكـۆڵی كـردووە لـە پێغەمبەرایـەتی هـەموو پێغەمبەران، ئەو نكۆڵی كردنەش تەنها ملنەدان و سەركەشی و یاخی بوون و لـەناوبردنی نرخ و بەهای عەقڵە، هەر بۆیە ئەم جـۆرە كەسـانە شـایەنی سـزایەكی توونـدن لـە ڕۆژی دواییدا.

❊❊❊

## موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)

## بەرزترین پلەو پایەی لەناو پێغەمبەراندا هەیە

هەموو پێغەمبەران لـە تایبەتمەنـدی پێغەمبەرایەتیـدا بەشـدارن و لەیـەك ئاسـتدان، چونكە پێغەمبەرایـەتی لـەخودی خۆیـدا پلەبەنـدی تێـدا نییـە، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پلـەی لەهـەر هـەموان گـەورەترە و پێگـەی لەهـەموان بەرزترە. جـا گـەورەتر بـوونی پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) لـە پێغەمبـەرەكانی تـر دەگەڕێتەوە بۆ ئـەو بـارودۆخ و ڕێزوپلـە زیادانـەی كـە پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) هەیبووە.

بەڵگەی مەزنتربوونی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە پێغەمبەرانی تر، ئەمانەن:

١- ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم): **(أنا سيد ولـد آدم يـوم القيامـة ولافَخْر)**[1] واتە: من گەورەی نـەوەكانی ئـادەمم لـە ڕۆژی دواییـدا، ئەمـەش وەك شـانازی بـەخۆكردن ناڵێم. مەبەسـتی ئەوەیـە كـە ئـەو قسـەیە دەكـەم دەمـەوێت بەخششی پەروەردگارم بخەمەڕوو.

---

[1] فەرمودەی: من گەورەی نەوەكانی ئادەمم... تاد: رواه أحمد في مسنده والترمذي وابن ماجه عن أبي سعيد، وهو حديث حسن./الجامع الصغير ١٦١.

٢- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەچەند شتێك لە پێغەمبەرانی تر گەورەترە، کە لە فەرموودەیەکی ڕاست و دروستدا باسی کردووە:(**أُعطيت خمساً لم يُعْطَهُنَّ أحدٌ من قبلي: كان كل نبي يُبعث إلى قومه خاصة، وبُعثتُ إلى كل أحمر و أسود، و أُحلَّت لي الغنائم، ولم تحل لأحد قبلي، وجُعلت لي الأرض طيبة و مسجدًا، فأيُّما رجل أدركته الصلاةُ صلى حيث كان، ونُصرتُ بالرعب بين يدَيْ مسيرة شهر، وأُعطيت الشّفاعة**)[1]

واتە: پێنج شتم پێ بەخشراون کە بە هیچ پێغەمبەرێك نەدراون: هەر کام لە پێغەمبەرەکانی تر تەنیا بۆ هۆزو قەومەکەی خۆی نێردراوە، بەڵام من بۆ گشت سوور پێست و ڕەش پێستێك - تێکڕای خەڵکی - نێردراوم، دەستکەوتەکان -ی جەنگ-م بۆ حەڵاڵ کراون بەر لەمن بۆ هیچ کەس حەڵاڵ نەبوون، زەویم بۆ کراوە بە پاك و پاککەرەوەو نوێژگە، جا هەر کەسێك لە ئوممەتم لە شوێنێك نوێژی بەسەردا هات با بیکات، مانگە ڕێیەك بەهۆی ترس و بیم - خرانە دڵی دوژمن -ەوە سەرخراوم، پلەوپایەی شەفاعەتم[2] پێدراوە.

٣- ئوممەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گەورەترین ئوممەتە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ﴾ آل عمران: ١١٠. واتە: ("بەڕاستی" ئێوە چاکترین ئوممەتێکن کە "بۆ سوودی" خەڵکی هێنراونەتە مەیدانەوە، چونکە فەرمان بەچاکە دەدەن و قەدەغە لە خراپە دەکەن و باوەڕی دامەزراوتان بەخوا دەهێنن). ئەمە پەیوەستە بە گەورەیی و پلە بڵندی پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم).

---

[1] فەرموودەی: ... تاد: صحيح البخاري: ٧ كتاب التيمم، ١ باب التيمم، رقم ٣٣٥، عن جابر بن عبدالله. و ٨ كتاب الصلاة، ٥٦ باب قول النبي (صلى الله عليه وسلم): جعلت لي الأرض مسجدا و طهورا، رقم ٤٣٨، عن جابر. وفي صحيح مسلم: واللفظ له، في أول ٥ كتاب المساجد و مواضع الصلاة، رقم ٥٢١، عن جابر بن عبدالله (رضي الله عنه).

[2] دیارە لێرەدا مەبەست لە شەفاعەت، شەفاعەتی مەزنە کە بە تایبەتی بەخشراوە بە پێغەمبەر نەك شەفاعەتەکانی تر، چونکە چەند جۆرێك لە شەفاعەت هەن. (وەرگێڕ).

واتە تەنها لەکاتێکدا ئوممەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گەورەترین ئوممەتە کە گوێڕایەڵ و شوێنکەوتووی فەرمانەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەبێت و خۆی دوور دەگرێت لەو شتانەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قەدەغەی کردووەو شوێن پێی دەکەوێت.

**ئەگەر وترا:**

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕێگری کردووە لەوەی یەکێك لە پێغەمبەران بە گەورەتر دابنێین لە یەکێکی تر، بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتانە:

أ- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: **(لا تخيِّروا بين الأنبياء)**[1] واتە: بەگەورەترم دامەنێن و هەڵم مەبژێرن بەسەر پێغەمبەراندا.

ب- هەروەها دەەرمووێت: **(لا ينبغي لعبد أن يقول: أنا خير من يُونس بن مَتَّى)**[2] واتە: نابێت بۆ بەندە بڵێت: من باشترم لە (یونسی کوڕی مەتا).

**وەڵامەکەی:**

ئەو فەرمایشتانە ڕاڤە دەکرێن کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەك خۆبەکەم زانی و لەخۆ بایی نەبووندەربڕیوە یاخود مەبەست لەو فەرمایشتانەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم). ئەوەیە کە یەکێك بەگەورەتر دانەنرێت لە ئەوەی تر کە ببێتە هۆی ناتەواوی و کەم و کورتی بدرێتە پاڵ هەندێکیان یان بەکەم تەماشا بکرێن[3].

---

[1] فەرموودەی: بەگەورەترم دامەنێن و هەڵمەبژێرن بەسەر پێغەمبەراندا. ... تاد: صحيح البخاري: كتاب الخصومات، ١ باب ما يذكر في الأشخاص والملازمة والخصومة بين المسلم واليهود، رقم ٢٤١٢، عن أبي سعيد الخدري. وفي صحيح مسلم: ٤٣ كتاب الفضائل، ٤٢ باب من فضائل موسى عليه السلام، رقم ٢٣٧٤ (١٦٣)، عن أبي سعيد الخدري.

[2] فەرموودەی: نابێت بۆ بەندە... تاد: متفق عليه، في: صحيح البخاري في كتاب الأنبياء. ومسلم في كتاب الفضائل./ اللؤلؤ والمرجان ٦٢٧.

[3] تفسير الرازي في تفسير الآية البقرة ٢٥٣ ﴿تِلْكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾ ٦/١٩٤ نۆزدە بەڵگەی هێناون لەسەر ئەم بۆچوونەی و لەگەڵ مشتومڕی دژەکان، و سەیری ئەمانەش بکە: الشفا ١/٢٢٥-٢٢٨ و شرح العقائدة النسفية مع شرح الكستلي ١٧٢، شرح الجوهرة للباجوري ٢١٤.

**تکا و شەفاعەتی پێغەمبەر موحەممەد** (صلى الله عليه وسلم)

**شەفاعەت لە زمانەونیدا:** بریتییە لە هۆکارو پاڕانەوەو بەهۆکار کردن.

**لە نەریت (عرف)دا:** بریتییە لە داواکردنی چاکە بۆ کەسێکی تر.

وشەی (الشفاعة) داتاشراوە لە جووت (الشَّفع) کە پێچەوانەی تاکە. وەك ئەوەی کەسی تکاکارو شەفاعەتکار داوای خۆی جووت کردبێت لەگەڵ داوای شەفاعەت بۆکراو. و (المشَفّع): بریتییە لەوەی شەفاعەت پەسند دەکات. و (الشافع و الشفيع و المستشفع): ئەو کەسەیە کە شەفاعەتی گیرابووە[1].

**شەفاعەت دوو جۆرە،** چەسپاو و نەچەسپاو:

١- شەفاعەتی چەسپاو: بریتییە لەو شەفاعەتەی کە خوای گەورە بەخشیویەتی بە خواناسە دڵسۆز و دڵپاکەکان، کە دوو مەرجی هەن، یەکەم: ڕێپێدان بە شەفاعەتکار لەلایەن خوای گەورە، دووەم: ڕازی بوونی خودا، ئەم دوو مەرجە باسکراون لەم فەرمایشتەی خوای گەورەدا: ﴿ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغۡنِي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ أَن يَأۡذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرۡضَىٰٓ ﴾ النجم: ٢٦. واتە: (زۆر فریشتەش هەن لە ئاسمانەکاندا کە تکاو پاڕانەوەیان بێ سودە، مەگەر خوا مۆڵەت بدات بە هەر کەسێك کە شایستەیە و ڕازی بێت کە تکا بکات یان تکای بۆ بکرێت).

هەروەها لەم فەرمایشتەدا: ﴿ يَوۡمَئِذٖ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنۡ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَرَضِيَ لَهُۥ قَوۡلٗا ﴾ طه: ١٠٩.[2] واتە: (لەو ڕۆژەدا تکاو شەفاعەت وەرناگیرێت و بێ سوودە، مەگەر لە کەسێك خوای میهرەبان مۆڵەتی بدات و ڕازی بێت بەوەی قسەی بۆ بکرێت و قسەی لێ وەربگیرێت).

شەفاعەتکار بەوپەڕی خۆ بەکەمزانی و نوزانەوەوە بەرامبەر خوای گەورە ڕادەوەستێت و داوای ڕەحمەت و بەزەیی و بەخششی خوا دەکات، چونکە ئەم جۆرە

[1] لوامع الأنوار البهية ٢/٢٠٤.

[2] الكواشف الجلية عن معاني الواسطية ٣٥٢.

شەفاعەتە گیرابوونی پاڕانەوەیـە کـە دەبێتـە هـۆی ئـەوەی خـوای گـەورە بەهۆیـەوە لـە تاوانەکان خۆش ببێت یان گوناهەکان سوك بکات یاخود پلەکان بەرز بکاتەوە، بە بەڵگەی ئەو فەرمایشتەی لە (دوو صەحیحەکە و سەرچاوەکانی تریشدا هاتووە): **(أن النبِي يسجد تحت العرش يوم القيامة، ويثنى على الله تعالى الثناء يلهمه يؤمئذ، "فيقال يا محمد، إرفـع رأسك، واشفع تشفع، واسأل تُعْطَهُ")** واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ڕۆژی دوایـیـدا لە ژێر عەرشدا سووژدە دەبات، بەهەموو ئەو شێوازانە ستایشـی خـودا دەکاتکـە خـوای گەورە بە ئیلهام دەیخاتە دڵییە، پێی دەوترێت: موحەممەد، سەرت بەرزکە، داوا بکـە پێـت دەدرێت، شەفاعەت بکە گیرا دەبێت.

مەبەست لە شەفاعەت ئەوە نییە کە خوای گەورە لە ویستێکی پاشگەز دەبێتـەوە کـە پێشتر هەیبووە لە پێناو شەفاعەتکاردا، بەڵکو هەموو ئەو شتانە دەگێڕێنەوە بـۆ ویسـتی هەربوو و زانستی بێ سەرەتا[1].

٢- شەفاعەتی نەچەسپاو: بریتیە لەو تکاو شەفاعەتەی کە لە غەیری خوا یـان بـەبێ ڕێپێدانی خوا دەکرێت یاخود تکاکە بۆ هاوبەش دانەرانە. خوای پاك و تاك دەفـەرمووێت:

---

[1] الشرح الجديد لجوهرة التوحيد للعدوي ١٤٠.

فەرموودەی: پێی دەوترێت: محمد، سەرت بەرزکە... تاد: صحيح البخاري، واللفظ له، في: ٦٠ أحاديث الأنبياء، ٣ باب قول الله تعالى: ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦٓ أَنۡ أَنذِرۡ قَوۡمَكَ﴾ نوح: ١، رقم ٣٣٤٠، عن أبي هريرة (رضي الله عنه). وهو بألفاظ مقاربة في: صحيح البخاري: ٦٥ كتاب التفسير- سورة البقرة، ١ باب قول الله تعالى: ﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا ﴾ البقرة: ٣١، رقم ٤٤٧٦، عن أأنس. و ٨١ كتاب الرقائق، ٥١ باب صفة الجنة والنار، رقم ٦٥٦٥، عن أنس. و٩٧ كتاب التوحيد، ١٩ باب قول الله تعالى: ﴿لِمَا خَلَقۡتُ بِيَدَيَّ﴾ ص: ٧٥، رقم ٧٤١٠، عن أنس. و ٢٤ باب قول الله تعالى: ﴿وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ نَّاضِرَةٌ﴾ القيامة: ٢٢، رقم ٧٤٤٠، عن أنس. وفي صحيح مسلم: ١ كتاب الإيمان، ٨٤ باب أدنى أهل الجنة منزلة منها، رقم ١٩٣ (٣٢٢ و ٣٢٦) عن أنس. و ١٩٤، عن أبي هريرة.

﴿مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خُلَّةٌ وَلَا شَفَاعَةٌ وَالْكَافِرُونَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ البقـــــرة: ٢٥٤.[1] واتە: (پێش ئەوەی ڕۆژێك بێت کە کڕین و فرۆشتن و دۆستایەتی و تکاکاری تیادا نییە، "ئەو ڕۆژە" بێ باوەڕان هەر خۆیان لە ڕیزی ستەمکارانن).

جا ڕاڤە کردنی شەفاعەت بەوە کە شەفاعەتکار وا لە شەفاعەت لـەلاکراو بکـات کـە کارێك بکات پێچەوانەی ئەوەی کە پێشتر دەیویست ئەنجامی بدات. وەك ئەوەی کەسێکی لاواز چاوی لەوە بێ کە کەسێکی خاوەن پێگە و دەســەڵات چـاکەیەکی لەگەڵـدا بکـات و بڕواشی وابێت کە خاوەن پێگەکە مەبەستی وایە کە لاوازەکە بێ بەش بکات لە چـاکەکە، بۆیە لاوازەکە پەنا بۆ کەسێکی نزیك لە خاوەن پێگەکە دەبات تا شــەفاعەت و تکـای بـۆ بکات و وای لێبکات چاکەکەی لەگەڵ بکات.

شەفاعەت بەو مانایە شتێکی نەبوو و ئەستەمە بەنیسبەت خودای گەورە، چونکە لـە نمونەی پێشوودا وا دەر دەکەوێت کە شەفاعەت لەلاکراو پێشتر مەبەستێکی بڕیاردابوو بـە پێچەوانەی ئەو شتەی کە شەفاعـەتی بۆ کراوە، کەچی کاتێك تکاکارو شــەفاعەتکار دێـت چــەند هۆکارێــك دەخاتــەڕوو کــە بەمــەش شــەفاعەت لــەلاکراو پێشــتر پێــی نــەزانیوە، بەپێچەوانەوە تەنها شتێك ڕوودەدات لە ناو بەدیهێنراو و بوونەوەرەکانی خوادا کـە خـوای گەورە ویستی لەسەر بووبێت، هیچ کەسێك ناتوانێت هەڵسوکەوت و گۆڕانکاری بکات لـە ویستی پەروەردگاردا.

ئەمە سەر دەکێشێت بۆ بۆچوونی گۆڕانی ویست (البداء[2]): بەو واتایــەی کـە خـوای گەورە پلە بەپلە شتەکان بەڕێوە دەبات، زانستی پەروەردگار دووبارە دادەڕێژرێتەوەو شـتی نوێی بۆ دەردەکەوێت، دوای ئەوەی کە پێشتر زانا نەبووە بەشتەکان. هــەموو ئــەم شـتانە ئەستەمن بۆ خوای تاك و پاك.

---

[1] الكواشف الجلية، سەرچاوەی پێشوو.

[2] خۆی لە ڕووی زمانەوانیەوە بە واتای بۆ دەرکەوتن دێت، بەڵام لە ڕووی زاراوەییەوە بە واتای گۆڕانی ویستی خوا دێت، هەر بۆیە بە گۆڕانی ویست لێکم داوەتەوە. (وەرگێڕ).

ئەم جۆرە شەفاعەت و تکایە کە خوای گەورە بە پوچەڵ و نەچەسپاوی داناوە لە چەندین ئایەتدا، هەروەك دەفەرموویت: ﴿فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ﴾ المدثر: ٤٨. واتە: (ئیتر تکای تکاکاران سوودیان پیٚ ناگەیەنێت).خوای بێ وێنە دەفەرموویت: ﴿يَوْمَ لَا تَمْلِكُ نَفْسٌ لِّنَفْسٍ شَيْـًٔا ۖ وَٱلْأَمْرُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ﴾ الانفطار: ١٩. واتە: (ئەو ڕۆژە کەس فریای کەس ناکەویت، کەس هیچ شتێکی لەدەست نایەت بۆ کەسانی تر، ئەو ڕۆژە هەموو شتێك بەدەست خوایە، فەرمان تەنها فەرمانی پەروەردگاری دادپەروەرە).هەروەها دەفەرموویت:﴿مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خُلَّةٌ وَلَا شَفَٰعَةٌ ۗ وَٱلْكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ البقرة: ٢٥٤.[1] واتە: (پێش ئەوەی ڕۆژێك بێت کە کڕین و فرۆشتن و دۆستایەتی و تکاکاری تیادا نییە، "ئەو ڕۆژە" بێ باوڕان هەر خۆیان لە ڕیزی ستەمکارانن).

### جۆرەکانی تکا و شەفاعەتی چەسپاو:

زانایان باسی چەند جۆرێك لە شەفاعەتی چەسپاویان کردووە، لەوانە:

١- شەفاعەتی مەزن کە تایبەتە بە پێغەمبەرمان موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) لە ناو گشت برایەکانی لە پێغەمبەرو پەیامبەران، ئەمە ئەو شەفاعەتەیە بۆ خەڵکی دەکرێت کە لە گۆڕەپانی مەحشەر ڕاگیراون تا ئەو ڕاوەستانەیان کۆتایی بێت و بحەسێنەوە لە دەست ناخۆشی و چەرمەسەری ڕاوەستانەکە، ئەم شەفاعەتەش دوای ئەوە دەبێت کە خەڵکی داوای دەکەن لە پێغەمبەرە خاوەن بەرنامەو شەریعەتەکان هەر لە ئادەم و نوح و ئیبراهیم و موسا و عیسا (سەلام خوایان لێ بێت) بەڵام ناوبراوان ڕایدەگەیەنن کە ئەو مەنزڵگاو پلەو پایەیان پێ نەدراوە کە بریتییە لە پلەی سوپاس کراو (مقام المحمود).

[1] شرح الجدید، سەرچاوەی پێشوو.

لەم بارەشەوە کۆمەڵێك فەرموودە لە هاوەڵانەوە هاتوون کە دەگەنە ئاستی تەواوتر.

٢- شەفاعەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ بردنە بەهەشتی کۆمەڵێك بەبێ لێ پێچینەوە، بە بەڵگەی فەرموودەی (عوکاشەی کوڕی میحصەن) لە (دوو صەحیحەکەدا) هاتووە، داوای لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کردووە بۆی بپاڕێتەوە تا ببێت بە یەکێك لەو حەفتا هەزارەی کە دەچنە بەهەشتەوە بەبێ لێ پێچینەوە، ئەمانە کەسانێکن سیخوڕی و جاسوسی و گوێ هەڵخستن ناکەن و ڕەشبین و خۆبەزلزان نین و پشتیش بەخودا دەبەستن.

٣- شەفاعەتێکە بۆ ئەو کەسانەی شایەنی ئاگری دۆزەخن، بەڵام خوای گەورە سزایان نادات بە ئاگری دۆزەخ. ئەمەش تەواو بە لێبوردنی خوایە.

٤- هێنانە دەرەوەی یەکتاناسان لە ئاگر دوای بەسەر چوونی ئەو ماوەیەی کە پێشتر لە زانستی خوای گەورەدا بڕیاری لەسەر درابوو کە لەو ماوەیەدا سزابدرێن.

٥- شەفاعەتێکە بۆ هەندێ لە کەسانی بێ باوەڕ بۆ ئەوەی سزایان لەسەر سووك بکرێت.

٦- شەفاعەتێکە بۆ پلە بەرزکردنەوەی هەندێ لە بەهەشتیەکان[1].

---

[1] الشرح الجديد ١٤١، سەیری ئەم بابەتە و جگە لەمەش بکە لە: شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٢٨٢ ولاپەڕەکانی دواتر، شرح الجوهرة للباجوري ٣٠٥ ونقل عن السيوطي وغيره. وانظر روايات الصحابة عن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) في الشفاعة لأهل الكبائر في: شرح أصول إعتقاد أهل السنة والجماعة ٣٨٧/٥ ولاپەڕەکانی دواتر،
وحديث عكاشة بن محصن: صحيح البخاري: ٧٦ كتاب الطب، باب من إكتوى أو كوى غيره، رقم ٥٧٠٥، ن عمرن بن حصين. و٨١ كتاب الرقائق، ٢١ باب: ﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ﴾ الطلاق: ٣، رقم ٦٤٧٢، عن إبن عباس. وفي صحيح مسلم: ١ كتاب الإيمان، ٩٤ باب الدليل على دخول طوائف من المسلمين الجنة...، رقم ٢١٨ (٣٧١ و ٣٧٢)، عن عمران بن حصين، ورقم ٢٢٠ (٣٧٤)، عن إبن عباس.

جۆری یەکەم و دووەم و شەشەم لە جۆرەکانی شەفاعەت ڕاجیاییان لەسەر نییە، بەهەمان شێوە پێویستە لەسەر جۆری پێنجەمیش ڕاجیایی نەبێت.

بەڵام ڕاجیایی لەسەر جۆری سێیەم و چوارەم هەیە، کە موعتەزیلەکان و ئیبازییەکان نکۆڵیان لێکردووە.

جهمی نکۆڵی کردووە لە بوونی شەفاعەت و لەوەی کۆمەڵێك دەربچن لە ئاگری دۆزەخ[1]. مورجیئەکانیش نکۆڵیان لە شەفاعەت کردووە بەهۆی ئەم بۆچوونەیان: هیچ تاوانێك لەگەڵ ئیمان زیانی نابێت[2].

جا موعتەزیلەکان و ئیبازییەکان ئەم بەڵگانەیان هێناوەتەوە لەسەر نکۆڵی کردنیان لە بوونی شەفاعەت بۆ ئەو کەسەی کە شیاوی چوونە دۆزەخە (ئەمە جۆری سێیەمی شەفاعەتە):

١- خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا لَّا تَجۡزِي نَفۡسٌ عَن نَّفۡسٖ شَيۡـٔٗا وَلَا يُقۡبَلُ مِنۡهَا شَفَٰعَةٞ ﴾ البقرة: ٤٨. واتە: (خۆتان بپارێزن لە ڕۆژێك کە کەس فریای کەس ناکەوێت و کەس هیچی لەدەست نایەت و تکاکاریی کەسیش وەرناگیرێت).

٢- خوای بێ وێنە دەفەرمووێت: ﴿مَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ حَمِيمٖ وَلَا شَفِيعٖ يُطَاعُ ﴾ غافر: ١٨. واتە: (هیچ دڵسۆزو پشتیوانێك بۆ ستەمکاران نییە، کەس تکاکارو غەمخۆریان نییە، تا قسەیەکی ڕەواجی هەبێت و تکای لێ وەربگیرێت).

زۆربەی زانایان بەم بەڵگانەوەڵامیان داوەتەوە:

١- مەبەست لە ئایەتی یەکەم خودی بێ باوەڕەکەیە، چونکە ڕووی دوان و فەرمایشتەکە لەوانە، ئایەتەکەش وەك بەرپەرچێك دابەزی بۆ ئەو جولەکانەی گومانیان دەبرد باوباپیرانیان تکاو شەفاعەتیان بۆ دەکەن. ستەمکارەکانیش کە لە

[1] التبيه والرد ١٣٤.

[2] كفاية الطالب الرباني ٦٧/١.

ئایەتی دووەمدا باسیان لێوەکراوە هەر بێ بـاوەرو کافرەکـانن، چـونکە سـتەمکار بەشێوەیەکی ڕەها هەر بێباوەڕە.

٢- لێخۆش بوون لە هەر گوناهێـك جگەلـە کـوفرو بـێ بـاوەڕی بـەبێ تەوبـەکردن و شەفاعەت شتێکی دروستە، کەواتە لێخـۆش بـوون شـەفاعەت لـەو گوناهانـە لـە پێشترە کە دروست بێت. سزادانیش مافی خوایە، بۆیە دەکرێ لـە تاوانبـار خـۆش ببێت و دەشکرێ سزای بدات. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَعْفُوا۟ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ الشورى: ٢٥. واتە: (خوا ئەو زاتەیـە کـە پەشـیمانی و تەوبە لە بەندەکانی وەردەگرێت، چاو پۆشیش دەکـات لـە هەڵـەو گوناهـەکانیان). هەروەها دەفەرمووێت:﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا﴾ الزمر: ٥٣. واتـە: ("بەڕاسـتی ئەگەر ئێوە تەوبەی ڕاست و دروست بکەن" خوا لـە هـەموو گونـاهو هەڵـەکانتان خۆش دەبێت).

موعتەزیلەکان و ئیبازییەکان نکۆڵیان کردووە لە جۆری چوارەمیش لـەو شـەفاعەتەی کە بۆ یەکتاناسانێك دەکرێت کە چوونەتە دۆزەخەوە، تەنانەت واگومانیـان بـردووە: هـەر کەسێ بچێتە دۆزەخەوە بـۆ هـەتا هـەتایی تیایـدا دەمێنێتـەوە، چـونکە کەسـێ بچـێتە دۆزەخەوە یان بێ باوەڕو کـافرە یـاخود گونـاهی گـەورەی ئەنجامـداوەو تۆبەشـی لەسـەر نەکردووە.

بەڵگەشیان لەسەر نکۆڵی کردن لەم جۆرەی شەفاعەت ئەوەیە: کە خـوا هـەر کەسـێك بخاتە دۆزەخەوە ئەوا ڕیسواو سەرشۆڕی کردووە، شەفاعەتیش تەنها بۆ کەسـێکە کـە خـوا لێـی ڕازی بوویێـت، کەسـێکیش خـوا ڕیسـوای کردبێـت هـەر گیـز لێـی ڕازی نابێـت، کەسێکیش خوا لێی ڕازی بێت هەرگیز ڕیسوای ناکات.

زۆربەی زانایان وەڵامیان داوەتەوەو وتویانە:

أ- پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: **(شفاعتي لأهل الكبـائر مـن أمتي)** واتە: شەفاعەتی من بۆ ئەو کەسانە لە ئوممەتەکەم کـە گونـاهی گـەورەیان کردووە. ئەم فەرموودەیە مانای ڕاشکاو لەوبارەوە بەدەستەوە دەدات[1].

---

[1] شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٢٩٠، الإنصاف للباقلاني ١٧٠.

ب- ئێمە داننانێین بەوەی خوای گەورە هەرگیز ڕازی نابێت لە کەسی لاسـار (فاسـق)، چونکە کەسی لاسار بەهۆی باوەڕو ئیمانەکەی ڕەزامەندی دەست دەخات و بـەهۆی لاسارییەکەیشی شیاوی ڕق لیّ بوونەوەیـە. بـەوەی ئـەو جـۆرە شـەفاعەتە سـزاکە لانابەرێت کە پێشتر بۆ شەفاعەت بۆکراو لە زانستی هەربووی پەروەردگاردا بڕیاری لەسـەر دراوە، لـە ئـاگری دۆزەخـدا دێنـە دەرەوە لـە دوای تـەواو بـوونی مـاوەی سزادانەکەی کە لە زانستی خوای گەورەدا بۆ دیاری کراوە[1].

---

فەرموودەی: : شەفاعەتی من... تاد: قال شيخ شعيب الأرتؤوط في هامش الصفحة من شرح العقيدة الطحاوية: حديث صحيح بطرقه وشواهده، أخرجه أبو دود والترمذي وأحمد والطيالیسي وأبو نعيم في الحلية والطبراني في الصغير من حديث أنس، وصححه ابن حبان والحاكم، وأخرجه الترمذي وابن ماجه والطيالیسي وأبو نعيم في الحلية من حديث جابر بن عبدالله، وصححه الحاكم وأخرجه الطبراني من حديث ابن عباس، والخطيب البغدادي من حديث ابن عمر.

[1] الشرح الجديد، سەرچاوەی پێشوو، ولوامع الأنوار البهية ٢/٢١٧، تمهيد الأوائل ٤١٥، شرح العقائد النسفية للتفتازاني ١٤٨، و شرح الجوهرة لعبدالسلام ٢٤٤، والمعتزله لعواد المعتق ٢٣٦.

به تێرو تەسەلی سەیری بۆچوونی ئیبازییەکان بکە لەبارەی شەفاعەت لە (البعد الحضاري ٦٧٠ ولاپەڕەکانی دواتر). لە سەرچاوەی ناوبراودا ئەم وتەیەی (عەمرو تەلانی) هێناوە: (هاوەڵانمان ڕەحمەتی خوایان لێبێت وتویانە: شەفاعەت ڕاستە و گومانی تێدا نییە، شەفاعەت تایبەتە بە باوەڕداران نەك ئەوانەی گوناهی گەورەیان کردووەو لاسارو خراپەکارن)، بەهەمان شێوە لە (٧٥٢) لە (عمرو التلانی)ەوە هێناوە: کە نکۆڵی کردووە لەوەی گوناهبارەکانی ئوممەتی محمد (صلى الله عليه وسلم) لە ئاگری دۆزەخ بێنە دەرەوە.

سالمی لە (مشارق أنوار العقول ٢/١٤٣) وتویەتی: (ڕێبازی ڕاستڕەو و خۆڕاگران - ئیبازییەکان - و موعتەزیلەکان ئەوەیە کە ئەوانەی گوناهی گەورە ئەنجام دەدەن هاوبەشدانەرین یاخود لاسارو گوناهبار ئەوا بۆ هەمیشەیی لە ئاگری دۆزەخدا دەمێننەوە، خواناس و گوێڕایەڵەکانیش بۆ هەمیشەیی لە بەهەشتدا دەمێننەوە، بەڵام ئیبازییەکان دەڵێن: سزادان بە دادگەری خودایە و پاداشت دانیش بە بەخشش و چاکەی خودایە، موعتەزیلەکان دەڵێن: ئەمە پێویستە لەسەر خودا، ئەم بۆچوونەی موعتەزیلەکانیش لەسەر بنچینە گەندەڵ و پوچەڵەکەیان بنیاتنراوە کە دەڵێن: عەقڵ چاك و خراپی شتەکان دەیاری دەکات)./ ونقل قول السالمي في البعد الحضاري ٧١٦، سەیری: الحق الدامغ ١٨٥. بکە.

**تکاو شەفاعەتی غەیری پێغەمبەر موحەممەد** (صلى الله عليه وسلم):

دوای شـەفاعەتی پێغەمبـەر موحەمـەد (صلى الله عليه وسلم)، دەرگـای شـەفاعەت دەکرێتەوە بۆ ئەوانەی کە خوای گەورە ڕەزامەندی لەسـەرە، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَٰنُ وَرَضِيَ لَهُ قَوْلًا﴾ طه: ١٠٩.[1] واتە: (لەو ڕۆژەدا تکاو شەفاعەت وەرناگیرێت و بێ سوودە، مەگەر لە کەسـێك خـوای میهرەبـان مۆڵـەتی بدات و ڕازی بێت بەوەی قسەی بۆ بکرێت و قسەی لـێ وەربگرێـت). مەبەسـتی لەوەیـە شەفاعەت تەنها بۆ ئەو کەسەیە کە وتەو بیروباوەڕی بریتی بێت لـە (لا الـه الا الله محمـد رسول الله (صلى الله عليه وسلم)).

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: **(فيقـول الله عزوجـل: شـفعت الملائكـة، وشفع النبيون، وشفع المؤمنون، ولم يبق إلا أرحم الراحمين، فيقبض قبضة من النـار، فيخـرج منها قوم لم يعملوا خيرا قطُ)** واتە: خوای گـەورە دەفـەرموێت: فریشـتەکان شـەفاعەتیان کرد، پێغەمبەران شەفاعەتیان کرد، تەنها خوای بەخشندەی میهرەبـان مـاوە، جـا خـوای گەورە کۆمەڵە خەڵکێك لە ئاگر دەردەهێنێت کە هەرگیز چاکەیەکیان نەکردووە.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: **(إن من أمتي مَن يشـفع للفِئـام، ومـنهم مَن يشفع للقبيلة، ومنهم من يشفع للعصبة، ومنهم مَن يشفع للرجل حتى يـدخلوا الجنـة)** واتە: لە ناو ئوممەتی من کەسانێك هەن کە شفاعەت بۆ کۆمەڵە خـەڵکێکی زۆر دەکـات، هەیانە شەفاعەت بۆ هۆزێك دەکات و هەیانە شەفاعەت بۆ دەستەیەك دەکات، هەشـیانە شەفاعەت بۆ یەك پیاو دەکات تا دەچنە بەهەشتەوە.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفـەرموێت: **(يشـفع الشـهيد في سـبعين مـن أهـل بيته)**[2] واتە: شەهید شەفاعەت بۆ حەفتا کەس لە خانەوادەکەی دەکات.

---

[1] نور الإسلام لعبدالكريم المدرس ٢٩١.

[2] نور الاسلام٢٩١، سەیری: لوامع الأنوار البهية٢/٢٠٩، شرح العقيدة الطَّحَاوية لإبن أبي العز٢٩٣. بکە.

هەروەها دەفەرموویت: (**يشفع يوم القيامة ثلاثة: الأنبِياء، ثم العلماء، ثم الشـهداء**)[1] واتە: لە ڕۆژی دواییدا سیّ دەستە تكاو شەفاعەت دەكـەن: پێغەمبــەران، دواتـر زانایــان، پاشان شەهیدەكان.

## حیكمەتی بوونی تكاو شەفاعەت:

حیكمەت لە شەفاعەت ڕێزگرتنە لە شەفاعەتكاران و بەرز ڕاگرتنیانە لەبەردەم گشـت بینەران، هەروەها دابارینی ڕێژنەی سۆزو بەخششی خواییە بەسەر شەفاعەت بۆكراو[2].

بڕوابوون بەشەفاعەت مانای وانییە خەڵكی ئامــادە بكـرێن و هانبـدرێن بـۆ بـوێری و دەستپێشخەری كردن لە تاوانكارییدا، هەروەك هەندێك بۆچوونیان وایە. لەبەر ئەوەی هیچ كەسێك نازانێت كە شەفاعەتی بـۆ دەكرێـت یـان نـا، تـا وای لێبكـات بەكـەیفی خـۆی هەڵسوكەوت بكات[3].

---

فەرموودەی: فریشتەكان شەفاعەتیان كرد، پێغەمبەران شەفاعەتیان كرد... تاد: صحيح مسلم، واللفظ له، ١ كتاب الإيمان، ٨١ باب معرفة طريق الرؤية، رقم ١٨٣، عن أبي سعيد االخدري. والحديث في: مسند الإمام أحمد ٩٤/٣، عن أبي سعيد الخدري.

فەرموودەی: لە ناو ئوممەتی من كەسانێك هەن.. تادد: سنن الترمذي، كتاب صفة االقيامة والرقئق والورع، باب ما جاء في الشفاعة، ن أبي سعيدد االخدري. وقال: حديث حسن.

فەرموودەی: شەهید شەفاعەت بۆ حەفتا كەس... تاد: سنن أبي داود، ١٥ كتاب الجهاد، ٢٦ بب في الشهيد يشفع، رقم ٢٥٢٢، عن أبي درداء. وحسنه السيوطي في الجامع الصغير ٥٩٠.

[1] نور الاسلام ٢٩١، شرح لعقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٢٩٣.

فەرموودەی: لە ڕۆژی دواییدا... تاد، رواه إبن ماجه، عن عثمان (رضي الله عنه)./ الجامع الصغير للسوطي ٥٩٠ وحسنه. وقال إبن أبي العز: رواه الحافظ أبو يعلى. وخرجه محققه االشيخ شعيب في الهامش.

[2] نور الاسلام ٢٨٧.

[3] نور الاسلام ٢٨٨.

### بنچینەکانی بانگەوازی پێغەمبەری مەزن موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)

بانگەوازی پێغەمبەر موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) لە هەردوو بەشی شایەتمان بەدەر دەکەوێت، کە دوو بنچینەنەی هەرە سەرەکی بانگەوازی ناوبراون[1]، جا لەژێر ئەم دوو بەشە هەموو بەش و لق و پۆپەکانی تری ئیسلام کۆدەبنەوە.

**بنچینەی یەکەم:**

بڕوابوون بەبوونی خوداو یەکتاییەکەی، هەروەها بەوەی خوای گەورە خاوەنی هەموو سیفەتێکی تەواو و کامڵە. هەر لەم کتێبەدا لە بەشی خواناسی لەوبارەوە قسەمان کرد، باسی ئەوەشمان کرد کە چ شتێك ئەستەم (مستحيل) و پێویست (واجب) و دروست (جائز)ە بۆ خوای پاك و بەرز.

ئەمەش بەسە کە ئاماژە بدەین، بەوەی قورئانی پیرۆز لەمیانەی خستنەڕووی ئەو بنچینەیەدا بیروباوەڕی سێکوچکەیی (تثليث)ی نەصرانیەکان و هاوبەش دانانی جولەکەکان و پەیکەرپەرستی و ئەستێرەپەرستی و هەموو جۆرەکانی تری بتپەرستی کە لەلایەن عەرەبەکان هەبوون و هەڵوەشاندەوە، خوای گەورە لە چەندین ئایەتدا باسی پوچەڵیانی کردووە: ﴿لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلَاثَةٍ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا إِلَٰهٌ وَاحِدٌ وَإِن لَّمْ يَنتَهُوا عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ المائدة: ٧٣. واتە: (سوێند بێت بەخوا بێگومان ئەوانەش بێ باوەڕ بوون کە وتیان: خوا یەکێکە لە سێ دانە خوا "لە حاڵەتێکدا": هیچ خوایەك، هیچ پەروەردگارێك نییە جگەلە خوایەکی تاك و تەنها، خۆ ئەگەر لەو گوفتارە نابەجێ و ناقۆڵایەیانە کۆڵ نەدەن، سوێند بەخوا ئەوانەیان کە بێباوەڕ بوون سزایەکی بەئێشیان تووش دەبێت).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ اللَّهِ ۖ قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ ۚ إِن كُنتُ قُلْتُهُ فَقَدْ

[1] شرح السنوسية للباجوري ١٦٥، شرح أم البراهين للسنوسي وحاشية الددسوقي عليها ١٩٠ و ٢١٩، شرح الجوهرة للباجوري ٢٠٨، مشارق أنوار العقول ٢٧٣/١، شرح غاية المراد ١٨.

عَلِمْتَهُۥ تَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِى وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِكَ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴾ المائدة: ١١٦. واتە: (کاتێکیش خوا "هەر لە قیامەتدا" فەرمووی: ئەی عیسای کوڕی مەریەم، ئایا ئەوە تۆ بە خەڵکیت وتوە: منیش و دایکیشم بە دوو خوا دابنێن لە ئاست خوای پەروەردگارەوە؟ عیسا لەوەڵامدا وتی: پاکی و بێگەردی و بێ هاوەڵی شایستەی تۆیە، بۆم نییە شتێك بڵێم بۆ خۆم کە مافی من نەبێت؟! "چۆن حەق بەخۆم دەدەم شتی وابێت بە دەممدا؟!" خۆ ئەگەر شتی وام وتبێت ئەوە بەڕاستی تۆ دەیزانیت و لێت شاراوە نییە، چونکە تۆ دەزانیت بەهەرچی لە دڵ و دەروونمدا هەیە، بەڵام من نازانم بەوەی کە لە دەریای علیم و زانستی بێ پایانی تۆدایە، چونکە بەڕاستی هەر تۆ زانا و شارەزای نهێنی و پەنهانی).

بیروباوەڕی یەکتاناسی لە قورئانی پیرۆزدا، بەرزترین زانست و زانیارییە، کە مرۆڤ بۆ پلە بەرزەکانبەرز دەکاتەوە.

ئەو یەکخواناسییەنەی خۆشویستن و پشت بەخوا بەستنەی پێشینان بوو، کە دەروونی ئەوانی پاك و پوخت کرد، هیمەتیانی بەرز ڕاگرتن، سەربەرزی و پایەداری و دەسەڵاتی پێی بەخشین، دادپەروەری و ڕاستی بەرپاکرد، تەنانەت بووە کلیلی سەرکەوتنەکانیان و ڕزگار کردنی وڵاتان، ئازاد کردنی خەڵکی لە ستەمی پادشاکان و کۆیلایەتی کردن بۆ قەشە و حیبر و ڕەبەنەکان، بەمەش پێشینان کۆڵەگەی ژیارو شارستانیەتیان دامەزراند، زانست و هونەرەکانیان زیندوو کردەوە، شتی وایان داهێنا کە هیچ گەلێك بۆی نەکرا، تەنانەت (غوستاف لوبون) لە کتێبەکەیدا (تطور الأمم) وتی: هۆنەری هیچ گەلێك لە گەلانی گەشەسەندوو تواناو بەهرەکەی تەواو و کامڵ نابێت، تەنها لەدوای سێ نەوە نەبێت: یەکەم نەوەی لاساییکەرەوە، دووەم: ئەو نەوەی دوو سەردەمی بینیبێت (مُخَضرِم)[1]، سێیەم: نەوەی سەربەخۆو خاوەن پیشەی تایبەت. دانەرەکە دواتر وتویەتی:

[1] **مُخَضرم:** بەو کەسە دەڵێن دوو سەردەمی بینی بێت، وەك: کەسێك سەردەمی پێش ئیسلام و سەردەمی ئیسلام، یاخود سەردەمی ڕژێمی بەعس و دیکتاتۆریەتی عێراق و فیدراڵیەتی هەرێمی بینی بێت. (وەرگێڕ).

بەڵام تەنها عەرەب تاکە ئوممەتێکە کە هەر لە نەوەی یەکەمدا توانیویەتی هەموو هونەرەکان بەتەواوی و کاملی بەهرەکانیانەوە دەست بخەن، کە ڕەفتاریان لەسەر کرد)[1].

کاریگەری بیروباوەڕی یەکتاناسی بە ئەندازەیك لە ژیانی مرۆڤدا گەشەی کردووەو پێشکەوتووە کە مرۆڤ هەر هێندەی پێویستە.

ئەم بنچینە، پێکهاتەی ڕستەی یەکەمی شایەتمانە (لا اله الا الله)[2].

**بنچینەی دووەم:**

باوەڕ بوون بە پێغەمبەر خودا موحەممەد (صلی الله علیه وسلم). واتاکەی ئەوەیە:

١- پێویستە بڕوا بەوە بهێنرێت کە موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)پێغەمبەری خوایە و کۆتا پەیامبەرە.

٢- پێویست بوونی باوەڕ هێنان و بەڕاستدانانی ئەو هەواڵ و خەبەرانەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)داویەتی.

٣- پێویستی گوێڕایەڵی و ملکەچ بوون بۆ هەر دان پێدانان (تقریر) و کردارو گوفتارێك جا فەرمان یاخود ڕێگری و قەدەغە کردن بێت، پێویستە شوێن پێی هەڵبگرین و پابەندی ڕێگە و ڕێبازی ببین، چونکە گوێڕایەڵی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گوێڕایەڵی بوونە بۆ خودا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَ﴾ النساء: ٨٠. واتە: (ئەوەی فەرمانبەرداری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بکات، بەڕاستی فەرمانبەرداری خوای کردووە). خوای بێ وێنە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْ﴾ الحشر: ٧. واتە: (جا ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی بەخشیون وەری بگرن، هەر فەرمانێکی پێدان بەگوێی بکەن، قەدەغەی هەر شتێکی لێ کردن مەیکەن). هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤۡمِنٖ وَلَا مُؤۡمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمۡرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلۡخِيَرَةُ مِنۡ أَمۡرِهِمۡۗ وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلٗا مُّبِينٗا﴾ الأحزاب: ٣٦. واتە: (بۆ هیچ پیاو و ئافرەتێکی ئیماندار دروست نییە، کاتێك خواو پێغەمبەرەکەی بڕیاری شتێك بدەن، ئەوان سەرپشك بن لە ئەنجامدانی ئەو کارەدا، چونکە ئەوەی

[1] الوحي المحمدي ١٣١.

[2] شرح أم البراهين وحاشية الدسوقي عليه ٢١٩.

سەرپێچی بکات لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی ئەوە بەڕاستی بە ئاشکرا، گومڕاو سەرلێشێواوە).... تاد،

بڕوا بوون بە فریشتە و جنۆکە و شتە شاراوەو غەیبیەکان دەچێتە ناو چوارچێوەی ئەو بنچینەیە.بەهەمان شێوە بڕوابوون بە پێغەمبەران بێ جیاوازی و زانینی ئەو شتەی پێویستە یانئەستەمە یاخود دروستە بۆیان، هەروەها بڕوابوون بەو کتێبە ئاسمانیانەی کە بۆ پێغەمبەران دابەزیون،بەهەمان شێوە دەچێتە ناو چوارچێوەی ئەو بنچینەیە، ئەو کتێبانە لە بنچینەکاندا کۆك و تەبان لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا، چونکە لەیەك سەرچاوەوە هاتوون کە خوای گەورەیە، بەشی پێغەمبەرایەتی ئەرکی قسە کردن لەسەر ئەم بابەتەی لە ئەستۆ گرتووە، هەروەك پێشتر خرایەڕوو.

هەروەها بڕوابوون بە ڕۆژی دوایی کە ڕۆژی پاداشت و سزایە لەکاتی زیندوو بوونەوە، هاندەرو پاڵنەرێکی بەهێزە بۆ ئەنجامدانی کارو خێرو چاکە و فەرامۆش کردنی کاری خراپ و ناشرین، ڕێنمایی دەروونی بەهێزتر دەکات کە مرۆڤ دەگێڕێتەوە لە خراپە و ستەم و زۆرداری. دواتربە تێروتەسەلی لەوبارەیەوە دەدوێن لە بەشی ژیانی دواڕۆژ.

ئەم بنچینە، پێکهاتەی ڕستەی دووەمی شایەتمانە (وأشهد أن محمدًا رسول الله)[1].

بەمەش ئەوە ڕووندەبێتەوە کە شایەتمان بە هەردوو بەشەکەیەوە، سەرباری کەمی پیتەکانی بەڵام هەموو ئەو شتانەی لەخۆ گرتووە، کە موسڵمان پێویستە لە بیروباوەڕو شەریعەتەکەیدا بڕوای پێی هەبێت[2].

یان بەدەربڕینێکی تر:

بریتیە لە بڕوابوون بەوەی ئاینی (ئیسلام) بریتییە لە ئاینی ڕاست و دروست، کە پێویستە هەر تاکێك باوەڕی بە هەموو پێکهاتەکانی بە وردو درشتی هەبێت و کاری پێبکات، بۆیە "سنوسی" وتویەتی: (لەوانەیە لەبەر پوختی ڕستەکە و لەخۆگرتنی ئەوشتانەی باسمان کردن، خودا ئەم ڕستەیەی کردبێتە وەرگێڕو بەر جەستەکەری واتاکانی

---

(1) سەرچاوەی پێشوو.

(2) سەرچاوەی پێشوو ٢٢١.

ئیسلام لە ناو دڵی بەندەکەدا، بۆیە ئیمان و باوەڕ بێ دەربڕینی شایەتمان بە زمان لە کەس وەرناگیرێت)[1].

لەبەر ئەمە ناونیشانی هاتنە ناو ئایینی ئیسلامە، موسڵمانێتی لە هیچ کەسێك قبول ناکرێت تا دان نەنێت بە هەر دوو بەشەکەی شایەتمان.

بۆیە پێویستە لەسەر موسڵمان زۆر شایەتمان دووبارە بکاتەوە، هەروەك ئەمە هاتووە لە فەرمایشتی ڕاستەوە، تا ئەو واتا بەرزو پیرۆزانەی لەخۆی گرتووە لەگەڵ گۆشت و خوێنی ئاوێتە ببێت. بەمەش گەر خودا ویستی لەسەر بێت کەسەکە نهێنی و شتی سەرسوڕهێنی وا بەدیدەکات وەك بەرهەمی شایەتمان نا ژمێردرێن[2].

❊❊❊

## لە بەرامبەر پێغەمبەری مەزن موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) چیمان لەسەر پێویستە

پاش ئەوەی خوای گەورە نیعمەت و بەخششی کرد لەگەڵ موسڵمان بەوەی بڕوای بە خواو پێغەمبەرە مەزنەکەی هێنا، ئەوا پێویست بوو موسڵمان بزانێت، لە بەرامبەر پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) چی لەسەر پێویستە، ئەو ئەرکانەش بریتین لە:

١- خۆشویستنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گەورەترە لە خۆشویستنی خود و منداڵ و سەروەت و سامان و هەموو خەڵکی.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: **(لا يؤمن أحدُكم حتى أكون أحبَّ إليه من والده وولده والناس أجمعين)**[3] واتە: هیچ یەکێکتان باوەڕی تەواو نابێت تا من خۆشەویستر نەبم لەلای لە باوکی و منداڵەکانی و لە هەموو خەڵکی.

---

[1] أم البراهين وشرحها للسنوسي ٢٢٢.

[2] سەرچاوەی پێشوو ٢٢٤.

[3] فەرموودەی: هیچ یەکێتان باوەڕی تەواو نابێت... تاد: أخرجه أحمد و البخاري و مسلم و النسائي و إبن ماجة، عن أنس. وهو صحيح./ الجامع الصغير ٥٨٦.

ئەم خۆشویستنەش تەنها لەوەدا دەدرەوشێتەوە کە موسـڵمان بەتـەواوی ملکـەچ و گوێڕایەڵی هەموو فەرمایشتەکانی ببێت.

٢- ڕێز و حورمەت گرتنی بە زیندووی و مردوویـی، دروسـت نییـە پـێش پێغەمبـەر (صلی الله علیه وسلم) دەست بە قسە بکرێـت، خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ الحجرات: ١. واتـە: (ئـەی ئـەو کەسانەی باوەڕتـان هێنـاوە پێشـی خـواو پێغەمبـەری خـوا مەکـەون لـە بڕیـارو پێشنیاردا لەخوا بترسن و پارێزکار بن).

دروستیش نییە دەنگ بەرز بکرێتەوە لە خزمەتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم)، خوای پـاك و بـەرز دەفـەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرْفَعُوٓاْ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُواْ لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ﴾ الحجرات: ٢. واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە" دەنگتان بەسەر دەنگی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) بەرز مەکەنەوە لە کاتی گفتوگۆدا، قسە بێ پەردە مەکەن لە خزمەتیدا، وەکو بۆ یەکتری دەکەن، نەوەکو کردەوەکانتان پوچ ببێتـەوەو هەستیشی پێ نەکەن).

ئەم ڕێزو حورمەت گرتنە تا دوای مردنیش هەر بەدەوامـە، دروسـت نییـە دەنـگ بەرز بکرێتەوە لەلای گۆڕی موبارەکی یان لـە مزگەوتەکەیـدا، هـەروەك پێویسـتە مرۆڤـ زۆر بە ئەدەب و حورمەتەوە گوێ شل کات کاتێ گوێبیستی فـەرموودەکانی دەبێت و ڕازی بێت بەوەی لە فەرمایشتەکانیدا هاتووەو یاخی نەبێت لێیان.

٣- ئازار نەدانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەهەر شێوەیەك لە شێوەکانی.

خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ رَسُولَ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ التوبـة: ٦١. واتە: (ئەوانـەی ئـازاری پێغەمبـەری خـوا (صلی الله علیـه وسـلم) دەدەن سـزایەکی بەئێشیان بۆ هەیە).

ئـازار گشـتگیرە: جنێـو و تانـەیش دەگرێتـەوە یـان تـوانج لێـدانی یـاخود لـە شەریعەتەکەی یان لە هاوسەرە پاکەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، هـەروەك خـوای گـەورە دەفـەرموویێت: ﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوۡلَىٰ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ مِنۡ أَنفُسِهِمۡۖ وَأَزۡوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمۡ ﴾ الأحزاب: ٦. واتە: (پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نزیکترە بە ئیمانداران لـە خـودی خۆیان و خێزانەکانیشی دایکیانن). یاخود توانج و جنێودان بەخانەوادە و ئالویـەیت یان هاوەڵانی...

٤- سڵاوات و سەلامدان لەسەر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

خـوای گـەورە دەفـەرموویێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴾ الأحزاب: ٥٦. واتە (بەڕاستی خواو فریشـتەکان سڵاوات دەدەن لەسەر پێغەمبـەر (صلی الله علیـه وسـلم)، ئـەی ئەوانـەی باوەڕتـان هێناوە، ئێوەش سەلام و سڵاواتی لەسەر بدەن).

٥- پێویستی شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەر (صلی الله علیـه وسـلم)، خـوای پایەبـەرز فەرموویـەتی: ﴿ لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ لِّمَن كَانَ يَرۡجُواْ ٱللَّهَ وَٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا ﴾ الأحزاب: ٢١. واتە: (سوێند بەخوا بەڕاسـتی لـە پێغەمبـەری خوادا چاکترین نمونەی تەواو و ڕێکوپێك هەیە تا چاوی لێ بکەن و شوێنی بکـەون، بەتایبەت بۆ ئەو کەسـانەی ڕەزامەنـدی خوایـان مەبەسـتە، سـەرفرازی قیامـەت ئاواتیانە، هەمیشە و بەردەوام یادی خـوا بـەزۆر ئـەنجام دەدەن و زمانیـان پـاراوە بەیادی ئەو). شوێنکەوتن و شوێن پێ هەڵگرتنیشی بریتییە لە فەرمانبەردار بـوون و جێبەجێ کردنی هەموو کردارو گوفتارێکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

***

# بەشی شەشەم

# ڕۆژی دوایی

سێ دەروازە لەخۆ دەگرێت:

دەروازەی یەکەم: بەڵگەی بوونی ڕۆژی دوایی و پێویستی باوەڕ پێ هەبوونی.

دەروازەی دووەم: ڕۆژی دوایی لەلای غەیری موسڵمانان:

**لەلای شارستانیەتی دۆڵی ڕافیدین، میسرییە کۆنەکان، ئایینی زەردەشتی، یۆنانییە کۆنەکان، ڕۆمانیەکان، هندۆسییەکان، سابیئەکان، جولەکەکان، نەصرانییەکان.**

دەروازەی سێیەم: ڕۆژی دوایی لە ئایینی ئیسلامدا:

**واتاکەی، حوکمی باوەڕ پێ بوونی، کردەوەکان پەیوەستن بە ئاکامەکانیانەوە، تەوبە، مردن، گۆڕ، زیندوو بوونەوەو دوبارە ژیانەوە، نیاش کردن و لێپرسینەوە، حەوز، تەرازوو، پرد، بەهەشت و دۆزەخ.**

## پێشەکی:

مرۆڤ لەسەر گۆی زەوی ژیاوە، بەشێوەیەکی ساکار ژیانی بەسەر بردووە، کە بیری نەدەکردەوە لە ئاکام و سەرەنجامەکانی ژیان. کاتێك مرۆڤ چاوی هەڵهێنا، بیری دەکردەوەو پرسیاری دەکرد ئایا نمونەی ئەو بەدیهێنراوە ژیرو عاقڵ و هۆشمەندە وەك ئاژەڵ یان جرِوجانەوەر وایە، کە هەر یەك ئاکام و سەرەنجامیان هەیە، ئەویش مردنە یاخود ژیانێکی تر هەیە کە چاوەڕانی دەکات؟.

هەندێك خراپەکارو چاکەکار دەبینێت، کە سزاو پاداشت هەر لەم ژیانیاندا بەر لە مردنیان وەردەگرن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبینێت هەندێك کەس لەوانە دەمرن بەبێ ئەوەی سزا یان پاداشت وەربگرنەوە، بۆیە دەی پرسی:

ئایا ئەمانە مردن و لەناوچوون و نا گەڕێنەوەو سزاو پاداشت وەرناگرنەوە؟ یاخود سزاو پاداشت لە جیهانێکی تر چاوەڕێیان دەکات؟ بۆیە باوەڕی خۆی بەستەوە بە پێویستی بڕوابوون بە ژیانێکی تری دوای مردن، چونکە بەدیهێنانی ئەو جیهانە زۆر سەر سوڕهێنەرە، بێ کەموکورتی و ڕێکوپێکە، تەنها بە خوایەکی بە توانا دەکرێت کە ئەو بەدیهێنراوانە گەواهی دادگەری ئەو دەدەن.

ڕای ڕاست و ڕاشکاو ئەوەیە، کە ئەو بیروباوەڕە بڵاوبووەوە لە ناو خەڵکیدا،تەنها دەرەنجامی بەڕاستدانانی بانگەوازی پێغەمبەرانی پێشوو بووە، ئەگەرچی ئەو ڕوونی و سافیە ناپوخت بوو بەهۆی بت پەرستی، ماوە دوای ماوە.

ئەم بەشەمان ڕێکخستووە بۆ دوان لەسەر بابەتی ڕۆژی دوایی، ئەوا لە سێ دەروازە پێکدێت:

**دەروازەی یەکەم:**

لەم دەروازەیەدا ڕوونکردنەوەی تەواو کراوە بۆ: بەڵگەی بوونی ڕۆژی دوایی، پێویستی باوەڕ پێ هەبوونی.

**دەروازەی دووەم:**

ڕوونکردنەوە کراوە لەبارەی بیروباوەڕ بوون بە ڕۆژی دوایی لە دیدی سەرجەم ئایینە جیاوازەکان.

**دەروازەی سێیەم:**

لەم دەروازەیەدا بە تێرو تەسەلی بیروباوەڕی موسڵمانان سەبارەت بە ڕۆژی دوایی، دیمەنەکانی زیندوو بوونەوە، بابەتە هاوپێچەکانی خراوەتەڕوو.

# دەروازەی یەکەم

## بەڵگەی بوونی ڕۆژی دوایی و پێویستی باوەڕ پێ هەبوونی

### بەڵگەکانی ڕۆژی دوایی[1]:

دەکرێت بەم شێوەیەی خوارەوە بەڵگە لەسەر ڕۆژی دوایی بێنینەوە:

**بەڵگەی یەکەم: بوونی ڕۆژی دوایی شتێکی شیاوە نەك ئەستەم:**

دەکرێت ڕۆژی دوای ڕوویدات، ئەو نیشانانەی کە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن بریتین لەمانە:

١- مرۆڤ و بوونەوەر نەمر نین، کۆتایی سەرسوڕهێنەر بەبێ گومان بەسەریاندادێت، جا مرۆڤ دەمرێت، بوونەوەر لەناو دەچێت و نامێنێت، ئەمەش مانای وایە کە ئەو سیستەمەی ئێستای بوونەوەر دادەڕووخێت و لە بەین دەچێت، هەروەها مەشخەڵی ئەو سیستەمەش کە دەیبینین تەنها وێنەیەکی بچوك کراوەو بەرایی و سەرەتاییە، هەر لەو وێنە بچوکراوانە وێنە گەورەکەی کۆتایی پەخش دەبێت، بەیانی لە وێنەی واقیعی گومان هەڵنەگردا دەیبینین[2].

٢- جەستەی مرۆڤ لە چەندین خانە پێك دێت، ئەو خانانەش گەردیلەی زۆر بچوك و چڕو پڕن، ژمارەیان لە جەستەی مرۆڤدا زیاترە لە هەزار ملیۆن ملیۆن خانە، ئەو خانانە جەستە پێك دێنن وەك چون دیوار لە کەرپووچ و خشت پێك دێت، خانەکانی لەش دەگۆڕێن، لە هەر چرکەیەکدا (١٢٥ ملیۆن) خانە دەمرن.

---

[1] بەڵگەی بوونی ڕۆژی دوایی و پێویستی باوەڕ پێ هەبوونی لە: الاسلام يتحدى ٧٢ و لاپەڕەکانی دواتر، هەروەها خوێنەر ڕەوانە دەکات بۆ چەندین سەرچاوەی بیانی تر.

[2] هەر لەم کتێبەدا سەیری بابەتەکانی مردن و حەقیقەتەکەی و ڕابوونی ڕۆژی دوایی بکە کە بەتێرو تەسەلی لەو بارەوە دواوە.

ئەمەش مانای وایە لاشە چەندین جار دەمرێت و دەژیتەوە لـە ژیـانی دونیـادا، بـەڵام لەگەڵ ئەو هەموو گۆڕانکارییەشدا کەچی هەر کەسایەتیە تایبەتەکەی و نەریت و تێـڕوانین و زانست و ئاواتەکانی خۆی دەپارێزێـت، مرۆڤـــ هەسـت ناکـات کـە هـیچ شـتێك لـە ئەندامەکانی گۆڕانی بەسەردا هاتووە، جا نمونەی مرۆڤـ وەك ڕووباری لەبـەر ڕۆیشـتووە، بەردەوام ئاوەکەی دەگۆڕێت کەچی هەر هەمان ڕووباریشە.

ئەو کەسەی تا پەنجا ساڵ دەژیێت ئەوا بۆ پێنج جار مردووە، ئەگەر لە جاری شەشەمدا مرد چۆن دەتوانێت بەدڵنیاییەوە دان بنێت بەوەی خۆی مردووە، کەچـی هـیچ ڕێگەیـەکی نەبێت بۆ ژیان.

## بەڵگەی دووەم:توێژینەوەکان پشتگیری بوونی ڕۆژی دوایی دەکەن:

### ١-توێژینەوەی دەروونی (نفسی):

فرۆید و زانایانی دەروونناس بەشێوەیەکی گشتی ملکەچی تیۆرێك بوون کە پوختەکەی ئەمەیە:(هەر شتێکی چاك یاخود خراپ کە بەمێشك و خەیاڵی مرۆڤــدا دێـت، ئـەوا لـە لاپەڕەی نەست "اللا شعور"دا دەنەخشێت، بۆ هەتا هـەتایی ناسـڕێتەوە، گـۆڕانی کـات، شوێن و ڕووداوەکان کاریگەری لێناکات، ئەمە بەبێ ویسـتی مرۆڤـــ، چ بەخۆشـی چ بـە ناخۆشی ڕوودەدات).

توێژینەوە دەروونیەکان جەخت ئەکەنەوە لەسەر ئەوەی کە بوونی ڕاسـتەقینەی مرۆڤـــ بریتیە لە لایەنی نەست (الـلا شـعور)، کـە مردنـی بەسـەردا نایـەت، ڕێسـا کاتییـەکان کاریگەری تێ ناکەن. بەڵام جەستەی ماددی لە گۆڕان و تێکشکان و لەناوچووندایە، بۆیـە بوونی جەستە بە بوونێکی ڕاستەقینە دانانرێت، ئەمەش مانای وایە کە ژیان بەردەوامە و لەناوناچێت بۆ هەتا هەتایـە، بـەڵکو دوای مردنـی مرۆڤـــیش ژیـان بـەردەوام دەبێـت، ئێمەش هەر لە ژیاندا دەمێنینەوەو مردن تەنها دەرەنجامی کۆسپ و ڕێسا کاتییەکانە.

پاشان ئەو هزرانەی کە بـە مێشـك و خەیاڵمانـدا دێـت، لـە بیریشـی دەکـەین، دوای ماوەیەکی دوور لە خەونمانـدا دەیبینینـەوە یـاخود قسـەی لەسـەر دەکـەین لـە حاڵـەتی

(هستریا[1]) یان شێتی، ئەمە تەنها بەڵگەیەکە لەسەر ئەوەی "عەقڵ" یاخود "یاد"ئەو شتە نییە کە ئێمە درکی پێ دەکەین و بەرهەستن، بەڵکو لایەنی نەستیش هەیە کە وێنەکە تەواوی و بەگشت شتە لاوەکیەکانیەوە وەردەگرێت و دەپارێزێت، ئەو لایەنەی نەستیش لە خودی خۆیدا جیهانێکی سەربەخۆیە و لەناو ناچێت بە لەناوچوونی جەستەی ماددی.

ئەمەش جەخت لەوە دەکاتەوە کە دەکرێت تۆمارێکی تەواو و کامڵ هەبێت، بۆ کردارو گوفتارەکانی[2] هەر لە ژیانی مرۆڤـدا، ئەمەش دەزانێت دەست دەکات بە ژیانەکەی تر یاخود دەچێتە قۆناغەکەی تری ژیانی.

٢- توێژینەوەی ڕۆحی

توێژینەوە ڕۆحییەکان، لەسەر ئاستی ئەزموونی، بوونی ژیان لە دوای مردنیان سەلماندووە، جا لەو تایبەتمەندیانەی مرۆڤ کە لە سەردەمی کۆنەوە هەیەتی بریتیە لە "خەون"، بەڵام ئەو ڕاستیە پڕ گرنگ و بایەخدارانەی کە زانایانی دەروونناسی ئەمڕۆ ئاشکرایان کردووە،ڕاستی زانستی زۆر قوڵن، کە پێشینان لێی شارەزا نەبوون.

توێژینەوە ڕۆحییەکان، لقێکن لە زانستی دەروونناسی سەردەم، ئامانجی ئاشکراکردنی تایبەتمەندییە نائاساییەکانی مرۆڤە، بۆ ئەم توێژینەوانەش چەندین پەیمانگا لەسەر ئاستی جیهان دروست کران و تاقیکردنەوەی بەرفراوان بۆ هەزاران خەڵك ئەنجام درا، لە دەرەنجامدا ئەو پەیمانگایانە سەلماندیان:

لە ڕاستیدا کەسایەتی مرڤایەتی هەر بەردەوام دەمێنێت، لە وێنەیەکی نامۆدا، دوای لە ناوچوونی جەستە ماددیەکەی[3].

---

[1] هستیریا: نەخۆشیەکی دەروونیە و دواتر بەرە بەرە دەبێتە جەستەیی و عەقڵی. (وەرگێڕ).

[2] سەیری بابەتی نمایش کردن و لێ پرسینەوە بکە، بەشێك لەوەمان هێناوە کە زانستی سەردەم باسی لێوەکردووە.

[3] بۆ نمونەی ئەو ئەزموون و تاقیکردنەوە ڕۆحیانە بڕوانە کتێبی: الإسلام يتحدى ٩٣.

### ٣- گەواهی کرداریی و ئەزموونی:

ئەو شایەتی و گەواهیـدەرە کـرداری و ئەزموونیـەی کـە بـوونی ژیـانی دوای مردنـی سەلماندووە، بریتیە لە: ژیانی یەکـەمان[1]، ئەگـەر دان بنـێین بـە ڕوودانـی ڕووداوێـك لـە ئێستادا و نکۆڵیش بکەین لە ڕوودانی هەمان ڕووداو لە داهاتوودا، ئەمە خۆی لە خۆیـدا دژایەتی لۆژیك و مەنتیق و عەقڵـە، هـەموو ئـەو زانایانـەی کـە هـەوڵی شـیکردنەوەی بوونەوەرو ژیان دەدەن بە داروینیشەوە باسـی ئـەوەیان کـردووە کـە: ئەگـەر هـەمان ئـەو هۆکارانەی یارمەتیدەر بوون لە بـەدیهێنانی یەکـەم جـاری بوونـەوەر ئامـادەبوون، ئـەوا دەگونجێت ژیان وتایبەتمەندییەکانی دووبارە بێنە کایەوە جارێکی تر.

## ئامانج و مەبەست لە بڕوا بوون بە ڕۆژی دوایی

کاتێك خوای گەورە ئادەمیزادی ڕێزدار کرد، هەروەها کردی بە گەورەی بوونەوەر، بـەم فەرمایشتەی: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ﴾ الاسراء: ٧٠. واتـە: (سـوێند بەخوا بەڕاسـتی ئێمـە ڕێزمـان لـە نـەوەی ئـادەم گرتـووەو بەسـەر وشـکانی و دەریـادا "بەجۆرەها هۆکاری گواستنەوە" هەڵمان گرتوون). ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویـدا هەیـە، بۆ مرۆڤـــی ڕام کرد، قورئانی پیرۆزی بۆ ڕەوانەکرد، کە چەندین نیشانە و بەڵگەی ڕۆشنی تێدایە، کە ناچێتە عەقڵەوە خـوای گـەورە - کـە دانایـە - بـەبێ دانـایی و حیکمـەت و هاکەزایی بەبێ بوونی مەبەسـتێکی ڕاسـتەقینە مرۆڤـــ دروسـت بکـات، خـوای گـەورە دەفـــەرموویێت: ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْكَرِيمِ ﴾ المؤمـون ١١٥ - ١١٦. واتـە: (ئایـا گومانتان وابردووە کە بەڕاستی ئێمە ئێوەمان بەبێ مەبەست دروست کـردووە و ئێـوە بـۆ لای ئێمە ناهێنرێنەوە؟!. بەرزی و بڵندی بۆ خوا، پاشای ڕەوای حەق، هیچ خوایـەك نییـە جگە لەو زاتە، خاوەنی عەرشی شکۆدارو بەڕێزە).

---

[1] باسی زیندووبوونەوەی جەستەیی دەخرێتەڕوو هەر لەم کتێبەدا.

هەروەها دەفەرموویێت: ﴿أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَن يُتۡرَكَ سُدًى﴾ القیامـة: ٣٦. واتە: (ئایا ئـادەمیزا وادەزانێت هەروا وازی لێدەهێنرێت بەخۆڕایی). مەبەستی ئەوەیە بـەبێ سـوود فـەرامۆش دەکرێت و فەرمانی پێ ناکرێت.

ئامانجی بەدیهێنانەکە ڕۆشـنە لـەم ئایەتـەدا: ﴿وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ﴾ الذاریات: ٥٦. واتە: (بێگومان من پەری و ئادەمیزادم دروست نـەکردووە تـەنها بـۆ ئـەوە نەبێت کە من بپەرستن و فەرمانبەردارم بن). ئەمە ڕاسپاردن و تەکلیف و تاقیکردنەوەیـە تا خراپ لە چاك جیا بکرێتەوە.

## بڕوابوون بە ڕۆژی دوایی پێویستە

هەروەك پێشتر سەلماندمان،چەندین بەڵگەمان خستەڕوو، کە ڕۆژی دوایی دەکرێت بێتە پێش و بەرپا ببێت و شـتێکی نـەبوو ئەسـتەم نییـە، هـەروەها ئـەوەمان خسـتەڕوو کـە لێکۆڵینەوە دەروونی و ڕۆحییەکان پشتگیری ئەم بیروبـاوەڕە دەکـەن، ئێسـتا ئـەوە ڕووون دەکەینەوە کە جیهان پێویستی بەوە هەیە کە بڕوای هەبێت بە ڕۆژی دوایی، ئەمەش لـەو لایەنانەدا دەردەکەوێت[1]:

### ١- لایەنی دەروونی:

هیواو ئاواتی مرۆڤــ بۆ دەستخستنی ژیانێکی خۆشگوزەران و بـەرز، لـە جیهـانێکی ئازادی نمونەی پڕ لە خۆشگوزەرانی، سەربەخۆ و بەدەر بێت لـە سـنوورو کێشـەکانی ئـەم جیهانە، بەڵگەیەکی بەهێزی دەروونیە لەسەر پێویستی بـوونی جیهـانێکی تـر، هـەروەك تێنوێتی بەڵگەیە لەسەر ئاو، هەروەها بەڵگەیـە لەسـەر بـوونی پەیوەندییـەکی تایبـەتی شاراوە لە نێوان ئاو و مرۆڤــ.

پاشان ئەم بیروباوەڕە کە بریتییە لە بوونی ڕۆژی دوایـی لـە کـۆنترین سـەردەمەکانەوە بوونی هەیە، ئەگەر ئـەو بیروبـاوەڕە پوچـەڵ بووبایـەوە ئـەوا بـەو شـێوە سەرسـام کـەرە

[1] الکلام عن الحاجة إلى الآخرة في الاسلام یتحدی ٨٢ و لاپەڕەکانی دواتر.

کاریگەری لەسەر مرۆڤ نەدەبوو، چونکە ئێمە هزرو فیکرێکی پوچی مرۆیی نابینین تا ئەو سەردەمەی ئێستا بەو شێوە زنجیرەییە رێکو پێکە مابێت.

**٢- لایەنی رەوشتی:**

فیترەتی مرۆڤ جیاوازی دەکات لە نێوان ستەم و دادگەری، چاك و خراپ، هەر ئەم فیترەتەشە کە مرۆڤ جیا دەکاتەوە لە جگە لەخۆی، لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێت مرۆڤ ئەو فیترەتە بە فیڕۆ بدات و نەوەکانی رەگەزی خۆی بکوژێت و هەراسانیان بکات، مێژوو پڕیەتی لە چیرۆکی ستەمکاریی و دەست درێژی، رۆژنامە رۆژانەییەکان دەدوێن لەبارەی پەنهان کوژی، تاوانی فڕاندنی خەڵك، تاڵان، تاوانبارکردنی درۆیین، بانگەشەی بێ بنەما، تێکشکاندن و قڕ کردنی گەلان. هەموو ئەمانەش تەنها وێنەیەکی بچوك کراوەن بۆ ئەو رووداوانەی رۆژانە لەسەر زەوی روودەدەن. بەڵام پاڵنەرەکانی دادگەری و ئینصاف لە ویژدانی مرۆڤدا جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ئەو جیهانە لەخودی خۆیدا کەموکورتە، ئەو کەموکورتییەش پێویستی بە تەواو کامڵ بوونە. بۆیە پێویستە رۆژێك هەبێت کە ستەمکارو ستەم لێکراو بەرهەمی کردەوەکانیان بدورنەوە، ناچێتە عەقڵەوە کە کەسی باوەڕدارو چاکەکارو گوێڕایەڵ، کاتێك لە دونیادا پاداشتی وەرنەگرتبێت کەچی پاداشتی لە کیس بچێت و ئەو تێکۆشانەی لەگەڵ دەروون و نەفسی خۆی بەبێ بایەخ بەفیڕۆ بڕوات.

بەهەمان شێوە ناچێتە عەقڵەوە، خوای گەورە کەسی گاڵتەجاری ستەمکاری رۆچوو لە گومڕاییەکەیدا فەرامۆش بکات، لە کاتێکدا پیشەی چاندنی تۆی خراپە و چەوساندنەوەی ئەوانی تر بووە لە زەویدا، بێ ئەوەی ئەو ستەمکارە بە سزای خۆی بگات و تۆڵەی ستەم لێکراوەکەی لێ بسەنێتەوە، بەڵکو هەر یەك لە چاکەکارو ستەمکار لە رۆژی دواییدا پاداشت و سزای خۆیان وەردەگرنەوە: ﴿ وَتُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ ﴾ النحل: ١١١. واتە: (هەر کەس پاداشتی کردەوەکانی دەدرێتەوە). ئەگەر خوای گەورە لێپرسینەوە نەکات لەگەڵ ستەمکاران، هەروەها پاداشتی گوێڕایەڵان نەدات، ئەوا ئەو کاتە ستەم دەدرایە پاڵ

خوای گەورە، ستەمکردنیش ئەستەمە بۆ خوای گەورە.

بڕوابوون بە ڕۆژی دوایی وادەکات کە مرۆڤ بەردەوام چاودێری بەسەر نەفس و دەروونی خۆیدا هەبێت، ئارامی و هێمنی لە دەروونی خۆیدا بەرپا دەکات، بەمەش باوەڕدار هەست دەکات کە دونیا هەڵخەڵەتێنەرە، بۆیە دونیا بەکەم ئەزانێت، هەڵپە ناکات لەدونیادا لە پێناو گلدانەوەی ئەو شتەی ئارەزووی لێیە، ئەگەر زیانی بۆ خەڵکی تریش هەبێت، ئا لەو کاتەدا باوەڕدار ژیانی بەرزو ئامانجی گەورە دەبێت، ئەویش بریتییە لە: ئەنجامدانی کاری چاکە و فەرامۆش کردنی کاری خراپە، خۆ ڕازاندنەوە بە خووڕەوشتە بەرزەکان و خۆ دارنین لە خووڕەوشتە پەست و نزمەکان.

ئا لێرەدا قورئانی پیرۆز بیروباوەڕەی کردۆتە ڕێبازی بانگەوازی کردن بۆ چاکەکاری پلەبەرزی و ڕەوشت بەرزی، خوای پایەبەرز دەفەرموێت: ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُم مُّلَٰقُوهُۗ﴾ البقرة: ٢٢٣. واتە: (لە خوا بترسن و خۆتان لە خوا بپارێزن و چاك بزانن و دڵنیا بن کە بەدیداری خوا شاد دەبن). فەرمان کردن بە پارێزگاری و تەقوای پەیوەست کردووە بە بینینی خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا، بۆ ئەوەی جێگیرتر ببێت لە دەروونیدا.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَا تُنفِقُواْ مِنۡ خَيۡرٖ يُوَفَّ إِلَيۡكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تُظۡلَمُونَ﴾ البقرة: ٢٧٢. واتە: (هەر خێرو چاکەیەکیش ئەنجام بدەن پاداشتەکەتان دەست دەکەوێت، ئەوسا ئێوە بەهیچ شێوەیەك ستەمتان لێ ناکرێت). بەخشینی لە پێناوی خوادا هێناوە لەگەڵ ئەوەی خوای گەورە لە دوارۆژدا پاداشتیان دەداتەوە.

قورئانی پیرۆز گرنگی داوە بە جێگیر کردنی بیروباوەڕ لە هۆشی مرۆڤدا، تەنانەت بە چاکترین خێر و بەنەبڕاوەیی وەسفی کردووە، دونیاش ماڵێکە هەر لەناو دەچێت و ئەوەش کە بەدوای دونیا دەکەوێت، بەخۆشی و چێژە ماوەکورتەکانی دونیاهەڵخەڵەتاوەو لەخۆی بایی بووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا لَهۡوٞ وَلَعِبٞۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ لَهِيَ ٱلۡحَيَوَانُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ﴾ العنکبوت: ٦٤. واتە: (ژیانی ئەم دونیایە جگە لە گەمە و گاڵتە و یاری شتێکی تر نییە... بەڕاستی ماڵی قیامەتیش و ژیانی ناو

بەهەشت، هەر ئەوە ژیانە، ئەگەر بیانزانیایە و تێ بگەیشتنایە).هەروەها دەفەرمووێت: ﴿بَلْ تُؤْثِرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ۝١٦ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ۝١٧﴾ الأعلى: ١٦ - ١٧. واتە: (کەچی ئێوە ڕێبازی ڕزگاری ناگرنە بەر بەڵکو زیاتر ژیانی دنیاتان مەبەستە. لەکاتێکدا قیامەت و بەدەست هێنانی بەهەشت چاکترە و بەردەوامیشە).

**٣- پابەند بوون و گرتنەبەر:**

دەکرێ مرۆڤ ئەو شتانە جێبەجێ بکات کە پێی سپێردراوە، لە ترسی ئەو سزایەی چاوەڕوانی دەکات، ئەگەر چی کارەکە وەك خۆیشی بە ئەنجام نەگەیەنێت، بەڵام دەکرێ بپرسین کە چ شتێك پاڵ بەو کەسەوە دەنێت کە خاوەن دەسەڵاتی سیاسیە تا دادگەری بەرپا بکات؟ کێ لادان و یاخی بوونی مرۆڤ ڕاست ئەکاتەوە؟ ئەگەر ڕاستکەرەوەیەك و پاڵنەرێك نەبێت؟ یاخود ئەگەر خاوەن دەسەڵاتی سیاسی بێ ئاگا بوو، لەو بەرپرسانەی کە ستەم ئەکەن، بەرتیل دەخۆن، فێڵ دەکەن، دەسەڵات خراپ بەکار دەهێنن، چ شتێکی تر هەیە ئەوان لەوکارانە بگێڕێتەوە..؟

لە ڕاستیدا ئەو لادانە تەنها ئەو پاڵنەرە ڕاستی دەکاتەوە، کە سەرچاوەی گرتووە لە ناخی مرۆڤدا، ئەویش بریتیە لە ویژدان. ئەم تایبەتمەندییەش تەنها لە بیروباوەڕی ڕۆژی دواییدا بەدی دەکرێت، چونکە مرۆڤ هەست دەکات کە لە هەر کوێیەك بێت خوای گەورە دەیبینێت و لێ پرسینەوەیەکی سەختی لەگەڵ دەکات.

ڤولتێر دەڵێت: (گرنگی خواو ڕۆژی دوایی زۆر مەزنە، تەنانەت دوو بنچینەن بۆ بەرپابوونی ڕێسا و بنەما ڕەوشتیەکان).

ناوبراو بۆچوونی وایە: کە بیروباوەڕی بڕوابوون بە ڕۆژی دوایی بەتەنها بەسە بۆ دەستەبەرکردنی چوارچێوەیەکی ڕەوشتی هەرە چاك بۆ کۆمەڵگا، ئەگەر ئەو بیروباوەڕە

لاچوو و نەما، ئەوا هیچ پاڵنەرێك بۆ کاری چاك بەدی ناکەین، بەمەش داڕووخانی ڕێسا و سیستەمی کۆمەڵایەتی لێ دەکەوێتەوە).

ئەگەر ژیانی ڕۆژی دوایی هزرێکی خەیاڵی بوایە، ئەوا بۆچی ناتوانین سیستەمێکی کۆمەڵایەتی سەلامەت بەبێ بڕوابوون بە ڕۆژی دوایی بەرپا بکەین؟ ئایا دەکرێ هزرو فیکرێکی خەیاڵی ئەو پێگە گرنگە لە ژیاندا داگیر بکات؟

پێویستییەکی زۆر هەیە بە بیروباوەڕی قیامەت و ڕۆژی دوایی بۆ ڕێکخستنی ژیان و بنیاتنانی لەسەر بنچینەی ڕاستەقینەی دادگەری، کە لە خودی خۆیدا جەخت کردنەوەیە لەسەر ئەوەی ڕۆژی دوایی لە گەورە ڕاستیەکانی بوونەوەرە، ئەمەش بەڵگەیەکی لۆژیکی و مەنتیقی و ڕوونە لەسەر شیاوی بڕوا هێنان پێی.

**٤- پێویستی گەردوونی:**

پێویستە لێرەدا پەیوەندییەك هەبێت لە نێوان خواو مرۆڤدا، ئەو پێوەندییەش پێویستە دەربکەوێت، چونکە عەقڵ نکۆڵی ئەکات لە بوونی خوایەك کە هیچ پەیوەندی بەکاروبارەکانی بوونەوەرەوە نەبێت و بەندەکانیش وەك بەدیهێنەر شایەتی لەسەر نادەن. بەڵام کەی ئەو پەیوەندییە بەوێنەیەکی ڕوون دەردەکەوێت؟

دەکرێت دان بەوەدا بنرێت کە ئەو پەیوەندییە لە ژیانی دونیادا دەرنەکەوتووەو نەدرەوشاوەتەوە بەتەواوی، تا ئەوە کەسی بێ باوەڕو خوانەناسە کە دەڵێت: لە خوا ناترسم، پاشان دەبینین دەبێتە سەرۆك یان هیچ ئازارێك بەهۆی ئەو بێ باوەڕییەیەوە ناچێژێت... دەکرێ سکاڵای بڕوادار ڕەتبکرێتەوە بە بەڵگەی ئەوەی کە ناڕەواو نا شەرعیە.

تا لێرەدا یان دەبێت بڕوامان بە بوونی خوا هەبێت یان نکۆڵی لە بوونی بکەین، ئینجا ئەگەر بڕوامان پێی هێنا، ئەوا پێویستە بڕوا بە ڕۆژی دوایش بێنین، تەنها لە ڕۆژی دواییدا بە جوانی و ڕۆشنی شوێنەواری پەیوەندییەکانی نێوان بەدیهێنەرو بەدیهێنراو دەردەکەوێت، بەوەی لەوێ لێ پرسینەوە هەیە و مرۆڤ سزا یان پاداشت وەرئەگرێت و دەگات بە نیشتەجێ هەتا هەتاییەکەی.

لەبەر ئەوەی خوای بەدیهێنەری ئەم بوونەوەرە مەزنە، ناکرێت کۆتایی بە بوونەوەر بێنێت تا مەبەستی بەدیهێنانی ئەم بوونەوەرە نەخاتەڕوو.

# دەروازەی دووەم

## ڕۆژی دوایی لەلای غەیری موسڵمانان

لەم دەروازەیەدا پوختەیەك لە مێژوو لەبارەی هزری ڕۆژی دوایی دەخەینەڕوو، لە کۆنترین ڕۆژگارەکانەوە تا ئەم کاتەی ئێستامان، لە ناودارترین ژیارو شارستانیەت و ئایینە جیهانییەکان.

### ١- لە شارستانیەتی دۆڵی ڕافیدەین:

#### هزری قیامەت و زیندوو بوونەوە دوای مردن:

هیچ دەقێك لە نووسینی بزماریدا نەبوو کە بسەلمێنێت عێراقییە کۆنەکان بڕوایان بە زیندوو بوونەوەو هەستانەوەی دوای مردن و قیامەت هەبووبێت، هەروەها هیچ شتێکی واش نەبوو لە ناو شوێنەوارەکانیان کە بسەلمێنێت دەکرێت ڕۆحی مردوو بگەڕێتەوە بۆ ناو لاشەکەی[١].

ئەم مانایە لەسەر زمانی (گلگامیش)دا بەڕوونی دەبینین، کاتێك ئەی لاواندەوە بە هاوڕێکەی ئەنکیدۆ و پیای هەڵدەدا، دەیوت: (ئاخ ئەو هاوەڵەم کۆچی دوایی کرد کە خۆڵ و خاکی خۆش دەویست، منیش بەهەمان شێوەی ئەو ڕادەکشێم "واتە: دەمرم[٢]" بۆ هەتا هەتایە هەڵناسمەوە)[٣].

لەو کاتەش کە دەقە بزمارییە کۆنەکان، دەدوێن لەبارەی گەڕانەوەی ڕۆح بۆ جیهانی زیندوان، ئەوا مەبەستی ئەوەیە کە ڕۆح دەگەڕێتەوە لە سەر شێوەی تارمایی (شبح)

---

[١] عقائد ما بعد الموت في حضارة وادي الرافدين لا ١١٣ هەروەها بڕوانە: مقدمة في تأريخ الحضارات القديمة: طه باقر ٢٣١/١. والأديان د. رشدي عليان وسعدون ساموك ٧٠-٧١.

[٢] وەرگێڕ.

[٣] سەرچاوەی پێشوو ١١٥-١١٦.

بەجیا لە جەستە دەگەڕێتەوە[1].

## هزری لێپرسینەوە (الحساب):

مامۆستا (هایدل) و (کریمەر) و هەندێك لە لێکۆلەران بۆچوونیان وایـە، کـە ئامـاژە و هێمای ڕوون هەن لە دەقە بزمارییە کۆنەکان، کە بیروباوەڕی ئـەوان دەخەنـەڕوو، لـەبارەی هزری لێ پرسینەوە لە دوای مردن لە بیروبـاوەڕی عێڕاقـی کۆنـدا[2]، هـەروەك میسـڕییە کۆنەکان هەمان بڕوایان هەبووە.

بەڵام دوای ڕامان و ورد بوونەوە لەو هێمایانەی کە لە دەقە بزمارییەکانیان وەرگرتبوو، لێکۆڵەران ئەو ڕایەیان پەسەند کرد کە پێی وایە شارستانیەتی دۆڵی ڕافدین بڕوایان بە لێ پرسینەوە نیە لە دوای مردن، بڕواشیان نیە بە بوونی سزاو پاداشت لەو جیهاندا[3].

دانیشتوانی دۆڵی ڕافیدەین پێیان وابوو کە تاوان کۆنە بەکۆنی مرۆڤـــایەتی، مرۆڤـــ تووشی ئەنجامدانی دەبێت بە ئەنقەست بێت یاخود بە ئەنقەستیش نەبێت.

ئینجا پێیان وایە ئەنجام دانی هەر تاوانێك زیانی زۆر گەورەی لێدەکەوێتەوە[4]، کە لــە دوو شتدا ڕەنگ دەداتەوە:

١- پشت تێکردن و فەرامۆش کرانـی تاوانبـار لەلایـەن خواوەندەکانـەوە، ئەوکاتـەش تاوانبارەکە دەبێتە نێچیری ئاشـوب و فیتنـە و کارەسـات و نـــەخۆشییەکان و ئـارامی و خۆشی نامێنێت[5]. پاشا (ئاشور بانیبال) بارودۆخـە ناهـەموارەکانی دەوڵەتەکـەی بـەوە وەسف دەکات، کە سزایەکە بەسەریدا سەپێنراوە، لەوبارەوە دەڵێت:

(بۆچی نـەخۆش و سـزای دڵ و دەروونـی و بەدبـەختی و ئـێش دەورەیـان داوم؟ لـەناو وڵاتێکدا کە پڕە لە شڵەژان، لە ماڵێکدا کە سیخوڕی و پیلان تاوتوێ دەکـرێن، بەڕاسـتی

---

[1] هەمان سەرچاوە ١١٣.
[2] سەرچاوەی پێشوو ١٢٣-١٢٤.
[3] سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە: الحجج ومناقشتها في عقائد ما بعد الموت ١٣٠.
[4] عقائد ما بعد الموت ١٣٢-١٣٣.
[5] سەرچاوەی پێشوو ١٣٥.

ئەم شتانە بەردەوام بەمنەوە پەیوەستن، کارەسات و وشە خراپەکان کۆدەبنەوە لە دژی من، بەڕاستی نەخۆشی دڵ و ناهەمواری جەستە قەدو باڵای منی چەماندۆتەوە... مردن بووەتەوە خاڵی کۆتاییم، بەڕاستی ئازارم هەیە لە دوودڵی و خەمباریدا، بە ڕۆژو شەو دەناڵێنم و دەپاڕێمەوە: ئەی خواوەند ئەو ناخۆشیانە زاڵ بکە بەسەر ئەوانەی لە خواوەندەکان ناترسێن،ئەی خواوەند ڕێگەم بدە نووری تۆ ببینم، بۆچی ئەم هەموو کارەساتەت بەسەرە مندا سەپاندووە؟ بەڕاستی من ئازاردەچێژم وەك ئەو کەسانەی کە هەرگیز لە خواوەندەکان ناترسن)[1].

٢- بە کورت ماوە دانانی ژیان و تەمەن و هاتنی مردن بەهۆی گوناهو تاوان، وەك سزایەك بۆ تاوانبارەکە لەسەر ئەنجامدانی ئەو تاوانەی. دەقە بزمارییەکان ئاماژەی ئەمەن، بۆ نمونە:(ئەگەر یەکێك لە داهاتوودا بلێت: کێلگە "حقل" نەبەخشراوە، ئەوا سەرپێچی خواوەندەکانی کردووە: أنو، ئەنلیل، ئەیا، نینا، شەمس، مەردوخ، نسکو، سەدرننا، نرکال، لازر، بۆیە خواوەندەکان ئەو تاوانبارە لە بنچینەدا هەڵ دەتەکێنن و نەژادەکەی ڕەش دەکەنەوەو لەناوی دەبەن، کە لەوانەیە بەتەواوی تاوانبارەکە بکوژن و لێی نەگەڕێن ڕۆژێك زیاتر بمێننەوە).

واتای ئەو دوو سزایە هاتووە، لە کۆتایی یاساکەی (حەموڕابی)دا، کە نزا لە هەموو ئەو کەسانە کراوە کە حوکمەکانی یاساکەی پشتگوێ بخات یاخود ئەو ڕێسایانە ڕەش بکاتەوە کە لە یاساکەدا نووسراون یان ناوی (حەموڕابی) ڕەش بکاتەوە، تا ناوی خۆی لە جێگەی ناوی ئەودا بنوسێت یاخود فەرمان بەکەسێکی تر بکات بۆ ئەوەی بەو کارە هەڵسێت[2]. پێچەوانەی ئەوەی کە پێشتر خستمانەڕوو، پاداشت کە بریتیە لە: خۆشی ژیان و تەمەن درێژی بەکەسێك دەبەخشرێت کە کاری چاك و خێر بکات و کردەوەی باش ئەنجام بدات، وەك: ترسان لە خواوەندەکان، پێشکەش کردنی قوربانی، دروستکردنی

---

[1] سەرچاوەی پێشوو ١٣٨.

[2] سەرچاوەی پێشوو ١٣٩-١٤٠.

پەرستگە، دروستکردنی پەیکەر بۆ خواوەندەکان، سەرجەم ئەمانە دەدرەوشێنەوە لە دەقێکی بزماری:

(ترسان لە خواوەندەکان هۆکاری بەدەستهێنانی سۆزو دلۆڤانییە، بەراستی قوربانی کردن تەمەن درێژ دەکات، گومان لەوەدا نییە کە هەر کەسێك لە خواوەندەکان بترسێت ئەوا خواوەند "الأنانوكي" تەمەنی درێژ دەکات).

هەروەها (سەرجۆنی دووەم: ٧٢١-٧٠٥ پ.ز) دەڵێت: (بۆ پاراستنی حەسانەوەی خۆم، درێژی تەمەنم، و جێگیر بوونی دەسەڵاتی بەردەوامم، خۆم دەچەمینمەوەو ڕکوع دەبەم لە پەرستشدا)[١].

جا بەم پێیە:

جیهانی زیندوان لە دیدی شارستانیەتی دۆڵی ڕافدین بریتییە لە هەمان ئەو جیهانە کە سزاو پاداشتی تیادا وەردەگیرێتەوە، بڕوایان وانیە کە لە جیهانی مردواندا پاداشت و سزا ببەخشرێنەوە. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بیروباوەڕی سزاو پاداشت لە دوای مردن، خۆی دەبینێتەوە لە ڕۆڵی ئاراستەکاری دەروونی لە ئاست هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ، لەو ساتانەی کە مرۆڤەکە سەرپشکە لەوەی ئەو کارە یاخود کارێکی تر بکات، ئەوا ئەو شتەی ڕوون کردۆتەوە کە مرۆڤ پێویستە خۆی لێ دوور بگرێت. ئەم بیروباوەڕەی دانیشتوانی دۆڵی ڕافدین ئەوانی دابڕیوە لە هەموو دەستەبەرکارو گرەنتیەك بەوەی هێزی خراپە و ئاشوب تێکبشکێت و بە ویژدانەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ ستەم لێکراوان بکرێت، پاداشتی چاکەکاران بدرێتەوە لە ژیانی تر لە جیهانی خواروو "قۆناغی مردن و دواتری[٢]"، لەبەر ئەمە ژیان لەسایەی شارستانیەتی دۆڵی ڕافدین بەهەموو قۆناغەکانیەوە کۆمەڵێك لە شەپۆلی دوودڵی و گومان و پرسیاری بێزارکەری نەزۆکی لەخۆ هەڵگرتبوو، سەرباری ئەوەی کە جۆرێك لە هەست کردن بە تێکشکانیان لەلا

---

[١] سەرچاوەی پێشوو ١٤٢-١٤٣.

[٢] وەرگێڕ.

دروست ببوو[1].

دەقە بزمارییەکان بەشێوەیەکی ئاشکرا ئەو لایەنە دەخەنەڕوو.

## ٢- لەلای میسرییە کۆنەکان:

میسرییە کۆنەکان ساڵی ٢٦٠٠ پ.ز یاخود پێش ئەو کاتەش، بڕوایان بە ژیانێکی تـر لە دوای مردن هەبوو، بەندە بەپێی کردەوەکانی سـزاو پاداشـتی خـۆی وەردەگرێـت، ئـەم بیروباوەڕەش تایبەت نەبوو بە چینی کاهینەکان بەڵکو لـە ناوەنـدەکانی گەلیشـدا بـوونی هەبوو.

خوا لێخۆشبوو (عەبدولقادر حەمزە پاشا) لە کتێبەکەیدا (على هامش التأريخ المصرى القديم) لەبارەی ئەو ماوەیە دەڵێت:

(لەو کاتەدا پەرستنی "ئوزریس" بـەردەوام بڵـاودەبووەوەو دەچـووە حاڵەتێکـەوە کـە ببێتە پەرستشی تەواوی گەل.... جا بنەمای یەکەمی پەرستنی "ئـوزریس" ئەوەیـە کـە هەر مرۆڤـێك - پادشا بێت یاخود کەسێکی ئاسـایی - بەرپرسـە لـە دوای مـردن لـەو کردەوانەی کە لە دونیادا ئەنجامی داوە لە بەرامبەر دادگای خوایی کـە داداگاییکردنەکـە خودی "ئوزریس" خۆی بەڕێوەی دەبات، لە پرۆسەی ئەم دادگایی کرنەدا ئـەم خواوەندانـە یارمەتی خواوەند "ئوزریس" دەدەن: "توت" خواوەنـدی دانـایی و زانسـت، "ئنـوبیس" بەڕێوبەری ناشتنی مردووەکان و ڕێبەری ڕۆژی دوایی مردووەکان، "حـوریس" کـە کـوڕی "ئوزریس" و "ئیزیس"ە، "معات" خواوەندی ڕاستی و دادپەروەی و چـل و دوو دادوەری تر یارمەتی دەدەن.

ئینجا ئەگەر دادگا بڕیاریدا کە چاکەکانی مردوو زیاترن لە خراپەکانی، ئەوا مردووەکە پاداشت دەدرێتەوە بە خۆشـگوزەرانی هەمیشـەیی، وەك خواوەنـد "أوزریـس"ی لێـدێت.

[1] سەرچاوەی پێشوو ١٤٤-١٤٦.

بەڵام ئەگەر دادگاکە بڕیاریدا کە مردووەکە زۆر خراپەی کردووە لە ژیانیدا، ئەوا سزاکەی بریتیە لەوەی ببێتە خۆراکی دڕندە یاخود فڕێبدرێتە ناو ئاگر یان جۆرێکی تر لە جۆرەکانی سزای بەسەردا بچەسپێت)[1].

دواتر لە کتێبی (الموتی)[2]، لەبارەی ئەم لێپرسینەوەیە دەدوێت، کە بوونی هەبووە لە ڕۆژگارەکانی "دەوڵەتی ناوەڕاست"، جا ئەم بیروباوەڕەبە پوختی دەخاتەڕوو:

میسرییە کۆنەکان وێنەی جەرستەی ئەو لێ پرسینەوەیەیان دەکێشا، جا لە کتێبی (الموتی) و لەسەر دارەباز (تابوت) وێنەی دادگاکە و دادگاکردنەکە و تەرازوویان دەکێشا وەك ئاماژەیەك بۆ لێپرسینەوەکە. لەو دادگایەدا "ئۆزریس" لەسەر تەختەکەی دادەنیشێت و گۆپاڵ و قامچیەکەی بەدەستە و چل و دوو دادوەری خواوەندی لەگەڵدایە، لێرەدا پێویستە تێبینی ئەوە بکرێت کە میسر ئەو کات دابەش کرابوو بۆ چل و دوو هەرێم، وەك ئەوەی هەر دادوەرێك لەو چل و دوو دادوەرە نوێنەری یەکێك لەو هەرێمانە بێت، جا کە مردووەك دەهێنرێت "ئەنوبیس" وەریدەگرێت و دڵی دەردەهێنرێت، لە تایەکی تەرازووەکەدا دادەنرێت، لە تاکەی تری تەرازووەکەدا پەیکەری خواوەند "معات" یان "ریشتها" دادەنرێت، پاشان خواوەند "توت" لەلای تەرازووەکە ڕادەوستێت و لە دەستی ڕاستی پێنوسێك، لە دەستی چەپیشی تێنووس و تۆمارگەیەکی بەدەستە، دەرەنجامی تەرازووەکە لەو تۆمارگەیەدا دەنووسێت، دواتر بەرزی دەکاتەوە بۆ لای

[1] بەڵام لە کتێبی (دین المقارن - المحمود أبي الفيض" کۆچی دوایی کردووە") ٧١: میسرییەکان بڕوایان وابووە کە ئەگەر چاکەکانی مرۆڤ لە خراپەکانی زیاتر بوون ئەوا بەختەوەری هەمیشەیی دەست دەخات. بەڵام ئەگەر خراپەکانی زیاتر بوون ئەوا ئەو مرۆڤە دەگەڕێنرێتەوە بۆ سەر ڕووی زەوی، تا گوناهو تاوانەکانی ڕەش بکاتەوە لە ڕێگەی ئەوەی هەر جارەو ڕۆحەکەی بچێتە ناو جەستەی ئاژەڵ و زیندەوەرێکەوە تا دەگاتە بەرزترین پلەی بەدیهێنراوان ئەویش: پلەی مرۆڤە.
میسرییەکان بیروباوەڕی گیانگۆڕکێ (التناسخ)یان لە هندییەکان وەرگرتووە.

[2] کتێبی (الموتی) گرنگییەکی زۆری هەبووە، چونکە گومانیان وابووە کە یەکێك لە خواوەندەکان نووسیویەتی، بۆیە ئەوانیش پەرستشیان بەو کتێبەوە دەکرد و دەخرایە ناوگۆڕیان./ الأديان - د. رشدی عليان وسعدون الساموك: ٦٠.

"ئوزریس" کە نزیك لە "توت"ی دڕندە "ئەمابیت" ڕادەوەستێت، کە دڕندەیەکە سەری تیمساحی و جەستەی شێری هەیە، کە لە ئامادەباشیدایە بۆ ئەوەی مردووەکە قووت بدات کە بڕیاری قووتدرانی بۆ دەردەچێت، لە هەندێ وێنەدا ئاگر لە شوێنێکی تایبەتی دادگاکەدا هەیە، بۆ ئەوەی تاوانباران بخرێنە ناویەوە، دڵ لە تای تەرازوودا بریتیە لە نوێنەری ئەو کردەوانەی کە مردووەکە لە ژیانی دونیایدا ئەنجامی داوە، جا دڵەکە شایەتی دەدات لە سەر هەر چاکە و خراپەیەك کە مردووەکە ئەنجامی دابێت.

دواتر دەقی چیرۆکێکی کۆنی میسری چەسپا کە (لوجی جریفت)ی وێنەگر لە پەڕێکی بەردیندا دۆزیەوە، کە ئێستا لە مۆزەخانەی بەریتانیە، دەقەکە وەسفی بەسەرهاتی گەشتێك دەکات کە لاوێك بەناوی (سینوزیریس) لەگەڵ باوکی خۆی (ساتنی) ئەنجامی داوە، بۆ ئەوەی شێوازی لێپرسینەوەو سزاو پاداشت لە ڕۆژی دواییدا فێری کوڕەکەی بکات. ئەمەش بەڵگەیە کە لێپرسینەوە پەیوەندی نیە بە دەوڵەمەندی و هەژاری، هەروەها وەسفی چۆنیەتی چوونە خانەی لێپرسینەوەی مردوان دەکات، بۆ ئەم مەبەستە دەچنە ناو حەوت هۆڵی فراوانەوە، ئەو هۆڵانەش پڕن لە هەموو چین و توێژەکانی خەڵك، جا لەم هۆڵانەدا خەڵکێکیان بینی لە دواوەی خۆیانەوە گۆشتی گوێدرێژو کەر دەخۆن، خەڵکانێکیش هەڵپە دەکەن بۆ خواردەمەنی کە لە سەروویانەوە هەڵواسراوەو دەستیان پێناگات لەو کاتەی کە هەوڵی گەیشتن و هەڵپە دەکەن بۆ ئەو خواردنە چەند چاڵ لێدەر بن پێیان هەڵدەکەنن بۆ ئەوەی زیاتر دووربکەونەوە لە خواردنە هەڵواسراوەکە.

بینیان کەسێك لەبن دەرگا درێژکراوە لەسەر پشتی، ڕاگرو ستونی دەرگاکە لە چاوی ڕاستی ئەو پیاوەدا ڕاگیر کراوە، جا هەر کە دەرگاکە دەکرایەوە یان دادەخرا ئەوا ڕاگری دەرگاکە لەسەر چاوی پیاوەکە دەخولایەوە، ئەو دەرگایەش بەردەوام دەکرایەوەو دادەخرا، پیاوەکە لەبەر زۆری ئێش و ئازار هاواری دەرکرد.

پاشان چەند ڕۆحێکی باش و چاکیان بینی، کە هەر یەك لەو ڕۆحانە شوێنێکیان هەیە و تیایاندا نیشتەجێ دەبن، ئا لەوکاتە وێنەگری چاکە و خراپە هات لەسەر زمانی یەکێك

لە مردوان کە پاداشت و سزا بەوهۆیە دیاری دەکرێت، ئەمەش وەك وتارێك کە پێشـکەش بە خواوەند "ئوزریس" دەکرێت، بۆ بەرگری کردن لەو دەقەی کـە لـە کتێبـی (المـوتی)دا هەیە، دەڵێت:

(هاتم بۆ لای تۆ ڕاستیم بـۆ هێنـاوی و هەڵـە بـەدەر دەنـێم، خراپـە و سـتەم و دزیـم نەکردووە، بـە زۆرداری کەسـم نەکوشـتووە، دەسـتکاریی قوربانییـەکانم نـەکردووە، درۆم نەکردووە، فرمێسکی کەسم نەڕژاندووە، خۆم پیس نەکردووە بەشـتی ناپوخـت، گیانـدارە پیرۆزەکانم سەر نەبڕیوە، زەوییەکی چێنراوم بەفیڕۆ نەداوە، کەسم تاوانبار نەکردووە، ڕێگەم نەداوە تورەیی لە ڕاستی لام بدات، زینام نەکردووە، هەرگیز وشەی دادپەروریم فـەرامۆش نەکردووە، گومانی خراپم نەبردووە نە بەپاشا نە بە بـاوکم، ئـاوی پـاکم پـیس نـەکردووە، گەورەیەکم هان نەداوە تا بەخراپە هەڵسوکەوت بکات لەگەڵ کۆیلەکـەی، سـوێندم بـەدرۆ نەخواردووە، فێڵم نەکردووە لە تەرازوودا، شیرم نەگرتۆتەوە لە دەمی شـیرەخۆران، ڕێگـریم نەکردووە لە باڵندەکانی خواوەندەکان، ئاوم نەویستوە مەگەر لە پێویسـتیدا نـەبوو بێـت، سەرچـاوەی تێرئـاویم نەگرتۆتـەوە جگـە لـەخۆم، هـەرگیز ئـاگرێکم نەکوژاندۆتـەوە کـە هەڵکرانی پێویست بووبێت، بە خەیاڵمدا نەهاتووە سووکایەتی بکەم بەخواوەنـدەکان .... بەڕاستی من پاکم بەڕاستی من پاکم).

سەبارەت بە چۆنیەتی تێڕوانینیان بۆ سزا، پێشتر لایەنێکمان لەوبارەوە خستەڕوو.

جا تێڕوانینیان بۆ پاداشت بریتیە لە بـەرز بوونـەوە بـۆ ئاسمـان، دوای گەشـتێکی پـڕ مەترسـی، بـۆ مانـەوە لەگـەڵ خواوەنـدەکان یـاخود مانـەوە لەگـەڵ خواوەنـد (رع) لـە کەشتیەکەدا، ئەو کەسانەی ناودەبرێن بە ڕێز لێگیراو و شکۆدارکراو، ناوبراوان دەمێننـەوە لە کێڵگەی خواردەمەنیدا، خواردەمەنی خۆشی هەمەجۆر دەخۆن و ئەو خواردەمەنیە نوێ ئەبنەوەو بەفیڕۆ ناچن و نابڕێنەوە، تەندروسـتیان بـەردەوام باشـتر دەبێـت، ئـەمڕۆ باشـتر دەبێت لە دوێنێ و سبەینێ چاکتر دەبێت لە ئەمڕۆ، هەروەك ئاسمان (نوت) و ئەو مـارەش کە خۆر دەپارێزێت مەمکی خۆیان دەدەن بەو کەسـەی کـە بـەرز دەبێتـەوە بـۆ ئاسمـان و لەوێدا جێگیر دەبێت، بۆ ئـەوەی بـەهۆی شـیری ئاسمـان مارەکـە پێبگـات جـا هـەر کـە

شیرەکەی خوارد دەبێتەوە منداڵ[1].

## ٣- لە ئایینی زەردەشتی دا:

وێکچونێکی زۆر هەیە لە نێوان بیروباوەڕی زەرەشتی و میسرپیە کۆنەکان، لە بابەتی لێ پرسینەوەو دۆزەخدا، لە خوارەوەدا ئەمە ڕوون دەبێتەوە:

زەردەشتیەکان ڕایان وایە کە کاتێك کەسێك دەمرێت، ڕۆحەکەی سێ ڕۆژو شەو بە هەڵپەسێردراوی لەلای جەستەدا دەمێنێتەوە، ئەگەر جەستە خۆشی یان ناخۆشی بچێژێت ئەوا ڕۆحیش دەیچێژێت، لە بەرەبەیانی ڕۆژی چوارەمدا بایەك بەسەر جەستەکەدا هەڵدەکات: ئەو بایە یان بۆن خۆش، ئەگەر مردووەکە چاکەکار بوویێت یاخود بۆن ناخۆشە ئەگەر مردووەکە خراپەکار بوویێت، جا بایەکە ڕۆحەکە لەباوەشی خۆی هەڵدەگرێت و بۆ شوێنێك دەیبات: لەوێش یان بە کچێکی جوان و قەشنگ دەگات یاخود بە پیرەژنێکی ناشرینی سامناك، کە لە ڕاستیدا نەئەوەی یەکەم ئافرەتێکی جوانە و نە ئەوەی دووەم پیرەژنە، بەڵکو هەر دوو دیمەنەکە وێنەی کردەوەی مردووەکەن کە خۆی لەخۆیدا بریتیە لە ویژدانەکەی کە ڕێبەری دەکات بۆ سەر ڕێڕەوی لێ پرسینەوەو بڕیاری کۆتایی.

لەسەر دەرگای ڕێڕەوی لێپرسینەوەدا سێ دادوەر ئامادەن کە لەناویاندا (میتهرا)ش ئامادەیە، ئا لەوێدا تەرازوو دادەنرێت، کە لە تایەکی تەرازوودا چاکە و لەتایەکی تریدا خراپەکانی مردووەکە دادەنرێن، بەپێی هەڵکشان و داکشان و گرانی و سوکی تایەکانی تەرازوەکە بڕیار دەردەچێت لەسەر چارەنووسی مردووەکە.

بەر لە کۆتایی هاتنی کێشان و پێوان و دەرچوونی بڕیارەکە، فەرمان بەو کەسە دەکرێت کە لێ پرسینەوەی لەگەڵ کراوە بەسەر ڕێڕەوەکەدا بڕوات یاخود بەسەر ئەو پردەدا بڕوات کە بەسەر سەری دۆزەخدا درێژکراوە، جا ئەو پردە لە بەردەم چاکەکاران فراوان و

[1] مشاهد القیامة في القرآن ١٢-١٧ ئاماژەی کردووە بۆ کتێبی (علی هامش التأریخ المصري القدیم) هەروەها سەیری ئەم سەرچاوانەش بکە: الأدیان لا ٥٨ للدکتور رشدي علیان وسعدون الساموك. ومقدمة في تأریخ الحضارات القدیمة - طه باقر ٢/٩٦-١٠٠.

لەبەردەم خراپەکاران باریك دەبێت تا باریکتر لە موو و تیژتر لـە چـەقۆی لـیٚ دێـت، جـا ئەوانەی کۆتایی فڕێدەدرێنە ناو دۆزەخەوە کە زۆر تاریکە بە ئەندازەیەك دەتوانرێت دەست لەوتاریکییە بدرێت، ئینجا کە فڕێدرانە نـاو دۆزەخـەوە زۆر نارەحـەت دەبـن و ژمارەیـان ئەوەندە زۆرە وەك تۆپەڵە موێك وان لە نێوچەوانی ئەسپدا. سەرباری ئەمەش هەریەك لەو دۆزەخیانە لەناو ئەو قەرەباڵغیەشدا هەست بە تەنیاییەکی زۆر نـاخۆش و کەنارگیرییـەکی دڵکوژو تۆقێنەر دەکەن.

بەڵام کەسانی چـاکەکار دەچـنە نـاو ڕوونـاکی و نـوورەوە، لەوێـدا خواوەنـدی خێـر و بەدیهێنەری گەردوون (ئەهورا مـازدا) پێشـوازیان لـیٚ دەکـات، کـە خواوەنـدنی نـاوبراو پارێزەری گەردوونە لەو ئاشوب و خراپەی کە خواوەندی خراپە (ئەهریمەن) دەیەوێت بڵـاوی بکاتەوە، جا چاکەکارانە دوای ئەوەی ژیانیان بـەکاری چـاکەدا و گوفتـارو کـرداری خێـرو فیکر و هزری باشدا تێپەڕ کردووە بەو پلەیە دەگەن و لەپاڵ خواوەنـد (مـازدا)دا چـێژ لـە بەختەوەری هەمیشەیی وەردەگرن[1].

## ٤- لەلایەن یۆنانیە کۆنەکان:

بیروباوەڕی بڕوابوون بە ڕۆژی دوایی لە داستانی (ئۆدیسا)ی هومیروسـەوە سـەریهەڵدا، کە لە دەورووبەری سەدەی نۆیەمی پێش زاین ژیاوە، واش پیٚ دەچێت بڕوابـوون بـە ڕۆژی دوایی لە پێش (هۆمیرۆس)ەوە هەبووبێت، هەر بۆیەش داستانی ناوبراو، باسی بڕوابوون بە ڕۆژی دوایی لە خۆگرتووە.

هۆمیرۆس لەسەر زمانی (عولیس)، پاڵەوانی ئۆدیسەوە ئەوەی هێناوەو باسی کردووە، کە (عولیس) لە (هیدز: واتە: جیهانی خواروو و ژێر زەوی) خواوەند (مینـوس)ی بینیـوە لەسەر تەخت و عەرشەکەی دانیشتووە، گۆپاڵ و گۆچانە ئاڵتونییەکەی بەدەسـتەوە بـووە،

[1] مشاهد القيامة في القرآن ١٩-٢٠ ئاماژەشی کردووە بۆ کتێبی (الفلسفة الشرقية للدكتور محمد غلاب). هەروەها سەیری ئەم سەرچاوانەش بکە: الأديان للدكتور رشدي عليان وسعدون الساموك ١٢٩. و العقائد والأديان للدكتور محمد جابر عبدالعال ١٦٣ و قصة الديانات لسليمان مظهر ٣١٤.

مردوان کێشەکانی خۆیان بۆ خواوەندی ناوبراو دەخستەڕوو. کۆدەبوونەوە لەلای چەند دەرگایەکی زۆر گەورە، چاوەڕێی هاتنی نۆبەی خۆیانیان دەکرد، بۆ خستنەڕووی کێشەکانیان.

یەکێك لەو جۆرە وێنانەی سزا، کە (عولیس) بینیویەتی، ئەوەبووە کە شایەتیدەر (تیتوس)ی زۆرداری بینیوە، لەسەر زەوی ڕاکشاوەو بەشێوەیەك کە نۆ پارچە زەوی گەورەی داگرتبوو، لە هەر لا تەنیشتێکی شامارو ئەژدیهایەکی گەورە هەبوو، کە لە جگەرە خوێناوی و هەناوە تووندو تۆڵ و ئالۆزەکانی ناوبراویان دەخوارد، ئەمەش وەك سزایەك،لە بەرامبەر ئەو هەوڵەی کە دابووی بۆ کەمەند کێش کردنی (لاتونا) کچە عاشق و خۆشەویستەکەی خواوەندی گەورە.

تانتالوسی بینی کە دەگەوزێت لەناو ئاوێکی گەرمی بۆگەندا، لەو ئاوەدا ڕۆچوو بوو تا چەناگەکەی، شەپۆلی ئاوەکە لە دەموچاوی دەدا، لەگەڵ ئەمەشدا هاواری ئاوی دەکرد لەبەر زۆری تێنوێتیەکەی، لەسەر سەریشی درەختی میوە هەبوو، کە دەستی پێ نەدەگەیشت.

سیفوسیشی بینی کە بەردێکی مەزن پاڵدەدات، بۆ ئەوەی پێی بگاتە لوتکەی چیاکە، تا وای لێدێت بگاتە لوتکە لەناکاو بەردەکە بەردەبێتەوەو دەکەوێتە سەر زەوی دۆزەخ، ماندوێتی لە ئەندازە بەدەر زۆر شەکەتی کردبوو و پەکی خستبوو.

هێرقلی زۆرداری بینی، کە حوکمی لەسەر دراوە گوێڕایەڵ و خزمەتی کوڕە مامەکەی(یوریزوس) بکات[1].

هەروەها شاعر (بندار - لە سەدەی پێنجەمی پ.ز - ) لە چامەکەی (الأولمبیة الثانیة)دا دەڵێت:

گەورەکانی سەر زەوی دادوەرێك لە دۆزەخدا بەدی دەکەن، جا ئەوانەی کردەوەی حەرامیان ئەنجامداوە ئەوا خواوەند (ئەنانکی) دادگاییان دەکات.

---

[1] مشاهد القيامة في القرآن ٢١-٢٣ عن كتاب الأوديسة للأستاذ دريني خشبة.

سەرباری ئەوەی کە چۆنیەتی لێ پرسینەوەکەی ڕوون نەکردۆتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نزیك دەبێتەوە لە بیروباوەڕی میسرییەکان لەبارەی دادگەری لێ پرسینەوە.

ئەفلاتۆن (لە نێوان ساڵانی ٤٢٩ - ٤٢٧ پ.ز لە دایك بووە) دەڵێت: ئەگەر مردوان هاتنە بەردەم دادوەریان، ئەوا (ردامانت) کە برای (مینوس)ە بانگی مردووەکان دەکات بۆ ئەوەی لێی نزیك ببنەوە، پاشان پشکنین ئەنجامدەدات بۆ ڕۆحی یەکە یەکەیان بەبێ ئەوەی بزانێت ئەو پشکنینە بۆ کێیە.... ئەگەر ڕۆحێکی بینی کە پڕ بێت لە خراپە و پیسی و دوور لەڕاستی ژیابێت ئەوا ڕەوانەی بەندیخانەی دەکات، بۆ ئەوەی سزای شیاوی خۆی وەربگرێت، هەروەها (ردامانت) مردووە حوکم لەسەر دراوەکە ڕەوانە دەکات بۆ بنی دۆزەخ، دوای ئەوەی ناویان دەنێت بە پێی شیاویان بۆ پاك بوونەوەو پاك نەبوونەوە. سەبارەت بەو ڕۆحەش کە وای دەردەکەوێت لە پاکژی و ڕاستیدا ژیانی بەسەر بردووە، ئەوا دادوەرەکە دڵی خۆش دەبێت، ئەو ڕۆحە ڕەوانە دەکات بۆ دوورگەکانی بەختەوەری[1].

## ٥- لەلایەن ڕۆمانیەکان:

بەهەمان شێوە شاعیرو هونەرمەندی گەورەی ڕۆمانی (فەرجل: ٧٠-١٩ پ.ز) لە داستانەکەیدا (ألیاذة) باسی دیمەن و وێنەکانی لێ پرسینەوەی کردووە:

(ئینیاس)ی پاڵەوانی داستانەکە دەچێتە جیهانی خواروو، بۆ گەیشتن بە ڕۆحی باوکی خۆی (ئەنشیر) بۆ ڕاوێژ پێکردنی لەبارەی داهاتووی خۆی و نەوەکانی، جا لەگەڵ کاهینێك دادەبەزێت بۆ ناو ماڵی مردووەکان، کە پڕیەتی لە تارمایی "شبح" و ڕۆح، دواتر ڕووباری (سکتس) دەبڕن، ڕووبارێکە لە دۆزەخ، پڕە لە مارو گیانداری ترسناك، بە جیهانێکدا تێپەڕین کە هەمووی بریتی بوو لە بێ هیوای و بێ ئومێدی، لە کۆتاییدا بەباوکی گەیشت، باوکیشی باسی ئەوەی بۆ کرد کە پایەداری و سەربەرزییەکی زۆری بۆ نەژاد و

(١) مشاهد القيامة في القرآن ٢٧-٢٨ نقلاً عن (موري) ترجمة المرحوم عبدالقادر حمزة باشا.

نەوەکانی ئەوی نووسیوەو بڕیارداوە[1].

## ٦- لەلایەن هیندۆسییەکان:

هندۆسەکان بڕوایان بە ژیانێکی تر نییە کە سزاو پاداشتی تێدا بێت، بەڵکو بڕوایان بە (کارما) هەیە واتە: یاسای سزاو پاداشت، مەبەست لێی ئەوەیە کە:

هەموو ئەو کردەوانەی کە مرۆڤ سەرپشکە تیایدا، چاك بێت یاخود خراپ، ئەوا ئەو مرۆڤە لەسەر ئەو کردەوانەی بەهەر شێوەیەك بێت سزاو پاداشت وەردەگرێتەوە، بەپێی ڕێسای دادگەری یەکلاکەرەوە، ئەم سزاو پاداشتەش هەر لەم ژیانەدا دەبێت.

بەڵام کاتێك بینیان کە دەکرێت سزا یاخود پاداشت جێبەجێ نەبێت، ستەمکار دەمرێت و تۆڵەی لێ ناسەندرێتەوە، هەروەها چاکەکار دەمرێت بەبێ ئەوەی پاداشتی چاکەکەی وەربگرێتەوە، بۆیە ناچار بوون پەنا بەرنەبەر بڕواهێنان بە گیانگۆڕکێ (التناسخ).

جا گەڕانەوەی ڕۆح لە جەستەیەکی تردا بە (دووبارە لە دایك بوونیش) ناودەبرێت: گەڕانەوەی ڕۆح لە جەستەیکی تردا، دوای ئەوەی لە جەستەیەکەوە دەرچووەو بەرەو جیهانی خواروو ڕۆیشتووە.

هۆکاری گەڕانەوەی ڕۆح لە جەستەیەکی تردا، ئەوەیە کە ڕۆح کۆمەڵە ئارەزوویێکی تری هەیە کە نەهاتوونەتەجێ، کۆمەڵە قەرزێك لەسەر شانیەتی و پێویستە بیداتەوە، بۆیە پێویستە چێژی بەرهەمی کردەوەکانی بکات لە ژیانێکی تردا، واتە لە جەستەیەکی تردا، جا ئەگەر لەو جەستەیەدا چێژو تامی بەرهەمەکەی نەکرد ئەوا لە جەستەیەکی تردا دەبێت چێژی بکات، ئا بەم شێوەیە تا ئارەزوو و هەوەسەکە تەواو دەبێت و قەرزەکان دەدرێنەوە، جا ئەگەر ئەمە تەواو بوو، ئەوا ڕۆحی مردووەکە سەردەکەوێت و لە

[1] مشاهد القيامة في القرآن ٢٨ نقلاً عن (قصة الأدب في العالم) لأحمد أمين، و (عن أساطير الحب والجمال عند الاغريق) لدريني خشبة.

گیانگۆڕكێ (تناسخ)یش ڕزگاری دەبێت و ئاوێتە دەبێت لەگەڵ (براهما[1]).

جا ئەو شتە بەناوبانگانەی لای ئەوان سەری هەڵدا، كە بریتیە لە سزادانی جەستە بە ڕۆژوو،زۆر دونیا بەكەمگرتن، شەوبێداری، ئازاردانی دەروون و نەفس و ئەنجامدانی ئەزموونی سەخت بە نەفس، تا وا دەردەكەوێت كە كەسەكە زۆر خەیاڵ و خەفەت و ترسی هەیە و ڕەشبینە، هەموو ئەو شتانە لە پێناو ڕزگار بوونی ڕۆحی لە زاڵبوونی جەستەكەی، تا ڕۆحەكەی بەرەو كۆتایی بچێت، لەگەڵ (براهما) ئاوێتە ببێت[2].

## ٧- لەلایەن صابیئەكان:

صابیئە مەندائییەكان بڕوایان وایە مردن بریتیە لە دەرچوون لە جیهانێكی ماددی - كە وەك بەندیخانە، كۆت و بەندێك وایە بۆ ڕۆح - بەرەو جیهانێكی ڕۆحی، لەوێدا بۆ هەتا هەتایە دەمێنێتەوە، لێ پرسینەوەیەكی سەختی لەگەڵ دەكرێت، بەوەی كردەوەكانی مردووەكە دەپێورێن و دەكێشرێن، جا ئەگەر چاكەكانی زیاتر بوون لە خراپەكانی، ئەوا ڕۆحەكەی دەڕوات بەرەو جیهانی نوور (بەهەشت) و لەوێدا وەك قەشە و ڕۆحانییەكان خۆشی دەكات، ئەگەر تای تەرازووی خراپەكان گرانتر بوو ئەوا ڕۆحی مردووەكە دەبرێت

---

[1] مقارنة الأديان - أديان الهند الكبرى - د. أحمد شلبي ٦٢-٥٣ والأديان د. رشدي عليان وسعدون ساموك ٨٩.

هندۆسیەت:

ئایینی زۆرینەی هەرە زۆری خەڵكی ئێستای هیندە، بە هندۆكیەش ناودەبرێت، هەر لە سەرەتای سەدەی هەشتەمی پ.ز بە (بەرهەمیەت) ناودەبرا كە پاڵدەدرایە لای (برهما)، كە بریتیە لە هێزی هەرە مەزنی جادووگەری شاراوە، بۆ بەدەستهێنانی پێویستی بە پەرستشی زۆر و خوێندنەوەی نزاو هۆنینەوەی سرود و قوربانی كردن هەیە. وشەی (البراهمية) لە (بەراهما) داتاشراوە بۆ ئەوەی ببێتە هێما و نیشانەیەك بۆ پیاوانی ئایینی، ئەوانەی كە بڕوایەیان پێبراوە كە لە سروشتی خۆیاندا پەیوەندی دەكەن بە ڕەگەزی خواوەندی، بۆیە بە كاهینەكانی ئوممەتی هندۆسی ناونران، قوربانی بەبێ ئامادە نەبوونی بە دروست دانەدەنرا، بەڵكو دەبوایە بە ئامادەبوون و لەسەر دەستی ئەوان بووبایە./ أديان الهند الكبرى - د. أحمد شلبي ٣٩.

[2] أديان الهند الكبرى ٦٩ ومشاهدة القيامة ٢٥.

بەو پاکژکەرەوە لە جیهانی تاریکی (ئاگردا)، بەشێوەیەك کە ئازار دەدرێت بە پلەی جیاواز تا لە خراپەکانی پاك دەبێتەوە دواتر دەنێردرێتە جیهانی نوور[1].

## ٨- لەلایەن جولەکەکان:

جولەکایەتی لە کرۆکی خۆیدا جۆرێکی ژیانە، بیروباوەڕێك نییە کە بڕوای پێ بهێنرێت، تاکە ماوەی بریتییە لە جیهانی ئێستا نەك جیهانێکی دوای ئەو دونیایەیە.

کوهلەر لە (دائرة المعارف العبرية) دان بەوەدا دەنێت کە: جولەکایەتی بیروباوەڕێك نییە یان سیستەمێکی بیروباوەڕی نییە کە لەسەر قوربانیدان و ڕزگار بوون لە داهاتوودا وەستا بێت، بەڵکو جولەکایەتی بریتییە لە سیستەم و ڕێسای ڕەفتاری مرۆیی و یاسای چاك، کە لەسەر مرۆڤ بەهەموو شێوەیەك پێویستە شوێنی بکەوێت.

لەبەر ئەوەی جولەکایەتی ئایینی کردار بوو نەك ئایینی باوەڕو ئیمان، جولەکەکان لە کتێبەکانیاندا نەدواون لەسەر ژیانی ڕۆژی دوایی و زیندوو بوونەوەو لێ پرسینەوە، چونکە ئەو شتانە لەسەر بیروباوەڕ ئەوەستن، سزاو پاداشت لەلای جولەکەکان هەر لە ژیانی دونیادا تەواو دەبێت. بەڵام دوای ئەوەی فارسەکان - کە زەردەشتی ئایینیانە - وڵاتی (بابل) و هەر دوو دەوڵەتی جولەکەیان داگیر کرد، هەروەها دوای ئەوەی پادشای فارسەکان (قورش) مۆڵەتی دا بە جولەکەکان تا بگەڕێنەوە بۆ فەڵەستین و پەرستگاکانیان دروست بکەنەوە، ئەوا پەیوەندی باش لە نێوان جولەکە و فارسەکاندا دروست بوو، بەم هۆیە جولەکەکان بیروباوەڕی زەردەشتیان خوێند، لە ئایینی زەردەشتی بابەتی بڕوابوون بە ڕۆژی دواییان وەرگرت.

ئا لەو کاتەدا هەر دوو پێغەمبەر (ئەشیعا) و (دانیال) هەروەك لە (سفر دانیال)دا هاتووە دەستیان کردووە بە وەبیرهێنانەوەو باس کردنی زیندوو بوونەوەو لێپرسینەوەو سزاو

[1] الأديان للدكتور رشدي عليان وسعدون الساموك ١٨٧ والصابئون - الحرانين ومندائيين - للدكتور رشدي عليان.

پاداشت، بەڵام کاتێك جولەکەکان دەدوێن لەبارەی ڕۆژی دوایی، ئەوان مەبەستیان لە ڕۆژی دوایی ئەوە نییە کە ئایینەکانی تر مەبەستیانە، لەوەی مرۆڤ سزاو پاداشت لە دوارۆژدا وەربگرێتەوە لەسەر ئەو کردەوانەی لە دونیادا ئەنجامی داون، جولەکە لەلایەن لێکۆڵەران دوو بەشن:

أ- بەشێکیان ژیانی دونیایان گوزەراندووە بە بەختەوەری و ئازادانە، تا ئەوانە ڕەزامەندی لایەنی ماددی خواوەندەکەیان دەستەبەر کردووە.

ب- بەشەکەی تریان لەژێر زەبرو زەنگ یاخود لە شاربەدەرو دەربەدەریدا ژیاون، تا ئەو بەشانە مافیانە بگەڕێنەوە ژیان جارێکی تر، بۆ ئەوەی بەشە خۆشیەکەی خۆیان بەدەست بێنن.

دەستەیەك لە (فەریسینەکان هەوڵیاندا ئەو بۆچوونە هەڵبگرن و بڵاوی بکەنەوە، بەڵام ئەم هەوڵەی دەستەی ناوبراو ڕووبەڕووی نارەزایی و ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی توند بوونەوە، سەبارەت بە سەرجەم پێڕو دەستەکانی تری جولەکەکان هیچ شتێکیان لەبارەوە نەزانراوە[1].

## ٩- لەلایەن نەصرانیەکان:

نەصرانیەکان بڕوایان هەیە بە ڕۆژی دوایی و زیندوو بوونەوەی مردوان لە گۆڕەکانیاندا و لێ پرسینەوەیان لەسەر ئەو کردەوانەی کە لە دونیادا ئەنجامیان داون، بەڵام نەصرانیەکان دەڵێن ئەوەی لێ پرسینەوە دەکات عیسایە (سەلامی خوای لێبێت) هەروەها بەهەشت پاداشتی ئەو کەسەیە کە چاکە دەکات، ئاگری دۆزەخیش سزاو جێگای ئەو کەسەیە کە خراپە دەکات[2].

---

[1] الیهود د. أحمد شلبي ١٩٤-١٩٦.

[2] مشاهد القیامة ٣٣: باسیشی کردووە کە: ناتوانین جەخت بکەینەوە کە چ کاتێك ڕۆژی قیامەتە یاخود کەی هەڵدەستێتەوەو زیندوو دەبێتەوە دوای بەخاك سپاردنی دوای سێ ڕۆژ، هەروەك لە ئینجیلدا هاتووە.

نەصرانیەکان دەڵێن عیسا (سەلامی خوای لێبێت) هەڵساوە بە ڕەش کردنەوەی تاوانەکانی خەڵکی، ڕەشکردنەوەی تاوانیش بریتیە لە خاچ دران، بۆیە عیسا لە خاچ دراو خوای گەورەش بە لەخاچ درانەکەی ڕازی بوو سەرباری ئەوەی کوڕی خواشە، لەدوای لە خاچ درانی بە خاك سپێردرا، بەڵام سێ ڕۆژ دوای ناشتنی لە گۆڕەکەی هەڵسایەوەو هاتەدەر، ئینجیلەکان ڕایان جیاوازە لەبارەی ڕوون کردنەوەی تێرو تەسەلی بابەتی چۆنیەتی زیندوو بوونەوەو لە گۆڕ هەڵسانەوەکەی، ئینجیلی (مەتا) دەڵێت: لە (جلیل)، ئینجیلی (لۆقا) دەڵێت: لە (ئورشەلیم)، ئینجیلی (یوحنا) دەڵێت: لە (جولەکایەتی و جەلیلدا)، (میرقس)یش دەڵێت: لەناو قوتابیەکانیدا دەرکەوت)[1].

هەروەها وتویانە: عیسا دوای هەستانەوەی لە گۆڕەکەی تەنها چل ڕۆژ مایەوە، پاشان بەرز کرایەوە بۆ ئاسمان و لە تەنیشت باوکی دانیشت، باوکیش لێ پرسینەوە لەگەڵ هیچ کەسێك ناکات بەڵکو ئەو کارەی سپاردووە بە عیسای کوڕی، بۆیە لە ڕۆژی قیامەتدا عیسا (سەلامی خوای لێبێت) دێت و لێ پرسینەوە دەکات لەگەڵ خەڵکی. لێ پێچینەوە لەگەڵ هەر مرۆڤێك دەکات لەسەر ئەو کردەوەی ئەنجامی داوەو ئەو هزرەی بەخەیاڵیدا هاتووە، جا ئەگەر چاکەی یاخود خراپەی کردبێت ئەوا بەپێی کردەوەکانی پاداشت و سزا وەردەگرێت، شوێنی هەتا هەتایی بۆ ئامادەیە و هەرگیز دەسەڵات و موڵکی لەناو ناچێت.

لە ئینجیلی (یوحنا)دا هاتووە: (ڕاستی ئەوەیە کە پێتان دەڵێم عیسا کاتێك دێت، ئەویشئەو کاتەیە مردوان گوێبیستی دەنگی کوڕی خوا دەبن، جا گوێبیستان زیندوو دەبنەوە، لەبەر ئەوەی چۆن خوای گەورە لە زاتی خۆیدا ژیانی هەیە، بەهەمان شێوەش ژیانی خودی بە کوڕەکەی بەخشیوەو دەسەڵاتی لێ پرسینەوەی خەڵکیشی پێ بەخشیوە، چونکە کوڕی مرۆڤیشە. سەرتان سوڕنەمێنێ لە ئاستی ئەمەدا، چونکە کاتژمێرێك دێت کە هەموو مردوانی ناو گۆڕ گوێبیستی دەنگی عیسای کوڕی خوا دەبن، جا ئەوانەی

[1] محاضرات في النصرانية: أبو زهرة ١٠٥.

کردەوەی چاکەیان کردووە لە گۆڕەکانیان دێنە دەرو زیندوو دەبنەوە، ئەوانەش کردەوەی خراپەیان ئەنجامداوە لە گۆڕەکانیان دێنەدەرەوەو زیندوو دەکرێنەوە بەمەبەستی لێ پرسینەوە، من ناتوانم لەخۆمەوە هیچ شتێك بکەم، وەك چۆن گوێبست دەبم ئاوا لێپرسینەوەکە ئەنجام دەدەم، لێپرسینەوەکەم دادگەرانەیە، چونکە من داوای ڕەزامەندی خۆم ناکەم بەڵکو داوای ڕەزامەندی باوکم دەکەم کە منی ڕەوانە کردووە)[1].

❊❊❊❊❊❊

---

[1] سەرچاوەی پێشوو ١٠٧.

## دەروازەی سێیەم

## ڕۆژی دوایی لە ئایینی ئیسلامدا

یەکێك لە شتە سەلمێنراوەکان، لە ئایینی ئیسلامدا بریتییە لە باوەڕ بوون بە ژیانێکی تر دوای مردن، کە خەڵکی دوای مردن زیندوو دەکرێنەوەو لێ پێچینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت، لەسەر ئەو کردەوانەی پێشتر ئەنجامیان داوە، ئینجا بەپێی کردەوەکانیان پاداشت یاخود سزا وەردەگرن، جا ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکیان ئەنجامداوە ئەوانە بەهەشتی هەتا هەتاییان بۆ ئامادەیە، ئەوانەش کە بێ باوەڕ بوون و کاری خراپ پیشەیان بووە ئاگری دۆزەخیان بۆ ئامادەیە، کە بە سەختی سزای تووند وەردەگرن: ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ﴾ الزلزلة: ٧-٨. واتە: (جا ئەوەی بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك خێرو چاکەی ئەنجام دابێت دەیبینێتەوە. ئەوەش کە بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك شەڕو خراپەی هەبێت، دەیبینێتەوە).

### هۆی ناونرانی بەو ناوە:

بۆیە بە (ڕۆژی دوایی) ناونراوە، چونکە دوایین ڕۆژی دونیایە، بەو واتایەی لکاوە بەکۆتا ڕۆژی دونیا، چونکە ڕۆژێك نییە لە دونیا تا ببێتە کۆتا ڕۆژی دونیا.

هەروەها ناونراوە بە (قیامەت) لەبەر هەڵسانەوەی خەڵکی لە گۆڕەکانیان و ڕاوەستانیان لەبەردەم بارەگای خوا، هەروەها بەرپابوونی بەڵگەکانیان و بەڵگەی لەسەریان، نزیکەی سێ سەد ناوی هەیە[1].

---

[1] البجوري على الجوهرة ٢/٧٦.

## حوکمی بڕوابوون بە ڕۆژی دوایی:

بڕوابوون بە ڕۆژی دوایی بنچینەیەکە لە بنچینەکانی ئیسلام، کەسێ بڕوای پـێ نـەبێت بە یەکدەنگی زانایان بە بێ باوەڕ دادەنرێـت. قورئـانی پـیرۆز و سـوننەتی بـەپێز بـەتێرو تەسەلی دواون لەبارەی ڕۆژی دوایی، دیمەنەکانی قیامەت و ئەو شتانەی پێیەوە پەیوەستن، وەسفەکانی بەهەشت و دۆزەخ، تا وای لێهاتووە کـە دیمەنـە زینـدووەکانی ڕۆژی دوایـی و تایبەتمەندییـەکانی بەتـەواوی دەرکـەوتن، بەشـێوەیەك کـە دڵ لەبـەری تێـك دەشـکێ و لاشەکانیش مووچڕکەیان پێدادێت.

## ئەو ڕێگەیەی کە ڕۆژیی دوایی پێی سەلمێنراوە:

ئـەو هـەواڵ و وەسـفانە لـەبارەی ڕۆژی دوایـی دەچـنە چوارچـێوەی شـتە پـەنهان و غەیبیەکانەوە کە هیچ یەکێك پەیی پێنەبردووە، چونکە ڕوودانیان لە دوای مردنە.

لەبەر ئەمە ئێمە لە لێکۆڵینەوەکەماندا تەنها ئەو هەواڵ و وەسفانە وەردەگرین کەسەر لە دڵنیایی و یەقین دەردەکات، ئەم ڕێگەیەش بریتییە لە: قورانی پـیرۆز کـە فەرمایشـتی خوای پایەبەرزە، کە سەلماندمان هیچ شك و گومانێك لـە هـەواڵ و خەبەرەکانیـدا نییـە. هەروەها سوننەتی ڕاستی چەسپاوی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، کە لـە سـەر زمـانی پیرۆزی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) بۆمان هاتووە کە ڕاستگۆو ئەمیندارە لە گەیانـدنی ئەو هەواڵانەی لەلایەن خواوە پێی گەیشتووە.

ئەو فەرموودانەش فەرامۆش دەکەین کە لاوازن یاخود تانـەیان لێـدراوە. چـونکە ئـەم بابەتە تایبەتە بە بیروباوەڕ، ئەم ڕێگەیە کە دیاریمان کردووە تاکە ڕێگەیە کـە گومـان لـە ڕاستیەکەیدا نییە بۆ سەلماندنی بیروباوەڕمان لەبارەی ڕۆژی دوایی.

## ڕێگەی تێگەیشتن لەشتە شاراوەو غەیبیەکان و بڕوابوون پێیان:

بڕوابوون بە ڕۆژی دوایی بەشێکە لە بڕوابوون بە شتە پەنهان و غەیبیەکان کە پێویستە لێی دڵنیا بین، دەشکرێت کە ڕێگـەی تێگەیشـتن لـە ڕۆژی دوایـی نزیـك بکەینـەوە بـەم شێوەیەی خوارەوە:

١- پزیشك کوپێك ئاو لە دەستتدا دەبینێت و لەو ئاوە ورد دەبێتـەوەو پێـت دەڵێـت: ئەو ئاوە مەخۆرەوە چونکە پیسە و ژیانت دەخاتە مەترسـیەوە. تـۆش هـیچ لـە زانسـتی پزیشکی و تایبەتمەندییەکانی نازانی، بەڵام ئەوەندە هەیە کە پزیشکەکە شارەزایە.

٢- هەواڵدرا کە زانایانی ڕوانگە و گەردووناسی گیرانی مانگیـان دیـاریکردووە، لـە شەوێکی تایبەت یاخود هەڵگیرسانی بای تووند، لە ڕۆژێك لە ڕۆژەکان، تـۆش پێـت وایـە کە ئەو هەواڵە دڵگیرو ڕاستە و لە سەرچاوەیەکی فەرمیەوەیە.

بێگومان تۆ بڕوات بەمانە هەیە لەبەر دوو شت کە بریتین لەمانە:

أ- دڵنیایت کـە پزیشـکەکە شـارەزایە، هـەروەها زانایـانی ڕوانگـە و گەردووناسـی ڕاستگۆن لە ڕاگەیاندنی ئەو هەواڵە.

ب- دڵنیایت کە قسەی پزیشکەکە و هەواڵی زانایـانی ڕوانگـە ڕاسـتن و لەلایـەنێکی فەرمیەوە دەرچوون، کە گریمانەی درۆ هەڵناگرێت.

ئەو دوو شتانە ئەگەرچی لە شتە پەنهان و غەیبیەکانیشن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دڵنیـا بوویت لێیان و گومانت لە هیچ بەشێکی هەردوو هەواڵەکەدا نییە[1].

ئێمەش دوای بەڵگە هێنانەوەمان لەسەر بوونی خوای گـەورە، سـەلماندنی ئـەوەی کـە خوای گەورە خۆی پارێزەرو چاودێری بوونەوەرو گەردوونـە، بەڵگـەشمان خسـتەڕوو لەسـەر ئەوەی کە موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) بەڕاستی پێغەمبـەری خوایـە و ڕاسـتگۆیە لـەو هەواڵانەی کە لە خواوە بە بەندەکانی ڕادەگەیەنێت، بەشێوەیەك هەواڵەکەی گەیشتە پلەی دڵنیایی و یەقین کە گومان هەڵنەگرێت، ئا لەو کاتەدا ئێمەش دڵنیا بووین لەوەی کە ئـەو هەواڵانەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) داویەتی لەبارەی ڕۆژی دوایی ڕاست و دروسـتن،

---

[1] كبرى اليقينيات الكونية ٣٠٤-٣٠٥.

ئەگەرچی هەواڵەکان لەبارەی پەنهان و غەیبی بن و هەستەکان نەتوانن حوکمی لەسەر بدەن چ بە بوون یاخود نەبوون.

## بڕوابوون بە ڕۆژی دوایی دەرەنجامی بڕوا بەخوا بوونە:

مرۆڤ بڕوادار نابێت بە ڕۆژی دوایی تا بڕوای نەبێت بە خوای گەورە، بۆیە قورئانی پیرۆز لە چەندین شوێندا بەیەکەوە باسی کردووە:

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ ﴾ البقرة: ٨. واتە: (لەناو خەڵکیدا کەسانێك هەن کە دەڵێن: ئیمان و باوەڕمان بەخواو بە ڕۆژی قیامەت هێناوە "لە ڕاستیدا ئەوانە درۆ دەکەن" ئەوانە هەمیشە باوەڕدار نین).

هەروەها دەفەرموویت: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّۦنَ ﴾ البقرة: ١٧٧.[١] واتە: (بەڵکو کرداری چاك و کرداری باش بریتیە لەوەی کە ئادەمیزاد باوەڕی هێنا بێت بەخواو بە ڕۆژی دوایی و بە فریشتەکان و کتێبەکان و پێغەمبەران).

کەواتە بڕوا بوون بە ڕۆژی دوایی بەبێ باوەڕی تەواو هێنان بە خواو پێغەمبەرەکانی هیچ مانایەکی نییە.

بۆیە شتێکی بێ کەڵك و پوچە کاتێك گفتوگۆو دەمەتەقێ بکەیت، لەگەڵ کەسێك لەسەر ڕۆژی دوایی کەچی ئەو کەسە بڕوای بەخوا نەبێت، چونکە ئەو کاتە نمونەی تۆ وەك ئەو کەسەی لێ دێت کە هەواڵ دەدات بە کەسێك بەوەی مرۆڤ گەیشتۆتە سەر مانگ، کەچی کابرا نکۆڵی لێ بکات و نەزان بێت بەو شتە سەلمێنراوانەی کە زانستی گەردووناسی ئێستا پێی گەیشتووە.

[١] سەیری ئەم ئایەتانە بکە کە ڕۆژی دوایی و باوەڕ بەخوا بوونی بەیەکەوە هێناوە: البقرة ١٢٦، ٢٢٨، ٢٣٢، ٢٦٤، آل عمران ١١٤، النساء ٣٨، ٣٩، ٥٩، ١٦٢، المائدة ٦٩، التوبة ١٨، ١٩، ٢٩، ٤٤، ٤٥، ٩٩، النور ٢، العنكبوت ٣٦، الأحزاب ٢١، المجادلة ٢٢، الممتحنة ٦، الطلاق ٢.

جا ئەوەی دەمەتەقیّ دەکات لەبارەی ڕۆژی دوایی ئـەوا ئێمـە ئاراسـتەی دەکـەین بـۆ بەڵگە سەلمێنراو (قطعي)ەکان، لەسەر بوونی خواو توانا و سیفەتە تەواوەکانی، وەك پێشتر لە بەشی خواناسی لەسەری دوایین.

ئەگەر بوونی خواو بوونی پێغەمبەرایەتیمان بۆ سەلما، ئا لەوکاتەدا پێویست دەبێت کە زیندوو بوونەوەو لێ پرسینەوە هەبێت، بەپێی کردەوەکانی مرۆڤـــ پاداشـت و سـزای بـۆ ئامـــادە بکرێـــت، خـــوای مـــەزن دەفـــەرموویّت: ﴿ فَمَن يَعْـمَلْ مِثْقَـالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَـرَهُۥ (٧) وَمَن يَعْـمَلْ مِثْقَـالَ ذَرَّةٍ شَـرًّا يَـرَهُۥ﴾ الزلزلة: ٧-٨. واتە: (جا ئەوەی بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك خێرو چاکەی ئەنجام دابێت دەیبینێتەوە. ئەوەش کە بەقەدەر سـەنگی گەردیلەیەك شەڕو خراپەی هەبێت، دەیبینێتەوە). ئەگەر خوای گەورە پاداشـتی کەسـی و گوێڕایەڵ و سزای یاخی و گومڕابوو نەدات، ئەو کاتە ستەم دەدرێتە پاڵ خوا، ستەم کـردن بۆ خوا ئەستەمە.

***

## ژیانێکی تر

### پچڕانی کردار بەهۆی مردن:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویت: **(إذا مات الانسان انقطع عملُه اِلا من ثلاث: صدقة جارية، أو عِلْمٍ يُنتفع به، أو ولَدٍ صالح يدعو له)**[1] واتە: کاتێك کەسێك مرد دەستبەرداری هەموو کردارێك دەبێت، جگە لە سێ شت: خێرێکی نەبڕاوەو بەردەوام یان زانستێك کە سوودی لێ ببینرێت یاخود منداڵێکی باشی هەبێت و نزای بۆ بکات[2].

مردن ئەوەیە کە ژیانی دونیا و دوارۆژ لێك جیادەکاتەوە، بەم پێیە قۆناغەکانی ڕۆژی دوایی لە یەکەم ساتی جیابوونەوەی ڕۆح لە جەستە دەست پێدەکات.

ئا لێرەدا لەبارەی ئەو قۆناغانە بەشێوەیەکی زنجیرەیی دەدوێین، سەرەتا لە مردن و ئەو شتانەی پێیەوە پەیوەستن دەست پێدەکەین و باسی ئەو شتانە دەکەین کە لە دوای مردن دێنە پێش و ئەو دیمەنانەی بەرپا دەبن تا کۆتا بابەت کە بریتیە لە جێگیر بوونی مرۆڤ لە بەهەشت یاخود لە دۆزەخ.

### ئاکام خراپی، کردەوەکان پەیوەستن بە ئاکامەکانیانەوە

ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: **(إن الرجل ليَعملُ الزمنَ الطويل بعمل أهل الجنة، ثم يختم له عمله بعمل أهل النار، واِن الرجل ليَعمل الزمنَ الطويل بعمل أهل النار، ثم يختم له عمله بعمل أهل الجنة)**[3] واتە: پیاوی وا هەیە ماوەیەکی زۆر کارو کردەوەی بەهەشتیی دەکات، پاشان

---

[1] فەرموودەی: کاتێك کەسێك مرد... تاد: صحيح مسلم ٢٥ كتاب الوصية ٣ باب ما يلحق من الثواب بعد وفاته، رقم ١٦٣١ عن أبي هريرة (رضي الله عنه).

[2] دەقی کوردی ئەم فەرمایشتەم وەرگرتووە لە پوختەی سەحیحی موسلیم، و. لیژنەیەك، ٤٦٨. (وەرگێڕ).

[3] فەرموودەی: پیاوی وا هەیە ماوەیەکی زۆر کاروکردەوەی... تاد: صحيح مسلم ٤٦ كتاب القدر ١ باب كيفية خلق الآدمي في بطن أمه... ٢٥٦١ عن أبي هريرة رضي لله عنه.

کۆتایی کردەوەکەی بە کردەوەی دۆزەخی دێت. پیاوی وایش هەیە ماوەیەکی زۆر کاروکردەوەی دۆزەخیی دەکات پاشان کۆتایی کردەوەکەی بە کردەوەی بەهەشتی دێت[1].

هەروەها سەهلی کوڕی سەعد دەڵێت، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: **(إن العبد ليَعمل عمل أهل النار وانه من أهل الجنة، ويعمل عمل أهل الجنة وانه من أهل النار، وانما الأعمال بالخواتيم)**[2] واتە: بەندە هەیە کاری دۆزەخیی دەکات و لە بەهەشتییەکانە، بەندەش هەیە کاری بەهەشتیی دەکات کەچی لە دۆزەخییەکانە، بێگومان کردەوەکان پەیوەستن بە ئاکامەکانیانەوە.

**ئاکام خراپی بۆ ئەو کەسە دەبێت:**

١- کە سووره لەسەر گوناهی گەورە و خێرا دەڕوات بەرەو ئەنجامدانی شتی قەدەغە کراو، لەوانەیە ئەنجامدانی ئەو کارە خراپانە ببێتە پیشە و بەسەریدا زاڵ ببێت، تا بەر لەوەی تەوبە بکات و پەشیمان ببێتەوە مردن یەخەی دەگرێت، ئا لەو حاڵەتەشدا شەیتان فێڵی لێ دەکات.

٢- ئەو کەسەی لەسەر ڕێگەی ڕاست دەڕوات و دواتر دەگۆڕێت و لە ڕێبازی ڕاست لادەدات.

بۆیە زانایان وتویانە: (بە باوەڕو کردەوەو نوێژو ڕۆژوو هەموو ئەو شتانەی پێی لە خوای گەورە نزیك دەبیەوە سەرسام مەبە بەخۆت، چونکە ئەگەر ئەو شتە ناوبراوانە لە بەدەستهێنانی خۆشت بێت ئەوا دەبێ بزانی کە لە بەدیهێنانی خوای گەورەیە... جا هەرچەندە شانازی بکەین ئەوا وەك ئەوەیە شانازی بکەیت بە شتی جگە لەخۆت، کە

---

[1] دەقی کوردی ئەم فەرمایشتەم وەرگرتووە لە پوختەی سەحیحی موسلیم، و. لیژنەیەك، ٩١٦. (وەرگێڕ).

[2] فەرموودەی: بەندە هەیە کاری دۆزەخیی دەکات... تاد: صحيح البخاري ٨٤ كتاب القدر ٥ باب العمل بالخواتيم، رقم ٦٦٠٧ عن سهل بن سعد (رضي الله عنه).

ئەکرێت ئەو شتە چاکەیە کە هی خۆت نییە لێت بسەنرێتەوە لەو کاتەدا دڵت لە خێر بەتاڵتر دەبێت لە دڵی باڵندە، جا چەند مێرگ هەبوون و گەیشتوونەتە ئێوارە لە کاتێکدا گوڵەکانی درەوشاوەو پڕن، کەچی بۆ بەیانی هەمان مێرگ گوڵەکانی پووچ هەڵگەڕاون و بوونەتە پوش و پەڵاش.. بەندەش هەیە ڕۆژ بەڕێ دەکات و دڵی پڕەو درەوشاوەیە بە گوێڕایەڵی خوا، بەیانی دەکاتەوە بە تاوان و ستەمکردن و دڵ نەخۆشی)[1].

هەر لەبەر ئەمە خوای گەورە پەشیمانی و تۆبەی لەسەر بڕواداران فەرزو پێویست کردووە، تا ئاکامیان باش بێت و سەرەنجام بچنە بەهەشتەوە، بەندە نازانێت کەی ڕۆحی دەکێشرێت، چونکە مردن یەخەی گەورەو بچوك و تەندروست باش و نەخۆش دەگرێت بەبێ جیاوازی.

مادەم ڕاسپێردراو (مكلف)ە مرۆڤ پێویستە بەپێی شەرع دەست پێشخەربێت لە گوێڕایەڵ بوون بۆ خوا، چونکە مرۆڤ دەگاتە ئەو تەمەنەی کە ڕاسپێرران (تكليف) ئەوا پاداشت و سزا پەیوەست دەبێت بە هەر کردەوەو گوفتارێکی. گوێڕایەڵ بوون بۆ خوا ڕێگەی گەیشتنە بە (فیردەوس).

❊ ❊ ❊

[1] التذكرة في أحوال الموتى وأمور الآخرة – للقرطبي. مطابع مدكور بالقاهرة ٣٦-٣٨.

## تۆبە و پەشیمانی

تۆبە (توبـة) لە بنچینەی زمانەوانیدا: بریتییە لە گەڕانـەوە. دەوترێـت: (تـاب) واتـە: گەڕایەوە.

هەروەها لە زاراوەشدا: بریتییە لە گەڕانەوە لەو شتانەی کـە لـە شـەرعدا ناپەسـەندو نەخوازراون بۆ ئەنجامدانی ئەو شتانەی کە لەلایەن شەرعەوە پەسەندن[1].

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: **(إن الله يقبل توبة العبد ما لم يُغَرغـر)**[2] واتە: خوای گەورە پەشیمانی و تۆبەی بەنـدە وەردەگرێـت مـادام کەسـەکە نەگەیشـتبێتە سەرەمەرگ و حاڵەتی ڕۆح کێشان.

پەشیمانی و تۆبە: موسڵمانان کۆکن لەسەر ئەوەی تۆبە پێویست و فەرزە، بەم بەڵگانە:

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموویت: ﴿وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾ النـور: ٣١. واتـە: (کەواتـە هـەمووتان ئـەی ئیمانـداران بـەرەو لای خـواو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو بگەڕێنەوە بۆ ئەوەی ڕزگارو سەرفراز بن).

هـــەروەها دەفـــەرموویت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةً نَّصُوحًا﴾ التحـريم: ٨. واتە: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتـان هێنـاوە، ئێـوە بـە تەوبـە و پەشـیمانیەکی پوخـت و دڵسۆزانەوە ڕوو بکەنە خوا).

### مەرجەکانی تۆبە و پەشیمان بوونەوە:

١. بەدڵ پەشیمان بوونەوە لەو تاوانانەی ئەنجامی داوە.
٢. دەستبەجێ دەست هەڵگرتن لە گوناهو تاوان.

---

[1] الرسالة القشيرية، میسر ساڵی ١٩٥٧، ٤٥.

[2] فەرموودەی: خوای گەورە پەشیمانی و تۆبەی بەندە وەردەگرێت... تاد: سنن الترمذي: كتاب الدعوات، عن إبن عمر. و قال: حديث حسن غريب.

٣. بڕیاردان بەدڵ و سوربوون لەسەر ئەوەی کە نەگەڕێتەوە سەر ئەنجامدانی تاوانی لەوجۆرە.

٤. پەشیمان بوونەوەو دەست هەڵگرتن لە شەرم و ترسی خوا بێت، نەك لە شەرم و ترسی کەسێکی تر.

ئینجا ئەگەر هەر یەکێك لەو مەرجانە فەرامۆش بکرێن تۆبەکە دروست نییە[١]. بۆ نمونە: ئەگەر گوناهەکە فەرامۆش بکات بەبێ ئەوەی پەشمان ببێتەوە، ئەوا ئەو گەڕانەوەیەی بە تۆبەی شەرعی دانانرێت، هەروەها ئەو کەسەش کە پەشیمانە لە کردنی گوناهێك کە زیانی بۆ جەستەی ئەو هەبووە بەهەمان شێوە ئەمە بە تۆبە دانانرێت[٢].

ئەمەش بەو مەرجەی تاوانەکە لەنێوان بەندە و خوای پایەبەرز بێت، پەیوەست نەبێت بە مافی ئادەمیزادەکان.

ئەگەر تاوانەکە پەیوەست بوو بە مافی هەر ئادەمیزادێك، ئەو مەرجەش پێویستە جێبەجێ بکات، سەرباری چوار مەرجەکە: ئەویش ئەوەیە کە خۆی پاك بکات لە مافی خاوەن ماف، ئەگەر مافەکە پارەو ماڵ و سامان بوو ئەوە دەبێت بۆ خاوەنەکەی بگەڕێنێتەوە، ئەگەر تاوانێك بێت سنووری پێ بکەوێتە سەر پێویستە لەسەری جێبەجێ بکرێت یاخود داوای لێخۆش بوون دەبێت بکات، ئەگەر بە پاشە ملە باسی یەکێکی کرد بێت ئەوا دەبێت دەستی لێ هەڵ بگرێت[٣].

---

[١] التذكرة للقرطبي ٤٥-٤٧، و لە: الرسالة القشيرية ٤٥ ورياض الصالحين ١٨-١٩ مەرجی چوارەمی باس نەکردووە. سەیری بابەتی تۆبە بکە لەم سەرچاوانەش بکە: الأساس ١٩٢ ومشارق الأنوار ١/٣٤٤ والبعد الحضاري ٥٦٩.

[٢] كفاية الطالب الرباني ١/٦٤.

[٣] رياض الصالحين سەرچاوەی پێشوو.

جا سەبارەت بەم فەرمایشتە: (الندم توبة)[1] مەبەستی ئـەو فەرمایشـتە ئەوەیـە کـە مەزنترین بنچینەی تۆبەکردن پەشیمان بوونەوەیە بەدڵ. ئـەم فەرمایشـتە هاووێنـەی ئـەو فەرمایشتەیە کە پێغەمبـەر دەفـەرمووێت: (الحـج عرفـة)[2] مەبەسـتی ئـەو فەرمایشـتە ئەوەیە کە گەورەترین بنچینەی حەج عەرەفەیە، واتە: ڕاوەستان لە عەرەفە.

هەندێ لە زانا لێکۆڵەرەکان دەڵێن: تەنها پەشیمان بوونـەوە بەسـە، چـونکە پەشـیمان بوونەوە دەبێتە ڕێگر لە ئەنجامـدانی کـارە خراپـەکان، چـونکە شـتێکی نەسـتەمە ئـەوە ئەندازە بکرێت کەسێك لە حاڵێکدا پەشیمان بێت و لەهەمان کاتیشـدا سـووربێت لەسـەر ئەنجامدانی هەمان تاوان[3].

***

## مردن (الموت)

### پێناسەکەی:

مردن بریتی نییە لە نەبوونی ڕووت و لە ناوچوونی پوخـت، بـەڵکو بریتیـە لەپچـڕانی پەیوەنـدی ڕۆح بـە جەسـتەوەو لێکترازانـی و پەیـدابوونی بۆشـایی لـەنێوانیان، گـۆڕانی بارودۆخی هەر دووکیان بەهۆی جیا بوونەوەیان، ڕۆیشتنە لە قۆناغێکـەوە بـۆ قۆنـاغێکی تر[4].

---

[1] فەرموودەی: تۆبە پەشیمانییە... تاد: رواه أحمد وابن ماجه والحاكم في المستدرك والبخاري في التأريخ، عن إبن مسعود، والحاكم في المستدرك والبيهقي في شعب الإيمان، عن أنس. وهو صحيح/ الجامع الصغير ٢/١٨٩.

[2] فەرموودەی: حەج عەرەفەیە... تاد: رواه أحمد وأصحاب السنن الأربعة والحاكم في المستدرك والبيهقي في السنن، عن عبدالرحمن بن يعمر. وهو صحيح./ الجامع الصغير ١/١٥١.

[3] رسالة القشيرية ٤٥-٤٦. لەوانەیە مەبەستی لەو قسەیەی: (زانا لێکۆڵەرەکان) پێ جوینی بێت، الإرشاد ٤٠١.

[4] التذكرة ٤.

ڕۆح: تەنێکی سووك و ڕوونە، خودی خۆی زیندووە، بەشێوەیەك لەگەڵ جەستە تێکەڵـە وەك تێکەڵی ئاو لەگەڵ لاشەی درەختی سەوز، وەك شلە بـە هـەموو جەسـتەدا بـڵاوە[1]. هەر کە ڕۆح لە جەستە جیا دەبێتەوەو پەیوەندییەکەی دەپچڕێت لەگەڵیدا، ئەوا ناتوانێـت هەڵسوکەوت لە جەستەدا بکات، بەو واتایەی کاریگەری لەسەر جەستە نامێنێـت، لەبـەر ئەوەی ئەندامەکانی لاشە وەك ئامێرو ئامراز وان بەدەست ڕۆحەوە، کە ڕۆح چۆن بیـەوێت ئاوا بەکاریان دەهێنێت[2].

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموویت: ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِى لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَا ۖ فَيُمْسِكُ ٱلَّتِى قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ الزمر: ٤٢. واتـە: (هـەر خوایـە کـە گیانـەکان دەکێشـێت لەکاتی مردنیاندا، هـەروەها ئـەو گیانـەش کـە نـەمرد لـە خەوەکەیـدا هـەر خـوا بـۆی دەنێرێتەوە، جـا ئـەو کەسـەی کـە خـوا بڕیـاری مردنـی دابێـت ڕۆحەکـەی دەگرێتـەوەو ناگەڕێتەوە بۆ لاشەی، ئەو کەسەش کە ڕۆژی تەواو نەبووبێت دەینێرێتەوە بۆی تا کاتێکی دیاریکراو، بەڕاستی ئا لەو دیاردانەدا چەندەها بەڵگەو نیشانەی زۆر هەیـە بـۆ کەسـانێك کە تێفکرن و بیر بکەنەوە).

هـــەروەها دەفـــەرموویت: ﴿ وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ ۖ وَيُرْسِلُ عَلَيْكُمْ حَفَظَةً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لَا يُفَرِّطُونَ ﴾ الأنعام: ٦١. واتە: (ئەو زاتە دەسەڵاتداری بێ سنورە بەسەر بەندەکانیدا، چەندەها "فریشتەی" چاودێرو تۆمارکەر دەنێرێت بـۆ سـەرتان هەتا ئەو کاتەی مەرگ دێت و یەخە بەکەسێکتان دەگرێـت، ئـەو کاتـە ئـیتر "فریشـتە" ڕەوانەکراوەکانمان گیانی دەکێشن و لەکاتێکدا ئەوان لەکارو کردەوەی خۆیان کەمتەرخەمی ناکەن).

---

[1] شرح الجوهرة للباجوري نقلا عن النووي عن إمام الحرمين.

[2] رسالة في التوحيد والفرق العاصرة ١٠٠.

ڕۆح لــە جەســتە دەردەچــێت، لەکاتێکــدا کــە جەســتە لــە تــەواوترین بــارودۆخی تەندروستیدایە. ئائەمە ئەو پێناسـەیەیە کـە موسـڵمانان خسـتویانەتەڕوو و بڕوایـان پـێ هێناوە.

سەبارەت بەو پێناسانەش هەندێك کەس باسیان کردووە، کە گوایە مردن بریتییە لە:

أ- لەکارکەوتنی دڵ لە لێدان.

ئەم پێناسەیە دارِما و پوچەڵ بوویەوە لە چەند ساڵانی دواییدا، بـەهۆی چـاندنەوەی دڵ یاخود بەکارهێنانی دەزگای دەستکرد لە جێگەی دڵ.

ب- مردن بریتییە لە مردنی خانەکانی مێشك.

ئەمەش بەهەمان شێوە دارِما، لەوکاتەی نەخۆشخانەی زانکۆی (تۆکیۆ) ڕایگەیاند کە سەرکەوتووبووە لــە گێڕانــەوەی مێشــکی پیاوێــك بــۆ ژیــان، دوای ئــەوەی چـالاکیەکانی مێشکی بۆ ماوەی چەند مانگێك لەکار کەوتبوو[1].

هەموو ئەو لێکۆڵینەوانە شکستیان خواردو تێکشکان، کە هەوڵیان دەدا مردن بکەنـە شتێکی گوماناوی و ناڕاست، تەنها ئەو گریمانە مایەوە کە ڕۆژگارو زەمانە جەختی لەسەر کردەوە، ئەویش ئەوەیە کە مرۆڤــ لەهەر تەمەنێك و لەهەر کاتێك بێـت دەکرێـت مـردن یەخەی بگرێت هەتاکو (د. کارڵ) دوای پشـکنینی کێشـەکە و بـاس کردنـی ئـەو هەوڵـە جیاوازە شکست خواردوانەی لـەوبارەوە دراون وتـی: (مرۆڤـــ هــەرگیز بێـزار نابێـت لــە توێژینەوە لە بابەتی نەمری و هەرمان، بەردەوام بۆی دەگەڕێت، لەگەڵ ئەوەی کە هــەرگیز پەیی پێ نابات، جا پێکهاتــە جەسـتەییەکەی ملکەچـی چـەند ڕێسـایەکی دیـاریکراوە،

---

[1] یوم القیامة - عبدالرزاق، ط الشعب ١٩٦٩، ٦٠-٦٢. سەیری چەند پێناسەیەکی تریش بکە لە کتێبی: الاسلام یتحدی - وحید الدین خان، چ ٤، قاهرة، ٧٣.

مرۆڤ دەتوانێت ماوەی فسیۆلۆجی ئەندامەکانی جەستەی بوەستێنێت، تا مردن بۆ ماوەیەکی کەم دوابخات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز ناتوانێت بەسەر مردندا زاڵ ببێت).

لەبەر ئەمە (د. لنس بالنج) خاوەنی خەڵاتی (نۆبل) بۆ زانستەکان، دەڵێت: (مرۆڤ بە ئەندازەیەکی زۆر مەزن لە ڕووی تیۆریەوە نەمرە، خانەکانی جەستەی وەك ئامێر وان کە هەڵدەستن بەچاکسازی کردن بۆ نەخۆشیەکانی جەستەی و چارەسەرکردنی بەشێوەیەکی خۆکاری، ئینجا سەرباری ئەمەش مرۆڤ پیر دەبێت و دەمرێت، هۆکارەکانی ئەم دیاردەیە "کەمردنە[1]" هەروەك خۆی بە نهێنی ماونەتەوەو سەری زانایان لەئاستیدا سورماوە)[2].

**ئەوەی شوێن مردوو دەکەوێت بۆ سەر گۆڕەکەی، هەروەها چی لەگەڵیدا دەمێنێتەوە:**

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەمەی لەم دوو فەرمایشتەدا ڕوون کردۆتەوە:

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (**يتبع الميت ثلاثة، فيرجع اثنان، ويبقى واحد، يتبعه أهله وماله وعمله، فيرجع أهله وماله، ويبقى عمله**)[3] واتە: سێ شت دوای مردوو دەکەون، دوانی دەگەڕێنەوەو یەکیان دەمێنێتەوە، خانەوادەو سەروەت و سامانی دەگەڕێتەوەو کردەوەکانی دەمێنێتەوە.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (**إن مما يَلحق المؤمن من عمله وحسناته بعد موته: علماً علَّمه ونشره، وولداً صالحاً تركه، ومُصْحَفاً ورَّثه، أو مسجداً بناهُ، أو بيتاً لابن السبيل بناه، أو نهراً أجراه، أو صدقةً أخرجها من ماله في صحته وحياته يلحقُه**

---

[1] وەرگێڕ.

[2] الاسلام يتحدى ٧٣-٧٤ و سەیری وتەی (د. کارڵ) لە کتێبەکەیدا بەناوی: (الانسان ذالك المجهول ترجمة شفيق أسعد فريد لا ٢٠٩ في فصل الزمن الداخلي).

[3] فەرموودەی: سێ شت دوای مردوو دەکەون... تاد: صحيح البخاري ٨١ كتاب الرقائق ٤٢ باب سكرات الموت رقم ٦٥١٤ واللفظ له عن أنس بن مالك.
وفي صحيح مسلم: أول ٥٣ كتاب الزهد والرقائق ٢٩٦٠ عن أنس.

**من بعدِ موته)**[1] واتە: لەو شتە چاك و باشانەی کە لە دوای مـردن بـەدوای مردووەکـە دەکەون: زانستێکی فێری خەڵکی کردبێت و بڵاوی کردبێتەوە، منداڵێکی خواناسە لەدوای خۆی بەجێی هێشتبێت و،قورئانێك نوسیبێتەوەولەدوای خـۆی بـەجێی هێشـتبێ، یـاخود مزگەوتێك یان خانوێکی بۆ ڕێبواران دروست کردبێت یاخود ڕووبـارێکی ڕاکێشـابێت یـان سەدەقە و بەخشینێك کە لە حاڵەتێك بەخشـی بێـت کـە خـۆی هـەر زینـدوو بووبێـت و تەندروستی باش بووبێت، ئەمانە لەدوای مردن پێی دەگەن.

هیچ تێکگیرانێك نییە لەنێوان دوو فەرموودەکە، لەبەر ئەوەی:

أ- یان ئەوەتە واتای ژمارەکە بەڵگە نییە.

ب- یاخود سەرەتا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تەنها ئاگاداری ئەو شتە کراوە، کـە لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە، دواتر خوای گەورە ئاگاداری کردۆتەوە لەشتی زیاتر[2].

## هیوا خواستنی مردن

ئاواتخواستنی مردن بەهۆی هاتنی کارەسات بەسەر ماڵ و سەروەت و سامان و لاشەدا، قەدەغەیە:

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: **(لا يتمنيَنَّ أحدُكم الموتَ لضُرٍ نـزل به، فإن كان لا بد متمنياً فليقل: اللهم أحيني ما كانت الحياة خيراً لـي، وتـوفني إذا كانـت الوفات خيراً لي)**واتە: با هیچ کەسێك لە ئێـوە ئـاواتی مـردن نـەخوازێت، لەبـەر ئـەوەی تووشی بەڵایەك بووە، ئەگەر زۆر پێویست بوو ئـاوات بخوازێـت، ئـەوا بـا بڵێـت: خوایـە" ئەگەر ژیان چاکترە بۆم ئەوا بژێینە، ئەگەر مردنیش چاکترە ئەوا بم مرێنە[3].

---

[1] فەرموودەی: لەو شتە چاك و باشانەی کە لە دوای مردن بەدوای مردووەکە دەکەون... تاد: سنن ابن ماجة في المقدمة ٢٠ باب ثواب معلم الناس الخير رقم ٢٤٢ ١/٨٨، عن أبي هريرة (رضي الله عنه). و حسنه السيوطي في الجامع الصغير ١٥٠.

[2] دليل الفالحين ٣/٤٣٣.

[3] دەقی کوردی ئەم فەرمایشتەم وەرگرتووە لە پوختەی سەحیحی موسلیم، و. لیژنەیەك، ٩٣٣. (وەرگێڕ).

هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: **(لا يتمنين أحدكم الموت، اما محسناً فلعله يزداد خيراً، واما مسيئاً فلعله يَسْتَعْتِب)**.

جا ئەم فەرمایشتە پیرۆزەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم): **(فلعله يَسْتَعْتِب)**: (الاستعتاب) واتە داواکرن و هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە، ئەمەش تەنها بە تۆبە و پەشیمانی و دەست هەڵگرتن دەبێت لە تاوان و خراپە[1].

جا واتای فەرموودەکە ئەوەیە: با هیچ کەسێك ئاواتی مردن نەخوازێت چ ئەو کەسە باش یان خراپ بێت، ئەگەر کەسەکە ئیش و پیشەی چاکە بوو، با ئاواتی مردن نەخوازێت بەڵکو چاکەی زیاتر دەخاتە سەر چاکەکانی، بەمەش پاداشت و دەستکەوتی زیاتر دەبێت. ئەگەر کەسەکە خراپ بوو بەهەمان شێوە با ئاواتی مردن نەخوازێت بەڵکو پەشیمان دەبێتەوەو دەست لەو خراپەکارییەی هەڵدەگرێت و داوای ڕەزامەندی دەکات لە خوا بەڵکو ئەمەش دەبێتە هۆکارێك بۆ ڕەش بوونەوەی خراپەکانی کە ئەنجامی داون[2].

## دروستە نزای مردن بکرێت و ئاواتی مردن بخوازرێت لە ترسی فەوتانی ئایین:

ئەمانەش بەڵگەکانن:

١- خوای گەورە لەسەر زمانی یوسف (سەلامی خوای لێبێت) فەرموویەتی: ﴿تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ﴾ یوسف: ١٠١. واتە: (داواکارم کە بە موسڵمان بمرێنیت و بمخەیتە ڕیزی پاکانەوە و بمگەیەنیت بە کاروانی چاکەکاران).

---

[1] التذكرة للقرطبي ٤-٥.

فەرموودەی: کەستان با ئاواتی ئەوە نەخوازێت... تاد: صحيح البخاري، كتاب الدعوات ٣٠ باب الدعاء بالموت والحياة، رقم ٦٣٥١ بهذا اللفظ عن أنس (رضي الله عنه).

صحيح مسلم: ٤٨ كتاب الذكر والدعاء ...، ٤ باب كراهة تمني الموت لضر نزل به، عن أنس (رضي الله عنه).

فەرموودەی: کەستان با ئاواتی ئەوە نەخوازێت... تاد: صحيح البخاري ٩٤ كتاب التمني ٦ باب ما يكره من التمني، رقم ٧٢٣٥ عن أبي هريرة (رضي الله عنه).

[2] إرشاد الساري ١٠/٢٨٠.

قەتادە وتویەتی: هیچ پێغەمبەرێك و هیچ کەسێك جگە لە پێغەمبەر یوسف (سەلامی خوای لێبێت) ئاواتی مردنیان نەخواستووە، یوسف (سەلامی خوای لێبێت) کاتێك ئاواتی مردنی خواست کە خوای گەورە بەخشش و نیعمەتی زۆری پێدا و دەسەڵاتی گرتەدەست، ئەم ئاوات خواستنەشی لەوەوە سەرچاوەی ئەگرت کە ئاواتەخوازی گەیشتن بوو بە خزمەت پەروەردگار، بۆیە فەرمووی: ﴿رَبِّ قَدْ ءَاتَيْتَنِي مِنَ ٱلْمُلْكِ﴾ یوسف: ١٠١. واتە: (پەروەردگارا بەڕاستی تۆ پاشایەتیت پێ بەخشیم).

هەروەها وتراوە: یوسف ئاواتی مردنی نەخواستووە، بەڵکو ئاواتی مردنی لەسەر ئیسلام خواستووە، واتە: ئەگەر کاتی مردنم هات بە موسڵمانی بم مرێنە، ئەم وتەیە پەسەندە لەلایەن توێژەرەو ڕاڤەکاران لە لێکدانەوەی ئایەتەکە.

٢- خوای گەورە لەبارەی مەریم دەفەرموویت: ﴿يَٰلَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا﴾ مریم: ٢٣. واتە: (خۆزگە پێش ئەم حاڵەتە بمردمایە و وەك شتێکی بێ نرخ فرامۆش بکرامایە).

وتویانە: لەبەر دوو شت ئاواتی مردنی خواستووە:

یەکەم: ترساوە لەوەی گومانی خراپ بە دینداربیەکەی ببرێت، بەمەش لەکەدار ببێت و تووشی تاقیکردنەوەو ناخۆشی بکات.

دووەم: گەلەکە بەهۆی ئەوەوە بکەونە ناو کاری بوختان هەڵبەستینەوەو کاری زینای بدەنە پاڵی، ئەمەش هۆکاری لەناوچوونیانە.

٣- فەرمایشتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویت: **(لا تقوم الساعة حتى يمر الرجل بقبر الرجل، فيقول يا ليتني مكانه)** واتە: قیامەت بەرپا نابێت تا پیاو بەلای گۆڕی یەکێکی تردا دەڕوات، دەڵێت: خۆزگە لە جێگەی مردووەکە بووبام.

وتویانە: ئەمە هەواڵێکە لەبارەی ئەوەی ئەو بارودۆخە پێش دێت، بەهۆی سەختی ئەو بارودۆخە گەندەڵ و خراپەی ئایینی خەڵکی تیایدا ئەبێت و لە ترسی فەوتانی ئاینیان ئەمە دەخوازن، نەوەك لەبەر تووش بوونی مرۆڤ بە ناڕەحەتی لە جەستە یاخود بە فیڕۆچوونی سەروەت و ماڵ و سامان، ئەمەی ئەو واتایە ڕۆشنتر دەکات: ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم):

**(اللهم اِني أسألك فِعْلَ الخيرات، وترك المنكرات وحب المساكين، واِذا أردتَ في الناس فتنة، فاقبضني اِليك غير مفتون)**[1]. واتە: خوایەگیان" داوات لێ دەکەم یارمەتیدەرم بیت لە ئەنجامدانی کاری چاکدا، وە خۆ دووگرتن لە خراپەکان و خۆشویستنی هەژاران، ئەگەر ویستت ئاشوب بڵاو ببێتەوە لەناو خەڵکی و ئەوا بم مرێنە و بم گێڕەوە بۆ لای خۆت بە سەلامەتی.

※※※

## ژیانی ناو گۆڕ (البرزخ)

### پێناسە:

**گۆڕ ( البرزخ ) لە زمانەوانیدا:** بەهەر بەربەستێك دەوترێت کە لە نێوان دوو شتدا هەبێت، لە ئایەتی پیرۆزیشدا هاتووە: ﴿بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ﴾ الرحمن: ٢٠. واتە: (لە نێوانیاندا بەربەستێك هەیە نایەڵێت تێکەڵ ببێت).

---

[1] التذكرة للقرطبي ٦-٧.

فەرموودەی: قیامەت هەڵناسێت تا بەندە تێپەڕ نەبێت... تاد: رواه مالك في الموطأ، جامع الجنائز./ تنوير الحوالك شرح موطأ إبن مالك ١٨٧/١، عن أبي هريرة (رضي الله عنه).

فەرموودەی: خوایەگیان داوات لێدەکەم یارمەتیدەرم بیت بۆ ئەنجامدانی کاری چاکە... تاد: رواه مالك في الموطأ، القرآن، العمل في الدعاء/ تنوير الحوالك ١/ ١٧٠.

**گۆڕ ( البرزخ ) لە زاراوەدا:** بەربەست و قۆناغی نێوان دونیا و ڕۆژی دواییە. خوای پایەبەرز دەفەرموویت: ﴿وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾[1] المؤمنون: ١٠٠. واتە: (بەڵکو دەبێت لە جیهانی بەرزەخدا، لە نێوان مردن و زیندوو بوونەوەدا تا زیندوو دەکرێنەوە چاوەڕێ بێت).

## گۆڕ یەکەم قۆناغە لە قۆناغەکانی ڕۆژی دوایی

گۆڕ (قبر)، تاکە. کۆیەکەیشی (القبور)ە، واتە: ژمارەیەکی زۆری گۆڕ. (أَقْبُر) کۆی کەمینەیە، بە شوێنی ناشتنی مردوان دەوترێت گۆڕستان (مقبر، مقبرة)[2].

## پرسیارو وەڵامی ناو گۆڕ:

مەبەسەت لە پرسیارەکانی ناوگۆڕ ئەوەیە: خوای گەورە ئەو بەندەیەی کە لە ژیانی دونیادا ڕایسپاردبوو، زیندووی دەکاتەوە، هەر لەگۆڕەکەیدا ژیانی بۆ دەگەڕێنێتەوە، هەروەها تا ئەو ئەندازەیەش ژیری بۆ دەگەڕێنێتەوە بەوێنەی پێشتر کە لەسەری ژیاوە، تا لەو پرسیارانە بگات کە ئاراستەی دەکرێن و وەڵامیان بداتەوە، هەروەها لە بەخشش‌ەکانی خوای گەورە تێبگات و لەوەش کە چی بۆ ئامادە کردووە لە گۆڕەکەیدا چ ڕێزو حورمەت یاخود ناخۆشی و چەرمەسەری[3].

بەڵگەی زۆرهەن، لەسەر سەلماندنی پرسیارو وەڵامی ناوگۆڕ، بۆ نمونە:

١- **پێغەمبەری خوا** (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویت: **(المسلمُ اِذا سئل في القبر، يشهد أن لا اله الا الله، وأنَّ محمداً رسول الله)** واتە: ئەگەر لە گۆڕدا پرسیار لە موسڵمان کرا، ئەوا

---

[1] بڕوانە ئەم سەرچاوانە: النهاية لابن الأثير مادة (البرزخ)، ولوامع الأنوار البهية للسفاريني ٢/٤. الروح لابن القيم ٧٣ و ١٠٨.
[2] لوامع الأنوار البهية ٢/٤ والتذكرة للقرطبي ٨٨.
[3] التذكرة للقرطبي ١٢٤.

لەوەڵامدا شایەتمان دەهێنێت. ئا ئەمە مەبەستی فەرمایشتی خوای گەورەیە: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ﴾ إبراهيم: ٢٧. واتە: (خوای گەورە ئەوانەی باوەڕیان هێناوە پایەداریان دەکات لەسەر گوفتاری بەجێ و دروست لە ژیانی دونیادا، لە سەرە مەرگ و لە قیامەتیشدا) بخاری هێناویەتی.

موسلیمیش گێڕاویەتیەوەو ئەمەشی تیایدا هاتووە: لە (برائی کوڕی عازب) ئەویش لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) گێڕاویەتیەوە، فەرموویەتی: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ ﴾ إبراهيم: ٢٧. لەبارەی سزای ناو گۆڕ دابەزیوە، پرسیاری لێ دەکرێت: کێ پەروەردگارتە؟ دەڵێت: پەروەرگارم خوای گەورەیە، پێغەمبەرم موحەممەدە (صلى الله عليه وسلم). ئا ئەمە مەبەستی فەرمایشتی خوای گەورەیە: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ﴾ إبراهيم: ٢٧.

٢- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: **(إنَّ العبدَ اذا وُضِع في قبره، وتولَّى عنه أصحابُه، وانه ليَسمعُ قَرْعَ نِعالهم، أتاه مَلَكان فيُقْعِدانه، فيقولان: ما كنتَ تقول في هذا الرجل لمحمد** (صلى الله عليه وسلم)**؟ فأمَّا المؤمنُ فيقول: أشهدُ أنه عبدُالله ورسوله، فيُقال له: انظر الى مَقْعَدك من النار، قد أبدلك الله به مَقْعَداً من الجنة، فيراهما جميعاً. وأما المنافق والكافر، فيقال له: ما كنتَ تقول في هذا الرجل؟ فيقول: لا أدري، كنتُ أقول ما يقولُ الناس. فيقال: لا دَرَيْتَ ولا تَلَيْتَ. ويُضربُ بمطارق من حديد ضربةً، فيصيح صيحةً يسمعُها مَن يليه غيرَ الثَّقَلَيْن)**[1] واتە: کاتێك بەندەیەك دەمرێت لە گۆڕەکەیدا دادەنرێت و

[1] بۆ بەڵگەکانی پرسیارو وەڵامی ناو گۆڕ، سەیری ئەم سەرچاوانە بکە: لوامع الأنوار البهية ٢/٥ والروح ٥٣-٥٤.

فەرموودەی: موسڵمان کە ناو گۆڕ پرسیاری لێ کرا... تاد: صحيح البخاري ٦٥ كتاب التفسير - سورة إبراهيم ٢ باب ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾ إبراهيم ٢٧، رقم ٤٦٩٩، عن البراء بن عازب.

وفي صحيح مسلم، ٥١ كتاب الجنة ١٧ باب عرض مقعد الميت رقم ٢٨٧١ عن البراء بن عازب.

فەرموودەی: ئەگەر بەندە خرایە ناو گۆڕی... تاد: صحيح البخاري ٢٣ كتاب الجنائز ٨٦ باب ما جاء في عذاب القبر ١٣٧٤ بهذا اللفظ عن أنس بن مالك.

پاشان هاوڕێکانی پشتی تێدەکەن و بەجێی دەهێڵێن. ئەو ئاگادارە پێیان تەنانەت گوێی لە شەقەی نەعلەکانیشیانە (تەقەی پێڵاوەکانیان) لەو کاتەدا دوو فریشتە دێن بۆ لای و دایدەنیشێنن و پێی دەڵێن: تۆچی دەڵێی دەربارەی ئەو پیاوە (موحەممەدە) (صلى الله عليه وسلم)؟

باوەڕدار دەڵێت: شایەتی دەدەم کە ئەو پیاوە بەندەی خواو پێغەمبەری خوا بووە، پێی دەڵێن: دە تەماشای شوێنەکەی خۆت بکە لە ئاگردا، کە چۆن خوا بۆی گۆڕیویت بە شوێنێك لە بەهەشتدا. پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: هەر دوو فریشتە دەبینێت.

بە مرۆڤـی بێ باوەڕ یاخود ناپاك و دووڕو دەوترێت: چی دەڵێی دەربارەی ئەو پیاوە (موحەممەد)؟، دەڵێت: نازانم، منیش هەر ئەوەم دەوت کە خەڵکی دەیان وت: پێی دەڵێن: دەی هەر نەزانیت و زمانت گۆ نەکات، پاشان چەکوشی ئاسنین دەکێشن بە پشتی سەریدا،ئیتر هاوارو قیژەیەکی وادەکات هەموو ئەوانەی دەورووبەری دەیبیستن بێجگە لە مرۆڤ و جنۆکە.

## حوکمی بڕوابوون بە پرسیارو وەڵامی ناو گۆڕ:

بڕوابوون پێی پێویست و فەرزە، ئەمە مەزهەبی زۆربەی زانایانە[1].

## ناخۆشی و سزای ناو گۆڕ:

ئەندێشە کردنی خۆشی و ناخۆشی ناو گۆڕ:

زۆربەی زانایان وتویانە: ئێمە بڕوامان هەیە بە سزای ناو گۆڕ، هەروەك لە هەواڵ و خەبەرەکان ئاماژەی بۆ کراوە، خوای گەورە چۆن بیەوێت ئاوا خۆشی یان ناخۆشی بە بەندەکە دەدات لە ناو گۆڕ، ئەم پرۆسەیەش لەبەرچاوی ئێمە ون و پەنهان بکات.

---

وفي صحيح مسلم ٥١ كتاب الجنة ١٧ باب عرض المعقد الميت....، رقم ٢٨٧٠، عن أنس بن مالك.

[1] شرح عبدالسلام على الجوهرة ٢٢٠.

تەنانەت ئەگەر مردوو لەناو ئێمەشدا دابنرێت، ئەوا ئەمــە نابێتــە ڕێگـر، لـەوەی دوو فریشــتە بێنــە لای و پرســیاری لــێ بکــەن و ئــەویش وەڵامیــان بداتــەوە، بــەبێ ئــەوەی ئامادەبوان هەستی پێبکەن[1].

عەقڵ ناتوانیت پەیی ببات بە چۆنیەتی گەڕانەوەی ڕۆح بۆ ناو جەستە و چۆنیەتی سـزا و خۆشی ناو گۆڕ، چونکە عەقڵ لەبارەی ئەو دونیا هــیچ زنیـاری و ئــەزموونێکی نییــە، پێغەمبەرانیش شتێك ناهێنن کە لەلایەن عەقڵ و ژیرییەوە ئەستەم بێت، بەڵکو لەوانەیــە شتێك بێنن کە عەقڵ پێی سەرسام بێت[2]، ئەو هەواڵانەی کە پێغەمبەران هێناویانــە دوو بەشن:

أ- ئەو هەواڵانەی کە عەقڵ و فیترەتی سەلامەت و تەندروست شایەتی لەسەر دەدەن.

ب- ئــەو هەواڵانــەی کــە عــەقڵ پــەییان پــێ نابــات وەك هــەواڵ و شــتە پــەنهان و غەیبیەکان.

هەر هەواڵێك گومانی ئەوەی پێبرا کە عەقڵ بە ئەستەمی ئەزانێت و ڕەتی دەکاتــەوە، ئەوا لە دوو حاڵەت دەرناچێت:

أ- یان لە نەقڵ کردن و گواستنەوەی هەواڵەکە هەڵە هەیە.

ب- یان عەقڵەکە گەندەڵە، لەو کاتەدا گومانەکە خەیاڵی و بێ بنەمایــە و نرخــی بــۆ دانانرێت[3].

زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە جۆرێك لە ژیان بــۆ مــردوو دەگەڕێنێتــەوە بەو ئەندازەیەی کە خۆش و ناخۆشی بچێژێت، قورئانی پیرۆز و هەواڵەکان و شوێنەوارەکان گەواهی دەدەن لەم بارەوە[4].

---

[1] التذكرة للقرطبي ١٢٦ وإحياء علوم الدين للغزالي ١/١١٩ و٤/٤٨٥.

[2] شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٥٧٨.

[3] الروح ٦٢، لوامع الأنوار البهية ٢/ ٢١ نقلاً عن الروح.

[4] شرح المقاصد للتفتازاني ٥/١١٧.

## چوونی فریشتە بۆ ناو گۆڕ:

دروستە تەئویلی چوونی فریشتە بۆ ناو گۆڕ بکەین، بەوەی فریشتە ئاگاداری بارودۆخی حاڵی مردووی ناو گۆڕە، لە دوورەوە فریشتەکان پەیی ببەن بە بارودۆخی ناو گۆڕەکە، بەبێ ئەوەی بچنە ناو گۆڕەکە یاخود نزیك بن لە گۆڕەکە.

لەبەر ناسکی ئەندامەکانی لاشەی فریشتەکان شتێکی دروستە بچێتە ناو گۆڕو بە مردووەکان بگەن بەبێ هەڵکەندنی گۆڕەکەکان. دروستیشە فریشتە گۆڕەکان هەڵبکەنن، دواتر خوای گەورە بارودۆخی گۆڕەکە بگەڕێنێتەوە بۆ هەمان وێنەی پێشووی، بێ ئەوەی دانیشتوانی دونیا پێی بزانن. دروستیشە کە فریشتەکان بچنە ناو گۆڕەکانەوە لە چەند ڕێگەو تونێلێکەوە کە مرۆڤ پەییان پێ نەبات[1].

ئیبن قەییم دەڵێت: گەورەترین نەفامی و نەزانی ئەوەیە کە بەدوور بزانرێ فریشتە زەوی و بەرد لەت و پەت بکات، کەچی زەوی و بەرد بۆ فریشتە وەك هەوایە بۆ باڵندە[2].

## گۆڕ؛ یان مێرگێکە لە مێرگەکانی بەهەشت یاخود چاڵێکە لە چاڵەکانی دۆزەخ:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: **(انما القبر روضة من رياض الجنة أو حفرة من حفر النار)** واتە: بەڕاستی گۆڕ" یان مێرگێکە لە مێرگەکانی بەهەشت یاخود چاڵێکە لە چاڵەکانی ئاگری دۆزەخ. ئەم فەرمایشتە خۆشی و ناخۆشی ناوگۆڕ ڕوون دەکاتەوە.

هەروەها پێویستە بزانرێ کە خۆشی و ناخۆشی ناو گۆڕ لە هەمان ڕەگەزی خۆشی و ناخۆشی دونیا نین، خوای گەورە توانای هەیە کە گڵ و خۆڵ و بەردەکانی ژێرو ژووری مردووەکە گەرم بکات بەشێوەیەك کە گەرمتر بێت لە پشکۆی ئاگری دونیا، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر دانیشتوانی دونیا دەست لەو گڵ و خاك و بەردە بدەن هەست بەو گەرمییە نەکەن، بەڵکو لەوە سەرسامتر ئەوەیە کە دوو پیاو لە تەنیش یەکتری دەنێژرێن، یەکێکیان

[1] التذكرة ١٢٦.

[2] الروح ٧٢.

لە مێرگێك لە مێرگەکانی بەهەشتدایە و ئەوەی تریان لە چاڵێك لە چاڵەکانی ئاگردایـە، نە گەرمی ئاگرەکە و نە خۆشییەکەی هیچ یەکێك لەو دوو مردووە دراوسـێیانە بـۆ یـەکتر ناچێت.

جا ئەگەر خوای گەورە ئـەوەی ئاشـکرا بکردایـە کـە لـە عەقڵـەکان شـاراوەیە، ئـەوا حیکمەتی سپاردنی مرۆڤــ (تکلیف) و بڕوابوون بە شتە پەنهان و غەیبیەکان نەدەما[1].

هەر کەسێك بە ئەندازەی شیاوی خـۆی خۆشـی و ناخۆشـی نـاو گـۆڕ دەچـێژێت، جـا مردووەکە نێـژرابێت یـاخود نەنێـژرابێت یـاخود دڕنـدەکان خواردبێتیـان یـان سـوتابێت، تەنانەت ئەگەر مردووەکە بووبێتە خۆڵەمێش و بە هەوادا بڵاوبووبێتەوە ئەوا خۆشی یاخود ناخۆشی بەوپێیەی شایەنیەتی دەچێژێت... [2].

ئەو هەواڵانەش کە لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) هاتوون لەبارەی دانیشـتاندنی مردوو، چوونە ناویەك و وێك هاتنەوەی پەراسـوەکانی و هاووێنـەی ئـەم هاوەڵانـە، ئـەوا پێویستە بەبێ زیـادەڕەوی و کـەمڕەوی لـە مەبەسـتی پێغەمبـەر (صـلی الله علیـه وسـلم) تێبگەین.. چونکە بەگشتی سێ قۆناغ هەن، هەر قۆناغێك حوکم و یاسای تایبەت بەخۆی هەیە، کە بریتین لەم قۆناغانە:

أ- قۆناغی دونیا و حوکمـەکانی لەسـەر جەسـتە، ڕۆحـیش پاشـکۆی جەسـتەیە لـەم قۆناغەدا.

ب- قۆناغی ناوگۆڕ و بەرزەخ و حوکمەکانی لەسەر ڕۆح، جەسـتەش پاشـکۆیەتی لـەم قۆناغەدا.

پ- قۆناغی هەمیشە و نەبڕاوە، حوکمەکانی ڕۆح و جەستە بەیەکەوە دەگرێتەوە[3].

---

[1] شرح العقیدة الطحاویة ٣٨٩-٣٩١، الروح ٦٤-٦٦.

فەرموودەی: بەڕاستی گۆڕ" یان مێرگێکە... تاد: سنن الترمذي، کتاب صفة القیامة، باب القبر یقول للمؤمن مرحباً وأهلا ١٦٧/٧ عن أبي سعید الخدري وقال: حسن غریب.

[2] الروح ٦٢-٦٣.

[3] هەمان سەرچاوە ٦٢-٦٣.

سەبارەت بەو مردووەش کە بەشەکانی لاشەی پەرش و بڵاوبووە بە خاك و هەوادا...
بێگومان لە قۆناغی ناو گۆڕو بەرزەخدا ڕۆح سزا ئەخوات و جەستەش بەهەمان شێوە وەك پاشکۆی ڕۆح لەو قۆناغەدا سزا دەچێژێت، ئینجا شتێك دوور نیە لە دەسەڵاتی خوای گەورە کە پەیوەندییەك لە نێوان ڕۆح و بەشەکانی لاشەدا دروست بکات هەرچەند دوور بن، ئەمرۆ ئێمە دەبینین کە سەدان ئامرازی بێتەل (لاسلکی) و بڵاوکراوەی ڕاگەیاندن دەگات بە سەرجەم ناوچە جیاوازەکانی جیهان لەیەك چرکەدا، کارەباش بەهەمان شێوە لە یەك چرکەدا دەگاتە شوێنی زۆر دوور لەو ساتەی دەمامکی تایبەتی گەیەنەری کارەبا دەکرێتەوە، جا هەڵسوکەوت و ڕفتاری ڕۆح زۆر لەو نمونانەی باسکران نامۆو سەیرترن.

## حوکمی بڕوا بوون بە ناخۆشی و سزای ناو گۆڕ:

کەسی بێ باوەڕو لاسار، سزاو ئازاری ناو گۆڕ دەچێژێت، ئەمەش ڕاستییەکە کە بڕوا پێ بوونی پێویستە، ئەمە ڕای زۆربەی زانایانە[1].

بەڵگەیان هێناوەتەوە لەسەر سەلماندنی بوونی سزای ناو گۆڕ، بەم بەڵگانەی خوارەوە:

١- ئەم فەرمایشتەی پەروەردگار لەبارەی دەست و پێوەند و خانەوادە و نزیکەکانی فیرعەون: ﴿ ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا ﴾ غافر: ٤٦. واتە: (ئاگری دۆزەخە،

(١) التذكرة للقرطبي ١٢٤. سەیری ئەو گێڕانەوانە بکە کە لەم بارەوە هاتوون لەم سەرچاوانەدا: شرح أصول الإعتقاد أهل السنة والجماعة ٤٣٦/٥ لاپەڕەکانی دواتر.
جبائی و بلخی کوری کە لە موعتەزیلەکانن سزای ناو گۆڕیان چەسپاندووە، بەڵام پێیان وابووە ئیمانداران ئەو سزایە ناچێژن، بەڵکو ئەو سزایەیان تەنها بۆ ئەو کەسانە چەسپاند .کە بۆ هەمیشەیی لە دۆزەخدل دەمێننەوەکەی أ./ الروح لإبن القيم ٥٨ ولوامع الأنوار البهية ٢٣/٢ نقلا عن الروح.
ئیبازییەکانیش سزای ناو گۆڕیان چەسپاندووە./ مشارق أنوار العقول ١٠٥/٢. زەیدییەکانییش سزای ناو گۆڕیان چەسپاندووە./ المعالم الدينية ١٢٣.

بەیانیان و ئێواران، نیشانیان دەدرێت، لە "جیهانی بەرزەخدا"). واتە مەبەستی پێش ڕۆژی دواییە. واتە "لە ناوگۆڕدا"، بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتە: ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓاْ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ﴾ غافر: ٤٦. واتە: (لە ڕۆژی قیامەتیش فەرمان دەدرێت: ئادەی تاقم و دەستەی فیرعەون بخەنە ناو ئێش و ئازاری زۆر ناخۆشەوە).

٢- ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿قَالُواْ رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا ٱثْنَتَيْنِ﴾ غافر: ١١. واتە: (پەروەردگارا تۆ دەسەڵاتت بێ سنورە، دوو جار ئێمەت مراند و دووجار ئێمەت زیندوو کردەوە).

مەبەست لە دووجار مراندن و دووجار زیندوو کردنەوە لەو ئایەتەدا بریتیە لە: مردنی پێش ناشتن و لە گۆڕنانی، دواتر زیندوو کردنەوەی لەناو گۆڕدا، پاشان مراندنی هەر لەناو گۆڕدا، دوا پارسیارکردنی مونکەرو نەکیر دواجار زیندوو کردنەوەی بۆ لێپرسینەوە. ڕاڤەکارانی قورئانی پیرۆز دەڵێن: مەبەست و ئامانج لە باس کردنی دووجار زیندوو کردنەوە ئەوەیە کە دۆزەخیەکان لە ئەنجامی ئەو دووجار زیندوو کردنەوەیە بۆیان دەرکەوت کە زیندوو کردنەوە لە توانای خوای گەورەدایە، هەر لەبەر ئەمەش دەڵێن: دانماننا بە تاوانەکانمان، واتە ئەو تاوانانەی کە بەرهەمی نکۆڵی کردنمان بوو لە زیندوو بوونەوە، فەرمایشتەکە باسی زیندوو کردنەوەی نەکردووە لە دوونیادا، لەبەر ئەوەی کە لە دونیادا زیندوو بوون دانیان نەدەنا بە تاوانەکانیاندا.

هەندێکیش بۆ ئەوە چوون کە مەبەست لە دووجار مراندنەکان ئەوەیە کە باسکران، هەروەها دووجار زیندوو کردنەوەکان یەکەمیان بریتیە لە زیندوو کردنەوە لە دونیادا و یەکێکی تریشیان لە گۆڕدا، مەبەستیشیان لەم تەفسیرەدا باس کردنی شتەکانی ڕابردووە، سەبارەت بە زیندوو کردنەوەو ژیانی سێیەمیش مەبەستم لەوەیە کە تیایدا کۆدەکرێنەوە بۆ لێپرسینەوە، پێویست ناکات لێرەدا باسی بکەین.

بەپێی هەر دوو ڕاڤە و لێکدانەوەکە زیندوو کردنەوە لە گۆڕدا سەلمێنرا[1].

- خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا ﴾ طه: ١٢٤. واتە: (ئەوەیش ڕوو وەربگێڕێت لە بەرنامەو ئاینی من و پشتی تێ بکات، بێگومان بۆ ئەو جۆرە کەسانە ژیانێکی ترش و تاڵ و ناخۆش پێش دێت).

ئەبو سعید خودری و عەبدوڵای کوڕی مەسعود وتویانە: سزادانی ترش و تاڵ و ناخۆش (ضَنكٗا ) مەبەست لێی سزای ناو گۆڕە.

٤- خوای پایەبەرز دەفەرموویێت: ﴿ فَذَرۡهُمۡ حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ يَوۡمَهُمُ ٱلَّذِي فِيهِ يُصۡعَقُونَ ﴾ الطور: ٤٧. واتە: (بێگومان بۆ ئەوانەی کە ستەمیان کردووە سزای تریش هەیە بێجگە لەوەی جارجار بۆیان پێش دێت).

وتراوە مەبەست لەو سزایە، سزای ناو گۆڕە، چونکە خوای گەورە پێشتر ئایەتێکی تری لەدوای ئەم فەرمایشتەدا هێناوە، دەفەرموویێت: ﴿ فَذَرۡهُمۡ حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ يَوۡمَهُمُ ٱلَّذِي فِيهِ يُصۡعَقُونَ ﴾ الطور: ٤٥. واتە: (وازیان لێ بهێنە هەتا بەو ڕۆژە دەگەن کە تیادەچن و لاڵ و پاڵ دەکەون). ئەم ڕۆژەش کۆتا ڕۆژە لە دونیادا، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەو سزایەی تیایدان بریتیە لە سزای گۆڕ.

٥- خوای مەزن دەفەرموویێت: ﴿أَلۡهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ۝١ حَتَّىٰ زُرۡتُمُ ٱلۡمَقَابِرَ ۝٢ كَلَّا سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ۝٣﴾ التكاثر: ١-٣. واتە: ("خەڵکینە!!" هەڵپەکردن و پێش برکێتان بۆ زۆر کردنی "ماڵ و منداڵ و سامان و کۆشك و تەلار و ...هتد" ئێوەی سەرگەرم و سەرگەردان و بێ ئاگا کردووە لە خواناسی و دینداری. تا ئەو کاتەی کە دەمرن و دەبرێنە گۆڕستان. وازبێنن لەمەودوا دەزانن).

---

[1] المواقف وشرحه للجرجاني ٣١٨/٨، بڕوانە: المقاصد وشرحه للتفتازاني ١١٢/٥-١١٣ والمالع الدينية ١٢٣.

٦- پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: **(اِنهم یعذبون عذاباً تسمعه البهائم کلها)** واتە: مردوان لە گۆڕەکانیاندا سزای ئەوەندە سەختە دەدرێن، گیانلەبەرو ئاژەڵەکان گوێبیستی ئاهو ناڵەیان دەبن.

٧- فەرموودەی بەرائی کوڕی عازب و ئەنەسی کوڕی مالیك، کە وەك بەڵگە لەسەر پرسیارو وەڵامی ناوگۆڕ خرانەڕوو[١].

جەهم، موعتەزیلەکان، ضراری کوڕی عمرو[٢]، بیشری مرسی[٣]، نکۆڵیان کردووە لە بوونی سزای ناو گۆڕ.

## زیندوو بوونەوەو (هەستانەوەی جەستەیی) دووبارە ژیانەوە

### پێناسەکەی:

زیندووبوونەوە (البعث): بریتییە لەوەی کە خوای گەورە مردووەکان لە گۆڕەکانیاندا زیندوو بکاتەوە، بەوەی بەشە ڕەسەنەکانی جەستەی کۆبکاتەوە و ڕۆحەکەی بۆ بگەڕێنێتەوە.

هەروەها دووبارە ژیانەوە (النشور): هاومانای زیندووبوونەوەیە، دەوترێت: (نشر المیت): ئەگەر دوای مردن دووبارە زیندوو بووەوەو ژیا. (أنشره الله) واتە: خوای گەورە ژیاندی[١].

---

[١] التذكرة للقرطبی ١١٣-١١٤ و١٣٣، الروح ٥٣-٥٤، لوامع الأنوار البهية ٢/٥ و١٣-١٤.
فەرموودەی: مردوان لە گۆڕەکانیاندا سزای ئەوەندە سەختە دەدرێن... تاد: صحيح البخاري ٨٠ كتاب الدعوات ٣٧ باب التعوذ من عذب القبر، رقم ٦٣٦٦، بهذا اللفظ عن عائيشة (رضي الله عنها).
وفي صحيح مسلم ٥ كتاب المساجد ٢٤ باب إستحباب التعوذ من عذاب القبر، رقم ٥٨٦ عن عائيشة (رضي الله عنها).

[٢] الإبانة للاشعري ٢٤٧ و بەرپەرچی داوەتەوە. و لە: المواقف ٣١٧/٨ هاتووە: ئەمە بۆچوونی زۆربەی پاشینەکانی موعتەزیلەیە. و لە: التمهيد للامشي ١٢٠ والمقاصد وشرحه للتفتازني ١١٣/٥ هاتووە: ئەمە بۆچوونی هەندێك لە موعتەزیلەکانە.

[٣] المواقف ٣١٧/٨. نکۆڵی کردنەکەی "ضرار" لە: كشف المراد ٤٥٢ هاتووە.

**ڕاجیایی لەسەر زیندوو بوونەوە، حوكمی بڕوا بوون پێی:**

ڕاجیایی هەیە لەبارەی زیندوو بوونـەوە، بەشـێوەیەكی گشـتی بـۆ سـەر دوو بۆچـوون دابەش بوون:

**یەكەم:** سروشتگەراكان (الطبيعيون) نكۆڵیان لێكردووە[2]، بۆ ئەوەچوون كە مرۆڤـــ تەنها ئەو پەیكەرەیە كە بەرهەستە و وێنــە و ئەندامــەكانی لــەناو ئەچـن و جـارێكی تــر

---

[1] لوامع الأنوار البهية ۲/۱۵۷-۱۵۸.

[2] قورئانی پیرۆز بیروباوەڕی ڕۆژگار پەرستەكان و سروشتگەڕاكانی باس كردووە، كە خۆی دەبینێتەوە لە نكۆڵی كردن لە بوونی لێپرسینەوەو بەهەشت و دۆزەخ، لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴾ الجاثية: ٢٤.
واتە: (خوانەناسان دەیانوت: ژیان تەنها ئەم ژیانی دنیایەیە، دەمرین و دەژین بە نۆرە، هەر ڕۆژگار و زەمانە كاریگەرن تیاماندا و دەمان مرێنن و هیچی تر! جا ئەوانە وەنەبێت لەسەر بنچینەی هیچ جۆرە زانستی و زانیاریەك ئەوە بڵێن تەنها پشت بەگومان و دوودڵی دەبەستن).
ناوبراوان پێیان وایە هەموو ئایینەكان پوچەڵ و بێ بنەمان، ئایینیان خستۆتە خانەی خەیاڵەوە، بەم پێیەش ئەو دەرەنجامانە كەڵكە دەبن:
١- نكۆڵیان كرد لەوەی كە مرۆڤ ڕێزدارترین بوونەوەر بێت، بەڵكو پێیان وابوو كە كەمترو بێ نرخترە لە ئاژەڵەكان و لەوان فیترەت نزمترە. ئەو پیشەسازیەش كە مرۆڤ پێی دەنازێت، ئەوا لەڕێگەی لاسایی كردنەوەی ئاژەڵاندا بەدەستی هێناوە، جا كرداری چنینی لە جاڵجاڵۆكە وەرگرتووە و كرداری دروستكردن و بیناكردنی لە هەنگ وەرگرتووەو لە مێروو فێری پاشەكەوت كردن و لە باڵندەی بول بول فێری مۆسیقا و ئاواز بووە....
نكۆڵیشیان كردووە لەوەی ئوممەتی پێغەمبەر محمد (صلى الله عليه وسلم) ڕێزدارترین و گەورەترین ئوممەت بێت، چونكە پێیان وابوو ئوممەتی محمد (صلى الله عليه وسلم) هیچ جیاوازی و تایبەتمەندییەكی زیاتری نیە لە ئوممەتەكانی تر.
٢- نكۆڵیان كردووە لەوەی مرۆڤ لە ڕۆژی دواییدا زیندوو ببێتەوە بۆ لێپرسینەوە لەسەر ئەو شتانەی كردوویانە لە دونیادا.
٣- بە پێویستیان زانیوە كە شەرح و دەستپاكی و ڕاستگۆیی لاببرێت و نەمێنێت، هەروەها ئایین بتاشرێت لە جیاوازی كردن لە نێوان حەڵاڵ و حەرام. (أبیقوری ڕۆژگار پەرست) دەڵێت: ئەگەر ئەمە حاڵی مرۆڤ بێت كە ڕەخنەو كەموكورتی دەگرێت لە گیانداران، ئەوا پێویستتر ئەوەیە كە مرۆڤ خۆی لە خۆ بایی نەبێت و هەڵنەخەڵەتێت بەوەی لە ڕۆژی دواییدا پاداشت و سزا هەیە، بەمەش

زینـــدوو نابێتـــەوە[1]. مرۆڤـــەکان بەچـــاوی خۆشـــیان مردوێکیـــان نـــەبینیوە کـــە زیندووکرابێتەوە تا باسی بارودۆخی دوای مردنیان بۆ بگێڕێتەوە.

**دووەم**:فەیلەسوف و دانا و خاوەن ئایینـەکان (الحكماء والمِلّیون) بڕوایـان بـە زینـدوو بوونەوە هەبووە[2].

ئیبن قەیمی جەوزی دەڵێت: موسڵمانان و جولەکە و نەصرانیەکان کۆکن لەسـەر زینـدوو بوونەوەی جەستەیی لە ڕۆژی دواییدا[3].

هەروەها جەلالی دەوانی) دەڵێت: باوەڕ بوون بە زیندوو بوونەوەی جەستەیی پێویست و فەرزە، هەر کەسێك نکۆڵی لێ بکات بە کافرو بێ بـاوەڕ دادەنرێـت، جـا ئەمـە شـتێکی ڕاست و بێ پێچ و پەنایە بە یەکدەنگی هەڵگرانی هەر سێ ئایینەکـە (واتـە: موسـڵمان و جولەکە و نەصرانیەکان) و قورئانی پیرۆز لە چەند شوێنی جیا جیـا شـایەتی لەسـەر ئـەو ڕاستیەی داوە کە تەئویل هەڵناگرێت[4].

بەشێوەیەك قورئانی پیرۆز پەیمانی سزای بەئێش و ئازاری داوە بەوانەی نکـۆڵی ئەکـەن لە زیندوو بوونەوە، هەروەها نکـۆڵی ئەکـەن لـە بـوونی ڕۆژی دوایـی، خـوای پایەبـەرز دەفـــــەرموویێت: ﴿وَإِن تَعۡجَبۡ فَعَجَبٞ قَوۡلُهُمۡ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡأَغۡلَٰلُ فِيٓ أَعۡنَاقِهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ الرعد: ٥. واتە: (خۆ ئەگەر تۆ بەشتێك سەرسام بیت و پێت سەیر بێت، ئەوە قسەی بـێ

---

بەشە خۆشەکانی ژیانی دونیا لەخۆی قەدەغە بکات و دەروونی بەند بکات بە بەندوبارەکانی حەڵاڵ و حەرام و شیاو نەشیاو و شەرم و ڕاستگۆیی و دەستپاکی و شتە دانراوەکانی تریش کە خەڵکی بەنەزانی پێیەوە پابەند کراون کەچی ئاژەڵ و گیانلەبەرێك پێی پابەند نەکراوە.

سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە: مقدمة الشيخ محمد عبده لرسالة ابطال مذهب الدهريين للسيد جمال الدين الأفغاني، وذلك في كتاب (خاطرات جمال الدين الأفغاني الحسيني ٢٨٩ - ٢٩٢).

[1] المقاصد وشرحه للتفتازاني ٥/٨٨-٨٩.

[2] المقاصد وشرحه للتفتازاني ٥/٨٨-٨٩.

[3] الروح الابن القيم ٥٢ ولوامع الأنوار البهية ٢/٢٥٧ نقلاً عنه.

[4] شرح العقائد العضدية للدواني ٢/٢٤٧، الكلنبوي عيله، ولوامع الأنوار البهية ٢/١٥٨ نقلاً عنه.

باوەڕان جێگەی سەرسامیە کە دەڵێن: ئایا کاتێك بووینەوە بە خاك و خۆڵ، سەر لـە نـوێ زیندوو دەکرێینەوەو دروست دەبینەوە؟ ئا ئەوانەن کە بێباوەڕ بوون بە پـەروەردگاریان، ئـا ئەوانە زنجیرەکان لە گەردنیاندان و نیشتەجێی ناو ئاگری دۆزەخن و هەمیشە دەبـێ تیایـدا بمێننەوە).

هـــــەروەها دەفـــــەرموویێت: ﴿وَإِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْآخِرَةِ عَنِ ٱلصِّرَٰطِ لَنَٰكِبُونَ﴾ المؤمنون: ٧٤.[1] واتە: (بەڕاستی ئەوانەی بـڕوا نـاهێنن بـە قیامـەت و وێـڵ و لادەرن لـە ڕێگەو ڕێبازی ڕاست).

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوا هەڵگرانی بۆچوونی دووەم ڕایان جیاوازە لە چۆنیەتی زینـدوو بوونەوە، لەمبارەوەش بۆ سێ ڕا دابەش بوون:

یەکەم: زیندوو بوونەوە تەنها بەشێوەیەکی ڕۆحییە، ئەمە ڕای فەیلەسوفەکانە، چـونکە لاشە و جەستە بە وێنەو ئەندامەکانیەوە لەناو ئەچێت و دووبارە ناهێتەوە بـوون، نەفسیش کـرۆك (جـوهر)ێکی ڕووتـە هـەر دەمێنێـت و لـەناو ناچـێت، لـەدوای جیابوونەوەی لە جەستە دەگەڕێتەوە بۆ جیهانی پەتی و ڕووت کە دادەماڵرێت لەو شتانەی پێیەوە پەیوەست دەبن.

دووەم: زیندوو بوونەوە تەنها جەستەییە، ئەمە ڕای زۆربەی موسـڵمانانە، چـونکە ڕۆح بە جەستەدا ئەڕوات وەك چۆن ئاگر بە خەڵوز و ئاو بەناو گوڵدا دێت و دەڕوات.

سێیەم: زیندوو بوونەوە بە ڕۆح و جەستەیە بەیەکەوە، ئەمـە ڕای غـەزالی و حلیمـی و راغب و ئەبو زید و دبوسی و ڕای زۆرێـك لـە صـۆفی و شـیعە و کەڕامیـەکان و زۆربەی نەصرانیەکان و هەڵگرانی بیرۆکەی گیانگۆڕکێ (تناسخ)یەکانە[2].

---

[1] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: النحل ٦٠، الاسراء ٤٩ - ٥١، مریم ٦٦ - ٦٨، الحج ٥ - ٦ المؤمنون ٨١ - ٨٣، النمل ٤-٥ و ٦٦-٦٧، الجاثية ٢٤، التغابن ٧.

[2] شرح المقاصد للتفتازاني ٢/٢١١، هەروەها دواتر باسی کردووە کە: ئیمامی ڕازی دەڵێت: جیاوازییەکە ئەوەیە: کە موسڵمانان دەڵێن ڕۆحەکان بەدیهێنراون و لەدوای مردن لە جیهانی ڕۆژی دواییدا دەگەڕێنرێنەوە بۆ ناو لاشەکان، بەڵام ئەوانەی بڕوایان بە بیرۆکەی گیانگۆڕکێ (تناسخ)

**بەڵگەکانی زیندوو بوونەوە:**

هەڵگرانی ڕاستی بەڵگەی نـەقلی و عـەقڵیان هێناوەتـە لەسـەر ئـەوەی کـە زینـدوو بوونەوەی جەستەیی ڕاستە، نمونە لە بەڵگەی نەقلیەکان:

**١- لە قورئانی پیرۆز، ئەم فەرمایشتانەی خوای گەورە:**

أ- خوای بێ وێنە دەفەرمووێت: ﴿وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لَا يَبْعَثُ اللَّهُ مَن يَمُوتُ بَلَىٰ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا﴾ النحل: ٣٨. واتە: (بێ باوەڕان سـوێندیان دەخـواردو جـەختیان دەکردەوە لەسەر سوێندەکەیان و دەیانوت: ئەوەی بمرێـت خـوا زینـدووی ناکاتـەوە! نەخێر، زیندووی دەکاتەوە، ئەوە بەڵێنێکی ڕاست و دروستی خوایە و لێی پاشـگەز نابێتەوە).

ب- خوای زانـا و خـاوەن توانـا دەفـەرمووێت: ﴿قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ﴾ التغـابن: ٧. واتـە: (پێیان بڵێ: وا نییە، سوێند بە پەروەردگارم، بەڕاستی هەر زیندوو دەکرێنەوە).

پ- خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تُبْعَثُونَ ﴾ المؤمنون: ١٦. واتە: (پاشان دەبێت لە ڕۆژی قیامەتدا زیندوو بکرێنەوە).

ت- خـوای پایەبـەرز دەفـەرمووێت: ﴿فَإِذَا هُم مِّنَ الْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ﴾ یـس: ٥١. واتە: (هەموویان لە گۆڕەکانیان لە توێی خاکەوە بەپەلە دێنـە دەرەوە بـۆ لای پەروەردگاریان).

---

هەیە: تێڕوانینیان وایە کە ڕۆح لە مێژینە و بێ سەرەتایە و هەر لەو ژیانەی دونیادا دەگەڕێتەوە بۆ ناو لاشەکەی تر و بیرۆکەی ناوبراو بڕوای بە ڕۆژی دوایی و بەهەشت و دۆزەخ نییە... جا هەڵگرانی ئەم بیرۆکەیە بەکافرو بێ باوەڕ دادەنرێن لەبەر ئەوەی نکۆڵی ئەکەن لە بوونی قیامەت و بەهەشت و دۆزەخ و نەصرانیەکانیش بەهەمان شێوە بەکافر دادەنرێن، چونکە بڕوایان بە بیروباوەڕی سێکوچکەیی (تثلیث) هەیە. سەیری ئەمەش بکە: المواقف وشرحه للسيد شريف ٢٩٧/٨.

ج- خوای تاك و پاك دەفـەرموویێت: ﴿ فَسَيَقُولُونَ مَن يُعِيدُنَا قُلِ الَّذِي فَطَرَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ ﴾ الاسـراء: ٥١. واتە: (دەڵێن: دەی باشە، کێ زیندوومان دەکاتەوە؟ بڵێ: ئـەو زاتـەی کە یەکەم جار بەدیهێناون).

چ- خوای بێ هاوەڵ و هاوبەش دەفەرموویێت: ﴿كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ ﴾ الأعـراف: ٢٩. واتە: (چۆن دروستی کردوون لەسەرتاوە، لە ئایندەشدا هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە).

ح- خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ دەفەرموویێت:﴿كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا ﴾الأنبياء: ١٠٤. واتە: (هەروەك چۆن لەسەرەتاوە دروستمان کرد، وەك ئەوسای خۆی لێدەکەینەوە، جا ئەوە پەیمان و بەڵێنی ئێمەیە).

خ- خوای گەورە دەفـەرموویێت: ﴿فَأَحْيَيْنَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا كَذَٰلِكَ النُّشُورُ ﴾ فـاطر: ٩. واتە: (ئینجا ئەو زەویەمان پێ زیندوو کردەوە دوای ئـەوەی کـە مردبـوو، زینـدوو کردنەوەی ئێوەش هەر بەو شێوەیە دەبێت).

ز- خوای خاوەن ویست و توانست دەفـەرموویێت: ﴿ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَن يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ ﴾ يـس: ٧٨ - ٧٩.[1] واتە: (وتی: کێ ئەم ئێسکانە زیندوو دەکاتەوە لە کاتێکدا کە ڕزیو و پرتوکـاون؟!. پێیان بڵێ: ئـەو زاتـەی کـە یەکـەمجار دروسـتی کـردووە، هـەر ئـەویش زینـدووی دەکاتەوە).

عیزی کوڕی عەبدوسسەلام دەڵێـت:- خـوای گـەورە یەکـەم جـار دروسـت کردنـی جەستەی وەك بەڵگە هێناوەتەوە لەسەر دووبارە زیندوو کردنـەوە، چـونکە هـەموو کەسێکی خاوەن عـەقڵ و ژیری ئەوە دەزانێت کـە ئـەو زاتـەی توانـای بـەدیهێنانی جەستەکانی هەبووە لە یەکەمجاردا ئەوا تواناشی هەیە، پارچە بڵاوەکانی جەستەکان

[1] لوامع الأنوار البهية ٢/١٥٧-١٥٩.

کۆبکاتەوەو، دووبارە دروستیان بکاتەوە، چونکە ئەگەر نەتوانیٚ دووبارە دروستیان بکاتەوە، ئەوا پێویست بوو لە یەکەم جاردا دەستەوەسان بوایە لە ئاست بەدیهێنانیان.

هەروەها کرداری بەدیهێنان، پێویستی بە توانای بەدیهێنەر نەدەبوو بەسەر بەدیهێنراواندا و پێویستی بەوە نەدەکرد کە زانا بێت بەهەموو زانیارییە وردو درشت و تێروتەسەلەکان، خوای گەورە ڕاستەوخۆ ئەم فەرمایشتەی لەدوای ئەم باسەی خستووەتەڕوو: ﴿وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ﴾ یس: ٧٩. واتە: (ئەو بەهەموو دروستکراوێك زانا و ئاگایە). جا خوای گەورە ئاگادارو زانایە بە هەموو شتەکانی بەدیهێنان و دروستکردنی یەکەم هەر لە بەشەکان و ماددەکان و وێنەکان، بەهەمان شێوە سەبارەت بەهی دووەمیش زانایە، جا مادەم خوای گەورە خاوەنی زانستی تەواوە، توانای کامڵە، چۆن زیندوو کردنەوەی ئێسکی پرتوکاو ڕزیوی لەسەر گران دەبێت؟.

دواتر خوای گەورە جەختی لەسەر پرۆسەی زیندوو کردنەوە کردۆتەوە، بەوەی بەڵگەی بە شتێکی زۆر گەورەو مەزنی هێناوەتەوە لەسەر شتێکی بچوك و ئاسانتر، چونکە هەر کەسێکی ژیر دەزانێت کە زاتێك دەسەڵاتی بەسەر شتێکی گەورەدا بڕوات ئەوا بەسەر شتی لەویش بچوکتردا زۆر بەئاسانتر دەڕوات: ﴿أَوَلَيْسَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم ۚ بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ﴾ یس: ٨١.[1] واتە: (ئایا ئەو زاتەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە ناتوانێت دووبارە وەك خۆیان دروستیان بکاتەوە؟! بەڵێ "زۆر چاك دەتوانێت"، چونکە ئەو زاتە لە دروستکردن و داهێنانیدا بەتوانا و زانایە).

ك- فەرمان و ڕێگرییەکان (الأوامر والنواهي) لە قورئانی پیرۆزدا زۆرن:

[1] شرح العقيدة الطحاوية لابن أبي العز ٥٩٤-٥٩٥. و نهاية الإقدام ٤٦٨ وعقائد الإمامية ١٢٦.

نمونەی ئەو فەرمانانە: خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ البقرة: ٤٣ و ٨٣ و ١١٠. واتە: (نوێژەکانتان بە چاکی ئەنجام بدەن بە دروشمەکانیەوەو زەکاتیش بدەن).

هەروەها دەفەرموویێت: ﴿وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦ﴾ الحج: ٧٨. واتە: (هەروەها بەردەوام بن لە خەبات و جیهاد و هەوڵ و کۆشش لە پێناوی خوادا بەو شێوەیەی شایستەیەتی). ...تاد.

نمونەی ڕێگرییەکان (نهی): ﴿وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا﴾ الحجرات: ١٢. واتە: (لەپاش ملە باس و ناوی یەکتر بەخراپە مەبەن).

هەروەها دەفەرموویێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ﴾ المائدة: ٩٠. واتە: (دڵنیابن کە عەرەق و قومارو گۆشتی ماڵاتی سەربڕاو بۆ غەیری خوا لەو شوێنانەی کە خەڵك بەپیرۆزی داناوە نەك ئیسلام، بورج و حەڵاڵ و حەڕام زانین بەهۆی هەڵدانی زارەوە ئەمانە هەر پیسن و لەکارو کردەوەی شەیتانن، کەواتە ئێوەش خۆتانی لێ دوور بگرن و خۆتانی لێ بپارێزن).

موسڵمان لە ئاست ئەم حوکم و بڕیارانەدا سەرپشك نییە، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ﴾ الأحزاب: ٣٦. واتە: (بۆ هیچ پیاو و ئافرەتێکی موسڵمان دروست نیە، کاتێك خواو پێغەمبەرەکەی بڕیاری شتێك بدەن، ئەوان سەرپشك بن لە ئەنجامدانی ئەو کارەدا).

خوای گەورە هەڕەشەی کردووە لە خەڵکی لەوەی فەرمان و ڕێگرییەکان بشکێنن، لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ النور: ٦٣. واتە: (دەبا ئەوانەی سەرپێچی لە فەرمانی خوا دەکەن بترسن لەوەی کە تووشی تاقی کردنەوەیەکی سەخت یان تووشی سزایەکی بە ئێش ببن).

بە پێی ئەو فەرمان و ڕێگرییانەی کە خرانەڕوو و ئەوەش باس کرا کە موسڵمان لە ئاستیدا سەرپشك نییە و هەڕەشەش کراوە لەوەی سەرپێچی دەکات، ئەوا بێگومان

شتێکی پێویستە کە سزای جەستەیی تاوانبارە سەرپێچیکارەکان بدرێت و پاداشت و خۆشی پێشکەش بە باوەڕداران بکرێت، جا دادگەری و حیکمەت و دانایی و پیرۆزییە تەواو و کاملەکەی خوای گەورە هەر ئەمە دەخوازێت.

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ السَّعِيرِ﴾ سبأ: ١٢.

واتە: (جا ئەوەی لە فەرمانی ئێمە دەربچێت سزای دۆزەخی پێ دەچێژین).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا ﴿٣١﴾ حَدَائِقَ وَأَعْنَابًا ﴿٣٢﴾ وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا ﴿٣٣﴾ وَكَأْسًا دِهَاقًا ﴿٣٤﴾ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّابًا ﴿٣٥﴾ جَزَاءً مِّن رَّبِّكَ عَطَاءً حِسَابًا ﴿٣٦﴾﴾ النبأ: ٣١-٣٦.

واتە: (بەڕاستی بۆ خواناسان و پارێزکاران سەرفرازی و خۆشی و شادی و کامەرانی فراوان ئامادەیە. چەندەها باخچەی جوان و جۆری ترێ. "لەو جێگە و ڕێگە خۆشانەدا هاوسەرو هاودەمی" ئافرەتانی سینە جوان و "دیمەن جوان" هاوتەمەن ئامادەیە. لەگەڵ کاسەی پڕ لە شەرابی تایبەتیدا. لەو بەهەشتەدا هیچ جۆرە قسەیەکی پڕو پووچ و درۆو دەلەسەیەك نابیستن. ئەمەش هەموو پاداشتێکە لەلایەن پەروەردگارتەوە "ئەی ئیماندار"، بەخششێکە بە حیسابێکی ورد دەبەخشرێت "بە بەختەوەران").

جا شتێکی ڕوونە کە تەنها هەڕەشە و ترساندنێکی ڕووت نییە، بەڵکو ئەوە دەسەلمێنێت کە زیندوو بوونەوە شتێکی پێویستە، هیچ شتێکی تر نییە کە بەهۆیەوە هەر کەسێك خۆی بدزێتەوە لە بڕوا پێبوونی.

### ٢- لە فەرموودەی بەڕێزو بەپێزدا:

أ- لە صەحیحی بوخاریدا: لە ئیبن عەبباسەوە (خوای لێی ڕازی بێت) هاتووە، دەڵێت: گوێبیستی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بووم کە وتاری دەدا لەسەر دوانگە و دەیفەرموو: (**اِنكم ملاقو الله حُفاة عراة غُرْلاً**) واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا بەپێی پەتی و ڕووت و قووتی و خەتەنە نەکراوی دەگەڕێنەوە لای خوا.

هەروەها لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە: دەڵێت: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەڵسا وتارێکی دا تیایدا ئامۆژگاری کردین و دواتر فەرمووی: (**یا أیها**

**الناس انكم تُحْشـرون الى الله حُفـاة عـراة غُـرْلاً)** واتـە: ئـەی خەڵكینـە لـە ڕۆژی قیامەتدا بەپێی پەتی و ڕووت و قووتی و خەتەنە نـەكراوی حەشـر دەكـرێن. ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ۚ وَعْدًا عَلَيْنَآ ۚ إِنَّا كُنَّا فَـٰعِلِينَ﴾ الأنبیاء: ١٠٤.[1] واتـە: (هەروەك چۆن لەسەرەتاوە دروستمان كرد، وەك ئەوسـای خـۆی لێدەكەینـەوە، جـا ئەوە پەیمان و بەڵێنی ئێمەیە، بێگومان ئێمە ئەو كارە ئەنجام دەدەین).

ب- **ئیبن عـەبباس** (خـوای لـێ ڕازی بێـت) دەڵێـت: **(عاصـی كـوڕی وائـل) هاتـە لای پێغەمبەری خوا** (صلی الله علیـه وسـلم) و ئێسـكێكی بەدەسـت بـوو، ئێسـكەكەی شكاند و وتی: ئەی موحەممەد، خوای گەورە ئـەو ئێسـكە زینـدوو دەكاتـەوە دوای ئەوەی پرتوكاوەو ڕزیوە؟ فەرمووی: **(نعم، يبعث الله هذا، ثم يميتك، ثم يُحييك، ثـم يدخلك نار جهنم)** واتە: بەڵێ، ئەمە زینـدوو دەكاتـەوەو تـۆش دەمرێنێتـو پاشـان زیندووت دەكاتەوە، دواتر دەتخاتـە نـاو ئـاگری دۆزەخـەوە. لـەدوای ئەمـە چـەند ئایەتێكی كۆتایی سورەتی (یس) دابـەزین: ﴿أَوَلَمْ يَرَ ٱلْإِنسَـٰنُ أَنَّا خَلَقْنَـٰهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِىَ خَلْقَهُۥ ۖ قَالَ مَن يُحْىِ ٱلْعِظَـٰمَ وَهِىَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِىٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَآ أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ أَوَلَيْسَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَـٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم ۚ بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّـٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨١﴾ إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ فَسُبْحَـٰنَ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾﴾ واتە: (ئایا ئادەمیزاد سەرنجی نەداوە كە: ئێمـە بێگومـان

[1] لوامع الأنوار ٢/١٥٩.

فەرموودەی: لە ڕۆژی قیامەتدا دەگەڕێنەوە لای خوا... تاد: صحيح البخاري ٨١ كتاب الرقائق ٤٥ باب كيف الحشر، رقم ٦٥٢٥.

فەرموودەی:ئەی خەڵكینە لە ڕۆژی قیامەتدا زیندوو دەكرێنەوە... تاد: صحيح مسلم ٥١ كتاب الجنة وصفة نعيمها، ١٤ بيان فناء الدنيا و بيان الحشر رقم ٢٨٦٠ (٥٨).

دروستمان کردووە لە نوتفەیەك، کەچی خێرا بووەتە دوژمنێکی ئاشکرا و دژایەتیمان دەکات؟!. نموونەی لاوازی و بێ دەسەڵاتی بۆ ئێمە هێناوەتەوەو بەدیهێنانی خۆی لە بیر کردووە، دەیوت: کێ ئەم ئێسکانە زیندوو دەکاتەوە لە کاتێکدا ڕزیوو و پرتوکاون؟! پێیان بڵێ: ئەو زاتەی کە یەکەمجار دروستی کرد، هەر ئەویش زیندوو دەکاتەوە، ئەو بەهەموو دروستکراوێك زانا و ئاگایە. ئەو زاتەی کە لە درەختی سەوز ئاگرتان بۆ بەدی دەهێنێت، ئیتر ئێوە دایدەگیرسێنن. ئایا ئەو زاتەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە ناتوانێت دووبارە وەك خۆیان دروست بکاتەوە؟! بەڵێ "زۆر چاك دەتوانێت"، چونکە ئەو زاتە لە دروستکردن و داهێناندا بە توانا و زانایە. بێگومان هەر کاتێك فەرمانی خودا دەرچوو، ویستی شتێك جێبەجێ بکات و بیهێنێتە دی، پێی دەڵێت ببە، ئەویش دەستبەجێ و بێ دواکەوتن پێش دێت و ئەنجام دەدرێت و دروست دەبێت. پاکی و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی جڵەوی هەموو شتێکی بەدەستە، هەر بۆ لای ئەویش دەبرێنەوە).

ئەمە دەقێکی ڕاشکاوە لەسەر زیندووکردنەوەو کۆکردنەوەی جەستەیی، کە ڕەگ و ڕیشەی تەئویل لەهەمبەر ئەو بابەتە بەتەواوی دەردەهێنێت.

### ٣- یەکدەنگی پێشینانی ئەم ئوممەتەی لەسەرە.

نمونەی بەڵگەی عەقڵی لەم بارەوە:

١- پێغەمبەران شتانێك دەهێنن کە عەقڵ توانای پەیی پێبردنی هەبێت یاخود پشکنینی لەبارەوە ئەکات، هەرگیز شتێکی وا ناهێنن کە ژیری و عەقڵەکان ڕەتی بکەنەوەو بە ئەستەمی بزانن، لەبەر ئەوەی زیندوو بوونەوە: هێنانە بوونە لە نەبوونەوە یاخو کۆکردنەوەیە دوای پەرش و بڵاوبوون یاخود زیندوو کردنەوەیە پاش مردن.جا هەموو ئەو حاڵەتانە شیاوی بوون و ئەستەم نین. هەواڵەکانی پێغەمبەران و کتێبە ئاسمانیەکان بەتایبەتی قورئانی پیرۆز زۆر زۆرن.

٢- هەر شتێك بەڵگەی پێویست بوون یان ئەستەم بوونی لەسەر نەبێت ئەوا بنچینەکەی شیاوی بوون (اِمکان)ە، هەروەك فەیلەسوفەکان و زانایانی کەلام

دەڵێن: هەر شتێك بە بەر گوێچکەت بکەوێت ئەوا وای دابنێ کە لە چوارچێوەی بووندایە، مەگەر بەڵگەیەك لەلای تۆ بەرپا ببێت و بوونی شتەکە ڕەت بکاتەوە، جا هەر کەسێك گومانی وا بێت شتی لەناوچوو ناکرێت بێتەوە بوون، ئەوا پێویستە بە بەڵگەی دروست بوونی سەرەتا پابەند بکرێت، چونکە دروست بوونی سەرەتا وەك دووبارە زیندوو کردنەوەیە، بەڵکو بریتیە لە خودی زیندوو کردنەوە یاخود ئاسانترە لێی (هەروەك خرایەڕوو)، ئەمەش ناشاردرێتەوە لە کەسی ژیرو عاقڵ[1].

بەم پێیە زیندوو بوونەوەی جەستەیی ڕاست و دروستەو دێتەجێ، جا دروستکەری کاتژمێرێك ئەگەر کاتژمێرەکەی لەیەکتر هەڵوەشاندەوەو کردی بە چەندین بەشی بچوك، توانای هەیە کاتژمێرەکە وەك خۆی لێبکاتەوە بەو پەڕی جوانی و تۆکمەیی، کاتەکەش بە وردی ڕێکدەخات و هیچ کەسێکیش ناتوانێت نکۆڵی لەو شتە بکات، جا گومان هەبوون لە زیندوو بوونەوە (دروست بوونەوەی دووەم) گومان هەبوونە لە توانای خوای گەورە لەسەر دروست کردنی بەدیهێنراوان لە سەرەتادا، گومان هەبوونە لەوەی خوای گەورە هۆکاری بوون بێت.

بەتایبەت ئەگەر زانیمان جەستەی زیندوو لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر نوێ دەبێتەوە، لاشەی مرۆڤ لە یەك چرکەدا (١٢٥ ملیۆن خانە) بەکاردەبات، هەر لە شوێنی ئەو خانانەش بەهەمان ئەندازە (١٢٥ ملیۆن خانە) لە دایك ئەبن و دێنە بوون، ئەمەش مانای وایە کە جەستەی مرۆڤ لە نوێبوونەوەو خولی بەردەوام دایە لە مردنەوە بۆ ژیان و لە ژیانەوە بۆ مردن، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ ﴾ الروم: ١٩. واتە: (ئەو خوایە زیندوو لە مردوو دەردەهێنێت، مردویش لە زیندوو

[1] لوامع الأنوار البهية ٢/١٥٨-١٥٩.

فەرموودەی: عاصی کوڕی وائل هاتە لای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)... تاد: أخرجه ابن جرير وابن المنذر وأبو حاتم والإسماعيلي في معجمه والحافظ الضياء في المختارة وابن مردويه والبيهقي في الشعب.

دەردەهێنێت). کەواتە جەستەی مرۆڤ لە هەر چرکەیەکدا دەمرێت و دەژیتەوە، جا ئەو زاتەی کە توانای هەیە لەسەر زیندوو کردنەوەو مراندنی لەبەرچاو و دیدگاکان لە دونیادا، ئەوا بەهەمان شێوە توانای هەیە زیندووی بکاتەوە لە دوای مردن بۆ ژیانێکی تر.

لێرەدا وێنە و دیمەنێکی تر هەیە کە نمونەی ئەو زیندوو کردنەوەمان بۆ نمایش دەکات، ئەویش ئەوەیە کە: پایز دێت دارو درەختەکان ڕووت ئەکاتەوە لە پەلکەکانی... دواتر لە بەهاردا ژیانی دێتەوەبەر، خوای گەورە ئاو و باران دەبارێنێت بەسەر زەوی وشکی ڕووتدا کەچی دواتر سەوز دەبێت بەهۆی گژو گیاوە، خوای پایەبەرز دەفەرموویێت: ﴿وَأَحْيَيْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا كَذَٰلِكَ ٱلْخُرُوجُ﴾ ق: ١١. واتە: (هەر بەو ئاو بارانە شوێنە مردووەکان زیندوو دەکەینەوە، هەر ئاوەهایش لە دوای مردن ئێوە لە خاك دێنە دەرەوە).



## بەرپابوونی ڕۆژی دوایی(قیامەت)

### پێناسەی بەرپابوونی ڕۆژی دوایی:

ئەو ڕۆژە گەورە سامناك و ترسناکیە، کە جیهان تیایدا دەشڵەژێت و سیستەمەکەی تێك دەچێت و هەموو زیندەوەرو گیانلەبەران لەناو دەچن.

**ناوەکانی ڕۆژی بەرپابوونی ڕۆژی دوایی:**

لە قورئانی پیرۆز چەندین ناو هاتوون، بۆ نمونە:

ڕۆژی قیامەت، ڕۆژی سزاو پاداشت (الدین)، ڕۆژی چەسپاندنی حەق و ڕاستی (الحاقة)، داپۆشەر[1] (غاشیة)، گرمەی لەرزێنەر (القارعة)، دەنگی گوێ کپکەر (الصاخة).

---

[1] واتە: سامناکی ئەو ڕۆژە هەموو زیندەوەرێك دادەگرێت و دادەپۆشێت. (وەرگێڕ).

## بەرپابوونی ڕۆژی دوایی گومانی تێدا نییە:

خوای گەورە هیچ گومان و دوودڵی نەهێشتووە لەمەڕ بەرپابوونی ڕۆژی دوایی، تەنانەت لە چەندین ئایەتدا جەختی کردۆتەوە لەسەر پێش هاتنی ڕۆژی دوایی، خوای پاك و بەرز دەفەرموویت:

﴿ إِنَّ مَا تُوعَدُونَ لَآتٍ وَمَا أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴾ الأنعام: ١٣٤. واتە: (بەڕاستی ئەو بەڵێنانەی کە دەتاندرێتێ "دەربارەی قیامەت و لێپرسینەوە" بەڕێوەیە و هەر دێت و ئێوە دەسەوسانکەر نین).

﴿وَإِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَآتِيَةٌ فَٱصْفَحِ ٱلصَّفْحَ ٱلْجَمِيلَ ﴾ الحجر: ٨٥.[١] واتە: (بەڕاستی ڕۆژی قیامەت بەڕێوەیە و هەر دێت و تۆ "ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەی ئیماندار" بەشێوازێکی جوان چاوپۆشی بکە و لێبوردە بە "لە ڕەفتاری نادروستی ئەوان").

زانستی سەردەمیش دان دەنێت بەم ڕاستیەدا، لەوبارەوە (د. موحەممەد جەمالەدینی ئەفەندی) دەڵێت: (سەرجەم زانایانی گەردوونناسی جەخت لەوە دەکەنەوە، کە خۆر وەك هەر ئەستێرەیەکی تر، دەبێت زیادبوونی لەناکاوی بەسەردابێت لە گەرمی و قەبارەو تیشکەکانی دا بە ئەندازەیەك کە عەقڵ و هۆشەکان بڕوای پێناکەن، لەم باردۆخەشدا ڕووی دەرەکی درێژ دەبێت و لێك دەچێت بەو دووکەڵ و ئاگرەی تیایدایە تا دەگاتە مانگ، بەمەش یەکسانی کۆمەڵەی خۆر تێکدەچێت بەگشتی، جا هەر خۆرێك کە لە ئاسماندا هەیە ئەوا پێویستە بە وێنەی ئەو بارودۆخەدا بڕوات، خۆری ئێمە هێشتا بەم خولەدا نەڕۆیشتووە)[٢].

---

[١] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: طه ١٥، الحج ٧، الروم ٤٣، سبأ ٤٣، الجاثية ٣٢.

[٢] الله يتجلى في عصر العلم ١٦٥. لە کتێبی ناوبراودا سەیری وتەی ئەمانە بکە: د. فرانك ألن ٥ و د. ارفنج وليام نوباوتش ٥٣ و أ. كلوم و م. هاثاوي و نيوتن و بولتزمان ٩٠-٩١، وتەی هەموویان جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە باسمان کردووە.

دیاردەی یەکەم کە دەکرێت ئاگادارمان بکاتەوە وەك هێمایەك بۆ ئـەوەی کـە گونجـاوە ڕۆژی دوایی بەرپا ببێت بریتییە لە زەوی لەرزین، نـاواخنی زەوی پلـەی گـەرمی زۆر زۆر بەرزە بەشێوەیەکی ئاشکرا کاریگەری لەسەر ڕووی زەوی هەیە، جا یـان ئـەوەتا زەوی بـە گەرمیە گڕکانییە تێکدەرەکان دەتەقێتەوە یـاخود زەوی لـەرزە سـامناکە ترسـێنەرەکان، کاریگەری دروست ئەکەن لەسەر ژیانی مرۆڤــ سەرباری پێشکەوتنی تەکنەلۆژی، چـونکە مرۆڤــ هیچ شتێکی لەدەست نایەت لەئاست ئەم دیاردانە، لەبەر ئەوەی زۆر جـار وابـووە کە شارێك بەتەواوی خاپوور بووەو چرای ژیانی لـیّ کوژاوەتـەوە یـاخود کۆشـك و تـەلارو خانووەکانی دارماون بەهۆی دەنگێکی ترسـێنەری گـەورە، ملیۆنـان خـەڵکیش لـەماوەی چەند چـرکەیەکی کەمـدا مـردوون، هـەروەك ئەمـە لـە وڵـاتی چـین و هینـد و پرتوگـال ڕوویدا.... مرۆڤــ خۆی ناتوانێت پێشبینی کاتی ڕوودانی ئەو دیاردانە بکات، بەڵکو لـە پڕێکەوە ڕوودەدەن، تەنانەت لەوبارەوە زەوی ناسی (جورج جاموف) دەڵێت: (ئێمە لەسـەر پشتی مینێکی گەورەدا ڕاوەستاوین، دەکرێ لە هەر کاتێکدا بەڕوومانـدا بتەقێتـەوە، تـا سیستەمی زەوی بەتەواوی لەناو ببات).

ئایا ئەمە قیامەتی بچوك نییە؟

ئەمە سەبارەت بەزەوی، جا سەبارەت بە بارودۆخی گەردوونیش ئەوا دەبیـنین چـەندین تەنی ئاسمانی و ئەستێرەی مەزنی تێدایە کە بە شتێك دەچێت ملیۆنان هاوێـژەری بـۆمبی نەوەوی تێدابێت، لە بۆشایی ئاسماندا بەخێراییـەکی زۆر دەڕوات، هـەرگیز نـامۆ نییـە - هەروەك زانا گەردونناسەکان دانیان پێداناوە - کە ئەو تەنانە بەیەکـدا بخشـێن و بەیەکـدا بدەن، بەم هۆیەش سیستەمی بوون بە تەواوی لەناوبچێت.

د. ئیدوارد لوسر کیسیل دەڵێت: (گوێزرانەوەی گەرمی بەبەردەوامی هەیە لە تەنە گەرمەکانەوە بۆ تەنە ساردەکان، ناکرێت ئەم کردارە بەپێچەوانەوە ڕووبدات بەهۆی هێزێکی خودی.. واتای ئەمەش ئەوەیە کە بوونەوەر بەرەو ئاراستەیەك دەڕوات کە پلەی گەرمی هەموو لاشەکان یەکسان ئەبن، سەرچاوەی هێزیان لەناو دەچێت، ئا لەو کاتەدا هیچ کارلێکێکی کیمایی یاخود سروشتی نابێت، تەنانەت شوێنەواری ژیان بوونی نابێت لەم بوونەوەرەدا)./ الله یتجلی في عصر العلم.

جا ئەم تێڕوانینەمان بۆ ڕۆژی دوایی بەوێنەیەکی بەرایی، یەکێکە لە بەڵگە ڕۆشنەکان کە بەرپابوونی قیامەت شتێکی چاوەڕوانکراوەو شیاوی بوونە. بەبێ دوودڵی و گومان هەبوون لە داهاتوویەکی نزیکدا قیامەت بەرپا دەبێت[1].

## تەنها خوای گەورە زانایە بە کاتی بەرپابوونی ڕۆژیی دوای:

خوای گەورە کاتی بەرپابوونی ڕۆژی دوایی بە پەنهانی هێشتۆتەوە، ویستی لەسەر نەبووە کە بوونەوەر پێی بزانن، بۆیە هیچ فریشتە و پێغەمبەرێك یاخود هیچ یەکێکی تر زانا نین بەکاتەکەی، ئەمەش خۆی لەخۆیدا بەرپەرچی بانگەشەی ئەو نەفام و نەزان و دەجالانەیە کە دەڵێن کاتی ڕابوونی قیامەت فلانە ساڵەیە یان فیسارە ڕۆژەیە...

خوای گەورە بۆیە ئەو زانیارییەی شاردۆتەوە، چونکە واباشتر و چاکترە بۆ بەندەکان، تاکو خاو و ساردوسوڕ نەبن لە تەوبە کردن و تەمبەڵی نەکەن لە خۆئامادە کردن و ئامادەکاری بۆ ڕۆژی دوایی، هەروەك گومان لەوەدا نییە کە شاردنەوەی کاتی مردن لەبەرژەوەندی بەندەکاندایە[2].

قورئانی پیرۆزیش ئەمەی لە چەندین ئایەتدا باس کردووە، بۆ نموونە:

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى ۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ ۚ ثَقُلَتْ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً ۗ يَسْـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِىٌّ عَنْهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ الأعراف: ١٨٧. واتە: ("ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)" پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی قیامەت: کەی بەرپا دەبێت؟ پێیان بڵێ: بەڕاستی زانینی کاتی بەرپابوون هەر لای پەروەردگارمە، لە کاتێکدا کەس لەکات و ساتی خۆیدا دەری ناخات و بەرپای ناکات زاتی پەروەردگار نەبێت، بەرپا بوونی قیامەت زۆر گرانە و زۆر دەکەوێت لەسەر دانیشتوانی ئاسمانەکان و زەوی، ڕۆژی دوایی بەرپا نابێت کتوپڕ نەبێت،

---

[1] الاسلام يتحدى ٧٤-٧٦.

[2] لوامع الأنوار البهية ٢/٦٦.

لەپڕ یەخەتان پێ دەگرێت، وا پرسیارت لێ دەکەن هەر وەك تۆ زۆر عەودالّی زانینی هاتنی ڕۆژی قیامەت بیت و پرسیاری زۆرت لەبارەیەوە دەکرێت!! پێیان بڵێ: بەڕاستی زانینی بەرپا بوونی قیامەت تەنها لای خوایە، بەڵام زۆربەی خەڵکیش "ئەمە" نازانن).

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ ﴾ لقمان: ٣٤.[1] واتە: (بەڕاستی هەر خوا خۆی زانیاری بەرپابوونی ڕۆژی قیامەت دەزانێت).

هەروەها لە فەرموودەی (ئیمان و ئیسلامدا) هاتووە: جبریل پرسیاری لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کرد: سەبارەت بە کاتی بەرپابوونی ڕۆژی دوایی؟ فەرمووی: **(ما المسئول عنها بأعلم من السائل)**[2] واتە: پرسیار لێکراو زاناتر نییە لە پرسیارکەر لەبارەی کاتی بەرپابوونی ڕۆژی دوایی.

## ڕۆژی دوایی لە ناکاو بەرپا دەبێت:

بەرپا بوونی ڕۆژی دوایی شتێکی کتوپڕو لەناکاوە، خێرایی بەرپابوونی وەك چاو تروکانە یاخود خێراتریش، خوای تاك و تەنها دەفەرمووێت: ﴿ وَلِلَّهِ غَيۡبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَمَآ أَمۡرُ ٱلسَّاعَةِ إِلَّا كَلَمۡحِ ٱلۡبَصَرِ أَوۡ هُوَ أَقۡرَبُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴾ النحل: ٧٧. واتە: (کاتێکیش قیامەت کتوپڕ یەخەیان پێ دەگرێت، دەڵێن: ئاخ و داخ و پەشیمانی بۆ ئەو ڕۆژگارەی بەکەمتەرخەمی بردمانەسەر، لە کاتێکدا ئەوانە هەموو گوناهو تاوانیان داوە بەکۆڵیاندا، ئاگادار بن کە چەندە خراپە، کۆڵ و باری وا، کە هەڵی دەگرن).

[1] بڕوانە ئایەتانەش: الأحزاب ٦٣ و فصلت ٤٧ والزخرف ٨٥ والنازعات ٤٢-٤٦.

[2] فەرموودەی: ئیمان و ئیسلام. متفق علیه. رواه البخاري و مسلم في كتاب الايمان./ اللؤلؤ والمرجان ٢. پێشتر لەکاتی قسەکردن لەسەر چەمکی ئیسلام ئەم فەرموودەیە خرایەڕوو.

﴿ بَلْ تَأْتِيهِم بَغْتَةً فَتَبْهَتُهُمْ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ رَدَّهَا وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴾ الأنبياء: ٤٠.[1] واتە: (بەڵکو قیامەت کتوپڕ یەخەیان دەگرێت و سەرسام و ڕیسوایان دەکات، ئەوسا ناتوانن بەرەنگاری بوەستن و بیگێڕنەوەو مۆڵەتیشیان نادرێت).

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: **(تقومُ الساعةُ والرجلُ يَحْلُب اللّقْحةَ، فما يصل الاناء الى فيه حتى تقوم، والرجلان يتبايعان الثوبَ، فما يتبايعانه حتى تقوم، والرجُل يَلِط في حوضه فما يَصْدُرُ حتى تقوم)**[2] واتە: قیامەت دێت کاتێک کە پیاوێک خەریکە حوشترە دۆشەنیەکەی دەدۆشێت، فریاناکەوێت جامەکە بگەیەنێتە دەمی قیامەت هەڵدەستێت، دوو پیاو خەریکی کڕین و فرۆشتنی پۆشاکێك دەبن، مامەڵەکەیان نابڕێننەوە قیامەت دێت، پیاوێکیش خەریکی چاك کردنی حەوزەکەیەتی، لێنابێتەوە قیامەت دێت[3].

## ئەو کاتەی ڕۆژیی دوایی تیایدا بەرپا دەبێت ئەوا بڕوا هێنان لە بێ باوەڕان وەرناگیرێت و پاساوەکانیش پەسەند نین:

خوای گەورە لەوبارەوە دەفەرموێت: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ الْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِيَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِيَ بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِيٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا قُلِ انتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴾ الأنعام: ١٥٨. واتە: (ئایا ئەوانە چاوەڕێی هیچ شتێك دەکەن جگە لەوەی کە فریشتەی گیان کێشانیان بۆ بێت؟ یان پەروەردگارت خۆی ڕاستەوخۆ بێت بێ چەندو چوون؟ یان هەندێك لە نیشانەکانی پەروەردگارت دەربکەوێت "کە بەڵگەیە لەسەر بەرپابوونی قیامەت" لە ڕۆژی هاتنی هەندێك لە نیشانەکانی پەروەردگارت، ئەو کەسەی ئەو ڕۆژە ئیمان و باوەڕ دەهێنێت، ئەو ئیمان و

---

[1] بڕوانە ئەم ئایەتانەش: يوسف ١٠٧، الحج ٥٥، الزخرف ٦٦، محمد ١٨.

[2] فەرموودەی: قیامەت دێت کاتێك کە پیاوێك خەریکە... تاد: صحيح مسلم ٥٢ كتاب الفتن ٢٧ باب قرب الساعة رقم ٢٩٥٤، عن أبي هريرة (رضي الله عنه).

[3] دەقی کوردی ئەم فەرمایشتەم لە پوختەی سەحیحی موسلیم ١٠٣٩ وەرگرتووە. (وەرگێڕ).

باوەڕەی سوودی بۆ نابێت ئەگەر پێشتر ئیمانی نەهێنابێت یان كردەوەی چاكی هاوڕێ لەگەڵ ئیمانەكەیدا ئەنجام نەدابێت، پێیان بڵێ: چاوەڕێ بكەن "بزانن خوا چیتان بەسەر دەهێنێت" ئێمەش چاوەڕوانین).

هەروەها دەفەرموویێت: ﴿فَيَوۡمَئِذٍ لَّا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مَعۡذِرَتُهُمۡ وَلَا هُمۡ يُسۡتَعۡتَبُونَ﴾ الروم: ٥٧. واتە: (جا لەو ڕۆژەدا تكاو پاڕانەوەو بڕو بیانووی ئەوانەی ستەمیان كردووە، هیچ سوودێكی نییە بۆیان، بەهیچ شێوەیەك خوا لێیان ڕازی نابێت و ئەوانەش داوای لابردنی رق و قینی خوایان لێ ناكرێت، بەهۆی تۆبەوە خۆیان ڕزگار بكەن).

هەر كەسێ نكۆڵی بكات لە بەرپابوونی ڕۆژی دوایی ئەوا كەسێكی ستەمكارو گوناهبارەو دۆڕانی ئاشكرا بەشی دەبێت و دەچێتە دۆزەخەوە:

خوای باڵادەست دەفەرموویێت: ﴿بَلۡ كَذَّبُواْ بِٱلسَّاعَةِۖ وَأَعۡتَدۡنَا لِمَن كَذَّبَ بِٱلسَّاعَةِ سَعِيرًا﴾ الفرقان: ١١. واتە: (نەخێر "ڕەخنەكانیان بەجێ نییە"، ئەگینا ئەوان بڕوایان هەر بەقیامەت نییە، ئێمەش ئاگری بڵێسەدارمان بۆ ئەو كەسانە ئامادەكرووە كە بڕوایان بە قیامەت نییە).

هەروەها دەفەرموویێت: ﴿أَلَآ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُمَارُونَ فِي ٱلسَّاعَةِ لَفِي ضَلَٰلِۭ بَعِيدٍ﴾ الشورى: ١٨. واتە: (ئاگادار بن لە ڕاستیدا ئەوانەی موجادەلە لەسەر قیامەت دەكەن و بەگومانن لێی، لە بزربوون و سەر لێشێواویەكی قووڵدا ڕۆچوون).

﴿وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ١٠ ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ ١١ وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعۡتَدٍ أَثِيمٍ ١٢﴾ المطففين: ١٠ - ١٢. واتە: (هاوارو ئاهوناڵە لەو ڕۆژەدا بۆ ئەوانەی بڕوایان نییە و بەرنامەی خوا بەدرۆ دەزانن. ئەوانەی كە باوەڕیان بە ڕۆژی قیامەت و زیندوو بوونەوە نییە و هەمیشە بەدرۆی دەزانن. كەسیش بەرپابوونی ئەو ڕۆژە بە درۆ نازانێت، مەگەر هەموو ستەمكارێكی گوناهبار نەبێت).

### نیشانەكانی بەرپابوونی ڕۆژی دوایی:

قورئانی پیرۆز لە چەندین ئایەتدا هەواڵی پێداوین كە كاتی بەرپابوونی ڕۆژی دوایی (قیامەت) نزیك بۆتەوە، بۆ نمونە:

ئەم فەرمایشتەی خـوای گـەورە: ﴿ٱقۡتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمۡ وَهُمۡ فِي غَفۡلَةٖ مُّعۡرِضُونَ﴾ الأنبياء: ١. واتە: (موحاسەبە و لێپرسینەوەی خەڵکی نزیك بۆتەوە، لەکاتێکدا "زۆربەی" ئـەوان بـێ ئاگـا و غـافڵن و پشـتیان لـە ئـایینی خـوا کـردووەو ڕوو وەرِدەگێـڕن "لـە بەرنامەکەی").

هـەروەها دەفـەرمووێت: ﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ﴾ القمـر: ١.[1] واتـە: (ڕۆژی قیامەت نزیك بۆتەوەو مانگیش لەت بوو).

قورئـانی پـیرۆز هـەواڵی پێـداوین بـەوەی هەنـدێك لـە نیشـانەکانی ڕۆژی قیامـەت دەرکەوتوون:

هەروەك دەفەرمووێت: ﴿فَهَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأۡتِيَهُم بَغۡتَةٗۖ فَقَدۡ جَآءَ أَشۡرَاطُهَا﴾ محمد: ١٨. واتە: (ئایا ئەوانە چاوەڕێی چی دەکەن جگە لە قیامـەت کـە لـەناکاو یەخـەیان پـێ بگرێت؟ چونکە بەڕاستی هەندێك لە نیشانەکانی دەرکەوتووە).

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەو تەمەنەی کە جیهان ماوەیـەتی زۆر کـەمترە لـە تەمـەنی بەسەرچوو.

نمونەی ئەو نیشانانەی کە قورئانی پیرۆز بۆ ئێمەی باس کردووە، بریتییـە لـە: ئـاوەدان کردنەوەی زەوی و پێشکەوتنی زانستی بەشێوەیەك کە خاوەنانی ئەم پێشکەوتنانە بڕوایـان وایە کە دەتوانن بەویستی خۆیان گۆڕانکاری بکەن، خوای گـەورە لـەوبارە دەفـەرمووێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلۡأَرۡضُ زُخۡرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتۡ وَظَنَّ أَهۡلُهَآ أَنَّهُمۡ قَٰدِرُونَ عَلَيۡهَآ أَتَىٰهَآ أَمۡرُنَا لَيۡلًا أَوۡ نَهَارٗا فَجَعَلۡنَٰهَا حَصِيدٗا كَأَن لَّمۡ تَغۡنَ بِٱلۡأَمۡسِۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ﴾ یونس: ٢٤. واتە: (هەتا کاتێك وای لێدێت زەوی، بەجوانی نەخش و نیگـاری خۆی دەردەخات و خۆی دەڕازێنێتەوە، خەڵکەکـەی واگومـان دەبـەن بەڕاسـتی هەمیشـە دەسەڵاتداری تەواون بەسەریدا "ئا لەو کاتەدا کە خەڵکی خراپ و غافڵن و دڵیـان بـەدنیا خۆشە و هەرچی گوناهو تاوانە دەیکەن" ئەوەی فەرمانی ئێمەیان بۆ دەردەچێت لە شـەودا

[1] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: الشوری ١٧، النجم ٥٧.

یـان لـه ڕۆژدا، ئەوسـا وەك كشـتوكاڵی دروێنـەكراوی لـێ دەكـەین، هـەروەكو دوێنـێ نەبوو‌بێت).

هـەروەها پێغەمبـەری ڕاسـتگۆش نیشـانەكانی بـەرپابوونی ڕۆژی دوایـی بەچـەندین فەرمووده ڕوون كردۆتەوە، بۆ نمونە:

حوزەیفەی كوڕی ئەسیدی غیفاری (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: ڕۆژێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هاتە لامان كە ئێمە لە نێـو خۆمانـدا قسـەمان دەكـرد، فـەرمووی: **(ما تذاكرون؟)** واتە: باسی چی دەكەن؟ وتمان: باسی بەرپابوونی قیامەت دەكـەین، فـەرمووی: **(إنها لن تقوم حتى ترون قبلها عشر آيات، فذكر: الدخان، الدجال، الدابة، وطلوع الشـمس من مغربها، ونزول عيسى بن مريم، ويأجوج ومـأجوج، وثلاثـة خسـوف: خسـف بالمشـرق، وخسف بالمغرب، وخسف بجزيرة العرب، وآخر ذلك: نار تخرج مـن الـيمن، تطـرد النـاس إلى محشرهم)** واتە: قیامەت بەرپا نابێت تاكو (دە) نیشانە لە پێشەوە نـەبینن، ئینجـا باسـی ئەمانەی كرد: دووكەڵ، دەجال، گیانلەبەرەكە[1]، هـەڵهاتنی خـۆر لـە خۆرئـاواوە، هاتنـە خوارەوەی عیسای كوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێ بێت)، هاتنی یەئجووج و مەئجووج، هەروەها سێ ڕۆچوونی زەوی: یەكێك لە خۆرهەڵات، یەكێك لە خۆرئاوا، یـەكێكی تـریش لە نیوە دوورگەی عەرەبی، كۆتایی ئەوانە ئاگرێكە لە یەمەن پەیـدا دەبێـت، كـە خـەڵك بەرەو شوێنی كۆبونەوە ڕاپێچ دەكات.

ئەمانە نیشانەی زۆر مەزنن لەسەر لەناوچوونی دونیا و كۆتایی هاتنی.

چەندین فەرمووده هاتوون ئاماژە دەدەن كە ئەمانەی خوارەوەش لە نیشـانەكانی ڕۆژی دواییـنە:

---

[1] ئەو گیانلەبەرە قسە لەگەڵ خەڵكیدا دەكات، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا وَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ﴾ النمل: ٨٢. واتە: (كاتێك بڕیاری بەرپابوونی "قیامەت درا یاخود نزیك بووەوە"، زیندەوەرێك لە زەوی دەردەهێنین، قسەیان بۆ دەكات). (وەرگێڕ).

هاتنی پێغەمبەر موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)، کۆچی دوایی کردنی و ڕزگاربوونی بەیتولمەقدیس و نەمانی زانست و بڵاوبوونەوەو زاڵبوونی نەفامی و نەزانی، دەسەڵات گرتنەدەستی نەزانان، زۆربوونی زینا و خواردنەوەی مەیی، کەمبوونەوەی ڕێژەی پیاو، زیادبوونی ژمارەی ئافرەتان، بەفیڕۆدانی سپاردەو نەپاراستنی، فەرامۆش کردنی نوێژ، خواردنی سوو (ڕیبا)، بەرزکردنەوەی باڵای خانوو و تەلارەکان، ڕازاندنەوەی مزگەوتەکان، بوونی منداڵ بە ئەمیر، نەفرەتکردنی کۆتایی ئومەت لە پێشینە و سەرەتاکەی، زۆربوونی کوشتن و خوێن ڕشتن، هاتنە خوارەوەی بەڵاو فیتنە وەك باران، زۆربوونی چەرمەسەری تا وای لێدێت پیاو بەلای گۆڕی یەکێکی تردا دەچێت هیوای ئەوە دەخوازێت کە لە جێگەی مردووەکەدا بێت لەبەر سەختی چەرمەسەرییەکە، لەناوچوونی ئەم ئومەتە هەندێکیان بەهۆی هەندێکی تریانەوە...

جا ئەم نیشانانە هەندێکیان هاتوونەتەجێ، هەندێکی تریان لە بن باڵی پەنها و غەیبەوە ماونەتەوە کە بە تێپەڕبوونی ڕۆژگارەکان بەدوای یەکدا هاتنی ڕۆژەکان ئاشکرای دەکەن و دەری دەخەن.

کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەواڵی لەبارەی ئەم شتانەوە داوە، خۆی لەخۆیدا بەڵگەیەکە لەسەر ڕاستێتی پێغەمبەرایەتیەکەی[1].

پێویستە لەسەر ئێمە بڕوامان هەبێت بەو هەواڵ و خەبەرانەی پێغەمبەری مەزن (صلی الله علیه وسلم) و بەڕاستیان دابنێین، جا هەروەك هەندێك لەو نیشانانە هاتوونەتەجێ، ئەوانەش کە ماونەتەوە بێگومان دێنەجێ. (قورتوبی) دەڵێت:

---

(1) بۆ زانیاری تێرو تەسەل لەسەر ئەو نیشانانە و فەرموودانەی لەبارەیانەوە هاتوون، بگەڕێوە بۆ: تذكرة القرطبي ولوامع الأنوار البهية ب ۲.

فەرموودەی:ڕۆژێك پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)هاتە لامان...تاد: صحيح مسلم ٥٢ كتاب الفتن وأشراط الساعة، ۱۳ باب في الآيات التي تكون قبل الساعة رقم ۲۹۰۱ (۳۹) ورواه أبو داود والترمي وإبن ماجه.

(زانایان وتویانە: حیکمەت لەوەی نیشانەکانی بەرپابوونی ڕۆژی قیامەت پێشخراون و خەڵکی لێی ئاگادار کراوەتەوە، بەئاگا هێنانەوەی خەڵکە لە پاڵدانەوەیان و هاندانیانە بۆ ئەوەی بۆخۆیان ئامادەباشی وەربگرن، بەوەی تۆبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، تاکو لەناکاو و کتوپڕ نێوانی ئەوان و تەوبە دانەخرێت و بەهۆی کۆمەڵێك ڕووداوەوە بە تۆبە ڕانەگەن، جا پێویستە خەڵك دوای دەرکەوتنی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی بەخۆیاندا بچنەوەو پشت لە دونیا بکەن و خۆیان ئامادە بکەن بۆ کاتی ڕابوونی قیامەت کە خوای گەورە پەیمانی لەبارەوە داوە)[1].

## ناخۆشییەکانی بەرپابوونی ڕۆژی دوایی:

قورئانی پیرۆزوێنەی دیمەنەکانی بەرپابوونی ڕۆژی دوایی دەکێشێت کە زۆر مەترسیدارو ترسێنەرو سامناك و سەخت و ناخۆشە و ترسێکی زۆر لە دەروونی ئەو کەسانەدا دەروێنێت کە بێباوەڕ بوونە پێی، بەشێوەیەکی زۆر ترسێنەر:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٞ ۝١ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّآ أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٞ ۝٢﴾ الحج: ١-٢. واتە: (ئەی خەڵکینە لە پەروەردگارتان بترسن و خۆتان لە خەشمی بپارێزن، چونکە بەڕاستی زەوی لەرزەی قیامەت و کاوڵ بوونی بوونەوەر کارەساتێکی زۆر گەورەیە و ڕوداوێکی سامناکە. لەو ڕۆژەدا کە کارەساتەکە دەبینن، هەموو شیردەرێك لە شیرە خۆرەکەی خۆی بێ ئاگا و فەرامۆش دەبێت، هەموو سك پڕو دوو گیانێکیش کۆرپەلەکەی دادەنێت و خەڵکی دەبینیت، وەکو سەرخۆشن، لەڕاستیدا سەرخۆشیش نین، بەڵکو سزای خوایی زۆر سەخت و سامناکە و سەری لێ شێواندوون).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِۚ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْوَعِيدِ ۝٢٠ وَجَآءَتْ كُلُّ نَفْسٖ مَّعَهَا سَآئِقٞ وَشَهِيدٞ ۝٢١ لَّقَدْ كُنتَ فِي غَفْلَةٖ مِّنْ هَٰذَا فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلْيَوْمَ حَدِيدٞ ۝٢٢﴾ ق: ٢٠-

[1] التذكرة للقرطبي ٦٢٤.

٢٢. واتە: (لەوەودوا فوو دەکرێت بە صوردا، ئیتر ئەوە ڕۆژی پێشهاتنی هەڕەشەو ئاگادار کردنەوەکانە. ڕۆژی قیامەت دێت و هەموو کەسێك دوو کەسی لەگەڵدایە، یەکێکیان دەیگەیەنێت و ئەوی تریشیان شایەتە بەسەریەوە. بەیەکە یەکەی بێباوەڕان دەوترێت: سوێند بەخوا بەڕاستی تۆ لەم بەسەرهاتانە نائاگا بوویت و گوێی خۆتت لێ خەواندبوو، ئێستا ئێمە پەردەمان لەسەر چاوەکانت لاداوەو هەموو شتێك وەکو خۆی دەبینیت و ئەمڕۆ چاوەکانت تیژە).

ئینجا ئەم سەختی و سامناکیە زەوی و ئاسمان و گیانلەبەرو مرۆڤ و بچوك و گەورە بەهەشت و دۆزەخ دەگرێتەوە، کە هەر هەموویان لە چاوەڕوانیدان و ترس دایگرتوونی.

خوای پایەبەرز دەفەرموویت: ﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ ۝ وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتْ ۝ وَإِذَا ٱلْجِبَالُ سُيِّرَتْ ۝ وَإِذَا ٱلْعِشَارُ عُطِّلَتْ ۝ وَإِذَا ٱلْوُحُوشُ حُشِرَتْ ۝ وَإِذَا ٱلْبِحَارُ سُجِّرَتْ ۝ وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتْ ۝ وَإِذَا ٱلْمَوْءُۥدَةُ سُئِلَتْ ۝ بِأَىِّ ذَنۢبٍ قُتِلَتْ ۝ وَإِذَا ٱلصُّحُفُ نُشِرَتْ ۝ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ كُشِطَتْ ۝ وَإِذَا ٱلْجَحِيمُ سُعِّرَتْ ۝ وَإِذَا ٱلْجَنَّةُ أُزْلِفَتْ ۝ عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّآ أَحْضَرَتْ ۝﴾ التكوير: ١-١٤. واتە: (کاتێك خۆر دەپێچرێتەوەو ڕووناکی نامێنێت. کاتێکیش ئەستێرەکان "لە خولگەی خۆیان" دەترازێن و دەدەن بەیەکدا. کاتێك کێوەکان لەشوێنی خۆیان هەڵدەکەندرێن و بەملاولادا دەبرێن. کاتێك حوشترانی ئاوس کە تەمەنی بارداربییان دە مانگە گوێیان پێ نادرێت. کاتێك گیانلەبەرانی کێوی و وەحشی و دڕندە بە دەوری یەکدا کۆدەکرێنەوە. کاتێك دەریاکان گڕ دەدرێن. کاتێك گیانی هەر کەس دەگەڕێتەوە بۆ لاشەی و جووت دەبێتەوە لەگەڵیدا. کاتێك کچی زیندە بەچاڵکراو پرسیاری لێ دەکرێت. بە چ گوناهێك کوژرا ؟!. کاتێك نامەی کردەوەکان واڵا دەکرێت. کاتێك ئاسمان لادەبرێن و دادەماڵرێن. کاتێك دۆزەخ دادەگیرسێت و تاودەدرێت. کاتێك بەهەشت نزیك دەخرێتەوە "لە خوانەناسان". ئیتر ئەوکاتە هەرکەس دەزانێت چی ئامادە کردووە و چ توێشوویەکی پێیە).

سەختی و ناخۆشییەکە زەوی لەبەری دێتە لەرزین و چیاکان دەلەقێن و ئاسمان لەت دەبێت و کۆمەڵەکان پەرت دەبن و لەو ڕۆژەدا منداڵ پیر دەبێت و هەر کەسەو بەخۆیەوە سەرقاڵە جا یا ئەوەتا: باوەڕدارێکی ڕووخۆش و گەشە یاخود تاوانبارێکی ڕووگرژ و سەرشۆڕە، قورئانی پیرۆز ئەم دیمەنەمان بۆ وێنە ئەکێشێت بەشێوەیەکی زیندوو سەرسوڕهێنەر، کە زۆر بەجوانی وێنەکە بۆ خوێنەر دەخاتەڕوو، بەشێوەیەك ویژدان دێنێتە هەژان:

خوای پاك و تاك دەفەرمووێت: ﴿ يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ وَكَانَتِ ٱلْجِبَالُ كَثِيبًا مَّهِيلًا ﴾ المزمل: ١٤. واتە: (لە ڕۆژێکدا کە زەوی و کێوەکان دێنە لەرزە، سەرەنجام کێوەکان وردو خاش دەبن و وەکو تەپۆلکەی لمیان لێ دێت).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿ يَوْمًا يَجْعَلُ ٱلْوِلْدَٰنَ شِيبًا ﴿١٧﴾ ٱلسَّمَآءُ مُنفَطِرٌۢ بِهِۦ ﴾ المزمل: ١٧-١٨. واتە: (ئەو ڕۆژەی کە منداڵ پیر دەکات و سەری سپی دەبێت؟. ئەو شەوە ئاسمان بەهەموو ئەستێرە و هەسارەکانیەوە لەت و پەت دەبێت).

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْجِبَالِ فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّى نَسْفًا ﴿١٠٥﴾ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا ﴿١٠٦﴾ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمْتًا ﴿١٠٧﴾ ﴾ طه: ١٠٥-١٠٧. واتە: (پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی کێوەکان "کە لە بەرپا بوونی قیامەتدا چیان بەسەر دێت"، ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) تۆ پێیان بڵێ: پەروەردگارم هەڵی دەتەکێنێت و وردو خاشی دەکات. جا پەرش و بڵاوی دەکاتەوەو دەیکاتە زەوییەکی پان و تەخت و بەرین و وازی لێدەهێنێت و بەجێی دەهێڵێت. هیچ خوارو خێچی و بەرزی و نزمیەك لەسەر ڕووکاری نابینیت).

﴿ يَوْمَ نَطْوِى ٱلسَّمَآءَ كَطَىِّ ٱلسِّجِلِّ لِلْكُتُبِ ۚ كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ۚ وَعْدًا عَلَيْنَآ ۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴾ الأنبياء: ١٠٤. واتە: (ڕۆژێك دێت ئێمە ئاسمان دەپێچینەوە، وەك چۆن کتێبی کراوە دادەخرێت و دەپێچرێتەوە هەروەك چۆن لەسەرەتاوە دروستمان کرد، وەك ئەوسای خۆی لێ دەکەینەوە، جا ئەوە پەیمان و بەڵێنی ئێمەیە، بێگومان ئێمە ئەو کارە ئەنجام دەدەین).

﴿ يَوْمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ كَٱلْفَرَاشِ ٱلْمَبْثُوثِ ۝٤ وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ٱلْمَنفُوشِ ۝٥ ﴾ القارعة: ٤-٥. واتە: (ئەو ڕۆژە خەڵکی وەکو پەپولەی سەرگەردان پەرش و بڵاو دەبنەوە. کێوەکانیش وەکو خوری شیکراوەیان لێ دێت).

﴿ يَوْمَ يَفِرُّ ٱلْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ ۝٣٤ وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ۝٣٥ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ ۝٣٦ لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ ۝٣٧ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُّسْفِرَةٌ ۝٣٨ ضَاحِكَةٌ مُّسْتَبْشِرَةٌ ۝٣٩ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ ۝٤٠ تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ ۝٤١ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَفَرَةُ ٱلْفَجَرَةُ ۝٤٢ ﴾ عبس: ٣٤ - ٤٢. واتە: (ئەو ڕۆژە "هێندە سامناکە" برا لەدەست برا هەڵدێت و ڕادەکات و خۆی لێ دەشارێتەوە. هەروەها لە دەست دایکی و باوکی. لە دەست هاوسەرو کوڕەکانی. لەو ڕۆژەدا هەر کەسێك لەوانە ئەوەندە سەرگەرمی کێشەی خۆیەتی، ناتوانێت فریای کەسی تر بکەوێت. لەو ڕۆژەدا ڕووخسارانێك گەش و جوان و ڕوون و شاد و دەم بەپێکەنینن، و مژدەو شادیان لێ دەدرەوشێتەوە. لەو ڕۆژەدا ڕووخسارانێکیش هەن کە گرژو تاڵ و ترش و تۆزاوی و پەست و غەمگینن. و دێزی و ڕەشی و تاریکی داپۆشیوون. ئا ئەوانە بێ باوەڕو خوانەناس و تاوانبارو گوناهکارەکانن).

﴿ كَلَّآ إِذَا دُكَّتِ ٱلْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا ۝٢١ وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا ۝٢٢ وَجِاْىٓءَ يَوْمَئِذٍۭ بِجَهَنَّمَ ۚ يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكْرَىٰ ۝٢٣ يَقُولُ يَٰلَيْتَنِى قَدَّمْتُ لِحَيَاتِى ۝٢٤ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٌ ۝٢٥ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٌ ۝٢٦ ﴾ الفجر: ٢١ - ٢٦.[١] واتە: (نەخێر، "هەر ئاوا بۆتان نالوێت"، کاتێك دێت کە زەوی وردو خاش دەکرێت و لەناکاو دەدرێت بەیەکدا. پەروەردگارت دێت و فریشتەکانیش پۆل پۆل. ئەو ڕۆژە دۆزەخ دەهێنرێت و نیشان دەدرێت، جا ئەو ڕۆژە "ئادەمیزادی بێ باوەڕ" دەزانێت چ بەڵایەکی بەسەر خۆیدا هێناوە، بەڵام تازە بەخۆدا هاتنەوەو پەشیمانی هیچ سوودێکی نییە و دادی نادات؟!. "ئەوسا بە کەساسی و هەناسەی ساردەوە" دەڵێت: خۆزگە بۆ ئەم ژیانە دەست پێشخەریم بکردایە. جا ئیتر ئەو ڕۆژە کەس وەکو خوا بەخەشم و قین نییە لە بێ باوەڕان، لەبەر ئەوە

---

[١] سەیری ئەم دیمەنە و هاوێنەکانی بکە لە کتێبی: مشاهد القيامة في القرآن - سيد قطب.

سزایەکیان دەدات کە کەس ناتوانێت سزای لەو چەشنە بدات. کەسیش وەکو ئەو زاتە "بێباوەڕان" نابەستێتەوەو بەندیان ناکات).

## شەیپور، کەڕەنا (الصور)

### پێناسەکەی:

شاخ و قۆچێکە وەك شەیپورو کەڕەنا، (ئیسرافیل) فووی تێدەکات، لەو کاتەی کە خوای گەورە ڕێگە بە بەرپابوونی ڕۆژی دوایی دەدات.

ترمزی لە عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (خوا لێیان ڕازی بێت) گێڕاویەتیەوە: کە عەرەبێکی دەشتەکی هاتە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و فەرمووی: شەیپور (صور) چییە؟ فەرمووی: (قرنٌ يُنْفخ فيه)[1]. واتە: شاخ و قۆچێکە فوی تێدەکرێت.

مجاهد وتویەتی: شەیپور (صور) وەك شاخ و قۆچە. بخاری ئەم وتەیەی هێناوە.

### ژمارەی ئەو فوانەی دەکرێن بە شەیپوردا:

زانایان ڕاجیان لەبارەی ژمارەی ئەو فوانەی کە بەشەیپوردا ئەکرێن، لەمبارەوە دوو ڕایان هەیە:

**ڕای یەکەم:** سێ فووە: ئەم ڕایە (ئیبن عەرەبی) و جگەلەویش پەسەندیان کردووە.

**فووی یەکەم:** ئەمە فووی ترس و بیم گرتن و تۆقینە، کە بەهۆی ئەم فووە جیهان گۆڕانی بەسەردا دێت و سیستەمەکەی تێکدەچێت، دانیشتوانی ئاسمانەکان و زەوی لەبەر سامناکی ئەو فووەو دەنگە دەتۆقێن، مێینەی سکپڕ منداڵەکەی لەبار دەچێت، منداڵ بەهۆیەوە پیر دەبێت، ئەمەش ئەو فوەیە کە لەم فەرمایشتەی خوای گەورەدا ئاماژەی بۆکراوە: ﴿ وَمَا يَنظُرُ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ مَّا لَهَا مِن فَوَاقٖ ﴾ ص: ١٥. واتە: (ئەوانە چاوەڕوانی هیچ شتێك ناکەن، تەنها یەکدەنگی سامناکی گەورە نەبێت، کە کتوپڕ ڕوودەدات و پێویستی بەدوبارە بوونەوە نیە).

---

[1] فەرموودەی: شاخ و قۆچێکە فوی تێدەکرێت... تاد: سنن الترمذي، كتاب صفة القيامة، باب ما جاء في شأن الصور، ١٤٥/٧. وقال: حديث حسن.

هەروەها لەم فەرمایشتەدا: ﴿ وَيَوْمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ فَفَزِعَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۚ وَكُلٌّ أَتَوْهُ دَٰخِرِينَ ﴾ النمل: ٨٧. واتە: (یادی ڕۆژێك بکەن کە فوو دەکرێت بە - صور -دا، هەر کەس لە ئاسمانەکان و هەرکەس لە زەویدا، ترس و بیمێکی زۆر دایدەگرێت، جگە لەوانەی کە ویستی خوا وایە ترس و بیمیان نەبێت).

**فووی دووەم:** فووی کەڕبوون و مردن و لەناوچوون، بەم فووە هەموو کەسێك لەناو دەچێت.

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ﴾ الزمر: ٦٨. واتە: (لەو ڕۆژەدا فوو دەکرێت بە - صور -دا، هەر کەس لە ئاسمانەکان و زەویدا مابێت خێرا دەمرێت، مەگەر کەسێك خوا ویستی لەسەر مردنی نەبێت). هەندێك وشەی (صعق)یان بە مردن لێکداوەتەوە.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: **(یطوي الله عزوجل السماوات یوم القیامة، ثم یأخذهن بیده الیمنی، ثم یقول: أنا الملك، أین الجبارون، أین المتکبرون؟ ثم یطوي الأرضین بشماله، ثم یقول: أنا الملك، أین الجبارون، أین المتکبرون؟)**[1] واتە: خوای باڵادەست لە ڕۆژی قیامەتدا ئاسمانەکان دەپێچێتەوە، پاشان بەدەستی ڕاستی ڕایان دەگرێت، ئینجا دەفەرموویێت: منم پاشا، دەسەڵاتدارە بەزەبرەکان لە کوێن؟ خۆبەزلزانەکان لە کوێن؟، پاشان زەویش بەدەستی چەپی دەپێچێتەوەو، دەفەرموویێت: منم پاشا، دەسەڵاتدارە بەزەبرەکان لە کوێن؟ خۆ بەزلزانەکان لەکوێن؟[2].

**فووی سێیەم:** ئەمە فووی زیندوو کرنەوەو هەستانەوەیە لەگۆڕو بڵاوبوونەوە بە گۆڕەپانی ڕۆژی دواییدا، هەروەها ڕاوەستان لەبەردەم بارەگای خوای جیهان.

---

[1] فەرمودەی: خوای باڵادەست لە ڕۆژی قیامەتدا ئاسمانەکان دەپێچێتەوە... تاد: صحیح مسلم ٥٠ کتاب صفة القیامة والجنة والنار رقم ٢٧٨٨ عن عبدالله بن عمر (رضي الله عنهما).

[2] دەقی کوردی ئەم فەرمایشتەم وەرگرتووە لە پوختەی سەحیحی موسلیم، ٩٧٧. (وەرگێڕ).

خوای گەورە دەفـەرموویێت: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ﴾ یس: ٥١. واتە: (پاشان هەر کە فوو دەکرێت بە - صور -دا، دەستبەجێ خێـرا هـەموویان لە گۆڕەکانیان لە توێی خاکەوە بەپەلە دێنە دەرەوە بۆ لای پەروەردگاریان).

هـەروەها دەفـەرموویێت: ﴿ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ﴾ الزمر: ٦٨. واتـە: (لەوەدوا فوویەکی تری پیادا دەکرێتەوە، جا دەستبەجێ هەر هەموو خەڵکی هەستاونەتە سەپێ و بەسەرسامیەوە چاوەڕوانن).

**ڕای دووەم**: پێیان وایە دوو فووە، فووی تۆقێنەرو فووی لەناوبەر بەیەك فـوو ئـەژمار دەکەن، چونکە هەر دووکیان پەیوەستن بەیـەکترەوە، واتـە: بەشـێوەیەك سـامیان گـرت و تۆقین کە لە تاوان مردن، (قرطبی) ئەم ڕایەی پەسەند کردووە، بەم بەڵگانەی خوارەوە:

أ- ئەم فەرمایشتەی ئەبو هوڕەیرە (ڕەزای خوای لێبێت)، کە دەڵێـت: پێغەمبـەری خـوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: **(ما بین النفختین أربعون)** واتـە: مـاوەی نێـوان هەردوو فووەکە چلە. وتیان: ئەی ئەبو هوڕەیرە چـل ڕۆژ؟ وتـی: نـاڵێم ئەوەندەیـە. وتیان: ئەی چل مانگ؟ وتی: نـاڵێم ئەوەندەشـە. وتیـان: چـل سـاڵ؟ وتـی: نـاڵێم ئەوەندەیە...[1].

ب- ئیبن موبارەك لە حەسەنەوە گێڕاویەتیەوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: **(بین النفختین أربعون سنة، الأولی: یمیت الله تعالی بها کـل حي، والأخری: یحي الله بها کل میت)** واتە: مـاوەی نێـوان هـەر دوو فووەکـە چـل ساڵە، فووی یەکەم: خوای گەورە هەموو زینـدەوەرێکی پـێ ئـەمرێنێت و لـەناوی دەبات، فووی دوەمیش: خوای گەورە هەموو مردوێکی پێ زیندوو دەکاتەوە.

[1] فەرموودەی: لە نێوان دوو فووەکە چلە... تاد: صحیح مسلم ٥٢ کتاب الفتن ٢٨ باب ما بین النفختین، رقم ٢٩٥٥، بهذا اللفظ.
و في صحیح البخاري بلفظ مقارب: ٦٥ کتاب التفسیر - سورة الزمر، ٤ باب ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ﴾ رقم ٤٨١٤ و ٦٥ کتاب التفسیر - سورة عم یتاساءلون، ١ باب ﴿وَيَوْمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ﴾ رقم ٤٩٣٥.

پ- ئــەو جیاکردنــەوەو هــەڵاواردن (اســتثناء)ە: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ﴾ الزمــر: ٦٨. کــە لــەم دوو ئایەتــەدا هــاتووە: ﴿وَيَوْمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ فَفَزِعَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ وَكُلٌّ أَتَوْهُ دَٰخِرِينَ﴾ النمل: ٨٧. بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەریەك شتە.

حلیمی دەڵێت: گێڕانەوەکان کۆکن لەسەر ئەوەی ماوەی نێـوان هـەر دوو فووەکـە چـل ساڵە، بە بەڵگەی فەرموودەی پێشوو.

ڕاڤەکارانی قورئانی پیرۆز دەڵێن: بانگدەرو هاوارکەرەکە (اسرافیل)ە کە فوو ئەکات بە شەیپوردا[١].

❊❊❊

## کۆکردنەوە (الحشر)

### پێناسەکەی و بەڵگەکەی:

حشر لە بنچینەی زمانەوانیدا: بە کۆکردنەوە دێت[٢]. دەوترێت: (حشرت الناس) واتە: خەڵکم کۆکردەوە. مەبەستیش لە کۆکردنەوەی ڕۆژی دوایی بریتییە لە:

١- کۆکردنەوەی مردوان لە گۆڕەکانیاندا، دوای زیندوو کرانەوەیان. واتە: کۆکردنەوەی سەرجەم بەشەکانی لاشەی مردوو، دوای بڵاوبوونەوەو پەرتەوازە بوونیان[٣]، پاشان زینـدوو کردنەوەی لاشەکان پاش مردنیان. جا هاوتایە لەگەڵ زیندوو بوونەوەو بڵاوبونـەوە (البعـث والنشور) لە گۆڕەپانی ڕۆژی دواییدا.

---

[١] لوامع الأنوار البهية ٢ /١٦١ و لاپەڕەکانی دواتری، تذكرة القرطبی ١٦٥-١٨٥.

[٢] قاموس المحيط مادة (حشر).

[٣] سەیری ڕاجیایی زانایانی کەلام بکە لەسەر ئەوەی: ئایا زیندوو کردنەوەو کۆکردنەوە لە ڕۆژی دواییدا، دووبارە بە دیهێنانەوەیە لە دوای نەمان و تیاچوون؟ یاخود کۆکردنەوەی بەشەکانی لاشەی مردووە لە دوای پەرت و پەرش و بڵاوبوون؟ بەڵگەکانی لەم بارەوە هێناوە لە: المقاصد وشرحه ٢١٥/٢-٢١٨.

خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَٱسْتَمِعْ يَوْمَ يُنَادِ ٱلْمُنَادِ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴿٤١﴾ يَوْمَ يَسْمَعُونَ ٱلصَّيْحَةَ بِٱلْحَقِّ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُرُوجِ ﴿٤٢﴾ إِنَّا نَحْنُ نُحْيِۦ وَنُمِيتُ وَإِلَيْنَا ٱلْمَصِيرُ ﴿٤٣﴾ يَوْمَ تَشَقَّقُ ٱلْأَرْضُ عَنْهُمْ سِرَاعًا ذَٰلِكَ حَشْرٌ عَلَيْنَا يَسِيرٌ ﴿٤٤﴾﴾ ق: ٤١ - ٤٤. واتـە: (گـوێش بەچـاکی ڕابگرە!! ڕۆژێك دێـت بـانگ وێـژێك بـانگ دەکـات لـە شـوێنێکی نزیکـەوە. ئـەو ڕۆژە دەنگێکی زۆر بەرز و سامناك دەبیستن، دیارە ئەو ڕۆژە هاتنە دەرەوەیـە لـەتوێی خاکـدا. بەڕاستی هەر ئێمە ژیان دەبەخشین و دەشیان مرێنین، گەڕانـەوەش هـەر بـۆ لای ئێمەیـە. ڕۆژێك دێت زەوی لە ئاستی ئەوان شەق دەبێت و خەڵکی لە گۆڕەکانیـان بـەگورجی دێنـە دەرەوە.. ئا ئەوە کۆکردنەوەیەکە لای ئێمە زۆر ئاسانە).

لە فەرموودەیەکی موسلیمدا هاتووە:

سەهلی کوڕی سەعد دەڵێـت: پێغەمبـەری خـوا (صـلى الله عليـه وسـلم) فەرموویـەتی: **(يُحشر الناسُ يوم القيامة على أرضٍ بيضاء عفراء كقُرْصَةِ النَّقي، ليس فيها عَلَم لأحد)**[1] واتە: خـەڵکی لـە ڕۆژی قیامەتـدا کۆدەکرێنـەوە لەسـەر زەوییـەکی سـپی خـاکی، وەك کولێرەیەکی دروستکراو لە ئاردێکی بێژراو نیشان کردنی تێدا نییە بۆ هیچ کەسێك[2].

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا کە (موسلیم) گێڕاویەتیەوە:

ئیبن عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبـەری خـوا (صـلى الله عليـه وسـلم) هەڵسا وتارێکی دا و ئامۆژگاری کردین و فەرمووی: **(يا أيها الناس انكم تُحشرون الى الله حُفـاة عُـراة غُـرْلاً)** ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ وَعْدًا عَلَيْنَآ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ﴾ الأنبياء: ١٠٤.[3] واتە: ئەی خەڵکینە، ئێوە بەپێی پەتـی و ڕووت و قـووتی و خەتەنـە نەکراوی کۆدەکرێنەوە. (هەروەك چۆن لە سەرەتاوە دروسـتمان کـرد، وەك ئەوسـای خـۆی

---

[1] فەرموودەی: خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا کۆ دەکرێنەوە... تاد: صحيح مسلم ٥٠ كتاب صفات المنافقين ٢ باب في البعث والنشور رقم ٢٧٩٠ عن سهل بن سعد.

[2] دەقی کوردی ئەم فەرمایشتەم وەرگرتووە لە پوختەی سەحیحی موسلیم، ٩٧٧. (وەرگێڕ).

[3] فەرموودەی: ئەی خەڵکینە ئێوە کۆ دەکرێنەوە... تاد: صحيح مسلم ٥١ كتاب الجنة وصفة نعيمها وأهلها ١٤ باب فناء الدنيا وبيان الحشر ٢٨٦٠ (٥٨).

لێدەکەینەوە، جا ئەوە پەیمان و بەڵێنی ئێمەیە، بێگومان ئێمە ئەو کارە ئەنجام دەدەین)[1].

٢- کۆکردنەوەیان بۆ گۆڕەپانی لێپرسینەوەو لێپێچینەوە، خوای پایەبەرز دەفەرموویت: ﴿وَحَشَرْنَٰهُمْ فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَدًا﴾ الكهف: ٤٧. واتە: (لە کاتێکدا هەموو خەڵکیشمان کۆکردۆتەوەو کەسیشمان لێ بەجێ نەهێشتوون).

٣- کۆکردنەوەیان بۆ بەهەشت و دۆزەخ، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿يَوْمَ نَحْشُرُ ٱلْمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحْمَٰنِ وَفْدًا﴾ مريم: ٨٥. واتە: (ڕۆژێك دێت ئێمە دەستە دەستە خواناس و پارێزگاران بۆ لای خوای میهرەبان بەڕێ دەکەین). ﴿وَنَحْشُرُ ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا﴾ طه: ١٠٢.واتە: (ئەو ڕۆژە تاوانباران چاویان کوێرو شین هەڵگەڕاوە). ﴿ٱلَّذِينَ يُحْشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ أُوْلَٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ سَبِيلًا﴾[2] الفرقان: ٣٤. واتە: (ئەو تاوانبارانەی "دژایەتی بەرنامەی خوا دەکەن"، لەسەر ڕووخساریان کێش دەکرێن بۆ دۆزەخ و تیایدا کۆدەکرێنەوە، ئا ئەوانە ناخۆشترین جێگەیان هەیە، چونکە گومڕاترین ڕێبازیان کاتی خۆی گرتبووە بەر).

هەندێکیش دەڵێن: ئەگەر وشەی (حشر) بەکارهات ئەوا بەپێی مانای شەرعی بریتییە لە کۆکردنەوەی بەشەکانی لاشەی مردووەکان، هەر ئەم مانایە دەگەیەنێت لەڕووی شەرعیەوە مەگەر بەڵگەیەك چەمکی ناوبراو تایبەت بکات بەشتێکی تر[3].

**ئەگەر وترا:**

ئەو دەنگەی لەو ئایەتەدا بۆ هاتنەدەرەوە بێت لە گۆڕ: ﴿يَوْمَ يَسْمَعُونَ ٱلصَّيْحَةَ بِٱلْحَقِّ ۚ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُرُوجِ﴾ ق: ٤٢. واتە: (ئەو ڕۆژە دەنگێکی زۆر بەرز و سامناك دەبیستن، دیارە

[1] دەقی کوردی ئەم فەرمایشتەم وەرگرتووە لە پوختەی سەحیحی موسلیم، ٩٧٩. (وەرگێڕ).
[2] التذكرة للقرطبي ٢٠١ و لاپەڕەکانی دواتر، ولوامع الأنوار البهية ٢/١٤٥-١٥٥،
[3] لوامع الأنوار البهية ٢/١٥٥.

ئەو ڕۆژە هاتنە دەرەوەیە لە توێی خاکدا). جا چۆن مردوان گوێبیستی ئـەو دەنگـە دەبـن کەچی مردوون؟

**وەڵامی ئەدەمەوە بەوەی:** ئەو فووەی کە بە شەیپوردا دەکرێت بۆ زیندوو بوونەوە زۆر درێژ دەبێت، جا سەرەتا فوەکە بۆ زیندوو کردنەوە دەبێت، پاشان بۆ هەراسان کردنیان لـە گۆڕەکانیاندا، جا ئەو بەشە دەنگە نابیستن کە بۆ زیندوو بوونەوەیە، تەنها ئـەو دەنگـەیان بەرگوێ دەکەوێت کە بۆ هەراسان کردنە.

هەروەها لەوانەیە: ئـەو فـوەی کـە بەشـەیپوردا ئـەکرێت درێـژە بکێشـێت، خـەڵکی هەندێکیان دوای هەندێکی تریان زیندوو ببنەوە، جا هـەر کـە یـەکێك زینـدوو دەبێتـەوە گوێی لەو شتە دەبێت کە ئەو کەسەی دوای ئەو پێی زیندوو دەبێتـەوە، تـا ئـەم پرۆسـەی زیندوو کردنەوەیە تەواو دەبێت و خەڵکی لە گۆڕەکانیاندا دێنە دەرەوە[1].

## حوکمی بڕوا بوون پێی:

بڕوابوون بە کۆکردنەوە پێویست و فەرزە، بەهۆی ئەو دەقانەی کـە لەسـەری هـاتوون. ئەمە ڕای ئەهلی سوننە و زۆربەی موعتەزیلەکانە[2].

فەیلەسوف[3] و بێ دین و خوانەناسەکان بڕوایان پێ نییە[4].

* * *

---

[1] التذكرة للقرطبي ٢٠٢.

[2] شرح الجوهرة للباجوري ٢٧٧.

[3] المواقف ٨/٢٩٤.

[4] شرح الجوهرة للباجوري، سەرچاوەی پێشوو.

# نمایش کردن و لێپرسینەوە (العرض والحساب)

## نمایش کردن (عرض):

کاتێك خوای گەورە خەڵکی لە گۆڕەکانیاندا دەر دەهێنێتو زیندوویان دەکاتەوە، بەرەو گۆڕەپانی ڕۆژیی دوایی دەبرێن و لەوێدا دەمێننەوە بەو ئەندازەیەی خوای گەورە دەیەوێت، لەو کاتەدا خەڵکەکە نمایش دەکرێت و دەخرێنەڕوو بەردەم خوای گەورە، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿فَيَوْمَئِذٍ وَقَعَتِ الْوَاقِعَةُ ﴿١٥﴾ وَانشَقَّتِ السَّمَاءُ فَهِيَ يَوْمَئِذٍ وَاهِيَةٌ ﴿١٦﴾ وَالْمَلَكُ عَلَىٰ أَرْجَائِهَا وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ ﴿١٧﴾ يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ ﴿١٨﴾﴾ الحاقە: ١٥-١٨. واتە: (لەو ڕۆژەدا ئیتر قیامەت بەرپا دەبێت.ئاسمان هەموو شەق و پەق دەبێت و لێك دەترازێت و شل و شۆڵ دەبێت. فریشتەکان لە گۆشە و کەناری "جیهانی نوێ"دا ئامادە دەبن، تەختی پەروەردگارت ئەو ڕۆژە هەشت هەڵی دەگرێت "هەشت فریشتە یاخود هەشت دەستە" بەسەر سەریانەوە. لەو ڕۆژەدا پیشان دەدرێن، هیچ شتێك لە نهێنیەکانتان شاراوە نییە).

﴿ وَعُرِضُوا عَلَىٰ رَبِّكَ صَفًّا لَّقَدْ جِئْتُمُونَا كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ ﴾ الكهف: ٤٨. واتە: (ئەو ڕۆژە سەرجەم نەوەی ئادەم، ڕیزکراون لەبەردەم پەروەردگاردا، خوای گەورە ڕوو بەکافران دەفەرموویت: سوێند بێت وا هاتنەوە بۆلامان هەر وەك لەسەرەتا دروستمان کردوون).

﴿ وَوُضِعَ الْكِتَابُ فَتَرَى الْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَا وَيْلَتَنَا مَالِ هَٰذَا الْكِتَابِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّا أَحْصَاهَا وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا حَاضِرًا وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴾ الكهف: ٤٩.[١] واتە: (نامەی کردەوەی هەر کەسێك دادەنرێت، "ئیمانداران دڵخۆشن"

---

[١] شرح العقيدة الطحاوية ٤٠٣-٤٠٤.

بە بەڵگەی گومان هەڵنەگرو بێ پێچو پەنا لە زانستی سەردەم و هاوچەرخدا سەلماوە: کە دەنگەکان شەپۆلەکانی ئەسیر دەجولێنن، جا ئەم دەنگە لە ناو چینەکانی ئەسیردا دەمێنێتەوە بۆ هەتا هەتایە، دەکرێت جارێکی تر ئەو دەنگە ببیسترێتەوە، بەڵام ئەوەی زۆر گرانە جیاکردنەوەی ئەو دەنگە زۆرانەیە - بەدەنگی کۆن و نوێیەوە - ئەگەر لێرەدا گرێمانێکی بەهێزیش هەبێت بەوەی چەند ئامرازێك هەبن کە توانای لێك جیاکردنەوەی ئەو دەنگانەی هەبێت.

بەڵام تاوانباران دەبینیت دڵەلەرزێ و دڵەڕاوکێیانە لە کـارو کـردەوەی ناپەسـەندی تۆمـار کراویان، بۆیە دەڵێن: هاوار لە ئێمە ئەم نامە و دۆسیەیە چـییە؟! هـیچ گونـاهێکی وردو

ئەمە شتێکی نامۆ نییە، چونکە سەرباری ئەوەی کە هەزاران وێستگەی ڕادیۆیی هەیە لە جیهاندا کە بەشەو بەڕۆژ پڕۆگرامەکانی بڵاو ئەکاتەوە کە لە ڕێگەی شەپۆڵەکانی لە هەوادا بەخێرایی (١٨٦٠٠٠ میل لە یەك چرکە) دەڕوات، کەچی دەنگەکانی ئەو ڕادیۆیانە لێك جیا ئەکرێنەوەو لە کاتی بەکارخستنی ڕادیۆ بەوەی بیخەیە سەر وێسگە خوازراوەکە. هەروەك ئێستا کە دەنگەکان لەسەر کاسیەت و ئامێر، تۆمار دەکرێن و دەکرێت ببنە نمونە و هێمایەك بۆ ڕووداوەکانی ڕۆژی دوایی.

هەروەك زانستی سەرەدەم جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە گشت ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدین چ لە تاریکی یان لە ڕووناکی چ بە تاك یاخود بەکۆ، تەنانەت ئەو شتانەش کە چ جوڵاو یاخود وەستاو بن، ئەوا (گەرمیی)ەکی لیێ دەردەچێت بەشێوەیەکی بەردەوام لەگشت شوێن و بارودۆخێك، جا ئەم گەرمایەتیە بەپێچەوانەی شێوەو ڕەهەندەکانی بەتەواوی، بۆ ئەم مەبەستە ئامێری وردبین دروستکراون بۆ وێنەگرتنی شەپۆڵە گەرمیەکان کە لەهەر شتێك دەرئەچێت، ئینجا ئەم ئامێرە وێنەیەکی فۆتۆگرافی تەواو دەبەخشێت بە شتەکە، لەو کاتەی کە شەپۆڵەکانی گەرمی لێی دەرئەچن. شەوێك فڕۆکەیەکی نەناسراو لە ئاسمانی نیۆیۆرك دەفڕی، بۆ ئاشکرا کردنی ناسنامەی ئەم فڕۆکەیە هەڵسان بە وێنەگرتنی شەپۆلەکانی گەرمی ئاسمانی نیۆیۆرك بەو ئامێرەی کە بۆ ئەم مەبەستە دروستکراوە، بەمە توانیان قەبارەو جۆری فڕۆکەکە بزانن.

بەم پێیە زانستی سەردەم جەختی کردەوە لەسەر تۆمار کردنی گوفتارو کردار لە بۆشاییدا، بەمەش هیچ گومانێك لەلای گومان هەڵگران نامێنێت لەبارەی لێپرسینەوەی خوا لە بەندەکانی و بڵاوکردنەوەی نامەی کردەوەکانیان لە ڕۆژیی دواییدا بۆ ئەوەی پاداشت و سزای کردەوەکانیان وەربگرن، جا بەندە ژیانی خۆی ببینێت وەك چیرۆکێکی وێنە گیراو لە فیلمێکی تەواودا، کە لەو فیلمەدا جوڵەکانی دروون و زمان و ئەندامەکان تۆمار کراون بە ئامێری خۆیزێوی خێرا لەسەر لاپەڕی بۆشایی ئاسمان و ئەسیر لە هەموو شەو و ڕۆژێکدا، خوای پایەبەرز دەفەرمووێت: ﴿مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ ق: ١٨. واتە: (هەر قسەیەك لە دەم دەرچێت، خێرا چاودێرێکی ئامادە" تۆماری دەکات). ئەو کەسانە لەو ڕۆژەدا دەڵێن: ﴿وَيَقُولُونَ يَٰوَيْلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلْكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحْصَىٰهَا﴾ الکهف: ٤٩. واتە: ("دەڵێن" هاوار لە ئێمە ئـەم نامە و دۆسیەیە چیە؟! هیچ گوناهێکی وردو درشت بەجێ ناهێڵێت بەڵکو هەمووی تۆمار کردووە). سەیری کتێبی: الاسلام یتحدی ٨٠-٨١. بکە.

درشت بەجێ ناهێڵێت بەڵکو هەمووی تۆمار کردووە، ئەو خەڵکە هەرچیان کردووە ئامادەیە، بێ گومان پەروەردگاری تۆ ستەم لە هیچ کەس ناکات).

ئەم نمایش کردنەی خەڵك و پیشاندانی کردەوەکانیان سێ جارە، فەرموودە پیرۆزەکان ئەمەیان ڕوون کردۆتەوە، بۆ نموونە:

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

**(يُعرض الناس يوم القيامة ثلاث عرضات: فأما عرضتان فجدال ومعاذير، وأما العرضة الثالثة فعند ذلك تطاير الصحف في الأيدي فآخِذٌ بيمينه وآخِذٌ بشماله)**[1] واتە: خەڵکی لە ڕۆژی دواییدا سێ جار نمایش دەکرێن و کردەوەکانیان دەخرێتەڕوو، جا نمایشی یەکەم و دووەم گفتوگۆو پاساو هێنانەوەو دەمەتەقێیە، هەروەها لە نمایشی سێیەمدا نامەی کردەوەکان ئەدرێنەوە، هەیانە بە دەستە ڕاست وەریدەگرێتەوەو هەشیانە بەدەستە چەپ وەریدەگرێتەوە.

جا درانەوەو وەرگرتنی نامەی کردەوەکان بە دەستی ڕاست و چەپ، خودی مەبەستی ئەو ئایەتەیە، کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلْزَمْنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِى عُنُقِهِۦ ۖ وَنُخْرِجُ لَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ كِتَٰبًا يَلْقَىٰهُ مَنشُورًا ﴿١٣﴾ ٱقْرَأْ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ ٱلْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴿١٤﴾ ﴾ الاسراء: ١٣-١٤. واتە: (نامەی کردەوەی هەر کەسێکیشمان هەڵواسیووە بە گەردنیداو لە ڕۆژی دواییدا کارنامەی کردەوەکانی بۆ دەردەهێنین و بەکراوەیی دەیخەینە بەردەستی. ئەوسا پێی دەوترێت: دەی نامەی کردەوەکانت بخوێنەرەوەو تەماشای بکە، ئەمڕۆ هەر خۆت بڕیار بدە و حیساب بۆ خۆت بکە "شایستەی چ جۆرە پاداشتێکیت؟!").

ئیبن عباس وتویەتی: (طائره) واتە: کردەوەکانی.

حەسەن وتویەتی: هەموو کەسێك خوێندەوار یان نەخوێندەوار بێت، نامەی کردەوەکانی دەخوێنێتەوە.

---

[1] فەرموودەی:خەڵکی لە ڕۆژی دواییدا سێ جار نمایش دەکرێن و کردەوەکانیان دەخرێتەڕوو... تاد: سنن الترمذي، كتاب صفة القيامة، باب ما جاء في العرض ١٤١/٧ عن أبي هريرة.
وفي سنن إبن ماجه: ٣٧ كتاب الزهد ٣٣ باب ذكر البعث رقم ٤٢٧٧، ١٤٣٠/٢، من حديث أبي موسى الأشعري.

## لێپرسینەوە (الحساب)

### پێناسەکەی:

لێپرسینەوە (الحساب) لە زمانەوانیدا: بە واتای ژمارە دێت.

لە زاراوەدا: بریتییە لەو پرۆسەیەی کە لە میانەیدا خوای گەورە هەموو کەسێك بە تێروتەسەلی بە کردەوەکانی ئاشنا دەکاتەوە، چ چاك یان خراپ، گوفتار یاخود کردار بێت، دوای پێدانەوەی کتێب و تۆمارەکانیان[1].

جا دوای ئەوەی خەڵکی زیندوو دەکرێنەوەو نامەی کردەوەکانیان دەبینن، ئەوا لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێت، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ۝٧ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا﴾ الانشقاق: ٧-٨. واتە: (جا ئەوەی دۆسیەی کردەوەکانی درایە دەستی. ئەوە لەمەودوا لێپرسینەوەیەکی زۆر ئاسانی لەگەڵ دەکرێت).

لێپرسینەوە لەکاتی وەرگرتنەوەی نامەی کردەوەکان دەبێت، چونکە کە خەڵکی زیندوو کرانەوە کردەوەکانی خۆیانی بەبیر ناهێنەوە، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓا۟ ۚ أَحْصَىٰهُ ٱللَّهُ وَنَسُوهُ﴾ المجادلة: ٦. واتە: (لە رۆژێکدا کە خوا هەموویان زیندوو دەکاتەوە پێکەوە، ئەوسا هەواڵی هەموو کارو کردەوەکانیان پێ رادەگەیەنێت، خوا ئاماری کردووە، ئەوانیش فەرامۆشیان کردووە).

### ئەو شتەی لێپرسینەوەی لەسەر دەکرێ:

لە کاتی لێپرسینەوەدا، پرسیار لە بەندە دەکرێت.

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا﴾ الاسراء: ٣٦. واتە: (بەراستی دەزگاکانی بیستن و بینین و تێگەیشتن هەر هەمووی، بەرپرسیارە لە بەرامبەریەوە).

﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ۝٨﴾ الزلزلة: ٧ - ٨. واتە: (جا ئەوەی بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك خێرو چاکەی ئەنجام

---

[1] شرح الجوهرة للباجوري ٢٨٢.

دابێت دەیبینێتەوە. ئەوەش كە بەقـەدەر سـەنگی گەردیلەیـەك شـەڕو خراپـەی هـەبێت، دەیبینێتەوە).

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: **(لا تزول قدما عبدٍ يوم القيامة حتى يُسأل: عن عمره فيمَ أفناه، وعن علمه فيمَ فعل، وعن ماله من أين اكتسبه وفيمَ أنفقه، وعن جسمه فيمَ أبلاه)**[1] واتە: پێیەكانی هیچ كەسێك لـە ڕۆژی دواییـدا لـە جێـی خۆیان ناجوڵێن تا پرسیاریان لێ نەكرێت لەبارەی: تەمەنەكەی لەچی بەسـەر بـردووە، لـە زانستەكەی لەچیدا بەكارهێناوە، لەبارەی پارەو سامانەكەی لە كوێوە هێناویەتی و لەچیدا خەرجی كردووە، لەبارەی جەستەی كە لەچیدا بەكاریخستووە.

## شایەتی دانی ئەندامەكانی جەستە لەسەر كردەوەكان:

كاتێك پرسیار دەكرێت لە بەندەكان لەبارەی ئەو شتەی لە دونیـادا كردویانـە، ئـــەوا گوێ و چاو و پێستەكەی وەك سەرزەنشت كردن گەواهی لەسەر كردەوەكانی دەدەن و دێنــە گۆ.

خـــوای پـــاك و تـــاك دەفـــەرمووێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا مَا جَآءُوهَا شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَٰرُهُمْ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢٠﴾ وَقَالُوا۟ لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا ۖ قَالُوٓا۟ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنطَقَ كُلَّ شَىْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢١﴾ وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٢﴾﴾ فصلت: ٢٠-٢٢. واتە: (هـەتا كاتێـك دەگەنـە ئاسـتی ئاگرەكـە گـوێ و چـاوو پێسـتیان شایەتیان لەسەر دەدات كە چ كارو كردەوەیەكی نادروست و خراپیان ئـەنجام دەدا. ئینجـا

[1] فەرمودەی: پێیەكانی هیچ كەسێك لە ڕۆژی دواییدا لە جێی خۆیان ناجوڵێن... تاد: سنن الترمذي، كتاب صفة القيامة، باب في القيامة ١٣٦/٧ عن أبي برزة الأسلمي، و قال: حسن صحيح.

بە غەمبارییەوە بە پێستی خۆیان دەڵێ: بۆچی شایەتیتان لەسەرداین خۆ زەرەرتانە؟ لە وەڵامدا دەڵێن: ئەو خوایەی ئێمەی هێناوەتە گوفتار کە دەتوانێت هەموو شتێك بێنێتە قسەو گفتوگۆ، هەر ئەو زاتەشە کە یەکەمجار بەدیهێناوین و هەر بۆ لای ئەویش دەبرێینەوە. ئێوە کاتی خۆی ئەوەندە غەڕرا بوون، گوناهو تاوانەکانتان نەدەشاردەوە، چونکە مەترسیتان نەبوو کە گوێتان و چاوتان و پێستتان شایەتیتان لەسەر بدات، بەڵام گومانتان وابوو کە بەڕاستی خوا زۆر ئاگاداری نیە بەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن).

﴿ ٱلْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَىٰٓ أَفْوَٰهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَآ أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴾ يس: ٦٥. واتە: (ئەمڕۆ مۆر دەنێین بەدەمیاندا و قسەیان پێ ناکرێت، بەڵکو دەستیان قسەمان بۆ دەکات، قاچیشیان شایەتی دەدات بەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامیان دەدا).

﴿يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ النور: ٢٤. واتە: (لە ڕۆژێکدا کە زمان و دەست و قاچیان لێیان دەبێتە شایەتێکی گۆیا، لە بەرامبەر ئەو کردەوانەی کە ئەنجامیان دەدا).

## حیکمەتی لێپرسینەوە:

لێپرسینەوەی خوا لە بەندەکانی بریتییە لەوەی پاداشت و سزاکەی ئەوان بەوان ڕادەگەیەنێت، جا بەختەوەران بە دەستە ڕاستی خۆیان نامەی کردەوەکانیان وەردەگرن و بەدبەختانیش بە دەستی چەپیان یاخود لەپشتیانەوە نامەی کردەوەکانیان وەردەگرن.

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ﴾[1] آل عمران: ١٠٦. واتە: (ڕۆژێك دێت ڕووخسارانێك سپی دەبن و ڕووخسارانێکیش ڕەش هەڵدەگەڕێن).

---

[1] التذکرة للقرطبی ٢٥٣ لاپەڕەکانی دواتر، لوامع الأنوار البهیة ١٧٢/٢ و١٨٠-١٨١ والغنیة للشیخ عبدالقادر ٨١/١.

حکمەتەکەی بریتیە لە دەرخستنی پلە بەندی و جیاوازی پێگەکان لە تەواوی و کامڵێتیدا، ئابڕووچوونی کەسانی کرچ و کاڵیش پیشان بدرێت. ئەمەش هاندەری چاکەکاری و ڕێگرییە لە خراپەکاری[1].

## جۆرەکانی لێپرسینەوە:

چەند جۆرێکن: سووك و سەخت، نهێنی و ئاشکرا، سەرکۆنە کردن و لێ خۆش بوون و دادگەری. هەندێ لە زانایان وتویانە: خوای گەورە بە پوختی باسی لێپرسینەوەی کردووە، خەبەرو هەواڵ لەوبارەوە هاتوون، لەو هەواڵ و خەبەرانەشدا ئاماژە بەوەدراوە کە زۆرێك لە باوەڕداران بە بێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشتەوە، جا بەم پێیە خەڵکی دەبنە سێ بەش: بەشێك بەهیچ شێوەیەك لێپرسینەوەیان لەگەڵ ناکرێت، بەشێکی تریش لێپرسینەوەیەکی سووکی لەگەڵ دەکرێت، ئەم دوو بەشە لەباوەڕدارانن، بەشێکی تریش زۆر بەتووندی لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێت کە موسڵمان و بێ باوەڕ ئەم بەشە پێك دێنن. جا ئەگەر کەسانێك لە باوەڕداران هەبن نزیکتر بن لە سۆزو بەزەیی خوا، ئەوا بەبێ لێپرسینەوە خوای گەورە دەیانخاتە بەهەشتەوە، دووریش نییە کە کەسانێك لە بێ باوەڕان هەبن نزیکتر بن لە تووڕەیی نەوەك سۆزی خوا، بەمەش بەبێ لێپرسینەوە خوای گەورە دەیانخاتە دۆزەخەوە[2].

## حوکمی بڕوابوون بە لێپرسینەوە:

بڕوابوون پێی پێویست و فەرزە. چونکە ڕاست و دروستە، بە قورئانی پیرۆزو سوننەتی بەپێزو یەکدەنگی (الاجماع) چەسپاوە[3].

---

[1] شرح الجوهرة للباجوري ٢٨٣.
[2] التذكرة ٢٨٦، و شرح الجوهرة للباجوري ٢٨٢-٢٨٣.
[3] شرح الجوهرة لعبدالسلام ٢٢٧ وشرح الجوهرة للباجوري.

## حەوز (الحوض)

### بەڵگەکانی و وەسفەکەی:

ئەو حەوزەی کە خوای گەورە بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەبەخشێت لە ڕۆژی دواییدا، بە چەندین دەقی فەرموودەی ڕاست و دروستچەسپاوە.

ئەو فەرموودانەی لەبارەی وەسفی حەوزەکەوە هاتوون دەگەنە ئاستی (تەواتر)، نزیکەی سی و ئەوەندە هاوەڵ ئەو فەرموودانەیان گێڕاوەتەوە، (ئیبن کەسیر) لە کۆتایی کتێبە مێژووییەکەیدا (البداية والنهاية)[1] هێناویەتی، بۆ نمونە:

ئەبو زەڕ (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا کاسەی حەوز چییە؟ فەرمووی:

**(والذي نفسُ محمد بيده لآنيته أكثر عدد نجوم السماء وكواكبها، ألا في الليلة المظلمة المُصْحِية، آنيةُ الجنة مَن شرب منها لم يظمأ آخرَ ما عليه، يَشْخُبُ فيه ميزان الجنة، مَن شرِب منه لم يظمأ، عَرْضه مِثْلَ طُولِه، ما بين عَمَّان اِلى أيلَة، ماؤه أشدُّ من اللبن وأحلى من العسل)**. واتە: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە کاسەکانی زیاترن لە ئەستێرەکانی ئاسمان و هەسارەکانیش بەڵام لە شەوێکی تاریك و سامالْدا، کاسەی بەهەشت هەر کەسێك تیایخواردەوە تینوی نابێت تاکۆتا ئەو حاڵەتەی لەسەریەتی (واتە هەتا هەتایە)، دوو پسولك لە بەهەشتەوە دەڕژێنە ناو ئەو حەوزە، هەر کەسێك لێی خواردەوە تینوی نابێ، پانابییەکەی وەك نێوەندی عەممان و ئەیلەیە، ئاوەکەی سپی ترە لە شیرو شیرینترە لە هەنگوین[2].

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: **(حوضي مسيرةُ شهر، و زواياه سواء، وماؤه أبيضُ من الورِق، وريحه أطيب من المِسك، وكِيْزانه كنجوم السماء، فمَن شرِب منه فلا يظمأ بعده أبدا)** واتە: حەوزەکەی من مانگێ ڕێگایە، سوچەکانی یەکسانن و

---

[1] شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٢٧٧. بۆ ئەم گێڕانەوانە سەیری: شرح أصول الإعتقاد أهل السنة والجماعة ٤٢٢/٥. بکە.

[2] دەقی کوردی ئەم فەرمایشتەم وەرگرتووە لە پوختەی سەحیحی موسلیم ٧٦٩. (وەرگێڕ).

ئاوەكەی سپیترە لە زیو و بۆنی خۆشترە لە میسك و سوراحیەكانی ئەوەندەی ئەستێرەكانی ئاسمانە، هەر كەسێك لێی بخواتەوە دوای ئەوە هەرگیز تینوی نابێت[1].

ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: جارێكیان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەناوماندا بوو، سووكە خەوێكی كردوو، ئینجا سەری بەزەردەخەنەوە بەرزكردەوە، ئێمەش وتمان بۆچی پێدەكەنیت ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئێستا سورەتێكم بۆ دابەزیوە، هەر ئەو كاتە خوێندیەوەو فەرمووی: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ إِنَّآ أَعْطَيْنَٰكَ ٱلْكَوْثَرَ ﴿١﴾ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ﴿٢﴾ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ ﴿٣﴾﴾ واتە: (بەناوی خودای بەخشندەو دلۆڤان. بەڕاستی ئێمە ئاوی كەوسەرمان داویەتیٚ. دەی تۆش نوێژو قوربانی بۆ خوای خۆت بكە. بێگومان هەر دوژمنان و ناحەزانی تۆ بیٚ ناو نیشان و وەجاخ كوێرو دوابڕاون). ئینجا فەرمووی: **(أتدرون ما الكوثر؟)** واتە: ئایا دەزانن "كوثر" چییە؟ وتمان: خواو پێغەمبەرەكەی باشتر دەزانن. فەرمووی: **(إنه نهر وعدنيه ربي عزوجل، عليه خير كثير، هو حوض ترد عليه أمتي يوم القيامة، آنيته عدد النجوم، فَيُخْتَلَجُ العبد منهم، فأقول: رب، انه من أمتي. فيقول: ما تدري ما أحدثتْ بعدك)**[2] واتە: ڕووبارێكە پەروەردگارم بەڵێنی پێداوم، خێری زۆری هەیە، حەوزێكە لە ڕۆژی قیامەتدا ئوممەتم دێنە سەری، جامەكانی بە ئەندازەی ژمارەكانی ئەستێرەكانە، خەڵكێك دادەبڕێن

---

[1] دەقی كوردی ئەم فەرمایشتەم وەرگرتووە لە پوختەی سەحیحی موسلیم، ٧٦٧. (وەرگێڕ).

[2] التذكرة للقرطبي ٣٠٣-٣٠٤. وشرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٢٧٩.

فەرموودەی: سوێند بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە كاسەكانی... تاد: صحيح مسلم ٤٣ كتاب الفضائل ٩ باب إثبات الحوض نبينا محمد (صلى الله عليه وسلم) وصفاته، رقم ٢٣٠٠.

فەرموودەی: حەوزەكەی من مانگیٚ ڕێگایە... تاد: صحيح مسلم ٤٣ كتاب الفضائل ٩ باب إثبات حوض نبينا محمد و صفاته، رقم ٢٢٩٢، عن عبدالله بن عمرو بن العاص (رضي الله عنهما).

فەرموودەی: جارێكیان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەناوماندا بوو... تاد: صحيح مسلم ٤ كتاب الصلاة ١٤ باب حجة من قال: البسملة آية من كل سورة سوى البراءة، رقم ٤٠٠.

لێیان، منیش دەڵێم: پەروەردگار" ئەوە لە ئوممەتی منە، ئەویش دەفەرمووێت: تـۆ نـازانی دوای تۆ چییان داهێناوە[1].

جا لەو فەرموودانە وەردەگیرێت کە وەسفی حەوزەکە بەم شێوەیەیە: کە حـەوزێکی زۆر گەورەیە، سەرچاوەو شوێنێکی بەخێرو فەرە، لە ڕووباری "کەوسەر" کـە لـە بەهەشـتدایە دەڕژێتە ناو حەوزەکە، ئاوی حەوزەکە سپی ترە لە شیرو ساردترە لـە بـەفرو شـیرینترە لـە هەنگوین و بۆن خۆشترە لـە میسـك و ڕووبەرەکـەی زۆر فراوانـە و پـانی و درێژییەکـەی یەکسانە[2].

بەڵام چەسپانی حەوزی کەوسەر لە قورئانی پیرۆزدا لە سوڕەتـی (الکـوثـر) گریمانـە و ئەگەرە نەوەك ڕاشکاو بێت، چونکە زانایان ڕاجیاییان هەیە لە تەفسیر کردنـی " کـوثـر": کـە ئایـا بریتییـە لـە حـەوز یـاخود خێـرو بێرێکـی زۆر یـان ئـەو ڕووبارەیـە کـە لـە بەهەشتدایە؟[3].

### کێن کە دوور لە حەوز دەخرێنەوە:

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: **(لیردنّ عليّ ناس مـن أصـحابي الحـوض، حتى اذا عرفتهم، اختلجوا دوني، فأقول: أصحابي، فيقول: لا تدري ما أحدثوا بعدك)** واتە: کەسانێك لە هاوەڵانم دێنە سەر حەوزەکەم، منیش دەیانناسمەوە، کەچـی لـێم دادەبـڕێن و دووردەخرێنەوە، دەڵێم: ئەوە لە هاوەڵانی منن، خوای گەورە دەفەرمووێ: تۆ نـازانی دوای تۆ چییان داهێناوە.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: **(انّي على الحوض حتـى أنظـرَ مَـن يرِد عليّ منكم، وسيُؤخذ أناس دوني، فأقول: ياربّ مني ومن أمتي، فيقال: أما شَعَرْتَ ما عملوا بعدَك؟ والله ما برِحُوا بعدكَ يَرجِعون على أعقابهم)** واتـە: مـن لەسـەر حەوزەکـەم،

---

[1] دەقی کوردی ئەم فەرمایشتەم وەرگرتووە لە پوختەی سەحیحی موسلیم، ١٥٩. (وەرگێڕ).
[2] شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٢٨٠.
[3] سەیری: تفسير القرطبي ٧٣٠٦/١٠-٧٣٠٦. بکە، کە چەندین ڕای جیاواز هێناوە سـەبارەت بە مانای (کوثر).

تەماشا دەکەم کێ لە ئێوە دێت بۆ لام، کەسانێك ڕێی لای منیان لێدەگیرێت، دەڵێم: ئەی پەروەردگار ئەوانە لە منن، لە ئوممەتی مـنن، دەوترێـت: ئـەی نازانیـت دوای تـۆ چـیان کردووە؟ سوێند بەخوا دوای تۆ هەر خەریکی پاشگەزبوونەوە بوون "لە ئاینەکەت"[1].

زانایان وتویانە: هەر کەسێك پاشگەز ببێتەوە لە ئایینی خوا یاخود شتێکی داهێنا کە خوای گەورە پێـی ڕازی نـەبێت و ڕێـی پێنـەدابێت، ئـەوا ئـەو کەسـە لەسـەر حەوزەکـە دەردەکرێت و دوور دەخرێتەوە[2].

## حوکمی بڕوابوون بە حەوز:

بڕوابوون بە حەوزی (کەوسەر) پێویست و فەڕزە، کەسێك بـڕوای پـێ هـەبێت پاداشـت وەردەگرێت و کەسێك نکۆڵی لێ بکات بیدعەچی و لاسارە. ئەمە ڕای زۆربـەی زانایانـە، ئەم ڕایەیان هەڵهێنجاوە لەو فەرموودە ڕاشکاوانەی پێشوو کە جـەخت دەکەنـەوە لەسـەر بوونی حەوزی ناوبراو دەکەنەوە.

ئەمەش بەرپەرچ دانەوەی موعتەزیلەکانە، کە نکۆڵیان لێ کردووە[3].

---

[1] دەقی کوردی ئەم فەرمایشتەم وەرگرتووە لە پوختەی سەحیحی موسلیم ٧٦٧. (وەرگێڕ).

[2] التذكرة للقرطبي ٣٠٦ ولوامع الأنوار البهية ٢/٢٠٠ وشرح الجوهرة للباجوري ٣٠٤.

فەرموودەی: کەسانێك لەسەر حەوزەکەم دێنە لام... تاد: صحيح البخاري ٨١ كتاب الرقائق ٥٣ باب في الحوض، رقم ٦٥٨٢ عن أنس بن مالك (رضي الله عنه)

والحديث بلفظ آخر في صحيح مسلم ٤٣ كتاب الفضائل ٩ باب اثبات الحوض نبينا (صلى الله عليه وسلم) وصفاته رقم ٢٣٠٣ عن أنس بن مالك.

فەرموودەی: من لەسەر حەوزەکەم، تەماشا دەکەم... تاد: صحيح مسلم ٤٣ كتاب الفضائل ٩ إثبات حوض نبينا (صلى الله عليه وسلم) و صفاته، رقم ٢٢٩٣ عن أسماء بنت بي بكر (رضي الله عنهما).

[3] شرح الجوهرة لعبدالسلام ٢٤٠ وشرح الجوهرة للباجوري ٣٠٢. بەڕاستدانانی بوونی حەوزی"کەوسەر" لەمانەدا هاتووە: أصول الدين للغزنوي ٢٢٨ ومشارق أنوار العقول ٢/١٢١. نکۆڵی کردنەکەی موعتەزیلەکان لە بوونی حەوزی ناوبرو لە: الإبانة للأشعري ٢٤٥ ، ئەشعەری بوەرپەرچیشی داوەتەوە.

## تەرازوو (المیزان)

### پێناسەی کێشان و تەرازوو:

کێشان (الوزن) لە بنچینەی زمانەوانیدا: زانینی چەندیەك بەهۆی بەراورد کردنی بە چەندییەکی تر بەشێوازێکی تایبەت[1]. تەرازوو (میزان) لە زمانەوانیدا: ناسراوە.

بەڵام لە زاراوەدا: بریتییە لەوەی خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا تەرازوویێك دادەنێت، زمان و دوو تایەی هەن، کە کردەوە چاك و خراپەکانی بەندەکانی پێ دەکێشێت. ئەمە ڕای زۆربەی زانایانە. ڕووکەشی ئەو فەرموودانەی لەوبارەوە هاتوون ئەوەیان لێ وەردەگیرێت.

زانایان وتویانە: ئەگەر لێپرسینەوە کۆتایی هات، ئەوا دەست دەکرێت بەکێشران و هەڵسەنگێنرانی کردەوەکان، چونکە کێشران و هەڵسەنگێنران بۆ سزاو پاداشتە بۆیە پێویستە لەدوای لێپرسینەوە بێت، جا لێپرسینەوە بۆ دیاریکردنی کرەوەکانە و کێشان و هەڵسەنگاندن بۆ ئەندازەو دەرخستنی پێوانە کردنیانە، تا پاداشت و سزا بە ئەندازەی کردەوەکە بێت.

### تەرازوو چەسپاوە بە دەقی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ﴾ الأنبياء: ٤٧. واتە: (ئێمە پێوەرو تەرازووەکانی دادپەروەری لە ڕۆژی قیامەتدا دادەنێین، جا کەس بەهیچ شێوەیەك ستەمی لێ ناکرێت، ئەگەر بەقەدەر تۆی خەرتەلەیەك "کە زۆر بچوك و وردە، کارێکی چاك یان خراپی ئەنجام دابێت" دەیهێنینە مەیدان، جا ئەوەندە بەسە بۆ ئێمە کە ئاوا بەوردی حساب و لێپرسینەوە ئەنجام دەدەین).

﴿ فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ ۝٦ فَهُوَ فِى عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ۝٧ وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ ۝٨ فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٌ ۝٩ ﴾ القارعة: ٦ - ٩. واتە: (جا ئەوەی تەرازووی خێری

---

[1] شرح عبدالسلام علی الجوهرة ٢٣٤.

سەنگین بێت. ئەوە لەبارودۆخێكی خۆش و ئاسوودەدا ژیان دەباتە سەرو زۆر پێی ڕازییە. ئەوەش تەرازووی "خێرو چاكەی" سووك بێت "گوناهی زۆر بێت". ئەوە دایكی ئەو دۆزەخە "باوەشی بۆ كردۆتەوە". جا تۆ چووزانی "هاویە" چییە؟!. ئاگرێكی زۆر سووتێنەرو بڵێسەدارە).

﴿ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُم بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَظْلِمُونَ ﴾ المؤمنون: ١٠٣، الأعراف: ٩. واتە: (بەڵام ئەو كەسەی تەرازووی چاكەكانی سووك بێت، ئەوانە ئەو كەسانەن لەدەست داوەو خۆیان زەرەرمەندو ڕیسوان).

هەروەها بە دەقی فەرموودە ڕاست و صەحیحەكانی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) چەسپاوە، هەروەك دەیانخەینەڕوو[1].

### ئەو شتەی دەپێورێ و دەكێشرێت:

زانایان ڕاجیان سەبارەت بەوەی كە چی دەپێورێت، بەهۆی جیاوازی ئەو فەرمایشتانەی لەوبارەوە هاتوون، بۆیە بۆ چەند ڕایەك دابەش بوونە:

**ڕای یەكەم: نامەی كردەوەكان:** واتە نامەی كردەوەكان هەڵ دەسەنگێنرێن و دەكێشرێن، ئەوانەی ئەو ڕایەیان پەسەند كردووە بریتین لەم زانایانە: (قورتوبی) و (ئیبن عەبدولبەر) و (شێخ مەرعی)، هەروەها زۆربەی ڕاڤەكارانی قورئانی پیرۆز، بەم بەڵگانەی خوارەوە:

أ- پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)دەفەرموێت: **(إن الله سيخلص رجلاً من أمتي على رؤوس الخلائق يوم القيامة، فينشر عليه تسعة وتسعين سجلاً، كل سِجل مثل مَد البصر، ثم يقول: أتنكر من هذا شيئاً؟ أظلمك كَتَبتي الحافظون؟ فيقول: لا يا رب. فيقول: أفلك عذرٌ؟ فيقول: لا يارب. فيقول: بلى ان لك عندنا حسنة، فانه لا ظلم عليك اليوم. فتخرج له بِطاقة فيها: أشهد أن لا اله الا الله، وأن محمداً عبده ورسوله، فيقول: احضر وزنك،**

[1] التذكرة للقرطبي ٣٠٩، لوامع الأنوار البهية ١٨٤/٢ نقلاً عن التذكرة، شرح الطحاوية لإبن أبي العز ٦٠٩ ولاپەڕەكانی دواتر.

**فيقول: يا رب ما هذه البطاقة مع السجلات؟ فقال: انك لا تظلم. قال: فتوضع السجلات في كِفة، والبطاقة في كِفَة، فطاشت السجلات و ثقلت البِطاقة، فلا يثقل مع اسم الله شيء)**
واتە: خوای گەورە کەسێك لە ئوممەتی من لەناو هەموو خەڵکی دوارۆژدا ڕزگار دەکات و نەوەدو نۆ نامەی پێ ئەداتەوە، هەر یەك لەو نامانە ئەوەندەی چاو حوکم ئەکات گەورەن، پاشان خوای گەورە پێی دەفەرمووێت: ئایا نکۆڵی لە هیچ شتێك لەمانە ئەکەیت؟ ئایا فریشتە نووسەرە پارێزراوەکانم ستەمیان لێکردی؟ دەڵێت: نا پەروەدگارا. خوای گەورە دەفەرمووێت: ئایا پاساوێك و بیانویەکت هەیە؟ دەڵێت: نا ئەی پەروەردگارا. خوای گەورە دەفەرمووێت: نا وانییە بەڵکو تۆ چاکەیەکت هەیە لەلای ئێمە کە بەپاساو ئەشێت، بەڕاستی ئەمڕۆ ستەمت لێ ناکرێت و مافت ناخورێت. جا پسوولەیەکی بۆ دەردەخرێت کە شایەتمانی لەسەر نووسراوە: "أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا رسول الله"، جا پێی دەفەرمووێت: سەنگ و کێشی خۆت بێنە. دەڵێت: پەروەردگارا" ئەم پووسەلەیە لەگەڵ ئەو نامانە چینە؟ فەرمووی: تۆ ستەمت لێ ناکرێت. فەرمووی: جا نامەکان لەلایەکی تەرازوو و پسوولەکە لەلایەکی تردا دادەنرێت، جا نامەکان هەڵدەکشێن و سوك دەبن و پسوولەکە دادەکشێت و گران دەبێت. بێگومان هیچ شتێك لە ناوی پیرۆزی خوای گەورە گرانتر نابێت.

ب- پرسیار لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کرا لەبارەی ئەوەی کە چ شتێك لە ڕۆژی دوایی دەکێشرێت، فەرمووی: (الصحف)[1] واتە: نامەی کردەوەکان.

---

[1] لوامع الأنوار البهية ٢/١٨٢.

فەرموودەی: خوای گەورە کەسێك لە ئوممەتی من لەناو هەموو خەڵکی دوارۆژدا ڕزگار دەکات...
تاد: سنن الترمذي: أبواب الإيمان، باب ما جاء فيمن يموت وهو يشهد ان لا إله إلا الله، ٧/٢٩٥ عن عبدالله بن عمرو بن العاص (رضي الله عنهما). وقال: حسن غريب.
وأخرجه إبن ماجه في سننه ٣٧ كتاب الزهد ٣٥ باب مايرجى من رحمة الله يوم القيامة رقم ٤٣٠٠، ٢/١٤٣٧ وقال في أول الحديث: (يصاح برجل من أمتي على رؤوس الخلائق).
ورواه إبن حبان في صحيحه والحاكم والبيهقي وقال الحاكم على شرط مسلم./ لوامع الأنوار البهية ٢/١٨٧.

پ- ئیبن عومەر وتویەتی: نامەی کردەوکان دەپێورێت و دەکێشرێت[1].

**ڕای دووەم: بکەرەکە (العامل)**: بەم بەڵگانەی خوارەوە:

أ- هەمان ئەو فەرموودەیەی پێشتر باسی پسوولە (بطاقـة) کرد، بەڵام بە دەربڕینێکـی تر کە هاتووە: **(توضع الموازين يـوم القيامـة فيـؤتى بالرجـل فيوضـع في كفـة...)** فەرموودەکەی پێشوو. واتە: تـەرازوو لـە ڕۆژی دوایـیـدا دادەنرێـت و جـا مرۆڤـــ دەخرێتە تایەکی تەرازووەوە... .

ب- پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویـەتی: **(اِنّـه ليـأتي الرجـل العظـيم السمين يوم القيامة، لا يَزِنُ عندَ الله جناح بعوضة، و قـال: اِقـرؤوا :﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَزْنًا﴾** الكهف: ١٠٥.[2] واتــە: لــە ڕۆژی دوایـیــدا کەســی گــەورەی قەڵــەو دەهێنرێت، کەچی لەلای خوای گەورە نرخی باڵی مێشولەیەکی نیـە. و فـەرمووی: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە بخوێننەوە: (لە ڕۆژی قیامەتدا هـیچ جـۆرە بایـەخ و نرخێکیان بۆ دانانێین).

پ- لە ئیبن مەسعودەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ناوبراو سیواکێکی لـە داری (ئـاراك) بەدەست بووە، لاقەکانیشی باریك بوون و با دەیجوڵاند، ئەوانەی لەدەوروبەری بـوون پێی پێکەنین، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فـەرمووی: **(مـم تضـحكون؟)** واتە: بەچی پێ دەکەنن. وتیان: ئەی پێغەمبەری خـوا بـە لاقـە باریکـەکانی. جـا فەرمووی **(والذي نفسي بيده لهما أثقل في الميزان مـن أُحُـد)**[3] واتــە: سـوێند بـەو

فەرموودەی: پرسیار لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کرا لەبارەی ئەوەی کە چ شتێك لە ڕۆژی دوایـیدا دەکێشرێت... تاد: ذكره فخر الرازي وغيره وحكاه إبن عطية عن أبي المعالي./ لوامع الأنوار، سەرچاوەی پێشوو.

[1] التذكرة للقرطبي ٣١٣.

[2] صحيح البخاري - كتاب التفسير - باب أولئك الذين الكفروا بآيات ربهم. / فتح الباري ٤٢٦/٨.

[3] شرح عقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٦١٠

زاتەی ڕۆحی منی بەدەستە لاقەکانی لە تەرازووی ڕۆژی دواییدا لە کێوی ئوحد گرانترە.

**ڕای سێیەم: کردەوەکان:** بەم بەڵگانەی خوارەوە:

أ- **پێغەمبەری خوا** (صلى الله عليه وسلم) **فەرموویەتی: (الطُّهور شَطْرُ الايمان، والحمد لله تملأ الميزان)** واتە: پاکژی نیوەی ئیمان و باوەڕە، خێری وتنی (الحمد لله) تەرازوو پڕ دەکات.

ب- **پێغەمبەر** (صلى الله عليه وسلم) **فەرموویەتی: (كلمتان خفيفتان على اللسان، ثقيلتان في الميزان، حبيبتان الى الرحمن: سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظيم)**[1]

---

فەرموودەی: لە ڕۆژی دواییدا کەسی وا دەهێنرێت... تا: صحيح البخاري، ٦٥ كتاب التفسير، ٦ باب ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ﴾ الكهف: ١٠٥ رقم ٤٧٢٩ عن أبي هريرة (رضي الله عنه).
وهو في صحيح مسلم، ٥٠ كتاب المنافقين، كتاب صفة القيامة والجنة والنار، رقم ٢٧٨٥، عن أبي هريرة (رضي الله عنه).

فەرموودەی: إبن مسعود (ڕەزای خوای لێ بێت) سیواکێکی بەدەست بوو... تاد: مسند الإمام أحمد ١/٤٢٠-٤٢١. وهو حديث حسن. انظر تخريجه في هامش ٦١١ من شرح العقيدة الطحاوية المذكور.

(1) شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٦١١ وشرح الجوهرة للباجوري ٢٩٢ هەر سێك بۆچوونەکەی تێدایە. و غزنوی ڕای یەکەم و سێیەمی هێناوە لە: أصول الدين ٢٢٧. باقلانی لە (الإنصاف ٥٢) وتویەتی: ئەو شتەی بە تەرازوو دەکێشرێت لە ڕۆژی دواییدا نامەی کردەوەکانە.

فەرموودەی: ... تاد: صحيح مسلم ٢ كتاب الطهارة ١ باب فضل الوضوء رقم ٢٢٣ عن أبي مالك الأشعري.

فەرموودەی: دوو وشە لەسەر زمان سوکن... تاد: صحيح البخاري ٨٣ كتاب الأيمان والنذور، ١٩ باب إذا قال والله لا اتكلم اليوم فصلى... ، رقم ٦٦٨٢، بهذا اللفظ. وفيه حديثان مقاربان باللفظ: ٨٠ كتاب الدعوات، ٦٥ باب فضل التسبيح رقم ٦٤٠٦، و ٩٧ كتاب التوحيد، ٥٨ باب قوله تعالى:﴿ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ ﴾ الأنبياء: ٤٧، رقم ٧٥٦٣ و كلها عن أبي هريرة (رضي الله عنه).

وفي صحيح مسلم ٤٨ كتاب الذكر والدعاء ١٠ باب فضل التهليل و التسبيح.. ، رقم ٢٦٩٤ بهذا اللفظ. عن أبي هريرة (رضي الله عنه).
وسنن الترمذي، باب الدعاء./ عارضة الأحوذي ١٦/١٣.

واتە: دوو وشە لەسەر زمان سوکن و لە تەرازوودا زۆرگران و قورسن و خۆشەویستن لەلایەن خوا، بریتین لە: سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظيم.

## حیکمەتی بوونی تەرازوو:

بریتییە لە دەرخستنی دادپەروەری و گەورەیی و بەخشندەیی، بەشێوەیەك کە تەنانەت یەك گەردیلەی چاکە و خراپەش فەرامۆش ناکرێت[1]، جا تەرازوو هێمایەکە بۆ بەختەوەران و بەدبەختان، بە هۆی تەرازووەوە بەندەکان بۆیان دەردەکەوێت کە چ چاکە و خراپەیەك بەشیانە، بەهۆی کێشانی کردەوەکانیان لە ڕێگەی تەرازووەوە بەڵگەیان لەسەر بەرپا دەکرێت[2].

## چۆنیەتی کێشان:

چاکەکان لە تایەیەکی تەرازوو و خراپەکانیش لە تایەکەی دیکەی تەرازوو دادەنرێن[3]، ئەمەش بەپێی بۆچوونی زۆربەی زانایانە.

## کردەوەی کێ دەپێورێ و دەکێشرێت؟

کردەوکانی کەسێك پێوان و کێشانەی بۆ دەکرێت کە بڕوادار بێت و کردەوەیەکی چاکی تێکەڵ بەیەکێکی خراپی کردبێت.

هەروەها کردەوەی بڕواداره پارێزگارو لەخواترسەکانیش دەکێشرێت، بۆ ئەوەی چاکە و گەورەییان دەربکەوێت.

---

وسنن إبن ماجة: كتاب الأدب، فضل التسبيح ١٢٥١/١.

ومسند أحمد ٢٣٢/٢.

وانظر الحديث مخرجا مشروحا في كتابي: الكمال بن همام و تحقيق رسالته. إعراب قوله (صلى الله عليه وسلم): كلمتان خفيفتان في اللسان... .

[1] لوامع الأنوار البهية ١٨٨/٢. و شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٦١٣.

[2] شرح الجوهرة للباجوري ٢٩٣.

[3] التذكرة للقرطبي ٣١٢.

بەڵام حەفتا هەزار کەس بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشت - هەروەك لە فەرموودەکەدا هاتووە - جا کردەوەی ئەوانە بە تەرازوو ناکێشرێت. تەنانەت کتێبی کردەوەکانیش وەرناگرن، بەڵکو تەنها بێ تاوانیان نووسراوە: "لا الە الا اللە محمد رسول اللە"، ئەمە بێ تاوانی فڵانی کوڕی فیسارەیە، خوای گەورە لێی خۆشبووەو بەختەوەرییەکی دەست خست، کە هەرگیز دوای ئەمە ناخۆشی نابینێت.

کردەوەی بێ باوەڕان دەکێشرێت، بۆ ئەوەی سەرشۆڕی و بێ نرخی ئەوان دەربکەوێت، تەنانەت وەك سەرزەنشتێك بۆیان لەسەر ئەوەی کە هیچ چاکەیەکیان نەکردووە[١].

## حوکمی بڕوابوون بە کێشان و تەرزووو:

بڕواپێ بوونی پێویست و فەرزە، بەهۆی ئەوەی بە بەڵگەی قورئانی پیرۆزو سوننەتی بەپێز چەسپاوە. ئەمە ڕای زۆربەی زانایانە، هەروەك پێشتر خستمانەڕوو[٢].

جەهمی کوڕی صەفوان[٣] و موعتەزیلەکانی و ئیبازییەکان و مورجیئەکان و خەواریجەکان نکۆڵیان لە بوونی تەرازوو کردووە، پێیان وابووە تەرازوو بریتییە لە دادگەری، چونکە لەلای ناوبراوان کردەوەکان بریتین لە ڕووکەشەکان (أعراض)، پێوان و کێشانی ڕووکەشەکانیش ئەستەمە، چونکە بەخۆیانەوە ڕاوەنەستاون[٤] و بە گرانی و سووکی وەسف ناکرێن.

---

[١] التذکرة للقرطبی ٣١١ و ٣١٥.

[٢] شرح الجوهرة لعبدالسلام ٢٣٣-٢٣٤. وأصول الدین للغزنوي ٢٢٧.

[٣] التبیه والرد ١١٠.

[٤] رسالة في التوحید للطائي ١١٤. و غەزنەوی لە (أصول الدین ٢٢٧) وتویەتی: تەرازوو بە دوو تایەکەیەوە شتێکی ڕاستە. لە (مشارق أنوار العقول ١٢٥/٢) ڕای ئیبازییەکان و زۆربەی موعتەزیلەکانی لەوبارەوە هێناوە. شێخ عەبدولقادر لە (الغنیه ٨١/١) ڕای موعتەزیلەکان و مورجیئەکان و خەواریجەکانی هێناوەو بەرپەرچی ئەوانی داوەتەوە. لە (المواقف ٣٢١/٨) هاتووە: (لە کۆتاییدا موعتەزیلەکان نکۆڵیان لێکرد). لە (شرح المقاصد للتفتازانی ١٢٠/٥) هاتووە: (هەندێك لە موعتەزیلەکان نۆکڵیان لێکردووە).

وەڵامەکەی بەوشێوەیەیە:

جەستەی مرۆڤ و هەر تەنێکی تری سەر زەوی کێشێکی دیاریکراوی هەیە، ئەمەش بەهۆی هێزی کێشکردنی زەوی، بەڵام کاتێك ئەو تەنە لە کێشکردنی زەوی دوور دەکەوێتەوە، بۆ نمونە هەر تەن و جەستەیەك لە سەر مانگ کێش و سەنگێکی تایبەتی هەیە، بەهەمان شێوە لەسەر زەویش سەنگێکی تایبەتی هەیە. کردەوەکانیش بەهەمان شێوە لە دونیادا ناتوانرێ هەڵبسەنگێنرێن و کێشیان نییە، بەڵام هیچ ڕێگریێکیش نییە لەبەردەم ئەوەی ئەو کردەوانە لە ڕۆژی دواییدا بگۆڕدرێن بۆ تەن و جەستە و بکێشرێن.

ئەمەش بەڵگەکان:

أ- ئەو فەرمایشتەی کە ئیبن عەبباس (ڕەزای خوای لێبێت) گێڕاویەتیەوە: خوای پایەبەرز ڕووکەشەکان دەکاتە جەستە، دەیان پێوێت و دەیانکێشێت لە ڕۆژی دوایی دا.

ب- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (**يُؤتَى بالموت كبشاً أغشر، فيوقف بين الجنة والنار، فيقال: يا أهل الجنة، فيشرئبُون وينظرون. ويقال ياأهل النار، فيشرئبُون وينظرون. ويرون أن قد جاء الفرج، فيذبح. فيقال خلوداً لا موت**)[1]. واتە: لە ڕۆژیی دواییدا مردن دەهێنرێت لە سەر شێوەی بەرانێك کە خوریەکی زۆری پێوەیە، لە نێوان بەهەشت و دۆزەخ ڕادەگیرێت، هاوار دەکرێت: ئەی دانیشتوانی بەهەشت، ئەوانیش سەر هەڵدەبڕن و تەماشا دەکەن، هەروەها بانگی دۆزەخییەکان دەکرێت: ئەوانیش بەهەمان شێوە سەر هەڵدەبڕن و تەماشا دەکەن، تەنانەت وا هەست دەکەن دەرویان لێ دەکرێتەوەو ڕزگار دەبن، جا لەو کاتەدا سەری دەبڕدرێت و دەوترێت: ئێوە نەمرن و بۆ هەتا هەتایی مردن یەختان ناگرێت. جا مردن کە (عرض)ە لە دونیادا کەچی لە دوارۆژدا دەبێتە جەستەو دەکوژرێتەوە، کردەوەکانیش بەهەمان شێوە.

---

[1] التذكرة للقرطبي ٣١٣ و المواقف وشرحه ٣١٣/٨.

فەرموودەی: لە ڕۆژیی دواییدا مردن دەهێنرێت لە سەر شێوەی بەرانێك... تاد: مسند أحمد ٤٢٣/٢، عن أبي هريرة وهو صحيح.

## پرد (الصراط)

### پێناسەكەی:

پرد (الصراط) لە زمانەوانیدا: بریتییە لە رێگای رۆشن. كە لە (سرطت الشيء: "چ بە سین یاخود صاد هەر یەك مانایان هەیە") هاتووە واتە: قوتدان و هەڵ لوشینی شت، چونكە رێگە رێبوارو ئەوەی پێیدا تێپەڕ هەڵ دەلوشێت. خوای گەورەش دەفەرموویت: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُ﴾ الأنعام: ١٥٣. واتە: (بێگومان ئەمە رێبازی منە كە ڕاستە دەسا ئێوەش شوێنی بكەون).

لە زاراوەدا: بریتییە لە پردێكی درێژكراو و دانراو لەسەر پشتی دۆزەخ، كە هەموو بونەوەران بە باوەڕدارو بێ باوەڕەوەو پێشین و پاشین دەبێت بەسەریدا بڕۆن[1]، جا ئەمە پردی دۆزەخە لەنێوان بەهەشت و ئاگری دۆزەخ[2].

پردی رۆژی دوایی بە چەندین ئایەت بوونی سەلماوە، نمونەی ئەم ئایەتانەش:

أ- ﴿وَلَوۡ نَشَآءُ لَطَمَسۡنَا عَلَىٰٓ أَعۡيُنِهِمۡ فَٱسۡتَبَقُواْ ٱلصِّرَٰطَ فَأَنَّىٰ يُبۡصِرُونَ﴾ يس: ٦٦.

واتە: (خوانەناسان بۆ بیرێك ناكەنەوە خۆ ئەگەر بمانەوێت چاویان كوێر دەكەین و شوێنەواری نایەڵین، ئەو كاتە ئەگەر بیانەوێت بە رێگاكەدا بڕۆن، چۆن دەتوانن رێگەكە ببینن و پێشبڕكێ بكەن؟!).

ب- ﴿وَإِن مِّنكُمۡ إِلَّا وَارِدُهَاۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتۡمٗا مَّقۡضِيّٗا ٧١ ثُمَّ نُنَجِّي ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيّٗا ٧٢﴾ مريم: ٧١ - ٧٢. واتە: (ئێوە "خەڵكینە" كەستان نییە تێپەڕ نەكات بەسەر دۆزەخدا، ئەم پێشهاتە شتێكی بڕیاردراوە هەر جێبەجێ دەكرێت. لەوەودوا ئەوانە رزگار دەكەین كە پارێزكارو خواناس بوون، ستەمكارانیش لەناو دۆزەخدا بەچۆكدا دەهێنین).

---

[1] المواقف وشرحه للسيد الشريف ٣٢١/٨. وشرح المقاصد للتفتازاني ١٢٠/٥ ولوامع الأنوار البهية ١٨٩/٢ وشرح الجوهرة للباجوري ٢٩٤.

[2] لوامع الأنوار البهية، سەرچاوەی پێشوو.

چەندین فەرموودەش لەمبارەوە هاتوون، بۆ نمونـە: پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: **(ثم يُضرب الجِسْرُ على جهنم، وتَحِلُّ الشفاعةُ، ويقولون: اللهم سلم سلم) قيل: يارسول الله، وما الجِسْرُ؟ قال: (دَحضٌ مَزِلَةٌ، فيه خطاطيف و كَلاليب وحَسَك، تكون بنجد فيها شُوَيكة، يقال لها السَعْدان، فيمر المؤمنون كطَرْف العين، وكالبرق، وكالريح، وكالطير، وكأجاويد الخيل و الرِّكاب، فناجٍ مُسَلَّمٌ، ومخدوش مُرْسَلٌ، ومَكْدُوسٌ في نارِ جهنم)**[1] واتە: (پاشان پرد بەسەر پشتی دۆزەخ ڕادەخرێ و شەفاعەت دەست پێدەکات، دەڵێن: بەسەلامەتی بەسەلامەتی) وترا: ئەی پێغەمبەری خوا، پرد چییە؟ فەرمووی: (ڕێیەکی زۆر خلیسکە، لووسە، قولاپ و دڕکی پان و ڕاخراوی پێوەن و دڕکێکی پێوەیە سەری قولاپە کە لە "نجد" دەبێ و "سەعدانی" پێ دەگوترێ، جا بڕواداران بەسەریدا تێدەپەڕن، هەندێکیان وەك ئەندازەی خێرایی چاو تێدەپەڕن، هەندێکیان وەك خێرایی تیشك، هەندێکی تریان وەك بایەکی بەهێز، هەندێکی تریشیان وەك ئەسپی باش و خێرا، هەندێکی تریان وەك سواری وڵاخی باربەر، جا هەیانە ڕزگاری دەبێ و سەلامەتە، هەشیانە تێپەڕ دەبێت بەڵام بریندار دەبێ و دەڕووشێت و هەشیانە سەرەو بن دەکەوێتەوە ناو دۆزەخەوە).

کاتێك بڕواداران بەسەر پرددا تێدەپەڕن ئەوا نوورو ڕووناکیان پێ دەدرێت بە ئەندازەی کردەوەکانیان، هەیانە نوورێکی وای پێدەدرێت وەك چیایەکە، هەیانە نوورەکەی کەمترە، هەروەك ئەو فەرموودە ڕاست و دروستەی کە بەیهەقی گێڕاویەتیەوە ئاماژەی پێداوە[2].

---

[1] التذكرة للقرطبي ٣٣١.

فەرموودەی: پرد بەسەر پشتی دۆزەخ ڕادەخرێ... تاد: صحيح مسلم، ١ كتاب الأيمان، ٨١ باب المعرفة طريق الرؤية، رقم ١٨٣ عن أبي سعيد الخدري.

[2] شرح العقيدة الطحاوية لإبن ابي العز ٦-٥، وفيه حيدث البيهقي بسنده عن مسروق عن عبدالله بن مسعود، وانظر تخريجه في هامش ٦٠٦.

**وەسفی پردەکە:**

ئەبو سەعید خودری (ڕەزای خوای لیٚ بێت) وتویەتی: پێم گەیشتووە کە پردەکە ناسکترە لە موو و تیژترە لە شمشێر[1].

هەندیٚ لە زانایانی کەلام وەك (قەرافی) و (عیزی کوڕی عەبدوسسەلام) بۆچوونیان وایە کە ئەو وەسفەی کە خرایەڕوو تەئویل بکرێت، بۆیە لەم بارەوە وتویانە:

أ- بارودۆخی پردەکە بە خۆشی و سەختیەکەی دەگۆڕێت، بەپێی پەرستش و تاوانەکان، تەنها خوای گەورەش زانایە بە ئەندازەکەی، نەریت وابووە کە نموونە بە مووی ناسك هێنراوەتەوە، بۆ شتی ناڕۆشن و نادیارو شمشێر تیژی بەنمونە هێنراوەتەوە، بۆ خێرایی فریشتەکان لە ڕۆیشتن بەرەو جێبەجیٚ کردنی فەرمانەکانی خوای گەورەو پاداشتدانەوەی خەڵکی.

ب- ئەو وەسفەی کرا، بەرپەرچ دراوەیە، بەوەی کە فریشتەکان لەلا تەنیشتی بروادارانەوەن، هەروەها باسکرا کە پرد قولاپە و دڕکی هەیە، واتە: هەر کەسێك بەسەر پردەکەدا بڕوات، ئەوا بەسەر سکیدا دەکەوێت، هەیانە دەکەوێت دواتر هەڵدەستێتەوە. ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە جێگای پێدانان هەیە بۆ ئەوانەی بەسەر پردەکەدا تێدەپەڕن، موی ناسکیش بەرگە ئەمە ناگرێت.

جا قەرافی و بەیهەقی وتویانە: (باریك و ناسك تربوونی پرد "سراط" لە موو، هەروەها تیژتر بوونی لە شمشێر، ئەم وەسفەم نەبینیوە لە گێڕانەوە ڕاست و دروستەکان، بەڵکو ئەم وەسفە لە چەند هاوەڵێکی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) هاتووە)[2].

پێشەوا (قورتوبی) ئەم بۆچوونەی ڕەتکردۆتەوەو وتویەتی: ئەم وتەیە ڕەت کراوەیە بەو هەواڵ و خەبەرانەی لەوبارەوە هاتوون کە پێویستە بڕوامان پێی هەبێت، چونکە ئەو

---

[1] التذكرة للقرطبي ٣٣١.

فەرموودەی: پێم گەیشتووە کە پردەکە... تاد: صحيح مسلم، ١ كتاب الايمان، ٨١ باب المعرفة طريق الرؤية، رقم ١٨٣.

[2] التذكرة للقرطبي ٣٣١. و لوامع الأنوار البهية ٢/١٩٣.

خوایەی کە توانای ڕاگرتنی باڵندەی هەیە لە هەوادا، ئەوا توانای هەیە کە مرۆڤ لەسەر شتی باریك ڕابگرێت و لەسەری بڕوێنێت و ڕۆیشتنی پێ لەسەر بکات، تەنها لەکاتی ئەستەم بووندا لە واتای ڕاستەقینە "حقیقی" لادەدرێت بۆ واتای خوازراو "مجاز"، ئەم وەسفەی کە بۆ پردەکە کراوە بە تیژی و باریکی شتێکی ئەستەم نییە بەهۆی ئەو شوێنەوارانەی لەوبارەوە هاتوون و پێشەوا دادپەروەرەکان ڕوونیان کردۆتەوەو نەقڵیان کردووە، جا ئەو کەسەی خوای گەورە هیچ نوورێکی پێ نەبەخشێت لەکوێ نووری دەست دەکەوێت)[1].

### پردەکە دوو پردە:

زانایان باسیان کردووە کە لە ڕۆژی دواییدا دوو پرد (سراط) هەن:

**یەکەم:** تێپەڕگە و پردێکە هەموو خەڵکی گۆڕەپانی دوارۆژ بەسەریدا تێدەپەڕن بەوانەی تاوانیان زۆرەو بەوانەش کە تاوانیان کەمە، جگە لەو کەسانەی بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشت یاخود ئاگر دەیان گرێت، هەتا ئەو موسڵمانانەشی لەو پردە ڕزگاریان نابێ کە تۆڵە سەندنەوە کۆتایی بە چاکەکانیان ناهێنێ، ئەمانە لەسەر پردی دووەم ڕادەگیرێن لە نێوان بەهەشت و دۆزەخ و کەس لەوانە بەویستی خوا ناگەڕێتەوە ناو ئاگر، چونکە ئەوانە لە پردی یەکەم پەڕیونەتەوە کە لەسەر پشتی دۆزەخ دانراوە کە لەو پردەدا ئەوانەی کە خاوەن گوناهن تێیدەکەون و ئەوانەش کە لە تۆڵە سەندنەوە خێرو پاداشیان نامێنێ.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: **(يخلصُ المؤمنون من النار، فيُحْبَسُون على قَنطرة بين الجنة والنار فَيُقَصُّ لبعضهم من بعض، مظالمُ كانت بينهم في الدنيا، حتى اذا هُذِّبوا ونَقوا أُذِنَ لهم الدخول الجنة، فوالذي نفس محمد بيده، لأحدهم أهدى بمنزله في الجنة منه بمنزله كان في الدنيا)** واتە: کاتێك بڕواداران لە ئاگر دەرباز دەبن لەسەر

---

[1] التذكرة للقرطبي، سەرچاوەی پێشوو. ولوامع الأنوار البهية ٢/١٩٤ نقلاً عن التذكرة. سەیری ئەمانەش بکە: المقاصد وشرحه ٥/١٢٠. واحياء علوم الدين ١/١٢٠.

قەراغی پردێکی نێوان بەهەشت و دۆزەخ گیر ئەخۆن لەوێدا داوەری دەکرێت لە نێوانیانـدا سەبارەت بەو ستەمانەی کە کردوویانە بەرامبەر یەکتری لە دونیادا، جا کاتێك لە گوناهو تاوان پاك و خاوێن دەبنەوە ڕێگەیان پێدەدرێت بچنە بەهەشتەوە. جا سوێند بـەو کەسـەی گیانی منی بەدەستە هەریەکە لەوان شارەزاترە بـەماڵی خـۆی لـە بەهەشـتدا زیـاتر لـەو ماڵەی کە هەیبووە لە دونیادا.

دارقطنی فەرموودەیەکی هێناوە کە تیایدا هاتووە: بەهەشت لەدوای پردەکەیە.

هەروەها (قورتوبی) وتویەتی: دەکرێ ئەم پـردەش (قنطـرة) لـەدوای پردەکـە (سـراط) بێت، بە بەڵگەی فەرموودەکەی بوخاری[1].

**حیکمەتی ڕۆیشتن بەسەر پردی دواڕۆژدا**

بریتییە لە دەرخستنی ڕزگار بوون لە دۆزەخ، ئاخ و داخ هەڵکێشانی بێ بـاوەڕان دوای ئەوەی لەسەر پردەکە لەگەڵ باوەڕدران دابوون، کەچی بـاوەڕداران ڕزگاریـان بـوو و ئـەوان ڕزگاریان نەبوو[2].

## حوکمی بڕوا بوون بە پرد:

زۆربەی زانایان پێیان وایە باوەڕ پێبوونی پێویستە، بە هـۆی ئـەو بەڵگـە ڕاشـکاوانەی ڕابردوو کە خرانەڕوو[3]. هەندێك لە موعتەزیلەکان[1] و ئیبازییەکان[2] هەمان بۆچـوونیان هەیە.

---

[1] التذكرة للقرطبي ٣٣٨-٣٣٩، لوامع الأنوار البهية ١٨٩/٢.

فەرموودەی: کاتێك بڕواداران لە ئاگر دەرباز دەبن... تاد: صحيح البخاري: ٨١ كتاب الرقائق، ٤٨ باب القصاص يوم القيامة، رقم ٦٥٣٥، عن أبي سعيد الخدري بهذا اللفظ. وانظره بلفظ مقارب في ٤٦ كتاب المظالم والغصب، ١ (أ) باب قصاص المظالم، رقم ٢٤٤٠، عن أبي سعيد الخدري (رضي الله عنه)..

[2] شرح الجوهرة للباجوري ٢٩٥.

[3] شرح الجوهرة لعبدالسلام ٢٣٥.

زۆربەی موعتەزیلەکان[3] بڕوایان پێ نەبووە، ئیبازییەکان وتویانە: پـرد شـتێکی ڕەواو ڕاستە، هەر کەسێك پلەی بەرز یان نزم بێت بەسەریدا تێپەڕ دەبێت[4].

* * *

## بەهەشت و دۆزەخ

ئەوە خرایەڕوو کە مرۆڤـ لە گۆڕ دێتەدەرو بەجەستەوە زیندوو دەکرێتـەوە- بـە ڕۆح و جەستەکەی - دواتر بڕوادار خۆشی دەکات و بێباوەڕیش ئازارو خەم دەخوات، دیاردەکـانی ڕۆژیی دوایی دەبینێت تـا دەگاتـە ئـەو شـوێنەی بـۆی ئامـادەکراوە چ وەك سـزا یـاخود پاداشت، کە بریتییە لە بەهەشت و دۆزەخ.

دەقەکانی قورئانی پیرۆزو سوننەتی بەپێزی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وێنەی ئـەم دیاردەو بارودۆخانەی ڕۆژیی دواییان کێشاوە، بەشـێوەیەك کـە وەك قەوارەیـەکی مـاددی بەرهەست وایە، ئەم وێنە کێشانەش نزیك خەرەوەیە بـۆ بـیری مرۆڤـ لـە ژیـانی دونیـا بەشێوەی نمونە، تا مرۆڤـ بزانێـت تـا چ ئەندازەیـەك ئـازار یـاخود خۆشـی یـان چـێژی جەستەیی یان چێژی ڕۆحی هەیە لە بەهەشت و دۆزەخدا، ئەمە تەنها بۆ نزیك خستنەوەیە ئەگەرنا بەهەشت و دۆزەخ زۆر لەوە گەورەو فراوانترن کە عەقڵی مرۆڤـ ئەندێشەی دەکات لە ژیانی دونیادا، بە بەڵگەی:

---

(1) لەم بارەوە جوبائی ڕا ڕا بووە، جاری وابووە بە پێویستی دانەناوە، جاری واش هەبووە بە پێویستی داناوە. "ئەبو هوزەیل" و "بیشری کوڕی موعتەمەر" بۆچوونیان وابووە دروستە شتێك لە شێوەی پرد ببێت، بەڵام حوکمیان لەسەر نەداوە./ المواقف وشرحه للسید الشریف ٨/٣٢١.

(2) هەندێك لە ئیبازییەکان وەك: هودی کوڕی حەکەم، ئیسماعیل لە ناوچەی قەناترە، ئەلقوتب لە همیان و جامعوشەمل هەمان بۆچوونی ئەشعەرییەکانیان هەیە، لەوەی پرد لەسەر پشتی دۆزەخ درێژ کراوەتەوە... ./ مشارق أنوار العقول ٢/١٢٨.

(3) المواقف ٨/٣٢١.

(4) مشارق أنوار العقول ٢/١٢٨.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)دەفەرموویێت: **(يقول الله عزوجل: أعددتُ لعبادي الصالحين ما لا عينٌ رأت، ولا أُذنٌ سمعت، ولا خَطَر على قلب بشر، ذُخْراً بَلْهَ ما أطلعكم الله عليه) ثم قرأ: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ ﴾** السجدة: ١٧.[1] واتە: (خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ دەفەرموویێت: بۆ بەندە چاکەکانی خۆم جێگیایەکم ئامادە کردووە، کە نەهیچ چاوێك بینیویەتی و نەهیچ گوێیەك بیستویەتی و نە بەخەیاڵی هیچ کەسیشدا هاتووە، بۆ ئێوەی هەڵگرتووە کە پیشانی ئێوەی نەداوە) دواتر ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (جا هیچ کەس لەو بەختەوەرانە نازانێت چی بۆ هەڵگیراوەو شاراوەتەوە لە نازو نیعمەتی جۆراو جۆر لای پەروەردگاری، کە چاو پێی گەش دەبنەوەو بە دیتنی شاد دەبن).

هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: **(ينادي منادٍ: إن لكم أن تَصِحُّوا فلا تقسموا أبداً، وان لكم أن تحيوا فلا تموتوا أبداً، وأن لكم أن تشبُّوا فلا تهرموا أبداً، وان لكم أن تنعموا فلا تَبْأسوا أبداً) فذلك قوله عزوجل: ﴿وَنُودُوٓاْ أَن تِلْكُمُ ٱلْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾** الأعراف: ٤٣.[2] واتە: "بانگدەرێك هاوار دەکات: بەخۆشی و تەندروستی چاك دەژین هەرگیز نەخۆش نابن، دەژین و هەرگیز مردن یەختان ناگرێت، هەر گەنج دەبن و هەرگیز پیر نابن، تام و لەزەت لە خۆشییەکانی دەکەن بەبێ ئەوەی ئەم تام و لەزەتە نەمێنێت) ئەمەش هاومانایە لەگەڵ ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (ئەوسا بانگیان لێکرا: ئەوە ئەو بەهەشتەیە کە پێتان دراوە بەهۆی ئەو کردەوانە کە ئەنجامتان داوە)".

---

[1] فەرموودەی: خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ دەفەرموویێت: بۆ بەندە چاکەکانی خۆم جێگیایەکم ئامادە کردووە... تاد: صحيح مسلم، بداية ٥١ كتاب الجنة، رقم ٢٨٢٤ (٤)، عن أبي هريرة (رضي الله عنه).

[2] فەرموودەی: بانگدەرێك هاوار دەکات: بەخۆشی و تەندروستی چاك دەژین... تاد: صحيح مسلم، ٥١ كتاب الجنة، ٨ باب دوام نعيم أهل الجنة، رقم ٢٨٣٧، عن أبي سعيد الخدري وأبي هريرة (رضي الله عنهما).

ئا لێرەدا ئەو وەسفانە ڕوون دەكەمەوە كە بەتایبەتی لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون، لەبارەی بەهەشت و بەهەشتیەكان و دۆزەخ و دۆزەخیەكان، وەك هاندان بەرەو بەهەشت و خۆشیەكانی،هەڕەشە و هۆشداریدان لەبارەی دۆزەخ و سزایە سامناكەكەی.

## ئاگری دۆزەخ

### دۆزەخییەكان:

خوای گەورە ئاگری دۆزەخی ئامادەكردووە، وەك سزایەك بۆ ئەوانەی كە ئەو شتانەیان نەكردووە كە خوای گەورە فەرمانی پێكردووە، هەروەها خۆشیان دوور نەگرت لەو شتانەی كەخوای مەزن قەدەغەی كردبوون لە ژیانی دونیادا، جا قورئانی پیرۆز چەند وەسفێكی دۆزەخییەكانی كردووە:

**١- بێ باوەڕان:**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا ﴾ النساء: ٥٦. واتە: (بەڕاستی ئەوانەی باوەڕیان نەهێناوە بە ئایەت و فەرمانەكانی ئێمە، لە ئایندەدا دەیانسوتێنین بە ئاگری دۆزەخ).

هەروەها دەفەرموویت: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴾ الأنفال: ٣٦.[1] واتە: (بێگومان ئەوانەش كە بێباوەڕ بوون بۆ دۆزەح كۆ دەكرێنەوە و ڕاپێچ دەكرێن).

**٢- ئەوانەیكەئایەتەكانی خوایان بە درۆ دەخستەوە، خۆیان بەگەورەتر دەزانی لەوەی گوێی بۆ بگرن:**

خوای پایەبەرز دەفەرموویت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَٱسْتَكْبَرُوا۟ عَنْهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلْجَمَلُ فِى سَمِّ ٱلْخِيَاطِ ﴾ الأعراف: ٤٠. واتە: (بێگومان

[1] سەیری ئەم ئایەتانەش بكە: البقرة ٢٤، آل عمران ١٣١، المائدة ١٠، الأنعام ٧٠، یونس ٤، الاسراء ٨، الحج ٧٢، العنكبوت ٦٨، الأحزاب ٦٤، فاطر ٣٦، الزمر ٧١، غافر ٦، الملك ٦، البیِّنة ٦.

ئەوانەی بڕوایان بە ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە نەهێناوەو خۆیان لە ئاستیدا بەگەورە داناوە، ئەوانە دەروازەکانی ئاسمانیان بۆ ناکرێتەوەو ناچنە بەهەشتەوە هەتا وشتر نەچێت بە ناو کونی دەرزیدا).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾ غافر: ٦٠.[1] واتە: (بەڕاستی ئەوانەی خۆیان بەگەورە دادەنێن و لووت بەرزی دەکەن لە ئاستی مندا، لە ئایندەدا بەسەرشۆڕی و خەجاڵەتییەوە دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە).

**٣- دووڕووەکان (المنافقین):**

خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ﴾ النساء: ١٤٥. واتە: (بەڕاستی دووڕووەکان لە چینی هەرە خواری ناو دۆزەخدان).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلۡكُفَّارَ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ هِيَ حَسۡبُهُمۡ﴾ التوبة: ٦٨. واتە: (خوا بەڵێنی ئاگری دۆزەخی بە دووڕووەکان لە پیاوان و ژنان و بێ باوەڕانیش داوە، کە بەردەوام نەمرن تیایدا، ئەو دۆزەخەیان بەسە).

**٤- تاوانبارەکان (المجرمون):**

خوای پاك و تاك دەفەرمووێت: ﴿وَنَسُوقُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرۡدٗا﴾ مريم: ٨٦. واتە: (تاوانبارو گوناهکارانیش بەپەلەو بە تونێتی ڕاپێچ دەکەین بۆ ناو دۆزەخ).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلۡمُجۡرِمِينَ فِي عَذَابِ جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ﴾ الزخرف: ٧٤.[2] واتە: (بەڕاستی تاوانبارو تاوانکاران لە ناو ئازارو سزای دۆزەخدا بەهەمیشەیی دەمێننەوە).

---

[1] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: المائدة ١٠، الفرقان ١١، الزمر ٦٠، فصلت ٢٨، المرسلات ٣٤، النبأ ٢٨.

[2] سەیری ئەم ئایەتەش بکە: القمر ٤٧.

**٥- سەر لێشێواوان (الغاوون):**

خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ دەفەرمووێت: ﴿ وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِلْغَاوِينَ﴾ الشعراء: ٩١. واتە: (دۆزەخیش بۆ گومڕاو سەرلێشێواوەکان دەرخراوە).

**٦- ستەمکاران (الظالمون):**

خوای تاك و پاك دەفەرمووێت: ﴿وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴾ المائدة: ٧٢. واتە: (شوێن و جێگە و سەرەنجامی ئاگرە، ئەوسا ئەو ستەمکارانە هیچ جۆرە پشتیوانێکیان نییە).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿ لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾الأعراف: ٤١. واتە: (ئەوانە "لەناو ئاگری دۆزەخدا" ڕایەخی ئاگرینیان هەیە، لە سەروشیانەوە "سەقف و بەتانی و لێفەی" ئاگرین داپۆشەریانە، بێگومان هەر بەوشێوەیە پاداشتی ستەمکاران دەدەینەوەو تۆڵەیان لێ دەسێنین).

**٧- یاخییەکان (الطاغون):**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا ﴿٢١﴾ لِّلطَّٰغِينَ مَـَٔابًا ﴿٢٢﴾﴾ النبأ: ٢١-٢٢. واتە: (بێگومان دۆزەخیش دەمێکە چاوەڕێی ئەو ڕۆژەیە و خۆی بۆ مەڵاسداوە. دەبێتە مەنزڵگای خوانەناس و یاخیەکان).

هەروەها خوای بێ وێنە دەفەرمووێت: ﴿فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ﴿٣٧﴾ وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿٣٨﴾ فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٣٩﴾﴾ النازعات: ٣٧-٣٩. واتە: (جا ئەوەی خوانەناس و یاخی و لە سنوور دەچوو بێت. ژیانی دونیای زیاتر لە قیامەت مەبەست بووبێت. ئەوە بێگومان ئەو دۆزەخە جێگەی مانەوەو حەوانەوەیەتی!!).

**٨- ئەوانەی ژیانی دونیایان زیاتر مەبەست بووە لە ژیانی ڕۆژی دوایی:**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصْلَىٰهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا ﴾ الاسراء: ١٨. واتە: (ئەوەی مەبەستی تەنها دونیا بێت کە بەپەلە و بەخێرایی تێدەپەڕێت، ئەوە ئێمە "بە ئارەزووی کەس ناکەین"

هەرچیمان بوویت بەزوویی، بەویستی خۆمان و بە هەر کەس بمانەویت دەیبەخشین، پاشان "لەو جیهان" ئەو جۆرە کەسانە "واتە دنیا پەرستان" دەخەینە ناو دۆزەخەوە، بە سەرزەنشت کراوەی و ڕاونراویەوە).

هەروەها فەرموویەتی: ﴿فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ﴿٣٧﴾ وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿٣٨﴾ فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٣٩﴾﴾ النازعات: ٣٧-٣٩.[١] واتە: (جا ئەوەی خوانەناس و یاخی و لە سنوور دەچوو بێت. ژیانی دونیای زیاتر لە قیامەت مەبەست بوویت. ئەوە بێگومان ئەو دۆزەخە جێگەی مانەوەو حەوانەوەیەتی!!).

٩- تاوانکاران (الفجار):

خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿وَإِنَّ ٱلْفُجَّارَ لَفِى جَحِيمٍ ﴿١٤﴾ يَصْلَوْنَهَا يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴿١٥﴾﴾ الانفطار: ١٤-١٥. واتە: (بێگومان تاوانبارو تاوانکارەکانیش لەناو دۆزەخدا ژیانی پڕ لە ئێش و ئازار دەبەنەسەر. کە لە ڕۆژی قیامەتدا دەخرێنە ناوی و دووچاری دەبن).

١٠- لاسارەکان (الفاسقون):

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُواْ فَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ﴾ السجدة: ٢٠. واتە: (ئەوانەش تاوانبارو یاخی بوون، شوێنیان ناو ئاگری دۆزەخە).

١١- ئەوانەی دوژمنایەتی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن:

خوای پایەبەرز دەفەرمویت: ﴿مَن يُحَادِدِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَأَنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَـٰلِدًا فِيهَا﴾ التوبة: ٦٣. واتە: (ئەوەی دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی بکات، ئەوە بەڕاستی ئاگری دۆزەخ بەشیەتی و بۆی ئامادەیە هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نەبڕاوەشدا).

١٢- هەر کەسێك خێرو چاکەی سووك و کەم بێت واتە ئەو تایەی تەرازوو کە چاکەی تێدایە سوکتر بێت لەو تایەی تەرازووەی کە گوناهەکانی تێدایە، لە تەرازووی ڕۆژی دواییدا:

خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمْ فِى جَهَنَّمَ خَـٰلِدُونَ ﴾ المؤمنون: ١٠٣. واتە: (بەڵام ئەو کەسانەی تەرازووی چاکەکانی سووك

---

[١] سەیری ئەم ئایەتەش بکە: یونس ٧-٨.

بێت، ئەوانە ئەو کەسانەن کە خۆیان دۆڕاندووەو خەسارو ڕیسوا کردووە، دەبێت هەر لەناو دۆزەخدا ژیانی نەبڕاوە ببەنە سەر).

هەروەها دەفەرموویێت ﴿ وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ ۝٨ فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٌ ۝٩ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا هِيَهْ ۝١٠ نَارٌ حَامِيَةٌۢ ۝١١﴾ القارعة: ٨-١١.[1] واتە: (ئەوەش تەرازووی "خێرو چاکەی" سووك بێت و "گوناهی زۆر بێت". ئەوە دایکی ئەو دۆزەخە "باوەشی بۆ کردۆتەوە. جا تۆ چووزانی "هاویە" چییە؟!. ئاگرێکی زۆر سوتێنەرو بڵێسەدارە).

## وەسفەکانی ئاگری دۆزەخ و بارودۆخی دۆزەخییەکان، وەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە:

### ١-خستنەڕووی دۆزەخ بۆ بێباوەڕان کە زۆر بە ڕوونی و دیاری دەیبینن و بۆیان دەردەکەوێت:

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَعَرَضْنَا جَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لِّلْكَٰفِرِينَ عَرْضًا﴾ الکهف: ١٠٠. واتە: (ئیتر ئەو ڕۆژە دۆزەخ نیشانی کافران دەدەین و بەتەواوی دەری دەخەین).

هەروەها دەفەرموویێت:﴿ وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ﴾ النازعات: ٣٦. واتە: (دۆزەخ نیشان دەدرێت و دەردەخرێت بۆ هەر کەسێك کە ببینێت).

### ٢- دۆزەخ هەموو ئەو کەسانەی شیاوی سزای ئاگرن، لە مرۆڤ و جنۆکە لە خۆ دەگرێت:

خوای پاك و تاك دەفەرموویێت: ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴾ هود: ١١٩، السجدة: ١٣. واتە: ("خوای گەورە بڕیاری داوە کە" دۆزەخ پڕ دەکەم لە گرۆی پەری و خەڵکی "ئەوانەی خۆیان شیاوی ئاگر دەکەن").

---

[1] سەیری ئەم ئایەتەش بکە: البقرة ٨١.

هــەروەها دەفــەرموویت: ﴿يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ ٱمْتَلَأْتِ وَتَقُولُ هَلْ مِن مَّزِيدٍ﴾ ق: ٣٠. واتــە: (ڕۆژێك دێت بە دۆزەخ دەڵێین: ئایا پڕ بوویت؟ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: ئایا کەسـی تـر ماوەو خەڵکی زیاتر نییە؟!).

## ٣-دۆزەخ چەند دەروازەیەکی هەیە:

خــوای پــەروەردگار دەفــەرموویت: ﴿لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَٰبٍ لِّكُلِّ بَابٍ مِّنْهُمْ جُزْءٌ مَّقْسُومٌ﴾ الحجر: ٤٤. واتە: (حەوت دەروازەی گەورەی هەیە، هەر دەروازەیەکیش چەند دەرگاو چـەند بەشێکە کە دەستەی دۆزەخیان بەگوێرەی تاوان و گوناهیان ڕاپێچ ئەکرێن بۆ ناوی).

هەروەها دەفـەرموویت: ﴿أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ الزمـر: ٧٢، غـافر: ٧٦.[1] واتــە: (دەی ئیتر لە دەرگاکانی دۆزەخەوە بۆ ژوورەوە).

## ٤- دۆزەخ فریشتەی تایبەتی هەن کە سزاو ئەشکەنجەی دۆزەخیان دەدەن:

خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ دەفەرموویت: ﴿وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ رَبِّكُمْ وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا ۚ قَالُوا۟ بَلَىٰ وَلَٰكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ الزمر: ٧١. واتە: (فریشتەی بەرپرس و سەرپەرشتیار سەرزەنشتیان دەکات و پێیان دەڵێت: باشە، مەگەر پێغەمبەران لـەخۆتان ڕەوانــە نـەکرابوو بۆتــان کـە ئایەتــەکانی پــەروەردگاری خۆتــان بەســەردا بخوێنێتــەوەو یادەوریتــان بکــات و داتــان بچڵەکێنێت لە گەیشتنی ئەم ڕۆژە؟! بەدەم ئاخ و داخ و ناڵەوە دەڵێن: بەڵێ، بــەڵام تــازە، بەڵێ، سوودی نیە و بڕیاری سزاو ئازار دراوە بەسەر کافرو بێ بڕواکاندا).

هــــەروەها دەفــــەرموویت: ﴿كُلَّمَآ أُلْقِىَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ﴿٨﴾ قَالُوا۟ بَلَىٰ قَدْ جَآءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ كَبِيرٍ ﴿٩﴾﴾ الملـك: ٨-٩. واتــە: (هەر جارێك دەستەو تاقمێك فڕێدەدرێتە ناوی پاسەوانی دۆزەخ لێیــان دەپرســێت: باشــە، ترسێنەرێکتان بۆ نەهات، تا لەم سەرەنجامە ئاگادارتان بکات؟!. لەوەڵامدا بەکەساسـیەوە دەڵێن: با، بەڵێ، لە ڕاستیدا ترسێنەرمان بۆ هات، بەڵام ئێمە بڕوامان پێ نـەکردو وتمـان:

[1] سەیری ئەم ئایەتەش بکە: الزمر ٧١.

خوا هیچی لەم بارەیەوە نەناردووە، ئێوە تەنها لە گـومڕایی گـەورەدا گیرتـان خـواردووەو هیچی تر).

**٥- فریشتە سەرپەرشتیارەکانی دۆزەخ زۆر دڵڕەق و توندو تیژن:**

خـوای پایەبـەرز دەفـەرموویێت: ﴿عَلَيْهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ التحـريم: ٦. واتــە: (سەرپەرشــتیاری ئــەو دۆزەخ و ئــاگرە، جـۆرە فریشتەیەکن کە زۆر دڵ ڕەق و توندو تیژن، بێ فەرمانی خوا ناکەن لە هیچ شتێکدا کـە فەرمانیان پێبدات و هەرچی فەرمانێکیان پێ بدرێت ئەنجامی دەدەن).

﴿عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ ﴿٣٠﴾ وَمَا جَعَلْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةً﴾ المـدثر: ٣٠-٣١. واتــە: (نــۆزدە فریشتە سەرپەرشتی دۆزەخ دەکەن. جا ئێمە وەنەبێت کارگوزارانی دۆزەخمان لـە کەسـانی تر جگە لە فریشتە بەدی هێنابێت).

**٦- دۆزەخ لەسەر چەند ستونێك دروستکراوەو دەرگاکانی داخراون:**

خوای بێ هـاوەڵ و هاوتـا دەفـەرموویێت: ﴿إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ ﴿٨﴾ فِى عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍۭ ﴿٩﴾﴾ الهمزة: ٨-٩. واتە: (بێگومان ئاگری دۆزەخ لە شوێنێکدایە کە سەرگیراو و دەرگـا داخـراوە لەسەریان. "خوانەناسان لەوێ" لەناو چەند ستونێکی ئاگرینی درێژدان).

**٧- دۆزەخ دیواری ئاگرینی هەیە:**

خوای مەزن دەفەرموویێت: ﴿إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا﴾ الكهف: ٢٩. واتە: (بێگومان ئێمە دۆزەخێکمان ئامادە کردووە بۆ ستەمکاران کە لە هەموو لایەکـەوە دەورەیان دەدات).

**٨- دۆزەخ نهۆم نهۆم و چین چینە لەسەر یەك:**

خـوای بـێ وێنـە دەفـەرمووێت: ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ ﴾ النسـاء: ١٤٥. واتە: (بەڕاستی دووڕووەکان لە چینی هەرە خوارەوەی ناو دۆزەخدان).

**٩- خوانەناسان بەرگەی کەش و هەوای دۆزەخ ناگرن، ئاگـرەکەی زۆر گەرمە و دووکەڵەکەی ڕەشە، گەرمایەتیەکەی کەم نابێتەوە، بەڵکو بەردەوام پلەی گەرمی زیاد دەبێت:**

خوای گەورە دەفەرموویت ﴿قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ﴾ التوبة: ٨١. واتە: (ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵـێ: ئـاگری دۆزەخ بـەتینترو بـەهێزترە لـە گەرمیـدا ئەگـەر تێبگەن و بیرو هۆشیان بخەنەکار).

هەروەها دەفـەرمووێت: ﴿ وَأَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴿٤١﴾ فِى سَمُومٍ وَحَمِيمٍ ﴿٤٢﴾ وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ ﴿٤٣﴾ لَّا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ ﴿٤٤﴾﴾ الواقعـة: ٤١ - ٤٤.[١] واتـە: (لەولاشـەوە دەسـتەی چەپەکان، قوڕبەسەریان بۆ بارودۆخێك کە تێـی کـەوتوون. لـەناو ئـاگرو ئـاوی لـەکوڵ دا گیریان خواردووەو دەتلێنەوە. ڕادەکەن بۆ ژێر سێبەر، کە ئەویش دوو کەڵی ڕەش و گەرم و سوتێنەرە. نە فێنکە و نەبە کەڵکی حەوانەوە دێت).

**١٠- ئاگری دۆزەخ داگیرساوەو گەرم تاودراوە:**

خوای تاك و پـاك لـە هـاوەڵ دەفـەرمووێت: ﴿ وَإِذَا ٱلْجَحِيمُ سُعِّرَتْ ﴾ التكوير: ١٢. واتـە: (کاتێك دۆزەخ دادەگیرسێت و تاودەدرێت).

هەروەها دەفـەرمووێت:﴿ تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَةً ﴾ الغاشـية: ٤.[٢] واتـە: (دەچـنە نـاو ئـاگرێکی سوتێنەرەوە).

---

[١] سەیری ئەم ئایەتەش بکە: الواقعة ٩٣-٩٤.

[٢] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: القارعة ١٠-١١ والهمزة ٦.

**١١- بڵێسەی ئاگری دۆزەخ زۆر گەورەیە:**

خــوای گــەورە دەفــەرمووێت: ﴿إِنَّهَا تَرْمِى بِشَرَرٍ كَٱلْقَصْرِ ﴿٣٢﴾ كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ ﴿٣٣﴾﴾ المرسلات: ٣٢ - ٣٣. واتــە: (بەڕاســتی ئــەو ئــاگرە بلێســەیەك فڕێــدەدات وەك كۆشــك و تەلارێكی گەورە، مەزنە. هەروەك وشتری زەردی مەیلەو ڕەش دەنوێنێت).

**١٢- هەر كاتێك بڵێسەی ئاگری دۆزەخ بەرەو كپ بوونەوە چوو ئەوا بڵێسەكەی زیاد دەكرێتەوە:**

خــوای پایەبــەرز دەفــەرمووێت: ﴿كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَٰهُمْ سَعِيرًا﴾ الاسراء: ٩٧. واتــە: (ئەوانە شوێنیان ناو ئــاگری دۆزەخــە، هــەر كاتێــك بلێســەی كوژایــەوە، بلێســەی زیــاد دەكەینەوە بۆیان).

**١٣- دۆزەخ چەند جۆرە دەنگێكی ترسێنەری هەیە:**

خوای باڵادەست و خاوەن شكۆ دەفــەرمووێت: ﴿إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ سَمِعُوا۟ لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا﴾ الفرقان: ١٢. واتە: (كاتێك هەر لــە دوورەوە ئــەو ئــاگرە بلێســەدارە خوانەناســان دەبینێت، دەنگی خەشم و قین و هەناسەی داخ لەدڵی دەبیستن).

هــــــەروەها دەفــــــەرمووێت: ﴿إِذَآ أُلْقُوا۟ فِيهَا سَمِعُوا۟ لَهَا شَهِيقًا وَهِىَ تَفُورُ ﴿٧﴾ تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلْغَيْظِ﴾ الملك: ٧-٨. واتە: (كاتێك فڕێدەدرێنە ناوی دەنگێكی ناسازو ناخۆش و لوورەیــەك لە دۆزەخەوە دەبیستن، لە كاتێكدا قوڵپ دەدات و دەكوڵێت. لەداخی خوانەناسان خەریكە پارچە پارچە و لێك ببێتەوە).

**١٤- ئاگری دۆزەخ زۆر توندو تیژە، ڕووبەڕووی هەر شتێك ببێتەوە تێكی دەشكێنێت:**

خوای تاك و بێ هاوەڵ دەفەرمووێت: ﴿سَأُصْلِيهِ سَقَرَ ﴿٢٦﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سَقَرُ ﴿٢٧﴾ لَا تُبْقِى وَلَا تَذَرُ ﴿٢٨﴾﴾ المدثر: ٢٦ - ٢٨. واتە: ("ئەو بێ ویژدانە بەســەرییەوە ناچــێت" دەبێــت بیگەیەنــە دۆزەخ. جا تۆ نازانیت دۆزەخ چییە. هیچ ئەندامێك ناهێڵێتەوەو دەست هەڵناگرێت).

**١٥- دۆزەخییەکان کۆ دەکرێنەوە، تا خەڵکی پاك و ناپاك لەیەکتر جیا بکرێنەوە:**

خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحۡشَرُونَ ۝٣٦ لِيَمِيزَ ٱللَّهُ ٱلۡخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ وَيَجۡعَلَ ٱلۡخَبِيثَ بَعۡضَهُۥ عَلَىٰ بَعۡضٍ فَيَرۡكُمَهُۥ جَمِيعًا فَيَجۡعَلَهُۥ فِي جَهَنَّمَۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ۝٣٧﴾ الأنفال: ٣٦ - ٣٧. واتە: (بێ گومان ئەوانـەش کـە بـێ باوەڕ بوون بۆ دۆزەخ کۆ دەکرێنەوەو ڕاپێچ دەکرێن. بۆ ئەوەی کـە: خـوا کەسـانی دەروون پیس و ناپاك لە کەسانی دەروون خاوێن و پاك جیا بکاتەوەو پیس و ناپاکەکانیش لەسـەر یەك کەڵەکە بکات و هەموویان بدات بە مل یەکدا بۆ ئەوەی کۆیـان بکاتـەوە بەگشـتی، ئینجا فڕێیان بداتە ناو دۆزەخەوە، ئا ئەوانە هەر خۆیان خەسارەتمەند و زەرەرمەندن).

**١٦- خوانەناسان و تاوانباران دەبرێنە سەر دۆزەخ، بە تیلەی چاو سەیری ئاگری دۆزەخ دەکەن لە ترسان:**

خوای بێ وێنە دەفـەرمووێت: ﴿وَتَرَىٰهُمۡ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا خَٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ يَنظُرُونَ مِن طَرۡفٍ خَفِيّٖ﴾ الشورى: ٤٥. واتە: (سەرەنجام تاوانباران دەبینیت دەبرێنە دۆزەخ، هـەموو پەست و زەلیل و خەجاڵەتن، "لە شەرمەزاری و لە ترسـدا" لـە ژێـرەوە بـە تیلـەی چـاو دەڕوانن بۆ ئاگرەکە).

**١٧- هیچ یەکێك لە دۆزەخیان لە سزای دۆزەخ دەرباز نابێت:**

خوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ العنكبـوت: ٥٤. واتـە: (بێگومان دۆزەخ دەوری کافرانی داوەو هەرگیز لە سزای دەرباز نابن).

هەروەها دەفەرمووێت ﴿أَحَاطَ بِهِمۡ سُرَادِقُهَا﴾ الكهف: ٢٩. واتە: (دیواری بڵێسەی ئاگر ئابلۆقەی داون).

**١٨- دۆزەخییەکان بەکۆت و زنجیرەوە فڕێدەدرێنە ناو شوێنێکی تەنگەبەرەوە:**

خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿وَإِذَآ أُلۡقُواْ مِنۡهَا مَكَانٗا ضَيِّقٗا مُّقَرَّنِينَ دَعَوۡاْ هُنَالِكَ ثُبُورٗا ۝١٣ لَّا تَدۡعُواْ ٱلۡيَوۡمَ ثُبُورٗا وَٰحِدٗا وَٱدۡعُواْ ثُبُورٗا كَثِيرٗا ۝١٤﴾ الفرقان: ١٣ - ١٤. واتـە: (هـەر

کاتێك ئەوانە بەکۆت و زنجیرەوە فڕێ دەدرێنە ناو شوێنێکی تەنگەبەرەوە لە دۆزەخدا، داوای مەرگ و تیاچوون دەکەن و مردن بە ئاوات دەخوازن لەوێ. "ئەوسا پێیان دەوترێت" ئەمڕۆ داوای تەنها مردنێك مەکەن، بەڵکو داوای مردنی زۆر و بێشومار بکەن و ئاواتی بۆ بخوازن).

**١٩- سووتەمەنی ئاگری دۆزەخ خەڵك و بەردە:**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ﴾ البقرة: ٢٤، التحريم: ٦. واتە: ("ئەو ئاگرەی" سووتەمەنیەکەی خەڵك و بەردە).

هەروەها دەفەرموویت: ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمْ وَقُودُ ٱلنَّارِ﴾ آل عمران: ١٠. واتە: (ئا ئەوانە سووتەمەنی ئاگرن).

**٢٠- ئاگری دۆزەخ دڵ دەروونیشیان دادەگرێت:**

خوای پەنهان زان دەفەرموویت: ﴿ٱلَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى ٱلْأَفْـِٔدَةِ﴾ الهمزة: ٧. واتە: (ئەو ئاگرەی ڕوو دەکاتە ناو جەرگەی دڵ و دەروونەکان "کە مەڵبەندی کوفرو خوانەناسی و ڕەزیلییە").

**٢١- سزادرانی دۆزەخییەکان بەردەوام و نەبڕاوەیە.**

خوای بێ هاوتا دەفەرموویت: ﴿لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ﴾ الزخرف: ٧٥. واتە: (ئازارو سزا لەسەریان کەم ناکرێتەوە، لە کاتێکدا هەمووشیان تیایدا نائومێد و بێ هیوان).

**٢٢-جۆرەها وێنە و شێوەی سزا بۆ دۆزەخیان ئامادەیە:**

خوای پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا۟

ﭐلۡعَذَابَ ﴾[1] النساء: ٥٦. واتە: (هەموو جارێك پێستیان داوەشاو سووتاو هەڵقرچا، پێستی تر دەکەین بەبەریاندا، بۆ ئەوەی بە چاکی سزاو ئازار بچێژن).

هەروەها دەفەرموویت: ﴿ فَذُوقُواْ فَلَن نَّزِيدَكُمۡ إِلَّا عَذَابًا ﴾ النبأ: ٣٠. واتە: ("پاشان پێیان دەوترێت" دەبچێژن "ئەی خوانەناسان" لە سزاو ئازارو ئەشکەنجە بەولاوە، جا هەرگیز هیچی ترتان بۆ زیاد ناکەین).

**٢٣- ئارامگرنین، توانای بەرگە گرتنی ئەو سزایەیان نییە:**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ ٱصۡلَوۡهَا فَٱصۡبِرُوٓاْ أَوۡ لَا تَصۡبِرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡكُمۡۖ إِنَّمَا تُجۡزَوۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴾ الطور: ١٦. واتە: (دەبێت بچنە ناوی و سزا بچێژن، جا ئیتر خۆڕادەگرن یان خۆڕاناگرن وەك یەکە بۆتان، بێگومان تۆڵەی ئەو کارو کردەوانەتان هەر دەدرێتەوە کە دەتانکرد).

**٢٤- دۆزەخیەکان لەلایەن سەرپەرشتیارانی دۆزەخەوە بەناو ئاگری دۆزەخدا ڕادەکێشرێن و کۆت و زنجیر دەخرێتە ملیان و بەگورزی ئاسنین لێیان دەدرێت:**

خوای پایەبەرز دەفەرموویت: ﴿ إِذِ ٱلۡأَغۡلَٰلُ فِيٓ أَعۡنَٰقِهِمۡ وَٱلسَّلَٰسِلُ يُسۡحَبُونَ ﴿٧١﴾ فِي ٱلۡحَمِيمِ ثُمَّ فِي ٱلنَّارِ يُسۡجَرُونَ ﴿٧٢﴾ ﴾ غافر: ٧١-٧٢. واتە: (کاتێك کۆت و زنجیرەکان دەکرێنە گەردەنیان و ڕادەکێشرێن. بۆ ناو ئاوی زۆر گەرم، پاشان ئاگریان پێ خۆش دەکرێت و دەبنە سووتەمەنی بۆی).

[1] زانستی پزیشکی هاوچەرخ دەڵێت: جەستەی مرۆڤ پێکدێت لە توێژ و بن توێژ (جلد و أدمة)، توێژەکە شوێنی هەست پێکردنە، بن توێژەکەش هیچ هەستێکی پێ ناکرێت، ئەمەش یەکێك لەو شوێنە ئیعجازییە زانستیانەی قورئانی پیرۆز.
سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: الحج ١٩-٢١، ق ٢٤ و٢٦، الطور ١٣-١٤،القمر ٤٨، الحاقة ٣١-٣٢، المزمل ١٢ .

هەروەها دەفەرموویێت: ﴿ خُذُوهُ فَٱعۡتِلُوهُ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ صُبُّواْ فَوۡقَ رَأۡسِهِۦ مِنۡ عَذَابِ ٱلۡحَمِيمِ ﴿٤٨﴾ ذُقۡ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡكَرِيمُ ﴿٤٩﴾ ﴾ الدخان: ٤٧-٤٩.[1] واتە: (فەرمان دەدرێت: ئەو تاوانبارە بگرن و بەرزی بکەنەوە بەسەر ناوەڕاستی دۆزەخداو بەری بدەنەوە. لەوەودوا ئاگرو ئاوی زۆر لەکوڵ بکەن بەسەریدا. ئەوسا پێی دەوترێت: دەبچێژە، بێگومان زۆر خۆتت بەشت دەزانی و خۆتت زۆر بە ماقووڵ دەخستە بەرچاو).

**٢٥- دۆزەخیەکان زۆر بە سەختی و قوڕسی بە ئاهوناڵەوە هەناسە دەدەن:**

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُواْ فَفِي ٱلنَّارِ لَهُمۡ فِيهَا زَفِيرٞ وَشَهِيقٌ ﴾ هود: ١٠٦. واتە: (جا ئەوانەی بەدبەخت و چارە ڕەش بوون، ئەوە لەناو ئاگردان، هەناسە هەڵمژین و هەناسە دانەوەیان زۆر سەخت و دژوارە).

هەروەها دەفەرموویێت: ﴿لَهُمۡ فِيهَا زَفِيرٞ وَهُمۡ فِيهَا لَا يَسۡمَعُونَ ﴾ الأنبياء: ١٠٠. واتە: (ئەوانە" بەهەناسەی قوڕس و لرخەلرخ و ئاهو ناڵەوە "ژیانی سەختی تیادا دەبەنەسەر" و مژدەو هیواو قسەیەکی خۆش نابیسن).

**٢٦- بڵێسەی ئاگر ڕووی دۆزەخییەکان دەسوتێنێت و ڕووخساریان ئەم دیوو ئەو دیوی پێ دەکرێت لەناو ئاگری دۆزەخدا:**

خوای مەزن دەفەرموویێت: ﴿ تَلۡفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ وَهُمۡ فِيهَا كَٰلِحُونَ ﴾ المؤمنون: ١٠٤. واتە: (بڵێسەی ئاگر چڕوچاویان دەبرژێنێت و هەموویان لێویان هەڵقرچاوەو دانیان ریچ دەبێتەوە).

هەروەها دەفەرموویێت: ﴿ يَوۡمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمۡ فِي ٱلنَّارِ ﴾ الأحزاب: ٦٦. واتە: (ڕۆژێك دێت ڕووخساریان ئەم دیودیوی پێ دەکرێت لەناو ئاگردا).

---

[1] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: الحج ١٩-٢١، ق ٢٤ و ٢٦، الطور ١٣-١٤، القمر ٤٨، الحاقة ٣١-٣٢، المزمل ١٢.

## ٢٧-ئاگری دۆزەخ پێستی ئەندامەکان و سەر دادەماڵێت و دەیسوتێنێت و ڕەشی دەکات:

خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ دەفەرموویت: ﴿كَلَّآ إِنَّهَا لَظَىٰ ﴿١٥﴾ نَزَّاعَةً لِّلشَّوَىٰ ﴿١٦﴾﴾ المعارج: ١٥ - ١٦. واتە: (نەخێر، ئەو ئاواتانە هیچی نایەنەدی، بەڕاستی دۆزەخ ئامادەیە و بڵێسەدارو داخ لە دڵە. لەکاتێکدا داماڵێنەری پێستی سەرو هەموو ئەندامەکانە).

هەروەها دەفەرموویت: ﴿لَوَّاحَةٌ لِّلْبَشَرِ﴾ المدثر: ٢٩. واتە: (پێستیان هەڵدەقرچێنێت و ڕەشی دەکات و دەری دەخات).

## ٢٨- ڕایەخ و داپۆشەریان لە ئاگرە :

خوای بێ وێنە دەفەرموویت: ﴿لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ﴾ الأعراف: ٤١. واتە: (ئەوانە "لەناو دۆزەخدا" ڕایەخی ئاگرینیان هەیە، لە سەروشیانەوە "سەقف و بەتانی و لێفەی" ئاگرین داپۆشەریانە).

هەروەها دەفەرموویت: ﴿لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ النَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ ذَٰلِكَ يُخَوِّفُ اللَّهُ بِهِ عِبَادَهُ﴾ الزمر: ١٦.[١] واتە: (ئەوانە لەسەرویانەوە پەلە هەوری دوو کەڵ لە ئاگر دەوری داون، لە ژێریشیانەوە هەمان پەلە هەورو دووکەڵ هەیە، ئا بەوشێوەیە خوا بەندەکانی دەترسێنێت).

## ٢٩- پۆشاکیان لە ئاگرە:

خوای پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٍ وَتَغْشَىٰ وُجُوهَهُمُ النَّارُ﴾ إبراهيم: ٥٠. واتە: (کراسەکانیان لە قەترانە "کە ماددەیەکی ڕەشی بۆن ناخۆشە و بەخێراییش دەسوتێت" و بڵێسەی ئاگریش ڕووخساریانی داپۆشیوە).

---

[١] سەیری ئەم ئایەتەش بکە: العنکبوت: ٥٥.

هـــەروەها دەفـــەرموویّت: ﴿فَالَّذِينَ كَفَرُوا قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ الْحَمِيمُ﴾ الحج: ١٩. واتە: (جا ئەوانەیان کە بیّ باوەڕ بوون پارچە پۆشاك لە ئـاگر بڕاوە بە باڵایان، ئاوی زۆر لەکوڵ لەسەرویانەوە دەکریّت بەسەریاندا).

**٣٠- ئەوانەی زێڕو زیویان کۆ دەکردەوەو لە ڕێی چاکە بەکاری ناهێنن، ئەوا بەوەی کۆیان کردۆتەوە سزا دەدرێن:**

خوای بیّ هـاوەڵ و هاوتـا دەفـەرموویّت: ﴿يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ﴾ التوبة: ٣٥. واتە: ("سزای سەخت" لە ڕۆژێکدا دەبیّت ئەو پارەو سـامانەی کۆیان کردۆتەوە، لە دۆزەخدا سوور دەکریّنەوە، ناوچـاو و لاتەنیشت و پشتیانی پیّی داخ دەکریّت،ئینجا پیّیان دەوتریّت: ئەمە ئەو سـامانەیە کـە کۆتـان دەکـردەوە بۆخۆتـان، دە بچیّژن سزای ئەوەی کە کۆدەکردەوە).

**٣١- خۆراکی دۆزەخییەکان لە درەختی ژەقنەبوتە، کە درەختێکە لەناخی دۆزەخدا خوا ڕوواندویەتی:**

ئەمە درەختیّکە گەڵاکانی بچوکن، بۆگەنە، تامی تاڵە، بەرووبوومی ئـاگرە، برسـیّتی دۆزەخییەکان ناچار دەکات لەم دارە بخۆن، چونکە لەم دارە بەدەر داریّکـی تـر نییــە. ئـەم دارە گەدەیان دەسوتیّنیّت، خواردنەوەیان وەك خڵتەی کـانزای تواوەیــە، یـان پاشماوەکـانی ئاگرە، کە تواوەتەوە:

خـوای گـەورە دەفـەرموویّت: ﴿إِنَّ شَجَرَتَ الزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾ طَعَامُ الْأَثِيمِ ﴿٤٤﴾ كَالْمُهْلِ يَغْلِي فِي الْبُطُونِ ﴿٤٥﴾ كَغَلْيِ الْحَمِيمِ ﴿٤٦﴾﴾ الـدخان: ٤٣ -٤٦. واتــە: (بەڕاســتی درەختــی ژەقنەبوت. بەروبوومەکـەی خـۆراکی تاوانبارانــە. هـەروەك کـانزای تـواوە لـەناو ورگ و ڕیخۆڵەکاندا دەکوڵیّت. وەك کوڵانی ئاوی یەکجار گەرم).

هـــــەروەها دەفـــــەرموویٚت: ﴿لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ ۝ لَّا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِي مِن جُوعٍ ﴾ الغاشية: ٦-٧.[1] واتە: (هیچ خۆراکیشیان نییە تەنها دڕکێکی وشك و تفت و تـاڵ نـەبێت. نە ئەوەیە گۆشتی پێبگرن و پێی قەڵەو بن، نە ئەوەشە پێی تێربن).

## ٣٢- خواردنەوەیان ئاوی گەرم و لەكوڵ و كێم و زووخاوە، كە لەبەر گەرمییەكەی ڕیخۆڵەكانیان لەت لەت دەبێت:

خوای پایەبەرز دەفەرموویٚت: ﴿ وَاسْتَفْتَحُوا وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ۝ مِّن وَرَائِهِ جَهَنَّمُ وَيُسْقَىٰ مِن مَّاءٍ صَدِيدٍ ۝ يَتَجَرَّعُهُ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُ وَيَأْتِيهِ الْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ وَمِن وَرَائِهِ عَذَابٌ غَلِيظٌ ۝﴾ إبـراهيم:١٥-١٧. واتـــە: (ئەوسـا ئـیتر پێغەمبـەران داوای سـەركەوتنیان لـە پـەروەردگار كـردو هـەموو زۆردارو ستەمكارو سەرسەخت و دڵ ڕەشێك نائومێد و مایەپووچ بـوو. "هـەر یـەك لەوانـە" لـە داهاتوودا دۆزەخ چاوەڕێیەتی و تیایدا كێم و زووخاوی دەرخوارد دەدرێت. جا ئـەو كـێم و زووخاوە قوم قوم بەناچاری دەخواتەوەو بەئاسانی بۆی قوت نادرێت، مەرگیش لـە هـەموو لایەكەوە هێرشی بۆ دەهێنێت، كەچی ناشمرێت، لـەوەودواش سـزاو ئـازاری هەمـە جـۆرو ناخۆش و گران یەخەی بەرنادات).

هەروەها دەفەرموویٚت: ﴿ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا ۝ إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا ۝﴾ النبأ: ٢٤-٢٥.[2] واتە: (لەناویدا ناچێژن فێنكاییەك یان خواردنەوەیەكی بەتام. جگە لەئاوی لـە كوڵ و كێم و زووخاو).

## ٣٣- بە ئاهو ناڵەوە هاوار دەكەن، لە تینویتیە زۆرەكەیاندا داوای ئاو ئەكەن، ئاوێكی گەرمی وەك خڵتەی كانزای تواوە پێیان دەدرێت:

خوای گەورە دەفەرموویٚت: ﴿وَإِن يَسْتَغِيثُوا يُغَاثُوا بِمَاءٍ كَالْمُهْلِ يَشْوِي الْوُجُوهَ ﴾ الكهف: ٢٩. واتە: (خۆ ئەگەر هاوار بكەن لە ئازارو تینویەتیـدا، ئـەوە ئـاو دەدرێـن بـە ئـاوێكی

---

[1] سەیری ئەم ئایەتەش بكە: الصافات ٦٢-٦٧، الواقعة ٥٢-٥٥، الحاقة ٣٥-٣٧.
[2] سەیری ئەم ئایەتەش بكە: الأنعام ٧٠، یونس ٤، الكهف ٢٩، محمد ١٥، الرحمن ٤٤.

گەرمی پیس و بۆن ناخۆش کە وەکو خلتەی کانزای تواوە وایە، ئەوەنـدەش گەرمــە دەم و چاویان هەڵدەکوروزێنێت و دەیبرژێنێت).

هەروەها دەفەرموویت: ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَاشِعَةٌ ﴿٢﴾ عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ﴿٣﴾ تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَةً ﴿٤﴾ تُسْقَىٰ مِنْ عَيْنٍ آنِيَةٍ ﴿٥﴾ ﴾ الغاشـية: ٢-٥. واتە: (لەو ڕۆژەدا چەند ڕووخسارانێك خەجاڵـەت و ڕەنگ زەرد و شەرمەزار و زەبوونن. "هەر یەك لە خاوەنی ئەو ڕووخسارانە" ئیشکەرێکی شەکەت و ماندوون "بـۆ دەسـتهێنانی دنیـای دوور لـە ئیمـان". دەچـنە نـاو ئـاگرێکی سووتێنەرەوە. لە سەرچاوەیەکی لە کوڵ و زۆر گەرم خواردنەوەی دەدرێتێ).

## ٣٤- خواردن و خواردنەوەی بەهەشتییەکان لە دۆزەخییەکان قەدەغە کراوە:

خــوای مــەزن دەفــەرموویت: ﴿ وَنَادَىٰ أَصْحَابُ النَّارِ أَصْحَابَ الْجَنَّةِ أَنْ أَفِيضُوا عَلَيْنَا مِنَ الْمَاءِ أَوْ مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ ۚ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى الْكَافِرِينَ ﴾ الأعـراف: ٥٠. واتـــە: ("دۆزەخیان بەدەم ئاهو ناڵەو غەم و پەژارەوە" هاواریان لـە بەهەشـتیەکان کـردو لێیـان پاڕانەوەو وتیان: نەختێك ئاومان بەسەردا بڕێژن یان بەشمان بدەن لەو ڕزق و ڕۆزیانـەی کـە خــوا پێــی بەخشــیوون "بەهەشـتیەکان لەوەڵامــدا" وتیــان: بەڕاسـتی خــوا خــواردن و خواردنەوەی بەهەشتیان لەسەر بێ باوەڕان حەڕام کردووە).

## ٣٥- ئاکامی دۆزەخیەکان ڕیسوایی و سەر شۆڕی و چارەنووسی هەرە خراپە:

خوای پایەبەرز دەفـەرموویت:﴿ فَحَسْبُهُ جَهَنَّمُ ۚ وَلَبِئْسَ الْمِهَادُ ﴾ البقـرة: ٢٠٦. واتـە: (جا ئەو خوانەناسە دۆزەخی بەسە، سوێند بەخوا ئەو دۆزەخە شوێن و جێگەو لانکەیـەکی نالەبارە).

﴿ٱلَّذِينَ يُحۡشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ إِلَىٰ جَهَنَّمَ أُوْلَٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴾ الفرقان: ٣٤.[1] واتە: (ئەو تاوانبارانەی "دژایەتی بەرنامەی خوا دەکەن"، لەسەر ڕووخساریان کێش دەکرێن بۆ دۆزەخ و تیایدا کۆدەکرێنەوە، ئا ئەوانە ناخۆشترین جێگەیان هەیە، چونکە گومڕاترین ڕێبازیان کاتی خۆی گرتبووە بەر).

**٣٦- کاتێك سزا دەدرێن ئومێدی گەڕانەوە دەخوازن بۆ ژیانی دونیا:**

خوای بێ هاوەڵ و هاوبەش دەفەرموویت: ﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُواْ يَٰلَيۡتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ الأنعام: ٢٧. واتە: (جا ئەگەر ئەوانە ببینی "لە قیامەتدا" لەسەر لێواری دۆزەخ ڕاوەستێنراون "بەدەم حەسرەت و ئاهوناڵەوە" دەڵێن: خۆزگە جارێکی تر بیانگێڕاینایەتەوە بۆ دونیا، ئەوسا هەرگیز نیشانە و بەڵگە و ئایەتەکانی خوامان بەدرۆ نەدەزانی و باوەڕی بە تینمان پێی دەبوو).

هەروەها دەفەرموویت: ﴿وَتَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ يَقُولُونَ هَلۡ إِلَىٰ مَرَدّٖ مِّن سَبِيلٖ ﴾ الشورى: ٤٤.[2] واتە: (ئەوسا تۆ ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) لە قیامەتدا دەبینیت ستەمکاران کاتێك سزاو ئەشکەنجەی دۆزەخ دەبینن، بەکەساسیەوە دەڵێن: ئایا هیچ ڕێگەیەك هەیە بۆ گەڕانەوە، تا خوا چۆنی بوێت وا بکەین؟!).

**٣٧-لەخوای گەورە دەپاڕێنەوە بۆ ئەوەی سزایان لەسەر کەم بکاتەوە یاخود سووك بکات:**

خوای بالادەست دەفەرموویت: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِي ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ يُخَفِّفۡ عَنَّا يَوۡمٗا مِّنَ ٱلۡعَذَابِ ﴾ غافر: ٤٩. واتە: (ئینجا ئەوانەی کە لەناو ئاگری دۆزەخدان

---

[1] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: البقرة ١٢٦، النساء ١٤، التوبة ٦٣ و٧٣، الرعد ١٨، الحج ٧٢، الفرقان ٦٦، الزمر ٧٢، غافر ٧٦، الحديد ١٥، المجادلة ٨، الملك ٦.

[2] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: الحج ٢٢، المؤمنون ١٠٧-١٠٨، السجدة ٢٠، الأحزاب ٦٦، فاطر ٣٧.

بە فریشتەکانی کارگێڕی دۆزەخ دەڵێن: داوا لە پەروەردگارتان بکەن، تەنها ڕۆژێـك سـزاو ئازارمان لەسەر کەم بکاتەوە).

**٣٨- هیوای مردن دەخوازن، تا لە سزا ڕزگاریان ببێت ئەمەش هەرگیز بۆیان نایەتەجێ:**

﴿وَنَادَوْاْ يَٰمَٰلِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ﴾ الزخـرف: ٧٧. واتـە: (دۆزەخیـەکان هاوار دەکەن، ئەی مالك "کە فریشتەی سەرپەرشتیارە": دەبا پەروەردگارت بمانکوژێـت و بمرین و کۆتایی بەم سەغڵەتیەمان بێت، لەوەڵامیانـدا دەڵێـت: بەڕاسـتی ئـەوە جێتانـە و تیایدا بۆ هەمیشەیی دەبێت بمێننەوە).

**٣٩- هیچ کەسێك نییە فریایان بکەوێت ئەگەر داوای پشتیوانیش بکەن:**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿لَّا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا﴾ الأحزاب: ٦٥. واتە: (لەوێش نـە پشتیوانێك شك دەبەن فریایان بکەوێت، نە کەسێك ڕزگاریان بکات).

هـەروەها دەفـەرموێت: ﴿أَفَمَنْ حَقَّ عَلَيْهِ كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ أَفَأَنتَ تُنقِذُ مَن فِى ٱلنَّارِ﴾ الزمـر: ١٩. واتە: (جا ئایا ئەو کەسـەی کـە بـەهۆی خراپـی و خوانەناسـیەوە بڕیـاری سـزادرانی درابێت "تۆ هیچ کاروباری ئەوت بەدەستە".. ئایا تۆ دەتوانیت ئەو جۆرە کەسـانە ڕزگـار بکەیت کە لەناو ئاگری دۆزەخدا گیریان خواردووە؟!).

**٤٠- تاوانباران دان بەتاوانەکانیان دەنێن و بەشەسزای خۆیان وەردەگرن:**

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَقَالُواْ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٠﴾ فَٱعْتَرَفُواْ بِذَنۢبِهِمْ فَسُحْقًا لِّأَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ﴾ الملك: ١٠-١١. واتە: (ئینجا دەڵێن: ئەگـەر ئێمـە گوێمان بگرتایە و بیرو هۆشمان بەکار بهێنایە نەدەبووینە نیشـتەجێی دۆزەخ. ئەوسـا ئـیتر بەناچاری و خەجاڵەتیەوە دان بەگوناهو تاوانی خۆیاندا دەنێن، جا با نیشتەجێکانی دۆزەخ لەوەولاترچن).

هـــەروەها دەفـــەرموێت: ﴿قَالُواْ رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَآلِّينَ﴾ المؤمنون: ١٠٦. واتە: ("سەرەنجام بەکەساسیەوە" دەڵێن: پەروەردگارا نەگبەتی و نەهامەتی سەرشانی گرتین و زاڵ بوو بەسەرماندا ئێمە کەسانێکی گومڕا بووین).

### ٤١- بۆ هەتا هەتایی لە دۆزەخدا دەمێننەوە:

خوای پایەبەرز دەفەرمووێت: ﴿هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ البقرة: ٣٩.[١] واتە: (ئەوانە نیشتەجێی دۆزەخن بۆ هەتا هەتایی تیایدا دەمێننەوە).

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ البقرة: ١٦٢.[٢] واتە: (لە ئاگری دۆزەخدا بۆ هەمیشە دەمێننەوە).

خوای بێ وێنە دەفەرمووێت: ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗا﴾ النساء: ١٦٩.[٣] واتە: (ژیانی نەمری بەناچاری دەبێت لە دۆزەخدا ببەنە سەر).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابُ وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ﴾ البقرة: ١٦٢، آل عمران: ٨٨. واتە: (ئەوانە بەو نەفرینە لە ئاگری دۆزەخدا بۆ هەمیشە دەمێننەوەو ئەو سزایەیان لەسەر سووك ناکرێت و بە چاوی سۆزەوە تەماشا ناکرێن).

﴿وَيَوۡمَ يَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعٗا يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ قَدِ ٱسۡتَكۡثَرۡتُم مِّنَ ٱلۡإِنسِۖ وَقَالَ أَوۡلِيَآؤُهُم مِّنَ ٱلۡإِنسِ رَبَّنَا ٱسۡتَمۡتَعَ بَعۡضُنَا بِبَعۡضٖ وَبَلَغۡنَآ أَجَلَنَا ٱلَّذِيٓ أَجَّلۡتَ لَنَاۚ قَالَ ٱلنَّارُ مَثۡوَىٰكُمۡ خَٰلِدِينَ فِيهَآ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ﴾ الأنعام: ١٢٨.[٤] واتە: (ڕۆژێك دێت خوا هەموویان کۆ دەکاتەوەو دەفەرمووێت: ئەی دەستەی پەرییەکان بەڕاستی ئێوە زۆر کەستان لە ئینسانەکان گومڕاکرد، لەولاشەوە گوێ لە مشتەکانیان، دەڵێن: پەروەردگارا هەندێکمان سوودمان لە هەندێکیان وەرگرت، ئێستاش ئەوەتە گەیشتووینەتە ئەو کات و ساتەی تۆ بۆت دیاری کردووین، خوایش فەرمووی: "مادەم وایە"ئەم ئاگرە جێگەتانە نەمرن تیادا، مەگەر خوا ویستی لەسەر بێت "بە سزایەکی تر سزایان بدات").

---

[١] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: البقرة ٨١ و٢١٧ و٢٥٧ و٢٧٥، آل عمران: ١١٦، الأعراف ٣٦، یونس ٢٧، الرعد ٥، المجادلة ١٧.

[٢] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: التوبة ٦٨، هود ١٠٧، النحل ٢٩، الزمر ٧٢، غافر ٧٦، التغابن ١٠، البينة ٦.

[٣] سەیری ئەم دوو ئایەتانەش بکە لە: الأحزاب ٦٥، الجن ٢٣.

[٤] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: النساء ١٤ و ٩٣، المائدة ٨٠، التوبة ١٧ و ٦٣، الأنبياء ٩٩، المؤمنون ١٠٣، السجدة ١٤، فصلت ٢٨، الزخرف ٧٤، النبأ ٢٣.

ڕاڤەکارانی قورئانی پیرۆز وتویانە، مەبەست لـە مانـەوەی هـەتا هـەتایی لـە ئـاگری دۆزەخدا: بۆ موسڵمانان و بڕواداران بریتیە لە مانەوە لە ئـاگری دۆزەخـدا بـۆ ماوەیـەکی درێژ. هەروەها بۆ بێ باوەڕان و دووڕووان بریتیە لە مانەوەی هەتا هـەتایی. وتـەی تـریش لەمبارەوە هەیە.

**٤٢- هەندێك لە دۆزەخیەکان نەفرەت لە هەندێکی تریان دەکەن و تۆمەتباریان دەکەن بەوەی هۆکاری چوونە دۆزەخی ئەوان بوونە، بۆیە لە خوای گەورە دەپاڕێنەوە کە دوو بەرامبەر سزای گومڕاکەرانیان بدات:**

خـوای پایەبـەرز دەفـەرمووێت: ﴿كُلَّمَا دَخَلَتْ أُمَّةٌ لَّعَنَتْ أُخْتَهَا حَتَّىٰ إِذَا ادَّارَكُوا فِيهَا جَمِيعًا قَالَتْ أُخْرَاهُمْ لِأُولَاهُمْ رَبَّنَا هَٰؤُلَاءِ أَضَلُّونَا فَآتِهِمْ عَذَابًا ضِعْفًا مِّنَ النَّارِ ۖ قَالَ لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ ﴿٣٨﴾ وَقَالَتْ أُولَاهُمْ لِأُخْرَاهُمْ فَمَا كَانَ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ﴾ الأعراف: ٣٨ - ٣٩. واتە: (هەر کاتێك هەر کۆمەڵ و دەسـتەیەك دەچـنە نـاوی نەفرین دەکەن لە هاوئاین و هاوبیرانیان، هـەتا ئـەو کاتـەی هـەموویان کـۆ دەکرێنـەوەو بەسەریەکدا دەدرێن لە ناویدا، شوێنکەوتەکان ڕوو بەگەورەکانیان دەڵێن: پـەروەردگارا ئـا ئەوانە ئێمەیان گومڕا کرد، دە تۆش لە ناو دۆزەخدا سزای دوو بەرامبەریان بدە!! "خـوای گەورەش دەفەرموویێت": بۆ هەموو لایەك "سزاو تۆڵە" دوو بەرامبەرە بـەڵام ئێـوە پێـی نازانن. "پاشان" دەستە پێشـوەکان بـە دواییـنەکان دەڵـێن: وەنـەبێت ئێـوە هـیچ ڕێـزو فەزڵێکتان هەبێت بەسەر ئێمەدا، دە ئێوەش بچێژن سزاو ئازار بەهۆی ئـەو کـارو کـردەوە نالەبارانەوە کە ئەنجامتان دەدا).

هـــــەروەها دەفـــــەرمووێت: ﴿ وَإِذْ يَتَحَاجُّونَ فِي النَّارِ فَيَقُولُ الضُّعَفَاءُ لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِّنَ النَّارِ﴾ غافر: ٤٧. واتــە: (ئەوکاتــە ئــیتر شــەڕو کێشــە دەســت پێدەکــەن لــەناو ئــاگری دۆزەخــدا، لاوازو چەوساوەکان بە دەسەڵاتدارو لووت بەرزەکان دەڵێن: خۆ بەڕاستی ئێمە شوێنکەوتەی ئێـوە بووین، ئایا ئێوە ناتوانن تۆزێك سزای ئاگرمان لەسەر کەم بکەنەوە؟).

دەفـــەرموویێت: ﴿إِذْ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُواْ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُواْ وَرَأَوُاْ ٱلْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ ٱلْأَسْبَابُ﴾ البقرة: ١٦٦. واتە: (لـەو کاتـەدا سـزای ڕۆژی دوایـی دەبیـنن، ئەوانـەی کـە خەڵکی شوێنیان کەوتبوون خۆیان بـەری دەکـەن و لـە شـوێنکەوتەکانیان حاشـا دەکـەن، بەتایبەت کاتێك ئەو سزا توندو تیژە دەبینن، هەموو پەیوەندییـەکیان دەپچـڕێت کـە لـە نێوانیاندا هەبوو و هیچ بەڵگە و بیانویەکیان بەدەستەوە نامێنێت کە خۆیـانی پـێ ڕزگـار بکەن).

**٤٣- بەهەشتیەکان بانگی دۆزەخییەکان دەکەن و پێیان دەڵێن ئەو بەڵێنەی پەروەردگارمان بە ئێمەی دابوو دەستمانکەوت، ئایا بەڕاستی ئەو بەڵێنەی کە پەروەردگارتان بە ئێوەی دابوو دەستتان کەوت؟:**

خوای مـەزن دەفـەرموویێت: ﴿وَنَادَىٰٓ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ أَصْحَٰبَ ٱلنَّارِ أَن قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا قَالُواْ نَعَمْ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنُۢ بَيْنَهُمْ أَن لَّعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ كَٰفِرُونَ﴾ الأعـراف: ٤٤-٤٥. واتـە: ("پاشـان" نیشتەجێیانی بەهەشت بانگی نیشتەجێکانی دۆزەخیان کرد: بەڕاسـتی ئـەو بەڵێنـەی کـە پەروەردگارمان پێی دابووین دەستمانکەوت و پێی بەخشین، ئایا ئێوەش ئەو بەڵێنـەی کـە پـەروەردگارتان دابـووی بەڕاسـتی دەسـتانکەوت؟! "لەوەڵامـدا بـەدڵ شـکاوی و غـەم و پەژارەیەکی زۆرەوە" وتیان: بەڵێ... ئەوسا جارچییەك جاریدا لە نێوانیاندا و هاواری کرد: نەفرەتی خوا لە ستەمکاران بێت. ئەوانەی کـە بەنەرمـە بـڕی بەرهەڵسـتی ڕێبـازی خـوا دەکەن و کۆسپ و تەگەرە دەخەنە بەردەم ڕێگە و ڕێبازی خۆیان بەخوارو خێچـی دەوێـت، لە کاتێکدا هەمیشە ئەوان بێ بڕوان بە زیندوو بوونەوەو لێپرسینەوە).

❊❊❊

## بـــەهـــەشـــــــت

### بەهەشتییەکان:

خــوای گــەورە بەهەشــتی ئامــادەکردووە، بــۆ ئەوانــەی باوەڕیــان هێنــاوە بــەخواو پێغەمبەرەکەی و پەیامەکەی کە ئیسلامە. جا قورئانی پـیرۆز بەچـەند وەسـفێك وەسـفی بەهەشتیەکانی کردووە، کە بریتین لەمانە:

**١- پارێزکاران و لە خواترسان (المتقون):**

خوای گەورە دەفـەرموویێت: ﴿لِلَّذِينَ اتَّقَوْا عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّاتٌ﴾ آل عمـران: ١٥. واتـە: (بـۆ ئەوانەی پارێزکارو خواناسن، لای پەروەردگاریان باخەکانی بەهەشت ئامادەیە).

هەروەها دەفەرموویێت: ﴿إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّاتِ النَّعِيمِ﴾ القلم: ٣٤.[1] واتە: (بەڕاسـتی بۆ خواناس و پارێزکاران باخەکانی بەهەشتی پڕ لە نـازو نیعمـەت لـەلای پـەروەردگاریان ئامادەیە).

**٢- چاکەکاران(الأبرار):**

خوای پایەبەرز دەفەرموویێت: ﴿إِنَّ الْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا﴾ الدهر: ٥. واتە: (بێگومان چاکان و پاکانیش لە پـەرداخێکی پـڕ شـەڕابدا دەخۆنـەوە، کـە ئاوێتەکەی لە سەرچاوەی کافوورەوەیە).

هـــەروەها دەفـــەرموویێت: ﴿لَٰكِنِ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا نُزُلًا مِّنْ عِندِ اللَّهِ ۗ وَمَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ لِّلْأَبْرَارِ﴾ آل عمـــران: ١٩٨. واتـــــــــە: (باخـــــەکانی بـــەهەشت کە چـــەندەها ڕووبـــــار بـــەژێر درەختەکانیـداو بەبـەردەم کۆشکەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی هەمیشەیی لەوێدا، ئـەو شـوێنانەش لەلایـەن

---

[1] سەیری ئەمانە بکە: آل عمران ١٣٣ و ١٩٨، الرعد ٣٥، النحل ٣٠-٣١، الفرقان ١٥، الشعراء ٩٠، الزمر ٢٠ و ٧٣، الدخان ٥١ - ٥٢، محمد ١٥، الذاريات ١٥، الطور ١٧، الحجر ٤٥، المرسلات ٤١، النبأ ٣١.

خواوە ئامادەکراوە، بۆ میوانداری هەمیشەیی بەختەوەران، ئەڵبەتە ئەو بەشەی کە لای خوایە چاکترو بەنرخترە بۆ چاکەکاران و خواناسان).

**٣- ڕاستگۆیان (الصادقون):**

خوای تاك و پاك دەفەرمووێت: ﴿هَٰذَا يَوْمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدْقُهُمْ ۚ لَهُمْ جَنَّٰتٌ﴾ المائدة: ١١٩. واتە: (ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە ڕاستگۆیان ڕاستگۆییەکەیان سوودیان پێ دەگەیەنێت، باخەکانی بەهەشتیان بۆ ئامادەیە).

**٤- گوێڕایەڵان (الطائعون):**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ﴾ النساء: ١٣. واتە: (ئەو کەسەی فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرەکەی بکات، ئەوە خوا دەیخاتە ناو باخەکانی بەهەشتەوە).

**٥- ئەوانەی بڕوایان بەخوا هەیە، چەسپاون و دامەزراون لەسەر ئەم باوەڕەیان:**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُوا۟ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٣﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾﴾ الأحقاف: ١٣ - ١٤. واتە: (بەڕاستی ئەوانەی کە دەڵێن: پەروەردگارمان - الله -یەو، پاشان پابەندی ئەو ئیمانە دەبین و ڕاست و ڕەوان پەیڕەوی دەکەن و لەسەری بەردەوامن، ئەوانە هیچ جۆرە ترس و بیمێکیان لەسەر نیە و دڵتەنگ نابن. ئەوانە بەهەشتین).

**٦- نزیك و خۆشەویستانی خوا (المقربون):**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴿٨٩﴾﴾ الواقعة: ٨٨ - ٨٩. واتە: (جا ئەگەر ئەو کەسەی کە لە سەرە مەرگدایە لە نزیکان و خۆشەویستانی ئێمە بێت. ئەوە ئیتر خۆشی و کامەرانی و ئاسوودەیی بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەت چاوەڕێیەتی).

### ٧- ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کاری چاکە دەکەن:

خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ﴾ البقرة: ٢٥. واتە: ("ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)" مژدە بدە بەوانەی کـە باوەڕیـان هێناوەو کاروکردەوەی چاکەکانیان ئەجامداوە بەوەی باخەکانی بەهەشتیان بۆ هەیە).

هـەروەها دەفـەرمووێت: ﴿ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا ﴾ النساء: ١٢٤.[١] واتە: (ئەوەش کردەوە چـاکەکان ئەنجامبـدات نێـر یـان مـێ لـە کاتێکـدا ئیمانـدار بێـت، جـا ئەوانـە دەچـنە بەهەشتەوەو بەقەدەر پەردەی ناوکی خورما ستەمیان لێ ناکرێت).

قورئانی پیرۆز باسی ئەو کردەوە چاکانەی کردووە، کە جێگیر بوونی ژیـان و گـوزەرانی پێوە بەندە، ئەنجامدەری ئەو کارە چاکانە شایەنی چوونە بەهەشتە، بۆیە وەسـفی کـردوون بەوەی کە:

أ- بڕوایان بە خواو پێغەمبەرەکەی و ڕۆژی دوایی و پەیامی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە وردو درشتیەوە هەیە، بۆیە ئەوانە:

بڕوایان بەخوا هەیە و هاوبەشی بۆ بڕیارنادەن، یـادی خـوا دەکـەن و کـاتێ بـەلای ئایەتەکانی خوای گەورەدا تێدەپەڕن بێ دەنگ دەبن و گوێی بۆ شل دەکەن و کـاری پێدەکەن، ئەوانە تەوبەکارو لەخواترسن و دەترسن، ئەوانەن بڕوایان بـە پێغەمبـەران هەیە و پشتیان گرتوون و سەریان دەخەن.

ب- پەرستشەکان ئەنجام دەدەن، ئەوانە کەسانێکن:

نوێژ بەجوانی و ڕێکوپێکی دەکەن و شەو بێدار دەکەنـەوەو سـوژدەی زۆر دەبـەن و زەکات دەدەن و ماڵیان دەبەخشن لەکاتی خۆشیدا بەبێ زیادەڕەوی و کەمڕەوی.

---

[١] سەیری ئەمانەش بکە: البقرة ٨٢، النساء ٥٧ و ١٢٢، الأعراف ٤٢، التوبة ٧٢، يونس ٩، هود ٢٣، إبراهيم ٢٣، الكهف ٣٠ - ٣١ و ١٠٧، مريم ٩٦، طه ٧٥-٧٦، الحج ٢٣، العنكبوت ٥٨، السجدة ١٩، غافر ٤٠، محمد ١٢، الفتح ٥، التغابن ٩، الطلاق ١١، البروج ١١، البينة ٧-٨.

پ- ئەوانەن کە قەدەغەکراوەکان فەرامۆش دەکەن و بەرگری لە ئایینی ئیسلام دەکەن، ئەوانە:

کۆچبەران (المهاجرون) و پشتیوانان (أنصار)ی بەرایی و سەرەتا و ئەوانەش کە بەچاکە شوێنی ئەوان دەکەون، جا ئەو کۆچبەرانەی کە کۆچ دەکەن بۆ ئەوەی نەکەونە ناو بازنەی قەدەغە کراوەکان، هەروەها ئەو تێکۆشەرانەی کە لە پێناوی خوا ئازاریان پێگەیشتووەو جەنگاون و دوژمنانی خوایان کوشتووەو خۆشیان کوژراون، ئەوانەش کە ئارامگرن لە پێناوی خوا.

ت- ئەوانەی کە پابەندی ڕەوشتی ڕاست و ڕێك بوون لە هەڵسوکەوتیاندا لەبەرامبەر کەسانی تر، ئەوانە:

تەنها بەڕەواو حەق نەبێت کەس ناکوژن، زینا ناکەن، شایەتی بەدرۆ نادەن، ڕقی خۆیان دەخۆنەوە، لە خەڵکی خۆش دەبن و چاکەکارن و داوای لێخۆشبوون دەکەن بۆ گوناهەکانیان و سورنین لەسەر ئەنجامدانی تاوان، پەیمانی خوا بەجێ دەگەیەنن، ئەو پەیوەندییە دەگەیەنن کە خوای گەورە فەرمانی گەیاندنی کردووە، خۆیان دەشکێنن و خاکی و خۆبەکەم زانن لەبەرامبەر خەڵکی، پشت لە نەفامەکان دەکەن بە نەرمی و سەلام لێکردنیان، کاتێ بە لای قسەی هەرچی و پەرچی و بێ کەڵکدا دەچن بە ڕێزەوە تێدەپەڕن، کاری چاکە دەکەن بۆ وەلانانی خراپەکان، ئەوانەن داوا لە خوای گەورە دەکەن چاوڕۆشنییەکیان پێ ببەخشێت و بیانکاتە پێشەوا بۆ موسڵمانان، داوا دەکەن خوا بیانپارێزێت لە سزای دۆزەخ.

ئەم چوار شتە کۆی ئەو شتانەیە کە پەیامی ئایینی ئیسلام لەخۆی دەگرێت، قورئانی پیرۆزیش بەدەق ئاماژەی بۆ زۆرێك لە شتە وردەکانی کردووە، باسی ئەوەشی کردووە کە پاداشتی ئەو شتانە بەهەشتە، هەروەك لەم ئایەتانەی خوارەوەدا هاتووە:

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلْكَٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٣٤﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا۟ عَلَىٰ مَا

فَعَلُوا۟ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَجَنَّـٰتٌ ﴾ آل عمـران: ١٣٤-١٣٦. واتە: (ئەوانەی لە خۆشی و ناخۆشـیدا، لـە هـەرزانی و گرانیـدا مـاڵ و سـامانیان دەبەخشن، ڕق و کینەی خۆیان دەخۆنەوەو خۆگرن، لە خـەڵکی خـۆش دەبـن و لێبـوردەن، خوای میهرەبانیش چاکەکاران و چاکەخوازانی خـۆش دەوێـت. ئەوانـەش کـە تـاوان یـان گوناهێك ئەنجام دەدەن یاخود ستەم لە خۆیان دەکەن "دوایی بەخۆیانـدا دێنـەوەو سـزای" خوا دێتە یادیان، ئەوسا داوای لێخۆشبوون دەکەن، جا کێ هەیە کە لـە گوناهیـان خـۆش ببێت جگە لەخوا؟! هەروەها لەسەر گوناهو تاوانیان بەردەوام نابن، لـە کاتێکـدا دەزانـن "ئەوە تاوانە". ئائەوانە پاداشـتیان لێخۆشـبوون و لێبوردنـە لەلایـەن پەروەردگاریانـەوە لەگەڵ باخەکانی بەهەشتدا).

هـەروەها دەفـەرمووێت: ﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَـٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَـٰمًا ﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَـٰمًا ﴿٦٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ ۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَآءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٦٦﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُوا۟ لَمْ يُسْرِفُوا۟ وَلَمْ يَقْتُرُوا۟ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ ﴾ الفرقـان: ٦٣-٦٨.[(١)] واتـە: (بەنـدەکانی خـوای میهرەبان ئەو کەسانەن کە زۆر بەهێمنی بەسـەر زەویـدا دەڕۆن، کـاتێکیش نـەفامان بـە قسەو قسەلۆکی ناخۆش بەرەنگاریان دەبن، لە وەڵامیاندا دەڵێن: سـڵاو "ڕەوشـت بـەرزی خۆیان دەنوێنن". ئەوانەی کە شەوگار بۆ پەروەردگاریان بە سوژدە وەستان و نوێـژ دەبەنـە سەر. ئەوانەی کە دەڵێن: پەروەردگارا" لە سزای ئاگر دوورمان بکە و پەنامان بدە، چونکە سزاو ئازاری لە کۆڵ نابێتەوەو بەردەوامە. بەڕاستی ئەو دۆزەخـە شـوێن و نیشـتەجێیەکی زۆر ناخۆش و ناسازە. "هەروەها بەندەکانی خوای میهرەبان" ئەوانەن کە: کاتێـك مـاڵ و

(١) سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: آل عمران ١٩٥، المائدة ١٢، التوبة ٨٨-٨٩ و١٠٠، الرعد ٢٠-٢٣، الفرقان ٧١-٧٤.

سامانیان دەبەخشن و خەرجی دەكەن، نە زیادەڕەوی تێدا دەكەن و بەزایەی دەدەن، نە دەست نوقاو ڕەزیلیشن، بەڵكو لەو نێوانەدان. هەروەها ئەوانەی هیچ جۆرە خوایەكی تر لەگەڵ خوادا ناپەرستن، كەسیش ناكوژن كە خودا كوشتنی حەرام كردبێت مەگەر بەحەق و ڕەوا، هەروەها زینا ناكەن و نزیكی ناكەون، جا ئەوەی ئەو جۆرە كارە خراپانە ئەنجام بدات، ئەوە تووشی سزاو ئازار و ڕیسوایی دەبێت).

## وەسفی بەهەشت و بارودۆخی بەهەشتیان، وەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە:

١- نزیك بوونەوەو دەركەوتنی بەهەشت بۆ بەهەشتیەكان، بەرلەوەی بچنە ناویەوە، هەر یەك لە بەهەشتیەكانیش پلەو مەنزڵگای خۆی دەزانێت لە بەهەشتدا، بۆیە بەرەو شوێنی خۆی دەچێت:

خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿ وَأُزْلِفَتِ ٱلْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴾ الشعراء: ٩٠. واتە: (ئەوكاتە، بەهەشت لە چاكەكاران و خواناسان نزیك كراوەتەوە).

هەروەها دەفەرموویت: ﴿ وَيُدْخِلُهُمُ ٱلْجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمْ ﴾ محمد: ٦.[١] واتە: (هەروەها دەیانخاتە ئەو بەهەشتەوە كە بە جۆرەها شێواز بۆی باس كردوون).

٢- بەهەشت لە شوێنێكی بەرزە یاخود پلەكانی یان خانو و تەلارو دارودرەختەكانی بەرزن:

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ فِى جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ﴾ الحاقة: ٢٢، والغاشية: ١٠. واتە: (لە بەهەشتێكی بەرزو بڵندا ژیان دەبەنە سەر).

٣- پانتایی بەهەشت بەئەندازەی پانتایی نێوان ئاسمانەكان و زەوییە:

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ ﴾ آل عمران: ١٣٣. واتە: (و بەهەشتێك كە پانایيەكەی ئاسمانەكان و زەوی گرتۆتەوە).

[١] سەیری ئەم ئایەتانەش بكە: ق ٣١، التكوير ١٣.

٤- بەهەشت چەند دەرگا و دەراوازەیەکی هەیە:

خوای پایەبەرز دەفەرموویێت ﴿ جَنَّٰتِ عَدۡنٖ مُّفَتَّحَةٗ لَّهُمُ ٱلۡأَبۡوَٰبُ ﴾ ص: ٥٠. واتە: (باخەکانی بەهەشتی عەدن، کە هەر هەموو دەروازەکانی لەسەر پشتە بۆیان).

هەروەها دەفەرموویێت: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا ﴾ الزمر: ٧٣. واتە: (هەتا ئەو کاتەی دەگەنە ئەوێ و دەروازەکانی بەهەشت لە ڕوویانـــدا کراوەیە و لەسەر پشتە).

٥- بەهەشت سەرپەرشتیاری هەیە، کە پێشوازی و سڵاو لــە ئەوانــە دەکــەن کــە دەچــنە ناویەوە:

خــــوای گـــەورە دەفـــەرمویێت:﴿وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ طِبۡتُمۡ فَٱدۡخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴾ الزمـر: ٧٣. واتــە: (فریشـــتەکانی بــەرپرس و سەرپەرشـــتیارانی بەهەشـــت پێشوازییان لێ دەکەن و دەڵێن: درودو سڵاوتان لێبێت، ئێوە پــاك و خــاوێنن، کەواتــە فەرموو بچنە ناو بەهەشتەوە، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوەدا).

٦- ڕووبارەکانی بەهەشت چەند ڕەنگێکی جیاوازیان هەیە:

خوای پاك و تاك دەفــەرموویێت: ﴿فِيهَآ أَنۡهَٰرٞ مِّن مَّآءٍ غَيۡرِ ءَاسِنٖ وَأَنۡهَٰرٞ مِّن لَّبَنٖ لَّمۡ يَتَغَيَّرۡ طَعۡمُهُۥ وَأَنۡهَٰرٞ مِّنۡ خَمۡرٖ لَّذَّةٖ لِّلشَّٰرِبِينَ وَأَنۡهَٰرٞ مِّنۡ عَسَلٖ مُّصَفّٗى ﴾ محمد: ١٥. واتە: (چەندەها ڕوویــاری لــە ئاوی سازگارو تام نەگۆڕاوی تێدایە و چەندەها ڕووباری شیر کە تــامی تێــك نەچــووە و چەندەها ڕووبار لە شەڕابی تـــام خۆش و بۆنخۆش بۆ ئەوانەی کە دەیخۆنــەوە، چــەندەها ڕووبار لە هەنگوینی پاڵفتە و بێگەرد).

هەروەها دەفەرموویێت: ﴿ وَمَآءٖ مَّسۡكُوبٖ ﴾ الواقعـة: ٣١. واتە: (تاڤگـــەی جوان و حەوزو فوارەی ڕازاوەی تێدایە).

٧- ئەو ڕووبارانە بەناو باخەکانی بەهەشتدا دەڕۆن:

خوای پایەبــەرز دەفــەرمویێت:﴿تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ﴾ البقـرة: ٢٥ و ٢٦٦.[1] واتــە: (چەندەها ڕووبار بەژێر درەخت و بەناو باخەکانیدا دەڕوات).

---

[1] سەیری ئەمانە بکە: آل عمران ١٥ و ١٣٦ و ١٩٥ و ١٩٨، النساء ١٣ و ٥٧ و ١٢٢، المائدة ١٢ و ٨٥ و ١١٩، التوبة ٧٢ و ٨٩، الرعد ٣٥، إبراهيم ٢٣، النحل ٣١، طه ٧٦، الحج ١٤ و ٢٣،

هــەروەها دەفــەرمووێت: ﴿تَجْرِي تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ التوبة: ١٠٠. واتــە: (چــەندەها ڕووبار بە بەردەم کۆشکەکانی و بەژێر درەختەکانیدا دەڕۆن).

﴿تَجْرِي مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ الأعراف: ٤٣، یونس: ٩، الکهف: ٣١. واتە: (چــەندەها ڕوویــار بەژێر درەختەکانیدا و بە بەردەم کۆشکەکانیدا دەڕوات).

٨- کانیاوی تێدان:

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فِيهَا عَيْنٌ جَارِيَةٌ﴾ الغاشیة: ١٢. واتە: (لەو بەهەشتەدا کـانی و سەرچاوەو تاڤگەی ڕەوانی تێدایە).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿فِيهِمَا عَيْنَانِ تَجْرِيَانِ﴾ الرحمن: ٥٠.[1] واتە: (دوو سەرچاوەی لەکانی و ئاوی سازگاریان تیایدایە و بەخوڕ بە جۆگەلەکاندا دەڕۆن).

٩- خانوی وای تێدایە کە ژوورەکانی لەسەر یەکن، وەك تەلارە چەند نهۆمییەکان:

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَهُمْ غُرَفٌ مِّن فَوْقِهَا غُرَفٌ مَّبْنِيَّةٌ﴾ الزمر: ٢٠. واتە: (کۆشك و تەلاری چەند نهۆم کە ژوورەکانی لەسەر یەکن بۆیان ئامادەیە).

١٠- درەختەکانی خاوەن لق و پۆپی سەوزن، کە ڕەش دەردەکەون لەبــەر ســەوزاییەکەیان، بۆن و بەرامیان خۆشە:

خوای پەروەردگار دەفــەرمووێت: ﴿وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٧﴾ ذَوَاتَآ أَفْنَانٍ ﴿٤٨﴾﴾ الــرحمن: ٤٦-٤٨. واتــە: (بــۆ ئــەو کەســەش لــە مــەقامی پەروەردگاری خۆی ترسابێت، دوو باخی ڕازاوە ئامادەیە. جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگار بڕوا ناکەن، کامەی پەسەند ناکەن. ئەو دوو باخەش خاوەنی دارو درەختی گەڵا ناسك و جوانی بریسکەدارە).

﴿وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ ﴿٦٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٣﴾ مُدْهَآمَّتَانِ ﴿٦٤﴾﴾ الرحمن: ٦٢-٦٤. واتە: (جگەلەو دوو بەهەشتەی کە باسکرا، دوو بەهەشــتی تــریش ئامادەیــە بــۆ

---

الفرقان ١٠، العنکبوت ٥٨، الزمر ٢٠، محمد ١٢، الفتح ٥ و ١٧، الحدید ١٢، المجادلة ٢٢، الصف ١٢، التغابن ٩، الطلاق ١١، التحریم ٨، البروج ١١، البینة ٨.

[1] سەیری ئەم ئایەتەش بکە: الرحمن ٦٦.

ئەوانەی کە پلەو پایەیان وا لەخوار خاوەنانی دوو بەهەشتی ناوبراوەوە. جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگار بڕوا ناکەن، کامەی پەسەند ناکەن. "ئەو بەهەشتانەش" ئەوەندە سەوز دەنوێنن مەیلەو ڕەش دەچنەوە لە جوانی و تۆخیدا).

هەروەها دەفەرموویت: ﴿فِي سِدْرٍ مَّخْضُودٍ (٢٨) وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ (٢٩)﴾ الواقعة: ٢٨ و ٢٩. واتە: (لە ژێر سێبەری - سدر - ی بێ دڕکدان. هەروەها درەختی مۆزیش کە بەرهەمەکانی چین چین لەسەر یەکن).

١١- سێبەرەکەی درێژو پان و پۆڕ و ڕازاوە:

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَنُدْخِلُهُمْ ظِلًّا ظَلِيلًا﴾ النساء: ٥٧. واتە: (هەروەها دەیانخەینە ژێر سایەی سێبەری جوان و ڕازاوەیی هەمیشەیی).

هەروەها دەفەرموویت: ﴿أُكُلُهَا دَآئِمٌ وَظِلُّهَا﴾ الرعد: ٣٥.[١] واتە: (خواردن و خواردنەوەی "هەمەجۆر و هەمەڕەنگی" بەردەوامە هاوڕێ لەگەڵ سێبەری خۆش).

١٢- کەش و هەواکەی خۆش و مامناوەندە نە زۆر گەرمە و نەزۆرساردە:

خوای پاك و تاك ئەفەرموویت: ﴿لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا وَلَا زَمْهَرِيرًا﴾ الإنسان: ١٣. واتە: (نەگەرمای خۆر بێزاریان دەکات، نە کزەبا و سەرما سەغڵەتیان دەکات).

١٣- نازو نیعمەت و خۆشیەکانی زۆرو بێ ئەندازەیە:

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا﴾ الإنسان: ٢٠. واتە: (کاتێکیش بەهەر لایەکدا چاودەگێڕیت، ئەوە نازو نیعمەتی نەبڕاوەو بێ ئەندازەو دەسەڵاتێکی گەورە دەبینیت لە باخ و باخات و کۆشك و تەلارو دیمەنی جوان و فراوانی بێ سنور).

هەروەها دەفەرموویت: ﴿يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ غافر: ٤٠.[١] واتە: (بێ سنوورو بێ حیساب ڕزق و ڕۆزی هەمەجۆرو هەمە چەشنیان پێدەبەخشرێت).

---

[١] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: الواقعة ٣٠، المرسلات ٤١.

١٤- ژیانی بەهەشتیەکان پڕە لە کامەرانی و شادومانی و بەختەوەری:
خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴾ الحاقة: ٢١. واتە: (جا ئەو بەختەوەرە لە ژیانێکی پڕ لە شادی و کامەرانیدا دەژی کە زۆر پێی ڕازییە).
١٥- نازو نیعمەت و خۆشی و شادی بەهەشتیەکان نەبڕاوەو بەردەوامە:
خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿وَجَنَّٰتٍ لَّهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُّقِيمٌ ﴾ التوبة: ٢١. واتە: (لەو بەهەشتانەدا نازو نیعمەتی نەبڕاوە پێشکەشیان دەکرێت).
١٦- بەخشش و نیعمەتەکان ئامادەکراون بۆ بەهەشتیەکانکە هەرگیز کۆتایی نایەن و نابڕێنەوە:
خوای پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَرِزْقُنَا مَا لَهُۥ مِن نَّفَادٍ ﴾ ص: ٥٤. واتە: (بەڕاستی ئەمە ڕزق و ڕۆزیمانە بۆ بەختەوەران، هەرگیز تەواو نابێت و کۆتایی نایەت).
هەروەها دەفەرموویت: ﴿ لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا مَمْنُوعَةٍ ﴾ الواقعة: ٣٣.[2] واتە: (نە بەروبوومی تەواو دەبێت، نە قەدەغە کراویشە).
١٧- گۆشتی هەمەجۆر دەخرێتە بەردەمیان:
خوای پایەبەرز دەفەرموویت: ﴿وَلَحْمٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴾ الطور: ٢٢. واتە: (حەزو ئارەزوویان لەهەر گۆشتێك بێت پێشکەشیان دەکەین).
هەروەها دەفەرموویت: ﴿ وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴾ الواقعة: ٢١. واتە: (گۆشتی هەر باڵندەیەکیش کە حەزی لێ بکەن بۆیان ئامادەیە).
١٨- خواردنەوەی بەهەشتیەکان لەناو کاسە و کوپە و پەرداخی زۆر جوان و قەشەنگ دایە، کە تام و چێژ دەبەخشن بە بینەران:
خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ يُطَافُ عَلَيْهِم بِكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴿٤٥﴾ بَيْضَاءَ لَذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ ﴿٤٦﴾ لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾ الصافات: ٤٥ - ٤٧. واتە: (لە پەرداخی

---

[1] سەیری ئەم ئایەتەش بکە: الطلاق ١١.
[2] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: هود ١٠٨، الرعد ٣٥، مریم ٦٢، الصافات ٤١.

تایبەتیدا شەرابی تایبەتیان بەسەردا دەگێڕن. شەرابەکە زۆر سپی و بەلەزەتە بۆ ئەو کەسانەی کە دەیخۆنەوەو نۆشی دەکەن. ئەو شەرابە نەدەبێتە هۆی سەرئێشە و ئێلنجدان، نە مەست و سەرخۆش و بێ هۆشیان دەکات).

هەروەها دەفەرموویێت: ﴿إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ يَشۡرَبُونَ مِن كَأۡسٖ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا ۝٥ عَيۡنٗا يَشۡرَبُ بِهَا عِبَادُ ٱللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفۡجِيرٗا ۝٦﴾ الإنسان: ٥-٦.[1] واتە: (بێگومان چاکان و پاکانیش لە پەرداخێکی پڕ شەرابدا دەخۆنەوە، کە ئاوێتەکەی لەسەرچاوەی کافورەوەیە. کە کانییەکە بەندەکانی خوا لێی ئەخۆنەوە لە هەر شوێنێك بیانەوێت هەڵی دەقوڵێنن و فوارە دەکات).

١٩- هەموو جۆرە میوەجات و بەربومێکی بۆن خۆش و بەتام بە هەموو ڕەنگەکانیەوە تیایدا ئامادەیە کە ئارەزووی دەکەن:

خوای مەزن دەفەرموویێت: ﴿يَدۡعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَٰكِهَةٍ ءَامِنِينَ ۝٥٥﴾ الدخان: ٥٥. واتە: (بانگ دەکەن تیایدا بۆ هەموو جۆرە میوەیەك، بێ ئەوەی بترسن لە تەواو بوون و، نەخۆش کەوتن و لەبەرچاو کەوتن).

هەروەها دەفەرموویێت: ﴿وَلَهُمۡ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ محمد: ١٥.[2] واتە: (هەروەها بۆیان هەیە لەو بەهەشتەدا لە هەموو جۆرە بەرو بووم و میوەیەکی و جوان و بەتام و بۆنخۆش).

٢٠- بەروبوومی بەهەشت وەك بەرووبومی دونیایە، بەڵام جیاوازییەکی زۆر لە نێوانیاندا هەیە:

خوای پەروەردگار دەفەرموویێت: ﴿كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنۡهَا مِن ثَمَرَةٖ رِّزۡقٗا قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِي رُزِقۡنَا مِن قَبۡلُۖ وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهٗا﴾ البقرة: ٢٥. واتە: (هەر کاتێك لە میوەو بەرهەمی

---

[1] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: ص ٥١، الطور ٢٣، الواقعة ١٨-١٩، الإنسان ٢١، النبأ ٣٤.

[2] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: یس ٥٧، الصافات ٤١-٤٢، ص ٥١، الزخرف ٧٣، الطور ٢٢، الرحمن ٥٢ و٦٨، الواقعة ٢٠ و٣٢، المرسلات ٤٢، النبأ ٣٢.

ئەو باخانەیان بۆ دەهێنن، دەڵێن: ئێستا لەوەتان هێنا، تاوێك لەمەو پێش خواردمان، هەر دەیهێنن و لەیەکتریش دەچن "لە ڕواڵەتدا، بەڵام لە تام و بۆندا زۆر جیاوازن").

٢١- میوەجاتی بەهەشت ملکەچ کراون و ئاسانن بۆ لێکردنەوە:

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ﴾ الحاقة: ٢٣. واتە: (میوەجاتی زۆر بەدرەختەکانەوە شۆڕ بۆتەوەو لێکردنەوەی ئاسانە لە دەست ڕەس دایە).

هەروەها دەفەرموویت: ﴿وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلَالُهَا وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلًا﴾ الانسان: ١٤. واتە: (سێبەری درەختە جوانەکان بەسەر شوێنە خۆشەکانیاندا سەری دەر هێناوەو لێکردنەوەی میوەکانیش ئاسانە و ملکەچ کراوە).

٢٢- خواردنیان بۆدێت لەقاپ وسینی، کە لە زێرو زیو دروستکراون:

خوای پاك و تاك دەفەرموویت: ﴿يُطَافُ عَلَيْهِم بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ﴾ الزخرف: ٧١. واتە: (لە سینی و کوپی ئاڵتون جۆرەها خواردن و خواردنەوەی جوان و ڕازاوەو تام خۆش و بۆن خۆشیان بەسەردا دەگێڕن).

هەروەها دەفەرموویت: ﴿وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِآنِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا ﴿١٥﴾ قَوَارِيرَا مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا ﴿١٦﴾ وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا ﴿١٧﴾ عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلْسَبِيلًا ﴿١٨﴾﴾

الانسان: ١٥-١٨. واتە: (هەروەها لە سوڕاحی و دۆڵکەی زیودا شەڕابیان بۆ دەگێڕن کە دەکرێتە ئەو کوپ و پەرداخانەوە کە لە شوشە و کریستاڵی تایبەت دروستکراون. هەموو دام و دەزگای خواردن و خواردنەوەکان لە شووشەی زیو دروستکراون بەشێوەیەکی جوان و دڵڕفێن. هەروەها شەڕابێکی تریان پێشکەش دەکرێت ئاوێتەکەی زەنجەبیلە. کە سەرچاوەیەکە لە بەهەشتدا بە سەلسەبیل ناودەبرێت).

٢٣- لاوانی ئێسك سووك و ڕووخۆش و زۆر جوانی نەمر، خواردن و خواردنەوە بۆ بەهەشتیەکان ئامادە دەکەن و بە چاکترین شێوە خزمەتیان دەکەن:

خوای پایەبەرز دەفەرموویت: ﴿وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ غِلْمَانٌ لَّهُمْ كَأَنَّهُمْ لُؤْلُؤٌ مَّكْنُونٌ﴾ الطور: ٢٤. واتە: (هەروەها منداڵانی جوان و ئێسك سووك بە دەوریاندا دێن و خزمەتیان دەکەن دەڵێی مرواری پاك و بێگەردن).

هــەروەها دەفــەرموویت: ﴿ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا ﴾ الانسـان: ١٩.[١] واتە: (ئینجا نێوجەوانانی هەمیشە لاو و ڕووخۆش و جوان و پـاك، بەناویانـدا دەگەڕێن، کاتێك دەیانبینیت وا دەزانیت مروارین و بەوناوەدا بڵاوبونەتەوە).

٢٤- دەسـتبەند و بازنـەکانی بەهەشـتیەکان لـە زێـڕو مـرواری و گەوهـەرە، هـەروەها پۆشاکیان لە ئاوریشمی تەنك و ئەستورە:

خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿ أُوْلَئِكَ لَهُمْ جَنَّاتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمُ الْأَنْهَارُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَيَلْبَسُونَ ثِيَابًا خُضْرًا مِّن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ ﴾ الكهـف: ٣١. واتـە: (بـازن و دەستبەندی ئاڵتونیان لە دەست ئەکرێت، پۆشاکی سەوزی جوان دەپۆشن کە دووتوێیە، چینی ژێرەوە ئاوریشمی ئەستورە و چینی سەرەوەش ئاوریشمی تەنکە).

هـــــەروەها دەفـــــەرموویت: ﴿ عَالِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ وَحُلُّوا أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ ﴾ الانسان:٢١.[٢] واتە: (پۆشاکی بەختەوەران ئاوریشمی سەوزی تەنکە کە بەسەر پۆشاکی ئاوریشمی ئەستوردا لەبەریان کردووە، بە بازنی زیوی ڕازێنراونەتەوە).

٢٥- بەهەشتیەکان لەسەر قەنەفە و کورسی و فەرش و ڕایەخی ئاوریشمی سەرسـوڕهێنەر شانیان داداوەو پاڵیان داوەتەوە:

خـوای باڵادەسـت و خـاوەن شـکۆ دەفـەرموویت: ﴿ هُمْ وَأَزْوَاجُهُمْ فِي ظِلَالٍ عَلَى الْأَرَائِكِ مُتَّكِئُونَ ﴾ یس: ٥٦. واتە: (خۆیـان و هاوسـەرانیان لـەژێر سـێبەری درەختـی جـوان و چڕوپڕدا لەسەر کورسی و قەنەفە ڕازاوەکان شانیان داداوە).

هــەروەها دەفــەرموویت: ﴿ مُتَّكِئِينَ عَلَى رَفْرَفٍ خُضْرٍ وَعَبْقَرِيٍّ حِسَانٍ ﴾ الـرحمن: ٧٦.[٣] واتە: (شانیان داداوە لەسەر پشتی سەوزو جوان و دۆشەکی نایاب و ڕازاوە).

---

[١] سەیری ئەم ئایەتەش بکە: الواقعة ١٧.

[٢] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: الحج ٢٣، فاطر ٣٣، ٥٣.

[٣] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: الکهف ٣١، یس ٥٧، الصافات ٤٤، ص ٥١، الطور ٢٠، الرحمن ٥٤، الواقعة ١٥-١٦ و٣٤ و٨٩، الإنسان ١٢-١٣، الغاشية ١٣-١٦.

٢٦- هاوسەرانی بەهەشتیەکان پاك و بێگەردو ڕەوشت بەرزن، کە قەشەنگ و خۆشەویستن لەلایەن مێردەکانیان، تەنها چاویان لەلای مێردەکانیانە:

خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ دەفـەرموویت: ﴿وَلَهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ﴾ البقرة:٢٥.

واتە: (هەروەها لەوێدا هاوسەرانی پاك و بێ گەردیان بۆ ئامادەکراوە).

هەروەها دەفەرموویت: ﴿فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴿٥٦﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٧﴾ كَأَنَّهُنَّ ٱلْيَاقُوتُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٥٨﴾﴾ الرحمن:٥٦ و ٥٨.[1] واتـە: (لـەو بەهەشتە حۆری تیادایە کە تەنها تەماشای هاوسەرەکانیان دەکەن، پێش ئەوان دەستی کەسیان لێ نەکەوتووە، نە لە گرۆی ئـادەمی و نـە لـە پـەری. جـا ئـیتر ئـەی گـرۆی ئادەمیزاد و پەری بەکام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگار بڕوا ناکەن، کامەی پەسـەند ناکەن. ئەو هاوسەرانە لـە جـوانی و شـۆخ و شـەنگی و قەشـەنگیدا وەکـو یـاقوت و مەرجانن).

٢٧- شادمان و بەختەوەر بوون بە بینینی خوای گەورە:

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ﴾ یونس: ٢٦. واتـە: (بـۆ ئـەو کەسانەی چاکەیان کردووە، پاداشتی زۆر چاك هەیە لەگەڵ زیـادەدا کـە گەیشـتنە بـە دیداری خوای گەورەوە).

خوای بـێ وێنـە دەفـەرموویت: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾﴾ القیامـة: ٢٢-٢٣.[2] واتـە: (لـەو ڕۆژەدا، ڕووخسـارانێك گەشـاوەو ناسـك و ئاسـوودەن. چـونکە "هەریەکە بۆ خۆی" تەماشای پەروەردگاری دەکات).

٢٨- هەر شتێك دەروون و نەفس، حەزو ئارەزووی بکات ئەوا لە بەهەشتدا هەیە:

---

[1] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: النساء ٥٧، الصافات ٤٨-٤٩، ص ٥٢، الزخرف ٧٠، الدخان ٥٤، الطور ٢٠، الرحمن ٧٠ و٧٢ و٧٤، الواقعة ٢٢-٢٣ و٣٥-٣٨، النبأ ٣٣.

[2] لەبارەی بینینی خوای پەروەرگار، هەروەها بۆچوون و مەزهەبەکانی زانایان لەوبارەوە بگەڕێوە بۆ بەشی خواناسی (الالهیات).

خوای پایەبەرز دەفەرموویت: ﴿وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ﴾ الزخرف: ٢٣. واتە: ("ئەوان لەناو نازو نیعمەتدا" کە حەزیان لێی بوو و ئارەزوویان دەکرد بۆ هەتا هەتایی دەمێنن).

خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ﴾ ق: ٣٥.[١] واتە: (هەرچیش داوا دەکەن و حەزی لێ دەکەن بۆیان ئامادەیە تیایدا، زۆر لەوەش زیاترمان لایە).

٢٩- بۆ هەتا هەتایی و هەمیشەیی بەهەشتیەکان ژیان لە بەهەشتدا بەسەر دەبەن:

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَهُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ البقرة: ٢٥. واتە: (ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوە لەو بەهەشتەدا دەبەنە سەر).

خوای بێ وێنە دەفەرموویت: ﴿هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ البقرة: ٨٢.[٢] واتە: (هەر ئەوان نیشتەجێی بەهەشتن و تیایدا ژیانی هەتا هەتایی دەبەنە سەر).

خوای بێ هاوەڵ و هاوبەش دەفەرموویت: ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ آل عمران: ١٥ و ١٣٦ و ١٩٨.[٣] واتە: (هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نەبڕاوە).

خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾ النساء:٥٧ و ١٢٢.[٤] واتە: (لەوێدا ژیانی هەمیشەیی و بەردەوام دەبەنە سەر).

خوای باڵادەست دەفەرموویت: ﴿لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلْمَوْتَ إِلَّا ٱلْمَوْتَةَ ٱلْأُولَىٰ وَوَقَىٰهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ﴾ الدخان: ٥٦. واتە: (لە هەمووی خۆشتر ئەوەیە کە هەرگیز تاڵیی مردن ناچێژن تیایدا جگە لەو مردنەی یەکەمجار، و پەروەردگاریان لە سزای دۆزەخ بەدووری گرتوون و پاراستوونی).

---

[١] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: النحل ٣١، الأنبیاء ١٠٢، الفرقان ١٦.

[٢] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: الأعراف ٤٢، یونس ٢٦، المؤمنون ١١، آل عمران ١٠٧، هود ٢٣.

[٣] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: النساء ١٣، المائدة ٨٥، التوبة ٧٢ و٨٩، هود ١٠٨، إبراهیم ٢٣، الکهف ١٠٨، طه ٧٦، الفرقان ٧٦، العنکبوت ٥٨، لقمان ٩، الأحقاف ١٤، الفتح ٥، الحدید ١٢، المجادلة ٢٢.

[٤] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: المائدة ١١٩، التوبة ٢٢ و ١٠٠، التغابن ٩، الطلاق ١١، البینة ٨.

هـەروەها دەفـەرموویێت: ﴿ ٱدْخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُلُودِ ﴾ ق: ٣٤.[1] واتـە: (بفـەرموون بچنە ناو بەهەشتەوە لەگەڵ ئاشتی و ئارامی و هێمنیدا، ئا ئەوە ئیتر ڕۆژی نـەمری و نەبڕاوەیە).

٣٠- قسەی بێ کەڵك و نابەجێ و یەکتر تۆمەتبار کردنی تێدا نییە:

خـوای مــەزن دەفــەرمووێت: ﴿ لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا تَأْثِيمًا ۝ إِلَّا قِيلًا سَلَٰمًا سَلَٰمًا ۝ ﴾ الواقعة: ٢٥-٢٦. واتە: (هیچ جۆرە قسەیەکی نابەجێ و نادروسـت و ناڕێـك نابیسـتن و یەکتریش گوناهبار ناکەن. جگە لەوتنی سڵاو و وەڵامدانەوەو قسەی خۆش نەبێت).

هــەروەها دەفــەرمووێت: ﴿ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّٰبًا ﴾ النبـأ: ٣٥.[2] واتــە: (لــەو بەهەشتەدا هیچ جۆرە قسەیەکی پڕو پووچ و درۆو دەلەسەیەك نابیستن).

٣١- هەست بە ماندوێتی و بێزاری ناکەن:

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ لَا يَمَسُّهُمْ فِيهَا نَصَبٌ ﴾ الحجر: ٤٨. واتە: (هـیچ جـۆرە بێ تاقەتی و بێزاری و ناخۆشی و پەستییەك دووچاریان نابێت).

هەروەها دەفـەرمووێت: ﴿لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٌ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٌ ﴾ فـاطر: ٣٥. واتـە: (هیچ نەخۆشی و ناخۆشـییەك توخنمـان ناکـەوێت، هـیچ ئـازارو ئێشـێکی دەروونـی تووشمان نابێت و هیچ بێزاری و ماندووبوونێکیش ڕوومان تێناکات).

٣٢- سوپاس و ستایشی پەروەردگاریان دەکەن لەسەر ئەوەی بـەڵێنی خـۆی هێنایـەجێ و نازو نیعمەتی بەوان بەخشیووە:

خوای باڵادەست دەفەرمووێت: ﴿ وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى صَدَقَنَا وَعْدَهُۥ وَأَوْرَثَنَا ٱلْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَآءُ ﴾ الزمر: ٧٤. واتە: (ئەوسا ئیتر ئەو بەختەوەرانە دەڵـێن: سوپاس و ستایش بۆ ئـەو خوایـەی، کـە بـەڵێنی خـۆی بۆمـان بـردە سـەرو کردینـی

---

[1] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: الحجر ٤٨، الزمر ٧٣، الزخرف ٧١.

[2] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: مریم ٦٢، الغاشیة ١١.

بەخاوەنی سەر زەمینـــی بەهەشـت و لەهــەر شـوێنێك و لەهــەر جێیەکیـدا بمانــەوێت سەربەستانە ژیان دەبەینە سەر).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَنَادَىٰٓ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ أَصْحَٰبَ ٱلنَّارِ أَن قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا قَالُوا۟ نَعَمْ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنٌۢ بَيْنَهُمْ أَن لَّعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ الأعـــــــراف: ٤٣.[1] واتە: ("ئەوسا ئیتر هەمووان بەیەك دەنگ و یـەك ئـاواز" دەڵـێن: سـوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە هیدایەت و ڕێنمووی کردین بۆ ئەم جێگە و ڕێگـە خۆشـە، ئەگەر ئـەو خودایـە هیدایـەت و ڕێنمـووی نەکردینایـە هـەرگیز ڕێگـەی هیدایـەتمان نـەدەزانی و ئـەم پاداشـتەمان وەرنـەدەگرت، سـوێند بـەخوا بەڕاسـتی پێغەمبــەرانی پەروەردگارمان بەحەق و ڕاستیەوە هاتن، ئەوسا بانگیان لێکرا: ئەوە ئـەو بەهەشـتەیە کە پێتان دراوە، بەهۆی ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامتان دەدا).

٣٣- هیچ ڕق و کینەیەك لە دڵ و دەروونی بەهەشتیەکاندا نییە:

خوای پاك و تـاك دەفـەرمووێت:﴿وَنَزَعْنَا مَا فِى صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ﴾ الأعـراف: ٤٣. واتـە: ("هــەروەها لــە دەروازەی بەهەشــتدا" هەرچـی بـوغزو کینەیــەك لــە دڵ و دەروون و سینەیاندا بوو ئێمە دامان ڕنی).

هــەروەها دەفــەرمووێت: ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِى صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ﴾ الحجـر: ٤٧. واتـــە: ( لــە کاتێکدا هەرچی کینەو بوغزە لە دڵ و دەروونیاندا دەرمان کێشا).

٣٤- چاك و چۆنیشیان لە بەهەشتدا سڵاو کردنە:

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿تَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ﴾ إبراهيم: ٢٣. واتە: (چاك و چۆنیان لــە بەهەشتدا سڵاوکردنە).

هەروەها دەفــەرمووێت: ﴿وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ﴾ يـونس: ١٠. واتــە: (چـاك و چۆنیشـیان لەوێ سڵاوکردنە).

[1] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: الأعراف ٤٣، یونس ١٠، فاطر ٣٤.

٣٥- فریشتەکان بەسڵاوی گەرمەوە پێشوازییان لێ دەکەن:

خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَدۡخُلُونَ عَلَيۡهِم مِّن كُلِّ بَابٖ ﴿٢٣﴾ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٤﴾ ﴾ الرعـد: ٢٣-٢٤. واتە: (کە باخچەکانی بەهەشتی -عەدنـە- بۆیـان ڕازاوەتـەوە، بەشـادییەوە دەچنە ناوی، هـاوڕێ لەگـەڵ هەرکەسـێك چـاك و پـاك و خواناسـە لـە باووبـاپیران و هاوسەرانیان و نەوەکانی، جا فریشتەکان دەچن بۆ سەردانیان لە هەموو دەروازەکانەوە. "دەڵێن" سڵاوتان لێبێت لەبەرامبـەر خۆگرتنتانـەوە، کـەوابوو ئـای چـەندە جێگـە و ڕێگەیەکی خۆشتان بۆ خۆتان مسۆگەر کرد).

هـەروەها دەفـەرمووێت: ﴿ لَا يَحۡزُنُهُمُ ٱلۡفَزَعُ ٱلۡأَكۡبَرُ وَتَتَلَقَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ هَٰذَا يَوۡمُكُمُ ٱلَّذِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ﴾ الأنبيـاء: ١٠٣. واتـــە: ("ئـــەو بەختەوەرانـــە" لێقەومانی گەورەو تەنگانەی بێ سنووری "قیامەت" تووشـی غـەمباری و پـەژارەیان ناکات، بەڵکو فریشتەکان "بەڕووی خۆشەوە پێشوازیان لێ دەکەن و" دەڵێن ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە کاتی خۆی بەڵێنتان پێدەدرا).

٣٦- بەهەشتیەکان ناترسن و خەفەتیش ناخۆن:

خوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمۡ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ ﴾ الأعـراف: ٤٩. واتە: (دە بچنە بەهەشتەوە، نە ترس و بیمتان لەسەرە نەغەم و پەژارەش دەخۆن).

هـــەروەها دەفـــەرمووێت: ﴿ ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ءَامِنِينَ ﴾ الحجـر: ٤٦.[1] واتـــە: ("پێیـــان دەوترێت:" فەرموون بچنە ناوی بەسەلامەتی و سەلامەتان لەسەر بێت، ژیـانی پـڕ لـە ئاسوودەیی تیادا بەرنە سەر).

٣٧- ڕووی گەش و شادییان پێ دەبەخشرێت:

خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَّىٰهُمۡ نَضۡرَةٗ وَسُرُورٗا ﴾ الـدهر: ١١. واتە: (ڕووی گەش و شادمانی پێیبەخشین).

---

[1] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: مریم ٦٠، الدخان ٥١ و٥٢ و٥٥، ق ٣٤.

٣٨- خاوەن حورمەت و ڕێز لێنراون:

خوای گەورە دەفەرمووێت:﴿وَهُم مُّكْرَمُونَ﴾ الصافات: ٤٢. واتە: (قەدرو ڕێزێکی بێ وێنە لەلایەن پەروەردگارو فریشتەکانەوە لێیان دەگیرێت).

هەروەها دەفـەرمووێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ فِي جَنَّٰتٖ مُّكۡرَمُونَ﴾ المعـارج: ٣٥. واتـە: (ئـا ئەوانـە لـە باخەکانی بەهەشتدا ڕێز لێنراون).

٣٩- بەهەشتیەکان میهرەبانی و ڕەزامەندی خوای گەورە دەست دەخەن:

خوای پایەبـەرز دەفـەرمووێت: ﴿يُبَشِّرُهُمۡ رَبُّهُم بِرَحۡمَةٖ مِّنۡهُ وَرِضۡوَٰنٖ﴾ التوبـة: ٢١. واتە: (پەروەردگاریان مـژدەیان دەداتـێ بـە ڕەحمـەت و میهرەبـانی تایبـەت لەلایـەن خۆیەوە، هاوڕێ لەگەڵ ڕەزامەندی).

هـــەروەها دەفـــەرمووێت: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةٗ فِي جَنَّٰتِ عَدۡنٖۚ وَرِضۡوَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِ أَكۡبَرُ﴾ التوبة: ٧٢.[1] واتە: (خوای گەورە بەڵێنی داوە بە ئیمانداران لە پیاوان و لـە ئافرەتـان، بەوەی کە باخەکانی بەهەشتیان پێ دەبەخشێت کە چەندەها ڕووبار بەژێر درەختەکان و بە بەردەم کۆشکەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی هەمیشـەیی و نـەبڕاوە تیایـدا، هەروەها چەندەها جێگە و ڕێگـە و کۆشـك و تـەلاری خـۆش و ڕازاوەی تایبـەتی لـە بەهەشتداو لە ناو باخی چڕوپڕی "عـەدەن"دا، لەگەڵ ڕەزامەندی خوای گەورەدا، کە لە هەموو نازو نیعمەتەکان بەنرخترو گرنگترە).

٤٠-بەدەستهێنانی بەهەشت گەورەترین سەرکەوتن و دەستکەوتی بێ سنوورییانە:

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾ النسـاء: ١٣.[2] واتـە: (بێگومـان هـەر ئەوەشە سەرفرازی گەورەو دەستکەوتی بێ سنوور).

---

[1] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: آل عمران ١٥، المائدة ١١٩.

[2] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: التوبة ٨٩ و ١٠٠، الصف ١٢، التغابن ٩.

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿ حَسُنَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴾ الفرقان: ٧٦.[1] واتە: (بەڕاستی جێگە و ڕێگە و نیشتەجێیەکی خۆش و سازگارو ڕازاوەیە).

٤١- مژدەیان پێ دەدرێت:

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿بُشْرَىٰكُمُ ٱلْيَوْمَ جَنَّٰتٌ ﴾ الحدید: ١٢. واتە: (مژدەی ئێوە ئەمڕۆ باخەکانی بەهەشتە).

٤٢- پیرۆزباییان لێدەکرێت بەوەی لەناو ئەو نازو نیعمەت و خۆشیانەدان:

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ الطور: ١٩، المرسلات: ٤٣. واتە: (پێیان دەوترێت بخۆن و بخۆنەوەو نۆشی گیانتان بێت لە پاداشتی کردەوەی چاك و ڕێك و پێکتاندا).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔا بِمَآ أَسْلَفْتُمْ فِى ٱلْأَيَّامِ ٱلْخَالِيَةِ ﴾ الحاقة: ٢٤. واتە: ("ئینجا پێیان دەوترێت" بخۆن و بخۆنەوە نۆشتان بێت، بەهۆی دەست پێشخەریتان لە ڕۆژگاری ڕابردوودا).

٤٣- بەهەشتییەکان سەرگەرم و سەرقاڵن لەناو خۆشی و شادی و بەختەوەرییەکی بێ هاوتادا، بۆیە ماوەی پرسیارکردنیان نییە، جا دوای ئەو نازو نیعمەتە هەتا هەتاییە پرسیارو داوای چی دەکەن؟

خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ ٱلْيَوْمَ فِى شُغُلٍ فَٰكِهُونَ ﴾ یس: ٥٥. واتە: (بەڕاستی ئەمڕۆ بەهەشتیەکان لەناوخۆشی و شادی و کامەرانیەکی بێ وێنەدا سەرگەرمن).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿ فَٰكِهِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ ﴾ الطور: ١٨. واتە: (زۆرکەیف خۆش و دڵخۆش و ڕووخۆشن بەو بەخششانەی کە پەروەردگاریان پێی بەخشیون).

---

[1] سەیری ئەم ئایەتانەش بکە: آل عمران ١٨٥، النساء ١٣، التوبة ٧٢، الدخان ٥٧، الحدید ١٢، الکهف ٣١، الصافات ٦٠، الفتح ٥، البروج ١١

٤٤- بەهەشتیەکان بەهەشت بەهیچ جێگرەوەو شوێنێك و جێگایەکی تر ناگۆڕنەوە، لەبەر ئەو نازو نیعمەتانەی کە بەهەشت هەیەتی:

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلْفِرْدَوْسِ نُزُلًا ﴿١٠٧﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلًا﴾ الكهف: ١٠٧-١٠٨. واتە: (بەڕاستی ئەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، ئێمە هەر لە زووەوە بەهەشتی فیردەوسمان بۆ ئامادە کردوون، تا لەوێ دابەزن و ژیانی کامەرانی تیایدا دەبەنەسەر. ژیانیان تیایدا بەردەوام و نەبڕاوەیە، نایانەوێت بگوێزرێنەوە بۆ شوێنێکی تر "لەبەرچاویان ناکەوێت").

ئا بەوشێوەیە وێنەی بەهەشت بۆ ئێمە ڕوون و ڕۆشن دەبێت، کە دانیشتوانەکەی تیایدا دەسوڕێنەوەو خۆشی و شادی دەکەن و ڕادەبوێرن بەهەموو جۆرەکانیەوە، (م. عبدالرزاق نوفل) لە کتێبەکەی کە بەناوی (یوم القیامة)ە دەڵێت:

بەهەشتیەکان جیاوازن و پلە پلەن، وەك چۆن دانیشتوانی دونیا پلە پلەن، لە چۆنیەتی و شێوازەکانی چێژو تام وەرگرتن، جا هەندێك کەس دەبینین کە لە ژیانی دونیا بەدوای چێژو خۆشی دەگەڕێت لە ڕێگەی چێشت و خواردنی خۆش و باشەوە یاخود لەڕێگەی خواردنەوەی خۆش و فێنکەرەوە یان لە ڕێگەی دیمەنی جوان و قەشەنگەوە یان ئاوازێکی ڕێکەوە یاخود دانوستانێکی ئارام لەگەڵ هاوڕێیەکدا یاخود لە ڕێگەی تەنیایی و بیرکردنەوەوە، لە دونیادا کۆمەڵە کەسێکی پاك و پوخت هەن، کە هەموو خۆشی و چێژێکیان و بەختەوەرەییان بریتیە لە تەنیا بوونی لەگەڵ خوای گەورە لە نوێژو نزاکانیەوە.... بەم شێوەیە.

جا کاتێك کە دەیبینی لە دواڕۆژدا ڕووناکایی و نووری خوای گەورە پەخش دەبێت بەسەر بووندا، پەردەکان هەڵدەگیرێن و لادەچن، بۆ ئەوەی دڵ و دەروونەکان بەر لەچاوەکان پەیوەست بن بەو نوورە پاك و بەرزو پیرۆزە.... جا مرۆڤ بە دوو بەشە پاکەکەی هەوڵدەدات کە پەیوەست ببێت و دەست بگرێت بە ئەصڵ و بنەچەی نوورەکە و ئاوێتە ببێت لە بوونێکدا کە جگە لەخوای گەورە هیچی تر نابینرێت... ئەم شتانە بەدی دەکەین

لە کەسانێکدا لەکاتی خوادرن و خواردنەوەو ڕابواردن... جا ئایا هیچ خۆشـی و چـێژێك و بەختەوەری و شادمانییەك هەیە بە ئەندازەی نزیـك بـوون لـە خـوای گـەورەو بینینـی... بێگومان هیوای باوەڕداران - هەروەك نووری ئەوان بۆیان ڕۆشن کراوەتەوە - ئەوەیـە کـە لەو نوورە بەهرەوەر بن، تا ببنە بەشێك لەو نوورە، هەر ئەمەشە کە پێی لـەخوای گـەورە دەپاڕێنەوە، داوای لێدەکەن بە دەقی ئایەتی پیرۆز: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ يَوْمَ لَا يُخْزِى ٱللَّهُ ٱلنَّبِىَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ ۖ نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَـٰنِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَٱغْفِرْ لَنَآ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ التحـريم: ٨.[1] واتـە: (ئـەی ئـەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، ئێوە بە تەوبە و پەشیمانییەکی پوخت و دڵسۆزانەوە ڕوویکەنـە خوا، نزیکە پەروەردگارتان لە هەڵە و گوناهـەکانتان خـۆش ببێـت و بتانخاتـە باخـەکانی بەهەشتەوە کە چەندەها ڕووبار بەژێر درەخت و کۆشـکەکانیدا دەڕوات، ڕۆژێـك دێـت کـە خوا پێغەمبەرو ئەوانـەی لەگەڵیـدان خەجاڵـەت و شـەرمەزار ناکـات، نـوورو ڕووناکیـان دەدرەوشێتەوەو دێت و دەچێت لەبەردەم و لای ڕاستیانەوەو دەڵێن: پەروەردگارا ئەم نـوورو ڕووناکیەمان بۆ زیاد بکە و لێمان خـۆش ببـە، چـونکە بەڕاسـتی تـۆ دەسـەڵاتت بەسـەر هەموو شتێکدا هەیە).

بەڵام دوان لەسەر شوێنی بەهەشت و ئاگری دۆزەخ ئایا نـاوبراوان ئێسـتا بـەدیهێنراون یان نا؟ ئێمە پێویستمان بەوە نییە لێرەدا لەسەری بدوێین، چونکە بابەتێکی واگرنگ نییـە و تایبەت نییە بە کرۆکی بیروباوەڕەوە[2].

---

[1] یوم القیامة - عبدالرزاق نوفل ١٥٥-١٥٧ (بە دەستکارییەوە).

[2] لە بارەی ئەم بابەتە سەیری: المواقف وشرحه للسید الشریف ٣٠١/١، المقاصد وشرحه للتفتازاني ١٠٧/٥.

# بەشی حەوتەم

# کوفرو تەکفیر

لە سێ دەروازە پێک دێت:

دەروازەی یەکەم: واتای کوفرو جۆرەکانی.

دەروازەی دووەم: حوکمی تەکفیر کردنی ئەهلی قیبلە.

دەروازەی سێیەم: سزای هەڵگەڕاوە (مرتد).

# دەروازەی یەکەم

## واتای کوفرو جۆرەکانی

لە کۆتایی بەشی (پێغەمبەرایەتی)دا بنەماکانی بانگەوازی پێغەمبەر موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) خرایەڕوو، ئەوەشمان باسکرد کە شایەتمان: (أشهد أن لا اله الله، وأشهد أن محمد رسول الله) ناونیشانی دەرگای چوونەژوورەوەیە بۆ ناو ئیسلام، چونکە هیچ کەسێك ناچێتە ناو ئیسلام تا هەردوو پارچەکەی شایەتمان بەیەکەوە دەرنەبڕێت، لەبەرئەوەی دەربڕینی شایەتمان نمیاش کردن و وێناکردنی ئەو بەشەی ئیسلامە کە لە دڵدا جێگیر بووە.

لەبەر ئەمە شایەتمان بنەمای یەکەم لە بنەماکانی ئیسلام، هەروەك لە فەرموودەکەی جبریلدا هاتووە کاتێك پرسیار لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)دەکات لەبارەی ئیمان و ئیسلام، (فەرمووی: ئەی موحەممەد، پێم بڵێ: ئیسلام چییە؟. پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە وەڵامدا فەرمووی: ئیسلام بریتییە لەوەی: هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق جگە لە خوای گەورە و موحەممەدیش نێردراوی خوایە، نوێژ بکەیت و زەکات بدەیت و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگریت و حەج بکەیت ئەگەر لە تواناتدا هەبێت)[1].

جا ئەگەر مرۆڤ بچێتە ناو ئایینی ئیسلام و موسڵمان ببێت، ئەوا هەم ئەرك و هەم مافیشی دەبێت، بەو شێوەیەی لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی بەپێزی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) هاتووە.

هیچ شتێك موسڵمان ناخاتە دەرەوەی بازنەی ئیسلام، ناسنامە و پێناسەی ئیسلام لە هیچ کەسێك وەرناگیرێتەوە، مەگەر موسڵمانەکە خۆی کارێك بکات کە سەربکێشێت بۆ کوفرو بێ باوەڕی.

---

[1] ئەم فەرموودەیەی جبریل بەم دەربڕینە لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە: کتاب الایمان، أول باب بیان الایمان و الاسلام، رقم ٨، عن عمر بن خطاب (رضي الله عنه).

ئەمەش پاڵمان دەنێت بۆ ئەوەی ئەو بابەتانەی خوارەوە، ڕوون بکەینەوە:

واتای کوفر، جۆرەکانی، ئەو شتانەی دەبنە هۆی تەکفیر کردن، تەکفیر کردنی ئەهلی قیبلە، سزای هەڵگەڕاوە (مرتد).

## کوفر لە زمانەوانی و زاراوەدا:

**کوفر لە بنچینەی زمانەوانیدا:** بریتییە لە داپۆشین و شاردنەوە. بۆیە بە جوتیار دەوترێت (کافر) چونکە تۆ دادەپۆشێت و دەیشارێتەوە[1].

**لە زاراوەدا:** بریتیە لەو شتەی مرۆڤی بێ باوەڕو کافر (بریتییە لەو مرۆڤەی بە کوفر وەسف دەکرێت) بێ بەش دەکات لە بەشدار بوون لەو فرە حوکم و یاسانەی تایبەتن بە موسڵمانان[2].

جا لەبەر ئەوەی لەلای هەموو تاقمەکان[3] کوفر لە ڕووی شەرعیەوە بریتییە لە پێچەوانە و دژ بوون لەگەڵ ئیمان و باوەڕ، بۆیە دەستە جیاوازەکانی زانایانی کەلام ڕاجیاییان هەبووە لە دەستنیشان کردنی واتای زاراوەیی کوفر بەپێی ڕاجیاییان لە دەستنیشان کردنی واتای ئیمان و باوەڕ.

١- هەیانە وتویەتی: ئیمان و باوەڕ بە خوابوون، بریتیە لە ناسینی خوا، هەروەها وتویەتی: کوفرو بێ باوەڕی، بریتییە لە: نەناسینی خوا[4].

بەڵام ڕەخنەیەك ئاراستەی ئەم دەستنیشان کردن و سنوردار کردنە کراوە:

ئەوەیە کە هەر کەسێك پەیامەکانی ئاسمانی بەدرۆ زانی و نکوڵی لێکرد، توانجی لە پێغەمبەردا و پەنجەی تۆمەتی بۆ درێژکرد و کڕنووشی بۆ بت برد، ئەوا بەیەکدەنگی زانایان ئەو کەسە کافرە. ئەمەش بەهۆی خوا نەناسی ئەو نییە،

---

(1) المصباح المنير مادة (كفر).

(2) الكليات للكفوي ٧٦٤. وتویەتی: ئەمە نزیکترینیانە.

(3) كشاف اصطلاحات الفنون ١٣٦٨.

(4) الكليات للكفوي ٧٦٤ وكشاف اصطلاحات الفنون، سەرچاوەی پێشوو.

بەڵکو دەکرێت هەندێك لەو ڕەفتارانە لە کەسێکی خواناسەوە دەربچێت بەڵام نەزان بێت سەبارەت بە دوورکەوتنەوە لەم جۆرە کارانە یان نەزان بێت بە زانیارییەکان لەم بارەوە[1].

٢- هەندێکی تر وتویانە: ئیمان، بریتییە لە: گوێڕایەڵی، ئەمە ڕای: موعتەزیلە و خەواریجەکانە، هەروەها لەبارەی کوفر وتویانە: کوفر بریتییە لە تاوان و گوناه. بەڵام خەواریجەکان وتویانە: هەموو تاوانێك کوفرە.

جا (موعتەزیلە) تاوان و گوناهیان بۆ سێ بەش دابەش کردووە:

أ- بەشێك لە تاوان و گوناه سەرچاوە دەگرن لە نەناسینی خواو یەکتاییەکەی و ئەو شتانەی کە شیاوی پەروەردگار نین. هەروەها نەزانین سەبارەت بە پەیامی پێغەمبەرەکەی، وەك: فڕێدانی قورئانی پیرۆز بۆ ناو شوێنی پیس و زبڵدان و دەربڕینی ئەو وشانەی کە ئاماژەن لەسەر نەزانی کەسەکە بە گەورەیی ئەو گوناهانە: وەك: تانە و توانجدان و سوکایەتی کردن بە پێغەمبەر، جا ئەم جۆرە تاوانانە کوفرن.

ب- بەشێکی تری تاوان و گوناه، گوناهبارەکە و تاوانکارەکە دەردەکات لە بازنەی ئیمان، دەیخاتە پلەیەك لەنێوان دوو پلەکە (المنزلة بين المنزلتين)، بەو واتایەی تاوانکارەکە حوکمی کوفرو ئیمانی بەسەردا نادرێت واتە: نە بە ئیمان نە بە کوفر وەسف ناکرێت، بەڵکو بە لاسارو تاوانکار وەسفی ئەکرێت، ئەو بەشە تاوانە پێیان دەوترێت گوناهە گەورەکان، وەك: کوشتنی مرۆڤێك بە ئەنقەست، زیناکردن، مەیی خواردنەوە.

پ- بەشێکی تر لە گوناه، گوناهکارەکە بەهۆیەوە لە خانەی ئیمان ناچێتەدەر، پێویستیش ناکات ئەنجامدەری ئەو جۆرە تاوانە بە کوفر یاخود بە لاسار

---

[1] الكليات. سەرچاوەی پێشوو. تتهانوی لە (كشاف اصطلاحات الفنون)دا وتویەتی: (پوچەڵی ئەم پێناسەیە دیارە)، بەبێ ئەوەی ڕووی پوچی و بێ بنەماییەکەی دیاری بکات.

(فاسق) وەسف بکرێت، ئەم بەشە تاوانە پێی دەوترێت گوناهە بچوکەکان، وەك: بەرەڵاکردنی داوێن و شەرمگە (عورة)، خۆ گێل کردن[1].

بەڵام بەرپەرچ دەدرێتەوە:

هەر تاوان و گوناهێك بە مەبەستی بەدرۆ خستەوەی پێغەمبەر نەبێت لەو پەیامەی کە هێناویەتی ئەوا نابێتە کوفر[2].

٣- هەیە وتویەتی: ئیمان واتە زانین (بەڕاستدانان) بە دڵ، دانپێدانان بە زمان، جێبەجێکردن بە ئەندامەکان، هەروەها وتویەتی: کوفریش: بریتییە لە کەم و کوری کرچ وکاڵی تێکەوتن لە هەر شتێك لەوەی باسکرا[3].

٤- هەشیانە وتویەتی: ئیمان بریتیە لەوەی بەدڵ بڕوا بەخوابێنێت و بەو پەیامەی پێغەمبەر هێناویەتی. هەروەها وتویەتی کوفر: بریتییە لە بەدرۆزانینی هەر شتێك کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هێناویەتی. ئیمامی غەزالی ئەمەی پەسەند کردووە.

جا (کفوی) ئەم وتەیەی خۆی وەك سەرنجێك لەسەر ئەم پێناسەیە خستوەتەڕوو: شتێك بەرپەرچی ئەم پێناسەیە ئەداتەوە، ئەویش بریتییە لەوەی کە حوکمی ئەو کەسە چییە کە پەیامی پێغەمبەران نە بەڕاست دائەنێت و نە بەدرۆی دەخاتەوە؟، جا ئەو کەسە بەیەکدەنگی و بەبێ ڕاجیایی بێ باوەڕو کافرە ئەگەرچی پەیامی پێغەمبەران بەدرۆش نەخاتەوە. بەهەمان شێوە منداڵەکان و کەسانی شێت لە بێباوەڕان بە کافر دادەنرێن، نە بە ڕاست نە بەدرۆ دانیان نەناوە بە پەیامی پێغەمبەران[4].

---

[1] دانەر بە (سفە: گێلی) هێناویەتی، بەڵام لەبەر ئەوەی من سەرم سوڕماوە گێلی بۆچی تاوانە و دەچێتە چ چوارچێوەیەکی تاوانەوە، بۆیە هەڵسام بە گۆڕینی بۆ (خۆ گێل کردن) پێم وایە ئەمە شیاوترە. خوا زاناترە. (وەرگێڕ).

[2] هەر دوو سەرچاوەکەی پێشوو.

[3] الكليات، سەرچاوەی پێشوو.

[4] الكليات، سەرچاوەی پێشوو.

ئەو پێناسەیەی کە ئیمامی (یەحیا)ی کوڕی (حمزه) هێناویەتی نزیکە لەو پێناسەیەی کە ئیمامی (غەزالی) پەسەندی کردووە، دەڵێت: (کوفر: بریتییە لە بەدرۆ زانینی هەر بەشێك لە پەیامی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، وەك: (نكۆڵی کردن لە زیندوو بوونەوەو سزاو پاداشت و هەر شتێك کە ئاماژەیەکی ڕوون بێت بۆ بەدرۆ خستنەوە، وەك: پۆشینی ئەو هێما و نیشانانەی کە ئەهلی کیتاب و ئەهلی ذیمە دەیپۆشن لەناو دەوڵەتی ئیسلامدا)[1].

هەمان ئەو سەرنج و ڕەخنەیەی کە ئاراستەی پێناسە پەسەندکراوەکەی ئیمامی غەزالی کراوە هەمان شتیش ئاراستەی وتەکەی پێشەوا یەحیا کراوە.

## جۆرەکانی کوفر:

زانایانی کەلام کوفریان بۆ چوار جۆر دابەش کردووە:

١- کوفری نكۆڵی کردن (إنكار): بریتییە لەوەی بە دڵ و زمانی کوفر بکات و دان دەنێت بە هەر شتێك کە لەبارەی یەکتاناسی بۆی باس بکرێت.

٢- کوفری دان پێدانەهێنان (جحود): بریتییە لەوەی بە دڵ بیناسێت و بەزمان دانی پێدا نەنێت و دەری نەبڕێت. وەك: کوفری (شەیتان).

٣- کوفری سەرکەشی (کفر عناد): بریتییە لەوەی بە دڵ ئیمان و باوەڕ بناسێت و بەزمان دانی پێدا بنێت و دەری ببڕێت، کەچی ملکەچ نەبێت بۆ ئیمان و باوەڕەکەی.

٤- کوفری دووڕوویی (کفر نفاق): بریتییە لەوەی بە زمان باوەڕ دەربېڕێت، کەچی بەدڵ بڕوای نەبێت و دانی پێدانەنێت.

سەرجەم ئەم جۆرانەی کوفر وەك یەکن، لەوەی هەر کەسێك هەر جۆرێك لەو کوفرانە بکات و بەو جۆرەش بگەڕێتەوە لای خوای گەورە ئەوا لێخۆشبوونی بۆ نییە[2].

---

[1] المعالم الدينية - إمام يحيى بن حمزة ١١٨.

[2] الكليات ٧٦٤-٧٦٥.

ئیبازییەکان کوفریان بۆ دوو جۆر دابەش کردووە: کوفر کردن بە خوا. و کوفر کردن بە بەخشش و نیعمەتەکانی.

١- کوفر کردن و بێ باوەڕ بوون: بریتییە لە هاوبەش بڕیاردان بۆ خوا. ئەم هاوبەشدانانە دەبێتە هۆی ئەوەی کەسەکە بچێتەدەر لە بازنەی ئیسلام[1].

---

نمونەیەکی تر کە لە کوفری نکوڵی کردنە: ﴿وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا﴾ النمل: ١٤. واتە: (جا ئەوانەی هەر ڕق ئەستوریان کردو باوەڕیان پێ نەبوو، بە زۆرداری و خۆبەزلزانی، لە کاتێکدا لە ناخی دەروونیانەوە هەستیان دەکرد حەقیقەتە و ڕاستە). و کوفری ئومەی کوڕی ئەبی صەڵت کە پێش هاتنی محمد (صلی الله علیه وسلم) ئامادەکاری دەکر بۆ ئەوەی وەکو پێغەمبەر خۆ دەربخات. هەروەها کوفری هەندێك لە جولەکەکان ئەوانەی کە پێغەمبەرایەتی موحەممەدیان (صلی الله علیه وسلم) دەناسی و باوەڕیان پێ نەهێنا.

[1] شرح غاية المراد ١٣٤.

هاوبەش دانان بۆ خوا لەلایەن ئیبازیەکان دوو جۆرە: هاوبەش دانانی وەك یەك دانان و یەکسان کردن، هاوبەش دانانی دان پێدانەهێنان.

**أ- هاوبەش دانانی وەك یەك دانان و یەکسان کردن:** ئەوەیە کە خواو یەکێك لە بەدیهێنراوانی وەك یەك دابنرێن، جا هەر کەسێك دانی نا بەبوونی خوایەکی تر لەگەڵ خوای گەورە، ئەوا خوای گەورەی یەکسان کرد لەگەڵ جگە لە خۆی. جا هەر کەسێك گومانی وابێت کە خوای گەورە پەیدابووە، ئەوا خوای گەورەی یەکسان کردووە لەگەڵ بەدیهێنراوەکانیدا لەوەی وەسفی کردووە بە پەیدابوون (حدوث).

**ب- هاوبەشدانانی دان پێدانەهێنان (شرك جحود):** ئەوەیە کە نکوڵی بکات لە بوونی خوا یاخود لە سیفەتەکانی یان لە کردارەکانی. وەك ئەوەی نکوڵی بکات لەوەی خوای گەورە زانا و خاوەن توانا بێت.... یاخود نکوڵی بکات لەوەی خوای گەورە پەیام و پەیامبەرانی ڕەوانە کردبێت.

ئەم جۆرە دابەش کردنە شتێك نیە دەقی لەسەر هاتبێت، بەڵکو زانایانی ئیبازی وا لەسەری ڕێکەوتوون، ئەگەرنا ئەکرێت لەکاتی لێکۆڵینەوەدا هەموو جۆرەکانی هاوبەش دانان بگەڕێنرێنەوە بۆ هاوبەشدانانی وەك یەك دانان یاخود دان پێدانەهێنان./ شرح غاية المراد ١٣٦. هەروەها سەیری ئەمەش بکە: مشارق أنوار العقول ٢/٣١٢.

٢-کوفر کردن بە بەخشش و نیعمەتەکانی خـوا: ئەوەیـە کـە لـە تـەئویلێکی هەڵـەوە دروست بووە، وەك: بە حەلاڵ دانانی شتێك کـە خـوای گـەورە حـەرامی کـردووە، ئەمەش بەهۆی تەئولێکی هەڵەوە لەلایەن کەسەکەوە[١].

کوفری نیعمەت بە دوو ڕوویی (نفـاق) ناودەبرێـت[٢]. ئـەم جـۆرە کـوفرە مرۆڤـــەکە ناخاتە دەرەوەی بازنەی ئیسلام، بەڵکو کەسەکە ئەگەرچی ئەو جۆرە کوفرەش بکات، ئەوا هەر مامەڵە و هەڵسوکەوتی موسڵمانانەی لەگەڵدا دەکرێت[٣].

---

[١] مشارق أنوار العقول ٢/٣١٣.

[٢] أنوار العقول وشرحها المشارق ٢/٣١٢ و ٣١٤.

[٣] شرح غاية المراد ١٣٤-١٣٥.

دوو ڕوویی (نفاق) لەلایەن ئیبازیەکان دوو جۆرە:

**أ- بەدرۆزانین و بڕوا پێنەبوون بە دڵ و بڕوا پێبوون و دەربڕینی بە زمان:** ئەمە لە فەرمایشتی خوای گەورەدا هاتووە کە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ﴾ النساء: ١٤٥. واتە: (بەڕاستی دووڕووەکان لە چینی هەرە خوارەوەی ناو دۆزەخدان).

**ب- ئەنجامدانی گوناهێکی گەورە:** هەروەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم): (**آية المنافق ثلاث: إذا حدث كذب، وإذا وعد أخلف، وإذا اؤتمن خان**)[١] واتە: نیشانەکانی دووڕوو سێ شتە: ئەگەر قسەی کرد درۆ بکات، ئەگەر بەڵێنی دا نەیباتەسەر و بیشکێنێت، ئەگەر سپاردەی لەلا دانرا خیانەتی لێبکات.

---

١- مشارق أنوار العقول ٢/٣١٣-٣١٢. فەرموودەی: (نیشانەکانی دووڕوو سێ شتە....تاد) لەم سەرچاوانەدا هاتووە: صحيح البخاري في: ٢ كتاب الايمان، ٢٤ باب علامة المنافق، رقم ٣٣، عن أبي هريرة. وهو في صحيح بخاري رقم ٢٦٨٢ و ٢٧٤٩ و ٦٠٩٥ وكلها عن أبي هريرة و في صحيح مسلم في: ١ كتاب الايمان، ٢٣ باب بيان خصال المنافق، رقم ٥٩، عن أبي هريرة (رضي الله عنه).

ئەم کوفرەش بەهۆی پشت کردنە لەو شتانەی خوای گەورە پێویستی کردووە یاخود کردنی کارێکە کە خوای گەورە قەدەغەی کردووە. جا بەو واتایە دەبێتە دژ و پێچەوانەی سوپاسگوزاری. (بڕوانە: شرح غاية المراد ١٣٤).

بەڵگەش لەمبارەوە:

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾﴾ الانسان: ٣. واتە: (بەڕاستی ئێمە ڕێنموویمان کرد بۆ ڕێگەی ڕاست، بە ئازادی دەتوانێت ببێتە کەسایەتیەکی ئیماندارو سوپاسگوزار یان بێ باوەڕو خوانەناس). ئیمامی موسلیم بەشێکی لە صەحیحەکەی

کوفر بە هەردوو جۆرەکەی پێشووتریەوە، پەیوەستە بە گوناهە گەورەکان. بەڵام ئەنجامدەری تاوانە بچوکەکان هەر موسڵمانە، بەو مەرجەی سور نەبێت لەسەر ئەنجامدانی[1].

## ئەوشتانەی دەبنە هۆی تەکفیر

کوفر لە چوار شتدا ڕوودەدات: ئەو شتانەی پەیوەستن بە بیروباوەڕەوە یان ئەوەی پەیوەستە بە گوفتار یاخود بە کردار یان بە فەرامۆش کردن[2].

**١- ئەو شتانەی پەیوەستن بە بیروباوەڕەوە:**

---

خۆی بۆ تەرخان کردووە، هەروەها ئیمامی بخاریش باسی کردووە بەم ناونیشانە کوفرێکی بچوکتر لە کوفری ڕەسەن (کفر دون کفر). (کوفری ڕەسەن و ئەصلی ئەوەیە کە مرۆڤ دەخاتە دەرەوەی بازنەی ئیسلام، ئا لێرەدا مەبەستی کوفری نیعمەتە - وەرگێڕ -).

ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم): تانەو توانجدان لە موسڵمانان تاوان و لاساریيە و شەڕکردن لەگەڵیاندا کوفرە[3]. (مەبەست لە کوفری بچوکە نەوەك کوفری گەورە - وەرگێڕ -).

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ﴾ النمل: ٤٠. واتە: (جا ئەوەی سوپاسگوزار بێت ئەوە بەڕاستی سوپاسگوزارە بۆ خۆی، ئەوەش کە سپڵەیە، ئەوە بێگومان پەروەردگارم دەوڵەمەند و بێ نیازە و خاوەنی بەخششە بە هەمووان). هەروەها دەفەرموویێت: ﴿وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ لقمان: ١٢. واتە: (خۆ ئەوەی سوپاسگوزار بێت ئەوە قازانج و سوودی سوپاسگوزاریيەکەی هەر بۆ خۆی دەگەڕێتەوە، ئەوەش سوپاسی خوای نەکرد، ئەوە بێگومان خوا بێ نیازەو سوپاس کراوە).

جا ئەو موسڵمانەی کە گوناهبارە بەوەی کوفری کردووە بە نیعمەتەکانی خواو سوپاسگوزار نەبووە، ئەوا ئەو موسڵمانە بەوە وەسف ناکرێت کە کوفری گەورەی کردووە، چونکە ئالێرەدا سوپاسگوزار نەبوونی موسڵمانەکە گوناهێکە و بەس و نایخاتە دەرەوەی بازنەی ئیمان و باوەڕەوە. /الحكم و قضية تكفير المسلم ٦٧-٦٨.

[1] مشارق أنوار العقول ٣٠٢/٢.

[2] المعالم الدينية ١١٨. هەروەها لە: (تشريع الجنائي الاسلامي ٧٠٧/٢)دا هاتووە: (هەڵگەڕانەوە لە ئایینی ئیسلام بریتیە لە فەرامۆش کردنی ئیسلام ... بە یەکێك لەم سێ ڕێگایانە: بەکردار یاخود بە نەکردن و بە گوفتار و بە بیروباوەڕ). بڕوانە ئەم سەرچاوەیەش: الايمان: د.محمد نعيم ياسين ٢٣٥.

هەروەك پێشتر خستمانەڕوو بنەماكانی ئـایین سـێ شـتن، كـە بـریتین لەمانـە: ئـەو شتانەی پەیوەستە بەخوای پاك و تاكەوە، ئـەوەش پەیوەسـتە بـە پێغەمبەرایـەتی و ڕۆژی دوایی.

هەر كەسێك نكۆڵی لە بوونی خوای گەورە كرد یاخود نكـۆڵی كـرد لـە یـەكێك لـە سیفەتەكانی وەك: توانا و زانست و یەكتایی خوا، یاخود نكۆڵی كرد لـە كارێـك لـە كارەكانی وەك: بەدیهێنان و ڕۆزی دان و مراندن، ئەوا ئەو كەسە كوفری كـردووە وەك سەرجەم بێ باوەڕ و خوانەناس و ئاگر پەرستەكان.

هــەر یــەكێكیش نكــۆڵی كــرد لــە پێغەمبەرایــەتی پێغەمبــەران و پەیامبــەران و پێغەمبەرایەتی موحەممەد (صلی الله علیـه وسـلم)و گشـتگیری پەیامەكـەی و كۆتـایی هێنانی بە پەیامە ئاسمانیەكانی پێشوو، هەروەها نكۆڵی كرد لە قورئانی پیرۆزو ئـەو شتەی پێیەوە پەیوەستە، ئەوا ئەو كەسە كوفری كردووە. وەك بەراهیمـەكان كـە لـە ڕەگ و ڕیشەوە نكۆڵی لە بوونی پێغەمبەرایەتی دەكەن و جولەكە و نەصرانیەكان كە بڕوایان بە پێغەمبەرایەتی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) نییە و ئەو كەسـانەش كـە بەڕەڵایی خوازن.

هەروەها هەر كەسێك، نكـۆڵی كـرد لـە بـوونی ژیـانی ڕۆژی دوایـی و دیمەنـەكانی ڕابوونی دوارۆژ و قیامەت و بەهەشـت و دۆزەخ، كـە ئەمانـە بـە دەقـی سـەلمێنراو چەسپاون، ئەوا ئەو كەسە بێ باوەڕو كافرە.

**٢- ئەوەی پەیوەستە بە گوفتار:**

هەموو ئەو گوفتارانە دەگرێتەوە كە لە میانەیدا دان بە بیروباوەڕێكی كوفریدا بنرێت یاخود واتاكەی بریتی بێت لە نكۆڵی كردن لـە شـتێك لـەو شـتانەی لـە ئیسـلامدا چەسـپاون، وەك: دەربڕینـی وشـەی كـوفر، یـاخود تانـەدان لـە خـوای پایەبـەرز و پێغەمبەران و پەیامبەران و كتێبە ئاسمانیەكان و ئایینی ئیسـلام یـاخود سـوكایەتی كردن بە ئیسلام و قورئان و یاسا و حوكمەكانی.

**٣- ئەوەی پەیوەستە بە كردارەوە:**

هەموو ئەو کردارانە دەگرێتە خۆی کە ئاماژەن بۆ دەرچوونی لە فەرمانی ئیسلام، وەك: دڕاندنی قورئانی پیرۆز یاخود فڕێدانی قورئانی پیرۆز بۆ ناو زبڵدان و شوێنی پیس بە مەبەستی سوکایەتی کردن یان وەك کرنووش بردن بۆ بتێك و بەگەورەگرتنی هەروەها وەك: بەملەوە هەڵواسینی دروشمی کوفر.

جا ئەگەر موسڵمان ئەو جۆرە شتانەی دەرخستن و ئەنجامی دا، هیچ بەڵگەیەکیش نەبووە لەسەر ئەوەی کە پاساو بێت بۆی لە ئەنجامدانی ئەو شتانەدا، وەك: ئەوەی ناچار کرابێت یاخود لەبەر بەرژەوەندی دەوڵەت هەڵی واسیبێت، ئەگەر هیچ پاساوی نەبوو، ئەوا ئەوکاتە بەوکارەی دەبێتە کافرێکی لە ئایین هەڵگەڕاوەو، حوکمەکانی کەسی هەڵگەڕاوەی لەسەر جێبەجێ دەکرێت[1].

٤- **فەرامۆش کردنی ئەو شتەی پێویستە بزانرێ**، وەك: فەرامۆش کردنی ناسینی خواو ئەو شتەی پەیوەستە بە پێغەمبەرەوە، بۆ نمونە: ڕانەمان و ورد نەبوونەوە لەو شتەی دەستەوەسان کەرە (المعجز)[2].

## پلەی هەرە بەرزی کوفر

کوفر پلە پلەیە، پلەکانی زیاتر دەبن بە زیاد بوونی سەرپێچی و سەرکەشی و دان پێدانەهێنان و سوور بوون و یاخیبوون و خراپتر بوون، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعۡدَ إِيمَـٰنِهِمۡ ثُمَّ ٱزۡدَادُواْ كُفۡرًا لَّن تُقۡبَلَ تَوۡبَتُهُمۡ وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلضَّآلُّونَ ﴾ آل عمران: ٩٠. واتە: (بەڕاستی ئەوانەی دوای باوەڕ هێنانیان کافر بوون و لەوەو دوا زیاتر ڕۆچوون لە کوفرو بێ دینیدا، ئەوانە پەشیمانی و تۆبەیان هەرگیز لێ وەرناگیرێت، ئا ئەوانە دەستەی گومڕاو سەر لێ شێواوەکانن).

---

[1] المعالم الدينية، و التشريع الجنائي الاسلامي، هەر دوو سەرچاوەکەی پێشوو، والعقيدة الاسلامية لعبد الرحمن حسن حبنكة ٦١٨.

[2] المعالم الدينية، سەرچاوەی پێشوو.

پلەی هەرە بەرزی کوفر بریتییە لە هاوبەش دانان بۆ خوا، خوای گەورە لەو کەسە خۆش نابێت کە مردبێت و هاوبەشی بۆ خوا بڕیار دابێت، هاوبەش دانان چڵە پۆپەی تاوانە و گەورەترین گوناهە لەناو گوناهە گەورەکان، خوای پایەبەرز فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴾ النساء: ١١٦. واتە: (بەڕاستی خوا خۆش نابێت لەوە هاوەڵ و شەریکی بۆ بڕیار بدرێت و جگە لەو - هاوبەش دانانە - لە گوناهانی تر بۆ هەر کەس بیەوێت و شایستە بێت خۆش دەبێت، جا ئەوەی شەریك و هاوەڵ بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە بەڕاستی گومڕا بووە بە گومڕاییەکی زۆر دوور).

سەبارەت بە گوناهەکانی تر چ گوناهی گەورە چ بچوك، ئەوا ئەنجامدەرەکەی بە بڕوادارێکی تاوانبار دادەنرێت کە دەکرێت بەبەر ڕەحمەتی خوای گەورە و لێخۆشبوونەکەی بکەون، بەوەی کە ئەگەر ویستی لەسەر بێت بە ویستی خۆی لێیان خۆش ببێت[1]. ئەمە مەزهەبی زۆربەی زانایانی موسڵمانانە، پاش کەمێکی تر ئاماژەی بۆ ئەکرێت.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊

[1] العقيدة الاسلامية وأُسسها ٦٢١-٦٢٢.

# دەروازەی دووەم

## حوکمی تەکفیر کردنی ئەهلی قیبلە

بەهۆی گوناهێکەوە هیچ کەسێکی ئەهلی قیبلە تەکفیر ناکەین، حـوکمی بـێ بـاوەڕی بەسەردا نادەین، مادەم گوناهەکە بە حەڵاڵ نەزانێت[1].

[1] ئیمامی ئەبو حەنیفە لە کتێبی (الفقه الأكبر) وتویەتی: (هیچ موسڵمانێك تەکفیر ناکـەین بـەهۆی هەر گوناهێکەوە مادەم بە حەڵاڵی نەزانێت، ناوی باوەڕداری لەسەر لا نابەین، بەڵکو بە باوەڕداری ڕاستەقینەی ناودەنێین، دەشکرێت بڕوادارێکی لاسار بێت نەوەك کـافر)./ بڕوانـە: الفقـه الأكـبر في شرحه القول الفصل ٣٠٦ وفي شرحه لملا علي القاري ١١٧.
ئەبو حەسەنی ئەشعەری لە کتێبی (الإبانة، ٢٦)دا وتویەتی: (دان بەوەدا دەنێین کە هیچ کەسێکی ئەهلی قیبلە تەکفیر ناکەین بەهۆی ئەوەی گوناهێکی کردووە مەگەر بە حەڵاڵی دابنێت، نموونـەی ئەو گوناهانە: زینا، دزی، خواردنەوەی مەیی، هەروەك خەواریجەکان لە مـەدا بـە هەڵەداچـوون و گومانیان وابوو کە گوناهکار کافرە، ئێمەش لەوبارەوە دەڵێین: هەر کەسـێك گونـاهێکی گـەورەی لەوجۆرە کرد وەك: زینا، دزی و هاووێنەکانی و بەحەڵاڵیشی دانا و بەحـەڕامی نـەزانی ئـەوا ئـەو کەسە بێ باوەڕو کافرە).
پێشتر هەندێ ڕاو بۆچـوونی تـری ئیمـامی ئەشـعەری لـەو بارەیـەوە خرایـەڕوو، کـە زەهـەبی و شێخەکەی ئیبن تیمیەش کۆك بوون لەسەری.
ئیبن حەزمیش لە کتێبی (الفِصَل، ٢٩٢/٣) وتویەتی: (ڕاستی ئەوەیە، کە هەر کەسێك هاتە نـاو چوارچێوەی ئیسلامەوەو بووە موسڵمان، ئەوا موسڵمانێتی لێ ناسەنرێتەوە تا نکوڵی نەکات یاخود بەیەکدەنگی بڕیاری کوفری لەسەر نەدرێت، بە پڕوپاگەندە و قسە بۆ هەڵبەسـتن لـە موسـڵمانێتی ناشۆرێت، بۆیە پێویستە هیچ کەسێك تەکفیر نەکرێت بەهۆی گوفتارێکیەوە تەنها ئەو کاتە نـەبێ کە کەسەکە خۆی بزانێت قسەکەی پێچـەوانەی فەرمایشـتی خـوای گەورەیـە یـاخود پێچـەوانەی فەرموودەی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، جـا ئـەو کەسـە ئەگـەر بەدروسـتی زانـی قسـەکەی پێچەوانەی قسەی خواو پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، ئەو کات ئەو کەسە تەکفیر دەکرێت...).

هەروەها ئەبو زەیدی قەیرەوانی ئەشعەری لە (رسالە)کەیدا دەڵێت: (هیچ یەکێك لە ئەهلی قیبلە بەهۆی گوناهەوە تەکفیر ناکرێت)./ بڕوانە: كفاية الطالب الرباني شرح رسالة ابن أبي زيد القيرواني ٨٢/١ و شرح رسالة ابن أبي زيد للقاضي عبدالوهاب ٣٤٧.
پێشەوا نەوەوی) لە (شرح صحیح مسلم: ٩٤) وتویەتی: (چاك بزانە مەزهەبی پەیڕەوانی حەق ئەوەیە: کە هیچ یەکێك لە ئەهلی قیبلە تەکفیر ناکرێت بەهۆی ئەنجامدانی گوناهێکەوە، هەروەها خەڵکی بیدعەچیش تەکفیر ناکرێت، جا هەر کەسێك نکۆڵی کرد لە شتێك کە لە ئیسلامدا بە پێویست زانراوە، ئەوا حوکمی هەڵگەڕانەوەو کافربوونی لەسەر دەدرێت مەگەر کەسەکە تازە موسڵمان بووبێت یاخود لە لادێیەکی دوور پێگەیشتبێت و هاووێنەی ئەم شتانە کە کابرا زانیاری لەبارەیەوە نەبێت، پێویستە فێر بکرێت، ئەگەر دوای ئەوەی پێی وتراو فێری ئەوەکرا کە ناکرێت نکۆڵی لەو شتانە بکات، کەچی کەسەکە هەر بەردەوام بوو لە نکۆڵی کردن ئەوا ئەوکاتە حوکمی هەڵگەڕانەوەی بەسەردا دەدرێت، بەهەمان شێوە حوکمی ئەو کەسەش هەمان شتە کە زینا و مەیی و کوشتن و هاووێنەی ئەمانە بە حەڵاڵ دادەنێت لەکاتێکدا بە حەرامدانانی ئەو شتانە پێویستن).
غەرنەوی ماتوریدی لە کتێبەکەیدا (أصول الدين: ٣٠١-٣٠٤) دەڵێت: (هیچ یەکێك لە ئەهلی قیبلە تەکفیر ناکەین بە کردنی هیچ گوناهێك مەگەر بە حەڵاڵی دابنێت، هیچ کەسێك لە بازنەی ئیمان بەدەر ناخەین مەگەر کەسەکە خۆی نکۆڵی بکات لەو شتەی کە بەهۆیەوە هاتۆتە ناو بازنەی ئیمان.... بڕیار لەسەر هیچ موسڵمانێك نادەین بەوەی فڵانە بەهەشتیە یاخود دۆزەخیی، گەواهی نادەین لەسەر هیچ یەکێکیان بەوەی کوفر یان دوو ڕوویی یاخود هابەشی داناوە بۆ خوا مادام ئەو شتەی لێ بەدی نەکرێت، نهێنیەکانیان بەخوای گەورە دەسپێرین).
شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە (الغنية: ٨٩/١)دا دەڵێت: (ئەهلی سوننە کۆکن لەسەر ئەوەی کە بەهەشت و دۆزەخ بۆ هیچ کەسێك یەکلا نەکەنەوە، جا ئەو کەسە گوێڕایەڵ بێت یاخود لاسار، بەرچاو ڕۆشن و پێگەیشتوو بێت یاخود یاخی بووێکی سەرکەش بێت، مەگەر بیدعە و گومڕایی لێ بەدی بکرێت).
ئیبن تەیمیە وتویەتی: (دروست نیە موسڵمان تەکفیر بکرێت بەهۆی کردنی گوناهێکەوە یاخود بەهۆی هەڵەیەکەوە، وەك ئەو مەسەلانەی ئەهلی قیبلە ڕاجیاییان لەسەرە... خەواریجە دەرچووەکان ئەوانەی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی کرد جەنگیان لەگەڵ بکرێت، ئەوا میری بڕواداران عەلی کوڕی ئەبو تالیب (ڕەزای خوای لێبێت) جەنگی لەگەڵ کردن، پێشەواکانی ئایین لە هاوەڵان و دواتر شوێنکەوتووان لەگەڵی کۆك بوون لەسەر ئەمە، کەچی عەلی کوڕی ئەبو تالیب و سعدی کوڕی أبی وەققاس و هاوەڵانی تریش خەواریجیان تەکفیر نەکرد، سەرباری ئەوەش کە جەنگیان لەگەڵ کردن، کەچی هەر بە موسڵمان دایان دەنان، عەلی جەنگی لەگەڵ خەواریجەکان بەرپا نەکرد تا ئەو کاتەی کە خەواریجەکان خوێنی حەرامیان ڕشت و هێرشیانکردە سەر

ئەمە مەزهەبی پەیڕەوان (ئەهل)ی سوننەیە بە پێشین و پاشین (سلف و خلف)ەوە[1].
ئەهلی قیبلە بریتین لە موسڵمانان[2]، یاخود هەر کەسێك دەگرێتەوە کە بانگەشەی موسڵمانێتی و ڕوو لە کەعبە دەکات، ئەگەرچی ئەو کەسە گوناهکاریش بێت مادام شتێك بەدرۆ نەخاتەوە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هێناویەتی[3].

---

موسڵمانان، لەو کاتەدا ئیمامی عەلی جەنگا لەگەڵیان بۆ بەرپەرچدانەوەی ستەم و زۆرداریییان، جا ئەم جەنگانە لەبەر ئەوە نەبوو کە کافرن، بۆیە ئیمامی عەلی کەسی لەوان بە بارمەتە نەگرت و ماڵی ئەوانی وەك تاڵان نەبرد.

مادام ئەو خەواریجانە کە گومڕابونیان بە دەق و یەکدەنگی چەسپا، کەچی هەر تەکفیر نەکران، سەرباری ئەوەی خواو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمانیان کرد بەوەی بجەنگن لەگەڵیان، جا چۆن تەکفری تاقمانێك دەکرێت کە دژەران و ڕاستی و حەقیان لە هەندێ مەسەلە و بابەتدا لێ ونبووە؟ کە کەسانی زۆر لەوان زاناتر لەو مەسەلانەدا هەڵەیان کردووە)./ بڕوانە: مجموع الفتاوی لابن تیمیة ٣/٢٨٢.

هەروەها لە (العقیدة الطحاویة)دا هاتووە: (هیچ یەکێك لە ئەهلی قیبلە تەکفیر ناکەین بەهۆی گوناهێکەوە مادەم بە حەڵاڵی دانەنێ) / بڕوانە: شرحها لابن أبي العز ٤٣٢. هەورەها لە (٤٥٨) هاتووە: (بەندە تەنها بەوە لە بازنەی ئیمان دەردەچێت کە نکۆڵی بکات لەو شتەی کە پێی هاتۆتە ناو بازنەی ناوبراو). بەهەمان شێوە لە (٥٣٩)دا هاتووە: (گەواهی نادەین لەسەر هیچ یەکێکیان بەوەی کوفر یان دوو ڕوویی یاخود هاوبەشی داناوە بۆ خوا، مادام ئەو شتەی لێ بەدی نەکرێت، نهێنیەکانیان بەخوای گەورە دەسپێرین).

[1] کفایة الطالب الرباني ٨٢/١، و تیایدا هاتووە: ئەمە ڕای فاکهانیە.

[2] کفایة الطالب الرباني، سەرچاوەی پێشوو.

[3] شرح العقیدة الطحاویة لابن أبي العز ٤٢٦-٤٢٧.

ئیبن تەیمیە وتویەتی: (هەر کەسێك یاخی یان ستەمکار بێت یان دەستدرێژی یاخود هەر گوناهێك بکات، ئەوا ئەو کەسانە دەبنە دوو بەش: بەشی یەکەم: تەئویلکەرە، بەشی دووەم: تەئویلکەر نییە.
ئەو تەئویلکەرەی کە موجتەهیدە وەك ئەو زانایانەی لە زانست و ئاییندا ڕۆچوون و ئیجتهادو کۆششیان کردووە، هەندێکیان بۆچوونیان وابووە هەندێ شت حەڵاڵە و هەندێکی تر پێیان حەرام بووە، هەروەك هەندێك لە زانایان هەندێ جۆری خواردنەوەیان بە حەڵاڵ داناوە و هەندێکی تریان هەندێ مامەڵەی سودار (ربوی)یان بە حەڵاڵ داناوەو هەندێکی تریان هەندێ گرێبەستیان حەڵاڵ کردووە وەك گرێبەستی حەڵاڵ کردنەوە موتعە، هاووێنەی ئەمانە، ئەم شتە و هاووێنەکانی

لە (العقیدة الطحاویة)دا هاتووە: (هەر كەسێ ڕوو لە ڕووگەی ئێمە بكـات و ئـەهلی قیبلەی ئێمە بێت بە موسڵمانی باوەڕدار ناوی دەنێین، مادام دانـدەنێن بـەوەی پێغەمبـەر (صلی الله علیه وسلم) هێناویەتی و فەرمان و هەواڵدانەكانی بەڕاست دەزانن)[١].

**بەپێی ئەم بەڵگانە:**

ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم): **(مـن صلى صـلاتنا، واسـتقبل قبلتنا، وأكل ذبیحتنا، فهو مسلم، له ما لنا وعلیه ما علینا)**[٢] واتە: هەر كەسێك نوێژی ئێمە بكـات و ڕوو لـە قیبلـە و ڕووگـەی ئێمـە بكـات و سـەربڕاوی ئێمـە بخـوات ئـەوا موسڵمانە، چی بۆ ئێمە بێت ئەویش بۆ ئەوە و چی لەسـەر ئێمـە پێویسـت بێـت ئـەوەش لەسەر ئەو پێویستە.

ئەگەر گوناهی حەڵاڵ كرد، جا بچوك بێ یان گەورە، ئـەوا ئـەو كاتـە شـەرع بـەدرۆ

---

ڕوویانداوە لەناو كەسە بەرزەكانی پێشین. حوكمی ئەو زانا تەئویلكارە موجتەهیدانە ئەوەیە كە هەڵەكارن، خوای پایەبەرزیش فەرموویەتی: ﴿رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا﴾ البقرة: ٢٨٦. واتە: (پەروەردگارا" لێمان مەگرە ئەگەر فەرامۆشیمان بەسەردا هات یان گوناهو هەڵەیەكمان كرد).

ئەگەر كەسی یاخی بووەكە موجتەهیدێكی تەئویلكەر بوو، بۆشی دەرنەكەوت كە یاخی بووە، بەڵكو بەپێچەوانەوە بڕوای وابوو خۆی لەسەر حەقە، جا ئەگەرچی لەو بۆچوونەیدا بەهەڵەدا چووەو ناو نانیشی بە یاخی مانای وانییە تاوانبارە، چ جای ئەوەی بەلاسار بژمێردرێت. ئەوانەش كە بۆچوونیان وایە دەبێت جەنگ بكرێ لەگەڵ یاخی بووە تەئویلكارەكان ئەوا دەڵێن: جەنگ كردنمان لەگەڵ ئەو یاخی بووانە بۆ بەربەرچدانەوەی زیانەكانیانە نەوەك بۆ سزادانی ئەوان، بەڵكو بۆ ڕێگرتنە لە دەستدرێژی كردن، هەروەها دەڵێن: ئەو یاخی بووانە هەر دادگەرن و بەلاسار لە قەڵەم نادرێن، هەروەها دەشڵێن: ئەوانە وەك كەسی ڕانەسپێرراو و نا موكەلەف وان)./ مجموع الفتاوی ٣٥/٧٥-٧٦.

[١] العقیدة الطحاویة. سەیری بكە لە: شرحها لابن أبي العز ٤٢٦. پێشتر قسەمان كرد لەبارەی هەردوو بنچینەی پەیمان و هەڕەشە (الوعد والوعید) و پلەیەك لە نێوان دوو پلەكە (المنزلة بین المنزلتین) و ئەو شتانەی پەیوەستن بەمانەوە.

[٢] شرح العقیدة الطحاویة لابن أبي العز ٤٢٦.

فەرموودەی: هەر كەسێك نوێژی ئێمە بكات..... تاد، هاتووە لە: صحیح البخاري في: ٨ كتاب الصلاة، ٢٨ باب فضل استقبال القبلة، رقم ٣٩١ و٣٩٢ و٣٩٣، و كلها عن أنس بن مالك (رضي الله عنه) بألفاظ متقاربة.

دەخاتەوە، بەڕاستدانانی شەریعەت لە دڵی دا نامێنێت بۆیە دەبێتە کەسێکی بێ باوەڕو کافر، پەنا بەخوا[1].

ڕاجیایی لە نێوان موسڵماناندا نییە لەبارەی کەسێك بە ئاشکرا نکۆڵی بکات لەو فەرزانەی (موتەواتیرن) و لەو شتە قەدەغە و حەرامانەی کە ئاشکراو متەواتیرن، هاووێنەی ئەمانەش، پێویستە داوای تەوبەی لێبکرێت، جا ئەگەر تۆبەی کرد ئەوە باشە ئەگەرنا بە کافرێکی هەڵگەڕاوەو سزای کوشتنی بەسەردا جێبەجێ دەکرێت[2].

بەڵام ڕەخنەیەك ناراستەی تەکفیر نەکردنی ئەهلی قیبلە دەکرێت:

کەسانی دوو ڕوو هەن لەناو ئەهلی قیبلەدا، ئەو دووڕووانە کافرترن لە جولەکە و مەسیحیەکان بە بەڵگەی قورئانی پیرۆز و سوننەتی بەپێزو یەکدەنگی، هەندێ کەس لەناو ئەهلی قیبلەدا هەن هەر کاتێککە هەلیان بۆ ڕەخساهەندێ حاڵەتی دوو ڕوویی دەردەخەن کەچی شایەتمانیش دەرەبڕن. لەبەر ئەم هۆکارە زۆرێك لە پێشەوایان پێیان ناپەسەند بووە کە بەڕەهایی بوترێت: ئێمە کەس بەهۆی هیچ گوناهێکەوە کافر ناکەین، بەڵکو دەوترێت: ئێمە هیچ کەسێك بەهەموو جۆرە گوناهێك تەکفیر ناکەین هەروەك خەواریجەکان دەیان کرد[3].

پێویستە لەم حاڵەتەدا ئاگاداری دوو شت بین:

یەکەم: گەواهی و شایەتیدان لەسەر کافرێتی کەسێکی دیاریکراو.

دروست نییە گەواهی و شایەتی بدرێت لەسەر کەسێکی دیاریراو بەوەی کافرە، تەنها لە حاڵەتێکدا نەبێت کە هۆکارێکی وا هەبێت ئەو شایەتیدانە بەشیاو دابنێت[4]،

---

[1] القول الفصل ٣٠٦.

[2] شرح العقيدة الطحاوية لابن أبي العز ٤٣٣.

[3] سەرچاوەی پێشوو ٤٣٣-٤٣٤.

[4] واتای ئەمە ئەوەیە: بۆ نمونە بڵێین: شوعیبیەکان کافرن یان ئەو حوکمڕانە عەلمانیانەی کە حوکمی شەرع ڕەتدەکەنەوە کافرن یان ئەوەی وا بڵێت و بانگەشە بۆ ئەمە بکات کافرە، ئەمە حوکمدانە لەسەر جۆر. جا ئەگەر کردارەکە پەیوەست بوو بە کەسێکی دیاریکراو کە لە فڵانە تاقمە یان فیسارەیە، ئەوا ئەو کاتە هەڵوەستە بکرێت بۆ زیاتر لێکۆڵینەوەو چەسپاندنی هەڵوێستی کەسەکە،

گەورەترین دەستدرێژی ئەوەیە کە شایەتی بدرێ لەسەر کەسێکی دیاریکراو، بەوەی خوا لێی خۆش نابێت و ڕەحمی پێناکات بەڵکو دەیخاتە ئاگری دۆزەخەوە، چونکە ئەمە حوکمی کافرە لە دوای مردنی. بەم بەڵگانەی خوارەوە:

أ- ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم): **(كان رجلان في بني إسرائيل متواخيين، فكان أحدهما يذنب، والآخر يجتهد في العبادة، فكان لا يزال المجتهد يرى الآخر على الذنب، فيقول: أقصر. فوجده يوما على الذنب، فقال له أقصر. فقال خلني وربي، أبعثت علي رقيبا؟ فقال والله، لا يغفر الله لك، أو لا يدخلك الله الجنة. فقبض أرواحهما، فاجتمعا عند رب العالمين، فقال لهذا المجتهد: أكنت بي عالما؟ أو كنت على ما في يدي قادرا؟ وقال للمذنب: إذهب فادل الجنة برحمتي. وقال للآخر: اذهبوا به إلى النار. قال أبو هريرة: والذي نفسي بيده، لتكلم بكلمة أوبقت دنياه وآخرته)** واتە: دوو پیاو لە نەوەی ئیسرائیل هەبوون وەکو برا وابوون، یەکێکیان گوناهی دەکرد و ئەوەی تریان زۆر پەرستشی دەکرد، ئەوەی زۆر بەندایەتی دەکرد ئەوەی تری دەبینی کە بەردەوامە لەسەر گوناه کردن و پێی دەوت: واز بێنە. ڕۆژێکی تر بەهەمان شێوە بینی تاوان دەکات، پێی وت: واز بێنە. گوناهکارەکەش وتی: واز بێنە لە من و خواکەم، خۆ تۆ بۆ چاودێری من ڕەوانە نەکراوی؟ لە وەڵامدا وتی: سوێند بەخوا، خوا لێت خۆش نابێت و ناتباتە بەهەشت. خوای گەورە ڕۆحی هەر دووکیانی کێشا، لەلایەن خوای گەورە کۆبوونەوە، خوای گەورە بە بەندە پەرستشکارەکەی وت: ئایا زانای بەمن؟ ئایا توانات بەسەر ئەوەدا ئەشکا کە لە ژێر دەسەڵاتی مندا بوو؟ و بە گوناهکارەکەی فەرموو: بڕۆ ناو بەهەشت بە ڕەحمەت و بە زەیی من. و بە ئەوەی تری وت: ببەنە ناو ئاگری دۆزەخ. ئەبو هورەیرە وتی: سوێند بەو زاتەی ڕۆحی منی بەدەستە، بەندە چاکەکە وشەیەکی وت دونیا و دوارۆژی پێ لە دەستچوو.

---

لە ڕێگەی پرسیار و گفتوگۆ لەگەڵ کردنی، تا بەڵگەی لەسەر بەرپا دەبێت./ فتاوی المعاصرة: د. یوسف القرضاوي ١/١٢٩.

ب- دەکرێت کەسی دیاریکراو کۆشش و ئیجتهاد و هەڵەی کردبێت و بەمەش لێخۆش بوونی بە دەست هێنابێت.

پ- دەکرێت کەسی دیاریکراو خاوەن بڕواو ئیمانێکی گەورەو چاکەی زۆر بێت بەمەش ڕەحمەتی خوای گەورەی دەست خستبێت، هەروەك لەو کەسە خۆش بوو کە وتی: (ئەگەر مردم بمکەنە خۆڵەمێش و فڕێم بدەن، دواتر خوای گەورە لێی خۆشبوو بەهۆی ئەو ترسەی هەیبوو) ئەو کەسە گومانی وابوو کە خوای گەورە ناتوانێت پارچە بڵاوەکانی لاشەی کۆبکاتەوەو زیندووی بکاتەوە یاخود گومانی لە زیندوو بوونەوە هەبوو.

زانایان وتویانە: ئێمە لەبارەی دوارۆژەوە بڕیار لەسەر کەس نادەین، ئەمەش ڕێگر نیە لەوەی سزای دونیایی ئەو کەسە بدەین، تا ڕێگری لەو بیدعەیەی بکرێت و داوای تەوبەی لێبکرێت، جا ئەگەر تەوبەی کرد ئەوە باشە ئەگەرنا دەکوژرێت.

بۆیە زانایان سەیری ئەو قسەیە دەکەن کە کەسەکە دەیکات، جا ئەگەر قسەکە لە خودی خۆیدا کوفر بوو، ئەوا دوترێت: ئەو کەسە کوفری کردووە، قسەکەرەکەش بەپێی مەرجەکان و لاچوونی پەرچەکان تەکفیر دەکرێت، ئەمەش لە کاتێکدایە کە ئەو کەسە بێ دین و دوو ڕوو بێت. چونکە مەزەندە ناکرێت کە یەکێ لە ئەهلی قیبلە کوفر بکات مەگەر کەسەکە دوو ڕوو و بێ دین بێت. بە بەڵگەی ئەوەی کە:

خوای گەورە لە سەرەتای سورەتی (البقرة)دا خەڵکی بۆ سێ بەش دابەش کردووە: ئەوانەی بە دەرو دەروون (بالظاهر والباطن) بڕوادارن، بێ باوەڕو کافرەکان ئەوانەن کە شایەتمان ناهێنن، دوو ڕووەکان ئەوانەی لە ڕووکەشدا شایەتمانیان هێناوەو بە دەروونیش بێ باوەڕییان حەشارداوە. جا هەر کەسێك شایەتمانی هێنابێت و کوفر بکات، ئەوا ئەو کەسە دوو ڕووە[1].

[1] شرح العقيدة الطحاوية لإبن أبي العز ٤٣٦-٤٣٨.

بەم پێیە: بۆ تەکفیر کردنی کەسێکی دیاریکراو،ناکرێت تەنها پشت بە ڕووکەش و لایەنە دیارەکەی ئەو کەسە ببەسترێت.

(إبن أبي العز) وتویەتی: هەر کەسێك گشت ئەو کەسانەی تەکفیر کرد کە قسەیەکی بیدعە دەکەن و کەچی لە ناخەوە سەرچاوەی نەگرتووە، ئەوا پێویستە کەسانێك تەکفیر بکات کە لە دەروونا دوو ڕوویان حەشار نەداوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە خواو پێغەمبەری خوایان خۆشدەوێت، بڕوای تەواویان بە خواو پێغەمبەرکەی هەیە، ئەگەرچی گوناهباریش بن. بەم بەڵگەیە: (پیاوێك لە سەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەبوو، ناوی عبدالله بوو، بە (حمار) ناوزەد دەکرا، پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) دەهێنایە پێکەنین، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چەندین جار سزای مەیی خواردنەوەی لەسەر جێبەجێ کرد، ڕۆژێك هێنایان، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)فەرمانی کرد سزا بدرێت. لەو کاتەدا پیاوێك لە ناو خەڵکەکەدا وتی: خوایە نەفرینی خۆتی بەسەردا ببارێنە، ئای چەند ئەم کەسە دەهێننە ئێرە! پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: نەفرەتی لێ مەکە،

---

ئیبن تەیمیەش ئەم بۆچوونەی لەلا پەسەندە، کە نابێت تەکفیری کەسێکی دیاریکراو بکرێت. بڕوانە بۆچوونەکەی لە: مجموع الفتاوی: ١٢/٤٨٤ و ٥٠٠ و ٢٣/٣٤٥ و ٣٥/٦٦ و١٦٥.

فەرموودەی: دوو پیاو لە نەوەی ئیسرائیل هەبوون... تاد. هاتووە لە: سنن أبي داود في: ٣٥ كتاب الأدب، ٥١ باب النهي عن البغي، رقم ٤٩٠١، عن أبي هريرة و حسنه ابن أبي العز.

فەرموودەی: کە مردم بمکەن بە خۆڵەمێش.... تاد، ئەمانە گێڕاویانەتەوە: البخاري و مسلم و النسائي و ابن ماجه و أحمد، عن أبي هريرة (رضي الله عنه). سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە: هامش شرح العقيدة الطحاوية، سەرچاوەی پێشوو.

ئیبن تەیمیە وتویەتی: ئەم کەسە گومانی لە توانای خوای گەورە هەبوو، لەوەی ئەگەر ببێتە خۆڵەمێش پێی وابوو خوای گەورە ناتوانێت زیندووی کاتەوە، تەنانەت بڕواشی وابوو کە ناگەڕێتەوە، ئەمە کوفرو بێ باوەڕییە لەلایەن هەموو موسڵمانانەوە، ناوبراو نەزان بوو نەیدەزانی خوای گەورە زیندووی دەکاتەوە، بڕوادار بوو لەخوای گەورە دەترسا لەوەی سزای بدات، لەبەر ئەم ترسە خوای گەورە لێی خۆش بوو. ئەو تەئویلکارەی لە پلەی ئیجتهاد دایە و سوریشە لەسەر شوێنکەوتنی پێغەمبەر لە پێشترە کە ڕەحمەت و بەزەیی بەسەریدا ببارێ لە ناوبراو ./ مجموع الفتاوی ٣/٢٣١.

